سەرجەمی پەیامەکانی نوور

٧

# ئامارەکانی ئیعجاز

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق رەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

سەرجەمی پەیامەکانی نوور

٧

# ئامارەکانی ئیعجاز

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی



نورسی، بدیع‌الزمان سعید، ۱۸۷۳ - ۱۹٦۰ م.
ئاماژەکانی ئیعجاز/ تألیف بدیع‌الزمان سعید نورسی؛
مترجم به زبان کردی فاروق رسول یحیی ۱۹۵۵.
تهران: نشر احسان، ۱۳۹٤
۸۰٦ ص.
فیپا: ISBN: ۹۷۸-٦۰۰-۳٤۹-۱٦۰-۱
موضوع: قرآن - بررسی معجزات، اسلام - مسائل متفرقه.
شناسه افزوده: یحیی، فاروق رسول.
رده بندی کنگره: BP۱۱ /۸٤م۳۰٤۷ ۱۳۹٤
رده بندی دیویی: ۲۹۷/۰۹م.
شماره کتابشناسی ملی: ۲۸۳٤۲۵٤



# ئاماژەکانی ئیعجاز

✦ مولف: بدیع الزمان سعید نورسی
✦ مترجم: فاروق رسول یحیی
✦ ناشر : نشر احسان
✦ نوبت چاپ : اول ـ ۱۳۹٤
✦ چاپ : مهارت
✦ تیراژ : ۳۰۰۰ جلد
✦ قیمت: ۲۵۰۰۰ تومان
✦ شابك: ۹۷۸ -٦۰۰-۳٤۹-۱٦۰-۱



تهران خ انقلاب روبروی دانشگاه
مجتمع فروزنده، شماره ۴۰۶
تلفن: ۶۶۹۵۴۴۰۴

# ئەم وەرگێڕانە کوردی‌یە

بسم الله الرحمن الرحيم

يا رب لك الحمد كما ينبغي لجلال وجهك وعظيم سلطانك، والصلاة والسلام على سيدنا ونبينا محمد، وعلى آله وصحبه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.

خوێنەری بەڕێزم!

دەبوو لە سەرەتای کتێبێکی وەك ئەمەدا، باس لە بەهای کتێبەکە و، قسە لەسەر نوسخە جیاجیاکانی بکرایە. کەچی ئەم کارەمان نەخستە ئەستۆی ئەم سەرەتایە..

چونکە باسی بەها و پێگەی ئەم کتێبە ناوازەیەمان بۆ پێشەکی‌یە بەنرخەکەی پسپۆڕی تەفسیر "دکتۆر موحسین عەبدولحەمید" بەجێ هێشتووە کە بە شێوەیەکی زانستییانە ئەو ئەرکەی ڕاپەڕاندووە.. هەروەك لێدوان لەسەر نوسخە دەستنووس و چاپکراوەکانی یەکەم جاریشی، پێشەکی‌یەکەی مامۆستای بەڕێز "ئیحسان قاسم صالحی" لە ئەستۆی گرتووە لە لاپەڕەکانی دواتردا.

بەڵام ئەوەی بە پێویستی بزانین لەم چەند دێڕەدا سەبارەت بەم وەرگێڕانە کوردی‌یە بۆ خوێنەری بەڕێزی بخەینە ڕوو، ئەم چەند مەبەستەی خوارەوەیە:

١ - مامۆستا نوورسی، لە بەرەی پێشەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی و، لەناو گەرمەی ڕووداوەکاندا، ئەم کتێبەی بە زمانی عەرەبی و، بە شێوازێکی خەستوخۆڵ بە تایبەت بۆ قوتابی‌یە زیرەکەکانی خۆی و، بەپێی هەلی ڕەخساو داناوە، هەتا ئەو دەمەی بە دیل گیراوە. دواتر کە لە دیلی گەڕاوەتەوە، بە بێ پێداچوونەوەیەکی ئەوتۆ لە چاپی داوە.

هەر ئەم شێوازە خەستوخۆڵەی کە دەقی کتێبەکەی پێ داڕێژراوە، ئەو بڕوایەی بە شارەزایانی ئەم کتێبە بەخشیوە کە وەرگێڕانی بۆ هەر زمانێکی تر، کارێکی دژوار و ئەستەم بێت بەلایانەوە..

تەنانەت یەکەم هەوڵی وەرگێڕانی بۆ زمانی تورکی، هەرچەندەش لە لایەن کەسێکی زانا و بەتوانای وەك مامۆستا عەبدولمەجید نورسیی برای دانەرەوە - خوا لێیان خۆش بێت - ئەنجام دراوە، کەچی لە هەندێ شوێنیدا وەرگێڕانەکە دەقاودەق دەرنەچووە، بەڵکو پوختەی واتاکەی بە زمانی تورکی بە دەستەوە داوە، یان لە شێوە ڕاڤەیەکی فراوانتردا مەبەستەکەی گەیاندووە. بۆیە دوای ئەو کەسێکی شارەزای وەك مامۆستا عەبدولقادر بادللی - خوا لێی خۆش بێت - سەر لەنوێ وەرگێڕانێکی تێروتەسەلی بۆ کردووە بە زمانی تورکی.

٢ - ئێمەش لەم هەلومەرجەی ئەم کتێبەدا سەبارەت بە وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی، لە نێوان هەڵبژاردنی یەکێك لەم دوو ڕێگایەدا بووین:

یان هەر وەری نەگێڕین بۆ کوردی و، خوێنەر بۆ خۆی هەوڵ بدات لە دەقی عەرەبی‌یەکەی تێبگات..

یاخود چی لە تواناماندایە هەوڵی خۆمان بخەینە کار بۆ وەرگێڕانی، بە تایبەت بۆ ئەو بەڕێزانەی کە پێدەچێت لە خوێندنەوەی بە زمانی کوردی زیاتر سوودمەند بن تاکو خوێندنەوەی بە هەر زمانێکی تر. نەخوازەلا کە بەڵێنمان بە خوێنەران دابوو ئەم کتێبەش بە کوردی لە زنجیرەی "سەرجەمی پەیامەکانی نور"دا بڵاو بکەینەوە!

بەڵام خۆ وزە و توانا و بەهرەکان، چەندەش بە ئەزموون بن، هێشتا سەبارەت بە زۆرێك لەم دەقانەی کە خوێنەر لەم کتێبەدا دەیبینێت، ڕووبەڕووی کارێکی هاوشێوەی دەرهێنانی بەرد دەبنەوە بە ئامێری سەرەتایی نێو کانە بەردەکان!

لە ئەنجامدا چارەسەری ئەم دوودڵی‌یەم تەنها لەوەدا بینی‌یەوە کە بە تەواوی دەست لە هەموو بەهرەیەکی کەسیی مرۆڤانەم دابشۆم و، خۆم لە گشت وزە و توانایەکم دابماڵم و، ڕاستەوخۆ پەیوەستی هێز و توانای خوای باڵا دەست ببم، بەو هیوایەی کە میهرەبانی‌یەکەی بێت بە هانامەوە و، بتوانم ئەو بەڵێنەم بیبەمە سەر کە بە خوێنەرانم داوە بۆ دەرکردنی ئەم بەرگەش بە زمانی شیرینی کوردی.

٣ - ئیتر بە گرتنەبەری ئەم ڕێبازە، پشتم بە خوای بەتوانا بەست و، هەنگاو بە هەنگاو دەستم دایە کاری وەرگێڕانی. زۆربەی جاریش کاتە پیرۆزەکانی وەك مانگی ڕەمەزانم بۆ ئەم مەبەستە هەڵدەبژارد، تاکو زیاتر ڕێژنەی میهرەبانیی خوای گەورەم بەسەردا بباریت و پتر لەم ئەرکەدا چاودێریم بکات. هەر بەم جۆرە بەردەوام بووم هەتا لە شەوەکانی "قەدر"ی ساڵی (١٤٣٥ك)دا خوای گەورە دەستی پیت و ڕێزی مانگی ڕەمەزانی لەسەر ئەم وەرگێڕانە دانا و، بە فەزڵی خۆی گەیاندی‌یە کۆتایی.

ئنجا قۆناغ بە قۆناغی وەرگێڕانەکەشم دەخستە بەردەست شارەزای زمانی عەرەبی برای بەڕێزم مامۆستا "حسەین حەسەن کەریم" مامۆستا لە زانکۆی سلێمانی، تاکو هەڵەکانی خۆمم پیشان بدات و، بۆ ڕاستی‌یەکان بێدارم بکاتەوە. ئەویش - خوای گەورە پاداشتی بداتەوە - دڵسۆزانە وەرگێڕانەکەی ئێمەی لەگەڵ دەقە عەرەبی‌یەکەدا بەرامبەر کرد و، لە چەندین شوێندا ڕێنمایی دروستی پێش چاو خست. تەنانەت هەندێ ڕوونکردنەوەی بەڕێزیانم لە پەراوێزی لاپەڕەکەدا بە هێمای (م. حسین) داناوە.

٤ - مامۆستا نوورسی پێی خۆش بووە کە دەقی عەرەبی‌یەکەش لەگەڵ وەرگێڕانە تورکی‌یەکەدا چاپ بکرێت، بە مەبەستی تەواوکردنی کاری یەکتر لە تێگەیاندنی خوێنەردا. هەر بۆیە مامۆستا عەبدولقادر بادللی لەگەڵ وەرگێڕانەکەیدا دەقی عەربی‌یەکەشی بڵاو کردووەتەوە. بەڵام سەرنجم دا دەقە عەرەبی‌یەکەی لە پێشدا بە تەواوی هێناوە، ئنجا دوا بە دوای ئەو وەرگێڕانەکەی خۆیشی بە جیا داناوە.

ئێمە لە لای خۆمانەوە پێمان باش بوو کە وەرگێڕانە کوردی‌یەکە و دەقە عەرەبی‌یەکە لە بەرامبەر یەکترەوە دابنێین، بەم جۆرەی کە لەم کتێبەدا خوێنەری بەڕێز دەیبینێت. دواتریش کاتێ چاپە تازەکەی ئەم کتێبە گەیشتە دەستمان کە لە لایەن "بەڕێوەبەرایەتیی کاروباری ئایینی"ی وڵاتی تورکیاوە چاپ کراوە، بینیمان هەمان ڕێبازی ئێمەی گرتووەتەبەر، چونکە لە لاپەڕەیەك دەقە عەرەبی‌یەکە و لە لاپەڕەکەی بەرامبەریشی وەرگێڕانەکەی مامۆستا عەبدولمەجیدی داناوە.

ئنجا تەقالایەکی زۆرمان دا کە وەرگێڕانەکە و دەقە عەرەبی‌یەکە بە ڕێکی لە بەرامبەر یەکترەوە دەربچن. لە زۆربەی لاپەڕەکانیشدا ئەو مەبەستەمان بۆ هاتەدی، بەڵام لە هەندێ لاپەڕەی کەمدا، لەبەر جیاوازیی تایبەتکاریی داڕشتنەوەی ڕستەکان لەم دوو

زمانەدا، بە تەواوی لە بەرامبەری یەکترەوە دەرنەچوون، بەڵکو هەندێ ڕستە و دەستەواژە لە لاپەڕە بەرامبەرەکاندا پاش و پێش کەوتوون، یان ڕۆشتوونەتە سەرەتای لاپەڕەی دوای ئەو.

٥ – ئەو هێمایانەش کە لێکۆڵەری دەقە عەرەبی‌یەکە باسی کردوون و لە داوێنی پەراوێزەکاندا دایناون، لە کوردی‌یەکەشدا وەکو خۆیان دامان نانەوە.

٦ – لە هەندێ شوێنی وەرگێڕانەکەدا پەراوێزی جگە لە هی دانەرمان بە پێویست نەزانیوە و نەمان هێناوە. لە هەندێ شوێنی تریشدا بەپێی پێویست پەراوێزی زیاترمان لە کوردی‌یەکەدا داناوە و بە نیشانەی (وەرگێڕ) جیامان کردوونەتەوە.

٧ – پەراوێزەکانی "مامۆستا ئیحسان"یش، خۆی لە داوێنیانەوە هیچ نیشانەیەکی دانەنابوو، ئێمەش بە هەمان شێوە مامەڵەمان لەگەڵدا کردن.

٨ – لە یەك شوێندا ڕوونکردنەوەیەکمان لە وەرگێڕانە تورکی‌یەکەی مامۆستا عەبدولمەجیدەوە لە پەراوێزدا هێناوە کە لە پەراوێزی دەقە عەرەبی‌یەکەدا نەبوو. بە هەمان جۆر یەك دێڕی لەو جۆرەشمان لە دەقی وەرگێڕانەکەی مامۆستا بادللی، بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی زیاتر، لە پەراوێزدا بە ناوی خۆیەوە هێناوە.

٩ – لە چەند شوێنێکی کەمی داوێنی دەقە عەرەبی‌یەکەدا پەراوێزمان بە نیشانەی (ف) داناوە کە هی ئێمەیە، بە نیازی جیاکردنەوەی لە پەراوێزەکانی تر کە نیشانەی خۆیان هەیە.

لە کۆتاییدا، پڕبەدڵ داواکارین لە زانایانی بەتوانای گەلەکەمان کە بفەرموون بە چاوی وردبینی ئەم وەرگێڕانە کوردی‌یە، بە بەراورد لەگەڵ دەقە عەرەبی‌یەکەیدا بخوێننەوە و، بە ڕەچاوکردنی تایبەتمەندیی هەردوو زمانەکە، تێبینی‌یە زانستی‌یە بەنرخەکانیان بە دیاری بنێرن بۆمان، تاکو لە چاپەکانی داهاتوودا سوودیان لێ وەربگرین و، ئەوانیش ببنە بەشداری ئەم خێرە بەردەوامە.

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

والحمد لله رب العالمين.

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

١٩/ڕەمەزان/١٤٣٦

٢٠١٥/٧/٦

# پێشەکی

به پێنووسی:
دکتۆر موحسین عەبدولحەمید
مامۆستای تەفسیر و هزری ئیسلامی
له زانکۆی بەغدا

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على مَن أُنزِلَ عليه القرآن الحكيم محمد بن عبد الله خاتم الأنبياء والرسل، وعلى آله وأصحابه والتابعين لهم بإحسان إلى يوم الدين.

پاشان..

زانا بە ویژدانەکان و ئەو توێژەرانەش کە ئاگاداری پەرەسەندنی بارودۆخی موسڵمانانن لەم چەرخانەی دواییدا، وەختە کۆدەنگ بن لەسەر ئەوەی کە مامۆستای بەڕێز "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی" کەسایەتی‌یەکی گەورەی ئیسلامیی ئەوتۆیە کە:

خاوەنی ئیمانێکی ڕاست و، ئیخلاسێکی مەزن بووە و.. دەروونێکی بەرزی لەخۆدا هەڵگرتووە و.. شارەزای ڕاستی‌یەکانی تەوحیدە و.. یەکێکە لە هەڵکەوتووەکانی ڕۆژگار و.. خاوەنی زانستێکی فراوان و هزرێکی تیژە و.. بانگەوازکارێکی دامەزراوی خاوەن بەسیرەتە بۆ لای خوای گەورە.. هەر لە هەرەتی لاوی‌یەوە خەمی سەرجەمی موسڵمانانی هەڵگرتووە و.. سەرانسەری ژیانیشی لە جیهادی دانەبڕاودا بەسەر بردووە لە پێناوی ڕوونکردنەوەی باوەڕی ئیسلام و، خستنەڕووی وردەکاریی بڕیارەکانی و، پووچەڵکردنەوەی بیری لە ڕێ لادەری فەلسەفە سەرسەختەکانی دژ بە ئیسلام و.. لە پلان دانانی کرداریدا بووە بۆ ڕزگارکردنی موسڵمانان لەو داگیرکاری‌یە فیکری‌یە ڕامالەرەی کە لە سەرەتای سەدەی چواردەهەمی کۆچی‌یەوە، بەڵکو پێشتریش، دووچاری بوون.

ئەم زانایە - خوا لێی خۆش بێت - لەم پێناوەدا هێندە گرفتی ئەوتۆی هاتە ڕێ کە مەگەر پاداشتەکەی تەنها لای خوای گەورە بێت کە چاوی لە بەندە باش و پیاوچاکە ڕاست و زانا موجاهیدەکانی خۆیەتی، لەوانەی کە بە ڕاست و دروستی پەیمانیان لەگەڵ خوادا بردە سەر و، لە پێناوی ئەودا سڵیان لە لۆمەی کەس نەکردەوە.

ئەم کتێبەی بەردەستت - خوێنەری ئازیزم! - یەکجار بەنرخە و، تابڵێی بە توندوتۆڵی دارێژراوە و، دارای بەڵگەی بەهێزە و، بە ڕوونترین شێوە توانای ڕۆچوونی لەڕادەبەدەری مامۆستا نوورسی دەنوێنێت لە پشت ئەو واتا وردانەی کە لە سەرجەمی نووسینەکانیدا هەن، بە تایبەت نووسینە زانستی‌یە پسپۆڕی‌یەکانی..

ئەوەش لە ڕاستیدا بەهرەیەکی بلیمەتانە بووە کە خوای گەورە پێی بەخشیوە. تاکو لەو ڕێیەوە بە دیدێکی تیژ و، بە ڕۆچوونێکی قووڵ لە زانستەکانی "کەلام" و "ڕەوانبێژی" و، بە چێژێکی خۆیی بەرز و، بە ڕێبازێکی ژیریی ڕاست و دروست بڕوانێتە کتێبەکەی خوای گەورە، بە نیازی دەرخستنی حەقیقەت و، بە مەبەستی گەیاندنی مرۆڤ بەو بڕوا و قەناعەتە تەواوەی کە ئەم قورئانە "خاوەنی ئیعجاز"ە. بە شێوەیەکی وەها کە خەڵکانی ژیر و زمانپاراو لە دەروونی خۆیاندا هەست بە پێویستیی دان پێدانان و باوەڕهێنان بکەن بەوەی کە قورئان ئەو کتێبە ڕەوا و ڕاستەیە لە لایەن زانای پەنهانەکانەوە بۆ سەر پێغەمبەری ئازیزی خۆی محەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا - خاوێنترین درووود و سڵاوی لەسەر بێت - دابەزیوە، تاکو مرۆڤایەتی بخاتە سەر شاڕێگای بانگەوازی حەق و، بە نووری ئیمانیش بەسیرەتی ڕووناك بکاتەوە و، دڵنیایی بە دەست بهێنێت، بۆ ئەوەی بگاتە پلەی بەندایەتیی بێگەرد بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

مامۆستا نوورسی، بە توێژینەوەی لە زانستەکانی لەمەڕ ئیسلام و، فەلسەفە دێرینەکان و، زانستە مرۆیی و پەتی‌یە هاوچەرخەکاندا، توانیی بەهرە نایابە تاقانەکەی خۆی دەمەزەرد بکات، جگە لە ئاگاداریی فراوانیشی بەسەر ئەدەب و ڕەوانبێژیی زمانی عەرەبیدا لە کتێبەکانی کەسانی وەك (جاحظ و زەمەخشەری و سەکاکی) بە تایبەت کتێبەکانی زانای مەزنی "ڕەوانبێژی" و "نەحو" پێشەوا عەبدولقاهیری جورجانی. ئەوەبوو نوورسی بڕوای بە بیردۆزە بەناوبانگەکەی ئەم پێشەوایە هێنا سەبارەت بە"هۆنین"ی قورئان و، لەم کتێبەشدا لە ڕادەبەدەر جێی سەرنج و بایەخ پێدانی بووە.

"بیردۆزی هۆنین"یش شتێکی نوێ نەبوو کە "جورجانی" لە خۆڕا و بێ هیچ پێشەکییەك دایهێنابێت، بەڵکو پێش ئەو "جاحظ" لە کتێبی "نظم القرآن" و، "واسیتی" لە کتێبی "إعجاز القرآن في نظمه" و، "باقیلانی"ش لە کتێبی "إعجاز القرآن"دا سەرنجی خوێنەریان بۆ لا ڕاکێشاوە. بەڵام "جورجانی" لە شێوەیەکی نەحوی و ڕەوانبێژیدا ڕاڤەیەکی پێویست و تێروتەسەلی بۆ کرد و، بیردۆزێکی تۆکمە و تەواوی لێ دارشت کە لەسەر بناغەی جیا نەکردنەوەی "وشە" لە "واتا"کەی و "ڕوخسار" لە "ناوەرۆك" دامەزراوە و، ڕایگەیاندووە کە ڕەوانبێژی لە "هۆنین"دایە، نەك لە "وشە"ی تەنیا و "واتا" تەنیاکاندا بێ ئەوەی وشەکان وێنەیان بۆ بکێشن.

جا لەسەر ئەم بناغەیە، "هۆنین" بەوە پێناسە دەکات کە:

"هەڵواسینی هەندێ وشەیە بە هەندێکی تردا و، هۆکاربوونی هەندێکیانە بۆ هەندێکی تر. واتە ئەوەیە کە گوفتارەکەت بە پێی خواستی زانستی نەحو دابنێیت و، کار لەسەر یاسا و بنەماکانی بکەیت و، ئاشنای ڕێبازەکانی بیت و لێی لا نەدەیت".

من پێم وایە مامۆستا نوورسی زۆر بە ڕێکوپێکی ئەم "بیردۆزی هۆنین"ەی تاوتوێ کردووە، ئنجا بۆی دەرکەوتووە کە تەفسیرنووسانی پێش خۆی، وەك زەمەخشەری و ڕازی و ئەبوو سعوود، هەوڵیان نەداوە ئەم بیردۆزە لەو ڕووەوە جێبەجێ بکەن کە ڕێسایەکی تۆکمە و تەواوی ئەوتۆبێت ڕیزکردنی سەرجەم سوورەت و، ئایەت و، وشەکانی قورئان، سوورەت لە دوای سوورەت و، ئایەت لە دوای ئایەت و، وشە لە دوای وشە، بە درێژەپێدانی تەواوی بگرێتەوە..

لەبەر ئەوە، ویستی چاو لەو تەفسیرنووسە گەورانە بکات و، تەفسیرێك دابنێت کە بە شێوەیەکی دوور و درێژ و گشتگیر "بیردۆزی هۆنین"ی تێدا پیادە بکات، لە ڕووی دارشتنی وشە و، واتاکان و، خستنەکاری زانیارییە هەمەکی و جوزئییەکانی لەمەڕ زمان و چێژ و ژیری، لەوانەی کە لە درێژە دەرخستنی ڕێسای هۆنینی قورئاندا – کە ئیعجازیان پێ دەردەکەوێت – پشتی پێ بەستوون و، ئەو وردەکارییە تایبەتمەندانەی شێوازی قورئان دەردەخەن کە پێچەوانەی تایبەتمەندیی دارشتنە عەرەبییە ڕەوانەکانی پێش قورئانە و، ڕەوانگۆیانی سەرسام و زمانپاراوانیشی بێدەنگ کردووە، تاکو تەحەددیی ئیعجازی قورئان هەتا ڕۆژی قیامەت بە سەریاندا زاڵ بێت.

تەقالای نوورسی بۆ ڕوونکردنەوەی "بیردۆزی هۆنین" تەنها لەبەر ئەوە نی‌یە کە پێشەکی بێت بۆ چەسپاندنی ئیعجازی ڕەوانبێژیی قورئان، بەڵکو لەبەر ڕۆچوونیشیەتی لەناو واتای ئایەتەکاندا. چونکە ویستوویەتی ئەم بیردۆزە، بە دوور و درێژی، لەسەر بناغە عەقڵی‌یەکان بنیات بنێت، تاکو بگاتە ئاشکرا کردنی باوەڕەکانی ئیسلام و دەرخستنی پەیوەندی‌یان بە ڕاستی‌یەکانی "وجوود"ەوە.

هەرکەسێك لەم کتێبە و ڕێکخستنی باسەکانی ورد ببێتەوە، زۆر بە ڕوونی بۆی دەردەکەوێت کە دانەر ویستوویەتی تەفسیرێکی تەواوەتی بەم ئاراستەیە دابنێت. خۆ ئەگەر مامۆستا – خوا لێی خۆش بێت – بۆی بڕەخسایە ئەم شاکارە مەزنەی بە تەواوی ئەنجام بدات، ئەوا تەفسیرێکی ڕەوانبێژی و عەقڵی و گشتگیر و تەواوی ئەوتۆی پێشکەش دەکرد کە شایانی ئەوەبوو سەرانسەری تەمەنی بگرێتەوە، چونکە بێ گومان ئەو کاتە دەیان بەرگی گەورەی لەخۆ دەگرت، گەر لە ڕووناکیی ئەم ڕێبازەیدا هەنگاوی بنایە کە لەم کتێبەدا دەیخوێنینەوە.

بەڵام خوای گەورە لەوە باشتری بۆ دەستنیشان کردبوو، چونکە بۆ کارێکی مەزنتر ئاراستەی کرد، کارێك کە بەهۆیەوە توانیی موسڵمانانی وڵاتەکەی، لەو بارودۆخەی چەرخەکەیدا، ڕووبەڕووی قورئانی پیرۆز دابنێت، بێ ئەوەی بە ڕووەکانی ڕەوانبێژی و ئیعجازی زمانەوانیی ئەم قورئانە، لە ناوەندی لێکۆڵینەوە لە وردەکاری‌یە جوزئی‌یەکان کە تەنها کەسانی زۆر تایبەتمەند لێی تێدەگەن و کێشەی خەڵکی ئەم چەرخە نین، سەرقاڵیان بکات.

خۆ ئەگەر درێژەی بە دانانی تەفسیرێکی لەم جۆرە بدایە، ئەوا بێ گومان جەماوەری هەرە زۆری موسڵمانانی سەردەمەکەی دابڕ دەبوون لەوەی کە سوود لە بەهرە ناوازە و حەماسەتە ئیمانی‌یە بێ وێنەکەی وەربگرن. هەروەك دەکەوتنە پەراوێزی ئەو ململانێ فیکری و شارستانی‌یە سامناکە نابەرامبەرەی کە لەگەڵ داگیرکاریی فیکری و ماددیی سەرسەختدا هاتە کایەوە و، لە پێشدا وردە وردە دزەی کردە ناو ژیانی ئیسلامی، ئنجا پەرەی سەند هەتا گەیشتە بەدەستەوە گرتنی جڵەوی سیاسەت و، ئابووری و، کۆمەڵایەتی و، ڕۆشنبیری و، هونەر و، ڕاگەیاندن، لە گەلێ وڵاتی ئیسلامدا.

لەبەر ئەوە، نوورسی لەم بەرگەی تەفسیرەکەیدا ڕاوەستا و، بارودۆخی سەردەم و وڵاتەکەی خستیە ناو گەرمەی ئەو ململانێیەوە. بەڵام بە قاڵبێکی تازە کە لە "سەعیدی نوێ"دا دەرکەوت. نیشانەکانیشی: هێمنی و، لەسەرخۆیی و، بنیاتنان و، ڕۆشتنە ناوەوەی توندوتۆڵە بۆ ناو دڵ و ژیریی موسڵمانان، بە بێ هاتوهاواری سۆز بزوێن، یاخود ئاژاوە نانەوەی وێرانکار، یان ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕووکەش، کە بارودۆخی ئیسلامیی ئەو دەمە [بە وێنەی ئێستا] نە ئامادەی شتی لەو جۆرە بوو، نە توانای ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمنە بەهێزەکانی ناوخۆ و دەرەوەشی لەخۆدا شك دەبرد.

شێوازی "پەیامەکانی نوور" بەو ڕوونییە یەکلاییکەر و، هێمنییە زانستییە درەخشان و، ڕوونکردنەوە بەتام و چێژە بەرز و، بەڵگە ژیرییە بێ وەڵامانەی خۆی، جێگرێکی هاوچەرخانەی زیرەك بوو بۆ شێوازی سەلماندنی ئیعجازی زمانەوانی و ڕەوانبێژی و عەقڵیی قورئان لە ناوەندی "بیردۆزی هۆنین"دا..

چونکە ئەو بابەتەی کە دوژمنان وروژاندبوویان، پەیوەندیی نەبوو بە تانە و تەشەردان لە ڕەوانبێژیی قورئان، یاخود وتووێژ نەبوو لەسەر شتێك کە پەیوەندیی بە ئیعجازەکەی، یان ڕێژەکاریی نێوان سوورەت و ئایەت و وشەکانیەوە هەبێت. بەڵکو جەختی لەسەر هێرشێکی گشتی و هەمەلایەنە دەکردەوە بۆ سەر بناغەکانی ئیمان و، حیکمەتی داڕشتنی یاساکانی شەرع و، لە هەوڵی هەڵوەشاندنەوەی ئەو ڕێسا ڕەوشتییەدا بوو کە قورئانی پیرۆز هێناویەتی.

مامۆستا نوورسی لەو گۆڕانکارییە گەورانە تێگەیشتبوو کە ئەم ململانێ تازەیە بەرپای کردبوون. بۆیە بەو ڕاستییانەی قورئان ڕووبەڕوویان بووەوە کە لە ناوەندی بناغەکانی مەنتیقی ژیری و سروشتی و، زانستەکانی سەردەمی خۆیەوە پێشکەشی کردن.

ئەم مامۆستایە لە ڕێی بەشێکی تەواوی ئەم کتێبەوە توانیی ئیعجازی قورئانی پیرۆز بچەسپێنێت و، بەڵگەشی بۆ توێژەران و عەوداڵانی ڕاستی هێنایەوە کە بەلایەوە ئاسانە لە ڕووناکیی ئەم ڕێبازە زانستی و ژیری و چێژە بەرزەدا، هەتا کۆتایی بڕوات و بەردەوام بێت..

كەواتە با ئەمە بەس بێت.. ئنجا بە هەموو قەوارەی خۆی و، بە پاشماوەی ژیانە بەپیتەكەی ڕوو بكاتە كێشە بنەڕەتی‌یەكە، ئەویش "ڕزگاركردنی ئیمانی موسڵمانان"ە لەم سەردەمی ململانێی ڕاگەیاندنە سامناكەدا..

ئیتر لەم بوارەدا و، لە ناوەندی دەیان كتێب و پەیامەوە كە ئاراستەی نەوەی نوێی كردن، بەرهەمێكی یەكجار بەپێزی پێشكەش كرد، تاكو شكستی هزر و باوەڕ بەسەر دوژمنانی ئیسلامدا بهێنێت، لە مولحیدان و بانگەشەچی‌یانی بەخۆرئاوایی كردن.

لەگەڵ ئەوەشدا من ستەم لەم كتێبە دەكەم گەر بڵێم ڕێبازی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم ململانێ نوێیەی لەخۆ نەگرتووە. بەڵكو بە پێی زانیاری‌یەكانم سەبارەت بە بیری نوورسی و، لە ڕێی خوێندنەوەم بۆ چەند پەیامێكی لە قۆناغی نوێیدا، پێم وایە كە: هەر بیرۆكەیەك لەو پەیامانەدا ڕوونی كردوونەتەوە یان نموونەی لەسەر هێناونەتەوە، چەند تۆوێكی پوخت یان دووروودرێژیان لەم كتێبە زانستی‌یە توندوتۆڵەی بەردەستتدا بۆ دەبینیتەوە، بە تایبەت لە خستنە ڕووی بناغەكانی بیر و باوەڕی ئیسلامدا بە شێوازێكی زانستی‌یانەی هاوچەرخ.

بەڵام لەم كتێبەیدا ڕووی گوفتاری ئاراستەی قوتابی‌یە تایبەتمەندەكانی خۆی كردووە، لە ناوەندی تێهەڵكێش كردنی زاراوە كەلامی‌یە دێرینەكان لەگەڵ سەرەتاكانی ئەم ڕێبازە نوێ‌یەی كە دواتر لە "پەیامەكانی نوور"دا لەسەری سەقامگیر بوو.

لەوانەیە هەر ئەمەش نهێنیی ناوهێنانی پەیامەكانی نوور بێت بەوەی كە "تەفسیری ڕاستەقینەی قورئانی پیرۆز"ن.

لە ڕاستیدا تەفسیر كردنی قورئانی پیرۆز و ئاراستەكردنی گوفتاری ئایەتەكانی بۆ موسڵمانان، هیچ كاتێك و، هەتا دوا چركەكانی ژیانە پڕ لە خەم و مەینەتی و زانست و بانگەوازەكەیدا بۆ پابەند بوون بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ، لە بیری نوورسی دانەبڕاوە.

بڵاوكردنەوەی ئەم كتێبە بەم پۆشاكە نوێیەی، نموونەیەكی شیكاری ڕەوانبێژی‌یانەی ڕەنگین دەخاتە بەردەم بایەخدەران بە توێژینەوە ئیعجازی و ڕەوانبێژی و ڕەخنەیە هاوچەرخەكان، بە تایبەت لە ناوەندە زانستی‌یەكاندا. هەروەك ئەوانەش كە بایەخ بە توێژینەوەكانی لەمەڕ بیروباوەڕەكانی ئیسلام دەدەن لە ڕووی مەنتیقی عەقڵی‌یەوە،

توێشووی خۆیانی تێدا دەبیننەوە، ئەوەش لە ناوەندی ئەو باسە ژیری و زانستی‌یە قوولانەدا کە مامۆستا لە شیکردنەوەی ئایەتەکانی سەرەتای سوورەتی (البقـــرة)دا پێشکەشی کردوون.

مامۆستای بەڕێز (ئیحسان قاسم صالحی) بە لێکۆڵینەوەی سەرلەنوێی لەم کتێبەدا، کارێکی جوانی ئەنجام داوە، چونکە بە وردەکاری‌یە سوودبەخشەکانی و ڕوونکردنەوە بەنرخەکانی لە پەراوێزەکاندا، کتێبەکەی دەوڵەمەند و بەپێز کردووە.

ئەمەش چاکەیەکی تری ئەم مامۆستا بەڕێزەیە کە چاکە پێشووەکانی بەسەر خوێنەرانی زمانی عەرەبیدا پێ تەواو دەکات. چونکە چەندین ساڵی لە وەرگێڕانی کۆمەڵێکی جۆراوجۆر لە "پەیامەکانی نوور"دا بەسەر برد کە شاکاری قەڵەمەکەی پێشەوای گرفتار سەعیدی نوورسی‌یە، ئەو کەسەی کە بە ڕاستی بەڵگەی ئیسلامە لە ژیانی تورکیای نوێدا.

خوای گەورە باشترین پاداشتی مامۆستا نوورسی بداتەوە. موسڵمانانیش لە زانستەکەی و، بەڵگە توندوتۆڵەکانی و، وتە نوورانی و ڕاستەکانی لە خزمەتی قورئان و سوننەتی پێغەمبەری پێشەوادا ﷺ، سوودمەند بکات.

لە کۆتایی ئەم وشانەدا:

لە خوا دەپاڕێمەوە کە پشتی لێکۆڵەری بەڕێزی ئەم کتێبە بگرێت و، یارمەتیی بدات بۆ وەرگێڕانی تەواوی پەیامەکان بۆ خوێنەرانی زمانی عەرەبی[1].

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين.

د. موحسین عەبدولحەمید
کۆلێجی پەروەردە - زانکۆی بەغدا
٢ی شەعبان ١٤٠٧ك

(١) خوای گەورە ئەم دوعایە و، دوعا بێگەردەکانی هاوشێوەی ئەمەی برا بەڕێزەکانی تری گیرا کرد و، لە وەرگێڕانی تەواوەتی و چاپ و بلاوکردنەوەی (سەرجەمی پەیامەکانی نوور)دا سەری خستین. فـــالحمد لله أولاً وآخراً. (لێکۆڵەری دەقە عەرەبی‌یەکەی ئەم کتێبە)

# ئەم لێکۆڵینەوەیە

به پێنووسی:
ماموٚستا ئیحسان قاسم صالحی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله ومن والاه، وبعد..

لە چەند ڕۆژ و مانگێکی بێ پیت و وشك و برنگدا، خوای گەورەی بەتوانا، بە خوێندنەوەی ئەم تەفسیرە مەزنە دەستی ڕێزی لەسەر دانام.. خوێندنەوەیەك کە جگە لە ڕەواندنەوەی دڵتەنگی و، خۆراك پێدانی "گیان" و، ڕۆشنکردنەوەی "زەین" هیچ ئامانجێکی دیکەم نەبوو..

خوێندنەوەیم چەند جارێك دووپات کردەوە.. هەتا - بە پشتیوانیی خوای گەورە - تینوێتیی "دڵ"ی منی بە ئاوێکی سازگار و فێنك شکاند.. بەڵام..

بەڵام بینیم ئەم کتێبە پێویستی بە ڕێکخستنەوەیەکی سەرلەنوێ و لێکۆڵینەوەیەکی ڕێکوپێك هەیە، تاکو بە ئاسانی وەربگیرێت و، تێگەیشتنیشی ئەستەم نەبێت بۆ هەرکەسێك کە خوازیاری سوود لێ وەرگرتنی بێت.

دوای ئەوە.. قەدەری خوای گەورە ویستی وابوو کە برایەکی بەڕێز نوسخەیەکی دەستنووسی ئەم کتێبە و، برایەکی تر نوسخەیەکی چاپی یەکەمیم بۆ بهێنن.. لای خۆیشم وەرگێڕانە تورکییەکەی و، چاپی دووهەمی و، دوا چاپیشی دەست دەکەوت. ئیتر تۆڤمە سەرەتاییەکانی ساغکردنەوەی ئەم کتێبەم لەلا گەڵاڵە بوو.

پاشان بە مەبەستی شوکرانەبژێریی ئەو نیعمەتەی خوای گەورە و، بە نیازی ئامادەکردنی نوسخەیەکی باش لەم تەفسیرە بەنرخە، ویستم دەست بدەمە لێکۆڵینەوەی.. بەڵام..

بەڵام قسـوور و کـەم ئـەزموونیی خـۆم و، گـەورەیی بابەتەکـە و، سام و شـکۆی ئـەو مەقامە و، مەترسیی هەڵە کـردن، ڕێی ئـەنجامدانی لێکۆڵینـەوەیان لـێ دەگـرتم.. کـەچی لەولاشەوە چاوبڕینە ئەوەی کە لای خوای گەورەیە و، ڕوانینـە چاکـە گشتییەکانی و، متمانەبوون پێی و، جوانیی نیاز لـە خزمەتکردنی کتێبە ئازیزەکەیدا، هانیـان دەدام کـاری تێدا بکەم..

لـە ئـەنجامدا دوودڵیـم نایـە لاوە و، هـەنگاوم بـەرەو پێـش نـا.. ئیـتر پشـتم بـە خـوای گەورەی زانا بەست و، بەم هەنگاوە لەسەرخۆیانەی خوارەوە کەوتمە ڕێ:

یەکەم:

نوسخەکانی بەردەستی خۆمم لەگەڵ یەکتردا بەرامبەر کردەوە، کە ئەمانەن:

١ - نوسخەیەکی دەستنووس بە خەتی "مەلا عەبدولمەجیدی نوورسـی" کـە لـە لایـەن خودی دانەرەوە چاکسازی و هەڵەگیریی تێدا کـراوە . ئـەم نوسـخەیەم کـردە نوسـخەی بنەڕەتی لەم لێکۆڵینەوەیەدا[1].

٢ - نوسـخەیەکی چـاپی یەکـەمی ئـەم کتێبـە، کـە سـاڵی ١٣٣٤ك لـە چاپخانـەی ئەوقافی ئیسلامی لە ئەستەمبووڵ لە چاپ دراوە و، لە لایەن خودی دانـەرەوە هەڵـەکانی ڕاست کراوەتەوە و، بە دەست خەتی خۆیشی هەندێ پەراوێزی لەسەر نووسراوە.

بە هێمای (ط ١) ئاماژەم بۆ ئەم نوسخەیە کردووە.

٣ - دەستنوسێك بـە خـەتی "سـەیید تاهیری شووشـی"[2] کـە سـاڵی ١٣٧٣ك لـە نوسینەوەی بووەتەوە و، چەند ڕوونکردنەوەیەکی باش و، هەڵە لـێ گرتنی نووسەرەوەی دەستنووسـەکانی لـەخۆ گرتـووە، هاوکـات لەگـەڵ دانـانی چـەند وردە ناونیشـانێك بـۆ گرنگترین بابەتەکانی لاپەڕەکە.

---

(١) ئـەم نوسـخەیە، لەگـەڵ دوو کۆمەڵـەی تـەواوی سـەرجەمی پەیامـەکانی نـوور کـە بـە دەسـتخەت نووسراونەتەوە و لـە لایـەن دانـەرەوە هەڵـەگیرییان بۆ کراوە، ساڵی (١٩٥١ز) دانـەر لـەناو دوو سـندووقدا ناردوونی بۆ شاری "ئوورفە" و، ئێستا لەوێ لە لای دکتۆر عەبدولقادر بادللی پارێزراون.

(٢) "شێخ تاهیری شـووشی" (١٩١٨-١٩٦٢ز) خەڵکی گوندی "شـووش"ی سـەر بـە شـاری "ئاکرێ"یە. زانا و شاعیر و خۆشنووسێکی نـاوداری کـوردە. خەتـە جوانەکـەی خـۆی تـەرخان کـردووە بـۆ نووسـینەوەی پەیامەکانی نوور، بە تایبەت دەقـی عـەرەبیی "ئاماژەکـانی ئیعجـاز" کـە چـەندین نوسـخەی لـێ نووسیوەتەوە. یەکێك لە بەرهەمەکانی کتێبێکە بە ناوی "رياض النور" کە سیازدە هەزار بەیتـە لـە مێژووی ژیـانی پێغەمبـەری ئازیزدا ﷺ بە زاری کرمانجیی ژووروو. هاوڕێی بەڕێزم "دوکتۆر حەمزە"ی کوڕی، چـەند بەشـێکی لـێ بڵاو کردووەتەوە، هەندێکیان بە ناوی "گوڵزار" و بەشێکی دیکەش بەناوی "پەند و شیرەت". (وەرگێڕ)

بە هێمای (ش) ئاماژەم بەم نوسخەیە داوە. جا هەر زیادە و ڕوونکردنەوەیەکی پەراوێزەکان لە کۆتاییدا (ش)ی بە دوادا هات، هی ئەوە.

٤ - ئەو وەرگێڕانە تورکی‌یەی کە "مەلا عەبدولمەجیدی نوورسی" وەری گێڕاوە و، دەزگای بلاوکردنەوەی "سۆزلەر" لە ئەستەمبوولْ ساڵی ١٩٧٦ز بلاوی کردووەتەوە.

ئەم نوسخەیەش بە هێمای (ت) ئاماژەم بۆ کردووە.

٥ - لێکۆڵینەوەیەك کە مامۆستا صەدرەدینی بەدلیسی لەم کتێبەدا کردوویەتی و، هەندێ پەراوێزی بۆ داناوە و، چەند هەڵەیەکی چاپیشی ڕاست کردووەتەوە.

بە هێمای (ب) ئاماژەم بەم نوسخەیەش داوە.

٦- چاپی دواهەمینی، کە لە "مؤسسة الخدمات الإجتماعية"ی بەیروت ساڵی ١٣٩٤ك (١٩٧٤ز) چاپ کراوە. لەم نوسخەیەدا سەرنجم دا ئەمانەی خوارەوەی تێدایە:

أ - وەرگێڕانی پێشەکیی کتێبەکە لە لایەن بەڕێز "عاصم الحسيني"یەوە، کە مامۆستا نوورسی بە تورکی نووسیویەتی. من هاتم بەشێکیم وەکو خۆی هێشتەوە و هەندێ وردە دەستکاریشم تێدا کرد، تاکو مەبەستی دانەر بەدەستەوە بدات، ئنجا وەرگێڕانی پاشماوەی ئەو پێشەکی‌یەم تەواو کرد.

ب - وتەیەکی ستایش کە مامۆستا صەدرەدینی بەدلیسی نووسیویەتی و، نرخی خۆی هەیە سەبارەت بە ڕوونکردنەوی بارودۆخی دانانی تەفسیرەکە و، بەراوردکردنی لەگەڵ چەندین تەفسیری تری بەناوبانگدا. ئەم وتەیەم وەك خۆی هێشتەوە.

ج - لە کۆتایی کتێبەکەدا سیازدە شایەتیی فەیلەسووف و زانایانی ئەوروپا دانراوە لەبارەی حەقتر بوونی قورئان. من ئەم شایەتی‌یانەم پشتگوێ خست، لەبەر ناڕێکیی وەرگێڕانەکەیان و، دەست نەکەوتنی ئەسڵەکەشیان تاکو سەرلەنوێ وەریان بگێڕمەوە. بەڵام لە بریی ئەوانە، فەسڵی یەکەمی تایبەت بە "قورئانی پیرۆز"م دانا لەو کتێبە بەنرخەی کە "دکتۆر عیمادەدین خەلیل" - لەگەڵ سوپاسماندا - پێشکەشی کرد بە ناوی "قالوا عن الاسلام" ئیتر کردمانە پاشکۆی ئەم کتێبە. خوای گەورە لەسەر ئەم کارە مەزنەی پاداشتی خێری بداتەوە.

دووهەم:

دوابەدوای، یاخود لە دەمی بەرامبەر کردنی نوسخەکاندا، هەڵەکانی چاپ و ڕێنووسم ڕاست کردەوە، لەگەڵ سەر و بۆر دانان بۆ گەلێ وشە. ئنجا شوێنی ئایەتەکانم لە سوورەتەکانیاندا دیاری کرد و، فەرموودە پیرۆزەکانی ناو کتێبەکەشم لە ڕێی ئەو کتێبە باوەڕ پێ کراوانەی لە بەردەستمدا بوون و بە هاوکاریی برای بەڕێز "فەلاح عەبدوڕڕەحمان" تەخریج کرد..

لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکی فەرموودەکانم وەك خۆی هێشتەوە، بەو ئومێدەی کە خوای گەورە سەرچاوەی تری ئەوتۆی فەرموودەمان بۆ بڕەخسێنێت کە بتوانین بەهۆیانەوە تەخریجیان بکەین، یاخود زانا بەڕێزەکانمان بۆ تەخریج کردنیان ڕێنماییمان بکەن.

سێهەم:

بۆ لێکدانەوەی هەندێ لەو وشانەی کە واتاکانیان لە ڕوومانداا داخرابوون، سەردانی فەرهەنگە بنەڕەتی‌یەکانی وەك "القاموس المحيط و، المصباح المنير و، مختار الصحاح" و، جگە لەوانیشم کرد.

چوارەم:

پەندەکانی ناو کتێبەکەم لەگەڵ ئەسڵەکانیاندا لە کتێبی "مجمع الأمثال"ی "مەیدانی"دا دەستنیشان و بەرامبەر کردەوە.

پێنجەم:

بە پشت بەستنم بە وەرگێڕانە تورکی‌یەکە، هەندێ دەستەواژەم ڕوون کردەوە کە بە لامەوە تەماوی بوون، چونکە ئەو دەستەواژانە لە وەرگێڕانە تورکی‌یەکەدا ڕوونتر بوون. ئیتر لە پەراوێزدا دامنان و لە داوێنیاندا بە هێمای "ت" لەگەڵ ژمارەی لاپەڕەکەیدا[1] ئاماژەم پێ دان.

شەشەم:

هەندێ بابەتی "نەحوی" و مەسەلەی "زمانەوانی"م لێ بوو بە کێشەیەکی ئەوتۆ کە ناچاریان کردم سەردانی سەرچاوە بنەڕەتی‌یەکانی کتێبەکانی زمان بکەم، وەك "المغني" و

---

(١) بەڵام ئێمە تەنها هێمای (ت)مان دانا و ژمارەی لاپەڕەمان بە پێویست نەزانی. (وەرگێڕ)

"الأشموني" و جگە لەوانیش. هەتا دڵم ئاسوودەیی و قەناعەتی تەواوی بەدەست هێنا کە ئەوەی مامۆستا نوورسی دایناوە "ڕاست"ە، یان شتێکی "دروست"ە. ئەو دەستوورانەی "نەحوو"یش کە پێیان ڕاهاتووم یان فێریان بووم، شتێکی کەمن لە زەریایەکی مەزن، بگرە تەنها یەك ڕووی بەکارهێنراوی نێوان چەندین ڕووی زۆر و زەبەندەیە.

دوای ئەوەی کە بە پشتیوانیی خوای گەورە لە کارەکەم بوومەوە، چیم ئەنجام دابوو خستمە بەردەستی برای ئازیزم مامۆستای بەڕێز "دکتۆر موحسین عەبدولحەمید" تاکو هەڵەکانی خۆمم بۆ دەستنیشان بکات و، کەلێنەکانی کارەکەم پیشان بدات. چونکە بەڕێزیان چەندین ساڵی لەگەڵ "ڕازی" و هێندەی دیکەشی لەگەڵ "ئالووسی"دا بەسەر بردووە، هەروەك بە توێژینەوە و وانە وتنەوەی ساڵانێکی درێژخایەن - ئێستاشی لەسەر بێت - خاوەنی ئەزموونی دەستوور و یاساکانی تەفسیرە. ئەویش بە نووسینی پێشەکییەکی تێروتەسەل تاجە گوڵینی لەسەر هەوڵ و تەقالاکەی من دانا. خوا پاداشتی چاکەی بداتەوە.

پاشان:

من چیم لە توانادا بوو لە لێکۆڵینەوەی ئەم کتێبەدا پێشکەشم کرد.. لەو بڕوایەشدا نیم کە مافی تەواوی خۆیم پێ دابێت. بەڵام ئەوەندەم بەسە کە هەوڵی خۆمم داوە و چیم لە توانادا بووە خستوومەتە کار. بەو نیازەی کە لای خوای گەورە بە کردەوەی باش دابنرێت و، بە ئومێدی ئەوەش کە دوعایەکی بێگەردم لە لایەن سوودمەندانیەوە دەستگیر ببێت.

لە خوای گەورە داواکارین کە نیازی جوان و، تێگەیشتنی ڕاست و، ڕاستیمان لە گوفتار و کرداردا پێ ببەخشێت.

وصلِّ اللهمَّ على سيدِنا محمدٍ وعلى آلِه وصحبِه وسلِّمْ.

ئیحسان قاسم صاڵحی

شەوی نیوەی شەعبانی

ساڵی ١٤٠٧ك

# ئامارەکانی ئیعجاز

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

# پێشەکیی دانەر
## بۆ وەرگێڕانە تورکییەکە

بێدارکردنەوەیەك:

یەکەم سالی جەنگی جیهانیی یەکەم، لە بەرەی جەنگدا و، بە بێ هیچ سەرچاوەیەك، تەفسیری: "ئاماژەکانی ئیعجاز" دانراوە. دیارە بارودۆخی دژواری جەنگ و، دەستکورتی و نەبوونی، کە لەگەڵ جەنگدا هاودەمن، داخوازی ئەوە بوون کە ئەم تەفسیرە - لەبەر چەند هۆکارێکی زۆر - لەوپەڕی کورتی و پوختیدا بنووسرێت.

ئەوەبوو تەفسیری سوورەتی "فاتیحە" و نیوەی یەکەمی تەفسیرەکە لەڕادەبەدەر بە کورت و پوختی نووسران:

یەکەم:

لەبەر ئەوەی کە ئەو ڕۆژگار و سەردەمە بواری ڕوونکردنەوەی نەدەدا، چونکە "سەعیدی کۆن"[(١)] بە دەستەواژەی کورت نیاز و مەبەستەکانی خۆی دەردەبڕی.

دووهەم:

"سەعید" تەنها بایەخی بە پلەی تێگەیشتنی قوتابییە هەرە زیرەکەکانی خۆی دەدا و، بیری لە تێگەیشتنی ئەوانی تر نەدەکردەوە.

سێهەم:

لەبەر ئەوەی کە وردترین و بەرزترینی "ئیجاز"ە خاوەن ئیعجازەکانی هۆنینی قورئانی ڕوون دەکردەوە، ئەوا دەستەواژەکان بەرز و پوخت هاتن بەدەستەوە.

---

(١) ئەو نازناوەیە کە مامۆستا نوورسی بۆ ئەو قۆناغەی ژیانی خۆی بەکاری دەهێنێت کە دەکەوێتە پێش نووسینی پەیامەکانی نوور، واتە هەتا سالی (١٩٢٦ز).

لەگەڵ ئەوەشدا، وا ئێستا بە چاوی "سەعیدی نوێ"[1] چاوم پێدا خشاندەوە و، بۆم دەرکەوت کە ئەم تەفسیرە بە هۆی ئەو وردەکارییانەی تیایدا کراوە، لە ڕاستیدا بە یەکێك لە شاکارە ڕەنگینەکانی "سەعیدی کۆن" دادەنرێت، سەرباری هەڵە و گوناهەکانیشی.

جا لەبەر ئەوەی "سەعیدی کۆن" لە دەمی نووسینی ئەم تەفسیرەدا هەڵمەتی بۆ بەدەستهێنانی "پلەی شەهیدی" دەبرد، ئیتر هەرچییەکی لێ دەردەکەوت بە نییەتێکی خاوێن دەینووسی و، یاساکانی ڕەوانبێژی و زانستەکانی زمانی عەرەبیی تێدا جێبەجێ دەکرد، ئەوا نەمتوانی ڕەخنە لە هیچ شوێنێکی بگرم، چونکە ئومێدم وایە کە بەدیهێنەری مەزن ئەم دانراوە بکاتە کەفارەتی گوناهەکانی و، خەڵکانێکی بەتوانا بنێرێت کە بە ڕاستی و دروستی لەم تەفسیرە تێبگەن.

خۆ ئەگەر ڕێگرەکانی جەنگی جیهانی نەبوونایە، ئەوا نیازمان وابوو کە ئەم بەرگە تایبەت بێت بە ڕوونکردنەوەی "ئیعجازی هۆنین" لە نێوان ڕووەکانی ئیعجازی قورئاندا و، هەریەك لە بەرگەکانی تریش تایبەت بێت بە یەکێك لە ڕووەکانی تری ئیعجاز. جا ئەگەر ئەو ڕاستییانەی تەفسیر، کە لە پەیامەکاندا پەرش و بڵاون، بخرێنە ناو بەرگەکانی ترەوە، ئەوا دەبێتە تەفسیرێکی ناوازە و هەمەلایەنەی قورئانی خاوەن ئیعجازی بەیان.

بەشکو خوای گەورە دەستەیەکی ڕووناکبیری بەختەوەر بنێرێت کە ئەم بەرگە و هەر شەست و شەش پەیامەکەی "وتەکان" و "مەکتووبات" بگرە هەر سەد و سی بەشەکانی (پەیامەکانی نوور) بکاتە سەرچاوەیەك و، لە ڕووناکیی ئەو سەرچاوەیەدا تەفسیرێکی لەم جۆرە بنووسێت.

* * *

* ئەم تەفسیرە بەنرخە چەندین سەرنجی ڕەوانبێژیی وردی لەخۆ گرتووە کە زۆرێك لە خوێنەران لێی تێناگەن و بایەخی نادەنێ، بە تایبەت ئەوەی کە لە ناوەندی تەفسیری

(١) ئەو نازناوەیە کە دانەر بۆ قۆناغی دووهەمی ژیانی خۆی بەکاری دەهێنێت لە ساڵی (١٩٢٦ز) بەدواوە، لەم قۆناغەدا ئەرکی "ڕزگارکردنی ئیمان" و "نووسینی پەیامەکانی نوور"ی لە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزەوە گرتە ئەستۆ.

ئەو دوو ئایەتەدا هاتووە کە حاڵی کافران وەسف دەکەن و، هی دوازدە ئایەتەکەش کە تایبەتن بە دووڕووەکانەوە.

هۆی باسکردنی چەند وردە سەرنجێك سەبارەت بەو ئایەتانە و، خستنە ڕووی تەنها لایەنە وردەکانی واتای وشەکان و، ئاماژە ناوازەکانیان بە بایەخ پێدانێکی زۆر، بە بێ درێژەدان بە ناوەڕۆکی کوفر.. هاوکات لەگەڵ لێدوانێکی کەم لەو گومانانەی کە دووڕووەکان دەیانگرنە خۆیان، بە پێچەوانەی ئەو لێکۆڵینەوە و درێژەپێدانەی کە لە تەفسیری ئایەتەکانی تردا کراوە.. هۆکاری هەموو ئەمانە، بە پوختی لە سێ سەرنجدا دەخەینە ڕوو:

سەرنجی یەکەم:

"سەعیدی کۆن" بە هۆی ڕێژنەی قورئانی پیرۆزەوە هەستی کرد کە لەم ڕۆژگارەی دواییدا خەڵکانێکی "کافر"ی ئەوتۆ پەیدا دەبن ڕێنمایی لە هیچ کتێبێك وەرناگرن و، کەسانێکی "دووڕوو"یش لەناو ئایینەکانی پێشوودا سەر هەڵدەدەن، وەك ئەوەی کە لە سەرەتای ئیسلامدا پەیدا بوون..

لەبەر ئەوە، تەنها سەرنجە وردەکانی ئەو ئایەتانەی ڕوون کردەوە، بە بێ درێژەدان بە ناوەڕۆکی ڕێبازیان و خاڵەکانی پشت پێ بەستنیان، بەڵکو بە کورتەیەك وازی لەو باسە هێنا، تاکو خاوێنیی زەینی خوێنەرە بەڕێزەکان لێڵ نەبێت.

ئاشکرایە کە ڕێبازی "پەیامەکانی نوور" بەجێ نەهێشتنی هیچ ئاسەوارێکی خراپە لە زەینی خوێنەریاندا. چونکە وەڵامی قسەبڕی ئەو شوبهە و گومانانە دەداتەوە کە دوژمنانی ئیسلام دەیانورووژێنن، بە بێ ئەوەی باسی خودی شوبهە و گومانەکە بکات. ئەمەشی بە پێچەوانەی ڕێبازی زانایانی ترەوەیە.

"پەیامەکان" بەم ڕێبازەی خۆیان، ڕێ لە چوونەژوورەوەی هەر گومانێك دەگرن بۆ ناو زەینی خوێنەر.

"سەعیدی کۆن"یش لەم تەفسیرەیدا ئەم ڕێبازەی پەیامەکانی نووری گرتەبەر و، بایەخی خۆی ئاراستەی لایەنی ڕەوانبێژیی ئەو ئایەتانە و، ڕوونکردنەوەی وشە و ئاماژەکانی کرد، تاکو خاوێنیی زەینەکان لێڵ نەبێت و نەشێوێت.

سەرنجی دووهەم:

لەبەر ئەوەی خوێندنەوەی هەر پیتێکی قورئانی پیرۆز دە دانە چاکە، یان سەد چاکە، یاخود هەزار، یان هەزاران بەروبوومی سەر بە ڕۆژی دوایی لەخۆ دەگرێت، ئەوا ڕوونکردنەوەکانی "سەعیدی کۆن" سەبارەت بە چەند وردە سەرنجێکی تایبەت بە وشەکانی قورئان، هەرگیز بە "ئیسرافی گوفتار" دانانرێت! چونکە وێرای وردیی پێڵووەکان و بچووکیی بیلبیلەی چاو کەچی گرنگییەکی یەکجار گەورەیان هەیە!

جا سەعیدی کۆنیش لەم سەرنجە ڕەوانبێژییانەدا هەستی بەم چەشنە گرنگییە کردبوو، بۆیە هیچ کاتێك سەختی و دژوارییی جەنگەکان و، مەترسی و سامی شەڕ لە بەرەی پێشەوەدا، ڕێی لە پێوتنی وردترین سەرنجەکانی "قورئان"ی بە قوتابیانی لێ نەگرت تاکو بینووسنەوە.

سەرنجی سێهەم:

وەرگێڕانی تورکیی ئەم تەفسیرە مافی تەواوەتیی بە ڕەوانبێژییە بەرزەکەی نەداوە، تەنانەت لە هەندێ شوێندا بە کورتی تەرجەمە کراوە. پشت بە خوا و بۆ لابردنی ئەم ناتەواوییە، گەر هیچ ڕێگرێك نەبێت، تەفسیرە عەرەبییەکە دەکەینە پاشکۆی.

لەبەر ئەوە، تکایە ئەوپەڕی توانا بخرێتە کار بۆ ڕێکاوڕێك دەرچوونی چاپەکە لەگەڵ ئەسڵەکەیدا، تاکو پارێزگاری لە "تەوافوق"ە ڕەنگینەکانی بکرێت کە دەستی ویستی مرۆڤی بەر نەکەوتووە و، بۆ ئەوەش کە نیشانەکانی قبوولبوونی تیانەچێت.

سەعیدی نوورسی

تێبینی:

مامۆستا نوورسی ئەم پێشەکییەی بە زمانی تورکی بۆ وەرگێڕانە تورکییەکە نووسیوە. پاشان مامۆستایان "عاصم حسەینی" و "ئیحسان قاسم صالحی" کردوویانە بە عەرەبی، بەو جۆرەی کە لە ڕوونکردنەوەکەی "مامۆستا ئیحسان"دا هاتووە. ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە ئەم وەرگێڕانە عەرەبییەمان کرد بە کوردی و، ئنجا لەگەڵ دەقە تورکییەکەیدا بەرامبەرمان کرد. (وەرگێڕ)

# گەیاندنی مەبەست

دەڵێم:

مادەم "قورئان" هەموو زانستە جیاجیاکانی لە خۆدا کۆ کردووەتـەوە و، وتارێکیشـە ئاراستەی سـەرجەم توێژەکـانی مرۆڤـی هـەموو چەرخـەکان کـراوە، ئـەوا تەفسـیرێکی شایانی لە تێگەیشتنی "تاکە کەس"ەوە بۆ نارەخسێت کە بە دەگمـەن لـە دەمارگـیریی بـۆ رێباز و مەشرەبی خۆی رزگاری دەبێت..

چونکە تێگەیشتنی ئەو کەسە تاکە، تایبەتە بە خۆی و، مافی بانگهێشـتی خـەڵکیی بـۆ لای ئـەو تێگەیشتنەی خـۆی نیـیە، مەگـەر بـە قبوولکردنـی تێگەیشـتنەکەی لـە لایـەن جەماوەری زانایانەوە ئەو مافەی بەدەست هێنابێت..

هەروەها دەرەنجامی هەڵێنجانەکانی خۆی لە قورئان – بە مەرجێ کـە بـە پێـی حـەز و ئـارەزوو نـەبێت – دەتوانێـت بـۆ خـۆی کـاری پـێ بکـات، بـەڵام نابێتـە بەڵگـە لەسـەر خەڵکی، مەگەر جۆرە "ئیجماع"ێك پشتڕاستی بکاتەوە.

جا هـەروەك بـۆ رێکخسـتنەوە و بـەردەوامبوونی بڕیارەکـانی شـەرع و، لابردنـی ئـەو بەربادیـیەی کـە بـەهۆی "سەربەستیی بیرکردنەوە" و "پشـتگوێ خسـتنی ئیجمـاع"ەوە سەری هەڵداوە، پێویست بە دەستەیەکی باڵا لە زانایانی لێکۆڵەر دەکات، لەوانـەی کـە بەهۆی ئەوەی جێی هیوا و متمانەی خەڵك و پشت پێ بەستنی جەماوەرن، لەناوەرۆکدا کەفالـەتێکی نەتـەوەیان لـە ئەسـتۆدایە و، لـەو رێیـەوە دەبنـە دەرخـەری نـهێنیی ئـەو "ئیجماع"ەی کـە بـە بـێ سـکە و مۆری ئـەو، دەرەنجـامی ئیجتیـهادەکان نابێتـە شـەرع و دەستوور..

(هەروەك ئەمە وایە)..

# إفادةُ المرام

أقولُ:

لما كان القرآنُ جامعاً لأشتاتِ العلومِ وخطبةً لعامّة الطبقاتِ في كلِّ الأعصار، لا يتحصّلُ له تفسيرٌ لائقٌ من فهم الفردِ الذي قلّما يخلُصُ من التعصب لمسلكه ومَشربِه؛ إذ فهمُه يخصُّه ليس له دعوةُ الغيرِ إليه، إلّا أن يُعدّيَه[1] قبولُ الجمهور. واستنباطُه - لا بالتشهي - له العملُ لنفسه فقط، ولا يكونُ حُجةً على الغير إلّا أن يُصدِّقَه نوعُ إجماع.

فكما لابدَّ لتنظيم الأحكامِ واطّرادِها ورفعِ الفوضى - الناشئةِ من حرية الفكـرِ مع إهمـالِ الإجمـاعِ - من وجـودِ هيئةٍ عـاليةٍ من العـلماء المحقِّقين الذين - بمظهريّتِهم لأمنية العمومِ واعتمادِ الجمهور - يتقلّدون كفالةً ضمنيةً للأُمة، فيصيرون مظهرَ سرِّ حجّيةِ الإجماعِ الذي لا تصيرُ نتيجةُ الاجتهادِ شرعاً ودستوراً إلّا بتصديقه وسِكّته[2]..

---

(١) عدّى الشيء: أجازه وأنفذه.

(٢) سكة: شارة الدولة الموضوعة على مسكوكاتها.

بە هەمان جۆر، بۆ خستنەڕووی واتاکانی قورئان و، کۆکردنەوەی جوانی‌یەکانی، کە لە تەفسیرەکاندا پەرش و بڵاون و، بۆ جێگیر کردنی ڕاستی‌یەکانی، کە زانستی نوێ و شەنوکەوی ڕۆژگار دەری خستوون، پێویست بە لێبڕانی دەستەیەکی باڵای زانایانی پسپۆڕی‌یە جیاجیاکان دەکات کە وێڕای "وردبینی"یان، "بیرێکی فراوان"یشیان هەبێت بۆ تەفسیر کردنی.

ئەنجامی مەبەستەکە:

دەبێ ڕاڤەکاری قورئان خاوەنی زیرەکی‌یەکی باڵا و، ئیجتیهادێکی جێبەجێ کراو بێت و، ویلایەتێکی تەواوی هەبێت. خۆ ئەوەش - لەم کاتەدا - شتێکی تری جگە لەو "کەسە مەعنەوی"یە نی‌یە کە لە تێکەڵبوون و پشتگیریی "گیانەکان" و، بەدوای یەکدا هاتن و هاوکاریی "هزرەکان" و، یەکگرتن و ئیخلاس و خاوێنیی ناخی "دڵەکان"ەوە ڕسکا بێت..

جا بە پێی نهێنیی " للکل حکم لیس لکل" زۆر جار ئاسەوار و نووری ئیجتیهاد، هەروەها تایبەتکاری و ڕووناکیی ویلایەت، لە کۆمەڵێکدا دەبینرێت کە لە دانە دانە و تاکەکانیدا نی‌یە.

ئنجا کاتێ کە من چاوەڕوان بووم و، ڕووم لەم ئامانجە کردبوو کە دەستەیەکی لەم شێوەیە سەرهەڵبدات - کە ئەمەش لەمێژ بوو ئامانجی ئەندێشەم بوو - کتوپڕ بە هەستێکی پێش ڕووداو، نزیکبوونەوەی بوومەلەرزەیەکی مەزن بە دڵدا تێپەڕی[1].

ئیتر وێڕای کۆڵەواری و ناتەواویم و داخراویی گوفتارم، دەستم دایە تۆمار کردنی هەرچیم لێ هەڵدەکەوت لە ئاماژەکانی ئیعجازی قورئان سەبارەت بە "هۆنین"ی و، خستنە ڕووی هەندێ لە ڕاستی‌یەکانی. لەو دەمەشدا سەردانی تەفسیرەکانم بۆ نەڕەخسا. جا ئەگەر لەگەڵیاندا یەکی گرتەوە ئەوا جێی دڵخۆشی‌یە، دەنا ئۆباڵی لە ئەستۆی خۆمدایە.

---

(١) چەندین جار لە کاتی دەرسەکانیدا هەواڵی سەرهەڵدانی بوومەلەرزەیەکی گەورەی بە واتای "جەنگی جیهانی" بە گوێدا دەداین. ئەوەبوو چۆن هەواڵی لەبارەوە دا، هەر بەو جۆرەش ڕووی دا.

حەمزە. محەممەد شەفیق. محەممەد میهری. (قوتابیانی دانەر)

كذلك لابدَّ لكشـف معـاني القرآنِ وجمعِ المحاسـنِ المتفرِّقةِ في التفاسـير وتثبيتِ حقائقِه - المتجليةِ بكشف الفنِّ[١] وتمخيضِ الزمان - من انتهاض هيئةٍ عاليةٍ من العلماء المتخصصين، المختلفين في وجوه الاختصاصِ، ولهم مع دِقَّةِ نظَرٍ وُسْعةُ[٢] فكرٍ لتفسيره.

**نتيجةُ المرام:**

إنّه لابدَّ أنْ يكونَ مفسرُ القرآنِ ذا دهاءٍ عالٍ واجتهادٍ نافذٍ وولايةٍ كاملة. وما هو الآنَ إلاّ "الشخصُ المعنويُّ" المتولِّدُ من امتزاج الأرواحِ وتسانُدِها، وتلاحُقِ الأفكارِ وتعاونِها، وتظافُرِ القلوبِ وإخلاصِها وصَمِيمِيَّتِها، من بين تلك الهيئة.

فبسرِّ "للكلِّ حُكمٌ ليس لكلِّ"[٣] كثيراً ما يُرى آثارُ الاجتهادِ وخاصّةُ الولايةِ، ونورُه وضياؤها[٤] من جماعةٍ خَلَتْ منها أفرادُها.

ثم إني بينما كنتُ منتظراً ومتوجِّهاً لهذا المقصدِ بتظاهُرِ هيئةٍ كذلك - وقد كان هذا غايةَ خيالي من زمان مديد - إذ سنحَ لقلبي من قبيل "الحسِّ قبل الوقوع" تقرُّبُ زلزلةٍ عظيمة،[٥] فشرعتُ - مع عجزي وقصوري والإغلاقِ في كلامي - في تقييد ما سنَح لي من إشارات إعجازِ القرآنِ في نظمه وبيانِ بعضِ حقائقِه، ولم يتيسرْ لي مراجعةُ التفاسيرِ. فإنْ وافقَها فبِها ونِعْمَتْ، وإلّا فالعُهدةُ عليَّ.

---

(١) العلم الحديث.

(٢) وُسْعة واتساع وسعة بمعنى الطاقة والقدرة.

(٣) انظر: كليات أبي البقاء ص ٢٩٦.

(٤) نور الاجتهاد وضياء الولاية.

(٥) لقد أخبرنا مراراً في أثناء الدرس وقوع زلزلة عظيمة (بمعنى الحرب العمومية فوقعت كما أخبرنا). حمزة. محمد شفيق. محمد مهري. (من تلاميذ المؤلف).

ئەوەبوو ئەم گرفتە مەزنە ڕووی دا..

ئیتر لە دەمی ئەنجامدانی فەرزی جیهاد و هەرکاتێ لە هێڵی جەنگدا هەلم بۆ هەڵبکەوتایە، بە چەند دەستەواژەیەکی جۆراوجۆری حاڵەتە جیاجیاکان و، لەناو چیا و دۆڵەکاندا هەرچیم لێ دەردەکەوت، تۆمارم دەکرد.

خۆ هەرچەندەش دەزانم پێویستیان بە پاکژکاری و چاکسازی هەیە، بەڵام دڵم بە گۆڕین و دەستکارییان ڕازی نابێت، چونکە لە حاڵەتێکی نیازپاکیی وەهادا سەریان هەڵداوە کە ئێستا شکی نابەم.

وا دەیانخەمە بەرچاوی خەڵکانی خاوەن کەماڵ، نەك لەبەر ئەوەی کە تەفسیری قورئان بێت، بەڵکو - ئەگەر قبووڵی جەماوەری زانایانی بەدەست هێنا - ببێتە جۆرە سەرچاوەیەك بۆ هەندێ لە ڕووەکانی تەفسیر.

دیارە حەز و شەوقم منی بەرەو کارێك دایەبەر کە لە سەرووی وزە و توانای خۆمەوەیە. جا ئەگەر ئەوان بە جوان هەڵیانسەنگاند، ئەوا بۆ بەردەوام بوون لەسەری هانم دەدەن.

ومن الله التوفيق.

سەعیدی نوورسی

فوقعتْ هذه الطامّةُ الكُبرى..

ففي أثناءِ أداءِ فريضةِ الجهادِ كلما انتهزتُ فرصةً في خطِّ الحربِ قيَّدتُ ما لاحَ لي في الأودية والجبالِ بعباراتٍ متفاوتةٍ باختلاف الحالات.

فمع احتياجِها إلى التصحيح والإصلاحِ لا يرضَى قلبي بتغييرها وتبديلها؛ إذ ظهرتْ في حالةٍ من خُلوص النيّةِ لا توجدُ الآنَ، فأعرِضُها لأنظار أهلِ الكمالِ لا لأنّه تفسيرٌ للتنزيل، بل ليصيرَ – لو ظفرَ بالقبول – نوعَ مأخذٍ[1] لبعض وجوهِ التفسير.

وقد ساقَني شوقي إلى ما هو فَوق طَوقي، فإنْ استحسنوه شجَّعوني على الدوام.

ومِن الله التوفيقُ.

**سعيد النورسي**

(١) المصدر والمرجع.

## بریسکەیەك لە پێناسەی قورئان

ئەگەر وتت: قورئان چی‌یە؟

پێت دەوترێت:

قورئان سەرگوزەشتەی ئەزەلیی ئەم بوونەوەرانەیە و.. وەرگێڕی ئەبەدیی ئەو زمانانەی بوونەوەرانە کە ئایەتە تەکوینی‌یەکانی گەردوون دەخوێننەوە و.. ڕوونکەرەوەی کتێبی جیهانە.. هەروەها دەرخەر و ئاشکراکەری ئەو گەنجینە پەنهانانەی ناوە(جوانە)کانە کە لە نێوان زەوی و ئاسمانەکاندا داپۆشراون.. هەروەها کلیلێکە بۆ کردنەوەی ڕاستیی ئەو کاروبارانەی کە لە ناوەندی دێڕەکانی ڕووداوەکاندا حەشار دراون.. هەروەها زمانی جیهانی پەنهانە لە جیهانی بینراودا.. هەروەها گەنجینەی گفتوگۆ ئەزەلی‌یە پاك و بێگەرد و، ئاوڕدانەوە میهرەبانی‌یە ئەبەدی‌یەکانی خوایە.. هەروەها بناغە و ئەندازە(نەخشە) و خۆری ئەم جیهانە مەعنەوی‌یە ئیسلامی‌یەیە.. هەروەها نەخشەیەکە بۆ جیهانی ئەودنیا.. هەروەها وتەی ڕاڤەکار و، تەفسیری ئاشکرا و، بەڵگەی یەکلایی کەرەوەی توندوتۆڵ و، تەرجومانی درەخشانی زات و سیفەت و ناو و کاروبارەکانی خواوەندە.. هەروەها پەروەردەکاری جیهانی مرۆڤایەتی‌یە و.. وەك ئاو و ڕووناکیش وایە بۆ مرۆڤایەتیی گەورە کە ئیسلامەتی‌یە.. هەروەها دانایی ڕاستەقینەیە بۆ جۆر و ڕەگەزی مرۆڤ، ڕابەر و ڕێ پیشاندەریشیانە بۆ ئەو شتانەی کە مرۆڤیان لە پێناودا دروست کراوە.. قورئان هەروەك کتێبی شەریعەتە بۆ مرۆڤ، کتێبی حیکمەتیشە.. هەروەك کتێبی دوعا و بەندایەتی‌یە، بە هەمان جۆر کتێبی فەرمان و بانگەوازیشە.. هەروەك کتێبی زیکرە، کتێبی فیکریشە.. هەروەك تەنها یەك کتێبە، بەڵام لە بەرامبەر پێداویستی‌یە مەعنەوی‌یەکانی مرۆڤەوە چەندین کتێبی تێدایە.. هەروەها ئەم قورئانە وەك مەنزڵێکی پیرۆزی پڕ لە نامە و کتێب وایە؛ بە ڕادەیەك کە بۆ مەشرەبی هەر یەکە لە ئەهلی مەشـــرەبە جۆراوجۆرەکان و ڕێبازی هەر یەکە لە خاوەنی ڕێبازە جیاجیاکان، لە ئەولیا و صیددیقان و خواناسان و زانا لێکۆڵەرەکان، بۆ هەر یەك لەمانە، نامەیەکی پیشان داوە کە شیاوی چێژی مەشرەبەکەی ئەو بێت و، ئەو مەشرەبەی پێ ڕوونـاك بێتەوە و لەگەڵ ڕێبازەکەیدا بگونجێت، بە ڕادەیەك کە دەڵێی ئەم قورئانە لە کۆمەڵە نامەیەك پێکهاتووە!

سەعیدی نوورسی

# لمعةٌ من تعريف القرآن

**فإن قلتَ: القرآن ما هو؟**

**قيل لك:** هو الترجمةُ الأزليةُ لهذه الكائنات، والترجمانُ الأبديُّ لألسنتها التاليات للآيات التكوينية، ومفسّرُ كتابِ العالَم.. وكذا هو كشافٌ لِـمَخفيات كنوز الأسماء المُستترة في صحائف السماوات والأرض.. وكذا هو مفتاحٌ لحقائق الشؤون المُضْمَرة في سطور الحادثات.. وكذا هو لسانُ الغيب في عالَم الشهادة.. وكذا هو خزينةٌ للمخاطبات الأزلية السبحانية والالتفاتات الأبدية الرحمانية.. وكذا هو أساسٌ وهندسةٌ وشمسٌ لهذا العالم المعنوي الإسلامي.. وكذا هو خريطةٌ للعالَم الأُخروي.. وكذا هو القولُ الشارحُ والتفسيرُ الواضح والبرهانُ القاطع والترجمانُ الساطع لذات الله وصفاته وأسمائه وشؤونه.. وكذا هو مربٍّ للعالَم الإنساني، وكالماء وكالضياء للإنسانية الكبرى التي هي الإسلامية.. وكذا هو الحكمةُ الحقيقيةُ لنوع البشر، وهو المرشدُ المهدي إلى ما خُلِقَ البشرُ له.. وكذا هو للإنسان كما أنه كتابُ شريعةٍ كذلك هو كتابُ حكمةٍ، وكما أنه كتابُ دعاء وعبودية كذلك هو كتابُ أمرٍ ودعوة، وكما أنه كتابُ ذكرٍ كذلك هو كتابُ فِكر، وكما أنه كتابٌ واحد لكن فيه كتبٌ كثيرةٌ في مقابلة جميع حاجات الإنسان المعنوية، كذلك هو كمَنـزلٍ مقدّسٍ مشحونٍ بالكتب والرسائل. حتى إنه قد أبرز لمشْرَب كلِّ واحدٍ من أهل المشارب المختلفة، ولمسلَك كلِّ واحدٍ من أهل المسالك المتباينة من الأولياء والصدّيقين، ومن العُرفاء والمحققين رسالةً لائقةً لمذاق ذلك المشرب وتنويره، ولمساق ذلك المسلك وتصويره حتى كأنه مجموعةُ الرسائل.

**سعيد النورسي**

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿الرَّحـــمنُ ۞ عَلَّمَ القُرْءَانَ ۞ خَلَقَ الإنسانَ ۞ عَلَّمَهُ الْبَيان﴾

سوپاس و ستایشی ئەو میهرەبانە دەکەین و، سلاوات بۆ سەر گیانی "محەممەد پێغەمبەر"ی ﷺ دەنێرین کە بە "میهرەبانی" ناردوویەتی بۆ سەرجەم جیهانەکان و، موعجیزە گەورەکەشی - بەو هێما و ئاماژانەی کە لەخۆی گرتوون بۆ ڕاستی‌یەکانی بوونەوەران - کردووە بە موعجیزەیەکی بەردەوامی ئەوتۆ کە بە درێژایی ڕۆژگار هەتا ڕۆژی دوایی هەر دەمێنێتەوە.. هەروەها بۆ سەر گیانی هەموو خزمان و سەرجەم هاوەڵانی.

پاشان.. بزانە کە:

یەکەم:

ئامانجمان لەم ئاماژانە، ڕاڤەی کۆمەڵە هێمایەکی "هۆنینی قورئان"ە. چونکە ئیعجازەکەی لە هۆنینیدا دەردەکەوێت. خۆ ئیعجازی درەخشانی ئەو قورئانەش جگە لە "نەخشی هۆنین"ی شتێکی تر نی‌یە.

دووهەم:

ئامانجە بنەڕەتی‌یەکانی قورئان و توخمە سەرەکی‌یەکانی، چوار دانەن:

تەوحید و، پێغەمبەرێتی و، حەشر و، دادگەری..

چونکە: مادەم ئادەمیزاد بە وێنەی زنجیرە کاروانێك وان کە لە وڵات و دۆڵ و شیوەکانی ڕابوردووەوە کۆچیان دەست پێ کردووە و، بەناو بیابانی "بوون" و "ژیان"دا تێدەپەڕن و، بەرەو بەرزایی و دوندەکانی داهاتوو گوزەر دەکەن و، ڕووەو باخچە و بەهەشتەکانی ئەوێ دەڕۆن، ئیتر پەیوەندی‌یەکان بەوان دەهەژێن و، ڕووی بوونەوەرانیش لەوانە، وەك بڵێی حکومەتی "بەدیهاتووان" هونەری حیکمەتی خستبێتە گۆ و ناردبێتی بۆلایان تاکو لێیان بپرسێ:

"ئەی نەوەی ئادەم! لە کوێوە هاتوون؟ بەرەو کوێ دەڕۆن؟ سەرقاڵی چین؟ کێ پادشاتانە؟ وتاربێژتان کێ‌یە"؟

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿الرَّحْمٰنُ * عَلَّمَ الْقُرْءَانَ * خَلَقَ الْإِنْسَانَ * عَلَّمَهُ الْبَيَانَ﴾

فنحمدُه مصلِّين على نبيِّهِ محمدٍ ﷺ الذي أرسَلَهُ رحمةً للعالمين وجعلَ معجزتَه الكُبرى الجامعةَ برموزِها وإشاراتِها لحقائقِ الكائناتِ باقيةً على مَرِّ الدهورِ إلى يومِ الدين، وعلى آلِه عامّةً وأصحابِه كافّة.

أما بعدُ؛ فاعلمْ!

أولاً: أنَّ مقصدَنا مِن هذه "الإشارات" تفسيرُ جملةٍ من رموز نظْمِ القرآن؛ لأنَّ الإعجازَ يتجَلّى من نظمه. وما الإعجازُ الزاهر إلاّ نقشُ النظم.

وثانياً: أنَّ المقاصدَ الأساسية من القرآن وعناصرَه الأصليةَ أربعةٌ:

التوحيدُ والنبوة والحشر والعدالة؛ لأنَّه:

لَـمّا كان بنو آدم كرَكبٍ وقافلةٍ متسلسلةٍ راحلةٍ من أودية الماضي وبلاده، سافرةٍ في صحراء الوجود والحياة، ذاهبةٍ إلى شواهق الإستقبال، متوجهةٍ إلى جنّاته، فتهتزُّ بِهم المناسباتُ وتتوجهُ إليهم الكائناتُ. كأنَّه أَرسلَتْ حكومةُ الخِلقة فَنَّ الحكمةِ مستنطقاً وسائلاً منهم بـ:

"يا بني آدمَ! مِن أين؟ إلى أين؟ ما تصنعون؟ مَنْ سلطانُكم؟ مَنْ خطيبُكم؟".

لەم كاتەدا كە ئەم گفتوگۆیە لە ئارادا بوو، لە نێوان نەوەی ئادەمدا، سەرداری رەگەزی مرۆڤ حەزرەتی محەممەدی هاشمی ﷺ - بە وێنەی پێغەمبەرانی خاوەن عەزمی هاوشێوەی - هەڵسایە سەرپێ و، بە زمانی قورئان فەرمووی:

"ئەی حیكمەت[1]! ئێمەی بوونەوەران، بە توانستی پادشای ئەزەل لە تاریكستانی "نەبوون" دەردەچین و، بەرەو رووناكیی "بوون" دێین و دەردەكەوین..

وەك نەوەی ئادەمیزادیش، ئێمە بە سیفەتی كار پێ سپێرراوی لە نێوان برایانی بوونەوەرماندا بە هەڵگرتنی "سپاردە" جیا كراوینەتەوە و، لەسەر رێی كۆچین لە رێی حەشرەوە رووە و بەختەوەریی هەمیشەیی. وا ئێستا سەرقاڵی خۆ تەیاركردنین بۆ ئەو بەختەوەرییە و، خەریكی بووژاندنەوە و پەرەپێدانی تواناكانمانین كە سەرمایەمانە..

منیش سەردار و وتاربێژیانم، فەرموون ئەوە پەخشنامەكەمە كە گوفتاری پادشای ئەزەلییە و سكەی ئیعجازی لەسەر دەبریسكێتەوە. وەڵامدەرەوەی راست و دروستی ئەم پرسیارانەش تەنها ئەم كتێبەیە كە قورئانی پیرۆزە".

(مادەم ئادەمیزاد ئاوا بوو).. ئەوا ئەم چوارە بوون بە توخمە بنەڕەتییەكانی قورئان.

جا هەروەك ئەم چوار ئامانجە لە سەرجەمی قورئاندا بەرامبەر یەكتر دەبینرێن، هەندێ جار لە سوورەت بە سوورەتیشیدا - بە هەمان جۆر - دەردەكەون.. تەنانەت جاری وا هەیە لە گوفتار بە گوفتاریدا ئاماژەیان پێ دەدرێت.. بەڵكو شوێنی ئەوتۆی هەیە كە لە یەك بە یەكی وشەكانیدا هێمایان بۆ دەكرێت. چونكە یەك بە یەكی "بەشەكان"ی، وەكو ئاوێنە وایە بۆ تێدا دەركەوتنی یەك لە دوای یەكی "هەموو"ەكانی هەتا بەرەو سەر بڕوات. هەروەها "هەموو"یشی لە دانە دانەی "بەش"ەكانیدا - یەك لە دوای یەك - دەبینرێت.

هەر لەبەر ئەم سەرنجەیە - مەبەستم هاوبەشیی "بەش"ە لەگەڵ "هەموو"دا - كە قورئانی بەرجەستە بە وێنەی "هەمەكی"یەكی خاوەن چەندین "هەندەكی" پێناسە دەكرێت.

---

(١) واتە: "ئەی هونەری حیكمەت". وشەی "هونەر" دەكرێ بۆ هەموو زانستێك بەكار بهێنرێت. "حیكمەت"یش بەو زانستە دەوترێت كە بە پێی توانا و وزەی مرۆڤ لە راستیی شتەكان دەدوێت بەو شێوەیەی كە هەن. كەواتە "حیكمەت" زانستێكی نەزەرییە و، ئامرازێك نییە بۆ زانستێكی تر. (لە "التعریفات"ی جورجانییەوە)

فبينما المحاورةُ، إذ قامَ من بين بني آدمَ - كأمثالِه الأماثلِ من الرسُل أولي العزائم- سيّدُ نوعِ البشر محمّدُ الهاشميُ ﷺ وقال بلسان القرآن:

"أيها الحكمةُ![1] نحن معاشرَ الموجوداتِ نجيءُ بارزين من ظلماتِ العدم بقدرةِ سلطان الأزل، إلى ضياءِ الوجود..

ونحن معاشرَ بني آدم بُعِثْنا بصفةِ المأموريةِ ممتازين من بين إخواننا "الموجودات" بحمل الأمانة..

ونحن على جناح السفرِ من طريق الحشرِ إلى السعادة الأبدية، ونشتغلُ الآن بتدارُكِ تلك السعادة وتنميةِ الاستعدادات التي هي رأسُ مالِنا..

وأنا سيُّدُهم وخطيبهم. فها دونكم منشوري! وهو كلامُ ذلك السلطان الأزلي تتلألأُ عليه سكّةُ الإعجاز. والمجيبُ عن هذه الأسئلةِ الجوابَ الصوابَ ليس إلا القرآنُ، ذلك الكتابُ"..

كانت[2] هذه الأربعةُ عناصرَه الأساسية.

فكما تتراءى هذه المقاصدُ الأربعة في كله، كذلك قد تتجلى في سورةٍ سورةٍ، بل قد يُلْمَح بِها في كلامٍ كلامٍ، بل قد يُرْمَز إليها في كلمةٍ كلمةٍ؛ لأن كلَّ جزءٍ فجزءٍ كالمرآةِ لكلٍّ فكلٍّ متصاعداً، كما أنَّ الكلَّ يتراءى في جزءٍ فجزءٍ متسلسلاً.

ولهذه النكتة - أعني إشتراكَ الجزءِ مع الكلِّ - يُعرَّفُ القرآنُ المشخَّصُ كالكلّي ذي الجزئيات.

---

(١) الظاهر: "أيتها". والمقصود أيها الفن المسمى بالحكمة. و"الفن يطلق على كل علم. والحكمة: علم يبحث عن حقائق الأشياء على ما هي عليه في الوجود بقدر الطاقة البشرية، فهى علم نظرى غير آلي". (التعريفات للجرجاني).

(٢) جواب "لمّا". (المؤلف)

* ئەگەر دەڵێیت:

دە فەرموو ئەم چوار ئامانجەم لە ﴿بِسْمِ اللهِ﴾ و ﴿الحمدُ للهِ﴾دا پیشان بدە..

دەڵێم:

لەبەر ئەوەی ﴿بِسْمِ اللهِ﴾ بۆ فێركاریی بەندەكان نازڵ كراوە، ئەوا "قُل"ی تێدا تەقدیر كراوە، كە بناغەی تەقدیرەكانی سەرجەم گوفتارەكانی قورئانی پیرۆزە[١].

جا لەسەر ئەم بناغەیە، "قُل" ئاماژەیەكی تێدایە بۆ "پێغەمبەرێتی" و..

لە ﴿بِسْمِ اللهِ﴾شدا هێمایەك هەیە بۆ "خوایەتی" و..

پێشخستنی پیتی "بـ"یش ئاماژەیەكی تێدایە بۆ "تەوحید"[٢] و..

﴿الرَّحمن﴾یش ئاماژەیەكی بۆ سیستمی "دادگەری" و چاكەكاری لەخۆ گرتووە و..

﴿الرَّحيمِ﴾یش هێمایەكی تێدایە بۆ "حەشر".

بە هەمان جۆر ﴿الحمْدُ للهِ﴾یش ئاماژەیەكی بۆ "خوایەتی" تێدایە و..

لامەكەشی - كە بۆ تایبەتكردنە - هێمایەكی بۆ "تەوحید" لەخۆ گرتووە و..

﴿رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾یش هێمایەكی بۆ "دادگەری" و "پێغەمبەرێتی" تێدایە، چونكە پەروەردەكردنی گرۆی مرۆڤ لە رێی پێغەمبەرانەوە دەبێت..

﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾یش دەقێكی راشكاوە لەسەر "حەشر".

تەنانەت سەدەفی ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ﴾[٣] ئەم چوار گەوهەرەی لەخۆ گرتووە.

دەسا تۆش ئەمە وەك نموونەیەك وەربگرە و، بۆ خۆت نموونەی تری لەسەر تانوپۆ بكە.

﴿بسمِ اللهِ﴾ وەكو خۆر وایە؛ خۆی و غەیری خۆیشی رووناك دەكاتەوە، بۆیە لە غەیری خۆی بێ نیازە. تەنانەت "بـ"ەكەی پەیوەستە بەو فیعلەی كە لە واتاكەی وەردەگیرێت[٤]، واتە: (أستعين بە - یارمەتیی لێ وەردەگرم).. یاخود پەیوەندیی بەو فیعلەوە هەیە كە لە واتا عورفییەكەی وەردەگیرێت، واتە: (أتيمَّنُ بە - پیت و

---

(١) واتە: ئەی محەممەد! ئەم گوفتارە بە خەڵكی "بڵێ" و فێریان بكە. (ت)

(٢) چونكە واتای "تایبەتكردن" (قەتیس كردن) دەگەیەنێت. (ت)

(٣) كە لە بچووكترینی سوورەتەكانی قورئانە.

(٤) لە رێزمانی عەرەبیدا "حەرفی جەر" دەبێ پەیوەستی فیعلێك یان موشتەقێك لە واتای فیعلدا بێت تاكو واتاكەی روون بێت. نموونەیەك بۆ حەرفی جەری "ب" دەڵێیت: (كتبتُ بالقلم). واتە بە قەڵەمەكە نووسیم. كەواتە (كتبتُ - نووسیم) ئەو فیعلەیە كە حەرفە جەرەكە پەیوەندیی پێوە هەیە. (وەرگێڕ)

* إنْ قلتَ: أرني هذه المقاصدَ الأربعة في ﴿بِسْمِ اللهِ﴾ وفي ﴿ الحمدُ لله﴾.

قلتُ: لما أُنزِلَ ﴿بِسْمِ اللهِ﴾ لتعليم العبادِ كان "قُلْ" مُقدَّراً فيه. وهو الأمُّ في تقدير الأقوال القرآنية[١].

فعلى هذا يكون في "قُلْ" إشارةٌ إلى الرسالة..

وفي ﴿بِسْمِ اللهِ﴾ رمزٌ إلى الألوهية..

وفي تقديم الباء تلويحٌ إلى التوحيد[٢]..

وفي ﴿الرَّحْمٰنِ﴾ تلميحٌ إلى نظام العدالةِ والإحسان..

وفي ﴿الرَّحِيمِ﴾ إيماءٌ إلى الحشر.

وكذلك في ﴿الحمدُ لله﴾ إشارةٌ إلى الألوهية..

وفي لام الاختصاص رمزٌ إلى التوحيد..

وفي ﴿رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ إيماءٌ إلى العدالة والنبوة أيضاً؛ لأنَّ بالرسُّلِ تربيةَ نوعِ البشر..

وفي ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ تصريحٌ بالحشر.

حتى إن صَدَفَ ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ﴾[٣] يتضمنُ هذه الجواهرَ.

هذا مثالاً[٤] فانسجْ على منواله .

﴿بِسْمِ اللهِ﴾ كالشمس يضيءُ نَفْسَه كغيرِه، فاستغنى..

حتى إنَّ باءَه متعلقةٌ بالفعل المفهوم من معناها. أي أستعينُ به..

أو المفهوم عُرفاً، أي أتيمّنُ به..

---

(١) أي: يا محمد! قل هذا الكلام وعَلِّمْهُ الناس. (ت)

(٢) حيث يفيد الحصر. (ت)

(٣) وهي مِن أقصر السور القرآنية.

(٤) هكذا وردت الكلمة في جميع الطبعات، ولعلها (مثالٌ) والله أعلم. (ف)

بەرەكەتی لێ بەدەست دەهێنم).. یان پەیوەستە بەو فیعلی "أَقْرَأُ"ەی كە لەبەر ئیخلاس و تەوحید دواخراوە و "قُل"ی تەقدیر كراو دەیخوازێ[1].

سەبارەت بە "اسم"یش[2]، ئەوا بزانە كە خوای گەورە هەندێ ناوی هەیە كە خۆیی(ذاتي)ن و، هەندێ ناوی جۆراوجۆری تریشی هەیە كە "كرداری"ن، وەكو "الغفار و، الرزاق و، المحيي و، المميت" و، هاوشێوەیان[3]. جۆراوجۆری و زۆربوونی ئەو ناوانەش، بەهۆی زۆریی پەیوەندی كردنی توانستی ئەزەلیی خواوەندەوەیە بە جۆرەكانی بوونەوەرانەوە[4]. وەك بڵێی ﴿بِسْمِ اللهِ﴾ داواكارییەكە بۆ دابەزاندنی كاریگەری و پەیوەندی كردنی توانستی خوایی بەو كردارەوە، تاكو ئەو پەیوەندی كردنە گیانێكی پشتگیر و یارمەتیدەر بێت بۆ دەستكەوتی ئەو بەندەیە.

﴿اللهِ﴾ كە وشەی "شكۆمەندی"یە، نوسخەیەكە سەرجەم سیفەتەكانی كەماڵی خوای گەورەی لە خۆدا كۆ كردووەتەوە. چونكە بە گوێرەی "دەلالەتی ئیلتیزامی"[5] ئەم وشەیە هەموو ئەو سیفەتانە دەگرێتەوە. ئەوەش بە پێی ئەو نهێنییەی كە: "زات"ی بەرزی ئەو داخوازی "سیفەتەكان"یەتی. بە پێچەوانەی ناوە عەلەمەكانی تر كە ئەو خواستە لەخۆ ناگرن[6].

---

(١) ئەو فیعلە باسكراوانەی كە "بـ"ی حەرفی جەڕ پەیوەندییان پێوە دەكات، لە دوای "بـ"ەكەوە تەقدیر دەكرێن (واتە: بسمِ الله أَقْرَأُ). ئەمەش بە مەبەستی "تایبەتكردن"ە، تاكو ئیخلاس و تەوحید لەخۆ بگرێت! (ت)

(٢) واتە وشەی "اسم" لە ﴿بِسْمِ اللهِ﴾دا. (وەرگێڕ)

(٣) "ناوی خۆیی" خوای گەورە ئەوانەن كە لە زاتی خوا دانابڕێن و پەیوەندی بە "غەیر"ی خواوە ناكەن. وەك: "الحي، السميع، البصير". "ناوی كرداری"ش ئەوانەن كە پەیوەندی بە "غەیر"ی خواوە دەكەن. وەك: "الغفار، الرزاق، المحيي، المميت". (وەرگێڕ)

(٤) واتە بە هۆی پەیوەندی كردنی توانستی ئەزەلییەوەیە بە جۆرەكانی بوونەوەران و بە دانە دانەیانەوە. (ت)

(٥) دەلالەتی ئیلتیزامی زاراوەیەكی زانستی مەنتیق و ڕەوانبێژییە. واتە هەركاتێ مەبەست لە بەكارهێنانی وشەیەك واتایەكی دەرەوەی واتای پڕاوپڕی وشەكە بوو، بەڵام چ لە ڕێی ژیرییەوە – وەك لە زانستی مەنتیقدا – چ لە ڕێی عورفەوە – وەك لە زانستی ڕەوانبێژیدا – بە واتایەكی پێوست(لازم) دادەنرا بۆ واتا سەرەكییەكەی ئەو وشەیە، پێی دەوترێ: "دەلالەتی ئیلتیزامی". بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە پەراوێزی ل (٦٩)ی كتێبی (داوەرییەكان). (وەرگێڕ)

(٦) واتە ناوی شتانی جگە لە خوا، كە تەنها بۆ زاتی ناولێنراوەكان دانراون، نابنە بەڵگە لەسەر سیفەتەكانی ناولێنراوەكە، چونكە سیفەتەكانی زاتەكانی جگە لە خوا "لازم"ی زاتەكان نین. بەڵام ناوی زاتی خوای گەورە دەبێتە بەڵگە لەسەر سیفەتەكانی، چونكە سیفەتەكانی "لازم"ی زاتی شكۆمەندی ئەون. (وەرگێڕ)

أو بما يستلزمه "قُلْ" المقدَّر من "أَقرأُ" المؤخَّر للإخلاص والتوحيد[١].

أما "الاسم" فاعلم أنَّ لله أسماءً ذاتية، وأسماءً فعليةً متنوعةً كالغفار والرزاق والمحيي والمميت وأمثالِها. وتنوّعُها وتكثُّرها بسبب تعدد نسبة القدرة الأزلية إلى أنواع الكائنات[٢].

فكأنَّ ﴿بِسْمِ اللهِ﴾ استنـزالٌ لتأثير وتعلُّق القدرةِ ليكونَ ذلك التعلّقُ روحاً مُمِدّاً لكسب العبد.

﴿اللهِ﴾ لفظةُ الجلال نسخةٌ جامعة لجميع الصفات الكمالية، لدلالتها التزاماً عليه؛ بسر استلزامِ ذاتِه تعالى لصفاته بخلاف سائر الأعلام، لعدم الإستلزام.

---

(١) إنَّ الأفعالَ المذكورة التي يتعلقُ بها الباء تُقدَّرُ مؤخَّراً للحصر، ليتضمنَ الإخلاصَ والتوحيد. (ت)

(٢) أي بسبب علاقة القدرة الأزلية وتعلقها بأنواع الكائنات وأفرادها. (ت)

﴿الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾.

هۆی "هۆنین"ی ئەوەیە کە: وشەی شکۆمەندی ﴿الله﴾ هەروەك "شکۆمەندی"ی لێ دەردەکەوێت بە زنجیرەکەی، بە هەمان جۆر "جوانی"ش بە زنجیرەکەی لە ﴿الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾ەوە دەبینرێت. چونکە "شکۆمەندی" و "جوانی"، بەوەی کە لە هەموو جیهاندا دەردەکەون، دوو بناغەن کە زنجیرەی چەندین لقیان لێ بووەتەوە، وەکو: فەرمان و نەهی.. پاداشت و سزا.. هاندان و مەترسی دانان.. تەسبیح و تەحمید.. ترس و ئومێد.. هتد.

هەروەها وەك وشەی "شکۆمەندی" ئاماژەیە بۆ سیفەتە عەینی و تەنزیهی‌یەکان، ﴿الرَّحِيمِ﴾یش هێمایە بۆ سیفەتە غەیری‌یە کرداری‌یەکان.. هەروەها ﴿الرَّحْمنِ﴾یش هێمایە بۆ ئەو حەوت سیفەتەی[1] کە نە خودی زات و نە غەیری زاتیشن[2]. چونکە "الرحمن" بە واتای "ڕۆزیدەر"ە کە بریتی‌یە لە بەخشینی "مانەوە". مانەوەش بریتی‌یە لە دووپات بوونەوەی "بوون"، بوونیش داخوازی سیفەتێکی جیاکەرەوە و سیفەتێکی تایبەتکار و سیفەتێکی کاریگەرە، کە "زانست و، ویست و، توانست"ن. ئەو "مانەوە"یەش کە بەروبوومی بەخشینی ڕۆزی‌یە، بە پێی عورف داخوازی بوونی سیفەتەکانی "بینین و، بیستن و، ئاخاوتن"ە. چونکە ڕۆزیدەر دەبێ دارای "بینین" بێت، تاکو پێداویستیی ڕۆزیدراو ببینێت، گەر خۆی داوای نەکات. هەروەها دەبێ سیفەتی "بیستن"ی هەبێت، تاکو گوفتاری ئەو ڕۆزیدراوە ببیستێ کاتێك داواکاریی پێشکەش دەکات. هەروەها دەبێ سیفەتی "ئاخاوتن"یشی هەبێت، تاکو لەگەڵ هۆکارەکەی نێوانیاندا بدوێت، گەر ئەو هۆکارە هەبێت. ئەم شەش سیفەتەش داخوازی حەوتەم دەبن کە سیفەتی "ژیان"ە.

* ئەگەر دەڵێیت: لە دوای ﴿الرَّحْمنِ﴾ کە بەڵگەیە لەسەر نیعمەتە مەزنەکان، هێنانی ﴿الرَّحِيمِ﴾ کە بەڵگەیە لەسەر نیعمەتە وردەکان، دەبێتە سنعەتی "دابەزاندنە خوارەوە".. لە کاتێکدا کە ڕەوانبێژی لە سنعەتی "بەرزبوونەوە"دایە لە پلە هەرە نزمەکانەوە بۆ هەرە بەرزەکان؟!

---

(١) کە بریتین لە: "زانست و، ویست و، توانست و، بینین و، بیستن و، ئاخاوتن و، ژیان". (وەرگێڕ)

(٢) واتە: ئەو سیفەتانە "زات"ی خوا نین، بەڵام هی "غەیر"ی ئەویش نین. وەك وێنەکانی ناو ئاوێنە. (وەرگێڕ)

﴿الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾.

وجهُ النظم: أنَّ لفظَ الجلال كما يتجلى منه الجلالُ بسلسلته، كذلك يتراءى الجمالُ بسلسلته من ﴿الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾، إذ الجلالُ والجمالُ أصلان تَسلسلَ منهما - بتجليهما في كل عالَمٍ - فروعٌ كالأمرِ والنهي، والثوابِ والعذاب، والترغيب والترهيب، والتسبيح والتحميد، والخوف والرجاء، إلى آخره..

وأيضاً كما أنَّ لفظَ الجلال إشارةٌ إلى الصفات العينية والتنـزيهية؛ كذلك ﴿الرَّحيم﴾ إيماءٌ إلى الصفاتِ الغيرية الفعلية؛ و ﴿الرَّحْمن﴾ رمزٌ إلى الصفات السبع التي هي لا عينٌ ولاغيرٌ..

إذ ﴿الرَّحْمن﴾ بمعنى الرزاق، وهو عبارةٌ عن إعطاء البقاءِ..

والبقاءُ تكرُّرُ الوجودِ..

والوجودُ يستلزمُ صفةً مُميِّزةً وصفةً مُخَصِّصَةً وصفةً مُؤَثِّرَةً، وهي:

العلمُ والإرادةُ والقدرةُ.

والبقاءُ الذي هو ثمرةُ إعطاء الرزق يقتضي عُرفاً ثبوتَ البصر والسمع والكلام؛ إذ لابدّ للرزّاق من البصر ليرى حاجةَ المرزوق إن لم يَطلب، ومن السمع ليستمعَ كلامَه إنْ طلبَ، ومن الكلام ليتكلمَ مع الواسطة إن كانت..

وهذه الستُّ تستلزمُ السابعةَ التي هي الحياةُ.

* إنْ قلتَ:

تذييلُ ﴿الرَّحْمن﴾ الدالّ على النِعَمِ العظيمة بـ﴿الرَّحيم﴾ الدالّ على النِعم الدقيقة يكونُ صنعةَ التدلّي، والبلاغةُ في صنعة الترقّي من الأدنى إلى الأعلى؟

دەڵێم: ئەو بەدواداهێنانە بە مەبەستی تەواوکاری‌یە، بە وێنەی پێڵوو بۆ چاو و، لغاو بۆ ئەسپ..

هەروەها لەبەر ئەوەش کە نیعمەتە مەزنەکان لەسەر وردەکان بەندن، ئەوا وردەکان بە بەرزتر دادەنرێن، بە وێنەی کلیل بۆ قفڵ و، زمان بۆ گیان..

هەروەها مادەم ئەم شوێن و ڕێیە مەقامی بێدارکردنەوەی مرۆڤە سەبارەت بە جێی نیعمەتەکان، ئەوا هەرە پەنهانەکانیان شایانترن کە مرۆڤیان لێ بێدار بکرێتەوە، کەواتە سنعەتی "دابەزاندنە خوار" لە مەقامی منەتلێنان و ژماردنی نیعمەتەکاندا، دەبێتە سنعەتی "بەرزبوونەوە" لە مەقامی بێدارکردنەوەدا.

* ئەگەر دەڵێیت: واتا سەرەتاییەکانی ﴿الرَّحْـمن﴾ و ﴿الرَّحِيم﴾ و سیفەتەکانی تری هاوشێوەیان، سەبارەت بە خوای گەورە مەحاڵن، وەك "دڵنەرمی". خۆ ئەگەر مەبەستیش کۆتاییەکان[1] بێت ئەوا حیکمەتی "مەجاز" لەوانەدا چی‌یە؟

دەڵێم: ئەوە حیکمەتی "موتەشابیهات"ە[2]، (کە دابەزاندنی وتارە خواییەکانە بۆ ئاستی ژیریی مرۆڤ) ئەوەش بە مەبەستی ڕاهێنان و تێگەیاندنی زەینەکانە. وەك ئەوەی کەسێك لەگەڵ منداڵێکدا بەو چەشنە گوفتارە بدوێ کە ئەو منداڵە لەگەڵی ڕاهاتووە و دڵی پێ دەکرێتەوە. چونکە جەماوەری خەڵك زانیاری‌یەکانیان لە شتانی هەست پێکراویان بەرچنی دەکەن و، تەنها لە ئاوێنەی ئەندێشە و لە ڕووی ئەو شتانەوە کە پێی ڕاهاتوون، دەڕواننە ڕاستی‌یە پەتی‌یەکان..

هەروەها ئامانج لە گوفتاردا گەیاندنی واتایە. ئەوەش تەنها بە "کاریگەریی لە دڵ و هەست"دا دروست دەبێت، ئەوەش تەنها بەوە دێتەدی کە شێوازی "ڕاهاتنی گوێ بیست" بە بەر "ڕاستی" بپۆشرێت و، تەنها بەوەش دڵی ئامادەی وەرگرتن دەبێت..

﴿الحمْدُ﴾.

هۆی "هۆنین"ی لەگەڵ پێش خۆیدا ئەوەیە کە:

لەبەر ئەوەی ﴿الرَّحْـمن﴾ و ﴿الرَّحِيم﴾ بوون بە بەڵگە لەسەر نیعمەتەکان، ئەوا بەدواداهاتنی "حەمد"یان دوای خۆیان خواست.

---

(١) واتە گەر مەبەست پێی "نیعمەت بەخشین" بێت کە ئەنجام و لازمێکی واتای حەقیقەتەکەیانە. (ت)

(٢) کە بەکارهێنانی واتا ڕاشکاوەکەیان بۆ خوای گەورە مەحاڵە، وەك واتای ڕاستەقینەی "الید". (ت)

قلتُ: تذييلٌ للتتميم كالأهدابِ للعين واللِّجام للفَرَس ..

وأيضاً لَمّا توقَّفت العظيمةُ على الدقيقة، كانت الدقيقةُ أرقى، كالمفتاحِ للقُفل واللسانِ للروح ..

وأيضاً لما كان هذا المقامُ مقامَ التنبيه على مواقع النِعَمِ كان الأخفى أجدرَ بالتنبيه، فتكونُ صنعةُ التدلّي في مقام الامتنانِ والتعدادِ صنعةَ الترقّي في مقام التنبيه.

* إنْ قلتَ:

﴿الرَّحْـمن﴾ و ﴿الرَّحيم﴾ كأمثالها بمبادئها محالٌ في حقه تعالى كرقَّةِ القلب، وإن أُريدتْ منها النهاياتُ[1] فما حكمةُ المجاز؟

قلتُ: هي حكمةُ المتشابهات[2]، وهي "التنـزّلاتُ الإلهيةُ إلى عقولِ البشر"، لتأنيسِ الأذهان وتفهيمِها، كمَن تكلّمَ مع صبيٍّ بما يألَفُه ويأنَسُ به. فإنَّ الجمهورَ من الناس يجتنون معلوماتِهم عن محسوساتهم، ولا ينظرون إلى الحقائقِ المحضة إلّا في مرآة متخيّلاتِهم ومن جانب مألوفاتِهم..

وأيضاً المقصودُ من الكلام إفادةُ المعنى، وهي لا تتمُ إلّا بالتأثير في القلب والحس، وهو لا يحصُلُ إلّا بإلباسِ الحقيقةِ أسلوبَ مألوفِ المخاطَب، وبه يستعدُّ القلبُ للقبول.

﴿الحَمْدُ﴾.

وجهُ النظم مع ما قبلَه، أنّ ﴿الرَّحْـمن﴾ و ﴿الرَّحيم﴾ لّما دلّتا على النِعَم، استوجَبتَا تعقيبَ الحمد.

---

(١) أي إن قُصِدَ الإنعامُ الذي هو نتيجة ولازمٌ لمعنى حقيقتها. (ت)

(٢) التي محال استعمال معناها الحقيقي بحقه تعالى، كاليد. (ت)

پاشان ﴿الحَمْدُ للهِ﴾ لە چوار سوورەتی قورئانی پیرۆزدا دووپات کراوەتەوە[١]، هەر یەکەشیان ڕوویان لە نیعمەتێکی بنەڕەتی‌یە کە بریتین لە: بەدیهاتنی یەکەم (دنیا) و، مانەوە تیایدا و، بەدیهاتنی دووهەم (قیامەت) و، مانەوە لە دوای ئەوە[٢].

پاشان هۆی هۆنینی لەم ڕشتەیەدا، واتە دانانی "الحمد" لە سەرەتای دەسپێکی قورئاندا کە سوورەتی "الفاتحة"یە، ئەوەیە کە سوپاس کردنی خوای گەورە وەك تەسەوور کردنی ئەو "هۆکارە ئامانج"ەیە کە پێشتر لە زەیندا ئامادە کراوە..

چونکە سوپاس کردنی خوای گەورە، وێنەیەکی پوختی "پەرستن"یەتی، کە ئاکامی بەدیهێنانە و.. پوختەی "ناسین"یشیەتی، کە حیکمەت و ئامانجی بوونەوەرانە. وەك بڵێی ناوهێنانی "الحمد" تەسەوورکردنی هۆکارە ئامانجی بەدیهاتنە. خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿وما خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنْسَ إلاَّ لِيَعْبُدونِ﴾ (الذاريات: ٥٦).

پاشان، ئەوەی کە لە واتاکانی "الحمد"دا بەناوبانگە: دەرخستنی سیفەتە "کەماڵی"یەکانی خوای گەورەیە..

بۆ ڕوونکردنەوەی ڕاستیی ئەمەش دەڵێین:

خوای گەورە مرۆڤی بەدی هێناوە و کردوویەتی بە نوسخەیەکی لەخۆدا کۆکەرەوەی گشت بوونەوەران و، پێرستێك بۆ کتێبی جیهان کە هەژدە هەزار جیهانی لەخۆ گرتووە. ئنجا وێنەیەکی هەموو یەکێ لەو جیهانانەشی - کە یەکێك لە ناوە بەرز و جوانەکانی ئەویان تێدا دەردەکەوێت - لە کاکڵە و گەوهەری مرۆڤدا داناوە..

جا ئەگەر مرۆڤ هەموو ئەو نیعمەتانەی کە پێی بەخشراون بۆ ئەوە بخاتەکار کە لە پێناویدا بەدیهێنراوە، تاکو ئەو شوکرانە عورفی‌یە جێبەجێ بکات کە لە ژێر وشەی

---

(١) کە بریتین لە سوورەتەکانی: "الانعام، الكهف، سبأ، فاطر".

(٢) ئەبوو ئیسحاقی ئیسفرایینی، خوا لێی خۆش بێت (ساڵی وەفاتی: ٤١٨ك) فەرموویەتی: هەموو یاسا و بناغەکانی تەوحید لە سوورەتی "الانعام"دا هەیە. جا لەبەر ئەوەی نیعمەتەکانی خوای گەورە لە ژمارە نایەن، ئەوا بە پوختی بریتین لە "بەدیهێنان" و "هێشتنەوە" لە دروستکردنی یەکەمدا و، "بەدیهێنان" و "هێشتنەوە" لە دروستکردنی دواییدا. لە سوورەتی "الفاتحة"دا ئاماژە بۆ هەمووی کراوە و سەرەتا بە حەمد و سوپاس دەستی پێ کردووە، چونکە پێشەکیی هەموو ئەو نیعمەتانەیە کە لە کتێبە پیرۆزەکەیدا باس کراون. پاشان لە سوورەتی "الأنعام"دا ئاماژە بۆ بەدیهێنانی یەکەم و، لە "الكهف"دا ئاماژە بۆ هێشتنەوەی یەکەم و، لە سوورەتی "سبأ"دا بۆ بەدیهێنانی دووهەم و، لە سوورەتی "فاطر"دا بۆ هێشتنەوەی دووهەم کراوە. لەبەر ئەمەیە کە ئەم پێنج سوورەتە بە "تەحمید" دەست پێدەکەن. (حاشية شهاب على سورة الأنعام ٤/٢). (ب)

ثم إنَّ ﴿الحَمْدُ لله﴾ قد كُرِّرَتْ في أربع سُوَرٍ من القرآن[١]، كلُّ واحدةٍ منها ناظرةٌ إلى نعمةٍ من النِعم الأساسية التي هي: النشأةُ الأولى، والبقاءُ فيها، والنشأةُ الأخرى، والبقاءُ بعدَها[٢].

ثم وجهُ نظمِه في هذا المقام (أي جعلُه فاتحةَ فاتحةِ القرآن) هو أنّه كتصوّر العلّةِ الغائية[٣] المقدَّم في الذهن؛ لأنَّ الحمدَ صورةٌ إجماليةٌ للعبادةِ، التي هي نتيجةٌ للخِلقة، والمعرفةِ التي هي حكمةٌ وغايةٌ للكائنات. كأنَّ ذكرَه تصوّرٌ للعلة الغائية .. وقد قال عزَّ وجَلَّ:

﴿وما خَلَقْتُ الجِنَّ وَالإِنْسَ إلاّ لِيَعْبُدون﴾ (الذاريات: ٥٦).

ثم إنَّ المشهورَ من معاني" الحمد" إظهارُ الصفات الكمالية.

وتحقيقُه:

أنَّ اللهَ سبحانه خلقَ الإنسانَ وجعلَه نسخةً جامعةً للكائنات، وفِهْرِسْتةً[٤] لكتاب العالَم المشتملِ على ثمانيةَ عشَر ألفَ عالَم، وأودعَ في جوهره أنموذجاً من كلِّ عالَمٍ تجَلَّى فيه اسمٌ من أسمائه تعالى..

فإذا صرفَ الإنسانُ كلَّ ما أُنعِمَ عليه إلى ما خُلِقَ لأجله إيفاءً للشكر العُرفي -الداخل تحت "الحمد" - وامتثالاً للشريعة التي هي جَلاءٌ لصدأ الطبيعة، يصيرُ كلُّ أُنموذجٍ مشكاةً

---

(١) وهي: الأنعام، الكهف، سبأ، فاطر.

(٢) قال أبو إسحق الإسفرايني رحمه الله: في سورة "الأنعام" كل قواعد التوحيد. ولما كانت نعمه تعالى مما تفوت الحصر إلاّ أنها ترجع إجمالاً إلى إيجاد وإبقاء في النشأة الأولى، وإيجاد وإبقاء في النشأة الآخرة، وقد أشير في"الفاتحة" إلى الجميع.. ابتدأت بالتحميد لأنها ديباجة نعمه المذكورة في كتابه المجيد . ثم أشير في الأنعام إلى الإيجاد الأول وفي "الكهف" إلى الإبقاء الأول، وفي "سبأ" إلى الإيجاد الثاني، وفي "فاطر" إلى الإبقاء الثاني، فلهذا ابتدأت هذه السور الخمس بالتحميد. (حاشية الشهاب على سورة الأنعام: ٤/ ٢ (ب)

(٣) أي يكون المعلوم لأجلها.

(٤) فهرس وفهرست كلمة مُعَرَّبة.

"الحمد"دایە و، بۆ ئەوەی گوێڕایەڵیی ئەو شەریعەتە بکات کە خاوێنکردنەوەی مرۆڤە لە ژەنگی سروشت.. ئەوا هەموو یەکێك لەو نموونانە دەبنە کلاورۆژنەیەك بۆ جیهانەکەی و، ئاوێنەیەك بۆ ئەو جیهانە و، بۆ ئەو سیفەتەی کە تیایدا دەرکەوتووە و، بۆ ئەو ناوەش کە لێیەوە دەبینرێت. ئیتر مرۆڤ بە "گیان" و "جەستە"ی دەبێتە پوختەیەکی هەردوو جیهانی ئاشکرا و پەنهان و، چی لەواندا دەردەکەوێت لەمیشدا دەدرەوشێتەوە.

کەواتە بە "حەمد و سوپاس"ی خوای گەورە مرۆڤ دەبێتە جێی تیادەرکەوتنی "سیفەتەکانی کەماڵی" خوای گەورە.

بەڵگەش لەسەر ئەمە، وتەکەی "محێدینی عەرەبی"یە کە لە ڕوونکردنەوەی حەدیسی: (كُنتُ كَنْزاً مَخْفِيّاً فَخَلَقْتُ الْخَلْقَ لِيَعْرِفُونِي)دا وتوویەتی:

"واتە: بەدیهاتووانم دروست کرد، تاکو ببنە ئاوێنەیەك جوانیی خۆمی تێدا ببینم".

﴿لله﴾ واتە "حەمد" تایبەت و شایستەی ئەو زاتە تەواو خاوێنە زانراوەیە کە بە چەمکی "واجب الوجود"[1] گوزارشتی لێ دەکرێت، چونکە هەندێ جار ڕەچاو کردنی کەسی زانراو بە شتێکی گشتی دەبێت. ئەم "لام"ەش پەیوەندیی بە واتاکەی خۆیەوە هەیە، وەك بڵێی واتای ئەو فیعلەی هەڵمژیوە کە پەیوەستە پێیەوە[2]..

هەروەها ئەم "لام"ە ئاماژەیەکیشی بۆ ئیخلاس و تەوحید تێدایە.

﴿رَبِّ﴾ واتە ئەو کەسەی کە جیهان بە هەموو بەشەکانیەوە پێدەگەیەنێت کە هەریەکە لەو بەشانە بە وێنەی "جیهان" جیهانێکە بۆ خۆی و، گەردیلەکانیشی بە وێنەی ئەستێرەکان بەوپەڕی ڕێکوپێکی پەرش و بڵاون و، دەجووڵێنەوە.

ئەوەش بزانە کە: خوای گەورە خاڵێکی "کەماڵ"ی بۆ هەموو شتێك دەستنیشان کردووە و، حەزێکی بەرەو ئەو کەماڵەش تێدا داناوە، وەك بڵێی فەرمانێکی مەعنەویی بۆ ئەو شتە دەرکردبێت کە بەرەو ئەو کەماڵە بکەوێتە ڕێ. لەم سەفەرەشیدا پێویستی بەو شتانە هەیە کە یارمەتیدەر و پشتگیری بن و، بە دوور خستنەوەی هەر شتێکیش کە لەمپەری بۆ دابنێت، ئەوەش بە پێگەیاندنی بە پەروەردەی خوای گەورە دەبێت..

خۆ ئەگەر سەرنج لە بوونەوەران بدەیت، دەبینیت بە وێنەی ئادەمیزاد چەند تیرە و هۆزێکن و، هەریەکەیان بە تاك و کۆ سەرقاڵی ئەنجامدانی ئەو ئەرکەیە کە بەدیهێنەری

(١) کە بریتییە لەو کەسەی "بوون"ی لە زاتی خۆیەوەیە و، هەرگیز پێویستی بە هیچ شتێك نییە.
(٢) دوای حەزفی ئەو فیعلەی کە پەیوەندیی پێیەوە کردووە. (ت)

لعالَمِهِ ومرآةٌ له وللصفةِ المتجلية فيه والاسمِ المتظاهر منه. فيكونُ الإنسانُ بروحه وجسمِه خلاصةَ عالَمَي الغيب والشهادة، ويتجلى فيه ما تجلى فيهما.

فبالحمدِ يصيرُ الإنسانُ مَظهراً للصفات الكمالية الإلهية.

يدلُّ على هذا قولُ "محي الدين العربي" في بيان حديث: "كُنْتُ كَنْزاً مَخْفِيًّا فَخَلَقْتُ الخَلْقَ لِيَعْرِفُوني"[1] أي: فخلقتُ الخَلق ليكونَ مرآةً أُشاهِدُ فيها جمالي.

﴿لله﴾ أي الحمدُ مُختصٌّ ومُستحَق للذات[2] الأقدس المشخَّص الذي يُلاحَظ بمفهوم "الواجب الوجود"[3] إذ قد يُلاحَظ المشخّص بأمرٍ عام. وهذه اللام متعلقةٌ بمعنًى نفسِها، كأنَّها تشرّبَتْ معنى متعلَّقها[4].

وفي اللام إشارةٌ إلى الإخلاص والتوحيد.

﴿رَبِّ﴾ أي الذي يربّي العالَمَ بجميع أجزائه، التي كلٌّ منها كالعالَمِ عالَمٌ؛ وذرّاتُه كنجومه متفرِّقةٌ متحرِّكة بالانتظام.

واعلم أنَّ الله عزّ وجلّ عيّنَ لكلِّ شيء نقطةَ كمالٍ وأودعَ فيه مَيلاً إليها، كأنَّه أمَرَه أمراً معنوياً أنْ يتحركَ به إليها، وفي سفره يحتاجُ إلى ما يُمِدُّه ودفعِ ما يَعوِّقهُ، وذلك بتربيته عزّ وجلّ.

لو تأملتَ في الكائنات لرأيتَها كبني آدمَ طوائفَ وقبائلَ يشتغلُ كلٌّ منفرداً ومجتمعاً

---

(١) لا يعرف له سند صحيح ولا ضعيف، إلاّ أن علياً القاري قال: ولكن معناه صحيح، مستفاد من قوله تعالى: ﴿وما خَلَقْتُ الجِنَّ وَالإِنْسَ إلاّ لِيَعْبُدونَ﴾ (الذاريات: ٥٦). أي ليعرفوني، كما فسره ابن عباس رضي الله عنهما. باختصار عن كشف الخفاء: (٢/ ١٣٢).

(٢) جعل كلمة "الذات" اسماً للحقيقة فزال التأنيث.

(٣) الذي يكون وجوده من ذاته ولا يحتاج إلى شيء أصلاً.

(٤) بعد حذف متعلقها. (ت)

بـۆی دیـاری کـردووە و، بـە گـەرموگوڕی لـە گوێڕایـەڵیی یاسـای بەدیهێنـەریدا تێدەکۆشێت. مرۆڤ چەندە سەیرە! چۆن لەم یاسایە خۆی کەنار دەدات!

﴿العالَمين﴾.

"یاء و نون"ەکەی، یان تەنها هی ئەوەیە کە نیشانەی ئیعرابن، وەك هی "عشـرين و، ثلاثين".. یان ئەوەیە بۆ "کۆ" بەکار هاتوون، چونکە بەشەکانی جیهانیش لە خۆیاندا چەند جیهانێکن.. یان هی ئەوەیە کە جیهان لەم کۆمەڵـە خۆرەدا بەند نیـیە، شاعیرێك وتوویەتی:

الحمدُ للهِ كَم للهِ مِن فَلَكٍ    تجري النجومُ بِه والشمسُ والقمرُ

کۆی هۆشمەندانیشی بۆ هەڵبژارد، بە وێنەی: ﴿رأيْتُهُمْ لِي ساجِدِين﴾ (یوسف: ٤) تاکو ئاماژە بکات بۆ ئـەوەی کـە ڕوانینـی "ڕەوانبێژی" وێنـەی هـەموو یـەکێك لـە بەشـەکانی جیهان لە شێوەی "زیندوویەکی ژیر"دا دەکێشێت کـە بـە زمـانی حـاڵ بدوێـت. چونکـە "العالَم" ناوە بۆ هەر شتێك کە بە هۆیەوە بەدیهێنەر بزانرێت و، شایەت بێـت لەسـەری و، ئاماژەی بـۆ بکـات. کەواتـە "پـەروەردە" و "ڕاگـەیاندن"(ناسـاندن) بـە وێنـەی "سـجود" ئاماژەن بۆ ئەوەی کە ئەو جیهانانە وەکو خاوەن ژیرییەکانن.

﴿الرَّحْـمن الرَّحِيم﴾.

هـۆی هۆنینیـان ئەوەیـە کـە: ئـەم دووانـە ئامـاژەن بـۆ هـەردوو بناغەکـەی پـەروەردە، چونکە ﴿الرَّحْـمن﴾ لەبەر ئەوەی لە واتای "الرزاق "دایە، ئەوا بۆ (هێنانی سوودەکان) دەسـت دەدات و، ﴿الرَّحِيـم﴾یش لەبـەر ئـەوەی بـە واتـای "الغفـار"ە، ئـەوا لەگـەڵ (دوورخستنەوەی زیانەکان)دا دەگونجێ، کە ئەم دوانەش دوو بناغەکەی پەروەردەن.

﴿مالِكِ يومِ الدِّين﴾ واتە ڕۆژی حەشر و تۆڵە و پاداشت.

هۆی هۆنینی ئەوەیە کە: وەکو ئەنجام وایە بۆ ئەوەی پێش خۆی، چونکە "میهرەبانی" لـە بەڵگەکانی قیامـەت و بەختـەوەریی هەمیشـەییە. لەبـەر ئـەوەی "میـهرەبانی" کاتـێ میهرەبانییـە و "نیعمـەت"یـش کاتێ بـە نیعمـەت دادەنرێـت کـە قیامـەت بێتـە کایـەوە و بەختەوەریی هەمیشەیی ڕوو بدات، دەنا ئەو "ژیـری"یـەی کـە لـە مـەزنترینی نیعمەتەکانـە دەبێتە گرفت بۆ مرۆڤ و، "خۆشەویستی" و "شەفەقەت"یش کە ناسـکترینی جۆرەکـانی میهرەبانین، بە ڕەچاو کردنی "جودایی هەمیشەیی" دەگۆڕێن بە ئازارێکی توندوتیژ!

بوظيفته التي عيَّنَها له صانِعُه ساعياً مُجِدّاً مطيعاً لقانون خالقه. فما أعجبَ الإنسانَ كيف يشذّ!

﴿الْعَالَمِينَ﴾. الياءُ والنون إمّا علامةٌ للإعراب فقط كـ"عشرين وثلاثين".. أو للجمعية؛ لأنَّ أجزاءَ العالَم عَوالمٌ.. أو العالَمُ ليس منحصراً في المنظومة الشمسية. قال الشاعر:

اَلْحَمْــدُ لله كَــمْ لله مِــنْ فَلَكٍ     تَجرِي النُّجُومُ بِهِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ[1]

وآثر جمعَ العقلاء مثل: ﴿رأَيْتُهُمْ لِي ساجِدِين﴾ (يوسف: ٤) إشارةً إلى أنَّ نظرَ البلاغة يصوّرُ كلَّ جزء من أجزاء العالم بصورةِ حيّ عاقلٍ متكلِّمٍ بلسان الحال. إذ العالَمُ اسمُ ما يُعلَمُ به الصانعُ[2] ويشهدُ عليه ويشيرُ إليه. فالتربيةُ والإعلامُ يُومِيان- كالسجود -إلى أنها كالعقلاء.

﴿الرَّحْـمن الرَّحِيم﴾.

وجهُ النظم: أنهما إشارتـان إلى أساسَي التربـية؛ إذ ﴿الرَّحْـمن﴾ لـكونه بمعنى الرزاق يلائمُ جلبَ المنافع؛ و ﴿ الرَّحِيم﴾ لكونه بمعنى الغفار يناسبُ دفعَ المضار وهما الأساسان للتربية.

﴿مالِكِ يومِ الدِّين﴾ أي يومِ الحشر والجزاء.

وجهُ النظم: أنَّه كالنتيجة لسابقه؛ إذ الرحمةُ من أدلة القيامة والسعادة الأبدية؛ لأنَّ الرحمةَ إنما تكونُ رحمةً، والنعمةُ نعمةً إذا جاءت القيامةُ وحصلت السعادةُ الأبدية. وإلّا فالعقلُ الذي هو من أعظَم النِعَم يكونُ مصيبةً على الإنسان، والمحبةُ والشفقة اللتان هما من ألطفِ أنواع الرحمة تتحولان ألَمَاً شديداً بملاحظة الفراق الأبدي .

---

(١) لأبي العلاء المعري:

يا أيها الناس كم لله من فلك     تجرى النجوم به والشمس والقمرُ

(٢) "إنَّ اللهَ صانعُ كُلِّ شيءٍ وَصَنْعَتَهُ". رواه الحاكم في المستدرك

* ئەگەر دەڵێیت: خـوای گەورە بە بەردەوامی خاوەنی هەموو شتێکە، ئیتر هۆی تایبەتکردنی خاوەنداریی‌یەکەی بە "ڕۆژی دوایی" چی‌یە؟

دەڵێم: لەبەر ئاماژەدانە بەوەی کە ئەو هۆکارە ڕواڵەتی‌یانەی خوای گەورە لەم جیهانی بوون و تێکچوونەدا بە مەبەستی دەرخستنی مەزنیی خۆی داینـاون (واتە بۆ ئەوەی لە ڕواڵەتبینیی ژێریدا پەیوەندی کردنی ڕاستەوخۆی دەستی توانست لە ڕووی "مولك"ی شتەکاندا بە کاروبارە مەزنەکانەوە نەبینرێ) لەو دنیـادا ئەم هۆکارانە لادەبرێن و، ڕووی "مەلەکووتییەت"ی هەموو شتێك بە ساف و ڕوونی دەردەکەوێت، بە ڕادەیەك کە هەموو شتێك، بە بێ هیچ هۆکارێك، گەورە و بەدیهێنەری خۆی دەبینێت و دەیناسێت.

گوزارشت کردنیش بە وشەی "یوم" ئاماژەیە بۆ نیشانەیەکی حەدسیی[1] نێـوان نیشانەکانی حەشر، لەسەر بناغەی پەیوەندیی ئاشکرای نێوان "ڕۆژ" و "ساڵ"، هەروەها "تەمەنی مرۆڤ" و "خولانەوەی دنیا"، بە وێنەی ئەو پەیوەندی‌یە ئاشکرایەی کە لە نێـوان میلە چرکە ژمێر و خولەك ژمێر و کات ژمێر و ڕۆژ ژمێرەکانی ئامێری سەعاتدا هەیە..

چونکە هەروەك ئەو کەسەی کە دەبینێت میلێکیان خولی خۆی تەواو دەکات، لەخۆیدا پەی بەوە دەبات کە ئەوی تریش دەبێ خولی خۆی - تەنانەت گەر بە لەسەرخۆییش بووە - تەواو بکات..

بە هەمان شێوە، ئەو کەسەی کە قیامەتە نەوعی‌یە[2] دووپات بووەکان لە هاوشێوەی ڕۆژ و ساڵدا دەبینێت، پەی بە لەدایکبوونی بەهاری بەختەوەریی هەمیشەیی لە بەرەبەیانی ڕۆژی حەشردا بۆ ئەم مرۆڤە دەبات، کە یەك "دانە"یان وەکو "جۆر" وایە لە بەدیهاتووانی تردا.

مەبەست لە ﴿الدِّين﴾دا یان سزایە، واتە ڕۆژی پاداشت و تۆڵەی کردارە چاك و خراپەکان.. یان مەبەست ڕاستی‌یە ئایینی‌یەکانە، واتە ڕۆژی دەرکەوتن و ئاشکرابوونیانە بە زاڵبوونی بازنەی "باوەڕ" بەسەر بازنەی "هۆکارەکان"دا..

---

(١) حەدس: خێرایی زەینی مرۆڤە لە تێگەیشتندا. (وەرگێڕ)

(٢) واتە لە دنیادا جۆر(نوع)ەکان زیندوو دەکرێتەوە. ئەوەتا لە بەهاراندا خوای گەورە "جۆر"ی ڕووەك و زیندەوەران زیندوو دەکاتەوە. بەڵام لەو دنیادا "دانە بە دانە"ی مرۆڤەکان زیندوو دەکاتەوە. (وەرگێڕ)

* إنْ قلتَ :

إنَّ اللهَ تعالى مالكٌ لكلِّ شيءٍ دائماً فما وجهُ الاختصاص[١]؟

قلت:

للإشارة إلى أنَّ الأسبابَ الظاهريةَ التي وضَعَها الله تعالى في عالم الكون والفساد لإظهار عظمته (أي لئلا يُرى في ظاهر نظر العقل مباشرةُ يد القدرة بالأمور الخسيسة في جهة مُلْك الأشياء) ترتفعُ في ذلك اليوم وتتجلّى ملكوتيةُ كلِّ شيء صافيةً شفّافةً، بحيث يَرى ويَعرفُ كلُّ شيء سيِّدَه وصانِعَه بلا واسطة.

وفي التعبير بلفظ "اليوم" إشارةٌ إلى أمارةٍ حَدْسِيَّةٍ من أمارات الحشر بناءً على التناسب البيّنِ بين اليوم والسنة، وعُمر البشر ودوران الدنيا. كالكائن بين أميال الساعة العادّة للثواني والدقائق والساعات والأيام .

فكما أنَّ مَن يرى مِيلاً أتمَّ دَوْرَه يَحدُس في نفسه أنَّ من شأن الآخَر أيضاً أنْ يُتمَّ دورَه وإنْ كان بمُهلة؛ كذلك إنَّ مَن يرى القيامةَ النوعيةَ المكرَّرةَ في أمثال اليوم والسنة يتحدّسُ بتولّد ربيع السعادةِ الأبدية في صُبح يوم الحشر للإنسان الذي شخصُه كنوعٍ.

والمرادُ من ﴿الدِّين﴾ إمّا الجزاءُ، أي يومِ جزاءِ الأعمال الخيرية والشرّيّة، أو الحقائقُ الدينية، أي يومِ طلوعها وظهورها وغلبةِ دائرة الاعتقاد على دائرة الأسباب..

---

(١) في: "مالك يومِ الدِّين".

چونکە خوای گەورە بە ویستی خۆی ڕێسایەکی (لەم دنیایەدا) لەناو بوونەوەراندا داناوە کە "هۆکارەکان" بە "بەهۆکراوەکان"ەوە پەیوەست دەکات و، مرۆڤی - بە سروشت و وەهم و ئەندێشەی - ناچار کردووە کە چاودێریی ئەو ڕێسایە بکات و پەیوەستی بێت. لە هەمان کاتدا هەموو شتێکیشی ئاراستەی خۆی کردووە، چونکە خاوێنە لەوەی کە هۆکارەکان لە موڵکی ئەودا کاریگەرییان هەبێت. ئنجا لە ڕووی ئیمان و باوەڕیشەوە داوای لە مرۆڤ کردووە کە بە ویژدان و گیانی خۆی چاودێریی ئەو بازنەیە بکات و پەیوەستی بێت..

جا لە دنیادا "بازنەی هۆکارەکان" بەسەر "بازنەی باوەڕ"دا زاڵە، بەڵام لەودنیادا ڕاستییەکانی "باوەڕ" هێندە بە ڕوونی دەردەکەون کە بە سەر "بازنەی هۆکارەکان"دا زاڵ دەبن.

ئەوەش بزانە کە: هەریەك لەم دوو بازنەیە پلەیەکی دیار و چەندین بڕیاری تایبەت بە خۆیان هەیە، دەبێ هەموو یەکێکیان مافی خۆی پێ بدرێت. ئەوەتا ئەو کەسەی کە بە سروشت و بە وەهم و ئەندێشەی خۆی و بە پێوەری هۆکارەکان لە "بازنەی هۆکارەکان"ەوە بڕوانێتە "بازنەی باوەڕ" ناچاری گرتنەبەری ڕێچکەی (ئیعتیزال) دەبێت. ئەو کەسەش کە بە گیان و ویژدانی خۆی لە پلەی باوەڕ و بە پێوەرەکانی بڕوانێتە "بازنەی هۆکارەکان"، ئەوا ئەو ڕوانینە لە بەرامبەر "ویست"ی ڕێسا ڕێکخەرەوە تەوەکولێکی تەمبەڵانەی بۆ بەرهەم دەهێنێت[١].

﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾. دوو سەرنج لەم "کاف"ەدا هەیە:

یەکەمیان:

بە پێی نهێنیی "ئاوڕدانەوە"[٢] بۆ سیفەتە کەمالییە ناوبراوەکان، ئاراستە کردنی گوفتاری بۆ بەرامبەر لەخۆ گرتووە، چونکە وردە وردە و کەم کەم باسکردنیان زەینی مرۆڤ دەبزوێنێت و، ئامادەی دەکات و، شەوقی دەورووژێنێت و، ڕایدەوەشێنێ بۆ ڕووکردنە خاوەنی ئەو سیفەتانە.

کەواتە ﴿إِيَّاكَ﴾ واتە: ئەی ئەو کەسەی کە خاوەنی ئەم سیفەتانەیت!

---

(١) مەبەست پێی ڕێچکەی جەبرییەکانە.

(٢) "ئاوڕدانەوە" لە ڕەوانبێژیدا بە وەرچەرخاندنی شێوازی گوفتار دەوترێ لە بارەی کەسی سێهەمەوە بەرەو ئاراستەکردنی بۆ کەسی دووهەم، یان یەکەم، هەروەها بە پێچەوانەشەوە. (لە: "التعريفات"ی جورجانییەوە)

لأنَّ اللهَ عزّ وجلّ أودعَ بمشيئته في الكائنات نظاماً يربطُ الأسبابَ بالمسبَّبات وألجأ الإنسانَ بطبيعته ووَهمِه وخيالِه إلى أنْ يُراعيَ ذلك النظامَ ويرتبطَ به..

وكذا وجَّه كلَّ شيء إليه وتَنَزَّه عن تأثير الأسباب في مُلكه. وكلّفَ الإنسانَ اعتقاداً وإيماناً بأنْ يراعيَ تلك الدائرةَ بوجدانه وروحه ويرتبطَ بها.

ففي الدنيا دائرةُ الأسباب غالبةٌ على دائرة الاعتقاد؛ وفي الأُخرى تتجلى حقائقُ العقائد غالبةً على دائرة الأسباب.

واعلم أنَّ لكلٍّ من هاتين الدائرتين مقاماً معيناً وأحكاماً مخصوصة، فلابدَّ أنْ يُعطَى كلٌّ حقَّه.

فمَن نظرَ في مقام دائرة الأسباب، بطبيعته ووهمِه وخياله ومقاييس الأسباب، إلى دائرة الاعتقاد اضطرَّ إلى الاعتزال..

ومن نظرَ في مقام الاعتقاد ومقاييسه بروحه ووجدانه، إلى دائرة الأسباب أنتجَ له توكلاً تَنْبَلياً[1] وتمرّداً في مقابلة المشيئة النَظّامة.

﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ في "الكاف" نكتتان:

إحداهما:

تضمُّن الخطابِ بسر الالتفات[2] للأوصاف الكمالية المذكورة، إذ ذكرُها شيئاً شيئاً يحرّكُ الذهنَ ويُعدِّه ويملؤهُ شوقاً ويهزُّه للتوجُّهِ إلى الموصوف.

فـ ﴿إِيَّاكَ﴾ أي يا مَن هو موصوفٌ بهذه الصفات.

---

(١) التنبل والتنبال: البليد الكسلان. ج تنابلة. والمقصود مذهب الجبرية.

(٢) الإلتفات: هو العدولُ عن الغيبة إلى الخطاب أو التكلم، أو العكس. (التعريفات).

ئەوی تریان:

لـە ڕێڕەوی ڕەوانبێژیـدا، ئاراستەکردنی گوفتـار بۆ بەرامبـەر ئاماژەیـە بۆ پێویستیی ڕەچاوکردنی واتاکـان، تـاکو "خوێنـدراو" بـە وێنـەی "نـازڵکراو"ی لـێ بێـت. ئیـتر بـە سروشت و چێژ بەرەو گوفتار کردن لەگەڵ بەرامبەردا کێش دەبێت. کەواتە ﴿إِيَّـــاكَ﴾ بەجێهێنانی فەرمانی: (اعبدْ ربَّكَ كأنَّكَ تراهُ)[1] لەخۆ دەگرێت!

ئاخاوتنیش بە "کۆ" لە ﴿نَعْبُدُ﴾دا لە سێ ڕووەوەیە..

واتە ئێمەی "ئەندام و گەردیلەکانی ئەم جیهانە بچووکە" - کـە بریتیـیە لـە مـن - بـە "شوکرانەی عورفی" تۆ دەپەرستین، کە بریتییە لـە: "گوێڕایـەڵیی هـەموو شتێك بۆ ئـەو فەرمانەی کە پێی دراوە"..

هەروەها ئێمەی "یەکتاپەرستان" بە گوێڕایەڵیی شەریعەتەکەت دەتپەرستین..

هەروەها ئێمەی "بوونەوەران"یش بە ملکەچ بوونمان بۆ شەریعەتە فیترییە مەزنەکەت دەتپەرستین و، سوجدەی سەرسامی و خۆشەویستی لـە ژێر عەرشـی مـەزنی و توانستی تۆدا دەبەین[2].

هۆی هۆنینیشی لێرەدا ئەوەیە کە: ﴿نَعْبُدُ﴾ ڕاڤە و ڕوونکردنەوەی ﴿الحَمْـــــدُ﴾ە و، ئەنجام و لازمی ﴿مالكِ يومِ الدين﴾یشە.

بیشـزانە کـە: پێشخستنی ﴿إِيَّـــاكَ﴾ لەبـەر "ئیخـلاس"ە، کـە گیـانی خواپەرستییە. بەکارهێنانی "کاف"یش بۆ گوفتار لەگەڵ بەرامبەردا، هێمایـەکی بۆ هۆکـاری پەرستن تێدایە، چونکە کەسێك ئەو سیفەتانەی تێدا بێت کە هۆکاری ئەوە بن گوفتاری ئاراستە بکرێت، شایستەی پەرستنە.

ئەم ﴿إِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ەش وەکو ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ وایە؛ بە گوێرەی هەرسێ کۆمەڵەکەیە..

واتە: ئێمەی ئەندامەکان و، کۆمەڵی یەکتاپەرستان و، دەستەی بوونەوەران، تەنها لە تـۆ داوای سـەرکەوتن و یارمـەتی دەکـەین بـۆ سـەرجەم پێویسـتی و ئامانجـەکان کـە گرنگترینیان "پەرستن"ی تۆیە.

---

(١) ئەسڵی فەرموودەکە بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتـەوە، کـە لـە پێناسـەی "الإحسـان"دا فەرموویـەتی: (أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تراهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَراهُ فَإِنَّهُ يراكَ).

(٢) لە سەرنجی شەشەمی بەشی یەکەمی مەکتووبی بیست و نۆهەمدا درێژە بەم سێ ڕووە دراوە.

والأخرى:

أنَّ الخطابَ يشيرُ إلى وجوب ملاحظة المعاني في مذهب البلاغة ليكونَ المقروءُ كالمُنْزَل، فينجرُّ طبعاً وذوقاً إلى الخطاب. فـ﴿إيَّاكَ﴾ يتضمنُ الامتثالَ بـ"أُعْبُدْ رَبَّكَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ"(١).

والتكلمُ مع الغير في ﴿نَعْبُدُ﴾ لوجوهٍ ثلاثة(٢):

أي نعبدُ نحن معاشرَ أعضاءِ وذرّاتِ هذا العالَمِ الصغير - وهو أنا - بالشكر العُرفي الذي هو إطاعةُ كلٍّ لما أُمر به.. ونحن معاشرَ الموحّدين نعبدُك بإطاعة شريعتك.. ونحن معاشرَ الكائنات نعبدُ شريعتَك الكبرى الفطرية(٣) ونسجدُ بالحَيْرَة والمحبة تحتَ عرش عظمتك وقدرتك.

وجهُ النظم أنَّ ﴿نَعْبُدُ﴾ بيانٌ وتفسير لـ﴿الحَمْدُ﴾ ونتيجةٌ ولازمٌ لـ﴿مالِكِ يوم الدِّين﴾.

واعلم أنَّ تقديم ﴿إيَّاكَ﴾ للإخلاص الذي هو روحُ العبادة. وأنَّ في خطاب الكاف رمزاً إلى علّة العبادة؛ لأنَّ مَن اتصفَ بتلك الأوصافِ الداعيةِ إلى الخطاب استحقَّ العبادةَ.

و﴿إيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ هذه كـ﴿إيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ باعتبار الجماعات الثلاث:

أي نحن معاشرَ الأعضاء ومعاشرَ الموحِّدين ومعاشرَ الكائنات نطلبُ منك التوفيقَ والإعانةَ على كل الحاجاتِ والمقاصد التي أهمُّها عبادتُك.

---

(١) أصل الحديث رواه البخارى ومسلم، وفيه: "ما الإحسان؟ قال: أن تعبد الله كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه يراك" (متفق عليه) ورواية الطبراني: "أُعبد الله كأنك تراه". وهو حديث صحيح (صحيح الجامع الصغير ١٠٤٩).

(٢) تفصيل هذه الوجوه في النكتة السادسة من القسم الأول من المكتوب التاسع والعشرين.

(٣) أي: ننقاد ونخضع ونطيعُ.

﴿إِيَّاكَ﴾ەشی دووپات كردەوە بە مەبەستی پتر كردنی چێژی گوفتاری ئامادە و رووبەڕوو.. هەروەها لەبەر ئەوەی كە مەقامی "بینین" بەرز و مەزنترە لە مەقامی "بەڵگە".. هەروەها لەبەر ئەوەی كە ئامادەبوون زیاتر هۆكارە بۆ "ڕاستی" و "درۆ نەكردن".. هەروەها لەبەر سەربەخۆیی هەریەك لەو دوو مەبەستەیە.

هەروەها بزانە كە: هۆنینی ﴿نَسْتَعِينُ﴾ لەگەڵ ﴿نَعْبُدُ﴾دا وەكو هۆنینی "كرێ" وایە لەگەڵ "خزمەت"دا. چونكە "پەرستن" مافی خوای گەورەیە بەسەر بەندەوە، "یارمەتیدان"یش چاكەی خوایە بۆ بەندەكەی.

"تایبەتكردن"یش بە ﴿إِيَّاكَ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە تەنها بەم پەیوەندییە پیرۆزە - كە پەرستن و خزمەتكردنە بۆ خوای گەورە - بەندە لە خۆ زەلیل كردنی بۆ هۆكارەكان بەرز دەبێتەوە، تەنانەت هۆكارەكان دەبنە خزمەتكاری ئەو بەندەیە و، ئەویش تەنها "یەكێك" دەناسێت. ئیتر وەك پێشتر وترا، فەرمانی بازنەی باوەڕ و ویژدان دەردەكەوێت. ئەو كەسەش كە خزمەتگوزاری ڕاستەقینەی خوا نەبێت، دەبێتە خزمەتكاری ڕسوای هۆكارەكان..

بەڵام دەبێ بەندە لە "بازنەی هۆكارەكان"دا بە تەواوەتی ئەو هۆكارانە پشتگوێ نەخات، تاكو نەبێتە كەسێكی هەڵگەڕاوەی سەرپێچیكار بەرامبەر ئەو ڕێسایەی كە بە دانست و ویستی خوا لەو بازنەیەدا دانراوە، چونكە وەك پێشتر وترا بەكارهێنانی تەوەكول لەو بازنەیەدا دەستبەتاڵیی لێ دەكەوێتەوە.

هەروەها هۆنینی ئەو دوانە لەگەڵ یەكتریدا، وەك هۆنینی "پێشەكی" وایە لەگەڵ "ئامانج"دا، چونكە یارمەتی و پشتگیری پێشەكین بۆ خواپەرستی.

﴿اِهْدِنَا﴾.

هۆی هۆنینی ئەوەیە كە:

ئەمە وەڵامی بەندەیە بۆ پرسیاری خوای گەورە. وەك بڵێی لێی دەپرسێت: كام لە ئامانجەكانت زیاتر پەیوەستن بە دڵتەوە؟ بەندەش دەڵێت: ﴿اِهْدِنَا﴾.

بزانە كە: ﴿اِهْدِنَا﴾ بە هۆی پلە زۆریی واتاكانی، لەسەر بناغەی جۆراوجۆریی مەفعوولەكانی (لە هیدایەتدراوان و، هیدایەتخوازان و، هیدایەتویستانی زیاتر و، جگە لەوانیش) دەڵێی لە هەر چوار چاوگەكەی كرداری "هیدایەت"ەوە دارێژراوە..

كرّرَ ﴿إِيَّاكَ﴾ لتزييدِ لذةِ الخطاب والحضور.. ولأنَّ مقامَ العيان أعلى وأجلُّ من مقامِ البرهان.. ولأنَّ الحضورَ أدعَى إلى الصدق وبأنْ لا يكذِبَ.. ولاستقلالِ كلٍّ من المقصدين.

واعلم أنَّ نظمَ ﴿نَسْتَعِينُ﴾ مع ﴿نَعْبُدُ﴾ كنظم الأجرة مع الخدمة؛ لأنَّ العبادةَ حقُّ الله على العبد، والإعانةَ إحسانُه تعالى لعبده.

وفي حصر ﴿إِيَّاكَ﴾ إشارةٌ إلى أنَّ بهذه النسبة الشريفة التي هي العبادةُ والخدمةُ له تعالى يترفَّعُ العبدُ عن التذلل للأسباب والوسائط، بل تصيرُ الوسائطُ خادمةً له وهو لا يعرفُ إلّا واحداً، فيتجلى حُكْمُ دائرةِ الاعتقاد والوجدانِ كما مرَّ.

ومَن لم يكنْ خادماً له تعالى بحقٍّ، يصيرُ خادماً للأسباب ومتذللاً للوسائط.

لكن يلزمُ على العبد وهو في دائرة الأسباب أنْ لا يهملَ الأسبابَ بالمرة، لئلا يكونَ مُتمرِّداً في مقابلة النظام المودَع بحكمته ومشيئته تعالى، لأنَّ التوكلَ في تلك الدائرةِ عَطالةٌ كما مرَّ..

وكنظم المقدِّمة مع المقصود، لأنَّ الإعانةَ والتوفيق مقدمةُ العبادة.

﴿اِهْدِنَا﴾.

وجهُ النظم: أنَّه جوابُ العبد عن سؤاله تعالى. كأنَّه يسأل: أيُّ مقاصدِكَ أعلَقُ بقلبك؟ فيقولُ العبدُ: ﴿اِهْدِنَا﴾.

واعلم أنَّ ﴿اِهْدِنَا﴾ بسبب تعدُّد مراتبِ معانيه - بناءً على تنوّع مفعولِه إلى الهادين والمُستهدين والمستزيدين وغيرهم - كأنه مشتقٌّ من المصادر الأربعة لفِعل الهداية..

كەواتە ﴿إِهْدِنَا﴾ بە پێی كۆمەڵێك واتە: "ثَبِّتْنـــا – دامـەزراومان بكـە".. بـە گوێـرەی دەستەیەكی تر واتە: "زِدْنا – هیدایەتمان بۆ زیاد بكە".. بە پێی دەستەیەكی تر واتە: "وفقنا – پشتمان بگرە".. سەبارەت بە كۆمەڵێكی دیكە واتە: "أعطنا – پێمان ببەخشە"..

هەروەها خوای گەورە بە پێی: ﴿أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُـــمَّ هَـــدَى﴾ (طـه:٥٠) بـە پێبەخشینی هەستەوەرە دیار و نادیارەكان، هیدایەتی داویـن و.. پاشـان بـە دانـانی بەڵگـە ئاسـۆیی و دەروونیـیـەكان، ڕێنمـایی كردوویـن و.. پاشـان بـە نـاردنی پێغەمبــەران و دابـەزاندنی كتێبـەكان، ڕێـی پیشـان داویـن و.. پاشـان بـە پـەردە لادانیـش لـەسـەر ڕووی "حـەق" كـە حـەق بـە حـەق و ناحـەقیش بـە ناحـەق دەركـەوتوون، گـەورەترین ڕێنمـایی پێشكەش كردووین.

اللهمَّ أرِنا الحَقَّ حقاً وارزُقْنا اتِّباعَه، وأرِنا الباطلَ باطلاً وارزُقْنا اجْتِنابَه.

﴿الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾.

بزانە كە "ڕاستەڕێ" ئەو ناوەندە هاوسەنگەیە كە پوختەی "دانست و، داوێنپـاكی و، ئازایەتی"ن، كە مامناوەندیی سێ پلەكانی هەر سێ هێزەكانن.

ڕوونكردنەوەی ئەمەش بەم جۆرەیە:

كاتێ خوای گەورە "گیان"ی لە "جەستە"ی پڕ لە ئـاڵوگۆڕ و موحتـاج و دووچـاری مەترسییەكاندا نیشتەجێ كرد، بۆ مەبەستی بەردەوامبوونی، سێ هێزی تێدا دانا:

یەكەمیان: هێزی ئارەزووی ئاژەڵانە، كە كێشكەر و هێنەری سوودەكانە.

دووهـەمیان: هـێزی توورەیـی دڕندانـە، كـە شـــتانی زیـانبەخش و وێرانكـار بـــەدەر دەنێت و دووریان دەخاتەوە.

سێهەمیان: هێزی ژیریی فریشتانە، كە سوود و زیان لە یەك جیا دەكاتەوە.

بەڵام خوای گەورە، بە پێی ئەو حیكمەتەی خۆی كە خوازیاری كامڵ بوونـی مرۆڤـە لە ڕێی پێشبڕكێ كردنەوە، هیچ كام لەو هێزانەی بە "سروشـت" لـە سنوورێكدا دیـاری نـەكردووە، وەك ئـەوەی كـە هێزەكـانی گیانـــەوەرانی تـری دەستنیشـــان كـــردووە. هەرچـەندەش بـە "شـــەریعەت" ســنووری بـۆ دانـاون، چونكـە شـەریعەت نـەهی لـە زیادەڕەوی و كورتبڕی دەكات و، فەرمان بە "ناوەندە ڕێ" دەدات. ئەمەش ﴿فَاسْـــتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ﴾ (هود: ١١٢) ئاشكرای دەكات..

فـ﴿إِهْدِنَا﴾ باعتبار معشرٍ: "ثبِّتْنا"، وبالنظر إلى جماعةٍ: "زِدْنا"، وبالقياس إلى طائفةٍ: "وفِّقْنا"، وإلى فرقة: "أعْطنا"..

وأيضاً إنَّ اللهَ تعالى بحُكم ﴿أعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾ (طه:٥٠) هدانا بإعطاء الحواس الظاهرة والباطنة، ثم هدانا بنَصب الدلائل الآفاقية والأنفُسية، ثم هدانا بإرسال الرسل وإنزال الكتب، ثم هدانا أعظمَ الهداية بكشف الحجاب عن الحقِّ فظهرَ الحقُّ حقاً والباطلُ باطلاً.

اللّهمَّ أرِنَا الْحَقَّ حَقًّا وَارْزُقْنَا اتِّبَاعَهُ وَأرِنَا الْبَاطِلَ بَاطِلاً وَارْزُقْنَا اجْتِنَابَهُ.

﴿الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾.

اعلم أنَّ الصراطَ المستقيمَ هو العدلُ الذي هو ملخّصُ الحكمة والعفّة والشجاعة اللاتي هي أوساطٌ للمراتب الثلاث للقوى الثلاث.

**توضيحُه:**

أنَّ اللهَ عزّ وجلّ لما أسكنَ الروحَ في البدن المتحوِّلِ، المحتاجِ، المعروضِ للمهالك، أودعَ لإدامتها فيه قوىً ثلاثاً:

**إحداها:** القوةُ الشهوية البهيمية الجاذبةُ للمنافع.

**وثانيتها:** القوةُ الغضبية السَبُعية الدافعةُ للمضرّات والمخرِّبات.

**وثالثتها:** القوةُ العقلية المَلَكية المميِّزةُ بين النفع والضر.

لكنه تعالى - بحكمته المُقتضيةِ لتكمُّل البشر بسرِّ المسابقة - لم يُحدِّدْ بالفطرة تلك القوى كما حدّد قوى سائرِ الحيوانات، وإنْ حدَّدَها بالشريعة؛ لأنها تنهى عن الإفراط والتفريط وتأمرُ بالوَسط، يصدع عن هذا:

﴿فاسْتَقِمْ كَما أُمِرْت﴾ (هود:١١٢).

ئنجا بە دیاری نەکردنی سنوورێکی سروشتی بۆ ئەو هێزانە، هەریەکەیان سێ پلەیان بۆ پەیدا دەبێت: پلەی ناتەواوی کە "کورتبڕی"یە، پلەی زیادبوون کە "زیادەڕەوی"یە، پلەی مامناوەند کە "دادگەری"یە..

جا کورتبڕیی هێزی ژیری: "کەودەنی" و "دەبەنگی"یە و، زیادەڕەویشی بریتی‌یە لە: "جەربەزەیی" خەڵەتێنەر و[1] "وردبوونەوە لە شتە نزمەکان". ناوەندەکەشی بریتی‌یە لە: "دانایی"(الحکمة) ﴿وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثِيراً﴾ (البقرة: ٢٦٩).

ئنجا بزانە! هەروەك قەدی ئەم هێزەی "ژیری" ئەو سێ جۆرە پلە ناوبراوانەی لێ بووەوە، هەریەك لە لقەکانیشی ئەم سێ جۆرە پلەیان لێ دەبێتەوە. بۆ نموونە: لە مەسەلەی بەدیهێنانی کردەوەکاندا "ڕێڕەوی ئەهلی سوننەت" ناوەندە لە نێوان ڕێڕەوی جەبر و ئیعتیزالدا[2]، لە بیروباوەڕیشدا "ڕێڕەوی تەوحید" ناوەندە لە نێوان تەعتیل (لەکارخستنی سیفەت و ناوەکانی خوای گەورە) و تەشبیهدا (چواندنی سیفەت و ناوەکانی خوای گەورە بە هی بەندەکان)..

ئیتر بەم جۆرە قیاسی لقەکانی تر لەسەر ئەمانە دەکرێت.

کورتبڕیی هێزی ئارەزوو: "کپ بوون" و حەزنەکردنە لە هیچ شتێك. زیادەڕەویشی: "لە ڕێ لادان"ە، بەوەی هەر شتێك بێتە ڕێی حەزی پێ بکات، حەڵاڵ بێت یان حەرام. ناوەندەکەشی بریتی‌یە لە: "داوێنپاکی" بەوەی کە حەڵاڵی بوێت و لە حەرامیش هەڵبێت. ئیتر بۆ خۆت لەسەر ئەم قەد و بناغەیە قیاسی سەرجەم لقەکانیشی بکە لە: "خواردن و، خواردنەوە و، پۆشین" و هاوشێوەیان.

کورتبڕیی هێزی تووڕەییش: "ترسنۆکی"یە. واتە ترسان و وەهم کردنە لە شتێك کە مایەی لێ ترسان نەبێت. زیادەڕەوی‌یەکەشی بریتی‌یە لەو: "هەڵەشەیی"یەی کە باوکی ئیستیبداد و ستەم و خۆسەپاندنە. ناوەندەکەشی: "ئازایەتی"یە، واتە بەخشینی گیانە بە

---

(١) وشەی "جەربەزەیی" (لێرەدا) کۆمەڵە واتایەکی لێك نزیك لەخۆ دەگرێت، وەك: فرتوفێڵ لە قسەدا بۆ هەڵخەڵەتاندنی بەرامبەر.. شاردنەوەی ڕاستی‌یەکان بە وشەی هەق و ناهەق.. چاوقایمی لە قسەدا بۆ زاڵبوون بەسەر قسەی تردا.. هاروهاجی.. جرپنی.. لاساری. (وەرگێڕ)

(٢) ڕێچکەی "جەبری‌یەکان" زیادەڕەوی‌یە، چونکە مرۆڤ لە کردار بێ بەش دەکات. هی "موعتەزیلە"ش کورتبڕی‌یە، چونکە کاریگەری بە مرۆڤ دەبەخشێت. بەڵام ڕێبازی "ئەهلی سوننەت" ناوەندە، چونکە سەرەتای ئەو کردارانە بە ویستی جوزئیی مرۆڤ و، کۆتاییەکانیشیان بە ویستی هەمەکیی خواوەند، دەسپێرێت. (ت)

وبعدمِ التحديدِ الفطري تحصلُ مراتبُ ثلاثٌ:

مرتبةُ النقصانِ وهي التفريطُ، والزيادةِ وهي الإفراطُ، والوسطِ وهي العدلُ.

فتفريطُ القوةِ العقلية الغباوةُ والبلادة، وإفراطُها الجربزةُ[1] الخادعة والتدقيقُ في سفاسف الأمور، ووسطُها الحكمة، ﴿وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثِيراً﴾ (البقرة: ٢٦٩).

اعلم أنّه كما تنوعَ أصلُ هذه القوة إلى تلك المراتب، كذلك كلُّ فرع من فروعها يتنوعُ إلى هذه الثلاث؛ مثلاً:

في مسألة خَلق الأفعال: مذهبُ أهل السنة وسطُ الجبر والاعتزال[2]، وفي الاعتقاد: مذهبُ التوحيد وسطُ التعطيل والتشبيه..

وعلى هذه القياسُ.

وتفريطُ القوة الشهَوية الخمودُ وعدمُ الاشتياق إلى شيء، وإفراطُها الفجورُ بأنْ يشتهيَ ما صادفَ، حَلَّ أو حَرُمَ.. ووسطُها العفةُ بأنْ يرغبَ في الحلال ويهربَ عن الحرام..

وقسْ على الأصل كلَّ فرعٍ من فروعاته من الأكل والشرب واللبس وأمثالِها.

وتفريطُ القوة الغضبية الجبانةُ أي الخوفُ مما لا يُخافُ منه والتوهمُ، وإفراطُها التهوّرُ الذي هو والدُ الاستبداد والتحكُّمِ والظلم.. ووسطُها الشجاعةُ أي بذلُ الروح بعشقٍ وشوقٍ لحماية ناموس[3] الإسلامية وإعلاءِ كلمةِ التوحيد. وقس عليها فروعَها..

---

(١) الجُرْبُزُ، بالضم: الخَبُّ الخبيثُ، معرّبُ كُرْبُزْ. والمصدرُ: الجربزةُ. (القاموس المحيط).

(٢) الجبرية: إفراطٌ، حيث يحرم الإنسانَ من العمل. والمعتزلة تفريط، حيث يمنح التأثير للإنسان. أما أهل السنة فهو الوسط، حيث يمنح بداية تلك الأفعال إلى الإرادة الجزئية، ونهاياتها إلى الإرادة الكلية. (ت)

(٣) الناموس: ما يحميه الرجل من اسمه وصيته وشرفه. وفي "التعريفات": هو الشرع الذي شرعه الله.

عەشق و شەوقەوە بۆ پاراستنی شەرەفی ئیسلامەتی و بەرزکردنەوەی وشەی تەوحید. ئیتر بۆ خۆت لقەکانی لەسەر قیاس بکە.

هەر شەش کەنارەکان "ستەم"ن و، سێ ناوەندەکەش بریتین لەو "دادگەری"یەی کە ڕاستەڕێیە. واتە کارکردنە بە فەرمانی: ﴿فاسْتَقِمْ كَما أُمِرْتَ﴾. جا هەر کەسێك بەسەر ئەم ڕێیەدا تێپەڕ ببێت، بەسەر ئەو پردەشدا تێدەپەڕێت کە لەسەر دۆزەخ دانراوە!

﴿صراطَ الَّذِينَ أنْعَمْتَ عَلَيْهِم﴾.

بزانە کە: مرواریەکانی قورئان تەنها بە یەك دانە ڕشتە نەهۆنراونەتەوە، بەڵکو هۆنینی زۆرێك لەو مرواریانە چەند نەخش و نیگارێکن کە لە چنینی چەند هێڵێکی پەیوەندیەوە دروست دەبن، کە بە پێی "نزیکی و دووری" ، "دیار و پەنهان" لە یەکتر جیا دەبنەوە. چونکە بناغەی ئیعجاز – لە دوای ئیجاز – بریتیە لەم نەخشە.

بۆ نموونە: ﴿صراطَ الَّذِينَ أنْعَمْتَ عَلَيْهِم﴾ پەیوەندیی هەیە لەگەڵ:

﴿الحمدُ للهِ﴾دا چونکە "نیعمەت" نیشانەی[1] حەمد و سوپاسە..

هەروەها ﴿ربِّ العَالَمِين﴾ چونکە "کەمالی پەروەردە" بەوە دەبێت کە نیعمەتەکان یەك لە دوای یەکتر بە مرۆڤ ببەخشرێن..

هەروەها ﴿الرَّحْمن الرَّحِيم﴾ چونکە ئەوانەی کە نیعمەتیان پێ بەخشراوە – مەبەستم پێغەمبەران و شەهیدان و پیاوچاکانە – "میهرەبانی"ن بۆ هەموو جیهانەکان و، خۆیشیان نموونەیەکی ئاشکران بۆ "میهرەبانی".

هەروەها ﴿مالِكِ يَومِ الدِّين﴾ چونکە "ئایین" نیعمەتێکی کامڵ و تەواوە..

هەروەها ﴿نعبُدُ﴾ چونکە هەر ئەوان پێشەوان لە خواپەرستیدا..

هەروەها ﴿نَستَعِينُ﴾ چونکە ئەوان پشتگیری کراون و یارمەتی دراون..

هەروەها ﴿إهْدِنَا﴾ چونکە هەر ئەوان پێشەنگن، بە پێی نهێنیی:

﴿فَبِهُداهُمُ اقْتَدِهْ﴾ (الأنعام: ٩٠).

هەروەها ﴿الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ش، لەبەر ئەوەی "ڕاستەڕێ" تەنها لە ڕێبازی ئەواندا دەرکەوتووە.

ئەمە نموونەیەکە بۆ تۆ، فەرموو قیاسی لەسەر بکە.

---

(١) ئەوەش هەڵدەگرێ کە لە بریی "نیشانەی" بوترێ: "هاوتای". (وەرگێڕ)

فالأطرافُ الستة ظلمٌ والأوساطُ الثلاثة هي العدلُ الذي هو الصراطُ المستقيم، أي العملُ بـ﴿فاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ﴾ (هود: ١١٢). ومَن مرَّ على هذا الصراط يمرّ على الصراط الممتدِّ على النار.

﴿صراطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِم﴾.

اعلم أنَّ نظمَ دُرَرِ القرآن ليس بخيط واحدٍ، بل النظمُ - في كثيرٍ - نقوشٌ تحصُلُ من نسج خطوطِ نِسَبٍ متفاوتةٍ قُرباً وبُعداً، ظهوراً وخفاءً. لأنَّ أساسَ الإعجاز بعدَ الإيجاز هذا النقشُ. مثلاً:

﴿صراطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِم﴾ يناسبُ ﴿الحمدُ لله﴾ لأنَّ النعمةَ قرينةُ الحمد..

و﴿رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ لأنَّ كمالَ التربية بترادف النِعَم..

و﴿الرَّحْـمنِ الرَّحِيمِ﴾ لأن المُنعَم عليهم - أعني الأنبياء والشهداء والصالحين- رحمةٌ للعالمين ومثالٌ ظاهر للرحمة..

و﴿مالِكِ يَومِ الدِّين﴾ لأنَّ الدينَ هو النعمةُ الكاملة..

و﴿نعبُدُ﴾ لأنَّهم الأئمة[1]..

و﴿نَسْتَعِينُ﴾ لأنَّهم الموفَّقون..

و﴿إهْدِنَا﴾ لأنَّهم الأُسوةُ بسرِّ ﴿فَبِهُداهُمُ اقْتَدِهْ﴾ (الأنعام:٩٠)..

و﴿الصِّرَاطَ المُسْتَقيمَ﴾ لظهور انحصارِ الطريق المستقيم في مسلكهم.

هذا مثالٌ لك فقِسْ عليه.

---

(١) لأنهم الأئمة في العبادة. (ت)

لە وشەی ﴿الصِّرَاطَ﴾یشدا ئاماژەیەك هەیە بۆ ئـەوەی کـە ڕێگاکـەیان گیراوەتەبـەر و کەنارەکانی دیارن؛ هەرکەسێك پیایدا بڕوات لێی لا نادات.

لە وشەی ﴿الذينَ﴾شدا – لەسەر بناغەی ئەوەی ئیسمی مەوصوولە و، مەوصوولیش شتێکی زانراوە و لـە بەرچاوی گـوێ بیستدایە – ئاماژەیەك هەیە بـۆ بڵندیـی شـان و شکۆیان و، درەوشانەوەیان لەناو تاریکستانی مرۆڤایەتیدا. وەك بڵێی ئەوانە ئاشکران و، لە پێش چاوی هەموو گوێ بیستێکدان تەنانەت گەر بە دوایشیاندا نەگەڕێت..

هێنانی ئەم وشەیەش بـە شـێوەی "کـۆ" هێمایـە بـۆ ئـەوەی کـە دەگونجـێ شـوێن پێیـان هەڵبگیرێت. هەروەك هێمایە بۆ ڕاسـت بوونـی ڕێبازەکەشیان، بـە پێـی نـهێنیی تـەواتور، چونکە (دەستی خوا لەگەڵ کۆمەڵدایە).

لـە داڕشتنی وشـەی ﴿أنْعَمْـــتَ﴾دا[1] ئاماژەیـەك دراوە بـە هۆکـاری داواکردنـی نیعمەت[2].. دانەپاڵیشی بۆ نیعمـەت بـەخش، بووەتـە تکاکـاری داواکـە و، وەکـو ئـەوە وایە کە بڵێت: خوایە گیان! نیعمەت بەخشـین هـی شـان و شـکۆی تۆیـە و، بـە چاکـەی خۆیشت بەخشیوتە، دەسا هەرچەندەش شایانی نەبم تۆ هەر نیعمەتی خۆتم پێ ببەخشە.

﴿عَلَيْهِم﴾یش ئاماژەی تێدایە بۆ قورسیی کۆڵی پێغەمبەرێتی و هەڵگرتنی ئەو ئەرکە. هەروەك هێمایە بۆ ئەوەی کە ئەوان بە وێنەی چیـا بـەرزەکانن کـە سـەختیی بـاران لـەخۆ دەگرن لەبەر بەخشینی بە بیابانەکان!

ئەوەش کە لە: ﴿الَّذِينَ أنْعَمْتَ عَلَيْهِم﴾دا بە کورتی هێنراوە، لە ئایەتی: ﴿فأولئكَ مَعَ الَّذينَ أنْعَمَ اللهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَداءِ وَالصَّالحِينَ﴾دا (النســاء: ٦٩) ڕوون کراوەتەوە، چونکە هەندێکی قورئان ڕاڤەی هەندێکی دیکەی دەکات.

* ئەگەر دەڵێیت:

ڕێبازی پێغەمبەران جیا جیایە و، شێوەی خواپەرستیشیان جۆراوجۆرە؟

پێت دەوترێ:

شوێنکەوتنیان لە "بناغەکانی باوەڕ و بڕیارەکان"دایـە، چونکـە ئـەو بناغانـە جێگـیر و بەردەوامن. نەك لە لقەکاندا کە بە گۆڕانی ڕۆژگار ئەوانیش ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت. جا هەروەك چوار وەرزەکـان و پلـەکانی تەمـەنی مـرۆڤ کاریگـەرییان لـە جیـاوازیی

(١) واتە لە شێوەی فیعلی مازیدا. (وەرگێڕ)

(٢) کە ئاشکراکردنی عادەتی نیعمەت بەخشە. (وەرگێڕ)

وفي لفظ ﴿الصِّرَاطَ﴾ إشارةٌ إلى أنَّ طريقَهم مسلوكةٌ محدودةُ الأطراف، مَن سلكَها لا يخرجُ عنها.

وفي لفظ ﴿الذينَ﴾ - بناءً على أنّه موصولٌ، ومِن شأنِ الموصول أنْ يكونَ معهوداً نُصْبَ العين للسامع- إشارةٌ إلى علوِّ شأنهم وتلألُئِهم في ظلمات البشر، كأنَّهم معهودون نُصبَ العين لكلِّ سامع وإنْ لم يتحرَّ ولم يطلبْ.. وفي جمعيتِه رمزٌ إلى إمكان الاقتداء بهم وحقّانية مسلكِهم بسرِّ التواتر، إذ "يَدُ الله مَعَ الجَماعَةِ"[1]..

وفي صيغة ﴿أَنْعَمْتَ﴾ إشارةٌ إلى وسيلةِ طلبِ النعمة.. وفي نسبتها شافعٌ له كأنه يقول: يا إلهي! مِن شأنك الإنعامُ وقد أنعمْتَ بفضلك، فأنْعِمْ عليّ وإنْ لم أستحقْ..

وفي ﴿عَلَيْهِم﴾ إشارةٌ إلى شدةِ أعباءِ الرسالة وحَملِ التكليف، وإيماءٌ إلى أنَّهم كالجبال العاليةِ تتلقّى شدائدَ المطر لإفاضة الصحارى.

وما أُجمِلَ في ﴿الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِم﴾ يفسرُه ﴿فأولئكَ مَعَ الَّذينَ أَنْعَمَ اللهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَداءِ وَالصَّالحينَ﴾ (النساء: ٦٩) إذ القرآنُ يفسِّرُ بعضُه بعضاً.

* إنْ قلتَ:

مسالكُ الأنبياء متفاوتةٌ وعباداتُهم مختلفة؟

قيل لك:

إنَّ التبعيةَ في أصول العقائد والأحكام؛ لأنَّها مستمرةٌ ثابتة دون الفروعات التي من شأنها التغيرُ بتبدلِ الزمان. فكما أنَّ الفصولَ الأربعة ومراتبَ عمر الإنســان تؤثِّرُ في تفاوت

---

(١) رواه الطبراني والترمذي وحسّنه بلفظ: "يد الله على الجماعة" (كشف الخفاء ٢/ ٣٩١) وصححه محقق الجامع الصغير (٧٩٢١) وعزاه للحاكم والبيهقي في الأسماء عن ابن عمر رضي الله عنهما وابن عاصم عن أسامة بن شريك.

دەرمانەکان و لەبەرکردنی پۆشاکدا هەیە، ئەوەتا زۆر دەرمان هەیە لەکاتی تردا دەبێتە هۆی نەخۆشی.. بە هەمان شێوە، پلەکانی تەمەنی ڕەگەزی مرۆڤیش کار دەکەنە سەر جیاوازیی لقەکانی ئەو بڕیارانە، کە دەرمانی گیانەکان و خۆراکی دڵەکانن.

﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ﴾.

هۆی هۆنینی:

بزانە کە ئەم مەقامە لەبەر ئەوەی مەقامی "ترس" و دەستبەردار بوونە لە شتە زیانبەخشەکان، تەواو گونجاوە لەگەڵ مەقامەکانی پێشوودا. ئەوەتا بە ڕوانینی سەرسامی دەڕوانێتە مەقامی وەسف کردنی پەروەردگاریتی بە "شکۆمەندی و جوانی" و.. بە ڕوانینی هانا بردن دەڕوانێتە مەقامی بەندایەتی لە ﴿نعبُدُ﴾دا و.. بە سەیرکردنی دەستەوسانی دەڕوانێتە مەقامی تەوەکول لە ﴿نَسْتَعِينُ﴾دا و.. بە ڕوانینی خۆ دڵدانەوەش سەیری هاوڕێ هەمیشەییەکەی دەکات کە مەقامی "ئومێد" و خۆڕازاندنەوەیە بە شتە سوودبەخشەکان. چونکە یەکەم شتێ لە دڵی کەسێکدا سەر هەڵدەدات کە دیاردەیەکی مەزن دەبینێت، هەستی سەرسامییە، پاشان ئارەزووی هەڵهاتنە، پاشان تەوەکولە لە دەمی دەستەوسانیدا، پاشان خۆ دڵدانەوەیە.

* ئەگەر وتت:

خۆ خوای گەورە دانا و بێ نیازە، ئیتر چ دانستێك لە بەدیهێنانی "شەڕ" و "ناشیرینی" و "گومڕایی"دا هەیە لەم جیهانەدا؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێ:

بزانە کە "کەماڵ و خێر و جوانی" شتانی گشتی و جێی مەبەستی ڕاستەوخۆن لە بوونەوەراندا. "شەڕ و ناشیرینی و ناتەواوی"ش سەبارەت بەوان جوزئی و، کەم و، شوێنکەوتە و، داپۆشراون لەناو بەدیهاتوواندا. بەدیهێنەریش کە بە پەرش و بڵاوی لە نێوان "جوانی و کەماڵ"دا بەدیی هێناون، لەبەر خودی خۆیان نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ببن بە پێشەکی و یەکەی پێوانەی دەرکەوتنی - تەنانەت هاتنە بوونی - ڕاستییە ڕێژەییەکانی "خێر و کەماڵ".

* ئەگەر دەڵێیت: کەواتە بەهای ڕاستییە ڕێژەییەکان چییە کە لە پێناویاندا شەڕی جوزئی بە "جوان" دانراوە؟

الأدويةِ والتلبُّسِ، فكم مِن دواءٍ في وقت يكونُ داءً في آخَر؛ كذلك مراتبُ عمرِ نوعِ البشرِ تؤثِّرُ في اختلاف فروعات الأحكامِ التي هي دواءُ الأرواح وغذاءُ القلوب.

﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِم﴾.

وجهُ النظم:

اعلم أنَّ هذا المقامَ لكونه مقامَ الخوف والتخلية يناسبُ المقامات السابقة؛ فيَنظُرُ بنَظرِ الحيرة والدهشة إلى مقام توصيف الربوبية بالجلال والجمال، وبنَظر الالتجاء إلى مقام العبودية في ﴿نعبُدُ﴾، وبنظر العَجز إلى مقام التوكل في ﴿نَسْتَعِينُ﴾، وبنظر التسلّي إلى رفيقه الدائمي أعني مقامَ الرجاء والتحلية، إذ أوّلُ ما يتولدُ في قلب مَن يرى أمراً هائلاً حِسُّ الحَيرةِ، ثم ميلُ الفرار، ثم التوكّلُ عند العجز، ثم التسلّي بعد ذلك الأمر.

* إنْ قلتَ:

إنَّ اللهَ عزّ وجلّ حكيمٌ غنيٌّ، فما الحكمةُ في خلق الشرّ والقبح والضلالة في العالم؟

قيل لك:

اعلم أنَّ الكمالَ والخير والحُسن في الكائنات هي المقصودةُ بالذات وهي الكليات؛ وأنَّ الشرَّ والقبح والنقصان جزئياتٌ بالنسبة إليها قليلةٌ تبَعيةٌ مغمورة في الخلقة، خلَقَها خالقُها منتشرةً بين الحسن والكمال، لا لذاتها، بل لتكونَ مقدمةً، وواحداً قياسياً، لظهور - بل لوجودِ - الحقائقِ النسبيةِ للخير والكمال.

* إنْ قلتَ:

فما قيمةُ الحقائق النسبية حتى استُحسِنَ لأجلها الشرُّ الجزئيُّ؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێ:

"ڕاستی‌یە ڕێژەییەکان" بریتین لە پەیوەندیدەری نێوان بوونەوەران و.. ئەو هێڵانەن کە ڕێسای بوونەوەرانیان لێ چنراوە و.. ئەو تیشکانەن کە (ڕووناکیی) یەك دانە "بوون"یان داوەتەوە بۆ هەموو جۆرەکانی بوونەوەران.

هەروەها ڕاستی‌یە ڕێژەییەکان ژمارەیان بە هەزاران زیاترە لە ڕاستی‌یە ڕاستەقینەکان، چونکە ئەگەر سیفەتە ڕاستەقینەکانی هەر زاتێك حەوت دانە بن، ئەوا ڕاستی‌یە ڕێژەییەکان حەوت سەد دەبن.

کەواتە لە پێناوی خێری زۆردا چاوپۆشی لە شەڕی کەم دەکرێت، تەنانەت بە جوانیش دادەنرێت، چونکە دەستبەردار بوون لە خێری زۆر - لەبەر ئەوەی شەڕێکی کەمی لەخۆ گرتبێت - لە ڕاستیدا شەڕێکی زۆرە.

ئنجا بە پێی ڕوانینی "دانایی" هەرکات شەڕێکی کەم بەرامبەرەکەی شەڕێکی زۆر بوو، ئەوا شەڕە کەمەکە بەهۆی غەیری خۆیەوە بە "جوان" دادەنرێت، وەك لە زانستی ئوسووڵ لە باسی زەکات و جیهاددا بڕیاری لەسەر دراوە.

ئەو وتە بەناوبانگەش کە دەڵێت: "شتەکان بە دژەکانیان دەناسرێن" واتاکەی ئەوەیە کە: بوونی "دژ" هۆکارە بۆ دەرکەوتن و بوونی ڕاستی‌یە ڕێژەییەکانی ئەو شتە. بۆ نموونە: ئەگەر "ناشیرینی" نەبوایە و نەکەوتایەتە نێوان "جوانی"یەوە، هەرگیز بوونی جوانی - بە سەرجەم پلە ناکۆتاکانیەوە - پێش چاو نەدەکەوت.

* ئەگەر وتت:

هۆی جیاوازیی بەکارهێنانی ئەم سێ وشەیە بە (فیعل و، ئیسمی مەفعوول و، ئیسمی فاعیل) چی‌یە لە: ﴿أَنْعَمْتَ﴾ و ﴿الْمَغْضُوبِ﴾ و ﴿الضَّالِّينَ﴾دا؟

هەروەها هۆی جیاوازی چی‌یە لە باسکردنی "سیفەت"ی دەستەی سێ‌هەم و، "ئەنجامی سیفەت"ی دەستەی دووهەم و، "ناونیشانی سیفەت"ی دەستەی یەکەم بە گوێرەی ئاکامیان؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێ:

ناونیشانی "نیعمەت"ی هەڵبژارد، چونکە نیعمەت چێژێکە دەروون مەیلی بەلایدایە و.. بە فیعلی "ماضی"(ڕابوردوو)ش دەری بڕی تاکو ئاماژە بێت بۆ ئەوەی کە بەخشندەی ڕەها شان و شکۆی وایە هەر شتێکی بەخشی وەری ناگرێتەوە..

قيل لك:

إنَّ الحقائقَ النسبيةَ هي الروابطُ بين الكائنات.. وهي الخطوطُ المنسوجُ منها نظامُها.. وهي الأشعةُ المنعكِسُ منها وجودٌ واحدٌ لأنواعها. وإنَّ الحقائقَ النسبية أزْيَدُ بألوفٍ من الحقائق الحقيقية؛ إذ الصفاتُ الحقيقية لذاتٍ لو كانت سبعةً كانت الحقائقُ النسبية سبعمائة. فالشرُّ القليل يُغْتَفَر بل يُسْتَحْسَن لأجل الخير الكثير؛ لأنَّ في ترك الخير الكثيرِ - لأنَّ فيه شراً قليلاً - شراً كثيراً.

وفي نظر الحكمة: "إذا قابلَ الشرُّ القليلُ شراً كثيراً صار الشرُّ القليل حسناً بالغير"، كما تقرر في الأصول في الزكاة والجهاد.

وما اشتهرَ مِن "أنَّ الأشياءَ إنما تُعْرَف بأضدادها" معناه: أنَّ وجودَ الضدِّ سببٌ لظهور ووجود الحقائق النسبية للشيء.. مثلاً: لو لم يوجَدُ القبحُ ولم يتخلَّلْ بين الحُسن، لَمَا تَظَاهَرَ وجودُ الحُسن بمراتبه الغيرِ المتناهيةِ.

* إنْ قلتَ:

ما وجهُ تفاوتِ هذه الكلمات الثلاث: فعلاً، واسمَ مفعولٍ، واسمَ فاعلٍ، في ﴿أَنْعَمْتَ﴾ و ﴿الْمَغْضُوبِ﴾ و ﴿الضَّالِّينَ﴾؟ وأيضاً ما وجهُ التفاوت في ذكر صفةِ الفرقة الثالثة، وعاقبةِ الصفة في الفرقة الثانية، وعنوانِ صفة الفرقة الأولى باعتبار المآل؟

قيل لك:

اختارَ عنوانَ النعمة؛ لأنَّ النعمةَ لذةٌ تميل النفسُ إليها.. وفعلاً ماضياً للإشارة إلى أنَّ الكريمَ المطلق شأنُه أنْ لا يَستَرِدَّ ما يُعطي..

هەروەها هێمایە بۆ هۆکاری ئەو شتەی داواکراوە، بە دەرخستنی دابی نیعمەت بەخش و، وەکو ئەوە وایە کە بڵێت: یەکێك لە دابەکانی شان و شکۆی تۆ نیعمەت بەخشینە، ئەوەتا بەخشیویشتە، دە فەرموو پێم ببەخشە.

بەڵام مەبەست لە ﴿غَـيْرِ الْمَغْضُـوبِ﴾ ئەوانەیە کە: بە سنوورشکاندنی "هێزی تووڕەیی" لە سنوور لایان داوە و ستەمیان کردووە، هەروەها بە وازهێنان لە فەرمانەکان لە ڕێ لایان داوە، بە وێنەی سەرپێچی و هەڵگەڕانەوەی جوولەکەکان..

جا لەبەر ئەوەی خودی "لە ڕێ لادان" و "ستەم" چێژێکی سەرەوخوون و عیززەتێکی چەپەڵیان تێدایە کە دەروون نەفرەتی لێ ناکات، ئەو ئاکامەی ئەوانی وا باس کرد کە هەموو دەروونێك دوورەپەرێزی و نەفرەتیان لێ بکات، ئەویش دابەزینی ڕق و تووڕەیی خوای گەورەیە. ئنجا بۆ ئەمەش "ئیسم"ی هەڵبژاردووە کە "بەردەوامی" دەگەیەنێت، تاکو ئاماژە بێت بۆ ئەوەی کە سەرپێچی و شەڕ کاتێ دەبێتە نیشانەی ئەوان کە بە تۆبە و لێبوردن کۆتایی پێ نەهاتبێت.

مەبەست لە ﴿ولا الضَّـالِّين﴾یش: ئەو کەسانەیە کە بە هۆی زاڵبوونی وەهم و ئارەزوویان بەسەر ژیری و ویژداندا، ڕێیان ون کردووە و، بە بیر و باوەڕی ناڕەواش، وەك سەفسەتەی دیانەکان، کەوتوونەتە ناو دووڕوویی.

قورئانی پیرۆز خودی سیفەتەکەی ئەوانی هەڵبژارد، چونکە خودی "گومڕایی" ئازارێکە "دەروون" نەفرەتی لێ دەکات و "گیان"یش خۆی لێ بە دوور دەگرێت، تەنانەت گەر ئاکامەکەشی نەبینێت.. هەروەها بە "ئیسم"یش دەری بڕی، چونکە گومڕایی کاتێ گومڕاییە کە کۆتایی پێ نەهاتبێت.

هەروەها بزانە کە: هەرچی ئازارە لە گومڕاییدا و، هەرچی تام و چێژە لە ئیماندایە!

ئەگەر دەتەوێ ئەمەت بۆ ڕوون ببێتەوە، فەرموو سەرنج لە حاڵی کەسێك بدە..

دەبینیت لەو کاتەدا کە دەستی توانست لە تاریکستانی "نەبوون" ئەو کەسەی هێنایەدەر و، هەڵیدایە ناو دنیا، کە بیابانێکی گەورە و بەرینە.. کاتێ بە داوای سۆز و بەزەییەوە چاوەکانی هەڵدێنێت، چەندین گرفت و نەخۆشی دەبینێت کە بە وێنەی دوژمن هێرش دەکەنە سەری. ئەویش بە داوای بەزەیی پێ هاتنەوەیدا دەڕوانێتە توخم و سروشتەکان، دەبینێت ئەوانە دڵڕەق و بێ بەزەیین و دانیان لێ جیڕ کردووەتەوە..

وأيضاً رمزٌ إلى وسيلة المطلوب بإظهار عادةِ المُنعم، كأنّه يقولُ: لأنَّ مِن شأنك الإنعامُ - وقد أنعَمْتَ- فأنْعِمْ عليّ.

أما ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ﴾ فالمرادُ منه الذين تجاوزوا بتجاوز القوةِ الغضبية فظلموا، وفَسقوا بترك الأحكام كتمرُّدِ اليهود.

ولما كان في نفس الفسق والظلم لذةٌ منحوسة وعزةٌ خبيثة لا تتنفَّرُ منه النفسُ، ذَكَرَ القرآنُ عاقبتَه التي تُنَفِّر كلَّ نفْسٍ وهي نُزُولُ غضبِه تعالى..

واختارَ الاسمَ الذي من شأنه الاستمرارُ، إشارةً إلى أنَّ العصيانَ والشرَّ إنما يكونان سمةً إذا لم ينقطعا بالتوبة والعفو .

أمّا ﴿ولا الضَّالِّين﴾ فالمرادُ منه الذين ضلّوا عن الطريق بسبب غلبة الوَهم والهوى على العقل والوجدان، ووقعوا في النفاق بالاعتقاد الباطل كسَفسطة النصارى.

اختار القرآنُ نفسَ صفتِهم، لأنَّ نفسَ الضلالة ألَمٌ يُنَفِّر النفسَ، ويجتنبُ منه الروحُ وإنْ لم يرَ النتيجةَ ..واسماً لأنَّ الضلالة إنما تكونُ ضلالةً إذا لم تنقطع[1].

واعلم أنَّ كلَّ الألم في الضلالة، وكلَّ اللذة في الإيمان.

فإنْ شئتَ تأمل في حال شخصٍ:

بينما أخرجَتْه يدُ القدرة من ظلمات العدم وألقَتْهُ في الدنيا - تلك الصحراءِ الهائلة - إذ يفتحُ عَينَيه مستعطفاً، فيرى البليّاتِ والعللَ كالأعداء تتهاجمُ عليه، فينظرُ مسترحِماً إلى العناصر والطبائع، فيراها غليظةَ القلب بلا رحمة قد كَشَرت عليه الأسـنانَ؛ فيرفعُ رأسَـه

---

(١) إذ إنقطاعها إشارة إلى دخولها ضمن العفو. (ت)

لـه تـاوا بۆ بەدەستهێنانی یارمـەتی، سـەری بۆ ئەستێرە و هەسـارە بڵندەكـان بـەرز دەكاتەوە، كەچی هێندە بە ترسـناك و سەرسـامی بـەخش دەیـانبینێت كـە هەڕەشـەی لـێ بكـەن، وەك بڵێـی چـەند تۆپ و تیرێكی ئـاگرین بـن كـە لـە چـەندین لوولـەی یـەكجار گەورەوە دەرچووبن و لەملاولایەوە تێپەڕ بن. ئیـتر دووچاری سەرسامی دەبێـت و، بۆ خۆشاردنەوە سەری دادەنەوێنێت و "دەروون"ی خۆی دەخوێنێتەوە..

لەو كاتەدا گوێی لە هەزاران هـاواری پێداویستی‌یەكانی و، نالـەی هەژاری‌یـەكانی خۆی دەبێـت و، بێزاری ڕووی تێ دەكـات. بۆیـە پەنا دەباتـە بـەر "ویـژدان"ی و بـۆی دەڕوانێـت، دەبینێـت ئـەو ویژدانـە هـەزاران ئـاواتی وورووژاوی هەیـە كـە تـابڵێی درێـژ بوونەتەوە و سەرانسەری دنیا تێریان ناكات.

دە توخوا پێم بڵـێ، حـاڵی ئەم كەسە دەبێ چۆن بێـت گـەر بـاوەڕی بـە سـەرەتا و، زیندووبوونەوە و، بەدیهێنەر و، حەشر نەبێت؟ ئایـا پێـت وایـە كـە "دۆزەخ" لـەو حاڵـەی ئەو دژوارتر و بۆ گیانیشی سووتێنەرتر بێت؟ چونكە ئەو لە حاڵێكدایە كـە پێكهاتەیەكە لـە تـرس و، سام و، كۆڵـەواری و، لـەرزین و، نیگـەرانی و، سـامناكی و، هـەتیوی و، نائومێدی! چونكە ئەگەر بۆلای توانای خۆی بگەڕێتەوە، دەبینێ دەستەوسان و لاوازە.. ئەگـەر ڕوو بكاتـە هێـور كردنـەوەی پێویستی‌یەكانی، دەبینێـت بێدەنـگ نـابن.. ئەگـەر هاوار و دادیشی لـێ بەرز بێتەوە، هاواری نابیسترێت و كەس بـە فریایـەوە نـاچێت. ئیـتر پێی وایە هەموو شتێك دوژمنە و لە ئەندێشەیدا بە نامۆی دادەنێت و، بە هیچ شـتێك دڵـی ناكرێتەوە و، خەمی نارەوێنێت و، تەنها بە بینینی ئەو ترس و سام و تەنیاییەی كە ویژدانـی بێزار دەكەن، دەڕوانێتە جووڵەی ئەستێرە و هەسارەكان.

ئنجا وەرە سەرنج لە حاڵی هەمان كەس بدە كـە ئەگـەر لەسـەر ڕێـی ڕاسـت بێـت و، ویژدان و گیانیشی ڕووناكی‌یان لە نـووری "ئیمـان"ەوە بەدەسـت هێنـابێت. بزانـە كاتـێ كە هەنگاو دەنێتە دنیا و چاوەكانی دەكاتەوە و هێرشی دوژمنە دەرەكی‌یـەكان دەبینێـت، چۆن "خالێكی پشـت پـێ بەسـتن" دەبینێـت كـە لـە بەرامبـەر ئـەو دوژمنانـەوە پـاڵی پێـوە دەداتەوە، ئەویش "ناسینی كردگار"ە و، لەم ڕێیەوە بۆ خۆی دەحەوێتەوە..

پاشـان كاتێ توانـا و ئاواتـە هـەتا ئەبەد خایەنـەكانی خۆی دەپشـكنێت، "خـاڵێكی یارمـەتیدان" دەبینێـت كـە ئاواتـەكانی لـەوێوە سـەرچاوە دەگـرن و، ئـاوی ژیـانی لـێ دەنۆشن، كە ئەویش "زانینی بەختەوەریی هەمیشەیی"یە..

- مستمداً - إلى الأجرام العلوية فيراها مهيبةً ومدهشة تهدِّدُه كأنَّها مَرامِيَ ناريةٌ[1] من أفواه هائلة تمرُّ حوالَيه؛ فيتحيَّرُ ويخفضُ رأسَه متستراً ويطالعُ نفسَه؛ فيسمعُ أُلوفَ صيحاتِ حاجاته وأنينِ فاقاتِه، فيتوحّشُ، فينظرُ إلى وجدانه ملتجئاً؛ فيرى فيه أُلوفاً مِن آمال متهيجةٍ ممتدةٍ لا تُشبِعُها الدنيا.

فبالله عليك، كيف حالُ هذا الشخصِ إنْ لم يعتقدْ بالمبدأ والمعاد والصانعِ والحشر؟

أتظنُّ جهنمَ أشدَّ عليه من حاله وأحرقَ لروحه؟ فإنَّ له حالةً تركّبتْ من الخوف والهيبة والعَجز والرعشة والقلق والوحشة واليُتم واليأس؛ لأنَّه إذا راجعَ قدرتَه يراها عاجزةً ضعيفة؛ وإذا توجّهَ إلى تسكين حاجاتِه يراها لا تسكتُ؛ واذا صاحَ واستغاث لا يُسْمَع ولا يُغاث. فيَظنُّ كلَّ شيء عدواً، ويتخيلُ كلَّ شيءٍ غريباً فلا يستأنسُ بشيء، ولا ينظرُ إلى دَوَران الأجرام إلّا بنظر الخوف والدهشة والتوحُّشِ المزعجة للوجدان.

ثم تأمَّلْ في حال ذلك الشخصِ إذا كان على الصراط المستقيم واستضاءَ وجدانُهُ وروحُه بنور الإيمان؛ كيف ترى أنَّه إذا وَضع قدمَه في الدنيا وفتح عينَيه فرأى تَهاجُمَ العاديات الخارجية يرى إذن "نقطةَ استنادٍ" يستندُ إليها في مقابلةِ تلك العاديات، وهي معرفةُ الصانع فيستريحُ..

ثم إذا فتَّشَ عن استعداداته وآمالِه الممتدةِ إلى الأبد، يرى "نقطةَ استمدادٍ" يستمدُ منها آمالَه وتتشربُ منها ماءَ الحياة وهي معرفةُ السعادة الأبدية.

---

(١) هكذا الأصل. ولعلها: "مرميات" أي: قنابل وقذائف.

کاتێك سەری بەرز دەکاتەوە و دەڕوانێتە بوونەوەران، دڵی بە هەموو شتێك گوشاد دەبێت و، چاوەکانیشی لە هەر گوڵێك بەرچنیی هاوڕازی و خۆ خۆشەویست کردن دەکات و، لە جووڵەی ئەستێرە وهەسارەکاندا دانستی بەدیهێنەریان دەبینێت و، هاوکات بە هاتوچۆی ئەوان ئەمیش گەشت و گوزار دەکات و، بە ڕوانینی پەند و تێفکرین بۆیان دەڕوانێت. وەك بڵێی "خۆر" بانگی دەکات و پێی دەڵێت:

"برام! لە من مەسڵەمێرەوە، یاخوا بەخێر بێیت! هەردووکمان خزمەتکاری یەك زاتین و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەوین".

ئنجا "مانگ" و "ئەستێرەکان" و "دەریا" و دەستە خوشکانیان، هەریەکەیان بە زمانی تایبەتیی خۆی دەیدوێنێت و، بە هێما پێی دەڵێن:

"بەخێربێیت! ئایا نامانناسیت؟ ئێمە هەموومان سەرگەرمی خزمەتی خاوەنەکەی تۆین، دەسا لێمان بێزار مەبە و، مەسڵەمێ و، لە هەڕەشەی نرکەی بەڵاکان مەترسە، چونکە جڵەوی هەموویان بە دەست بەدیهێنەرتە".

جا ئەو کەسە، لە حاڵی یەکەمیدا، هەست بە ئازارێکی سەخت لە ناخی ویژدانی خۆیدا دەکات و، ناچار دەبێت بە خۆ خافڵاندن و خەریك بوونی بە شتانی نزمەوە خۆی لەو ئازارە ڕزگار بکات و کەمی بکاتەوە و، بە لەبیربردنەوەش هەستی خۆی لەکار بخات، تاکو ویژدانی بخەڵەتێنێت و گیانیشی خەوی لێ بکەوێ.. دەنا هەست بە ئازارێکی هێندە قووڵ دەکات کە ناخی ویژدانی بسووتێنێت. جا بە ڕێژەی دووریی ئەو کەسە لە "ڕێی حەق" کاریگەریی ئەو ئازارەش خۆی لەودا دەردەخات.

بەڵام لە حاڵەتی دووهەمیدا، هەست بە چێژێکی بەرز و بەختەوەرییەکی خێرا دەکات لە بنکی گیانی خۆیدا و، هەرکاتێ دڵی بەخەبەر بێت و ویژدانی ببزوێت و گیانیشی هەست بکات، پتر بەختەوەر دەبێت و، چاوەڕوان دەبێت بۆ مژدەی کردنەوەی دەرگاکانی چەندین بەهەشتی ڕۆحانی لە ڕوویدا.

دەسا خوایە گیان! بە خاتری ڕێزی ئەم سوورەتە، بمانخەرە ڕیزی ڕێڕەوانی ئەم ڕاستە ڕێیە!

* * *

وإذ يرفعُ رأسَه وينظرُ في الكائنات يستأنسُ بكلِّ شيء، وتجتني عيناه من كلِّ زهرةٍ أُنسيةً وتحبُّباً، ويرى في حركات الأجرام حكمةَ خالقِها، ويتنـزَّهُ بسيرها، وينظرُ نظَرَ العبرةِ والتفكُّر، كأنَّ الشمسَ تناديه:

"أيها الأخُ! لا تتوحشْ مني، فمرحباً بقدومك! نحن كلانا خادمان لذاتٍ واحد، مطيعان لأمره".

والقمرُ والنجومُ والبحرُ وأخواتها يناجيه كلٌّ منها بلسانه الخاص وترمزُ إليه: بـ"أهلاً وسهلاً، أمَا تعرفُنا؟ كلّنا مشغولون بخدمة مالكك، فلا تَضجرْ ولا تتوحشْ ولا تخفْ من تهديد البلايا بنَعَراتها، فإن لِجام كلٍّ بيد خالقِك".

فذلك الشخصُ في الحالة الأولى يحسُّ في أعماق وجدانه ألَماً شديداً فيضطرُ للتخلص منه وتهوينه وإبطالِ حسِّهِ بالتسلّي، بالتغافلِ، بالاشتغالِ بسفاسف الأمور، ليُخادِعَ وجدانَه وينامَ روحُه؛ وإلّا أحسَّ بألَمٍ عميق يُحرقُ أعماقَ وجدانه. فبنسبة البُعْدِ عن الطريق الحق يتظاهرُ تأثيرُ ذلك الألم.

وأما في الحالة الثانية، فهو يحسُ في قعر روحِه لذةً عاليةً وسعادةً عاجلة كلما أيقظَ قلبَه وحرَّك وجدانَه وأحسّ روحَه استزاد سعادةً واستبشرَ بفتح أبواب جناتٍ روحانيةٍ له.

اللَّهُمَّ بِحُرْمَةِ هذِهِ السُّورَةِ اجْعَلْنَا مِنْ أَهْلِ الصِّرَاطِ الْمُسْتَقِيمِ.

* * *

بسم الله الرحمن الرحيم

## یەکەم دانەی "دوو سوورەتە درەخشانەکە"[١]

* ئەگەر وتت:

هەندێ شت لەم قورئانە پوخت و خاوەن ئیعجازەدا هەیە کە بە ڕواڵەت زۆر جار دووپات دەبنەوە، وەك بەسمەلە[٢] و، ﴿فَبِأَيِّ ءالاءِ..﴾ هتد و، ﴿وَيلٌ يَوْمَئِذٍ..﴾ هتد.. و، "چیرۆکی مووسا" و هاوشێوەکانی.. لە کاتێکدا کە "دووبارەکردنەوە" دەبێتە هۆی بێزاری و، لەگەڵ "ڕەوانبێژی"دا یەك ناگرێتەوە.

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

"گشت بریسکەیەك سووتێنەر نی‌یە".

ڕاستە.. دووپات بوونەوە - هەندێ جار - دەبێتە مایەی بێزاری، بەڵام نەك بە شێوەیەکی ڕەها. بەڵکو جاری وا هەیە بە جوان دادەنرێت و، هەندێ جاری دیکەش بێزاری دەبەخشێت.

---

(١) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "قورئان بخوێننەوە، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە تکاکاری هاوڕێیانی. دوو سوورەتە درەخشانەکە بخوێننەوە: بەقەرە و ئالی عیمران".. هتد فەرمووده‌کە. موسلیم ڕیوایەتی کردووە.

(٢) واتە: ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْـمنِ الرَّحِيمِ﴾.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# السورةُ الأولى من الزَّهْرَاوَيْنِ[1]

* إنْ قلتَ:

إنَّ في القُرآن الموجزِ المعجِزِ أشياءَ مُكرَّرةً تكراراً كثيراً في الظاهر كالبسملةِ و ﴿فَبِأَيِّ ءَالاءِ..﴾ الخ.. و ﴿وَيلٌ يَوْمَئِذٍ..﴾ الخ.. وقصةِ موسى وأمثالِها، مع أنَّ التكرارَ يُمِلُّ وينافي البلاغةَ.

قيل لك:

"مَا كُلُّ مَا يَتَلَأْلَأُ يُحْرِقُ". فإنَّ التكرارَ قد يُمِلُّ، لا مطلقاً . بل قد يُستحسَن وقد يُسْئِم.

---

(١) عن أبي أمامة الباهلي رضي الله عنه، قال :سمعت رسول الله ﷺ يقول: "اقرأوا القرآن، فإنه يأتي يوم القيامة شفيعاً لأصحابه، اقرأوا الزهراوين :البقرة وسورة آل عمران" .. الحديث. رواه مسلم. ٤٠٨

جا هەروەك خۆراکەکانی مرۆڤ هەندێکیان "بژێو"ن؛ هەتا دووبارە بینەوە تامیان خۆش دەبێت و پتر پێی ڕادێت.. هەندێکی تریان لە جۆری "میوە"ن؛ ئەگەر دووپات بینەوە دەبێزرێن و، گەر جارجاریش نوێ بینەوە چێژیان خۆش دەبێت..

گوفتارەکانیش بە هەمان شێوەن.. هەندێکیان حەقیقەت و بژێون و، هێزی هزرەکان و خۆراکی گیانەکانن؛ هەتا دووبارە بکرێنەوە بە جوان دادەنرێن و، بە وێنەی ڕووناکیی خۆر وان؛ مرۆڤ بە ڕاهاتنی لەگەڵیاندا خۆشحاڵە.

گوفتاری تریش هەیە کە لە جۆری میوە و ئارایشتن؛ چێژیان لە نوێ بوونەوەی شێوەکەیان و ڕەنگاوڕەنگیی پۆشاکەکانیدایە.

ئەگەر لەمە تێگەیشتی، ئەوا بزانە کە:

هەروەك کۆی قورئانی پیرۆز هێز و بژێوی دڵانە و، بە دووپاتکردنەوەی هەرگیز نابێزرێت، تەنانەت هەتا زیاتر بخوێنرێتەوە تامی شیرینتر دەبێت..

بە هەمان جۆر هەندێکی قورئانیش "گیان"ە بۆ ئەو خۆراکە بژێوەی دڵان و، هەتا دووپات بیێتەوە پتر دەدرەوشێتەوە و، تیشکی ڕاستی و حەقیقەت لە کەنارەکانیەوە زیاتر جۆش دەسێنێت. لە نێوان ئەو هەندەشدا بەشێك هەیە کە بەردی بناغە و گرێی ژیان و ڕووناکی‌یەکی بەرجەستەیە لە تەنێکی هەمیشەییدا، وەکو:

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾.

دەسا کاکە! ڕاوێژ بە چێژی خۆت بکە، ئەگەر خاوەنی چێژیت!

ئەمە لەسەر بناغەی ئەوەی کە بسەلمێت قورئان دووپاتکردنەوەی تێدایە.. دەنا چیرۆکی مووسا - بۆ نموونە - دەکرێ لە هەر شوێنێکدا لەبەر یەکێك لەو ڕووە زۆرانە هێنرابێت کە ئەو چیرۆکە لە خۆی دەگرن. چونکە چیرۆکی مووسا (أجدى من تفاريق العصا)[1]، بەو واتایەی کە لە کارە جیاجیاکانی عەساکەی دەستی پتر سوودی تێدایە. ئەوەبوو قورئانی پیرۆز بە دەستی درەخشانی خۆی وەك "زیو"ێك ئەو چیرۆکەی گرتە دەست، بەڵام بە "زێڕ" دایڕشتەوە و، جادووگەرانی "ڕەوانکاری"ش سەری سوژدەیان بۆ ڕەوانبێژی‌یەکەی نایە زەوی!

---

(١) پەندێکی عەرەبی‌یە. بۆ شتێك دەوترێت کە سوودی لە شتێکی تر زیاتر بێت. بۆ زیادە ڕوونبوونەوەی ئەم پەندە و بەکارهێنانی لە ڕووی ڕەوانبێژیی‌یەوە سەبارەت بە چیرۆکی حەزرەتی مووسا لە قورئاندا، بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە (١٧٩-١٨٠) لە کتێبی (داوەری‌یەکان)دا. (وەرگێڕ)

فكما أنَّ في غذاء الإنسان ما هو قُوتٌ كلما تكرّرَ حلا وكان آنَسَ، وما هو تفكّهٌ إنْ تكرَّرَ مَلَّ وإنْ تجددَ أُستُلِذَّ؛ كذلك في الكلام ما هو حقيقةٌ وقوتٌ وقوَّةٌ للأفكار وغذاءٌ للأرواح كلما استُعيد استُحسِن واستُؤنسَ بمألوفه كضياءِ الشمس..

وفيه ما هو من قبيل الزينة والتفكّهِ، لذّتُه في تجدّدِ صورتِه وتلوُّنِ لباسِه[1].

إذا عرفتَ هذا، فاعلمْ أنَّه:

كما أنَّ القرآنَ بمجموعه قوتٌ وقوّة للقلوب لا يُمَلُّ على التكرار، بل يُستحلى على الإكثار منه، كذلك في القرآن ما هو روحٌ لذلك القُوت كلما تكرّرَ تلألأَ[2] وفارتْ أشعةُ الحق والحقيقة من أطرافه، وفي ذلك البعضِ ما هو أُسُّ الأساس والعُقدةُ الحياتيةُ والنورُ المتجسّدُ بجسدٍ سرمدي كـ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْـمنِ الرَّحِيمِ﴾.

فيا هذا، شاوِرْ مذاقَك إنْ كنت ذا مذاق!

هذا بناءً على تسليم التكرار، وإلّا فيجوزُ أنْ تكونَ قصةُ موسى- مثلاً - مذكورةً في كلِّ مقامٍ لوجهٍ مناسبٍ من الوجوه المشتملةِ هي عليها. فإنَّ قصةَ موسى أجدى من تفاريق العصا[3] أخذَها القرآنُ بيده البيضاء فضةً فصاغها ذهباً، فخرّتْ سَحَرةُ البيان ساجدين لبلاغته!

---

(١) المسألة العاشرة من الشعاع الحادي عشر يفصل حكمة التكرار.

(٢) كالمسك ما كررته يتضوّع. (ت)

(٣) "إنك خير من تفاريق العصا"، مثل يُضرب فيمَن نفعُه أعمَّ مِن نفع غيره (مجمع الأمثال للميداني)

هەروەها "بەسمەلە"ش چەند "ڕوو"یەکی: داوای هاوکاری و، پیت وەرگرتن و، بابەت لەخۆ گرتن و، تەنانەت ئامانجداری و، پێڕست بوونی بۆ خاڵە بنەڕەتی‌یەکانی قورئان، لەخۆ گرتووە.

هەروەها چەند "پلە"یەکی وەك: مەقامی تەوحید و، مەقامی خاوێن ڕاگرتنی خواوەند و، مەقامی سەنا و ستایشی و، مەقامی شکۆمەندی و جوانی و، مەقامی چاکەکاری و، جگە لەمانەشی لەخۆ گرتووە.

هەروەها چەندین "بڕیار"ی ناوەکیی تێدایە وەك: ئاماژەدان بە تەوحید و، پێغەمبەرێتی و، حەشر و، دادگەری، واتە چوار ئامانجە بەناوبانگەکە. لە کاتێکدا کە لە زۆربەی سوورەتەکاندا یەکێك لەمانە ڕاستەوخۆ ئامانجی ئەو سوورەتەن و، ئامانجەکانی تر لەوێدا بە لاوەکی هێنراون..

ئیتر بۆچی نابێ "ڕوویەك" یان "بڕیارێك" یان "پلەیەك" لەوانە، پەیوەندی‌یەکی تایبەتیی لەگەڵ گیانی ئەو سوورەتەدا هەبێت و، بابەتی ئەو مەقامە بێت، بەڵکو پوختە پێڕستێکی بێت، بە پێی ئەو مەقام و ڕووانە؟

* * *

وكذا في "البسملة" جهاتٌ: من الاستعانةِ، والتبرّكِ، والموضوعيةِ، بل الغايَتِيَّةِ والفهرستيةِ[1] للنُّقَطِ الأساسيةِ في القرآن.

وأيضاً فيها مقاماتٌ: كمقامِ التوحيدِ، ومقام التنـزيه، ومقام الثناء، ومقام الجلال والجمال، ومقام الإحسان وغيرها.

وأيضاً فيها أحكامٌ ضمنيةٌ: كالإشارةِ إلى التوحيد والنبوة والحشر والعدل. أعني المقاصدَ الأربعةَ المشهورةَ، مع أنَّ في أكثر السور يكونُ المقصودُ بالذات واحداً منها، والباقي استطرادياً.

فلِمَ لا يجوزُ أنْ يكونَ لجهةٍ أو حُكمٍ أو مقامٍ منها مناسبةٌ مخصوصةٌ لروح السورة وتكونَ موضوعاً للمقام بل فهرستةً إجمالية باعتبار تلك الجهاتِ والمقامات؟

* * *

(١) كذا الأصل. لعل المقصود: الغائية والفهرسية. (ف)

﴿الم﴾ (البقرة: ١)

بزانە کە چوار باس لێرەدا هەیە:

باسی یەکەم:

"ئیعجاز" لە ئاسۆی ﴿الم﴾ەوە هەڵهاتووە! چونکە ئیعجاز ڕووناکی‌یەکە لە ئاوێتەکردنی بریسکانەوەی ڕووە نیانەکانی "ڕەوانبێژی"یەوە دەردەکەوێت..

ئەم باسەش چەند ناسکە سەرنجێکی وەها لەخۆ دەگرێت، کە هەرچەندەش یەك بە یەکیان ورد بن، بەڵام هەموویان سپێدەی ڕاستن.

یەکێك لەوانە: ﴿الم﴾ لەگەڵ دەستە خوشکەکانی لە سەرەتای سوورەتەکاندا[1]، سەرجەم پیتە هیجائی‌یەکان، کە هەوێنی گشت وشەکانن، دەکەنە دوو بەش[2]. دە فەرموو بیری لێ بکەرەوە.

یەکێکی تر لەوانە: ئەو نیوەیەی کە وەرگیراون، پتر بەکار دێن لە چاو وەرنەگیراوەکان.

یەکێکی تر لەوانە: قورئان لە نێوان وەرگیراوەکاندا ئەوانەی دووپات کردەوە کە لەسەر زمان ئاسانن، وەك "ئەلف" و "لام".

یەکێکی تر لەوانە: قورئان پیتە پچڕپچڕەکانی لە سەرەتای بیست و نۆ سوورەتدا هێناوە، کە ژمارەی پیتە هیجائی‌یەکانە[3].

یەکێکی تر لەوانە: ئەم نیوە وەرگیراوەش هەموو "جووت ڕەگەز"ێکی سروشتی پیتەکان دەکەن بە دوو بەشەوە، لە پیتەکانی: "المهموسة و، المجهورة و، الشديدة و،

---

(١) واتە ئەو سوورەتانەی کە بە پیتە پچڕپچڕەکان دەست پێ دەکەن. (وەرگێڕ)

(٢) پیتە پچڕپچڕەکان چواردە دانەن، کە نیوەی ژمارەی پیتە هیجائی‌یەکانە. (وەرگێڕ)

(٣) پیتە هیجائی‌یەکانی زمانی عەرەبی، بە "ئەلفی ساکینە"وە ژمارەیان بیست و نۆیە. (ت)

﴿الٓمٓ﴾ (البقرة: ١)

اعلم أنَّ ههنا مباحثَ أربعة:

المبحثُ الأول

إنَّ الإعجازَ قد تنفّسَ من أُفقِ ﴿الٓمٓ﴾ لأنَّ الإعجازَ نورٌ يتجلى من امتزاج لمعاتِ لطائف البلاغة. وفي هذا المبحثِ لطائفُ، كلٌّ منها وإنْ دقَّ لكنّ الكلَّ فجرٌ صادق.

منها: أنَّ ﴿الٓمٓ﴾ مع سائر أخواتها في أوائل السُّوَر، تُنصِّف كلَّ الحروف الهجائية التي هي عناصرُ كلِّ الكلمات. فتأملْ!

ومنها: أنَّ النصفَ المأخوذَ أكثرُ استعمالاً من المتروك.

ومنها: أنَّ القرآنَ كرّرَ من المأخوذ ما هو أيْسَرُ على الألسنة كالألف واللام.

ومنها: أنّه ذَكَرَ المقطّعاتِ في رأس تسعٍ وعشرين سورةً عِدّةِ الحروف الهجائية[1].

ومنها: أنَّ النصفَ المأخوذَ ينصِّفُ كلَّ أزواج أجناسِ طبائع الحروف، مِن

(١) عدة حروف الهجاء تسع وعشرون مع الألف الساكنة. (ت)

الرخوة و، المستعلية و، المنخفضة و، المنفتحة" و جگە لەمانەش. سەبارەت بە "تاکەکان"یش، قورسەکانیان کەمی لێ هێناون، وەك: "القلقلة" و، لە سووکەڵەکانیشیان زۆری لێ بەکار هێناون وەك: "الذلاقة"[(١)].

یەکێکی تر لەوانە: نیوەی وەرگیراو نەرم و نیانییەکی پتر لە سروشتیاندا هەیە.

یەکێکی تر لەوانە: قورئان بۆ پیتە پچڕپچڕەکان ڕێگایەکی لە نێوان پێنج سەد و چوار گریماندا هەڵبژاردووە، کە بەو ڕێیە نەبێت ناتوانرێ سروشتی پیتەکان بکرێنە دوو بەش! چونکە دابەشکردنە زۆرەکان تابلێی تێهەڵکێش و ئاڵۆز و جیاوازن. ئیتر دابەش کردنی نیوە بە نیوەی هەموو یەکێکی ئەوانە، نامۆییەکی سەرسووڕهێنی تێدایە!

هەر کەسێك لە ئاوێتەکردنی ئەو بریسکانە، گوڵچنیی نووری ئیعجاز نەکات، با هەر لۆمەی چێژی خۆی بکات.

باسی دووهەم:

بزانە کە:

﴿الم﴾ وەك دەنگی تەقەی گۆچان وایە، گوێ بیست بێدار دەکاتەوە و لاتەنیشتی ڕادەوەشێنێت کە:

بەم شێوە نامۆیەی خۆی، پێشەنگی شتێکی نامۆ و سەرسووڕهێنەرە.

ئەم باسەش چەند ڕوویەکی نیانی لەخۆ گرتووە..

یەکێك لەوانە: حوبجە کردن و لێك پچڕاندنی پیتەکانی "ناو" ئاماژەیە بۆ ڕەگەزی ئەو شتەی کە "خاوەن ناو"ەکەی لێ پەیدا دەبێت[(٢)].

---

(١) لە پیتەکانی (المهموسة) کە لەمانەن: (ستشحثك خصفه) نیوەیانی بەکارهێناوە کە بریتین لە: (ح، هـ، ص، س، ك). لە (المجهورة)ش نیوەیان کە ئەم پیتانەن (لن يقطع أمر)، لە (الشديدة)ش کە ئەم هەشت پیتەن: (أجدت طبقك) ئەم چوار پیتەی هێناوە: (أقطك). لە (الرخوة)ش ئەم دە پیتە: (حمس على نصره). لە (المطبقة)ش نیوەیان کە ئەم پیتانەن: (ص، ض، ط، ظ). لە (المنفتحة)ش نیوەیان. لە (القلقلة)ش کە ئەم پیتانەن (قد طبج) نیوە کەمەکەیان لەبەر کەمییان. لە (اللينتين) کە (و، ي)ن، (ي)ی هێناوە، چونکە کەمتر قورسە لەسەر زمان، لە (المستعلية)ش کە ئەم حەوت پیتەن: (ق، ص، ط، خ، غ، ض، ظ) نیوە هەرە کەمەکەی هێناوە، لە (المنخفضة)ش نیوەیان. (لێکۆڵەری دەقە عەرەبییەکە لە "تفسير البيضاوي"یەوە هێناویەتی ١٣/١).

(٢) واتە ڕەگەزی ئەو پیتانەی کە گوفتارەکانیان لێ دەهۆننەوە. (وەرگێڕ)

المهموسة والمجهورة والشديدة والرخوة والمستعلية والمنخفضة والمنفتحة وغيرها، وأما الأوتارُ فمِن الثقيلِ القليلُ كالقلقلة؛ ومن الخفيفِ الكثيرُ كالذلّاقة[1].

ومنها: أنَّ النصفَ المأخوذَ من طبائعها ألطفُ سجيةً.

ومنها: أنَّ القرآنَ اختارَ طريقاً في المقطّعات من بين أربعةٍ وخمسمائةِ احتمالٍ، لا يمكنُ تنصيفُ طبائع الحروف إلّا بتلك الطريقِ، لأنَّ التقسيماتِ الكثيرةَ متداخلةٌ ومشتبكةٌ ومتفاوتة. ففي تنصيف كلٍّ غرابةٌ عجيبة!

فمَن لم يجتَنِ نورَ الإعجاز من مزج تلك اللمعاتِ فلا يلومَنّ إلّا ذوقَه.

## المبحثُ الثاني

اعلم أنَّ ﴿الٓمٓ﴾ كقَرع العصا؛ يوقِظ السامعَ ويهزُّ عِطفَه بأنَّه - بغرابته - طليعةُ غريبٍ وعجيبٍ.

وفي هذا المبحث أيضاً لطائفُ:

منها: أنَّ التهجّيَ وتقطيعَ الحروف في الاسم إشارةٌ إلى جنس ما يتولّدُ منه المسمّى.

---

(١) (فذكر من "المهموسة" وهي ما يضعف الاعتماد على مخرجه، ويجمعها "ستشحثك خصفه" نصفها وهي الحاء والهاء والصاد والسين والكاف. ومن البواقي "المجهورة" نصفها يجمعه "لن يقطع أمر" ومن "الشديدة" الثمانية المجموعة في "أجدت طبقك" أربعة يجمعها "أقطك". ومن البواقي "الرخوة" عشرة يجمعها "حمس حمس على نصره". ومن "المطبقة" التي هي الصاد والضاد والطاء والظاء نصفها. ومن البواقي "المنفتحة" نصفها. ومن "القلقلة" وهي حروف تضطرب عند خروجها ويجمعها "قد طبج" نصفها الأقل لقلتها. ومن "الليتين" الياء لأنها أقل ثقلاً. ومن "المستعلية" وهي التي يتصعد الصوت بها في الحنك الأعلى وهي سبعة: القاف والصاد والطاء والخاء والغين والضاد والظاء نصفها الأقل. ومن البواقي "المنخفضة" نصفها). عن تفسير البيضاوي. (١/ ١٣)

یەکێکی تر لەوانە: لێکدابڕینی پیتەکان ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە "خاوەن ناوەکە" یەکەیەکی گوێرەییە، نەك پێکهاتەیەکی تێهەڵکێش[١].

یەکێکی تر لەوانە: حوبجە کردنی پچڕپچڕی پیتەکان، هێمایە بۆ پیشاندانی ماددەی سنعەتەکە. بە وێنەی ئەوەی کە قەڵەم و کاغەز هەڵبدەیتە بەردەستی کەسێك لە نووسیندا بەربەرەکانێت بکات. وەك بڵێی قورئان دەفەرموێت:

"ئەی سەرسەختانی لاف لێدەر! خۆ ئێوە میری گوفتارن.. دە ئەوەتا هەر ئەو کەرەسەیەی بەردەستتانە کە من ئەوەی لێ دروست دەکەم کە دەیکەم"!

یەکێکی تر لەوانە: لێك پچڕاندنی پیتەکان بە شێوەیەك هێما بێت بۆ پشتگوێ خستنی واتا، ئاماژە بۆ بەڵگەبڕینی ئەوان دەکات کە بڵێن: "ئێمە لەو ڕاستی و چیرۆك و بڕیارانە شارەزا نیین، هەتا ڕووبەڕووت ببینەوە"..

جا قورئان وەکو ئەوە وایە کە (لە ڕێی ئەو پیتە پچڕپچڕانەوە) پێیان بڵێت:

"تەنها هۆنینی ڕەوانبێژییانەم لە ئێوە دەوێت.. دە فەرموون بیهێنن، تەنانەت گەر دەمهەڵبەستیش بێت".

یەکێکی تر لەوانە: دەربڕینی پیتەکان بە ناوی خۆیان، لە نیشانەکانی ئەو کەسانەیە کە دەخوێننەوە و دەنووسن[٢]. کەچی ئەو کەسەی گوفتارەکەی لێ دەبیستن و ژینگەکەشی، نەخوێندەوارن. جا لە ڕووی ئەو سروشتەیانەوە - لە کاتێکدا یەکەم شتێك ڕووبەڕوویان دەبێتەوە پێچەوانەی چاوەڕوانکراوە - هێمایە بۆ ئەوەی کە: "پەیدا بوونی ئەم گوفتارە لە خودی ئەو کەسەوە نییە، بەڵکو ئاراستەی دەکرێت".

یەکێکی تر لەوانە: حوبجە کردنی ناوی پیتەکان، بناغە و سەرەتای خوێندنە[٣]. ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە:

قورئان دامەزرێنەری ڕێگایەکی تایبەتییە و، مامۆستایە بۆ کەسانێکی نەخوێندەوار.

---

(١) واتە "قورئان" ناوە بۆ هەر بەشێکی، کەواتە یەك سوورەتیشی هەر قورئانە، نەك ئەوەی کە پێکهاتەیەکی تێهەڵکێش بێت، هەتا بە بەشێك لە قورئان نەوترێت قورئان. (وەرگێڕ)

(٢) وەك دەربڕینی پیتەکانی: (أ، ل) بە: (ئەلف، لام). چونکە ئەم چەشنە دەربڕینەی ناوی پیتەکان، لە ڕێ و ڕەسمەکانی ئەو کەسانەیە کە دەخوێننەوە و دەنووسن. (ت)

(٣) واتە حوبجەکردن تایبەتە بەوانەی کە لە سەرەتای خوێندندان. (ت)

ومنها: أنَّ التقطيعَ إشارةٌ إلى أنَّ المسمّى واحدٌ اعتباريٌّ لا مركبٌ مَزجي.

ومنها: أنَّ التهجيَ بالتقطيع تلميحٌ إلى إراءة مادةِ الصنعة؛ كإلقاءِ القلم والقرطاس لِمَنْ يُعارِضُك في الكتابة. كأنَّ القرآنَ يقولُ:

"أيها المعاندون المدّعون! إنَّكم أُمراءُ الكلام. هذه المادةُ التي بين أيديكم هي التي أصنعُ منها ما أصنع".

ومنها: أنَّ التقطيعَ المُرمِزَ إلى الإهمال عن المعنى يشيرُ إلى قطع حُجتهم بـ"أنّا لا نعرفُ الحقائقَ والقصصَ والأحكامَ حتى نقابلَك"..

فكأنَّ القرآنَ يقولُ:

"لا أطلبُ منكم إلّا نظمَ البلاغة، فجيئوا به ولو مُفتَرياتٍ"!

ومنها: أنَّ التعبيرَ عن الحروف بأسمائها من رسوم أهلِ القراءةِ والكتابة[1]، ومَن يسمعون منه الكلامَ أمّيٌّ مع محيطه، فنظراً إلى السجيةِ - مع أنَّ أولَ ما يتلقّاهم خلافُ المنتظَرِ - يرمزُ إلى:

"أنَّ هذا الكلامَ لا يتولدُ منه، بل يُلقى إليه".

ومنها: أنَّ التهجّيَ أساسُ القراءة ومبدؤها[2]، فيومئُ إلى:

أنَّ القرآنَ مؤسسٌ لطريقٍ خاص ومعلِّمٌ لأمّيين.

---

(١) كالتعبير عن الحروف (أ، ل) بـ(ألف لام)، فهذا التعبير بأسماء الحروف هو من أصول أهل القراءة والكتابة (ت)

(٢) أي إنَّ التهجي يخصُ المبتدئين بالقراءةِ. (ت)

جا ئەگەر کەسێك لە چنینی تانوپۆی ئەم تاڵانەدا - با هەندێکیان باریکیش بن - نەخش و نیگارێکی بڵند نەبینێت، ئەوا لە پیشەی ڕەوانبێژیدا نامۆیەکی دەرەکی‌یە، دەبا شوێن فەتوای شارەزایانی ئەو پیشەیە بکەوێت.

**باسی سێهەم:**

﴿الم﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوپەڕی "ئیجاز" کە دووهەم بناغەی ئیعجازە.

ئەم باسەش چەند وردەکاری‌یەکی ناسك لەخۆ دەگرێت..

یەکێك لەوانە: ﴿الم﴾ بە زنجیرەی قیاسی تەمسیلی، هێما و ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە:

"ئەمە گوفتاری ئەزەلیی خوای گەورەیە، جیبریل هێناویەتیە خوار بۆ سەر محەممەد، سەڵات و سەلامیان لەسەر بێت"..

چونکە هەروەك ئەو ئەحکامانەی کە لە کۆی قورئاندا بە درێژی باس کراون، هەندێ جار وێنەیان بە پوختی لە سوورەتێکی درێژدا نەخش دەبێت و.. هەندێ جاری تر سوورەتێکی درێژ لە کورتە سوورەتێکدا بە ئاماژە دەردەکەوێت و.. کاتی وایش هەیە کورتە سوورەتێك بە هێما ئایەتێك لەخۆی دەگرێت و.. هەندێ جاریش ئایەتێك لە یەك دانە گوفتاردا بە ئاماژە جێی دەبێتەوە و.. هەندێ کاتی تر گوفتارێك بە تیلی چاو تێهەڵکێشی وشەیەك دەبێت و.. هەندێ جاری تر ئەو وشە کۆکار(جامع)ە لە چەند پیتێکی لێك پچڕاوی چەشنی "سین، لام، میم"دا دەبینرێت.. وەك قورئان لە سوورەتی "البقرة"دا و، "البقرة"ش لە سوورەتی "فاتیحە"دا و، فاتیحەش لە ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾ دا و، ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾یش لە "بەسمەلە"ی داتاشراودا[1]..

(هەروەك ئەمە وایە).. بە هەمان جۆر ئەمە لە ﴿الم﴾یشدا دروستە.

جا بە پشت بەستن بە زنجیرەی ئەم قیاسە تەمسیلی‌یە و، بە ئاماژەی ﴿ذٰلِكَ الْكِتَابُ﴾، بە ڕوونی لە ﴿الم﴾ەوە دەردەکەوێت کە:

"ئەمە گوفتاری ئەزەلیی خوای گەورەیە، جیبریل هێناویەتیە خوار بۆ سەر محەممەد، سەڵات و سەلامیان لەسەر بێت".

---

(١) واتە لە وشەی: "بەسمەلە"دا، کە لە ڕووی زمانەوە بۆ پوختە گوزارشت کردن لە: ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾ داتاشراوە.

ومَن لم يرَ نقشاً عالياً من انتساج هذه الخيوط - وإن دقَّ البعضُ - فهو دخيلٌ في صَنعة البلاغة فليقلِّدْ فتاوى أهلِها.

**المبحثُ الثالث**

إنَّ ﴿الٓمٓ﴾ إشارةٌ إلى نهايةِ الإيجاز، الذي هو ثاني أساسَي الإعجاز.

وفيه لطائفُ:

منها: أنَّ ﴿الٓمٓ﴾ يرمزُ ويشير ويومئ ويُلَوِّح ويلَمِّح بالقياس التمثيلي المتسلسل إلى:

"أنَّ هذا كلامُ الله الأزلي، نزلَ به جبريلُ على محمد عليهما الصلاة والسلام"..

لأنه كما أنَّ الأحكامَ المفصّلةَ في مجموع القرآن قد ترتسمُ في سورةٍ طويلةٍ إجمالاً؛ وقد تتمثلُ سورةٌ طويلةٌ في قصيرةٍ إشارةً؛ وقد تندرجُ سورةٌ قصيرةٌ في آيةٍ رمزاً؛ وقد تندمجُ آيةٌ في كلام واحدٍ تلويحاً؛ وقد يتداخلُ كلامٌ في كلمة تلميحاً، وقد تتراءى تلك الكلمةُ الجامعةُ في حروف مقطّعة، كـ"سين، لام، ميم".. كالقرآنِ في البقرة، والبقرةِ في الفاتحة، والفاتحةِ في ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحمن الرَّحيم﴾ و ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحمن الرَّحيم﴾ في البسملة المنحوتة[1]؛ كذلك يجوز ذلك في ﴿الٓمٓ﴾ أيضاً.

فبالاستناد إلى هذا القياس التمثيلي المتسلسل، وبإشارة ﴿ذلكَ الْكِتابُ﴾ يتجلى من ﴿الٓمٓ﴾:

"هذا كلامُ الله الأزلي نزلَ به جبريلُ على محمد عليهما الصلاة والسلام".

---

(١) المقصود: النحت اللغوي. أي أخذ الكلمة من كلمتين أو أكثر.

یەکێکی تر لەوانە: پیتە پچڕپچڕەکان بە وێنەی پەرلەی خوایین، بە بروسکە ناردوونی بۆ ئەو پێغەمبەرەی خۆی کە هەر ئەو کلیلەکەیانی لە لایە و، هێشتا دەستی بیری مرۆڤی پێ نەگەیشتووە!

یەکێکی تر لەوانە: ﴿الم﴾ ئاماژەیە بۆ زۆر زیرەکیی ئەو کەسەی کە بۆی نازڵ کراوە، وەك هێمایەك بۆ ئەوەی کە "هێما" سەبارەت بەو وەکو "ڕاشکاو" وایە[1]!

یەکێکی تر لەوانە: لێك پچڕاندنی پیتەکان ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە بەهای ئەو پیتانە تەنها لە واتاکانیاندا نییە، بەڵکو چەندین پەیوەندیی فیتریی چەشنی پەیوەندیی ژمارەکانیشیان لە نێواندا هەیە، کە "زانستی نهێنیی پیتەکان" پەردەی لەسەر لاداون.

یەکێکی تر لەوانە: بە تایبەت ﴿الم﴾ بە لێك پچڕاندنی پیتەکان ئاماژە بۆ هەر سێ شوێنی دەرچوونیان لە: "قوڕگ" و "ناوەڕاست" و "لێو" دەکات..

ئەو ئاماژەیەش هێمایە بۆ ناچار کردنی زەین کە ورد ببێتەوە و پەردەی ڕاهاتن بدڕێنێت، تاکو پەنا بباتە بەر خوێندنەوەی لایەنە سەرسووڕهێنەکانی نەخش و نیگاری ڕەنگاوڕەنگی بەدیهاتنی پیتەکان.

دەسا ئەی ئەو کەسەی کە دەستی خۆی بە پیشەی ڕەوانبێژی ڕەنگ کردووە!

پارچەکانی ئەم لایەنە ناسکانە یەك بخە و، پێکەوە بە یەك شت بۆیان بڕوانە و، گوێیان لێ بگرە، تاکو: "ئەمە گوفتاری خوایە"ت بەسەردا بخوێننەوە!

باسی چوارەم:

﴿الم﴾ و دەستەخوشکەکانی، کاتێ کە بەو شێوەیە دەرکەوتن، وەکو ئەوە وان کە بڵێن:

"هەر ئێمە پێشەواین.. چاو لە کەس ناکەین و شوێن هیچ ئیمامێك نەکەوتووین و، شێوازمان ناوازە و، جۆرەکەمان نامۆیە".

ئەم باسەش چەند لایەنێکی نیانی لەخۆ گرتووە:

---

(١) واتە لەبەر کەمالی زیرەکیی خۆی، بە وێنەی تێگەشتنی لە وتەی ڕاشکاو، لە هێما و ئاماژە و مەبەستە پەنهانەکانیش تێدەگات. (ت)

ومنها: أنَّ الحروفَ المقطّعةَ كالشِّفرةِ الإلهية أبرَقَها إلى رسولِه الذي عنده مفتاحُها. ولم تتطاولْ يدُ فكرِ البشرِ إليه بعدُ.

ومنها: أنَّ ﴿ الٓمٓ ﴾ إشارةٌ إلى شدَّةِ ذَكاوة المُنـزَل عليه، رمزاً إلى أنَّ الرمزَ له كالتصريح(١).

ومنها: أنَّ التقطيعَ إشارةٌ إلى أنَّ قيمةَ الحروف ليستْ في معانيها فقط، بل بينَها مناسباتٌ فطرية كمناسبة الأعداد، كشَفَها علمُ أسرار الحروف.

ومنها: أنَّ ﴿ الٓمٓ ﴾ خاصةً، إشارةٌ بالتقطيع إلى المخارج الثلاثة، من الحلق والوسط والشفة، وترمزُ تلك الإشارةُ إلى إجبار الذهن للدقّةِ، وشقِّ حجابِ الأُلفة؛ ليلجأَ إلى مطالعةِ عجائبِ ألوان نقش خِلقة الحروف.

فيا مَن صبغَ يدَه بصنعةِ البلاغة!

رَكِّبْ قطعاتِ هذه اللطائفِ وانظرْها واحدةً، واستمعْ، لتقرأ عليك:

"هذا كَلَامُ الله".

## المبحثُ الرابع

إنَّ ﴿الٓمٓ﴾ مع أخواتِها لَمّا برزتْ بتلك الصورةِ كانتْ كأنَّها تنادي:

"نحن الأئمة؛ لا نُقلِّد أحداً، وما اتَّبعنا إماماً، وأُسلوبنا بديعٌ، وطرزُنا غريب".

وفيه لطائفُ:

---

(١) أي لكمال ذكائه يفهم ماهو رمز وإيماء وأمر خفي، كالصريح . (ت)

یەکێك لەوانە: یەکێ لە خوو و ڕەفتاری وتارگۆیان و زمانپاراوان چاولێکردنی نموونەیەك و، تانوپۆکردنە لەسەر شێوە ڕێبازێك و، ڕۆشتنە بە ڕێیەکدا کە پێشتر گیرابێتەبەر.. کەچی ئەم پیتە پچرپچڕانە، لە پێش خۆیاندا، نە مرۆڤ و نە جیننی توخنیان نەکەوتوون.

یەکێکی تر لەوانە: قورئان بە دەستپێك و بڕگەکانی، وەکو باری پێشووی ماوەتەوە و، هاوشێوەی بۆ دروست نەبووە و، لاساییش نەکراوەتەوە. سەرباری لەدوای یەك هاتنی هۆکارەکانی چاولێکەری و شوێن پێ هەڵگرتنی، چ لە حەزی خۆشەویستانی و چ هی تەحەددیی دوژمنانی..

ئەگەر شایەتت لەسەر ئەمە دەوێت، فەرموو ئەمە ملیۆنەها "کتێبی عەرەبی"ن.. ئایا یەکێکیان دەبینیت کە هاوشانی بێت، یاخود لێی نزیك بووبێتەوە؟ نەخێر. تەنانەت گەر مرۆڤی نەزانی نەخوێندەواریش بە پێوەری قورئان هەڵیان بسەنگێنێت و قورئان لە بەرامبەریانەوە ڕابگرێت، سەرنج و تێبینیی ئەو کەسە بانگی لێ دەکات کە: "پلەی ئەم لەوان جیایە". جا یان ئەوەیە لە خوار هەموو ئەو کتێبانەوەیە، کە ئەمەش بە دڵنیایی مەحاڵە، یان لە سەرووی هەموویانەوەیە، کە ئەمەش جێی مەبەستە..

بەشی ئەو نەخوێندەوارە نەزانە، ئەمەیە لە پەی بردندا بە "ئیعجاز".

یەکێکی تر لەوانە: حاڵی پیشەسازیی مرۆڤ وایە کە یەکەم جار بە زبری و درشتی و، لە چەند ڕوویەکەوە بە ناتەواوی و کرچ و کاڵی سەر هەڵدەدات و، لە ڕێکوپێکی و پاراوی بێ بەشە. پاشان وردە وردە پێدەگات و تامی شیرین دەبێت..

کەچی شێوازی قورئان هەر لە سەرەتای دەرکەوتنیەوە بە ڕازاوەیی و پاراوی و لاوی سەری هەڵدا و، ڕۆشتە زۆرانەوە لەگەڵ ئەو بیر و هزرانەی کە لە ڕێی بەدوای یەکدا هاتنی هزرەکان و لە یەکتر فڕاندنەوە، تەمەنێکی درێژیان پێکەوە نابوو.. ئنجا سەرباری ئەوەش بە سەریاندا زاڵ بوو! بەم زاڵ بوونەشی ئەوەی ڕاگەیاند کە:

"قورئان لە سنعەتەکانی بەدیهێنەری قەدەر و تواناکانە".

دەسا ئەی ئەو کەسەی کە بۆنی ڕەوانبێژیی هەڵمژیوە!

ئایا هەنگی زەینت لە گوڵزاری ئەو چوار باسەدا بەرچنیی هەنگوینی: "أشهد أن هذا كلام الله" ناکات؟!

منها: أنَّ مِن دَيدنِ الخُطباء والفُصحاء التأسّيَ بمثالٍ والنسجَ على منوالٍ والتمشيَ في طريق مسلوك، مع أنَّها لم يطمثْهُنَّ قبلَه إنسٌ ولا جان.

ومنها: أنَّ القرآنَ بفواتحه ومقاطعه بقيَ بعدُ كما كان قبلُ، لم يماثِلْ ولم يُقلَّدْ مع تآخذِ أسباب التقليد والتأسِّي من شوق الأودّاء وتحدِّي الأعداء. إنْ شئتَ شاهداً فهذه ملايينُ من الكتب العربية! هل ترى واحداً منها يوازيه، أو يقعُ قريباً منه؟ كلّا! بل الجاهلُ العاميّ أيضاً إذا قاسَها معه وقابَله بها ناداه نظرُه بـ"أنَّ هذا ليس في مرتبتها". فإمّا هو تحت الكلِّ، وهو محالٌ بالضرورة، وإمّا هو فوق الكلِّ وهو المطلوبُ. فهو نصيبُه من دَرْك الإعجاز.

ومنها: أنَّ مِن شأن صنعة البشر أنَّها تظهرُ أوّلَ ما تظهرُ خَشِنَةً ناقصةً من وجوه، يابسةً من الطلاوة، ثم تتكملُ وتحلو. مع أنَّ أسلوبَ القرآن لمّا ظهرَ ظهرَ بطلاوة وطراوةً وشبابية، وتحدّى مع الأفكار المعمَّرين - بتلاحق الأفكار وسرقة البعضِ عن البعض - وغلَبَهم، فأعْلنَ بالغلبة: "أنَّه من صُنع خالق القُوى والقَدر".

فيا مَنْ استنشقَ نسيمَ البلاغة!

أفلا يجتني نحلُ ذهنِك عن أزهارِ تلك المباحث الأربعة شَهْدَ:

**"أشْهَدُ أنَّ هذَا كَلَامُ الله"؟!**

﴿ذٰلِكَ الْكِتابُ لا رَيْبَ فِيهِ هُدىً لِلْمُتَّقِين﴾ (البقرة: ٢)

# پێشەکی

بزانە کە:

یـەکێك لـە بناغـەکانی ئـەو ڕەوانبێژی‌یـەی کـە بـە هۆیـەوە جوانیـی گوفتـار دەبریسـکێتەوە: بەدەنگەوەچوونی یەکتری ڕوخسـارەکانی گوفتـارە و، کێش کردنـی یەکتری بەستێنەکانیەتی و، یەکگرتنیانە لەسەر ئامانجە بنەڕەتی‌یەکە و، پشتگیری هـەموو یەکێکیانـە - بـە پێـی توانـای خـۆی - بـۆ ئـەو ئامانجـەی کـە وەکـو شـوێنی بـە یـەك گەیشتنەوەی شێوەکانە، یان بە وێنەی حەوزێك وایـە کـە ئـاوی لـە لاکانیـەوە مژبێت..

بەو جۆرەی کە نموونەیەکی بەرجەستە بێت بۆ ئەوەی کە وتراوە:

عباراتُنا شَتّى وحُسنُكَ واحدٌ  وكُلٌّ إلى ذاكَ الجمالِ يُشيرُ[1]

بۆ نموونە:

سەرنج لە ئایەتی: ﴿وَلَئِنْ مَسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِنْ عَذابِ رَبِّـكَ﴾ (الأنبيـاء: ٤٦) بـدە کـە بـۆ "گـەورە پیشـاندان"ێـك بـەکار هـاتووە کـە لـە "کـەم پیشـاندان" و، بـە پێـی نـهێنیی ڕەنگدانەوەی دژ لە دژدا، وەردەگیرێت!

ئایا نابینیت کە گومان دروستکردنی ﴿إنْ﴾ چۆن پشتی "کەمکردنەوە" دەگرێت و.. "مَس" (واتە لێککەوتن)ی لە ﴿مسَّـتْ﴾دا لـە بریـی "دووچـاربوون" بـەکارهێناوە، کە

(١) خاوەنی ئەم بەیتە، نەزانراوە کێ‌یە. واتە:

جوانیت یەکێکە و باسمان جیا جیایە  یەك یەك ئاماژەی جوانیی تۆی لایە

(وەرگێڕ)

## ﴿ذَلِكَ الْكِتَابُ لا رَيْبَ فِيهِ هُدىً لِلْمُتَّقِينَ﴾ (البقرة: ٢)

### مقدمة

اعلم أنَّ مِن أساسِ البلاغة الذي به يبرُقُ حُسنُ الكلام تجاوبَ الهيئات وتداعيَ القيود وتآخذَها على المقصد الأصلي، وإمدادَ كلٍّ بقدْرِ الطاقة للمقصد، الذي هو كمجمَع الأودية أو الحوض المتشرِّبِ من الجوانب، بأنْ تكونَ مصداقاً وتمثالاً لما قيل:

عِبَارَاتُنَا شَتَّى وَحُسْنُكَ وَاحِدٌ وَكُلٌّ إلى ذَاكَ الْجَمَال يُشِيرُ[1]

مثلاً: تأمّل في آية: ﴿وَلَئِنْ مَسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِنْ عَذَابِ رَبِّكَ﴾ (الأنبياء:٤٦) المسوقةِ للتهويل، المستفادِ من التقليل بسرّ انعكاسِ الضدِّ من الضد. أفلا ترى التشكيكَ في ﴿إنْ﴾ كيف يُمدُّ التقليلَ، والمسَّ بدلَ الإصابة في ﴿مسَّتْ﴾ كيف يشيرُ إلى القلّة والتروّحَ فقط،

(١) لم ينسب إلى قائله: انظر تفسير الألوسي ٨/ ٤١٧؛ البحر المديد لابن عجيبة ٤/ ١١٣؛ البرهان للزركشي ٢/ ١٦٠.

چۆن تەنها ئاماژە بۆ كەمی و حەوانەوە دەكات و.. یەك دانەیی و سووك پیشاندانیش لە ناوەرۆك و دارِشتن و تەنوینی ﴿نفحةٌ﴾دا چۆن ئاماژە بە كەمی دەدات و.. هەند گەیاندنیش لە ﴿مِنْ﴾دا چۆن هێمایە بۆی و.. گۆرینی "نَكال"یش بە ﴿عذاب﴾ چۆن هێمای بۆ دەكات و.. ئەو شەفەقەتەش كە لە ﴿رَبّ﴾ وەردەگیرێت چۆن ئاماژەیە بۆی؟!

ئیتر بۆ خۆت قیاس لەسەر ئەمانە بكە..

دەبینیت كە هەریەكەیان لە رووی تایبەتیی خۆیەوە، پشتی ئامانجە بنەرەتی‌یەكە دەگرێت.

دەستە خوشكەكانی تری ئەم ئایەتەش هەر بەم پێوەرە لێك بدەرەوە، بە تایبەت:

﴿الم * ذَلِكَ الْكِتابُ لا رَيْبَ فِيهِ هُدىً لِلْمُتَّقِين﴾..

چونكە ئەم ئایەتە بۆ "مەدح" و "سەلماندنی كەماڵی قورئان" هێنراوە.

دەبینی بۆ "پشتگیری" و "بەدەنگەوەچوون" لەسەر ئەم ئامانجە، هەموو ئەمانە یەكیان گرتووە:

سوێند خواردن بە ﴿الم﴾، بە پێی روویەك لە رووەكان(ی تەفسیرەكەی) و.. ئاماژەدان و هەست پێكراوی و دووری لە ﴿ذلِكَ﴾دا و.. ئەلف و لامی ﴿الْكِتابُ﴾ و.. ئاراستە كردنی سەلماندیشی بە ﴿لا رَيْبَ فِيهِ﴾..

دەبینی هەموو یەكێكیان، هەروەك پشتی ئامانجەكە دەگرێت و بەشی خۆی پێدەدات، بە هێما و دەركەوتنێكی تەنك ئەو بەڵگەیەشی لە ژێرەوە دەبینرێت - هەرچەندەش ورد بێت - كە پشتی پێ بەستووە.

ئەگەر ویستت پتر ئەمەت بۆ روون بێتەوە، ئەوا سەرنج لەو سوێند خواردنە بدە كە لە ﴿الم﴾دایە، چونكە هەروەك ئەو سوێندە جەخت كردنەوەی تێدایە، بە هەمان جۆر هەستی "بە گەورە راگرتن"ێك دەبزوێنێت كە سەرنجی مرۆڤ بۆ ئەو تێروانینە ئاراستە دەكات كە دەبێتە هۆكاری دەركەوتنی ئەو لایەنە نیانە ناوبراوانەی لە ژێر ئەو سوێندەدان، تاكو بەڵگە بێت لەسەر ئەو دەعوایەی كە هێمای پێ دراوە.

هەروەها سەیری ئاماژەدان بكە لەو ﴿ذلِكَ﴾یەدا كە تایبەتە بە گەرانەوەی بۆ زات لەگەڵ سیفەتەكاندا، تاكو بزانیت كە ئەو ئاماژەیە هەروەك "بە گەورە راگرتن" دەگەیەنێت - چونكە یان ئاماژەیە بەوەی كە بە ﴿الم﴾ ئاماژەی بۆ كراوە، یان بە مژدە

والمرّتيةَ والتحقيرَ في جوهرٍ وصيغةٍ وتنوينِ ﴿نَفْحَةٌ﴾ كيف تلوِّحُ بالقلّة، والبعضيةَ في ﴿مِنْ﴾ كيف تومئُ إليها، وتبديلَ النكال بالـ﴿عَذَاب﴾ كيف يرمزُ إليها، والشفقةَ المستفادةَ من الـ﴿ربّ﴾ كيف تشيرُ إليها؟! وقِسْ..

فكلٌّ يُمدُّ المقصدَ بجهته الخاصة.

وقِسْ على هذه الآية أخواتِها. وبالخاصة:

﴿الٓمٓ * ذَلِكَ الْكِتَابُ لا رَيْبَ فيهِ هُدىً لِلْمُتَّقِينَ﴾..

لأنَّ هذه الآيةَ ذُكرتْ لَمدح القرآنِ وإثبات الكمال له.

ولقد تجاوبَ وتآخذَ على هذا المقصد:

القَسَمُ بـ﴿الٓمٓ﴾ على وجهٍ، وإشارةُ ﴿ذَلِكَ﴾ ومحسوسيتُه وبُعديتُه، والألفُ واللامُ في ﴿الْكِتَابُ﴾، وتوجيهُ إثباتِه بـ﴿لا رَيْبَ فِيهِ﴾..

فكلٌّ كما يُمدُّ المقصدَ ويُلقي إليه حصّتَه يرمزُ ويشِفُّ من تحته عن ما يستندُ إليه من الدليل وإنْ دقَّ.

فإن شئتَ تأملْ في القَسَم بـ﴿الٓمٓ﴾ إذ إنَّه كما يؤكِّدُ، كذلك يُشعِرُ بالتعظيم الموجَّه للنظر الموجِبِ لانكشاف ما تحته من اللطائف المذكورةِ ليبرهنَ على الدعوى المرموز إليها.

وانظرْ الإشارةَ في ﴿ذَلِكَ﴾ المختصةَ بالرجوع إلى الذات مع الصفات لتعلمَ أنّها كما تفيدُ التعظيمَ – لأنها إمّا إشارةٌ إلى المشـار إليه بـ﴿الٓمٓ﴾ أو المبشَّرِ به في التوراة والإنجيل – كذلك

پێدراوەکەی تەورات و ئینجیل - بە هەمان جۆر، ئاماژە بە بەڵگەکەشی دەدات. چونکە ئەوەی کە سوێندی پێ خوراوە تابڵێی مەزنە و، ئەوەش کە تەورات و ئینجیل مژدەیان بە هاتنی داوە هەتا بڵێی کامڵ و تەواوە..

پاشان بە وردی بڕوانە بۆ ئەو ئاماژەیەی کە هی شتی "هەست پێکراو"ە چۆن ئاماژەی پێ دراوە بە شتێك کە هی بازنەی "پەی بردنی ژیری"یە.. تاکو ببینیت کە ئەو ئاماژەیە هەروەك "بە گەورە ڕاگرتن" و "گرنگی" دەگەیەنێت، بە هەمان جۆر ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کە قورئان بە وێنەی موگناتیسێك وایە؛ زەینەکان بەرەو لای کێش دەبن و، ڕوانینەکانیش پاڵەپەستۆیانە لەسەری و، ئەندێشەی هەموو یەکێك ناچار دەکات سەرقاڵ بێت پێیەوە. ئیتر بە پلەیەکی ئەوتۆ دەرکەوت - چاوەکان لە پشتی ئەو پلەوە دەیبینن گەر سەردانی ئەندێشە بکەن - کە بە زمانی حاڵ هێما دەکات بۆ متمانەبوونی بەوەی کە "ڕاست"ە و، بەوەش کە بێ نیازە لە "فێڵ" و "لاوازی" کە داواکاری خۆشاردنەوەن..

پاشان بیر لەو "دووری"یە بکەرەوە کە لە ﴿ذٰلِكَ﴾ وەردەگیرێت، چونکە هەروەك ئەو پایەبڵندی‌یە دەگەیەنێت کە دەرخەری کەماڵی ئەوە، بە هەمان جۆر ئاماژەش بۆ بەڵگەکەی دەکات، بەوەی کە دوورە لەو ڕێبازەی هاوشێوەکانی ئەوی پێدا ڕۆشتووە. کەواتە یان پلەی لە خوار هەموویانەوەیە، کە ئەمەش بە یەکگرتنی قسەی هەموو لایەك ڕاست نی‌یە و بۆچوونێکی نارەوایە.. کەواتە لە سەرووی هەموویانەوەیە.

پاشان لە "ال"ی ﴿الْكِتابُ﴾ ورد بەرەوە. چونکە هەروەك ئەو تایبەتکردن(قەتیس کردن)ە عورفی‌یە دەگەیەنێت کە دەرخەری کەماڵی ئەو کتێبەیە، بە هەمان جۆر دەرگای بەراوردکاریش دەخاتە سەر پشت و، ئاماژەی پێ دەدات بەوەی کە "قورئان" هەروەك لایەنە جوانەکانی سەرجەم کتێبەکانی لەخۆدا کۆ کردووەتەوە، زیادەشی بەسەر ئەواندا داوەتەوە، کەواتە کامڵترینی هەموویانە.

پاشان لەسەر گوزارشتی ﴿الْكِتابُ﴾ ڕابووەستە و، بزانە کە چۆن ئاماژە دەکات بەوەی "کتێب" دەستکردی نەخوێندەوارێك نابێت کە خوێندنەوە و نووسین نازانێت.

﴿لا ريبَ فيه﴾یش دوو ڕوو لەخۆ دەگرێت، کە گێڕانەوەی ئەو "ضَمیر"ەیە یان بۆ بڕیارەکە، یاخود بۆ ﴿الْكِتابُ﴾..

تلوّحُ بدليلها؛ إذ ما أعظمَ ما أُقسمَ به! وما أكملَ ما بشَّرَ به التوراةُ والإنجيل!

ثم أمعِن النظرَ في الإشارة الحسيةِ إلى الأمر المعقولِ لترى أنَّها كما تفيدُ التعظيمَ والأهميةَ؛ كذلك تشيرُ إلى أنَّ القرآنَ كالمغناطيس المنجذِبِ إليه الأذهانُ، والمتزاحِمِ عليه الأنظارُ المجْبِرِ لخيالِ كلٍّ على الإشتغال به. فتظاهرَ بدرجةٍ - تراه العيونُ من خلفها إذا راجعتْ الخيالَ - يرمزُ بلسان الحالِ إلى وثوقِه بصدقه وتبرّيه عن الضعف والحيلة الداعيَين إلى التستُّر..

ثم تفكّرْ في البُعدية المستفادةِ من ﴿ذَلِكَ﴾؛ إذ إنَّها كما تفيدُ علوَّ الرتبة المفيدَ لكماله؛ كذلك تومئُ إلى دليله بأنَّه بعيدٌ عن ما سلكَ عليه أمثالُه. فإما تحت كلٍّ وهو باطلٌ بالاتفاق، فهو فوق الكلِّ.

ثم تدبّرْ في "الـ"﴿الْكِتَابُ﴾، لأنَّها كما تفيدُ الحصرَ العرفيَّ المفيدَ للكمال؛ تفتحُ بابَ الموازنة وتلمِّحُ بها إلى أنَّ القرآنَ كما جمَع محاسنَ الكتب قد زادَ عليها فهو أكملُها..

ثم قفْ على التعبير بـ﴿الْكِتَابُ﴾ كيف يلوّحُ بأنَّ الكتابَ لا يكونُ من مصنوع الأمّيّ الذي ليس من أهل القراءة والكتابة.

أما ﴿لا رَيْبَ فِيهِ﴾ ففيه وجهان:

إرجاعُ الضميرِ إلى الحُكم، أو إلى ﴿الْكِتَابُ﴾..

بە پێی ڕووی یەکەم - وەك "مفتــاح"[١] پێـی وایـە - بـە واتـای: "بـە دڵنیـایی" و "بێ گومان" دێت. کەواتە دەبێتە ڕوویەك لـە ڕووەکـانِ و سـاغ کردنەوەیەك بۆ چەسپاندنی کەماڵی ئەو کتێبە.

بە پێی ڕووی دووهەمیش - وەك ئەوەی "کشـــاف"[٢] پێـی وایـە - دەبێتـە جـەخت لەسەر چەسپینی کەماڵی.

بە پێی هەموویشـیان، ئەوا لە ژێر ﴿لا ريبَ فيه﴾یەوە بە ﴿وَإنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّـــا نَزَّلْنَا على عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ﴾ (البقرة: ٢٣) دەدوێ و، هێما بۆ بەڵگـە تایبەتەکـەی دەکات.

گشتگیریی ﴿لا﴾یش، بە هۆی نەهێشتنی گومانەکان، ئەم بەیتە دەخوێنێتەوە:

وكَم مِن عائبٍ قولاً صحيحاً    وآفتُه مِن الفهمِ السقيمِ[٣]

هەروەها ئاماژە بۆ ئەوەش دەکـات کـە ئـەم شـوێنە شـایانی سـەرهەڵدانی گومانـەکان نییە، چونکە لەسەر سنوورەکان هێندە نیشانەی داناوە کە لە هەموو لایەکـەوە دەنگیـان دەگاتە یەکتری و، ئەو گومانانە دەڕەتێنن کە هێرش دەکەنە سەری.

دەفر بوونی ﴿فيه﴾ و، گوزارشت کردنیش بە "فِي" لـە بریـی دەسـتە خوشـکەکانی[٤]، ئاماژەیە بۆ ڕۆچوونی ڕوانینی قورئان بە ناخی ناوەوەدا و، بـۆ ئـەوەش کـە ڕاستـییەکانی قورئان هەموو ئەو وەهمانە دەردەکات و هەڵیاندەفڕێنێ کە بە پێی بینینی ڕواڵەتی لەسـەر ڕووی دەرەوەی دانراون.

دەسا ئـەی ئـەو کەسـەی کـە پـەیی بـە نرخـی "تێهـەڵکێش کـردن" بـردووە لـە ڕووی "شـیکردنەوە" و، هەستی بـە جیـاوازیی "کــۆی هــەموو"ی لــەچاو یــەك بــە یــەکیاندا، کردووە!

---

(١) مەبەست کتێبی (مفتاح العلوم)ی ئەبوو یەعقووبی سـەکاکییە، کـە فراوانـترینی کتێبـەکانی ڕەوانبێژییـە هەتا ئەو سەردەمە. بڕوانە پەراوێزی (١)ی لاپەڕە (١١٨)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

(٢) مەبەست تەفسیری: (الکشاف عن حقائق التنزيل)ە، کـە دانـراوی زانـای گـەورەی زمـان و ڕەوانبێـژی و تەفسیر: ئەبولقاسم جارولڵای زەمەخشەرییە (٤٦٧-٥٣٨ك).

(٣) ئەم بەیتە هی "موتەنەبیی"یە. واتە:

زۆر هەن توانجیان لە قسەی جوانە    هۆکەی نەخۆشیی تێگەشـتنیانە

(وەرگێڕ)

(٤) لە حەرفە جەڕەکانی چەشنی: "ل، من، ب". (وەرگێڕ)

فعلى الأول - كما عليه المفتاحُ[1] - يكون بمعنى يقيناً، وبلا شك، فيكون جهةً وتحقيقاً لإثبات كماله.

وعلى الثاني - كما عليه الكشافُ[2]- يكون تأكيداً لثبوت كماله.

وعلى الكلِّ يناجي من تحت ﴿لا رَيْبَ﴾ بـ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا على عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ﴾ (البقرة: ٢٣) ويرمزُ إلى دليله الخاص..

والاستغراقُ في ﴿لا﴾ بسبب إعدامِ الريوب الموجودة ينشدُ:

وَكَمْ مِنْ عَائِبٍ قَوْلاً صَحِيحاً

وَآفَتُهُ مِنَ الْفَهْمِ السَّـقِيمِ[3]

ويشيرُ إلى أنَّ المحلَّ ليس بقابلٍ لتولُّدِ الشكوك؛ إذ أقامَ على الثغور أماراتٍ تتنادى من الجوانب وتطردُ الريوبَ المتهاجمةَ عليه.

وفي ظرفيةِ ﴿فيه﴾ والتعبيرِ بـ"فِي" بدلَ أخواتها إشارةٌ إلى إنفاذ النظرِ في الباطن. وإلى أنَّ حقائقَه تطردُ وتطيّرُ الأوهامَ المتوضِّعةَ على سطحه بالنظر الظاهر.

فيا مَن آنس قيمةَ التركيب من جانب التحليل، وأدرَكَ فرقَ الكلِّ عن كلٍّ!

---

(١) "مفتاح العلوم" للعلامة سراج الدين أبي يعقوب يوسف بن أبي بكر بن محمد بن علي السكاكي (ت ٦٢٦هـ/ ١٢٢٨م). من أعلام البلاغة، ويعدّ كتابه هذا أوسع ما كتب في البيان في زمانه، وله شروح كثيرة. وضع علوم البلاغة في قالبها العلمي. مولده ووفاته بخوارزم.

(٢) "الكشاف عن حقائق التنزيل" للإمام العلامة أبي القاسم جار الله محمود بن عمر الزمخشري الخوارزمي المتوفى سنة ٥٣٨هـ.

(٣) للمتنبي في ديوانه ٤/ ٢٤٦.

فەرموو بە یەك ڕوانین سەیری ئەو هەموو "بەستێن" و "ڕوخسار"انە بکە، تاکو ببینیت کە چۆن هەریەکەیان بەشی خۆی ئاراستەی ئامانجە هاوبەشەکە لەگەڵ بەڵگەی تایبەتیی خۆیدا دەکات و، چۆن ڕووناکیی ڕەوانبێژی لە هەموو لایەکەوە هەڵدەقوڵێت!

ئەوەش بزانە کە:

بە ئەڵقەکانی پیتی "عەتف" نێوان ڕستەکانی: ﴿الم.. ذَلِكَ الْكِتابُ.. لا رَيْبَ فِيهِ.. هُدىً لِلْمُتَّقِين﴾ی بە یەکەوە گرێ نەدا، لەبەر پەیوەندیی توندوتۆڵ و دەست لە مل کردنی یەکتریی نێوانیان و، دەستگرتنی هەریەکەیان بە پشتێنی ئەوەی پێش خۆی و داوێنی ئەوەی دوای خۆیەوە. چونکە هەریەکەیان هەروەك لە ڕوویەکەوە دەبێتە بەڵگە بۆ هەموویان، بە هەمان جۆر لە ڕوویەکی ترەوە دەبێتە ئەنجامی هەموو یەکێکی تریان.

نەخشی ئیعجاز بەسەر ئەم ئایەتەوە بە تانوپۆی دوازدە هێڵی تێهەڵکێشی پەیوەندییەکان کێشراوە[1].

گەر درێژەپێدانی ئەمەت ویست، سەرنج لەمەی خوارەوە بدە:

واتا و دەرەنجامی ﴿الم﴾ هێمایە بۆ ئەوەی کە: "ئەمە (گوفتارێکی) تەحەددا پێ کراوە، کێ دێتە مەیدان"؟.. پاشان ئاماژە دەکات بەوەی کە خاوەنی ئیعجازە..

ئنجا بیر لە ﴿ذلكَ الْكِتابُ﴾ بکەرەوە. ئەوەتا بە ڕاشکاوی دەری دەخات کە زیادەی بەسەر دەستەخوشکەکانیدا داوەتەوە و ئەوانی داپۆشیوە.. پاشان ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کە شتێکی جیاواز و نایابی ئەوتۆیە هیچ شتێك نابێتە هاوشێوەی..

پاشان بیر لە ﴿لا رَيْبَ فيه﴾ بکەرەوە، چونکە هەروەك زۆر بە پاراوی دەری دەبڕێت کە جێی گومان نییە.. بە هەمان شێوە، ئەوەش ڕادەگەیەنێت کە بە نووری یەقین ڕووناك بووەتەوە..

ئنجا بۆ ﴿هُدىً للمُتَّقين﴾ بڕوانە، چونکە هەروەك ئەوەت پێ دەبەخشێت کە پیشاندەری ڕێی ڕاستە.. ئەوەشت پێ ڕادەگەیەنێت کە لە نووری هیدایەت بەرجەستە بووە.

هەموو یەکێکی ئەمانە، بە پێی واتای یەکەمیان: بەڵگەی هاوەڵانیەتی و، بە پێی واتای دووهەمیش: ئەنجامی هەموو یەکێکیانە.

---

(١) واتە بە پێی پەیوەندیی هەریەك لەم چوار ڕستەیە بە سێ ڕستەکەی ترەوە. (وەرگێڕ)

انظُر نظرةً واحدة إلى تلك القيود والهيئات لترى كيف يُلقي كلٌّ حصتَه إلى المقصد المشترك مع دليله الخاص، وكيف يفورُ نورُ البلاغة من الجوانب.

اعلم أنَّه لم يُربَط بين جُمَل ﴿الٓمٓ.. ذَٰلِكَ الْكِتَابُ.. لا رَيْبَ فيه.. هُدىً لِلْمُتَّقِينَ﴾ بحلقاتِ العطف، لشدة الاتصالِ والتعانقِ بينها، وأخذِ كلٍّ بحُجْز سابقتها وذَيلِ لاحقتها. فإنَّ كلَّ واحدة كما أنَّها دليلٌ لكلٍّ بجهة؛ كذلك نتيجةٌ لِكلٍّ واحدة بجهة أخرى.

ولقد انتقشَ الإعجَازُ على هذه الآية بنسْج اثنَي عَشَرَ من خطوط المناسباتِ المتشابكةِ المتداخلة..

إنْ شئتَ التفصيلَ تأملْ في هذا:

﴿الٓمٓ﴾ فإنَّها تومئُ بالمآل إلى: "هذا متحدًّى به، ومَن يبرزُ إلى الميدان؟" ثم تلوِّحُ بأنَّه مُعجِزٌ.

وتفكَّرْ في ﴿ذَٰلِكَ الْكِتَابُ﴾ فإنَّها تصرِّحُ بأنَّه ازدادَ على أخواته وطمَّ عليها، ثم تلمَحُ بأنَّه مستثنى ممتازٌ لا يماثَل.

ثم تدبَّرْ في ﴿لا رَيْبَ فِيهِ﴾ فإنَّها كما تُفصحُ عن أنه ليس محلاً للشك تعلنُ بأنه منوّرٌ بنور اليقين.

ثم انظُرْ في ﴿هُدىً لِلْمُتَّقِينَ﴾ إذ إنَّها كما تهدي إليك أنَّه يُري الطريقَ المستقيمَ؛ تفيدُك أنَّه قد تجسمَ من نور الهداية.

فكلٌّ منها باعتبار المعنى الأول برهانٌ لرفقائها، وباعتبار المعنى الثاني نتيجةٌ لكل منها.

بۆ نموونـە، تەنـها سێ دانـە لـە دوازدە پەیوەندی‌یەكـە بـاس دەكـەین، تـاكو بـۆ خـۆت پاشماوەكەیان بەو پێوەرە بدۆزیتەوە:

ئـەوەتا ﴿الم﴾ واتـە: ئەمـە تەحـەددای هـەموو نـەیارێك دەكـات.. كەواتـە كامڵـترینی كتێبەكانە.. كەواتە شتێكی دڵنیاییدەر و بێ گومانە، چونكە كـەماڵی كتێـب بـە یـەقین و دڵنیایی دەبێت.. كەواتە هیدایەتی بەرجەستەیە بۆ ئادەمیزاد..

پاشـان ﴿ذٰلِكَ الْكِتابُ﴾ واتـە ئـەم كتێبە زیـادی داوەتەوە بەسـەر هـاوشێوەكانیدا.. كەواتە ئیعجازبەخشە، یان واتە: نایـاب و جیـا كراوەیـە.. چونكـە گومـانی تێدا نی‌یـە.. لەبەر ئەوەی ڕێی ڕاست پیشانی كەسانی خاوەن تەقوا دەدات..

پاشان ﴿هُدىً لِلْمُتَّقِينَ﴾ واتە: بەرەو ڕێی ڕاست ڕێنمایی دەكـات.. كەواتـە دڵنیـایی بەخش و بێ گومانە.. كەواتە نایابە.. كەواتە ئیعجازبەخشە..

ئیتر بۆ خۆت پاشماوەكانی دەربهێنە.

سەبارەت بە ﴿هُدىً لِلْمُتَّقِينَ﴾یش، ئەوا بزانە كە سەرچاوەی جوانیی ئەم گوفتارە لـە چوار خاڵەوەیە:

یەكەم: حەزف كردنی موبتەداكەی، چونكە ئەو كارە ئاماژەی تێدایـە بـۆ ئـەوەی كـە حوكمی یەكگرتنی موبتەدا و خەبەر سەلمێنراوە. وەك بڵێی خودی موبتەداكـە لـە خـودی خەبەرەكەدایە، بە ڕادەیەك كە بڵێی لە زەینیشدا جیاوازییان لە نێواندا نی‌یە.

دووهەم: گۆڕینی ئیسمی فاعیل بە مـەصدەر[1]، كـە هێمـای بـۆ ئەوە لـەخۆ گرتـووە: نـووری هیدایـەت هێنـدە بەرجەستە بـووە كـە بووەتـە خـودی گەوهـەری قورئـان، وەك ئەوەی كە ڕەنگی "سوور" بەرجەستە دەبێت و دەبێتە بۆیەی قرمزی[2].

سێ‌هەم: هێنانی ﴿هُدىً﴾ بە شێوەی نەكیرە (نەناسراو). چونكە هێمایەكی تێدایـە بـۆ ئەوپەڕی وردیی ڕێنمـایی قورئـان كـە لـە ڕادەیەكدایـە نـاتوانرێت پـەی بـە گەوهـەر و كۆتاییەكـەی بـبرێت و، بـۆ ئەوپـەڕی فراوانیشـی كـە لـە ڕادەیەكدایـە بــە "زانــین" دەوراندەوری نادرێت. چونكە "نەكیرەیی" هەر شتێك یان لەبەر وردی و پەنهانی‌یە، یان

(١) واتە لە بریی: "هاد" كە ئیسمی فاعیل(بكەر)ە ﴿هُدىً﴾ بەكارهێناوە كە مەصدەر(چاوگ)ە. (وەرگێڕ)

(٢) جۆرە بۆیەیەكی سوورە.

ونذكرُ على وجه المثالِ ثلاثاً من الروابط الثِنْتَي عشْرةَ لتقيسَ عليها البواقي:

فـ﴿الٓمٓ﴾ أي هذا يتحدّى كلَّ مُعارض، فهو أكملُ الكتب، فهو يقينيٌّ؛ إذ كمالُ الكتاب باليقين، فهو مُجسَّمُ الهداية للبشر..

ثم ﴿ذَٰلِكَ الْكِتَابُ﴾ أي هو ازدادَ على أمثاله فهو مُعجِزٌ - أو - أي هو ممتازٌ ومستثنى؛ إذ لا شكَ فيه؛ إذ إنه يُري السبيلَ السويَّ للمتقين..

ثم ﴿هُدىً لِلْمُتَّقِينَ﴾ أي يرشدُ إلى الطريق المستقيم، فهو يقينيٌّ، فهو ممتازٌ، فهو مُعجِزٌ.. وعليك باستنباط البواقي.

أما ﴿هُدىً لِلْمُتَّقِينَ﴾ فاعلم أنَّ منبعَ حُسن هذا الكلام من أربع نقط:

**الأولى:**

حذفُ المبتدأ، إذ فيه إشارةٌ إلى أنَّ حُكمَ الاتحادِ مسلَّمٌ. كأنَّ ذاتَ المبتدأ في نفس الخبر. حتى كأنه لا تغايُرَ بينَهما في الذهن أيضاً.

**والثانية:**

تبديلُ اسم الفاعلِ بالمصدر، إذ فيه رمزٌ إلى أنَّ نورَ الهداية تجسَّمَ فصار نفسَ جوهر القرآن؛ كما يتجسمُ لونُ الحُمرة فيصيرُ قرْمِزاً[1].

**والثالثة:**

تنكيرُ ﴿هُدىً﴾ إذ فيه إيماءٌ إلى نهاية دقةِ هداية القرآن حتى لا يُكْتَنَهُ كُنْهُها، وإلى غاية وُسعتِها حتى لا يُحاطُ بها علماً. إذ المنكوريةُ إما بالدقة والخفاء، وإما بالوسعة الفائتةِ عن الإحاطة..

---

(١) قِرمز: بالكسر، صبغ أرمني أحمر، يقال: إنه من عصارة دود في آجامهم. (كتاب العين ٥/ ٢٥٥) (لسان العرب).

بە هۆی فراوانی‌یەكی ئەوتۆیـە كـە دەورەدانـی لـە توانـادا نی‌یـە. هـەر لێرەشـەوەیە كـە بـە نـەكیرە دانـانی هـەر شتێك هـەندێ جـار لـەبەر سـووكایەتی پێكردنـە و، هـەندێ جـاری دیكەش بۆ گەورە ڕاگرتنە.

چوارەم: "كورتكردنەوە"ش لە ﴿لِلْمُتَّقِينَ﴾دا لە بریی: "للناس الذين يصيرون متقـــين بە" كورتكردنەوەیەكە بە "مەجازی ئەول"[1] وەك ئاماژەیەك بـە بـەروبووم و كاریگـەریی هیدایەت و، هێمایەكیش بۆ بەڵگەی "إنّي"[2] لەسەر بوونـی هیدایـەت. چونكـە بیسـەری هەر سەردەمێك بەڵگە بەوانەی پێش خۆی دەهێنێتەوە، هـەروەك ئەوانـەی كـە دوای ئـەو دێن بەڵگە بەو دەهێننەوە.

* ئەگەر وتت:

چۆن بە هۆی ئەم چەند خاڵە كەمەوە ڕەوانبێژی‌یەك پەیدا دەبێت كە لە وزەی مرۆڤ بەدەر بێت؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێ:

"هاوكاری" و "كۆبوونەوە" نهێنی‌یەكی سەیریان تێدایە!

چونكە ئەگەر جوانیی سێ شت كۆ ببنەوە وەك جوانیی پێنج دانەی لێ دێت و، پێنجیـش وەك هــی دە و، دەیـش وەك هــی چـل دانــە. ئـەوەش بـــە هـــۆی نـــهێنیی ڕەنگدانەوەیان و دەركەوتنیان لە یەكتریدا. چونكە هەموو شتێك جۆرە تێدادەركەوتن و پلەیـەكی تێدانواندنی هەیە. هـەروەك ئەگـەر دوو ئاوێنـە بەرامبـەر یـەك كـۆ بكەیتـەوە، چەندین ئاوێنەی زۆریان تێدا دەبینـرێت. یـان گـەر بـە چرایـەك ڕووناكیـان بكەیتـەوە، بـە هۆی تێدا دەركەوتنی تیشكەكان، ڕووناكیی هەموو یەكێكیان زیاد دەبێت..

كۆبوونەوەی سەرنجەكان و خاڵەكانیش بە هەمان شێوەیە.

---

(١) واتە ئەو مەجازە مورسەلەی كە "پەیوەندی"ی نێوان واتا ئەسلی و مەجازی‌یەكەی بە پێی "ما يؤولُ إليه" (دەرەنجام)ە. وەك: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ﴾ (الزمر: ٣٠) و، ﴿أَعْصِرُ خَمْراً﴾ (یوسف: ٣٦). (وەرگێڕ)

(٢) بەڵگەی "إنّي" و "لِمّي" دوو زاراوەن لە دەقەكەدا لە مەولا ڕاڵەیان دێت. "إنّي" لە پیتی "إنّ"ی (موشەببەهـ بە فیعل) وەرگیراوە كە بوون و بەردەوامی دەگەیەنێت، بەڵام "لِمّي" لە وشەی "لِمَ" وەرگیراوە و بۆ هۆكارێتی بەكاردەهێنرێت. لە "التعريفات"ی جورجانیشدا هاتووە كە: "لِمّي" بەڵگەهێنانەوەیـە بە هۆكـار لەسـەر شتی زانراو، بەڵام "إنّي" بەڵگەهێنانەوەیە بە شتی زانراو لەسەر هۆكارەكەی.

ومن هنا قد يكونُ التنكيرُ للتحقيرِ وقد يكونُ للتعظيم.

**والرابعة:**

الإيجازُ في ﴿لِلْمُتَّقِينَ﴾ بدلَ "للناسِ الذين يصيرون مُتقين به" أوجزَ بالمجاز الأوّل[1] إشارةً إلى ثمرة الهدايةِ وتأثيرِها، ورمزاً إلى البرهان "الإِنّيّ"[2] على وجود الهداية. فإن السامعَ في عصرٍ يستدلُّ بسابقه كما يستدلُّ به لاحقُه.

* إن قلتَ:

كيف تتولدُ البلاغةُ الخارجةُ عن طَوق البشر بسبب هذه النقطِ القليلة المعدودة؟

قيل لك:

إنَّ في التعاون والاجتماع سراً عجيباً!

لأنه إذا اجتمعَ حُسنُ ثلاثةِ أشياءَ صار كخمسةٍ، وخمسةٌ كعشرةٍ، وعشرةٌ كأربعين بسر الانعكاسِ. إذ في كل شيء نوعٌ من الانعكاس ودرجةٌ من التمثُّلِ..

كما إذا جمعتَ بين مرآتين تتراءى فيهما مرايا كثيرةٌ، أو نوَّرْتَهما بالمصباح يزدادُ ضياءُ كلٍّ بانعكاس الأشعة؛ فكذلك اجتماعُ النُّكَت والنقط.

---

(١) أي المجاز المرسل.

(٢) البرهان الإنيّ واللِّمِّيّ: إصطلاحان يرد شرحهما، فالإنّي - بتشديد النون - مصدر صناعي مأخوذ من «إن» المشبهة بالفعل التي تدل على الثبوت والوجود. أما اللمّي، فهو مصدر صناعي مأخوذ من كلمة «لِمَ» للعلية. وفي (التعريفات للجرجاني) الاستدلال من العلة إلى المعلول برهان لَمِّيّ ومن المعلول إلى العلّة برهان إنّيّ.

لەم حیکمەت و نهێنییەشەوەیە کە هەموو خاوەن کەماڵ و خاوەن جوانییەك حەزێکی سروشتی لە خۆیدا دەبینێت کە بڕواتە تەنیشتی هاووێنەکەی و دەستی هاوشێوەکەی بگرێت، تاکو جوانییەکی تر لەسەر جوانیی خۆی زیاد بکات. تەنانەت بەرد لەگەڵ بەردبوونیشیدا کاتێ لە دەستی بەنّنای بنمیچی چەماوە دەچێتەدەر، لار دەبێتەوە و سەری نەوی دەکات هەتا بەر سەری براکەی بکەوێت تاکو یەکتری بگرن و نەکەونە خوارەوە!

کەواتە ئەو مرۆڤەی لە نهێنیی "هەرەوەزی" تێنەگات لە بەرد بێ گیانترە، چونکە "بەرد" هی وایان هەیە بۆ یارمەتیی براکەی دەچەمێتەوە!

* ئەگەر وتت:

ڕێنمایی و ڕەوانبێژی دەبێ ڕوون و ئاشکرا بن و، زەینەکان لە پەرتەوازەیی بپارێزن. ئیتر بۆچی تەفسیرنووسان لە تەفسیری ئەم چەشنە ئایەتەدا جیاوازییەکی پەرت و بڵاویان تێدایە و، چەندین گریمانی جیاجیایان پێش چاو خستووە و، چەندەها ڕووی دارشتنی جیاوازیان ڕوون کردووەتەوە؟ ئایا "حەق" لە ناو ئەمانەدا چۆن دەناسرێتەوە؟

پێت دەوترێ:

دەگونجێ هەموویان حەق بن سەبارەت بە گوێبیستێك هەتا دەگاتە گوێبیستێکی تر. چونکە قورئانی پیرۆز تەنها بۆ خەڵکی سەردەمێك یان بۆ تەنها توێژێك نازڵ نەبووە، بەڵکو بۆ خەڵکی هەموو سەردەمەکان و گشت توێژەکانی مرۆڤ هاتووە و، بۆ تەنیا چینێکی خەڵکی نییە، بەڵکو بۆ هەموو چین و جۆرەکانی ئادەمیزادە و، هەموو یەکێکیان بەشی خۆیان لە تێگەیشتنیدا هەیە. ئەمەش لە حاڵێکدایە کە تێگەیشتنی نەوەی مرۆڤ پلە بە پلە دەگۆڕێت و، چێژەکانیشی لایەن بە لایەن جیاواز دەبێت و، حەز و مەیلیشی بەملا و ئەولادا پەرتەوازە دەبێت و، جوان هەڵسەنگاندنیشی بۆ شتەکان لە ڕوویەکەوە بۆ ڕوویەکی تر جیا جیایە و، چێژبردنیشی لە جۆرێکەوە بۆ جۆرە شتێکی تر جۆراوجۆرە و، سروشتیشی سەبارەت بە بەشێك هەتا بەشێکی تر جیاوازە. ئەوەتا زۆر شت هەیە لە ڕوانینی دەستەیەکدا جوانە، نەك لە ڕوانینی دەستەیەکی تردا و.. توێژێك چێژی لێ دەبینێت، بەڵام توێژێکی تر دانابەزێتە ئاستی.

ئیتر بۆ خۆت لەمەوە شتی تر بەم پێوەرە هەڵبسەنگێنە!

ومن هذا السرِّ والحكمةِ ترى كلَّ صاحبِ كمالٍ وصاحبِ جمالٍ يرى من نفسه ميلاً فطرياً إلى أنْ ينضمَّ إلى مثيله ويأخذَ بيد نظيره ليزدادَ حُسناً إلى حُسنه. حتى إنَّ الحَجرَ مع حَجَريته إذا خرجَ من يد المعقِّد الباني في السقف المحدَّب يميلُ ويُخضِعُ رأسَه ليُماسَّ رأسَ أخيه ليتماسكا عن السقوط..

فالإنسانُ الذي لا يُدركُ سرَّ التعاون لهو أجمدُ من الحجر؛ إذ مِن الحجر مَن يتقوسُ لمعاونة أخيه!

* إن قلتَ:

من شأن الهداية والبلاغةِ البيانُ والوضوحُ وحفظُ الأذهان عن التشتت، فما بالُ المفسرين في أمثال هذه الآية اختلفوا اختلافاً مشتِّتاً، وأظهروا احتمالاتٍ مختلفةً، وبيّنوا وجوهَ تراكيبَ متباينةٍ، وكيف يُعرَفُ الحقُّ من بينها؟

قيل لك:

قد يكونُ الكلُّ حقاً بالنسبة إلى سامعٍ فسامعٍ؛ إذ القرآنُ ما نزلَ لأهل عصرٍ فقط بل لأهل جميع الأعصار، ولا لطبقة فقط بل لجميع طبقات الإنسان، ولا لصنف فقط بل لجميع أصناف البشر. ولكلٍّ فيه حصةٌ ونصيبٌ من الفهم..

والحالُ أنَّ فهمَ نوعِ البشر يختلفُ درجةً درجةً.. وذوقَه يتفاوتُ جهةً جهةً.. وميلَه يتشتتُ جانباً جانباً.. واستحسانَه يتفرقُ وجهاً وجهاً.. ولذتَه تتنوعُ نوعاً نوعاً.. وطبيعتَه تتباينُ قسماً قسماً. فكم مِن أشياءَ يستحسِنُها نظرُ طائفةٍ دون طائفة، وتستلذُّها طبقةٌ ولا تتنـزَّلُ إليها طبقةٌ. وقِس!

لەبەر ئەم نهێنی و حیکمەتەیە کە قورئان گەلێ جار شتی "تایبەت" حەزف دەکات لەبەر گشتاندنی، تاکو هەرکەسە و بە پێی خواستی چێژ و نرخ شناسیی خۆی تەقدیری حەزف کراوەکە بکات[١].

قورئان ڕستەکانی خۆی بە شێوەیەك هۆنیوەتەوە و لە شوێنێکدا دایناوە کە لە هەموو لاکانیەوە دەرگای چەندین ڕووی گریمانکراو بکرێتەوە، ئەوەش لەبەر چاودێریی تێگەیشتنە جیاجیاکان، تاکو هەموو یەکێکیان بەشی خۆی لێ وەربگرێت.

ئیتر بۆ خۆت شتی تر بەم پێوەرە لێکبدەرەوە.

کەواتە دروستە هەموو ئەو ڕووە زۆرانە جێی مەبەست بن، بە مەرجێ "زانستەکانی زمانی عەرەبی" نەیانگێڕنە دواوە و، "ڕەوانبێژی" بە جوانیان بزانێت و، "زانستی بناغەکانی ئامانجی شەریعەت"یش وەریان بگرێت.

لەم سەرنجەوە دەرکەوت کە یەکێك لە ڕووەکانی ئیعجازی قورئان: هۆنین و داڕشتنیەتی لە شێوازێکدا کە لەگەڵ تێگەیشتنی چەرخ لە دوای چەرخ و چین لە دوای چیندا پڕاوپڕ دەربچێت.

* * *

(١) "حەزف کردن"ی وشەیەك، واتە لابردنی، هەندێ جار "گشتاندن" بەرهەم دەهێنێت. بۆ نموونە، گەر بڵێیت: "ئازاد دەبەخشێت". واتە شتە بەخشراوەکە حەزف بکەیت، ئەوا بەم کارەت بەخشینەکە دەگشتێنیت بۆ زۆر شتی وەك: پارە، زێڕ، زیو، پۆشاك، خۆراك، زانست.. هتد. بەڵام گەر بەیەکێکیانت دیاری بکردایە، گشتاندنەکەی تێدا نەدەما. (وەرگێڕ)

فلأجل هذا السرِّ والحكمةِ أكْثَرَ القرآنُ من حذفِ الخاصِ للتعميم ليقدِّرَ كلٌّ مُقتضى ذوقِه واستحسانِه.

ولقد نظَمَ القرآنُ جُمَله ووضعَها في مكان ينفتحُ من جهاته وجوهٌ محتملةٌ لمراعاة الأفهام المختلفة ليأخذَ كلُّ فهمٍ حصته. وقس!

فإذن يجوزُ أنْ تكونَ الوجوهُ بتمامها مُرادةً، بشرط أنْ لا تردَّها علومُ العربية، وبشرط أن تستحسنَها البلاغةُ، وبشرط أن يقبلَها علمُ أصول مقاصد الشريعة.

فظهرَ من هذه النكتة أنَّ من وجوه إعجازِ القرآنِ نظمَه وسبكَه في أسلوب ينطبقُ على أفهامِ عصرٍ فعصرٍ.. وطبقةٍ فطبقة.

***

﴿الَّذِينَ يُؤْمِنونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَمِمَّا رَزَقْناهُمْ يُنْفِقُونَ﴾ (البقرة: ٣)

﴿الَّذِينَ يُؤْمِنونَ بِالْغَيْبِ﴾.

بزانە کە: هۆی هۆنینی "دەستکەوت" لەگەڵ "بەدەستهێنەر"دا دارشتنی مەدحی قورئانە لە تەنیشت مەدحی ئیمانداران و گونجانیەتی لەگەڵیدا.. چونکە "ئیمانداران" ئەنجامی هاتنی قورئان و، بەڵگەی "ئینني"ن لەسەری و، بەروبوومی هیدایەتی ئەون و، شایەتن بۆی. ئنجا بەهۆی لەخۆگرتنی هاندان و شەوق بەخشین، ئاماژەیە بۆ هۆی بەشی ئەم ئایەتە لە هیدایەتدان و، بۆ ئەوەش کە نموونەیەکی ئەو هیدایەتەیە.

هۆی هۆنینی ﴿الَّذِينَ﴾ش لەگەڵ ﴿الْمُتَّقِينَ﴾دا بەدواداهێنانی "جوانکاری"یە لە دوای "خاوێنکاری" کە هاوڕێی هەمیشەییەتی! چونکە "ئارایشت" لە دوای "پاکژی" دێت..

ئایا نابینی "تەقوا" کە بریتی‌یە لە وازهێنان و دەستبەرداربوون لە خراپەکاری، قورئان هەر سێ پلەکەی باس کردووە کە بریتین لە: وازهێنان لە شیرك.. پاشان دەست هەڵگرتن لە گوناهەکان.. دواتر دەستبەرداربوون لە هەموو شتێکی جگە لە خوای گەورە..

دانانی "جوانکاری"ش لە جێگایاندا، کە بریتی‌یە لە کردارە چاکەکان: یان بە "دڵ" یان بە "جەستە" یان بە "سامان" دەبێت.. ئەوەتا خۆری کردارەکانی دڵ "ئیمان"ە و.. پێرستی لەخۆگری سەرجەم کردارەکانی جەستە "نوێژ"ە، کە کۆڵەکەی ئایینە و.. جەمسەری کردارەکانی لەمەڕ سامانیش "زەکات"ە، کە پردی ئیسلامە.

بزانە کە: ئەگەر لە ﴿الَّذِينَ يُؤْمِنونَ بِالْغَيْبِ﴾دا سەیری خواستی حاڵ و مەقام بکەیت، بە کورت (إيجاز) دەردەکەوێت.. بەڵام ئەگەر لەگەڵ هاوواتاکەیدا بەراوردی بکەیت کە "المؤمنونَ"یە، پێت وا دەبێت کە درێژەپێدان (إطناب) بێت..

﴿الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ
وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾ (البقرة: ٣)

﴿الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ﴾.

اعلم أنَّ وجهَ نظمِ المحصَّلِ مع المحصَّل انصبابُ مدحِ القرآنِ إلى مدحِ المؤمنين وانسجامُه به؛ إذ إنَّه نتيجةٌ له، وبرهانٌ إنّيّ عليه، وثمرةُ هدايته، وشاهدٌ عليه. وبسبب تضمُّنِ التشويق إشارةٌ إلى جهة حصّةِ هذه الآية من الهداية، وإلى أنَّها مثالٌ لها.

أما وجهُ ﴿الَّذِينَ﴾ مع ﴿لِلْمُتَّقِينَ﴾ فتشييعُ التخلية بالتحلية التي هي رفيقتُها أبداً؛ إذ التزيينُ بعدَ التنـزيه، ألا ترى أنَّ التقوى هي التخلّي عن السيئات. وقد ذكرَها القرآنُ بمراتبِها الثلاث، وهي: تركُ الشرك، ثم تركُ المعاصي، ثم تركُ ما سوى الله. والتحليةُ فعلُ الحسنات: إمّا بالقلب أو القالب أو المال. فشمسُ الأعمال القلبية: "الإيمانُ". والفهرستةُ الجامعةُ للأعمال القالبية: "الصلاةُ" التي هي عمادُ الدين. وقطبُ الأعمال المالية: "الزكاة"، إذ هي قَنْطَرَةُ الإسلام.

اعلم أنَّ ﴿الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ﴾ مع أنَّه إذا نظرتَ إلى مقتضى الحال إيجازٌ، إلّا أنَّه إذا وازنتَ بينَه وبين مرادفِه وهو "المؤمنون" تظنُّه إطناباً..

دەبینیت ﴿الَّذِينَ﴾ی لە بریی "ال" بەكار هێناوە، كە تەنها بە "صیلـە" ئاماژە بۆ زات لەخۆ دەگرێت[1]، وەك بڵێی زاتەكە تەنها ئەو سیفەتەی هەیە. ئەمەش بە مەبەستی شـەوق بەخشین و هاندانە بۆ "ئیمان" و بۆ گەورە ڕاگرتنیەتی، وەك هێمایەكیش وایـە بـۆ ئـەوەی كە "ئیمـان" نیشـانەیەكی ئـەوتۆی زاتەكەیـە كـە سـەرجەمی سیفەتەكانی تـری لـەچاودا بچووك بوونەتەوە..

هەروەهـا ﴿يُؤْمِنُونَ﴾ی لە بریی "مؤمنون" بەكارهێنـا، بە مـەبەسـتی وێنەكێشـان و دەرخستنی ئـەو حاڵەتـە جوانـە لـە پێش چاوی ئەندێشـەدا و، بۆ ئاماژەدانیش بـە نـوێ بوونـەوەی بـەهۆی بەردەوامی‌یـەوە و، دەركەوتنیشـی بـەهۆی هاوتـەریب بوونـی لـەگـەڵ بەڵگە ئاسۆیی و دەروونی‌یەكاندا، ئیتر هـەتا ئـەو بەڵگانـە پـتر دەربكـەون، ئیمـاندارانیش ئیمانیان زیاتر دەبێت.

﴿بِالْغَيْبِ﴾ واتـە بـە دڵ، بە واتـای ئیخـلاسێكی بێ دووڕوویی.. لـەگـەڵ پەنهانیی ئیمان پێ هێنراودا.. هەروەها باوەڕهێنان بە نادیار.. هەروەها بە جیهانی پەنهان.

ئەوەش بزانە كە:

"ئیمان" ڕووناكی‌یەكە دەرەنجامی سەلماندنی هەموو ئـەو شتانەیە كـە پێغەمبـەر ﷺ بـە دووروودرێژی لە پێداویستی‌یەكانی ئاییندا و، بە پوختیش لە شتی تردا، هێناویەتی.

* ئەگەر وتت:

"گشتینەی خەڵك" مەگەر لە سەدا یەك دانەیان، دەنا كەسی تریـان توانـای دەربڕینی "ڕاستی‌یەكانی ئیمان"ی نی‌یە؟

پێت دەوترێ:

گوزارشـت نـەكردن نیشـانەی "نـەبوون" نی‌یـە. چونكـە هـەروەك زۆر جـار "زمـان" دەستەوسان دەبێت لـەوەی كە وردەكاری‌یەكانی بۆچوونی "ژیری" دەربـبڕێت، بە هەمان جۆر نهێنی‌یـەكانی نـاو "ویژدان"یـش لـە "ژیـری" دەرناكـەوێت، تەنانـەت خـۆی لێـڵ و تەماویش نیشان دەدات، ئیتر چۆن دەتوانێت هەموو شتێكی ناو ویژدان دەربـبڕێت؟

---

(١) چونكە "الذين" لە ئیسمە نادیارەكانە، بۆیە پێویستی بە "صیلە"یەك دەبێت كە دەستنیشانی بكات. (ت) "صیلە"ش بەو ڕستەیەی دوای ئیسمە مەوصوولەكە دەڵێن كە پەنهانی و نادیاریی ئەو لادەبات، بەو هەل و مەرجەی كە لە كتێبەكانی ڕێزمانی عەرەبیدا ڕوون كراوەتەوە. (وەرگێڕ)

فأبدَلَ "ال" بـ﴿الَّذِينَ﴾ الذي من شأنه الإشارةُ إلى الذات بالصلة فقط[١]، كأنّه لا صفةَ له إلّا هي، للتشويقِ على الإيمان، والتعظيمِ له؛ والرمزِ إلى أنَّ الإيمانَ هو المنارُ على الذات؛ قد تضاءلتْ تحته سائرُ الصفات..

وأبدلَ "مؤمنون" بـ ﴿يُؤْمِنُونَ﴾؛ لتصوير وإظهارِ تلك الحالة المستحسَنة في نظر الخيال، وللإشارة إلى تجدُّدِه بالاستمرار وتجلّيه بترادفِ الدلائلِ الآفاقية والأنفسية، فكلما ازدادتْ ظهوراً ازدادوا إيماناً.

﴿بِالْغَيْبِ﴾ أي بالقلب، أي بالإخلاص بلا نفاقٍ. ومع الغائِبيَّة.. وبالغائب.. وبعالَمِ الغيب.

واعلم أنَّ الايمانَ هو النورُ الحاصلُ بالتصديق بجميع ما جاء به النبي عليه السلام تفصيلاً في ضروريات الدين وإجمالاً في غيرها.

* إنْ قلتَ:

لا يقتدرُ على التعبير عن حقائق الإيمانِ مِن العوام مِن المائةِ إلّا واحدٌ؟

قيل لك:

إنَّ عدمَ التعبير ليس عَلَماً على عدم الوجودِ؛ فكما أنَّ اللسانَ كثيراً ما يتقاصرُ عن أنْ يُترجِمَ عن دقائق ما في تصوراتِ العقل؛ كذلك قد لا يتراءى بل يتغامضُ عن العقل سرائرُ ما في الوجدان، فكيف يُتَرجِمُ عن كلِّ ما فيه؟

---

(١) لأن "الذين" من الأسماء المبهمة، لذا فإن صلته هي التي تميّزه وتعينه. (ت)

ئایا نابینیت زیرەکیی پێشەوایەکی بلیمەتی وەك "سەکاکی"[(١)] چۆن دەستەوسان ما لە بەرچنیی ئەو وردەکارییانەی کە سەلیقەی "إمرؤ القیس"[(٢)]، یان هەر دەشتەکییەکی تر پێش چاویان خستووە؟

جا لەسەر ئەم بناغەیە، بەڵگەهێنانەوە لەسەر بوونی ئیمان لای کەسی عەوام بە پرسیار لێکردنی دەسەلمێت، بەوەی کە ئەم چەشنە پرسیارەی نێوان "نەفی" و "سەلماندن"ی لێ بکرێت:

ئەی کەسی نەخوێندەوار! ئایا دەچێتە عەقڵتەوە کە ئەو کردگارەی هەموو جیهان، بە هەر شەش لاکەیەوە، لەناو چنگی ئاڵوگۆڕ پێکردنیدا بووە، خۆی لەناو یەکێکی لاکانی جیهاندا جێگیر ببێت[(٣)] یان نا؟

جا ئەگەر وتی: "نەخێر".. ئەوا نەفی کردنی بوونی "لا" بۆ خوای گەورە، لە ویژدانی ئەودا، دەردەکەوێت و دەسەلمێت..

خۆ ئەمەش سەروزیادە.

بۆ خۆت ئەمە بکە بە پێوەر بۆ شتی تر.

پاشان "ئیمان" - وەك ئەوەی کە سەعد[(٤)] ڕاڤەی کردووە - نوورێکە خوای گەورە دەیهاوێتە دڵی هەر کەسێك لە بەندەکانی کە خۆی ویستی لەسەری بێت، واتە دوای لادانی جوزئی ئیختیاری. کەواتە "ئیمان" نوورێکە بۆ ویژدانی مرۆڤ و، تیشکێکی خۆری ئەزەلە[(٥)] هەر بە یەك جار سەرانسەری دیوی پەنهانی ویژدان ڕوونـاك دەکاتەوە.

---

(١) ناوی: (ئەبوو یەعقووب یووسفی کوڕی ئەبووبەکری سەکاکی)یە (٥٥٤ -٦٢٦ك/١١٥٩-١٢٢٨ز) لە خوارێزم (ئۆزبەکستانی ئێستا) لە دایك بووە. پێشەوای زانستەکانی ڕۆژگاری خۆی بووە. بەناوبانگترین بەرهەمی کتێبی: (مفتاح العلوم)ە. (وەرگێڕ)

(٢) ناوی (امرؤ القیس)ی کیندییە. لە نێوان ساڵەکانی (٤٩٧-٥٤٥ز)دا ژیاوە. بە مەزنترینی شاعیرە عەرەبەکان دادەنرێت و، یەکێکە لە خاوەن موعەللەقاتی شیعری جاهیلی.

(٣) واتە جێگایەك لە ناویاندا بگرێت؟

(٤) مەبەست (پێشەوا سەعدی تەفتازانی)یە (٧١٢، یان٧٢٧- ٧٩٣ك)، کە ناوی "مەسعوودی کوڕی عومەری کوڕی عەبدوڵلا"یە. لە تەفتازانی سەر بە خۆراسان لە دایك بووە و، پێشەوای زانایانی ڕۆژگاری خۆی بووە. ئەمەش ناوی هەندێکە لە کتێبەکانی: (تهذیب المنطق، شرح المقاصد، شرح العقائد النسفیة، المطول، مختصر المعاني، التلویح في کشف حقائق التنقیح). (وەرگێڕ)

(٥) گوزارشتێکی بەکارهاتووە لە ئەدەبی تورکی و فارسیدا سەبارەت بە خوای گەورە، کە لە ئەدەبی عەرەبیدا بەکارنەهاتووە.

ألا ترى ذكاءَ السكاكي ذلك الإمامِ الداهي قد تقاصرَ عن اجتناء دقائقِ ما أبرزَتْه سجيّةُ امرئِ القيس، أو بدويٍّ آخرَ؟

فبناءً على ذلك، الاستدلالُ على وجود الإيمانِ في العامي يثبتُ بالاستفسار والاستيضاحِ منه، بأنْ تستفسرَ مِن العاميّ بالسؤال المردَّدِ بين النفي والإثبات هكذا:

أيها العاميُّ! أيمكنُ في عقلك أنْ يكونَ الصانعُ الذي كان العالَمُ بجهاتِه الستِّ في قبضةِ تصرفِه أنْ يتمكّنَ[1] في جهة من جهاته أو لا؟

فإنْ قال: "لا"، فنفيُ الجهة ثابتٌ في وجدانه.

وذلك كافٍ.

وقسْ على هذا..

ثم إنَّ الإيمانَ - كما فسّرَه السعدُ - نورٌ يقذفُه اللهُ تعالى في قلب مَن يشاءُ من عباده، أي بعدَ صرفِ الجزءَ الاختياري. فالإيمانُ نورٌ لوجدان البشرِ وشعاعٌ من شمس الأزلِ[2] يُضيءُ دفعةً ملكوتيةَ الوجدان بتمامِها. فينشرُ أُنسيةً له مع كلِّ الكائناتِ.. ويؤسِّسُ مناسبةً بين

(١) يتحيز في مكان.

(٢) تعبير مألوف بحق الله جلّ جلاله، في الأدب التركي والفارسي بخلاف الأدب العربي. ويُقصد منه المنور لكل شيء.

ئیتر هاودەمی‌یەك بۆ ئەو ویژدانە لەگەڵ هەموو بوونەوەراندا پەرە پێدەدات و، پەیوەندی‌یەکیش لە نێوان ویژدان و هەموو شتێکدا دادەمەزرێنێت و، وره و هێزێکی مەعنەویی ئەوتۆش دەهاوێتە ناو دڵەوە کە مرۆڤ بە هۆیەوە بتوانێت لەگەڵ هەموو گرفت و ڕووداوەکاندا زۆران بگرێت و، فراوانی‌یەکی ئەوتۆی پێ دەبەخشێت کە "ڕابوردوو" و "داهاتوو" قووت بدات..

ئنجا هەروەك "ئیمان" تیشکێکە لە خۆری ئەزەلەوە.. بە هەمان جۆر، بریسکانەوەیەکی بەختەوەریی هەمیشەیی (واتە: حەشر)یشە. ئیتر بە ڕووناکیی ئەو بریسکەیە تۆوەکانی سەرجەم ئاواتەکان و ناوکی گشت ئەو تواناییانەش کە لە ویژداندا دانراون، گەشە دەکەن و، سەوز دەبن و، بەرەو هەتاهەتایی درێژ دەبنەوە و، ناوکی توانا و لێهاتنی مرۆڤیش وەکو "درەختی تووبا"ی لێ دێت.

﴿وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ﴾.

بزانە کە:

هۆی هۆنین لێرەدا لە خۆری کاتی نیوەڕۆ ئاشکراترە.

تایبەتکردنی "نوێژ"یش لە نێوان کردارە چاکەکانی جەستەدا، ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە نوێژ (بە وێنەی فاتیحە بۆ قورئان و مرۆڤیش بۆ جیهان) وایە؛ پێرست و، نموونە و، دەرخەری هەموو کردارە چاکەکانە. چونکە "نوێژ" جۆرێکی لە ڕۆژوو و، حەج و، زەکات و، جگە لەمانەشی گرتووەتەوە و، جۆرەکانی پەرستشی سروشتی و ئیختیاریی بوونەوەرانیشی لەخۆ گرتووە:

لە هی مەلائیکەتەکان، کە تێکڕا لە "ڕکووع و سوژدە و وەستان"دان و.. لە هی بەردی سوژدەبەر و.. درەختی ڕاوەستاو و.. ئاژەڵی چەماوەی سەر بە ڕکووع.

پاشان ﴿يُقِيمُونَ﴾ی لە جێی "المقيمين" دانا، تاکو ئەو بزووتنەوە زیندووە فراوان و، بێداری‌یە ڕۆحانی‌یە خواییەی جیهانی ئیسلامی لە بەردەم بینینی گوێ بیستدا ئامادە بکات و، ئەو دۆخە جوان و بارە ڕێکوپێکەی هەموو گۆشەیەکی نەوەی ئادەمیزاد لە پێش چاوی ئەندێشەدا دابنێت، هەتا مەیلی گوێ بیست بێدار بکاتەوە و، بۆ چاولێکردنیان بیورووژێنێت..

الوجدانِ وبين كل شيء.. ويُلقي في القلب قوةً معنوية يقتدرُ بها الإنسانُ أنْ يُصارعَ جميعَ الحوادث والمصيبات.. ويُعطيه وُسْعةً يقتدرُ بها أنْ يبتلعَ الماضيَ والمستقبل.

وكما أنَّ الايمانَ شعاعٌ من شمس الأزل؛ كذلك لمعةٌ من السعادة الأبدية أي الحشرِ. فينمو بضياء تلك اللمعة بذورُ كلِّ الآمال، ونواةُ كلِّ الاستعدادات المودَعة في الوجدان، فتنبتُ ممتدةً إلى الأبد، فتنقلبُ نواةُ الاستعداد كشجرة طوبى.

﴿وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ﴾.

اعلم أنَّ وجهَ النظم أظهرُ من الشمس في رابعة النهارِ. وأنَّ في تخصيص "الصلاةِ" مِن بين حسنات القالبِ إشارةً إلى أنّها فهرستةُ كل الحسنات وأنموذجُها ومَعْكسُها. كالفاتحةِ للقرآن، والإنسانِ للعالَم. لاشتمالها على نوع صومٍ وحج وزكاة وغيرها، ولاشتمالها على أنواع عبادات المخلوقات، الفطرية والاختيارية مِن الملائكة الراكعين الساجدين القائمين، ومِن الحجر الساجد، والشجر القائم، والحيوان الراكع..

ثم إنَّه أقامَ ﴿يُقِيمُونَ﴾ مقامَ "المقيمين" لإحضار تلك الحركةِ الحياتية الواسعة والإنتباهِ الروحاني الإلهي في العالم الإسلامي إلى نظر السامع. ووضعِ تلك الوضعيةِ المستحسَنة والحالةِ المنتظَمة مِن نواحي نوع البشر نُصبَ عين الخيالِ، ليهيّجَ ويوقظَ ميَلانَ السامع للتأسّي..

چونکە هەر کەسێك سەرنج لە کاریگەریی دەنگی ئەو ئامێرە زانراوە بدات[1] لەو سەربازە بڵاوە لێ کردووانەی کە ناونیشانیان لەناو خەڵکیدا نی‌یە و، بزواندنی تەنها یەك جاری ئەو دەنگە بۆیان و، بێداری نانەوە لە نێوانیاندا و، ڕۆکردنیان لە دۆخ و شێوەیەکی جواندا و، کۆکردنەوەیان لە ژێر سایەی ڕێسایەکی ڕەنگیندا.. ئەو کەسەی سەرنج لەمە دەدات، حەزێك لە خۆیدا دەبینێت کە ئەویش ئاوێتەیان ببێت!

جا "بانگی محەممەدی"ش، لە نێوان مرۆڤی ناو بیابانی جیهاندا - ﴿وَلِلّٰهِ الْمَثَلُ الأَعْلَى﴾ - بە هەمان شێوەیە.

لەبەر ئەوەش لە بواری "ئیجاز"دا "يُصَلُّونَ"ی بە کورتی بەکار نەهێنا، بەڵکو بە ﴿يُقِيمُونَ الصَّــلاةَ﴾ تەواوی کرد، تاکو ئاماژە بدات بە گرنگیی چاودێری کردنی واتاکانی "الإقامة" لە نوێژدا، لە ڕووی: ڕێککردنەوەی ڕوکنەکانی و، بەردەوامبوون لەسەری و، پارێزگاری کردنی و، بە هەند وەرگرتنی و، برەو پێدانی لە بازاڕی جیهاندا. ئیتر بۆخۆت بیری لێ بکەرەوە!

پاشان "نوێژ" پەیوەندی‌یەکی بڵند و، بۆنەیەکی بەنرخ و، خزمەتێکی خاوێنە لە نێوان بەندە و پادشای ئەزەلدا. ئەو پەیوەندی‌یەش وەهایە کە هەموو گیانێك شەیدای ببێت..

ڕوکنەکانیشی ئەو نهێنی‌یانەیان لەخۆ گرتووە کە کتێبەکانی هاوشێوەی "الفتوحات المكية"[2] ڕاڤەیان کردووە. خۆ ئەو نهێنی‌یانەش شایانی ئەوەن کە هەموو ویژدانێك خۆشی بوێن..

هەروەها "نوێژ" بانگهێشتی کردگاری ئەزەلە بۆ میوانداریی حوزووری خۆی، کە لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا پێنج جار بەندەکانی بانگهێشت دەکات بۆ موناجات لەگەڵ کردگاردا، کە ئەوەش وەکو میعراجێك وایە؛ شایستەی ئەوەیە هەموو دڵێك تاسەمەندی بێت..

هەروەها "نوێژ" درێژەدان بە تەسەووری گەورەیی کردگار لەناو دڵاندا لەخۆ دەگرێت و، ئاراستەکردنی دڵانیشی بۆ ئەو مەزنی‌یە تێدایە بە مەبەستی دامەزراندنی گوێڕایەڵی بۆ یاسای دادگەریی خوای گەورە و، ملکەچ بوون بۆ ڕێسای پەروەردگار.

---

(١) شەیپووری سەربازی.

(٢) کتێبێکی محیّدینی کوڕی عەرەبی‌یە.

إذ مَنْ تأمَّلَ في تأثير النداءِ بالآلة المعروفة[1] في نفرات العسكرِ المنتشرين المغمورين بين الناس وتحريكِ النداءِ لهم دفعةً، وإلقاءِ انتباهٍ فيهم، وإفراغِهم في وضعٍ مستحسَنٍ، وجمعِهم تحتَ نظامٍ مُستملَح يرى في نفسِه اشتياقاً لأنْ ينسابَ إليهم.

فهكذا الأذانُ المحمَّديُّ بين الإنسان في صحراء العالَم - ﴿وَلله المَثَلُ الأعلى﴾ -..

وإنَّما لم يقتصرْ في مسافة الإيجاز على "يصلّون" بل أتمّها بـ﴿يُقِيمُونَ الصَّلاةَ﴾ للإشارةِ إلى أهميةِ مراعاة معاني "الإقامة" في الصلاةِ من تعديلِ الأركان، والمداومَةِ، والمحافظةِ، والجدِّ، وترويجِها في سوق العالَمِ. تأمَّل!

ثم إنَّ الصلاةَ نسبةٌ عالية، ومناسبةٌ غالية، وخدمةٌ نزيهة بين العبد وسلطان الأزلِ، فمِن شأنِ تلك النسبة أنْ يعشقَها كلُّ روح..

وأركانُها متضمنةٌ للأسرار التي شرحَها أمثالُ "الفتوحات المكية"[2]، فمِن شأنِ تلك الأسرارِ أنْ يحبَّها كلُّ وجدان..

وإنَّها دعوةُ صانعِ الأزل إلى سُرادِقِ حضوره خمسَ دعَواتٍ في اليوم والليلة لمناجاتِه التي هي في حُكم المعراجِ. فمِن شأنها أنْ يشتاقَها كلُّ قلب..

وفيها إدامةُ تصوّرِ عظمةِ الصانع في القلوب وتوجيهِ العقول إليها لتأسيس إطاعةِ قانونِ العدالة الإلهية، وامتثالِ النظام الرباني..

---

(١) البوق العسكري.

(٢) كتاب لمحي الدين بن عربي.

خۆ مرۆڤیش لەو ڕووەوە كە مرۆڤە، پێویستی بەو درێژەپێدانەیە، چونكە بە سروشت بەدیهاتوویەكی شارستانیی‌یە..

دەسا وەیل بۆ كەسێك واز لە نوێژ دەهێنێت و.. زەرەرمەندی بۆ ئەوەش تەمبەڵیی تێدا دەكات و.. ئەو كەسەش دەبێ چەندە نەفام بێت كە نرخی نەزانێت و.. ئەولاتر بچێت ئەوەی كە بە جوانی دانەنێت!

﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾.

هۆی هۆنینی ئەوەیە كە:

هەروەك "نوێژ" كۆڵەكەی ئایینە و ڕاگیربوونی ئایین بەوە، "زەكات"یش بە هەمان جۆر پردی ئیسلامە و، یارمەتیدانی یەكتریی نێوان موسڵمانان بە هۆی زەكاتەوەیە.

پاشان یەكێك لە مەرجەكانی ئەوەی كە "خێر" جێی شایانی خۆی بگرێت، ئەوەیە كە:

خێرەومەند ئیسراف نەكات، تاكو خۆیشی هەژار نەكەوێت و.. لەمی وەرنەگرێت بیدات بەو، بەڵكو لە سامانی خۆی بێت و.. بۆ ئەوەش نەیبەخشێت كە منەت بكات و لە بریی ئەوەدا زۆرتری بوێت و.. لە هەژاری نەترسێت و.. خێركردنیشی تەنها بە سامان نەبێت، بەڵكو بە زانست و هزر و كرداریش بێت و.. وەرگریشی لە هەرزەییدا بەكاری نەهێنێت، بەڵكو لە نەفەقە و پێداویستیدا خەرجی بكات.

لەبەر چاكە بەخشین بەم سەرنجانە و هەست پێكردنی مرۆڤیش بەم مەرجانە، قورئانی پیرۆز بە هەڵبژاردنی: ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾ لە بریی "يتصدقون" یاخود "يزكـــون"دا چاكە و خێرێكی بە تێگەیشتنەكان بەخشی!

چونكە بە ﴿مِنْ﴾ی "تبعیـض" ئاماژەی بۆ ڕەتكردنەوەی ئیسراف كردووە و.. بە پێشخستنی ﴿مِمَّا﴾ بۆ ئەوەی كە لە سامانی خۆی بێت و.. بە ﴿رَزَقْنَا﴾ش بۆ نەهێشتنی منەت. واتە خوا خۆی دەیبەخشێت و تۆیش هۆكاریت و.. بە گێڕانەوەی ڕۆزیی‌یەكەش بۆ لای ﴿نَا﴾ ئاماژەی داوە بە: "لا تخف من ذي العـــرش إقـــلالا"[1] و.. بە ڕەهایی هێشتنەوەی خێرەكەش ئاماژەی كردووە بە گشتاندنی بۆ سەرجەم بوارەكانی زانست و،

---

(١) واتە: ببەخشە.. ترست لە كەمبوونەوەی نەبێت لە لایەن خوای گەورەوە. بۆ پوختەی تەخریجەكەی بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر. (وەرگێڕ)

والإنسانُ يحتاجُ إلى تلك الإدامةِ من حيثُ هو إنسانٌ لأنَّه مدنيٌّ بالطبع..

فيا ويلَ من تركَها! ويا خسارةَ من تكاسَل فيها! ويا جهالةَ مَن لم يعرفْ قيمتَها! فسُحقاً وبُعداً وأُفّاً وتُفّاً[١] لنفسِ مَن لم يستحسنْها.

﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾.

وجهُ النظم: أنَّه كما أنَّ الصلاةَ عمادُ الدين وبها قوامُه؛ كذلك الزكاةُ قنطرةُ الإسلام، وبها التعاونُ بين أهله.

ثم إنَّ من شروطِ أنْ تقعَ الصدقةُ موقعَها اللائقَ:

أنْ لا يُسرفَ المتصدقُ فيقعُدَ ملوماً.. وأنْ لا يأخذَ مِن هذا ويعطيَ لذاك؛ بل من مال نفسه.. وأنْ لا يمنَّ فيستكثرَ.. وأنْ لا يخافَ من الفقر.. وأنْ لا يقتصرَ على المال، بل بالعلمِ والفكر والفعل أيضاً.. وأنْ لا يصرفَ الآخذُ في السفاهة، بل في النفقةِ والحاجة الضرورية.

فلإحسانِ هذه النُكتِ، وإحساسِ هذه الشروطِ تصدَّقَ القرآنُ على الأفهام بإيثارِ ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾ على "يتصدقون" أو "يزكّون" وغيرهما..

إذ أشارَ بـ﴿مِن﴾ التبعيضِ إلى ردِّ الإسراف..

وبتقديم ﴿مِمَّا﴾ إلى كونه من مال نفسه..

وبـ﴿رَزَقْنَا﴾ إلى قطع المنّة. أي إنَّ اللهَ هو المعطي وأنتَ واسطةٌ..

وبالإسناد إلى ﴿نَا﴾ إلى: "لَاتَخَفْ مِنْ ذِي الْعَرْشِ إِقْلَالاً"[٢]..

---

(١) الأف والتف: وسخ الأذن والأظفار، ثم استُعملا عند كل شيء يُضجر منه. (الزاهر للأنباري).

(٢) رواه البزار باسناد حسن والطبراني في الكبير. وحسّنه الحافظ ابن حجر. وهو صحيح بطرقه (صحيح الجامع الصغير رقم ١٥٠٨ وصحيح الترغيب برقم ٩١٢، والمشكاة برقم ١٨٨٥).

هزر و، جگە لەوانیش.. بە ماددەی ﴿يُنفِقُونَ﴾ش ئاماژەی داوە بە مەرجی خەرجکردنی وەرگرەکە لە نەفەقە و پێداویستی‌یە ناچاری‌یەکانیدا.

پاشان لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە:

"الزكاة قنطرة الاسلام"(١).

واتە: زەکات پردێکە موسڵمان بە سەریدا تێدەپەڕێ بۆ فریاگوزاریی برای موسڵمانی. چونکە زەکات هۆکاری ئەنجامدانی ئەو هەرەوەزی‌یەیە کە فەرمان بە موسڵمان دراوە لەگەڵ موسڵماناندا پیادەی بکات، تەنانەت ڕاستەشەقامە لە ڕێسای کۆمەڵایەتیی جۆری مرۆڤدا و، پەیوەندیدەری هاتوچۆی ماددەی ژیانە لە نێوانیاندا، بگرە چارەسەری ئەو ژەهرانەیە کە نێوانبڕی پێشکەوتنەکانی مرۆڤن.

بەڵێ، حیکمەتێکی مەزن و، بەرژەوەندی‌یەکی بلند و، میهرەبانی‌یەکی فراوان لە "واجب کردنی زەکات" و "حەرامکردنی سوو"دا هەیە. چونکە ئەگەر بە وردی و بە ڕوانینی مێژوویی سەیری لاپەڕەی جیهان بکەیت و، لە خراپکاری‌یەکانی گرۆی مرۆڤ ورد ببیتەوە، دەبینیت بەردی بناغەی هەموو پشێوی و خراپکاری‌یەك و، سەرچاوەی گشت ڕەوشتە نزمەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، تەنها دوو وشەن:

یەکەمیان:

"ئەگەر خۆم تێر بم، بەلامەوە گرنگ نی‌یە خەڵکی تر لە برساندا بمرن".

دووهەمیان:

"تۆ ڕەنج و تەقالا بدە هەتا من بیخۆم و، تۆ ماندوو ببە با من بحەوێمەوە".

هەر تەنها وشەی غەددار و چاوبرسی و ناشیرینی یەکەم بوو کە هێندە لەرزەی بە جیهانی مرۆڤ خست، وەخت بوو تیابچێت..

قرتێنەری دەماری ئەو وشەیەش جگە لە "زەکات" شتێکی تر نی‌یە.

وشەی ستەمکاری بەهەڵپە و شێواوی دووهەمیش بوو کە هێندە پێشکەوتنەکانی گرۆی مرۆڤی داڕماند، کە نزیکە بۆ ناو ئاگری ئاژاوە و بێ سەرەوبەرەیی بەر ببێتەوە..

لە ڕیشەدەرهێنەر و دەرمانی ئەو وشەیەش جگە لە "حەرامکردنی سوو" هیچ شتێکی دیکە نی‌یە. دەسا فەرموو بیری لێ بکەرەوە!

---

(١) بۆ پوختەی تەخریجەکەی بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر. (وەرگێڕ)

وبالإطلاق إلى تعميم التصدُّقِ للعلمِ والفكرِ وغيرهما..

وبمادةِ ﴿يُنفِقُونَ﴾ إلى شرطِ صرفِ الآخذِ في النفقةِ والحاجاتِ الضرورية.

ثم إنَّ في الحديث الصحيح: "الزَّكاةُ قَنْطَرَةُ الإسلام"[1] أي الزكاةُ جسرٌ يُغيثُ المسلمُ أخاه المسلمَ بالعبور عليها؛ إذ هي الواسطةُ للتعاون المأمورِ به، بل هي الصراطُ في نظام الهيئةِ الاجتماعيةِ لنوع البشرِ، وهي الرابطةُ لجَرَيان مادة الحياة بينهم، بل هي التِرياقُ للسموم الواقعة في تَرقِيّات البشر.

نعم، في "وجوبِ الزكاة" و"حُرمةِ الربا" حكمةٌ عظيمة، ومصلحةٌ عالية، ورحمةٌ واسعة؛ إذ لو أمعنتَ النظرَ في صحيفةِ العالَمِ نظراً تاريخياً وتأملتَ في مساوي جمعية البشر لرأيتَ أُسَّ أساسِ جميعِ اختلالاتِها وفسادِها، ومنبعَ كلِّ الأخلاقِ الرذيلةِ في الهيئةِ الاجتماعية كلمتين فقط:

إحداهما: "إنْ شَبِعْتُ فلا عليَّ أن يموتَ غيري من الجُوعِ".

والثانية: "اكْتَسِبْ أنْتَ لآكُلَ أنَا، واتْعَبْ أنتَ لأستريحَ أنَا".

فالكلمةُ الأولى الغدّارةُ النَهِمَةُ الشنعاءُ هي التي زلزلَت العالَمَ الإنسانيَّ فأشرفَ على الخراب. والقاطعُ لعِرق تلك الكلمة ليس إلّا "الزكاةُ".

والكلمةُ الثانيةُ الظالمةُ الحريصةُ الشوهاءُ هي التي هارتْ بترقِّياتِ البشر فأوشكَ أنْ تنهارَ بها في نار الهَرْج والمَرْج. والمستأصِلُ والدواءُ لتلك الكلمةِ ليس إلّا "حُرمة الربا". فتأمّلْ!

---

(١) أورده الهيثمي في المجمع (٣/ ٦٢) وقال: رواه الطبراني في الكبير والأوسط ورجاله موثقون إلّا "بقية مدلس" وهو ثقة، وقال المنذري في الترغيب والترهيب: (١/ ٥١٧) رواه الطبراني وفيه ابن لهيعة، والبيهقي وفيه بقية بن الوليد. والحديث ضعفه محقق الجامع الصغير برقم ٣١٩١ في ضعيف الجامع الصغير.

بزانە كە: ڕێكوپێكیی ژیانی كۆمەڵایـەتی مەرجەكـەی ئەوەیـە كـە چینـەكانی مرۆڤ لێكدانەبڕێن و، توێژی "تایبەتمەندان" لە توێژی "گشتینە"ی خەڵك و دەوڵەمـەندانیش لـە هەژاران هێندە دوور نەكەونەوە كە دەزووی پەیوەندیی نێوانیان بپچڕێت..

كەچی بە پشتگوێ خستنی "واجب كردنی زەكات" و "حەرام كردنی سوو" مـاوەی نێوان چینەكان لێك ترازا و، بـە ڕادەیـەكی ئـەوتۆیش چینـەكانی "تایبەتمـەندان" لـە "گشتینە" دوور كەوتنەوە كە پەیوەندی لە نێوانیاندا نەما..

بە داخەوە..

لە بریی ڕێز و گوێڕایەڵی و خۆبردنەپێشەوەی خۆشەویستی، دەبینیت تەنها زایەڵەی: پشێوی و، هاواری حەسوودی و، بۆڵەی ڕق و نـەفرەت، لـە چینە هـەرە نزمەكانـەوە بۆ هەرە بەرزەكان هەڵدەقوڵێت..

هەروەها لە بریی سۆز و چاكە و نەرمونیانی، تەنـها ئـاگری ستەم و، خۆسـەپاندن و، بروسكەی سووكایەتی پێكردن، لە توێژە هەرە بەرزەكانەوە بەسەر نزمەكاندا دەڕژێت.

هەر لەبەر ئەوەیە كـە دەبینیـت ئـەو ڕەوشتەی تایبەتمـەندان، كـە هـۆی خۆنەویستی و بەزەیی هاتنەوەیە، بووە بە هۆی خۆ بە گەورە گرتن و لەخۆ بایی بوون..

دەستەوسـانیی هـەژاران و دەسـتكورتیی زۆرینـەش، كـە دوو هۆكـاری بـەزەیی پێـدا هاتنەوەیان و مایەی چاكەكارییە لەگەڵیاندا، بوونەتە هۆكاری دیلی و نزمییان.

ئەگەر شایەتت لەسەر ئەمە دەوێت، سەیری خراپكـاری و ڕسـوایی حاڵـەتی جیـهانی شارستانی بكە. چونكە نموونە و شایەتی زۆری تێدا دەبینیت!

هیـچ پەنا و داڵدەیـەكیش بـۆ ئاشـتەوایی و نزیكبوونـەوەی نێـوان توێژەكـان شـك نـابرێت، جگـە لـەوەی كـە زەكـات - كـە یەكێكـە لـە پایـەكانی ئیسـلام - بكرێتـە دەستوورێكی بڵند و فراوانی هەڵسووڕاندنی ژیانی كۆمەڵایەتی.

* * *

اعلم أنَّ شرطَ انتظامِ الهيئة الاجتماعية أنْ لا تتجافى طبقاتُ الإنسان، وأنْ لا تتباعدَ طبقةُ الخواصِ عن طبقة العوامِ، والأغنياءُ عن الفقراءِ بدرجةٍ ينقطع خيطُ الصلة بينهم. مع أنَّ بإهمال وجوبِ الزكاة وحرمةِ الربا انفرجت المسافةُ بين الطبقات، وتباعدتْ طبقاتُ الخواص عن العوام بدرجةٍ لا صلةَ بينهما. ولا يفورُ من الطبقة السفلى إلى العليا إلّا أصداءُ[1] الاختلالِ، وصِياحُ الحسَد، وأنينُ الحِقد والنَّفرةِ بدلاً عن الاحترامِ والإطاعةِ والتحبُّبِ. ولا يفيضُ من العليا على السفلى بدلَ المرحمةِ والإحسانِ والتلطيفِ إلّا نارُ الظلمِ والتحكمِ، ورعدُ التحقيرِ..

فأسفاً!

لأجل هذا قد صارت "مزيةُ الخواص" التي هي سببُ التواضعِ والترحُّمِ سبباً للتكبُّرِ والغرور..

وصار "عجزُ الفقراء" و"فقرُ العوام" اللذان هما سبباَ المرحمةِ عليهم والإحسان إليهم سبباً لأسارتِهم وسَفالتِهم..

وإنْ شئتَ شاهداً فعليك بفسادِ ورذالةِ حالة العالَمِ المدنيّ، فلك فيه شواهدُ كثيرةٌ.

ولا ملجأ للمصالحةِ بين الطبقاتِ والتقريبِ بينها إلّا جعلُ الزكاةِ - التي هي ركنٌ من أركان الإسلامية - دستوراً عالياً واسعاً في تدوير الهيئة الاجتماعية.

* * *

(١) والصَّدى: ذكرُ البُومِ والهامُ، والجمعُ أصداءٌ. وقيل: أنيسُك أصداءُ القُبور تَصيحُ. (لسان العرب)

﴿وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾ (البقرة: ٤)

بزانە کە:

قورئـان لـە زۆر شـوێنی هاووێنـەی ئـەم ئایەتـەدا "هۆنـین"ی خـۆی بـە ڕەهـایی هێشـتووەتەوە، واتە یـەك دانـەی لـە ڕووە زۆرەکـانی پێکـهێنانی ڕسـتە - بـە دانـانی نیشانەیەك - دەستنیشان نەکردووە. ئەوەش لەبەر نهێنییەکی ورد کە جێی سەرهەڵدانی ئەو "ئیجاز"ەیە مایەی "ئیعجاز"ە. کە ئەمەی خوارەوەیە:

"ڕەوانبێژی" بریتییە لـە یەکاویـەك بوونـی گوفتـار لەگـەڵ خواستی حـاڵدا. کـەچی ئەوانەی گوفتاری قورئانیان ئاراستە کراوە چەند توێژێکی جیاجیـای چـەندین چـەرخی جیاوازن. ئیتر لەبەر چاودێری کردنی ئەم توێژانە و، لەبەر دراوسێیەتیی ئەم چەرخانـە و، تاکو هەموو جۆرێکی ئەوانەی کە گوفتـاری قورئانیـان ئاراستە کـراوە سـوود لـە بەشـی دیـاری کراوی خـۆی وەربگرێـت، قورئـانی پـیرۆز لـە گەلـێ شـوێنیدا، بـە مەبەسـتی "گشتاندن" و "بڵاوکردنەوە" حـەزفی بـەکار هێنـاوە و.. لەبـەر "گشـتگیر کـردن" و "دابەش کـردن" لـە زۆر شـوێندا گوفتـاری خـۆی بـە ڕەهـا و والآیـی دانـاوە و.. بـۆ زۆرکردنـی ڕووەکـانی واتابەخشـین هۆنینەکـەی خـۆی لـە گەلـێ شـوێندا بـە ئـازادی هێشتووەتەوە و.. گەلـێ گریمـانی ئەوتۆشـی تێـدا حەشـار داوە کـە لـە پێـش چـاوی ڕەوانبێژی و زانستی زمانی عەرەبیدا جوان و وەرگیراون، تـاکو ڕێژنـەی خـۆی بەسـەر هەموو زەینێکـدا و بـە ئـەندازەی چێژی ئـەو زەینـە ببەخشـێت. دەسـا فـەرموو بـیری لـێ بکەرەوە!

پاشـان هـۆی هۆنینـی ئـەم ئایەتـە لەگـەڵ ئـەوەی پێـش خۆیـدا: "تایبـەتکردن"ی دوای "گشتاندن"ە، تـاکو بـە ئاشـکرا و لـە بـەرچاوی خـەڵکیدا شـەرەفمەندیی ئـەو خـاوەن ئایینانەی پێشوو ڕابگەیـەنێت کـە باوەڕیـان بـەم قورئانـە هێنـا و.. بۆ ئـەوەش دەسـتی بێ

## ﴿وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾ (البقرة: ٤)

اعلم أنَّ القرآنَ أرسلَ النظمَ أي لم يُعيِّنْ بوضعِ أمارةٍ وجهاً من وجوهِ التراكيب في كثيرٍ من أمثال هذه الآيةِ، لسرٍّ لطيف، هو منشأُ الإيجازِ الذي هو منشأُ الإعجاز، وهو :

أنَّ البلاغةَ هي مطابقةُ مقتضى الحال. والحالُ أنَّ المخاطَبين بالقرآن على طبقاتٍ متفاوتةٍ، وفي أعصارٍ مختلفة. فلمُراعاة هذه الطبقاتِ، ولمجاورةِ هذه الأعصارِ، ليستفيدَ مخاطَبُ كُلِّ نوعٍ ما قُدِّرَ له من حصَّتِه، حَذَفَ القرآنُ في كثيرٍ للتعميم والتوزيع، وأطلقَ في كثيرٍ للتشميل والتقسيم، وأرسَلَ النظمَ في كثيرٍ لتكثير الوجوه، وتضمينِ الاحتمالات المستحسَنة في نظر البلاغةِ والمقبولةِ عند العِلم العربي ليفيضَ على كلِّ ذهنٍ بمقدار ذوقِه. فتأملْ!

ثم إنَّ وجهَ نظمِ هذه الآيةِ بسابقتِها التخصيصُ بعد التعميم. ليُعلنَ على رؤوس الأشهاد شرفَ مَنْ آمَن مِن أهل الكتاب.. ولِيَرُدَّ يدَ استغناءِ أهله في أفواهِهم..

نیـازیی شـوێنكەوتەی كتێبـەكانی پێشـوو لـەو ئیماندارانـە، بـەرەو دەم و پلـی خۆیـان بگێڕێتـەوە و.. دەستی هاوشێوەی "عـەبدوڵڵای كـوڕی سـەلام"[١] بگرێـت و.. هـانی كەسانی تری وەك ئەویش بدات كە چاوی لـێ بكەن..

هۆیەكی تر ئەوەیە كە دەقێكیش بێت لەسەر هەردوو بەشەكەی "المتقین"[٢] تـاكو بـە ڕاشكاوی گشتگیریی ڕێنمایی قورئـان بـۆ سـەرجەم نەتـەوەكان دەربـبڕێت و.. ئاماژەش بدات بە گشتی بوونـی پـەیامی حـەزرەتی محەممـەد - دروودی لەسـەر بێـت - بـۆ هـەموو گەلان.. هۆیەكی تر درێژەپێدانی دوای كورتە لێدوانـە بـۆ ڕابوردووەكـانی ئـەو پایانـەی ئیمان كە سەدەفی ﴿يُؤْمِنونَ بِالْغَيْبِ﴾ لـەخۆی گرتـوون، چونكـە بـە ڕاشـكاوی بەڵگەیـە لەسەر "كتێبەكان" و "قیامـەت"، هـەروەك لەسـەر "پێغەمبـەران" و "مەلائیكـەت"یش بـە شێوەیەكی ناوەكی.

پاشان قورئان لێرەدا گوفتاری خۆی بە هاوشێوەی (والمؤمنـــون بـــالقرآن) كـورت نەكردەوە، لەبەر ڕازاندنەوەی ئەم واتایە بە چەند وردەكارییەكی ناسك و ئارایشتدانی پاشكۆكانی بە چەند سەرنجێك، ئیتر ﴿وَالَّذينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ﴾ی هەڵبژارد..

چونكـە ﴿الَّذيـــنَ﴾ هێمایـەكی بـۆ ئـەوە تێدایـە كـە تـەوەرەی بڕیارەكـە لـە سـیفەتی "ئیمان"دایە و، زاتەكە و سیفەتەكانی تر شوێنكەوتەی ئەون و، لە ژێر ئەودا ون بوون[٣].

بـەكارهێنانی ﴿يُؤْمِنُـــونَ﴾ش لـە بریـی "المؤمنـــین" كـە جێگـیر بـوون لـە زەمـەنێكدا دەگەیەنێت، بۆ ئاماژەدانە بەوەی كە "ئیمان" بە هۆی تەواتوری نازڵ بوونی كتێبـەكان و دووپاتبوونەوەی دەركەوتنی پێغەمبەرانەوە، بە بەردەوامی نوێ دەبێتەوە.

ئەو نادیارییەش كە لە ﴿ما﴾دا هەیە، هێمایـە بـۆ ئـەوەی كـە هـەندێ جـار "پوختـەی ئیمان" سەروزیادە و، بۆ ئەوەش كە "ئیمان" هەردوو سرووشـی ئاشكرا و پەنـهان - كـە فەرموودەیە - دەگرێتەوە.

﴿أُنْزِلَ﴾ش لە ڕووی ماددە كـەیەوە ئـاماژەی بۆ ئـەوە لـەخۆ گـرتووە كـە "ئیمـان بە قورئان" بریتییە لە ئیمان هێنان بەوەی كە لـە لایـەن خـوای گـەورەوە "نـازڵ" بـووە.. بـە

---

(١) زانایەكی گەورەی جوولەكە بـووە. دوای كۆچی پێغەمبـەر ﷺ بۆ مەدینە ڕۆشتە خزمـەتی و موسـڵمان بوو، ناوەكەشی گۆڕی بـە "عـەبدوڵڵا". لەگـەڵ حـەزرەتی عومـەردا بەشـداریی فـەتحی "بەیتولمـەقدیس" و "جابیە"ی كردووە. ساڵی (٤٣ك) لە مەدینە وەفاتی كردووە.

(٢) كە لەم ئایەتە و ئایەتی پێشوودا باس كراون. (ت)

(٣) تەنانەت دەڵێی جگە لە "ئیمان" هیچ سیفەتێكی تریان نییە جیایان بكاتەوە. (ت)

وليأخذَ يدَ أمثال "عبدِ الله بن سلام"، ويُشوِّقَ غيرَه لأنْ يأتمَّ به..

وأيضاً التنصيصُ على قسْمَي المتقين[١] للتصريح بشمول هدايةِ القرآنِ لكافَّةِ الأُممِ، والتلويحِ لعمومِ رسالةِ محمدٍ عليه السلامُ لقاطِبة المِللِ..

وأيضاً التفصيلُ بعد الإجمالِ لشرحِ أركانِ الإيمان المندمجةِ في صَدَفِ ﴿يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ﴾ إذْ دلَّ على الكتُبِ والقيامةِ صراحةً، وعلى الرسلِ والملائكةِ ضمناً.

ثم إنَّ القرآنَ لم يوجِزْ هنا بنحو "والمؤمنين بالقرآن" لترصيعِ هذا المعنى بلطائفَ وتزيينِ ذيوله بنكَتٍ، فآثَرَ:

﴿وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾..

إذ في ﴿الَّذِينَ﴾ رمزٌ إلى أنَّ وصفَ الإيمانِ هو مناطُ الحكمِ، وأنَّ الذاتَ مع سائر الصفاتِ تابعةٌ له ومغمورةٌ تحتَه[٢].

وفي ﴿يُؤْمِنُونَ﴾ بدلَ "المؤمنين" الدالِّ على الثبوتِ في زمانٍ مّا، تلويحٌ إلى تجدُّدِ الإيمانِ بتواترِ النـزولِ وتكرُّرِ الظهور مستمراً.

وفي ﴿مَا﴾ الإبهامِ، إيماءٌ إلى أنَّ الإيمانَ مُجمَلاً قد يكفي، وإلى تشميلِ الإيمان للوحي الظاهرِ والباطنِ وهو الحديثُ.

وفي ﴿أُنزِلَ﴾ باعتبارِ مادَّتِه إشارةٌ إلى أنَّ الإيمانَ بالقرآنِ هو الإيمانُ بنزولِه مِن عندِ الله..

---

(١) المذكورين في هذه الآية والتي سبقتها. (ت)

(٢) حتى كأن لا صفـةَ لهم مميـزة الّا الإيمان. (ت)

وێنەی ئەوەی کە "ئیمان بە خوا" بریتی‌یە لە ئیمان هێنان بە "بوون"ی و، "ئیمان بە ڕۆژی دوایی"ش بریتی‌یە لە ئیمان هێنان بە "هاتن"ی!

لەو ڕووەشەوە کە شێوە داڕشتنی "ماضي"(ڕابوردوو)ی بۆ بەکارهێنا، لە کاتێکدا کە ئەو دەمە هێشتا نازڵ بوونی هەموو قورئان کۆتایی پێ نەهاتبوو، ئاماژەیە بۆ هاتنەدیی تەواوەتیی نازڵ بوونەکەی و، دانانی لە پلەیەکدا کە هەمووی نازڵ بووبێت! لەگەڵ ئەوەشدا "ڕابوردوو" نەبوونی ﴿يؤمنـــون﴾ قەرەبووی "ڕابوردوو"بوونەکەی ئەو دەکاتەوە[1]. تەنانەت لەبەر ئەم دانانەی ڕابوردوو لە شوێنی داهاتوودا، زۆر جار لە شێوازەکانی قورئاندا دەبینیت کە کاتی "ڕابوردوو" کاتی "داهاتوو" قووت دەدات و "مضـــارع"یش بەرگی "مـــاضي" دەپۆشێت، لەبەر ئەوەی ڕەوانبێژی‌یەکی ورد لەم شێوازەدا هەیە..

چونکە ئەو کەسەی کاتی ڕابوردوو دەبیستێت لە شتێکدا کە سەبارەت بەو ڕانەبوردووە، زەینی ڕادەچڵەکێت و، بێدار دەبێتەوە کە هەر بە تەنیا خۆی گوێ بیست نی‌یە، بەڵکو بیر دەکاتەوە لەوەی کە چەندین ڕیزی گوێ بیستی تری، بە چەند ماوەیەك، لە پشتەوەیە. تەنانەت دەڵێی چەرخ و سەردەمەکان چەند پلیکانەیەکن و، بەرەکانی مرۆڤیش چەند ڕیزێکن لە پشتیانەوە دانیشتوون. ئیتر ئەو کەسە وریا دەبێتەوە و، تێدەگات لەوەی کە ئەو بانگ و گوفتارەی ئاراستەی کراوە چەندە بەرز و توندوتۆڵە و، لە ڕادەیەکدایە هەموو بەرەکانی مرۆڤ دەیبیستن و، وتارێکی خوایی ئەوتۆشە کە ڕیزەکانی هەموو چەرخێك گوێیان بۆ ڕاگرتووە..

کەواتە "مـــاضي" - لە زۆربەی زەمانەکاندا - "حەقیقەت"ە بۆ خەڵکانی زۆر و، "مەجاز"یشە - لە کەمترینی کاتەکاندا - بۆ خەڵکانێکی کەم. دیارە چاودێری کردنی "زۆرینە"ش پتر مافی "ڕەوانبێژی" دەپارێزێت.

بەکارهێنانی ﴿إِلَيْكَ﴾ش لە بریی "عليك" هێمایەکی بۆ ئەوە تێدایە کە "پێغەمبەرێتی" ئەرکێکە بە پێغەمبەر - درودی لەسەر بێت - سپێرراوە و، ئەویش بە جوزئی ئیختیاریی خۆی ئەو ئەرکەی هەڵگرتووە.. هەروەك ئاماژەیە بۆ پایە بڵندیی ئەو، بەوەی کە جیبریل

(١) واتە ماضی بوونی ﴿أُنْزِلَ﴾. بەو واتایەی ئەو بەشەی قورئان کە ئەو کاتە بە تەواوی نازڵ نەبووبوو، ئەگەر لە ناوەندی گشتگیریی ﴿أُنْزِلَ﴾دا نەبێت، ئەوا لەناوەندی گشتگیریی ﴿يُؤْمِنُونَ﴾دایە. (ت)

كما أنَّ الإيمانَ باللهِ هو الإيمانُ بوجودِه، وباليومِ الآخرِ هو الإيمانُ بمجيئِه.

وبالنظرِ إلى صيغتِه الماضَويةِ - مع أنَّه لم يتمَّ النـزولُ إذ ذاكَ - إشارةٌ إلى تحقُّقِه المُنـزَّلِ بمنـزلةِ الواقعِ، مع أنَّ مضارعِيَّةَ ﴿يُؤْمِنُونَ﴾ تلافي ما في ماضويته[1].

بل لأجل هذا التنـزيلِ ترى في أساليبِ التنـزيلِ كثيراً ما يبتلعُ الزمانُ الماضي المستقبلَ ويتَزَيَّا المضارعُ بزيّ الماضي، إذ فيه بلاغةٌ لطيفة..

لأنَّ مَن سمعَ الماضيَ فيما لم يمضِ بالنسبة إليه اهتزَّ ذهنُه، وتيقَّظَ أنَّه ليس وحدَه، وتذكَّرَ أنَّ خلفَه غيرَه من الصفوفِ بمسافاتٍ. حتى كأنَّ الأعصارَ مدارجُ والأجيالَ صفوفٌ قاعدون خلفَها، وتَنبَّهَ أنَّ الخطابَ والنداءَ الموجَّهَ إليه بدرجةٍ من الشدة والعلوِّ يسمعُه كلُّ الأجيالِ. وهو خُطبةٌ إلهيةٌ أنصتَ لها كلُّ الصفوف في كلِّ الأعصار.

فالماضي حقيقةٌ في الكثير - في أكثرِ الأزمان - ومجازٌ في القليل - في أقلّها[2] - ومراعاةُ الأكثر أوفَى لحقِ البلاغة.

وفي ﴿إِلَيْكَ﴾ بدلَ "عليك" رمزٌ إلى أنَّ الرسالةَ وظيفةٌ كُلِّفَ بها النبيُّ عليه السلام وتحمَّلَها بجزئِه الاختياري.. وإيماءٌ إلى علوِّه بخدمةِ جبرائيلَ بالتقديمِ إليه؛ إذ في "عَلى" شَمُّ

---

(١) أي ماضوية ﴿أُنزِلَ﴾، بمعنى أن الذي لم يتم نزوله، إن لم يكن داخلاً ضمن شمولية ﴿أُنزِلَ﴾ فهو ضمن شمولية ﴿يُؤْمِنُونَ﴾. (ت)

(٢) فالماضي حقيقة ثابتة لدى كثير من الناس في أغلب الأزمان، بينما يكون مجازاً لدى القليلين في أقل الأزمان.

بە پێشكەش كردنی ئەم قورئانە بۆی لە خزمەتی ئەو سەروەرەدا بووە، چونكە "عَلـــی" بۆنی ناچاركردن و بەرزیی هۆكاری نازڵ بوونەكەی لێ دەكرێت.. ئنجا گوفتاری ﴿إِلَيْكَ﴾ لە بریی "إلی نحو محمد" ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە ڕۆڵی محەممەد - دروودی لەسەر بێت - تەنها ئەوەیە كە گوفتارەكەی ئاراستە كراوە و، گوفتارەكەش تەنها هی خوای گەورەیە.. هەروەها واتای "گوفتار ئاراستە كردن"یش جەخت و وێنەكێشانێكە بۆ واتای "نازڵ بوون" كە بریتی‌یە لە وەحی، ئەویش بریتی‌یە لە قورئان، ئەویش بریتی‌یە لە گوفتاری خوای گەورە لەگەڵ ئەودا، كە ئەویش تایبەتمەندی‌یەكە دەڕواتە ناخی هەموانەوە. ئیتر ئەم جوزئە، پەردەی لەسەر پشكی ئەو لابرد لەو تایبەتمەندی‌یەدا[1]. ئنجا دەركەوت كە ئەم گوفتارە، لەو ڕووەوە ئەم هەموو وردەكاری‌یە ناوبراوانەی لەخۆ گرتووە، لەوپەڕی "ئیجاز"دایە.

﴿وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ﴾.

بزانە كە:

ئەم چەشنە وەسف كردنانە، شەوق بەخشینێكی وەهای لەخۆ گرتووە كە چەندین بڕیاری ئینشائیی وەك: "بەو جۆرە ئیمان بهێنن" و "لێك دامەبڕێن"ی تێدایە.

پاشان ئەم هۆنین و پەیوەستكردنە، چوار وردەكاریی ناسكۆڵەی لە ئامێز گرتووە:

یەكەمیان:

عەتفی بەڵگە بۆهێنراو لەسەر بەڵگەكەی. واتە:

"خەڵكینە ئەگەر باوەڕتان بە قورئان هێنا، باوەڕیش بە كتێبەكانی پێشوو بهێنن، چونكە قورئان پشت ڕاستكەرەوەیانە و شایەتە لە سەریان".

ئەوەش بە بەڵگەی: ﴿مُصَدِّقاً لِما بينَ يَدَيْه﴾ (البقرة: ٩٧).

دووهەمیان:

عەتفی بەڵگە لەسەر بەڵگە بۆهێنراو. واتە:

"ئەی شوێنكەوتووانی كتێبەكانی پێشوو! ئەگەر باوەڕتان بە پێغەمبەرانی پێشین و كتێبەكانی ڕابوردوو هێنا، پێویستە باوەڕ بە قورئان و بە محەممەدیش - دروودی لەسەر بێت - بهێنن، چونكە ئەوان مژدەیان بە هاتنی ئەم داوە.. هەروەها لەبەر ئەوەش كە

---

(١) كە پێ سپاردنی ئەركی پێغەمبەرێتی‌یە. (وەرگێڕ)

اضطرارٍ وعُلوّ واسطةِ النـزولِ.. وفي خطابِ ﴿إِلَيْكَ﴾ بدل "إلى نحو محمد" تلويحٌ إلى أنَّ محمداً عليه السلامُ ما هو إلّا مخاطَبٌ والكلامُ كلامُ الله.. وأيضاً معنى الخطابِ تأكيدٌ وتصويرٌ لمعنى النـزول؛ الذي هو الوحيُ، الذي هو القرآنُ، الذي هو خطابُ الله معه، الذي هو الخاصةُ النافذةُ في الكلِّ. فكشَفَ هذا الجزءُ الحجابَ عن حصتِّه من تلك الخاصةِ. فظهرَ أنَّ هذا الكلامَ بالنظرِ إلى اشتماله على هذه اللطائفِ المذكورةِ في نهاية الإيجاز.

﴿ وَمَا أُنزِلَ مِنْ قَبْلِكَ ﴾.

اعلم أنَّ أمثالَ هذه التوصيفاتِ تتضمنُ تشويقاً، يتضمنُ أحكاماً إنشائيةً. كآمِنوا كذا وكذا.. ولا تفرَّقوا..

ثم إنَّ في هذا النظمِ والربطِ أربعَ لطائفَ:

**إحداها:**

عطفُ المدلولِ على الدليل. أي:

"يا أيها الناسُ! إذا آمنْتم بالقرآنِ فآمنوا بالكتبِ السابقة أيضاً، إذ القرآنُ مصدِّقٌ لها وشاهدٌ عليها" بدليل: ﴿مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ (البقرة: ٩٧).

**والثانية:**

عطفُ الدليلِ على المدلول. أي:

"يا أهلَ الكتابِ! إذا آمنْتم بالأنبياءِ السابقين والكتبِ السالفةِ لَزِمَ عليكم أنْ تؤمنوا بالقرآنِ وبمحمدٍ عليه السلام، لأنَّهم قد بشّروا به. ولأنَّ مدارَ صدقِهم ونزولِها، ومناطَ

"حەقیقەت" و "گیان"ی خولگەی ڕاستگۆیی ئەوان و نازڵ بوونی کتێبەکانیان و تەوەرەی پێغەمبەرێتی‌یان، بە تەواوترین شێوە، لە قورئاندا و بە ئاشکراترین ڕوویش لە حەزرەتی محەممەددا - دروودی لەسەر بێت - هەیە. کەواتە بە "قیاسی ئەولەوی" قورئان گوفتاری خوایە و، بە "تەریقی ئەولا"[1]ش محەممەد - صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت - پێغەمبەری ڕەوانەکراوی ئەوە".

سێ‌هەمیان:

ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە دەرەنجامی قورئان - مەبەستم ئەو ئایینی ئیسلامەیە کە لە سەردەمی بەختەوەریدا سەری هەڵدا - بە وێنەی درەختێك وایە کە ڕەگەکانی لە ناخی ڕابوردوودا چەسپیوە و، دەمارەکانی ئەو ڕەگانەش بڵاو بوونەتەوە و لە کانیاوەکانی ژیانی خۆیان نۆشیوە و لە سەرچاوەکانی هێزی خۆیشیان مژیوە، لقەکانیشی بە ئاسمانی داهاتوودا پەلیان هاویشتووە و، پەلەکانیشی بەردارن. واتە "ئایینی ئیسلام" هەردوو جڵەوی ڕابوردوو و داهاتووی بە دەستەوە گرتووە.

چوارەمیان:

ئاماژەیەکی تێدایە بە شەوق بەخشین بە خاوەن کتێبەکانی پێشین و، ڕاهێنانیان بۆ ئەوەی کە ئیمان بهێنن و، ئاسان کردنی ئەمەش لە سەریان. وەکو ئەوەی پێیان بڵێت:

"هاتنتان بۆ ناو ئەم ڕێبازە بە کارێکی دژوار مەزانن، چونکە بە تەواوی لە توێکڵی خۆتان دەرناچن. بەڵکو بیر و باوەڕەکانی خۆتان پڕ دەکەنەوە و، لەسەر بناغەکەی ئەوەی لای خۆتان شتی نوێ بنیات دەنێن".

چونکە قورئان لە بناغە و باوەڕەکاندا "هەموارکار" و "تەواوکار"ە و، سەرجەم جوانی‌یەکانی هەموو کتێبەکانی پێشین و بناغەکانی شەریعەتەکانی ڕابوردووی لەخۆدا کۆ کردووەتەوە. بەڵام لە لقەکانی ئەو شەریعەتانەدا، کە بە کاریگەریی ئاڵوگۆڕی کات و شوێن دەگۆڕێن، قورئان "دامەزرێنەر"ە.

ئەوەتا هەروەك لە چوار وەرزەکەدا دەرمان و پۆشاکەکان و، لە چینەکانی تەمەنی تاکەکەسیشدا شێوازی پەروەردە و فێرکردن، دەگۆڕێن..

---

(١) قیاسی ئەولەوی، یاخود "قیاسُ الأولَى" لە زاراوەکانی زانستی "أصول الفقه"ە و، بریتی‌یە لە: یەکەم بەشی "قیاسی جەلی" کە ئەوەیە عیللەتی حوکمەکە لە فەرعدا بەهێزتر بێت تاکو ئەسڵەکە. (بڕوانە: داوەری‌یەکان، ل: ٢٢٨). "تەریقی ئەولا"ش بە کوردی واتە: "بە شێوەیەکی باشتر". (وەرگێڕ)

نبوتِّهم يوجَدُ بحقيقتِه وبروحِه في القرآنِ بوجهٍ أكملَ وفي محمدٍ عليه السلام بالوجهِ الأظهرِ..

فيكونُ القرآنُ كلامَ الله بالقياس الأَوْلَوِيّ، ومحمَّدٌ عليه الصلاة والسلام رسولَه بالطريقِ الأَوْلى".

**والثالثة:**

أنَّ فيه إشارةً إلى أنَّ مآلَ القرآنِ - أعني الإسلاميةَ الناشئةَ في زمان السعادة - كشجرةٍ أصلُها ثابتٌ في أعماقِ الماضي، منتشرة العروقِ، متشربة عن منابعِ حياتِها وقوّتِها، وفرعُها في سماءِ الاستقبالِ ناشرة، أغصانها مثمرة. أي أخذتْ الإسلاميةُ بقَرنَي الماضي والاستقبال.

**والرابعة:**

أنَّ فيه إشارةً إلى تشويق أهلِ الكتابِ على الإيمانِ وتأنيسِهم، والتسهيلِ عليهم. كأنه يقول:

"لا يَشُقَّنَّ عليكم الدخولُ في هذا السلكِ، إذ لا تخرجون عن قشرِكم بالمرّةِ، بل إنما تكمِّلون معتقداتِكم، وتبنون على ما هو مؤسَّسٌ لديكم".

إذ القرآنُ معدِّلٌ ومكمِّلٌ في الأُصول والعقائد، وجامعٌ لجميعِ محاسن الكتب السابقةِ وأُصولِ الشرائع السالفة.. إلّا أنّه مؤسِّسٌ في التفرعاتِ التي تتحولُ بتأثير تغيُّرِ الزمانِ والمكان؛ فكما تتحولُ الأدويةُ والألبسةُ في الفصول الأربعةِ، وطرزُ التربيةِ والتعليم في طبقاتِ عمر الشخص..

بە هەمان جۆر، "بەرژەوەندی" و "دانایی" داخوازی ئەوەن کە لە پلەکانی تەمەنی "ڕەگەزی مرۆڤ"یشدا ئەحکامە فەرعی‌یەکان بگۆڕرێن. دەبینیت زۆر حوکمی فەرعی هەیە کە لە زەمانێکدا بەرژەوەندیی تێدا بووە و گەلێ دەرمانیش هەن لە دەمی منالیی ڕەگەزی مرۆڤدا بەکار هاتوون، کەچی لە کاتێکی تردا ئەو حوکمە فەرعی‌یە بەرژەوەندیی تێدا نامێنێت و دەرمانەکەش لە دەمی لاوێتیی ڕەگەزی مرۆڤدا بە دەرمانی نامێنێتەوە.

هەر لەبەر ئەم نهێنی‌یەیە کە قورئان هەندێ حوکمی فەرعیی (ئایینەکانی پێش خۆی) هەڵوەشاندەوە، واتە بەسەرچوونی "کات"ی ئەو حوکمە فەرعی‌یانە و، هاتنی "کات"ی حوکمی فەرعیی نوێی، ڕاگەیاند.

﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ش چەند وردە سەرنجێکی ناسکی تێدایە..

بزانە کە هیچ وشەیەك نی‌یە لە قورئاندا شوێنەکەی ڕێی بۆ نەکاتەوە، یان پێی ڕازی نەبێت، یان وشەیەکی تری بۆ باشتر بێت. بەڵکو هەموو وشەیەکی قورئان وەك مرواری‌یەکی ڕازاوەی ڕیزبووی ئەوتۆیە کە بە چەندین پەیوەندیی "بۆنە"کان (لەگەڵ ئەوانی تردا) یەکیان گرتووە.

ئەگەر نموونەت لەسەر ئەمە دەوێت فەرموو لە: ﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ ڕامێنە و، بزانە چۆن وردەکاری‌یە ناسکەکان، کە لە هەموو لاکانی ئەم ئایەتەوە هەڵدەفڕن، لەسەر ئەم وشە نایابە دانراون..

ئەوەتا ﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ بە پێنج وردە "پەیوەندی"ی ئەوتۆ تێراو بووە و، ڕەنگی گرتووە و، نمەکانی شێ دەدات و، هێمایان بۆ ئەو پێنج ئامانجە پێ دەکات کە لە "مەسەلەی پێغەمبەرێتی"دا هەن، کە ئەم ئایەتەی لە پێناودا هێنراوە.

سەبارەت بەو ئامانجانەی کە "مەسەلەی پێغەمبەرێتی" لەخۆی گرتوون، ئەوەیە کە:

محەممەد - دروودی لەسەر بێت - پێغەمبەرە و.. کامڵترینی پێغەمبەرانە و.. دواهەمینیانە و.. بۆ سەرجەم نەتەوەکان ڕەوانە کراوە و.. شەریعەتەکەشی هەڵوەشێنەری سەرجەم شەریعەتەکانی پێش خۆیەتی و، کۆکەرەوەی هەموو لایەنە جوانەکانیانە.

ئنجا ڕووی دەرکەوتنی "یەکەم ئامانج" لەو وشەیەدا ئەوەیە کە:

كذلك تقتضي الحكمةُ والمصلحةُ تبدُّلَ الأحكامِ الفرعيةِ في مراتبِ عمرِ نَوعِ البشر.. فكم مِن حُكمٍ فرعيٍّ كان مصلحةً في زمان، ودواءً في وقتِ طفوليةِ النوع، لا يبقى مصلحةً في آخَرَ، ودواءً عند شبابيةِ النوع.

ولهذا السرِّ نَسخَ القرآنُ بعضَ الفروع. أي بيّنَ انقضاءَ أوقاتِ تلك الفروع ودخولَ وقتٍ آخر.

وفي ﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ لطائفُ:

اعلم أنّه ما مِن كلمةٍ في التنـزيلِ يأبى عنها مكانُها، أو لم يرضَ بها، أو كان غيرُها أولى به. بل ما مِن كلمةٍ مِن التنـزيلِ إلا وهي كدُرٍّ مُرصَّعٍ مرصوصٍ متماسكٍ بروابط المناسبات..

فإن شئتَ مثالاً تأملْ في ﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ كيف ترى اللطائفَ المتطايرةَ مِن جوانبِ هذه الآيةِ تَوَضَّعتْ على هذه الكلمةِ الفذّة.

فإنَّ ﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ تشرّبتْ وتلوّنتْ - فتُرشِّح وتُرمز بخمسٍ لطائفَ - المناسباتِ المنعكسةَ من المقاصد الخمسةِ المندمجةِ في مسألة النبوةِ المسوقةِ لها هذه الآيةُ.

أما المقاصدُ المندمجةُ فهي:

أنَّ محمداً عليه السلام نبيٌّ.. وأنّه أكملُ الأنبياءِ.. وأنّه خاتمُ الأنبياءِ.. وأنّه مُرسَلٌ لكافةِ الأقوام.. وأنَّ شريعتَه ناسِخةٌ لجميعِ الشرائع، وجامِعةٌ لمحاسنِها.

أما وجهُ انعكاسِ المقصدِ الأول في تلك الكلمة، فهو:

لە کاتێکدا دەوترێ: ﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ کە ڕێگا و ڕێباز یەکێك بێت.

وەك بڵێی ئەم وشەیە ئەوەی لێ دەپاڵێورێت کە:

هەموو ئەو بەڵگانەی لەسەر پێغەمبەرێتیی ئەوانەی پێش خۆی و ڕاستیی کتێبەکانیان هەن، بە کۆی هەموویان و بە "تنقیح المناط" و، "تحقيق المناط" و بە "القيـــــاس الأولى"[1] بەڵگەشن لەسەر پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەد - دروودی لەسەر بێت - و، لەسەر نازڵ بوونی کتێبەکەشی. وەك بڵێی سەرانسەری موعجیزاتی ئەوان موعجیزەیەکی تاقانە و ناوازە بن لەسەر ڕاستگۆیی حەزرەتی محەممەد، دروودی لەسەر بێت.

ڕووی دەرکەوتنی "ئامانجی دووهەم"یش لەو وشەیەدا، کە بریتی‌یە لەوەی کامڵترینی هەموو پێغەمبەرانە، ئەوەیە کە:

﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە حەزرەتی محەممەد - دروودی لەسەر بێت - پادشای پێغەمبەرانە و لە هەموویان کامڵترە. هەروەك قورئان لە گشت کتێبەکانی ئەوان گشتگیرتر و جوانترە. ئەوەش بە پێی ڕەچاوکردنی ئەو نەریتەی کە "پادشا لە دواینی خەڵکی‌یەوە دەردەچێت" و.. بە پێی دەستووری خۆ کامڵ کردنی جۆری مرۆڤیش کە خوازیاری ئەوەیە پەروەردەکاری دووهەم لە هی یەکەم کامڵتر بێت و.. لەسەر ئەو بناغەیەش کە زۆربەی جار کارامەیی "دواین" لەچاو هی "پێشین" زۆر زیاترە.

ڕووی هەڵمژینیشی لە "ئامانجی سێهەم" کە ئەوەیە: دواهەمینی پێغەمبەرانە، لەوەدایە کە:

بە پێی دەستووری: "یەك، ئەگەر زۆر بێت زنجیرەیەکی نەوەستاو پێکدەهێنێت و.. زۆریش، گەر یەکبگرێت جێگیر دەبێت و ناپچڕێت" و، بە بۆن لێکردنی "مەفهوومی موخالیف"یش، ﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەو سەروەرە - دروودی لەسەر بێت - دواهەمینی هەموو پێغەمبەرانە.

(١) چەند زاراوەیەکی زانستی "أصول الفقه"ن. "تنقيح المنـــــاط" بریتی‌یە لە پاڵفتە کردنی "عیللەت" لەو سیفەتانەی کە ئاوێتەی بوون و پەیوەندییان بە عیللەت بوونەوە نی‌یە. بۆ زیادە شارەزابوون بڕوانە پەراوێزی ل: ٢٢٨ی (داوەری‌یەکان). "تحقيق المناط"یش ئیجتیهاد کردنە لە دەستنیشیان کردنی لەو "عیللەت"ەی کە بە "دەق" یان "ئیجماع" یاخود بە ڕێگایەکی تری ئوصوولی سەلمابێت، لە ڕووداوێکی تردا کە دەقی تێدا نەبێت. (بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر). "قياسُ الأَولَى"ش لە پەراوێزی ل: (١٣٨)دا واتاکەی ڕابورد. (وەرگێڕ)

أنَّ ﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ إنما يُقالُ إذا اتّحدَ المسلكُ وكان الطريقُ واحداً..

فكأنَّ هذه الكلمةَ تترشحُ بأنَّ الحججَ على نبوة مَن قبله وصِدقِ كُتبهم، حُجةٌ بمجموعِها بتنقيحِ المناط[1] وتحقيقِ المناط بالقياسِ الأَوْلَوِي على نبوةِ محمدٍ عليه السلام ونزولِ كتابه. فكأنَّ جميعَ معجزاتِهم معجزةٌ فذّةٌ على صدقِ محمدٍ عليه السلام.

وأما وجهُ انعكاسِ المقصدِ الثاني، وهو الأكمليةُ فيها، فهو:

أنَّ ﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ بناءً على ملاحظةِ عادةِ "أنَّ السلطانَ يخرجُ في أُخرَياتِ الناس". وعلى قاعدةِ التكمُّلِ في نوع البشر المقتضيةِ لأكمليةِ المربِّي الثاني عن المربِّي الأول.. وعلى أغلبيةِ مهارةِ وزيادةِ الخَلَفِ على السَّلَف، تُلوِّحُ بأنَّ محمداً عليه السلام سلطانُ الأنبياء، أكملُ من كلِّهم. كما أنَّ القرآنَ أجمعُ وأجلُ[2] من كُتبهم.

وأما وجهُ تشرُّبِها من المقصد الثالثِ وهو "الخاتمية" فهو:

أنَّ ﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ بسرِّ قاعدة: "إنَّ الواحدَ إذا تكثَّرَ تسلْسَلَ لا يسكنُ، وإنَّ الكثيرَ إذا اتّحدَ استقرّ لا ينقطعُ"، وبإشمامِ المفهومِ المخالف تُلمِّحُ بأنّه عليه السلام خاتمُ الأنبياء.

---

(١) تنقيح المناط: اصطلاح أصولي في مباحث العلة. فتنقيح المناط: تهذيبُ العلة مما علق بها من الأوصاف التي لا مدخل لها في العلية. أما تحقيق المناط: فهو الاجتهاد في تحقيق العلة الثابتة بالنص أو بالإجماع أو بأي مسلك آخر، في واقعة غير التي ورد فيها النص.

(٢) وأشمل. (ش)

ڕووی ڕەنگگرتنیشی لە ئامانجی چوارەم، کە گشتی بوونی بانگەوازەکەیەتی، بریتی‌یە لەوەی:

ئەم ﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾یە کە چەمکی: "تۆ دواینی ئەوانی و هەموو یەکێکی ئەوانیش پێشینی تۆن" دەگەیەنێت، بە پێی دەستووری: "دوایین هەموو ئەرکی پێشین دەگرێتە ئەستۆ و لەجێی ئەودایە"، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەگەر هەموو یەکێکی ئەوان "پێشین"ی تۆ بن، ئەوا تۆ "جێگر"ی هەموویانیت و، پێغەمبەری هەموو نەتەوەکانیت.

بەڵێ، هەر دەبێ بەو جۆرە بێت! ئەوەتا "فیترەت" وا بڕیار دەدات و، "حیکمەت"یش وا دەخوازێت..

چونکە نەتەوەکانی جیهانی مرۆڤ، لە پێش سەردەمی بەختەوەریدا[1]، لە ڕووی مادده و ناوەڕۆك و، لە ڕووی ئامادەیی و پەروەردەشەوە، لەوپەڕی لێك دووری و جیاوازیدا بوون، کە یەك دانە پەروەردە و یەك دانە بانگەواز بەشی نەدەکردن. پاشان کە - دوای ئەوە - جیهانی مرۆڤایەتی بە هاتنی سەردەمی بەختەوەری بێدار بووەوە و، بە هۆی دەستاودەست پێکردنی هزرەکان و، ئاڵوگۆڕی سروشتەکان و، تێکەڵ بوونی نەتەوەکان و، هەواڵ پرسینی حاڵی یەکتری، حەزی یەکگرتنیان بۆ دروست بوو، بە ڕادەیەك کە ڕۆژگار بە هۆی زۆریی ڕێگاکانی هەواڵ زانین و گواستنەوەکانەوە گۆڕانی بەسەردا هات، ئیتر گۆی زەوی بە وێنەی وڵاتێك و، ئەویش وەك پارێزگایەك و، ئەویش وەك شارێکی لێ هات و، پەیوەندیی ڕەحم کەوتە نێوان خەڵکی دنیاوە.. ئەوا تاقانە بانگەواز و، تاقانە پێغەمبەرێتی بۆ هەموویان سەروزیاد بوو.

ڕووی بۆن گرتنیشی بە "ئامانجی پێنجەم" ئەوەیە کە:

﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ کە لە "مِن"ەوە ئاماژە بۆ "إلى" و لە "إلى"شەوە ئاماژە بۆ بێ نیاز کردن دەکات[2]. بەو واتایەی کە "بە هاتنی تۆ پێغەمبەرێتی کۆتایی پێ هات، چونکە شەریعەتەکەت جێی هەموویان دەگرێتەوە".. ئەمەش هێمایە بۆ ئەوەی کە شەریعەتەکەی ئەو - دروودی لەسەر بێت - بە کۆتایی هێنانی بەوان، شەریعەتەکانی تری هەڵوەشاندەوە و.. بە بێ نیازیشی لەوان، هەموویانی لە خۆیدا کۆ کردەوە.

---

(١) واتە پێش هاتنی دواهەمین پێغەمبەر، دروودی لەسەر بێت. (وەرگێڕ)

(٢) واتە: "مِن" واتای سەرەتا دەگەیەنێت، خۆ سەرەتاش دەبێ کۆتایی، واتە "إلى"ی هەبێت. کۆتاییش بەڵگەیە لەسەر نەبوونی پێویستی، یان بێ‌نیاز کردن. (ت)

وأما وجهُ انصباغِها مِن المقصدِ الرابع وهو "عمومُ الدعوةِ" فهو:

أنَّ ﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ المفيدةَ "أنَّك خَلَفُهم وكلٌّ منهم سلَفُك" بسرٍّ قاعدة: "إنَّ الخلفَ يأخذُ تمامَ وظيفةِ السلفِ ويقومُ مقامَه" تشيرُ بأنَّه إذا كان كلٌّ منهم سلفَك فأنت نائبُ الكلِّ، ورسولُ جميع الأُمَم.

نعم، لا يكونُ إلّا كذلك! إذ الفطرةُ حاكمةٌ له، والحكمةُ قاضيةٌ به؛ لأنَّه كانت أُممُ العالَمِ الإنساني قبلَ زمان السعادة في غاية التباعُدِ والاختلاف مادةً ومعنىً، واستعداداً وتربيةً؛ ما كفَتْ لهم التربيةُ الواحدةُ وما شملت الدعوةُ المفردة. ثم لمّا انتبهَ العالمُ الإنساني بزمان السعادة بعدَه، وتمايلَ إلى الاتحاد بمداولة الأفكارِ، ومبادلةِ الطبائع، واختلاطِ الأقوام، وتحرّي البعضُ عن حال البعض حتى تمخّضَ الزمانُ بكثرةِ طرق المخابرة والمناقلة؛ فصارتْ الكرةُ كمملكةٍ، وهي كولايةٍ، وهي كبلدةٍ، واتصلَ الرَّحِمُ بين أهل الدنيا؛ كَفَت الدعوةُ الواحدةُ والنبوةُ الفريدةُ للكافة.

وأما وجهُ إشمامِها بالمقصدِ الخامس فهو:

أنَّ ﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ الموميةَ مِن "مِن" إلى "إلى"، ومن "إلى" إلى الإغناء[1]، أي "انتهت الرسالةُ بقدومك إذ أَغْنَتْ شريعتُك"، ترمزُ بأنَّ شريعتَه عليه السلام ناسِخةٌ بالانتهاءِ وجامعةٌ بالإغناء.

(١) أي إن "مِن" يفيد معنى الابتداء، والابتداء لابد له من انتهاء - أي "إلى" - والانتهاء يدل على عدم الحاجة أو الإغناء. (ت)

بیشزانە کە نیشانە – لە ڕوانینی "ڕەوانبیژی"دا – لەسەر ئەوەی کە ئەم وشەیە هەموو ئەو لایەنە ناسکانەی هەڵمژیوەتە ناوخۆی، ئەوەیە کە:

ئەم پێنج ئامانجە وەك ڕووباری "لەبەرڕۆشتوو" وان لە ژێر ئەم ئایەتانەدا. تەنانەت ئەم ئامانجەیان بە تەواوەتی لە ئایەتێکدا هەڵدەقوڵێت و، ئەو ئامانجەی تر بە تەواوەتی لە ئایەتێکی تردا سەرچاوە دەگرێت و، سەرانسەری ئامانجی سێهەمیش لە ئایەتێکی تردا دەردەکەوێت. چونکە کەمترینی نم دانەوەی "سەر ڕوو" هێمایە بە بەرکەوتنی "ڕەگەکان"ی ئەو وشەیە بەو "ئامانج"ە! هەروەها ئەم واتایانە لە چەند ئایەتێکدا گوڵ دەگرن کە لە پێناوی ئەو ئامانجانەدا هێنراون.

﴿وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾.

بزانە کە:

ناوەرۆك و دەرەنجامی ئەم ئایەتە چوارەم ئامانجە لە چوار ئامانجە بەناوبانگەکان، کە ئەویش "مەسەلەی حەشر"ە.

پاشان ئێمە، بە سوود وەرگرتنمان لە هۆنینی قورئان، "دە" بەڵگەمان لە سەر حەشر بەدەست هێناوە، لە کتێبێکی تردا باسمان کردوون[1]. لێرەدا بە گونجاوی دەزانین کورتیان بکەینەوە. کە بریتین لەوەی "حەشر حەقە" لەبەر ئەوەی:

* بوونەوەران ڕێسایەکی تابلێی کاملی تێدایە کە بە مەبەست و ویست دانراوە و..
* دانستێکی تەواوەتییش لە بەدیهێنراواندا هەیە و..
* بەربادی و بێ ئامانجی لە جیهاندا نییە و..
* بەدیهاتنی هیچ شتێك ئیسرافی تێدا نەکراوە و..

ئەو شتەش کە تەزکیەی ئەو شایەتانە دەکات و پشتیان دەگرێت "پشکنینی تەواو"ە[2] بە هەموو ئەو زانستانەی کە هەریەکەیان شایەتێکی ڕاستن لەسەر ڕێکوپێکیی جۆری بابەتەکەی خۆی..

---

(١) ئەو بەڵگانە لە پەیامی (بە تایبەتەکان) لە کۆمەڵە پەیامی (مەسنەویی نووری)دا باسکراون و، لە وتەی بیست و نۆهەمدا درێژەیان پێ دراوە و، لە وتەی دەهەمیشدا ڕوون کراونەتەوە، کە هی دانەری ئەم کتێبەن و کردوومانن کوردی. خوێنەری بەڕێز دەتوانێت لەو شوێنانە زانیاریی زیاتر بەدەست بهێنێت. (وەرگێڕ)

(٢) پشکنین و لێکۆڵینەوەی تەواو(الإستقراء التام) لە زانستی "مەنتیق"دا بریتییە لە بڕیاردان لەسەر "هەمەکی" بەو شتانەی کە لە هەموو بەشە "هەندەکی"یەکانیدا، یان لە هەندێکیاندا هەبێت. بۆ نموونە: بەو

واعلم أنَّ الأمارةَ لنظرِ البلاغة على تشرُّب هذه الكلمةِ لهؤلاء اللطائفِ هي أنَّ هذه المقاصدَ الخمسةَ كالأنهار الجارية تحت هذه الآيات، حتى يفورُ هذا بكماله في آيةٍ.. وينبعُ ذاك بتمامه في أُخرى.. ويتجلى ذلك بشَرَاشيره[1] في آخرة. فأدنى ترشُّحٍ على السطح يومي بتماسّ عروقِ الكلمة بها. وأيضاً تتسنبلُ هذه المعاني في آيات مسوقةٍ لها.

﴿وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾.

اعلم أنَّ مآلَ هذه الآيةِ هو المقصدُ الرابعُ من المقاصد الأربعة المشهورة، وهو "مسألةُ الحشر".

ثم إنّا قد استفدْنا من نظم القرآن عَشرةَ براهينَ عليها، ذكرناها في كتاب آخر[2] فناسبَ تلخيصُها هنا. وهي: أنَّ الحشرَ حقٌّ..

لأنَّ في الكائنات نظاماً أكملَ قصديّاً..

وأنَّ في الخلقةِ حكمةً تامة..

وأنْ لا عبثيةَ في العالم..

وأنْ لا إسرافَ في الفطرة..

والمزكّي لهؤلاء الشواهدِ الاستقراءُ التام بجميع الفنون التي كلٌّ منها شاهدُ صدقٍ على نظامِ نوعِ موضوعِه..

---

(١) بشراشيره: بأجمعه.

(٢) هذه البراهين مذكورة في رسالة "لاسيما" من المثنوى العربى النورى، ومفصّلة في الكلمة التاسعة والعشرين، وموضحة بنور تجليات الأسماء الحسنى في الكلمة العاشرة (رسالة الحشر).

* هەروەها زۆرێك لـە جۆرەکـانی وەك ڕۆژ و، سـاڵ و، جگـە لـەوانیش "قیامـەتێکی نەوعی"یان تێدا دووپات دەبێتەوە..

* هەروەها گەوهەری لێهاتنەکانی مرۆڤ هێما بۆ حەشر دەکەن..

* هەروەها ناکۆتایی حەز و ئاواتەکانی مرۆڤ ئاماژەی بۆ دەکەن..

* هەروەها میهرەبانیی کردگاری دانا ئاماژەی پێ دەدات و..

* زمـانی پێغەمبـەری ڕاسـتگۆ - دروودی خـوای لەسـەر بێـت - بـە ڕاشـکاوی ڕایدەگەیەنێت و..

* ڕوونکردنەوەکانی قورئانی خاوەن ئیعجازیش لە هاوشێوەکانی: ﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَاراً﴾ (نوح: ١٤) و ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلاَّمٍ لِلْعَبِيدِ﴾دا (فصلت: ٤٦) شایەتیی لەسەر دەدات.

ئەوە (دە) دانە بەڵگەی تەواو، کە کلیلی بەختەوەریی هەمیشـەیی و دەرگاکـانی ئـەو بەهەشتەن.

● سەبارەت بە ڕوونکردنەوەی بەڵگەی یەکەم ئەوەیە کە:

ئەگـەر ئـەم بوونەوەرانـە ئاکامەکـەیان "بەختـەوەریی هەمیشـەیی" نـەبێت، ئـەوا ئـەو "ڕێسا"یەی کە "کردگار" وردەکاریەکی ئەوتۆی تێدا بەکارهێناوە ژیریـەکانی تێدا سەرسام بوون، دەبێتە وێنەیەکی لاوازی خەڵەتێنەر و، سەرجەم شتانی مەعنەوی و ڕێژە و پەیوەندیەکانی ئەم ڕێسایەش دەبنە تەپوتۆزی پەرش و بڵاو.

کەواتە ڕێکخەری ئەو ڕێسایە جگە لە پەیوەست بوونی بەو بەختەوەریـەوە شتێکی تر نییە. واتە وردەکاری و لایەنە مەعنەویەکانی ئەو ڕێسایە تەنها لە جیـهانی ئـەودنیادا گوڵ دەگرن..

دەنا سەرجەمی شتانی مەعنەوی دەکوژێنەوە و، کۆی پەیوەندیەکانیش دەقرتێـن و، گشت ڕێژەکانیش دەپچڕێن و، ئەم ڕێسایەش ورد و خاش دەبێـت. لـە کـاتێکدا کـە ئـەو هێزەی تێهەڵکێشی ئەم ڕێسایە بووە، بـە دەنگـی بـەرزی خـۆی هـاوار دەکـات کـە: هـی دارمان و شی بوونەوە نییە.

---

پێوەرە دەتوانیت بڕیار بدەیت کە وەچەی مرۆڤ توانای قسە و گوفتاری هەیـە. ئەمـە بڕیـارێکی هەمەکیـە و، ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکە دەری خستووە کە هەموو مرۆڤـەکان، یـان زۆربـەیان، توانـای قسـەکردنیان هەیـە، بـە پێچەوانەی زیندەوەرانی تر. وەك ئاشکرایە زۆربەی زانستەکانی مرۆڤ لەم ڕێیەوە بەدەست دێن. (وەرگێڕ)

وأيضاً إنَّ في كثيرٍ من الأنواع مثلُ اليوم والسنةِ وغيرهما قيامةٌ مكرَّرَةٌ نوعية..

وأيضاً جوهرُ استعدادِ البشر يرمزُ إلى الحشر..

وأيضاً عدمُ تناهي آمال البشر وميولِه يُشيرُ إليه..

وأيضاً رحمةُ الصانع الحكيم تلوِّحُ به..

وأيضاً لسانُ الرسول الصادق عليه السلام يصرِّحُ به..

وأيضاً بيانُ القرآن المعجِز في أمثال: ﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَاراً﴾ (نوح: ١٤)، ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلاَّمٍ لِلْعَبِيدِ﴾ (فصلت: ٤٦) يشهدُ له.

تلكَ عَشَرَةٌ كاملةٌ، مفاتيحُ للسعادةِ الأبدية وأبوابٌ لتلك الجنةِ.

**أما بيانُ البرهانِ الأول:**

فهو أنّه لو لم تنجرَّ الكائناتُ إلى السعادة الأبديةِ لصار ذلك النظامُ الذي أتقنَ فيه صانعُه إتقاناً حَيَّرَ فيه العقولَ صورةً ضعيفةً خادعة، وجميعُ المعنويات والروابط والنِّسَبِ في النظام هباءً منثوراً.

فليس نظامُ ذلك النظامِ إلّا اتصالَه بالسعادة، أي إنَّ النُّكتَ والمعنوياتِ في ذلك النظامِ إنما تتسنبلُ في عالم الآخرة..

وإلّا لانطَفأ جميعُ المعنويات، وتقطّعَ مجموعُ الروابط، وتمزّقَ كلُّ النِّسَبِ، وتفتّتَ هذا النظامُ؛ مع أنَّ القوةَ المندمِجَةَ في النظام تُنادي بأعلى صوتها: أنْ ليس من شأنها الانقضاضُ والانحلال.

● بەڵگەی دووهەمیش ئەوەیە کە:

"چاودێریی ئەزەلی" کە بریتی‌یە لەو "دانست"ە تەواوەی لە چاودێریی دانایی و بەرژەوەندی‌یەکاندا (بە شایەتیی هەموو زانستەکان) لە هەموو جۆرێکدا، تەنانەت لە هەموو شتێکی جوزئیدا بە بەرجەستەیی دەردەکەوێت، مژدەی هاتنی "بەختەوەریی هەمیشەیی" دەدات..

دەنا دەبێ ئینکاریی ئەم هەموو دانایی و سوودانە بکەین کە "بەڵگەنەویستی" ناچاری کردووین دانیان پێدا بنێین. چونکە ئەو کاتە "سوود" دەبێتە بێ سوودی و، "دانایی"ش نادانایی و، "بەرژەوەندی"یش نەبوونی بەرژەوەندی!

خۆ ئەمەش "سەفسەتە"[1] نەبێت شتێکی تر نی‌یە.

● بەڵگەی سێهەم، کە دووهەم ڕاڤە دەکات، ئەوەیە کە:

زانستەکانیش شایەتن لەسەر ئەوەی کردگار لە هەموو شتێکدا کورتترین ڕێگا و، نزیکترین لا و، سووکەڵەترین و جوانترین شێوەی هەڵبژاردووە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر نەبوونی هەڕەمەکێتی، کە ئەویش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو شتە بە شێوەیەکی ڕاستەقینە و بە هەند وەرگیراوە. خۆ ئەوەش بە هاتنی "بەختەوەریی هەمیشەیی" دێتەدی..

دەنا ئەم "بوون"ە دادەبەزێتە پلەی نەبوونی یەکجارەکی و، هەموو شتێکیش دەگۆڕێت بە هەڕەمەکی و بێهوودەییەکی سەرتاسەری..

"خوایە گیان! تۆ پاك و بێگەردیت.. ئەمەت بە بێهوودەیی بەدی نەهێناوە"!

● بەڵگەی چوارەمیش، کە سێهەم ڕوون دەکاتەوە، ئەوەیە کە:

بە شایەتیی زانستەکان "زیادەڕەوی" لە بەدیهێنانی هیچ شتێکدا نی‌یە. ئەگەر زەینت بۆ زانینی حیکمەتەکانی بەدیهێنانی مرۆڤە هەرە گەورەکە (واتە جیهان) بڕی نەکرد، دە فەرموو بە وردی سەیری جیهانی هەرە بچووك بکە (کە مرۆڤە)..

دەبینیت زانستی "سوودی ئەندامەکان" ڕوونی کردووەتەوە و سەلماندوویەتی کە:

جەستەی مرۆڤ نزیکەی شەش سەد ئێسکی تێدایە، هەریەکەیان لەبەر سوودێك و.. شەش هەزار دەماری هاتوچۆی خوێنیش کە هەموو یەکێکیان لەبەر سوودێکە و..

---

(١) "سەفسەتە" لە زانستی مەنتیقدا: قیاسێکە لە "وەهمیات" پێکهاتووە. ئەم وشەیە لە ڕەفتاری "سۆفستائی"یەکانەوە داتاشراوە، کە بە زمانزانی و فێڵبازی دەچوون لە دەمی گفتوگۆدا حەقیان بە ناحەق و، ناحەقیشیان بە حەق، پیشان دەدا! (وەرگێڕ)

**وأما البرهانُ الثاني:**

فهو أنَّ تمثالَ العناية الأزلية الذي هو الحكمةُ التامة، التي هي رعايةُ المصالح والحِكَم في كل نوع، بل في كل جزئي - بشهادة كلِّ الفنون - يبشِّرُ بقدوم السعادةِ الأبدية..

وإلّا لَزِمَ إنكارُ هذه الحِكم والفوائدِ التي أجبرتْنا البداهةُ على الإقرار بها؛ إذ حينئذٍ تكون الفائدةُ لا فائدةَ.. والحكمةُ غيرَ حكمةٍ.. والمصلحةُ عدمَ مصلحة. وإنْ هذا إلّا سفسطةٌ.

**وأما البرهانُ الثالث المفسِّرُ للثاني:**

فهو أنَّ الفنَّ يشهدُ أيضاً أنَّ الصانعَ اختار في كل شيءٍ الطريقَ الأقصرَ، والجهةَ الأقربَ، والصورةَ الأخفَّ والأحسنَ. فيدلُّ على أنْ لا عبثيةَ. فيدلُّ على أنَّه جدّيٌّ حقيقيّ. وما هو إلا بمجيءِ السعادة الأبدية..

وإلّا لتَنَـزَّلَ هذا الوجودُ منـزلةَ العدم الصِّرفِ. وتحوَّلَ كلُّ شيء عبثاً محضاً..

سبحانَك ماخلَقْتَ هذا عَبَثاً.

**أما البرهانُ الرابع الموضِّحُ للثالث:**

فهو أنْ لا إسرافَ في الفطرةِ بشهادة الفنون. فإنْ تقاصرَ ذِهْنُك عن إدراك حِكَم الإنسانِ الأكبرِ وهو "العالم" فأمعِن النظرَ في العالم الأصغرِ وهو "الإنسانُ"..

فإنَّ فنَّ منافعِ الأعضاءِ قد شرحَ وأثبتَ أنَّ في جسد الإنسانِ - تقريباً - ستَّمائةِ عظم كلٌّ لمنفعة.. وستةَ آلافِ عَصَبٍ هي مجارٍ للدم كلٌّ لفائدة.. ومائةً وأربعةً وعشرين ألفَ مسامةٍ

سەد و بیست و چوار هەزار کونیلە و کلاورۆژنەی خانۆچکەکان، کە لە هەموو یەکێکیاندا پێنج هێزی کێشکەر و، پاڵنەر و، وەرگر و، وێنەگر و، بەرهەمهێن ئیش دەکات، کە هەریەکەیان بۆ بەرژەوەندییەکە..

جا ئەگەر جیهانە هەرە بچووکەکە بەم جۆرە بێت، ئیتر چۆن مرۆڤە هەرە گەورەکە لەو کەمتر دەبێت؟

ئەگەر ئەو "جەستە"یەی کە لەچاو کاکڵەکەیدا نرخێکی ئەوتۆی نییە، هەتا ئەو پلەیە ئیسرافی تێدا نەبێت، چۆن تەسەووری ئەوە دەکرێت کە گەوهەری "ڕۆح" پشتگوێ بخرێت و، سەرجەم ئاسەوارەکانی لە مەعنەوییات و ئاواتەکان و هزرەکان بە زیادەڕۆیی دەربکەون؟ چونکە ئەگەر "بەختەوەریی هەمیشەیی" نەبێت، ئەو لایەنە مەعنەوییانە دەچنەوە یەك و دەبنە زیادەڕۆیی.

دە توخوا پێم بڵێ ئایا ژیری ئەوەی بەلاوە پەسەندە کە تۆ "گەوهەر"ێکت هەبێت بە ئەندازەی دنیا بەنرخ بێت، بچیت ئەوەندە بایەخ بە "سەدەف" و "بەرگ"ەکەی بدەیت کە نەهێڵیت تۆزی بەربکەوێت، کەچی خودی گەوهەرەکە بشکێنیت و، بەملا و ئەولادا فڕێی بدەیت و، ئاسەوارەکانی بسڕیتەوە؟

نەخێر.. نەخێر. چونکە تەنها لەبەر ناواخنی بەرگەکەیە بایەخ بەو بەرگە دەدەیت!

هەروەها ئەگەر هێزی جەستەی کەسێك و، تەندروستیی ئەندامەکانی و، توانا و لێهاتنەکانی: "بەردەوامیی مانەوە" و "خۆ کامڵ کردن"ی ئەو کەسەت تێبگەیەنێت، ئەی ئایا ئەو ڕاستییە دامەزراوەی کە لە گیانی بوونەوەراندا هەیە و، ئەو هێزە تەواوەش کە هێمایەکە بۆ بەردەوامبوونی ڕێکوپێکی و، ئەو کەماڵەش کە ئاکامەکەی خۆ کامڵ کردنی ڕێساکەیەتی، هاتنی "بەختەوەریی هەمیشەیی"ت لە دەرگای حەشری جیسمانییەوە تێناگەیەنێت؟

چونکە هەر تەنها "بەختەوەریی هەمیشەیی"یە کە ئەو ڕێکوپێکییە لە تێکچوون ڕزگار دەکات و، دەبێتە هۆی خۆ کامڵ کردنی ڕێسا و، دەرکەوتنی ئەو هێزە هەمیشەییە.

● بەڵگەی پێنجەم و ئەو حەدسەش کە هێمایە بۆ ئامانجەکە، بریتییە لەوەی کە:

بوونی جۆرە قیامەتێکی نەوعی و دووپاتبوو لە زۆر "جۆر"ی بوونەوەراندا، ئاماژە بۆ قیامەتی هەرە گەورە دەکات.

وكُوَّةٍ للحجيرات التي تعملُ في كلٍّ منها خمسُ قوى من الجاذبة والدافعة والمُمسكة والمصوِّرة والمولِّدة، كلٌّ منها لمصلحة..

وإذا كان العالَمُ الأصغرُ كذا، فكيف يكونُ الإنسان الأكبرُ أنقصَ منه؟

وإذا كان الجسدُ الذي لا أهميةَ له بالنسبة إلى لُبِّه بتلك الدرجةِ من عدمِ الإسراف، فكيف يُتصوَّرُ إهمالُ جوهرِ الروح؟ وإسرافُ كلِّ آثارِه من المعنويات والآمال والأفكار؟ إذ لولا السعادةُ الأبديةُ لتقلصتْ كلُّ المعنوياتِ وصارتْ إسرافاً..

فبالله عليك، أيُمكنُ في العقل أنْ يكونَ لك جوهرةٌ قيمتُها الدنيا، فتهتمُ بصدَفها وغلافِها حتى لا تُخَلِّيَ أنْ يصلَ الغبار إليه، ثم تأخذَ الجوهرةَ فتكسِّرَها شذراً مذراً[1] وتمحوَ آثارَها؟ كلّا ثم كلّا! ما تهتمُ بالغلافِ إلّا لأجْل ما فيه..

وأيضاً إذا أفهمَتْك قوةُ البِنيةُ في شخصٍ وصحةُ أعضائِه واستعدادُه استمرارَ بقائِه وتَكمُّلَه؛ أفلا تُفهِّمُك الحقيقةُ الثابتةُ الجارية في روح الكائنات، والقوةُ الكاملةُ الموميةُ بالاستمرار في الانتظام، والكمالُ المنجرُّ إلى التكمُّلِ في النظام مجيءَ السعادة الأبديةِ من باب الحشرِ الجسماني؟ إذ هي المخلِّصةُ للانتظامِ عن الاختلال، والواسطةُ للتكمُّلِ وانكشافِ تلك القوةِ المؤبَّدة.

**وأما البرهان الخامسُ والحَدسُ المُرمِز إلى المقصد:**

فهو أنَّ وجودَ نوعِ قياماتٍ مكرّرةٍ نوعيةٍ في كثير من الأنواع يشيرُ إلى القيامة العظمى.

---

(١) شذراً مذراً: أي ذهبوا في كل وجه، فالمرادُ المبالغة في الكسر والتجزئة. (ش). والذي في المعاجم شذرَ مذرَ.

ئەگەر دەتەوێ ئەم هێمایەت لە نموونەیەكدا بۆ بەرجەستە ببێت، ئەوا سەیری سەعاتە هەفتانەكەی خۆت بكە. چونكە هەروەك چەند چەرخێكی جۆراوجۆری خولاوە و بزۆكی تێدایە كە دەرزی و میلەكان دەجوولێنن، ئەوانەی كە یەكێكیان چركەكان دەژمێرێت و پێشەكی و هەوالدەری جوولەی دەرزیی خولەك ژمێرەكانە، كە ئەویش ئامادەكار و ڕاگەیەنەری جوولەی سەعاتژمێرە، كە ئەویش بەرهەمهێن و ڕێ خۆشكەرە بۆ جوولەی ئەو دەرزییەی كە ڕۆژەكانی هەفتە دەژمێرێت.. ئیتر تەواوبوونی خولی میلی پێشوو، ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە ئەوەی دوای خۆیشی خولی خۆی تەواو دەكات..

بە هەمان جۆر.. خوای گەورەش سەعاتێكی یەكجار مەزنی هەیە، چەرخەكانی بریتین لە خولگەكان (الأفلاك) كە میلەكانی ئەوانیش ڕۆژەكان و سالەكان و تەمەنی مرۆڤ و مانەوەی دنیا دەژمێرن، بە هەمان شێوەی چركە و خولەك و سەعات و ڕۆژەكان لە سەعاتەكەی تۆدا.

جا بە پێی جوولەی ئەو سەعاتە:

هاتنی بەیانی لە دوای هەموو شەوێك و، هاتنی بەهاریش لە دوای هەموو زستانێك، ئاماژەیەكی پەنهان و هێمایەكی وردن بۆ لەدایكبوونی "بەرەبەیانی بەهاری حەشر" لەو سەعاتە یەكجار مەزنەدا!

* ئەگەر وتت:

"قیامەتی نەوعی" خودی كەسەكان حەشر ناكات، ئیتر چۆن دەبێتە ڕەمزێك بۆ سەرلەنوێ هاتنەوەی "خودی كەسەكان" لە قیامەتی هەرە مەزندا؟

پێت دەوترێ:

"كەس"ی مرۆڤ وەكو "جۆر" وایە لە شتی تردا. چونكە ڕووناكیی "هزر و بیر" فراوانی و كرانەوەیەكی تا ئەو پلەیەی بە گیان و ئاواتەكانی مرۆڤ بەخشیوە كە هەر سێ زەمەنەكەی تێدا جێ دەبێتەوە، بە ڕادەیەك كە ئەگەر "ڕابوردوو" و "ئێستا" و "داهاتوو" قووت بدات، هێشتا ئاواتەكانی پڕ نابنەوە.. چونكە ڕووناكیی "بیر" ناوەرۆكی مرۆڤی بلند ڕاگرتووە و، نرخیشی كردووە بە گشتی و، ڕوانینی بە هەمەكی و، كەمالی بە بێ سنوور و، چێژی بە هەمیشەیی و، ئازاریشی بە بەردەوام..

وإنْ شئتَ تمثُّلَ الرمزِ في مثالٍ، فانظرْ في ساعتك الأُسبوعيةِ، فكما أنَّ فيها دواليبَ مختلفةً دوّارةً متحرِّكة محرِّكةً للإبر والأمْيالِ العادّةِ واحدةٌ منها للثواني، وهي مقدمةٌ ومُخبِرَةٌ لحركة إبرةِ الدقائق، وهي مُعدِّةٌ ومُعلِنةٌ لحركة مِيل الساعات، وهي محصِّلةٌ ومُؤْذِنةٌ لحركة الإبرةِ التي تَعُدُّ أيامَ الأُسبوع. فإتمامُ دورة السابقةِ يشيرُ بأنَّ أُختَها اللاحقةَ تتمُ دورَها..

كذلك إنَّ لله تعالى ساعةً كبرى دواليبُها الأفلاكُ تعُدُّ أميالُها الأيامَ والسنين وعمرَ البشر وبقاءَ الدنيا، نظيرَ الثواني والدقائق والساعات والأيامِ في ساعتك..

فمجيءُ الصبحِ بعد كلِّ ليلةٍ، والربيعِ بعد كل شتاءٍ - بناءً على حركة تلك الساعةِ - يشيرُ إشارةً خفيةً ويرمزُ رمزاً دقيقاً بتولُّدِ صبحِ ربيع الحشر من تلك الساعةِ الكبرى.

* إنْ قلتَ:

القيامةُ النوعيةُ لا تَحشُر الأشخاصَ بأعيانهم، فكيف ترمزُ بالقيامة الكبرى لِعَوْدِ الأشخاص هناك بأعيانِهم؟

قيل لك:

إنَّ شخصَ الإنسان كنوعِ غيره، إذ نورُ الفكر أعطَى لآمال البشرِ وروحِه وُسْعةً وإنبساطاً بدرجة وسِعَت الأزمنةَ الثلاثةَ، لو ابتلعَ الماضيَ والمستقبلَ مع الحالِ لم تمتلئْ آمالُه؛ لأنَّ نورَ الفكر صيَّرَ ماهيتَه عُلْويةً، وقيمتَه عموميةً، ونظرَه كلياً، وكمالَه غيرَ محصورٍ، ولذتَه دائميةً، وألَمه مستمراً.

بەڵام "دانە"ی جۆری تر ناوەڕۆکەکەی جوزئی و، نرخەکەی کەسی و، ڕوانینی سنووردار و، کەماڵی دیاری کراو و، چێژی کاتی و، ئازاریشی یەکجارەییە..

ئیتر چۆن بوونی جۆرە قیامەتێك لە "جۆر"ەکاندا ئاماژە بۆ قیامەتی "کەسی"ی گشتیی مرۆڤ ناکات؟!

● بەڵگەی ئاماژەدەری شەشەمیش بریتی‌یە لە:

"ناکۆتایی توانا و لێهاتنەکانی مرۆڤ".

بەڵێ، تەسەوور و هزرەکانی مرۆڤ کە ناکۆتایین و، لە ئاواتە نەبڕاوەکانیەوە سەریان هەڵداوە، کە ئەوانیش لە حەزە دەستنیشان نەکراوەکانیەوە پەیدا بوون، کە ئەوانیش هی لێهاتنە بێ سنوورەکانیەتی، کە ئەوانیش لە توانا دیاری نەکراوەکانیدا خۆیان حەشار داوە، کە ئەوانیش لە گەوهەری ئەو "گیان"ەیدا چێنراون کە خوای گەورە بەهۆیەوە ڕێزی لێ ناوە..

هەموو یەکێکی ئەمانە، بە پەنجەی شایەتمان ئاماژە بۆ "بەختەوەریی هەمیشەیی" ئەودیو حەشری جیسمانی دەکەن و بۆی دەڕوانن!

دە فەرموو بیری لێ بکەرەوە!

● بەڵگەی مژدەدەری حەوتەمیش بریتی‌یە لەوەی کە:

"میهرەبانیی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان" مژدە بە هاتنی گەورەترین میهرەبانی دەدات، مەبەستم "بەختەوەریی هەمیشەیی"یە..

چونکە هەر تەنها بەو بەختەوەری‌یە "میهرەبانی" دەبێت بە میهرەبانی و، "نیعمەت"یش بە نیعمەت..

هەر بەو بەختەوەری‌یەش بوونەوەران لەو ناڵە و گریانە ڕزگاریان دەبێت کە لەو ماتەمینە گشتیی‌یەوە بەرز دەبێتەوە کە هی ئەو جوداییە هەمیشەییەن نیعمەتەکان دەگۆڕێت بە ڕق و تۆڵە.

چونکە ئەگەر گیانی نیعمەتەکان، واتە بەختەوەریی هەمیشەیی، نەیەتە پێش، ئەوا سەرجەمی نیعمەتەکان دەبنە تۆڵە و سزا. ئەو کاتەش دەبێ بە ناحەق نکوولی لەو میهرەبانی‌یە بکرێت کە بە ڕوونی و بەڵگەنەویستی و بە شایەتیی هەموو بوونەوەران، چەسپاوە.

أما فرُد النوعِ الآخَرِ فماهيتُه جزئيةٌ، وقيمتُه شخصيةٌ، ونظرُه محدودٌ، وكمالُه محصورٌ، ولذتُه آنيّةٌ، وألُمه دفعيٌّ. فوجودُ نوعٍ قيامةٍ في الأنواع، كيف لا يشيرُ بالقيامة الشخصيةِ العمومية للإنسان؟

**وأما البرهان السادسُ الملوِّحُ:**

فهو عدمُ تناهي استعداداتِ البشر.

نعم، إنَّ تصوراتِ البشر وأفكارَه التي لا تتناهى، المتولِّدةَ من آماله الغيرِ المتناهية، الحاصلةِ من ميولِه الغيرِ المضبوطةِ، الناشئةِ من قابلياته الغير المحدودة، المستترةِ في استعداداته الغير المحصورةِ، المزروعةِ في جوهر روحه الذي كرّمَه الله تعالى؛ كلٌّ منها يشيرُ في ما وراءَ الحشر الجسماني بإصبعِ الشهادةِ إلى السعادةِ الأبدية وتمدُّ نظرَها اليه. فتأملْ!

**وأما البرهانُ السابع المبشِّرُ:**

فهو أنَّ رحمةَ الرحمن الرحيم تبشِّرُ بقدوم أعظمِ الرحمة، أعني السعادةَ الأبدية..

إذ بها تصيرُ الرحمةُ رحمةً، والنعمةُ نعمةً..

وبها تخلصُ الكائناتُ من النياحات المرتفعةِ من المأتِم العموميّ المتولِّدِ من الفراق الأبديّ المصيِّرِ للنِعَم نِقَماً..

إذ لو لم يجئْ روحُ النِعَم أعني السعادةَ الأبدية، لتحوّلَ جميعُ النعم نِقماً؛ ولَلزِمَ المكابرةُ في إنكار الرحمة الثابتة بشهادة عمومِ الكائنات بالبداهة وبالضرورة..

دەسا ئەی "حەبیب"[1]ی بە شەفەقەتی شەیدا!

سەیری ناسکترینی ئاسەوارەکانی میهرەبانیی خوا بکە، واتە خۆشەویستی و شەفەقەت و عیشق..

پاشان سەردانی ویژدانی خۆت بکە، بەڵام دوای گریمان دانانی بەدواداهاتنی جودایی هەمیشەیی و، لێکدابڕانی تەواوەتی لەو خۆشەویستی و شەفەقەت و عیشقە! بزانە "ویژدان" چۆن دەکەوێتە هاواری فریاگوزاری و، "ئەندێشە" دەنگ هەڵدەبڕێت و، "گیان"یش بێزاری دەردەبڕێت لە هەڵگەڕانەوەی ئەو خۆشەویستی و شەفەقەتەی کە جوانترین و ناسکترینی جۆرەکانی میهرەبانی و نیعمەتن، بە گەورەترین گرفت لەسەر تۆ و قورسترین بەڵا لە تۆدا؟

ئایا "ژیری" ئەوەی بەلاوە گونجاوە کە ئەو میهرەبانی‌یە پێویستە، یارمەتیی هێرشی جودایی هەمیشەیی و لێکدابڕانی هەتاهەتایی بدات بۆ سەر ئەو خۆشەویستی و شەفەقەتە؟

نەخێر.. بەڵکو شان و شکۆی ئەو "میهرەبانی"یە وایە کە:

جودایی هەمیشەیی بەسەر لێکدابڕانی هەتاهەتایی و، لێکدابڕانی هەتاهەتایی بەسەر جودایی هەمیشەیی و، نەبوونیش بەسەر هەردووکیاندا زاڵ بکات!

● بەڵگەی ڕاشکاوی هەشتەم بریتی‌یە لە:

زمانی ڕاست و پشتڕاستکراوەی حەزرەتی محەممەد - دروودی لەسەر بێت - کە بە گوفتارەکانی خۆی، دەرگاکانی "بەختەوەریی هەمیشەیی" کردەوە.

وێڕای ئەوەش کۆدەنگیی پێغەمبەران، هەر لە ئادەمیانەوە هەتا خاتەمیان - درووديان لەسەر بێت - لەسەر ئەم ڕاستی‌یە، بەڵگەیەکی گومان بڕی ڕاستەقینەیە لەسەر ئەم دەعوایە. دیارە ئەوانیش لە خۆڕا یەکیان نەگرتووە.

● بەڵگەی نۆهەم بریتی‌یە لە:

هەواڵدانی قورئانی خاوەن ئیعجاز.

---

(١) ئەو قوتابی‌یە خەت خۆشەی مامۆستا نوورسی‌یە کە ڕەشنووسی ئەم کتێبە و، چەندین بەرهەمی تری دانەری بە خەتە جوانەکەی خۆی نووسیوەتەوە. لە یەکەم جەنگی جیهانیدا لەگەڵ مامۆستا نوورسی بەشداریی جیهادی کردووە، هەتا شەهید بووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

فيا أيها الحبيبُ الشفيقُ العاشق!

انظُرْ إلى ألطفِ آثارِ رحمة الله، أعني المحبةَ والشفقةَ والعشقَ؛ ثم راجعْ وجدانَك، لكنْ بعد فرضِ تعقُّبِ الفراقِ الأبديّ والهجرانِ اللايزالي عليها، كيف ترى الوجدانَ يستغيثُ.. والخيالَ يصرخُ.. والروحَ يضجرُ من انقلاب تلك المحبةِ والشفقة - اللتين هما أحسنُ وألطفُ أنواع الرحمة والنعمة - أعظمَ مصيبةٍ عليك وأشدَّ بلاءٍ فيك؟

أفيمكنُ في العقل أنْ تساعدَ تلك الرحمةُ الضروريةُ لهجومِ الفراق الأبديِّ والهجرانِ اللايزاليّ على المحبة والشفقة؟

لا!

بل من شأنِ تلك الرحمةِ أنْ تسلِّطَ الفراقَ الأبديَّ على الهجرانِ اللايزاليّ، والهجرانَ اللايزاليّ على الفراقِ الأبدي، والعدمَ عليهما.

**وأما البرهانُ الثامنُ المصرِّح:**

فهو لسانُ محمدٍ عليه السلام الصادقُ المصدوق، ولقد فتحَ كلامُه أبوابَ السعادة الأبدية.

على أنَّ إجماعَ الأنبياء من آدمِهم إلى خاتمِهم عليهم السلام على هذه الحقيقةِ حُجةٌ حقيقيةٌ قطعيةٌ على هذا المدّعَى. ولِأمرٍ مّا اتفقوا.

**وأما البرهانُ التاسع**

هو إخبارُ القرآنِ المعجِز..

چونکە ئەم قورئانەی کە بە درێژایی سیازدە چەرخ، ئیعجازەکەی بە حەوت "ڕوو"[1] پشتڕاست کراوەتەوە، دەعواکەی هەر خودی بەڵگەکەیەتی! جا هەواڵەکانی ئەم قورئانە، دەرخەر و کلیلن بۆ حەشری جیسمانی.

● بەڵگەی دەهەمیش ئەوەیە کە هەزاران بەڵگەی گەلێ ئایەتی لەخۆگرتووە، وەك:

﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَاراً﴾ کە ئاماژە بۆ "قیاسی تەمسیلی" دەکات و..

﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلاَّمٍ لِلْعَبِيدِ﴾ کە ئاماژە بۆ "بەڵگەی دادگەری" دەکات و..

جگە لەمانەش..

قورئان لە زۆربەی ئایەتەکانیدا چەندین کلاوڕۆژنەی کردووەتەوە کە بەسەر حەشردا دەڕوانن.

سەبارەت بەو قیاسە تەمسیلی‌یەی کە بە ئایەتی یەکەم ئاماژەی بۆ کراوە، ئەوا:

فەرموو بۆ "بوون"ی مرۆڤ بڕوانە.. ئەوەتا لە قۆناغێکەوە دەگوێزێتەوە بۆ قۆناغێکی تر، لە "نوتفە"وە بۆ "زەروو".. لە ویشەوە بۆ "جووراو".. لەویشەوە بۆ "ئێسك و گۆشت".. لەویشەوە بۆ "بەدیهاتووی نوێ"..

هەریەك لەو قۆناغانەش چەندین یاسای تایبەتی و، ڕێسای دیاری کراوی خۆی و، چەندین جووڵەی ڕێکوپێك و یەك لە دوای یەکی خۆیان هەیە، کە هەموو یەکێکیان "مەبەست" و "ویست" و "هەڵبژاردن"یان پێوە دەبینرێت..

پاشان بە وردی لە "مانەوە"ی ڕامێنە! چونکە "بوون"(جەستە) هەموو ساڵێك پۆشاکەکانی خۆی نوێ دەکاتەوە و، هەڵوەشانەوە و پێکهاتنەوەی بەسەردا دێت. واتە دارمانی خانۆچکەکان، ئنجا ئاوەدانکردنەوەیان - لە بریی هەڵوەشاوەی ئەوان - بەو ماددە نیانەی کە بە ڕێژەی پێویستیی ئەندامەکان و بە یاسایەکی دیاری کراو، کردگاریان ئامادەی دەکات..

پاشان سەرنج لە قۆناغەکانی ئەو ماددە نیانە بدە کە ڕۆزیی ئەو بەشانەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، ببینە کە چۆن بە شێوەیەك ژیری‌یەکان سەرسام دەکات، بە هەموو کەنارێکی جەستەدا بڵاو دەبێتەوە و، چۆن بە یاسای دابەشکردنی دیاریکراو بە

(١) لەو "ڕووانەی ئیعجاز" لە وتەی بیست و پێنجەمی کتێبی (وتەکان)دا کە پەیامی (موعجیزاتی قورئانی)یە، بە درێژی باس کراون.

إذ التنـزيلُ المصدَّقُ إعجازُه بسبعة أوجه[١] في ثلاثةَ عشرَ عصراً دعواه عينُ برهانها[٢].

فإخبارُه كشّافٌ للحشر الجسماني ومفتاحٌ له.

وأما البرهانُ العاشر، المشتملُ على ألوفٍ من البراهين التي تضمّنَها كثيرٌ من الآياتِ مثلِ: ﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَاراً﴾ المشيرِ إلى "قياسٍ تمثيلي".. و ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ﴾ المشيرِ إلى "دليل عَدْليّ"، وغيرِهما..

فلقد فتحَ القرآنُ في أكثر الآيات كُوّاتٍ[٣] ناظرةً إلى الحشر.

أما القياسُ التمثيليُّ المشارُ إليه بالآية الأُولى:

فانظرْ في وجود الإنسانِ فإنَّه ينتقلُ من طَورٍ إلى طور؛ من النطفةِ إلى العلَقةِ.. ومنها إلى المضغةِ.. ومنها إلى العظمِ واللحمِ.. ومنه إلى الخلقِ الجديد.

ولكلٍّ من تلك الأطوارِ قوانينُ مخصوصةٌ، ونظاماتٌ معيّنةٌ، وحركاتٌ مطَّرَدَةٌ يشِفُّ كلٌّ منها عن قصدٍ وإرادةٍ واختيارٍ..

ثم تأملْ في بقائه، فإنَّ هذا الوجودَ يجدِّدُ لباسَه في كل سنة، ومن شأنه التحللُ والتركّبُ، أي انقضاضُ الحجيراتِ وتعميرُها ببدلِ ما يتحللُ من المادة اللطيفةِ الموزَّعة على نسبة مناسبةِ الأعضاء التي يُحضِرُها صانعُها بقانون مخصوص.

ثم تأملْ في أطوار تلك المادةِ اللطيفة الحاملةِ لأرزاق الأجزاء، كيف تنتشرُ في أقطار البدَن انتشاراً تحيّرَت فيه العقولُ. وكيف تنقسـمُ بقانون التقسـيم المعيَّنِ على مقدار حاجاتِ

(١) تفصيل هذه الأوجه في الكلمة الخامسة والعشرين (رسالة المعجزات القرآنية).

(٢) أي برهان الدعوى. (ب)

(٣) الكُوةُ: الخرق في الحائط. ج: كواء وكوى وكوات.

ئەندازەی پێویستیی ئەندامەکان دابەش دەبێت، دوای ئەوەی کە ئەو ماددەیە بە ڕێسایەکی جێگیر و، بە دەستوورێکی دەستنیشان کراو و، بە جووڵەیەکی سەیر لە چوار پاڵێوگەدا پوخت کراوە و، لە چوار کوڵێنگەدا کوڵاوە، دوابەدوای چوار ئالوگۆڕی سەرسووڕهێن..

ئەو ماددەیەش لەو "بژێو"ە وەرگیراوە کە هی ئەو بەرهەمانەیە بە دەستوورێکی ڕێکوپێك و، ڕێسایەکی تایبەتی و، یاسایەکی دیاریکراو، لە جیهانی تۆخمەکاندا بڵاو بوونەتەوە..

هەموو یاسا و ڕێسایەکی ئەو قۆناغانەش "ڕانەر" و "مەبەست" و "دانست"ێك دەردەخەن لە پشتیانەوە.

ئاخر چۆن وا نییە.. خۆ ئەگەر لەناو کاروانی ئەو ماددە نیانەدا - بۆ نموونە - سەرنج لە گەردیلەیەك بدەیت کە لەناو تۆخمی "هەوا"دا شارراوەتەوە و دوایی دەبێتە بەشێك لە ڕەشێنەی چاوی "حەبیب"، ئەوا دەزانیت کە ئەو گەردیلەیە هەر ئەو کاتەی لە هەوادا بووە دیاری کراوە، وەك بڵێی کارمەندێکە ئەو ئەرکەی خراوەتە ئەستۆ کە بڕوات بۆ ئەو شوێنەی بۆی دەستنیشان کراوە. چونکە ئەگەر بە تێڕوانینێکی زانستییانە بۆی بڕوانیت، دڵنیا دەبیت کە جووڵەی ئەو گەردیلەیە بە ڕێکەوتێکی کوێرانە نییە. بەڵکو کە دەڕواتە هەر پلەیەك بە پێی ڕێسای تایبەتیی ئەو پلەیە هەنگاو دەنێت و، بە هەر قۆناغێکیشدا سەردەکەوێت کار بە یاساکانی ئەو قۆناغە دەکات و، بۆ هەر توێژێکیش بڕوات بە جووڵەیەکی سەرسووڕهێنەری ڕێکوپێك دەڕوات. ئیتر بەسەر ئەو قۆناغانەدا تێدەپەڕێت هەتا دەگاتە شوێنی خۆی، لەگەڵ ئەوەشدا بە ئەندازەی گەردیلەیەك لە ئامانجەکەی خۆی لانادات.

به پوختی:

ئەو کەسەی لە "بەدیهاتنی یەکەم جار" ڕادەمێنێت، هیچ گومانێکی لە "بەدیهاتنی دووهەم جار"دا نامێنێت. پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی:

(جێی سەرسووڕمانە! کەسێك کە بەدیهاتنی یەکەم جار دەبینێت، چۆن نکووڵی لە بەدیهاتنی دووهەم جار دەکات)[1]؟!

(١) بۆ تەخریجەکەی بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر.

الأعضاء؛ بعد أنْ تلخّصتْ تلك المادةُ بنظامٍ ثابت، ودستورٍ معين، وحركةٍ عجيبة من أربع مصفاتاتٍ، وانطبختْ في أربعةِ مطابخَ بعد أربعةِ انقلاباتٍ عجيبة؛ المأخوذةِ تلك المادةُ من القُوتِ المحصَّلِ من المواليدِ المنتشرةِ في عالم العناصر بدستورٍ منتظَم؛ ونظامٍ مخصوص، وقانونٍ معين.

وكلٌّ من القوانين والنظامات في تلك الأطوار يشفُّ عن سائقٍ وقصدٍ وحكمةٍ.

كيف لا، ولو تأملتَ من قافلةِ تلك المادة اللطيفةِ في ذرةٍ مثلاً، مُستَّرةٍ في عنصر الهواء تصيرُ بالآخرة جزءاً من سواد عين "الحبيب"، لعَلِمتَ أنَّ تلك الذرةَ وهي في الهواء معيّنةٌ كأنها موظفةٌ مأمورةٌ بالذهاب إلى مكانها الذي عُيِّن لها؛ إذ لو نظرتَ إليها بنظرٍ فنّيّ تيقنتَ أنْ ليستْ حركتُها "اتفاقيةً عمياءَ"، "بِتصادفٍ أعمى"، بل تلك الذرةُ ما دخلتْ في مرتبةٍ إلَّا تبعَتْ نظاماتِها المخصوصةَ، وما تدرّجَتْ إلى طورٍ إلَّا عَمِلتْ بقوانينه المعيّنةِ، وما سافرتْ إلى طبقةٍ إلَّا وهي تُساقُ بحركةٍ عجيبةٍ منتظمة، فتمرُّ على تلك الأطوارِ حتى تصلَ إلى موضعِها. مع أنّها لا تنحرفُ قطعاً مقدار ذرةٍ عن هدفِ مقصدها.

والحاصلُ:

أنَّ مَن تأمَّلَ في النشأةِ الأولى لم يبقَ له تردّدٌ في النشأةِ الأخرى، ولقد قال النبيُّ عليه الصلاةُ والسلام:

"عَجباً لمن يَرى النشأةَ الأُولَى كيفَ يُنكِرُ النشأةَ الأخرى"[١].

---

(١) القضاعي، مسند الشهاب ١/ ٣٤٧، رقم ٥٩٥؛ ابن الجوزي، صفوة الصفوة ٢/ ٩٥.

بەڵێ، هەروەك كۆكردنەوەی یەك بە یەكی سەربازەكانی سوپایەك كە دەرفەتی حەوانەوە و بڵاوبوونەوەیان پێ درابێت، بە ئامێرە زانراوە تایبەتی‌یەكە، ئیتر بە بیستنی دەنگی ئەو ئامێرە لە گۆشە و كەنارە جیاجیاكانەوە دەگەڕێنەوە و لە ژێر ئاڵاكەیاندا كۆدەبنەوە.. هەروەك ئەمە لە هێنانی یەكەم جاریان و ڕێكخستن و پرچەك كردنیان گەلێ ئاسانترە..

بە هەمان شێوە، ئەو گەردیلانەش كە بە ئاوێتە بوونیان لەناو یەك جەستەدا هۆگری و پەیوەندی‌یان لە نێواندا بۆ دروست بووە، كۆكردنەوەیان كاتێ بە شەیپووری ئیسرافیل بانگیان لێ دەكرێت و، یەك بە یەكی ئەوانیش لە گشت ڕێگایەكی دوورەوە بەرەو گوێڕایەڵیی فەرمانی بەدیهێنەریان بە هەڵەداوان دەڕۆن..

ئەمە، بە لای ژیری‌یەوە، گونجاوتر و ئاسانترە لە دروستكردن و پێكهێنانی یەكەم جاریان.

سەبارەت بە "توانست"ی خوای گەورەش، ئەوا مەزنترین شت وەكو بچووكترینیان وایە بەلایەوە.

پاشان وا دیارە كە ئەوەی زیندوو دەكرێتەوە بە هەموو بەشە بنەڕەتی و لاوەكی‌یەكانیەوە سەرلەنوێ دەهێنرێتەوە. بە پێی ئەوەی كە: كەتەیی جەستەی خەڵكی ڕۆژی حەشر و[1]، ناپەسەندیی نینۆك كردن و موو بڕین لە كاتی لەش قورسیدا و، سوونەت بوونی كردنیان بە ژێر خۆڵەوە[2]، ئاماژەی بۆ دەكەن.

بە لێكۆڵینەوەی بێگومانیش ئەوە سەلماوە كە "كلێنچكە" (عَجْبُ الذَّنَب) سەروزیادی ئەوەیە ببێتە مایە و تۆوی پێكهاتنەوەی سەرلەنوێی[3].

سەبارەت بەو بەڵگەیەش كە: ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلاَّمٍ لِلْعَبِيدِ﴾ ئاماژەی بۆ كرد، ئەوا بزانە كە:

---

(١) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "خرێی كافر - یان كەڵبەی كافر - هێندەی چیای ئوحود دەبێت و، ئەستووریی پێستەكەشی سێ ڕۆژە ڕێیە". بۆ تەخریجەكەی بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر.

(٢) "مردووەكانتان و مووەكانتان و نینۆكەكانتان بنێژن، با سیحربازەكان یاری‌یان پێ نەكەن". بۆ تەخریجەكەی بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر.

(٣) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "جەستەی ئادەمیزاد هەمووی دەبێتەوە بە خاك، كلێنچكەی نەبێت، كە لەو بەدیهێنراوە و، لەویشدا پێكدەهێنرێتەوە". بۆ تەخریجەكەی بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر.

نعم، كما أنَّ جمعَ نفراتِ عسكرٍ فرقةٍ أُذِنَ لهم بالاستراحةِ والانتشار إذا دُعوا بالآلة المعروفة - يتسللون عن كل طرَفٍ ومكمَن، فيجتمعون متّحدين تحت لوائهم - يكونُ أسهلَ وأسهلَ من جلبهم أولَّ الأمرِ إلى الانتظامِ تحت السلاح..

كذلك إنَّ جمعَ الذرات التي حصَلتْ بينها المؤانسةُ والمناسبةُ بالامتزاج في وجودٍ واحدٍ إذا نوديتْ بصُور إسرافيلَ فينسابُ الكلُّ من كل فجٍّ عميق مُلبّيَةً لأمر خالقِها، يكونُ أسهلَ وأمكنَ في العقل من إنشائِها وتركيبِها أولَّ المرة.

أما بالنسبةِ إلى القدرةِ فأعظمُ الأشياء كأصغرِها.

ثم الظاهرُ أنَّ المُعادَ يُعادُ بأجزائِه الأصليةِ والفضولية معاً. كما يشيرُ إليه كبرُ أجسام أهل الحشر[1] وكراهةُ قصِّ الأظفارِ والأشعارِ ونحوها للجُنُب، وسُنّيّةُ دفنِها[2].

والتحقيقُ أن عَجْبَ الذَّنَبِ يكفي أنْ يكونَ بذراً ومادةً لتشكُّلِه[3].

وأما الدليلُ الذي لوّحَ به:

﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ﴾:

---

(١) عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: "ضرس الكافر - أو ناب الكافر - مثل أُحد وغلظ جلده مسيرة ثلاث". رواه مسلم (٤/ ٢١٨٩).

(٢) "ادفنوا ماءكم وأشعاركم وأظفاركم، لا تلعب بها السحرة" مسند الفردوس ١/ ١٠٢. وانظر الفتح الكبير ٢/ ٣٧٥ وكنز العمال ١٧٢٤٥ وجمع الجوامع رقم ٨٨٥.

(٣) عن أبي هريرة رضي الله عنه قال :قال رسول الله ﷺ: "كل ابن آدم يأكله التراب إلّا عَجْبَ الذنب، منه خُلق ومنه يركّب" . رواه مسلم وأبو داود وابن ماجه . والعجب: أصل الذنب.

ئێمە زۆر جار ستەمکاری یاخی و ناپاك دەبینین کە لەوپەڕی ناز و نیعمەتدایە و، تەمەنیشی تابلێی بە حەوانەوە و خۆشی لێ دەگوزەرێت.. پاشان بابای ستەملێکراوی هەژار و دیندار و ڕەوشت جوانیش دەبینین کە بەوپەڕی ئەرك و ماندووبوون و زەلیلی و ستەملێکراوی تەمەنی دەچێتە سەر..

ئنجا کاتێ کە مردن دێت هەردوو لایان بە یەکسانی بەڕێ دەکات. ئەم یەکسانی‌یەش، گەر بێ کۆتایی بێت، ئەوا ستەم لە مەسەلەکەدا دەخاتە پێش چاو. لە کاتێکدا "دادگەری" و "دانایی" خوای گەورە، کە سەرانسەری بوونەوەران شایەتن لەسەریان، پاك و خاوێنن لەوەی بە ستەم ڕازی بن.

کەواتە دەبێ جێگایەکی تری کۆبوونەوە هەبێت، هەتاکو یەکەمیان سزای خۆی و دووهەمیشیان پاداشتی خۆی وەربگرێت، ئیتر دادگەریی خوای گەورە بە ڕوونی دەربکەوێت.

فەرموو بۆ خۆت ئایەتەکانی تری هاوشێوەی ئەم دوو ئایەتە، بە هەمان خوێندنەوە و پێوەری ئەمان، لێکبدەرەوە.

هۆی هۆنینیش لە بەشەکانی: ﴿وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾دا، ئەوا بزانە کە ئەو هێشووەی سەربجەکانی پێدا شۆڕ بوونەتەوە:

"واو"ەکە، پاشان پێشخستنی ﴿بِالآخِرَةِ﴾، ئنجا "ئەلف و لام"ەکەی، پاشان گوزارشت کردن بەم دارشتنە، ئنجا بەکارهێنانی ﴿هُمْ﴾، پاشان هێنانی ﴿يُوقِنُونَ﴾ لە بری "یؤمنون"یە.

"واو"ەکە "تایبەتکردن"ی دوای "گشتاندن"ی تێدایە، تاکو دەقێك بێت لەسەر ئەم پایەیەی "ئیمان". چونکە (ئیمان بە دوارۆژ) یەکێکە لەو دوو جەمسەرەی کە سەرجەم کتێبە ئاسمانی‌یەکان لە دەوریان دەخولێنەوە.

پێشخستنی ﴿بِالآخِرَةِ﴾ش "قەتیسکردن"ی تێدایە. ئەوەش پلارێکە ڕووەو خاوەن کتێبەکانی پێشین کە دەیانوت: ﴿لَنْ تَمَسَّنَا النَّارُ إِلاَّ أَيَّاماً مَعْدُودَةً﴾ (البقرة: ٨٠) و، پێیان وا بووە چێژەکانی ئەودنیا جەستەیی نین. پلارێکە بۆ ئەوەی کە ئاخیرەتی (لای) ئەوان ناوێکی "مەجازی"یە، دەنا ئاخیرەتی "ڕاستەقینە" نی‌یە.

فاعلم أنّا كثيراً ما نرى الظالمَ الفاجرَ الغدّارَ في غاية التنعُّمِ، ويمرُّ عمرُه في غايةِ الطِّيبِ والراحة..

ثم نرى المظلومَ الفقيرَ المتديّنَ الحَسَنَ الخُلقِ ينقضي عمرُه في غاية الزحمة[1] والذلّةِ والمظلوميةِ..

ثم يجيءُ الموتُ فيساوي بينهما. وهذه المساواةُ بلا نهايةٍ تُرى ظُلماً..

والعدالةُ والحكمةُ الإلهيتان اللتان شهِدتْ عليهما الكائناتُ منـزَّهتان عن الظلمِ..

فلابدَّ مِن مجمَعٍ آخَر ليرى الأولُ جزاءَه والثاني ثوابَه فتتجلى العدالةُ الإلهية.

وقِسْ على هاتين الآيتين نظائرَهما. هذا..

أما وجهُ النظم في أجزاءِ ﴿وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾ فاعلم أنَّ مناطَ النكت:

"الواو"، ثم تقديمُ ﴿بِالآخِرَةِ﴾، ثم الألف واللام فيها، ثم التعبير بهذا العنوان، ثم ذِكر ﴿هُمْ﴾ ، ثم ذِكرُ ﴿يُوقِنُونَ﴾ بدلَ "يؤمنون".

أما "الواو" ففيها التخصيصُ بعد التعميمِ، للتنصيصِ على هذا الركنِ من الإيمان، إذ هو أحدُ القطبين اللذين تدورُ عليهما الكتبُ السماويةُ.

وأما تقديمُ ﴿بِالآخِرَةِ﴾ ففيه حصرٌ، وفي الحصرِ تعريضٌ بأنَّ أهلَ الكتابِ بناءً على قولهم: ﴿لَنْ تَمَسَّنَا النَّارُ إلاّ أيّاماً مَعْدُودَةً﴾ (البقرة: ٨٠) ونفيِهُم اللذائذَ الجسمانيةَ، آخرتُهم آخرةٌ مجازيةٌ اسمية، ما هي بحقيقةِ الآخرة.

---

(١) التعب والمشقة والضيق.

"ئەلف و لام"ەكەشی بۆ زانراوییە، واتە ئاماژەیە بۆ ئەو "ئاخیرەت"ەی كە هەموان دەزانن لەسەر زمانی گشت كتێبە ئاسمانییەكان باسی هاتووە. زانراوییەكەشی هێمایە بەوەی كە "حەق"ە و، ئاماژەدانە بەو ڕاستییەی كە بەهۆی بەڵگە فیترییە باسكراوەكانەوە لە نێوان برژانگی ژیرییەكاندایە. ئەو كاتەش زانراوییەكەی هێمایە بۆ ئەوەی كە "حەقیقەت"ە.

گوزارشت كردنیش بە ناونیشانی ﴿الآخِرَة﴾ كە سیفەتی بەدیهێنان(ی دووهەم)ە، بۆ ئاراستەكردنی زەینە بەرەو "بەدیهاتنی یەكەم"، هەتا لەوێوە بڕوات بۆ "بەدیهاتنی دووهەم".

﴿هُمْ﴾یش "قەتیسكردن"ی تێدایە. كە ئەویش پلارێكە بۆ ئەوەی "ئیمان"ی ئەو خاوەن كتێبانەی باوەڕیان بە حەزرەتی محەممەد - دروودی لەسەر بێت - نەهێناوە، "یەقین" نییە، بەڵكو بە گومانی خۆیان پێیان وایە كە "یەقین" بێت.

بەكارهێنانی ﴿يُوقِنُونَ﴾ش لە بری "یۆمنون" لە كاتێكدا كە "ئیمان" بریتییە لە "تەسدیق"ێك هاوكات بێت لەگەڵ "یەقین"دا، بۆ ئەوەیە كە بە مەبەستەوە پەنجە لەسەر شوێنی ئامانجەكە دابنێت، تاكو گومانەكان هەڵبفڕێنێت. چونكە قیامەت مەحشەری گومانەكانە..

هەروەها بۆ ئەوەی كە دەربڕین بە "دەق" ڕێی ئەو بیانووەیان دەبەستێت كە بڵێن: "ئێمە ئیمانداریں، دەبا ئەوانە ئیمان بهێنن كە ئیمانیان نییە"!

* * *

وأما الألفُ واللام فللعَهدِ، أي إشارةٌ إلى المعهودِ بالدورانِ على ألسنةِ كلِّ الكُتبِ السماوية.. وفي العهدِ لمحٌ إلى أنّها حقٌّ وإشارةٌ إلى الحقيقةِ المعهودة الحاضرةِ بين أهدابِ العقول بسببِ الدلائلِ الفطرية المذكورة.. وفي العهدِ حينئذٍ رمزٌ إلى أنّها حقيقةٌ..

وأما التعبيرُ بعنوان ﴿الآخِرَةِ﴾ الناعتةِ للنشأةِ فلتوجيهِ الذهن إلى النشأة الأولى، لينتقلَ إلى إمكانِ النشأة الأخرى.

وأما ﴿هُمْ﴾ ففيه حصرٌ، وفي الحصر تعريضٌ بأنَّ إيمانَ من لم يؤمنْ بمحمدٍ عليه الصلاة والسلام مِن أهل الكتابِ ليس بيقينٍ، بل إنما يظنونه يقيناً.

وأما ذكرُ ﴿يُوقِنُونَ﴾ بدل "يؤمنون" مع أنَّ الإيمانَ هو التصديقُ مع اليقين، فلِيضعَ الإصبعَ على مناط الغرضِ قصداً لإطارةِ الشكوكِ؛ إذ القيامةُ محشرُ الريوب..

وأيضاً بالتنصيصِ ينسدُّ طُرقُ التعلُّلِ بـ"إنا مؤمنون فليؤمِنْ مَن لم يؤمنْ".

* * *

﴿أولئِكَ عَلَى هُدىً مِنْ رَبِّهِمْ وَأُولئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (البقرة: ٥)

﴿أولئِكَ عَلَى هُدىً مِنْ رَبِّهِمْ﴾.

بزانە كە:

ئەو شوێنانەی لێرەدا سەرنجەكانی تێدا دەبریسكێنەوە بریتین لە:

هۆنینی ئەم ئایەتە لەگەڵ ئەوەی پێش خۆیدا.. پاشان "هەست پێكراوی لە ﴿أولئِكَ﴾دا.. ئنجا "دووری" تیایدا.. پاشان "بەرزی" لە ﴿عَلَى﴾دا.. ئنجا "نەكیرەیی" لە ﴿هُدىً﴾دا.. ئنجا وشەی ﴿مِنْ﴾.. پاشان "پەروەردە" لە ﴿رَبِّهِمْ﴾دا.

سەبارەت بە "هۆنین"ەكەی، ئەوا بزانە كە ئەم ئایەتە، بە چەند هێڵێكی پەیوەندی، بە ئایەتەكەی پێش خۆیەوە پەیوەستە. كە یەكێكیان دەستپێكی ڕستەی نوێیە، واتە وەڵامی سێ پرسیاری گریمان كراوە:

یەكێك لەوانە: پرسیار كردنە لە "نموونە". وەك بڵێی كاتێ گوێ بیست ئەوەی بەر گوێ كەوت كە یەكێك لە كارەكانی قورئان هیدایەتدانی كەسانێكە بە هۆی ئەو هیدایەتەوە چەند سیفەتێكیان تێدا بێتەدی.. ئەوا حەزی كرد لە كاتی بەرجەستەبوونی ئەو سیفەتانە لەواندا و دانیشتنیان لەسەر كورسیی هیدایەتدا، بیانبینێت.. لەبەر ئەوە، قورئان بە پیشاندانیان بۆ گوێ بیست وەڵامی دایەوە و، فەرمووی:

﴿أولئِكَ عَلَى هُدىً مِنْ رَبِّهِمْ﴾.

یەكێكی تریان: پرسیار كردنە لە "هۆكار". وەك بڵێی كەسی خاوەن پرسیار دەڵێت: بۆچی ئەوانە شایستە و تایبەتمەندی هیدایەت بوون؟

وەڵامی دایەوە كە: ئەو كەسانەی ئەو سیفەتانەیان تێدا ئاوێتە و كۆیە - گەر سەرنجیان بدەیت - شایانی نووری هیدایەتن.

﴿أُولَئِكَ عَلَى هُدىً مِنْ رَبِّهِمْ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (البقرة: ٥)

﴿أُولَئِكَ عَلَى هُدىً مِنْ رَبِّهِمْ﴾.

اعلم أنَّ المظانَ التي تتلمّعُ فيها النُّكَتُ هي:

نظمُها مع سابقِها، ثم المحسوسيةُ في ﴿أُولَئِكَ﴾، ثم البُعْدية فيها، ثم العُلوُّ في ﴿عَلَى﴾، ثم التنكيرُ في ﴿هُدىً﴾، ثم لفظُ ﴿مِنْ﴾، ثم التربيةُ في ﴿رَبِّهِمْ﴾.

أما النظمُ، فاعلم أنَّ هذه[1] مرتبطةٌ بسابقَتِها بخطوطِ مناسباتٍ. منها الاستينافُ، أي[2] جوابٌ لثلاثة أسئلةٍ مقدَّرة:

منها: السؤالُ عن المثال، كأنَّ السامعَ بعدما سمِع أنَّ القرآنَ من شأنه الهدايةُ لأشخاصٍ من شأنهم- بسبب الهداية -الاتّصافُ بأوصافٍ، أحبَّ أن يراهم وهم بالفعل تلبّسوا بتلك الأوصافِ متكئين على أرائك الهداية. فأجاب مُريئاً للسامع بقوله:

﴿أُولَئِكَ عَلَى هُدىً مِنْ رَبِّهِمْ﴾.

ومنها: السؤالُ عن العلّةِ، كأنَّ السائلَ يقولُ: ما بالُ هؤلاءِ استحقوا الهدايةَ واختصُّوا بها؟ فأجابَ: بأنَّ هؤلاء الذين امتزجتْ واجتمعتْ فيهم تلك الأوصافُ - إنْ تأملتَ - لجديرون بنور الهداية.

(١) أنَّ هذه الآية. (ش)

(٢) أي إنها جواب.

* ئەگەر وتت:

درێژەپێدانی پێشوو، ڕوونتر هۆکارەکە دەردەخات، هەتا ئەو کورتەیەی کە لە ﴿أولئِكَ﴾دایە؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

هەندێ جار "کورتکردنەوە" لە "درێژەپێدان" ڕوونتر دەبێت، بە تایبەتی ئەگەر مەبەستەکە لە کۆی هەمووی بەدەست هاتبێت.. چونکە بەهۆی جوزئی بوونی زەینی گوێ بیست و.. سەرکەوتنی پلەپلەی بە بەشەکانی درێژەپێداندا و.. ئاوێتەبوونی "لەبیرچوونەوە" لە نێوانیاندا و.. دەرکەوتنی هۆکارەکە لە ئاوێتەکردنی هەموو بەشەکان.. بەهۆی ئەمانەوە، هەندێ جار لە درێژەپێداندا هەست بە پەیدابوونی هۆکارەکە ناکرێت. کەواتە کورتکردنەوەی ﴿أولئِـــكَ﴾ کە بۆ ئاوێتەکردنە، "هۆکارێتی"یەکە ڕوونتر دەردەخات.

یەکێکی تریان: پرسیار کردنە لە "ئەنجام" و "بەروبووم" و "نیعمەت" و "چێـژ"ی هیدایەت. وەك بڵێی گوێ بیست دەڵێت: چێـژ و نیعمەت چییە؟ وەڵامی دایەوە کە: "هیـدایەت" بەختەوەریی هەردوو دنیای تێدایە. واتە ئەنجامی "هیدایەت" خـودی هیدایەتە و، بەروبوومەکەشی هەر خۆیەتی. چونکە هیدایەت لەخۆیدا نیعمەتێکی یەکجار مەزنە و چێژێکی ویژدانییە، بەڵکو بەهەشتی "گیان"ە، وەك چۆن گومڕایی دۆزەخیەتی. پاشان لەودنیاشدا سەرکەوتن و سەرفرازی بەرهەم دەهێنێت.

سەبارەت بە "ئاماژە پێکراویی بەرچاو"یش لە ﴿أولئِكَ﴾دا، ئەوا ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە: باسکردنی وەسفە زۆرەکان دەبێتە هۆی بەرجەستە بوونیان لە زەین و، ئامادە بوونیان لە ژێری و، هەست پێکراوییان لەناو ئەندێشەدا..

ئەوەتا لە "زانراوی"ی[1] باسکردنیانەوە[2] دەرگایەك بۆ زانراویی دەرەکییان دەکرێتەوە[3].. لە زانراویی دەرەکیشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ جیاوازیی تایبەتمەندییان و.. لەناو جۆری مرۆڤدا سەیری درەخشانییان دەکرێت. وەك بڵێی هەرکەسێك سەری هەڵبڕێت و چاوەکانی والا بکات، جگە لەوان کەسی تری لێ دەرناکەوێت!

---

(١) واتە لە ئاشنابوونی زەین پێیان لە ڕێی باسکردنیانەوە. (م. حسین)

(٢) چونکە لەبەر ئەوەی وەسفەکانی ئەوانی باس کرد، ئەوا بوون بە "زانراو". (ت)

(٣) واتە دەرگایەك بۆ ئاشنا بوون پێیان لە دەرەوەی زەین دەکرێتەوە. (واتە بەرجەستە دەبن). (م. حسین)

* فإنْ قلتَ:

التفصيلُ السابقُ أجلى للعلّةِ من الإجمال في ﴿أُوْلَئِكَ﴾؟

قيلَ لك:

قد يكونُ الإجمالُ أوضحَ من التفصيل لاسيما إذا كان المطلوبُ متولّداً من المجموع؛ إذ بسبب جزئيةِ ذهن السامع، والتدرّجِ في أجزاء التفصيلِ، وتداخلِ النسيان بينها، وتجلّي العلّةِ من مزج الأجزاء قد لا يُتفَطّنُ لتولُّدِ العلّة. فالإجمالُ في ﴿أُوْلَئِكَ﴾ لأجلِ الامتزاج أجلى للعلّية.

ومنها: السؤالُ عن نتيجة الهدايةِ وثمرتِها، والنعمةِ واللذةِ فيها؛ كأنَّ السامعَ يقولُ: ما اللذةُ والنعمة؟ فأجابَ بأنَّ فيها سعادةَ الدارين. أي إنَّ نتيجةَ الهدايةِ نفسُها، وثمرتَها عينُها، إذ هي بذاتها نعمةٌ عظمى ولذةٌ وجدانية، بل جنةُ الروح؛ كما أنَّ الضلالةَ جهنمُها. ثم بعد ذلك تُثمِرُ الفلاحَ في الآخرة.

وأما المحسوسيةُ في ﴿أُوْلَئِكَ﴾ فإشارةٌ إلى أنَّ ذكرَ الأوصافِ الكثيرةِ سببٌ للتجسُّمِ في الذهن، والحضورِ في العقل، والمحسوسيةِ للخيال..

فمِن العهد[1] الذِكْريّ ينفتحُ بابٌ إلى العهد الخارجيّ، ومن العهد الخارجي ينتقلُ إلى امتيازهم، وينظرُ إلى تلألُئهم في نوع البشرِ كأنّه مَن رفعَ رأسَه وفتحَ عينيه لا يتراءى له إلّا هؤلاء.

---

(١) حيث ذكرت أوصافهم فأصبحت معهودة. (ت)

ئامـاژەی "دووری"ش لە ﴿أُولئِكَ﴾دا، وێڕای نزیکی‌یـان بـە شـێوەیەکی گشتی، بۆ ئاماژەدانە بە بڵندیی پلە و پایەیان. چونکە ئەو کەسـەی بۆ خەڵکانێکی دوور بڕوانێت، تەنها باڵا بەرزەکانیان دەبینێت..

لەگەڵ ئەوەشدا حەقیقەتی دووریی کات و شـوێن زیـاتر مـافی "ڕەوانبێژی" دەدات، چونکە ئەم ئایەتە هەروەك لە کاتی نازڵ بوونیدا "چەرخی بەختەوەری" بووەتـە زمـانێکی پاراو بۆ یاد و خوێندنەوەی، بە هەمان جۆر هەموو چەرخەکانی داهاتووی دوای ئـەویش وەکو زمانێکی خوێنەر و زیکرگۆی پاراو و لاوی ئەم ئایەتەیان لـێ هـاتووە، دەڵێی هـەر ئەو ساتەوەختە بە تازەیی نازڵ بووە، نەك پێشتر هاتبێتـە خـوار و پاشـان بـە گێڕانـەوە بـاس کرابێت!

جـا یـەکەمینی ئەو ڕیزانـەی کـە بـە ﴿أُولئِكَ﴾ ئـامـاژەیـان بۆ کـراوە، لـە دوورەوە دەبینرێن. ئنجا لەبـەر "بینینیـان" هاوکـات لەگـەڵ "دووری‌یـان"دا، گـەورەیی و بـەرزیی پلەیان دەزانرێت.

سەبارەت بە وشەی ﴿عَلَـى﴾ش، ئـەوا بزانـە کـە: نـهێنیی پـەیوەندیی نێـوان شتەکان زۆربەیانی وەك چەندین ئاوێنە لـێ کردووە کە لە خۆیـاندا یـەکتری دەبینـن، ئـەم لـەودا و ئـەویش لـەمدا. جـا هـەروەك پارچـە شووشـەیەك بیابـانێکی فراوانت پیشـان دەدات، بـە هەمان جـۆر، "تـەنیا وشـەیەك"یـش گەلـێ جـار ئەندێشـەیەکی درێژت بیر دەخاتـەوە و، "ڕوخساری وشەیەك" بەسەرهاتێکی سەیرت لە پێش چاودا دادەنێت و، "گوفتار"ێکیش زەینت بەناو جیهانی میسالیی نموونەدا دەگێڕێت. بە وێنەی ئـەوەی کـە وشـەی "زۆرانـی گرت" دەرگـای جـەنگت بۆ دەکاتـەوە و، وشـەی "بـەروبووم"یـش لـە ئایـەتدا دەرگـای بەهەشتت بۆ دەخاتە سەرپشت.. ئیتر بەم پێوەرە پەیوەندی‌یەکان لێك بدەرەوە!

جا لەسـەر ئەم بناغـەیە، وشەی ﴿عَلَى﴾ بۆ "زەین" وەکـو پەنجەرە و کلاورۆژنـە وایە بەسـەر شێوازێکی نموونەهێنانـەوەدا، کـە بریتی‌یـە لـەوەی: هیدایـەتی قورئـان بوراقێکـی خواییـە پێشکەشـی ئیمـاندارانی کـردووە، تـاکو بکەونـە ڕێ، ئـەوانیش بـە سـواری ئـەو بوراقە لەسەر ڕاستەڕێ بەرەو عەرشی کەمالات دەڕۆن.

نەکیرەییش لە ﴿هُدىً﴾دا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە جیایە لە ﴿هُدىً لِلْمُتَّقِينَ﴾ (کـە لە ئایەتی دووهەمدا هاتووە). چونکە زۆربەی جار کە نـەکیرە دووبـارە بێتـەوە جیـاوازە

وأما البُعديةُ في ﴿أُوْلَئِكَ﴾ مع قُربيَّتِهم في الجملة، فللإشارةِ إلى تعالِي رتبتِهم؛ إذ الناظرُ إلى البُعَداء لا يرى إلّا أطولَهم قامةً، مع أنَّ حقيقةَ البُعد الزماني والمكاني أقضى لحقِّ البلاغة؛ إذ هذه الآيةُ كما أنَّ عصرَ السعادة لسانٌ ذاكرٌ لها وهي تَنـزِلُ، كذلك كلٌّ من الأعصار الاستقباليةِ كأنّه لسانٌ ذاكرٌ لها، وهي شابةٌ طريّةٌ كأنها إذ ذاك نزلَتْ لا أنها نزلتْ ثم حُكِيتْ.

فأوائلُ الصفوفِ المشارِ إليهم بـ﴿أُوْلَئِكَ﴾ يتراءَون من بُعْدٍ. ولأجْل الرؤيةِ مع بُعدهم يُعلَمُ عظمتُهم وعلوُّ رتبتِهم.

وأما لفظُ ﴿عَلَى﴾ فاعلم أنَّ سرَّ المناسبةِ بين الأشياء صيَّرَ أكثرَ الأمور كالمرايا التي تتراءى في أنفسها؛ هذه في تلك، وتلك في هذه..

فكما أنَّ قطعةَ زجاجةٍ تُريك صحراءَ واسعةً؛ كذلك كثيراً ما تُذكِّرُك كلمةٌ فذَّةٌ خيالاً طويلاً، وتمثّلُ نُصبَ عينيك هيئةُ كلمةٍ حكايةً عجيبةً. ويجولُ بذهنك كلامٌ في عالم المثال المثالي. كما أنَّ لفظَ "بارَزَ" يفتحُ لك معركةَ الحرب، ولفظَ «"ثمرة" في الآية يفتحُ لك بابَ الجنة، وقِس!

فعلى هذا لفظُ ﴿عَلَى﴾ للذهن كالكُوَّة إلى أُسلوبٍ تمثيلي، هو أنَّ هدايةَ القرآن بُراقٌ إلهيٌّ أهداه للمؤمنين ليَسلكوا – وهم عليه – في الطريق المستقيم سائرين إلى عرشِ الكمالات.

وأمـا التنكيرُ في ﴿هُدىً﴾ فيشـيرُ إلى: أنّه غيرُ ﴿هُـدىً لِلْمُتَّقِينَ﴾، إذ المنكَّرُ المكـرَّرُ غيرُ

لەوەی یەکەمیان[١]. دەبینی ئەویان "مەصدەر"ە و، ئەمیان "دەرەنجامی بەدەستهاتووی مەصدەر"ە و[٢] سیفەتێکی هەست پێ کراوی جێگیرە و، بە وێنەی بەروبوومی یەکەمیان وایە.

وشەی ﴿مِنْ﴾یش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە "بەدیهێنانی هیدایەتیان" و "پشتگیرییان لەو هیدایەت"ەدا - کە دەسکەوتی خۆیشیانە - لە لایەن خوای گەورەوەیە[٣].

وشەی ﴿رَبِّ﴾یش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هیدایەتدان یەکێکە لە کارەکانی شان و شکۆی پەروەردگارێتی. جا هەروەك بە ڕۆزی پەروەردەیان دەکات، بە خۆراکی هیدایەتیش پێیان دەگەیەنێت.

﴿وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾.

بزانە کە شوێنی پشکنینی سەرنجەکان لێرەدا بریتین لە:

عەتفی واوەکە.. پاشان دووپاتبوونەوەی ﴿أُولَئِكَ﴾.. ئنجا جێناوی جیاکەرەوەی ﴿هُمُ﴾.. پاشان ئەلف و لام.. ئنجا ڕەهاکردنی "مُفلحـــون" و دیاری نەکردنی هۆی سەرفرازییان.

سەبارەت بە عەتفەکە، ئەوا لەسەر بناغەی پەیوەندییە. چونکە هەروەك ﴿أُولَئِكَ﴾ەی یەکەم ئاماژەیە بە "بەروبوومی هیدایەت" کە بەختەوەریی دنیایە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ "بەروبوومەکەی" لە بەختەوەریی ئەودنیادا..

پاشان وێڕای ئەوەی کە هەردووکیان بەروبوومی هەموو ئەوانەن کە باس کران، بەڵام باشتر وایە بوترێت: ڕەگی ﴿أُولَئِكَ﴾ی یەکەم پەیوەستە بە ﴿الَّذِينَ﴾ی یەکەمەوە، کە ئاشکرایە مەبەست ئیماندارە نەخوێندەوارەکانە (کە پێشتر کتێبیان نەبووە) و، هێزیشی لە پایەکانی ئیسلام وەردەگرێت و، دەڕوانێتە پێش ﴿وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾.

---

(١) لەبەر ئەوەی کە ئەگەر "نەکیرە" لە شێوەی "معریفە"دا دووپات بێتەوە، ئەو معریفەیە هەر خودی نەکیرەکە دەبێت. بەڵام ئەگەر "نەکیرە" بە نەکیرەیی دووپات بێتەوە، زۆربەی جار خودی ئەو نابێت. (ت)

(٢) یەکەمیان: ﴿هُدىً لِلْمُتَّقِيـــنَ﴾ واتای "هیدایەت دەگەیەنێت. واتە قورئان خۆی کتێبی هیدایەتە بۆ ئەوانەی کە خاوەن تەقوان (ئەمەیان مەصدەرە). دووهەمیان: ﴿عَلَى هُـــدىً﴾ واتاکەی ئەوەیە کە: ئەوان کەوتوونەتە سەر ڕێگاکە و بەرەو لای خوا دەڕۆن و نزیك دەبنەوە. (کە ئەمە دەرەنجامی مەصدەرە). (م. حسین)

(٣) چونکە گرتنەبەری ڕێی ڕاست لە ناوەندی دەسکەوت و هەڵبژاردنی خۆیاندایە، بەڵام هیدایەتدان، کە سیفەتێکی سەلماوی خوای گەورەیە، لە لایەن خواوەیە. (ت)

الأوّلِ في الأغلب[١]؛ فذاك مصدرٌ وهذا حاصلٌ بالمصدر.. وهو صفةٌ محسوسة قارَّةٌ[٢] كثمرة الأول.

وأما لفظُ ﴿مِنْ﴾ فيشيرُ إلى أنَّ الخلقَ والتوفيقَ في اهتدائهم - المكسوبِ لهم - مِن الله[٣].

وأما لفظُ الـ﴿رَبِّ﴾ فيشيرُ إلى أنَّ الهدايةَ من شأنُ الربوبية؛ فكما يُربّيهم بالرزق يُغذّيهم بالهداية.

﴿وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾.

اعلم أنَّ مظانَّ تحري النُكتِ هي:

عطفُ "الواو"، ثم تكرارُ ﴿أُوْلَئِكَ﴾، ثم "ضميرُ الفصل"، ثم الألفُ واللام، ثم إطلاقُ "مفلحون" وعدمُ تعيين وجهِ الفلاح.

أما العطفُ فمبنيٌّ على المناسبة؛ إذ كما أنَّ ﴿أُوْلَئِكَ﴾ الأوّلَ إشارةٌ إلى ثمرة الهدايةِ من السعادة العاجلةِ؛ فهذا إشارةٌ إلى ثمرتها من السعادة الآجلة..

ثم إنَّه مع أنَّ كلاًّ منهما ثمرةٌ لكلِّ ما مرَّ، إلّا أنَّ الأوْلَى أنَّ ﴿أُوْلَئِكَ﴾ الأوّلَ يرتبطُ عِرْقُه بـ﴿الَّذِينَ﴾ الأوّلِ، الظاهرِ أنهم المؤمنون من الأميين، ويأخذُ قوَّتَه من أركان الإسلامية، وينظرُ إلى ما قبل: ﴿وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾..

---

(١) حيث إن النكرة إذا كررت بصورة معرفة، فتلك المعرفة هي عين تلك النكرة، أما إذا ذكرت النكرة نكرة فلا تكون عين النكرة في الأغلب. (ت)

(٢) قارة: ثابتة.

(٣) إذ الاهتداء، أي سلوك طريق الصواب، هو ضمن اختيارهم وداخل كسبهم، مع أن الهداية التي هي صفة ثابتة، فهي من الله تعالى. (ت)

بەڵام ﴿أُولَئِكَ﴾ی دووهەم بە هێمایەکی پەنهان دەڕوانێتە ﴿الَّذِينَ﴾ی دووهەم، کە دیارە ئیماندارانی شوێنکەوتەی کتێبەکانی پێشوون و، سەرچاوەی هێزیشی پایەکانی ئیمان و دڵنیابوونە لە دوارۆژ. دە فەرموو بیری لێ بکەرەوە.

سەبارەت بە دووپاتبوونەوەی ﴿أُولَئِكَ﴾ش ئەوا ئاماژەیە بۆ سەربەخۆیی هەریەك لەم دوو بەرووبوومە لە "هۆکارە ئامانج"ی هیدایەت و "هۆ"ی جیابوونەوە و مەدح کردنیان. بەڵام باشتر وایە کە ﴿أُولَئِكَ﴾ی دووهەم ئاماژە بێت بۆ یەکەم لەگەڵ حوکمەکەیدا، وەك ئەوەی کە دەڵێیت: ئەو زانایە و ئەو (واتە زاناکە) بەڕێزە.

"جێناوی جیاکەرەوە"یش، وێڕای ئەوەی جەختە لەسەر ئەو تایبەتکردنەی کە پلاری بۆ ئەو خاوەن کتێبانە لەخۆ گرتووە باوەڕیان بە پێغەمبەر ﷺ نەهێنا، سەرنجێکی ناسکیشی تێدایە کە بریتییە لەوەی:

هێنانی ﴿هُمُ﴾ لە نێوان موبتەدا و خەبەردا، وا لەو موبتەدایە دەکات کە هی یەك دانە خەبەرە، بیێتە هەڵگری چەند حوکمێکی زۆر کە هەندێکیان باس دەکرێت و پاشماوەکەیان بە ئەندێشە دەسپێررێت. چونکە ﴿هُمُ﴾ ئەندێشەی مرۆڤ بۆ "بێ سنووری" بێدار دەکاتەوە و، هانی دەدات کە بە شوێن بڕیارە گونجاوەکاندا بگەڕێت..

جا هەروەك تۆ کەسێك - بۆ نموونە "زەید" - لە بەرچاوی گوێ بیست دادەنێیت و، ئنجا بڕیارەکانی لەسەر هەڵدەچنیت و دەڵێیت: ئەو زانایە.. ئەو کارگوزارە.. ئەو فلان شتە.. ئەو فیسار شتە. پاشان پێی دەڵێیت: "قیاسی شتەکانی تریشی لەسەر ئەمانە بکە"!

بە هەمان جۆر، کاتێ فەرمووی: ﴿أُولَئِكَ﴾ ئنجا ﴿هُمُ﴾ی بە دوادا هات، ئەوا ئەندێشەی مرۆڤی وورووژاند کە بەهۆی جێناوەکەوە چەندین بڕیاری گونجاو بۆ سیفەتەکانیان بەرچنی بکات و، بیانخاتە سەر ئەوەی پێشوو، وەك:

"أولئك هم على هدى.. هم مفلحون.. هم فائزون (بالنجاة) من النار.. هم فائزون بالجنة.. هم ظافرون برؤية جمال الله تعالى"... هتد!

"ئەلف و لام"ەکەش بۆ وێنەکێشانی ڕاستییە، وەکو ئەوە وایە کە بڵێت:

ئەگەر پێت خۆشە ڕاستیی سەرفرازبووان (الْمُفْلِحُونَ) ببینیت، ئەوا فەرموو سەیری ئاوێنەی ﴿أُولَئِكَ﴾ بکە، تاکو بۆت دەربکەون..

و﴿أُولَئِكَ﴾ الثاني ينظرُ برمزٍ خفيٍّ إلى ﴿الَّذِينَ﴾ الثاني، الظاهرِ أنّهم مؤمنو أهلِ الكتاب. ويكونُ مأخذُه أركانَ الإيمان واليقينَ بالآخرة. فتأملْ!

وأما تكرارُ ﴿أُولَئِكَ﴾ فإشارةٌ إلى استقلالِ كلٍّ من هاتين الثمرتين في العلّة الغائيةِ للهداية والسببيةِ لتميُّزِهم ومدحِهم، إلّا أنَّ الأَوْلَى أنْ يكونَ ﴿أُولَئِكَ﴾ الثاني إشارةً إلى الأوّلِ مع حكمه، كما تقولُ: ذلك عالمٌ وذلك مكرَّمٌ.

وأما ضميرُ الفصل فمع أنّه تأكيدُ الحصر الذي فيه تعريضٌ بأهل الكتاب الذين لم يؤمنوا بالنبيّ عليه السلام، فيه نكتةٌ لطيفة وهي:

أنَّ توسُّطَ ﴿هُم﴾ بين المبتدأ والخبر من شأنه أنْ يحوِّلَ المبتدأ للخبر الواحدِ موضوعاً لأحكام كثيرةٍ يُذكَرُ البعضُ ويُحالُ الباقيةُ على الخيال؛ لأنَّ ﴿هُم﴾ ينبّهُ الخيالَ على عدم التحديد ويشوِّقُه على تحرّي الأحكام المناسبة..

فكما أنّك تضعُ "زيداً" بينَ عيني السامع فتأخذُ تغزلُ منه الأحكامَ قائلاً: هو عالمٌ، هو عاملٌ، هو كذا وكذا. ثم تقولُ قس!

كذلك لما قال: ﴿أُولَئِكَ﴾ ثم جاء ﴿هُم﴾ هيَّجَ الخيالَ لأنْ يجتنيَ ويبتنيَ بواسطة الضمير أحكاماً مناسبةً لصفاتهم، كـ"أولئك هم على هدى.. هم مفلحون.. هم فائزون من النار.. هم فائزون بالجنة.. هم ظافرون برؤية جمال الله تعالى".. إلى آخره.

وأما الألفُ واللامُ فلتصويرِ الحقيقة. كأنّه يقولُ:

إنْ أحببتَ أنْ ترى حقيقةَ المفلحين، فانظرْ في مرآة ﴿أُولَئِكَ﴾ لِتُمثَّلَ لك..

یان بۆ جیاکردنەوە و تایبەتکردنی زاتی ئەوانە، وەکو ئەوەی کە بڵێت:

ئەوانەی کە بیستت لە سەرفرازانن، گەر دەتەوێت بیانناسیت ئەوا لە ﴿أُولَئِكَ﴾دا دەیاندۆزیتەوە، چونکە ئەوان هەر ئەوانن..

یان لەبەر ئاشکرایی و بەڵگەنەویستیی حوکمەکەیە، بە وێنەی "والده العبد" چونکە عەبدبوونی باوکی ئاشکرا و زانراوە.

ڕەها کردنی "مفلحون"یش بۆ "گشتاندن"ە؛ چونکە ئەوانەی گوفتاری قورئانیان ئاراستە کراوە چەند چینێکن و، خواستەکانیشیان جیاوازە. دەبینی هەندێکیان داخوازی ڕزگاربوونە لە ئاگری دۆزەخ.. هەندێکیش تەنها بەدەستهێنانی بەهەشتی مەبەستە.. هەندێکی تر بە دوای ڕەزامەندیی خوادا دەگەڕێت.. هەندێکی دیکە تەنها حەزی لە بینینی جوانیی خوای گەورەیە.. ئیتر بەم جۆرە..

دەبینی لێرەدا وشەکەی بە ڕەهایی هێشتەوە، تاکو سفرەی چاکەکاریی خواوەند گشتی بێت و، هەرکەسە حەز و خواستی خۆی تێدا بەرچنی بکات.

* * *

أو لتمييز ذواتهم، كأنّه يقولُ:

الذين سمعتَ أنهم من أهل الفلاح إنْ أردتَ أنْ تعرفَهم فعليك بـ﴿أُوْلَئِكَ﴾ فهم هم..

أو لظهورِ الحُكم وبداهته نظيرَ: "والدُه العبدُ". إذ كَوْنُ والدِه عبداً معلومٌ ظاهر..

وأما إطلاقُ "مفلحون" فللتعميم؛ إذ مخاطَبُ القرآن على طبقاتٍ، مطالِبُهم مختلفةٌ. فبعضُهم يطلبُ الفوزَ من النار.. وبعضٌ إنما يقصدُ الفوزَ بالجنة.. وبعضٌ إنما يتحرّى الرضاءَ الإلهيَّ.. وبعضٌ ما يحبُّ إلّا رؤيةَ جمالِه.. وهلمَّ جرّاً..

فأطلقَ هنا لِتعمَّ مائدةُ إحسانِه فيجتنيَ كلٌّ مُشتهاه.

* * *

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنْذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنْذِرْهُمْ لا يُؤْمِنُونَ﴾ (البقرة: ٦)

هۆی هۆنینی:

بزانە کە زاتی تـەنیای خـوای گـەورە لـە جیـهانی سـیفەتە ئەزەلیـیـەكانیدا، دوو درەوشانەوەی هەیە: یەكێكیان "شكۆمەندی" و ئەوی تریان "جوانی"[١]..

ئیتر بە دەركەوتنیان لـە جیـهانی سیفەتە كرداریيەكاندا[٢] "میـهرەبانی" و "زەبر"، "جوانی" و "سـام" دەردەكـەوێت.. پاشـان بـە وەرچـەرخانیان بۆ جیـهانی كردارەكـان هەریـەك لـە "دەرخستنی جوانی" و "كـەناردانی ناشیرینی"، "ئارایشـتدان" و "خـاوێن ڕاگرتـن" پـەیدا دەبن.. پاشـان بـە ڕەنگگرتنیـان لـە جیـهانی ئاسـەوارەكانی لـەودنیادا "میهرەبانی" بە بەهەشت و ڕووناكی، "زەبر"یش بە دۆزەخ و ئاگر، دەردەكەون.. پاشان بـە وێنەدانـەوەیان لـە جیـهانی زیكـردا لـەو زیكـرە دابـەش دەبێـت بەسـەر "حـەمد" و "تەسبیح"دا.. پاشان بە دەركەوتنیان لە جیهانی گوفتاری خواییدا گوفتارەكە دەبێتە دوو جۆری "ئەمر" و "نەهی".. پاشان بە دەركەوتنی وێنەیان لە جیهانی ڕێنماییدا ئـەو جیهانـە دابەش دەكەن بە سەر "خولیاندن"(الترغیب) و "ترساندن"، "مژدەدان" و "هەڕەشـە"دا. پاشان بە دەركەوتنیان لەسەر ویژدان "ئومێد" و "ترس" دێنە گۆڕێ... ئیتر بەم جۆرە هەتا دوایی..

---

(١) سیفەتەكانی خوای گەورە ئەزەلین، واتە هـەر لەگەڵ بوونی زاتی ئەزەلیی ئەودا سیفەتەكانیشی هـەن. ئنجا هەندێك لەو سیفەتانە پێی دەڵێن: "سیفەتی شكۆمەندی" كە ئەوانـەن پەیوەندییان بـە زەبر و عـیززەت و مەزنییەوە هەیە. هـەندێكی دیكەشیان پێی دەڵێن: "سـیفەتی جوانی" كـە ئەوانەن پەیوەندییان بـە نیـانی و میهرەبانییەوە هەیە. (وەرگێڕ، لە "التعریفات"ی جورجانییەوە)

(٢) سیفەتە كرداریيەكانی خوای گەورە ئەوانەن كە دەكرێت خوای گەورە بە دژەكانیـان وەسـف بكرێـت، وەك: ڕەزامەندی و ڕق، میهرەبانی و تووڕەیی. (وەرگێڕ، لە "التعریفات"ی جورجانییەوە)

﴿إِنَّ الَّذِيْنَ كَفَرُوا سَوَاءٌ عَلَيهِمْ ءَأَنْذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنْذِرْهُمْ لا يُؤْمِنُونَ﴾ (البقرة: ٦)

وجهُ النظم:

اعلم أنَّ للذات الأحديِّ في عالَم صفاتِه الأزليةِ تجلِّيَيْن: جلاليٌّ وجماليٌّ..

فبتجليهما في عالَم صفاتِ الأفعال يتظاهرُ اللطفُ والقهرُ والحُسنُ والهَيبةُ. ثم بالانعطافِ في عالَم الأفعالِ تتولَّدُ التحليةُ والتخليةُ والتزيينُ والتنـزيهُ. ثم بالانطباعِ في العالَم الأُخرويِّ من عالَم الآثارِ يتجلى اللطفُ جَنَّةً ونوراً، والقهرُ جهنمَ وناراً. ثم بالانعكاسِ في عالَم الذِّكرِ ينقسمُ الذِّكرُ إلى الحمدِ والتسبيح. ثم بتمثُّلِهما في عالَم الكلامِ يتنوعُ الكلامُ إلى الأمرِ والنهي. ثم بالارتسامِ في عالَم الإرشادِ يقسِّمانِه إلى الترغيبِ والترهيب والتبشير والإنذار. ثم بتجلِّيهما على الوجدانِ يتولَّدُ الرجاءُ والخوفُ.. وهكذا.

پاشان یەکێك لە خواستەکانی "ڕێنمایی" ڕاگرتنی هاوسەنگیی بەردەوامە لە نێوان "ئومێد" و "ترس"دا، تاکو ئومێد بانگهێشتی مرۆڤ بکات بۆ بەکارهێنانی هێزەکانی. "ترس"یش بێداری بکاتەوە کە سنوور نەبەزێنێت و لە بێ فەرمانیدا پێ ڕانەکێشێت. ئیتر نە لە "میهرەبانی" نائومێد ببێت کە بە خەفەتەوە دابنیشێت، نە لە "سزا"ش بێ خەم بێت کە ستەم بکات و گوێیشی پێ نەدات..

لەبەر ئەم زنجیرە دانستەیە کە دەبینیت قورئانی پیرۆز هەرکاتێك "خولیاندن"ی بەکار هێنابێت "ترساندن"یشی لەگەڵدا هێناوە و، کە "مەدح"ی چاکەکارانی کردبێت، "زەم"ی خراپکارانیشی کردووە بە هاوتای.

* ئەگەر وتت:

بۆچی لێرەدا عەتفی بەکار نەهێنا، بە وێنەی ئەوەی کە لە ﴿إِنَّ الأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ۞ وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ﴾دا (الإنفطار: ١٣-١٤) بەکاری هێناوە؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

جوانیی عەتف دەڕوانێتە جوانیی پەیوەندی، جوانیی پەیوەندییش بە گوێرەی جیاوازیی ئەو ئامانجەی کە گوفتارەکەی لە پێناودا هێنراوە، جیاواز دەبێت. ئیتر لەبەر "جیاوازیی ئامانج" لێرە و لەوێ، عەتف لێرەدا بە جوان نەزانرا. چونکە مەدحی ئیمانداران پێشەکی‌یەکە سەری لە مەدحی قورئانەوە دەردەچێت و، لەنجامیەتی، هەر لەو پێناوەشدا هێنراوە.. بەڵام زەمی کافران بۆ "ترساندن"ە و، هیچ پەیوەندی‌یەکی بە مەدحی قورئانەوە نی‌یە.

پاشان بۆ ئەو وردەکاری‌یە ناسکانە بڕوانە کە تێهەڵکێشی هۆنینی بەشەکانی ئەم ئایەتەن:

یەکەم: بە ﴿إِنَّ﴾ و ﴿الَّذِينَ﴾ نامۆییت بڕەوێنەرەوە، چونکە دوو هاودەمی ئەوتۆن کە لە مەنزڵگاکانی قورئاندا لە هەموو شتێك زیاتر دێن و دەڕۆن و ڕووبەڕوویان دەبیتەوە؛ لە خۆڕا نی‌یە کە قورئان زۆر جار بەکاری هێناون، چونکە دوو سەرنجی ورد و گشتیی گەوهەری ڕەوانبێژی‌یان لەگەڵدایە، جیاواز لەوەی کە تایبەتە بە هەموو شوێنێك.

ثم إنَّ مِن شأنِ الإرشادِ إدامةَ الموازنة بين الرجاء والخوف، ليدعوَ الرجاءُ إلى أنْ يسعى بصرف القوى، والخوفُ إلى أنْ لا يتجاوزَ بالاسترسالِ فلا ييأسَ من الرحمة فيقعدَ ملوماً، ولا يأمَنَ العذابَ فيتعسفَ ولا يباليَ.

فلهذه الحكمةِ المتسلسلةِ ما رغَّبَ القرآنُ إلّا وقد رهَّبَ، وما مدحَ الأبرارَ إلّا وقرَنَه بذمِّ الفُجّار.

* إنْ قلت:

فلِمَ لمْ يعطفْ هنا كما عطفَ في:

﴿إِنَّ الأَبْرَارَ لَفِي نَعيمٍ * وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ﴾ (الانفطار: ١٣-١٤)؟

قيل لك:

إنَّ حُسنَ العطفِ ينظرُ إلى حُسن المناسبة، وحُسنُ المناسبةِ يختلفُ باختلاف الغَرَضِ المَسوق له الكلامُ. ولما اختلفَ الغرضُ هنا وهنالك، لم يُستحسَن العطفُ هنا؛ إذ مدحُ المؤمنين مُنجَرٌّ ومقدمةٌ لمدح القرآن، ونتيجةٌ له، وسِيق له. وأما ذمُّ الكافرين فللترهيبِ، لا يتصلُ بمدحِ القرآن.

ثم انظرْ إلى اللطائف المندمجةِ في نظم أجزاء هذه الآية:

فأولاً: استأنِس بـ﴿إِنَّ﴾ و ﴿الَّذِيْنَ﴾ فإنهما أجْوَلُ وأسْيَرُ ما يصادفُك في منازل التنـزيلِ. ولأمرٍ مّا أكثرَ القرآنُ مِن ذِكرِهما؛ إذ معهما من جوهر البلاغةِ نكتتان عامّتان غيرُ ما تختصُّ كلَّ موقع.

سەبارەت بە ﴿إِنَّ﴾ ئەوا "ڕووی دەرەوە" کوناودەر دەکات و دەڕوات تا دەگاتە ناوەرۆکی "حەقیقەت" و لەوێ بڕیارەکەی پێ دەگەیەنێت، وەك بلێی ڕەگی داواکەی پەیوەست بووە بە "حەق"ەوە. بۆ نموونە: "ئەمە ئاوایە". واتە: ئەم بڕیارە. ئەم داوایەش نە ئەندێشەییە و نە دەست هەڵبەستە و نە گوێرەییە و نە دروست کراویشە، بەڵکو یەکێکە لە ڕاستی‌یە دەست بەکارە جێگیرەکان.

خۆ ئەوەش کە دەوترێت "إِنَّ" بۆ "تەحقیق"ە، ناونیشانە بۆ ئەم ڕاستی و تایبەتمەندی‌یە.

سەرنجە تایبەتی‌یەکەی ئێرەش لەوەدایە کە: ئەو ﴿إِنَّ﴾یەی بۆ بەرپەرچدانەوەی گومان و نکوولی‌یە، بەکارهێنانی لێرەدا، کە هیچ گومان و نکوولی‌یەك لە لای بەرامبەر نی‌یە، بە مەبەستی ئاماژەدانە بە زیادە سووربوونی پێغەمبەر - دروودی لەسەر بێت - لەسەر باوەڕهێنانیان.

سەبارەت بە ﴿الَّذِينَ﴾ش، ئەوا بزانە کە: "الَّذي" بۆ ئاماژەدانە بەو حەقیقەتە نوێیەی کە پێش ئەوەی "چاو" هەستی پێ بکات، "ژیری" هەستی پێ کردووە و، خەریکە پێکدێت و، هێشتا خۆی نەگرتووە. تەنانەت لە تێکەڵ بوونی چەندەها شت و یەکگرتنی چەندین هۆکار، لەگەڵ جۆرە نامۆییەکدا پەیدا دەبێت..

هەر لەبەر ئەوەیە کە لە نێوان هۆکارەکانی ئاماژەدان و وێنەکێشانی ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە ڕاستی‌یەکان نوێ دەکەنەوە، وشەی "الَّذي" پتر لەسەر زمانەکان دێت و بەکار دەهێنرێت.

ئنجا کاتێ دامەزرێنەری ڕاستی‌یەکان دەرکەوت، کە "قورئانی پیرۆز"ە، گەلێ "جۆر" هەبوون پووکانەوە و بەشەکانیان هەڵوەشانەوە و، لە بریی ئەوان چەند جۆرێکی تر پێکهات و گەلێ حەقیقەتی تر پەیدا بوون. نابینی کە چۆن لە سەردەمی جاهیلیدا "جۆرەکان" لەسەر پەیوەندی‌یەکانی نەتەوایەتی پێکهاتبوون و "ڕاستی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان"یش لە دەمارگیری‌یەکانی نەتەوەییەوە سەریان هەڵدابوو، بەڵام کاتێ کە "قورئان" هات سەرجەمی ئەو پەیوەندی‌یانەی قرتاند و هەموو ئەو بنەمایانەشی هەڵتەکاند، ئنجا لە بریی ئەوانە چەند جۆرێکی تری دامەزراند کە بەشەکانی بریتی بوون لە پەیوەندی‌یە ئایینی‌یەکان!

دەسا بیری لێ بکەرەوە!

أمّا ﴿إِنَّ﴾ فإنَّ من شأنها أنْ تثقُبَ السّطحَ نافذةً إلى الحقيقة، وتوصِلَ الحُكمَ إليها؛ كأنها عِرق الدعوى اتصلتْ بالحق. مثلاً: إنَّ هذا كذا.. أي الحُكمُ، وهذه الدعوى ليستْ خياليةً ولا مُبتدَعةً ولا اعتباريةً ولا مستحدَثة؛ بل هي مِن الحقائق الجاريةِ الثابتة.

وما يُقالُ مِن أنَّ "إنَّ" للتحقيق فعنوانٌ لهذه الحقيقةِ والخاصيّة.

والنكتةُ الخصوصيةُ هنا هي أنَّ ﴿إِنَّ﴾ الذي شأنُه ردُّ الشّكِ والإنكار، مع عدمِهما في المخاطَب، للإشارة إلى شدَّةِ حرصِ النبي عليه السلام على إيمانهم.

وأما ﴿الَّذِيْنَ﴾ فاعلم أنَّ "الذي" مِن شأنه الإشارةُ إلى الحقيقة الجديدةِ التي أحسَّ بها العقلُ قبلَ العين، وأخذتْ في الانعقاد ولم تشتدَّ، بل تتولَّدُ من امتزاج أشياء وتَآخُذِ أسبابٍ مع نوع غَرابةٍ.

ولهذا ترى من بين وسائطِ الإشارة والتصوير في الانقلاب المجدِّدِ للحقائق لفظَ "الذي" أسْيَرَ على الألسنة وأكثرَ دوراناً.

فلما أنْ تجلّى مؤسِّسُ الحقائقِ وهو القرآنُ، اضمحَلَّ أنواعٌ ونُقِضتْ فصولُها، وتشكّلتْ أنواعٌ أُخَرُ وتولَّدتْ حقائقُ أُخرى. أمَا ترى زمانَ الجاهلية كيف تشكلت الأنواعُ على الروابط المِلّيةِ وتولدت الحقائقُ الاجتماعية على العصَبياتِ القومية، فلما أنْ جاءَ القرآنُ قطعَ تلك الروابطَ وخرَّبَ تلك الحقائقَ، فأسَّسَ بدلاً عنها أنواعاً، فصولُها الروابطُ الدينية؟ فتأملْ!

هەروەها کاتێ خۆری قورئان بەسەر جۆری مرۆڤدا هەڵهات، چەندین "دڵ" بە ڕووناکیی‌یەکەی گوڵیان گرت و بە نووریشی بەرهەمیان بەخشی، ئیتر "ڕاستیی‌یەکی نوورانی" بەدەست هات کە جیاکردنەوەی جۆری ئیماندارانە. پاشان هەندێ دەروون، لەبەر چەپەڵیی‌یان، لە بەرامبەر ئەو ڕووناکیی‌یەدا بۆگەنیان کرد و، حەقیقەتێکی ژەهراوی پەیدا بوو کە تایبەتمەندیی جۆری ئەوانەیە کافر بوون[1].

پاشان گونجاوی‌یەك لە نێوان ﴿الَّذِينَ﴾ و ﴿الَّذِينَ﴾دا[2] هەیە[3]..

بزانە کە:

"ئیسمی مەوصوول" وەکو "ئەلف و لام" وایە، لە پێنج واتادا بەکار دێت، کە بەناوبانگتریان "زانراوی"یە. کەواتە ﴿الَّذِينَ﴾ی ئێرە ئاماژەیە بۆ سەرسەختانی کوفر لە هاوشێوەی ئەبووجەهل و ئەبولەهەب و ئومەیەی کوڕی خەلەف، کە لەسەر ڕێبازی کوفر مردن. بەم پێیە ئەم ئایەتە هەواڵدانێکی غەیبیی لەخۆ گرتووە. هاوشێوەکانی ئەمەش چەند بریسکەیەکن جۆرە ئیعجازێکیان لێ پەیدا دەبێت لە چوار جۆرەکەی "ئیعجازی مەعنەوی".

سەبارەت بە وشەی ﴿كَفَرُوا﴾ش، ئەوا بزانە کە:

"کوفر" تاریکاییەکە دەرەنجامی ئینکاریی هەر شتێکە بە بێگومانی زانرابێت کە پێغەمبەر - دروودی لەسەر بێت - لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی.

* ئەگەر وتت:

قورئان یەکێکە لەوانەی کە بە بێگومانی سەلماون، کەچی ڕای جیاواز لە واتاکانیدا دروست بووە؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

هەموو گوفتارێکی قورئان سێ مەسەلەی تێدایە:

یەکەمیان: "ئەمە گوفتاری خوایە".

دووهەمیان: "واتای مەبەست لەم گوفتارەدا حەقە".

---

(١) لەبەر ئاماژەدان بەم حەقیقەتەی کوفر، "الذينَ"ی بەکارهێنا. (ت)

(٢) واتە ئەوەی ﴿الَّذِينَ يُؤْمِنونَ بالْغَيْبِ﴾ و، ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَواءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنْذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنْذِرْهُمْ لا يُؤْمِنُونَ﴾. (وەرگێڕ)

(٣) چونکە هەریەکەیان بۆ حەقیقەتێکی جیاواز لەوی تر بەکار هاتووە. (ت)

فلما أشرَقَ القرآنُ على نوع البشرِ تزاهرَ بضيائه وأثمَر بنورِه قلوبٌ، فتحصلتْ حقيقةٌ نورانيةٌ هي فصلُ نوع المؤمنين. ثم لخُبثِ بعضِ النفوس تعفّنتْ في مقابلة الضياءِ تلك النفوسُ فتولَّدَتْ حقيقةٌ سُمّيّةٌ هي خاصةُ نوعِ مَن كَفَر[1]..

وأيضاً بين ﴿الَّذِيْنَ﴾ و ﴿الَّذِيْنَ﴾ تناسبٌ[2].

اعلم أنَّ الموصولَ كالألفِ واللام يُستعملُ في خمسةِ معانٍ[3] أشهَرُها العهدُ؛ فـ﴿الَّذِيْنَ﴾ هنا إشارةٌ إلى صناديدِ الكفر أمثالِ أبي جهلٍ وأبي لهبٍ وأُميةِ بن خلفٍ وقد ماتوا على الكفر. فعلى هذا في الآية إخبارٌ عن الغيب. وأمثالُ هذا لمعاتٌ يتولَّدُ منها نوعٌ من الإعجاز من الأنواع الأربعةِ للإعجاز المعنوي.

وأما لفظ ﴿كَفَرُوا﴾ فاعلم أنَّ الكفرَ ظُلمةٌ تحصُلُ من إنكار شيءٍ مما عُلِمَ ضرورةً مجيءُ الرسول عليه السلام به.

* إن قلتَ:

إنَّ القرآنَ من الضروريات وقد اختُلِفَ في معانيه؟

قيل لك:

إنَّ في كلِّ كلامٍ من القرآن ثلاثَ قضايا:

إحداها: "هذا كلامُ الله".

والثانية: "معناه المرادُ حقٌّ".

---

(١) فلأجل الإشارة إلى هذه الحقيقة الكفرية، ذكر "الذين". (ت)

(٢) لأنَّ كلاً منهما يدلان على حقيقة مضادة للأخرى. (ت)

(٣) وهي: العهد الذهني والعهد الخارجي، والجنس، والحقيقة، واستغراق الأفراد، واستغراق الصفات. أو الاستغراق الحقيقي، والاستغراق العرفي. (ب)

ئینکاری کردنی هەریەك لەم دوانە، بە "کوفر" دادەنرێت.

سێهەم: "واتا مەبەستەکەی ئەمەیە"..

جا ئەگەر ئەمە "موحکەم" یان "موفەسسەر" بێـت، ئـەوا دوای ئاگاداربوونـەوە لێـی، باوەڕهێنان پێی واجبە و ئینکاریشی کوفرە. بەڵام گەر "زاهـیر" یـان "دەق"ێـك بێـت کـە واتـای تـر هـەڵبگرێت[1]، ئـەوا ئینکـاری کردنی لەسـەر بناغـەی تەئویلێـك کـە حـەز و ئارەزوو ڕۆڵی تێدا نەبینێت، بە کوفر دانانرێت[2].

"حەدیسی موتەواتیر"یش بە وێنـەی "ئایـەت" ئـەم سێ مەسـەلەیە دەیانگرێتـەوە، بـەڵام هەڵوێستەیەك لە ئینکاریی مەسەلەی یەکەمدا هەیە سەبارەت بە حەدیس[3].

* ئەگەر وتت: کوفر "نەزانی"یە، لە قورئانیشدا هاتووە کە: ﴿يَعْرِفُونَه كما يَعْرِفُونَ أبناءَهُمْ﴾ ئیتر چۆن ئەم دوانە یەکدەخرێن؟

پێت دەوترێت: "کوفر" دوو بەشە:

یەکەمیان: لە نەزانییەوەیە؛ لەبەر ئەوەی کە نازانێت ئینکاری دەکات.

دووهەم: ملـهوڕی و یاخیبوونـە؛ دەزانێـت، بـەڵام قبوڵـی ناکـات.. دڵنیایـە، بـەڵام بـاوەڕ نـاهێنێت.. تەسـدیق دەکـات، بـەڵام ویژدانی ملکـەچ نـابێت.. دەسـا بـیری لـێ بکەرەوە.

* ئەگەر وتت: ئایا دڵی شەیتان "حەقناسی"ی تێدایە؟

پێـت دەوترێـت: نـەخێر.. چونکە بەپێی پیشـەی سروشتیی خـۆی هـەردەم "دڵ"ی سەرقاڵی گومڕاکردنە و، "ژیـری"یشـی بـەردەوام بـیر لـە کوفـر دەکاتـەوە تـاکو بـەگوێی خەڵکیدا بدات. ئیتر دڵی لەم سەرقاڵییەی ڕاناوەستێت و ئەو بیرکردنەوەیـەی ژیرییشی هیچ کاتێك لاناچێت، هەتا جێی "حەقناسی"ی تێدا ببێتەوە.

---

(١) لە زانستی ئوسوولی فیقهدا ئەو وشانەی کە بە ڕوونی واتاکانیـان دەردەکـەون چـوار بەشـن. ئـەو دابەشکردنەش بە گوێرەی لاوازی یان بەهێزیی ئەو واتاگەیاندنەیە. ئەوەی کە لە هـەموویان کـەمتر ڕوون بێـت لە گـەیاندنی واتاکـەیدا پێی دەوترێت"زاهـیر" ئنجا ئـەو زیـاتر پێی دەوترێـت "دەق". ئەم دوانـەیان تـەئویل و لێدانەوەی واتای تر هەڵدەگرن، بەو هەلومەرجانەی کە لـە زانستی ناوبراودا ڕوون کراونەتەوە. سێهەمیان لـەوان زیـاتر بە ڕوونـی واتاکـەی دەگەیـەنێت و پێـی دەوترێـت "موفەسسـەر". چـوارەم لەوپـەڕی ڕوونـیی واتاکەیدایە و پێـی دەوترێـت "موحکـەم". ئـەم دوانـەیان بـواری لێدانـەوەی واتـای تـری جگـە لـە واتـا ئاشکراکەیان تێدا نییە. بڕوانە: "الوجيز في أصول الفقه" ص: ٣٤٠-٣٥٠. (وەرگێڕ)

(٢) جیاوازیی تەفسیرەکانیش تەنها لەمەدایە. (ت)

(٣) واتە لە سەلماندنی "صەحیح بوون" و "تەواتور"یدا. (ت)

وإنكارُ كلٍّ من هاتين كفرٌ.

والثالثة: "معناه المرادُ هذا"..

فإنْ كان مُحكَماً أو مُفسَّراً فالإيمانُ به واجبٌ بعد الاطلاع، والإنكار كُفرٌ. وإنْ كان ظاهراً، أو نصّاً يَحتملُ معنىً آخرَ، فالإنكارُ بناءً على التأويل- دون التشهّي - ليس بكفرٍ[١].

ومثلُ الآيةِ الحديثُ المتواترُ؛ إلّا أنَّ في إنكار القضيةِ الأولى من الحديثِ تأمُّلاً[٢].

* إنْ قلتَ:

الكفرُ جهلٌ وفي التنـزيل: ﴿يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُم﴾ (البقرة: ١٤٦) فما التوفيقُ؟

قيل لك:

إنَّ الكفرَ قسمان:

جهليّ، يُنكِر لأنّه لا يعلمُ. والثاني: جُحوديٌّ تمرّديّ، يَعرِفُ لكنْ لا يَقبَلُ، يتيقّنُ لكن لا يعتقدُ، يصدّقُ لكن لا يُذعِنُ وجدانُه. فتأمّلْ!

* إنْ قلت:

هل في قلب الشيطانِ معرفةٌ؟

قيل لك:

لا، إذ بحكم صنعتِه الفطريةِ يشتغلُ قلبُه دائماً بالإضلالِ، ويتصوَّرُ عقلُه دائماً الكفرَ للتلقين فلا ينقطعُ هذا الشغلُ، ولا يزولُ ذلك التصوّرُ عن عقله حتى تتمكّنَ فيه المعرفةُ.

---

(١) واختلاف المفسرين ليس إلّا في هذا القسم. (ت)

(٢) أي ثبوت صحته وتواتره. (ت)

* ئەگەر وتت:

"کافرێتی" سیفەتێکە لە دڵدا..

ئیتر بۆچی بەستنی "زوننار" - بە هەمان جۆر لەسەرکردنی "شەپقە"ش - بە کوفر دانراوە؟

پێت دەوترێت:

شەریعەت بایەخ بە "نیشانەکان" دەدات لەسەر "شتە پەنهانەکان"، بە رادەیەك کە هۆکارە رواڵەتی‌یەکانی[1] لە جێی هۆکارە راستەقینەکاندا داناوە. دەبینیت بەستنی "زوننار" کە هەندێ جۆری رێ لە تەواوکردنی رکووع و، لەسەرکردنی "شەپقە"ش کە رێ لە تەواوکردنی سوجدە دەگرێت، نیشانەی بێ نیازی‌یە لە "خواپەرستی" و، لاسایی کردنەوەیەکی "کافران"ە کە ئاماژە بەوە دەدات رێباز و ئایینی ئەوانی بەلاوە پەسەند بێت..

جا مادەم نەبوونی کارە پەنهان و نادیارەکە بە بێگومانی بڕیاری لەسەر نادرێت، ئەوا بڕیار لەسەر کارە رواڵەتی‌یەکە دەدرێت.

* ئەگەر وتت:

مادەم رێنمایی ئەوان بە هەرەشە لێکردن هیچ سوودێکی نەبێت، ئیتر بۆچی تەکلیفیان لێ دەکرێت؟

پێت دەوترێت:

لەبەر بەڵگە پێ نەهێشتن و قسە بڕینیانە[2].

* ئەگەر وتت:

هەواڵدانی سەرکەشی و یاخی‌بوونی ئەوان، ئیمان نەهێنانیان دەگەیەنێت، ئەو کاتەش تەکلیفی شتی مەحاڵیان لێ کراوە؟

---

(١) کە عیللەت نین. (ت)

(٢) واتە لەو کاتە دەیانتوانی بڵێن: تەکلیفمان پێ رانەگەیەنراوە و ئاگامان لێی نی‌یە. ئەوەش دەبووە مایەی رزگاربوونیان لە سزا. (ت)

* إنْ قلتَ:

الكفرُ صفةُ القلب فكيف كان شَدُّ الزُنّار – وقد قيس عليه "الشَّوْقَةُ"[١] – كفراً؟

قيل لك:

إنَّ الشريعةَ تعتبرُ بالأمارات على الأمور الخفيةِ، حتى أقامت الأسبابَ الظاهريةَ[٢] مقامَ العِلل. ففي شَدِّ الزُنّار المانعِ بعضُ نوعِه عن إتمام الركوعِ، وإلباسِ "الشَوْقَةِ" المانعةِ عن تمام السجودِ علامةُ الاستغناء عن العبودية، والتشبُّهِ بالكَفرة الموميءِ باستحسانِ مسلكِهم وملّيتهم. فما دام لم يُقطَعْ بانتفاء الأمرِ الخفي يُحكَمُ بالأمرِ الظاهر.

* إنْ قلتَ:

إذا لم يُجْدِ الإنذارُ فلِمَ التكليفُ؟

قيل لك:

لإلزامِ الحُجّةِ عليهم[٣].

* إنْ قلت:

الإخبارُ عن تمرّدِهم يستلزمُ امتناعَ إيمانهم فيكونُ التكليفُ بالمحال؟

---

(١) القبعة. وقد بيّن الأستاذ رأيه في الشعاع الخامس حول لبس القبعة حينما فُرِضَ على الناس.

(٢) التي هي ليست عللاً. (ت)

(٣) إذ يمكنهم أن يقولوا لم نُبلّغ بالتكليف ولا علم لنا به، ويكون هذا مدار نجاتهم من الجزاء. (ت)

پێت دەوترێت:

"هەوالدان" - بە هەمان جۆر "زانست" و "ویست"یش - پەیوەندییان نابێت بە کافربوونی سەربەخۆ و دابڕاو لە هۆکاری ئەو کوفرەیان، بەڵکو پەیوەندییان هەیە بەو کافربوونەیانەوە کە خۆیان هەڵیان بژاردووە، وەك لەمەولا بە درێژی باسی دێت.

هەر لێرەوەیە کە دەوترێت:

"واجبێك بە ئیختیار بێت دژی ئیختیار نییە".

* ئەگەر وتت: "باوەڕیان بە بێ باوەڕییان"[1] لە ژێریدا مەحاڵە و، وەکو "الجذر الأصم الكلامي"[2] وایە؟

پێت دەوترێ:

ئەوان "وردەکاریی ئیمان"یان نەخراوەتە ئەستۆ، هەتا شتی مەحاڵ ڕوو بدات.

پاشان هێنانی ﴿كَفَرُوا﴾ بە "فیعلی ماضی" ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەوان دوای ئەوەی "حەق"یان بۆ ڕوون بووەوە، کوفریان هەڵبژارد. هەر لەبەر ئەوەیە کە هەڕەشەکردن سوودی نابێت.

﴿سَواءٌ﴾یش مەجازێکە لە بریی: "هەڕەشەیان لێ بکەیت وەکو ئەوە وایە کە لێیان نەکەیت لەوەدا کە بێ سوودە، یان لەوەدا کە جێی خۆی ناگرێت". واتە هیچ داخوازێك بۆ هەڕەشە لێکردن یاخود نەکردنی لە ئارادا نییە.

سەبارەت بە ﴿عَلَيْهِمْ﴾یش هێمایەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە ئەوان بە زەوییەوە نووساون، سەریان بەرز ناکەنەوە و گوێ لە گوفتاری فەرماندەکەیان ڕاناگرن.. هێمایەکیشی تێدایە بۆ ئەوەی کە سەبارەت بە "تۆ" ئەو دوو شتە یەکسان نییە، چونکە بۆ تۆ خێر لەوەدایە کە پەیامەکەتیان پێ ڕابگەیەنیت، لەبەر ئەوەی:

﴿مَا عَلَى الرَّسُولِ إلاَّ الْبَلاغ﴾ (المائدة: ٩٩).

---

(١) وەك لە: ﴿لا يُؤْمِنُونَ﴾ و ئایەتەکانی هاوشێوەیدا. (ت)

(٢) واتە کۆبوونەوەی دووشتی دژ بە یەك. نموونەکەی وەك ئەوەی کەسێك بڵێت: "هەرچی قسەم لەم سەعاتەدا وتووە، هەمووی درۆیە"! لەو سەعاتەشدا هەر ئەوەی وتبێت. جا یاخود ڕاست دەکات لەو قسەیەدا یان درۆ. هەردوو گریمانەکەش دەرەنجامەکەیان ئەوە دەبێت کە دوو شتی دژ بە یەك کۆببوبێتنەوە! (بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر).

قيل لك:

إنَّ الإخبارَ وكذا العلم والإرادة لا تتعلقُ بكُفرهم مستقلاً مقطوعاً عن السبب، بل إنما تتعلقُ بكفرهم باختيارهم. كما يأتيك تفصيلُه. ومن هنا يُقالُ: "الوجوبُ بالاختيار لا ينافي الاختيارَ".

* إنْ قلت: إيمانُهم بعدم إيمانهم[1] محالٌ عقليٌ يشبهُ "الجذرَ الأصمَّ الكلاميَّ"[2]؟

قيل لك: إنهم ليسوا مكلَّفين بالتفصيل حتى يلزمَ المحالُ.

ثم في إيراد ﴿كَفَرُوا﴾ فعلاً ماضياً، إشارةٌ إلى أنهم اختاروا الكفرَ بعد تبيُّنِ الحقِّ فلذا لا يُفيدُ الإنذارُ.

وأما ﴿سَوَاءٌ﴾ فمجازٌ عن: "إنذارُك كعدم الإنذارِ في عدم الفائدةِ أو في صحة الوقوعِ" أي لا موجبَ للإنذار ولا لعدمِه.

وأما ﴿عَلَيْهِمْ﴾ ففيه إيماءٌ إلى أنهم أخلدوا إلى الأرض فلا يرفعون رؤوسَهم ولا يصغون إلى كلام آمرِهم.. وفيه أيضاً رمزٌ إلى أنه ليس سواءً عليك، لأنَّ لك الخيرَ في التبليغ؛ إذ ﴿مَا عَلَى الرَّسُولِ إلاّ الْبَلاغُ﴾ (المائدة: ٩٩).

---

(١) كما في "لا يؤمنون" وأمثالها من الآيات. (ت)

(٢) مغلطة الجذر الأصم هي هذه :قيل إنَّ اجتماع النقيضين واقع، لأنه لو قال قائل:"كل كلامي في هذه الساعة كاذب". والحال أنه لم يقل في تلك الساعة غير هذا الكلام، فلا يخلو من أن يكون هذا الكلام صادقاً أو كاذباً. وعلى التقديرين يلزم اجتماع النقيضين. أما إذا كان صادقاً فيلزم كذب كلامه في تلك الساعة، وهذا الكلام مما تكلم به في تلك الساعة ولم يتكلم بغيره؛ فيلزم كذب كلامه. والتقدير أنه صادق فيلزم اجتماع النقيضين وان كان كاذباً يلزم أيضاً اجتماع النقيضين لأنه يلزم أن يكون بعض أفراد كلامه صادقاً في تلك الساعة لكن ما وجد عنه في تلك الساعة سوى هذا الكلام فيلزم صدقه، والمفروض كذبه فيلزم اجتماع النقيضين. وهذه المغلطة مشهورة تحير جميع العلماء في حلّها. (ب)

سەبارەت بە ﴿ءَأَنْذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنْذِرْهُـــمْ﴾یش، "هـەمزە" و "أم" لـێرەدا لـە حوکمی "سـواء"(یەکسـانن)دان و، دوو پیتی جەختن بۆ ﴿سواءٌ﴾ی یەکەم. یاخود دامەزراندنی "یەکسانی"یەکی ترە، لەو ڕووەوە کە هەردوو واتـا ناوبراوەکـەی "یەکسـانی" لـە نێـوان خۆیاندا دابەش دەکەن[1].

* ئەگەر وتت:

بۆچی "یەکسانی"ی لە شێوەی "پرسیار"دا دەربڕی؟

پێت دەوترێت:

ئەگەر ویستت بە شێوەیەکی نەرم و قەناعەت بەخش بەرامبەرەکـەت بێـدار بکەیتـەوە لەوەی کە ئەو کارەی بۆ خۆی دەیکات سوودی تێدا نی‌یە، دەبێ پرسیار بەکاربـهێنیت، تاکو زەینی بـەرەو کارەکـەی ئاراستە ببێـت و، لەویشـەوە بگوێزێتـەوە بـۆ دەرەنجـام، بۆ ئەوەی دڵنیا ببێت. پاشان پەیوەندیی نێوان "پرسیار" و "یەکسـانی" لـەخۆگرتنی پرسـیارە بۆ یەکسانی. چونکە کەسی خـاوەن پرسـیار "بـوون" و "نـەبوون" لـە زانینیـدا یەکسـانە. زۆر جاریش وەڵامی پرسیارەکە ئەم یەکسانی‌یە ناوەکی‌یەیە.

* ئەگەر وتت:

بۆچی لە ﴿أَنْذَرْتَهُمْ﴾دا بە شێوەی "ڕابوردوو" گوزارشتی لە هەڕەشە (الإنذار) کرد؟

پێت دەوترێت: تاکو بانگی لـێ بکات کە: "ئەی محەممەد! بۆ خـۆت تـاقیت کـردەوە" ئیتر لەمەوە قیاس بکە.

* ئەگەر وتت:

بۆچی ﴿أَمْ لَمْ تُنْذِرْهُمْ﴾ی هێنـا، لە کاتێکـدا کە بێ سـوودیی "هەڕەشـە نەکـردن" ڕوون و ئاشکرایە؟

پێت دەوترێت:

هەروەك هەڕەشە کردن "سووربوون" بەرهەم دەهێنێت، بە هەمان جۆر بێ دەنگییـش هەندێ جار سوودی بۆ ئەوە دەبێت کە لەگەڵ بەرامبەردا ویژدان بەکار هاتبێت.

ئەگەر وتت: بۆچی تەنها هەڕەشـەی بـەکارهێناوە، لـەکاتێکدا کـە ئـەو "مژدەدەر" و "هەڕەشەکەر"یشە؟

---

(١) چونکە "یەکسانی" یان لە بێسوودیی هەڕەشەکەوە سەرهەڵدەدات، یاخود لە نەبوونی پێویستکەر. (ت)

وأما ﴿ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ﴾ فـ"الهمزةُ" و "أمْ" هنا في حُكم "سواءٌ" حرفي تأكيدٍ لـ﴿سَوَاءٌ﴾ الأولِ. أو تأسيسٌ نظراً إلى اقتسامِها المعنيَين المذكورَين للمساواة[1].

* إنْ قلت:

فلِمَ عبَّرَ عن المساواة بصورة الاستفهام؟

قيل لك:

إذا أردتَ أنْ تُنبِّهَ المخاطَبَ على عدم الفائدةِ في فعل نفسِه بوجهٍ لطيفٍ مُقنِعٍ، لابدَّ أنْ تستفهمَ ليتوجَّهَ ذهنُه إلى فعله فينتقلَ منه إلى النتيجة فيطمئنَّ.. ثم العلاقةُ بين الاستفهام والمساواة تضمُّنُه لها؛ إذ السائلُ يتساوى في علمه الوجودُ والعدمُ.. وأيضاً كثيراً ما يكونُ الجوابُ هذه المساواةَ الضمنية.

* إنْ قلت:

لِمَ عبَّرَ عن الإنذار في ﴿ءَأَنذَرْتَهُمْ﴾ بصورة الماضي؟

قيل لك:

ليناديَ: "يا محمدُ قد جرَّبْتَ" فقِس!

* إنْ قلت:

لِمَ ذكرَ ﴿أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ﴾ مع أنَّ عدمَ فائدةِ عدمِ الإنذارِ ظاهرٌ؟

قيل لك:

كما قد ينتجُ الإنذارُ إصراراً، كذلك قد يُجدي السكوتُ إنصافَ المخاطَب.

* إنْ قلت:

لِمَ أنذرَ بالترهيب فقط مع أنَّه بشيرٌ نذير؟

---

(١) إذ المساواة تنشأ إما من عدم الفائدة أو عدم وجود الموجب. (ت)

پێـت دەوتـرێ: چونکــە تەنــها "هەڕەشــە" لەگــەڵ "کوفــر"دا گونجــاوە و، "دوورخستنەوەی زیانبەخشەکان"یش لە پێشترە هەتا "هێنانی شتە سوودبەخشەکان" و، کاریگەریشی زیاترە. هەروەها لەبەر ئەوەش کە لێرەدا "هەڕەشە" دەماری "ئەندێشە" دەجوولێنێت و بێداری دەکاتەوە، تاکو لە دوای ﴿لا يُؤْمِنُــــونَ﴾ بەرچنیی: "مژدەیان بدەیتێ یان مژدەیان نەدەیتێ" بکات و وەریبگرێت.

پاشان بزانە کە: هەروەك هەموو بڕیارێك واتایەکی حەرفی و ئامانجێکی پەنهانی تێدایە، بە هەمان جۆر ئەم گوفتارەش چەند وردە واتا و ئامانجێکی لەخۆ گرتووە کە لەو پێناوەدا گوفتارەکە هێنراوە، ئەویش سووك کردنی ئەرك و کەمکردنەوەی قورسیەتی لەسەر شانی پێغەمبەر - دروودی لەسەر بێت - و دڵدانەوەیەتی بەوەی کە شوێن پێی پێغەمبەرانی پێشین - درودیان لەسەربێت - هەڵبگرێت، چونکە زۆربەیان ئەم چەشنە گوفتارەیان ئاراستە کراوە. تەنانەت حەزرەتی نووح - دروودی لەسەر بێت - دوای ئەوە[1] فەرموویەتی: ﴿لا تَذَرْ عَلَى الأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً﴾ (نوح: ٢٦)..

پاشان لەبەر ئەوەی کە ئایەتەکانی قورئان بە وێنەی ئاوێنە بەرامبەر یەکەکان و، چیرۆکی پێغەمبەرانیش بە وێنەی خەرمانەی مانگ بۆ حاڵی پێغەمبەر - دروودی لەسەر بێت - دەڕوانن، ئەوا ئەم گوفتارە وەکو ئەوە وایە کە بڵێت:

"ئەمە یاسایەکی فیتریی خوای گەورەیە، دەبێ ملی بۆ کەچ بکرێت".

دوای ئەم شیکردنەوەیە، بزانە کە:

کۆی ئەم ئایەتە هەتا دەگاتە: ﴿وَلَهُمْ عَذابٌ عَظِيمٌ﴾ بۆ ئەوە هێنراوە تاکو بە هەموو گرێ و ڕستەکانی ئاماژە بکات بۆ ناشیرین پیشاندان و ڕسواکردنی کوفر و، خەڵك لێ دوورخستنەوەی و، نەهیی ناوەکی لێی و، سووکایەتی نواندن بە شوێنکەوتووانی و، لەسەر تۆمار کردنیان و، ترساندنیان و، هەڕەشە لێ کردنیان.. بە وشەکانیشی بانگیان لێ دەکات کە چەندین گرفتی گەورە و، لەدەستچوونی چەندەها نیعمەتی مەزن و، سەرهەڵدانی گەلێ ئازاری سەخت و، نەمانی چەندین چێژ و لەزەتی بڵند لە "کوفر"دا هەیە.. بە ڕستەکانیشی ڕاشکاوانە ڕایدەگەیەنێت کە "کوفر" لە هەموو شتێك چەپەڵتر و بەزیانترە..

---

(١) واتە دوای ئەو هەڕەشە کردنە، یان دوای گەیاندنی ئەو گوفتارەی خوا بە کافران. (بادللی)

قيل لك:

إذ الترهيبُ هو المناسبُ للكفر، ولأنَّ دفعَ المضارِّ أولى من جَلبِ المنافع وأشدُّ تأثيراً، ولأنَّ الترهيبَ هنا يهزُّ عِطفَ الخيالَ ويوقِظُه لأنْ يتلقى ويجتنيَ بعد قوله ﴿لا يُؤْمِنُونَ﴾: "أبشَّرْتَهم أم لم تبشرْهم".

ثم اعلم كما أنَّ لكلِّ حُكمٍ معنى حرفياً ومقصداً خفياً؛ كذلك لهذا الكلامِ معانٍ طيارةٌ ومقصدٌ سيق له، هو تخفيفُ الزحمة، وتهوينُ الشدَّةِ عن النبي عليه السلام، وتسليتُه بتأسِّيه بالرسل السالفين. إذ خوطبَ أكثرُهم بمثل هذا الخطابِ، حتى قال نوحٌ بعده:

﴿لا تَذَرْ عَلَى الأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً﴾ (نوح: ٢٦)..

ثم لأنَّ آياتِ القرآن كالمرايا المتناظرة، وقصصَ الأنبياءِ كالهالة للقمر تنظرُ إلى حالِ النبيِّ عليه السلام؛ كان كأنَّ هذا الكلامَ يقولُ:

هذا قانونٌ فطريٌّ إلهيٌّ يجبُ الانقيادُ له.

واعلم بعد هذا التحليل؛ أنَّ مجموعَ هذه الآيةِ إلى ﴿وَلَـهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ سيقتْ مشيرةً بعقودِها إلى تقبيح الكفرِ وترذيلِه، والتنفيرِ منه والنهيِ الضمنيِّ عنه، وتذليلِ أهله، والتسجيلِ عليهم، والترهيبِ عنه، وتهديدِهم.. مناديةً[1] بكلماتها بأنَّ في الكفر مصائبَ عظيمةً، وفواتَ نِعَمٍ جسيمةٍ، وتولُّدَ آلامٍ شديدةٍ، وزوالَ لذائذَ عاليةٍ.. مصرِّحةً بجُمَلها بأنَّ الكفرَ أخبثُ الأشياء وأضرُّها.

---

(١) بالنصب، عطف على قوله: مشيرةً. وكذا مصرحة.

چونکە بە هێنانی وشەی ﴿كَفَرُوا﴾ لە بریی " لم یؤمنوا" ئاماژەی بەوە دا کە ئەوان بە ئیمان نەهێنانیان کەوتوونەتە ناو تاریکایی "کوفر"ەوە، کە موسیبەتێکی ئەوتۆیە گەوهەری گیان دەشێوێنێت، جگە لەوەش کە کانگای ئازارەکانە.

بە وشەی ﴿لا يُؤْمِنُونَ﴾ش لە بریی "لا یترکون الکفر" ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە:.

ئەوان سەرباری ئەو زیانەی لێیان کەوت، ئەو ئیمانەشیان لەدەست چوو کە سەرچاوەی گشت بەختەوەرییەکانە.

بە وشەی ﴿خَتَمَ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِم﴾ ئاماژەی بەوە دا کە:

ئەو "دڵ" و "ویژدان"ەی ژیان و کەماڵ و خۆشحاڵییان لەوەدایە بە "نووری ئیمان" ڕاستییەکانی لەمەڕ خوای گەورەیان تێدا دەربکەوێت، ئەو دڵ و ویژدانەی ئەوان، دوای کافربوونیان، بە وێنەی خانوویەکی ترسناکی نائاوەدان و پڕ لە شتی زیانبەخش و پڕ لە مێرووی لێ هاتووە، کە داخراوە و مۆر لە دەرگاکەی دراوە، تاکو دوورەپەرێزیی لێ بکرێت و، بەجێیان هێشتووە بۆ دووپشك و مارەکان.

بە وشەی ﴿وَعَلَى سَمْعِهِم﴾ ئاماژەی بەوە دا کە:

ئەوان بەهۆی "کوفر"ەوە نیعمەتێکی مەزنی "بیستن"یان لەدەستچوو. چونکە ئەگەر نووری ئیمان لە پشت کرکراگەی گوێ جێگیر ببێت و پشتی پێ ببەستێت، ئەوا "بیستن" هەست بە دەنگ و زایەڵەی هەموو دنیا دەکات و، لە زیکرەکانیان تێدەگات و، دەنگی بوونەوەران دەبیستێت و، پەی بە تەسبیحاتیان دەبات..

تەنانەت هەستی "بیستن" لە دەنگی هەڵکردنی با و، گرمەی هەور و، ئاوازەکانی شەپۆلی دەریا و، دەنگی تەقەی بەرد و، خرمەی باران بارین و، ئاوازی گۆرانیی باڵندەدا گوفتارێکی پەروەردگاری دەبیستێت و تەسبیحاتێکی بەرز و بڵند تێدەگات.. دەڵێی بوونەوەران سەبارەت بە هەستی "بیستن" مۆسیقاژەنێکی مەزنی ئەوتۆیە کە خەمێکی بڵند و عیشقێکی ڕۆحانی لە دڵیدا دەورووژێنێت. ئیتر بە یادکردنەوەی یاران و هاودەمانی خەم دەخوات، ئەو خەمەشی بۆ دەبێتە "چێژ"ێکی خۆش، نەك بۆی ببێتە "پەژارە"ی نەبوونی خۆشەویستان..

إذ أشار بلفظ ﴿كَفَرُوا﴾ بدلَ "لم يؤمنوا" إلى أنهم بعدم الإيمانِ وقعوا في ظُلمة الكفر الذي هو مصيبةٌ تفسِدُ جوهرَ الروح وأيضاً هو معدِن الآلام.

وبلفظِ ﴿لا يُؤْمِنُونَ﴾ بدلَ "لا يتركون الكفرَ" إلى أنّهم مع تلك الخسارةِ سقطَ من أيديهم الإيمانُ الذي هو منبعُ جميعِ السعادات.

وبلفظِ ﴿خَتَمَ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ﴾ إلى أنَّ القلبَ والوجدانَ ـ اللذَيْن حياتُهما وفَرَحُهما وسرورُهما وكمالاتُهما بتجَلّي الحقائقِ الإلهية بنور الإيمانِ - بعدما كفروا، صارا كالبناء المُوحِشِ الغيرِ المعمور المشحونِ بالمضرات والحشرات، فأُقْفِلَ وأُمْهِرَ[1] على بابه ليُجتَنبَ، وتُرِكَ مفوَّضاً للعقارب والأفاعي.

وبلفظِ ﴿وَعَلَى سَمْعِهِمْ﴾ إلى فوات نعمةٍ عظيمةٍ سمعيةٍ بسبب الكفرِ؛ إذ السمعُ من شأنه - إذا استقرَّ خلفَ صِماخه نورُ الإيمان واستندَ إليه - الاحتساسُ بنداءِ كل العالَم وفَهْمُ أذكارِه، وسَمْعُ صياح الكائنات وتفهُّمُ تسبيحاتِها..

حتى إنَّ السمعَ ليَسمعُ من ترنُّماتِ هبوبِ الريح، ومِن نَعَرات رعدِ الغَيم، ومن نغَمات أمواج البحر، ومن صرَخات دقدقةِ الحجَرِ، ومن هزَجات نزولِ المطر، ومن سجَعات غناءِ الطير كلاماً ربانياً، ويفهَمُ تسبيحاً عُلوياً، كأنَّ الكائناتِ موسيقيةٌ عظيمةٌ له، تُهيّجُ في قلبه حُزناً عُلوياً وعِشقاً روحانياً، فيحزَنُ بتذكُّرِ الأحبابِ والأنيس، فيكونُ الحزنُ لذةً؛ لا بعدَم الأحباب فيكونَ غمّاً..

---

(١) أي ختم على بابه. والمُهر- بالضم - هو الختم الذي يطبع ويوقع به. والكلمة أعجمية استعملها تفنناً. وله من الحسن مقام. (ش)

بەڵام هەرکاتێ بە هۆی کوفرەوە هەستی "بیستن" تاریك دابێت، ئەوا گوێی لەو دەنگە بەتام و چێژانە کەڕ دەبێت و، مەگەر گریەی ماتەمینی و لاواندنەوەی مردن، دەنا دەنگێکی تر لە بوونەوەرانەوە نابیستێت. ئیتر ئەو "بیستن"ە جگە لە خەفەتی هەتیوانە (واتە نەبوونی خۆشەویست) هەروەها سامی نامۆیی (واتە نەبوونی خاوەن و سەرپەرشتیار) هیچ شتێکی تر ناهاوێتە ناو دڵەوە.

لەسەر بناغەی ئەم نهێنییەیە کە شەرع هەندێ دەنگی حەڵاڵ کردووە، کە ئەوەیە عیشقێکی بڵند و خەمێکی عاشقانە بورووژێنێت. هەندێکی تریشیانی حەرام کردووە، کە ئەوەیە حەزێکی دەروونی و خەمێکی هەتیوانە بەرهەم بهێنێت. ئەوەش کە شەرع حوکمەکەی پیشان نەداویت، خۆت بە کاریگەریی لە "گیان" و "ویژدان"تدا لێکیان جیا بکەرەوە.

بە وشەی ﴿وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ﴾ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بە هۆی کوفرەوە نیعمەتێکی مەزن دەڕوات و نامێنێت. چونکە ئەگەر ڕووناکیی هەستی "بینین" بکەوێتە کار و، پەیوەست بێت بەو نوورەی "ئیمان"ەوە کە لە پشت تۆڕی چاوەوەیە و، "ئیمان" ببێتە پشتگیر و بزوێنی، ئەوا هەموو بوونەوەران وەکو بەهەشتێکی لێ دێت کە بە گوڵ و حۆری ڕازابێتەوە و، ڕووناکیی چاویش دەبێتە هەنگێك کە بە سەریاندا دەفڕێت و شیلەی پەند و هزر و هاودەمی و لەگەڵ ڕاهاتن و خۆخۆشەویست کردن و پیرۆزبایی لەو گوڵانە دەچنێتەوە و، ئنجا کۆڵەکەی هەڵدەگرێت و لەناو ویژداندا هەنگوینی ڕەفتار و ڕەوشتە کامڵەکان دادەنێت..

بەڵام هەرکاتێ - پەنا بە خوا - ئەو هەستی "بینین"ە بە هۆی کوفرەوە تاریك دابێت، ئەوا پەردەی بە سەردا دێت و، دنیا لە پێش چاویدا دەبێتە بەندیخانە و، "ڕاستییەکان" خۆیانی لێ دەشارنەوە، بوونەوەرانیش لێی دەبنە مایەی بێزاری و ترسناکی و، ئازارێك دەهاونە دڵی کە سەرتاپێی ویژدانی بگرێتەوە.

بە وشەی ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾یش ئاماژە دەکات بۆ بەروبوومی درەختی زەقوومی "کوفر" لە جیهانی دواییدا، کە سزای دۆزەخ و تۆڵەی تووڕەبوونی خوای گەورەیە.

﴿لا يُؤْمِنُونَ﴾ش جەخت کردنەوەیە لەسەر ﴿سَوَاءٌ﴾ و، دەقە لەسەر لایەنی "یەکسانی"یەکە.

وإذا أظلمَ ذلك السمعُ بالكفر صار أصمَّ من تلك الأصوات اللذيذة، ولا يسمعُ من الكائنات إلّا نياحاتِ المأتمِ ونعياتِ الموت، فلا يُلقي في القلب إلّا غمَّ اليُتمَة أي عدمِ الأحباب، ووحشةَ الغُربة أي عدمِ المالك والمتعهّد.

فبناءً على هذا السرِّ أحلَّ الشرعُ بعضَ الأصوات وهو ما هيّجَ عشقاً عُلوياً وحُزناً عاشقياً، وحرَّمَ بعضَها وهو ما أنتجَ اشتهاءً نفسياً وحُزناً يُتمياً، وما لم يُرِكَ الشرعُ فمَيِّزْه بتأثيره في روحك ووجدانك.

وبكلمةِ ﴿وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞ﴾ إلى زوالِ نعمةٍ جسيمة بسبب الكفرِ؛ إذ البصرُ من شأنه - إذا استضاءَ نورُه واتصلَ بنور الإيمان الساكنِ خلفَ شُبيكتِه مُمِدّاً ومحرِّكاً له - كان[1] كلُّ الكائنات كجنة مزيَّنة بالزهر والحُور، ويصير نورُ العين نحلاً تطيرُ عليها فتجتني من تلك الأزاهير عُصارةَ العِبرة والفكرة والأُنسية والاستيناس والتحبُّبِ والتهنئة، فتأخذُ حَميلتَها فتتخذُ في الوجدان شهدَ الكمالات..

وإذا أظلمَ - العياذُ بالله - ذلك البصرُ بالكفر طُمِسَ، وصارت الدنيا في نظره سجناً، وتستّرتْ عنه الحقائقُ وتوحّشتْ عليه الكائناتُ وتُلقي إلى قلبه آلاماً تحيطُ بوجدانه من الرأس إلى القدم..

وبلفظِ ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ إلى ثمرةِ شجرةِ زقّوم الكفر في العالم الأخرويِّ من عذاب جهنمَ ومن نَكالِ الغضَب الإلهي. هذا.

وأما ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ فتأكيدٌ لـ﴿سَوَآءٌ﴾ ينصُّ على جهةِ المساواةِ.

***

---

(١) هكذا الأصلُ: "كان". ولعله: "أنْ يكونَ له" والله أعلم. (ف)

﴿خَتَمَ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِم وَعَلَى سَمْعِهِمْ وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (البقرة:٧)

## پێشەکی

بزانە کە پێویستە لێرەدا ڕابووەستین، تاکو گوێبیستی وتەی زانایانی " کەلام" بین، چونکە لە ژێر (قەڵای) ئەم ئایەتەدا جەنگێکی مەزن لە نێوان شوێنکەوتووانی ڕێبازی "موعتەزیلە" و "جەبر" و، شوێنکەوتووانی ڕێبازی "ئەهلی سوننەت و جەماعەت"دا هەیە. خۆ ئەم چەشنە جەنگەش سەرنجی بیرمەندان بۆ خۆی ڕادەگرێت. بۆیە بە گونجاومان زانی کە لێرەدا چەند بناغەیەك باس بکەین، بۆ ئەوەی سوودیان لێ وەربگریت:

ڕێبازی "ئەهلی سوننەت و جەماعەت" ڕاستەڕێگایە و، ڕێبازەکانی تر "زیادەڕەوی" یاخود "کورتبڕی"یە[1].

یەکێك لەوانە ئەوەیە کە: "سەلماوە جگە لە خوای گەورە هیچ شتێك کاریگەریی لە گەردووندا نی یە". کەواتە هەرگیز "تەفویز"[2] لە گۆڕێدا نی یە[3].

یەکێکی تریان ئەوەیە کە: "خوای گەورە دانایە". کەواتە سزا و پاداشت بێهوودە نین. ئەو کاتەش دەزانرێت کە کاری "زۆرەملێ" لە ئارادا نی یە[4].

جا هەروەك تەوحید دەست بە سنگی "ئیعتیزال"ەوە دەنێت، خاوێن ڕاگرتنی خواوەندیش چەپۆك بە دەموپلی "جەبر"دا دەکێشێت!

---

(١) وتەی بیست و شەشەمی کتێبی (وتەکان) برگەکانی ئەم باسەی بە درێژتر تێدایە.
(٢) واتە: ئەوەی کە خوای گەورە بەدیهێنانی کردەوەکانی بەندەی بە بەندەکان سپاردبێت. (وەرگێڕ)
(٣) وەك ئەوەی کە موعتەزیلەکان دەڵێن: بەندە خۆی بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆیەتی. (ت)
(٤) واتە: وەك ئەوەی ڕێبازی "جەبر" دەڵێن. (وەرگێڕ)

﴿خَتَمَ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَعَلَى سَمْعِهِمْ وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ وَلَـهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (البقرة: ٧)

## مقدمة

اعلم أنّه لزمَنا أنْ نقفَ هنا حتى نستمعَ لما يتكلّمُ به المتكلمون؛ إذ تحت هذه الآيةِ حربٌ عظيمةٌ بين أهل الاعتزالِ وأهل الجبرِ وأهل السنةِ والجماعة. ومثلُ هذه الحربِ تستوقفُ النُظّارَ. فناسَبَ أنْ نذكرَ أساساتٍ لتستفيدَ منها:

إنَّ مذهبَ أهل السنةِ والجماعة هو الصراطُ المستقيمُ، وما عداه إما إفراطٌ أو تفريط[١].

منها: أنّه قد تحقَقَ: "أنْ لا مُؤَثِّرَ فِي الْكَوْنِ إلّا اللهُ" فإذن لا تفويضَ[٢].

ومنها: "أنَّ اللهَ حكيمٌ" فلا يكونُ الثوابُ والعقاب عبَثين، فحينئذ لا اضطرارَ.

فكما أن التوحيدَ يدفعُ في صدر الاعتزال؛ كذلك التنـزيهُ يضربُ على فمِ الجبر.

---

(١) في "الكلمة السادسة والعشرين" (رسالة القدر) تفصيل جميع الفقرات التالية.

(٢) كما يقول أهل الاعتزال من أن العبد خالق لأفعاله. (ت)

يەكێكى تريان ئەوەيە كە: هەموو شتێك دوو "ڕوو"ى هەيە[١]! ڕوويەكى "مولك" كە ڕێ دەكەوێت هەندێ جار جوان بێت و لەوانەشە هەندێ جار ناشيرين، بە وێنەى ديوى پشتەوەى ئاوێنە كە شێوە جۆراوجۆرەكانى بەسەردا دێت..

ڕووى "مەلەكووت"يشى هەيە كە دەڕوانێتە بەديهێنەر. ئەم ڕووە لە هەموو شتێكدا بە وێنەى ڕووى ئاوێنە ڕوونە.

ئيتر لەم ڕووەدا بەديهێنانى شتى ناشيرين "ناشيرين" نىيە، چونكە "بەديهێنان" لە ڕووى "مەلەكووت"ەوە شتێكى جوانە. هەروەها لەبەر ئەوەش كە بەديهێنانى شتى ناشيرين بۆ كاملكردنى جوانىيەكانە، ئەوا ئەو ناشيرينىيە بەهۆى غەيرى خۆيەوە دەبێت بە شتێكى "جوان". كەواتە ئيتر گوێ لە سەفسەتەى[٢] "ئيعتيزال" ڕامەگرە.

يەكێكى تريان: ئەو شتەى كە: "دەرەنجامى مەصدەر"ە[٣]، شتێكى جێگير، بەديهاتوو، وشك و بێ گيان(جامد)ە و، سيفەتەكانى لێ وەرناگيرێت[٤]. بەڵام خودى "مەصدەر" شتێكى بەدەستهاتوو، ڕێژەيى و گوێزەييە و، سيفەتەكانى لێ وەردەگيرێت. كەواتە بەديهێنەرى "كوشتن" بە "بكوژ" دانانرێت[٥]. ئيتر كە ئەمەت زانى، واز لە شوێنكەوتوانى ڕێچكەى ئيعتيزال بهێنە، با هەر لەناو گەمەى خۆياندا ڕۆبچن!

---

(١) "مولك و مەلەكووت" هەردووكيان مولكى خواى گەورەن. ئەوەندە هەيە مولك ڕووى لە جيهانى ئاشكرا (الشهادة) و بەندەكانى خوايە. بەڵام مەلەكووت ڕووى لە جيهانى پەنهان (الغيب) و كاروبارە موقەددەسەكانى خواى گەورەيە. (وەرگێڕ)

(٢) بۆ واتاى "سەفسەتە" بڕوانە پەراوێزى لاپەڕە: (١٥٠). (وەرگێڕ)

(٣) وەك: "ئازار" و "مردن" كە دەرەنجامى "ئێشان" و "كوشتن"ن. (ت)

(٤) واتە: وەك لە زانستى "صەرف"دا ڕوون كراوەتەوە: "ئيسمى فاعيل" (وەكو قاتيل) لە "جاميد" وەرناگيرێت. (ت)

(٥) بۆ نموونە: كردارى "كوشتن" كە كەسێك كەسێكى ديكە دەكوژێت، بەدەستهاتووى مرۆڤە. واتە "كوشتن" بەو واتايە "مەصدەر"ە، كەواتە "ئيسمى فاعيل" لەو مەصدەرە دادەڕێژرێت و، بەو كەسەى كردارى "كوشتن"ى كردووە دەوترێت: "بكوژ"(قاتيل) و، بەرپرسيارى كارەكەيەتى. بەڵام ئەو شتەى كە لە ئەنجامى كارى كوشتنەكەوە پەيدا دەبێت، كە دەرچوونى گيانى كوژراوەكەيە "دەرەنجامى مەصدەر"ە، واتە دەرەنجامى كارەكەى ئەوە. خۆ ئەوەش "بەديهێنان"ێكە لە لايەن خواوە. "دەرەنجامى مەصدەر"يش بە پێى زانستى زمانەوانيى صەرف "ئيسمى فاعيل"ى لێ وەرناگيرێت. كەواتە بە "بەديهێنەر"ى گيان كێشانەكە - كە خواى گەورەيە - ناوترێت "بكوژ". (وەرگێڕ)

ومنها: أنَّ لكلِّ شيءٍ جهتين:

جهةٍ مِلْكيةٍ هي قد تكونُ حسنةً وقد تكونُ قبيحةً تتواردُ عليها الأشكالُ، كظهر المرآةِ.

وجهةٍ مَلَكوتيةٍ تنظرُ إلى الخالق. وتلك شفافةٌ في كلِّ شيءٍ كوجهِ المرآةِ.

فخَلْقُ القبيح ليس قبيحاً؛ إذ الخَلْقُ من جهة الملكوتية حَسنٌ، ولأنَّ خلقَه لتكميل المحاسنِ فيحسُنُ بالغير. فلا تُصغِ إلى سفسطة الاعتزال!

ومنها: أنَّ الحاصلَ بالمصدر[1] أمرٌ قارٌ مخلوقٌ جامدٌ لا يُشتَقُّ منه الصفاتُ[2]. وأما المصدرُ فمكسوبٌ نسبيٌّ اعتباريٌ يُشتَقُّ منه الصفاتُ. فلا يكونُ خالقُ القتل قاتلاً.. فَذَرْ أهلَ الاعتزالِ في خوضهم يَلْعَبُون!

---

(١) كالألم والموت الحاصلين بالضرب والقتل. (ت)

(٢) أي لا يشتق من الجامد اسم الفاعل كما هو معلوم في علم الصرف. (ت)

یەكێكی تریان ئەوەیە كە: زۆربەی جار كرداری ڕواڵەتی ئەنجامی زنجیرە كردارێكە بەو مەیلەی دەروون كۆتاییان پێ دێت كە پێی دەوترێت: "جوزئی ئیختیاری". ئیتر مشتومڕەكان لەسەر ئەم بناغەیە ڕوو دەدەن.

یەكێكی تریان: "ویستی هەمەكیی خوایی"، بە عادەتی خۆی، دەڕوانێتە "ویستی هەندەكیی بەندە". كەواتە ئیتر "ناچاركردن" لە ئارادا نییە.

یەكێكی تریان: "زانست شوێنكەوتەی زانراوە". كەواتە زانراو شوێنی ئەو ناكەوێت هەتا "دەور" دروست ببێت. ئیتر بیانوو بۆ كردەوەكان ناهێنرێتەوە بە دانەپاڵی پێوەرەكانی ئەو كردەوانە بۆ قەدەر.

یەكێكی تریان: بەپێی بەڕێچوونی عادەتی خوای گەورە و بە مەرجگرتنی ئەو، بەدیهێنانی "دەرەنجامی مەصدەر" بەندە لەسەر ئەوەی كە مرۆڤ "مەصدەر"ەكە بەدەست بهێنێت..

ناوك و هەوێنی "بەدەستهێنانی مەصدەر"یش بریتییە لە "مەیەلان" (ئارەزوو كردن).

كەواتە بە شیتەڵكردنی "مەیەلان" گرێی مەسەلەكە دەكرێتەوە.

یەكێكی تریان: "زاڵبوونی بێ زاڵكردن" مەحاڵە.. نەك "زاڵكردنی بێ زاڵكەر". كە لەمە زانرا، ئیتر كردارەكانی خوای گەورە بە "مەبەستە هۆكارەكان" لێكنادرێنەوە، بەڵكو ویست و ئیختیاری خوای گەورە دەبێتە زاڵكەر و تەرجیحدەر[1].

یەكێكی تریان: هەر شتێك كە "هەیە" پێویستە كاریگەرێك هێنابێتیە "بوون". دەنا "زاڵبوونی بێ زاڵكردن" دێتە كایەوە، كە وەك پێشتر وتمان كارێكی مەحاڵە. بەڵام تایبەتبوونی شتی گوێرەیی (إعتباري)[2] بە بێ بوونی تایبەتكەر مەحاڵی لێ ناكەوێتەوە.

یەكێكی تریان: شتی بەدیهاتوو (بووە) دەبێت "بوون"ەكەی پێویست ببێت ئنجا دێتەدی (دەبێت)[3].

---

(١) ئەم چەمكە لە كتێبی (وتەكان) وتەی بیست و شەشەم، ل٦٨٦دا پتر ڕوون كراوەتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) شتی ئیعتیباری: ئەوەیە كە "بوونی دەرەكیی" نییە و، تەنها لە ژێربی ئەو كەسەدا هەیە كە ئیعتیباری بۆ دادەنێت لەو كاتەدا كە بۆی داناوە. (لە كتێبی "التعریفات"ی جورجانییەوە).

(٣) واتە: هەرشتێك بوونی پێویست نەبێت نابێتە "بوون"ەوە. جا لە دەمی پەیوەندی كردنی هەردوو ویستەكە (جوزئی و كوللی) لە هەر شتێكدا، "بوون"ی ئەو شتە پێویست دەبێت و یەكسەر دێتە "بوون". (ت)

ومنها: أنَّ الفعلَ الظاهريَّ في الأغلب نتيجةٌ لأفعالٍ متسلسلةٍ منتهيةٍ إلى ميَلان النفسِ الذي يسمّى بـ"الجزء الاختياري". فتدورُ المنازعاتُ على هذا الأساس.

ومنها: أنَّ الإرادةَ الكليةَ الإلهيةَ ناظرةٌ بعادته تعالى إلى الإرادةِ الجزئية للعبد، فلا اضطرارَ.

ومنها: أنَّ العلمَ تابعٌ للمعلوم، فلا يتبعُه المعلومُ حتى يدورَ. فلا يُتعلَّلُ في العمل بإحالة مقاييسِه على القدَر.

ومنها: أنَّ خلقَ الحاصلِ بالمصدر متوقِّفٌ على كسب المصدرِ بجَرَيان عادةِ الله تعالى باشتراطه به. والنواةُ في كسب المصدر والعُقدةُ الحياتيةُ فيه هي الميَلان، فبحَلِّه تنحلّ عُقدةُ المسألةِ.

ومنها: أنَّ الترجُّحَ بلا مُرجِّحٍ محالٌ دون الترجيحِ بلا مرجِّحٍ، فلا يُعلَّلُ أفعالُه تعالى بالأغراض؛ بل اختيارُه تعالى هو المرجِّحُ.

ومنها: أنَّ الأمرَ الموجودَ لابدَّ له من مُؤثِّرٍ وإلا لزَمَ الترجُّحُ بلا مرجِّحٍ وهو محالٌ كما مرَّ. وأما الأمرُ الاعتباريُّ[1] فتخصُّصُه بلا مخصِّصٍ لا يلزمُ منه المحالُ.

ومنها: أنَّ الموجودَ يجبُ أنْ يجبَ ثم يوجَدَ[2].

---

(١) هو الذي لا وجود له إلّا في عقل المعتبر مادام معتبراً. (التعريفات)

(٢) أي لا يأتي إلى الوجود شيء ما لم يكن وجوده واجباً. فعند تعلق الإرادتين الجزئية والكلية في شيء يكون وجود الشيء واجباً، فيوجد حالاً. (ت)

بەڵام زاڵبوونی شتی ئیعتیباری، بێ ئەوەی بگاتە ڕادەی "پێویست بوون"، سەروزیادە و، ئەوەی لێ ناکەوێتەوە کە مومکینێك بە بێ کاریگەر پەیدا بووبێت.

یەکێکی تریان: زانیاری سەبارەت بە "بوون"ی هەر شتێك داخوازی زانینی "ماهییەت"ەکەی نییە و، نەبوونی زانینی ئەو ماهییەتەش داخوازی نەبوونی ئەو شتە نییە. کەواتە "نەبوون"ی تەعبیرێك لەبارەی گەوهەری "ئیختیار" ڕێ لە بێگومانیی "بوون"ەکەی ناگرێت.

جا ئەگەر لەم بناغانە تێگەیشتیت، ئەوا گوێبیستی ئەمە ببە کە بە گوێتدا دەدرێت:

ئێمەی دەستەی سونەت و جەماعەت، دەڵێین:

ئەی دەستەی "ئیعتیزال"!

"بەندە" بەدیهێنەری ئەو شتە نییە کە "دەرەنجامی مەصدەر"ە، وەك ئەوەی کە بەدیهێنەری ئەو شتەش نییە کە لە "مەصدەر"ەوە[1] سەرهەڵدەدات[2]، بەڵکو تەنها سەرچاوەی "مەصدەر"ەکەیە[3]، چونکە جگە لە خوای گەورە هیچ کاریگەرێکی دیکە لە گەردووندا نییە.. "تەوحید" وا دەخوازێت!

پاشان دەڵێین:

ئەی دەستەی "جەبر"!

"بەندە" ناچار نەکراوە لەسەر کردنی کارەکانی، بەڵکو جوزئێکی ئیختیاریی هەیە. چونکە خوای گەورە دانایە.. "خاوێن ڕاگرتنی خوا" ئاوا دەخوازێت.

* خۆ ئەگەر وتتان:

هەتا "جوزئی ئیختیاری" شیتەڵ بکرێت، جگە لە "جەبر" شتی دیکەی لێ بەدەست نایەت..

پێتان دەوترێت:

---

(١) واتە: بەدیهێنەری ئەو شوێنەوارە نییە کە دەرەنجامی مەصدەرەکەیە و پێی دەوترێت: بەدەستهێنان(الکسب). (ت)

(٢) واتە: بەندە بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆی نییە. (وەرگێڕ)

(٣) واتە: جگە لە "بەدەستهێنان – الکسب" هیچ شتێکی تر بە دەستی بەندە نییە. (ت)

لێرەدا مرۆڤیش تەنها لەسەر "بەدەستهێنان"ەکەیەتی، کە هی "جوزئی ئیختیاری"یەتی. (وەرگێڕ)

وأما الأمرُ الاعتباريُّ فالترجُّحُ بلا انتهاءٍ إلى حدِّ الوجوبِ كافٍ، فلا يلزمُ ممكنٌ بلا مُؤثِّر.

ومنها: أنَّ العلمَ بوجود شيءٍ لا يستلزمُ العلمَ بماهيَّتِه، وعدمَ العلم بالماهية لا يستلزمُ العدمَ..

فعدمُ التعبير عن كُنهِ الاختيار لا يُنافي قطعيةَ وجودِه.

وإذا تفطنتَ لهذه الأساسيات فاستمعْ لما يُتلى عليك:

فنحن معاشرَ أهل السنة والجماعة نقولُ:

يا أهلَ الاعتزالِ! إنَّ العبدَ ليس خالقاً للحاصل بالمصدر كالحاصلِ من المصدر[1]، بل هو مصدرُ المصدرِ فقط[2]؛ إذ "لا مُؤثِّرَ في الكون إلا اللهُ"، والتوحيدُ هكذا يقتضي.

ثم نقولُ:

يا أهلَ الجبر! ليس العبدُ مضطراً، بل له جزءٌ اختياريٌّ لأنَّ اللهَ حكيمٌ. وهكذا يقتضي التنـزيهُ.

* فإنْ قلتم:

كلّما يُشرَّحُ الجزءُ الاختياري بالتحليل لا يظهرُ منه إلا الجبرُ.

قيل لكم:

---

(١) أي ليس خالقاً للأثر الحاصل بالمصدر، وهو الذي يطلق عليه الكسب. (ت)

(٢) فليس بيد العبد إلّا الكسب. (ت)

یەکەم: ویژدان و سروشت شایەتی دەدەن کە لە نێوان کاری "ئیختیاری" و "نائیختیاری"دا جیاکەرەوەیەکی نادیار هەیە و، بوونی بێگومانە. ئیتر ئەوە گرنگ نییە کە گوزارشت لەو جیاکەرەوەیە نەکەین.

دووهەم: دەڵێین: "مەیەلان" ئەگەر "بوون"ی هەبێت، وەك ئەوەی "ئەشعەری"یەکان[1] دەڵێن، ئەوا هەڵسوکەوت تیایدا شتێکی "گوێرەیی"یە و بە دەستی بەندەیە[2]. خۆ ئەگەر ئەو "مەیەلان"ە خۆی شتێکی "گوێرەیی" بێت، وەك ئەوەی دەستەی "ماتوریدی"[3] دەڵێن، ئەوا سەلماندن و خۆتایبەتکردنی ئەو شتە گوێرەییە پێویستی بە هۆکارێکی تەواوەتی پێویستکەر نابێت[4]. کەواتە دەگونجێ کردارەکە بەو "مەیەلان"ە نەیەتەدی[5]. جا فەرموو بیری لێ بکەرەوە.

بە پوختی: "دەرەنجامی مەصدەر"ەکە، بەپێی عادەتی خوایی، بەندە لەسەر ئەو "مەصدەر"ەی کە بناغەکەی "مەیەلان"ە. ئەویش خۆی - یان هەڵسوکەوت تیایدا - شتێکی خاوەن "بوون" نییە هەتا جارێ بە خۆتایبەتکردنی بەمە و جارێکی تر بەوە، مومکینێکی بێ کاریگەر، یان زاڵبوونی بێ زاڵکەری لێ بکەوێتەوە[6]..

هەروەها ئەو "مەیەلان"ە - یان هەڵسوکەوت تیایدا - بە هەمان جۆر "نەبوو"یش نییە، هەتا بوترێت: دەست نادات بۆ ئەوەی مەرجێك بێت بۆ بەدیهێنانی "دەرەنجامی مەصدەر"ەکە، یاخود هۆکارێك بێت بۆ پاداشت و سزا.

* ئەگەر وتت:

"زانستی ئەزەلی" و "ویستی ئەزەلی" بەو ئاراستەیەدان کە "ئیختیار" لە ئێمەدا دەربهێنن[7]؟

پێت دەوترێت:

---

(١) یەکێکە لە دوو قوتابخانەکەی زانستی "کەلام"ی "ئەهلی سوننەت و جەماعەت". (وەرگێڕ)

(٢) واتە: گۆڕینی ئەو "مەیەلان"ە لە کردارێکەوە بۆ کردارێکی تر. (ت)

(٣) قوتابخانەکەی تری زانستی "کەلام"ی "ئەهلی سوننەت و جەماعەت"ە. (وەرگێڕ)

(٤) بە شێوەیەك کە پێویست بە "ویستی هەمەکی" نەمێنێت. (ت). "هۆکاری تەواوەتی"ش بریتییە لە کۆی هەموو ئەو شتانەی کە "بوون"ی شتەکەی لەسەر بەندە. (تەعریفات)

(٥) چونکە زۆر جار ڕوودانی "مەیەلان"ەکە هەیە، کەچی "کردار"ەکەش ڕوونادات. (ت)

(٦) واتە: هەتا پێویستی بە کاریگەرێك هەبێت. (ت)

(٧) واتە: ئیختیار ناهێڵن.

أولاً: إنَّ الوجدانَ والفطرةَ يشهدان أنَّ بين الأمر الاختياري والاضطراري أمراً خفياً فارِقاً، وجودُه قطعيٌّ. فلا علينا أنْ لا نعبِّرَ عنه.

وثانياً: نقولُ إنَّ المَيَلانَ إنْ كان أمراً موجوداً - كما عليه الأشاعرةُ - فالتصرّفُ فيه أمرٌ اعتباريٌّ بيد العبد[١]؛ وإن كان المَيلان أمراً اعتبارياً - كما عليه الماتريدية - فذلك الأمرُ الاعتباريُّ ثبوتُه وتخصُّصُه لا يستلزمُ العلةَ التامةَ الموجِبةَ[٢] فيجوزَ التخلّفُ[٣]. فتأملْ!

والحاصلُ:

أنَّ الحاصلَ بالمصدر موقوفٌ عادةً على[٤] المصدر الذي أساسُه المَيَلانُ الذي هو - أو التصرُّفُ فيه - ليس موجوداً حتى يلزمَ[٥] مِن تخصُّصِه مرةً هذا ومرةً ذاك ممكنٌ بلا مؤثِّرٍ، أو ترجُّحٌ بلا مُرجِّحٍ.. ولا معدوماً أيضاً حتى لا يصلُحَ أنْ يكونَ شرطاً لخَلق الحاصل بالمصدر أو سبباً للثواب والعقاب.

* إن قلتَ: العلمُ الأزلي والإرادةُ الأزليةُ ينحَيان على الاختيار بالقَلع[٦]؟

قيل لك:

---

(١) أي تحويل ذلك الميلان من فعل إلى آخر. (ت)

(٢) بحيث لا تبقى الحاجة إلى الإرادة الكلية. (ت). والعلة التامة: هي جملة ما يتوقف عليه وجود الشيء. (التعريفات)

(٣) إذ كثيراً لا يقع الفعل بوقوع الميلان. (ت)

(٤) على عادة الله الجارية. (ت)

(٥) فيحتاج إلى مؤثر. (ت)

(٦) أي يزيلان الاختيار ويقضيان عليه.

"زانین"ی ئەنجامدانی کردارێك، بە ئیختیار(ی بکەرەکەی)، ڕێ لە بوونی ئیختیاری ئەو بکەرە ناگرێت[١]..

هەروەها " زانستی ئەزەلی" گشتگیر و دەورەدەرە، بە وێنەی ئاسمان[٢]، نەك ئەوەی سەرەتای زنجیرەیەك بێت، بە وێنەی سەرەتای زەمانی ڕابوردوو، هەتا بەدیهاتووە "بەهۆکراوەکان"ی بدرێتە پاڵ و خۆ لە "هۆکارەکان" گێل بکرێت و، ئەو گومانە بێتە گۆڕێ کە هۆکارەکان لە گۆڕێدا نەبن..

هەروەها "زانست شوێنکەوتەی زانراو"ە. واتە "زانراو"ەکە لەسەر هەر چۆنێتی‌یەك بێت بەو شێوەیە "زانست" دەوراندەوری دەدات، ئیتر پێوەرەکانی زانراوەکە پشت بە بناغەکانی قەدەر نابەستێت..

هەروەها "ویست" جارێك بە تەنها پەیوەندی ناکات بە "بەهۆکراو"ەکە و جارێکی تریش بە "هۆکار"ەکەوە، هەتا بوترێ هیچ سوودێك لە بوونی "ئیختیار" و "هۆکار"دا نەماوە، نەخێر.. بەڵکو تەنها یەك پەیوەندی دەکات بە "بەهۆکراو" و "هۆکار"ەکەوە پێکەوە..

جا لەسەر بناغەی ئەم نهێنی‌یە:

ئەگەر - بۆ نموونە - کەسێك کەسێکی دیکەی بە تفەنگ کوشت، پاشان گریمانی نەبوونی هۆکار و نەبوونی تەقە لێکردنمان دانا.. ئایا ئەو کەسە لەو ساتە وەختەدا دەمرێت؟ یان نا؟

دەستەی "جەبر" دەڵێن:

ئەگەر نەشکوژرایە هەر دەمرد.. لەبەر جیابوونی پەیوەندی‌یەکان و دابڕانی نێوان "هۆکار" و "بەهۆکراو".

دەستەی "ئیعتیزال"یش دەڵێن:

نەدەمرد.. چونکە بە لایانەوە دروستە "مەبەست" لە "ویست" دوا بکەوێت.

"ئەهلی سوننەت و جەماعەت"یش دەڵێن:

---

(١) چونکە کاریگەر "توانست"ە نەك "زانست" کە شوێنکەوتەی "زانراو"ەکەیە. (ت)

(٢) واتە: دەوراندەوری "هۆکار" و "بەهۆکراو" پێکەوە دەدات.

إنَّ العلمَ بفعلٍ باختيارٍ لا ينافي الاختيارَ[1]..

وأيضاً إنَّ العلمَ الأزليَّ محيطٌ كالسماء[2]، لا مبدأٌ للسلسلة، كرأسِ زمانِ الماضي حتى تسندَ إليه المسبّباتُ متغافلاً عن الأسباب موهماً خروجُها..

وأيضاً إنَّ العلمَ تابعٌ للمعلوم، أي على أيِّ كيفيةٍ يكونُ المعلومُ، كذلك يُحيطُ به العلمُ، فلا يستندُ مقاييسُ المعلوم إلى أساساتِ القدَر..

وأيضاً إنَّ الإرادةَ لا تتعلَّقُ بالمسبَّب فقط مرةً وبالسبب مرةً أخرى حتى لا تبقى فائدةٌ في الاختيار والسبب؛ بل تتعلقُ تعلُّقاً واحداً بالمسبَّب وبسَببه.

وعلى هذا السرِّ:

لو قَتَلَ شخصٌ شخصاً بالبندقة مثلاً، ثم فرضنا عدمَ السبب والرمي، هل يموتُ ذلك الشخصُ في ذلك الآن أم لا؟

فأهلُ الجبرِ يقولون:

لو لم يُقتَلْ لمات أيضاً، لتعدُّدِ التعلّقِ، والانقطاعِ بين السبب والمسبَّب..

وأهلُ الاعتزالِ يقولون:

لم يمتْ، لجواز تخلُّفِ المرادِ عن الإرادة عندهم..

وأما أهلُ السنة والجماعة فيقولون:

---

(١) لأن المؤثر هو القدرة وليس العلم الذي هو تابع للمعلوم. (ت)

(٢) أي يحيط بالأسباب و المسببات معا.

دەوەستین و قسەی تێدا ناکەین.. چونکە گریمانکردنی نەبوونی "هۆکار" ئەو گریمانەش دەخوازێت کە "ویست" و "زانست" پەیوەندییان بە "بەهۆکراو"ەکەوە نەکردبێت، لەبەر ئەوەی هەردوو پەیوەندییەکە هەر یەکێکە.. جا ئەم گریمانە مەحاڵە، دەگونجێ مەحاڵێك بخوازێ!

فەرموو بیری لێ بکەرەوە!

## پێشەکییەکی تر

بزانە کە:

"سروشتییەکان" دەڵێن: هۆکارەکان کاریگەریی ڕاستەقینەیان هەیە..

"مەجووسەکان" دەڵێن: بەدیهێنەرێکی دیکە هەیە بۆ "شەڕ"..

"دەستەی موعتەزیلە"ش لایان وایە: زیندەوەر بەدیهێنەری کردارە ئیختیارییەکانی خۆیەتی.

بناغەی ئەم سیانە لەسەر وەهمێکی بەتاڵ و، هەڵەیەکی پەتی و، سنووربەزاندن و، قیاسێکی بێ جێ داڕێژراوە، کە ئەوانی بە هەڵەدا بردووە و لە ڕاستی دووری خستوونەتەوە، چونکە بە گومانی خۆیان تەنزیهی خواوەند دەکەن، کەچی کەوتنە ناو داوی "شیرك"ەوە!

ئەگەر ویستت درێژەی ئەمە بزانیت، ئەوا گوێ لە چەند مەسەلەیەك ڕابگرە کە ئەو وەهمە بەدەر دەنێن:

یەکێك لەوانە: هەروەك بیستن و گوفتار و تێبینی و بیرکردنەوەی مرۆڤ جوزئییە و، بە نۆرە و یەك لە دوای یەك پەیوەندی بە شتەکانەوە دەکەن، هیممەتەکەشی بە هەمان جۆر "جوزئی"یە و بە نۆرە بە شتەکانەوە سەرقاڵ دەبێت.

یەکێکی تریان: ڕێزی مرۆڤ بە ڕێژەی ماهییەتەکەیەتی.. ماهییەتەکەشی بە پلەی هیممەتەکەیەتی.. هیممەتەکەشی بە ئەندازەی گرنگیی ئەو ئامانجەیە کە سەرقاڵە پێیەوە.

یەکێکی تریان: مرۆڤ ڕوو بکاتە هەر شتێك، تیایدا بەند و فانی دەبێت. هەر لەم حاڵەوەیە کە دەبینیت خەڵك - لە داب و نەریتی خۆیاندا - شتێکی بێ نرخ و کارێکی هەندەکی نادەنە پاڵ کەسێکی گەورە و زاتێکی بڵند، بەڵکو دەیدەنە پاڵ هۆکارەکان،

نتوقفُ ونسكتُ؛ إذ فرضُ عدم السبب يستلزمُ فرضَ عدم تعلُّقِ الإرادة والعلمِ بالمسبَّب أيضاً، إذ التعلقُ واحدٌ. فهذا الفرضُ المحالُ جازَ أن يستلزمَ محالاً.

فتأمل!

* * *

## مقدمة أخرى

اعلم أنَّ الطبيعيين يقولون: إنَّ للأسباب تأثيراً حقيقياً.. والمجوسَ يقولون: إنَّ للشرّ خالقاً آخرَ.. والمعتزلةَ يدَّعون: أنَّ الحيوانَ خالقٌ لأفعاله الاختيارية.

وأُسُسُ هذه الثلاثة مبنيةٌ على وهمٍ باطلٍ، وخطإٍ محضٍ، وتجاوزٍ عن الحدّ وقياسٍ مع الفارق، خدعَهم وثبَّطهم؛ إذ ذهبوا ظناً منهم إلى التنـزيهِ فوقعوا في شَرَكِ الشِرك.

وإنْ شئت التفصيلَ فاستمعْ لمسائلَ تطرُد ذلك الوهمَ:

منها: أنَّه كما أنَّ استماعَ الإنسان وتكلُّمَه وملاحظتَه وتفكُّرَه جزئيةٌ تتعلقُ بشيءٍ فشيءٍ على سبيل التعاقُب؛ كذلك همّتُه جزئيةٌ لا تشتغلُ بالأشياء إلّا على سبيل التناوبِ.

منها: أنَّ قيمةَ الإنسان بنسبةِ ماهيتِه.. وماهيتُه بدرجة همّته.. وهمّتُه بمقدار أهميةِ المقصدِ الذي يشتغلُ به.

منها: أنَّ الإنسانَ إلى أيِّ شيءٍ توجَّهَ يفنى فيه وينحبِسُ عليه. ومن هذه النقطة ترى الناس - في عُرفهم - لا يُسندون شيئاً خسيساً وأمراً جزئياً إلى شخص عظيمٍ وذاتٍ عالٍ؛

گومانیان وایە کە بۆ ویقاری ئەو کەسە ناگونجێت بە کاری نزمەوە سەرقاڵ بیێت و، دانابەزێتە ئەو ئاستە و، شتی بێ نرخ لە هیممەتی مەزنی ئەودا جێی نابێتەوە و، کاری "سووکەڵە" هاوشانی هیممەتە گەورەکەی ئەو نییە!

یەکێکی تریان ئەوەیە کە: حاڵی مرۆڤ وایە کە هەرکات بە مەبەستی داوەری کردن لە بارودۆخەکانی هەرشتێك لەو شتە ورد ببێتەوە، ئەوا یەکەم جار لە خۆیدا، پاشان لە هاوڕەگەزەکانیدا، بە دوای پێوەرەکان و پەیوەندییەکان و بناغەکانی ئەو شتەدا دەگەڕێ کە بیری لێ دەکاتەوە..

خۆ ئەگەر لە خۆی و هاوڕەگەزەکانیدا ئەوانەی دەست نەکەوێ، ئەوا لە مومکیناتی دەوروبەریدا بە دوایاندا دەگەڕێت..

تەنانەت خوای گەورەی "واجب الوجود"یش، کە بە هیچ شێوەیەك لە "مومکینات" ناچێت، کاتێ مرۆڤ بیری لێ دەکاتەوە، هێزی واهیمەکەی ڕاپێچی دەکات کە ئەم وەهمە خراپە ناوبراوە و، ئەم پێوەرە خەڵەتێنەرە بکاتە دەستوور و چاویلکەیەك بۆ خۆی. لە کاتێکدا کە بەدیهێنەری شکۆمەند لەم خاڵەوە سەیر ناکرێت، چونکە توانستی ئەو هیچ شتێك سنوورداری ناکات.

یەکێکی تریان ئەوەیە کە: "توانست" و "زانست" و "ویست"ی خوای گەورە وەکو ڕووناکیی خۆر وان ﴿وَلِلهِ الْمَثَلُ الأَعْلَى﴾ هەموو شتێك دەگرنەوە و، گشتین بۆ هەموو کاروبارێك. کەواتە سنووردار ناکرێن و نارۆنە بەراوردەوە لەگەڵ شتی تردا..

چونکە هەروەك پەیوەندی بە گەورەترین شتی وەك "عەرش"ەوە دەکەن، پەیوەندی بە بچووکترین شتی وەکو "گەوهەری تاقانە"شەوە(گەردیلە) دەکەن..

هەروەها وەك ئەوەی خۆر و مانگی دروست کردووە، چاوەکانی کێچ و مێشوولەشی بەدیهێناوە..

هەروەك سیستەمێکی باڵای لە بوونەوەراندا دامەزراندووە، سیستەمێکی وردیشی لە ڕیخۆڵەی زیندەوەرە میکرۆسکۆبییەکاندا داناوە..

هەروەك تەنە بەرزەکان و ئەستێرە هەڵواسراوەکانی بەو یاسایەی خۆیەوە پەیوەست کردووە کە پێی دەوترێ "کێشی گشتی"، گەردیلەکانیشی بە هاوشێوەی ئەو یاسایە - کە دەڵێی نموونەیەکی بچووکیەتی - ڕێکخستووە..

بل إلى الوسائل ظناً منهم أنَّ الاشتغالَ بالأمر الخسيس لا يناسبُ وقارَه، وهو لا يتنـزَّلُ له ولا يسعُ الأمرُ الحقيرُ همّتَه العظيمة[1]،ولا يوازَنُ الأمرُ الخفيفُ مع همّتَه العظيمة.

ومنها: أنَّ مِن شأن الإنسان - إذا تفكّرَ في شيء لمحاكمةِ أحواله - أنْ يتحرّى مقاييسَه وروابطَه وأساساتِه، أولاً في نفسه، ثم في أبناءِ جنسه..

وإنْ لم يجدْ ففي جوانبه من الممكنات..

حتى إنَّ واجبَ الوجود الذي لا يشبهُ الممكناتِ بوجهٍ من الوجوه إذا تفكّرَ فيه الإنسانُ تُلجِئُه القوةُ الواهمةُ لأنْ يجعلَ هذا الوهمَ السيِّءَ المذكورَ دستوراً، والقياسَ الخادعَ منظاراً له. مع أنَّ الصانعَ جلّ جلالُه لا يُنظَرُ إليه من هذه النقطة؛ إذ لا انحصارَ لقدرتِه.

ومنها: أنَّ قدرتَه وعلمَه وإرادتَه جلّ جلالُه كضياء الشمس - ﴿وَلِلهِ المَثَلُ الأَعْلَى﴾ - شاملةٌ لكلِّ شيءٍ، وعامةٌ لكلِّ أمر. فلا تقعُ في الانحصار ولا تجيءُ في الموازنة.

فكما تتعلقُ بأعظم الأشياءِ كالعرش؛ تتعلقُ بأصغرِها كالجَوهر الفرد..

وكما خلَقَ الشمسَ والقمرَ؛ كذلك خلَقَ عينَي البرغوث والبعوضة..

وكما أودعَ نظاماً عالياً في الكائنات؛ كذلك أوقعَ نظاماً دقيقاً في أمعاء الحيوانات الخُرْدَبِينِيَّة[2]..

وكما ربطَ الأجرامَ العلويةَ والنجومَ المعلَّقةَ بقانونِه المسمّى بالجاذب العمومي؛ كذلك نظّمَ الجواهرَ الفَردةَ بنظير ذلك القانون كأنَّه مثالٌ مصغَّرٌ لها.

---

(١) أي لا يليق بهمته العظيمة الانشغال بالأمر الحقير. (ت)

(٢) أي المجهرية التي لا يمكن رؤيتها بالعين المجردة.

چونکە بە تێهەڵکێش بوونی "دەستەوسانی"، پلەکانی "توانست"یش جیاوازییان دەبێت..

جا کەسێك کە "دەستەوسانی" سەبارەت بەو مەحاڵ بێت، ئەوا هەموو شتێك بۆ "توانست"ی ئەو یەکسان دەبێت، لەبەر ئەوەی "دەستەوسانی" دژ و پێچەوانەی "توانستی خۆیی"یە. دە فەرموو بیری لێ بکەرەوە!

یەکێکی تریان ئەوەیە کە: یەکەم شتێ "توانست" پەیوەندیی پێیەوە دەکات ڕووی "مەلەکووتییەت"ی شتەکانە، کە ئەویش وەك پێشتر باس کرا ڕوویەکی جوان و ڕوونە.

جا هەروەك خوای گەورە ڕووی خۆری کردووە بە شوێنی تیادەرکەوتنی ڕووناکی و، مانگیشی کردووە بە ڕووناکی وەرگر و ڕووناکی دەرەوە، بە هەمان جۆر ڕووی مەلەکووتییەتی "شەو" و "هەور"یشی کردووە بە ڕوویەکی جوان و ڕووناکی بەخش.

یەکێکی تریان ئەوەیە کە: زەینی مرۆڤ جێی پێوەری گەورەیی خوا و تەرازووی کەماڵاتی و هۆکاری داوەری کردنی سیفەتەکانی ئەوی تێدا نابێتەوە، مەگەر لە تەنها ڕوویەکەوە[1] دەنا ئەوەی لە توانادا نییە. بەڵکو ئەوە لە کۆی هەموو بەدیهێنراوانیەوە بەدەست دێت و، لە سەرجەمی ئاسەوارەکانیەوە بە پوختی دەبینرێت.

بەڵێ، "گەردیلە" دەبێتە ئاوێنە، بەڵام نابێتە پێوەر.

جا ئەگەر لەم مەسەلانە تێگەیشتیت، ئەوا بزانە کە:

خوای گەورەی "واجب الوجود" بە پێوەری مومکینات قیاس ناکرێت، چونکە جیاوازییەکە لە ئاسمانەوەیە بۆ ڕێسمان. ئایا نابینی کە "سروشتییەکان" و "دەستەی موعتەزیلە" و "مەجووسەکان" بەهۆی زاڵبوونی هێزی واهیمە بەسەر ژیرییاندا، لە ڕێی ئەم قیاسەوە، چۆن ناچار بوون کاریگەریی ڕاستەقینە بدەنە پاڵ هۆکارەکان و، بەدیهێنانی کردەوەکان بۆ زیندەوەر و، بەدیهێنانی "شەڕ"یش بۆ غەیری خوای گەورە بگێڕنەوە[2]؟! لەو گومانەدان کە خوای گەورە بە مەزنی و خاوێنی و بڵندیی خۆی چۆن دادەبەزێتە ئاستی ئەم چەشنە کاروبار و شتە بێ نرخ و ناشیرینانە!

---

(١) واتە: مرۆڤ ناتوانێت پەی بە هەموو سیفەتە مەزنەکانی ببات، مەگەر بەو ئەندازەیەی کە لە بینینی بەدیهێنراوانیەوە بەدەستی دەهێنێت.

(٢) لەف و نەشری مورەتەبی تێدایە! (م. حسین)

إذ بتداخل العَجز تتفاوتُ مراتبُ القُدرة..

فمَن امتنعَ عليه العجزُ تتساوى في قدرته الأشياءُ، إذ العجزُ ضدُّ القدرةِ الذاتية. فتأمل!

ومنها: أنَّ أولَ ما تتعلقُ به القدرةُ ملكوتيةُ الأشياء، وهي شفّافةٌ حسنةٌ في الكلِّ كما مرَّ..

فكما أنَّه جلَّ جلالُه جعلَ وجهَ الشمس مجلىً ووجهَ القمر مُستضيئاً؛ كذلك صيَّرَ ملكوتيةَ الليل والغيمِ حسنةً مُنيرةً.

ومنها: أنَّ مقياسَ عظمته تعالى وميزانَ كمالاته وواسطةَ محاكمة أوصافِه لا يسعُها ذهنُ البشر، ولا يمكنُ له إلّا بوجهٍ[1]، بل إنما هو بما يتحصّلُ من جميع مصنوعاته.. وبما يتجلّى من مجموع آثاره.. وبما يتلخّصُ من كل أفعاله..

نَعم، الذرةُ تكونُ مرآةً ولا تكون مقياساً.

وإذا تفطنتَ لهذه المسائل، فاعلمْ أنَّ الواجبَ تعالى لا يُقاسُ على الممكنات، إذ الفرقُ من الثرى إلى الثريا..

ألا ترى أهلَ الطبيعة والاعتزالِ والمجوس - بناءً على تسلُّط القوةِ الواهمة بهذا القياس على عقولِهم - كيف التجَأوا إلى إسنادِ التأثير الحقيقيِّ إلى الأسباب، وخلقِ الأفعال للحيوان، وخلقِ الشر لغيره تعالى؟ يظنون ويتوهمون أنَّ اللهَ تعالى بعظمته وكبريائه وتنـزُّهه كيف يتنـزَّلُ لهذه الأمور الخسيسةِ والأشياءِ القبيحة؟

---

(١) أي لا يمكن للإنسان أن يستوعب أوصافه الجليلة إلّا بما يتحصل له من مشاهدة مصنوعاته سبحانه وتعالى.

دەك ئەولاتر بچن! چۆن ژیریی خۆیان كردە دیلی ئەم گومانە لاوازە!

دەسا كاكە! هەندێ جار ئەم وەهمە لە ڕووی "وەسوەسە"وە بەسەر ئیمانداریشدا زاڵ دەبێت. وریابە خۆتی لێ بپارێزە!

* * *

﴿خَتَمَ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَعَلَى سَمْعِهِمْ وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾.

سەبارەت بە شیتەڵكردنی وشەكانی ئەم ئایەتە و هۆنینیشیان، ئەوا بزانە كە:

پەیوەستكردنی ﴿خَتَمَ﴾ بە ﴿لا يُؤْمِنُـونَ﴾ و هـاتنی بە دوای ئـەودا، بـە وێنـەی هـاتنی سزایە بە دوای كردەوەدا. وەك ئەوەی بڵێ: كاتێ كە "جوزئی ئیختیـاری"یـان شێواند و ئیمانیان نەهێنا، بە "مۆركردنی دڵ" و داخستنی، سزا دران.

پاشان وشەی "مۆر - الختم" ئاماژەیە بۆ ئیستیعارەیەكی لێكدراو كە هێمایە بۆ نموونە هێنانەوەیەك گومڕایی ئەوان وێنا دەكات. چونكە واتاكەی ڕێگرییـە لـە ڕۆشتنی حـەق بۆ ناو دڵ. كەواتە گوزارشت كردن بە "مۆرلێـدان" لـێرەدا، "دڵ" بـە وێنـەی خانوویـەك وێنا دەكات كە خوای گەورە بۆ ئەوە بنیاتی نابێت گەنجینەی گەوهەرەكان بێت، پاشـان بە هـەڵبژاردنی خـراپ - لـە لایـەن مرۆڤـەوە - تێكچوویێـت و گـەنی بێـت و، شتەكانی ناوی بووبن بە ژەهر. ئیتر لەبـەر ئـەوە، داخرابێـت و مـۆر كرابێـت، تـاكو هیـچ كەسێك توخنی نەكەوێت.

وشەی ﴿الله﴾یش، ئەوا بزانە كە:

ئاوڕدانەوەیەكی لە كەسی یەكەمەوە بۆ كەسی سێهەم تێدایە[1]. وێـڕای ئـەم سـەرنجی ئاوڕدانەوەیە، گونجاویی وشەی ﴿الله﴾یش لەگەڵ ئەو پیتەی كە لە نییـەتدا پـەیوەندیی بـە ﴿لا يُؤْمِنُونَ﴾وە كردەوە، مەبەستم وشەی "باللّه"یە، ئاماژەی تێدایـە بـۆ وردەكارییـەكی ناسك، كە بریتییە لەوەی: كاتێ "نووری ناسینی خوا" هات، ئەوان دەرگای دڵیان لـێ نەكردەوە، ئەویش بە تووڕەییەوە پشتی لـێ هەڵكردن و دەرگای لـێ داخستن!

سەبارەت بە ﴿عَلَى﴾ش، ئەوا بزانە كە:

(١) واتە لە شێوەی كەسی سێ‌هەمدا دەری بڕیوە. (وەرگێڕ)

فسُحقاً لهم! كيف صيَّروا العقلَ أسيراً لهذا الوهم الواهي هذا؟

يا هذا! هذا الوهمُ قد يتسلَّطُ على المؤمن أيضاً من جهة الوَسوسة. فتجنَّبْ!

***

﴿خَتَمَ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَعَلَى سَمْعِهِمْ وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾.

أما تحليلُ كلمات هذه الآيةِ ونظمُها:

فاعلم أنَّ ربطَ ﴿خَتَمَ﴾ بـ﴿لا يُؤْمِنُونَ﴾ وتعقيبَه به نظيرُ ترتُّبِ العقابِ على العمل. كأنّه يقولُ: لمّا أفسَدوا الجزءَ الاختياريَّ ولم يؤمنوا، عوقبوا بختم القلبِ وسَدِّه.

ثم لفظُ "الختم" يشيرُ إلى استعارة مُرَكَّبةٍ تومئُ إلى أسلوب تمثيلي يرمزُ إلى ضربِ مَثَلٍ يصوِّر ضلالَتهم؛ إذ المعنى فيه منعُ نفوذِ الحقِّ إلى القلب. فالتعبيرُ بالختم يُصوِّرُ القلبَ بيتاً بناه الله تعالى ليكونَ خزينةَ الجواهر، ثم بسوء الاختيارِ فَسدَ وتعفَّنَ وصارَ ما فيه سُموماً فأُغلِقَ وأُمهِرَ ليُجتنَب.

وأما ﴿اللهُ﴾ فاعلم أنَّ فيه التفاتاً من التكلُّم إلى الغَيبة. ومع نكتة الالتفاتِ ففي مناسبة لفظِ ﴿اللهُ﴾ مع متعلَّق ﴿لا يُؤْمِنُونَ﴾ في النية، أعني لفظَ "بالله"، إشارةٌ إلى لطافةٍ، هي أنّه لمّا جاءَ نورُ معرفةِ الله إليهم فلمْ يفتحوا بابَ قلبِهم له، تولّى عنه مُغضِباً وأغلقَ البابَ عليهم.

وأما ﴿عَلَى﴾ فاعلم:

لەسەر بناغەی ئەوەی کە وشەی "خَتَـــم" هەر بۆ خۆی و بێ هیچ هۆکارێکی تر کردارێکی تێپەڕە، ئەوا ئاماژەی تێدایە بۆ ئەوەی کە وشەی ﴿خَتَمَ﴾(مۆری کرد) واتای "وسَم"(نیشانەی کردووە)شی لەگەڵدا تێهەڵکێشە. وەك ئەوەی بڵێ: خوای گەورە ئەو مۆرەی کردووە بە نیشانەیەك لەسەر ئەو دڵانە کە بەهۆیەوە مەلائیکەتەکان دەیانناسنەوە!

هەروەها ﴿عَلَى﴾ هێمایەکیشی بۆ ئەوە تێدایە کە دەرگای لای سەرەوەی دڵە مۆری لێ دراوە، نەك دەرگای خوارەوەی کە دەڕوانێتە دنیا!

﴿قُلُوبِهِمْ﴾ "دڵانیان"ی بەسەر "بیستن" و "بینین"یاندا پێش خست، چونکە "دڵ" شوێنی ئیمانە و، لەبەر ئەوەش کە یەکەم بەڵگەکانی بەدیهێنەر لە ڕاوێژی دڵ لەگەڵ خۆیدا دەردەکەوێت و، دەرەنجامی گەڕانەوەی ویژدانە بۆ لای سروشتی خۆی. چونکە "دڵ" کاتێ دەگەڕێتەوە بۆ لای خۆی، هەست بە کۆڵەوارییەکی هێندە توند دەکات کە بەرەو خالێکی "پشت پێ بەستن" ڕایپێچێت و، پێویستییەکی ئەوەندە زۆریش لە خۆیدا بۆ گەشەپێکردنی ئاواتەکانی دەبینێت کە ناچار دەبێت بۆ خالێکی "یارمەتی لێ وەرگرتن" بگەڕێت. خۆ جگە لە "ئیمان" شتێکی دیکە نییە کە ئەو "پشت پێ بەستن" و "یارمەتی لێ وەرگرتن"ەی تێدا بەدەست بهێنێت..

پاشان مەبەست لە "دڵ" ئەو لایەنە ورد و نیانە پەروەردگارییەیە کە "ویژدان" هەستەکانی دەردەخات و "مێشك"یش هزرەکانی پیشان دەدات، نەك ئەو ئەندامە سنەوبەرییەی جەستەی. کەواتە گوزارشت کردن بە وشەی "دڵ" هێمایەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە: ئەو لایەنە نیانە پەروەردگارییە، بۆ لایەنە مەعنەوییەکانی مرۆڤ بە وێنەی ئەندامە سنەوبەرییەکە وایە بۆ جەستەی..

جا هەروەك ئەو ئەندامەی جەستە مەکینەیەکی زیندەکارە؛ ئاوی ژیان بە هەموو لایەکی جەستە دەگەیەنێت و، گەر دابخرێت و بووەستێت جەستە لەکار دەکەوێت.. ئەو لایەنە نیانەش بە هەمان جۆر، نووری ژیانی ڕاستەقینە بە هەموو لایەنێکی مەعنەوی و حاڵەت و ئاواتە بەرجەستەکانیدا پەخش دەکات و، گەر - خوا نەخواستە - نووری ئیمان نەمێنێت، ئەوا ئەو ماهییەتەی کە زۆرانی پێ دەگرێت لەگەڵ بوونەوەراندا، وەك تارماییەکی خامۆش و بێ جووڵەی لێ دێت و دنیای لێ تاریك دەکات.

سەبارەت بە ﴿وَعَلَى سَمْعِهِمْ﴾یش، ئەوا ﴿عَلَـــى﴾ی دووبارە کردەوە بە مەبەستی ئاماژەدان بەوەی کە هەریەك لەوانە بە سەربەخۆیی جۆرێك بەڵگەیان تێدایە؛ "دڵ"

أنَّ فيه - بناءً على كَوْن الختم متعدّياً بنفسه - إشارةً إلى تضمين ﴿خَتَمَ﴾ "وَسَم"، كأنَّه يقولُ:

جعلَ الله الختمَ وَسْماً وعلامةً على القلب يتوسَّمُه الملائكةُ.

وفي ﴿عَلَى﴾ أيضاً إيماءٌ إلى أنَّ المسدودَ البابُ العُلويُّ من القلب، لا البابُ السفلي الناظرُ إلى الدنيا.

وأما ﴿قُلُوبِهِمْ﴾ قدَّمَه على السمع والبصر لأنَّه هو محلُّ الإيمان.. ولأنَّ أوّلَ دلائلِ الصانع يتجلى من مشاورة القلبِ مع نفسه، ومراجعةِ الوجدان إلى فطرته، لأنَّه إذا راجعَ نفسَه يُحِسُّ بعَجزٍ شديد يُلجئُه إلى نقطةِ استنادٍ، ويرى احتياجاً شديداً لتنمية آمالِه فيضطرُّ إلى نقطةِ استمداد، ولا استنادَ ولا استمدادَ إلّا بالإيمان..

ثم إن المرادَ بالقلب اللطيفةُ الربانيةُ التي مظهرُ حسيّاتِها الوجدانُ، ومَعكَسُ أفكارها الدماغُ، لا الجسمُ الصنوبريُّ. فإذاً في التعبير بالقلب رمزٌ إلى أنَّ اللطيفةَ الربانيةَ لمعنويات الإنسان كالجسم الصنوبري لجسدِه..

فكما أنَّ ذلك الجسمَ ماكينةٌ حياتيةٌ تنشُرُ ماءَ الحياة لأقطار البدن، وإذا انسدَّ وسكَنَ جمَد الجسدُ؛ كذلك تلك اللطيفةُ تنشُر نورَ الحياة الحقيقية لأقطار الهيئةِ المجسَّمةِ من معنوياته وأحواله وآماله. وإذا زال نورُ الإيمان - العياذُ بالله - صارتْ ماهيتُه التي يصارعُ بها الكائناتِ كشَبَحٍ لا حراكَ به وأظلمَ عليه.

وأما ﴿وَعَلَى سَمْعِهِمْ﴾ كرّرَ ﴿عَلَى﴾ للإشارة إلى استقلال كلٍّ بنوعٍ من الدلائل..

تایبەتمەندە بە بەڵگەی "ژیری" و "ویژدان".. "بیستن"یش بە بەڵگەی "نەقلی" و "دەرەکی". هەروەها هێمایەکیشە بۆ ئەوەی مۆری "گوێ" لە جۆری مۆری "دڵ" نییە.

پاشان بەکارهێنانی "بیستن" بە "تاك" و، بەکارهێنانی ئەم لا و ئەولاکەشی، بە شێوەی "کۆ"[1]، پوختەکردنەوە و چەند هێمایەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە:

"بیستن" چاوگە[2]، لەبەر ئەوەی پێڵووی نییە[3].. بۆ ئەوەش کە: "بەگوێدادەر" تاکە و.. "بیستراو"ەکەش بۆ هەموو یەکێکی بیسەران بە هەمان جۆر یەك دانەیە و.. دانە دانەش دەیدات بە گوێیاندا.. ئنجا لەبەر ئەوەش کە هەموو لەو بیستنەدا بەشدارن وەکو ئەوە وایە کە بەهۆی ئەو پەیوەست بوونەوە "بیستن"یان بوویێت بە یەك و.. لەبەر یەکگرتنی ئەو کۆمەڵە و بەرجەستەبوونیان خەیاڵی "بیستن"ی یەك کەسیان بۆ دەکرێت. هەروەها هێمایە بۆ ئەوەی گوێبیستیی یەك دانەیان سەروزیادە و پێویست بە بیستنی هەموویان ناهێڵێتەوە[4]، کەواتە مافی "بیستن" لە ڕەوانبێژیدا بەکارهێنانیەتی بە تاك..

بەڵام لەبەر ئەوەی "دڵان" و "بینینەکان" پەیوەندییەکانیان جۆراوجۆرە و، ڕێگاکانیان جیاوازە و، بەڵگەی هەریەکەیان لەوی تر جیایە و، مامۆستا و فێرکاریان بەش بەش و جۆراوجۆرن، ئەوا "تاك" کەوتە نێوان دوو "کۆ".

هەروەها "بیستن" لە دوای "دڵ" هێنرا، چونکە بیستن باوکی سەرجەم توانا و لێهاتنەکانی دڵە و، لە هەموویان نزیکترە لێیەوە و، هاوشێوەشیەتی لەوەدا کە هەر "شەش لاکان"ی بەلاوە یەکسانە.

سەبارەت بە ﴿وَعَلَى أبصارِهِم غِشاوةٌ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

گۆڕانی شێوازەکە بە هەڵبژاردنی ڕستەی "ئیسمی" ئاماژەی تێدایە بۆ ئەوەی:

ئەو باخانەی "بینایی" کە بەرچنیی بەڵگەکانی "بینین"ی لێ دەکرێن، جێگیر و بەردەوامن. بە پێچەوانەی باخچەکانی "بیستن" و "دڵ" کە هەمیشە نوێ دەبنەوە..

دانەپاڵی "مۆرکردن"یش بۆ لای خوای گەورە، نەك دانەپاڵی "پەردە"(غشاوة) بۆ لای، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە "مۆرکردن" سزای "بەدەستهێنان"ی خۆیانە بۆ

---

(١) واتە: ﴿قُلُوبِهِمْ﴾ و ﴿أَبْصَارِهِمْ﴾. (وەرگێڕ)

(٢) وشەی "السمع" لە بناغەدا "مەصدەر"ە، بۆیە چاودێریی ئەسڵەکەی کراوە و بە "تاك" هێنراوە. (وەرگێڕ)

(٣) واتە: بە وێنەی "چاو" داپۆشەرێکی نییە. (وەرگێڕ)

(٤) پێدەچێ مەبەستی ئەوە بێت کە ئەگەر "قسە" کەوتە زاری دەکەوێتە شارێ! (وەرگێڕ)

فالقلبُ بالدلائل العقليةِ والوجدانية. والسمعُ بالدلائل النقليةِ والخارجية، وللرمزِ إلى أنَّ ختمَ السمعِ ليس من جنس ختمِ القلب..

ثم إنَّ في إفراد السمع مع جمعِ جانبَيه إيجازاً ورموزاً إلى أنَّ السمعَ مصدرٌ، لعدم الجَفن له..

وإلى أنَّ المُسمِعَ فردٌ..

وأنَّ المسموعَ للكلِّ فردٌ..

وأنّه يُسمِعُ فرداً فرداً..

ولاشتراك الكلِّ كأنَّ أسماعَهم بالاتصال صارت فرداً..

ولاتحاد الجماعة وتشخُّصِها يُتَخيَّلُ لها سمعٌ فردٍ..

وإلى إغناءِ سمعِ الفردِ عن استماع الكلِّ، فحقُّ السمع في البلاغة الإفرادُ..

لكنَّ القلوبَ والأبصارَ مختلفةٌ متعلقاتُها، ومتباينةٌ طرقُها، ومتفاوتةٌ دلائلُها، ومعلِّمُها على أنواع، وملقّنُها على أقسام. فلهذا توسَّطَ المُفرَدُ بين الجَمعَين.

وعُقّبَ القلبُ بالسمع لأنَّ السمعَ أبٌ لمَلَكاته، وأقربُ إليه، ونظيرُه في تساوي الجهات الستِّ عنده.

وأما ﴿وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞ﴾ فاعلمْ أنَّ في تغيير الأسلوبِ باختيار الجملةِ الاسميةِ إشارةً إلى أنَّ جِنانَ البصَر التي يُجتَنى منها دلائلُه ثابتةٌ دائمةٌ بخلاف حدائقِ السمع والقلب؛ فإنَّها متجدِّدةٌ..

وفي إسنادِ الختم إلى الله تعالى دون الغشاوةِ إشارةً إلى أنَّ الختمَ جزاءُ كسبِهم، والغشاوة

کارەکانیان و، "پەردە"ش "بەدەستهاتوو"ی خۆیانـە و، هێمایـە بۆ ئەوەش کـە سـەرەتای کاری "بیستن" و "دڵ" ئیختیاری تێدایە و، سەرەتای "بینـین"یـش ناچـاربوونی تێدایـە و، شوێنی ئیختیاریش تەنها "پەردە"ی خۆ نابیناکردنە.

ناونیشـــانی "غِشاوةٌ"یش ئاماژەی تێدایە بۆ ئەوەی کـە "چـاو" یـەك لای هەیە[1]. "نـەکیرە"کردنیشـــی بـۆ نـەزانراوی کـــردنیەتی، واتـــە "خۆنابیناکـــردن" پەردەیـــەکی نەناسراوە و ناتوانرێ خۆپارێزیی لـێ بکرێت..

﴿عَلَی أبصـــارِهِم﴾ی [بەسـەر ﴿غِشـــاوةٌ﴾دا] پێش خسـت تـاکو چاوەکـان بـۆلای چاوانی ئەوان ئاراستە بکات! چونکە "چاو" ئاوێنەی نهێنییەکانی دڵە.

سەبارەت بە ﴿وَلَهُم عَذابٌ عَظيمٌ﴾یش ئەوا بزانە کە: هـەروەك بـە وشـەکانی پێشـوو ئاماژەی بۆ تاڵیی بـەروبوومی ئـەو درەختـە کوفرییـە نـەفرەت لێکـراوە کـرد لـە دنیـادا، بەمەش ئاماژەی بۆ تاڵیی لەو لایەنەی کرد کـە هـەتا ئـەودنیا درێـژ بووەتـەوە، کـە ئـەویش "زەقوومی دۆزەخ"ە.

ڕەوتی شێواز وا دەخوازێت کە لە بریی ئەوە، بیوتایە: "وعليهم عقاب شديد"..

جا لە گۆڕینی "على" بە "لام" و، "عقاب" بە "عذاب" و، "شديد"دا بە "عظيـــم"، لـە کاتێکدا کە هەریەکەیان شایانی ئەوەن بـۆ "نیعمـەت" بـەکار بـهێنرێن، هێمایـە بـۆ جـۆرە پلارێکی سووکایەتی و سەرزەنشت، وەك بڵێی بەوە دەیانلاوێنێتەوە کـە جگـە لـە "سـزا" هیچ سوود و چێژ و نیعمەتێکی مەزنیان نییە، بە وێنەی: "تحيةُ بينهم ضربٌ وجيـــع"[2]. هەروەها بە وێنەی ﴿فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ (آل عمران: ٢١)..

چونکە "لام" بۆ دەرەنجام و سوودی "کار"ە. وەك بڵێی ئەوەیان بـە سـەردا بخوێنێتـەوە کە: "پاداشتی کارەکەتان وەربگرن"!

لە وشەی ﴿عَـــذابٌ﴾یشدا هێمایەکی پەنـهان دانـراوە، کـە ئەوەیـە چێژبردنیـان یـاد دەخاتەوە لـە گوناهەکانی دنیایان. وەك بڵێی ئەمەیان بە سەردا دەخوێنێتەوە کە:

"تاڵیی شیرینییەکەتان بچێژن"!

---

(١) واتە: داپۆشینی "چاو" وەك داپۆشینی هەموو "جەستە" نییە کـە پێویسـت بێـت هـەموو لاکانی بگرێتـەوە، بەڵکو تەنها بە داپۆشینی یەك لا دەبێت کە بەردەمەکەیەتی. (وەرگێڕ)

(٢) واتە: "سڵاوی نێوانیان لێدانێکی ئازاربەخشە"! بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر. (وەرگێڕ)

مكسوبةٌ لهم، ورمزٌ إلى أنَّ في مبدأ السمع والقلب اختياراً، وفي مبدأ البصر اضطراراً، ومحلُّ الاختيار غشاوةُ التعامي.

وفي عنوان الـ"غِشاوة" إشارةٌ إلى أنَّ للعينِ جهةً واحدةً. وتنكيرُها للتنكير، أي التعامي حجابٌ غيرُ معروف حتى يُتَحفَّظَ منه..

قدَّمَ ﴿وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ﴾ ليوجِّهَ العيونَ إلى عيونهم، إذ العينُ مرآةُ سرائر القلب.

وأما ﴿وَلَـهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ فاعلم أنّه كما أشارَ بالكلمات السابقةِ إلى حنظلات تلك الشجرةِ الملعونةِ الكفريةِ في الدنيا؛ كذلك أشارَ بهذه إلى حنظلةِ جانبِها الممتدِّ إلى الآخرة، وهي زقّومُ جهنّم..

ثم إنَّ سجيةَ الأسلوب تقتضي: "وعليهم عقابٌ شديد"..

ففي إبدال "عَلَى" باللام و"العقاب" بالعذاب و"الشديد" بالعظيم، مع أنَّ كُلاً منها يليقُ بالنعمةِ، رمزٌ إلى نوعِ تهكُّمٍ توبيخيٍّ تعريضيّ؛ كأنّه ينعي بهم:

ما منفعتُهم، ولا لذتُهم، ولا نعمتُهم العظيمة إلّا العقابُ؛ نظيرُ:

"تَحِيَّةُ بَيْنِهِمْ ضَرْبٌ وَجِيع"[1]، و ﴿فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ (آل عمران: ٢١).

إذ اللامُ لعاقبة العمل وفائدتِه. فكأنّه يتلو عليهم: "خذوا أُجرةَ عملِكم".

وفي لفظِ الـ﴿عذاب﴾ رمزٌ خفيٌّ إلى أنْ يذكّرَهم استعذابَهم واستلذاذَهم بالمعاصي في الدنيا فكأنّه يقرأُ عليهم:

"ذوقوا مرارةَ حلاوتكم".

---

(١) وخيلٍ قد دَلَفتُ لها بِخيلٍ تحيّةُ بَينِهم ضربٌ وَجيعُ

البيت لعمرو بن معدي كرب الزبيدي شاعر مخضرم ٧٥ ق -٢١هـ / ٥٤٧-٦٤٢م).

لە وشەی ﴿عَظِيمٌ﴾یشدا ئاماژەیەكی نادیار هەیە بۆ ئەوەی حاڵی خاوەن نیعمەتە گەورەكانی بەهەشتیان یاد دەخاتەوە، وەك بڵێی ئەوەیان بە گوێدا دەدات كە:

"بڕوانن چ نیعمەتێكی مەزنتان لە كیسی خۆتان دا و، چۆن كەوتنە ئازارێكی سەختەوە"!

پاشان ﴿عَظِيمٌ﴾ جەخت كردنەوەیە لە تەنوینی ﴿عَذَابٌ﴾!

* ئەگەر وتت:

سەرپێچیی "كوفر" لە زەمانێكی كەمدا بووە، كەچی سزاكەی ناكۆتایە. ئایا چۆن ئەم سزایە لەگەڵ "دادگەری"ی خوای گەورەدا یەكدەگرێتەوە؟

خۆ ئەگەر سەلمێنرا لەگەڵ دادگەریدا یەكبگرێتەوە، ئەی چۆن لەگەڵ "حیكمەتی ئەزەلی"دا دەگونجێ؟

خۆ ئەگەر ئەوەش سەلمێنرا، ئەی چۆن "میهرەبانی"ی پەروەردگار ڕێی پێ دەدات؟!

پێت دەوترێت:

لەگەڵ سەلماندنی ناكۆتایی سزاكەشدا، دڵنیابە كە "كوفر" لە زەمانێكی كۆتادا، بە "شەش ڕوو" تاوانێكی ناكۆتایە:

یەكێكیان ئەوەیە كە: ئەو كەسەی بە "كافری" مردووە، گەر نەمردایە و بمایە، ئەوا بە هەمیشەیی كافر دەبوو، لەبەر تێكچوونی گەوهەری ڕۆحی. جا ئەم دڵە گەنیوە ئامادە بووە بۆ تاوانێكی ناكۆتا.

یەكێكی تریان ئەوەیە كە: هەرچەندە "كوفر" لە زەمانێكی كۆتاپێهاتوودا بووە، بەڵام لە ڕاستیدا تاوانە لە بەرامبەر "ناكۆتا" و، بەدرۆخستنەوەی ناكۆتایە، مەبەستم سەرجەمی بوونەوەرانە كە شایەتی لەسەر "یەكتایی" دەدەن.

یەكێكی تریان ئەوەیە كە: "كوفر" سپڵەیی و پێنەزانییە بۆ چەندین نیعمەتی ناكۆتا.

یەكێكی تریان ئەوەیە كە: "كوفر" تاوانێكە لە بەرامبەر "ناكۆتا"، كە "زات" و "سیفەتەكان"ی خوای گەورەیە.

یەكێكی تریان ئەوەیە كە: "ویژدان"ی مرۆڤ بەپێی نهێنیی فەرموودەی: "لايسعني أرضي ولا سمائي ... إلخ"[1] هەرچەندەش لە ڕواڵەت و جیهانی بینراودا سنووردار و

(١) بەشێكە لە ناوەرۆكی حەدیسێكی قودسی. بۆ تەخریجەكەی بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر. (وەرگێڕ)

وفي لفظِ الـ﴿عظيم﴾ إشارةٌ خفيةٌ إلى تذكيرِهم حالَ صاحبِ النعمةِ العظيمةِ في الجنةِ فكأنّه يلقّنُهم: انظروا إلى ما ضيَّعتم على أنفسكم من النعمة العظيمة، وكيف وقعتُم في الألم الأليم. ثم إنَّ ﴿عَظِيمٌ﴾ تأكيدٌ لتنوينِ ﴿عَذَابٌ﴾.

* إنْ قلتَ: إنَّ معصيةَ الكفر كانتْ في زمانٍ قليل والجزاءُ أبديٌّ غيرُ متناهٍ، فكيف ينطبقُ هذا الجزاءُ على العدالة الإلهية؟ وإنْ سُلِّمَ، فكيف يوافقُ الحكمةَ الأزلية؟ وإنْ سُلِّمَ، فكيف تساعدُه المرحمةُ الربانية؟

قيل لك: مع تسليم عدم تناهي الجزاءِ، إنَّ الكفرَ في زمان متناهٍ جنايةٌ غيرُ متناهية بستٍّ جهات:

منها: أنَّ مَنْ ماتَ على الكفر لو بقِيَ أبداً لكان كافراً أبداً لِفَساد جوهر روحِه، فهذا القلبُ الفاسدُ استعدَّ لجناية غيرِ متناهية.

ومنها: أنَّ الكفرَ وإنْ كان في زمانٍ متناهٍ لكنَّه جنايةٌ على غير المتناهي، وتكذيبٌ لغير المتناهي أعني عمومَ الكائنات التي تشهدُ على الوحدانية.

ومنها: أنَّ الكفرَ كُفرانٌ لنِعَمٍ غيرِ متناهية.

ومنها: أنَّ الكفرَ جنايةٌ في مقابلة الغير المتناهي وهو الذاتُ والصفاتُ الإلهية.

ومنها: أنَّ وجدانَ البشر - بسرِّ حديثِ: "لَا يَسَعُنِي أرْضِي وَلا سَمائِي"[1] - وإنْ كان في

---

(١) الحديث "ما وسعني سمائي ولا أرضي ولكن وسعني قلب عبدي المؤمن". قال ابن حجر الهيتمي في الفتاوى الحديثية: وذكرُ جماعةٍ له من الصوفية لا يريدون حقيقة ظاهره من الاتحاد والحلول لأن كلاً منهما كفر، وصالحو الصوفية أعرف الناس بالله وما يجب له وما يستحيل عليه، وإنما يريدون بذلك أن قلب المؤمن يسع الإيمان بالله ومحبته ومعرفته. اهـ

وانظر: أحمد بن حنبل، الزهد ٨١؛ الغزالي، إحياء علوم الدين ٣/ ١٥؛ الديلمي، المسند ٣/ ١٧٤؛ الزركشي، التذكرة في الأحاديث المشتهرة ١٣٥؛ السخاوي، المقاصد الحسنة ٩٩٠؛ العجلوني، كشف الخفاء ٢/ ٢٥٥.

کۆتا بێت، بەڵام لە ڕاستیدا ڕووی "مەلەکووتییەت"ی ئەو ویژدانە، ڕەگ و ڕیشەیان هەتا ئەبەد بڵاو کردووەتەوە.. کەواتە لەم ڕووەوە بە وێنەی ناکۆتا وایە، خۆ بە "کافربوونی" پیس دەبێت و دەپووکێتەوە.

یەکێکی تریان ئەوەیە کە: "دژ" هەرچەندە پێچەوانەی دژەکەیەتی، بەڵام لە زۆر بڕیاردا لە یەك دەچن. ئەوەتا هەروەك "ئیمان" چێژ و لەزەتی هەمیشەیی بەرهەم دەهێنێت، "کوفر"یش وایە کە ئازاری هەمیشەیی لێ دەکەوێتەوە.

هەرکەسێ ئەم "شەش" لایە تێکەڵ بکات، ئەو دەرەنجامە بەدەست دەهێنێت کە[1]:

سزای ناکۆتا لە ڕاستیدا لە بەرامبەر تاوانێکی ناکۆتایە. خۆ ئەوەش خودی دادگەرییە.

* ئەگەر وتت:

سزای هەمیشەیی لەگەڵ "دادگەری"دا یەکی گرتەوە.. ئەی ئایا ئەو "حیکمەت"ە لە کوێیە کە بێ نیازە لە بوونی ئەو خراپکارییانەی بەرهەمهێنی سزان؟

پێت دەوترێت:

وەك جارێکی تر بیستت، دەست لە خێرێکی زۆر هەڵناگیرێت لەبەر ئاوێتەبوونی شەڕێکی کەم، لەبەر ئەوەی دەست هەڵگرتن لەو خێرە شەڕێکی زۆر لەخۆ دەگرێت..

چونکە کاتێ حیکمەتی خوای گەورە خواستی وابوو ڕاستییە گوێرەییەکان بوونی خۆیان دەربخەن، کە بە چەندین پلەی زۆر لە ڕاستییە ڕاستەقینەکان زۆرترن.. لەم خۆدەرخستنەی ئەوانیش بە بوونی "شەڕ" نەبێت نایەتەدی.. ڕاوەستاندنی "شەڕ"یش لە سنووری خۆیدا و ڕێگری لە پەرەسەندنی تەنها بە "هەڕەشە" دەبێت.. کاریگەریی ڕاستەقینەی "هەڕەشە"ش لە ویژداندا نایەتەدی بە سەلماندنی هەڕەشەکە و هاتنەدیی نەبێت بەهۆی ئازارێکی دەرەکییەوە، چونکە ویژدان وەك "عەقڵ" و "وەهم" ناکەوێتە ژێر کاریگەریی هەڕەشەوە مەگەر دوای ئەوەی لە ڕێی نیشانە جیاجیاکانەوە دڵنیا بێتەوە لە حەقیقەتێکی خاریجی و هەمیشەیی.. ئەوا دوای ترساندنیان لە دنیادا بە ئاگر، بوونی ئەو ئاگرەش بە ڕاستی لەودنیادا عەینی "حیکمەت"ە.

---

(١) دەشتوانرێ دەقەکە بە شێوەیەکی تر بخوێنرێتەوە کە واتاکەی بە کوردی بەم جۆرە دەبێت: (لە تێکەڵکردنی ئەم "شەش" لایە، ئەو دەرەنجامە بەدەست دێت کە). (وەرگێڕ)

الظاهر والملك محصوراً ومتناهياً لكنَّ ملكوتيتَه بالحقيقة نشرتْ ومدّتْ عروقَها إلى الأبد. فهو مِن هذه الجهة كغير المتناهي وبالكفر تلوّثَ واضمحلّ.

ومنها: أنَّ الضدَّ وإن كان معانِداً لضدِّه لكنَّه مماثلٌ له في أكثر الأحكامِ. فكما أنَّ الإيمانَ يُثمِرُ اللذائذَ الأبديةَ، كذلك مِن شأنِ الكفرِ أنْ يتولَّدَ منه الآلامُ الأبدية.

فمَن مزَج هذه الجهات الستَّ يستنتجُ أنَّ الجزاءَ الغير المتناهي إنما هو في مقابلة الجنايةِ الغيرِ المتناهيةِ وما هو إلّا عينُ العدالة.

* إنْ قلت:

طابقَ العدالةَ[1]، لكنْ أين الحكمةُ الغنيةُ عن وجود الشرور المنتجةِ للعذاب؟

قيل لك: - كما قد سمعتَ مرة أخرى - إنَّه لا يُترَكُ الخيرُ الكثيرُ لتخلّلِ الشرِّ القليل، لأنه شرٌّ كثيرٌ..

إذ لمّا اقتضت الحكمةُ الإلهية تظاهُرَ ثبوتِ الحقائق النسبية - التي هي أزيدُ بدرجاتٍ من الحقائق الحقيقية - ولا يمكنُ هذا التظاهرُ إلا بوجود الشرِّ؛ ولا يمكنُ توقيفُ الشرِّ على حدِّه ومنعُ طغيانه إلّا بالترهيب؛ ولا يمكنُ تأثيرُ الترهيب حقيقةً في الوجدان إلّا بتصديق الترهيبِ وتحقيقِه بوجودِ عذابٍ خارجيّ؛ إذ الوجدانُ لا يتأثّرُ حقَّ التأثُّرِ - كالعقل والوَهم - بالترهيب إلّا بعد أن يتحدّسَ بالحقيقة الخارجيةِ الأبدية بتفاريق الأماراتِ..

فمِن عينِ الحكمة بعد التخويف من النار في الدنيا وجودُ النار في الآخرة.

---

(١) أي إن الجزاء الأبدي للكافر طابق العدالة.

* ئەگەر وتت:

وا لەگەڵ "حیكمەت"یشدا یەكی گرتەوە.. ئەی ئایا چ ڕوویەكی "میهرەبانی"ی تێدایە؟

دەڵێم:

سەبارەت بەوان تەنها دوو شت تەسەوور دەكرێت:

"نەبوون" یاخود "بوون لە سزادا"..

خۆ ئەگەر بە وردی لە ویژدان و ناخی خۆتدا بیر بكەیتەوە، دەزانیت كە:

"بوون" - با لە دۆزەخیشدا بێت - میهرەبانی و خێرە لەچاو "نەبوون"دا، چونكە "نەبوون" شەڕێكی تەواوەتی و پەتییە. تەنانەت گەر بیر لە شیتەڵكردنەوەی بكەیتەوە، دەزانیت كە هەموو گرفت و گوناهێك بۆ "نەبوون" دەگەڕێتەوە!

بەڵام "بوون" سەرتاپا خێری پەتییە، دەبا لە دۆزەخدا بێت..

هەروەها سروشتی "گیان" وایە كە ئەگەر بزانێت "ئازاردان" سزایەكە بۆ نەهێشتنی تاوان و سەرپێچییەكەی، بەو سزایە ڕازی ببێت تاكو قورسایی شەرمەزاریی تاوانەكەی لەسەر شان سووك بكات و، دەڵێت: "ئەو سزایە حەقە و، منیش شایستەیم". تەنانەت لەبەر حەزكردنی لە "پیادەبوونی دادگەری" لە ناخیدا چێژی لێ وەردەگرێت!

خۆ گەلێ كەسی بەناموس هەن پێیان خۆشە سزاكەیان هەر لە دنیادا بدرێت، تاكو پەردەی شەرمەزاریی تاوانەكەی لەسەر لابچێت..

هەروەها ڕۆشتنە ناو هەتاهەتایی بەردەوام و، دۆزەخیش خانە و لانەی هەمیشەییان بێت، بەڵام بە تەواوبوونی سزای كردەوەكەیان، بێ ئەوەی شایانی ئەو تەواوبوونەش بن، جۆرە خووپێوەگرتن و ڕاهاتنێكیان لەگەڵیدا بۆ پەیدا دەبێت، وێڕای گەلێ ئاسانكاری، ئەوەش وەك پاداشتێك لەسەر كردارە باشەكانیان، فەرموودەكان ئاماژەیان پێداوە.

ئەمەش میهرەبانییەكە بەرامبەریان، هەرچەندەش شایستەی ئەو میهرەبانییە نین.

* * *

* إنْ قلتَ:

قد وافقَ الحكمةَ، فما جهةُ المرحمة فيه؟

قلتُ:

لا يُتصورُ في حقّهم إلاّ العدمُ أو الوجودُ في العذاب.. والوجودُ - ولو في جهنمَ - مرحمةٌ وخيرٌ بالنسبة إلى العدم إنْ تأملتَ في وجدانك؛ إذ العدمُ شرٌّ محضٌ، حتى إنَّ العدمَ مرجعُ كلِّ المصائب والمعاصي إنْ تفكرتَ في تحليلها..

وأما الوجودُ فخيرٌ محض فليكنْ في جهنم..

وكذا إنَّ مِن شأن فطرةِ الروح - إذا عَلِمَ أنَّ العذابَ جزاءٌ مزيلٌ لجنايته وعصيانِه - أنْ يرضى به لتخفيفِ حمل خجالةِ الجناية، ويقولَ: "هو حقٌّ، وأنا مستحق". بل حباً للعدالة قد يلتذُّ معنىً!

وكم مِن صاحب ناموسٍ في الدنيا يشتاقُ إلى إجراء الحدِّ على نفسه ليزولَ عنه حجابُ خجالةِ الجناية..

وكذا إنَّ الدخولَ وإنْ كان إلى خلودٍ دائم وجهنمُ بيتُهم أبداً، لكنْ بعد مرور جزاءِ العمل دون الاستحقاقِ يحصلُ لهم نوع ألفةٍ وتطبّعٍ مع تخفيفات كثيرة، مكافأةً لأعمالهم الخيرية. أشارت إليها الأحاديث. فهذا مرحمةٌ لهم مع عدم لياقتهم.

***

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِاللهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ﴾ (البقرة: ٨)

ڕووی "هۆنین" لەم ئایەتەدا:

هەروەك لەبەر هاوبەشبوون لە بڕیاردا "تاك بۆ سەر تاك" و، لەبەر یەكبوونیش لە ئەنجامدا "ڕستە بۆ سەر ڕستە" عەتف دەكرێتەوە و پەیوەست دەكرێن.. بە هەمان جۆر، لەبەر هاوڕێژەییش لە ئامانجدا، هەندێ جار "چیرۆك بۆ سەر چیرۆك" عەتف دەكرێتەوە..

جا پەیوەست كردنی چیرۆكی دووڕووەكان بە هی كافرەكان، لەمەی دواییە. واتە عەتف كردنەوە(گێڕانەوە)ی پوختەی دوازدە ئایەتە بۆ سەر دەرەنجامی دوو ئایەت..

چونكە كاتێ سەرەتای ئەم سوورەتەی قورئان بە ستایشی ﴿ذلكَ الْكِتـابُ﴾ دەست پێ كرا، ئەوا بەروبوومەكانی ئەو مەدح و ستایشەی بە دوای خۆیدا هێنا كە مەدحی ئیماندارانە.. ئنجا ئەوەش زەمی دژەكانی ئەوانی (واتە كافرانی) بە دوای خۆیدا هێنا، بەهۆی نهێنیی: "شتەكان بە دژەكانیان دەناسرێنەوە". ئنجا بۆ ئەوەی حیكمەتی ڕێنمایی بە تەواوەتی بێتەدی، وا گونجاو بوو كە باسی دووڕووەكانیش بە دوایاندا بێت، بە مەبەستی تەواوكردنی هەموو بەشەكان.

* ئەگەر وتت:

بۆچی سەبارەت بە كافری پەتی لە كوفردا تەنها لە دوو ئایەتدا بە كورتی دوا، كەچی لەبارەی دووڕووەكانەوە بە دوازدە ئایەت درێژەی بە باسیان دا؟

پێت دەوترێت:

لەبەر چەند سەرنجێك:

یەكێكیان ئەوەیە كە: دوژمن گەر نەناسرێت، زیانی زیاترە.. خۆ ئەگەر پەنهان بێت، چەپەڵتر دەبێت.. گەر درۆزنیش بێت، خراپكارییەكانی زیاتر دەبن.. خۆ ئەگەر لە ناوخۆدا بێت، زیانی گەورەتری لێ دەوەشێتەوە، چونكە دوژمنی ناوخۆیی پتر

## ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ ءامَنَّا بِاللهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ﴾ (البقرة: ٨)

وجهُ النظم:

أنّه كما يُعطَفُ المفردُ على المفردِ للاشتراك في الحُكم، والجملةُ على الجملةِ للاتحاد في المقصِد؛ كذلك قد تُعطَفُ القصةُ على القصة للتناسب في الغَرَض. ومن الأخير عطفُ قصةِ المنافقين على الكافرين. أي عطفُ ملخَّصِ اثنتي عشْرَةَ آيةً على مآل آيتين؛ إذ لما افتُتِحَ التنـزيلُ بثناء ﴿ذَلك الْكِتَابُ﴾ فاستتبعَ ثمراتِ ثنائه من مدح المؤمنين، فاستردفَ ذمَّ أضدادِهم بسرّ "إنما تُعرَفُ الأشياءُ بأضدادها"، ولِتَتمَ حكمةُ الإرشاد... ناسَبَ تعقيبُ المنافقين تكميلاً للأقسام.

* إنْ قلتَ:

لِمَ أوجزَ في حق الكافرين كفراً محضاً بآيتين وأطنبَ في النفاق باثنتي عَشْرَةَ آيةً؟

قيل لك: لنكاتٍ؛

منها: أنَّ العدُوَّ إذا لم يُعْرَفْ كان أضرَّ. وإذا كان مُخَنِّساً[1] كان أخبثَ. وإذا كان كذّاباً كان أشدَّ فساداً. وإذا كان داخلياً كان أعظمَ ضرراً؛ إذ الداخليُّ يفتِّتُ الصلابةَ ويشتِّتُ القوةَ..

(١) الخُنُوس: الانقباضُ والاستخفاء. (لسان العرب)

توندوتۆڵیی ناوخۆ وردوخاش و هێزەکەشی زیاتر پەرت دەکات، بە پێچەوانەی دوژمنی دەرەکی کە دەبێتە هۆی قایمکردنەوە و توندوتۆڵیی پەیوەندیی ناوخۆ.

بەداخەوە! تاوانی "دووڕوویی" لە دژی ئیسلام گەلێ گەورەیە.

ئەم پشێویەی موسڵمانانیش تەنها لەوەوەیە. هەر لەبەر ئەوەشە کە قورئان بە زۆری دەیانزڕێنێت و ئابڕوویان دەبات.

یەکێکی تریان ئەوەیە کە: مرۆڤی دووڕوو لەبەر تێکەڵبوونی بە ئیمانداران، وردە وردە لەگەڵیان دەکرێتەوە و، کەم کەمیش لەگەڵ ئیمان ڕادێت و، ئامادەیی ئەوەی تێدا پەیدا دەبێت کە نەفرین لە حاڵی خۆی بکات، بەهۆی ناشیرین پیشاندانی کردارەکانی و زڕاندنی جموجووڵەکانی، ئیتر وشەی تەوحید لە زمانیەوە بۆ ناو دڵی دەچۆڕێت.

یەکێکی تریان ئەوەیە کە:

کەسی دووڕوو چەند تاوانێکی لە تاوانی کوفر زیاتری هەیە، وەکو گاڵتەپێکردن و، فێڵ و، تەڵەکەبازی و، درۆ و، مەرایی.

یەکێکی تریان ئەوەیە کە: زۆربەی جار کەسی "دووڕوو" لە خاوەن کتێبانی پێشین و لە خەڵکانی جرپن دەبێت. ئیتر کەسێکی فرۆفێڵاوی و پیلانگێڕ و خاوەن زیرەکییەکی شەیتان ئاسای لێ دەردەچێت. کەواتە لە "ڕەوانبێژی"دا ئەوە ڕەسەنترە کە درێژە بە باسیان بدرێت.

سەبارەت بە شیتەڵکردنی وشەکانی ئەم ئایەتەش، ئەوا بزانە کە:

﴿مِنَ النَّــــاسِ﴾ (واتە هەندێ لە مرۆڤەکان) لە ڕوویەکەوە (کە لایەنی ئیعرابە)، خەبەرێکی پێشکەوتووە بۆ ﴿مَنْ﴾ (کە موبتەدایە).

* ئەگەر وتت:

شتێکی بەڵگەنەویستە کە "دووڕوو" مرۆڤ بێت؟

پێت دەوترێت:

گەر هەر بڕیارێك بەڵگەنەویست بێت، ئەوا ئامانجەکەی یەکێك لە "لازم"ەکانی دەبێت. ئەوەش لێرەدا بە سەیروسەمەرە دانانی کارەکەیانە. وەك ئەوەی بڵێت: جێی سەرسووڕمانە کە دووڕووی سووك و ڕسوا مرۆڤ بێت! چونکە مرۆڤ بەدیهاتوویەکی ڕێزدارە و، دانابەزێتە ئەم پلە نزمەی ڕسوایی.

بخلاف الخارجيِّ فإنَّه يتسببُ لتشدُّدُ الصلابة العصبية.

فأسفاً! إنَّ جنايةَ النفاق على الإسلام عظيمةٌ جداً..

وما هذه المُشَوَّشِيَّةَ[1] إلّا منه. ولهذا أكثَرَ القرآنُ من التشنيع عليهم.

ومنها: أنَّ المنافقَ لاختلاطه بالمؤمنين يَستأنسُ شيئاً فشيئاً، ويألَفُ بالإيمان قليلاً قليلاً، ويستعدُّ لأنْ يتنفّرَ عن حال نفسِه بسبب تقبيح أعماله وتشنيع حركاته؛ فتتقطَّرُ كلمةُ التوحيد من لسانه إلى قلبه.

ومنها: أنَّ المنافقَ يزيدُ على الكفر جناياتٍ أُخَر كالاستهزاءِ والخُداع والتدليس والحيلة والكذب والرياء.

منها: أن المنافقَ في الأغلب يكونُ من أهل الكتابِ ومن أهل الجَرْبَزَة الوهمية فيكون حَيّالاً دسّاساً ذا ذكاء شيطانيٍّ، فالإطنابُ في حقّه أعرقُ في البلاغة.

أما تحليلُ كلمات هذه الآيةِ، فاعلم أنَّ ﴿مِنَ النَّاسِ﴾ خبرٌ مقدَّمٌ لـ﴿مَنْ﴾ على وجهٍ.

* إنْ قلتَ:

كَوْنُ المنافق إنساناً بدَهيٌّ...؟

قيل لك:

إذا كان الحكم بدَهياً يكونُ الغرضُ واحداً من لوازمه، وهنا هو التّعجيبُ. كأنّه يقولُ: كَوْنُ المنافق الرذيل إنساناً عجيبٌ؛ إذ الإنسان مكرَّمٌ، ليس من شأنه أنْ يتنـزّلَ إلى هذه الدَرَكةِ من الخِسّة.

---

(١) شوّش الأمر: خلطه، صيّره مضطرباً.

* ئەگەر وتت: بۆچی پێشی خست[1]؟

پێت دەوترێ: دارشتنی "سەرسوورمان" وا دەخوازێت كە لە "سەرەتا"دا بێت، هەروەها بۆ ئەوەش كە روانین بە چری ئاراستەی سیفەتی موبتەداكە بكرێت[2] كە خولگەی مەبەستەكەیە، دەنا گەر پێشی نەخستایە مرۆڤ هەتا هاتنی خەبەرەكە چاوەروانی سیفەتەكەی دەكرد و بەرەو خەبەرەكە دەرۆشت.

پاشان ناونیشانی ﴿النَّاس﴾ چەند تێبینییەكی وردی لێ وەردەگیرێت:

یەكێكیان ئەوەیە كە: بە ناونەهێنانی ئەوان، ناوی نەزراندن. بەڵكو لە ژێر ناونیشانی ﴿النَّاس﴾دا ئەوانی داپۆشی، وەك هێمایەك بۆ ئەوەی كە پۆشینیان و لانەبردنی پەردە لەسەر رووی ناشیرینی ئەوان، گونجاوترە بۆ سیاسەتی پێغەمبەر، دروودی خوای لەسەر بێت. چونكە ئەگەر بە دیاری كردنیان ناوی ئەوانی بزراندایە، ئەوا ئیمانداران دەكەوتنە وەسوەسە و گومانەوە، لەبەر ئەوەی فرۆفێڵی دەروون جێی متمانە نییە، خۆ وەسوەسەش سەری بۆ ترس و، ترسیش بۆ مەرایی و، مەراییش بۆ دووروویی دەكێشێت..

هەروەها گەر بە ناوهێنانیان ئەوانی بزراندایە، دەوترا: پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێت - دوودڵە و، متمانەی بە شوێنكەوتووانی خۆی نییە..

هەروەها گەر هەندێ خراپكاری لە ژێر پەردەدا بمێنێتەوە، وردە وردە بۆ خۆی كپ دەبێت و، خاوەنەكەشی هەوڵ دەدات بیشارێتەوە. بەڵام گەر ئەو پەردەیە لابرێت، ئەوا بەپێی وتەی "إذا لم تَستَحِ فاصنَعْ ماشِئْت"[3] دەیوت: "چی دەبێت با ببێت". ئیتر بێ پەروا خراپكارییەكەی بڵاو دەكردەوە.

یەكێكی تریان ئەوەیە كە: گوزارشت كردن بە ﴿النَّاس﴾ ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە: وێرای ئەو هەموو سیفەتانەی دژی "دووروویی"ن، تەنانەت گشتی ترینی سیفەتەكانیش، واتە "مرۆڤێتی"، بە هەمان جۆر دژیەتی، چونكە "مرۆڤ" رێزدارە و ئەم رسواییەی لێ ناوەشێتەوە!

---

(١) واتە: خەبەری ﴿مِنَ النَّاسِ﴾ی بەسەر ﴿مَنْ﴾ی موبتەدادا پێش خست. (وەرگێر)

(٢) واتە: خەبەرەكەی. (وەرگێر)

(٣) ئەم پەندە لەم فەرموودەیە وەرگیراوە: "إن مما أدركَ الناسُ مِن كلامِ النبوةِ الأُولى: إذا لم تستَحِ فاصنَعْ ما شِئتَ"! بۆ تەخریجەكەی بروانە لاپەرەی بەرامبەر.

* إنْ قلتَ:

لِمَ قدَّمَ؟

قيل لك:

من شأن إنشاءِ التعجّبِ الصدارةُ، وليتمركزَ النظرُ على صفة المبتدأ التي هي مناطُ الغَرض وإلّا لانتظرَ ومرَّ إلى الخبر.

ثم إنَّ عنوانَ ﴿النَّاسِ﴾ يترشحُ منه لطائفُ:

منها: أنَّه لم يفضَحْهم بالتعيين، بل ستَرَهم تحت عنوان ﴿النَّاسِ﴾ إيماءً إلى أنَّ سَترَهم وعدمَ كشف الحجاب عن وجوههم القبيحة أنسبُ بسياسة النبيّ عليه السلام؛ إذ لو فضَحَهم بالتشخيص لتوَسوَسَ المؤمنون؛ إذ لا يُؤْمَنُ من دسائس النفس. والوسوسةُ تنجرُّ إلى الخوف، والخوفُ إلى الرياء، والرياءُ إلى النفاق..

ولأنَّه لو شنَّعَهم بالتعيين لقيل: إنَّ النبيَّ عليه السلام متردِّدٌ لا يثِقُ بأتباعِه..

ولأنَّ بعضاً من الفساد لو بقيَ تحت الحجاب لانطفأ شيئاً فشيئاً واجتَهدَ صاحبُه في إخفائه ولو رُفعَ الحجاب - فبناءً على ما قيل: "إذا لَمْ تَسْتَحِ فَافْعَلْ مَا شِئْتَ"[1] - لَيقولُ: فليكنْ ما كان، ويأخذُ في النشر ولا يبالي.

ومنها: أنَّ التعبيرَ بـ﴿النَّاسِ﴾ يشيرُ إلى أنَّه مع قطع النظر عن سائر الصفات المنافية للنفاق، فأعَمُّ الصفات - أعني "الإنسانيةَ" - أيضاً منافيةٌ له؛ إذ الإنسانُ مكرَّمٌ ليس من شأنه هذه الرَذالةُ.

---

(١) هذا المثل أصله حديث نبوي رواه البخاري عن أبي مسعود عقبة بن عمرو الأنصاري رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: "إن مما أدرك الناسُ من كلام النبوة الأولى :إذا لم تستح فاصنع ما شئت".

یەكێكی تریان ئەوەیە كە: هێمایە بۆ ئەوەی "دووڕوویی" تایبەت نییە بە دەستەیەك یان چینێكی خەڵك، بەڵكو لە "جۆری مرۆڤ"دا هەیە، لە هەر دەستە و تیرەیەك بێت.

یەكێكی تریان: ئاماژە دەكات بۆ ئەوەی كە "دووڕوویی" پایە و ڕێزی هەموو "مرۆڤ"ێك تێك دەدات و دەیشێوێنێت، كەواتە دەبێ ڕقی هەموویان لە دژی بجوولێت و، تێكڕا بۆ دەستنیشان كردنی لێ بڕێن، تاكو ئەو ژەهرە بڵاو نەبێتەوە، بە وێنەی ئەوەی كە بەدڕەفتاریی تاكە كەسێك لە ناو كۆمەڵێكدا زیان بە ئابڕووی هەموویان دەگەیەنێت و تووڕەییان دەورووژێنێت.

سەبارەت بە ﴿مَن يَقُولُ ءامَنَّا﴾ش:

* ئەگەر وتت:

بۆچی ﴿يَقُولُ﴾ی بە تاك و ﴿ءامَنَّا﴾شی بە كۆ بەكار هێنا، لەكاتێكدا كە هەردووكیان بۆ یەك كەسی قسەكەر دەگەڕێنەوە[1]؟

پێت دەوترێت:

ئاماژەیەكی تێدایە بۆ وردەكارییەكی نیان، كە بریتییە لە:

دەرخستنی ئەوەی كەسێك خەڵكانی تری لەگەڵدا بێت و بەناویانەوە بدوێت، تەنیا خۆیەتی كە دەدوێت و قسە دەكات! چونكە ﴿يَقُولُ﴾ لەبەر ئەوەیە كە لە وتندا تەنهایە (یەك كەسە قسە دەكات).. ﴿ءامَنَّا﴾ش لەبەر ئەوەیە كە لە بڕیارەكەدا كەسی تری لەگەڵدایە، بۆیە كۆیە..

پاشان ئەمە (واتە: يَقُولُ ءامَنَّا) باسكردن و گێڕانەوەی داواكەی ئەوانە.

جا شێوە گێڕانەوەی داواكەیان، لە دوو ڕووەوە ئاماژەی تێدایە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو داوایە..

هەروەك خودی قسە گێڕراوەكەش لە دوو لایەنەوە ئاماژەی تێدایە بۆ بەهێزیی بەرپەرچدانەوەكە. چونكە:

ماددەی ﴿يَقُولُ﴾ هێمایە بۆ ئەوەی كە قسەكەیان لە باوەڕ و كردارەوە نییە، بەڵكو بە دەم شتێك "دەڵێن" كە لە دڵیاندا نییە..

---

(١) واتە هەردووكیان بۆ ﴿مَن﴾ دەگەڕێنەوە. (وەرگێڕ)

ومنها: أنّه رمزٌ إلى أنَّ النفاقَ لا يختصُّ بطائفةٍ ولا طبقة، بل يوجَدُ في نوع الإنسان أيةَ طائفةٍ كانت.

ومنها: أنَّه يُلَوِّحُ بأنَّ النفاقَ يُخِلُّ بحيثية كلِّ مَن كان إنساناً، فلابدَّ أنْ يتحرَّكَ غضبُ الكلِّ عليه، ويتوجّهَ الكلُّ إلى تحديده، لئلا ينتشرَ ذلك السُّمُّ؛ كما يُخِلُّ بناموس طائفةٍ ويهيِّجُ غضبَهم شناعةُ فرد منهم.

وأما ﴿مَنْ يَقُولُ ءَامَنَّا﴾..

* إنْ قلتَ:

لِمَ أفردَ ﴿يَقُولُ﴾ وجمعَ ﴿ءَامَنَّا﴾ مع أنَّ المرجعَ واحدٌ؟

قيل لك:

فيه إشارةٌ إلى لطافةٍ ظريفة هي:

إظهارُ أنَّ المتكلمَ مع الغير متكلمٌ وحدَه! فـ﴿يَقُولُ﴾: للتلفظ وحدَه و﴿ءَامَنَّا﴾ لأنّه مع الغير في الحُكم..

ثم إنَّ هذا حكايةٌ عن دعواهم..

ففي صورة الحكاية إشارةٌ إلى ردِّ المَحكيّ بوجهين، كما أنَّ في المَحكيّ إشارةً إلى قوّته بجهتين:

إذ ﴿يَقُولُ﴾ يرمز بمادّته إلى أنَّ قولَهم ليس عن اعتقادٍ وفعلٍ، بل يقولون بأفواههم ما ليس في قلوبهم..

داڕشتنی وشەكەش - لەم شێوەیەدا[1] - هێمایە بۆ ئەوەی كە هۆكاری بەردەوامبوونی بەرگری لەخۆكردنیان و بەردەوامیی داواكەیان مەرایی كردنی خەڵكە، نەك ئەوەی هاندەرێكی ویژدانی بێت لە ناخیاندا.

داڕشتنی داواكەشیان - واتە "ءامَنَّا" - لە شێوەی "ڕابوردوو"دا، هێمایە بۆ ئەوەی كە:

"ئێمەی دەستەی ئەهلی كیتاب پێشتر ئیمانمان هێناوە، ئیتر چۆن ئێستا ئیمان ناهێنین"؟

وشەی ﴿نَا﴾ش هێمایە كە لەلایەن ئەوانەوە بۆ ئەوەی كە:

"ئێمە كۆمەڵە كەسێكی خاوەن دەستە و پێڕەین، وەكو تاكە كەس نیین كە درۆ بكات یان بەدرۆ بخرێتەوە"!

سەبارەت بە ﴿بِاللَّهِ وبِالْيَوْمِ الآخِرِ﴾یش، ئەوا بزانە كە:

قورئان بۆی هەیە خودی ئەو قسەیە وەربگرێت كە دەیگێڕێتەوە.. یاخود بە دەستكارییەوە بیهێنێت و بیگێڕێتەوە، بە ڕەچاوكردنی واتا و دەرەنجامەكەی یان كورتكردنەوەی دەربڕینەكەی..

جا بەپێی یەكەمیان:

ئەوان لەناو پایەكانی ئیماندا یەكەمین و دواهەمینیان باس كرد، بە نیازی پێش چاو خستنی بەهێزەكانیان و، بۆ پیشاندانی نزیكترینیان كە لێیان قبووڵ بكرێت. ئنجا هەرچەندەش ناوی ئەو دوو پایەیەی ئیمانیان لە نزیكی یەكەوە هێناوە، كەچی بە دووپاتكردنەوەی پیتی "ب" ئاماژەیان بۆ زنجیرەی پایەكانی ئیمان كردووە..

بەپێی دووهەمیشیان:

كە ئەوە گوفتاری خوای گەورە خۆی بێت، ئەوا باسكردنی تەنها دوو جەمسەرەكەی ئیمان (واتە باوەڕ بە خوا و ڕۆژی دوایی) ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە تەنانەت بەهێزترینی داواكەشیان هەر بە "ئیمان" دانانرێت، چونكە بە تەواوی و ڕێكوپێكی ئیمانیان بەو دوانە نییە.

---

(١) واتە: لە شێوەی فیعلی موزاریعدا. (وەرگێڕ)

وبصيغتِه يومئُ إلى أنَّ سببَ استمرار مُدافعَتِهم وادعائِهم مُراءاةُ الناسِ لا مُحرِّكٌ وجدانيٌّ..

وفي الدعوى إيماءٌ منهم بصيغة الماضي إلى:

"إنّا معاشرَ أهلِ الكتابِ قد آمنّا قبلُ، فكيف لا نؤمنُ الآن"..

وفي لفظ ﴿نَا﴾ رمزٌ منهم إلى:

"إنّا جماعةٌ متحزّبون لسنا كفردٍ يَكذِبُ أو يُكذَّبُ".

وأما ﴿بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾..

فاعلم: أنَّ للتنـزيل أنْ يأخذَ المَحكيَّ بعينه، أو يتصرَّفَ فيه بأخذ مآلِه، أو تلخيصِ عبارتِه:

فعلى الأوّلِ:

ذكروا الأولَ والآخِرَ من أركان الإيمان إظهاراً للقويِّ، ولِما هو أقربُ لأنْ يُقبَلَ منهم، وأشاروا إلى سلسلة الأركان بتكرار الباء مع القُرب.

وعلى الثاني:

بأنْ يكونَ كلامَه تعالى؛ ففي ذكر القُطبين فقط إشارةٌ إلى أنَّ أقوى ما يدَّعونه أيضاً ليس بإيمان؛ إذ ليس إيمانُهم بهما على وجههما.

وكرّرَ الباءَ للتفاوت؛ إذ الإيمانُ بالله إيمانٌ بوجوده ووَحدته، وباليوم الآخر بحقيّتِه ومجيئِه كما مرّ.

بە مەبەستی لێك جیابوونی ئەو دوو پایەیەی ئیمانیش پیتی "ب"ی دووبارە کردەوە، چونکە "ئیمان بە خوا" باوەڕبوونە بە "بوون" و "تەنیایی" خوای گەورە. "ئیمان بە دوارِۆژ"یش باوەڕبوونە بە "حەقبوونی ڕۆژی دوایی" و "بێگومانیی هاتنی" وەك ئەوەی کە پێشتر باس کرا.

سەبارەت بە ﴿وما هُمْ بِمُؤْمِنِينَ﴾یش:

* ئەگەر وتت:

بۆچی نەیوت: "وما آمنوا" کە پتر لە ﴿ءامَنَّا﴾ دەچێت[1]؟

پێت دەوترێت:

تاکو ئەوە بە وەهمدا نەیەت کە لە شێوەدا ناسازیی تێدا بێت[2]. هەروەها بۆ ئەوەش کە "بەدرۆخستنەوە" نەدرێتە پاڵ خودی ﴿ءامَنَّا﴾ کە ڕواڵەتەکەی "إنشاء"ە[3]و، ئەویش ڕێ لە "بەدرۆخستنەوە"ی دەگرێت، بەڵکو نەفی کردن و بەدرۆخستنەوە بۆ ئەو ڕستە ناوەکی‌یە بگەڕێتەوە کە لە ناوەرۆکی ﴿ءامَنَّا﴾ وەردەگیرێت و بریتی‌یە لە "فنحن مؤمنون" (واتە ئێمە ئیمانداریین)..

هەروەها بۆ ئەوەش کە "ئیسمی" بوونی ڕستەکە بکاتە بەڵگە لەسەر بەردەوامیی نەفی کردنی ئیمان لێیان.

* ئەگەر وتت:

بۆچی – بە بێ ئەوەش – نابێتە بەڵگە لەسەر بەردەوامیی نەفیی ئیمان لەوان، لە کاتێکدا کە "ما آمنوا" – گەر بوترایە – "ما"ی تێدا پێش خراوە؟

---

(١) واتە ئەگەر بیوتایە "وما آمنوا" پتر لە ﴿ءامَنَّا﴾ دەچوو کە هەردووکیان "ڕستەی فیعلی"ن و، فیعلەکەیان مازی‌یە و، فاعیلەکانیشیان جێناوی لکاوە. کەچی لە بری ئەوە ﴿وما هُمْ بِمُؤْمِنِينَ﴾ی فەرموو کە "ڕستەی ئیسمی"یە. (وەرگێڕ)

(٢) واتە لە نێوان ﴿ءامَنَّا﴾ی ئایەتەکە و "وما ءامنوا"ی پرسیارەکەدا.

(٣) گوفتارەکان لە ڕەوانبێژیدا بە دوو جۆری "خەبەر" و "ئینشاء" پۆلێن دەکرێن. سەبارەت بە "خەبەر" ئەوە هەڵدەگرێ کە پێی بوترێ "ڕاستە" یان "درۆیە". کەچی "ئینشاء" ئەوە هەڵناگرێ. واتە ڕاست و درۆی نادرێتە پاڵ. "ئینشاء"یش دوو جۆرە: داخوازی و ناداخوازی. یەکێك لە بەشەکانی ناداخوازی وشە و دەستەواژەکانی "گرێبەست"ن. ئنجا لەبەر ئەوەش "ئیمان" جۆرە گرێبەستێکی پابەندبوونی بەندەیە بە داواکاری‌یەکانی خوای گەورەوە و، ئیمان هێنان "ئینشاء"ی ئەو گرێبەستەیە، ئەوا دانەر وتی: ڕواڵەتی ﴿ءامَنَّا﴾ ئەوە دەردەخات کە "ئینشاء" بێت و ئیتر بەدرۆخستنەوە هەڵنەگرێت. (وەرگێڕ)

وأما ﴿وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ﴾..

* إنْ قلتَ:

لِمَ لَمْ يقلْ: "وما آمنوا" الأشبهَ بـ﴿ءَامَنَّا﴾؟

قيل لك:

لئلّا يُتوهمَ التناقضُ صورةً،[1] ولئلّا يَرجِعَ التكذيبُ إلى نفس ﴿ءَامَنَّا﴾، الظاهرِ إنشائيتُه المانعةُ من التكذيب. بل ليرجِعَ النفيُ والتكذيبُ إلى الجملةِ الضمنيةِ المستفادَةِ من ﴿ءَامَنَّا﴾، وهي "فنحن مؤمنون"..

وأيضاً ليدلَّ باسميّةِ الجملة على دوام نفي الإيمانِ عنهم.

* إنْ قلتَ:

لِمَ لا يدلُّ على نفي الدوام مع أنَّ "ما" مُقدَّمٌ؟

---

(١) أي بين "ءامنا" التي جاءت في الآية، وبين "وما آمنوا" المذكورة في السؤال.

پێت دەوترێت:

"نەفی" لە واتای "پیتی نەفی"یەکە وەردەگیرێت کـە پیتیش لـە خۆیـدا شتێکی چڕ و پڕە.. "بەردەوامی"ش، واتە بەردەوامیی نەبوونی ئیمانیـان، هـی ڕوخسـاری سـوو کەڵەی "ڕستە ئیسمی"یەکەیە، کەواتە نـەفی کردنـی "مـا" پـتر بـۆ بڕیـاری نـەفیی ئیمانـە، نـەك بۆ بەردەوامیی ئەو بڕیارە.

* ئەگەر وتت:

چ وردەکارییەك لە پیتی "بْ"ی سەر خەبەری "ما"کەدا هەیە[1]؟

پێت دەوترێ:

تاکو بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسانە لـە خـودی خۆیـاندا شایستەی ئیمـان نین، هەرچەندەش بە ڕواڵەت ئیمانیان هێنابێت! چونکە جیاوازی هەیە لە نێوان "ما زيدٌ سخياً" (زەید بەخشندە نییە) و "ما زيدٌ بسخيٍّ"دا (زەید بەخشندەیی تێدا نییە)..

یەکەمیان، لەبەر ئـەوەی مرۆڤ ئـارەزووی لـە شتێك نـەبێت نایکـات[2]، واتاکـەی ئەوەیە کە: زەید بە کردەوە بەخشندە نییە، هەرچەندەش شایانی بەخشندەییە و لە جۆری مرۆڤە بەخشندەکانە..

بـەڵام واتـای دووهـەمیان ئەوەیـە کـە: زەیـد کەسـێکی ئـەوتۆ نییـە بەخشـندەیی لـێ بووەشێتەوە و، لـە جـۆری مرۆڤـە بەخشـندەکان نییـە، تەنانـەت گـەر بـە کرداریـش چاکەکار بێت.

* * *

(١) سەرنجێکە لەوپەڕی وردیدا. (دانەر)

(٢) هەڵدەگرێت بەم واتایەش بێت: "لەبەر ئەوەی خودی کەسەکە مەبەست نییە". (وەرگێڕ)

قيل لك:

إنَّ النفيَ معنى الحرف الكثيف، والدوامَ معنى الهيئة الخفيفة، فالنفيُ أغمسُ وأقربُ إلى الحُكم.

* إنْ قلتَ:

ما نكتةُ[1] الباء على خبر "ما"؟

قيل لك:

ليَدلَّ على أنهم ليسوا ذواتاً أهلاً للإيمان وإن آمنوا صورةً، إذ فرقٌ بين "ما زيدٌ سَخِيّاً" و"ما زيدٌ بسَخِيٍّ"..

إذ الأوّلُ - لهوائية الذات - معناه: زيدٌ لا يسخو بالفعل وإنْ كان أهلاً ومِن نوع الكُرَماءِ..

وأما الثاني: فمعناه زيدٌ ليس بذاتٍ قابل للسماحة وليس من نوع الأسخياء وإنْ أحسَنَ بالفعل.

* * *

(١) نكتة في غاية الدقة. (المؤلف)

﴿يُخَادِعُونَ اللهَ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُم وَمَا يَشْعُرُونَ ۞ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمُ اللهُ مَرَضاً وَلَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ (البقرة: ٩-١٠)

بزانە ڕووى "هۆنین" لێرەدا:

ئاماژەى ڕستەكانیەتى بۆ: سەرزەنشت كردنیان لەسەر "دووڕوویى".. پاشان بە سووك پیشاندانى.. پاشان ناشیرین كردنیان.. پاشان هەڕەشەكردن لەسەرى.. پاشان ترساندنیان.. پاشان سەرسووڕمان لێیان.. پاشان ڕوونكردنەوەى مەبەستیان لەو قسەیەدا كە كردیان.. پاشان دەرخستنى هۆى قسەكەیان.. پاشان ڕوونكردنەوەى یەكەم دانەى ئەو چوار تاوانەى كە لە "دووڕوویى"یەوە سەرهەڵدەدەن، كە بریتین لە: فێڵ و، خراپەكارى و، بە گەوج پیشاندانى ئیمانداران و، گاڵتەپێكردنیان.. پاشان پیشاندانى تاوان و فێڵەكانیان لە شێوازى ئیستیعارەیەكى تەمسیلیى وەك ئەمەدا:

مامەڵەى ئەوانى لەگەڵ بڕیارەكانى خواى گەورە و لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و لەگەڵ ئیمانداراندا، كە "دەرخستنى ئیمان" بووە لەبەر چەند ئامانجێكى دنیا و "شاردنەوەى كافرێتى".. هەروەها بەرامبەر بەوە، مامەڵەى خوا و پێغەمبەر ﷺ و ئیماندارانیش لەگەڵ ئەواندا، كە جێبەجێ كردنى ئەحكامى ئیمانداران بووە لەسەریان، وەك داوێك بۆیان..

ئەم دوو مامەڵەیەى لە شێوەى دوو كەسدا وێنا كرد كە فێڵ لە یەكترى بكەن! یاخود لە شێوەى ڕاوچى و ئەو نێچیرەدا كە ڕاوچییەكەى لەخشتە دەبات بە پیشاندانى دەرچوونى لە دەروازەیەكى ئاشكراى كولانەكەیەوە، كەچى لە دەروازەیەكى ترى پەنهانەوە خۆى دەرباز دەكات!

سەبارەت بە هۆنینى ڕستەكانى یەكەم تاوان، هەر لە ﴿يُخَـــادِعُونَ﴾وە هەتا دەگاتە ﴿بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ ئەوا بڕوانەرە ئەو زنجیرە ئەنجامە یەك لە دواى یەكەى كە هەر حەوت ڕستەكە لەخۆیان گرتوون، كە بریتین لە:

﴿يُخَادِعُونَ اللهَ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ * فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمُ اللهُ مَرَضاً وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كانُوا يَكْذِبُون﴾ (البقرة: ٩-١٠)

اعلم أنَّ وجهَ النظم:

إشاراتُ جُمَلها إلى: التوبيخِ على النفاق.. ثم تشنيعُه.. ثم تقبيحُهم.. ثم التهديدُ عليه.. ثم ترهيبُهم.. ثم التعجُّب منهم.. ثم بيانُ مقصدِهم من قولهم المذكور.. ثم بيانُ علّةِ قولهم.. ثم بيانُ أوّلِ الجناياتِ الأربعِ الناشئةِ من النفاق وهي الخِداعُ، والإفسادُ، وتسفيهُ المؤمنين، والاستهزاءُ بهم.. ثم تمثيلُ جناياتِهم وحيَلهم بأسلوبِ استعارةٍ تمثيلية هكذا: بأنْ صوَّرَ معاملتَهم مع أحكامِ الله تعالى ومع النبيِّ عليه السلام والمؤمنين - بإظهارِهم الإيمانَ لأغراضٍ دنيوية مع تبطُّنِ الكُفر - ومعاملةَ الله والنبي والمؤمنين معهم - بإجراءِ أحكام المؤمنين عليهم استدراجاً، مع أنهم أخبثُ الكفَرة عند الله - بصورة خداعِ شخصين، أو الصَّيّادِ مع الصيدِ الذي يُحِسُّ الصيادَ بالخروج عن القاصعاء ثم يَفِرُّ من النافقاء[1].

أما نظمُ جُمَلِ الجنايةِ الأولى من ﴿يُخَادِعُونَ﴾ إلى ﴿بِمَا كانُوا يَكْذِبُون﴾ فانظرْ إلى ما تضمنتْ من النتائجِ المتسلسلةِ المترتبةِ في الجُملِ السبعِ، وهي:

---

(١) كلاهما من جحرة اليربوع، يُظهر الأولى ويخفي الثانية. (ش)

گەمژاندنیان لە داواکردنی شتی مەحالدا..

پاشان گەوجاندنیان بەوەی کە زیان لە خۆیان دەدەن بە نیازی سوود گەیاندن..

پاشان نەفاماندنیان بە جیانەکردنەوەی سوود و زیان..

پاشان ڕسواکردنیان بە دەرخستنی چەپەڵیی سروشتیان و، نەخۆشکەوتنی کانگای تەندروستییان و، مردن(وشکبوون)ی کانیاوی ژیانیان..

پاشان سووکایەتی پێکردنیان بە پەرەسەندنی نەخۆشییەکەیان لە دەمی هەوڵی چارەسەرکردنیدا..

پاشان هەڕەشە لێکردنیان بە ئازارێکی پەتی کە ئازاری ڕووتی لێ دەکەوێتەوە..

پاشان ناوزڕاندنیان لەناو خەڵکدا بە قێزەونترین نیشانە کە "درۆکردن"ە!

سەبارەت بە خشتی و ڕێکیی ئەو حەوت ڕستەیە و، جۆش خواردنی بڕیارەکەش لە نێوانیاندا، ئەوەیە کە تۆ ئەگەر ویستت سەرزەنشت و ئامۆژگاریی کەسێك لەبارەی شتێکەوە بکەیت، ئەوا یەکەم شت پێی دەڵێیت:

کاکە! ئەگەر تۆ کەسێکی ژیریت، بزانە ئەو کارە مەحاڵە..

پاشان ئەگەر خۆتت خۆش دەوێت، ئەوە زیانت پێ دەگەیەنێت..

پاشان ئەگەر خاوەن هەستیت، بۆچی سوود و زیان لە یەك جیا ناکەیتەوە؟..

پاشان ئەگەر خاوەنی ئیختیار نەبیت، خۆ لانی کەم دەبێ پەی بە تێکچوونی سروشتی خۆت ببەیت و، بزانیت دووچاری نەخۆشییەك بوویت کە حەقیقەتت لێ دەشێوێنێت و "شیرین"ت بە "تاڵ" پیشان دەدات..

پاشان ئەگەر بتەوێ بەوە چارەسەری خۆت بکەیت، ئەوا بزانە کە ئەم کارە نەخۆشییەکەت زیاتر دەکات و چاکت ناکاتەوە..

تۆ لەمەدا وەکو ئەو کەسەیت کە خەوی لێ زڕابێت و بە "زۆر لەخۆ کردن" بیەوێت خەوی لێ بکەوێت، ئەوەش نیگەرانییەکی وای بۆ پێکهێنابێت کە تەنانەت وەنەوزیشی لە چاو فڕاندبێت! یان بە وێنەی کەسێك دڵی تووشی خەفەت و پەژارە بووبێت، کەچی خەم بۆ ئەو موسیبەتەی بخوات و، بەوەش یەك گرفتەکەی لە خۆی کردبێت بە دوو!

تحميقُهم بطلب المُحالِ..

ثم تسفيهُهم بإضرار أنفسِهم بنيّةِ المنفعةِ..

ثم تجهيلُهم بعدم التمييزِ بين الضُّرِّ والنفع..

ثم ترذيلُهم بخبث الطينةِ ومرضِ معدنِ الصحةِ وموتِ منبعِ الحياة..

ثم تذليلُهم بتزييدِ المرضِ في طلب الشفاء..

ثم تهديدُهم بألمٍ محضٍ يُولِّدُ ألماً صِرفاً..

ثم تشهيرُهم بين الناس بأقبح العلاماتِ، أعني الكذبَ.

وأما اتّساقُ وانتظامُ تلك الجملِ السبعِ وانصبابُ الحُكم فيما بينها فهو أنّك كما إذا أردْتَ زجْرَ واحد عن شيءٍ ونُصحَه، تقولُ له أوّلاً:

يا هذا! إنْ كان لك عقلٌ فهذا محالٌ..

ثم إنْ كنتَ تحبُّ نفسَك فهذا يضرُّها..

ثم إنْ كان لك حسٌّ فلِمَ لا تُميّزُ بين الضُّر والنفع؟.

ثم إنْ لم يكنْ لك اختيارٌ فلا أقلَّ مِن أنْ تعرِفَ فسادَ سجيَّتِك، وفيها مرضٌ يحرِّفُ الحقيقةَ، ويُريك الحُلوَ مُراً..

ثم إنْ تطلب الشفاءَ فهذا يزيدُ مرضَك ولا يشفي..

مَثلُك كمَثَلِ مَن ابتُلِيَ بداء السَّهَرِ فاجتهدَ في النوم فأَنتجَ له قلَقاً طيَّرَ نعاسَه أيضاً، أو كمَن أُصيبَ قلبُه بداء "المَرَق"[1] فاغتمَّ لوجود المصيبةِ حتى صيَّرَ المصيبةَ مصيبتين..

(١) المرق: كلمة أعجمية تعنى الاهتمام واللهفة والأمل وحب التطلع.

پاشان ئەگەر بە دوای چێژدا دەگەڕێت، ئەوا ئەم کارە ئازارێکی هێندە زۆری تێدایە کە ئێش و ئازارێکی سەخت و تیژتر بە دوای خۆیدا دەهێنێت و، بە وێنەی چێژە هاوشێوەکانی تر نییە کە تامێکی بە ڕووکەش ڕازاوەی لەخۆ گرتبێت..

پاشان ئەگەر بێدار نەبیتەوە و دەستی لێ هەڵنەگریت، ئەوا هێندەت بۆ دەمێنێتەوە کە نیشانەیەکی ناشیرین لەسەر لووتت بدرێت و، لەناو خەڵکدا ناوت ئاشکرا بکرێت، تاکو خراپکارییەکانت تەشەنە نەکات بۆیان.

بە وێنەی ئەمە.. خوای گەورەش بۆ سەرزەنشتی "دووڕووەکان" فەرمووی:

﴿يُخَادِعُونَ اللّهَ﴾ (واتە: فێڵبازی لەگەڵ خوادا دەکەن). لە بریی ئەوەی بفەرموێ: "فێڵبازی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەکەن". ئەوەش بۆ گەمژاندنیانە..

واتە چۆن فێڵ لە پێغەمبەر ﷺ دەکەن لە کاتێکدا کە ئەو ڕاگەیەنەرێکە لە لایەن خوای گەورەوە. کەواتە فێڵەکەیان ئاراستەی خوای گەورەیە و، خوایش فێڵی لێ ناکرێت! داواکردنی شتی مەحاڵیش بێ عەقڵییە. خۆ ئەم بێ عەقڵییەش مایەی سەرسووڕمانە!

پاشان ئەوەی بە دوادا هێنا کە ﴿وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُم﴾! ئەوەش بۆ گەوجاندنیان! واتە: کارەکەتان هیچ سوودێکی تێدا نییە، بەڵکو زیانی لەخۆ گرتووە و، ئەو زیانەش ڕووی لە خۆتانە، وەکو ئەوە وایە کە خۆتان بخەڵەتێنن..

پاشان بۆ مەبەستی نەفاماندنیان ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ی بە دوادا هێنا! واتە: ئەی نەفامینە! ئێوە لە ئاژەڵیش نەفامترتان لێ دەرچووە و، بە وێنەی بەردە بێ گیانەکانتان لێ هاتووە، ئەوەتا هەست بە جیاوازیی نێوان سوود و زیان ناکەن..

پاشان بە مەبەستی ڕسواکردنیان، بە تێکچوونی گەوهەر و ناوەرۆکیان ﴿فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ﴾ی بە دوادا هێنا..

واتە ئەگەر توانای هەڵبژاردنی سوودەکانتان لە نێوان زیانەکاندا نییە، خۆ دەبوو بە لای کەمەوە "نەخۆشی" بە نەخۆشی بزانن! هەروەها سروشتتان شێواوە. "دووڕوویی" و "حەسوودی"ش نەخۆشییەکی ئەوتۆیە لە گیاندا کە "ڕاستی" ئاوەژوو دەکات و دەیشێوێنێت، بە ڕادەیەك کە ئێوە شیرین بە تاڵ و، تاڵ بە شیرین و، ڕەش بە سپی و، سپی بە ڕەش تێدەگەن! کەواتە شوێن دووڕوویی مەکەون.

ثم إنْ تتحرَّ اللذةَ فهذا فيه ألمٌ شديدٌ يُنتِجُ ألماً أشدَّ، ليس كأمثاله التي فيها لذةٌ مزخرَفة..

ثم إنْ لم تنتبهْ ولم تنـزجِرْ لا يبقى إلّا أنْ يُوسَمَ على خُرطومِك بوَسْمٍ قبيحٍ، وتُعلَنَ بين الناس لِمنع سرايةِ فسادِك إلى الناس.

كذلك إنَّ اللهَ تعالى قال لزجر المنافقين:

﴿يُخَادِعُونَ اللهَ﴾ بدَلَ "يخادعون النبيَّ" لتحميقهم، أي كيف يخادعون النبيَّ عليه السلام والنبيُّ مبلِّغٌ عن الله تعالى، فحيلتُهم راجعةٌ إلى الله، والاحتيالُ مع الله تعالى محالٌ، وطلبُ المحالِ حُمقٌ. ومِثلُ هذا الحُمقِ مما يُتعجَّبُ منه.

ثم أتبَعَه ﴿وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنْفُسَهُمْ﴾ لتسفيهِهِم، أي ليس في فعلكم نفعٌ بل فيه ضررٌ، وضررُه يعودُ على أنفسِكم، فكأنّكم تخادعون أنفسَكم..

ثم عقَّبَه ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ لتجهيلهم أي أيّها الجهلاء! قد صرْتُم أضلَّ من الحيوان، كالأحجار الجامدةِ لا تحسُّون بالفرق بين الضُّرِّ والنفع.

ثم أردَفَه ﴿فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ﴾ لترذيلهم بانفساد الجوهرِ، أي إنْ لم يكنْ لكم اختيارٌ فلا أقلَّ مِن أنْ تعرِفوا المرَض مرضاً، وأنَّ سجيّتَكم فسدَتْ. وأنَّ النفاقَ والحسدَ مرضٌ في الروح، من شأنه تحريفُ الحقيقةِ وتغييرُها حتى تظنون الحلوَ مُرّاً والمرَّ حلواً والسوداءَ[1] بيضاءَ والأبيضَ أسودَ فلا تتبعوه.

(١) كما في نسخة (ب)

پاشان بە مەبەستی سووکایەتی پێکردنیان ﴿فَزَادَهُمُ اللهُ مَرَضاً﴾ی لەسەر زیاد کردن! واتە ئەگەر دەتانەوێ بەمە دەرمانێکی ئەو دەردەتان دەست بکەوێت و، لە ڕق و حەسوودی‌یەکەتان دەربازتان بێت، ئەوا بزانن کە ئەمە خۆی لە خۆیدا دەردێکی وەهایە کە نەخۆشی‌یەکەتان لەسەر زیاد دەکات..

ئێوە لەم کارەتاندا وەکو ئەو کەسە وان کە یەکێك دەستی شکاندبێت و، ئنجا بە نیازی تۆڵە لێ سەندنەوەی، بەو دەستە شکاوە لێی دابێتەوە. ئیتر بەو کارەی، شکاوی‌یەکەی دەستی پتر زیادی کردبێت!

پاشان بە مەبەستی هەڕەشە لێکردنیان فەرمووی: ﴿وَلَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾. واتە: ئەگەر بە دوای تام و چێژدا وێڵن، ئەوا بزانن کە ئەم دووڕوویی‌یەتان ئازارێکی خێرای هێندە توندوتیژی لەخۆ گرتووە کە ئازارێکی ئایندە بەرهەم دەهێنێت و، بە وێنەی گوناهەکانی تر نی‌یە کە جۆرە لەزەتێکی نزم و خێرای تێدا بێت..

پاشان بۆ ئەوەی چەپەڵترین و ناشیرینترین نیشانەیان لێ بدات، بە فەرمایشتی: ﴿بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ کۆتایی پێ هێنا. واتە: ئەگەر بێدار نەبنەوە و دەست لە دووڕوویی هەڵنەگرن، ئەوا هێندەتان لە بەردەمدا دەمێنێتەوە کە لەناو خەڵکدا بە "درۆزن" ناوتان لێ بنرێت، کە ئەوەش ڕێ لەوە دەگرێت پشتتان پێ ببەسترێت، تاکو نەخۆشی‌یەکەتان بەرەو کەسی تر نەتەنێتەوە.

* * *

سەبارەت بە هۆی هۆنینی بەشەکانی هەموو یەکێکی ڕستەکانیش، ئەوا:

لە ڕستەی یەکەمدا، واتە ڕستەی: ﴿يُخَادِعُونَ اللهَ وَالَّذِينَ ءامَنُوا﴾ ئەوەیە کە:

گوزارشت کردن لە کارەکەیان بە وشەی "فێڵ" (خِداع) هاوکات لەگەڵ موزاریع بوونی فیعلەکەدا، بە تایبەت لە داڕشتنێکدا کە "هاوبەشی"[1] بگەیەنێت، نەخوازەڵا لە دانانی وشەی ﴿اللهَ﴾ لە بریی "النبي" و، ﴿الَّذِينَ ءامَنُوا﴾ لە بریی "المؤمنـــين"دا، دەبێتە دەقێکی ڕاشکاو لەسەر مەحاڵیی ئامانجەکەیان لەو فێڵەیاندا و، خستنە پێش چاوی ئەو مەحاڵی‌یەشە لە شێوەیەکدا کە دەروونەکان لێی بسڵەمێنەوە و دوورەپەرێزیی لێ بکەن. چونکە ئیستیعارەیەکی تەمسیلیی ئەوتۆ لە "فێڵکاری"یەکەدا هەیە کە هەستی نەفرین بێدار بکاتەوە.

(١) واتە: "يخادعون" لە بابی (موفاعەلە)یە کە بۆ "هاوبەشبوون"ە لە فیعلەکەدا. (وەرگێڕ)

ثم زادَ ﴿فَزَادَهُمُ اللهُ مَرَضاً﴾ لتذليلهم، أي إنْ كنتم تطلبون بهذا الدواءَ والتشفّيَ من غيظكم وحسَدكم فهذا داءٌ لا يزيدُكم إلّا مرضاً على مرض..

فأنتم كمَن كَسرَ أحدٌ يدَه فأرادَ الانتقامَ فضرَبَه بتلك اليدِ المكسورةِ فازدادَ كسراً على كسرٍ!

ثم قال: ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ لتهديدهم، أي إنْ تتحرَّوْا اللذةَ فما نفاقُكم هذا إلّا فيه ألمٌ شديدٌ عاجلٌ يُنتجُ ألماً أشدَّ آجلاً، ليس كسائر المعاصي التي فيها نوعٌ من اللذة السُّفليةِ العاجلة.

ثم أتمّه بقول: ﴿بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ لِتَوسيمهم بأشنع الوَسْم، أي إنْ لم تتنبهوا ولم تنتهوا لم يبقَ إلّا أن تُشَهَّروا بين الناس بالكذبِ المانعِ للاعتماد لئلّا يتعدى مرضُكم.

***

أما وجهُ النَّظْم بين أجزاء كلِّ جملة:

ففي الأولى: أعني جملةَ ﴿يُخَادِعُونَ اللهَ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ هو أنَّ في التعبير عن عملهم بالخِداع مع المُضارِعيّةِ، لاسيما مِن باب المشارَكة، خصوصاً مع إقامة لفظة ﴿اللهَ﴾ مقامَ النبيِّ وإقامةَ ﴿الَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ مقامَ "المؤمنين" تنصيصاً وتصريحاً بمُحاليّةِ غَرَضِهم من حيلتِهم، وجعلِ المُحالية نصبَ العين بصورة تتنفّرُ عنها النفوسُ وترتعدُ، إذ فيها في الخِداع من الاستعارة التمثيلية ما يوقِظُ النفرةَ..

هەروەها موزاریع بوونی فیعلەکەش، وێناکردن و "بەردەوامی"یـەکی لەوتۆی تێدایـە کە دڵی مرۆڤ بێزی لـێ بکاتەوە.

ئنجا "هاوبەشێتی"یەکەش، جۆرێك لە "هاوشێوەیەتی" (موشاکەلە) لەخۆ دەگرێـت، بە وێنەی: ﴿وَجَزاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُها﴾ (البقرة: ٤٠) کـە ئـەوەش بـێ دەرەنجامیی فێڵەکـەیان بەرهـەم دەهێنێـت. چونکـە لـە بـابی "موشـارەکە"(هاوبەشـێتی)[1]دا کـرداری بکەر(فاعیل)ەکە هۆیە بۆ کرداری مەفعوولەکەش. کەچی لێرەدا کـرداری مەفعوولـەکە بووەتە هۆی بێ ئەنجامی و کاریگەر نەبوونی فێڵی بکەرەکە. تەنانەت "فێڵ"ەکە خراوەتـە شێوەیەکی لاوازی چەشنی "هەڵگەڕانەوەی مەبەست". وەك ئەوەی کە ئەگـەر گاڵتـەت بە کەسێك کرد لەبەر "نەزانی"یەکەی، کەچی ئەو "زانا" بێت و بە نیازی گاڵتەکردن بـە تۆ زانستەکەی خۆی لە تۆ شاردبێتەوە!

هـەروەها هێنـانی وشـەی ڕاشـکاوی ﴿اللهُ﴾ دەقێکـی وەهایـە لەسـەر مـەحاڵیی ئامانجەکەیان کە ژیریی مرۆڤ بە لای "فێڵ"دا نەبات، چونکە فێڵکـردن لـە پێغەمبـەر ﷺ لە دەرەنجامدا دەبێتە فێڵکردن لە خوای گەورە.

دانـانی صیلـەی مـەوصوولیش (واتـە: ءامنوا) لـە ﴿الَّذِينَ ءامَنُوا﴾دا بـە خـولگـەی مەبەستەکە، ئاماژەیەکـە بـۆ ئـەوەی کـە "دووڕووەکـان" بـە سیفەتی "ئیمـان" خۆیـان لـە "ئیمانداران" نزیك دەخەنەوە و، دەماری "ئیمان"یان دەبزوێنن، تاکو خۆیـان لای ئـەوان خۆشەویست بکەن و لەو ڕێیەوە خۆیان بخزێننە ناویانەوە. هـەروەك هێمایەکیشـی تێدایـە بۆ ئەوەی کە ئەو کۆمەڵە ئیماندارەی ژیرییان بە نووری ئیمان ڕووناك بوویێتەوە، فێڵیـان بەسەردا تێناپەڕێت. دیارە ئەوەش "بێ دەرەنجامیی" فێڵەکەیان دەگەیەنێت.

هـۆی هۆنینی بەشـەکانی ڕستەی دووهـەمیش، واتـە: ﴿وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُمْ﴾ ئەمەیە کە:

ئەم تایبەتکردنە ئاماژەیەکی تێدایـە بـۆ ئەوپـەڕی "نـەفامی"یـان، بـەوەی کـە مامەڵـەی پێچەوانەیان لەگەڵدا کراوە، بە وێنـەی کەسێك بـەردێك بگرێتـە دیوارێـك، بەردەکـەش

---

(١) واتە: ئەو فیعلانەی کە واتای "هاوبەشێتی" دەگەیەنن، کە لێرەدا بریتییە لە فیعلی "يخادعون" کە لـە بـابی (موفاعەلە)یە و بۆ "موشارەکە"یە. (وەرگێڕ)

وفيها في المضارعيةِ من التصوير مع الاستمرارِ ما يَشْمَئِزُّ منه القلبُ..

وفيها في المشاركة من المشاكلة نظِيرَ: ﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا﴾ (الشورى: ٤٠) ما يُنتِجُ عدمَ إنتاجِ حيلتِهم؛ إذ في باب المشاركةِ فعلُ الفاعل سببٌ لفعل المفعول، وهنا فعلُ المفعول صار سبباً لعُقم خِداعِ الفاعل وعدمِ تأثيره، بل جُعل الخداعُ صورةً واهيةً كانعكاس المقصدِ؛ فيما إذا استَهزيتَ بأحدٍ لجهلِه، مع أنّه مستبطِنٌ علماً ومُستَخفٍ استهزاءً بك..

وفيها في التصريح بلفظة ﴿اللهَ﴾ من التنصيص على مُحالية الغرض - إذ خداعُ النبيِّ عليه السلام ينجرُّ إليه تعالى - ما يُثَبِّطُ العقلَ عن الحيلةِ..

وما في ﴿الَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ من جَعْلِ الصلةِ مداراً، إشارةٌ إلى أنَّ المنافقين يتحبَّبون إليهم بصفةِ الإيمان ويهيِّجون عِرق إيمانهم للتحبُّب والتداخُل فيهم..

وفيه إيماءٌ أيضاً إلى أنَّ جماعةَ المؤمنين المنوَّرين عقولُهم بنور الإيمان لا تتسَتَّرُ عنهم الحيلةُ. فيُنتِجُ أيضاً عُقمَ حيلتِهم..

وفي الثانية: أعني جملةَ ﴿وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُمْ﴾ هو:

أنَّ في هذا الحصر إشارةً إلى كمالِ سفاهتِهم بعكس العملِ في معاملتهم كمَن رمى حجراً

بگەڕێتەوە سەری خۆی بشكێنێت! چونكە بە نیازی زیاندان لە ئیمانداران تیریان هاویشت، كەچی بەر خۆیان كەوت. وەك بڵێی ڕاستەوخۆ خودی خۆیان بخەڵەتێنن.

گۆڕینی "یضرون"ش (واتە: زیاندەگەیەنن) بە ﴿یَخْدَعُونَ﴾ ئاماژەیەكی بۆ ئەوپەڕی نەفامیی ئەوان تێدایە، چونكە گریمانی ئەوە هەیە كە لەناو خەڵكانی خاوەن "ژیری"دا كەسێك هەبێت بە ئەنقەست "زیان" لە خۆی بدات، بەڵام هیچ كەسێكی ژیر نییەكە بە ئەنقەست خۆی بخەڵەتێنێت، مەگەر گوێدرێژێك بێت لە شێوەی مرۆڤدا!

ناونیشانی: ﴿أَنفُسَهُم﴾یش هێمایەكی پەنهانی تێدایە بۆ ئەوەی كە مادەم "دووڕوویی" و "فێڵ"ەكەیان لەبەر ئامانجێكی "دەروونی" بووە، ئەوا پێچەوانەی خواستەكەی خۆیانی لێ كەوتەوە.

* ئەگەر وتت:

ئەم تایبەتكردنە هێمایە بۆ ئەوەی كە فێڵەكەیان زیانی لە ئیسلام و موسڵمانان نەداوە.. كەچی ئیسلام لە هیچ شتێكی تر زیانی ئەوتۆی نەبینیوە بە وێنەی ئەو زیانەی كە لە جۆر و لقەكانی "دووڕوویی"یەوە بینیویەتی، كە بە وێنەی ژەهر لەناو توخمەكانی جیهانی ئیسلامیدا بڵاو بووەتەوە.

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

ئەو زیانە دەستدرێژیكار و ژەهرە بڵاوەی كە تۆ دەیبینیت تەنها هی سروشتە تێكچووەكەیان و، فیترەتە گەنیوەكەیان و، ناخە بۆگەنەكەیانە كە بە وێنەی پەرەسەندنی نەخۆشی وایە، نەك هی ئەو فڕوفێڵەیان كە بە ئیختیاری خۆیان ئەنجامی دەدەن! چونكە ئەوان دەیانەوێت خوای گەورە و پێغەمبەر ﷺ و كۆمەڵی ئیمانداران بخەڵەتێنن. خۆ ئاشكرایە كە خوای گەورە بە هەموو شتێك زانایە و، پێغەمبەریش ﷺ "وەحی"ی بۆ دێت و، كۆمەڵی ئیماندارانیش "فێڵ" ناتوانێت هەتا ماوەیەكی درێژخایەن خۆی لەوان بشارێتەوە، كەواتە ئەوانیش ناخەڵەتێن.

بەمەش سەلما كە "دووڕووەكان" تەنها خۆیان دەخەڵەتێنن.

ڕستەی سێهەمیش ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ (واتە: هەست ناكەن) ئەوەی تێدایە كە:

ئەم پوختە ئاماژەیە بە نەزان دانانی ئەوانی لەخۆ گرتووە، بەڵام چۆن نەزانكردنێك! چونكە ئەو هەستەت دەداتێ كە ئەگەر ئەو دووڕووانە ژیر بن، ئەوا ئەم كارە هی ژیری

إلى جدارٍ فانثنى لكسرِ رأسِه؛ إذ رشُّوا النبالَ لضرر المؤمنين فأُصيبَتْ أنفسُهم، فكأنهم يخادعون بالذات ذواتِهم..

وفي تبديل "يضرون" بـ﴿يَخْدَعُونَ﴾ إشارةٌ إلى نهاية سفاهتِهم، إذ يوجَدُ في أهل العقل مَن يضرُّ نفسَه قصداً ولا يوجَدُ من يخادعُ نفسَه عمداً إلّا أنْ يكونَ حماراً في صورة إنسان!

وفي عنوان ﴿أَنفُسَهُمْ﴾ رمزٌ خفيٌّ إلى أنَّ نفاقَهم وحيلتَهم لَمّا كان لحظٍّ نفسانيّ وغَرَض نفسيّ أنتجَ نقيضَ مطلوبِهم لنفسهم.

* إنْ قلتَ:

هذا الحصرُ يومئُ إلى أنَّ خِداعَهم ما ضرَّ الإسلامَ والمسلمين، مع أنَّ الإسلامَ ما رأى من شيءٍ ضرراً مثلَ ما رأى من أنواع النفاقِ وشُعُباتِه المنتشرة كالسُّم في عناصر العالمِ الإسلاميّ؟

قيل لك:

وما تراه من الضرر المتعدي والسُّمّ الساري إنما هو من طبيعتهم المتفسِّدةِ وفطرتِهم المتفسّخةِ ووجدانِهم المتعفنِ نظيرَ سرايةِ المَرَض؛ وليس نتيجةَ حيلتِهم وخداعِهم باختيارِهم إذ يريدون خِداعَ الله والنبيِّ وجماعةِ المؤمنين، واللهُ عالمٌ بكل شيءٍ، والنبيُّ عليه السلام يوحَى اليه، وجماعةُ المؤمنين لا تستطيعُ الحيلةُ أنْ تتستَّر عنهم مدةً مديدة فهم لا ينخدعون. فثبَتَ أنهم لا يخدعون إلّا أنفسَهم فقط.

وفي الثالثة: أعني جملةَ ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ أي لا يحسُّون، هو:

أنَّ في هذه الفذلكةِ تجهيلاً أيَّ تجهيلٍ لهم، لأنها تُشعِرُ بأنهم إنْ كانوا عقلاءَ فهذا ليس من

نی‌یه.. خۆ ئەگەر ئاژەڵیش بن و بە مەیل و ئارەزووی دەروون بجوولێن، ئەوا دەبوو هەست بەم چەشنە زیانە "هەست پێ کراوە" بکەن!

بەمەش سەلما کە ئەو دوورووانە وەکو بێ گیانەکانیان لێ هاتووە؛ خاوەنی ئیختیاری خۆیان نین!

هێنانی ڕستەی چوارەمیش، واتە: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ ئەوە دەگەیەنێت کە:

کاتێ "دووڕووەکان" بە پێی خواستی داوەریی ژیری و زانینی هەستی مرۆڤانە ڕەفتاریان نەکرد، ئەوا دەرکەوت کە نەخۆشی‌یەك لە ڕۆحیاندا هەیە. کەواتە لانی کەم دەبێ پێی بزانن کە ئەوە نەخۆشی‌یە، تاکو لە کێشەکاندا دوورەپەرێزی بکەن و بڕیاریان لەسەر نەدەن. چونکە نەخۆشی - وەك پێشتر باس کرا - "ڕاستی" ئاوەژوو دەکات و، شتی ڕازاوەش ناشیرین پیشان دەدات و، تاڵیش بە شیرین دەردەخات.

وشەی ﴿فِي﴾ ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە ئێرەیی و ڕقی ئەوان "نەخۆشی"یەکە لە دیوی پەنهانی دڵدا، ئەو دڵەی کە وەك باسی ڕابورد لایەنێکی نیانە لە مرۆڤدا.

ناونیشانی "القلب" ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە:

هەروەك "جەستە"ی دڵ ئەگەر نەخۆش بکەوێت ئەوا هەموو کردارەکانی لەش تێکدەچێت، بە هەمان جۆر ئەگەر بە فێڵ و دووڕوویی "واتا" و ناوەڕۆکی دڵیش نەخۆش بکەوێت ئەوا هەموو کردارەکانی "ڕۆح" لە ڕێبازی "ڕاستڕەوی" دەترازێت و لادەدات، چونکە دڵ سەرچاوە و مەکینەی ژیانە.

پێشخستنی ﴿فِي قُلُوبِهِم﴾یش بەسەر ﴿مَّرَضٌ﴾دا، لە دوو ڕووەوە ئاماژەی بۆ "تایبەتکردن" تێدایە. هێماکەش لە ڕێی پلارەوە ئاماژەیەکی بۆ ئەوە تێدایە کە "ئیمان" نوورێکە دەتوانێت "تەندروستی" و "ڕاستڕەوی" بە هەموو کردار و ئاسەوارێکی مرۆڤ ببەخشێت.. هەروەها هێمای تایبەتکردنەکەش هێمای ئەوەی تێدایە کە "تێکچوون"ەکە لە بناغەدایە، کەواتە نۆژەنکردنەوەی لق و پەلەکان هیچ سوودێکی نابێت.

وشەی "مَرَضٌ"یش هێمایەکە بۆ بیانووبڕینی ئەوان و، بەردێکیان (بەم واتایە) دەرخوارد دەدات کە: فیترەتی مرۆڤ بۆ "حەقیقەت" ئامادە کراوە. کەواتە تێکچوون و خراپبوونی تەنها لەبەر "نەخۆشی‌یەکی لاوەکی"یە.

شأن العقلِ، وإنْ كانوا حيواناتٍ يتحركون بمَيل نفسانيّ فشأنُهم أنْ يحسُّوا ويشعروا بمثل هذا الضررِ المحسوس..

فثبَتَ أنهم صاروا مثلَ جمادات لا اختيارَ لها.

وفي الرابعةِ: أعني جملةَ ﴿فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ﴾ هو:

أنَّ سَوْقَها يفيدُ أنَّهم لمّا لَم يعملوا بمقتضى المحاكمةِ العقليةِ والشعورِ الحسيّ ظهرَ أنَّ في روحهم مرضاً فلا أقلَّ مِن أنْ يعرِفوا أنَّه مَرَضٌ ليجتنبوا عن القضايا ولا يحكموا عليها؛ إذ مِنْ شأنِ المَرَضِ تغييرُ الحقيقةِ وتشويهُ المزيَّنِ وتحليةُ المُرّ كما مرَّ..

وفي لفظ ﴿فِي﴾ رمزٌ إلى أنَّ حسدَهم وحقدَهم مرَضٌ في ملكوت القلبِ وهي اللطيفةُ التي مرَّ ذكرُها..

وفي عنوان "القلبِ" إشارةٌ إلى أنّه كما أنَّ جسمَ القلب إذا مرضَ اختلَّ جميعُ أفعالِ البدن؛ كذلك إذا مرضَ معنى القلبِ بالخداعِ والنفاقِ انحرفَ كلُّ أفعالِ الروحِ عن منهجِ الاستقامةِ إذ هو منبعُ الحياة ومَاكِنتُها..

وفي تقديمِ ﴿فِي قُلُوبِهِمْ﴾ على ﴿مَرَضٌ﴾ إيماءٌ إلى الحصر بجهتين، ومِن الإيماءِ إشارةٌ بطريق التعريضِ إلى أنَّ الإيمانَ نورٌ، شأنه أنْ يُعطِيَ لجميع أفعالِ الإنسانِ وآثارِه صحةً واستقامةً..

وأيضاً في إيماءِ الحصرِ رمزٌ إلى أنَّ الفسادَ في الأساسِ فلا يجدي تعميرُ الفروعات.

وفي لفظ "المرض" رمزٌ إلى قطع عذرِهم وإلقامِهم الحَجَرَ بأنَّ الفطرةَ مُهيَّأةٌ للحقيقة. وما الفسادُ والخرابُ إلّا مرضٌ عارض..

تەنوینی تەنکیریش [واتە لە: ﴿مَـــرَضٌ﴾دا]، ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە ئەو نەخۆشی‌یە لە شوێنێکی هێندە قووڵدا حەشار دراوە کە نابینرێت هەتا چارەسەر بکرێت!

ڕستەی پێنجەمیش، واتە: ﴿فَزَادَهُمُ اللهُ مَرَضاً﴾ ئەوەی تێدایە کە:

ئەو دووڕووانە، لەبەر ئەوەی نەیانزانی دووڕوویەکەیان "نەخۆشی"یە هەتا دوورەپەرێزیی لێ بکەن، بەڵکو لەبەر ئەوەی بە شتێکی باشیان زانی، ئەوا بە خواستی خۆیان داوایان کرد. خوای گەورەش نەخۆشی‌یەکەی لەسەر زیاد کردن، چونکە "مَــن طَلَبَ وَجَدَ"! (هەرکەسێك خوازیاری هەر شتێك بێت، لە ئەنجامدا دەیدۆزێتەوە و بەدەستی دەهێنێت).

پیتی "ف"یش کە بۆ "بەدواداهاتن"ێکە "هۆکار"ی لەخۆ گرتبێت - لە کاتێکدا کە "بوون"ی نەخۆشی هۆکارێك نی‌یە بۆ "زیادبوون"ی - هێمایەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە مادەم بە نەخۆشی‌یەکەیان نەزانی، ئەوا بە دوای هۆکاری "شیفا"کەشیدا نەگەڕان، بەڵکو دەستیان لە داوێنی هۆکارەکانی زیادبوونی ئەو نەخۆشی‌یە گیر کرد و، بە وێنەی کەسێك بە دەستە شکاوەکەی لە ڕکابەرە زاڵەکەی بدات، ئەوانیش وەك بڵێی داوای زیادبوونیان کردبێت، بۆیە خوای گەورە نەخۆشی‌یەکەی بەوە لەسەر زیادکردن کە "هیوا"ی ئەوانی هەڵگێڕایەوە بە "نائومێدی‌یەکی بێزارکەر" و، "ڕکابەری"یەکەشی بۆ هەڵگێڕانەوە بە " ڕقێکی سووتێنەر" بۆ دڵیان، ئەوەش بە زاڵبوون و سەرکەوتنی ئیمانداران بەسەریاندا. ئیتر هەردوو نەخۆشیی "نائومێدی" و "ڕق"ەکەیان: دەردی "ترس" و، نەخۆشیی "لاوازی" و، بیماریی "زەلیلی"یەکی ئەوتۆیان بەرهەم هێنا کە سەرانسەری دڵی ئەوانی بە تەواوی گرتەوە.

پاشان خوای گەورە نەیفەرموو: "فزادَ اللهُ مَرَضَهم"، بەڵکو مەفعوولەکە (مَـرَضَ)ی کرد بە تەمییز ﴿مَرَضاً﴾ ئەوەش بۆ ئاماژەدان بەوەی کە: نەخۆشی‌یە ناوەکی‌یەکەی ناخی ئەوان تەشەنەی بۆ دیوی ڕواڵەت کردووە و تێپەڕیوە بەرەو هەموو کردارەکان! وەك بڵێی ئەم دەردە چەپەڵە بەسەر هەموو بوون و قەوارەی ئەواندا زاڵ بووە؛ دەڵێی "بوون"یان خودی نەخۆشی‌یەکەیە. چونکە زیادبوونی زام و زیپکەکانی نەخۆشی‌یەك زیادبوونە لە خودی کەسەکاندا. ئەوەتا ڕستەی "ماڵەکە ئاگری گرت" ئەوە دەگەیەنێت

وفي تنوين التنكيرِ إشارةٌ إلى أنّه في مكمَنٍ عميقٍ لا يُرى حتى يُداوَى.

وفي الخامسة: أعني جملةَ ﴿فَزَادَهُمُ اللهُ مَرَضاً﴾ هو:

أنّهم حينما لم يعرِفوا أنّه مرَضٌ حتى يتجنبوا منه بل طلبوه مستحسنين له زادَهم الله تعالى؛ إذ "مَن طَلَبَ وَجَدَ"..

وفي "الفاء" التي هي للتعقيب السببي - مع أنَّ وجودَ المرض ليس سبباً لزيادته - رمزٌ إلى أنهم لمّا لم يشخّصُوا المرضَ فلم يتحرَّوْا وسائلَ الشفاءِ بل توسَّلوا بأسباب الزيادة كمَن يُضارِبُ خصماً غالباً بيده العليلةِ، صاروا كأنّهم طلبوا الزيادةَ فزادَهم اللهُ مرضاً بقلبِ أمَلِهم يأساً مُزعِجاً، بسبب ظفَرِ المؤمنين، وقلبِ خصومَتهم حقداً مُحرِقاً للقلب بسبب غلبةِ المؤمنين، فتولّدَ من مرضَي اليأسِ والحقدِ داءُ الخوفِ وعلّةُ الضعفِ ومرضُ الذلةِ، فاستولتْ على القلب.

ثم إنَّ اللهَ تعالى لم يقلْ: "فزادَ الله مرضَهم" بل جعلَ المفعولَ تمييزاً للإشارة إلى أنَّ المرضَ الباطنيَّ القلبيَّ سرى إلى الظاهر أيضاً وتعدَّى إلى جميع الأفعالِ، فكأنَّ هذا الداءَ الخبيثَ استولى على وجودِهم، فكأنَّ وجودَهم نفسُ الداءِ، فزيادةُ جراحاتِ المرض ونفطاتِه[1] زيادةٌ لنفس ذواتهم؛ إذ "اشْتَعَلَ الْبَيْتُ ناراً" يفيدُ أنَّ النارَ سَرَتْ إلى تمام البيت حتى كأنَّ تمامَ

(١) نفطاته: بثراته.

کە ئاگر لە هەموو ماڵەکە بەربووە، بە ڕادەیەك کە دەڵێی سەرانسەری ماڵەکە گڕی گرتووە. بە پێچەوانەی ڕستەی: "ئاگری ماڵەکە گڕی گرت" چونکە ئاگر لە هەر لایەکی ماڵەکەدا گڕی گرتبێت، قسەکە ڕاست دەردەچێت.

ڕستەی شەشەمیش، واتە: ﴿وَلَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەوەی تێدایە کە:

ئەو "لام"ەی بۆ "سوودگەیاندن"ە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە: ئەگەر ئەوان سوودێکیان لەم "دووڕوویی"یەدا هەبێت، ئەوا بێ گومان ئێشێکی ئازاربەخشی ئەم دنیا و سزایەکی بە ئازاری ئەودنیایە! خۆ مەحاڵە کە ئازاریش "سوود" بێت. کەواتە مەحاڵە سوود بەدەست بهێنن!

ئنجا وەسفکردنی سزاکەشیان بە "أليم" واتە ئازار پێگەیشتوو، لە کاتێکدا کە ئازار پێگەیشتوو "کەس"ەکەیە، نەك "سزا"کە، هێمایە بۆ ئەوەی کە "سزا" بەسەر "بوون"ی ئەواندا هێندە زاڵە و دەوراندەوری زاتی ئەوانی داوە و ڕۆشتووەتە ناو ناخیانەوە کە بۆ خۆیان گۆڕاون بە خودی سزاکە و، ئەو سزایە بووەتە خودی زاتی ئەوان، بە وێنەی ئەوەی کە بەهۆی ڕۆشتنە ناوەوەی ئاگرەوە "خەڵووز" دەبێتە "پشکۆ"یەکی ئاگر!

جا ئەگەر "ئەندێشە" سەیری وێنەی "سزا" بکات و لە هەموو لایەکەوە گوێ لەو شین و هاوار و ئازار پێگەیشتنە بگرێت کە لە ژیانی بەردەوام نوێ بووەوەی ژێر سزاکەوە بەرز دەبێتەوە، یەکسەر وای بۆ دەچێت کە هەر خودی سزاکەیە شین و هاواری ئازار پێگەیشتنی لێ بەرز دەبێتەوە. دە فەرموو بزانە چ هەڕەشەیەکی سەختە بۆ کەسێك بیری لێ بکاتەوە!

ڕستەی حەوتەمیش، واتە: ﴿بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ ئەوەی تێدایە کە:

پەیوەستکردنی سزاکە، لە نێوان تاوانە باسکراوەکانیاندا، تەنها بە "درۆکردنیان"ەوە، ئاماژەیەکی تێدایە بۆ زۆر ناشیرینیی لەڕادەبەدەری "درۆ".

ئەم ئاماژەیەش شایەتێکی ڕاستە لەسەر کاریگەریی لەڕادەبەدەری ژەهری "درۆ". چونکە درۆ بناغەی "کوفر"ە.. تەنانەت کوفر خۆی لەخۆیدا درۆیە و، سەری جەستەی درۆیە و، یەکەم نیشانەی "دووڕوویی"یە.. درۆ بوختانە بەدەم توانستی خوای گەورەوە و، دژی حیکمەتی پەروەردگارێتییەتی.. هەر درۆ بوو کە ڕەوشتە بەرزەکانی

البَيت نارٌ تلتهبُ، بخلاف "اِشْتَعَلتَ نَارُ الْبَيْتِ" فإنَّه يصدُقُ بتلهُّبِ النارِ من أيِّ جانبٍ كان.

وفي السادسة: أعني جملةَ ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ هو:

أنَّ "اللامَ" التي هي للنفع إشارةٌ إلى أنّه لو كان لهم منفعةٌ لكانتْ البتةَ ألماً مُعذِّباً دنيوياً، أو عذاباً أُخروياً مُؤلِماً، وكونُه منفعةً من المحال، فمحالٌ لهم المنفعةُ..

وفي وصف العذابِ بالأليم أي المتألِم، مع أنَّ الأليمَ هو الشخصُ رمزٌ إلى أنَّ العذابَ استولى على وجودِهم وأحاطَ بذواتِهم ونفذَ في بواطنِهم بحيث تحولوا بنفس العذاب، وصار العذابُ عينَ ذواتِهم، كانقلاب الفحمِ جمرةَ نارٍ بنفوذ النار[1]..

فإذا نظرَ الخيالُ إلى صورة العذاب واستمعَ مِن جوانبه أنيناً وتألماً وعويلاً تتولدُ من الحياة المتجددةِ تحت العذاب، يتخيلُ أنَّ العذابَ هو الذي يئنُّ ويتألَمُ. فما أشدَّ التهديدَ لِـمَن تأمَّلَ!

وفي السابعة: أعني جملةَ ﴿بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ هو:

أنَّ في تعليق العذابِ من بين جناياتِهم المذكورة بالكَذِب فقط، إشارةً إلى شدةِ شناعة الكَذِبِ وقُبحِه وسَماجتِه.

وهذه الإشارةُ شاهدُ صدقٍ على شدة تأثيرِ سمِّ الكذب؛ إذ الكَذِبُ:

أساسُ الكفر، بل الكفرُ كذبٌ ورأسُ الكذب، وهو الأُولى مِن علامات النفاق.. وما الكذبُ إلا افتراءٌ على القدرة الإلهية، وضدٌّ للحكمة الربانية.. وهو الذي خرَّبَ الأخلاقَ

---

(١) بنفوذ النار فيها. (ش)

تێکدا و، تەقالا مەزنەکانی بە وێنەی لاکە بۆگەنەکان لێکرد.. بە هۆی درۆوە ژەهر لەناو موسڵمانانندا بڵاو بووەوە و، بارودۆخەکانی ئادەمیزاد ئاڵۆزیی بەسەر هات.. هەر درۆیە کۆت و زنجیری لە پێی جیهانی ئیسلامی ناوە، بۆ ئەوەی نەیەڵێت بەرەو کەماڵاتی خۆی ڕاپەڕێ و بڕوات.. درۆ بوو کە هاوشێوەی موسەیلەمەی درۆزنی خستە نزمترینی پلەکانی نزمی.. درۆ ئەو کۆڵە قورسەی سەر پشتی مرۆڤە کە لەمپەری لە بەردەم ئامانجەکاندا بۆ دادەنێت.. درۆ باوکی "ڕیا" و دایکی "خۆنواندن"ە.

لەبەر ئەم هەموو هۆکارانەیە کە "درۆ" تایبەت کراوە بە لەعنەت لێکردن و هەڕەشە و لاواندنەوەیەك کە لەسەرووی عەرشەوە ئاراستەی کراوە!

دەسا خەڵکینە! بە تایبەت ئەی موسڵمانان!

ئەم ئایەتە بۆ "وردبوونەوە" بانگهێشتتان دەکات!

* ئەگەر وتتان:

"درۆکردن" لەبەر بەرژەوەندی، چاوپۆشیی لێ دەکرێت؟

لە وەڵامدا پێتان دەوترێت:

ئەمەی کە دەیڵێن کاتێکە بەرژەوەندییەکە بێ هیچ گومانێك شتێکی پێویست بێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بەهانەیە بەتاڵە! چونکە لە ئوسووڵی شەریعەتدا ئەوە بڕیاردراوە کە:

هەر شتێك "زەبت نەکرێت" واتە: لەبەر ئەوەی ڕێی تێبچێت و بگوبجێت کە بە جۆرێکی خراپ بەکار بهێنرێت نەتوانرێت لە سنوورێکدا دابنرێت، هەر شتێك ئاوا بێت، هەرگیز نابێت بە عیللەت و خولگەی حوکمی شەرع، وەك "مەشەققەت" کە لەبەر ئەوەی لە تواناداا نییە سنوورێکی بۆ دیاری بکرێت، بە عیللەتی کورتکردنەوەی نوێژ دانانرێت، بەڵکو عیللەتەکەی تەنها "سەفەر"ە.

ئەگەر چاویشمان لەمە پۆشی و سەلماندمان، خۆ زیادبوونی "زیان" بەسەر "سوود" لە هەر شتێکدا، فەتوای هەڵوەشاندنەوەی ئەو حوکمە دەدات و، "بەرژەوەندییەکە" لە نەبوونیدا دەبێت! ئەو پشێوییەی کە لە باری ئێستای جیهاندا دەیبینیت، شایەتە لەسەر ئەوەی کە "زیان"ی بەبیانوو کردنی "بەرژەوەندی" گەلێ زیاترە لە "سوودەکان"ی!

بەڵام بەکارهێنانی پلار بۆ درکاندنی مەبەست بە درۆ دانانرێت.

العاليةَ.. وهو الذي صيَّرَ التشبثاتِ العظيمةَ كالشَّبَحاتِ المُنتِنَةِ.. وبه انتشرَ السمُّ في الإسلام.. وبه اختلَّتْ أحوالُ نوعِ البشر.. وهو الذي قيَّدَ العالمَ الإنسانيَّ عن كمالاته، وأوقفَه عن ترقياته.. وبه وقعَ أمثالُ "مسيلمةِ الكذّابِ" في أسفل سافلي الخِسَةِ.. وهو الحملُ الثقيلُ على ظهر الإنسانِ فيعوِّقُه عن مقصوده.. وهو الأبُ للرياء والأمُّ للتّصَنُّع..

فلهذه الأسبابِ اختصَّ بالتلعين والتهديدِ والنعيِ النازلِ من فوق العرشِ..

فيا أيّها الناسُ! لاسيما أيّها المسلمون! إنَّ هذه الآيةَ تدعوكم إلى الدّقّة!

* إنْ قلتُم:

إنَّ الكَذِبَ للمصلحة عفوٌ؟

قيل لكم:

إذا كانت المصلحةُ ضروريةً قطعية، مع أنّه عذرٌ باطل؛ إذ تقرَّرَ في أصول الشريعةِ: "إنَّ الأمرَ الغيرَ المضبوطَ (أي الذي لا يتحصَّلُ) - بسبب كونه قابلاً لسوء الاستعمالِ - لا يصيرُ علةً ومداراً للحكم"، كما أنَّ المشقةَ لعدم انضباطِها ما صارتْ علةً للقَصر، بل العلةُ السفرُ.

ولئن سلَّمْنا فغلبةُ الضرر على منفعة شيءٍ تُفتي بنَسْخه وتكونُ المصلحةُ في عدمه.

وما ترى من الهَرْج والمَرْج في حال العالَمَ شاهدٌ على غلبة ضررِ عذرِ المصلحةِ. إلّا أنَّ التعريضَ والكنايةَ ليسا من الكَذب.

كەواتە، تەنها دوو ڕێ لە بەردەم مرۆڤدایە:

یان "بێدەنگی".. چونكە "پێویستبوونی ڕاستیی هەموو قسەیەك، وتنی هەموو ڕاستییەك ناكات بە شتێكی پێویست"!

یان "ڕاستگۆیی".. چونكە ڕاستگۆیی بناغەی ئیسلامەتییە و، تایبەتكاریی ئیمانە، بگرە ئیمان یەكپارچە ڕاستییە و.. "ڕاستی": سەری جەستەی ئیمانە.. پەیوەندیی نێوان هەموو كەمالاتێكە.. ژیانی هەموو ڕەوشت و خوویەكی بەرزە.. دەماری پەیوەندیدەری ڕاستەقینەی هەموو شتانە.. درەوشانەوەی حەقە بەسەر زمانەوە.. تەوەرەی بەرزبوونەوە و پێشكەوتنی مرۆڤە.. ڕێسای جیهانی ئیسلامە.. نەژادی مرۆڤ لە ڕێی بلندی و پێشكەوتنەوە، بە خێرایی بروسكە، بەرەو كەعبەی كەمالات دەبات.. هەژار و بێ ناوترین كەس لە پادشا سەربەرزتر دەكات.. هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە بۆنەی "ڕاستی"یەوە بەسەر هەموو خەڵكیدا پلەیان بەرز بووەوە.. پێغەمبەریش - كە حەزرەتی محەممەدی هاشمییە ﷺ - بە "ڕاستگۆیی" بۆ بلندترین پلەكانی مرۆڤایەتی سەركەوت و بەرزبوویەوە.

* * *

فالسبيلُ مَثْنَى:

إما السكوتُ؛ إذ "لا يلزمُ من لزومِ صدقِ كلِّ قولٍ قولُ كلِّ صدقٍ"..

وإما الصدقُ؛ إذ الصدقُ:

هو أساسُ الإسلاميةِ.. وهو خاصةُ الإيمان.. بل الإيمانُ صدقٌ ورأسُه.. وهو الرابطُ لكلِّ الكمالات.. وهو الحياةُ للأخلاق العاليةِ.. وهو العِرقُ الرابطُ للأشياء بالحقيقة.. وهو تجلّي الحقِّ في اللسان.. وهو محورُ ترقي الإنسانِ.. وهو نظامُ العالمِ الإسلامي.. وهو الذي يُسرِع بنوع البشرِ في طريق الترقي - كالبرق - إلى كعبة الكمالاتِ.. وهو الذي يصيِّرُ أخمدَ الناس وأفقرَه أعزَّ من السلاطين.. وبه تَفوَّقَ أصحابُ النبيِّ عليه الصلاة والسلام على جميعِ الناس.. وبه ارتفعَ "سَيِّدُنا محمدٌ الهاشميُّ" عليه الصلاة والسلامُ إلى أعلى عليي مراتبِ البشر.

***

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ قَالُواْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ۝ أَلا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِن لا يَشْعُرُونَ﴾ (البقرة: ١١-١٢)

بزانە کە هۆی هۆنینی ئەم ئایەتە لە ڕشتەی ئەوەی پێش خۆیدا، ئەوەیە کە:

کاتێ خوای گەورە باسی ئەو یەکەم تاوانەی کرد کە لە دووڕوویی ئەوانەوە پەیدا بووە، کە بریتی‌یە لە: ستەم کردنیان لە خۆیان و دەستدرێژی‌یان بۆ سەر مافەکانی خوای گەورە، بە هەموو زنجیرە دەرەنجامە باسکراوەکانیەوە.. ئەوا باسی دووهەم تاوانی ئەوانی بە دوادا هێنا، کە دەستدرێژی‌یانە بۆ سەر مافی بەندەکان و نانەوەی خراپکاری‌یە، بە هەموو لقەکانیەوە، لە نێوانیاندا.

پاشان ﴿إِذَا قِيلَ﴾ هەروەك بە پێی بەسەرهاتەکە پەیوەستە بە ﴿يَقُولُ﴾ لە ئایەتی ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ ءامَنَّا﴾دا و، بە گوێرەی دەرەنجامیش پەیوەستە بە ﴿يُخَادِعُونَ﴾.. بە هەمان جۆر و بە گوێرەی خۆیشی پەیوەستە بە ﴿يَكْذِبُونَ﴾.

گۆڕینی شێوازەکەش لە "حەملی"یەوە بۆ "شەرتی"[1]، نیشانە و هێمایەکی پەنهانە بۆ چەمکێکی تەقدیر کراو لە نێوان هەردوو جۆرە شێوازەکەدا. وەك بڵێی دەفەرموێ:

---

(١) لە زانستی مەنتیقدا "ڕستەی خەبەری" پێی دەوترێ "قەزییە" و، دەکرێ بە سێ بەشەوە: حەملی، شەرتیی لکاو، شەرتیی سەربەخۆ. "حەملی" بریتی‌یە لە بڕیاردان لەسەر پەیوەندیی شتێك بە شتێکی دیکەوە، یان نەبوونی ئەو پەیوەندی‌یە. وەك: "خالید شاعیرە"، "ئازاد بەرگدروو نی‌یە".. "شەرتیی لکاو" ئەوەیە کە بڕیاردان لەو کێشەیەدا مەرجە پەیوەست بێت بە بڕیارێکی ترەوە، یان مەرجە ئەو بڕیارە نەفی بکات. وەك "ئەگەر خۆر هەڵهات ئەوا ڕۆژ هەیە"، "ئەگەر خۆر هەڵهات ئەوا شەو نی‌یە". "شەرتیی سەربەخۆ" بڕیارێکە دوو گریمان یان زیاتر هەڵبگرێت. وەك: "ژمارە یان تاکە یان جووتە". بە پوختی لە (ضوابط المعرفة و أصول الاستدلال والمناظرة)ی "عبدالرحمن الميداني"یەوە، ص ٧٧-٨١. (وەرگێڕ)

﴿وَإِذَا قِيلَ لَـهُمْ لا تُفْسِدُوا في الأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ * أَلا إِنَّهُمْ هُمُ الْـمُفْسِدُونَ وَلكِنْ لا يَشْعُرُونَ ﴾ (البقرة: ١١-١٢)

اعلم أنَّ وجهَ نظمِ هذه الآيةِ بما قبلَها هو:

أنَّ اللهَ تعالى لمّا ذكرَ الأُولى من الجنايات الناشئةِ عن نفاقهم وهي ظلمُهم أنفسَهم وتجاوزُهم على حقوق الله تعالى بنتائجها المتسلسلةِ المذكورة، عقَّبَها بثانيةِ الجنايات؛ وهي تجاوزُهم على حقوق العبادِ وإيقاعُهم الفسادَ بينهم مع تفرُّعاتها ..

ثم إنَّ ﴿إِذَا قِيلَ﴾ كما أنّه مربوطٌ باعتبار القصةِ بـ﴿يَقُولُ﴾ في ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ﴾، وباعتبار المآلِ بـ﴿يُخَادِعُونَ﴾؛ كذلك يرتبطُ باعتبار نفسِه بـ﴿يَكْذِبُونَ﴾.

وتغيُّرُ الأسلوبِ من الحَمْلية إلى الشرطية أمارةٌ ورمزٌ خفيٌّ إلى مُقدَّرٍ بينهما، كأنّه يقولُ:

﴿لَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾؛ إذ إذا كذبوا فتنوا، وإذا فتنوا أفسدوا، وإذا نوصِحوا لم يقبلوا، ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ تُفْسِدُواْ﴾.. هتد.

هۆی "هۆنین"یش لە نێوان ڕستە ڕاشکاوەکان و ڕستە ناوەکی‌یەکانی ئەم ئایەتەدا، هەمان هۆی هۆنین و پەیوەست بوونە کە لەم نموونەیەدا دەیهێنمەوە بۆت:

ئەگەر کەسێکت بینی بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت دەیگەیاندە تیاچوونی خۆی، ئەوا یەکەم شت ئامۆژگاریی دەکەیت و، پێی دەڵێیت:

"ئەم ڕێگایە بەرەو تیاچوونت دەبات، کەواتە خۆتی لێ بپارێزە".

خۆ ئەگەر ژیریی نەخستەکار و وازی لەو ڕێیە نەهێنا، ئەوا سەرزەنشت و نەهی و لاواندنەوەی بۆ دەخەیتەکار، ئنجا پشتگیری لە نەهی کردنەکە دەکەیت و بەردەوامیی لە زەیندا پێ دەبەخشیت، ئەوەش یان دەیترسێنیت بەوەی کە گشتینەی خەڵك نەفرەتت لێ دەکەن، یان لە ڕێی شەفەقەتی هاوڕەگەزی‌یەوە دڵی نەرم دەکەیت، وەك لەمەولا ڕوونکردنەوەکەیان دێت.

خۆ ئەگەر ئەو کەسە هێندە سەرسەخت بوو کە ملی نەدا و، بەردەوام بوو لەسەر ئەو ڕێیە و، سەری بۆ حەق نەوی نەکرد و، لە سواری پشتی "نەزانیی ئاڵۆزکاو" نەهاتە خوار، ئەوا بێدەنگ نابێت، بەڵکو بە وێنەی خووی هەموو خراپکارێك کە خراپەکەی خۆی بە چاك دەزانێت، داکۆکی لە خۆی دەکات. چونکە "مرۆڤێتی"ی مرۆڤ ڕێ بەوە نادات کە خراپە ئەنجام بدات لەو ڕووەوە کە "خراپە"یە.

پاشان لاف لێ دەدات و بەڵگەش دەهێنێتەوە کە:

" ڕێگاکەم حەقە، ئاشکرایە کە وەهایشە. لەبەر ئەوە تۆ مافی ئامۆژگاری کردنی منت نی‌یە و، هیچ پێویستی‌یەکیش بەو ئامۆژگاریە ناکات، بەڵکو تۆ پێویستت بەوە هەیە کە فێر ببیت. چونکە ڕێی ڕاست تەنها ئەوەی ئێمەیە، پلاری ئەوەش مەهاوە کە ڕێگایەکی لەمە باشتر هەبێت"!

ئنجا ئەگەر ئەو کەسە چەنەبازە "دووڕوو" بێت ئەوا قسەکەشی "بە زمانێکی دوو فاق" دەبێت، بە یەکێك لەو دوو ڕووە خۆی لەگەڵ کەسی ئامۆژگاردا دەگونجێنێت بە مەبەستی دەمبەستکردنی، بە ڕووەکەی تریشی پارێزگاری لە ڕێبازەکەی خۆی

﴿لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كانُوا يَكْذِبُونَ﴾؛ إذ إذا كَذبوا فَتَنُوا، وإذا فتنوا أفسَدوا، وإذا نوصِحُوا لم يقبلُوا، ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لا تُفْسِدُوا .. ﴾ الخ.

وأما وجهُ النظمِ بين الجملِ الصريحةِ والضمنيةِ في هذه الآيةِ فهو عينُ النظمِ والربطِ في ما أُمثّل لك، وهو:

أنّك إذا رأيتَ أحداً يسلكُ في طريقٍ تنجرُّ إلى هلاكِه، فأولاً تنصَحُه قائلاً له:

"مذهبُك هذا ينهارُ بك في البوار فتجنَّبْ"..

وإنْ لم ينتهِ بنُهاه، تعُودُ عليه بالزّجر والنهيِ والنعيِ، وتؤيّدُ نهيَك وتديمُه في ذهنه إما بتخويفِه بنفرةِ العمومِ، وإما بترقيق قلبِه بالشفقة الجنسية كما سيأتيك بيانُهما.

فإنْ كان ذلك الشخصُ مُتعنّتاً لَجوجاً مُصِرّاً ألدَّ راكباً متنَ الجهلِ المركّب، فهو لا يسكتُ، بل يدافعُ عن نفسه، كما هو شأنُ كلِّ مفسدٍ يرى فسادَه صلاحاً؛ إذ الإنسانيةُ لا تُخَلّي أنْ يرتكبَ الفسادَ من حيث هو فسادٌ..

ثم يستدِلُّ ويدَّعي بـ"أنَّ طريقي هذا حقٌّ، ومعلومٌ أنّه كذلك؛ فلا حقَّ لك في النصيحة فلا احتياجَ إلى نصيحتك، بل أنت محتاجٌ إلى التعلُّمِ، فما السبيلُ السويُّ إلّا سبيلُنا، فلا تُعرِّض بوجود طريقٍ أصوبَ"..

وإن كان ذلك الشخصُ اللجوجُ ذا الوجهين يكونُ كلامُه ذا اللسانين؛ يداري الناصحَ لإلزامِه بوجهٍ، ويتحفّظُ على مسلكه بآخرَ، فيقولُ:

دەکات و، دەڵێت: "من چاکەکارم". واتە: بە "ڕوالەت" وەك ئەو چاکەیەی کە تۆ دەتەوێت و، لە ڕووە "نادیار"ەکەشەوە وەك ئەوەی کە خۆم بڕوام پێی هەیە.

پاشان ئەوەی لێ چاوەڕوان دەکرێت کە پشتگیریی داواکەی بکات و جەختی لێ بکاتەوە، بەوەی "چاکەکاری سیفەتی بەردەوامی منە، نەك ئەوەی زووتر خراپەکار بوویێتم و ئێستا بووبم بە چاکەکار".

پاشان ئەگەر ئەو کەسە یاخی‌یەکی سەرکێش و تووڕە و نەمروود ئاسا بوو؛ سوور بوو لەسەر بڵاوکردنەوە و برەودان بە ڕێبازەکەی و، گاڵتەی بە کەسی "ئامۆژگار"ی دەکرد و، تا ئەم ڕادەیە قسە و پلاری دەگرتە ئەهلی حەق، ئەوا دەردەکەوێت کە هیچ دەرمانێك سوودی پێ ناگەیەنێت و، تەنها دوا دەرمان ماوە، مەبەستم چارەسەری پەرەنەسەندنی دەردەکەیەتی، ئەوەش ئاگادارکردنەوەی خەڵکە لێی کە "کەسێکی خراپەکارە؛ خێر و چاکەی تێدا نەماوە، ئەوەتا ژیری و هەستی خۆی ناخاتە کار هەتا هەست بەم شتە ئاشکرا و هەست پێکراوە بکات".

جا ئەگەر لەم زنجیرە بە دوای یەکدا هاتووەی ناو ئەم نموونەیە حاڵی بوویت، ئەوا لە هۆنینی نێوان دەقی ئەو ڕستانەش تێدەگەیت کە بەستێنەکانی ﴿وَإِذَا قِيلَ لَـــهُمْ﴾.. هتد، هێمایان بۆ کردووە، چونکە بە ئیجاز(کورتی)ێکی ئەوتۆ کە ئیعجازی لێ دەدرەوشێتەوە هۆنینێکی فیتری‌یان لە نێواندا هەیە.

سەبارەت بە هۆنینی ڕوخساری یەك بە یەکی ڕستەکانیش، ئەوا بزانە کە:

لە ڕستەی ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ﴾دا بەم جۆرەیە:

بێ گومانی لە ﴿إِذَا﴾دا[1] ئاماژەیە بە واجب بوون و پێویستیی "نەهی لە خراپە"..

"بکەر نادیاری" لە ﴿قِيـــلَ﴾دا هێمایە بۆ ئەوەی کە: "نەهی لە خراپە" فەرزێکی کیفایەیە لەسەر گشتینەی خەڵك..

---

(١) لە زمانی عەرەبیدا (إنْ) و (إذا) بە واتای "ئەگەر"ی زمانی کوردی دێن و، هەردووکیان ئامرازن لە ڕستەی مەرج و وەڵامی مەرجدا. (إنْ) کاتێ بەکار دەهێنرێت کە ڕوودانی مەرجەکە جێی دڵنیایی نەبێت. بەڵام (إذا) کاتێ بەکار دەهێنرێت کە مەرجەکە بە دڵنیایی ڕووی دابێت. لەبەر ئەوەشە کە "فیعلی مازی"ی بە دوادا دێت، چونکە بە دڵنیایی مەرجەکە ڕوویداوە. بڕوانە "جواهر البلاغة" ص: ١٦٣ (وەرگێڕ)

أنا مصلحٌ. أي ظاهراً كما تطلُبُ، وباطناً كما أعتقدُ..

ثم من شأنه تأييدُ وتأكيدُ دعواه بأنَّ الصلاحَ من صفتي المستمرةِ، لا أني كنتُ صالحاً الآن بعد فسادي قبلُ..

ثم إذا كان ذلك الشخصُ مُتمرِّداً ومُتَنَمِّراً[١] ومُصِرّاً في نشر مذهبِه، وترويجِ مسلكه، وتزييفِ ناصحه وتعريضِ أهل الحق بهذه الدرجة، ظهرَ أنَّه لا يُجدي له دواءٌ، ولم يبقَ إلا آخرُ الدواء، أعني المعالجةَ لعدم السراية. وما هذه المعالجةُ إلّا تنبيهُ الناس وإعلامُهم بأنَّه مفسدٌ لا صلاحَ فيه؛ إذ لا يستعمِلُ عقلَه ولا يستخدمُ شعورَه حتى يُحسَّ بهذا الشيء الظاهرِ المحسوس.

فإذا تفهّمتَ الحلقات المُسرَّدةَ في هذا المثالِ تفطّنتَ ما بين الجمل المنصوصةِ والمرموزةِ إليها بالقيود، في ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ﴾ إلى آخره، فإنَّ فيما بينها نظماً فطرياً بإيجازٍ يحمرُّ[٢] من تحته الإعجازُ.

وأما نظمُ هيئاتِ كلِّ جملةٍ جملةٍ:

فاعلم أنَّ جملةَ:

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لا تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ﴾...

القطعيةُ في ﴿إِذَا﴾ إشارةٌ إلى لزوم النهيِ عن المنكر ووجوبِه..

وبناءُ المفعول في ﴿قِيلَ﴾ رمزٌ إلى أنَّ النهيَ فرضُ كفايةٍ على العموم..

---

(١) أي غضِباً، غير أن ظاهر السياق والمذاق متنمرداً، أي كائناً كالنمرود. (ش)

(٢) يشعّ ويضيء.

"لام"ی ﴿لَهُمْ﴾یش هێمایەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە "نەهی"یەکە دەبێ لەسەر شێوەی "ئامۆژگاری" بێت، نەك خۆسەپاندن.. ئامۆژگارییەکەش بە شێوەیەکی "نەرمونیان" بێت، نەك سەرزەنشت و قسە پێ وتن.

﴿لاَ تُفْسِدُواْ﴾یش پوختەیەکە بۆ "پێوانەیەکی دەراوێتەیی"[1]. واتە: کاری وا مەکەن، دەنا ئەو کارە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی پشێوی و ئاڵۆزی، ئەو کاتەش گوێڕایەڵی نامێنێت، ئیتر سیستەمی دادپەروەری تێکدەچێت، لەوەشەوە پەیوەندیدەری یەکریزی هەڵدەوەشێتەوە، دیارە ئەوەش خراپەکاری لێ دەکەوێتەوە. کەواتە کاری وا مەکەن، بۆ ئەوەی خراپە نەنێنەوە!

وشەی ﴿فِي الأَرْضِ﴾ پشتگیری و جەختە بۆ "نەهی"یەکە و بەردەوامیی سەرزەنشتەکە، چونکە "نەهی کردن"ی کەسی ئامۆژگار کاتییە. لە کاتێکدا کە دەبێ درێژە بەو ئامۆژگارییە لە زەینی ئامۆژگاری کراودا بدرێت. ئەوەش بەوە دەبێت کە ئەرکی ئامۆژگارییەکە بە "ویژدان"ی ئەو بسپێررێت، تاکو بەردەوام لە لایەنی خۆیەوە سەرزەنشتی بکات. ئەوەش یان بە بزواندنی دەماری شەفەقەتی هاوڕەگەزایەتی دەبێت، یان بە وروژاندنی دەماری خۆ بە دوور گرتن لە نەفرینی گشتینەی خەڵك..

جا هەر تەنها وشەی ﴿فِي الأَرْضِ﴾یە کە هەردوو دەمارەکەی تێدا بێدار دەکاتەوە و دەیانبووژێنێتەوە.. چونکە ﴿فِي الأَرْضِ﴾ دەچرپێنێت بە گوێیاندا کە:

ئەم خراپکارییەتان بۆ نەوەی ئادەمیزاد تەشەنە دەکات..

جا ئایا ئێوە چ ڕق و قینێکتان لەو هەموو خەڵکە هەیە کە هەژار و بێ گوناهیان لە نێواندایە و، کەسی وایان تێدایە کە ئێوە نایانناسن..

ئایا هەست بە ئازاریان ناکەن؟ یان ئایا بۆچی بەزەیی و سۆزتان بۆیان نییە؟

گریمان ئەو "شەفەقەتی هاوڕەگەزی"یە لە ئێوەدا نییە، خۆ دەبوو لانی کەم تێبینی بکەن کە ئەم جموجووڵەتان لە ناوەڕۆکدا هەستی نەفرەتی گشتینەی خەڵکتان دەهێنێتە سەر!

---

(١) پێوانەی دەراوێتەیی (قیاس استثنائي) لە زانستی مەنتیقدا بەو پێوانەیە دەڵێن کە خودی دەرەنجامەکە، یان دژەکەی لە پێشەکییەکانیدا هەبێت (التعریفات). وەك: "وێنەکە یان ڕەش و سپییە، یان ڕەنگاوڕەنگە، بەڵام خۆ ڕەش و سپی نییە، کەواتە ڕەنگاوڕەنگە". بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە پەراوێزی ل: ٣٨٢. (وەرگێڕ)

وفي لام ﴿لَـهُمْ﴾ إيماءٌ إلى أنَّ النهيَ لابدَّ أنْ يكونَ على وجه النصيحةِ دون التحكُّمِ، والنصيحةَ على وجه اللطفِ دون التقريع..

و﴿لا تُفْسِدُوا﴾ فذلكةٌ وخلاصةٌ لصورة قياسٍ استثنائي[1]. أي لا تفعلوا هكذا، وإلّا نشأ منه الهَرْجُ والمَرْجُ، فينقطعُ خيطُ الإطاعة، فيتشوَّشُ نظامُ العدالة، فتنحلُّ رابطةُ الاتفاق، فيتولَّدُ منه الفسادُ، فلا تفعلوا لئلّا تفسدوا..

ولفظُ ﴿فِي الأَرْضِ﴾ تأييدٌ وتأكيدٌ للنهي وإدامةٌ للزجر، إذ نهيُ الناصح موَقَّتٌ لابدَّ من إدامته في ذهن المنصوحِ بتوكيل وجدانِه ليزجرَه دائماً من تحته. وهو إما بتحريك عِرق الشفقةِ الجنسية، وإما بتهييج عرق التنفُّرِ من نفرة العموم..

و﴿فِي الأَرْضِ﴾ هو الذي يوقِظُ العِرقَين وينعِشُهما؛ إذ لفظُ ﴿فِي الأَرْضِ﴾ يناجيهم: بأنَّ فسادَكم هذا يسري إلى نوع البشر..

فأيُّ حقدٍ وغيظٍ لكم على جميع الناسِ الذين فيهم المعصومون والفقراءُ والذين لا تعرفونهم. أفلا تتوجَّعُون لهم؟ ولِمَ لا تترحّمون بهم؟

هبْ أنْ ليستْ لكم تلك الشفقةُ الجنسية، فلا أقلَّ من أنْ تلاحظوا أنَّ حركتَكم هذه تجلبُ عليكم معنى نَفرة العموم.

---

(١) القياس الاستثنائي: ما يكون عين النتيجة أو نقيضها مذكوراً فيه بالفعل. (التعريفات)

* ئەگەر وتت:

ئەوان چ کارێکیان بەسەر گشتینەوە هەیە و، چۆن چۆنی خراپکارییەکەیان هەمووان دەگرێتەوە؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

هەروەك ئەو کەسەی کە لە چاویلکەیەکی ڕەشەوە بڕوانێت، هەموو شتێك بە ڕەش و ناشیرین دەبینێت، بە هەمان جۆر ئەو کەسەش کە "بینایی دڵ"(بصيرة)ی پەردەی دووڕوویی بەسەردا درابێت و، دڵیشی بە "کوفر" شێوابێت، هەموو شتێك بە ناشیرین و بێزلێکراو دەبینێت و، لە ناخی دڵیدا ڕق و سەرسەختی بەرامبەر هەموو مرۆڤەکان، تەنانەت سەرجەمی بوونەوەران، دروست دەبێت..

پاشان هەروەك ئەگەر ددانی چەرخی ناو سەعاتێك شکابێت، ئەوا بە جۆرێکی هەمەکی یان هەندەکی کار دەکاتە سەر هەموو سەعاتەکە.. بە هەمان جۆر "دووڕوویی"ەکەی ئەو کەسەش کار دەکاتە سەر سیستەمی گرۆی مرۆڤ کە بە ڕشتەی دادپەروەری و موسڵمانێتی و گوێڕایەڵی هۆنراوەتەوە..

بەداخەوە، زنجیرەی ژەهرەکانیان هێندە خۆی دەرخست هەتا ئەم نزمییەی بەرهەم هێنا!

سەبارەت بە ڕستەی: ﴿قَالُواْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ﴾یش، ئەوا:

بەکارهێنانی ﴿قَالُواْ﴾ (واتە دەڵێن) لە بریی "لا يقبلون النصيحة" (واتە: ئامۆژگاری وەرناگرن)، کە ئەوەش لە هێنانی ڕستەکەوە دەردەکەوێت، ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە ئەوان لاف لێ دەدەن و بانگەشە بۆ ڕێبازەکەیان دەکەن.

﴿إِنَّمَا﴾ش دوو تایبەتمەندیی تێدایە:

یەکەم:

ئەو چەمکەی لە دوای "إنما"وە دێت، دەبێت یان لە ڕاستیدا، یان بە ئیددیعا، شتێکی زانراو بێت. لەوەش لێرەدا هێمایەکە بۆ پووچەڵکردنەوەی کاری ئامۆژگار و، دەرخستنی پێداگرییان لەسەر نەزانییە ئاڵۆزەکەیان.

* فإنْ قلتَ:

أيُّ غَرَضٍ لهم بالعموم؟ وكيف ينجرُّ فسادُهم إلى الكل؟

قيل لك:

كما أنَّ مَن نظرَ بمرآة البصرِ السوداءِ رأى كلَّ شيء أسودَ قبيحاً..

كذلك من احتجبتْ بصيرتُه بالنفاق وفسَدَ قلبُه بالكفر رأى كلَّ شيء قبيحاً مبغوضاً، (و) يحصلُ في قلبه عنادٌ وحقدٌ مع كلِّ البشرِ بل كلِّ الكائنات..

ثم كما أنَّ انكسارَ سنٍّ من جَرْخٍ[1] من دولابٍ من ساعةٍ يتأثَّرُ به الكلُّ كلياً أو جزئياً؛ كذلك بنفاق الشخصِ يتأثَّرُ نظامُ هيئةِ البشرِ التي انتظمتْ بالعدالة والإسلامية والإطاعة.

فأسفاً قد تظاهرتْ سمومُهم المتسلسلةُ حتى أنتجتْ هذه السفالةَ.

وأما جملةُ: ﴿قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ﴾..

ففي ﴿قَالُوا﴾ بدلَ "لا يقبلون النصيحةَ" الظاهرِ من السياق، إشارةٌ إلى أنهم يدَّعون ويَدْعون إلى مسلكهم.

وفي ﴿إِنَّمَا﴾ خاصيتان:

الأولى:

أنَّ مدخولَه لابدَّ أنْ يكونَ معلوماً حقيقةً أو ادّعاءً. ففيها رمزٌ إلى تزييف الناصح وإظهارُ ثَباتهم على جهلهم المركَّب.

---

(١) جَرْخ (چرخ): يقرب من معنى دولاب.

دووهەم:

تایبەتکردن لە "إنما"دا ئاماژەیەکی لەخۆ گرتووە بۆ ئەوەی کە چاکسازییەکەیان (واتە ئەوەی کە بە گومانی خۆیان چاکسازییە) خراپەی ئاوێتە نییە و، ئەوان بە وێنەی غەیری خۆیان نین! جا ئەو ئاماژەیە، هێمایەکی تێدایە بۆ پلار گرتنە ئیمانداران.

ئیسمی بوونی ﴿مُصْلِحُونَ﴾یش لە بریی فیعلی "نُصلِحُ" ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە "چاکەکاری" سیفەتی دامەزراوی بەردەوامی ئێمەیە و، ئەم حالەمان خودی "چاکەکاری"یە و، هەر لە بناغەدا ئەم سیفەتەمان هەبووە، بێ ئەوەی خراپە بووبێت، دوایی گۆڕانی بەسەردا هاتبێت و بووبێت بە چاکە.

ئنجا ئەوان تەنانەت لەم قسەیەشیاندا "دووڕوویی" دەنوێنن، چونکە ئەوەی دەیشارنەوە و نایدرکێنن پێچەوانەی ئەوەیە کە بە ڕواڵەت دەری دەبڕن، ئەوەتا لە دیوی نادیاردا لافی ئەوە لێ دەدەن کە "خراپ"ەکەیان "چاکی" بێت، بە ڕواڵەتیش مەرایی دەکەن کە کارەکەیان بە مەبەستی چاکە و سوودی ئیماندارانە!

سەبارەت بە ڕستەی ﴿أَلا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِن لا يَشْعُرُونَ﴾یش ئەوا بزانە کە:

کاتێ ئەوان (دووڕووەکان) ئەم واتایانەی خوارەوەیان خستە ناو پێچاوپێچی ڕستەکەی پێشوو، کە بریتین لە: بڕەودان بە ڕێبازەکەیان و.. لافی سەلماویی چاکەکارییان و.. ئەوەش کە "چاکەکاری" سیفەتی بەردەوامیانە و.. جگە لە "چاکە" شتی تریان لە لا نییە و.. "خراپە"ش ئاوێتەی "چاکە"یان نابێت و.. ئەم بڕیارەش ئاشکرا و زانراوە.. هەروەها پلار هاویشتنیان بۆ ئیمانداران و.. بە نەزان دانانی کەسی ئامۆژگاریان..

(کاتێ ئەم واتایانەیان لە پێچاوپێچی ڕستەی پێشوودا کۆکردەوە)..

ئەوا قورئانی پیرۆز بەم ڕستەیە وەڵامی دانەوە کە چەند بڕیارێکی لەخۆ گرتووە لە:

سەلماندنی خراپەکارییان و.. یەکگرتنیان لەگەڵ ناوەرۆکی ڕاستەقینەی خراپەکاران و.. خراپەش تەنها لەواندا کۆبووەتەوە و.. ئەم بڕیارەش ڕاستییەکی جێگیر و سەلماوە و.. هەروەها بێدارکردنەوەی خەڵك لە ناشیرینیی کارەکەیان و.. نەفاماندنیان بە داماڵینی هەست و سۆز لێیان، بە شێوەیەك کە دەڵێی شتانی بێ گیانن.

والثانية:

الحصرُ، ففيها إشارةٌ إلى أنَّ صلاحَهم لا يشوبُه فسادٌ فليسوا كغيرهم؛ ففي الإشارة رمزٌ إلى التعريض بالمؤمنين.

وفي اسميّةِ ﴿مُصْلِحُونَ﴾ بدلَ "نصلحُ" إشارةٌ إلى أنَّ الصلاحَ صفتُنا الثابتةُ المستمرة. فحالُنا هذه عينُ الإصلاح بالاستصحاب..

ثم إنّهم ينافقون في هذا الكلام أيضاً، إذ يَتَبَطَّنون خلافَ ما يُظهرون، فباطناً يدَّعون فسادَهم صلاحاً وظاهراً يُرَاؤُونَ أنَّ عملَهم لصلاح المؤمنين ومنفعتهم.

وأما جملةُ ﴿أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْـمُفْسِدُونَ وَلكِنْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ فاعلم:

أنّهم لَمّا أدرجوا في معاطف الجملةِ السابقة معاني: من ترويج مسلكِهم.. ودعوى ثبوت الصلاحِ لهم.. وأنَّ الصلاحَ صفتُهم المستمرة.. وأنهم مُنحصرون عليه.. وأنَّ الفسادَ لا يشوبُ صلاحَهم.. وأنَّ هذا الحكمَ ظاهرٌ معلوم.. ومن تعريضهم بالمؤمنين ومن تجهيلهم للناصح..

أجابَهم القرآنُ بهذه الجملة المتضمنةِ لأحكامٍ من إثبات الفسادِ لهم.. وأنهم متحدون مع حقيقة المفسدين.. وأنَّ الفسادَ منحصرٌ عليهم.. وأنَّ هذا الحكمَ حقيقةٌ ثابتة.. ومن تنبيه الناس على شناعتهم.. ومن تجهيلهم بنفي الحس عنهم كأنهم جمادات.

ئەگەر پێت خۆشە ئەمە بزانیت، ئەوا فەرموو بڕوانە بۆ:

ئەو ﴿أَلا﴾یەی کە بۆ "بێدارکردنەوە"یە، بزانە کە چۆن بەم بێدارکردنەوەیە بڕەودانەکەیان بە خراپەکاری پووچەڵ دەکاتەوە، کە لەو لاف لێدانەیانەوە سەری هەڵداوە کە دەرەنجامی ﴿قَالُواْ﴾ە..

هەروەها ئەو ﴿إِنَّ﴾یەش کە بۆ "بێگومانی"یە، بڕوانە چۆن بەرپەرچی لافی "زانراوی"ی ﴿إِنَّمَـا﴾ دەداتەوە. وەك بڵێی ﴿إِنَّ﴾ دەڵێت: حاڵی ئەوان لە ڕاستی و ناوەڕۆکدا "خراپەکاری"یە، ئیتر "چاکەکاری"ی ڕواڵەتی دادیان نادات..

هەروەها بڕوانە بۆ ئەو "تایبەتکردن"ەی کە لە ﴿هُم﴾دایە چۆن لە بەرامبەر ئەو پلارە ناواخنەی قسەکەی ئەوانەوە دانراوە کە لە ﴿إِنَّمَا﴾ و ﴿نَحْنُ﴾دایە..

هەروەها بڕوانە بۆ مەعریفەکردنی ﴿الْمُفْسِدُونَ﴾یش کە واتاکەی ئەوەیە: حەقیقەتی خراپەکاران لە زاتی ئەواندا دەبینیت، هەر ئەوان حەقیقەتی ئەو خراپەکاری‌یەن.. بڕوانە ئەوەش چۆن بەرەنگاری ئەو تایبەتکردنە دەکات کە لە ﴿إِنَّمَا﴾ وەردەگیرێت.

هەروەها بڕوانە بۆ ﴿وَلَكِن لاَّ يَشْعُرُونَ﴾یش، کە چۆن بەرەنگاری پەرپەچدانەوەی ئەوان دەکات بۆ کەسی ئامۆژگاریان و، دەری دەخات کە ئەوان بە لافی ئەوەی هەموو شتێك دەزانن، شایستەی ئامۆژگاری نین.

دەسا فەرموو بیری لێ بکەرەوە!

* * *

وإنْ شئتَ فانظرْ إلى:

﴿أَلاَ﴾ التي للتنبيه كيف تزيِّفُ بتنبيهها ترويجَهم الناشئَ من دعواهم المترشحَ من ﴿قَالُوا﴾..

وإلى ﴿إِنَّ﴾ التي للتحقيق كيف تردُّ دعواهم المعلوميةَ بـ﴿إِنَّمَا﴾، كأنَّ ﴿إِنَّ﴾ تقولُ: حالُهم في الحقيقة والباطن فسادٌ، فلا يجديهم الصلاحُ ظاهراً..

وإلى الحصر في ﴿هُمْ﴾ كيف يقابلُ تعريضَهم الضمنيَّ في ﴿إِنَّمَا﴾ و ﴿نَحْنُ﴾..

وإلى تعريف ﴿الْـمُفْسِدُونَ﴾ - الذي معناه حقيقةُ المفسدين تُرى في ذاتهم فهُم هي - كيف يدافعُ حصرَهم المستفاد من ﴿إِنَّمَا﴾ أيضاً..

وإلى ﴿وَلَكِنْ لا يَشْعُرُونَ﴾ كيف يدافعُ تزييفهم الناصحَ وأنهم ليسوا مستحقين للنصيحة بدعوى المعلومية.

فتأملْ!

* * *

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءامِنُواْ كَمَا ءامَنَ النَّاسُ قَالُواْ أَنُؤْمِنُ كَمَا ءامَنَ السُّفَهَاءُ أَلا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ وَلَكِن لا يَعْلَمُونَ﴾ (البقرة: ١٣)

بزانە هۆی هۆنینی ئەم جۆرە (واتە: فەرمان بە ئیمان) لە ڕشتەی جۆری یەکەمدا (واتە: نەهی کردن لە خراپەکاری) بەم شێوەیە:

لەو ڕووەوە کە هەردووکیان "ئامۆژگاری و ڕێنمایی"ن، ئەوا عەتفکردنەوەی فەرمان بە چاکە و ڕەفتار جوانی و هاندان بۆ چاکەکارییە، بۆ سەر نەهی لە خراپە و دوورەپەرێزی لە ڕەفتاری ناشیرین و ترساندن لە خراپەکاری.

لەو ڕووەشەوە کە هەردووکیان لە "تاوان"ن، ئەوا عەتفکردنەوەی گەمژاندنی ئیمانداران و، لەخۆبایی بوونی ئەوانە، بۆ سەر خراپەنانەوەیان.. هەروەك خراپەنانەوەی ئەوانی پەیوەست کردووە بەو خراپەکارییانەی کە ئەنجامی دەدەن و، هەریەکەیان لقێکی درەختی زەقوومی "دووڕوویی"یە.

سەبارەت بە هۆی هۆنینی نێوان ڕستەکانی ئەم ئایەتەش، ئەوا بزانە کە:

کاتێ وترا: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءامِنُواْ كَمَا ءامَنَ النَّاسُ﴾ و، بە ڕوخسارەکانی پێکهاتەی ڕستەکەش ئاماژە کرا بۆ واجب بوونی "ئامۆژگاری" وەك فەرزێکی کیفایەت، ئەو ئامۆژگارییەش بە ئیمانێکی بێگەردی وەك هی جەماوەری ئەو خەڵکانە پێشکەش بکرێت کە کامڵ و تەواون، تاکو ویژدانیان بەردەوام ئەم فەرمانەیان ئاراستە بکات..

کاتێ ئەمە وترا، قورئان لەسەر زمانی ئەوان ئەمەی گێڕایەوە و، فەرمووی: ﴿قَالُواْ أَنُؤْمِنُ كَمَا ءامَنَ السُّفَهَاءُ﴾ بۆ ئاماژەدان بە یاخیبوون و، لووتبەرزی و، لاف لێدانی ئەوەیان کە گوایا "لەسەر حەقن". ئەوەش وەك پیشەی هەموو ناحەقرەوێك کە ناڕەوایی خۆی بە حەق دەبینێت و نەزانییەکەشی بە زانین دادەنێت، چونکە دڵیان بە

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا كَمَا ءَامَنَ النَّاسُ قَالُوا أَنُؤْمِنُ كَمَا ءَامَنَ السُّفَهَاءُ أَلا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ وَلكِنْ لا يَعْلَمُونَ ﴾ (البقرة: ١٣)

اعلم أنَّ وجهَ نظمِ هذا النوع بالنوع الأول:

من حيث إنَّها نصيحةٌ وإرشاد؛ عطف الأمرِ بالمعروف والتحليةِ والترغيبِ على النهيِ عن المنكر والتخليةِ والترهيب..

ومن حيث إنَّها من الجناية؛ عطف تسفيههم للمؤمنين وغرورهم على إفسادهم، كما ربطَ إفسادَهم بفسادِهم اللاتي كلٌّ منها غُصنٌ من شجرة زقّومِ النفاق.

وأما وجهُ النظم بين جُملِ هذه الآية فاعلم أنّه لَمَّا قيل: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا كَمَا ءَامَنَ النَّاسُ﴾ وأُشيرَ بهيئاتها إلى وجوب النصيحةِ على سبيل الكفايةِ بإيمانٍ خالصٍ اتّباعاً للجمهور الذين هم الناسُ الكُمَّلُ ليأمرَهم الوجدانُ دائماً بهذا الأمر، حكى وقال: ﴿قَالُوا أَنُؤْمِنُ كَمَا ءَامَنَ السُّفَهَاءُ﴾ إشارةً إلى تمرُّدِهم وغرورِهم ودعواهم أنّهم على الحق، كما هو شأنُ كلِّ مُبطِلٍ يرى باطلَه حقاً ويعلمُ جهلَه علماً؛ إذ بالنفاق تفسَّدَ قلبُهم، وبالفساد نشأ

"دووڕوویی" گەنیوە و، بە خراپەکاری‌یەکەشیان حەز و ئارەزوویەك بۆ لووتبەرزی و خراپەنانەوە لەواندا پەیدا بووە..

هەروەك بە پێی ئەوەی خۆیان کردە خراپەکار، بوونە یاخی و ملنەدەر و، بەپێی خراپەنانەوەشیان وتەی گومراکردن بە گوێی یەکتردا دەچرپێنن و، بە حوکمی ئەوەش کە لەخۆبایی و لووت بەرزی‌یان نواند، ئەوا ئەو دینداری‌یە توندوتۆڵ و ئیمان کاملی‌یەی کە خوازیاری قەناعەت و بێ نیازین لە خەڵك، بە نزمی و گەمژەیی و هەژاری دەبینن.

پاشان بە پێی "دووڕوویی"یەکەیان تەنانەت لەو گوفتارەشیاندا دووڕوویی دەنوێنن، چونکە "ڕوالەت"ی قسەکەیان ئەوەیە کە: چۆن ئێمە بە وێنەی کەسانی هەرزە و گەمژەین، لە کاتێکدا کە ئێمە شێت نین، بەڵکو وەك ئێوە دەتانەوێ کەسانی چاکەکارین؟

دیوی "پەنهان"ی قسەکەشیان ئەوەیە کە: چۆن خۆمان وەکو باوەڕدارەکان لێ دەکەین کە زۆربەیان هەژارن و، لە دیدی ئێمەدا هەرچی و پەرچیی ناو خەڵکن یەکیان گرتووە؟

دەسا فەرموو بۆ بەراوردی وردەکاریی نێوان هەردوو بەشەکەی ڕستە مەرجی‌یەکە.

پاشان بە فەرمایشتی: ﴿أَلا إِنَّهُمْ هُمُ السُّــــفَهَاءُ﴾ بەردێکی دەرخوارد دان. چونکە ئەوانەی کە هەتا ئەم ڕادەیە یاخی بن و، لە "نەزانی"یەکەیان ئاوا بێ ئاگا بن، شایانی ئەوەن کە لەناو خەڵکدا ئاشکرا بکرێن و بەوە بزرێنرێن کە: "نەفامی و گەمژەیی لەواندا کۆبووەتەوە. ئەوەش ڕاستی‌یەکی چەسپاوی بێ گومانە و، لەبەر نەفامی خۆیانە وا بە نەفام دادەنرێن".

پاشان فەرمووی: ﴿وَلَكِن لا يَعْلَمُــــونَ﴾. ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە نازانن بە نەزانیی خۆیان! کەواتە نەزانی‌یەکی هێندە ئاڵۆزکاوە کە ئامۆژگاری سوودیان پێ ناگەیەنێت. بۆیە دەبێ "فەرامۆش" بکرێن! چونکە تەنها ئەو کەسە لە ئامۆژگاری تێدەگات کە پەی بە نەزانیی خۆی ببات.

سەبارەت بە هۆی هۆنینی شێوەی یەك بە یەکی ڕستەکانیش، ئەوا:

لە ڕستەی ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُواْ كَمَا ءَامَنَ النَّاسُ﴾دا:

بێگومانیی ﴿إِذَا﴾ هێمایە بۆ پێویستیی ڕێنمایی‌کردن لە ڕێی "فەرمان بە چاکە"وە.

غرورٌ وميلُ إفسادٍ، وبحكم التفسُّدِ تمرّدوا، وبحكم الإفسادِ يقولُ بعضُهم لبعض متناجياً بالإضلال، وبحكم الغرورِ يرَون شدةَ الديانة وكمالَ الإيمان المقتضيين للاستغناء والقناعةِ سفالةً وسفاهةً وفقراً..

ثم بحكم النفاقِ ينافقون في كلامهم هذا أيضاً؛ إذ ظاهرُه:

كيف نكونُ كالسفهاء ولسنا مجانين ونحن أخيارٌ كما تطلبون؟

وباطنُه: كيف نكونُ كالمؤمنين الذين أكثرُهم فقراءُ، وهم في نظرنا سفهاءُ تحزَّبوا من أوْباش[1] الأقوام؟

وإليك التطبيقَ بين دقائقِ الجزئين من الشرطية.

ثم ألقَمَهم الحجرَ بقوله: ﴿أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ﴾؛ إذ مَن كان مُتمرِّداً بهذه الدرجةِ وجاهلاً بجهله فحقُّهم الإعلانُ بين الخلقِ وتشهيرُهم بانحصارِ السفاهةِ [فيهم] وأنّه من الحقائق الثابتةِ، وأنَّ تسفيهَهم لسفاهة نفسِهم..

ثم قال: ﴿وَلَكِنْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ إشارةً إلى أنّهم جاهلون بجَهلهم فيكونُ جهلاً مُرَكَّباً فلا يُجديهم النصيحةُ، فلابدَّ أنْ يُعرَضَ عنهم صفحاً؛ إذ لا يَفهمُ النصيحةَ إلّا مَنْ يعلمُ جهلَه.

وأما وجهُ النظمِ في هيئاتِ كلِّ جملةٍ جملةٍ:

ففي جملة: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُوا كَمَا آمَنَ النَّاسُ﴾..

لفظُ ﴿إِذَا﴾ بجزميته رمزٌ إلى لزومِ الإرشادِ بالأمر بالمعروف..

---

(١) أوباش: سِفلَة الناس وأخلاطِهم.

"بكەر نادیاری"یش لە ﴿قیلَ﴾دا هێمایە بۆ واجب بوونی "ئامۆژگاری" بە فەرزی كیفایەت، وەك پێشتر باس كرا.

وشەی ﴿ءامِنُواْ﴾ لە بریی "أخلصوا فی إیمانكم" (واتە: با ئیمانەكەتان یێگەرد بێت) ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە "ئیمان"ی بێ "ئیخلاس" ئیمان نییە.

وشەی ﴿كَمَا ءامَنَ﴾ ئاماژەیە بۆ "پێشەنگ"ی باش و "نموونە"ی جوان، تاكو چاوی لێ بكەن.

دوو سەرنجیش لە وشەی ﴿النَّـــاسُ﴾دا هەیە، كە هەر ئەو دووانە هۆكاری ئەوەن "ویژدان" هەمیشە فەرمان بە چاكە بكات. چونكە:

﴿كَمَا ءامَنَ النَّاسُ﴾ ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە: "فاتبعوا جمهور الناس" (واتە شوێن جەماوەری خەڵك بكەون). چونكە ڕەفتاری پێچەوانەی جەماوەر هەڵەیەكە دەبێ دڵی مرۆڤ توخنی نەكەوێت..

هەروەها ئاماژەیەكیشە بۆ ئەوەی كە تەنها ئەوان "مرۆڤ"ن، وەك بڵێی كەسانی جگە لەوان مەگەر بە شێوە، دەنا "مرۆڤ" نین. ئەوەش یان بەهۆی بەرزبوونەوەی ئەمان بە پلەكانی كەماڵی مرۆڤدا و چڕبوونەوەی حەقیقەتی مرۆڤێتییە تیایاندا، یاخود بەهۆی نزمبوونەوەی ئەوانە و دابەزینیانە لە پلەی مرۆڤێتی.

سەبارەت بە ڕستەی: ﴿قَالُواْ أَنُؤْمِنُ كَمَا ءامَنَ السُّفَهَاءُ﴾ كە دەرەنجامەكەی ئەوەیە: "ئێمە ئامۆژگاری وەرناگرین، چونكە چۆن خۆمان وەكو ئەو ڕسوایانە لێ دەكەین كە لە پێش چاوی ئێمەدا كەسانێكی گەوجن. ئێمەی خاوەن پلەوپایە وەكو ئەوان دانانرێین"..

جا لە وشەی ﴿قَالُواْ﴾دا هێمایەك هەیە بۆ: بێ تاوان دەركردنی خود و، بەرەودان بە ڕێباز و، بێ نیاز بوون لە ئامۆژگاری و، لەخۆبایی بوون و، لاف لێدان..

لە پرسیاری نكوولی كردنی وشەی ﴿أَنُؤْمِـــنُ﴾شدا ئاماژەیەك هەیە بۆ سەختیی یاخیبوونەكەیان لەو نەزانییە ئاڵۆزەیاندا. وەك بڵێی ئەوان لە شێوەی پرسیاركردندا دەڵێن:

"ئەی كەسی ئامۆژگار! سەردانی ویژدانت بكە، ئایا بەرپەرچدانەوەی ئێمەی پێ ڕەوایە"؟

وبناءُ المفعول في ﴿قِيلَ﴾ إيماءٌ إلى أنَّ وجوبَ النصيحةِ على سبيل الكفايةِ كما مرَّ.

ولفظُ ﴿ءَامِنُوا﴾ بدلَ "أخلِصُوا في إيمانكم" إشارةٌ إلى أنَّ الإيمانَ بلا إخلاصٍ ليس بإيمانٍ.

ولفظُ ﴿كَمَا ءَامَنَ﴾ تلويحٌ بالأُسْوَةِ الحسنة وحُسنِ المثال ليُخلِصُوا على منوالِه.

وفي لفظِ ﴿النَّاسُ﴾ نكتتان: وهما السببُ في جعْل الوجدانِ آمراً بالمعروف دائماً؛ إذ ﴿كَمَا ءَامَنَ النَّاسُ﴾ يترشَّحُ بـ"فاتَّبِعوا جمهورَ الناس" إذ مخالفةُ الجمهور خطأً من شأن القلب أنْ لا يُقدِمَ عليه..

وأيضاً يلوِّحُ بأنَّهم هم الناسُ فقط، كأنَّ مَن عداهم ليسوا بإنسانٍ إلّا صورةً، إمّا بترقي هؤلاءِ في الكمالات وانحصارِ حقيقةِ الإنسانية عليهم، وإمّا بتدنِّي أُولئك عن مرتبة الإنسانية.

أما جملةُ: ﴿قَالُوا أَنُؤْمِنُ كَمَا ءَامَنَ السُّفَهَاءُ﴾ التي مآلُها: "لا نقبلُ النصيحةَ، كيف نكونُ كهؤلاءِ الأذلّاءِ؛ إذ هم في نظرنا سفهاءُ ولا نُقاسُ نحن معاشرَ أهلِ الجاهِ عليهم"..

ففي لفظِ ﴿قَالُوا﴾ رمزٌ إلى تبرئة النفسِ وترويجِ المسلك والاستغناءِ عن النصيحة والغرورِ والدعوى..

وفي لفظِ ﴿أَنُؤْمِنُ﴾ بالاستفهامِ الإنكاريِّ إشارةٌ إلى شدةِ تمرُّدِهم في جهلهم المركَّبِ، كأنَّهم بصورة الاستفهام يقولون:

"أيها الناصحُ! راجعْ وجدانَك هل ترى إنصافَك يقبلُ ردّنا؟".

پاشان سێ ڕووی ڕیز بەستووی یەك لە دوای یەك لەو "جار و مەجروور"ەدا هەیە کە پەیوەستن بە فیعلی ﴿قَالُواْ﴾. واتە: وتیان بە خۆیـان، پاشـان بـە هاوڕەگەزیان، پاشـان بـە ڕێنماییکار و ئامۆژگاریان. کە ئەوەش پیشەی هەموو ئامۆژگاری کراوێکە کاتێ کەسی ئامۆژگار ڕێنمایی دەکات..

چونکە یەکەم جار ڕاوێژ لەگەڵ خۆیدا دەکات. پاشان لەگەڵ هاوڕەگەزی دەدوێ. پاشان دەرەنجامی داوەریی لەگەڵ ئەو دووانەدا دەهێنێتەوە بۆ تۆی ئامۆژگار..

جا بەم پێیە، کاتێ ئەوەیان پێ وترا کە ڕابورد، سـەردانی دڵـە گـەنیوەکان و ویژدانـە رزیوەکانی خۆیان کرد، ئەوانیش ئاماژەی نکوڵی لـێ کردنیـان دانـێ، ئیـتر قسـەکەیان دەربڕینی ئەوەی ناخیان بوو..

پاشـان بـە چـاوی "خراپـە نانـەوە" سـەردانی برایـانی خۆیـان کـرد، ئـەوانیش هـەمان ئاماژەی نکوڵیيان بۆ کردن. ئیتر بە گوێی چپە و گفتوگۆی ئەوانیان کرد..

پاشان لە ڕێی پۆزش هێنانەوە و فێڵی قسەی هەڵەی بە ڕووکەش ڕازاوە، گەڕانەوە بۆ لای ئامۆژگارەکەیان و، بە گێچەڵ نانەوە و ئاژاوەگێڕی وتیان:

"ئێمە و ئـەوان جیـاین و بـە یـەك چـاو تەماشـا نـاکرێین.. ئـەوان کەسـانێکی هـەژار و دەستکورت و ناچارن، دەستگرتنی توند و تۆڵیشیان لە داوێنی ئایین و ڕێبازی زوهد، لە ناچارییاندایە. بەڵام ئێمە خاوەنی پلە و پایەین".

جا لەبەر لووتبەرزییان، دەچن ئامۆژگارەکەیان ڕەوانەی ویژدانی دەکەن و.. بەپێی بەکارهێنانی فڕوفێڵیش قسەیەك دەکەن کە لە زمانێکی دوو فاقەوە دەرچووە..

واتە: "ئەی کەسی ڕێ پیشـاندەر! بـە "گـەوج"مـان مەزانـە، ئێمـەش بـە گوێرەی ئـەو ڕوانینـەی ئێـوە گـەمژە و نـەفام نیـین، بـەڵکو هـەمان کـرداری ئیمـانداره خـاوێن و بێگەردەکان ئەنجام دەدەین".

کەچی مەبەستی پەنهانیان ئەوەیە کە:

"وەك ئەو بڕوادارە هەژارانە نابین، کە لای ئێمە بایەخیان نییە".

جا ئەم وشەیە، هێمایەکی پەنـهانی تێدایـە بـۆ: خراپـەکارییان و، خراپەنانـەوەیان و، لەخۆ بایی بوونیان و، دووڕووییان.

ثم إنَّ في متعَلَّق ﴿قَالُوا﴾ وجوهاً ثلاثةً مترتبة:

أي قالوا لأنفسِهم، ثم لأبناءِ جنسِهم، ثم لمرشِدهم، كما هو شأنُ كل متنصِّحٍ إذا نصحَه الناصحُ..

فأولُ الأمر يشاورُ مع نفسِه، ثم يحاورُ مع أبناء جنسِه، ثم يراجعُك بنتيجةِ محاكمَتهم.

فعلى هذا، لمّا قيلَ لهم ما قيلَ، راجَعوا قلوبَهم المتفسِّدةَ ووجدانَهم المتفسِّخَ، فأشارتْ عليهم بالإنكار، فقالوا مترجِمين عمّا في ضميرهم..

ثم راجَعُوا بنظر الإفسادِ إلى إخوانهم، فأشاروا عليهم أيضاً بالإنكار، فأخَذوا بنجواهم ومحاورتِهم..

ثم رجَعوا بطريق الاعتذارِ والسفسطةِ إلى الناصحِ، فشاغَبُوا وقالوا:

"بينَنا فرقٌ لا نُقاسُ عليهم إذ هم فقراءُ مضطرون مجبورون، فشدَّتُهم في الديانة وتصوّفُهم بالاضطرار. أما نحن فأهلُ عزةٍ وجاه"..

فبحكمِ الغُرورِ يُحيلون الناصحَ على إنصافِه. وبحكمِ الخِداعِ والحيلةِ يتكلمون بكلامٍ ذي لسانين..

أي أيُّها المرشدُ! لا تظنَّنا سفهاءَ، ولا نكونُ كالسفهاءِ في نظركم، بل نفعلُ كما يفعلُ المؤمنون الخُلَّصُ..

مع أنَّ مرادَهم باطناً: لا نكونُ كهؤلاء المؤمنين الفقراءِ؛ إذ لا اعتدادَ بهم في نظرنا.

ففي هذا اللفظِ رمزٌ خفيٌّ إلى فسادِهم وإفسادِهم وغرورِهم ونفاقِهم..

﴿كَمَا ءامَنَ السُّفَهَاءُ﴾ واته: ئەوانەی كە ئێوە بە مرۆڤی كامڵیان دادەنێن، لە پێش چاوی ئێمەدا - چەندەش زۆر بن - هەر هەژار و ناچار و ڕسوان و، هەر یەكەیان گەمژە و نەفامی ناو دەستەیەكە.

جا دەعواكەی ئەوان لە جیاوازیی بەراوردەكەدا، ئاماژەیەكە بۆ ئەوەی كە ئایینی ئیسلام ئەشكەوتی هەژاران و، داڵدەی دەستكورتان و، پارێزەری حەق و، پارێزگاری ڕاستی و، ڕێگر لە لووتبەرزی و، دەمكوتكاری خۆ بە گەورە زانینە. خۆ جگە لەوە شتێكی تر پێوەری كەماڵ و سەربەرزی نییە!

هەروەها دەعوای ئەو جیاوازییە، ئاماژەیەكە بۆ ئەوەی كە زۆربەی جار هۆی "دووڕوویی": ڕق و، لەخۆبایی بوون و، خۆ بەگەورە زانینە، وەك ئەم ئایەتە ڕوونی دەكاتەوە:

﴿وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلاَّ الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ﴾ (هود: ٢٧).

هەروەها ئەو جیاوازییە، ئاماژەیەكی نادیاریشی تێدایە بۆ ئەوەی كە ئایینی ئیسلام نابێتە هۆكار و ئامرازێكی خۆسەپاندن و خۆزاڵكردن بە دەست ئەهلی دنیا و كەسانی خاوەن پلەوپایەوە، بەڵكو هۆكاری هێنانەدیی "حەق"ە لە دەستی خەڵكانی دەست كورت و هەژاردا، بە پێچەوانەی ئایینەكانی تر. "مێژوو" شایەتی لەسەر ئەم ڕاستییە دەدات.

سەبارەت بە ڕستەی ﴿أَلا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ﴾یش، ئەوا بزانە:

قورئان كە توندوتیژیی زۆر لە دژی "دووڕوویی" بەكاردەهێنێت و خراپەیان دەخاتە ڕوو، لەبەر ئەوەیە كە زۆربەی گرفتەكانی جیهانی ئیسلامی لە جۆرەكانی "دووڕوویی"یەوەیە!

پاشان وشەی ﴿أَلا﴾ بۆ بێداركردنەوە و ئاشكراكردنی گەمژەیی و نەفامیی ئەوانە لە پێش چاوی خەڵكیدا و، بۆ ئەوەشە كە بیر و هزری زۆرینەی خەڵك بگرێت بە شایەت لەسەر گەوجی و نەفامیی ئەو دووڕووانە.

واتای ﴿أَلا﴾ لە بناغەدا ئەوەیە كە: ئایا نەتان زانیوە كە ئەوانە كەسانێكی گەمژە و نەفامن؟ واتە دە فەرموون ئێستا بزانن.

﴿كَمَا ءَامَنَ السُّفَهَاءُ﴾ أي الذين تظنونهم الناسَ الكاملينَ هم في نظرنا أذلاءُ فقراءُ مجبورون مع كثرتِهم، كلٌّ منهم سفيهُ قومٍ.

ففي دعواهم الفرقَ في القياس إشارةٌ إلى أنَّ الإسلاميةَ كهفُ المساكين وملجأُ الفقراءِ وحاميةُ الحقِ وحافظةُ الحقيقةِ ومانعةُ الغرورِ وقامعةُ التكبُّرِ، وما مقياسُ الكمالِ والمجدِ إلّا هي..

وأيضاً في الفرق إشارةٌ إلى أنَّ سببَ النفاقِ في الأغلب هو الغَرَضُ والغرورُ والتكبرُ كما يفسِّرُه:

﴿وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إلاّ الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ﴾ (هود: ٢٧).

وأيضاً في الفرق إشارةٌ خفيةٌ إلى أنَّ الإسلاميةَ لا تصيرُ وسيلةَ التَّحكُّمِ والتَّغَلُّبِ في أيدي أهل الدنيا والجاه؛ بل إنَّما هي واسطةٌ لإحقاقِ الحقِ في أيادي أهل الفقرِ والضرورةِ خلافَ سائرِ الأديان. ويشهدُ على هذه الحقيقةِ التاريخُ.

أمّا جملة ﴿أَلا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ﴾..

فاعلم أنَّ القرآنَ إنَّما أكثرَ من التشديد والتشنيع على النفاق لأجل أنَّ أكثرَ بلياتِ العالمِ الإسلامي من أنواعِ النفاق..

ثم إنَّ لفظَ ﴿أَلا﴾ للتنبيه وتشهيرِ سفاهتِهم على رؤوس الأشهادِ، ولاستشهادِ فكر العموم على سفاهتِهم.

وأصلُ معنى ﴿أَلا﴾ ألا تعلمون أنَّهم سفهاءُ؟ أي فاعلموا..

پاشان ﴿إِنَّ﴾ ئاوێنەی دەرخەری حەقیقەتە و هۆکارێکە بۆ گەیشتن پێی. وەك بڵێی پێیان دەڵێت: سەردانی حەقیقەت بکەن، تاکو بزانن سەفسەتە ڕواڵەتی‌یەکەیان هیچ بنج و بناغەیەکی نی‌یە.

پاشان وشەی ﴿هُــم﴾ کە بۆ قەتیس کردنە، بۆ بەرپەرچدانەوەی خۆ بێتاوان دەرکردنەکەی ئەوانە. هەروەها بۆ بەرپەرچدانەوەی بە گەمژە دانانی ئیماندارانە کە بە ﴿كَمَا ءامَنَ السُّفَهَاءُ﴾ ئاماژەیان بۆ کرد. واتە: گەمژە و گەوج ئەو کەسەیە کە بەهۆی ڕق و لووتبەرزی و چێژی فانی‌یەوە وازی لە دواڕۆژی ئەودنیا هێنابێت، نەك ئەو کەسەی کە بە وازهێنانی لە خواستە نزم و فانی‌یەکانی دنیا، ئەودنیای نەبڕاوە و هەمیشەیی کڕی بێت.

پاشان ئەلف و لام لە ﴿السُّفَهَاءُ﴾دا بۆ ئەوەیە کە بڕیارەکە بکاتە شتێکی ناسراو، واتە شتێکی ئاشکرا و زانراوە کە ئەوانە "گەمژە"ن. هەروەك بۆ کەماڵە، واتە کەماڵی گەمژەیی لەواندایە.

سەبارەت بە ﴿وَلَكِن لا يَعْلَمُونَ﴾یش، ئەوا سێ ئاماژەی تێدایە:

یەکەمیان: جیاکردنەوەی حەق لە ناحەق و ڕێبازی ئیمانداران لە هی ئەوان، پێویستی بە زانست و تێڕوانین هەیە. بە پێچەوانەی خراپەنانەوە و ئاژاوەگێڕیی ئەوان، چونکە هێندە ئاشکرایە کە هەر کەسێك تۆزقاڵێ هەستی تێدا بێت پێی دەزانێت و هەستی پێ دەکات. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ئایەتی پێشووی بە: ﴿وَلَكِن لا يَشْعُرُونَ﴾ کۆتایی پێ هێنا.

دووهەمیان: ﴿لا يَعْلَمُونَ﴾ و هاوشێوەکانی تری لە کۆتایی ئایەتەکاندا، وەك ﴿لا يَعْقِلُونَ﴾ و ﴿أَفَلا تَتَفَكَّرُونَ﴾ و ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ و جگە لەمانەش، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئایینی ئیسلام لەسەر ژیری و دانایی و زانست دامەزراوە. کەواتە هەڵدەگرێت و شایستەی ئەوەیە کە هەموو ژیری‌یەکی ساغ قبووڵی بکات. بە پێچەوانەی ئەو ئایینانەی تر کە لەسەر چاولێکەری و دەمارگیری بنیات نراون.

جا ئەم ئاماژەیە مژدەیەکی تێدایە، وەك لە شوێنێکی تردا باس کراوە.

سێ‌هەمیان: فەرامۆش کردنیان و بایەخ نەدان پێیان. چونکە ئامۆژگاری سوودیان پێ ناگەیەنێت، لەبەر ئەوەی بە "نەزانی"ی خۆیان نازانن هەتا هەوڵی لابردنی بدەن.

ثم إنَّ ﴿إِنَّ﴾ مرآةُ الحقيقة ووسيلةٌ إليها، كأنّه يقولُ: راجِعوا الحقيقةَ لتعلموا أنَّ سفسطتَهم الظاهريةَ لا أصلَ لها.

ثم لفظُ ﴿هُم﴾ للحصر لردِّ تبرئةِ أنفسِهم، ودفعِ تسفيهِهم للمؤمنين الذي أشاروا إليه بـ﴿كَمَا ءَامَنَ السُّفَهَاءُ﴾. أي إنَّ السفيهَ مَن ترَكَ الآخرةَ بالغرور والغَرَض واللذةِ الفانيةِ دونَ مَن اشترى الباقيَ بتركِ الهَوَسات[1] الفانيةِ.

ثم إنَّ الألفَ واللامَ في ﴿السُّفَهَاءُ﴾ لتعريفِ الحُكمِ، أي معلومٌ أنّهم سفهاءُ. وللكمالِ أي كمالُ السفاهةِ فيهم.

أمّا: ﴿وَلكِنْ لا يَعْلَمُونَ﴾ ففيه إشاراتٌ ثلاث:

*إحداها*: أنَّ تمييزَ الحق عن الباطل وتفريقَ مسلكِ المؤمنين عن مسلكِهم محتاجٌ إلى نظرٍ وعلم، بخلاف إفسادِهم وفتنتِهم، فإنّه ظاهرٌ يحسُّ به مَن له أدنى شعور. ولهذا ذَيَّلَ الآيةَ الأولى بـ﴿وَلكِنْ لا يَشْعُرُونَ﴾.

*والثانية*: أنَّ ﴿لا يَعْلَمُونَ﴾ وأمثالَها من فواصل الآيات، مِن ﴿لا يَعْقِلُونَ﴾ و ﴿أَفَلا تَتَفَكَّرُون﴾ و ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُون﴾ وغيرِها تشيرُ إلى أنَّ الإسلاميةَ مؤسسةٌ على العقلِ والحكمةِ والعلمِ. فمِن شأنها أنْ يقبلَها كلُّ عقلٍ سليمٍ، لا كسائر الأديانِ المبنيةِ على التقليدِ والتعصبِ.

ففي هذه الإشارةِ بشارةٌ كما ذُكرت في موضعٍ آخَر.

*والثالثة*: الإعراضُ عنهم وعدمُ الاهتمام بهم، إذ النصيحةُ لا تجديهم، إذ لا يعلمون جهلَهم حتى يتحرَّوْا زوالَه.

---

(١) الهوس: طرف من الجنون وخفة العقل. والمقصود هنا الأغراض النفسية وأمانيها.

﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ ءَامَنُوا قَالُوا ءامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ۞ اللَّهُ يَسْتَهْزِىءُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ (البقرة: ١٤-١٥)

بزانە كە هۆی هۆنینی ناوەرۆكی ئەم ئایەتە لە رشتەی ناوەرۆكی ئایەتی پێشوودا: عەتف كردنەوەی چوارەم تاوانە، واتە "گاڵتە پێكردن و بەسووك سەیر كردن" بۆ سەر تاوانەكانی تر كە بریتین لە: "بە گەوج دانانی ئیمانداران و، خراپەنانەوەی ئەو دووڕووانە و، خراپكارییان".

هۆی پێكەوە هۆنینی نێوان ڕستەكانیشی ئەوەیە كە:

هەروەك ئەو ئیمانەی كە "خاڵی پشت پێ بەستن"ە بۆ دەرباز بوون لە ئازارەكان و، "خاڵی یارمەتی لێ وەرگرتن"یشە بۆ ئاواتەكان، سێ تایبەتكاریی ڕاستەقینەی هەیە:

یەكەمیان:

"دەروون بەرزی" كە لە خاڵی پشت پێ بەستنەوە پەیدا بووە. ئەو دەروون بەرزییەش بە جۆرێكە ڕێ بە مرۆڤ نادات داببەزێتە ئاستی خۆ زەلیل كردن..

دووهەمیشیان:

ئەو "شەفەقەت"ەی كە ڕێ لە مرۆڤ دەگرێت بێ ڕێزی و سووكایەتی بە هیچ كەسێك بكات..

سێهەمیشیان:

"ڕێزگرتن لە ڕاستییەكان و نرخ زانینیان". چونكە ئەو كەسەی خاوەنی شتی بەهادار بێت، دارای حەقیقەتێكە و گەوهەری تاقانەی لایە و، گاڵتەش بە "حەقیقەت" ناكات، چونكە مرۆڤێكی سەنگینە..

﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ ءَامَنُوا قَالُوا ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ * اللهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ (البقرة: ١٤- ١٥)

اعلم أنَّ وجهَ نظمِ مآلِ هذه الآيةِ بمآل سابقتِها: عطفُ الجناية الرابعةِ، أعني الاستهزاءَ والاستخفافَ على الجنايات السابقةِ من التسفيه والإفسادِ والفساد.

وأنَّ وجهَ النظمِ بين جملها هو أنّه: كما أنَّ للإيمان الذي هو نقطةُ استنادٍ عن الآلام ونقطةُ استمداد للآمال ثلاثَ خواصّ حقيقية:

إحداها: عزةُ النفسِ الناشئةُ من "نقطة الاستنادِ"، ومِن شأن عزةِ النفسِ عدمُ التنزّلِ للتذلّل.

والثانيةُ: الشفقةُ التي من شأنها عدمُ التذليل والتحقير.

والثالثةُ: احترامُ الحقائق ومعرفةُ قيمتها، لأنَّ صاحبَ غالي القيمة ذو حقيقةٍ، وعنده الجوهرُ الفريدُ. وعدمُ الاستخفاف بالحقيقة لأنّه أيضاً رزينٌ..

(هەروەك ئیمان ئەم سێ تایبەتكاری‌یەی هەیە)..

بە هەمان جۆر دژەکەشی، واتە "دووڕوویی" دژەکانی ئەم سێ تایبەتكاری‌یانەی لەخۆ گرتووە.

جا ئەو تایبەتكاری‌یانەی کە لە خودی "دووڕوویی"یەوە پەیدا بوون، بریتین لە:

دەروون نزمی و.. ئارەزووی خراپەنانەوە و.. لەخۆبایی بوون بەهۆی سووکایەتی کردن بە غەیری خۆی.

جا کە ئەمەت زانی، ئەوەش بزانە کە:

"دووڕوویی" نزمیی دەروونی لێ دەکەوێتەوە .. ئەویش خۆزەلیل کردن بەرهەم دەهێنێت.. ئەویش ڕیای لێ پەیدا دەبێت.. ئەویش "مەرایی کردن" بە دوای خۆیدا دەهێنێت.. ئەویش "درۆ" بەرهەمەکەیەتی.. خوای گەورە بە فەرمایشتی: ﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ ءامَنُوا قَالُوا ءامَنَّا﴾ ئاماژەی بۆ هەموو ئەمانە کرد.

پاشان لەبەر ئەوەی "دووڕوویی" دڵی مرۆڤ تێك دەدات و دەیشێوێنێت.. ئەو تێکچوون و شێواندنەشی "هەتیوکەوتنی ڕۆح" بەرهەم دەهێنێت، واتە: نەبوونی خاوەن و پارێزەر، ئەوا "ترس" دروست دەبێت.. ئەویش بۆ "خۆشاردنەوە" ڕایدەپێچێت. خوای گەورە بە وشەی: ﴿وَإِذَا خَلَوْا﴾ ئاماژەی بۆ ئەمە کرد.

پاشان لەبەر ئەوەی "دووڕوویی" سیلەی ڕەحم دەبڕێت.. ئەو بڕینەش "شەفەقەت" ناهێڵێت.. نەمانی شەفەقەتیش خراپەنانەوە و تێکدان بەرهەم دەهێنێت.. ئەویش ئاژاوەگێڕی دەنێتەوە.. ئەویش "خیانەت" بە دوای خۆیدا دەهێنێت.. ئەویش "لاوازی"ی لێ پەیدا دەبێت.. ئەویش ناچاری دەکات کە هانا بۆ پەنا و پشتیوانێك بیات. ئەوا خوای گەورەش لەبەر ئەوە، بە وشەی: ﴿إِلَى شَيَاطِينِهِمْ﴾ ئاماژەی بۆ هەموو ئەمانە کرد.

پاشان لەبەر ئەوەی "دووڕوویی" نەزانی‌یەکی ئاوێتەی دوودڵی‌یە، ئەوا ڕاڕایی بوون لە سروشتی کەسەکەدا بەرهەم دەهێنێت، ئەویش "نادامەزراوی"ی لێ دەکەوێتەوە.. ئەویش "بێ ڕێبازی"ی بە دوادا دێت، ئەویش دەرەنجامەکەی "نائەمینی دەبێت لە دووڕووەکان".. ئەویش ناچاریان دەکات کە پەیمانەکەیان نوێ بکەنەوە. ئەوا خوای گەورە بە وشەی: ﴿قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ﴾ ئاماژەی بەم زنجیرەیە دا.

كذلك لضِدِّ الإيمان، أعني النفاقَ، أضدادُ خواصّه الثلاث..

فخواصُّ النفاق الناشئةُ منه:

ذلةُ النفس، وميلُ الإفساد، والغرورُ بتحقير الغير.

إذا عرفتَ هذا، فاعلمْ:

أنَّ النفاقَ يولِّدُ ذلةَ النفس، وهي تُنتِجُ التذلل، وهو الرياءَ، وهو المداهنةَ، وهي الكذبَ.

فأشارَ اليه بقوله:

﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ ءَامَنُوا قَالُوا ءَامَنَّا..﴾.

ثم لما كان النفاقُ مُفسِداً للقلب، وفسادُه يُنتجُ يُتْمَ الروحِ، أي عدمَ الصاحب والحامي والمالك، فيتولّدُ الخوفُ، وهو يُلجِئه إلى التستر، أشارَ إليه بلفظ:

﴿وَإِذَا خَلَوْا﴾.

ثم لما كان النفاقُ قاطعاً للرَّحِم، وقطعُه يُزيلُ الشفقةَ، وزوالُها يُنتجُ الإفسادَ، وهو الفتنةَ وهي الخيانةَ، وهي الضعفَ، وهو يضطرُّه إلى الالتجاء إلى ظهيرٍ ومُستنَد، أشار إليه بلفظ:

﴿إِلَى شَيَاطِينِهِمْ﴾..

ثم لَمّا كان النفاقُ جهلاً تردُّدياً أنتجَ تذبذبَ الطبيعةِ، وهو عدمَ الثبات وهو عدمَ المسلكِ وهو عدمَ الأَمنية بهم، وهو يُجبرُهم على تجديد عهدهم، أشار إلى هذه السلسلة بلفظ:

﴿قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ﴾.

پاشان لەبەر ئەوەی دووڕووەکان موحتاجی "پۆزش هێنانەوە" بوون، ئەوا بەهۆی سووکیی خۆیانەوە، گاڵتە و سووکایەتی‌یان بە "حەقیقەت" کرد و..

بەهۆی بێ نرخی‌یانەوە لە بەهای شتی بەنرخیان دابەزاند و..

لەبەر ئەو سووکی و لاوازی‌یەی دەروونیان کە لووتبەرزیی لێ پەیدا دەبێت، گاڵتەیان بە شتانی بڵند و بەها باڵاکان کرد..

ئەوا قورئانیش بۆ ئاماژەدان بەوان، فەرمووی:

﴿قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ﴾.

پاشان کاتێ بیسەر، بەپێی دارشتنی ئەم گوفتارە، چاوەڕوانی ئەوە بوو کە "ئیمانداران" بەرەنگاری دووڕووەکان ببنەوە، کەچی بینیی خوای گەورە خۆی، لە بریی ئیمانداران، بەرەنگاریان دەبێتەوە!

ئەوەش ئاماژەیە بۆ ڕێزنان لە ئیمانداران و، هێمایەکیشە بۆ ئەوەی کە گاڵتەکردنی دووڕووان پێیان وەك هیچ وایە لە بەرامبەر ئەو پاداشتەی خوای گەورەدا. هەروەك هێمایەکیشە بۆ گەوجێتیی دووڕووەکان و سەرزەنشتیان و بەرپەرچدانەوەیان، چونکە چۆن گاڵتە بە کەسێك دەکرێت کە خوای گەورە پارێزەری بێت؟

بۆیە خوای گەورە فەرمووی: ﴿اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ﴾.

واتە لە شێوەی سووکایەتی پێکردندا، چ لە دنیا و چ لە قیامەتدا، سزایەکی سەختیان دەدات لەسەر گاڵتەکردنەکەیان بە ئیمانداران، هاوکات لەگەڵ نوێ بوونەوەی بەردەوامی ئەو سزایەدا[1].

ئنجا ڕستەی ﴿وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ لە شێوازی گاڵتەکردندا بەو دووڕووانە، سزای سووکایەتی و گاڵتەکردنەکەیان وێنا دەکات و بە درێژی دەیخاتە پێش چاو.

سەبارەت بە هۆی هۆنینی یەك بە یەکی ڕستەکانیش لەم ڕشتەیەدا، ئەوا بزانە کە:

ڕستەی: ﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا﴾ کە لەبارەی مەرایی کردنی دووڕووانەوە بۆ ئیمانداران، هێنراوە، ئەمانەی تێدایە:

---

(١) بە ئاماژەی ڕستەی فیعلیی ﴿يَسْتَهْزِئُ﴾. (وەرگێڕ)

ثم لمّا احتاجوا إلى الاعتذار استخفُّوا بالحقيقةِ لخفّتِهم..

ورخَّصُوا غاليَ القيمةَ لعدم قيمتِهم..

وأهانوا بالعالي لهَوْن نفسِهم وضعفِها الذي ينشأُ منه الغرورُ، فقال:

﴿قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ﴾..

ثم بينما كان السامعُ منتظراً من انصباب الكلامِ مقابلةَ المؤمنين لهم، رأى أنَّ اللهَ قابلَهم بدلاً عن المؤمنين، إشارةً إلى تشريفهم، ورمزاً إلى أنَّ استهزاءَهم في مقابلة جزاءِ الله تعالى كالعدم، وإيماءً إلى حُمقهم وزجرهم وردِّهم؛ إذ كيف يُستَهْزأُ بمَن كان اللهُ حاميَه؟ فقال تعالى:

﴿اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ﴾..

أي يعاقبُهم على استهزائهم أشدَّ جزاءٍ بصورةِ استخفافٍ وتهكُّمٍ بهم في الدنيا والآخرةِ مع الاستمرارِ التجدديّ..

وجملةُ ﴿وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ كشفٌ وتفصيلٌ وتصويرٌ لجزاء استهزائِهم بطرزِ الاستهزاء.

أما وجهُ نظمِ هيئاتِ كلِّ جملةٍ جملةٍ:

فاعلم أنَّ جملةَ ﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ ءَامَنُوا قَالُوا ءَامَنَّا﴾ التي سيقت في مُداهنتهم:

بێ گومانی لە ﴿إِذَا﴾دا هێمایە بۆ بڕیاری کۆتایی و کاری بە ئەنقەست. واتە: ئەو دووڕووانە ئامانجیان بووە و، بە مەبەستێك چاوپێکەوتن و گفتوگۆیان لەگەڵ ئیمانداراندا کردووە.

وشەی ﴿لَقُوا﴾ هێمایە بۆ ئەوەی کە دووڕووەکان بە ئەنقەست ویستوویانە لە ڕێگاوبانەکان و لە نێوان خەڵك و پێش چاویاندا ڕووبەڕووی ئیمانداران ببنەوە..

وشەی ﴿الَّذِينَ ءامَنُوا﴾ لە بریی "المؤمنين" ئاماژەیە بۆ بینینی ڕووبەڕووی ڕاستەوخۆ و بێ پەردە.. هەروەها بۆ ئەوەی کە لە ڕووی سیفەتی "ئیمان"ی ئیماندارانەوە ئەو پەیوەندییە لە نێوانیاندا بووە.. هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەش کە تەنها سیفەتی "ئیمان"ە لە نێوان سەرجەم سیفەتەکانی تری ئیمانداراندا لێرەدا جێی تێڕوانینە.

وشەی ﴿قَالُوا﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە دووڕووەکان بە دەم شتێك دەڵێن کە لە دڵیاندا نییە و، قسەکەشیان بۆ خۆنواندن و ڕیا و مەرایی و تۆمەت لەسەر خۆ لابردن و هەڵپەی بەدەستهێنانی سوودەکانی ئیمانداران و بەئاگابوونەوەشە لە نهێنییەکانیان.

وشەی ﴿ءامَنَّا﴾ کە لێرەدا بە بێ "تەوکید"(جەخت) هێنراوە، لە کاتێکدا شوێنەکەی "تەوکید" دەخوازێت[1].. هەروەها هێنانی لە شێوەی ڕستەی کرداریدا، ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە هیچ شەوقێکی هاندەر و عیشقێکی بزوێنەر لەناو دڵیاندا نییە بۆ ئەوەی کە بە توندوتۆڵی و گەرموگوڕی گوفتارەکەیان دەربڕن..

هەروەها وازهێنانیش لە تەوکید هێمایەکی تێدایە بۆ توندوتۆڵییان لە دوورخستنەوەی تۆمەتەکە لەسەر خۆیان[2]! وەك ئەوەی بڵێن: "نکوولیی ئێوە کارێکی بێ جێیە، تەنانەت لە پلەی نەبوودایە، چونکە ئێمە شایانی تۆمەت نین"..

هەروەها هێمایەکە بۆ ئەوەی کە ئەگەر تەوکیدیش بکرێت، لای ئیمانداران برەوێك بە قسەکەیان نادات.. هەروەها ئاماژەیەکیشە بۆ ئەوەی کە ئەگەر ئەم پەردە لاواز و تەنکەی سەر ڕووی درۆکەیان زۆری لێ بکرێت، دەدڕێت و پارچە پارچە دەبێت..

(١) چونکە وتەکەیان جێی گومان و نکوولییە لای ئیمانداران، کەواتە دەبوو لەم حاڵەدا - بە پێی خواستی ڕەوانبێژی - تەوکیدیان لەگەڵدا بهێنایە، کەچی بە بێ تەوکید قسەکەیان کرد. (وەرگێڕ)

(٢) واتە: تەوکید کاتێ دەهێنرێت کە قسەکەیان جێی گومان و نکوولی بێت، بەڵام ئەوان تەوکیدیان نەکرد، تاکو تۆمەتی ئەوە لەسەر خۆیان لابدەن کە قسەکەیان جێی گومانە! (وەرگێڕ)

قطعيةُ ﴿إِذَا﴾ فيها إيماءٌ إلى الجزم والتعمُّدِ والقصد، أي عزموا بعَمدٍ وقصد ملاقاتَهم..

ولفظُ ﴿لَقُوا﴾ إيماءٌ إلى أنّهم تعمَّدوا مصادفتَهم في الطرق بين ظهرانَي الناس..

ولفظُ ﴿الَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ بدلَ "المؤمنين" إشارةٌ إلى مباشرتِهم معهم وتماسّهم بهم، وإلى أنّ ارتباطَهم معهم بصفةِ الإيمان، وإلى أنّ مدارَ النظر بين أوصاف المؤمنين صفةُ الإيمان فقط.

ولفظُ ﴿قَالُوا﴾ تلويحٌ إلى أنّهم يقولون بأفواههم ما ليس في قلوبهم، وأنّ قولَهم للتصَنُّعِ والرياءِ والمداهنةِ ودفعِ التهمة والحرصِ على جلبِ منافعِ المؤمنين والاطلاعِ على أسرارهم.

ولفظُ ﴿ءَامَنَّا﴾ بلا تأكيدٍ مع اقتضاءِ المقام إياه، وبإيرادِه جملةً فعليةً، إشارةٌ إلى أنْ ليس في قلوبهم مشوِّقٌ وعشقٌ محرِّكٌ ليتشدَّدوا ويتجلَّدوا في كلامهم..

وأيضاً إنّ في ترْك التأكيد إيماءً إلى تشدُّدِهم في دفع التهمة عنهم، كأنهم يقولون:

"إنكارُكم ليس في موقعه بل في منـزلة العدم، إذ لسنا أهلاً للتهمة"..

وأيضاً فيه رمزٌ إلى أنّ التأكيدَ لا يروِّجُ عنهم..

أيضاً فيه لمحٌ إلى أنّ هذا الحجابَ الرقيقَ الضعيفَ على الكذبِ إذا شُدِّدَ تمزّقَ..

هەروەها فیعلی بوونی گوفتارەکەش، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو دووڕووانە ناتوانن لافی دامەزراوی و بەردەوامی لەسەر قسەکەیان لێ بدەن، بەڵکو تەنیا ئامانجیان لەم خۆنواندنەدا هاوبەشی کردنیانە لەو سوودانەی کە ئیمانداران بەدەستیان دەهێنن و، ئاگاداربوونەوەشیانە لە نهێنییەکانی ئەوان، ئەوەش بە لاف لێدانی سەرهەڵدانی ئیمان لە دڵیاندا.

سەبارەت بە ڕستەی: ﴿وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ﴾یش، ئەوا:

بەکارهێنانی "واو"ی عەتف کە خۆی لە خۆیدا بۆ کۆکردنەوەی حوکمە جیاجیاکانە، لە وشەی ﴿وَإِذَا﴾دا، ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە ئەم گوفتارە بۆ ئەوە هێنراوە ڕوونی بکاتەوە ئەوانە خاوەنی هیچ ڕێبازێك نین، هەروەها بۆ ڕوونکردنەوەی ڕاڕایی ئەوانە کە بەم دوو ڕستەی مەرجە[1] بە درێژی ڕوون کراوەتەوە.

بێگومانی لە ﴿إِذَا﴾دا هێمایەکە بۆ ئەوەی کە ئەوان بە حوکمی تایبەتکاریی "خراپەکردن" و "خراپەنانەوە"ی دووڕوویيەکەیان، پێیان وایە "هانابردن" بۆ پشت و پەنایەك، ئەرکێکی سروشتیی پێویستە..

وشەی ﴿خَلَــوْا﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەوان بە پێی ئەو "ناپاکی"یەی کە لە "دووڕوویی"دا هەیە هەردەم لە مەترسیدان و، هەر لەبەر ترسیش خۆیان دەشارنەوە و ڕاستیی خۆیان ئاشکرا ناکەن.

بەکارهێنانی وشەی ﴿إِلَى﴾ لە بریی بەکارهێنانی "مَعَ" کە گونجاوتر بوو بۆ ﴿خَلَوْا﴾ ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە ئەوان لەبەر دەستەوسانی و لاوازییان پەنا بۆ داڵدەیەك دەبەن.. هەروەها بەپێی خووی ئاژاوەگێڕی و خراپەنانەوەی دەرەنجامی دووڕوویی، دەچن نهێنییەکانی ئیمانداران دەبەن بۆ کافران..

وشەی ﴿شَيَاطِينِ﴾ ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە سەرکردەکانیان بە وێنەی شەیتانەکان خۆیان دەشارنەوە و گومان و دوودڵی دەخەنە دڵەکانەوە.. هەروەها بۆ ئەوەش کە بە وێنەی شەیتانەکان زیانبەخشن و، بۆ ئەوەش کە لەسەر ڕێڕەوی شەیتانەکانن؛ جگە لە شەڕ و خراپە، بیریان بە لای شتی تردا ناچێت.

---

(١) واتە: ﴿وَإِذَا لَقُواْ الَّذِينَ ءامَنُواْ﴾ و ﴿وَإِذَا خَلَوْاْ إِلَى شَيَاطِينِهِمْ﴾. (وەرگێڕ)

وأيضاً في فعليته إشارةٌ إلى أنّه لا يمكنُ لهم أنْ يدَّعوا الثباتَ والدوامَ، وإنما غرضُهم من هذا التصَنُّعِ الاشتراكُ في منافع المؤمنين والاطلاعُ على أسرارهم بادّعاءِ حدوثِ الإيمان.

وأما جملةُ ﴿وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ﴾..

فـ"الواو" الجامعةُ في ﴿وَإِذَا﴾ إيماءٌ إلى أنَّ هذا الكلامَ سيقَ لبيان أنْ لا مسلَكَ لهم، ولبيان تذبذُبِهم المفصَّلِ بهاتين الشرطيتين.

والجزميةُ في ﴿إِذَا﴾ رمزٌ إلى أنَّهم بحكم الفسادِ والإفسادِ يرَوْن الالتجاءَ وظيفةً ضرورية.

ولفظُ ﴿خَلَوْا﴾ إشارةٌ إلى أنهم بحُكمِ الخيانةِ يتخوَّفون، وبحكمِ الخوفِ يتَسَتَّرون..

ولفظُ ﴿إِلَى﴾ بدلَ "مع" المناسبِ لِـ﴿خَلَوْا﴾ إشارةٌ إلى أنَّهم بحكمِ العَجزِ والضعف يلتجئون، وبحكمِ الفتنةِ والإفسادِ يوصِلون أسرارَ المؤمنين إلى الكافرين..

ولفظُ الـ﴿شَيَاطِينِ﴾ إشارةٌ إلى أنَّ رؤساءَهم كالشياطين متستِّرون موَسْوِسون، وإلى أنَّهم كالشياطين يُضرّون، وإلى أنَّهم على مذهب الشياطين لا يتصورون إلّا الشرَّ.

ڕستەی ﴿قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ﴾یش، کە بۆ ئەستۆپاکیی خۆیان لای شەیتانەکانیان و، نوێکردنەوەی پەیمان لەگەڵیان و، دامەزراوی لەسەر ڕێبازەکەیان هێنراوە.. ئەوا بزانە لەم شوێنەدا کە هیچ کەسێك نییە نکوولی لەم بڕیارەیان بکات، دەبینی تەوکیدی بەکارهێنا[1]، کەچی لەوێ[2] لەگەڵ بوونی نکوولیشدا تەوکیدی نەهێنا! ئەمەش ئاماژە و بەڵگەیە لەسەر نەبوونی هاندەری بزوێنەر لە دڵی قسەکەردا لەوێ و، بوونیشی لێرەدا!

ئنجا ئیسمی بوونی ڕستەکەی ئێرە و، فیعلی بوونی ڕستەکەی ئەوێ[3]، مەبەست سەلماندنی دامەزراوی و جێگیریی ئەوەی ئێرە و، تازەیی (و ناجێگیریی) ئەوەی ئەوێیە!

سەبارەت بە ڕستەی ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

لێرەدا "پیتی عەتف"ی بەکار نەهێنا (واتە عەتفی نەکردە سەر "إنا معکم"ی ڕستەی پێشوو) چونکە پەیوەستکردنی دوو ڕستە[4] کاتێك دەبێت کە پەیوەندییەکەیان "ناوەند" بێت لە نێوان "ئەوپەڕی پەیوەستی" و "ئەوپەڕی لێکدابڕاوی"دا. کەچی پەیوەندیی ئەم ڕستەیە بەوەی پێشوو لە ڕوویەکەوە "بەدەل"ی ئەوە و، لە ڕوویەکی ترەوە "تەوکید"ە بۆی، کە هەریەك لەم دوانەش لەوپەڕی پەیوەست بووندان بەو ڕستەیەی کە دەبنە "تەوکید" یان "بەدەل"ی. هەروەها ئەم ڕستەیە، لە ڕوویەکی دیکەوە، وەڵامی پرسیارێکی نادیاری گریمان کراوە، کە ئەوەش ئەوپەڕی لێك دابڕاویی ئەو دوو ڕستەیە دەردەخات، لەبەر ئەوەی زۆربەی جار وەڵامەکە ڕستەیەکی "خەبەری" و پرسیارەکەش ڕستەیەکی "ئینشائی" دەبێت.. (کە ئەو دوو جۆرە ڕستەیەش لەوپەڕی لێکدابڕاویدان)..

هۆی تەوکیدکردنەکە - هۆی بەدەلەکەش لەمەوە نزیکە - ئەوەیە کە دەرەنجامەکەی سووکایەتی کردنە بە حەق و شوێنکەوتووانی حەق، کە ئەوەش دەبێتە ڕێزلێگرتن و بە گەورە دانانی ناحەق و شوێنکەوتووانی. خۆ دەرەنجامی ﴿إِنَّا مَعَكُمْ﴾یش هەر ئەوەیە.

---

(١) کە پێویست بە تەوکید ناکات. (وەرگێڕ)

(٢) واتە: لە ئایەتی: ﴿قَالُوا ءَامَنَّا﴾دا. کە قسەکەی ئەوان پێویستی بە تەوکید هەبوو.

(٣)ڕستەکەی ئێرە، واتە: ﴿إِنَّا مَعَكُمْ﴾.. ڕستەکەی ئەوێ واتە: ﴿ءَامَنَّا﴾. (وەرگێڕ)

(٤) واتە بە پیتی عەتف، وەك لە ڕەوانبێژیدا ڕوون کراوەتەوە. (وەرگێڕ)

وأما جملةُ ﴿قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ﴾ الـمَسوقةَ لتبرئة ذمّتِهم وتجديدِ عهدِهم وثباتِهم في مسلكِهم، فاعلم:

أنّه أكّدَ مع غير الـمُنكِر هنا، وتَرَكَ التأكيدَ مع المنكِر هناك[١] إشارةً ودلالةً على عدم الشوق المحرِّكِ في قلب المتكلمِ هناك ووجودِه هنا.

أما اسميةُ هذا وفعليةُ ذاك، فلأنَّ المقصودَ إثباتُ الثبوتِ والدوامِ في ذا، والحدوثِ في ذلك.

أما ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ﴾ فاعلم:

أنّه لم يَعطفْ، إذ الوصلُ إنما هو بالتوسط بين كمالِ الاتصالِ وكمالِ الانقطاعِ. مع أنَّ هذه الجملةَ بدلٌ بجهةٍ وتأكيدٌ بجهة، وهما من كمالِ الاتصالِ، وجوابُ سؤالٍ مقدَّر بجهة أخرى، وهو من كمال الانقطاع لخبَرية الجواب وإنشائيةِ السؤال في الأغلب..

أمّا وجهُ التأكيد - ويقرُبُ منه البدَلُ - فهو أنَّ مآلَها إهانةُ الحقِ وأهلِه فيكونُ تعظيماً للباطلِ وأهلِه، وهو مآلُ ﴿إِنَّا مَعَكُمْ﴾..

---

(١) أي في الآية: ﴿ءَامَنَّا﴾ بلا تأكيد.

هۆی ئەوەش كە ئەم ڕستەیە وەڵامی پرسیارێكی گریمانكراو بێت، بەم جۆرەیە كە: شەیتانەكانیان وەكو ئەوەی پێیان بڵێن:

"ئەگەر لەگەڵ ئێمەدان و لەسەر ڕێبازمانن، بۆچی لەگەڵ ئیماندارانیدا ڕێكن؟ كەواتە ئێوە یان لەسەر ڕێرەوی ئەوانن، یان هیچ ڕێباز و ڕێرەوێكتان نییە"!

دووڕووەكانیش پۆزشیان بۆ شەیتانەكانیان هێنایەوە و، لە وەڵامدا وتیان: ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ﴾.

ئیتر بە ڕاشكاوی دانیان بەوەدا نا كە هیچ پەیوەندییەكیان بە ئیسلامەوە نییە.

بەو "تایبەتكردن"ەش كە لە وشەی ﴿إِنَّمَــــا﴾دایە، ئاماژەیان بەوە دا خەڵكانێكی "ڕاڕا" و "بێ ڕێبازی زانراو" نین.

بە ئیسمی بوونی ﴿مُسْتَهْزِءُونَ﴾یش ئاماژەیان بەوە دا كە گاڵتەكردن و سووكایەتی نواندن، سیفەتی بەردەوامیانە و، ئەو ڕەفتارەیان (كە بە ڕواڵەت بۆ ئیمانداری‌یە) لەگەڵ ئیماندارانیدا كارێكی ڕاستەقینە و جیددی نییە.

ئنجا بزانە كە ڕستەی ﴿اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ﴾ پەیوەست نەكراوە بە هیچ یەكێك لە ڕستەكانی پێشوو (واتە عەتف نەكراوەتە سەر هیچ كامیان). چونكە ئەگەر عەتف بكرایە ئەوا:

یان عەتف دەكرایە سەر ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ﴾. خۆ ئەو كاتە ئەم ڕستەیەش دەبووە تەوكیدێكی تری ﴿إِنَّا مَعَكُمْ﴾[1]..

یان عەتف دەكرایە سەر ﴿إِنَّا مَعَكُمْ﴾. ئەو كاتە ئەوەی دەگەیاند كە ئەمەش قسەی دووڕووەكان بێت..

یان عەتف دەكرایە سەر ﴿قَالُوا﴾. خۆ ئەوەش وا دەخوازێ كە گاڵتەكردنی خوای گەورە بەوان لەو كاتانەدا بێت كە بە پەنهانی دەچنە لای شەیتانەكانیان. كەچی گاڵتەی خوای گەورە بەوان هەمیشە و بەردەوامە.

یان عەتف دەكرایە سەر ﴿إِذَا خَلَوْا﴾. كە ئەوەش وا دەخوازێ پاشماوەی سیفەتی ڕاڕاییەكەیان بێت (كە وا نییە)..

---

(١) واتە: ئەو كاتە ئەوەی دەگەیاند كە قسەی دووڕووەكان بێت و، بڵێن: "خوا گاڵتە بە ئیمانداران دەكات"! كە وا نییە. (وەرگێڕ)

وأما وجهُ الجوابيةِ للسؤال المقدَّرِ، فكأنَّ شياطينَهم يقولون لهم:

"إنْ كنتم معنا وفي مسلكِنا فما بالُكم توافقون المؤمنين؟ فإما أنتم في مذهبِهم أو لا مذهبَ لكم".

فاعتذَروا مجيبين بـ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ﴾..

فصرَّحوا بأنَّهم ليسوا من الإسلام في شيء..

وأشاروا بحصر ﴿إِنَّمَا﴾ إلى أنَّهم ليسوا مُذبذَبين بلا مذهبٍ معلوم..

وباسمية ﴿مُسْتَهْزِءُونَ﴾ إلى أنَّ الاستهزاءَ شأنُهم وصفتُهم. ففعلُهم هذا ليس بالجِدّ.

وأما جملةُ ﴿اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ﴾ فاعلم أنَّها لم توصَلْ بسوابقها بل فُصِلت فصلاً..

لأنها لو عُطفت، فإمّا على ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ﴾ وهو يقتضي أنْ تكونَ هذه أيضاً تأكيداً لـ﴿إِنَّا مَعَكُمْ﴾..

وإمّا على ﴿إِنَّا مَعَكُمْ﴾ وهو يقتضي أنْ تكونَ هذه أيضاً مقولاً لهم..

وإمّا على ﴿قَالُوا﴾ وهو يقتضي أنْ تكونَ هذه أيضاً مقيدةً بوقت الخلوةِ، مع أنَّ استهزاءَ الله بالدوامِ..

وإمّا على ﴿خَلَوْا﴾ وهو يقتضي أنْ تكونَ هذه من تتمة صفةِ تَذَبْذُبِهم..

یان عەتف دەكرایە سەر ﴿إِذَا لَقُـــوا﴾. كە ئەوەش داخوازی ئەوە دەبوو ئامانجی هەردوو ڕستەكە یەكێك بێت، لە كاتێكدا كە ڕستەی یەكەمیان بۆ دەرخستنی كارەكەیانە و، ڕستەی دووهەمیشیان[1] بۆ سزای ئەو كارەیانە..

(جا ئەگەر ئەم ڕستەیە عەتف بكرایەتە سەر هەركام لەو ڕستانەی باس كران، ئەوا یەكێك لەو خواستانەی پێشوو دەهاتە كایەوە كە باس كران)..

خۆ هەموو یەكێكی ئەو خواستانەش بەتاڵن و، هیچ كامیان بۆ ئەوە دەست نادەن كە ئەم ڕستەیە عەتف بكرێتەوە سەریان..

كەواتە تەنها ئەو گریمانە ماوەتەوە كە دەسپێكی ڕستەیەكی سەرلەنوێ (مُســـتأنَف) بێت، لە وەڵامی پرسیارێكی چاوەڕوانكراودا. (واتە پێویست دەكات دابڕێت لە ڕستەكانی پێشوو).

ئنجا ئەم دەستپێكە سەرلەنوێیەش ئاماژە و هێمایەكی تێدایە بۆ ئەوەی كە خراپەكاری و چەپەڵیی ئەوان گەیشتووەتە ڕادەیەكی ئەوتۆ ڕۆحی هەموو بیسەر و بینەرێك ڕاپێچی ئەم پرسیارە بكات كە ئایا:

"سزای ئەو كەسە چۆنە كە ئەمە كرداری بێت"؟

پاشان دەستپێكی ڕستەكە بە وشەی ﴿اللهُ﴾ لە كاتێكدا كە زەینی بیسەر چاوەڕێی ئەوە بوو بەرەنگاربوونەوەی "ئیمانداران" بەرامبەر بەوان ببیستێ، ئاماژەیەكە بۆ ڕێزنان لە ئیمانداران و دەربڕینی سۆز و میهرەبانیی خوای گەورە بۆیان، چونكە لە بریی ئەوان خوای گەورە خۆی بەرەنگاری دووڕووەكان بووەوە..

هەروەها ئەم وشەیە هێمایەكە بۆ سەرزەنشتی دووڕووان، چونكە گاڵتە بە كەسێك ناكرێت كە پشتی بە خوای زانای پەنهانەكان بەستبێت..

هەروەها بە دابڕكردنی ڕستەكە لەوەی پێشوو، هەروەها گوێ نەدان بە جێگیربوونی گاڵتەكردنەكەیان، ئاماژە دەكات بۆ ئەوەی كە گاڵتەكردنەكانی ئەوان لەچاو سزاكەیدا وەكو "نەبوو" وایە.

پاشان گوزارشت كردن لە سزاكانی خوای گەورە لەسەر ڕەفتاری ئەو دووڕووانە بە وشەی "گاڵتە پێكردن" - كە بۆ شكۆمەندیی خوای گەورە ناشێت -

---

(١) ڕستەی یەكەم: ﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ ءامَنُوا﴾، ڕستەی دووهەم: ﴿اللهُ يَسْتَهْزِىءُ بِهِمْ﴾. (وەرگێڕ)

وإما على ﴿إِذَا لَقُوا﴾ وهو يستلزمُ أنْ يكونَ الغرضُ منهما واحداً. مع أنَّ الأولَ لبيان العمل، والثاني للجزاء..

واللوازم باطلة. فالوصلُ لا يصحُّ..

فلَم يبقَ إلّا أنْ تكونَ مُستأنَفَةً جواباً لسؤال مُقدَّر.

ثم إنَّ في هذا الاستينافِ إيماءً ورمزاً إلى أن شناعتَهم وخباثتَهم بلغتْ درجةً تُجبرُ روحَ كلِّ سامعٍ و راءٍ أنْ يسألَ بـ"كيف جزاءُ مَن هذا عملُه؟".

ثم إنَّ الافتتاحَ بلفظة ﴿اللهُ﴾ مع أنَّ ذهنَ السامع كان منتظراً لتلقي مقابلةِ المؤمنين معهم، إشارةٌ إلى تشريف المؤمنين وترحُّمه عليهم، إذ قد قابلَ بدلاً عنهم..

وأيضاً رمزٌ إلى زَجرهم؛ إذ لا يُستهزَأُ بمَن استناده بعلّامِ الغيوب..

وأيضاً إيماءٌ بالاقتطاع وعدم النظر إلى تقرر استهزائهم، إلى أن استهزاءَهم كالعدم بالنظر إلى جزائه..

ثم إنَّ التعبيرَ عن نكايات الله تعالى معهم بالاستهزاء - الذي لا يليقُ بشأنه تعالى -

بە مەبەستی هاوشێوەیی(موشاکەلە)یە لە هاوڕێیەتیی وشەکاندا[١] و، هێمایەکیشە بۆ ئەوەی کە زاڵبوونی خوا بەسەریاندا، سزا و دەرەنجام و خواستی گاڵتەکردنیانە بە ئیمانداران، لێرەشدا "لازم"ی گاڵتەکردنەکە مەبەستە، کە سووکایەتی پێکردنیانە..

هەروەها ئاماژەیەکە بۆ ئەوەش کە ئەو گاڵتەکردنە بێ سوودە زیان بەخشەی ئەوان، خودی گاڵتەکردنی خوایە پێیان..

ئەوان لەمەدا وەکو ئەو کەسەوان کە پێی وایە گاڵتە دەکات، کەچی تۆ بە وێنەی شێتێك بۆی دەڕوانیت؛ دەتەوێ بدوێت، تەنانەت گەر جوێن بە خۆیشت بدات، تاکو پێی پێ بکەنیت! کەواتە گاڵتەکردنەکەی ئەو بە تۆ بەشێکە لە گاڵتەکردنی تۆ بەو!

پاشان لە بەکارهێنانی ﴿يَسْتَهْزِئُ﴾دا کە فیعلی موزاریعە، لە کاتێکدا کە وشەی پێشوو ﴿مُسْتَهْزِءُونَ﴾ ئیسمی فاعیل بوو، ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە سزای خوا لەسەریان و سووکایەتی پێکردنیان، نوێ دەبێتەوە لەسەریان[٢]، تاکو هەست بە ئازاری بکەن و بکەونە ژێر کاریگەرییەوە. چونکە ئەگەر ئەو سزایە لەسەر یەك ڕەوت و شێواز بەردەوام بوایە[٣]، ئەوا کاریگەریی سزاکە لەسەریان کەم دەبووەوە، بەڵکو لەوانەشە هەر نەمایە. هەر لەبەر ئەوەیە کە وتراوە: "مەرجی هەست پێکردن جیاوازییە".

﴿وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾یش، واتە: ئەو دووڕووانە دەستیان لە داوێنی هۆکارەکانی گومڕایی گیر کرد و، خۆیان داوای گومڕاییان کرد و خواستیان. خوای گەورەش ئەو خواستەی خۆیانی پێ دان..

---

(١) "هاوشێوەیی"(موشاکەلە) لە ڕەوانبێژیدا بەوە دەوترێ کە شتێك بە وشەیەکی غەیری خۆی گوزارشتی لێ بکرێت، لەبەر ئەوەی بە هاوڕێیەتیی ئەو وشەیە و پێکەوە هاتبن. وەك لە قورئاندا لەسەر زمانی حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - هاتووە: ﴿تعلمُ ما في نفسي ولا أعلمُ ما في نفسك﴾ مەبەستی لە: ﴿ولا أعلمُ ما في نفسك﴾ ئەوەیە کە: "ولا أعلم ما عندك". یاخود گەر کەسێکی هەژارت بینی، گومانت وابوو برسییەتی، بەڵام ئەو پێویستی بە پۆشاك بوو، پێت وت: حەزت لە چ خواردنێکە بۆت بکوڵێنم؟ ئەویش بڵێ: شەرواڵ و کراسێکم بۆ بکوڵێنە! مەبەستی لە "بۆ بکوڵێنە" ئەوەیە کە (بۆم بدوورە)! یان گەر ئەو برسیی بێت، تۆ پێی بڵێیت: چ پۆشاکێکت بۆ بدوورم؟ ئەویش بڵێت: کولێرەیەکم بۆ بدوورە! (وەرگێڕ)

(٢) لەبەر ئەوەی ڕستەی فیعلی تازەبوونەوە دەخوازێت، بۆیە لێرەدا بە ڕستەی فیعلی فەرمووی: ﴿يَسْتَهْزِئُ﴾. (وەرگێڕ)

(٣) وەك ئەوەی ڕستەی ئیسمی دەیخوازێت، گەر لێرەشدا بە دارشتنی ئیسمی فاعیل بفەرموایە: "مُسْتَهْزِئٌ". (وەرگێڕ)

للمُشاكَلَةِ في الصُحبةِ، وللرمزِ إلى أنَّ النكايةَ جزاءٌ للاستهزاءِ ونتيجةٌ ولازمةٌ له، مع أنَّ المرادَ لازمُ الاستهزاءِ، أعني التحقيرَ..

وأيضاً إيماءٌ إلى أنَّ استهزاءَهم الذي لا يفيدُ بل يضرُّ، عينُ استهزاءِ الله تعالى معهم؛ كمَن يظنُ أنّه يستهزئُ مع أنّك تراه كالمجنون، تريدُ أنْ يتكلَّمَ ولو بشَتْمِكَ، لِتضحكَ منه، فاستهزاؤه بعضُ استهزائك.

ثم في ﴿يَسْتَهْزِئُ﴾ مضارعاً مع أنَّ السابقَ ﴿مُسْتَهْزِءُونَ﴾ اسمُ فاعلٍ، إشارةٌ إلى أنَّ نكاياتِ الله تعالى وتحقيراتِه تتجدَّدُ عليهم ليحسُّوا بالألم ويتأثَّروا به؛ إذ ما استمرَّ على نسَقٍ يقِلُّ تأثيرُه بل قد يَعدِمُ. ولذا قيل: شرطُ الإحساسِ الاختلافُ.

أما ﴿وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ أي توسَّلوا بأسبابِ الضلالةِ وطلبوها، فأعطاهم الله تعالى..

جا لە وشەی ﴿يَمُدُّ﴾دا هێمایەك هەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی ڕێبازی "ئیعتیزال" و[١]، لەخۆگرتنی ﴿يَمُدُّ﴾یش بۆ واتای "داوای یارمەتی" ئاماژەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی ڕێبازی "جەبر"[٢].

واتە: ئەو دووڕووانە ڕێبازی گومڕاییان بە ئیختیاری خراپی خۆیان هەڵبژارد و داوای یارمەتیشیان بۆ ئەو هەڵبژاردنەیان کرد، خوای گەورەش پشتی گرتن و جڵەوی بۆ شل کردن.

ئیزافەکردنی ﴿طُغْيَانِ﴾یش بۆ لای ﴿هُمْ﴾ (بەو واتایەی کە خۆیان ئیختیارێکیان لەو یاخیبوونەدا هەیە) هێمایەکە بۆ وەرنەگرتنی بەهانەکەیان کە گوایا ناچاربوون و دەسەڵاتی خۆیانی تێدا نەبووە.

وشەی ﴿طُغْيَانِ﴾یش، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە زیانی ئەوان تێپەڕ و پەرەسێنە[٣] و، بە وێنەی لافاو هەموو چاکەکارییەکانی ڕامالیوە و بناغەکانی کەماڵاتی مرۆڤی لە بناغەوە ڕووخاندووە و، تەنها پووش و پەڵاشێکی وشك و ڕەش هەڵگەڕاو ماوەتەوە.

﴿يَعْمَهُونَ﴾یش، واتە: سەرسام و دوودڵ دەبن[٤]، ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە "دووڕووەکان" بێ ڕێبازن و، ئامانجێکی دیاری کراوی خۆیان نییە.

* * *

(١) چونکە موعتەزیلە پێیان وایە مرۆڤ بکەری کردەوە ئیختیارییەکانی خۆیەتی. (وەرگێڕ)

(٢) چونکە شوێنکەوتووانی ڕێبازی "جەبر" پێیان وایە مرۆڤ خاوەنی ویستی خۆی نییە. (وەرگێڕ)

(٣) لەبەر ئەوەی وشەی ﴿طُغْيَانِ﴾ بە واتای سەرکردن و تێپەڕینی شت دێت لە سنووری خۆی. (وەرگێڕ)

(٤) ﴿يَعْمَهُونَ﴾: بە واتای ئەوەیە کە بینایی دڵیان لە بینین کەوتووە و، حەقیقەتی شتەکان نابینن، ئەوەش داخوازی سەرسامی و دوودڵییە. (وەرگێڕ)

ففي لفظِ ﴿يَمُدُّ﴾ رمزٌ إلى ردِّ الاعتزالِ، وفي تضمُّنِ ﴿يَمُدُّ﴾ للاستمدادِ إيماءٌ إلى ردِّ الجبرِ..

أي اختاروا بسوء اختيارِهم واستمدُّوا، فأمدَّهم الله تعالى وأرخى عنانَهم..

وفي إضافةِ الـ﴿طُغيانِ﴾ إلى ﴿هُمْ﴾ (أي إنَّ لهم فيه اختياراً) رمزٌ إلى ردِّ عُذرِهم بالمجبورية..

وفي الـ﴿طُغيانِ﴾ إشارةٌ إلى أنَّ ضرَرَهم متعدٌّ استغرقَ المحاسنَ كالسيل وهَدَمَ أساسَ الكمالات، فلم يبقَ إلّا غُثاءً أحْوَى.

و﴿يَعْمَهُونَ﴾ أي يتحيَّرون ويتردَّدون. وفيه إشارةٌ إلى أنَّه لا مسلكَ لهم وليس لهم مقصودٌ معين.

* * *

﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُاْ الضَّلاَلَةَ بِالْهُدَى فَمَا رَبِحَت تِّجَارَتُهُمْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ﴾ (البقرة: ١٦)

بزانە کە هۆی هۆنینی ئەم ئایەتە لە ڕشتەی ئایەتەکەی پێش خۆیدا ئەوەیە کە:

ئەم ئایەتـە، کورتـە و پوختەیەکە بۆ درێژە پێدانـەکانی پێشـوو. هـەروەك وێنـاکردنی ئەوانەی پێشووە لە شێوەیەکی بڵند و کاریگەردا.

تایبەتکردنی شێوازی "بازرگانی"یش بۆ نموونە پێ هێنانەوە، بەو مەبەستەیە کـە ڕیـزی یەکەمی گوێ بیستان، بەهۆی گەشتی هاوینە و زستانەیان، تاڵ و شـیرینیی بازرگانیـان چەشتبوو.

ڕووی "پەیوەندی"یش لـە نێـوان نموونەکـە و حـاڵی دووروواندا ئەوەیـە کـە نـەوەی ئادەمیزاد بە مەبەستی تێدا مانـەوە و نیشتەجێ بـوون ڕەوانـەی دنیـا نـەکراون، بـەڵکو بۆ ئەوەی لە دەسمایەی توانا و لێهاتنەکانیاندا خەریکی بازرگانی بن و، بۆ ئـەوەش کـرداری چاندن ئەنجام بدەن، ئنجا هەڵسوکەوت لە داهاتەکەیدا بکەن.

پاشان هۆی هۆنینی نێوان ڕستەکانی ئـەم ئایەتـە ئەوەیـە کـە بـە شـێوەیەکی سروشتیی ڕەوان و، لەسەر شێوازی "نموونە هێنانەوە" ڕێکخراون و داڕێژراون، کە ئـەم نموونەیـەی خوارەوەیە:

بازرگـانێکی گـزی لێکـراوی بـەزیو، دەسمایەیەکـی بـەنرخی پـێ درا، ئـەویش ژەهرەکان و ئەو شتانەی پێ کڕی کە زیانی بۆ خۆی تێدا بێـت. ئنجـا کـار و کەسـابەتی

## ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الضَّلالَةَ بِالْـهُدَى فَمَا رَبِحَت تِّجَارَتُهُمْ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ﴾ (البقرة: ١٦)

اعلم أنَّ وجهَ نظمِها بسابقتِها هو أنَّ هذه الآيةَ فَذْلَكةٌ وإجمالٌ للتفاصيلِ السابقة، وتصويرٌ لها بصورةٍ عاليةٍ مؤثّرَة.

وتخصيصُ أسلوبِ التجارةِ للتمثيل، لأجْلِ أنَّ المخاطَبين في الصفِ الأولِ قد ذاقوا حُلوَ التجارة ومُرَّها برحلتَي الصيفِ والشتاء.

ووجهُ المناسبةِ، هو أنَّ نوعَ البشرِ أُرسِلَ إلى الدنيا لا للتوطُّنِ فيها، بل لِيتَّجِرُوا في رأس مالِهم من الاستعدادات والقابلياتِ ليَزرعوا ثم يتصَرَّفوا في غَلّاتها.

ثم إنَّ وجهَ النظمِ بين جُملِ هذه الآيةِ هو أنَّها ترتبتْ تَرَتُّباً فِطرياً سلِساً على نَسَقِ أسلوبِ التمثيلِ، وهو هذا:

إنَّ تاجراً مغبوناً مخـذولاً أُعْطِيَ لـه رأسُ مـالٍ غـالٍ، فاشـترى به السّـمومَ ومـا يضـرُّه،

تێدا کرد، بەڵام نە قازانجی کـرد و نـە سوودێکیشی دەسـت کـەوت، بـەڵکو خستیە نـاو زیانی یەك لـە دوای یەکەوە. ئیـتر بـەو جۆرە، دەسمایەکـەی بـە زایـە دا و، ڕێگاکەشـی بـە جۆرێ لە خۆی ون کرد کە نەتوانێ بگەڕێتەوە.

سەبارەت بە هۆنینی پێکهاتەی یەك بە یەکی ڕستەکانیش ، ئەوا:

وشەی: ﴿أُولَئِكَ﴾ بۆ "لەبەرچاوگرتن"ی شتی "هەست پێکراو"ی "دوور" دانراوە..

"لەبەرچاوگرتن"ەکە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کـە هـەر بیسـەرێك ئـەو تاوانـە باسکراوانە بیستێ، وردە وردە نەفرین و ڕقێك لە دڵیدا پەیدا دەبێت کە پلە بە پلە زیاد دەکـات و بـە ڕادەیەك توندوتۆڵ دەبێت کە دەیـەوێ بیـانبینێت تـاکو داخـی دڵـی پێـان بڕێژێـت و، لـە بەرامبەر تاوانەکانیانەوە نەفرین و سووکایەتی دەرببڕێت..

"هەسـت پێکـراوی"یەکـەش، هێمایەکـە بـۆ ئـەوەی کـە: خۆوەسـفدارکردنی "دوورڕووەکان" بەم سیفەتە سەیر و سەمەرانە، بە ڕادەیـەك لـە زەینـی مرۆڤدا بەرجەستە دەکات کە دەڵێی لە پێش چاوی ئەندێشەدا دانراوە.

ئنجا بەهۆی ئەوەی کە گوناهـ گوناهی تر بـە دوای خۆیـدا دەهێنێـت، ئـەوا هـەر لـەم "هەست پێکراوی"یەوە هێمایەکیش هەیە بۆ عیللەتیحوکمەکە..

"دووری"یـش [واتـە لـە وشـەی ﴿أُولَئِـــــكَ﴾دا] ئاماژەیـە بـۆ دووریـی یـەکجار لەڕادەبەدەریان لە ڕێی "حـەق"ەوە، کـە بـەرەو شـوێنێك ڕۆشتوون ناگەڕێنەوە. کەواتـە ڕۆشتن بە دەستی خۆیانە، نەك گەڕانەوە!

وشـەی ﴿الَّذِينَ﴾ش، ئـامـاژەیە بـۆ ئـەوەی کـە:

ئـەم بـازرگانییە، جۆرێکی سـەیر و سەمەرە و چەپەڵ و، شـتێکی تـازە پـەیدا بـووە و، خەریکـە دەبێتـە بناغـە و ڕێبـازێکی وا کـە خـەڵکانێك بیگرنەبـەر. چونکـە وەك پێشـتر ڕابورد، "ئیسمی مەوصوول" ئاماژەیە بۆ ئەو ڕاستییە نوێیانەی کە تازە خۆیان دەگرن و خەریکە پێکدێن و دادەمەزرێن.

وشەی ﴿اشْتَرَوُاْ﴾ ئاماژەیە بۆ وەرنەگرتنی بەهانەکەیان کە دەڵێن: "سرووشتمان بـەم جۆرە بەدیهاتووە"!

وەك بڵێی قورئان پێیان دەڵێت:

فتصرَّفَ فيه، فلم يربحْ ولم يفِدْ؛ بل ألقاه في خسارةٍ على خسارة، فأضاعَ رأسَ مالِه، ثم أضلَّ الطريقَ؛ بحيث لا يستطيعُ أنْ يرجعَ.

أما نظمُ هيئاتِ جملةِ جملةٍ:

فلفظُ ﴿أُوْلَئِكَ﴾ موضوعٌ لإحضارِ المحسوسِ البعيدِ..

أما الإحضارُ فإشارةٌ إلى أنَّ مِن شأنِ كلِّ سامعٍ إذا سمعَ تلكَ الجناياتِ المذكورةَ أنْ يحصُل شيئاً فشيئاً في قلبه نفرةٌ وغيظٌ يتشدَّدُ تدريجاً بحيث يريدُ أنْ يراهم ليتشفَّى الغيظُ منهم، ويقابلَهم بالنفرةِ والتحقيرِ..

وأما المحسوسيةُ فرمزٌ إلى أنَّ الاتّصافَ بهذه الأوصافِ العجيبةِ يجسِّمُهم في الذهنِ حتى صاروا محسوسين نُصْبَ الخيالِ..

ومِن المحسوسيةِ رمز إلى علّةِ الحُكم بسرِّ انجرارِ المعصيةِ إلى المعصية..

وأما البُعديةُ فإشارةٌ إلى شدّةِ بُعدِهم عن الطريقِ الحقِ، ذهبوا إلى حيث لا يرجعون، فالذَّهابُ في أيديهم دون الإيابِ.

ولفظُ ﴿الَّذِينَ﴾ إشارةٌ إلى أنَّ هذا نوعٌ من التجارةِ عجيبٌ خبيثٌ تحدَّثَ وطَفِقَ أنْ يصيرَ أساساً ومسلكاً يمرُّ عليه ناسٌ؛ إذ قد مرَّ أنَّ الموصولَ إشارةٌ إلى الحقائق الجديدةِ التي أخذتْ في الانعقادِ.

ولفظُ ﴿اشْتَرَوُا﴾ إشارةٌ إلى ردِّ اعتذارِهم بـ"أنَّ فطرتَنا هكذا"..

فكأنَّ القرآنَ يقولُ لهم:

"نەخێر.. خوای گەورە هەموو هەناسەکانی تەمەنی ئێوەی وەك دەسمایەیەك پێ بەخشیون و، توانای کاملیی لە ڕۆحتاندا داناوە و، ئەو ناوکی حەقیقەتەشی لە ویژدانی ئێوەدا چاندووە کە بریتی‌یە لە "هیدایەتی فیتری" تاکو "بەختەوەری"ی پێ بکڕن. کەچی ئێوە لە بریی کڕینی ئەوە – بگرە بە وازلێهێنانی – چێژە بەپەلەکان و سوودەکانی دنیاتان پێ کڕی، ئیتر بە ئیختیاری خراپی خۆتان، لە بریی ڕێبازی "هیدایەت" ڕێبازی "گومڕایی"تان هەڵبژارد، بەم کارەش ئەو هیدایەتە فیتری‌یەتان شێواند و دەسمایەکەی تەمەنیشتان بە زایە دا.

وشەی ﴿الضَّلَالَةَ بِالْهُدَىٰ﴾ ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە:

ئەوانە زیان لە دوای زیانیان کردووە، چونکە هەروەك بە "هەڵبژاردنی گومڕایی" زیانیان کرد، بە "دەست هەڵگرتنیش لە نیعمەتی مەزنی هیدایەت" زیانێکی تریان هێنایە ڕێی خۆیان.

سەبارەت بە ڕستەی ﴿فَمَا رَبِحَتْ تِجَارَتُهُمْ﴾یش، (بازرگانی‌یەکەیان قازانجی نەکرد) ئەوا بزانە کە:

تایبەتکردنی باسی "بێ قازانجی" لە بازرگانی‌یەکەی ئەواندا، لەو کاتەدا کە هەروەك زیانیان کردووە، دەسمایەکەشیان لە کیس چووە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مرۆڤی ژیر بازرگانی‌یەك ناکات زیانی تێدا بێت، چ جای ئەوەی زیان بکات و دەسمایەکەشی تێدا دابنێت!

پاشان دانەپاڵی کرداری "قازانج نەکردن" بۆ "بازرگانی"یەکە، لە کاتێکدا کە دەبوو بوترایە: "فما ربحوا في تجارتهم" (لە بازرگانی‌یەکەیاندا قازانجیان نەکرد) ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە:

بازرگانی‌یەکەیان، بە هەموو بەشەکانی و، گشت حاڵەتەکانی و، سەرجەم هۆکارەکانیەوە، هیچ جۆرە سوودێکی هەندەکی یاخود هەمەکیی تێدا نی‌یە و، نەك بە وێنەی هەندێ لەو بازرگانی‌یانەی کە هەرچەند کۆتایی و دەرەنجامەکەی بێ قازانجی‌یە، بەڵام هەندێ لە بەشەکانی و لە هۆکارەکانی خزمەتەکەیدا، هەندێ سوودی تێدا دەبێت. بەڵام ئەم بازرگانی‌یە، هەر تەنها شەڕ و زیانی پەتی و سەرانسەری‌یە..

لا! ولقد أعطاكُم اللهُ أنفاسَ العمرِ رأسَ مالٍ، وأودعَ في روحِكم استعدادَ الكمالِ، وغرسَ في وجدانِكم نواةَ الحقيقةِ وهي الهدايةُ الفطريةُ لتشتروا السعادةَ، فاشتريتُم بدَلَها - بل بتركِها - اللذائذَ العاجلةَ والمنافعَ الدنيويةَ، فاخترتُم بسوءِ اختيارِكم مسلكَ الضلالةِ على منهجِ الهدايةِ، فأفسدتُم الهدايةَ الفطريةَ، وضيَّعتُم رأسَ مالِكم.

ولفظُ ﴿الضَّلاَلَةَ بِالْـهُدَى﴾ فيه إشارةٌ إلى:

أنَّهم خسِروا خسارةً على خسارة. إذ كما خسِروا بالضلالةِ؛ كذلك خسِروا بتركِ النعمةِ العظيمةِ التي هي الهدايةُ.

أما جملةُ ﴿فَمَا رَبِحَتْ تِجَارَتُهُمْ﴾ فاعلم أنَّ في تخصيصِ نفيِ الربحِ - مع أنَّهم كما قد خسِروا فقد أضاعوا رأسَ المال أيضاً - إشارةً إلى أنَّ مِن شأنِ العاقلِ أن لا يُقْدِمَ على تجارةٍ لا ربحَ فيها، فضلاً عما فيها خسارةٌ وإضاعةُ رأسِ المالِ..

ثم في إسنادِ الفعلِ إلى التجارةِ، مع أنَّ الأصلَ "فما ربحوا في تجارتِهم"، إشارةٌ إلى أنَّ تجارتَهم هذه بجميع أجزائها وكلِّ أحوالها وقاطبةِ وسائطِها لا فائدةَ فيها، لا جُزئياً ولا كُلياً؛ لا كبعضِ التجاراتِ التي لا يكونُ في محصَّلِها وفذلكتِها ربحٌ، ولكن في أجزائِها فوائدُ، ولوسائطِ خدمتها استفاداتٌ.. أما هذه فشرٌّ محضٌ وضررٌ بَحتٌ.

هاوشێوەی ئەم دانەپاڵی كرداری قازانجە بۆ بازرگانی‌یەكە، ئەوەیە كە بوترێت: "نامَ لیلُهُ" (شەوەكەی نوست) لە بریی "نامَ في الليـــلِ" (لە شەودا نوست). چونكە واتای یەكەمیان ئەوەیە كە تەنانەت شەوەكەی ئەو كەسەش بە وێنەی كەسی نوستوو مەنگ و بێ دەنگە و، هیچ شتێك شەوەكەی لێ ناشڵەقێنێت و، كەسیش لە دەرگای نادات ڕایبچڵەكێنێت!

ڕستەی ﴿وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ﴾یش - واتە هەروەك سامانەكەیان بە زایە دا و زیانیان كرد، بە هەمان جۆر ڕێگاشیان ون كرد - بە وێنەی ڕستەكەی پێش خۆی "تەرشیح"[1] و ئارایشتێكە[2] بۆ شێوازی ﴿اشْتَرَوا﴾.

هەروەك هێمایەكی پەنهانیشی تێدایە بۆ ﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ی سەرەتای سوورەتەكە. وەك ئەوەی بفەرموێ:

"قورئان هیدایەتی بەخشی، بەڵام ئەوان وەریان نەگرت".

* * *

(١) "تەرشیح" لە بنەڕەتدا پاڵاوتنی ئاو یان هەر شلەمەنی‌یەكە لە دەفرەكەیەوە بۆ ناو شتێكی تر. بەڵام لێرەدا ئاماژەیە بۆ زاراوەیەكی "ڕەوانبێژی" كە پێی دەوترێ: "ئیستیعارەی مورەششەحە" (واتە: خواستنی پاڵێوراو) كە بریتی‌یە لەوەی خواستنەكە نیشانەیەكی وەهای لەگەڵدا بێت كە بۆ "لێ خوازراو(مستعار منه)"ەكە بگونجێت. وەك نموونەی ئەم ئایەتە. لەوەتا وشەی "شراء" بۆ "گۆڕینەوە" خوازراوە. (واتە: هیدایەتیان گۆڕییەوە و لە بەرامبەریدا گومڕاییان وەرگرت) ئنجا وشەی "ربح" و "تجارة"ی لەگەڵدا بەكارهێنراوە كە بۆ "شراء" دەگونجێت. جا هەروەك "ئیستیعارەی مورەششەحە" لەم ڕستەیەدا بەم جۆرەیە، لە ڕستەی: ﴿وَمَـــا كَانُواْ مُـــهْتَدِينَ﴾یشدا بە هەمان جۆرە، چونكە "هدى" بۆ "ئیمان" خوازراوە، ئنجا "عدم الاهتداء"ی لەگەڵدا بەكارهێنراوە كە بۆ "هدى" دەگونجێت. (وەرگێڕ)

(٢) ئەم وشەیە لە ئەسڵەكەدا (تزيين)ە كە بە واتای ئارایشتدان و ڕازاندنەوە دێت. خۆ هەرچەندە لە سەرجەم چاپەكانی ئەم كتێبەدا، هەر لە یەكەم چاپەوە هەتا دوا چاپ، بەو جۆرە نووسراوە، لەگەڵ ئەوەشدا بە دووری نازانم كە "تذييل" بێت. والله أعلم. (وەرگێڕ)

ونظيرُ هذا الإسنادِ "نامَ لَيْلُهُ" بدلَ "نامَ في الليل"؛ إذ الأولُ يفيدُ أنَّ ليلَه أيضاً ساكنٌ وساكتٌ كالنائم لا يحرِّكُ ليلتَه شيءٌ ولا يموِّجُه طارقٌ.

وأما جملةُ ﴿وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ﴾ - أي كما خسِروا وأضاعُوا المالَ؛ كذلك قد أضلُّوا الطريقَ - فترشيحٌ وتزيينٌ كسابقتِها لأسلوبِ ﴿اشْتَرَوُا﴾..

وأيضاً فيها رمزٌ خفيٌّ إلى ﴿هُدىً لِلْمُتَّقِينَ﴾ في رأس السورةِ. كأنَّه يقولُ: أعطى القرآنُ الهدايةَ فما قَبِلَ هؤلاءِ.

***

﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً فَلَمَّا أَضَاءتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَاتٍ لاَّ يُبْصِرُونَ ۞ صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لاَ يَرْجِعُونَ ۞ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ السَّمَاء فِيهِ ظُلُمَاتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصْابِعَهُمْ فِي آذَانِهِم مِّنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ واللّهُ مُحِيطٌ بِالْكافِرِينَ ۞ يَكَادُ الْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَارَهُمْ كُلَّمَا أَضَاء لَهُم مَّشَوْاْ فِيهِ وَإِذَا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُواْ وَلَوْ شَاء اللّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ إِنَّ اللَّه عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (البقرة: ١٧-٢٠)

بزانە کە بناغەی "ئیعجاز"ی قورئانی پیرۆز لە "ڕەوانبێژیی هۆنینـی"دایە. ڕەوانبێژیی هۆنینیش دوو بەشە:

بەشێکی وەکو خشڵ و، بەشەکەی دیکەی وەکو پۆشاك وایە.

یەکەم:

بە وێنەی مرواریی وەریو، ئارایشتی پەرش و بڵاو، نەخشی تێهەڵکێشی هۆنراو، وایە. کانزای بەدەستهێنانیشی گەڕانە بە دوای واتا حەرفییەکانی زانستی "نـەحوو" لـە نێـوان وشەکاندا، کە بە وێنەی تواندنەوەی زێڕ وان لە نێوان چەندین بەردی زیودا.

بەروبوومـەکانی "ئـەم بەشـە" بریتـین لـەو واتـا نیـان و ناسـکانەی کـە هونـەری "گوزارەکاری"(المعاني) ڕوونکردنەوەیانی لە ئەستۆ گرتووە.

بەشی دووهەم:

بە وێنەی بەرگێکی بەهادار و پۆشاکێکی نایابە، لە شێوازێك بڕاوە کە بە قەد باڵای واتاکـان بێـت و، بـە ڕێکوپێکیـش لـە چەند پارچەیەکی جیاجیـا دووراوە و، یەکسـەر دەکرێتە بەر باڵای "واتا" یان "چیرۆك" یان "ئامانج" لە گوفتاردا.

﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَاتٍ لا يُبْصِرُونَ * صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لا يَرْجِعُونَ * أَوْ كَصَيِّبٍ مِنَ السَّمَاءِ فِيهِ ظُلُمَاتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصْابِعَهُمْ فِي ءَاذَانِهِم مِنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ واللهُ مُحِيطٌ بِالْكافِرِينَ * يَكَادُ الْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَارَهُمْ كُلَّمَا أَضَاءَ لَهُمْ مَشَوْاْ فِيهِ وَإِذَا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُواْ وَلَوْ شَاء اللهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ إِنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (البقرة: ١٦-٢٠)

اعلم أنَّ أساسَ إعجازِ القرآنِ الكريمِ في بلاغةِ نظمِه. وبلاغةُ النظمِ على قسمين:

قسم كالحِلية وقسم كالحُلّة:

**فالأولُ:**

كاللآلئ المنثورةِ والزينةِ المنشورةِ والنقشِ المرصَّعِ. ومَعدِنُه الذي يتحصَّلُ منه هو: تَوَخّي المعاني النحويةِ الحرفيةِ فيما بين الكَلِم، كإذابة الذهبِ بين أحجارِ فضةٍ.

وثمراتُ هذا النوعِ هي اللطائفُ التي تعهَّدَ بيانَها فنُّ "المعاني"..

**والقسمُ الثاني:**

هو كلباسٍ عالٍ وحُلَّةٍ فاخرةٍ قُدّتْ من أسلوبٍ على مقدار قاماتِ المعاني، وخيطَتْ من قِطَعاتٍ خيطاً مُنتظَماً فيُلبَسُ على قامة المعنى أو القصةِ أو الغَرَضِ دفعةً.

هونەری "ڕەوانکاری"(البیان) وەستای کارامە و لە ئەستۆگری ئەم بەشەیە.
گرنگترین بابەتەکانی ئەم بەشە بریتی‌یە لە "نموونە هێنانەوە".
قورئانی پیرۆز هێندە نموونەی زۆری هێناوەتەوە هەتا گەیشتووەتە هەزار. چونکە "نموونە هێنانەوە" نهێنی‌یەکی ورد و دانستێکی بلندی لەخۆ گرتووە. لەبەر ئەوەی بە نموونە هێنانەوە:

"گومان" لە بەرامبەر "ژیری"یەوە دەبەزێت و.. "ئەندێشە" ناچاری ملکەچبوون دەبێت بۆ "هزر" و.. "نادیار" دەبێتە "ئامادە" و.. شتی "بە ژیری زانراو" دەبێتە "هەست پێکراو" و.. "واتا" دەبێتە "بەرجەستە" و.. "پەرش و بڵاو" بە هۆیەوە "کۆدەبنەوە" و.. شتانی "تێکەڵاو" دەبنە "ئاوێتە" و.. شتە "جیاوازەکان"یش "یەکدەگرن" و.. "لێکدابڕاو"ەکان پێکەوە "پەیوەست دەبن" و.. "بێ چەك"یش دەبێتە "چەکدار".

گەر پێت خۆشە درێژەی ئەمانە بزانیت، ئەوا فەرموو لەگەڵ مندا گوێ بیستی خاوەنی "دلائل الإعجاز" بە لە "أسرار البلاغة"کەیدا[1]، ئەوەتا دەڵێت:

### "بەندێك لەبارەی
### شوێنەکانی بەکارهێنان و کاریگەریی "نموونە هێنانەوە"

بزانە: یەکێك لەو شتانەی ژیر و هۆشمەندان یەکدەنگن لەسەری، ئەوەیە کە:
"نموونە هێنانەوە" گەر لە دوای واتاکانەوە هات، یان بۆ خۆی بە پوختی لە دەمی خستنەڕووی واتادا دەرکەوت و، لە وێنە بنەڕەتی‌یەکانی خۆیەوە گواسترایەوە بۆ ئەو وێنەیەی کە هەیەتی، ئەوا شکۆیەکی بە بەر دەپۆشێت و، ڕێز و ستایشێکی پێ دەبەخشێت و، بەهای بەرز دەکاتەوە و، پشکۆی دەگەشێنێتەوە و، هێز و پێزی زیاتر دەکات لەوەدا کە دەروونەکانی بۆ لا دەبزوێنێت و، دڵانی بۆ کەمەندکێش دەکات و، لەوپەڕی دوورییەکانی ناخەوە ئەوینێك دەخرۆشێنێت و، سروشتەکانیش بۆ خۆشویستنی ڕادەپێچێت.

---

(١) "دلائل الإعجاز" و "أسرار البلاغة" دوو کتێبی بەناوبانگی پێشەوا "عەبدولقاهیری جورجانی"ن، کە لە سەرەتای سەدەی پێنجەمی کۆچیدا لە شاری (جورجان) لە دایك بووە و، لە هەموو بوارێکی زانستەکانی ئەو کات و شوێنەدا خوێندوویەتی، هەتا بووە بە زانایەکی لەوتۆ زانستخوازان ڕوویان تێکردووە. کەسێکی خاوەن تەقوا و وەرع و بە قەناعەت و هەژار بووە. جگە لە دیوانێکی شیعر، چەندین کتێبی لە بابەتەکانی ئەدەب و زانستی "نەحوو"دا داناوە. بەڵام زیاتر کتێبەکانی لە بواری ئیعجازی قورئان و ڕەوانبێژیدا ناوبانگیان دەرکردووە. ساڵی (٤٧١ك) یان (٤٧٤ك) ماڵئاوایی لە دنیا کردووە. (وەرگێڕ)

وصَنّاعُ هذا القسمِ والمتكفِّلُ به فنُّ "البيان"..

ومن أهم مسائلِ هذا القسمِ التمثيلُ.

ولقد أكثرَ القرآنُ من التمثيلات إلى أنْ بلغت الألفَ؛ لأنَّ في التمثيل سرّاً لطيفاً وحكمةً عالية؛ إذ به يصيرُ الوهمُ مغلوباً للعقل، والخيالُ مجبوراً للانقياد للفكر، وبه يتحوَّلُ الغائبُ حاضراً، والمعقولُ محسوساً، والمعنى مجسَّماً، وبه يُجعَلُ المتفرّقُ مجموعاً، والمختلطُ ممتزجاً، والمختلفُ متّحداً، والمنقطعُ متصلاً، والأعزَلُ مسلَّحاً.

وإنْ شئت التفصيلَ فاستمعْ معي لما يترنّمُ به صاحبُ "دلائل الإعجاز" في أسرار بلاغتِه[1]؛ حيث قال:

## فصلٌ في مواقعِ التمثيلِ وتأثيرِه

اعلم أنَّ مما اتفقَ العقلاءُ عليه، أنَّ التمثيلَ إذا جاء في أعقاب المعاني أو بَرَزتْ هي باختصارٍ في معرِضِه، ونُقِلَتْ عن صُوَرِها الأصليةِ إلى صورته،كساها أُبّهةً، وأكسَبها مَنْقَبةً، ورفعَ من أقدارِها، وشَبَّ من نارها، وضاعفَ قُواها في تحريك النفوسِ لها، ودعا القلوبَ إليها، واستثارَ لها من أقاصي الأفئدة صَبابةً وكلَفاً، وقَسَر الطِباعَ على أنْ تُعطيَها محبةً وشغفاً.

(١) "أسرار البلاغة" لعبد القاهر الجرجاني (المتوفي ٤٧١هـ). طبع عدة طبعات منها في مطبعة الاستقامة سنة ١٩٤٨ بمصر وكتب حواشيه الأستاذ أحمد مصطفى المراغي، والفصل المذكور هو في ص١٢٨ من الطبعة المذكورة.

جا ئەگەر ئەو نموونەیە بۆ "مەدح" هێنرایەوە، ئەوا واتاکەی پێ گەشاوەتر و مەزنتر و، لە دەروونەکاندا گەورەتر و بەرێزتر دەبێت و، پتر تەنیشتەکانی پێ دەلەرێنەوە و، زووتر مرۆڤ پێی ڕادێت و، لە هەموو شتێ زیاتر شادمانی کێش دەکات و، بەسەر مەدحکراودا پتر زاڵ دەبێت و، بۆ مەدحکاریش زیاتر تکای گیرا دەکات و، پتر دەبێتە هۆی بڕیاری پێدانی خەڵات و بەخشینە نایابەکان و، لەسەر زمانەکاندا زیاتر بڵاو دەبێتەوە و باس دەکرێت و، شایانترە بۆ ئەوەی کە دڵان پەیوەستی بن.

خۆ ئەگەر "زەم" بوو، ئەوا بەرکەوتنی بەئازارترە و، چزەی داخی بەسوێ ترە و، کاریگەریی قورستر و، نووکیشی تیژترە.

ئەگەر "دەمقالی" بوو، ئەوا بەڵگەکانی ڕووناکتر و، دەسەڵاتی زاڵتر و، ڕوونکردنەوەکانی گەشاوەترە.

ئەگەر "شانازی" بوو، ئەوا مەوداکەی دوورتر و، شەرەفمەندییەکەی زەنگینتر و، زمانیشی بە بڕشت ترە.

ئەگەر "پۆزش هێنانەوە" بوو، ئەوا بۆ دڵەکان نزیکتر و سەرنج ڕاکێش ترە و، بۆ ڕق و کینەکانیش لە ڕەگ و ڕیشە دەرهێنەرترە و، بە خێراتر تووڕەیی بەرەو ئاوابوون دەبات و، پتر فوو بە گرێی گرێبەستەکاندا دەکات و، بۆ جوانیی پەشیمان بوونەوەش پتر هان دەدات.

ئەگەر "ئامۆژگاری" بوو، ئەوا زیاتر دڵ و دەروونەکان ئاو دەدات و، پتر بیرکردنەوە دەبزوێنێت و، بۆ بێدارکردنەوە و سەرزەنشتیش ڕەوانترە و، شایانترە بۆ ڕەواندنەوەی هەور و سێبەر و تەپوتۆزەکان و بینینی ئامانجەکان و، نەخۆش (زووتر) چاك دەکاتەوە و، تینوێتی (خێراتر) دەشکێنێت.

جا ئەگەر بە دوای جۆر و هونەرەکانی گوفتاردا بگەڕێیت و، بەدواداچوون بۆ لق و بەشەکانی بکەیت، ئەوا ئەم بڕیارە بەم جۆرە دەبینیت"[1]. (دەقەکەی جورجانی کۆتایی پێ هات).

* * *

(١) "أسرار البلاغة" لاپەڕە (١٢٨)ی چاپی (١٩٤٨ز) چاپخانەی "الإستقامة" لە میسر. (بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە ٣٢٩)

فإن كان مدحاً كان أبهى وأفخمَ، وأنبلَ في النفوس وأعظمَ، وأهزَّ للعِطْف، وأسرعَ للإلف، وأجلبَ للفرَح، وأغلبَ على الممتدَح، وأوجَبَ شفاعةً للمادح، وأقضى له بغُرِّ المواهبِ والمنائحِ، وأسْيَرَ على الألسُن وأذكرَ، وأولى بأنْ تعْلَقَه القلوبُ وأجدرَ.

وإن كان ذماً كان مَسُّه أوجعَ، ومِيسمُه ألذَعَ، ووقعُه أشدَّ، وحدُّه أحدَّ.

وإن كان حِجاجاً كان برهانُه أنورَ، وسلطانُه أقهرَ، وبيانُه أبهَرَ.

وإن كان افتخاراً كان شأْوُه أبعدَ، وشرفُه أجدَّ، ولسانُه ألدَّ.

وإن كان اعتذاراً كان إلى القلوب أقربَ، وللقلوب أخلبَ، وللسخائم أسلَّ، ولغَرَبِ الغَضَبِ أفلَّ، وفي عُقَد العقودِ أنفثَ، وعلى حُسن الرجوعِ أبعثَ.

وإن كان وعظاً كان أشفى للصدر، وأدعى إلى الفكر، وأبلغَ في التنبيه والزجرِ، وأجدرَ بأنْ يجْلِيَ الغيايةَ[1]، ويبصرَ الغايةَ، ويُبرئَ العليلَ، ويشفي الغليلَ..

وهكذا الحُكمُ إذا استقريتَ فُنونَ القولِ وضروبَهُ، وتتبعتَ أبوابَه وشُعوبَه.

انتهى..



(١) الغيابة: كل شيءٍ أظَلَّ الإنسانَ فوق رَأسِهِ مثلُ السَّحابة والغَبَرة والظِّلِّ ونحوِه؛ ومنه حديث هِلالِ رمضان: فإن حالَتْ دونه غَيايَةٌ أي سَحابَةٌ أو قَتَرة. (لسان العرب).

پاشان لەم ئایەتانەدا كە دێن چەندین "بەڵگەی ئیعجاز" و "نـهێنیی ڕەوانبێژی" هەیە. لێرەدا دەیانهێنین لەبەر پەیوەندییان بە باسەكانی ئەو پێشەكییەی كە دێت.

نموونە هێنانەوە لـە مـەقامی "مـەدح"دا وەكـو ئـەوەی قورئـان لـە وەسـفی هــاوەڵاندا دەفەرموێت:

﴿وَمَثَلُهُمْ فِي الإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ﴾ (الفتح: ٢٩).

هاوشێوەكانیشی قیاس بكەرە سەر ئەمە.

لە مەقامی "زەم"دا وەك:

﴿فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَثْ﴾ (الأعراف: ٧٦)..

﴿مَثَلُ الَّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا﴾(الجمعة: ٥)..

﴿إِنَّا جَعَلْنَا فِي أَعْنَاقِهِمْ أَغْلاَلاً فَهِيَ إِلَى الأَذْقَانِ فَهُمْ مُقْمَحُونَ﴾ (يس: ٨).

بۆ خۆت ئایەتەكانی تری ئەم مەقامە قیاس بكەرە سەر ئەمانە.

لە مەقامی "وتووێژ و بەڵگەهێنانەوە"دا وەك:

﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً﴾ (البقرة: ١٧)، و..

﴿أَوْ كَصَيِّبٍ مِنَ السَّمَاءِ فِيهِ ظُلُمَاتٌ.. ﴾ (البقرة: ١٩)، و..

﴿وَمَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ الَّذِي يَنْعِقُ بِمَا لاَ يَسْمَعُ إِلاَّ دُعَاءً وَنِدَاءً﴾ (البقرة: ١٧١)..

﴿مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللهِ أَوْلِيَاءَ كَمَثَلِ الْعَنكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا﴾ (العنكبوت: ٤١)..

﴿أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَدًا رَابِيًا وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِثْلُهُ﴾ (الرعد: ١٧)..

﴿ضَرَبَ اللهُ مَثَلاً رَجُلاً فِيهِ شُرَكَاءُ مُتَشَاكِسُونَ وَرَجُلاً سَلَمًا لِرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلاً﴾ (الزمر: ٢٩).

بۆ خۆت ئایەتەكانی تری ئەم مەقامە قیاس بكەرە سەر ئەمانە.

هاوشـێوەی نموونـەی "شـانازی"ش - هەرچـەندە نـاوی شـانازیی لــێ نـەنراوە - ڕوونكردنەوەی مەزنی و كەماڵاتی خوای گەورەیە لەم ئایەتەدا:

ثم إنَّ في الآيات الآتيةِ دلائلَ إعجازٍ وأسرارَ بلاغةٍ فذكرناها هنا لمناسبتها لمسائل المقدمةِ الآتية.

فمثالُ التمثيل في مقام المدحِ:

ما ذكرَه القرآنُ في وصف الصحابةِ مِن: ﴿وَمَثَلُهُمْ فِي الإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ﴾ (الفتح: ٢٩). وقِسْ نظائرَه..

وفي مقام الذم:

﴿فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَثْ﴾ (الأعراف: ٧٦)، و ﴿مَثَلُ الَّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا﴾(الجمعة: ٥)، و ﴿إِنَّا جَعَلْنَا فِي أَعْنَاقِهِمْ أَغْلاَلاً فَهِيَ إِلَى الأَذْقَانِ فَهُمْ مُقْمَحُونَ﴾ (يس: ٨). وقِسْ.

وفي مقام الاحتجاجِ والاستدلال:

﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً﴾ (البقرة: ١٧)، و ﴿أَوْ كَصَيِّبٍ مِنَ السَّمَاءِ فِيهِ ظُلُمَاتٌ..﴾ (البقرة: ١٩)، و ﴿وَمَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ الَّذِي يَنْعِقُ بِمَا لاَ يَسْمَعُ إِلاَّ دُعَاءً وَنِدَاءً﴾ (البقرة: ١٧١)، و ﴿مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللهِ أَوْلِيَاءَ كَمَثَلِ الْعَنكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا﴾ (العنكبوت: ٤١)، و ﴿أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَدًا رَابِيًا وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِثْلُهُ﴾ (الرعد: ١٧)، و ﴿ضَرَبَ اللهُ مَثَلاً رَجُلاً فِيهِ شُرَكَاءُ مُتَشَاكِسُونَ وَرَجُلاً سَلَمًا لِرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلاً﴾ (الزمر: ٢٩). وقِسْ عليه.

ونظيرُ مثالِ الافتخارِ - وإنْ لم يُسمَّ افتخاراً - بيانُ عظمتِه تعالى وكمالاته الإلهية، قولُه تعالى:

﴿وَمَا قَدَرُوا اللهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمواتُ مَطْوِيَّـــاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (الزمر: ٦٧).

بۆ خۆت ئایەتەکانی تری ئەم مەقامە قیاس بکەرە سەر ئەمە.

هێنانی نموونەش لە مەقامی "پۆزش هێنانەوە"دا، تەنها چەرۆکی خاوەن بەهانە بەتاڵەکان لە قورئاندا هەیە، ئەوەش بە مەبەستی بەڵگەهێنانەوە لە دژیان، وەك:

﴿وَقَالُواْ قُلُوبُنَا غُلْفٌ﴾ (البقرة: ٨٨) ، و..

﴿وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي ءاذَانِنَا وَقْرٌ وَمِن بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَـــابٌ﴾ (فصلت: ٥).

ئیتر ئایەتەکانی تری ئەم مەقامە قیاس بکەرە سەر ئەمانە.

نموونەی ئەمەش لە شیعردا، وەك:

لا تحسَبُوا أنَّ رقصي بينَكم طَرَبٌ فالطَّيرُ يرقُصُ مذبوحـــاً مِنَ الألَمِ[1]

نموونە هێنانەوەش لە ئامۆژگاریدا بۆ وەسفی "نیعمەتەکانی دنیا" وەك ئەمانەی کە قورئان باسی کردوون:

﴿كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَـــتَرَاهُ مُصْفَـــرًّا ثُـــمَّ يَكُـــونُ حُطَامـــاً﴾ (الحديد: ٢٠)..

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِـــهِ زَرْعًـــا مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ﴾ (الزمر: ٢١)..

﴿إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْـهَا وَحَمَلَهَا الإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً﴾ (الأحزاب: ٧٢)..

﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُتَصَدِّعًا مِنْ خَشْيَةِ اللهِ وَتِلْكَ الأَمْثَـــالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الحشر: ٢١)..

﴿فَمَا لَهُمْ عَنِ التَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ * كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُسْتَنفِرَةٌ * فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾ (المدثـــر: ٤٩-٥١)..

---

(١) بۆم ساغ نەبووەوە ئەم بەیتە هی کێیە. واتە:

مەزانن "سەما"م بۆ هەڵپەڕینە ئێشی سەمای مەل هی سەربڕینە

(وەرگێڕ)

﴿وَمَا قَدَرُوا اللهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّموَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (الزمر: ٦٧). وقِسْ عليه.

ومثالُ التمثيلِ في مقام الاعتذارِ لا يوجَدُ إلّا حكاياتُ أهلِ الأعذارِ الباطلةِ للاحتجاج عليهم، كقوله:

﴿وَقَالُواْ قُلُوبُنَا غُلْفٌ﴾ (البقرة: ٨٨) ، و ﴿وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي ءَاذَانِنَا وَقْرٌ وَمِن بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ﴾ (فصلت: ٥). وقِسْ..

ومن الشعر:

لا تَحْسَبُوا أَنَّ رَقْصِي بيْنَكُمْ طَرَبٌ

فَالطَّيْرُ يَرْقُصُ مَذبُوحاً مِنَ الألمِ

ومثالُه من الوعظ في وصف نعيمِ الدنيا:

﴿كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَاماً﴾ (الحديد: ٢٠)، و ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ﴾ (الزمر: ٢١)، و ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً﴾ (الأحزاب: ٧٢)، و ﴿لَوْ أَنْزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُتَصَدِّعًا مِنْ خَشْيَةِ اللهِ وَتِلْكَ الأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الحشر: ٢١)، و ﴿فَمَا لَهُمْ عَنِ التَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ * كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُسْتَنفِرَةٌ *

﴿مَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِئَةُ حَبَّةٍ﴾ (البقرة: ٢٦١)..

﴿كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَآتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ﴾ (البقرة: ٢٦٥).

نموونەش بۆ پووچەڵ كردنەوەی كردەوەی چاك، بە هۆی ئازاردانی خەڵك و ڕیاكارییەوە، وەك:

﴿أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ مِن نَخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ لَهُ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَأَصَابَهُ الْكِبَرُ وَلَهُ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَاءُ فَأَصَابَهَا إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَاحْتَرَقَتْ﴾ (البقرة: ٢٦٦)..

﴿مَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ لاَّ يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُواْ عَلَى شَيْءٍ ذَلِكَ هُوَ الضَّلاَلُ الْبَعِيدُ﴾ (إبراهيم: ١٨).

نموونە هێنانەوەش لە چینەكانی گوفتاردا بۆ مەقامی "وەسف" وەك:

﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾ (فصلت: ١١)..

﴿وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْداً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ (هود: ٤٤)..

﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ ۞ تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا﴾ (إبراهيم: ٢٤-٢٥)..

﴿وَمَثلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ الأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ﴾ (إبراهيم: ٢٦).

نموونەی ئەمەش لە شیعردا، وەك:

واللیلُ تجري الدّراري في مجرَّتِهِ    كالرَّوضِ تطفو على نَهرٍ أزاهيرُه[1]

بزانە كە:

(١) ئەم بەیتە هی "ابن النبیە"ی میسرییە (ساڵی وەفاتی: ٦١٩ك) لە مەدحی ئەیوبییەكاندا. واتە: ئەو ئەستێرانەی كە وەكو مرواری وان و بە شەو لەناو گەلەستێرەكەیاندا دەڕۆن، بە وێنەی ئەو گوڵانەن كە سەر ئاوی ڕووبارێك كەوتبن. (وەرگێڕ)

فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾ (المدثر: ٤٩-٥١)، و ﴿مَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِئَةُ حَبَّةٍ﴾ (البقرة: ٢٦١)، و ﴿كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَآتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ﴾ (البقرة: ٢٦٥).

وفي إحباط العملِ الصالحِ بالإيذاء والرياءِ:

﴿أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ لَهُ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَأَصَابَهُ الْكِبَرُ وَلَهُ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَاءُ فَأَصَابَهَا إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَاحْتَرَقَتْ﴾ (البقرة: ٢٦٦)، و﴿مَّثَلُ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ لاَّ يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُواْ عَلَى شَيْءٍ ذَلِكَ هُوَ الضَّلاَلُ الْبَعِيدُ﴾ (إبراهيم: ١٨).

ومثالُه من طبقات الكلامِ في مقام الوصفِ:

﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلأَرْضِ اِئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾ (فصلت: ١١)، و ﴿وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْداً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ (هود: ٤٤)، و ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ * تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا﴾ (إبراهيم: ٢٤-٢٥)، و ﴿وَمَثلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ الأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ﴾ (إبراهيم: ٢٦).

ومن الشعر:

والليلُ تَجري الدَّراري في مَجَرَّتِه ... كالروضِ تطفو على نهرٍ أزاهِيرُه[1]

(١) قائله ابن النبيه المصري (ت ٦١٩ هـ)، في مدح الأيوبيين.

هەریەك لەم ئایەتانەی کە "نموونە هێنانەوە"یان لەخۆ گرتووە، چەندین چین و، پلە و، وێنە و، شێوازی جۆراوجۆریان تێدایە، کە هەریەکەیان - لەناو هەریەکەیاندا - کۆمەڵێك "ڕاستی"ی لە ئەستۆ گرتووە.

جا هەروەك ئەگەر چەند شووشەیەکی "زیو"ین بهێنیت و، بە تەواوەی "زێڕ" بیانڕازێنیتەوە و، ئنجا بە "گەوهەرەکان" بیان نەخشێنیت و، پاشان بە "داگیرساندنی کارەبا" لەناویاندا ڕووناکی‌یان پێ ببەخشیت، ئەوا چەندین چین و توێژی جوانی و، چەندەها پلەی جۆراوجۆری ئارایشتیان تێدا دەبینیت..

(هەروەك ئەمە وایە)..

بە هەمان جۆر، لە یەك بە یەکی ئەو ئایەتانەشدا، هەر لە ئامانجە بنەڕەتی‌یەکەوە هەتا دەگاتە شێوازی نموونە هێنانەوەکە، چەندین "ئاماژە" دانراوە و چەندەها "هێما" ڕاکێشراوە بۆ گەلێ مەقام و پلەی جیاجیا، دەڵێی مەبەستە بنەڕەتی‌یەکە بەسەر ئەو پلە و مەقامانەدا تلۆر بووەتەوە و، لە هەریەکەیان ڕەنگێك و شتێکی بۆ خۆی وەرگرتووە، هەتا وشەکانی بوونەتە بەشێك لەو وشانەی کە "کۆکەرەوە و لەخۆگری واتا زۆرەکان"ن، تەنانەت "کۆکەرەوەی کۆکەرەوەکان"یش!

* * *

"بەند"ێك و "پێشەکی"یەك:

بزانە کە:

قسەبێژ، هەروەك لە پێشدا واتا دەردەبڕێت و ئنجا لە ڕێی بەڵگەوە قەناعەت بە "ژیری" دەبەخشێت.. بە هەمان جۆر لە ڕێی وێناکانی "نموونە هێنانەوە"شەوە چەند هەستێك دەهاوێتە ناو "ویژدان"ی گوێ بیستەوە، ئیتر "مەیل و ئارەزوو" یاخود "نەفرین" لە دڵدا دەبزوێنێت و ئامادەی دەکات بۆ وەرگرتن..

کەواتە "گوفتاری ڕەوان" ئەوەیە کە "ژیری" و "ویژدان" پێکەوە سوودی لێ وەربگرن. چونکە ئەو گوفتارە هەروەك خۆی بەناو "ژیری"دا دەکات، بە هەمان جۆر دەدڵۆپێتە ناو "ویژدان"یشەوە.

لە ئەستۆگری گەیاندنی ئەم دوو ڕووەی گوفتار، بریتی‌یە لە "نموونە هێنانەوە". چونکە پێوەرێکی تێدایە کە بە هۆیەوە ئەو پاسایەی کە لە "نموونە بۆ هاتوو"دا هەیە، لە

اعلم أنَّ في كلِّ آيةٍ من هذه الآياتِ التمثيليةِ طبقاتٍ ومراتبَ وصُوَراً وأساليبَ متنوعةً. كلٌّ منها – في كلِّ منها – كفيلٌ وضامنٌ لطائفةٍ من الحقائق..

وكما أنك إذا أخذتَ قواريرَ من فضةٍ وزيَّنتَها بذَوْبِ الذهبِ، ثم نقشتَها بجواهرَ، ثم صيَّرْتَها ذواتِ نور[1] بإدراج "الألكتريق"[2] ترى فيها طبقاتِ حُسنٍ وأنواعَ زينةٍ؛ كذلك في كلٍّ من تلك الآياتِ من المقصد الأصليِّ إلى الأسلوب التمثيليِّ قد شُرِعَتْ إشاراتٌ ومُدّتْ رموزٌ إلى مقاماتٍ، كأنَّ أصلَ المقصدِ تدحرجَ على المراتب وأخَذَ من كلٍّ لوناً وحصةً حتى صارت تلك الكلماتُ من جوامع الكلماتِ بل من جَمعِ الجوامع.



## فصلٌ ومقدمة:

اعلم أنَّ المتكلمَ كما يفيدُ المعنى ثم يُقْنِعُ العقلَ بواسطةِ الدليل؛ كذلك يُلقي إلى الوجدانِ حسِّياتٍ بواسطةِ صوَرِ التمثيل، فيحرِّكُ في القلب المَيلَ أو النَّفرةَ ويُهيِّئه للقبول.

فالكلامُ البليغُ، ما استفادَ منه العقلُ والوجدانُ معاً، فكما يتداخلُ إلى العقل يتقطّرُ إلى الوجدان أيضاً.

والمتكفِّلُ لهذين الوجهَين التمثيلُ؛ إذ هو يتضمَّنُ قياساً وينعكسُ به في مرآة الممثَّلِ

---

(١) ذوات أنوار. (ش).

(٢) الكهرباء.

ئاوێنەی "نموونەکە"دا دەردەخات ، دەڵێی دەعوایەکـە بـە بەڵگەوە پێشکەش کـراوە. بـە وێنەی ئەوەی کە سەبارەت بە سەرۆکێك لە پێناوی حەوانـەوەی گەلەکـەیدا گرفتـەکان هەڵبگرێت، بڵێیت:

"چیـای گەردنکـەش، سـەختیی بـەفر و تـەرزە هـەڵدەگرێت و، شـیوەکانی لای خوارەوەی بە سەوزایی دەبووژێنەوە ".

پاشان بناغەی "نموونە هێنانەوە" بریتی‌یە لە "چواندن"(التشبیه). کاری "چواندن"یش بزواندنی هەستی "نەفرین یان مەیل"، "حەز یان ڕق"، "سەرسووڕمان یان سام و شکۆ"یـە لە مرۆڤدا. چونکە "چواندن" هەندێ جار بۆ "مەزن ڕاگرتن یان سـووکایەتی پێکـردن"، "هاندان یان دوورەپـەرێزی"، "شێواندن یـان ڕازاندنـەوە"، "نەرمکردنـەوە" یـان.. هتـد، بەکاردەهێنرێت.

کەواتە بە هۆی وێنەی شێوازەوە، "ویژدان" بێدار دەکرێتـەوە و، هەستی "حـەز" یـان "نەفرین"ی تێدا بەخەبەر دەهێنرێت.

پاشان یەکێك لەو شتانەی کە "نموونە هێنانەوە" دەکاتە کارێکی پێویست، "قووڵی" و "وردیی" واتایـە، تـاکو لـە ڕێی "نموونـە"وە ئاشـکرا بکرێـت و پێـش چـاو بخرێـت.. یـان "پەرت و بڵاوی"ی ئامانجەکەیە، تاکو بە هۆی "نموونە"وە پەیوەستی یەکتر بێتەوە..

"موتەشابیهەکان"ی قورئان[1] لە جۆری یەکەمیانە. چونکە لای لێکۆڵەران سـەلماوە کە ئەو موتەشابیهانە جۆرێکی بڵندی نموونە هێنانەوە و، چەند شێوازێکی باڵان بۆ گەلـێ حەقیقەتی ڕووت و چەندین زانیاریی عەقڵیی پەتی.

---

(١) (موتەشابیه): ئەو دەقە شەرعی‌یانە دەوترێ کە بە ڕوونی نازانرێ مەبەستی دانەری شەرع تیایاندا چی‌یە. هۆی پەنهانیی مەبەست لـە هـەندێکیاندا "وشـە"کانیانە، وەك سـەرەتای ئـەو سـوورەتانەی کـە بـە پیتـە پچـڕ پچڕەکان دەست پێدەکەن.. یـان هۆکـەی لـە "واتـا"کەیدایە، وەك ئایەتەکانی (صیفـات)ی خـوای گـەورە و سیفەتەکانی قیامەت.. یاخود لە "وشە" و لە "واتا"شدایە، وەکو ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ ظُهُورِهَا﴾ (البقرة:١٨٩). هەموو ئەمانەش دەبن بـە سێ بەشەوە. یەکەمیان: کـەس ناتوانێ بگاتـە ڕاستیی واتاکانیـان، وەکـو کـاتی بـەرپابوونی قیامـەت. دووهـەمیان مـرۆڤ دەتوانێـت بگاتـە ڕاسـتیی واتاکانیان، وەکو وشە نامۆکان و واتا داخراوەکان. سێ‌هەمیان: لە نێوان ئەو دوانەدایـە و زانینیـان تایبەتـە بـە هەندێ لە زانایانی ڕۆچوو لە زانستدا و لای غەیری ئەوان پەنهانە. هەر ئەمەش مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بووە لـە دوعاکەیدا بۆ ئیبن عەبباس کە فەرموویەتی: (اللهم فَقِّهْهُ في الدِّين وعَلِّمْهُ التـــأويل). بۆ درێژەی ئـەم بابەتـە

القانونُ المندمِجُ في الممثَّلِ به. فكأنَّه دعوى مدلَّلٌ. كما تقولُ في رئيسٍ يكابِدُ البلايا لراحةِ رعيتِه:

"الجبلُ العالي يتحمَّلُ مشاقَّ الثلجِ والبَرَدِ، وتخضرُّ من تحته الأوديةُ".

ثم إنَّ أساسَ التمثيلِ هو التشبيهُ. ومن شأن التشبيهِ تحريكُ حسِّ النَّفرةِ أو الرَّغبةِ أو الـمَيَلانِ أو الكراهيةِ أو الحَيرةِ أو الهَيبة؛ فقد يكونُ للتعظيمِ أو التحقير أو الترغيب أو التنفير أو التشويه أو التزيين أو التلطيف إلى آخره..

فبصورةِ الأسلوب يُوقَظُ الوجدانُ وينبَّهُ الحسُّ بميلٍ أو نَفرة.

ثم إنَّ مما يُحْوِجُ إلى التمثيل عمقَ المعنى ودقَّته ليتظاهرَ بالتمثيل، أو تفرُّقَ المقصدِ وانتشارَه ليرتبطَ به.

ومِن الأوّلِ متشابهاتُ القرآن؛ إذ هي عند أهلِ التحقيقِ نوعٌ من التمثيلات العاليةِ وأساليبُ لحقائقَ محضةٍ ومعقولاتٍ صرفة..

جا لەبەر ئەوەی گشتینەی خەڵك زۆربەی جار بە هۆی وێنەی خەیاڵکردەوە نەبێت حەقیقەتەکان وەرناگرن و، لە ڕێی شێوازەکانی نموونەشەوە نەبێت لە زانیاری‌یە عەقڵی‌یە پەتی‌یەکان تێناگەن، ئەوا جگە لە "موتەشابیهەکان" چارەیەکی دیکە نی‌یە بۆ تێگەیاندنیان لەو مەبەستانە، وەك: ﴿اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ (الأعراف: ٥٤). ئەوەش لەبەر ڕاهاتنی زەینیان بەو نموونانە و، چاودێری کردنی توانای تێگەیشتنیان.

پاشان من لە کاتێکی ڕابوردوودا، وەك پێشەکی‌یەك بۆ ڕوونکردنەوەی ئیعجازی قورئان، "دوازدە مەسەلە"م لە بنچینەی بناغەی ڕەوانبێژی دەرهێنا[1]، کە هەریەکەیان تاڵە دەزوویەکی پەیوەندی‌یە بە چەندین حەقیقەتەوە. جا لەبەر ئەوەی ئەم ئایەتانەی کە نموونەیان لەخۆ گرتووە بە یەکجار لێرەدا باس کران، ئەوا بە گونجاوی دەزانین کە ئەو دوازدە مەسەلانەش کورت بکەینەوە. بۆیە پشت بە خوای گەورە دەبەستین و، دەڵێین:

**مەسەلەی یەکەم**

جێی سەرهەڵدانی نەخشی ڕەوانبێژی، تەنها هۆنینەوەی "واتا"یە نەك هۆنینەوەی "وشە"، وەك ئەوەی کە زیادەڕەوانی شەیدای وشە لەسەری دەڕۆن و، "خۆشویستنی وشە" لای ئەوان بووەتە نەخۆشی‌یەکی درێژخایەنی ئەوتۆ کە "عەبدولقاهیری جورجانی" لە "دلائل الإعجاز" و "أسرار البلاغة"دا بەرپەرچی داونەتەوە و، زیاد لە سەد لاپەڕەی بۆ گفتوگۆ لەگەڵیاندا تەرخان کردووە.

"هۆنینەوەی واتا": پشکنین و گەڕانە لە نێوان وشەکاندا بە دوای واتاکانی زانستی "نەحوو"دا، واتە تواندنەوەی واتای پیتەکانە لە نێوان وشەکاندا، تاکو نەخش و نیگارە نامۆکان دروست بین.

جا ئەگەر بە وردی سەرنج بدەیت، دەبینیت:

ڕێڕەوی سروشتیی "جۆگەی هزر و هەستەکان" تەنها "هۆنینەوەی واتاکان"ە.. هۆنینەوەی واتاش ئەوەیە کە بە یاسای "مەنتیق" بنیات بنرێت.. "شێوازی مەنتیق"یش

---

بڕوانە: (المفردات في غريب القرآن) للراغب الأصفهاني. ص:٢٥٧-٢٥٨. چاپی پێنجەمی (دار المعرفة، بیروت) ساڵی ١٤٢٨ك/٢٠٠٧ز بە تەحقیقی: (محمد خليل عيتاني). (وەرگێڕ)

[1] مەبەستی دانەر "وتاری دووهەم، توخمی ڕەوانبێژی"یە لە کتێبی "موحاکەمات"دا، کە ئەویش لە بەرگی شەشەمی سەرجەمی پەیامەکانی نوور (داوەری‌یەکان)دا لاپەڕە ١٥١-١٨٨، بە زمانی کوردی بڵاوماان کردووەتەوە. (وەرگێڕ)

ولأنَّ العوامَ لا يتلقَّوْنَ الحقائقَ في الأغلب إلّا بصورةٍ متخيَّلةٍ، ولا يفهمون المعقولاتِ الصِّرفةَ إلّا بأساليبَ تمثيليةٍ، لم يكنْ بُدٌّ من المتشابهات كـ﴿اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ (الأعراف: ٥٤) لتأنيسِ أذهانِهم ومراعاةِ أفهامِهم.

ثم إني استخرجتُ - فيما مضى من الزمان - من أُسِّ أساسِ البلاغةِ مقدِّمةً لبيان إعجازِ القرآن ثنتَي عَشْرَةَ مسألةً. كلٌّ منها خيطٌ لحقائقَ[1]. ولما ذُكرتْ هذه الآياتُ التمثيليةُ هنا - دُفعةً - ناسبَ تلخيصَ تلك المسائل. فنقولُ وبالله التوفيقُ:

**المسألةُ الأولى**

إنَّ منشأ نقوشِ البلاغةِ إنما هو نظمُ المعاني دون نظمِ اللفظ، كما جرى عليه اللفظيون المتصلِّفون، وصارَ حبُّ اللفظ فيهم مَرَضاً مُزمِناً إلى أنْ ردَّ عليهم عبدُ القاهرِ الجرجانيُّ في دلائلِ الإعجازِ وأسرار البلاغةِ، وحصرَ على المناظرة معهم أكثرَ من مائةِ صحيفةٍ.

ونظمُ المعاني: عبارةٌ عن تَوَخّي المعاني النحويةِ فيما بين الكلماتِ أي إذابةِ المعاني الحَرفيةِ بين الكَلِم لتحصيلِ النقوشِ الغريبة..

وإنْ أمعنتَ النظرَ لرأيتَ:

أنَّ المجرى الطبيعيَّ للأفكار والحسيات إنما هو نظمُ المعاني. ونظمُ المعاني هو الذي يُشَيِّدُ بقوانين المنطق.. وأسلوبُ المنطقِ هو الذي يتسلسَلُ به الفكرُ إلى الحقائق.

---

(١) المقصود المقالة الثانية "عنصر البلاغة" من كتاب "محاكمات عقلية" (صيقل الإسلام).

ئەوەیە کە زنجیرەی هزرەکان لە ڕێیەوە دەگەنە "ڕاستییەکان".. ئەو "هزر"ەش دەگاتە ڕاستییەکان ئەوەیە کە دەچێتە ناخی وردەکارییەکانی "ماهییەت"[1] و ڕێژەکانی.. هەر ڕێژەکانی ماهییەتیشن کە پەیوەندیدەری "ڕێسای تەواو کامڵ"ی جیهانن.. ڕێسای تەواو کامڵیش ئەوەیە کە "جوانیی پەتی"ی تێدا دانراوە، کە ئەویش سەرچاوەی هەموو جوانییەکە.. "جوانیی پەتی"ش باخچە و گوڵزاری ڕەوانبێژییە کە پێی دەوترێ: ڕووە ناسکەکان و تایبەتمەندییەکان.. ئەو باخچە بە گوڵ خەملاوەش ئەوەیە کە بولبولانی ڕەوانبێژی و شەیدایانی سروشت گەشت و هاتوچۆی تێدا دەکەن.. ئنجا ئاوازە ناسك و شیرینەکانی ئەو بولبولانەش لە بەش بەش کردنی ئەو زایەڵە ڕۆحانییەوە پەیدا دەبێت کە بەناو لوولەکانی (شمشاڵەکانی) "هۆنینەوەی واتاکان"دا بڵاو بووەتەوە.

بە پوختی: بوونەوەران لەوپەڕی "ڕەوانبێژی"دان؛ چونکە بەدیهێنەریان بە شێوەیەکی ڕەوان دایڕشتوون و، بە ئاوازی سروودێکی پاراویش دەری بڕیون. کەواتە هەر وێنەیەك و هەر جۆرێکی ئەم بوونەوەرانە، بە پێی ئەو سیستەمەی تیایدا دانراوە، یەکێکە لە موعجیزەکانی توانستی بەدیهێنەر.

جا ئەگەر "گوفتار" شوێن پێی "واقیع" هەڵبگرێت و، هۆنینیشی لەگەڵ "ڕێسای بوونەوەران"دا بە پڕاوپڕی یەك بگرێتەوە، ئەوا ڕەوانییەکی سەرانسەری بەدەست دەهێنێت. دەنا گەر بایەخی خۆی ئاراستەی هۆنینی "وشە" بکات، دووچاری ڕیا و خۆنواندن دەبێت و، وەکو ئەوەی لێ دێت کە بکەوێتە ناو زەوییەکی وشك و برنگ و سەرابێکی خەڵەتێنەرەوە!

هۆی لادانیش لە سروشتی "ڕەوانبێژی" ئەوەیە کە: دەسەڵاتداریی عەرەب کاتێ عەجەمەکانی بەرەو خۆی کێش کرد و ئەوانیش فێری زمانی عەرەبی بوون، گرنگترین شت بە لایانەوە پیشەی وشەسازی بوو. هەروەك بە تێکەڵ بوونیشیان لەگەڵ ئەواندا بەهرە و لێهاتوویی "گوفتاری موزەری"[2] تێکچوو کە بناغەی ڕەوانبێژیی قورئانە. ئیتر

---

(١) ماهییەت: زاراوەیەکی فەلسەفە و زانستی "کەلام"ە، لە پرسیاری: (ما هو؟) وەرگیراوە، وەڵامی ئەم پرسیارەش پێی دەوترێت "ماهییەت"، کە دەبێ وەڵامێك بێت تەسەووری ئەو شتەی پرسیاری لەبارەوە کراوە، هەروەها زانینی زات و گەوهەر و سروشتی، بەدەستەوە بدات. (وەرگێڕ)

(٢) واتە: زمانی عەرەبیی فوسحا. "موزەر"یش ناوی یەکێکە لە باپیرانی پێغەمبەر، دروودی خوای لەسەر بێت. (وەرگێڕ)

والفكرُ الواصلُ إلى الحقائق هو الذي ينفُذُ في دقائق الماهياتِ ونِسَبها.. ونِسَبُ الماهياتِ هي الروابطُ للنظام الأكملِ.. والنظامُ الأكملُ هو الصَدَفُ للحُسن المجرَّدِ الذي هو منبعُ كلِّ حُسنٍ.. والحسنُ المجرّدُ هو الروضةُ لأزاهير البلاغةِ التي تُسَمَّى لطائفَ ومزايا.. وتلك الجنةُ المُزهِرةُ هي التي يجولُ ويتنـزّهُ فيها البلابلُ المسمّاةُ بالبلغاء وعشّاقِ الفطرةِ.. وأولئك البلابلُ نغماتُهم الحلوةُ اللطيفةُ إنما تتولَّدُ من تقطيع الصدى الروحاني المنتشرِ من أنابيبِ نظمِ المعاني.

والحاصلُ:

أنَّ الكائناتِ في غاية البلاغةِ قد أنشأها وأنشدَها صانعُها فصيحةً بليغةً، فكلُّ صورةٍ وكلُّ نوعٍ منها - بالنظام المندمجِ فيه - معجزةٌ من معجزات القدرة..

فالكلامُ إذا حذا حذوَ الواقع، وطابقَ نظمُه نظامَه حازَ الجزالةَ بحذافيرها. وإلّا فإنْ توجَّهَ إلى نظم اللفظِ وقعَ في التصنُّعِ والرياء، كأنَّه يقعُ في أرضٍ يابسةٍ وسرابٍ خادع.

والسرُّ في الانحراف عن طبيعة البلاغةِ أنَّه:

لما انجذبَ واستعربَ العجمُ بجاذبة سلطنةِ العربِ صارتْ صَنعةُ اللفظِ عندهم أهمَّ، وفسدَ بالاختلاطِ مَلَكةُ الكلامِ المُضَريّ التي هي أساسُ بلاغةِ القرآن، وتلوَّنَ

ئاڵوگۆڕ بەسەر هۆنینی گوفتار لەو زمانەدا هات كە دەرخەری شێوازەكانی قورئانە. سەرچاوەی ئەو شێوازانەش تەنها هەست و نەست و میزاجی قەومی "موزەر"ە. كەچی "خۆشویستنی وشە" گەلێ كەسی چینەكانی دواییی شەیدای خۆی كرد.

*پاشكۆیەك*:

تەنها لەو كاتەدا ئارایشتدانی وشە بە جوان دادەنرێت كە سروشتی واتاكان داخوازی بێت..

كاتێ درەخشانیی "وێنەی واتا" شكۆ بە واتا دەبەخشێت كە "درەنجام" ڕێی پێ بدات..

شێوازیش كاتێ ڕووناك دەكرێتەوە و بە "ڕەوانی" دادەنرێت كە "ئامانج" ئامادەیی تێدا بێت..

ناسكیی "تەشبیهـ"یش كاتێ ڕەوانبێژیی تێدا دەبێت كە لەسەر پەیوەندیی بە مەبەستەكەوە بنیات نرابێت و، ئامانجی گوفتاریش پێی ڕازی بێت..

مەزنی و هاتوچۆی "ئەندێشە" كاتێ لە ڕیزی ڕەوانبێژیدایە كە "حەقیقەت" ئازار نەدات و لەسەر شانی قورس نەبێت و، نموونەیەكی گوڵگرتووی چەكەرەی "حەقیقەت" بێت.

گەر نموونەی وەهات دەوێت كە ئەو هەل و مەرجانەی سەرەوەی لەخۆ گرتبێت، ئەوا فەرموو سەر لەو ئایەتانە بدەرەوە كە "نموونە هێنانەوە"یان لەخۆ گرتووە و لە پێش ئەم پێشەكییەوە دامان ناون.

مەسەلەی دووهەم

هەركات "سیحری بەیان" لە گوفتاردا دەركەوت، ئەوا "عەرەز" دەكات بە "گەوهەر" و[1]، "واتاكان" دەكاتە "بەرجەستە" و، "بێ گیانەكان" دەگۆڕێت بە "گیاندار" و، "ڕووەكەكان" دەكاتە "خاوەنی ژیری" و، گفتوگۆیەكیان لە نێواندا ساز دەكات كە ئەنجامەكەی یان "ڕكابەری" یاخود "دڵنەوایی كردنی یەكتری" دەبێت. ئیتر بێ گیانەكان لە پێش چاوی ئەندێشەدا دەكەونە سەما و هەڵپەڕكێ.

---

(١) "عەرەز" (العَـــرَض) لەو شتەیە كە بۆ "بوون"ی پێویستی بە جێیەك هەبێت كە بە هۆیەوە دەربكەوێت. "گەوهەر" (الجوهر) زیاتر ماهییەتی شتەكان دەگرێتەوە، چ موجەڕڕەد بن، وەك "دەروون" و "ژیری" چ نا موجەڕڕەد بن، وەكو "تەن" و "شێوە". لە: "التعريفات"ی جورجانییەوە. (وەرگێڕ)

مَعكِسُ أساليبِ القرآن؛ وإنما معدنُها من حسّياتِ قوم "مُضَرَ" ومزاجِهم. فاستهوى حبُّ اللفظ كثيراً من المتأخرين.

*تذييل:*

تزيينُ اللفظِ إنما يكونُ زينةً إذا اقتضتْهُ طبيعةُ المعاني..

وشعشَعةُ صورةِ المعنى إنما تكونُ حشمةً له إذا أذِنَ به المآلُ..

وتنويرُ الأسلوبِ إنما يكونُ جزالةً إذا ساعدَه استعدادُ المقصودِ..

ولطافةُ التشبيهِ إنما تكونُ بلاغةً إذا تأسّسَتْ على مناسبة المقصودِ وارتضى به المطلوبُ..

وعظمةُ الخيالِ وجَوَلانُه إنما تكونُ من البلاغة إذا لم تؤلِمِ الحقيقةَ ولم تثقُلْ عليها، ويكونُ الخيالُ مثالاً للحقيقة مُتَسَنْبِلاً عليها.

وإنْ شئت الأمثلةَ الجامعةَ لتلك الشرائطِ فعليك بتلك الآياتِ التمثيليةِ المذكورةِ قبل المقدمة.

المسألةُ الثانيةُ

إنَّ السحرَ البيانيَّ إذا تجلّى في الكلام صيّرَ الأعراضَ جواهرَ، والمعانيَ أجساماً، والجماداتِ ذواتِ أرواحٍ والنباتاتِ عقلاءَ، فيوقِعُ بينها محاورةً قد تنجرُّ إلى المخاصمةِ، وقد تُوصِلُ إلى المطايبةِ فترقُصُ الجماداتُ في نظر الخيالِ.

ئەگەر نموونەت لەسەر ئەمە دەوێ، فەرموو بڕۆرە ناخی ئەم بەیتەوە:

یُناجِینِی الإخلافُ من تحتِ مَطْلِه      فتختصمُ الآمال والیأس فی صدري[1]

یان لەم بەیتەی خوارەوەدا گوێ لە ئەویندارییی نێوان زەوی و باران بگرە:

تَشَكّی الأرضُ غیبتَه إلیه      وترشُفُ ماءه رشفَ الرضاب[2]

ئەم وێنەیە لە دەنگ دەرکردنی زەوی لە کاتی هەلمژینی ئاوی بارانەکەوە گوڵی گرتووە کاتێ کە زەوی بارانی درەنگ لێ بباریێت.

دەبێ هەموو "ئەندێشە"یەك - بە وێنەی ئەم نموونەیە - ناوکێکی "حەقیقەت"ی لەخۆ گرتبێت. هەروەك پێویستە هەموو شووشەیەکی "مەجاز" چرای "حقیقەت"ی[3] تێدا بێت. دەنا ئەوەی کە "ئەندێشە" پێی وا دەبێ "ڕەوانبێژی" بێت، لە ڕاستیدا خورافەتێکی بێ ڕەگ و ڕیشە دەبێت کە جگە لە سەرسامی شتێکی تری لێ ناوەشێتەوە.

**مەسەلەی سێهەم**

بزانە کە: تەواوی و جوانی و پۆشاکی ڕەوانکاریی هەر گوفتارێك لە "شێواز"ەکەیدایە، "شێواز"ەکەشی وێنەی "ڕاستی"یەکان و قالبی ئەو واتایانەیە کە لە پارچەکانی "ئیستیعارەی تەمسیلی"[4] پێکدێت. دەڵێی ئەو پارچانە "سینەما"یەکی ئەندێشەیین. وەك ئەوەی کە وشەی "میوە" باخەکەی و، وشەی "زۆرانی گرت"یش مەیدانی جەنگ پێش چاوی مرۆڤ دەخات.

---

(١) ئەم بەیتە هی "ابن المعتز"ە (٨٦١-٩٠٨ز). لە کتێبی "دلائل الإعجاز"ی "عەبدولقاهیری جورجانی"دا ص ٦١ بەو دەقەی سەرەوە هاتووە، بەڵام لە دیوانی شاعیردا بەم جۆرەیە: (تجاذبنی الاطراف بالوصْل والقلی.. هتد). بڕوانە: (دیوان ابن المعتز) ص: ٣١٥، شرح الدکتور شکري فرحات، دار الجیل، بیروت ط١، ١٩٩٥م. واتە: "بێ بەڵێنی" لە ژێر پەردەی تەفرەدان و دەستی دەستی لە حەقدا، پێم دەڵێ: "مەخەڵەتێ"! ئیتر "ئومێد" و "نائومێدی"یەکان" لەناو سینەمدا دەبێتە هەرایان و ئەو مەنزڵە شێواوەم دەڕمێنن. (وەرگێڕ)

(٢) ئەم بەیتە هی موتەنەبی"یە. واتە:

"زەوی" سکاڵای دووری لای "باران"      دەکات و ئاوی لێوانی دەمژێ

بڕوانە: (دیوان المتنبي، ص: ١٥٨ دار الجیل، بیروت، دون تأریخ). (وەرگێڕ)

(٣) "حەقیقەت": بەکارهێنانی وشەیە لەو واتایەدا کە بەکەم جار بۆی دانراوە. بەڵام "مەجاز" بەکارهێنانی وشەیە لە واتایەکی تری جیاواز لە واتا ڕاستەقینەکەیدا، لەبەر ئامانجێکی ڕەوانبێژی. (وەرگێڕ)

(٤) ئیستیعارەی تەمسیلی لە ڕەوانبێژیی زمانی عەرەبیدا بەو جۆرە دەستەواژە مەجازییانە دەوترێ کە لەبەر نیشانە و هۆیەکی تایبەتی لە واتایەکی تری جگە لە واتا ڕاستەقینەکەیاندا بەکارهێنراون و، زیاتر لەو پەندانە دەگرێتەوە کە لەناو خەڵکیدا دەماودەمیان پێ دەکرێت. وەك ئەوەی کە دەڵێن: (برا لە پشت برا بێت، مەگەر قەزا لای خوا بێت)! (وەرگێڕ)

وإن شئت مثالاً فادخُلْ في هذا البيت:

يُنَاجِينِي الإِخْلَافُ مِنْ تَحْتِ مَطْلِهِ     فَتَخْتَصِمُ الآمَالُ وَالْيَأْسُ في صَدْرِي[1]

أو استمعْ معاشقةَ الأرضِ مع المطرِ في:

تَشَكَّى الأَرْضُ غَيْبَتَهُ إِلَيْهِ     وَ تَرْشُفُ مَاءَهُ رَشْفَ الرُضابِ[2]

فهذه الصورةُ إنما تسنبلتْ على تَصَوُّتِ الأرضِ اليابسةِ بنـزولِ المطرِ بعد تأَخُّرٍ.

ولابدَّ في كلِّ خيالٍ من نواةٍ من الحقيقة نظيرَ هذا المثال، ولابدَّ في زجاجةِ كلِّ مجازٍ من سراجِ الحقيقةِ، وإلّا كانتْ بلاغتُه الخياليةُ خرافةً بلا عِرقٍ لا تُفيدُ إلّا حَيرةً.

**المسألةُ الثالثةُ**

اعلم أنَّ كمالَ الكلام وجمالَه وحُلّتَه البيانيةُ بأسلوبه. وأسلوبُه صورةُ الحقائق وقالبُ المعاني المتّخَذُ من قطعَات الاستعارةِ التمثيلية. وكأنَّ تلك القطعاتِ "سِيمُوطُوغْرَاف"[3] خياليٌّ؛ كإراءةِ لفظِ "الثمرة" جنتَّها وحديقتَها، ولفظِ "بارَزَ" معركةَ الحرب.

---

(١) لابن المعتز "دلائل الإعجاز" ص:٦١ وفي ديوان ابن المعتز: تجاذبنى الأطراف بالوصل والقلى.. ص ٢٢٦.

(٢) للمتنبي في ديوانه ١/ ٢٦٣.

(٣) الكتابة المتحركة، أصلها: سينماطوغراف ثم اختصرت إلى سينما.

پاشان "نموونە هێنانەوەکان" لەسەر بناغەی پەیوەندیی نێوان شتەکان و، دەرکەوتنیان لە سیستەمی بوونەوەراندا و، ڕاکێشانی سەرنجی هەندێ شت بۆ هەندێ شتی تر، دادەمەزرێن..

بە وێنەی ئەوەی کە بینینی شێوە کەوانەیی مانگ لەناو کۆئەستێرەی "سورەییا" لە زەینی ڕۆڵەی ناو دارخورمادا سەرنجی بۆ لای پەلی سپیی ئەو درەختە ڕادەکشێت کە وەك پێیەکی کەوانەیی لێ هاتووە بەهۆی شۆڕبوونەوەی هێشووەکانی.

لە قورئانیشدا ئەم نموونەیە هەیە:

﴿حَتّٰى عادَ كَالْعُرجُوْنِ الْقَدِيمِ﴾ (يس: ٣٩)[1].

پاشان سوودی شێوازی "نموونە هێنانەوە" وەك ئەوەی کە لەو ئایەتە باسکراوانەدا هەیە، ئەوەیە کە:

قسەبێژ لە ڕێی "ئیستیعارەی تەمسیلی"یەوە ڕەگ و ریشە قووڵەکان پێش چاو دەخات و، واتا پەرش و بڵاوەکانیش بە یەك دەگەیەنێت.

جا ئەگەر قسەبێژ چمکێکی شێوازەکەی بداتە دەست گوێ بیست، ئەوا ئەو گوێ بیستە دەتوانێ پاشماوەکەی بۆ خۆی ڕابکێشێت و، بە هۆی پەیوەندیی نێوان بەشەکانی ئەو گوفتارە بگاتە بەشەکانی تری. ئیتر بە بینینی هەندێکی، تەنانەت گەر بە هەندێ تاریکی و تەم و مژیش بووە، وردە وردە بەرەو هەموو واتاکە سەردەکەوێت..

---

(١) دانەر لە "وتەی بیست و پێنجەم"دا، کە پەیامی "موعجیزاتی قورئانی"یە، لەم بارەیەوە دەڵێت: "مانگ" مەنزڵێکی تایبەتیی خۆی هەیە کە بازنەی "سورەییا"یە. جا کاتێك کە مانگ لەو مەنزڵەدا وەکو دەمەداس (هلالی) دەبێت، ئەوا شێوەی لە پەلی وشکی دارخورما دەچێت کە گەڵاکانی لێ کرابێتەوە و ڕەنگی سپی بنوێنێت.

لەم ئایەتە پیرۆزە، بەم تەشبیهەی باس کرا، وا دەخاتە پێش‌چاوی ئەندێشەی بیسەر کە: لە پشت پەردەی ئاسمانی شینەوە درەختێك هەیە‌ت یەکێك لە پەلە نوورانی و سپی و نووك تیژەکانی لەو پەردەیەی دڕی بێت و سەری لێ هێنابێتە دەرەوە و، کۆمەڵە ئەستێرەی "سورەییا"ش وەك هێشووەیەکی هەڵواسراوی ئەو درەختە وابێت و، ئەستێرەکانی تریش وەك بەروبوومە نوورانی‌یەکانی تری وابن!

بێ گومان باسکردنی "هیلال" بەم تەشبیهە بۆ کەسانێك کە سەرچاوەی گوزەران و زۆربەی بژێویان لەسەر دارخورما بێت، لەوپەڕی جوانی و ناسکی و گونجاوی و بڵندیدایە. گەر خاوەنی چێژی ناسك و هەستیار بیت، پەی بەمە دەبەیت. (وەر گێڕ)

ثم إنَّ التمثيلاتِ مؤسَّسةٌ على سرِّ المناسباتِ بين الأشياءِ، والانعكاساتِ في نظام الكائناتِ، وإخطارِ أمورٍ أموراً؛ كإخطار رؤيةِ الهلالِ في الثريا في ذهن أبناءِ النخلةِ غصنَها الأبيضَ بالقدم المتقوّس بتدلي العنقودِ(١).

وفي التنزيل:

﴿حَتَّى عادَ كَالْعُرْجُوْنِ الْقَدِيمِ﴾ (يس: ٣٩).

ثم إنَّ فائدةَ أسلوبِ التمثيلِ كما في الآيات المذكورةِ، هي أنَّ المتكلمَ بواسطة الاستعارةِ التمثيليةِ يُظهِرُ العروقَ العميقةَ، ويُوصِلُ المعاني المتفرقةَ..

وإذا وضعَ بيد السامعِ طرفاً أمكَنَ له أنْ يجُرَّ الباقيَ إلى نفسِه، وينتقلَ إليه بواسطة الاتّصالِ. فبرؤيةِ بعضٍ يتدرجُ شيئاً فشيئاً - ولو مع ظُلمةٍ - إلى تمامه..

---

(١) لعل الأستاذ يقصد قول قيس بن خطيم:

وقد لاح في الصبح الثريا لمن رأى     كعنقود مـلاحيّه حين نوّرا

أو قول ابن المعتز:

وأرى الثريا في السماء كأنها     قدم تبدت من ثياب حداد

بۆ نموونە:

گەر کەسێك لە وەسفی گوفتاری ڕەواندا گوێی لە گەوهەرفرۆش بوو دەیوت: "ئەوەیە کە هزر کوناودەری کردبێت".. بادە فرۆش لە بارەیەوە دەیوت: "ئەوەیە کە لە مەنجەڵەکانی زانستدا کوڵێنرابێت".. حوشترەوانیش لە وەسفیدا دەیوت: "ئەوەیە کە ڕەشمەی بگریت و لە نشینگەی واتادا یخی بدەیت"..

گەر کەسێك ئەم وەسفەی لەوان بیست، ئەوا بە تێبینی کردنی بۆ پیشەی هەر یەك لەوان، بە تەواوی لە مەبەستەکە دەگات.

پاشان حیکمەتی پێکهاتنی "شێواز" ئەوەیە کە قسەبێژ بە ویستی خۆی "بانگ" دەکات و، بەو بانگەش واتا نوستووەکانی ناو گۆشە تاریکەکانی "دڵ" بەخەبەر دێنێ و، دەڵێی ئەو واتایانە بە ڕووتی و پەتی لەوێ دێنە دەرەوە و، دەڕۆنە ناو "ئەندێشە"وە، ئیتر بە پێی پیشە، یان تێدارۆچوون، یان ڕاهاتن، یان پێویستی، پۆشاکی یەکێك لەو وێنە ئامادانە دەپۆشن کە لەوێ دەیبینن. لانی کەم مێزەرێك لەو پیشەیە لە سەری دەپێچێتەوە، یان ڕەنگێکی ئەوێ دەگرێت.

یەکێك لە ئاشکراترینی نموونەکانی ئەم مەسەلەیە بریتییە لەو سەرەتا قەشەنگانەی کە لە پێشەکیی کتێبەکاندا دەیانبینیت.

پاشان ئەوەت لەبیر نەچێت کە هەندێ جار "شێوازی گوفتار" بە پێی ئەندێشەی گوێ بیست دادەڕێژرێت، وەك شێوازەکانی قورئان.

پاشان پلەکانی "شێواز" جیاجیان. هەندێکیان لە شنەی دەمی بەیان نیانترە و، بە شێوە دارشتنی گوفتارەکە هێمای بۆ دەکرێت.. بەشێکی تریان لە فرت و فێڵەکانی جەنگ پەنهانترن؛ کەسانی زیرەك و بلیمەتی بواری جەنگ نەبێ بۆنی ناکات. وەك ئەوەی کە "زەمەخشەری"[1] لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وهِيَ رَمِيمٌ﴾؟ (یس:٧٨) بۆنی شێوازی کەسێکی کردووە کە بڕواتە ناو مەیدانی جەنگەوە!

گەر پێت خۆشە، ئەوا سەرنج لەو ئایەتانە بدە کە لە پێشدا هێنامانن، چونکە بە نەرم و نیانترین شێوە ڕاستیی ئەم مەسەلانەیان تێدا دەبینیت.

(١) بڕوانە پەراوێزی (٢)ی لاپەڕە (١٠٢)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

فمَن سمِعَ مِن الجوهريِّ ما قال في وصف الكلامِ البليغِ: "الكلامُ البليغُ ما ثقبَتْه الفكرةُ".. ومن الخمّار ما قال فيه: "ما طُبِخَ في مراجِل العلم".. ومن الجمَّال ما قال فيه: "ما أخذتَ بخطامِه وأنَخْتَهُ في مَبْرك المعنى".. ينتقلُ إلى تمام المقصدِ بملاحظة الصنعةِ.

ثم إنَّ الحكمةَ في تشكُّلِ الأسلوبِ هي أنَّ المتكلمَ بإرادته ينادي ويوقِظ المعانيَ الساكنةَ في زوايا القلبِ كأنَّها حُفاةٌ عراةٌ. فيخرُجون ويدخُلون الخيالَ، فيلبَسون ما يجِدون مِن الصُّور الحاضرةِ بسببِ الصنعةِ أو التوغُّلِ أو الأُلفةِ أو الاحتياجِ، ولا أقلَّ مِن لَفِّ مِنديلٍ من تلك الصنعةِ برأسِه، أو الانصباغِ بلونٍ مّا. وما تجدُه في ديباجة الكتبِ من براعةِ الاستهلالِ مِنْ أظهرِ أمثلةِ هذه المسألة.

ثم إنَّ أسلوبَ الكلامِ قد يكونُ باعتبار خيالِ المخاطَبِ كما في أساليبِ القرآنِ فلا تنسَ.

ثم إنَّ مراتبَ الأسلوبِ متفاوِتةٌ، فبعضُها أرقُّ من النسيمِ إذا سَرى يُرمَز اليه بهيئاتِ الكلام، وبعضُها أخفى من دسائسِ الحربِ لا يشمُّه إلّا ذو دَهاءٍ في الحرب؛ كاستشمام الزمخشريِّ مِن ﴿مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وهيَ رَمِيم﴾؟(يس:٧٨) أسلوبَ "مَن يبرزُ إلى الميدان".

وإنْ شئت فتأمَّلْ في الآيات المذكورةِ ترَ فيها مِصداقَ هذه المسائلِ بألطفِ وجهٍ.

یان ئەگەر ویستت، فەرموو سەردانی ئیمامی "بووصیری"[1] بکەو، بڕوانە کە چۆن ڕەچەتەکەی بە "شێوازی حەکیم" نووسیوە:

واستفرغ الدمعَ من عينٍ قد امتلأتْ   من المحارمِ والزمْ حِميةَ النَدَمِ[2]

دەبینی بە وشەی "حِمية"(پارێز) هێمای بۆ "شێواز" کردووە.

یان گوێ لە "پەپووسلێمانە" ڕابگرە کە چۆن ئاماژەی بۆ ئەندازیاریی خۆی کردووە، لەو قسەیەیدا کە وتوویەتی:

﴿أَلاَّ يَسْجُدُوا لله الَّذِي يُخْرِجُ الْخَبْءَ فِي السَّموَاتِ وَالأَرْضِ﴾ (النمل: ٢٥)؟

**مەسەلەی چوارەم**

بزانە: "گوفتار" کاتێ هێز و توانای تێدا دەبێت کە بەشەکانی ئەو گوفتارە ناوەڕۆکی ئەم بەیتەیان تێدا بێتەدی کە وتراوە:

جوانیت یەکێکە و باسمان جیا جیایە   یەك یەك ئاماژەی جوانیی تۆی لایە

ئەوەش بەوە دەبێ کە بەستێنەکانی ئەو گوفتارە و، ڕێساکانی و، ڕوخسارەکانی، بە دەم خواستی یەکترەوە بڕۆن و، هەریەکەیان دەستی ئەوی تر بگرێت و پشتیوانیی لێ بکات و، بە ئەندازەی خۆی پارمەتیی ئامانجە گشتییەکە بدات، هاوکات لەگەڵ دەرخستنی بەروبوومی تایبەتیی خۆیدا. وەك بڵێی ئامانجە هاوبەشەکە حەوزە ئاوێك بێت لە تەڕایی لاکانیەوە ئاو هەڵبمژێت..

ئیتر لەم "بەدەم خواستی یەکتر ڕۆشتن"ەوە "هاوکاری" و.. لەویش "ڕێکوپێکی و.. لەویش "پێکەوە گونجاوی" و.. لەویش "جوانیی خۆیی" دروست دەبێت.

ئەم نهێنییەی ڕەوانبێژی لە کۆی "قورئان"دا دەردەکەوێت، بە تایبەت لە:

﴿الم ۞ ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُــدًى لِلْمُتَّقِــينَ﴾دا، وەك پێشتر لەگەڵ هێنانی هاوشێوەکەی بیستت لە: ﴿وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِنْ عَذَابِ رَبِّكَ﴾دا[3] (الأنبياء: ٤٦).

---

(١) محەممەدی کوڕی سەعیدی بووصیری (٦٠٨-٦٩٦ك): زانا و شاعیرێکی بەناوبانگە. (وەرگێڕ)

(٢) ئەم بەیتە هی "بووصیری"یە لە قەسیدەی "بردة المديح"دا. واتە: فرمێسکەکانی ئەو چاوە هەڵڕێژە کە لە بینینی شتی حەرام پڕ بووە و، لە پارێزی پەشیمانی لامەدە. بڕوانە: (ديوان البوصيري، ص: ٢٢٨، دار المعرفة، بيروت، ١٤٢٨هـ/٢٠٠٧م). (وەرگێڕ)

(٣) واتە لە سەرەتای تەفسیری ئایەتی دووهەمی ئەم سوورەتەدا. (وەرگێڕ)

وإنْ شئت زُرِ الإمامَ البوصيريَّ وانظرْ كيف كتبَ "رَجَتَتَهُ"[١] بأسلوبِ الحكيم في قوله:

وَاسْتَفْرِغِ الدَّمْعَ مِنْ عَيْنٍ قَدِ امْتَلأتْ    مِنَ الْمَحَارِمِ وَالْزَمْ حِمْيَةَ النَّدَمِ

ورَمزَ إلى الأسلوب بلفظ الحِمية.

أو استمعْ هُدهدَ سليمانَ كيف أومأ إلى هندسته[٢] بقوله:

﴿أَلاّ يَسْجُدُوا للهِ الَّذِي يُخْرِجُ الْخَبْءَ فِي السَّموَاتِ وَالأَرْضِ﴾ (النمل: ٢٥).

**المسألةُ الرابعةُ**

اعلم أنَّ الكلامَ إنما يكونُ ذا قوّةٍ وقدرةٍ إذا كان أجزاؤه مصداقاً لَمّا قيل:

عِبَاراتُنا شَتى وَحسْنُكَ وَاحِدٌ    وَكُلٌّ إلى ذَاكَ الجَمَالِ يُشيرُ

بأن تتجاوبَ قيوداتُ الكلامِ ونظمُه وهيئتُه، ويأخذَ كلٌّ بيَد الآخَر ويظاهِرَه، ويمدَّ كلٌّ بقَدَرِه الغرضَ الكلّيَّ مع ثمراتِه الخصوصيةِ. كأنَّ الغرضَ المشتركَ حوضٌ يتشرَّبُ من جوانبِه الرّطبةِ، فيتولَّدُ من هذه المجاوبةِ المعاونةُ، ومنها الانتظامُ، ومنه التناسبُ، ومنه الحُسنُ والجمالُ الذاتي.

وهذا السرُّ من البلاغةِ يتلألأُ من مجموع القرآنِ لا سيما في: ﴿الم * ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ﴾ كما سمعتَه مع التنظيرِ بقوله: ﴿وَلَئِن مَسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِنْ عَذَابِ رَبِّكَ﴾ (الأنبياء: ٤٦).

---

(١) وصفة طبية.

(٢) ومعرفته الماء تحت الأرض. (الكشاف).

**مەسەلەی پێنجەم**

بزانە سامان و دەوڵەمەندی و فراوانیی گوفتار لەوەدایە کە هەروەك "بناغەی پێکهاتنی ئەو گوفتارە" خودی مەبەستەکەی روون بکاتەوە.. بە هەمان جۆر، چۆنێتی و روخسار و شوێنکەوتەکانیشی هێما و ئاماژە بۆ پێداویستییەکانی ئامانجە گشتییەکە و، پاشکۆکانی و، لقەکانیشی بکەن. وەك بڵێی هەریەك لەمانە، چین لە دوای چین و پلە لە دوای پلە، لە یەکتریدا دەربکەون.

گەر نموونەت لەسەر ئەمە دەوێت، ئەوا بیر لە: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ﴾.. هتد، هەروەها: ﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ ءامَنُوا﴾.. هتد، بکەرەوە، بەو شێوە تەفسیرەی کە رابورد.

**مەسەلەی شەشەم**

بزانە کە: ئەو "واتا"یانەی لە نەخشەی گوفتار دەرنرێن، کە ئەویش بە فۆتۆگرافی "وشە"دەربرین وەرگیراوە و نەخشێنراوە، چەند جۆرێکی جیاواز و چەندین پلەی جیاجیای هەیە. هەندێکیان بە وێنەی "هەوا"یە هەستی پێ دەکرێت و نابینرێ.. هەندێکی تریان وەکو "هەڵم" وایە دەبینرێت بەڵام ناگیرێت.. هەندێکی دیکەشیان بە وێنەی "ئاو"ە دەگیرێت بەڵام راگیر ناکرێت.. هەندێکی تر وەکو "دارێژراو" وایە راگیر دەکرێت بەڵام دەستنیشان ناکرێت.. هەندێکی دی بە وێنەی "مرواریی هۆنراو" و "زێری سکە لێدراو" وایە، دەستنیشان دەکرێ..

پاشان ئەوەی کە وەکو "هەوا"یە هەندێ جار بە کاریگەریی ئامانج و مەقامی گوفتارەکە، رەق دەبێت..

هەندێ جاری تریش یەك دانە "واتا" هەر سێ حاڵەتەکە دەستاودەستی پێدەکەن[1]..

ئایا نابینی کە ئەگەر هۆکارێکی دەرەکی کاربکاتە سەر ویژدانت دڵت پێی دەورووژێت؟ ئەویش هەست و نەستەکان دەخرۆشێنێت و، لەوەشەوە کۆمەڵێك واتای "هەوا" ئاسا دەفڕن و هەندێ مەیل و ئارەزووش سەرهەڵدەدەن، پاشان هەندێ لەوانە دێنە دەست و، ئنجا لەو هەندەش بەشێك پێکدێت و، پاشان لەو بەشە هەندێك دادەمەزرێت؟

---

(١) بۆ نموونە وەك: دۆخەکانی: شلی، رەقی، هەڵم، بۆ واتای "ئاو". لەوانەشە مەبەستی بە سێ حاڵەتەکە ئەوانە بێت کە بە وێنەی: هەوا، هەڵم، ئاو وان. (وەرگێڕ)

## المسألةُ الخامسةُ

اعلم أنَّ غِناءَ الكلام وثروتَه ووسعتَه هو أنَّه كما أنَّ أصلَ الكلام يُفيدُ أصلَ المقصدِ؛ كذلك كيفياتُه وهيئاتُه ومستتبعاتُه تشيرُ وترمزُ وتلوّحُ إلى لوازم الغَرَضِ وتوابعِه وفروعِه، فكأنها تتراءى طبقةً بعد طبقةٍ ومقاماً خلفَ مقامٍ. وإنْ شئت مثالاً تأملْ في:

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ﴾.. إلى آخره، و ﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ إلى آخره، على الوجه المفسَّر سابقاً.

## المسألةُ السادسةُ

اعلم أنَّ المعانيَ المُجتناةَ من خريطة الكلامِ المأخوذةِ المنقوشةِ بـ"فُوطُغْراف" التلفُّظِ على أنواعٍ مختلفةٍ ومراتبَ متفاوتة..

فبعضُها كالهواء يُحَسُّ به ولا يُرى.. وبعضُها كالبخار يُرى ولا يُؤخَذُ.. وبعضُها كالماء يُؤخَذُ ولا ينضبِطُ.. وبعضُها كالسبيكةِ ينضبِطُ ولا يتعيَّنُ.. وبعضُها كالدُّرِّ المنتظَمِ والذهبِ المضروبِ يتشخَّصُ، ثم بتأثير الغَرَضِ والمقامِ قد يتصلَّبُ الهوائيُّ.

وقد تعتَوِرُ على المعنى الواحدِ الحالاتُ الثلاثُ.

ألا ترى أنّه إذا أثّر أمرٌ خارجيٌّ في وجدانك يتهيّجُ قلبُك؟ فيثيرُ الحسياتِ فيتطايرُ معانٍ هوائيةٌ فيتولَّدُ ميولٌ، ثم يتحصَّلُ بعضُها، ثم يتشكَّلُ من ذلك البعض قسمٌ، ثم ينعقدُ من ذلك القسمِ بعضٌ.

جا لە هەموو یەکێکی ئەم چینانەی گوفتاردا هەمیشە هەندێك لە دۆخی دانان و دامەزراندایە و، هەندێکی تریش بە هەڵواسراوی دەمێنێتەوە، بە وێنەی هەڵواسراویی بەشێکی "دەنگ" لە دەمی پێکهاتنی "پیتەکان"دا و، پێکهاتنی "کا" و تونێکڵی دانەوێڵەش لە کاتی ڕەقبوون و پێکهاتنی "دەنکەکانی"دا.

جا کاری مرۆی ڕەوانگۆ ئەوەیە بە ڕاشکاوی باسی ئەو شتە بکات کە"ئامانجی گوفتار" خۆی پێدا هەڵواسیوە و، خواستی حاڵ و مەقامە و، قسەبۆکراویش بۆ خۆی داوای کردووە. ئنجا چینەکانی تری گوفتار - بە ڕێژەی پلەی نزیکییان لە ئامانجەکەوە - بسپێرێت بە واتا بەخشینی بەستێنەکان و، ئاماژەی ناوەرۆك و، هێمای چۆنێتی و، ئاماژەی شوێنکەوتەکانی داڕشتنەکان و، تیلنیشانی شێوازەکان و، ئاماژەی قۆناغەکانی قسەبێژ.

پاشان بەشێك لەو واتا هەڵواسراوانەش هەندێ واتای چەشنی "پیت" و "هەوا"یان تێدایە کە وشەی دیاریکراو، یان نیشتمانێکی زانراویان نییە، بەڵکو بە وێنەی گەشتیارێکی گەڕیدە وان؛ هەندێ جار لە وشەیەکدا خۆی دەشارێتەوە، هەندێ جاری تر گوفتارێك هەڵی دەمژێت، جاری تریش هەیە خۆی بەناو چیرۆکێکدا دەکات، بە ڕادەیەك کە ئەگەر چیرۆکەکە بگوورشیت ئەو واتایەی لێ دەچۆڕێت! بە وێنەی واتای "خەفەت خواردن" لە: ﴿إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى﴾دا (آل عمران: ٣٦)..

هەروەها "پەژارە" لە "ألا لیت الشباب"دا.. هتد[١]. بە هەمان جۆر واتاکانی تری چەشنی: تاسەمەندی و، خۆ مەدح کردن و، گوفتار ئاراستە کردن و، ئاماژە و، ئازار چەشتن و، سەرسامی و، سەرسوورمان و، شانازی بەخۆ کردن و، جگە لەمانەش.

پاشان مەرجی تێکەڵاوی و هاوەڵێتیی باش لە نێوان ئەو واتایانەدا کە جێ بە یەکتر لێژ و سەختڵەت دەکەن، دابەشکردنی بایەخ پێدانیانە بە گوێرەی خزمەتی هەریەکەیان بە ئامانجە بنەڕەتییەکە. گەر نموونەت لەسەر ئەمە دەوێت، ئەوا هەر لە سەرەتای سوورەتەکەوە هەتا ئێرە نموونەی ڕوونی ئەمەن، بەو شێوەیەی کە پێشتر ڕاڤە کرا.

(١) بەیتێکی "ئەبولعەتاهیە"یە. کورد لە واتای ئەمەدا وتوویەتی:

خۆزگا گەنجییەکەم لەگەڕا دواوە گلەیی پیریم لەکرد بەلاوە

(وەرگێڕ)

ففي كلٍّ من هذه الطبقاتِ يتوضَّعُ وينعقدُ البعضُ، ويبقى البعضُ الآخَرُ مُعلّقاً كمعلّقيةِ بعضِ الصوتِ عند تشكُّل الحروفِ، والتِّبنِ عند انعقادِ الحبوبِ..

فمِن شأنِ البليغِ أنْ يُفيدَ بصريح الكلامِ ما تعلّقَ به الغرَضُ واقتضاه المقامُ وطلبَه المخاطَبُ. ثم يُحيلُ الطبقاتِ الأُخَرَ - بمقدار نسبةِ درجةِ القُرب من الغرض - على دلالة القيودِ، وإشارةِ الفحوى، ورمزِ الكيفيات، وتلويحِ مستَتبعات التراكيبِ، وتلميحِ الأساليب، وإيماءِ أطوارِ المتكلم. .

ثم إنَّ مِن تلك المعاني المعلّقةِ معانيَ حرفيةً هوائيةً ليس لها ألفاظٌ مخصوصةٌ، ولا لها وطنٌ معيّنٌ بل كالسَيَّاح السيَّار؛ قد يستتِرُ في كلمة وقد يتشرَّبُه كلامٌ وقد يتداخَلُ في قصةٍ، فإنْ عصرتَ تقطَّرَ؛ كالتحسُّر في: ﴿إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى﴾ (آل عمران: ٣٦)..

والتأسُّفِ في: "لَيْتَ الشَّبَابَ.. الخ"[1]..

والاشتياقِ والتمدُّحِ والخطابِ والإشارةِ والتألُّم والتحيُّر والتعجُّبِ والتفاخُر وغيرِ ذلك.

ثم إنَّ شرطَ حُسنِ المعاشرةِ بين تلك المعاني المتزاحمةِ تقسيمُ العنايةِ والاهتمامِ على نسبة خدمتِها للغرَضِ الأساسيّ.

إنْ شئت مثالاً لهذه المسألةِ فمِن رأسِ السورةِ إلى هنا مثالٌ بيّنٌ على الوجهِ المشروحِ سابقاً.

---

(١) البيتُ لأبي العتاهية وكامله:

فَيا لَيتَ الشَبابَ يَعودُ يَوماً ... فَأُخبِرَهُ بِما صَنَعَ المَشيبُ

**مەسەلەی حەوتەم**

بزانە: ئەو "ئەندێشە"یەی کە تێهەڵکێشی شێوازێکە، دەبێ ببێتە گوڵی سەر ناوکی "حەقیقەت"ێك و، بە وێنەی ئاوێنە وابێت کە بە هۆیەوە لە شتانی "مەعنەوی"دا ئەو یاسا و هۆکارانە دەربکەوێت کە لە زنجیرەی شتانی "دەرەکی"دان.

فەلسەفەی "نەحوو"یش، کە بریتی‌یە لەو پەیوەندی‌یانەی لە کتێبەکانیدا باس کراوە، لەم جۆرەیە. وەك ئەوەی کە دەوترێ: "ڕەفع" بۆ فاعیل دانراوە، چونکە "بەهێز" شتی "بەهێز"وەردەگرێت.. شتانی تریش قیاس بکەرە سەر ئەمە.

**مەسەلەی هەشتەم**

بزانە کە: "سیبەوەیهی"[(١)] بە دەقی قسەی خۆی وتوویەتی: ئەو پیتانەی واتای جۆراوجۆر هەڵدەگرن، وەك "مِنْ" و "إلی" و "بـــاء" و جگە لەمانەش، واتای هەموو یەکێکی ئەو پیتانە لە بنەڕەتدا یەکێکە و ئەو واتایەش لە شوێنی خۆی لاناچێت، بەڵام بە گوێرەی "مەقام" و "ئامانج" هەندێ جار واتایەکی هەڵواسراو دەمژێت و کێشی دەکاتە ناو ناخی خۆی. ئەو کاتەش واتا بنەڕەتی‌یەکە دەبێتە وێنە و شێوازێك بۆ میوانەکەی.

هەروەها ئەو کەسەی شارەزای زانستی "فیقهی زمان" بێت، دەزانێت کە زۆربەی جار "وشەی هاوبەش"[(٢)] واتاکەی یەکێکە، پاشان بە گوێرەی پەیوەندی‌یەکان، چەندین "تەشبیه" کەوتە نێوانیانەوە.. ئنجا لەوانەوە چەند "مەجاز"ێك پەیدا بوون.. پاشان لەوانیشەوە چەندین "حەقیقەتی عورفی" دروست بوون، ئنجا دوای ئەمانە واتای جۆراوجۆری لێ دەکەوێتەوە. تەنانەت وشەی "العین" کە واتا تەنیاکەی "چاو" یان "کانی"یە، هەندێ جار بۆ "خۆر"یش بەکاردەهێنرێت، بە هێمایەك بۆ ئەوەی کە جیهانی باڵا بە چاوی خۆر سەیری جیهانی خوارەوە دەکات، یان ئاوی ژیان کە بریتی‌یە لە "ڕووناکی" لە سەرچاوەی ئەو چیا سپی‌یەوە خوڕ دەبێتەوە کە بەسەر ئەم لا و ئەو لایدا دەڕوانێت.. بۆ خۆت وشە هاوبەشەکانی تر قیاس بکەرە سەر ئەم نموونەیە.

---

(١) سیبەوەیهی (١٤٨-١٨٠ك): پێشەوای زانایانی زانستی "نەحوو"ە. لە کتێبەکەیدا کە ناوی "الکتاب"ە بابەتەکانی ئەم زانستەی ڕوون کردووەتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) "وشەی هاوبەش" بەو وشانە دەوترێ کە چەند واتایەك هەڵدەگرن و، نیشانەی شوێن و بابەت دەریدەخات کام واتایە لەوێدا مەبەستە. (وەرگێڕ)

### المسألةُ السابعةُ

اعلم أنَّ الخيالَ المندمجَ في أسلوبٍ لابدَّ أنْ يتسنبلَ على نواةٍ حقيقةٍ، ويكونَ كالمرآة في أنْ ينعكسَ به - في المعنويات - القوانينُ والعِللُ المندرِجةُ في سلسلةِ الخارجيات.

وفلسفةُ النحوِ التي هي المناسباتُ المذكورةُ في كُتبه أيضاً من هذا القبيلِ؛ كما يُقالُ: الرفعُ للفاعل، لأنَّ القويَّ يأخذُ القويَّ. وقِسْ عليه..

### المسألةُ الثامنةُ

اعلم أنَّ سيبويه نصَّ على أنَّ الحروفَ التي تعَدّدَ معانيها كـ"مِن" و"إلى" و"الباء" وغيرها، أصلُ المعنى فيها واحدٌ لا يزولُ؛ لكنْ باعتبار المقامِ والغَرَضِ قد تتشرَّبُ معنىً مُعلَّقاً، وتجذِبُه إلى جوفِها، فيصيرُ المعنى الأصليُّ صورةً وأسلوباً لمسافرِه.

وكذلك إنَّ العارفَ بفقهِ اللغةِ إذا تأمّلَ عَرَفَ أنَّ اللفظَ المشترَكَ في الأغلب معناه واحدٌ، ثم بالمناسبات وقعَتْ تشبيهاتٌ.. ثم منها مجازاتٌ.. ثم منها حقائقٌ عرفيةٌ.. ثم يتعددُ. حتى إنَّ "العينَ" التي معناها الواحدُ البصَرُ أو المنهَلُ، تُطلَقُ على الشمس أيضاً[1]؛ بالرمز إلى أنَّ العالَمَ العلويَّ ينظرُ إلى العالم السفليِّ بها، أو أنَّ ماءَ الحياة الذي هو الضياءُ يسيلُ من ذلك المنبعِ في الجبلِ الأبيضِ المُشرِف، وقِسْ!

---

(١) والعين: عين الشمس. وعين الشمس: شعاعها الذي لا تثبت عليه العين. وقيل: العين الشمس نفسها، يقال: طلعت العين، وغابت العين. (لسان العرب لابن منظور).

مەسەلەی نۆهەم

بزانە: بڵندترینی پلەکانی ڕەوانبێژی، کە ویستی جوزئی و هزری کەسی و بۆچوونی ساکاری مرۆڤ دەستەوسان دەکات، لەوەدایە کە قسەبێژ پارێزگاری و چاودێریی گوفتارەکەی بکات و، بە یەکجار بڕوانێتە پەیوەندییەکانی سەرجەم بەستێنەکانی گوفتار و، پەیوەندیی نێوان وشەکانی و هاوسەنگیی ئەو ڕستانەش کە هەریەکەیان لەگەڵ ئەوی تردا زنجیرە نەخشێك دەردەخەن و پێکی دەهێنن هەتا دەگاتە نەخشی هەرە مەزن.. تەنانەت دەڵێی قسەبێژ چەند ژیرییەکی تری لەگەڵ ژیریی خۆیدا خستووەتەکار، بە وێنەی وەستای بنیاتنەری کۆشکێك کە بەردە ڕەنگاوڕەنگەکان بە شێوە دانانێك دەخاتە شوێنی خۆیان چەندین نەخشی ناوازەیان لێ پێك بێت کە هاوشانی یەکتر بن و بڕواننە یەکتری، بە وێنەی پیتی "عەین" لەو خەتە هاوبەشەی نێوان ناوی خەلیفە ڕاشیدەکان[1].

دیارترینی نموونەکانی ئەم مەسەلەیە، ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە: ﴿الم ۞ ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ﴾ (البقرة: ١-٢) بەو شێوەیەی کە پێشتر بیستت.

هەروەها یەکێك لە هۆکارەکانی بڵندیی گوفتار، ئەوەیە کە بە وێنەی درەختی "ڕەچەڵەك"[2] زنجیرە ببەستێ و وەچە بخاتەوە هەتا دەگاتە ئەو مەبەستانەی کە بەسەر مەقام و ئامانجدا شۆڕبوونەتەوە..

هەروەها یەکێك لە هۆکارەکانی بەرزیی چینەکانی گوفتار، ئەوەیە کە ئامادەیی ئەوەی تێدا بێت لق و ڕووی زۆری لێ هەڵێنجرێت، بە وێنەی چیرۆکی مووسا، على نبينا وعليه السلام.

مەسەلەی دەهەم

بزانە: ڕەوانیی گوفتار، کە ناسکی و شیرینییەکەی بەرهەم دێنێت، لەوەدایە کە ئەو واتا و هەستانەی تێهەڵکێشی گوفتارەکەن، ئاوێتەی یەکتر ببن بۆ ئەوەی یەکبگرن،

---

(١) ناوی هەر چوار خەلیفە ڕاشیدەکە بە پیتی "عەین" دەست پێ دەکات، "ئەبوبەکر"یش ناوی خۆی "عەبدوڵلا"یە. جا خۆشنووسێك نەخشێکی ناوازەی لە ناوی هەر چواریان کێشاوە کە پیتی "عەین"ەکە هاوبەشە لە نێوان هەر چوار ناوەکەدا!

(٢) درەختی ڕەچەڵەك: ڕشتەی نەسەبی بنەماڵەیەك دەردەخات، لە باپیرانەوە بەرەو خوار دێت بۆ وەچە و نەوەکانی دوای خۆیان. (وەرگێڕ)

### المسألةُ التاسعةُ

اعلم أنَّ أعلى مراتبِ البلاغةِ الذي يُعجِزُ الإرادةَ الجزئيةَ والفكرَ الشخصيَّ والتصوّرَ البسيطَ هو أنْ يحافظَ ويراعيَ وينظرَ المتكلمُ دفعةً نِسَبَ قيودِ الكلامِ وروابطَ الكلمات وموازنةَ الجُمل التي يُظهِرُ كلٌّ مع الآخَر نقشاً متسلسلاً إلى النقش الأعظم. حتى كأنَّ المتكلمَ استخدمَ عقولاً إلى عقله، كالباني لقصرٍ يضعُ الأحجارَ المتلوِّنةَ بوضعيةٍ تحصُلُ بها نقوشٌ غريبةٌ من مناظرةٍ وموازاةِ الكلِّ مع الكلِّ كـ"العين"[1] في الخطِ المشترَك بين أسماء "الخلفاء الراشدين".

ومن أظهر مسائلِ هذه المسألة قولُه تعالى: ﴿الم * ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ﴾ (البقرة: ١-٢) على ما سمعتَ سابقاً.

وأيضاً من أسباب عُلوِّ الكلامِ أنْ يكونَ كشجرةِ النَّسَب يتسلسَلُ متناسلاً إلى المقاصدِ التي تتدلى على المقام والغرَضِ..

وأيضاً من أسباب رِفعةِ طبقة الكلامِ أنْ يكونَ مستعِداً لاستنباط كثيرٍ من الفروع والوجوهِ كقصة موسى على نبينا وعليه السلام.

### المسألةُ العاشرةُ

اعلم أنَّ سـلاسـةَ الكلام المنتجةَ لِلَطافتِه وحُلْوِه هو أنْ تكونَ المعاني والحسـياتُ المندمجةُ

---

(١) من المعلوم أن أسماء الخلفاء الراشدين الأربعة رضي الله عنهم تبدأ بحرف "العين". حيث إن اسم أبي بكر "عبد الله". وقد استلهم بعض الخطاطين نقشاً بديعاً استعمل فيه حرف العين مشتركاً بين أسمائهم.

یاخود جیاجیا بن بەڵام ڕێکبخرێن، تاکو لاکانی گوفتار هێزی واتابەخشین و ئامانجەکە بۆ خۆیان نەمژن. بەڵکو "ناوەند" هێز لە لاکانیەوە بۆ خۆی کێش بکات.

هەروەها بەشێکی ئەو ڕەوانی‌یە لەوەدایە کە "مەبەست" دیاری بکرێت..

هەروەها شوێنی بە یەك گەیشتنی ئامانجەکان دەربکەوێت.

مەسەلەی یازدەهەم

بزانە: سەلامەتیی گوفتار، کە هۆی ساغی و تەندروستی و هێزبەتی، لەوەدایە کە گوفتارەکە بە جۆرێك بێت ئاماژە بۆ بنەما و بەڵگەکان بکات و، هێمای تێدا بێت بۆ "پێداویستی" و "پاشکۆکان"ی. هەروەها بە بەستێنەکانی "مەوزووع" و "مەحمول"[1] و چۆنێتی‌یان ئاماژە بۆ بەرپەرچدانەوە و دوورخستنەوەی گومانەکان بکات، وەك بڵێی هەموو یەکێکی بەستێنەکان وەڵامی پرسیارێکی تەقدیر کراو بێت.

گەر نموونەت لەسەر ئەمە دەوێت، فەرموو سوورەتی "فاتیحە" جوانترین نموونەیە.

مەسەلەی دوازدەهەم

بزانە کە شێوازەکان سێ جۆرن:

یەکێکیان:

شێوازی "پەتی"، کە یەك ڕەنگی هەیە و، تایبەتمەندی‌یەکانی بریتین لە: کورتی و، هاتنی لەسەر سەلیقە (واتە: بێ زۆر لەخۆ کردن) و، سەلامەتی و، ڕاستڕەوی..

ئەمەیان شێوازێکی ساف و سۆڵ و تەختە و، پتر لە بواری مامەڵەکان و، گفتوگۆکان و، زانستە ئامرازەکاندا ئەم شێوازە بەکاردەهێنرێت. ئەگەر نموونەی ئەم شێوازەت دەوێت، ئەوا سەیری کتێبەکانی سەییدی جورجانی[2] بکە.

دووهەم:

شێوازی "ڕازاوە". تایبەتمەندی‌یەکانی بریتین لە: ئارایشتدان و، ڕوونا ککردنەوە و، وروژاندنی "دڵ" یان بە هاندان، یاخود نەفرەت لێ کردن.

---

(١) دوو زاراوەی زانستی "مەنتیق"ن و، بەرامبەر بە زاراوەکانی "موبتەدا و خەبەر" و "فاعیل و فیعل"ن لە ڕێزماندا. بۆ نموونە کە دەوترێ: (زێڕ کانزایە) وشەی "زێڕ" مەوزووعە، وشەی "کانزا"ش مەحمولە. یان کە دەڵێن: "مرۆڤ گۆیایە" وشەی مرۆڤ "مەوزووع"ە و وشەی گۆیا "مەحمول"ە. (وەرگێڕ)

(٢) پێدەچێ مەبەست سەیید شەریفی جورجانی بێت (سالی وەفاتی: ٨١٦).

فيه ممتزجةً تتَّحِدُ أو مختلِفةً تنتظِمُ؛ لئلا تتشرَّبَ الجوانبُ قوّةَ الإفادةِ والغرَضِ، بل يجذبَ المركزُ القوّةَ من الأطراف..

وأيضاً من السلاسة أنْ يتعيّنَ المقصدُ..

وأيضاً منه أنْ يتظاهرَ مُلتَقى الأغراضِ.

**المسألةُ الحاديةَ عشْرَةَ**

اعلم أنَّ سلامةَ الكلام التي هي سببُ صحتِه وقوّتِه هي أنْ يكونَ الكلامُ بحيث يشيرُ إلى المبادئ والدلائلِ، ويرمزُ إلى اللوازم والتوابعِ، وبقيود الموضوعِ والمحمولِ وكيفياتها يومئُ إلى ردِّ الأوهامِ ودفعِ الشبهات؛ كأنّ كلَّ قيدٍ جوابٌ لسؤالٍ مقدَّر.

وإنْ شئت مثالاً فعليك بفاتحة الكتاب.

**المسألةُ الثانيةَ عشْرَةَ**

اعلم أنَّ الأساليبَ على ثلاثة أنواعٍ:

*أحدُها:*

الأسلوبُ المجرَّدُ، الذي لونُه واحدٌ، وخاصّتُه الاختصارُ والسليقيةُ والسلامةُ والاستقامةُ. فهو أملسٌ سويٌّ، ومحلُّ استعمالِه المعاملاتُ والمحاوراتُ والعلومُ الآلية. وإنْ شئت مثالاً سليماً منه فعليك بكتب السيّد الجرجاني[1].

*والثاني:*

الأسلوبُ المزيَّنُ، وخاصتُه التزيينُ والتنويرُ، وتهييجُ القلب بالتشويق أو التنفير.

---

(١) لعل المقصود هنا هو السيد الشريف الجرجاني. (ت ٨١٦ هـ).

شوێنی گونجاو بۆ ئەم شێوازە، بوارەکانی گفتوگۆ ئاراستە کردنی چەشنی "مەدح" و "زەم"، هەروەها شوێنەکانی قەناعەت پێ بەخشین و، جگە لەمانەشە.

ئەگەر بە دوای نموونەی شێوازی ڕازاوەدا گەڕایت، ئەوا بڕۆرە ناو "دلائل الإعجاز" و "أسرار البلاغة"؛ چەندین باخچەی ڕازاوەیان تێدا دەبینیت.

سێهەم:

شێوازی "بڵند". تایبەتمەندییەکانی بریتین لە: توندوتۆڵی و، هێز و، سام و، بڵندیی ڕۆحانی.

شوێنی گونجاوی ئەم شێوازە، بوارەکانی ئیلاهیات و، زانستی ئوسووڵ و، حیکمەتە.

ئەگەر نموونەی ڕوون و پەیکەری خاوەن ئیعجازی ئەم شێوازەت دەوێ، ئەوا فەرموو بڕۆرە خزمەتی "قورئان"ی پیرۆز، چونکە شتی وای تێدایە کە نە چاو بینیویەتی و نە بە دڵی هیچ کەسێکی ڕەوانگۆشدا هاتووە!

بە پوختی "بەند" و "پێشەکی"یەکە لێرەدا کۆتایی هات

* * *

پاشان بزانە کە خولگەی تێڕوانین لەم ئایەتەماندا: ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً..﴾.. هتد، بریتییە لە:

یەکەم: هۆنینەوەی لە ڕشتەی ئایەتی پێشوودا.. دووەم: هۆنینی نێوان ڕستەکانی.. سێهەم: هۆنینی چۆنێتیی پێکهاتنی یەك بە یەکی ڕستەکانی.

جا لەگەڵ یادکردنەوەی ئەوانەدا کە ڕابورد، بزانە کە:

قورئان کاتێ بە ڕاشکاوی لە حاڵی دووڕووەکان دوا و، بە دەق تاوانەکانی ئەوانی باس کرد، ئەوا لەبەر سێ سەرنجی وردیش نموونەی بە دوادا هێنا:

یەکەمیان:

ڕاهێنانی "ئەندێشە". چونکە ئەندێشە پتر گوێڕایەڵی شتانی خەیاڵییە، تا بابەتە ژیرییەکان.. هەروەها دەستەبەرکردنی گوێڕایەڵیی "وەهم" و دەستەمۆکردنی..

والمقامُ المناسِبُ له الخطابياتُ كالمدح والذم وغيرهما والإقناعياتُ ونظائرُهما. وإذا تحرّيتَ المثالَ المزيَّنَ فادخلْ في "دلائل الإعجاز" و"أسرار البلاغة" ترَ فيهما جِناناً مزيّنة.

*والثالثُ:*

الأسلوبُ العالي، وخاصتُه الشدةُ والقوّةُ والهيبةُ والعُلويةُ الروحانيةُ. ومقامُه المناسبُ الإلهياتُ والأصولُ والحكمةُ. وإنْ شئت مثلاً بيِّناً وتمثالاً مُعجِزاً فعليك بـ"القرآنِ" فإنَّ فيه ما لا عينٌ رأتْ ولا خطرَ على قلب بليغ..

انتهى الفصلُ والمقدمةُ بتلخيص.

***

ثم اعلم أنَّ مدارَ النظرِ في آيتنا هذه، وهي:

**﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً..﴾** .. الخ:

أوّلاً: نظمُها بسابقها.. وثانياً: النظمُ بين جملها.. وثالثاً: نظمُ كيفية جملةٍ جملةٍ؛ فمع استحضارِ ما مضى:

اعلم أنَّ القرآنَ لمّا صرّحَ بحقيقة حالِ المنافقين ونصَّ على جنايتِهم عقَّبها بالتمثيل لثلاث نُكَتٍ:

إحداها:

تأنيسُ الخيـال الذي هـو أطوَعُ للمتخيَّلات من المعقـولات، وتأمينُ إطـاعةِ الوهمِ الذي

چونکە "وەهم" هەردەم خەریکی گومان دروست کردن و دژایەتی کردنی ژیرییە، ئەوەش بە پیشاندانی شتی نامۆ لە شێوەی شتی ئاساییدا و، وێناکردنی شتی نادیار لە شێوەی شتی ئاشکرا و لەبەرچاودا.

دووهەم:

وررووژاندنی "ویژدان" و، بزواندنی دەماری "دوورەپەرێزی کردنی". تاکو "هەست" و "هزر" شان بە شانی یەکتر بڕۆن و یەکبگرن، ئەوەش لە ڕێی هێنانەوەی شتانی "بە ژیری سەلماو" لە شێوەی شتی "هەست پێ کراو"دا.

سێهەم:

پەیوەست کردنی واتا پەرت و بڵاوەکان و، پیشاندانی پەیوەندییەکی ڕاستەقینە لە نێوانیاندا، ئەوەش لە ڕێی "نموونە هێنانەوە".. هەروەها دانانیەتی لە پێش چاوی "ئەندێشە"دا، تاکو بۆ خۆی ئەو وردەکارییانە ببینێت کە "زمان" باسی نەکردوون.

بیشزانە دەرەنجامی ڕستەکانی ئەم ئایەتە، هەروەك لەگەڵ کۆی دەرەنجامی چیرۆکی دووڕوواندا گونجاوە، بۆ یەك بە یەکی ئایەتەکانیش بە هەمان جۆرە. ئایا نابینی دەرەنجامی چیرۆکەکە ئەوەیە کە: "دووڕووەکان" لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی دنیادا بە "ڕواڵەت" ئیمانیان هێنا، پاشان بە "پەنهانی" کافر بوون.. پاشان دووچاری ڕاڕایی و سەرسامی بوون.. پاشان بە دوای "حەق"دا نەگەڕان.. پاشان نەیانتوانی بگەڕێنە دواوە هەتا حەق بناسن؟

ئنجا بزانە کە ئەمەی باس کرا، چەندە بۆ حاڵی ئەو کەسانە گونجاوە کە ئاگرێك یاخود چرایەکیان داگیرساند.. پاشان پارێزگارییان لێ نەکرد.. پاشان کوژایەوە.. پاشان دەوروبەریان تاریك داهات.. پاشان هیچ شتێکیان نەدەبینی، بە ڕادەیەك کە هەموو شتێك سەبارەت بەوان وەکو "نەبوو"ی لێ هاتبوو!

ئیتر ئەوانە لەبەر "بێ ورتەیی" شەو، چەشنی "کەڕ"یان لێ هات و.. لەبەر خۆنابیناکردن و کوژانەوەی ڕووناکییەکانیشی، وەکو "کوێر"یان لێ هات و.. لەبەر نەبوونی فریادڕەس و گوێ بیستێك کە حاڵی خۆیانی بۆ باس بکەن، ئەوا هاوار لە کەس ناکەن، دەڵێی هەموویان زمانیان "لاڵ" بووە و.. ئنجا لەبەر ئەوەش کە نەیاندەتوانی بەرەو دواوە بگەڕێنەوە، ئەوا بە وێنەی چەند تارماییەکی وشك و بێ گیانیان لێ هات!

شأنه التشكيكاتُ ومعارضةُ العقل، وانقيادُه بإظهار الوحشيِّ بصورةِ المأنوس، وتصويرُ الغائبِ بصورة الشاهد.

**والثانيةُ:**

تهييجُ الوجدان وتحريكُ نَفرته ليتفقَ الحسُّ والفكرُ بتمثيل المعقول بالمحسوس.

**والثالثةُ:**

ربْط المعاني المتفرقةِ وإراءةُ رابطةٍ حقيقية بينها بواسطة التمثيل.. وأيضاً الوضعُ نُصبَ عين الخيالِ ليجتنيَ بالنظر الدقائقَ التي أهملَها اللسانُ.

واعلم أنَّ مآلَ جُملِ هذه الآيةِ كما يناسِبُ مآلَ مجموع قصِة المنافقين؛ كذلك يناسبُ آيةً آيةً منها. ألَا ترى أنَّ مآلَ القصِة أنهم آمنوا صورةً للمنافع الدنيوية.. ثم تبطَّنوا الكفرَ.. ثم تحيّروا وتردّدوا.. ثم لم يتحرَّوا الحقَ.. ثم لم يستطيعوا الرجوعَ فيعرفوا.

وما أنسبَ هذا بحال مَن أوقدوا لهم ناراً أو مصباحاً.. ثم لم يحافظوا عليها.. ثم انطفأتْ.. ثم أُظلِموا.. ثم لا يتراءى لهم شيءٌ حتى يكون كلُّ شيء معدوماً في حقهم!

فلِسُكونِ الليلِ كأنهم صُمٌّ، ولتعامي الليلِ وانطفاءِ أنوارِه كأنهم عُميٌّ، ولعدمِ وجودِ المخاطَب والمُغيثِ لا يستغيثون كأنهم بُكمٌ، ولعدمِ استطاعةِ الرجوعِ كأنهم أشباحٌ جامدةٌ لا أرواحَ لها.

پاشان چەند خـاڵێكی بنـەڕەتی لـە "موشەبیەهـ بیـهی"یەكـەدا هەیـە كـە بەرامبـەر بـەو خاڵانەن لە " موشەبیەهـ"ەكەدان و دەڕوانەنە یەكتر. بۆ نموونە:

"تاریكی" لە بەرامبەر "كوفر" و.. "سەرسامی" لە بەرامبەر "ڕاڕایـی" و.. "ئـاگر" لـە بەرامبەر "ئاژاوەگێڕی"یەوە.

بۆ خۆت خاڵەكانی دیكەش قیاس بكەرە سەر ئەمانە.

* ئەگەر وتت:

"نموونە"كە ڕووناكی‌یەكی تێدایە. جا ئایـا "دووڕوو" ڕوونـاكیی لـە كـوێ بـوو هـەتا ئەو نموونەیە پڕبەپڕی دەربچێت؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێ:

ئەگـەر خـودی كەسـەكە هیـچ ڕووناكی‌یـەكی تێـدا نـەبێت، ئـەوا دەتوانێـت لـە دەوروبەری ڕووناكی بەدەست بهێنێت.. ئەگـەر لـەوەش دەستی نەكـەوت، دەتوانێ لـە قەومەكـەی ڕوونـاكی وەربگرێـت.. گـەر ئـەوانیش نـەیانبوو، دەتوانـێ سـوود لـە هـاوڕەگـەزی خۆی وەربگرێت.. ئەگەر لای ئەوانیش دەستی نەكەوت، ئـەوا دەیتوانی - وەك پێشتر باس كرا - لە فیترەتەكەی خـۆی بەهرەمـەند ببێـت.. گـەر فیـترەتی بـەوەش قایل نەبوو، ئەوا لە زمانیدا، بە گوێرەی ڕوانینـی بۆ تێڕوانینی خـەڵك، یـان بـە گوێـرەی ڕوانینی بۆ خۆی لەو ڕووەوە كە سوودە دنیاییەكانی لەسەر بەندە.. گەر ئەوەش نـەبێت، ئەوا مەبەست ئەو بەشەیانە كە لـە پێشـدا ئیمانیـان هێنـا و دوایـی پاشـگەزبوونەوە.. گـەر ئەوەش نەبێت، ئەوا دەكرێ ئەو "نوور"ە ئاماژەیەك بێـت بـۆ ئـەو سـوودانەی كـە وەریـان گـرت، بـە وێنـەی ئـەوەی كـە "ئـاگر" ئاماژەیـە بـۆ ئاژاوەنانـەوەیان.. گـەر بەمـەش ڕازی نابیت، ئەوا دەكرێ مەبەست "دانـانی گریمـانی هیدایـەت" بێـت لـە جێـی ئـەوەی كـە لـە ڕاسـتیدا "بوون"ی هەبێت، وەك ﴿اشْتَرَوُاْ الضَّلاَلَةَ بِالْهُدَى﴾ ئامـاژەی بۆ كرد، چونكـە ئەم گریمانە، ئەو دراوسێ‌یەی "نموونە هێنانەوە"یە كە لە خزمانی كەسی ترە.

سەبارەت بە هۆی هۆنینی نێوان ڕستەكانیش، ئەوا بزانە كە:

هۆی هۆنینی ڕستەی ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْـتَوْقَدَ نَـاراً﴾ گونجاوی‌یـەتی بـۆ ئـەم شوێنە..

ثم إنَّ في المشبَّه به نُقَطاً أساسيةً تُناظِرُ النقطَ الأساسيةَ في المشبَّهِ. مثلاً: الظلمةُ تنظرُ إلى الكُفرِ والحيرةُ إلى التذبذبِ، والنارُ إلى الفتنةِ. وقِسْ.

* إنْ قلتَ:

إنَّ في التمثيل نوراً، فأينَ نورُ المنافِق حتى يتمَّ تطبيقُ التمثيل؟

قيل لك:

إنْ لم يكنْ في الشخص نورٌ، ففي محيطِه يمكنُ له الاستنارةُ.. وإنْ لَمْ، ففي قومِه يمكنُ الاستضاءةُ.. وإنْ لم، ففي نوعِه يمكنُ له الاستفادةُ.. وإنْ لم، ففي فطرتِه كان يمكنُ له الاستفاضةُ كما مرَّ.. وإنْ لم تقنعْ، ففي لسانِه بالنظر إلى نظرِ غيره أو بالنظر إلى نفسِه لترتُّبِ المنافعِ الدنيوية.. وإنْ لم، فباعتبارِ البعضِ من الذين آمنوا ثم ارتدُّوا.. وإنْ لم، فيجوزُ أنْ يكونَ النورُ إشارةً إلى ما استفادوا كما أنَّ النارَ إشارةٌ إلى الفتنة.. وإنْ لم ترضَ بهذا أيضاً، فبتنـزيلِ إمكانِ الهدايةِ منـزلةَ وجودِها، كما أشارَ إليه ﴿اشْتَرَوُاْ الضَّلاَلَةَ بِالْهُـدَى﴾ فإنَّه هو الجارُ الجُنُبُ[1] للتمثيل.

أما وجهُ النظمِ بين الجمل:

فاعلم أنَّ نظمَ ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً﴾ مناسبتُها للموقع.

---

(١) الجار الجُنُب :هو جارك من قوم آخرين. (الصحاح في اللغة).

بەڵێ، حاڵی ئەو كەسەی كە بەم شێوەیە ئاگر دادەگیرسێنێت، پڕاوپڕی حاڵی پۆلی یەكەمی ئەوانەیە كە قورئان گوفتاری خۆی ئاراستە كردبوون، كە خەڵكانی نیشتەجێی دوورگەی عەرەب بوون. چونكە هیچ كەسێكیان نەبووە كە شارەزای ئەم چەشنە حاڵەتە نەبێت و هەستی بە پلەی كاریگەری و ئاڵۆزیی نەكردبێت، ئیتر چ ڕاستەوخۆ بۆ خۆی تیایدا شارەزا بوو بێت و هەستی پێ كردبێت، یاخود بە بیستنی لە كەسانی ترەوە..

ئەوەبوو بە هۆی "ستەم"ی خۆرەوە لێیان[1]، بە ڕۆژدا هاتووچۆیان نەدەكرد، لە ناچاریدا پەنایان دەبردە بەر تاریكایی شەو، تاكو گەڕان و سەفەری تێدا بكەن. زۆر جاریش ئاسمانیان لێ دەبوو بە هەور و دەكەوتنە ڕێی هەڵەت و سەختەوە، تەنانەت جاری وا هەبوو ڕێگاكەیان دووچاری گرفتی وەهای دەكردن كە ڕزگاربوون لێی ئەستەم بێت.. هەروەها هەندێ جار دەڕۆشتنە ناو پێچاوپێچی ئەو ئەشكەوتانەی كە پڕن لە شتانی مەترسیدار و ئازاردەر. ئیتر بەو جۆرە ڕێیان ون دەكرد و، پێویستیان بە داگیرساندنی ئاگر یاخود چرا دەبوو تاكو هاوڕێكانیان ببینن و مەترسییان بڕەوێتەوە و، چاویان لە شمەك و پێداویستییەكانیان بێت بۆ ئەوەی پارێزگارییان لێ بكەن و، بزانن ڕێگاكەیان كامەیە هەتا پیایدا بڕۆن و، مەترسی و دڕندەكانیشیان لێ دەربكەوێت تاكو خۆیانی لێ بپارێزن.

جا كاتێ كە ئەوان بەو "ڕووناكی"یە چاویان كرایەوە و، دەوروبەری خۆیان بینی، كتوپڕ بەڵایەكی ئاسمانی دای بە سەریاندا و، ئاگرەكەی لێ كوژاندنەوە.. ئیتر لەو كاتەدا كە ئەوان لە لوتكەی ئومێد و دەمی بەدەستهێنانی ئامانجەكەیاندا بوون، كتوپڕ بەربوونەوە بۆ ناو چاڵی نائومێدیی تەواوەتی! جا قورئان بە دەقی: ﴿فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللَّهُ بِنُورِهِمْ﴾ باسی ئەو حاڵەی ئەوانی كرد.

بزانە ئەم پیتی "فاء"ە ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە ئەو كەسانە بەو نیازە ئاگرەكەیان كردەوە كە دەوروبەریان بۆ ڕووناك بكاتەوە، هەر وەهاش بوو لەو ناوەی بۆ ڕووناك كردنەوە. ئیتر لە لایەنی خۆیانەوە دڵنیا بوون لە ڕووناكییەكە.. كەچی ئا لەم كاتەدا كتوپڕ "نائومێدی"ی بە دوادا هات و، دەستەوسان كەوتن. جا بزانە كاریگەریی "نەمانی ئامانجەكەیان" لە دەمی چاوەڕوانیی بەدەستهێنانیدا، چەندە دژوارە!

---

(١) مەبەستی گەرماكەیەتی. (وەرگێڕ)

نعم، حالُ هذا المستوقِدِ على هذه الصورةِ تطابقُ مقتضى حالِ الصفِّ الأولِ من مخاطَبي القرآن، وهم ساكنو جزيرةِ العرب؛ إذ ما منهم إلّا وقد عرفَ هذه الحالةَ بالذاتِ أو بالتسامُعِ، ويَحُسُّ[1] بدرجة تأثيرِها ومُشَوِّشِيَّتِها؛ إذ بسببِ ظُلم الشمسِ يلتجئون إلى ظُلمةِ الليلِ فيسيرون فيها.. وكثيراً ما تُغمّى عليهم السماءُ فيصادِفون حَزْنَ الطُّرُقِ، وقد ينجرُّ بهم الطريقُ إلى الورطةِ.. وأيضاً قد يجولون في معاطِف الكهوفِ المشحونةِ بالمؤذياتِ، فيضلّون الطريقَ فيحتاجون لإيقادِ النارِ أو اشتعالِ المصباح ليَبصُروا رفقاءَهم حتى يستأنِسوا ويروا أهبتَهم وأشياءَهم كي يحافظوا عليها، ويعرفوا طريقَهم ليذهبوا فيها ويتراءى لهم الضواري والمهالكُ ليجتنبوا..

فبينما هم استضاؤوا بنورهم إذ اختطفَتْهم آفةٌ سماويةٌ.. وبينما هم في ذِروة كمالِ الرجاء وآنِ الظَفَرِ بالمطلوبِ إذ سقطوا في حضيضِ اليأسِ المطلقِ. فنصَّ على هذا الحالِ بقوله:

﴿فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللهُ بِنُورِهِمْ﴾.

اعلم أنَّ هذه "الفاءَ" تشيرُ إلى أنهم أوقدوا النارَ ليستضيئوا فأضاءتْ فاطمأنّوا بالاستضاءةِ فتعقّبَتْهم الخيبةُ وسُقطوا في أيديهم. وما أشدَّ تأثيرَ العدمِ عليهم في آنِ انتظارِ الحصول!

---

(١) وأحسّ (ش).

پاشان ئەم "ڕستەی مەرج"ە، داخوازی "پێویستیی ڕووناکی بەخشینەکە"یە بۆ "نەمانی ئەو ڕووناکی‌یە"[1]! پەنهانیی ئەم داخوازی‌یەش ئاماژە بۆ تەقدیر کردنێکی لەم جۆرە دەکات، هەتا داخوازی‌یەکەی پێ دەربکەوێت:

"کاتێ ئاگرەکە ئەو ناوەی ڕووناك کردەوە، سوودیان لە ڕووناکی‌یەکەی وەرگرت، ئنجا لەناو خۆیاندا سەرقاڵ بوون.. ئنجا پارێزگاری‌یان لێ نەکرد.. ئنجا بایەخیان پێ نەدا و نرخی ئەو نیعمەتەیان نەزانی کە لەو ئاگرەدایە.. ئنجا سووتەمەنیی تریان بۆ نەهێنا.. ئنجا بەردەوامی‌یان پێ نەبەخشی.. ئنجا ئەویش کوژایەوە"!

چونکە لەبەر ئەوەی بێ ئاگابوونیان لە "هۆکار"، بە هۆی سەرقاڵی‌یان بە "دەرەنجام"ەوە - بە پێی ﴿إِنَّ الإنسانَ لَيَطْغَى ۞ أَنْ رَآهُ اسـتغنى﴾ (العلق: ٦-٧) - بووە هۆیەکی بەردەوامی نەدان بە ئاگرەکە و گوێ پێنەدانی و، ئەوەش داخوازی کوژانەوەی بوو.. ئەوا وەکو ئەوە وایە کە خودی "ڕووناککردنەوە"کە هۆکاری "نەمانی ڕووناکی"یەکە بێت!

سەبارەت بە ڕستەی ﴿وَتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَاتٍ﴾یش، ئەوا دوای ئەوەی کە ئاماژەی بەو زیانەی ئەوان دا لە نەمانی نیعمەت و لەدەستچوونی ڕووناکی، باسی نائومێدیی ئەوانی بە دوادا هێنا، ئەویش بە داباریني ڕقی خوای گەورە، لەوەدا کە کەوتنە ناو تاریکی‌یەوە.

سەبارەت بە ڕستەی ﴿لا يُبْصِرُونَ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

ئەگەر مرۆڤ تاریکایی لێ دابێت و ڕێگا ون بکات، لەوانەیە بە بینینی هاوڕێ و یاوەرانی، دڵی خۆی بداتەوە و لە شوێنی خۆی نەبزوێت.

---

(١) هەر شتێك شتێکی دیکە بخوازێت، بە یەکەمیان دەوترێ "مەلزووم" و بە دووهەمیش دەوترێ "لازم". بە وێنەی ڕشتنی ئاو لە شوێنێکدا کە ئەو شوێنەی پێ تەڕ دەبێت. لێرەدا ڕشتنەکە "مەلزووم"ە و، تەڕبوونەکەش "لازم"ە. هەر بە وێنەی ئەمە، "ڕستەی مەرج" ڕستەیەکی تر دەخوازێت کە "ڕستەی وەڵامی مەرج"ە. یەکەمیان "مەلزووم" و، دووهەمیشیان "لازم"ە.

جا لێرەدا "ڕستەی مەرج"ی: ﴿فلما أضاءت ما حولـه﴾ (واتە کاتێ ئاگرەکە دەوروبەری ئەوی ڕووناك کردەوە) وای دەخواست کە "وەڵامی مەرج"ەکە بەردەوامیی ڕووناکی‌یەکە و سوود وەرگرتنی ئەوان بێت لێی، کەچی "وەڵامی مەرج"ەکە ڕستەی ﴿ذهب الله بنورهم﴾ بوو، (واتە خوای گەورە ڕووناکی‌یەکەی لێ گرتنەوە)! کە ئەمەش وا دەگەیەنێت ڕووناکی بەخشینەکە داخوازی نەمانی ڕووناکی‌یەکە بێت. خۆ ئەو داخوازی‌یەش پەنهان و نادیارە. لەبەر ئەوە، دانەر وتی: "پەنهانیی ئەم داخوازی‌یەش ئاماژە بۆ تەقدیر کردنێکی لەم جۆرە دەکات.. هتد". (وەرگێڕ)

ثم إنَّ هذه الشرطيةَ تستلزمُ استلزامَ الإضاءةِ لذَهاب النور. وخفاءُ هذا الاستلزامِ يشيرُ إلى تقدير ما يظهرُ به اللزومُ هكذا:

فلما أضاءتْ استضاؤوا بها فاشتَغلوا.. فلم يحافظوا.. فلم يهتّموا بها، ولم يعرفوا قدرَ النعمةِ فيها.. فلم يمدّوها.. فلم يديموها؛ فانطفأتْ..

لأنه لمّا كانت الغفلةُ عن الوسيلةِ للاشتغال بالنتيجة - بسر: ﴿إنَّ الإنسانَ لَيَطْغَى * أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى﴾ (العلق: ٦-٧) - سبباً لعدمِ الإدامةِ المستلزِمِ للانطفاءِ، كان كأنَّ نفسَ الإضاءةِ سببٌ لذَهاب النورِ.

أما جملةُ ﴿وَتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَاتٍ﴾ فبعدما أشارَ إلى خُسرانهم بذَهاب النِعَمِ، بزوال النورِ، عقّبَه بخِذلانهم بنـزول النِقمِ، بالسقوط في الظلمات.

أما جملةُ ﴿لا يُبْصِرُونَ﴾..

فاعلم أنَّ الإنسانَ إذا أُظلِمَ عليه وأضلَّ السبيلَ، فقد يسكنُ ويتسلّى برؤية رفقائه ومُرافقِه..

بەڵام گەر نەیانبینێت، ئەوا "نەبزوان"یشی لە شوێنی خۆیدا - بە وێنەی "بزوان"ی - دەبێتە گرفتێك لێی، لەوانەیشە زیاتر دووچاری سام و ترسی بکات.

سەبارەت بە ﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لا يَرْجِعُونَ﴾یش، بزانە کە:

ئەگەر مرۆڤ دووچاری ئەم چەشنە بەڵایە ببێت، ئەوا لە چوار لای یەك لە دوای یەکەوە دڵدانەوەی خۆی دەکات و، ئومێدی ڕزگاریی دەبێت:

یەکەمیان: ئومێدی ئەوەی دەبێت کە قسە و ورتەی نێوان ڕێبواران و خەڵکی گوندەکان ببیستێ و، گەر داوای یارمەتییان لێ بکات بێن بە هانایەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی "شەو" لاڵ و کش و ماتە، ئەوا ئەو کەسە و مرۆڤی "کەڕ" یەکسانن. بۆیە فەرمووی: ﴿صُمٌّ﴾ تاکو ڕێی ئەم ئومێدەی لێ ببڕێت.

دووهەمیان: ئومێد دەکات کە ئەگەر دەنگ هەڵبڕێت و داوای فریاگوزاری بکات، لەوانەیە کەسێك هاوارەکەی ببیستێ و بگاتە فریای. بەڵام لەبەر ئەوەی شەو "کەڕ"ە و نابیستێ، ئەوا کەسی خاوەن زمان و "لاڵ" لەو حاڵەدا یەکسانن. لەبەر ئەوە، فەرمووی: ﴿بُكْمٌ﴾ تاکو بەردیان دەرخوارد بدات بۆ بڕینی ئەم ئومێدەش.

سێهەم: ئومێد دەکات کە بە بینینی نیشانەیەك، یان ئاگرێك، یاخود ڕووناکییەك، کە ئاماژە بۆ ڕێی مەبەست بکات، ڕزگاری ببێت. بەڵام لەبەر ئەوەی شەو تاریك و نووتەك و، چاویشی[1] گلاوی و نابینا و، ڕووی گرژ و مۆنە، ئەوا لەو کاتەدا "بینەر" و "نابینا" وەکو یەك وان. بۆیە فەرمووی: ﴿عُمْيٌ﴾ تاکو چرای ئەم هیوایەشیان لێ بکوژێنێتەوە.

چوارەم: تەنها ئەوەندەی بۆ دەمێنێتەوە کە هەوڵی گەڕانەوە بەرەو دواوە بدات. بەڵام لەبەر ئەوەی "تاریکی" لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی داوە، ئەوا بە وێنەی کەسێکی لێ هاتووە کە بە ویستی خۆی ڕۆشتبێتە ناو قوڕێکەوە، دوایی چەقیبێت و نەتوانێت لێی دەرباز ببێت..

بەڵێ، زۆر شت هەیە بە ویست و ئیختیاری خۆت بەرەو ڕووی دەڕۆیت، کەچی ویستی گەڕانەوەت لێ دەسەنرێت.. تۆ وازت لەو هێناوە، بەڵام ئەو واز لە تۆ ناهێنێت!

---

(١) واتە چاوی شەو. (وەرگێڕ)

وإذا لم يُبصِرْهما كان السكونُ مصيبةً عليه كالحركة بل أوحش.

أما ﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لا يَرْجِعُونَ﴾..

فاعلم أنَّ الإنسانَ إذا وقع في مثل هذا البلاءِ قد يتسلّى ويأمل ويرجو النجاةَ من جهاتٍ أربعٍ مترتبة:

**فأولاً:**

يرجو أنْ يسمعَ تناجِيَ الخَلْق مِن القُرى أو أبناءِ السبيل؛ إنْ يستمِدَّ يُمِدُّوه .ولّما كانت الليلةُ ساكنةً بَكماءَ استوى هو والأصمُّ، فقال: ﴿صُمٌّ﴾ لقطع هذا الرجاء.

**وثانياً:**

يأملُ أنّه إنْ نادى أو استغاثَ يُحتمَلُ أنْ يسمعَ أحدٌ فيُغيثَه، ولّما كانت الليلةُ صماءَ كان ذو اللسان والأبكمُ سواءً، فقال: ﴿بُكْمٌ﴾ لإلقامِهم الحجرَ بقطعِ هذا الرجاء أيضاً.

**وثالثاً:**

يأملُ الخلاصَ برؤية علامةٍ أو نارٍ أو نيّرٍ، تشيرُ له إلى هدفِ المقصدِ. ولّما كانت الليلةُ طاميةً رمداءَ عبوسةً عمياءَ، كان ذو البصر والأعمى واحداً، فقال: ﴿عُمْيٌ﴾ لإطفاءِ هذا الأملِ أيضاً.

ورابعاً: لا يبقى له إلّا أنْ يجهَدَ في الرجوع، ولّما أحاطَ به الظلمةُ كان كمَن دخلَ في وَحْلٍ باختياره وامتنعَ عليه الخروجُ..

نعَمْ، كم مِن أمرٍ تذهبُ إليه باختيارٍ ثم يُسلَبُ عنك الاختيارُ في الرجوعِ عنه، تُخلّيه أنت ولا يُخلّيك هو..

بۆیە خوای گەورە بۆ داخستنی ئەم دەرگایەش لە سەریان و برینی دوا پەتی ئەو ئومێدەی کە دەستی لێ گیر دەکەن، فەرمووی: ﴿فَهُمْ لا يَرْجِعُونَ﴾. ئیتر بەربوونەوە بۆ ناو تاریکایی نائومێدی و، سامناکی و، بێدەنگی و، ترس و لەرزەوە.

سەبارەت بە لایەنی سێ‌هەمیش، مەبەستم هۆنینی بەستێنەکانی یەك بە یەکی رستەکانیەتی، ئەوا بروانە بۆ: ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً﴾ و، ببینە کە چۆن سەرنجەکان لە بەستێنەکانیەوە بە هەموو لایەکدا پزیسك دەهاون!

وشەی ﴿مَثَل﴾ ئاماژەیە بۆ نامۆیی حاڵی دوورووان و بۆ ئەوەش کە بەسەرهاتەکەیان سەیر و سەمەرەیە. چونکە "مَثَـل"(پەند) لەبەر ئەوەی نامۆیی و سەمەرەییەکی لەخۆ گرتووە، ئەوەیە کە لەسەر زمانەکانە و، خەڵك دەماودەمی پێ دەکەن. کەواتە "نامۆیی و سەمەرەیی" تایبەتترین سیفەتی "پەند"ەکانە.

پاشان لەبەر ئەوەی پەندەکان دەستوورێکی بنەرەتی‌یان تێ هەڵکێشراوە، ئەوا پێی دەوترێت: "حیکمەتی عەوام" و "فەلسەفەی گشتینە".

جا مەبەست بە ﴿مَثَل﴾ لێرەدا سیفەتە نامۆکەیان و، بەسەرهاتە سەیرەکەیان و، حاڵە پەرێشانەکەیانە. کەواتە دەربرینی مەجازیی ئەو حاڵەیان بە وشەی ﴿مَثَـل﴾ ئاماژەیە بۆ "نامۆیی".. ئەو ئاماژەیەش هێمایەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە سیفەتەکەیان بە جۆرێکە وەکو پەندەکان لەسەر زمانی نەفرین و بەلەعنەت کردندا باس بکرێت.

سەبارەت بە "کاف"ەکەش:

* ئەگەر وتت:

گەر لا برایە، دەبووە تەشبیهێکی "بەلیغ"[1] و، رەوانتر دەبوو؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

لەم شوێنەدا رەوانتر وایە کە بمێنێتەوە! چونکە هێنانی کافەکە بە راشکاوی، زەینی مرۆڤ بۆ ئەوە بێدار دەکاتەوە کە بە روانینێکی "شوێنکەوتەیی" بروانێتە نموونەکە.

---

(١) لە زمانی عەرەبیدا "تەشبیه" لە چوار پایە پێك دێت، یەکێك لەوانە "ئامرازی لێکچوون"ەکەیە. جا ئەگەر ئەم ئامرازە لابرێت، پێی دەوترێت "تەشبیهی بەلیغ". ئەو جۆرە تەشبیهەش رەوانترە لەوەی کە ئامرازەکەی لەگەڵدا هێنرابێت. (وەرگێر)

فقال تعالى: ﴿فَهُمْ لا يَرْجِعُونَ﴾ لسدِّ هذا البابِ عليهم وقطعِ آخر الحبلِ الذي يتمسكون به، فسقطوا في ظلمات اليأسِ والتوحُّشِ والسكونةِ والخوفِ.

أما الجهةُ الثالثةُ، أعني: نظمَ قيوداتِ جملةٍ جملةٍ، فانظرْ ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً﴾ كيف تتطايرُ شراراتُ النُكَتِ من قيوداتها.

أما لفظُ الـ﴿مَثَل﴾ فإشارةٌ إلى غرابة حالِ المنافقين وأنَّ قصتَهم أعجوبةٌ؛ إذ المَثَلُ هو الذي يجولُ على الألسنة ويتناقلُه الناسُ لتضمُّنه لغرابةٍ؛ إذ أخصُّ صفاتِه الغرابةُ.

ثم لاندماجِ قاعدةٍ أساسيةٍ في الأمثال يُقالُ لها: "حِكمةُ العوام" و"فلسفةُ العموم".

فالمرادُ بـ﴿مَثَل﴾ هنا، صفتُهم الغريبةُ وقصتُهم العجيبةُ وحالُهم الشنيعة..

ففي التعبير بـ﴿مَثَل﴾ مجازاً إشارةٌ إلى الغرابةِ، وفي الإشارةِ رمزٌ إلى أنَّ مِن شأنِ صفتِهم أنْ تدورَ على لسان النَّفرةِ والتلعينِ كضرْبِ المَثَل.

وأما "الكافُ":

* فإنْ قلتَ:

إنْ حُذِفَ كان تشبيهاً بليغاً فهو أبلغُ؟

قيل لك:

الأبلغُ في هذا المقامِ ذكرُه، إذ التصـريحُ به يوقِظُ الذهنَ بأنْ ينظرَ إلى المثـال تَبَعياً، فينتقلَ

ئیتر لەم ڕێیەوە، لە هەموو خاڵێکی گرنگی نموونەکەوە ڕوانینی خۆی ئاراستەی هاوشێوەکەی دەکات لە "موشەبیەهـ"ەکەدا. دەنا گەر کافەکە لابرایە، ئەوا بە ئەنقەست ڕۆدەچووە ناو نموونەکە و، لە ئەنجامدا وردەکارییەکانی ئەو بەرامبەر کردنەی لەدەست دەچوو!

﴿مَثَل﴾ی دووهەمیش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە حاڵی داگیرسێنەری ئاگرەکە، بە "نامۆیی"یەکەی و "ئامادەبوون"ی لە هەستی گشتینەی خەڵکدا، لە حوکمی "هێنانەوەی پەندێك"دایە.

سەبارەت بە ﴿الَّذِي﴾..

*ئەگەر وتت:

بۆچی ئەم وشەیە بە "تاك" هێنراوە، لە کاتێکدا کە ئەوان "کۆ"ن؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

ئەگەر "جوزء و کول"، "تاك و کۆ" یەکسان بوون و، "هاوبەشی"یەکە کاری زیادی و کەمیی نەکردە سەر سیفەتی "تاك"، ئەوا هەردوو ڕووەکە دروستە. بە وێنەی ﴿كَمَثَلِ الحِمَارِ﴾[1]. جا هێنانی ئەم وشەیە بە "تاك" ئاماژەیە بۆ سەربەخۆیی هەموو یەکێکی ئەوان لە بەرجەستەبوونی سەرسامییان و، وێناکردنی کارە نابەجێ کەیان. یاخود ﴿الَّذِي﴾ لە پێشدا "الَّذِينَ" بووە، دوایی کورت کراوەتەوە.

﴿اسْتَوْقَدَ﴾ش، "سین"ەکەی ئاماژەیە بۆ گەڕان و خۆماندووکردن. هێنانی وشەکەش بە "تاك" هاوکات لەگەڵ هێنانی "جێناوی کۆ" لە ﴿بِنُورِهِمْ﴾دا، هێمایەکی وردی تێدایە بۆ ئەوەی کە "تاك" بۆ "کۆمەڵێك" ئاگر دەکاتەوە! ئەم گوزارشتە گەلێ ناسك و نیانە کە داگیرساندنەکەی بە "تاك" و "ڕووناکبوونەوە"کەشی بە "کۆ" هێناوە!

سەبارەت بە ﴿نَاراً﴾(ئاگرێك) لە بریی "المصباح"(چرا)، یان هەر شتێکی دیکە، ئەوا ئاماژەیە بۆ ئەرك و ماندووبوون لە نووری "ئەرك پێ سپاردن"(التكليف)دا. هەروەها هێمایەکیشە بۆ ئەوەی کە ئەوان لە ژێر ئەم ڕووناکییە ڕواڵەتییەدا ئاگری ئاشووبێك دادەگیرسێنن.

---

(١) ﴿مَثَلُ الَّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا بِئْسَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ وَاللَّهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ (الجمعة: ٥).

عن كلِّ نقطةٍ مهمةٍ منه إلى نظيرها من المشبَّهِ. وإلّا فقد يتوغَّلُ فيه قصداً فتفوتُ منه دقائقُ التطبيقِ.

وأما الـ﴿مَثَلِ﴾ الثاني فإشارةٌ إلى أنَّ حالَ المستوقِدِ بغرابتِه ووجودِه في حسِّ العمومِ كان في حُكم ضَرْبِ المثَلِ.

وأما ﴿الَّذِي﴾:

* فإنْ قلتَ:

كيف أفردَ مع أنهم جماعةٌ؟

قيل لك:

إذا تساوى الجزءُ والكلُّ والفردُ والجماعةُ ولم يؤثِّرُ الاشتراكُ في صفة الفردِ زيادةً ونقصاناً جازَ الوجهان، مثل ﴿كَمَثَلِ الْحِمَارِ﴾[1] ففي إفرادِه إشارةٌ إلى استقلالِ كلِّ فردٍ في تمثُّلِ الدهشةِ وتصويرِ شناعتِهم، أو كان ﴿الَّذِي﴾ "الذين" فاختُصِرَ.

وأما ﴿اسْتَوْقَدَ﴾ فسينُه إشارةٌ إلى التكلّفِ والتحرِّي. وفي إفرادِه معَ جمع الضمير في ﴿بِنُورِهِمْ﴾ رمزٌ لطيفٌ إلى أنَّ فرداً يوقِدُ لجماعةٍ. ولقد ألطفَ في الإفرادِ إيقاداً والجمعِ استنارةً!

وأما ﴿نَاراً﴾ بدلَ "المصباح" أو غيره، فإشارةٌ إلى المشقةِ في نور التكليفِ، ورمزَ إلى أنهم يوقدون تحت النور الظاهريِّ نارَ فتنةٍ.

---

(١) ﴿مَثَلُ الَّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَاراً بِئْسَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللهِ وَاللهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ (الجمعة: ٥).

هێنانی ئەم وشەیەش [واتە ﴿نَاراً﴾] بە نەكیرەیی(نەناسراوی)، ئاماژەیەكە بۆ ئەوپەڕی پێویستی‌یان بە ئاگر، تەنانەت گەر هەر "ئاگر"ێك بێت، ئەوان پێی ڕازین!

پاشان چاو بە دەوروبەری ڕستەی ﴿فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللهُ بِنُورِهِمْ﴾دا بگێڕە، تاكو بۆ خۆت ببینیت كە چۆن بەستێنەكانی ئەم ڕستەیە ڕووناكی ئاراستەی تاریكی‌یەكانی ئەو "سەرسامی"ە دەكەن كە ئامانجی بنەڕەتیی چیرۆكەكەیە! خۆ لە "مەسەلەی چوارەم"دا ئەوەت بیست كە هێز و پێزی گوفتار لەوەدایە بەستێنەكانی بە دەم خواستی یەكترەوە بڕۆن. (دە فەرموو ئەمە لێرەدا ببینە):

"فاء"ەكە ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە: هێرشی "نائومێدیی ڕەها" دوابەدوای "ئەوپەڕی هیوا و ئومێد" دەست پێ دەكات!

﴿لَمَّا﴾یش، لەبەر ئەوەی "پێوانەیەكی دەراوێتەیی ڕاستەوخۆ"ی لەخۆ گرتووە و، لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگەیە لەسەر هاتنەدیی "موقەددەم"، ئەوا هاتنەدیی "تالی"ش بەرهەم دەهێنێت[1] و، ئیتر ئومێدی دڵارامیی ئەوان دەبڕێت.

---

(١) دانەر لێرەدا چەند زاراوەیەكی زانستی "مەنتیق"ی هێناوە، هەروەك ئاماژەی بۆ زاراوەیەكی زانستی "نەحوو"یش كردووە.

پوختەی پێوانەی دەراوێتەیی (قیاس استثنائي) بەو ئەندازەیەی كە پەیوەندیی بێرەوە هەیێت، بەم جۆرەیە:
قیاسەكە لە دوو پێشەكی پێكدێت: یەكەم و دووەم، یان گەورە و بچووك. گەورەكەیان (یەكەمەكە) بریتی‌یە لە ڕستەی مەرج و ڕستەی وەڵامی مەرج پێكەوە. ڕستەی مەرجەكە پێی دەوترێ: "موقەددەم" چونكە لە پێشەوەیە، ڕستەی وەڵامەكەشی پێی دەوترێ "تالی" چونكە لە دوای ئەو دێت. پێشەكی‌یە بچووكەكەش (دووەمەكە) هەر لە "موقەددەم" یان لە "تالی"ی پێشەكیی یەكەم وەردەگیرێت. ئنجا "ئەنجام" لە هەردوو پێشەكی‌یەكە بەدەست دێت. جا ئەگەر "ئەنجام"ەكە ڕاستەوخۆ (بالفعل) لە پێشەكی‌یەكاندا دانرابوو، پێی دەوترێ: "قیاس استثنائي مستقیم" (پێوانەی دەراوێتەیی ڕاستەوخۆ). دەنا "غیر مستقیم" (ناڕاستەوخۆ)یە. ڕاستەوخۆكە وەك ئەم نموونەیە: "هەتا كەش و هەوا سارد بێت سووتەمەنی زۆر پێویست دەبێت". ئەمە پێشەكی‌یە گەورەكەیە كە لە "موقەددەم" و "تالی" پێكهاتووە. پێشەكیی دووەم (بچووكەكە)ش هەر لەو پێشەكی‌یەی یەكەم (واتە یان لە موقەددەمەكە یان لە تالی‌یەكە) دەردەهێنین، دەڵێین: "بەڵام سووتەمەنی زۆر پێویستە". ئیتر لەم دوو پێشەكی‌یە، ئەم "ئەنجام"ەی خوارەوە بەدەست دێت كە: "كەواتە كەش و هەوا ساردە".
لەم ئایەتەشدا ڕستەی ﴿فلما أضاءت ما حوله﴾ كە مەرجەكەیە پێی دەوترێ: "موقەددەم" و، هاتنەدیی ئەم موقەددەمەش هەروەك خۆی بێگومانە، هاتنەدیی "تالی"یەكەش بە بێگومانی بە دوای خۆیدا دەهێنێت كە بریتی‌یە لە ڕستەی ﴿ذهب الله بنورهم﴾ چونكە لە زانستی "نەحوو"دا بە ﴿لمـــا﴾ دەوترێت: "حرف وجود لوجود". واتە پیتێكی مەرجە، وەڵامی مەرجەكەی دێتەدی لەبەر ئەوەی مەرجەكەی هاتووەتەدی. هەروەها كە "مەلزووم" هەبوو "لازم"یش بە دوای خۆیدا دەهێنێت. وەك پێشتر ڕوون كرایەوە. (وەرگێڕ)

وأما تنكيرُه فإيماءٌ إلى شدةِ احتياجِهم حتى إنهم يرضَوْنَ بأيّةِ نارٍ كانتْ.

ثم أجِلِ النظرَ فيما حولَ جملةِ: ﴿فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللهُ بِنُورِهِمْ﴾ لترى كيف تضيءُ قيوداتُها على ظلماتِ الدهشةِ التي هي الغرَضُ الأساسيُّ. ولقد سمعتَ في "المسألة الرابعةِ" أنّ قوةَ الكلام بتجاوبِ القيودِ:

أما "الفاءُ" فإيماءٌ إلى أنّ هجومَ اليأسِ المطلقِ يعقُبُ كمالَ الرجاء.

وأما ﴿لَـمَّا﴾ فلتضمُّنِه قياساً استثنائياً مستقيماً مع دلالته على تحقُّقِ المقدَّمِ، يُنتِجُ تحقُّقَ التالي وقطعَ التسلّي.

﴿أَضَـــاءَتْ﴾یـش، ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی کـە کردنـەوەی ئاگرەکـە بـە مەبەسـتی ڕووناککردنەوەیە، نـەك خۆ گەرمکردنـەوە. ئەمـەش ئاماژەیـەکی تێدایـە بـۆ سـەختیی سەرسامییەکەیان. چونکە ڕووناککردنەوەکە هیچ سـوودێکی پێ نەگەیاندن جگـە لـە "بینین"ی ئەو مەترسییانەی کە مایەی تیاچوونیانە و، "زانین"ی ئەوەش کە ئەو شتانە لـە دەوروبەریاندا هەیە! خۆ ئەگەر ئەو ڕووناککردنەوەیە نەبوایە، دەگونجا بـە "خۆفریـودان" خۆیـان بخەڵەتاندایـە و، تەسـکینییان بـە دەروونیـان بدایـە (کـە هیـچ مەترسـییەك لـە دەوروبەریاندا نییە)!

﴿مَا حَوْلَهُ﴾یش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە سەرسـامییەکە لـە هـەر چـوار لاوە گەمارۆی داون، هەروەها بۆ ئەوەش کە پێویست بوو بەو ڕووناکبوونەوەیـە پارێزگـاری لـە خۆیـان بکەن، لە بەرامبەر مەترسیی هێرشی زیانەکان لە سەریان لە هەر شەش لاوە.

﴿ذَهَبَ﴾ش، لەبەر ئەوەی "وەڵامـی مـەرج"ە، ئـەوا دەبێـت "لازم" بێـت (بۆ ڕستەی مەرجەکە، کە "مەلزووم"ە). جا لـەبـەر پەنـهانیی "لـزووم" بوونەکـە (واتـە ئـەوەی نێـوان مەرج و وەڵامی مەرج) - وەك پێشتر باس کرا - ئەوا ئەم وەڵامی مەرجە ئاماژە دەکـات بۆ ئەوەی کە پارێزگاریی مانەوەی ئاگرەکەیان نـەکرد و، نرخی ئـەو نیعمەتـەیان نـەزانی کە لەو ئاگرەدایە. کەواتە هەر بـە خـودی ڕووناککردنەوەکە دەستەوسـان کـران. ئنجا لەخۆ بایی بوون و خۆشحاڵییان ئەوەی لە بیر بردنەوە کە پارێزگاری لەو ئـاگرە بکـەن، بۆیە خوای گەورەش لێی سەندنەوە.

دانەپاڵی ﴿ذَهَـــبَ﴾ش بۆ لای ﴿اللّٰهُ﴾ ئاماژەیـە بۆ بڕینی دوو جـۆر هیـوا و ئومێد: "ئومێدی داگیرساندنەوەی سـەرلەنوێی ئاگرەکـە" و، "ئومێـدی میـهرەبانی"ی خـوای گەورەش. چونکە ئەم دانەپاڵە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کـە ئافـەتێکی ئاسمانییـە و تازەکردنـەوە قبووڵ ناکات (ئەمە سەبارەت بە بڕینی ئومێدی یەکەم).. هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەش کە ئەو کوژانەوەیـە سـزای کەمتەرخـەمیی مرۆڤـە و، هـەر لەبەر ئەوەشـە کـە خـوای گـەورە ئاگرەکـەی لـێ گرتـەوە. ئیـتر لـە دەمـی پچـڕان و لەکارکەوتنی "هۆکـار"ەکـاندا ئـەو هیوایەش دەپچڕێت کە دەستی لـێ گـیر دەکـرا، کـە "ئومێـدی میـهرەبانی" بـوو، چونکـە داوای یارمەتی لە "حەق" ناکرێت بۆ "پووچەڵکردنەوەی حەق"! (ئەمـەش سـەبارەت بـە بڕینی ئومێدی دووەم).

وأما ﴿أَضَاءَتْ﴾ فإشارةٌ إلى أنَّ الإيقادَ للاستنارة لا للاصطلاء. وفيه رمزٌ إلى شدةِ الدهشةِ إذ ما أفادَ لهم الإضاءةُ إلّا رؤيةَ المهالكِ والعلمَ بوجودها، ولولاها لأمكَنَ مغالطةُ النفسِ وتسكينُها.

وأما ﴿مَا حَوْلَهُ﴾ فإشارةٌ إلى إحاطةِ الدهشةِ من الجهاتِ الأربعِ، وإلى لزومِ التحفُّظِ بالإضاءة عن هجوم الضررِ عن الجهاتِ الستِّ.

وأما ﴿ذَهَبَ﴾ فلأنّه جزاءُ الشرطِ لابُدَّ أنْ يكونَ لازماً. ولخفاء اللزوم - كما مرَّ- يرمزُ إلى أنّهم لم يتعهدوها ولم يعرفوا قَدْرَ النعمةِ فيها. فبنفسِ الإضاءةِ أُخِذوا عن أنفسِهم وأنساهم البطَرُ والفرَحُ تعهُّدَها فأخذَها اللهُ عنهم..

وأما إسنادُ ﴿ذَهَبَ﴾ إلى ﴿اللهُ﴾ فإشارةٌ إلى قطع رجاءين: رجاءِ التعميرِ ورجاءِ الرحمةِ؛ لأنّه يشيرُ إلى أنَّ الآفةَ سماويةٌ لا تقبلُ التعميرَ، ويرمزُ إلى أنّه جزاءٌ لقصور المرءِ، ولهذا يأخذُه اللهُ تعالى. فينقطعُ المتمسّكُ به عند انقطاعِ الأسبابِ، وهو أملُ الرحمةِ. إذ لا يُستعانُ من الحقِّ على إبطالِ الحق.

"باء"ەکەش ئاماژەیە بۆ نائومێدی لە "گەڕانەوە". چونکە هەر شتێ خوای گەورە خۆی لایببات، هیچ کەسێك ناتوانێت بیهێنێتەوە. ئەوەتا جیاوازی لە نێوان ئەمانەدا ئاشکرایە: "ذهَبَ بِهِ" واتە لەگەڵ خۆی بردی.. "أذهَبَـــهُ" بەڕێی کرد و خستیە ڕێ.. "ذَهَبَ" خۆی ڕۆیشت. چونکە ئەم دوانەی دوایی گریمانی گەڕانەوەیان هەیە، نەك یەکەمیان.

﴿نور﴾یش ئاماژەیەکی وردی تێدایە بۆ یادکردنەوەی حاڵی ئەوان لەسەر پردی "سیرات"دا.

"ئیزافە"ش لە ﴿هُمْ﴾دا کە بۆ "تایبەتکاری"یە، ئاماژەیە بۆ زۆریی لەڕادەبەدەری ئازار و خەفەتەکەیان، چونکە ئازاری ئەو کەسە گەلێ زیاترە کە ئەگەر تەنها ئاگرەکەی خۆی کوژابێتەوە و، لە هەمان کاتدا ئاگری خەڵك بڵێسە بدات!

ماشەڵڵا قورئان چەندە ورد و نیانە لە هونەرەکانی ڕەوانبێژیدا! ئایا نەتبینی کە چۆن هەموو ڕوخسارە پێکهێنەرەکانی ئەم ڕستەیە ڕوویان لە دەرخستنی مەبەستە گشتییەکە بوو، کە "سەرسامیی ئاوێتەی نائومێدی"یە، بە وێنەی ئەو گۆمە ئاوەی کە لە شوێنی یەکگرتنی شیوەکاندا ئاوی هەموویانی دەچێتەسەر؟

پاشان بە وردی بڕوانە بۆ:

﴿وتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَاتٍ لا يُبْصِرُونَ﴾..

سەبارەت بە "واو"ەکە (کە پیتی عەتفە و بۆ کۆکردنەوەی چەند شتێکە) ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەوانە دوو جۆر زیانیان لەسەر خۆیان کۆ کردەوە، ڕووناکییان لێ گیرایەوە و، تاریکیشیان بەبەر پۆشرا!

﴿تَــرَكَ﴾یش لە بریی "أبقى" یان هەر شتێکی دیکە، ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە دووڕووەکان بە وێنەی جەستەیەکی بێ گیان و توێکڵێکی بێ کاکڵەیان لێ هاتووە. کەواتە هەڵدەگرن فەرامۆش بکرێن و، شایانی ئەوەن پشتگوێ بخرێن.

﴿في﴾یش هێمایەکە بۆ ئەوەی کە هەموو شتێك لە پێش چاویاندا بووەتە "نەبوو"، جگە لە ناونیشانی "نەبوون" هیچی تریان بۆ نەماوە، ئەویش "تاریکی"یە، کە بووەتە دەفر و گۆڕێك بۆیان.

وأما "الباءُ" فإشارةٌ إلى اليأسِ عن العَوْدِ؛ إذ لا رادَّ لما أخذَه اللهُ، للفرق البيِّنِ بين ذهبَ به أي استصحبَه، وبين أذهَبَه أي أرسَله، وذهبَ أي انطلقَ؛ لإمكانِ العَوْدِ في الآخَرين دون الأولِ.

وأما الـ﴿نُور﴾ ففيه إيماءٌ لطيفٌ إلى تذكُّرِ حالِهم على الصراط.

وأما الإضافةُ في ﴿هم﴾ المفيدةُ للاختصاص، فإشارةٌ إلى شدّةِ تأثُّرِهم؛ إذ مَن انطفأتْ نارُه فقط مع أنَّ نار الناسِ تلتهبُ أشدُّ تألماً.

ولله دَرُّ التنـزيلِ! ما ألطفَه في فنون البلاغةِ! ألَم ترَ كيف توجهتْ هيئاتُها إلى الغَرَضِ الكلّيّ، أعني الدهشةَ مع اليأسِ، كالحوضِ في ملتقَى الأودية؟

ثم أمعِنِ النظرَ في:

﴿وَتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَاتٍ لا يُبْصِرُونَ﴾..

أما "الواوُ" فإشارةٌ إلى أنّهم جَمعوا بين الخسارتين؛ سُلبوا ضياءً، وأُلبِسُوا ظُلمةً.

أما ﴿تَرَكَ﴾ بدلَ "أبقى" أو غيرِه فإشارةٌ إلى أنّهم صاروا كجسدٍ بلا روحٍ، وقشرٍ بلا لُبٍّ. فمِن شأنهم أنْ يُترَكوا سُدىً ويُلقَوْا ظِهرياً.

وأما ﴿فِي﴾ فرمزٌ إلى أنّه انعدمَ في نظرِهم كلُّ شيءٍ، ولم يبقَ إلّا عنوانُ العدمِ، وهو الظلمةُ فصارتْ ظرفاً وقبراً لهم.

هێنانی ﴿ظُلُمَاتٍ﴾یش بە شێوەی "کۆ" ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە "ڕەشیی شەو" لەگەڵ "تاریکایی هەور"دا، تاریکیی نائومێدی و ترسی لەناو "ڕۆح"ی ئەواندا پێکهێناوە و، لە "شوێن"ەکەیاندا تاریکیی سامی تەنیایی و سەرسامیی بۆ دروست کردوون و، لە "کات"ەکەشیاندا تاریکیی بێدەنگی و کش و ماتیی ناوەتەوە.. ئیتر چەندین تاریکایی جۆراوجۆر، لە هەموو لایەکەوە، دەورەی داون..

"نەکیرە"کردنی وشەکەش، ئاماژەیە کە بۆ ئەوەی کە ئەو تاریکییە سەبارەت بەوان نەناسراوە و، تا ئێستا لەگەڵ هاوشێوەی ئەوەدا ڕانەهاتوون. ئەوەش کاریگەریی تاریکییەکە لە سەریان زیاتر دەکات.

سەبارەت بە ﴿لا يُبْصِرُونَ﴾یش، ئەوا دەقە لەسەر بناغەی گرفتەکان. چونکە ئەو کەسەی کە دەوروبەری خۆی نەبینێت لە هەموو کەسێك زیاتر بەلاّ و گرفتەکان دەبینێت و، بە نەمانی "بینین"یش نادیارترینی موسیبەتەکان لە پێش چاویدا دەردەکەوێت!

"موزاریع" بوونی وشەکەش، بە مەبەستی وێناکردن و بەرجەستەکردنی حالّی ئەوانە لە پێش چاوی ئەندێشەدا، تاکو بیسەر سەرسامییەکەی ئەوان ببینێت و، لە ناخی ویژدانیدا هەستی پێ بکات.

وازهێنانیش لە "مەفعوول" - بۆ فیعلی ﴿لا يُبْصِرُونَ﴾ - (واتە لە شێوەی فیعلی "لازم"دا هێنای، لە کاتێکدا کە "موتەعەددی"یە)، بۆ مەبەستی گشتاندنە. واتە سوود و بەرژەوەندییەکانی خۆیان نابینن، هەتا پارێزگارییان لێ بکەن و.. مەترسییەکان چاوناکەن، هەتا خۆیانی لێ بپارێزن و.. هاوەڵەکانیان لێ دەرناکەوێت، هەتا دڵیان پێ خۆش بکەن و نامۆیی خۆیانی پێ بڕەوێننەوە.. دەڵێی هەموو یەکێکی ئەوان "تاك"ێکی سەربەخۆ و بێ هاوڕێیە.

پاشان سەیری ڕستەکانی ﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لا يَرْجِعُونَ﴾ بکە، تاکو گوێت لە گفتوگۆی نێوانیان بێت. چونکە ئەم چوارە سنووری هاوبەشی نێوان "نموونە بۆ هێنراو" و "نموونە پێ هێنراو"ەکەیە و، پەرژینێکن لە نێوانیاندا و ڕوویان لە هەردووکیانە و، لە حالّی هەردوو لایان دەدوێن و، ئاوێنەیانن؛ کاروباری ئەوانت پیشان دەدەن و، دەرەنجامیشیانن؛ بەسەرهاتی ئەوانت بۆ دەگێڕنەوە.

وأما جمعُ ﴿ظُلُمَاتٍ﴾ فإيماءٌ إلى أنَّ سَوادَ الليل وظلمةَ السحابِ أولَدتا في روحهم ظلمةَ اليأسِ والخوفِ، وفي مكانهم ظلمةَ التوحُّشِ والدهشةِ، وفي زمانهم ظلمةَ السكونِ والسكوتِ، فأحاطتْ بهم ظلماتٌ متنوِّعةٌ..

وأما تنكيرُها فإيماءٌ إلى أنّها مجهولةٌ لهم، لم يسبِقْ لهم ألفَةٌ بمثلها فتكونُ أشدَّ وقعاً.

وأما ﴿لا يُبْصِرُونَ﴾ فتنصيصٌ على أساس المصائبِ، إذ مَن لم يرَ كان أرْأى للبلايا، وبفَقْدِ البصَر يُبصِرُ أخفى المصائبِ.

وأما المضارِعيةُ فلتصويرِ وتمثيلِ حالهم نُصْبَ عينِ الخيالِ ليرى السامعُ دهشتَهم فيتحسَّسَ بوجدانِه أيضاً.

وأما تركُ المفعولِ فللتعميمِ، أي لا يرَوْنَ منافعَهم ليحفظوها، ولا يُبصرون المهالكَ كي يجتنبوا عنها، ولا يتراءى الرفقاءُ ليستأنِسوا بهم، فكأنَّ كلَّ واحدٍ فردٌ برأسِه.

ثم انظرْ إلى جُمل ﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لا يَرْجِعُونَ﴾ لتسمعَ ما تتناجى به؛ إذ هذه الأربعةُ حدٌّ مشتَرَكٌ بين الممثَّل[1] والممثَّلِ به، وبرزخٌ بينهما ومتوجِّهةٌ إليهما؛ تتكلمُ عن حال الطَرَفين. ومرآةٌ لهما تُريك شأنَهما. ونتيجةٌ لهما تُسمِعُك قصتَّهما.

---

(١) لعل المراد الممثَّل له.

سەبارەت بەو ڕووەی کە دەڕوانێتە "نموونە پێ هێنراو"، ئەوا بزانە کە:

هەر کەسێك بکەوێتە ناو ئەم چەشنە گرفتەوە، ئەنانەت بە بیستنی وتـەی کەسێك کـە بە چپە بدوێت، ئومێدێکی ڕزگاربوونی دەمێنێت. بەڵام لێرەدا "لاڵی"ی شەو "کەڕی"ی ئەو کەسەی خواست..

پاشان ئومێدی ئەوەی دەبێـت کـە دەنگی بـدات بـە گوێی فریـاگوزارێکدا، کـەچی "کەڕی"ی شەو "لاڵی"ی ئەوی گەیاند..

پاشـان ئومێـدی بـەوە دەبێـت کـە "ڕێ دەربکـات"، ئـەوەش بـە بینینـی ئـاگرێك یـان ڕووناکییەك، بەڵام "خۆنابیناکردن"ی شەو "نابینایی"ی ئەو کەسەی لـێ کەوتەوە..

پاشان ئومێدی بە "گەڕانەوە" دەبێـت بـەرەو ئـەو شـوێنەی کـە لێیـەوە هـاتووە، بـەڵام لێرەدا دەرگای لەسەر داخرا و، بە وێنەی ئەو کەسەی لـێ هات کەوتبێتە ناو قوڕێکەوە، هەتا زیاتر بجووڵێت، پتر تیایدا دەچەقێت!

سەبارەت بەو ڕووەش کە دەڕوانێتە "نموونە بۆ هێنراو"، ئەوا بزانە کە:

ئەوان کاتێ کەوتنە ناو تاریکایی "کوفـر" و "دووڕوویی"یـەوە، دەیـانتوانی لـە چـوار ڕێگای یەك لە دوای یەکەوە لەو تاریکاییانە ڕزگاریان ببێت:

یەکەمیان:

دەبوو سەریان بـەرز بکردایەتـەوە و، گوێیـان لـە "حـەق" ڕابگرتایـە و، گـوێ بیستی ڕێنمایی "قورئان" بوونایە. بەڵام لەبەر ئەوەی "هەوا و ئارەزوو" ڕۆشتە ناخیانەوە و ڕێی لـێ گرتن کە زایەڵەی قورئـان بڕواتـە نـاو دەمـاری بیستنیان و، "هەوەسبازی"ش گوێی ئـەوانی ڕاکێشـا و لـەو ڕێیـە دووری خستنەوە، ئـەوا قورئـان بـە فەرمایشتی ﴿صُمٌّ﴾ لەکارکەوتنی بیستنی ئەوانی ڕاگەیاند، وەك ئاماژەیەك بۆ داخرانی ئـەم دەرگایـە و، وەك هێمایەکیش بۆ ئەوەی کە گوێی ئەوان وەکو ئەوە وایـە بڕابێـت و، تەنـها چـەند کـەلێن و کەلەبەرێکی ناشیرین و شێواو، یـاخود چـەند پارچەیـەکی شـۆڕەوەبوو بـەم لا و ئـەولای سەریانەوە مابێتەوە!

دووەم:

پێویست بوو ئەوان سەریان دابنەواندایە و ڕاوێژیان بە ویژدانیان بکردایە و، بەم پێیـە پرسیاریان لە بارەی "حەق" و "ڕاستەڕێ"وە بکردایە..

أما الجهةُ الناظرةُ إلى الممثَّل به:

فاعلم أنَّ مَن سقطَ في مثل هذه المصيبةِ يبقى له رجاءُ النجاةِ باستماعِ نجوى مُنجٍ، فاستلزمتْ أبكميةُ الليلةِ أصمّيّتَه.. ثم إسماعِ مغيثٍ، فاقتضتْ أصميةُ الليلِ أبكميتَه.. ثم الهدى برؤيةِ نارٍ أو نيّرٍ فانتجَ تعاميَ الليلِ عُمْيَه[1].. ثم العَودِ إلى بدءٍ، فانسدَّ عليه البابُ كمَن سقطَ في وحلٍ كلما تحرَّكَ انغمس..

وأما الجهةُ الناظرةُ إلى الممثَّل:

فاعلم أنَّهم لَمّا وقعوا في ظلماتِ الكفرِ والنفاقِ أمكَنَ لهم النجاةُ عن تلك الظلماتِ بطرُقٍ أربعةٍ مترتبة:

**فأوّلاً:**

كان عليهم أنْ يرفعوا رؤوسَهم ويستمعوا إلى الحقِّ ويصغُوا إلى إرشادِ القرآنِ، لكن لما صارتْ غَلغَلة[2] الهوى مانعةً لأنْ يَخلُصَ صدى القرآنِ إلى صماخِهم، وأخَذَ التهوُّسُ بآذانهم جارّاً لهم عن تلك الطريقِ، نعى عليهم القرآنُ بقوله: ﴿صُمٌّ﴾ إشارةً إلى انسدادِ هذا الباب، ورمزاً إلى أنَّ آذانَهم كأنها قُطعتْ وبقيَتْ ثَقباتٌ مشوَّهةٌ أو قِطعاتٌ متدليةٌ في جوانب رؤوسِهم.

**وثانياً:**

لابدَّ لهم أنْ يَخفضوا رؤوسَهم ويُشاوِروا وجدانَهم، فيسألوا عن الحق والصراط..

---

(١) أي عَماه.

(٢) غلغل الشيء في الشيء: أدخله فيه، على تعب وشدة.

بەڵام لەبەر ئەوەی "نکوولی و سەرسەختی" زمانی ئەوانی گرت و، "ڕق و قین"یش لە پشتەوە زمانیانی بەرەو ناوەوەیان ڕاکێشا، ئەوا "قورئان" بە فەرمایشتی ﴿بُكْمٌ﴾ بەردی دەرخوارد دان. ئەوەش ئاماژەیە بە داخراویی ئەم دەرگایە لە ڕوویاندا. هەروەك هێمایە کیشە بۆ ئەوەی کە بە بێدەنگ بوونیان لە "دان نان بە حەق"دا وەکو ئەو کەسەیان لێ هات کە زمانیان دەرهێنابێت و، دەمی بە وێنەی ئەشکەوتێکی لێ هاتبێت کە دانیشتوانی چۆڵیان کردبێت و، دەموچاوی ئەوی شێواندبێت!

سێهەم:

پێویست بوو "چاوی پەند وەرگرتن"یان بەم لا و ئەولادا بگێڕایە، تاکو بەڵگەکانی ناو ئاسۆکانی دەوروبەریان بۆ بچنێتەوە. بەڵام "خۆ گێل کردن" دەستی لەسەر چاوی ئەوان دانا و، "خۆ نابینا کردن"یش بینینەکانی ئەوانی گێڕایەوە ناو پێڵووەکانیان. لەبەر ئەوە، قورئان فەرمووی: ﴿عُمْيٌ﴾ وەك ئاماژەیەك بۆ ئەوەی کە ئەو دووڕووانە لەم ڕێگایەشدا سەرسام مان. هەروەك لە ڕێی حەزف کردنی ئامرازی تەشبیهەکەش هێمای کردووە بۆ ئەوەی کە ئەو چاوانەی ڕووناکین لە سەردا، (لای ئەوان) وەکو ئەوەیان لێ هاتووە کە دەرهێنرابن و، چەند کەلەبەرێکی شێواویان لە ڕوخساری ئەواندا بەجێ هێشتبێت.

چوارەم:

پێویست بوو ناشیرینیی حاڵەتەکەی خۆیان بزانن، تاکو دوورەپەرێزیی لێ بکەن و، پەشیمان بینەوە و، تۆبە بکەن و، بگەڕێنەوە. کەچی لەبەر تێکچوونی سروشتیان بە هۆی سووربوون لەسەر ئەو حاڵەتە و، زاڵبوونی شەیتان و هەوا و ئارەزوو بەسەریاندا، "دەروون"یان ئەو شتە ناشیرین و چەپەڵانەی لە پێش چاودا بۆ ڕازاندنەوە. قورئانیش فەرمووی: ﴿فَهُمْ لا يَرْجِعُونَ﴾ کە ئەوەش ئاماژەیە بۆ داخراویی دواهەمین ڕێگا لەوان و، هێمایەکیشە بۆ ئەوەی کە بە ویستی خۆیان کەوتنە ناو شتێك ویستی خۆیانی تێدا نەماوە بۆ دەربازبوون لێی! بە وێنەی کەسێك لە دەریای لمدا بگەوزێت!

* * *

لكن لما أخذَ العنادُ على يد لسانِهم وجرَّه الحقدُ من خلفٍ إلى الجوف، ألقمَهم القرآنُ الحجرَ بقوله: ﴿بُكْمٌ﴾ إشارةً إلى انسدادِ هذا الباب أيضاً في وجوهِهم، ورمزاً إلى أنَّهم بالسكوتِ عن الإقرار بالحق كانوا كمَن قُلعَ لسانُه فبقيَ الفمُ ككهفٍ خلا عن ساكنِهِ مشوِّهاً للوجهِ.

**وثالثاً:**

لَزِمَهم أنْ يُرسلوا أنظارَ العِبرة لتجتنيَ لهم الدلائلَ الآفاقيةَ، لكنْ وضَعَ التغافلُ يدَه على عيونهم، وردَّ ــ وطرَدَ - التعامي الأنظارَ إلى أجفانهم، فقال القرآنُ: ﴿عُمْيٌ﴾ إشارةً إلى أنهم عمهوا[1] عن هذا الطريقِ أيضاً. ورمزَ بحذفِ أداة التشبيه إلى أنَّ عيونَهم التي هي أنوارُ الرأس كأنها قُلعتْ فبقيتْ نُقَراتٌ مشوَّهةٌ في جباهِهم.

**ورابعاً:**

لابدَّ من أنْ يعرفوا قبحَ حالِهم القبيحِ، ليتنفّروا، فيندَموا، فيتوبوا، فيرجِعوا. لكن لمّا زيّنتْ لهم أنفسُهم - لأجل فسادِ الفطرةِ بالإصرار وغلبةِ الهوى والشيطانِ - تلكَ القبائحَ، قال القرآنُ: ﴿فَهُمْ لا يَرْجِعُونَ﴾ إشارةً إلى انسدادِ آخِرِ الطُّرُقِ عنهم، ورمزاً إلى أنَّهم وقعوا باختيارهم فيما لا اختيارَ لهم في الخروجِ كالمضطربِ في بحر الرملِ.

* * *

(١) تحيروا في طريقهم أو أمرهم.

﴿أَوْ كَصَيِّبٍ مِنَ السَّمَاءِ فِيهِ ظُلُمَاتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَابِعَهُمْ فِي ءاذَانِهِمْ مِنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ واللهُ مُحِيطٌ بِالْكافِرِينَ ۞ يَكَادُ الْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَارَهُمْ كُلَّمَا أَضَاءَ لَهُمْ مَشَوْاْ فِيهِ وَإِذَا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُواْ وَلَوْ شَاءَ اللهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ إِنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (البقرة: ١٩-٢٠)

بزانە کە: خولگەی تێڕوانین لەم ئایەتەشدا لە سێ ڕووەوەیە:

هۆنینی لە ڕشتەی ئایەتی پێش خۆیدا.. هۆنینی نێوان ڕستەکانی.. پاشان تێڕوانین لە نێوان شێوەی پێکهاتنی یەك بە یەکی ڕستەکانی.

پەیوەندیی نێوان ئەمانەش بە وێنەی پەیوەندیی نێوان میلەکانی ژماردنی سەعات و خولەك و چرکەکانە.

**هۆی هۆنینی نێوان خۆی و ئایەتەکەی پێشووی، ئەوەیە کە:**

لێرەدا نموونەی دووپات کردەوە و، درێژەی بە وێناکردنەکان دا، کە ئەوەش ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی وێنەکێشانی حاڵی دووڕووەکان لە سەرسامییەکەیاندا، پێویستی بە دوو جۆر "نموونە هێنانەوە" هەیە:

پوختەی نموونەی یەکەم ئەوەیە کە:

کەسی "دووڕوو" خۆی لە بیابانی "بوون"دا بە تەنیا و، دوور لە هاوڕێیان و، دەرکراو لە کۆمەڵەی بوونەوەراندا و، لە دەرەوەی بڕیاری خۆری حەقیقەت دەبینێت.. هەموو شتێك لە پێش چاویدا دەبێتە "نەبوو".. سەرجەمی بوونەوەرانیش بە "بیانی" و کش و مات و بێدەنگ دەبینێت، بە شێوەیەکی وەها کە مەنگی و سام و مەترسی باڵیان بەسەردا ڕاکێشاوە..

ئنجا بزانە ئەمە لە کوێ و، حاڵی ئەو ئیماندارەش لە کوێ کە بە نووری ئیمانەکەی سەرانسەری بوونەوەران بە "خۆشەویست"ی خۆی دەبینێت و، دڵی بە هەموویان دەکرێتەوە.

﴿أَوْ كَصَيِّبٍ مِنَ السَّمَاءِ فِيهِ ظُلُمَاتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَابِعَهُمْ فِي ءَاذَانِهِم مِنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ واللهُ مُحِيطٌ بِالْكافِرِينَ * يَكَادُ الْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَارَهُمْ كُلَّمَا أَضَاءَ لَهُمْ مَشَوْا فِيهِ وَإِذَا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا وَلَوْ شَاءَ اللهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ إِنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (البقرة: ١٩-٢٠)

اعلم أنَّ مدارَ النظرِ في هذه الآيةِ أيضاً من ثلاثة وجوهٍ:

نظمُها بسابقتها، والنظمُ بين جُملِها، ثم النظرُ بين هيئاتِ جملةٍ جملةٍ. مَثَلُها في الارتباط كمَثَلِ الأميالِ العادَّةِ للساعات والدقائقِ والثواني.

أما وجهُ النظمِ بينها وبين سابقتِها فهو:

أنه كرّرَ التمثيلَ وأطنبَ في التصوير، إشارةً إلى احتياج تصويرِ حالِ المنافقين في دهشتهم وحَيرتِهم إلى نوعين منه، إذ:

خلاصةُ التمثيلِ الأولِ هي:

أنَّ المنافقَ يرى نفسَه في صحراء الوجودِ منفردةً عن الأصحاب، مطرودةً عن جمعية الكائناتِ، خارجةً عن حُكم شمسِ الحقيقةِ. يصيرُ كلُّ شيءٍ في نظره معدوماً ويرى المخلوقاتِ أجنبيةً كلَّها، ساكنةً وساكتة، استولى عليها الوحشةُ والخمودُ.

وأين هذا من حال المؤمنِ الذي يرى بنور الإيمانِ كلَّ الموجوداتِ أحبّاءَه ويستأنسُ بكلِّ الكائنات؟

پوختەی نموونەی دووهەمیش ئەوەیە کە:

کەسی دووڕوو لەو گومانەدایە کە هەموو بەشەکانی جیهان، لە ڕێی بەلاّ و موسیبەتەکانیانەوە، هەواڵی مردنی بە گوێدا دەدەن و، هەڕەشەی لێ دەکەن، هەروەك بە ڕووداوەکانیشی هاواری بەسەردا دەکەن و گەمارۆی دەدەن. دەڵێی هەموو جۆر و ڕەگەزەکانی بوونەوەران لەسەر دوژمنایەتی کردنی ئەو دووڕووە یەکیان گرتووە، ئیتر ئەو شتانەی کە چاوەڕێی سوودی لێ دەکردن، بوونەتە زیانبەخش سەبارەت بەو.

ئەم حاڵەی "دووڕووان" - وەك پێشتر باس کرا - هی نەبوونی هەردوو حاڵی "یارمەتی لێ وەرگرتن" و "پشت پێ بەستن"ە.

جا ئەمە لە کوێ و، حاڵی ئەو ئیماندارەش لە کوێ کە بە گوێی "ئیمان"ەکەی تەسبیحات و مژدەدانی بوونەوەران دەبیستێ؟

هەروەها دووپاتکردنەوەی "نموونە هێنانەوە" ئاماژەیە بۆ دابەشبوونی دووڕووەکان بۆ دوو چین: "چینی نزمی عەوام" کە لەگەڵ نموونەی یەکەمدا گونجاون. هەروەها "چینی لووتبەرزی لەخۆبایی" کە لەگەڵ نموونەی دووهەمدا یەکدەگرنەوە.

گونجاویی ئەم نموونەیەش بۆ شوێنەکەی، سەبارەت بە کەسی بیسەر، ئەوەیە کە:

ڕیزی یەکەمی گوێ بیستانی قورئان ڕۆڵەی دەشت و دەر بوون، بیابانەکانیان دەکرد بە ڕایەخ و گومەزی ئاسمانیش بە خێوەت. کەسێکیان نەبووە کە هەر بۆ خۆی ئەم چەشنە ڕووداوەی نەبینیبێت، یان لە هاوڕەگەزەکانی خۆی نەیبیستبێت، بە ڕادەیەك ئەم چەشنە ڕووداوە هێندە لە لایان زانراو بووە کە هەستی گشتینەی خەڵك پێی ڕاهاتووە و، بە وێنەی نموونە و پەندەکان کاری تێکردوون.

پەیوەندیی ئەم نموونە هێنانەوەیەی دووهەمیش بە نموونەی یەکەمەوە، هێندە ڕوونە کە شاردنەوە هەڵناگرێت، چونکە لە زۆر خاڵیدا وەکو تەواوکار و پاشماوەی ئەو وایە، لەگەڵ یەکگرتنیان لە زۆر خاڵدا.

پەیوەندیشی بە "نموونە بۆ هێنراو"ەکە لە پێنج ڕووەوەیە:

یەکێکیان: ڕوودانی هەردوو کیانە لە کاتی ئەوپەڕی سەرسامیدا، ئەوەش بە هۆی داخرانی هەموو ڕێگاکانی ڕزگاری لێیان و، ونکردنی هەموو هۆکارەکانی دەربازبوون.

وخلاصةُ التمثيلِ الثاني هي:

أنَّ المنافقَ يظنُّ أنَّ العالَمَ بأجزائه ينعى عليه بمصائبه ويهدِّدُه ببلاياه ويصيحُ عليه بحادثاته ويُحيطُ به بنوازله، كأنَّ الأنواعَ اتفقت على عداوته فانقلبَ النافعُ ضاراً..

وما هذه الحالةُ إلا لعدم نقطتي الاستمدادِ والاستنادِ كما مرَّ.

وأين هذا من حال المؤمنِ الذي يسمعُ بالإيمان تسبيحاتِ الكائناتِ وتبشيراتِها؟

وأيضاً تكرارُ التمثيلِ إيماءٌ إلى انقسام المنافقين إلى الطبقة السفليةِ العاميةِ المناسِبةِ للتمثيل الأولِ، وإلى الطبقة المتكبِّرَةِ المغرورةِ الموافقةِ للتمثيل الثاني.

وأما مناسبةُ هذا التمثيلِ لمقامه بالنظر إلى السامع فهي أنَّ الصفَّ الأولَ من مخاطبي القرآنِ أبناءُ الفيافي يفترشون الصحارى ويتخيّمون بفُسطاط السماءِ. وما منهم إلّا وقد رأى بنفسه أو سمعَ من أبناء جنسِه مثلَ هذه الحادثةِ حتى استأنسَ بها حسُّ العمومِ؛ بحيث تُؤثِّرُ فيه كضَرْب المثَل.

وأما مناسبتُه للتمثيل الأولِ فأظهرُ من أنْ يَخفى، إذ هو كالتكملة والتتمةِ له، مع الاتحادِ في كثيرٍ من النُّقَطِ.

وأما مناسبةُ التمثيلِ للممثَّلِ له فبخمسةِ وجوهٍ:

منها: وقوعُهما كليهما في شدّة الحَيرة، بانسداد كلِّ طُرقِ النجاةِ عليهم، وبأنْ ضلّ جميعُ أسبابِ الخلاصِ عنهم.

یەکێکی تریان: ڕوودانی هەردوو کیانە لە دەمی ئەوپەڕی ترس و دڵەڕاوکێدا، تەنانەت ئەندێشەی هەریەك لە "موشەببەهـ" و "موشەببەهـ بیهی" پێی وایە کە هەموو بوونەوەران لەسەر دوژمنایەتی کردنی ئەو یەکیان گرتووە، بە ڕادەیەك کە هیچ خولەکێك لە مانەوەی خۆی دڵنیا نی‌یە.

یەکێکی تریان: ڕوودانی هەردوو کیانە لە کاتی ئەوپەڕی حەپەساویدا، کە ئەوەش تێکچوونی ژیریی لێ دەکەوێتەوە. تەنانەت دەڵێی هەر یەکەیان دووچاری وڕی و کەودەنی بووە.. وەك ئەو کەسەی کە بریسکانەوەی شمشێر دەبینێت، کەچی بە چاونووقاندن خۆی لێ دەپارێزێت.. یان گوێی لە تەقەی تفەنگە، کەچی بە داخستنی گوێی، خۆی لە بریندار بوون دوور دەخاتەوە.. یاخود بە وێنەی ئەو کەسەی کە حەز ناکات خۆر ئاوا بێت، دەچێ چەرخی سەعاتەکەی خۆی دەوەستێنێت، تاکو چەرخی بە خولی گەردوون لە جووڵە بخات!! ئنجا بزانە کە ئەوانە چەندە شێتن! چونکە هەورە گرمە بە گوێ ئاخنینی ئەوان ناگەڕێتەوە و، بە چاو نووقاندنیشیان بروسکە و چەخماخەی سووتێنەریش بەزەیی پێیاندا نایەتەوە..

ئا لێرەوە دەردەکەوێ کە هیچ شتێکیان نەماوە دەستی لێ گیر بکەن.

یەکێکی تریان: هەروەك خۆر و باران، ڕووناکی و ئاو، سەرچاوەی ژیانی گوڵەکان و، پێگەیشتنی ڕووەکەکانن، کەچی هۆی گەنینی مردارەوەبووەکان و، بۆگەنکردنی پیس و چەپەڵی‌یەکانیشن.. بە هەمان جۆر، گەر "میهرەبانی" و "نیعمەت"یش نەخرێنە شوێنی چاوەڕوانکراوی خۆیان و، نەکەونە دەستی کەسی قەدرزانیان، دەگۆڕێن بە ڕق و سەخڵەتی.

یەکێکی تریان: هەروەك "هاوپەیوەندی" لە نێوان هەردوو دەرەنجامەکەدا هەیە، کە ئەوەش بناغەیە بۆ پێکهێنانی "ئیستیعارە تەمسیلی‌یەکە"، بێ ڕوانینە جێبەجێ کردنی ئەو ئیستیعارەیە بەسەر بەشە پێکهێنەرەکاندا.. بە هەمان جۆر، لێرەشدا چەندین پەیوەندیی گونجاو لە نێوان بەشەکانی هەردوولادا (موشەببەهـ و موشەببەهـ بیهی) هەیە. ئەوەتا باران هۆی ژیانی ڕووەکەکانە، وەك چۆن ئایینی ئیسلام مایەی ژیانی گیانەکانە.. هەورە تریشقە و چەخماخەش ئاماژە بۆ بەڵێن و هەڕەشەکان دەکەن و.. تاریکی‌یەکانیش، دوودڵی و گومانەکانی "کوفر" و "دووڕوویی" دەخەنە پێش چاوت.

ومنها: وقوعُهما في شدة الخوفِ، حتى يتخيَّلُ كلٌّ من المشبَّه والمشبَّه به، أنَّ الموجوداتِ اتفقتْ على عداوته، ولا يأمَنُ من بقائه في كلِّ دقيقة.

ومنها: وقوعُهما في شدة الدهشةِ المنتجةِ لاختبالِ العقلِ حتى إنَّ كُلاً منهما يتَبَلَّهُ. كمَثَل مَن يرى برقَ السيوفِ فيتحفَّظُ بغَمضِ بصرِه أو يسمعُ تَقْتَقَةَ البنادقِ فيتجنّبُ عن الجرح بسدِّ سمعِه. أو كمَثَلِ مَن لا يحبُّ غروبَ الشمسِ فيُمسِكُ دولابَ ساعتِه لئلّا يدورَ جرخُ الفَلك الدَّوّارِ، فما أخبَلَهم! إذ الصاعقةُ لا تنثني بسدّ الأسماعِ، والبرقُ المُحرِقُ لا يترحَّمُ عليهم بغضِّ الأبصار. ومِن هنا يُرى أنْ لم يبقَ لهم تَمَسّك.

ومنها: أنَّ الشمسَ والمطرَ والضياءَ والماءَ كما أنَّها منابعُ حياةِ الأزاهيرِ وتربيةِ النباتاتِ، وسببُ تعفُّنِ الميتاتِ ونَتْنِ القاذورات؛ كذلك إنَّ الرحمةَ والنعمةَ إذا لم تُصادِفا موقعَهما المنتظَرَ لهما والعارفَ بقيمتهما، تنقلبان زحمةً ونِقمة.

ومنها: أنّه كما يوجَدُ التناسبُ بين المآلين الذي هو الأصلُ في انعقاد الاستعارةِ التمثيليةِ بلا نظر إلى تطبيق الأجزاءِ؛ كذلك توجَدُ مناسباتٌ هنا بين أجزائِهما؛ إذ الصيِّبُ حياةُ النباتاتِ كما أنَّ الإسلاميةَ حياةُ الأرواح، والبرقُ والرعدُ يُشيران إلى الوعدِ والوعيد، والظلماتُ تريك شبهاتِ الكفرِ وشكوكَ النفاقِ.

سەبارەت بە هۆی هۆنینی نێوان ڕستەکانیش، ئەوا بزانە کە:

کاتێ قورئان فەرمووی: ﴿أَوْ كَصَيِّبٍ مِنَ السَّمَاءِ﴾ بەمەش ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە ئەو دووڕووانە وەکو ئەو کەسانە وان کە ناچاربوون بە ناو بیابانێکی سامناك و لە شەوی تاریك و لە ژێر بارانێکی هێندە بە خوڕەمدا سەفەر بکەن کە دڵۆپەکانی بە وێنەی چەند تیرێکی ئاراستەکراوی چەند موسیبەتێك وان کە نیشانەکانیان دەپێکن و، لەبەر زۆرییان ئاسمانیان پڕ کردووە..

(کاتێ قورئان بەو فەرمایشتە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد)..

زەینی بیسەر بێدار بووەوە و چاوەڕوانیی ئەوەی تێدا دروست بوو کە هۆی ئەوەی بۆ ڕوون ببێتەوە چی وای لەو بارانە کرد کە لە بنەڕەتدا میهرەبانی‌یەکە و حەزی پێ دەکرێ، ببێتە موسیبەتێکی ئاوا مەزن.. بۆیە ئایەتەکە بۆ وێناکردنی سەرسامیی کەسی خاوەن پرسیار، فەرمووی: ﴿فِيهِ ظُلُمَاتٌ﴾ بەمەش ئاماژەی بەوە دا کە باران هەروەك دەفرێکە بۆ چڕی و تاریکی هەورەکە، بە هەمان جۆر لەبەر گشتی بوون و زۆری و هەمە لایەنگیری‌یەکەشی وەکو دەفرێکی لێ هاتووە بۆ شەوێکی ئەوتۆ کە لە شێوەی چەند دڵۆپێکدا لەت لەت بووبێت و، کەرتەکانی بووبن بە چەند دڵۆپێکی ڕەش لە نێوان دڵۆپەکانی بارانەکەدا!

پاشان هەر بیسەرێك ﴿فِيهِ ظُلُمَاتٌ﴾ ببیستێ، چاوەڕێی ڕوونکردنەوەیەك دەبێت لە بارەی ئەو تاریکایییەوە.

ئنجا وەك بڵێی قسەبێژ گوێی لە زایەڵەی هەورە گرمە بوو لە زەینی بیسەرەکەدا، بۆیە فەرمووی ﴿وَرَعْدٌ﴾ بەمەش ئاماژەی بۆ دەربڕینی مەزنی و سەختیی ئەو حاڵەتە کرد، بەوەی کە ئاسمانی میری بوونەوەران بڕیاری لەناوبردنی ئەوانی داوە و، بە هەورە گرمەشی هاوار دەکات بەسەریاندا. چونکە ئەندێشەی مرۆڤی گیرۆدەی سەرسام لە ژێر کش و ماتیی ئەو بوونەوەرانەدا کە بۆ زیان پێگەیاندنی ئەم هاوکاریی یەکتر دەکەن، جموجووڵێك و، لە ژێر بێدەنگیشیاندا گوفتارێکی سامناکی بۆ وێنا دەکات. جا هەر هێندەی گرمەی هەوری بیست، وا گومان دەبات کە ئەو هەورە هاوار لە دژی ئەم دەکات و بە گوفتارێك دەدوێ کە هەڕەشەی لەمی تێدا بێت، چونکە بە هۆی ترسەکەیەوە لای وا دەبێت کە هەموو هاوارێك لە دژی ئەوە..

وأما وجهُ النظمِ بين الجُمَلِ:

فاعلم أنَّ التنـزيلَ لمّا قال: ﴿أَوْ كَصَيِّبٍ مِنَ السَّمَاءِ﴾ مُشيراً إلى أنَّهم كالذين اضطرُّوا إلى السَّفَر في صحراءٍ موحِشةٍ في ليلة مظلمةٍ تحت مطرٍ شديد، كأنَّ قطراتِه مصائبُ تصيبُ مَرماها بصَوبها وقد ملأت الجوَّ بكثرتها؛ استيقظَ ذهنُ السامعِ مُنتظِراً لبيان السببِ في أنْ صارَ الصيّبُ الذي هو في الأصل رحمةٌ مرغوبةٌ مصيبةً هائلةً، فقال مصوِّراً لدهشته: ﴿ فِيهِ ظُلُمَاتٌ﴾ مُشيراً إلى أنَّ المطرَ كما هو ظرفٌ لظُلمة السحابِ ولكثافته؛ كذلك لأجْلِ عمومِه وكثرتِه وإحاطتِه كأنّه ظرفٌ للّيلةِ المُتَفَتّتَة قطراتٍ مُسْوَدَّةً بين قطراته..

ثم ما مِن سامعٍ يسمعُ ﴿فِيهِ ظُلُمَاتٌ﴾ إلّا وينتظرُ لبيان..

كأنَّ المتكلمَ سمعَ صدى الرعدِ من ذهن السامعِ فقال: ﴿وَرَعْدٌ﴾ مُشيراً إلى تهويل الحالِ وتشديدِها بأنَّ السماءَ أميرَ[1] الموجوداتِ عزمتْ على إهلاكِهم، وتصيحُ عليهم برعدِها؛ إذ المصابُ المدهوشُ يتخيَّلُ من الكائنات المتعاونةِ على إضراره حركةً مُزعِجةً تحت سكونها، ونطقاً مُهيباً تحت سكوتِها. فإذ سمع الرعدَ توهَّمَ أنَّها تتكلمُ بما يهدِّه وتصيحُ عليه؛ إذ بالخوف يحسَبُ كلَّ صيحةٍ عليه..

---

(١) قد تذكَّر السماءُ وإن كانت مؤنَّثة، كقوله تعالى: ﴿السَّمَاءُ مُنفَطِرٌ بِهِ﴾.

پاشان بیسەر هەر هێندەی گرمەی هەور دەبیستێ، یەکسەر لە گوێیدا شەوقدانەوەی چەخماخەشی بە دوادا دێت، ئیتر هاوڕێ بەردەوامەکەی ئەو هەورە گرمەیە لە زەینیدا بریسکە دەدات! لەبەر ئەوە، فەرمووی: ﴿وَبَــــرْقٌ﴾. هێنانی وشەکەش بە نەکیرەیی، ئاماژەی پێ دەکات بۆ ئەوەی کە شتێکی نامۆ و سەرسووڕهێنەرە.

بەڵێ، ئەو دیاردەیە خۆی لە خۆیدا سەرسووڕهێنەرە، چونکە بە لەدایك بوونی ئەو چەخماخەیە جیهانێکی "تاریکی" دەمرێت و دەپێچرێتەوە و فڕێ دەدرێتە ناو "نەبوون"ەوە. بە مردنیشی جیهانێکی تری "تاریکی" زیندوو دەبێتەوە و حەشر دەکرێت، دەڵێی ئاگرێکە لە دەمی کوژانەوەیدا، پڕ بە دنیا دوو کەڵ بەجێ دەهێڵێت.

کەسی گیرۆدەی تووشبوو، لەبەر ڕاهاتن و پەیوەندی، بە ڕوانینێکی سەر پێیی بەسەریدا تێناپەڕێت، بەڵکو هێندە بە وردی بیر دەکاتەوە هەتا وردەکارییەکانی کاری توانستی خوای گەورەی لێ دەردەکەوێت.

ئنجا دوای ئەم وێنەکێشانە، وەك بڵێی زەینی بیسەر دەبزوێ و دەپرسێ: ئەی ئایا ئەوانە چ کارێك ئەنجام دەدەن؟ دەست لە چی گیر دەکەن؟ فەرمووی:

﴿يَجْعَلُونَ أَصابِعَهُمْ فِي ءاذَانِهِمْ مِنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ﴾..

بەمەش ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە هیچ ڕزگاری و داڵدە و پەنایەك نییە هانای بۆ بەن، تەنانەت بە وێنەی ئەو کەسەیان لێ هاتووە کە خەریکە لەناو ئاودا بخنکێت، کەچی لە تاوا دەستی لە شتی وەها گیر دەکات کە هی دەست پێوە گرتن نییە! ئەوەتا لە سەرسامیدا پەنجەکانیان لە بریی سەرپەنجە بەکاردەهێنن، وەك بڵێی حاڵەتی "سەرسامی"یان هێندە دەستی ئەوانی گرتووە کە لەتاو ئازار پەنجەکانیان دەئاخننە گوێیان.. هەروەها لە نیشانەی خۆگێل کردنیان ئەوەیە کە گوێی خۆیان دەگرن، تاکو هەورە تریشقەیان بەرنەکەوێت!

ئنجا لە دوای ئەمە، زەینی بیسەر بە دوای وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەگەڕێت کە:

ئایا موسیبەتەکەیان گشتییە؟ یاخود تایبەتییە و ئومێد دەکرێ ڕزگاریان ببێت؟

بۆیە فەرمووی: ﴿واللّهُ مُحِيطٌ بِالْكافِرِينَ﴾ بەمەش ئاماژەی بەوە دا کە ئەم موسیبەتە سزای ناشکوریی ئەوانە بەرامبەر نیعمەتەکان و، خوای گەورە بەوە سزایان دەدات کە لەو یاسا خواییە لایانداوە کە لەناو جەماوەردا دانراوە.

ثم إنَّ السامعَ لا يسمعُ الرعدَ إلّا ويستهِلُّ فيبرُقُ في ذهنه رفيقُه الدائميُّ، ولذلك قال: ﴿وَبَرْقٌ﴾ مُشيراً بالتنكير إلى أنّه غريبٌ عجيب..

نعم، هو في نفسه عجيبٌ؛ إذ بتولُّدِه يموتُ عالَمٌ من الظلمات فتُطوى وتُلقى إلى العدم، وبموته فجأةً يحيى ويُحشَرُ عالمٌ من الظلمات. كأنّه نارٌ حينما تنطفئُ تورِثُ مِلءَ الدنيا دخاناً.

ومِن شأن المصابِ بها أنْ يُمعِنَ النظرَ ولا يمرَّ بنظر سطحيٍّ بناءً على الأُلفةِ والمناسبةِ حتى يتكشفَ عن دقائق صُنعِ القدرة..

ثم بعد هذا التصويرِ كأنَّ ذهنَ السامعِ يتحرَّكُ سائلاً: كيف يعملون؟ وبِمَ يتشبثون؟ فقال: ﴿يَجْعَلُونَ أَصَابِعَهُمْ فِي ءَاذَانِهِم مِنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ﴾ مُشيراً إلى أنْ لا مناصَ ولا ملجأ ولا مَنجَى لهم حتى إنهم كالغريق يتمسَّكون بما لا يُتَمَسكُ به .فمِن التدهُّشِ يستعملون الأصابعَ موضعَ الأناملِ كأنَّ الدهشةَ تضرِبُ على أيديهم فيُدخِلون الأصابعَ من الوجَعِ في الآذان، ومن التبلُّهِ أنهم يسدّون الآذانَ لئلَا تصيبَهم الصواعقُ..

ثم بعد هذا يتحرَّى ذهنُ السامع سائلاً:

أعَمَّت المصيبةُ أم خَصَّت فيُرجى؟

فقال: ﴿واللهُ مُحِيطٌ بِالْكافِرِينَ﴾ مشيراً إلى أنَّ هذه المصيبةَ جزاءٌ لكفرانهم النعمةَ. يؤاخذُهم الله تعالى به لشذوذهم عن القانون الإلهي المودَعِ في الجمهور.

پاشان کاتێ بیسەر توندوتیژیی هەورە گرمەکەی بیست، بە خۆی دەڵێت: " ئایا بروسکەی هەورەکە سوودی ئەوەیان پێ ناگەیەنێت کە ڕێگایان پیشان بدات"؟

بۆیە فەرمووی: ﴿يَكَادُ الْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَارَهُمْ﴾. بەمەش ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە هەروەك هەورە گرمە دوژمنایەتییان دەکات و توانای بیستنیان ناهێڵێت، هەورە بروسکەش بە هەمان جۆر بەوە دوژمنایەتییان دەکات کە دەوروبەریان ڕووناك دەکاتەوە و، بەوەش تاریکی بەسەر چاوانی ئەواندا دەهێنێت.

پاشان دوای بیستنی هاوکاریی بوونەوەران لە دوژمنایەتی کردنی ئەواندا، زەینی بیسەر هاوار دەکات کە: "ئایا چارەنووسی حاڵی ئەوانە چییە؟ چ کارێك دەکەن؟ بە چییەوە سەرقاڵن"؟ بۆیە فەرمووی: ﴿كُلَّمَا أَضَاءَ لَهُمْ مَشَوْاْ فِيهِ وَإِذَا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُواْ﴾ ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە ئەوانە تابڵێی شپرزە و ڕاڕا و سەرسامن و، چاوەڕێی کەمترین هەل و دەرفەتن بەرپێی خۆیانی تێدا ببینن و ڕێی پێ دەربکەن. ئەوەتا هەر هێندەی ڕێیان لێ دەردەکەوێ یەکسەر دەکەونە ڕێ، بەڵام لەبەر شێواوی و چەواشەیی ڕۆحەکانیان، جووڵەیان وەکو هی جووڵەی "سەربڕاو" وایە و هەنگاوی کەم دەنێن، هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانن هیچ سوودێك لەو ڕۆشتنەدا نییە؛ هەر هێندەی کتوپڕ تاریکییان لێ دادێت لە شوێنی خۆیاندا وشك دەبن..

پاشان زەینی بیسەر ئامادەی ئەم پرسیارە دەبێت کە:

"ئەوان بۆچی نامرن؟ یاخود بە تەواوی "کوێر" یان "کەڕ" نابن، هەتا بە جارێ لەو شپرزەیی و چەواشەییە ڕزگاریان بێت"؟ بۆیە فەرمووی: ﴿وَلَوْ شَاءَ اللّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ﴾ واتە شایانی ڕزگاربوون نین لەو چەواشەیی و شپرزەییە، هەر لەبەر ئەوەیە کە ویستی خوای گەورە پەیوەندی ناکات بە مردنیانەوە، خۆ ئەگەر پەیوەندیی بکردایە ئەوا بە نەهێشتنی بیستن و بینینی ئەوانەوە دەیکرد..

بەڵام مانەوەی "بیستن" بۆ بە گوێدادانی تۆڵە و، بوونی "بینین"یش بۆ چاوپێکەوتنی سزا، شایانترە بۆ ئەو کەسەی کە لە یاسای خوای گەورە لایداوە و لاڕێی گرتووە.

پاشان لەبەر ئەوەی ئەم چیرۆکە چەند خاڵێکی لەوتۆی لەخۆ گرتووە کە لە پێچاوپێچەکانیدا - وەك درێژە پێدانێك - ئاماژە بۆ مەزنی و توانستی خوای گەورە و هەڵسوکەوتی دەکات لە بوونەوەراندا، بە تایبەت کە بیسەر بە ناڕاستەوخۆ لەناو

ثم لما سمعَ شدةَ الرعدِ يحدِّثُ نفسَه بـ"ألَا يفيدُهم البرقُ بإراءةِ الطريقِ"؟

فقال: ﴿يَكَادُ الْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَارَهُمْ﴾ مُشيراً إلى أنّه كما أنَّ الرعدَ يُعاديهم فلا يستطيعون السمعَ؛ كذلك البرقُ يُخاصمُهم بإضاءته فيُظلِمُ أبصارَهم..

ثم بعد سماع تجاوبِ الكائناتِ على عداوتهم يُنادي ذهنُ السامعِ بـ"فما مصيرُ حالهم وما يفعلون؟ وبِمَ يشتغلون"؟

فقال: ﴿كُلَّمَا أَضَاءَ لَهُمْ مَشَوْا فِيهِ وَإِذَا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا﴾ مشيراً إلى أنهم مشوَّشون متردِّدون متحيِّرون مترقِّبون لأدنى فرصَةٍ ولأدنى رؤيةٍ للطريق. فكلما تراءت لهم يتحرّكون، لكن كحركةِ المذبوحِ لاضطراب أرواحِهم، ويتخطَّوْن خُطى يسيرةً مع علمِهم بأنْ لا فائدةَ، وكلما غشيَتْهم الظلمةُ فجأةً ينجمدون في مقامهم..

ثم يستعدُّ ذهنُ السامع للاستفسار بـ"لِمَ لا يموتون أو يعْمَوْن أو يَصَمُّون بالمرّةِ فيخلُصون عن الاضطراب"؟

فقال: ﴿وَلَوْ شَاءَ اللهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ﴾ أي ليسوا مُستحقّين للخلاص من الاضطراب، ولهذا لا تتعلقُ المشيئةُ بإماتتهم، ولو تعلَّقتْ لتعلقتْ بذَهاب سمعِهم وبصرِهم.

ولكنَّ بقاءَ السمعِ لاستماع العقابِ ووجودَ البصر لرؤية العذابِ أجدرُ بمَن شذَّ ونشَزَ عن قانونه تعالى..

ثم إنَّ هذه القصةَ لما احتوتْ على نقاطٍ يتلوّحُ من معاطفها استطراداً: العظمةُ والقدرةُ الإلهيةُ وتصرّفُه تعالى في الكائنات، ولاسيّما يتذكَّرُ السامعُ تبَعاً في تلافيفها عجائبَ الرعدِ

پێچاوپێچی چیرۆكەكەدا كارە سەیر و سەرسوورهێنەكانی هەورە گرمە و هەورە بروسكەی بیر دەكەوێتەوە، ئەوا بیسەرێك كە ویژدانی بێدار بێت مافی خۆیەتی رایبگەیەنێت و بڵێت: "پاك و خاوێنی و بەرزی بۆ خوای گەورە. ماشەڵڵا توانستی ئەو كەسە چەندە مەزنە كە ئەم بوونەوەرانە درەوشانەوەی سام و شكۆ و، ئەم گیروگرفتانەش دەرخەری رق و تووڕەیی ئەون"! بۆیە فەرمووی: ﴿إِنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾.

سەبارەت بە هۆنینی روخسارە پێكهاتەی یەك بە یەكی رستەكانیشی، ئەوا بزانە كە:

﴿أَوْ﴾ی ﴿أَوْ كَصَيِّبٍ﴾ ئاماژەیە بۆ دابەشبوونی حاڵی "نموونە پێ هێنراو" بە دوو بەشەوە[1] و، هێماش دەكات بۆ هاتنەدیی پەیوەندی لە نێوان هەردوو نموونەكەدا لە لایەكەوە و، لە نێوان دوو نموونەكە و "نموونە بۆ هاتوو"شدا لە لایەكی دیكەوە و، ئاماژەیە بۆ سەلماویی لێكچوونەكەش.. هەروەها واتای "بَل"ی "تەرقیە"شی[2] لەخۆ گرتووە، چونكە نموونەی دووهەم لەوی پێشوو سامناكترە.

ئنجا لەبەر ئەوەی (وەك مەلزوومێك) ﴿كَصَيِّبٍ﴾ پراوپری "نموونە بۆ هاتوو" نییە، ئەوا پێویست بە تەقدیری "لازم"ێك دەبێت. بێدەنگ بوونیش لەو تەقدیر كراوە بە مەبەستی "كورتكردنەوە"(إيجاز)یە. كورتكردنەوەی "وشە"ش بۆ درێژەدانە بە "واتا"، ئەوەش بە ناردنی بۆ ئەندێشەی بیسەر دەبێت تاكو یارمەتی لە "مەقام"ەكە وەربگرێ بۆ زانینی ئەو تەقدیر كراوە.

جا بەم پراوپر نەبوونە، وەكو ئەوە وایە كە بڵێت:

"یان بە وێنەی ئەو كەسانەن كە لە بیابانێكی چۆڵ و شەوێكی تاریكدا سەفەریان كرد و، بە بارانێكی پڕ و بە خوڕ دووچاری گەلێ گرفت بوون".

---

(١) "أو"ی رستەی خەبەری لە بناغەدا یان بۆ "یەكسانیی گومان" لە نێوان دوو شتدا بەكاردێت، وەك: ﴿لَبِثْنَا يَوْماً أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾، یان بۆ دابەشكردن، وەك: "الكلمة إسم أو فعل أو حرف". بەڵام لێرەدا بۆ "یەكسانیی رەها" بەكارهاتووە و، مەبەستی لەوەیە كە حاڵی نموونە پێ هێنراو دوو بەشە بە یەكسانی، بە بێ بوونی گومان لە هیچ كامیاندا. (وەرگێڕ)

(٢) تەرقیە واتە: (بەرزكردنەوە). هەندێ جار "أو" واتای "بَل" لە خۆ دەگرێت، وەك لە كتێبەكانی نەحوودا هاتووە. بەكارهێنانی (بَل)یش لە نێوان دوو رستەدا، یان بۆ بەتاڵكردنەوەی بڕیاری رستەی یەكەمە، یان بۆ گواستنەوەیە لە باسێكەوە بۆ باسێكی تر. ئەو گواستنەوەیەش ئەگەر لە باسێكەوە بۆ باسێكی لەو بەرزتر بوو دەبێتە "تەرقیە". (وەرگێڕ)

والبرقِ والسحابِ، كان مِن حقِّ السامعِ المتيقظِ وجدانُه أنْ يُعلنَ ويقولَ: "سبحانه ما أعظمَ قدرةَ مَنْ هذه الكائناتُ تَجَلِّي هيبتِه، وهذه المصيباتُ تَجَلِّي غضبه"! فقال: ﴿إِنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾.

وأما نظمُ هيئاتِ جملةٍ جملةٍ:

فاعلم أنَّ ﴿أَوْ﴾ في ﴿أَوْ كَصَيِّبٍ﴾ إشارةٌ إلى انقسام حالِ الممثَّلِ إلى قسمين، ورمزٌ إلى تحقيق المناسبةِ بين التمثيلين وبينهما وبين الممثَّلِ له، وإيماءٌ إلى مسلَّميةِ المشابهةِ.. وأيضاً متضمِنٌ لـ"بل" التَرْقِيَة؛[1] إذ التمثيلُ الثاني أشدُّ هَوْلاً.

وأنَّ ﴿كَصَيِّبٍ﴾ لعدم مطابقتِه للمُمثَّل يقتضي تقديرَ لازمٍ، والسكوتُ عن إظهار المقدَّرِ للإيجاز، والإيجازُ في اللفظ لإطنابِ المعنى بإحالته على خيال السامعِ بالاستمداد من المقام..

فبعدم المطابقةِ كأنّه يقولُ:

أو كالذين سافروا في صحراءَ خاليةٍ وليلةٍ مظلِمةٍ فأصابتْهم مصائبُ بصيِّبٍ.

---

(١) أي التي تفيد معنى الترقي.

ئنجا بەکارهێنانی وشـەی "صَیِّب" (باران) لە بریی وشـەی "مطر" کە ئەوان لەگەڵی ڕاهاتوون و پێی ئاشنان، هێمایەکە بۆ ئەوەی کـە دڵۆپەکانی ئـەو بارانـە بـە وێنـەی تـیری موسیبەت بە ئەنقەست ئاراستەیان دەکرێت و دەیـانپێکێت، هاوکـات لەگـەڵ نـەبوونی شتێکی داپۆشەردا کە بیانپارێزێت.

وتنی ﴿مِنَ السَّمَاءِ﴾ لە کاتێکدا کە شتێکی بەڵگە نەویستە "باران" لەوێوە دێت، بـەو "تایبەتکردن"ە ئاماژە دەکات بۆ "گشتاندن"[1]. هـەروەها "پابـەندکردن"یشـی ئامـاژە بـۆ "ڕەهاکردن"ی دەکات[2]، بە وێنەی: ﴿وَمَا مِنْ دَآبَّـــةٍ فِـــي الأَرْضِ وَلاَ طَـــائِرٍ يَطِـــيرُ بِجَنَاحَيْـــهِ﴾ (الأنعـــام:٣٨). واتـە هـەورێکی سەرانسـەرییە و هـەموو ئاسـۆکانی ئاسمـانی گرتووەتەوە.

ئەوەش کە هەندێ لە تەفسیر نووسان لەم وشەی ﴿مِنَ السَّمَاءِ﴾ەی ئێرە و، لە ئایـەتی ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِن بَـــرَدٍ﴾دا (النور:٤٣) کردوویانـە بـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوەی کـە بـاران لـە تـەن و جەستەی "ئاسمـان"ەوە دەبـارێت، بـە ڕادەیـەك ئەندێشـەی هەندێکیان پێی وا بووە کە دەریایەك لە ژێر ئاسماندا هەیە، ئەو بۆچوونەی ئەوان، ڕوانینی "ڕەوانبێژی" مۆر و سکەی حەقیقەتی بەسەرەوە نابینێت! بەڵکو واتاکـەی ئەوەیـە کـە لـە لای ئاسمانەوەی دەبارێت.

"پابەندکردن"ی بارینی "باران"یش بە وشەی ﴿مِنَ السَّمَاءِ﴾ لەبەر ئەوەیە کە زانیت.

خۆ وتراویشە: "السـماء مـا عـلاك." (ئاسمـان ئەوەیـە کـە لـە لای سـەرووتەوە بێـت). کەواتە هەوریش بە وێنەی هەوا ئاسمانێکە.

ساغکردنەوەی ئەم مەقامەش بەم جۆرەیە:

ئەگەر تۆ بڕوانیتە "توانستی خوای گەورە" ئەوا هەر شـەش لاکـەی بـەلاوە یەکسـانە، واتە دەگونجێ لـە هـەر لایەکـەوە بـاران ببـارێت. بـەڵام ئەگـەر بڕوانیتـە "دانستی خـوای

---

(١) واتە: تایبەتکردنی لای ئاسمان بۆ بارینی باران، بەو مەبەسـتەیە کە هـەرچی بارانـە بەگشتی لـەو لایەنەوە دێت. (وەرگێڕ)

(٢) واتە: پابەند کردنی هاتنی باران تەنـها لـە ئاسمانـەوە ئاماژەیە بۆ ڕەهـایی هـاتنی بـاران لـەوێوە. بـە وێنـەی: ﴿وَمَا مِنْ دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ﴾ چونکە پابەندکردنی "دابة" بە "الأرض"ەوە بـۆ ڕەهاییـە، واتە هەرچی "دابة"یە هەر لەسەر زەویدایە. هەروەها تایبەت کردنی "طائر" بە "يَطِيرُ بِجَنَاحَيْـــهِ" بۆ ڕەهاییـە، چونکە هەرچی "طائر"ە هەر بە دوو باڵەکەی دەفڕێت. (وەرگێڕ)

وأنَّ العدولَ عن لفظ المطرِ المأنوسِ المألوفِ إلى الصيِّبِ رمزٌ إلى أنَّ قطراتِ ذلك المطرِ كمصائبَ تُرمَى إليهم بقصدٍ فتصيبُهم مع فقدِ الساترِ عليهم.

وأنَّ ذِكْرَ ﴿مِنَ السَّمَاءِ﴾ مع بداهةِ أنَّ المطرَ لا يجيءُ إلّا مِن جهتِها، إيماءٌ بالتخصيص إلى التعميم، وبالتقييد إلى الإطلاق نظيرَ التقييدِ في ﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ﴾ (الأنعام:٣٨) أي مُطبِقٌ آخذٌ بآفاق السماءِ.

وما استدلَّ بعضُ المفسرين بلفظ ﴿مِنَ السَّمَاءِ﴾ هنا وفي آيةِ ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ جِبَالٍ فِيهَا مِنْ بَرَدٍ﴾ (النور:٤٣) على نزول المطرِ من جِرمِ السماءِ حتى تَخَيَّلَ "بعضٌ" وجودَ بحرٍ تحت السماءِ، فنظرُ البلاغةِ لا يرى عليه سكةَ الحقيقةِ. بل المعنى: من جهةِ السماءِ، والتقييدُ لَمّا عرفت.

وقد قيل: السماءُ ما علاك. فالسحابُ كالهواء سماءٌ.

وتحقيقُ المقامِ:

هو أنّك إنْ نظرتَ إلى القدرة، تتساوى الجهاتُ، أي يمكنُ النـزولُ من أية جهةٍ كانتْ..

گەورە" کە دامەزرێنەی جوانترین ڕێسایە لە شتەکاندا، کە ئەویش داخوازی هاوسەنگی گشتییە، کە ئەویش نزیکترین هۆکار هەڵدەبژێرێت، ئەوا (دەزانرێت) کە باران هی چڕبوونەوەی ئەو هەڵمە ئاوەیە کە لە گۆی هەوادا بڵاو بووەتەوە، ئەو هەوایەی کە یەك لە دەی بەشەکانی بریتییە لەو هەڵمە ئاوییەی لە ناخیدا پەرش و بڵاوە.

ڕوونکردنەوەی ئەمەش بەم جۆرەیە:

گەردیلەکانی ئەو هەڵمە ئاوە، ئەگەر "ویستی خوای گەورە" فەرمانیان پێ بدات، ئەوا هەموو یەکێکیان بەرجەستە دەبێت و لە کەنارەکانەوە دزە دەکەن و لە هەموو ڕێیەکی دوورەوە دێن و لە شێوەی هەورێکی بە بارشدا یەکدەگرن. پاشان بە ویستی فەرماندەکەیان چڕیی هەندێکیان زیاد دەکات هەتا دەبنە چەند دڵۆپێك، ئنجا ئەو مەلائیکەتانەی کە جێبەجێکاری یاساکان و دەرخەری ڕێساکانن، دەستیان دەگرن، تاکو دڵۆپەکانی پاڵپاڵێن نەکەن و بەر یەکتر نەکەون، هەتا لەسەر زەوی دایاندەنێن..

پاشان لەبەر ڕاگرتنی هاوسەنگی لە بۆشاییدا، پێویست بە هەڵمی تر دەکات جێی ئەوانە بگرنەوە کە بە دڵۆپاندنیان شی دەبنەوە. بۆیە لە دەریا و وشکایی زەوییەوە هەڵمەکان پێکدێنەوە و جێگاکانیان پڕ دەکەنەوە.

بۆچوونی ئەندێشەیی ئەو هەندە کەسەش کە گوایا دەریایەکی ئاسمانی هەبێت، هی ئەوەیە کە "مەجاز"ی بە "حەقیقەت" وەرگرتووە، چونکە لەبەر ئەوەی "شینیی" ئاسمان ڕەنگی دەریا پیشان دەدات و، لەبەر ئاو لەخۆ گرتنی بۆشایی ئاسمانیش زیاد لە ئاوی زەریا، ئەوا تەشبیهـ کردنی بۆشایی ئاسمان بە "دەریا" بە دوور نەزانراوە.

سەبارەت بە ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ جِبَالٍ فِيهَا مِنْ بَرَدٍ﴾یش ئەوا بزانە کە:

لەو کاتەدا کە ئیستیعارەی ئەم ئایەتە بە وێنەی ئاگری داگیرساو ڕووناکی پەخش دەکات، کەچی "چەق بەستن"ی تێگەشتن لەسەر ڕواڵەتەکەی، لە ڕاستیدا چەق بەستنێکی سارد و سڕ و، کپ بوونەوەیەکی ئاشکرایە. چونکە هەروەك ﴿قَوَارِيرَ مِن فِضَّةٍ﴾ (الإنسان: ١٦) ئیستیعارەیەکی ناوازەی لەخۆگرتووە، بە هەمان جۆر ﴿مِنْ جِبَالٍ فِيهَا مِنْ بَرَدٍ﴾یش ئیستیعارەیەکی ناوازە و سەرسووڕهێن و جوانی تێدایە..

ئەوەتا هەروەك دەفرەکانی بەهەشت نە لە "شووشە" و نە لە "زیو"ن، بەڵکو لە ڕوونیی شووشە و سپێتیی زیودان، هەروەها لەو ڕووەشەوە کە شووشە لە زیو نابێت،

وإنْ نظرتَ إلى الحكمة الإلهيةِ المؤسِّسةِ للنظام الأحسنِ في الأشياء المستلزِمِ لمحافظة الموازنةِ العموميةِ المرجِّحةِ لأقرب الوسائلِ، فالمطرُ إنما هو من تكاثُفِ البُخارِ المائيِّ المنتشِرِ في كرة الهواءِ التي أحدُ أجزائِها العشرةِ ذلك البخارُ المائيُّ المنتشرُ في أعماقها.

وتوضيحُه: أنَّ ذراتِه إذا أمرَتْها الإرادةُ الإلهيةُ، يتمثّلْ كلٌّ، ويتسللْنَ من الأطراف، ومن كُلِّ فجٍّ عميق. فيتحزَّبْنَ سحاباً هامِراً. ثم بإرادةِ آمرِها يشتدُّ تكاثُفُ بعضٍ فتصيرُ قطراتٍ تأخذُها بأيديهم الملائكةُ الذين هم ممثلو القوانين ومَعكَسُ النظاماتِ، لئلّا يزاحِمَ ويصادمَ بعضٌ بعضاً، فيضعوها على الأرض. ولأجْلِ محافظةِ الموازنةِ في الجوِّ لابدَّ من بَدَلِ ما يتحلّلُ بالتقَطُّر، فيُبخِّرُ البحرُ والأرضُ فيملأُ منازلَها.

وأما تخيُّلُ بعضٍ وجودَ بحرٍ سماويٍّ فمَحْمِلُه أنه تَصورَ المجازَ حقيقةً؛ إذ لإراءة خُضرةِ الجوِّ[1] لونَ البحر، ولاحتواءِ الجوِّ على ماءٍ أكثرَ من البحر المحيطِ، ما استُبعِد تشبيهُه بالبحر.

أما ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ جِبَالٍ فِيهَا مِنْ بَرَدٍ﴾ فاعلم أنَّ الجمودَ على الظاهر مع التوقُّدِ في استعارتها جمودٌ باردٌ وخمودٌ ظاهر. إذ كما تَضمَّنَ: ﴿قَوَارِيرَ مِنْ فِضَّةٍ﴾ (الإنسان: ١٦) استعارةً بديعةً؛ كذلك يحتوي ﴿مِنْ جِبَالٍ فِيهَا مِنْ بَرَدٍ﴾ على استعارةٍ بديعةٍ عجيبةٍ مستملَحَةٍ. فكما أنَّ ظروفَ الجنة لم تكنْ مِن الزجاجةِ ولا مِن الفضة بل في شفافية الزجاجِ وبياضِ الفضةِ، ومن حيث إنَّ الزجاجةَ لا تكونُ من الفضة لتخالُفِ النوعين أشار إلى

---

(١) الخَضْراءُ: السماء لخُضْرَتِها؛ صفة غلبت غَلَبَةَ الأَسماء. وفي الحديث: "ما أظَلَّتِ الخَضراءُ ولا أقَلَّتِ الغَبْراءُ أصْدَقَ لَهْجَةً من أبي ذَرٍّ"؛ الخَضْراءُ: السماء، والغبراء: الأرض. (لسان العرب)

لەبەر جیاوازیی جۆرەکانیان، ئەوا بە "ئیزافە کردن" ئاماژەی بۆ ئیستیعارەکە کرد بەهۆی هێنانی وشەی ﴿مِنْ﴾[1]ەوە..

هەر بە وێنەی ئەمە ﴿مِنْ جِبَالٍ فِيهَا مِنْ بَرَدٍ﴾یش دوو ئیستیعارەی لەخۆ گرتووە، کە بە پێی ڕوانینی بیسەر لەسەر بناغەی ئەندێشەیەکی شیعری دامەزراون..

ئەو ئەندێشەیەش لەسەر تێبینی کردنی لێکچوون و هاوشێوەیی دامەزراوە لە نێوان بەرجەستە بوونی جیهانی بالاّ و پێکهاتنی جیهانی خوارەوە..

ئەو تێبینی‌یەش لەسەر وێناکردنی پێشبڕکێ و ئێرەییەك دامەزراوە لە نێوان زەوی و بۆشایی ئاسماندا، لەوەدا هەردووکیان وێنەکان لە دەستی توانستی خوای گەورە وەردەگرن و بە بەری خۆیانی دەپۆشن، دەڵێی کاتێ زەوی بە چیا سپی پۆشەکانی خۆی لە پۆشاکی بەفر و تەرزەی زستاندا و، بە لەسەر کردنی مێزەری ئەم دوو سپی‌یەش لە بەهاردا پێش چاو کەوت و، پاشان لە هاوینیشدا بە بێستانە ڕەنگا و ڕەنگەکانی، خۆی ڕازاندەوە و، بە ئاڵوگۆڕەکانیش موعجیزەی "توانستی خوای گەورە"ی لە پێش چاوی "دانست"دا دەرخست..

لەم کاتەدا، بەرزایی ئاسمانیش لە بەرامبەریەوە، لاسایی کردەوە و، بە مەبەستی پیشاندانی موعجیزەی مەزنیی خوای گەورە، کەوتە کێبڕکێ لە گەڵیدا. بۆیە لە پەچە و کراسی هەورە پەرت بووەکاندا پێش چاو کەوت کە لە شێوەی چیا و شاخ و شیو و دۆڵەکاندان و، بە چەندین ڕەنگی جۆراوجۆر دەرکەوتن و، بەوەش وێنەی باخ و بێستانەکانی زەوی‌یان گرت. ئیتر بەم جۆرە، ئەو بۆشاییەی ئاسمان، ئاماژەی بە ڕوونترین و مەزنترینی بەڵگەکانی گەورەیی خوای بالاّ دەست دا.

جا لەسەر بناغەی ئەم بینین و لێکچوون و وەهمە ئەندێشەییە، شێوازی عەرەب چواندنی هەوریان، بە تایبەت هەوری هاوینیان، بە چیا و کەشتی و باخ و شیو و دۆڵ و کاروانی حوشتر، بە لاوە تەشبیهێکی جوان بووە، وەك ئەوەی لە وتارەکانیاندا دەیبیستیت..

---

(١) ئیزافە کردنی ئیسمێك بۆ لای ئیسمێکی تر، دەبێ واتای یەکێك لەم حەرفە جەرڕانەی تێدا بێت: "مِن، فِي، اللام". جا ئەگەر موزاف ئیلەیهی ڕەگەزی موزافەکە بوو، ئەوا لە واتای "مِن"دایە. بەلاّم لێرەدا بە شێوەی ئیستیعارە هاتووە و "مِن"ەکە حەزف نەکراوە، وەك ئیدیعایەك شووشەکە لە زیو بێت و چیاکەش لە تەرزە. بەو شێوە ڕەوانبێژی‌یەی کە دانەر لە دەقەکەدا ڕوونی کردووەتەوە. (وەرگێڕ)

الاستعارة بالإضافة بذكرِ ﴿مِنْ﴾، كذلك ﴿مِنْ جِبَالٍ فِيهَا مِنْ بَرَدٍ﴾ مُتضمِّنةٌ لاستعارتين مؤسَّستين على خيالٍ شعريٍّ بالنظر إلى السامع.

وذلك الخيالُ مبنيٌّ على ملاحظة المشابهةِ والمماثلةِ بين تمثُّلِ العالمِ العُلويِّ وتشكُّلِ العالم السفليّ..

وتلك الملاحظةُ مبنيةٌ على تصوُّر المسابقةِ والرقابةِ بين الأرضِ والجوِّ في لبس الصُّوَرِ من يد القدرةِ، كأنَّ الأرضَ لما برزتْ بجبالها اللابسةِ للبيض من حُلل الثلجِ والبَرَدِ في الشتاء، والمتعمِّمَةِ بها في الربيع. ثم تزيّنتْ في الصيف ببساتينها المتلونةِ فأظهرَتْ في نظر الحكمةِ بانقلاباتها معجزةَ القدرةِ الإلهية..

قابلَها جوُّ السماءِ محاكياً لها مسابِقاً معها لإظهار معجزةِ العظمةِ الإلهية فبرز مُتَبَرْقِعاً ومُتَقَمِّصاً بالسحاب المتقطعِ جبالاً وأطواداً وأوديةً، والمتلوِّنِ بألوان مختلفةٍ مصوِّرةٍ لبساتين الأرضِ، ملوِّحاً ذلك الجوُّ بأجْلى دلائلِ العظمةِ وأجلِّها.

فبناءً على هذه الرؤيةِ والمشابهةِ والتوهُّمِ الخياليِّ، استَحسنَ أسلوبُ العرب تشبيهَ السحابِ لاسيما الصيفيِّ بالجبال والسُّفُنِ والبساتينِ والأوديةِ وقافلةِ الإبلِ كما تسمعُ من العرب في خُطَبِهم..

ئیتر لـه دیـدی ڕەوانبێژیـدا، ئەندێشـەی مـرۆڤ پارچـەكانی هـەوری هاوینـە بـە كاروانێكی گەڕۆك و مەلـەوانێك دەبینێـت لـە بـەرزاییدا، تەنانـەت دەڵێی هـەورە گرمـە بووەتە شوان و سەرقافڵەی ئەو كاروانە و، هـەر كـات گزچانی هـەورە بروسـكەی لـەو دەریا هەواییە گشتگیرە ڕاوەشاند ئـەوا یەكسـەر ئـەو پارچـە هەورانـە دەكەونـە لـەرزە و جووڵە و، بە وێنەی چەند شاخێك دەردەكەون كە ڕووبەڕووی حەشر بووبێتنەوە، یان بە وێنـەی چـەند كەشتیەك دەستی زریـان یاریـان پـێ بكـات، یـاخود چـەند بـاخێك بوومەلەرزە لە ژێرەوە جۆلانێی پێ بكات، یان كاروانێك لە هێرشی چەتە هەڵهاتبێ..

لەگەڵ ئەوەشـدا، هـەموویان بـە فـەرمانی بەدیهێنەرەكەیان دێـن و دەڕۆن، تەنانـەت دەڵێی هەموو دانەیەكی گەردیلـەكانی ئـەو هەڵمـە لـە شـوێنی خۆیـدا یەكـەم جـار خۆی حەشارداوە و بە بێدەنگی و كش و ماتی چاوەڕێی فـەرمانی بەدیهێنـەری كـردووە. بـەڵام هەر هێندەی هەورە بروسـكە - بـە وێنـەی ئـامێری شـەیپووری سـەربازی - بـە فـەرمانی: "وەرن كـۆببنەوە و یـەك بگـرن" بـانگی لـێ كـردن، ئـەوا بـە خـێرایی لـە ماڵـەكانیان هاتنەدەر و بە هەڵەداوان بەدەم بانگەوازكاریانەوە ڕۆشـتن. ئیتر دوای ئـەوە، لـە شێوەی هـەوردا كۆدەبنـەوە. ئنجا پاش ئەنجامدانی ئـەركی سەرشـانیان و وەرگرتنـی فـەرمانی "پشوو وەرگرتن"، هەریەكەیان بەرەو لانەی خۆی دەفڕێت و دەگەڕێتەوە.

جا لەسەر بناغەی ئەم پەیوەندییە ئەندێشەییە و..

لەبەر هاوسێیەتیی هـەور و چیـا، چونكـە چیـا بـۆ بەدەستهێنانی "شـێ" خـۆی لـەو دەردەخـات و، هـەوریش بـە ئـەندازەی ئـەو لەسـەری پێكدێـت و پۆشـاكی ئـەو لەبـەر دەكات..

هەروەها لەسـەر بناغـەی ڕەنگگرتنـی هـەور بـە هاوشێوەی سپێتیی بـەفر و تـەرزە و، خۆگونجاندن و ڕاهاتنی بە شێ و سەرمای هەردوو كیان..

هەروەها لەسەر بناغەی بوونی برایەتی و، گۆڕینەوەی شێوە و پۆشاك لە نێوانیاندا و، تەوقەكردنیان لە زۆر شوێنی قورئانی پیرۆزدا، كتومت بە وێنەی گفتوگۆی نێوانیان و لە ئامێز گرتنی یەكتری لەگەڵێ دێری لاپەڕەی زەویی كتێبی جیهاندا، دەبینی هـەور لەسـەر چیا جێگیرە و، چیاش دەڵێی بەندەرێكە بۆ لەنگـەرگرتنی كەشتیی هـەور لەسـەری، یـان ئەنجومەنێكە هەورەكان ڕاوێژی لەسەر دەكەن، یاخود هێلانەیەكە بەرەو ڕووی دەفڕن..

فيُخيَّلُ إلى نظر البلاغةِ أنَّ قطعاتِ السحابِ الصيفيِّ سيارةٌ وسبّاحةٌ في الجوِّ، كأنَّ الرعدَ راعيها وحاديها كلما هزّ عصا بَرقِه على رؤوسهم في البحر المحيطِ الهوائيِّ اهتزتْ تلك القطعاتُ وارتجّتْ، وتراءَتْ جبالاً صادفت الحشرَ، أو سُفناً يلعبُ بها يدُ العاصفةِ، أو بساتينَ ترجُّجُها من تحتها الزلزلةُ، أو قافلةً شردتْ من هجوم قُطّاعِ الطريق..

ومع ذلك يسيرون ويجرُون بأمر خالقِهم حتى كأنَّ كلَّ ذرةٍ من ذرات ذلك البخارِ تكمَّنتْ في مكانها أوّلاً ساكتةً ساكنةً منتظرةً لأمر خالقِها. ولما ناداها الرعدُ - كالآلة المعروفةِ في العسكر - بـ"حَيَّ على الاجتماع والاتحاد!" تسارَعوا من منازلهم مُهطعين إلى داعيهم فيُحشَرون سحاباً. ثم بعد إيفاءِ الوظيفةِ وأمرِهم بالاستراحة يطيرُ كلٌّ إلى وَكْرِه..

فبناءً على هذه المناسبةِ الخياليةِ، وعلى المجاورة بين السحابِ والجبالِ - إذ الجبلُ لجذب الرطوبةِ يتظاهرُ ويتشكّلُ السحابُ عليه بمقداره ويلبسُ لباسَه - وعلى تلوُّنِ السحابِ بنظير بياضِ الثلجِ والبَردِ وتكيُّفِه برطوبتهما وبرودتهما، وعلى وجود الأخوَّةِ بينهما ومبادلةِ الصورةِ واللباسِ لهما في كثير من مواضع القرآنِ ومصافحتِهما في منازل التنـزيلِ كمحاورتهما ومعانقتِهما في كثير من سطور صحيفةِ الأرضِ مِن كتاب العالَم، فترى السحابَ متوضّعاً على الجبل ويصيرُ الجبلُ كأنّه مرسىً لسُفن السحابِ تُرسَى عليه، أو مجلسٌ تتشاوَرُ عليه، أو وَكْرٌ تطيرُ اليه..

لەسەر بناغەی هەموو ئەمانە و، بە حوکمی هاوسێیەتی، ئەوا لـە ڕوانینی ڕەوانبێژیـدا شـایانی ئەوەیە کـە ئـەم دووانـە پێداویستی‌یەکانیان لـە نێـوان خۆیـاندا بگۆڕنـەوە و بـە ئەمانـەت لـە یـەکتری بخـوازن و، بـە وشـەی "چیـا" گـوزارشـت لـە "هـەور" بکرێـت، هاوکات لەگەڵ لەبیربردنەوەی تەشبیهەکەدا.

جا ئەگەر ئەم پەیوەندی‌یانەی کـە بیستت، هـەموویانت زانـی، ئـەوا ﴿وَيُـنَزِّلُ مِـنَ السَّمَاءِ﴾ واتە لە لای ئاسمانەوە. ﴿مِن جِبَالٍ﴾ واتە چـەند هـەورێکی وەك چیاکـان. ﴿مِنْ بَرَدٍ﴾یش واتە لە ڕەنگ و شێ و ساردیی تەرزەدا!

دەسا کاکە! لەگـەڵ بوونـی ئـەم تەئویلـەدا کـە "ڕەوانبێـژی" قبووڵـی دەکـات، چـی ناچاری ئەو باوەڕەی کردوویت کە باران بە ماوەی دوو خولەك لە دووریـی "پێنـج سـەد ساڵ ڕێ"وە بێت و ببارێت، کە ئەو باوەڕەش پێچەوانەی دانستی ئەو خواوەندە گەورەیە کە هەموو شتێکی بە وردەکاری دروست کردووە؟!

سەبارەت بە ڕوخساری ڕستەی ﴿فِيهِ ظُلُمَاتٌ﴾یش، کە بۆ "بەسامی" هێنراوە، ئەوا:

پێشخسـتنی ﴿فِيــهِ﴾ ئاماژەیەکە بۆ ئـەوەی کـە ئەندێشـەی ئـەو کەسـە گـیرۆدە سەرسـامە و، هـی ئـەو بیسـەرەش کـە ئـەو حاڵەتـەی لـە ئەندێشـەدا ئامادەیـە، وا گومـان دەبات کە تاریکایی چەندین شەوی زۆر، بە تەواوی، لەو شەوەدا ڕۆکراوە!

"زەرف بوون"یشی، لە کاتێکدا کە ﴿صَيِّبٍ﴾ خۆی "مەزرووف"(ناواخنی دەفر)ە، هێمایەکە بۆ ئەوەی کـە مرۆڤـی حەپەسـاو بـەو موسیبەتە، گومـانی وایـە بۆشـایی جیـهان گۆمێکی پڕ لە بارانە و، شەویش تەنها ناواخنێکی کەرت و پـەرت بـووی نێـوان لاکـانی ئەو گۆمە پڕ لە بارانەیە.

هێنانی ﴿ظُلُمَاتٌ﴾یش بە شێوەی "کۆ" هێمایە بۆ جۆراوجۆری "تاریکی‌یـەکان" کـە پێکهاتوون لـە تـاریکیی ڕەشـی و چـڕی و پڕاوپڕیی هەورەکە و، لێـك نزیکیی جـار لـە دوای جاری بارانەکە و چڕیی دڵۆپەکانی و، دووچەندانە بوونی تاریکیی شەو.

بە نـەکیرە کردنی ﴿ظُلُمَــاتٌ﴾یش بۆ دەربڕینی ناڕەزاییـە لـە کارەکـەیان و، لەبـەر نەزانینی ئەو تاریکی‌یانەیە لای کەسی قسەبۆکراو، کەواتە جەختە بۆ ﴿ظُلُمَاتٌ﴾ی (دوو ئایەتی پێشتر).

سەبارەت بە ڕستەی ﴿وَرَعْدٌ وَبَـــرْقٌ﴾یـش، ئـەوا بزانـە کـە: مەبەسـت وێنەکێشـانی سەرسامی و حەپەساویی ئەوانە و، بۆ دەرخستنی ئەوەشە کـە کەسـی گـیرۆدە و سەرسـام هەموو وردبینی و تیڕوانینێکی خۆی بۆ بچووکترین ڕووداو ئاراستە دەکات..

استحقَّ بحُكمِ المجاورةِ في نظر البلاغةِ أنْ يتبادلا ويستعيرا لوازمَهما فيعبّرَ عن السحاب بالجبَلِ مع تناسي التشبيه.

فإذا قد عرفتَ ما سمعتَ من المناسبات فـ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ﴾ أيْ مِن جهةِ السماءِ. ﴿مِنْ جِبَالٍ﴾ أي من سحابٍ كالجبال. ﴿مِنْ بَرَدٍ﴾ أي في لونه ورطوبتِه وبرودتِه.

فيا هذا! ما أجْبَرَكَ مع وجودِ هذا التأويلِ الذي تقبلُه البلاغةُ على اعتقادِ نزولِ المطرِ بدقيقتين من مسافةِ خمسِ مائةِ سنةِ المخالفِ لحكمة الله الذي أتقنَ كُلَّ شيءٍ صُنعاً.

أما هيئاتُ جملةِ ﴿فِيهِ ظُلُمَاتٌ﴾ المسوقةِ للتهويل..

فتقديمُ ﴿فِيهِ﴾ إشارةٌ إلى أنَّ خيالَ المصابِ المدهوشِ والسامعِ المستحضِرِ خيالَه لتلك الحالِ يتوهَّمُ أنَّ ظلماتِ الليالي الكثيرةِ أُفرغَتْ بتمامها في تلك الليلةِ.

وأما الظرفيةُ مع أنَّ الصيِّبَ مظروفٌ فرمزٌ إلى أنَّ المتدهِّشَ بتلك المصيبةِ يظنُّ فضاءَ العالمِ حَوضاً قد مُلئَ من المطر، فما الليلُ إلا مظروفٌ مُفتَّتٌ بين أجزائِه.

وأما جمعُ الـ﴿ظُلُمَات﴾ فإيماءٌ إلى تنوُّعِها مِن ظلمة سوادِ السحابِ وكثافتِه وانطباقِه، ومن تقارُبِ دفَعاتِ المطرِ وتكاثُفِ قَطْره، ومن تضاعُفِ ظلمةِ الليل.

وأما تنكيرُ ﴿ظُلُمَاتٌ﴾ فللاستنكار ولجهل المخاطَبِ، فهو تأكيدُ ﴿ظُلُمَاتٍ﴾.

وأما جملةُ ﴿وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ﴾ فاعلم أنَّ المقصدَ تصويرُ حَيرتِهم ودهشتِهم، وأنَّ المصابَ المتحيرَ يجمعُ تمام دقتِه ونظرِه إلى أدنى حادثٍ..

جا لەبەر وردڕووانینیان، هەست بەو ئاڵوگۆڕە سەیر و سەمەرە و نامۆیانە دەکەن کە لە دووتوێی گرمە و بروسکەی هەوردا هەیە. چونکە ئەو گیرۆدەبووانە لەو کاتەدا کە دەبینن تاریکی‌یەك باڵی بەسەر هەموو لایەکدا کێشاوە و ئەو بوونەوەرانەی هەڵلووشیوە کە بە وێنەی "نەبوو"یان لێ هاتووە و، ئیتر سەرسامی‌یەکەیان دەبێتە خەمێکی هەتیوانە و بێدەنگی‌یەکی مردووانە.. لەم کاتەدا، دیارترین بەڵگەکانی "بوون" دەبینن کە ئاخاوتنی بوونەوەرە باڵاکانە..

پاشان بە هۆی لادانی پەردەی تاریکی، ئەو بوونەوەرە باڵایانەیان لێ دەردەکەوێت. ئیتر ڕوانینەکەیان دەبێت بە ڕوانینی کەسێکی حەپەساوی سەرسامی ترساو، چونکە هەروەك ئەوان چەندین تاریکیی بێ سنووریان لە بۆشاییەکی ناکۆتادا بینی، کە لە هیچ لایەکەوە لاوازیی تێدا نەبوو هەتا هیوایەکیان بۆ بهێڵێتەوە و، بە چاوی نائومێدی‌یەوە دەیانڕوانی.. لەو کاتەدا، کتوپڕ تاریکایی نەما و بۆشایی ئاسمانی لێ خاڵی کرایەوە و، لە بریی ئەو تاریکاییە پڕ کرا لە ڕووناکی.. لەم کاتەدا نائومێدی‌یە ڕەهاکەیان گۆڕا بە هیوا و ئومێد.

بزانە کە هەورە گرمە و بروسکە، دوو نیشانەی ئاشکرای دەسەڵاتی خوای گەورەن، لە لای جیهانی غەیبەوە بە دەست ئەو مەلائیکەتانەوەن کە سەرپەرشتیاری جیهانی هەوریان، بۆ ڕێکخستنی یاساکانی، پێ سپێرراوە.

پاشان "دانست"ی خوای گەورە "هۆکارەکان"ی پەیوەست کردووە بە "بەهۆکراوەکان"ەوە. جا هەر کات لە هەڵمی ئاوی پەرت و بڵاوی ناو هەوا "هەور" پێکهات، ئەوا هەندێکیان بارگەی "سالب" و هەندێکی تریان بارگەی "موجەب"ی کارەبا لەگەڵ خۆدا هەڵدەگرێت. ئنجا کاتێ ئەو دوو بارگەیە لە یەکتر نزیك دەبنەوە، کتوپڕ بەر یەك دەکەون و، "بروسکە"ی هەوری لێ پێکدێت..

ئنجا بە هێرش بردن و گەڕانەوەی کتوپڕی و، پڕبوونەوەی شوێنەکەی بە هی تر - لەبەر نەبوونی چۆڵایی - هەورەکە هەڵدەبەزێتەوە و چینەکان شەپۆل دەدەن و زایەڵەی "گرمەی هەور" دروست دەبێت. ئەم حاڵەتانەش تەنها لە ژێر چاودێریی ڕێسا و یاسایەکدایە کە مەلائیکەتی سەرپەرشتیاری هەورە گرمە و بروسکە نوێنەرایەتی‌یان دەکات.

فلإمعانِ النظرِ يتفطنون لما في الرعدِ والبرقِ من الانقلابات العجيبةِ والتحوُّلِ الغريبِ.

إذ بينما يرى المصابون ظلمةً استولتْ على الكائناتِ وابتلعت الموجوداتِ - نظيرَ العدم - فتنقلبُ حيرتُهم بالغمِّ اليُتْمِيِّ والسكوتِ الميتيِّ؛ إذ يروْنَ أظهرَ دلائلِ الوجودِ، وهو تكلُّمُ العُلوياتِ، ثم ظهورُها بكشفِ الحجابِ، فينقلبُ نظرُهم إلى نظرِ المدهوشِ المتحيِّرِ الخائفِ؛ إذ كما أنهم إذا رأوا ظلماتٍ غيرَ محصورةٍ في فضاء غيرِ متناهٍ، لا ضعفَ [فيه] بجانبٍ يُبقي لهم أملاً، ينظرون نظرَ اليأسِ؛ كذلك إذا فاجَأهم بغتةً انعدامُ الظلماتِ بأنْ أُفرِغَتْ من الفضاء، ومُلئَ بدلها نوراً، ينقلبُ يأسهُم المطلقُ إلى رجاء.

اعلم أنَّ الرعدَ والبرقَ آيتان ظاهرتان من جهة العالمِ الغيبيِّ في أيدي الملائكةِ الموكَّلين على عالم السحابِ لتنظيم قوانينه.

ثم إنَّ الحكمةَ الإلهيةَ ربطت الأسبابَ بالمسَّبَبَاتِ فإذا تشكَّلَ السحابُ من بُخار الماءِ المنتشِرِ في الهواء؛ صار قسمٌ حاملاً "للألكتريق" المنفي وقسمٌ حاملاً "للألكتريق" المثبَتِ؛ فحينما يتقاربان يتصادمان دفعةً فيتولَّدُ البرقُ.

ثم بالهجوم والانقلاع دفعةً وامتلاءِ موضعِه بآخَرَ لعدم الخلوِّ، يهتزُّ وتتموَّجُ الطبقاتُ فيتولّدُ صدى الرعدِ. ولا تجري هذه الحالاتُ إلا تحت نظامٍ وقانونٍ يتمثلُّها مَلَكُ الرَّعدِ والبرقِ.

"دەفر بوون"ی بارانەكەش بۆ گرمە و بروسكەكە، لە كاتێكدا كە "دەفر"ی ئەوان هەورەكەیە، هی ئەوەیە كە مرۆڤی سەرسامی ئەو حاڵە و بیسەری حەپەساو، لەبەر ئەوەی بارانەكە دەوراندەوری خۆی گرتووە، سەرسامییەكەیان وایان لێ دەكات كە بارانەكە وا ببینن دەوراندەوری هەموو شتێكی دیكەشی دابێت.

هێنانی هەردوو وشەی ﴿رَعْدٌ﴾ و ﴿بَرْقٌ﴾ بە "تاك" لەكاتێكدا كە ﴿ظُلُمَاتٌ﴾ بە "كۆ" هێنراوە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە سەرهەڵدانی "سەرسامی"یەكە هی ئەوەیە "ئەندێشە"ی كەسی گیرۆدەبوو "قسە كردنی ئاسمان و هەڕەشە لێكردنی بە هەور"و، "لادانی پەردەی تاریكی"ی لەم دیاردەیەدا بۆ وێنا دەكات. خۆ ئەم دووانەش[1] "واتای مەصدەری"ن[2]، نەك خودی "قسەكە" و "دەستە سپییەكە"ی[3] ئەو. هەروەها هەریەك لەم دووانە، یەك "جۆر"ن، هەرچەندەش تاكەكانیان زۆر بن.

تەنوینی ﴿وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ﴾یش، لە بریی سیفەتەكەیان هێنراون، واتە "رعدٌ قاصفٌ" (هەورە گرمەیەكی تێك شكێنەر) و، "برقٌ خاطِفٌ" (هەورە بروسكەیەكی شەوارەخەر). هەروەها ئەو تەنوینە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە لەگەڵ ئەو دووانەدا ڕانەهاتوون، بە هۆی پەی بردنیان بەو شتە سەرسووڕهێنەرانەی كە لەو دووانەدا هەیە[4]. هەروەها ئاماژەیەكیشی تێدایە بۆ ئەوەی كە لەبەر ئاخنینی گوێ و نووقاندنی چاو، بەو هەورە گرمە و بروسكەیە ئاشنا نین.

سەبارەت بە ڕوخساری پێكهێنەری ڕستەی ﴿يَجْعَلُونَ أَصَابِعَهُمْ فِي ءاذَانِهِمْ مِنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ﴾یش، ئەوا بزانە كە ئەم ڕستەیە وەڵامی پرسیارێكی تەقدیر كراوە و، دەستپێكێكی جوانە بۆ ڕستەیەكی نوێ.

---

(١) واتە: قسە كردنی ئاسمان و، لادانی پەردە. (وەرگێڕ)

(٢) واتە مەبەستی خودی ئەو "رعد" و برق"ە نییە كە چەند جارێك دووبارە بوونەوە، بەڵكو لێرەدا وەكو "چاوگ"(مصدر) هێنراون. كەواتە واتا مەصدەرییەكە لێرەدا مەبەستە، نەك خودی قسەكە و لابردنی پەردەكە. خۆ "واتای مەصدەری"ش بە "تاك" بەكاردێت، نەك بە "كۆ". (وەرگێڕ)

(٣) واتە نەك قسەی هەور (گرمەكەی) و، دەستەسپییەكەی (واتە بروسكەكەی). هەتا بە "كۆ" بهێنرێن. گوزارشتی دانەریش بە "دەستە سپییەكە" بۆ بروسكەی هەور، ئاماژەی بۆ موعجیزەی "دەستی سپی"ی حەزرەتی موسا - درودی لەسەر بێت- تێدایە. (وەرگێڕ)

(٤) لەبەر ئەوەی "ڕاهاتن" لەگەڵ هەر شتێكدا كارێك دەكات مرۆڤ پەی بەو لایەنە سەرسووڕهێنەرانەی موعجیزەی خوای گەورە نەبات كە لەو شتەدا هەن. (وەرگێڕ)

وأما ظرفيةُ الصيّبِ لهما مع أنَّ الظرفَ هو السحابُ فلأنَّ المدهوشَ والسامعَ المتدهِّشَ بدهشتِه يرى الصيِّبَ محيطاً بكلِّ شيءٍ لإحاطته بنفسِه.

وأما إفرادُ الرعدِ والبرقِ مع جمعِ الظلماتِ، فإشارةٌ إلى أنَّ منشأَ الدهشةِ تخيُّلُ المُصابِ تكلُّمَ السماءِ وتهديدَها بالإرعادِ، وكشْفَ الحجابِ بالإبراقِ، وهما معنى مصدريٌّ، لا الكلامُ واليدُ البيضاءُ. وأيضاً كلٌّ منهما نوعٌ واحدٌ وإنْ تعدّدَتْ أفرادُه.

وأما تنوينُ ﴿وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ﴾ فبدلٌ مِن الصفةِ، أي رعدٌ قاصِفٌ وبرقٌ خاطِفٌ، ودالَّةٌ على عدم الأُلفةِ بهما بسببِ التفطُّنِ بالدقة لما فيهما من العجائب.. وأيضاً فيهما إيماءٌ إلى أنهم لا يعرفون ذلك الرعدَ والبرقَ لسدِّ السمعِ وغضِّ البصرِ.

وأما هيئاتُ جملةِ ﴿يَجْعَلُونَ أَصَابِعَهُمْ فِي ءَاذَانِهِم مِنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ﴾..

فاعلم أنَّها جوابٌ لسـؤالٍ مقدَّرٍ واسـتينافٌ حسَنٌ..

چونکە کاتێ سەرنجی بیسەر ڕووی کردە ئەم چیرۆکە هەست پێ کراوەی کە بە نموونە هێنراوەتەوە، حەزێکی توندوتۆڵی لە لا دروست بوو بۆ دەرکەوتنی چۆنێتیی "گیرۆدەبوون"ەکە..

ئنجا دوای ئەوەی ئامێری وێنەکێشانەکە وێنەکەی گرت و کاری خۆی تەواو کرد، ئاراستەی حەز و ئارەزووەکە پێچی کردەوە بۆ لای دەرخستنی چۆنێتیی "کەسی گیرۆدە بوو". وەك بڵێی خاوەن پرسیار دەڵێ: ئایا لەو کاتەدا حاڵی کەسی گیرۆدەبوو چۆن بووە و، دەستی لە چی گیر کردووە بۆ ڕزگار بوونی؟

قورئان بەم فەرمایشتەی وەڵامی دانەوە: ﴿يَجْعَلُونَ أَصابِعَـــهُمْ﴾.. هتد.. واتە هیچ چارە و ڕێگایەکی دەربازبوونیان نییە، چونکە وەکو کەسانی خنکاوی ناو ئاویان لێ هاتووە، دەست لە شتی وا گیر دەکەن کە هی دەست پێوەگرتن نییە. ئەوەتا دەیانەوێ بە کرداری گوێ ئاخنین خۆیان لە بۆردومانی خەڵکانی ئاسمان بپارێزن! خۆ ئەو کردارەش مەحاڵە هۆکارێکی خۆپاراستن بێت، کەواتە هیچ هۆکارێك نییە بۆ ڕزگاربوونیان.

وشەی ﴿يَجْعَلُونَ﴾یش لەبری "يُدخِلُـــون" ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەوانە بە دوای هۆکارەکانی ڕزگاربووندا گەڕان، بەڵام هەر ڕێیان لەو شتانە کەوت کە تەنها بە گومانی خۆیان هۆکارن و، تەنها ئەوان دایان ناون بە هۆکار. هاتنی فیعلەکەش لە شێوەی موزاریعدا کە بۆ هێنانی ڕوودانی فیعلەکەیە بۆ کاتی ئێستا، هێمایەکە بۆ ئەوەی زەینی بیسەر لەم جۆرە شوێنەدا، کە سەرسامی دەورووژێنێت، بە ئەندێشەی خۆی ئامادەی شوێن و کاتی ڕووداوەکە دەبێت. پاشان فیعلی موزاریع بەردەوامی یەکی نوێبوونەوەی تێدایە. ئەو بەردەوامی یەشی ئاماژەیە بۆ بە دوای یەکدا هاتنی گرمەی هەورەکە.

بەکارهێنانی ﴿أَصابِعَـــهُمْ﴾یش لە بریی "أناملـهم" ئاماژەیەکە بۆ سەرسامیی لەڕادەبەدەریان، ئەوەش لە بەکارهێنانی "پەنجە"دا لە بریی "سەرپەنجە".

﴿فِي ءاذَانِهِم﴾یش ئاماژەیە بۆ زۆریی ترسەکەیان لە زایەڵەی هەورە گرمەکە، بە ڕادەیەك کە لە ئەندێشەیاندا وایە گەر ئەو گرمەیە بڕواتە ناو تۆڕی گوێیانەوە، ئەوا گیانەکان لە دەرگای دەمەکانەوە هەڵدەفڕێنێت!

هەروەك هێمایەکی وردیشی تێدایە بۆ ئەوەی کە: ئەوانە کاتێك دەرگای گوێکانی خۆیان نەکردەوە بۆ بیستنی بانگی حەق و ئامۆژگاری، هەر لەوێوە بە دەنگی نەعرەتەی

إذ السـامعُ لما توجَّهَ إلى هذه القصةِ الحسيةِ التمثيليةِ حصلَ له مَيَلانٌ شديدٌ لكشْفِ حالِ المصيبةِ.

ثم بعد أنْ كمَّلَ التصويرُ التصويرَ وقضى منه الوَطَرَ انثنى مجرى الميلانِ إلى كشفِ حالِ المصابِ. فكأنَّه يقولُ السائلُ: كيف حالُ المُصاب حينئذٍ وبمَ يتشبثُ للنجاة؟

فأجابَ القرآنُ بقوله: ﴿يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ..﴾ الخ. أي لامناصَ لهم، إنما هم كالغَرْقَى يتمسَّكون بغير متمسَّكٍ فيريدون التحفُّظَ من مجانيق[1] السماويين بسدِّ الأسماعِ. وكونُه سبباً محالٌ، فلا سببَ.

وأما لفظُ ﴿يَجْعَلُونَ﴾ بدلَ "يُدخِلون" فإيماءٌ إلى أنَّهم تحرَّوا الأسبابَ فما صادفوا إلَّا ما سببيَّتُه بجعلِهم وظنِّهم فقط.. وصورةُ المضارعِ المستحضِرةِ للحالِ فرمزٌ إلى أنَّ السامعَ في مثلِ هذا المقامِ المهيِّجِ للحَيرة يحضُرُ بخياله زمانَ الواقعةِ ومكانَ الحادثةِ. ثم في المضارع استمرارٌ تجدُّدِيٌّ. وفي استمراره إيماءٌ إلى تواتُرِ تَقْتَقَةِ السحابِ.

وأما ﴿أَصَٰبِعَهُمْ﴾ بدلَ "أناملَهم" فإشارةٌ إلى شدَّةِ الحَيرةِ باستعمال الأصابعِ موضعَ الأناملِ.

وأما ﴿فِي ءَاذَانِهِم﴾ فإيماءٌ إلى شدَّةِ الخوفِ من صَدى الرعدِ حتى يُخَيَّلُ إليهم أنه لو دخلَ الرعدُ في شبكة الآذانِ لطيَّرَ الأرواحَ من أبواب الأفواهِ..

وفيه رمزٌ لطيفٌ إلى أنهم لمّا لم يفتحـوا آذانَهم لنداء الحقِّ والنصيحةِ عوقِبوا من تلك الجهةِ

---

(١) مجانيق: جمع منجنيق: آلة حربية ترمى بها القذائف.

هەور سزا دران. ئیتر لێرەدا بە دەستی خۆیان ئەوەیان داخست کە پێشتر لەوێ دایانخست! بە وێنەی ئەو کەسەی کە گوفتارێکی ناشیرین لە دەمی خۆی دەربکات، بەوە سزا دەدرێت کە دەکێشرێت بە دەمیدا! ئیتر دەستە ڕاستی پەشیمانی دەئاخنێتە ناو دەمی و، دەستە چەپی ڕووزەردیش لەسەر چاوی خۆی دادەنێت!

﴿مِنَ الصَّوَاعِقِ﴾یش ئاماژەیە بۆ یەکگرتنی هەورە گرمە و بروسکە لەسەر زیانگەیاندن بەو کەسە. چونکە "صاعقـة" دەنگێکی بەهێزە و ئاگرێکی سووتێنەری لەگەڵدایە؛ بەر هەر کەسێك بکەوێت دەیخات.

﴿حَذَرَ الْمَوْتِ﴾یش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو بەڵایە هەر لە گۆشتەوە هەتا سەر ئێسقانی بڕیوە و، هەموو حاڵەتەکانی تێپەڕاندووە و، تەنانەت ژیانیشی گرتووەتەوە، ئیتر جگە لە "خەمی مردن" و "پاراستنی ژیان" شتێکی تر نەماوە بایەخی پێ بدەن.

سەبارەت بە پێکهاتەی ڕستەی ﴿والله مُحِيطٌ بِالْكافِرِينَ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

"واو"ەکە پەیوەندییەك دەخوازێت، خۆ ئەو پەیوەندییەش تەنها لە نێوان ئەم ڕستەیە و پاشکۆی دەرەنجامی ڕستەی پێشوودایە. وەك بڵێی ئەم "واو"ە، ئەمەی خوارەوەیان بەسەردا دەخوێنێتەوە:

"ئەوانە خەڵکانێکن لە ئاوەدانی هەڵهاتوون و، لە شارستانێتی بێزار بوون و، سەرپێچییان لەو یاسایە کردووە کە "شەو"ی بۆ حەوانەوە داناوە و، بە گوێی ئامۆژگاریی کەسی ئامۆژگاریان نەکردووە و، لایان وابووە کە ڕزگاربوونیان لەوەدایە بڕۆنە دەرەوە بۆ ناو بیابان، کەچی هیوا بڕاو بوون و، بەڵای خوای گەورەش دەوراندەوری دان".

وشەی ﴿الله﴾ش هێمایە کە بۆ بڕینی دواهەمین ئومێدیان! چونکە مرۆڤی گیرۆدە، لە سەرەتا و کۆتاییدا هانا بۆ لای میهرەبانیی خوا دەبات و، دڵی خۆی پێ خۆش دەکات.

جا کاتێ ئەوانە بوونە شایانی سزای خوای گەورە، ئەو ئومێدەشیان لێ کوژایەوە!

وشەی ﴿مُحِيطٌ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەم چەشنە موسیبەتە گشتگیرە، ئاسەواری ڕق و تووڕەیی خوای گەورەیە. ئەوەتا هەروەك یەك بە یەکی ئاسمان و هەور و باران و شەو، لە هەر شەش لاوە، هێرش دەکەنە سەریان. بە هەمان جۆر، تووڕەیی و، بەڵا و، گرفتەکانی خوای گەورەش لە هەموو لایەکەوە گەمارۆیان دەدەن..

بنَعَراتِ الرعدِ، فسَدُّوا هنا ما سدُّوا هناك، كمَن أخرَجَ كلاماً شنيعاً مِن فيهِ يُضْرَبُ على فمه، فيُدخِلُ يمينَ الندامةِ في فيهِ ويضعُ يسارَ الخجالةِ على عَينه.

وأما ﴿مِنَ الصَّوَاعِقِ﴾ فإشارةٌ إلى اتحاد الرعدِ والبرقِ على إضرارِه؛ إذ الصاعقةُ صوتٌ شديدٌ معه نارٌ مُحرِقة تصرَعُ مَن صادفَ.

وأما ﴿حَذَرَ الْمَوْتِ﴾ فإشارةٌ إلى أنَّ البلاءَ جذَّ[1] اللحمَ إلى العظم، وجازَ الأحوالَ إلى الحياة، فما يعنيهم إلّا غمُّ الموتِ وحفظُ الحياةِ.

وأما هيئاتُ جملةِ: ﴿واللهُ مُحِيطٌ بِالْكافِرِينَ﴾..

فاعلم أنَّ "الواوَ" تقتضي المناسبةَ، وما المناسبةُ إلّا بين هذه وبين التابعِ لمآل السابقةِ. فكأنَّ هذه "الواوَ" تقرأُ عليهم:

"هم قومٌ فرُّوا مِن العمارةِ ونفرُوا مِن الحضارةِ وعصَوا قانونَ كَوْنِ الليلِ سُباتاً ولم يُطيعوا نصيحةَ الناصحِ فظنوا النجاةَ بالخروج إلى الصحراء فخابُوا وأحاطَ بهم بلاءُ الله".

وأما لفظُ ﴿اللهُ﴾ فرمزٌ إلى قطع آخِرِ رجائِهم؛ إذ المصابُ إنما يلتجئُ ويتسلَّى أولاً وآخِراً إلى رحمة الله، فحين استحقُّوا غضبَ الله تعالى انطفأَ ذلك الرجاءُ.

وأما لفظُ ﴿مُحِيطٌ﴾ فإيماءٌ إلى أنَّ هذه المصائبَ المحيطةَ آثارُ غضبِه تعالى، فكما أنَّ السماءَ والسحابَ والصيِّبَ والليلَ تهجُمُ عليهم من الجهات الستِّ؛ كذلك غضبُه تعالى وبليّاتُه محيطةٌ بهم..

---

(١) جذّه وجزّه: قطعه.

هەروەها "زانست" و "توانست"ی خوای گەورە دەورانـدەوری سەرجەمی بوونەوەرانیان داوە و، فەرمانی ئەویش هەموو گەردیلەکان دەگرێتەوە. جا ﴿مُحِيطٌ﴾ وەکو ئەوە وایە کە ئەمەیان بەسەردا بخوێنێتەوە:

"ئێوە لە هەرێمەکانی ئاسمان و زەوی ناڕۆنە دەر، چونکە ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ﴾ (البقرة: ١١٥)"!

پەیوەندی کردنی "باء"ەکەش، هێمایەکە بۆ ئەوەی کە ئەوانە گرفتاری ئەو شتە بوون کە لێی هەڵهاتن، ئیتر بوونە نیشانەی تیرەکان.

گوزارشت کردنیش بە ﴿الْكَافِرِينَ﴾ ئاماژەیە بۆ پیشاندانی وێنەی "نموونە بۆ هاتوو" - واتە دووڕووەکان - لە ئاوێنەی "نموونە"کەدا، تاوەکو زەینی بیسەر لە نموونەکەدا ڕۆنەچێت و ئیتر مەبەستەکەی لەبیر بچێتەوە! هەروەك هێمایەکە بۆ ئەوەی کە لێکچوونەکە (لە نێوان نموونە و نموونە بۆ هاتوودا) گەیشتووەتە ڕادەیەك و، تەسکبوونەوەی ماوەی نێوانیشیان گەیشتووەتە سنوورێك کە لە یەکترەوە دیارن و، لەوێدا "حەقیقەت" و "ئەندێشە" ئاوێتەی یەکتر دەبن.. هەروەها ئاماژەیە بۆ تاریکیی "دڵ"یان، چونکە تەنانەت ویژدانیشیان لەسەر کەمتەرخەمی و تاوانەکانیان سزایان دەدات، ئەوەتا کەسێك سزای تاوانەکەی خۆی ببینێت، ویژدانیشی ناحەوێتەوە.

سەبارەت بە ڕوخسارە پێکهێنەرەکانی ڕستەی: ﴿يَكَادُ الْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَارَهُمْ﴾یش، ئەوا بوونی بە دەستپێکی ڕستەی نوێ، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بیسەر دەڵێت: "ئایا سوود لە هەورە بروسکەکە وەرناگرن کە (ڕووناکییەکەی) بەلای تاریکییان لەسەر شان سووك بکات"؟

وەڵامی درایەوە کە: ئەوانە لەبەر ترسیان لە زیانەکانی ئەو هەورە بروسکەیە، نایانپەرژێتە سەر ئەوەی سوودی لێ وەربگرن.

﴿يَكَادُ﴾یش - لە ڕووی تایبەتکارییە بەناوبانگەکەیەوە[1] - ئاماژە دەکات بۆ بوونی هۆکاری لەدەستدانی بینین، بەڵام لەدەستیان نەدا، لەبەر بوونی ڕێگرێك لێی.

---

(١) کاد: یەکێکە لەو جۆرە فیعلەی کە پێیان دەوترێت: فیعلەکانی "موقارەبە" (لێك نزیکبوونەوە). لەم فیعلەش کاتێ بەکاردێت کە نزیك بێت خەبەرەکەی بێتە وجوود، لەبەر ئەوەی هۆکاری بوونی بۆ هاتووەتە پێش. بەڵام لێرەدا خەبەرەکە نەهاتووەتە وجوود، دیارە ئەوەش یان لەبەر ئەوەیە مەرجێکی لەدەست داوە، یان لەبەر هاتنە پێشەوەی ڕێگرێك لێی. (ب)

وأيضاً علمُه تعالى وقدرتُه محيطان بكلِّ الكائناتِ، وأمرُه شاملٌ لكلِّ الذراتِ. فكأنَّ ﴿مُحِيطٌ﴾ يتلو عليهم:

لا تنفذون من أقطار السماواتِ والأرض؛ ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللهِ﴾ (البقرة: ١١٥).

وأما تعلُّقُ "الباءِ" فرمزٌ إلى أنَّهم وقعوا فيما هربُوا عنه، فصاروا هدفاً للسهام.

وأما التعبيرُ بـ﴿الكَافِرِينَ﴾ فإشارةٌ إلى إراءةِ تمثالِ الممثَّلِ - أعني المنافقين - في مرآة التمثيلِ، لئلَا يتوغَّلَ فيه ذهنُ السامعِ فينسى المقصدَ.. ورمزٌ إلى أنَّ المشابهةَ وصلتْ إلى درجةٍ، وتَضايَقَ المسافةُ بينهما إلى حدٍّ يتراءَيان معاً، فتمتزِجُ الحقيقةُ بالخيال.. وأيضاً إيماءٌ إلى ظُلمةِ قلوبِهم إذ وجدانُهم أيضاً يعذبُهم لقصورهم وجنايتِهم؛ إذ مَن رأى جزاءَ جنايتِه لا يستريحُ وجدانُه.

وأما هيئاتُ جملةِ: ﴿يَكَادُ الْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَارَهُمْ﴾ فاستينافُها يشيرُ إلى أنَّ السامعَ يقولُ: ألَا ينتفعون بالبرق المخفِّفِ لبلاءِ الظلمةِ عنهم؟

فأُجيبَ بأنهم يخافون مِن الضررِ فضلاً عن الفائدة.

وأما ﴿يَكَادُ﴾[1] فيشيرُ - باعتبار خاصَّتِه المشهورةِ - إلى وجودِ سببِ زوالِ البصرِ، لكنْ لم يزلْ لوجودِ مانعٍ.

---

(١) كاد من أفعال المقاربة وضعت لمقاربة الخبر من الوجود لعروض سببه، لكنه لم يوجد إما لفقد شرط أو لعروض مانع. (ب)

سەبارەت بە ﴿يَخْطَفُ﴾یش، ئەوا بە گوێرەی بەکارهێنانی، وەك:

"اختطفتْه الغولُ والعُقابُ" (واتە: هەڵۆ و دێو فڕاندوویانە) ڕەوانبێژییەکی وردی تێدایە کە بە خێرایی بروسکە لە زەین دەردەکەوێت و، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە "بروسکە" لەگەڵ "تیشکی چاو"دا پێشبڕکێ دەکات، تاکو پێش ئەوەی تیشکی چاو بگاتە شتەکان و وێنەیان بگرێت، ئەو پیایدا تێدەپەڕێت تاکو بیبڕێت و، لە پێڵوی بدات تاکو ڕووناکیی ببات و نەیهێڵێت. وەك بڵێی کاتێ "ڕووناکیی چاو" لە ماڵی خۆیەوە بە پەلە هاتە دەرەوە تاکو وێنەی شتەکان بگرێت، "بروسکە"ش کە تیشکی چاوی شەوە، بە پەلە دەڕوات و ئەو وێنەیە لە دەستی تیشکی چاو دەسێنێت پێش ئەوەی بیگەیەنێتە گەنجینەی وێنەکان، واتە وێنە گیراوەکەی لەدەست دەفڕێنێت!

﴿أَبْصَارَهُمْ﴾یش، ئەوا لەو ڕووەوە کە چاوەکان ئاوێنەی دڵانن، هێمایە بۆ کاری بەسیرەتی خۆنابیناکەری دووڕووان سەبارەت بە بەڵگە گومان بڕەکانی قورئان.

ڕوخسارە پێکهێنەرەکانی ڕستەی ﴿كُلَّمَا أَضَاءَ لَهُمْ مَشَوْاْ فِيهِ وَإِذَا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُواْ﴾یش، ئەوا بوونی بە دەستپێکی ڕستەیەکی نوێ، ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە بیسەر کاتێ گۆڕان و جۆراوجۆریی موسیبەتەکەی بینی، پرسیاری لەبارەی دووڕووەکانەوە کرد لە هەردوو حاڵەتەکەدا، ئیتر بەوە وەڵام درایەوە.

بەکارهێنانی ﴿كُلَّمَا﴾ لە "ڕووناك کردنەوە"دا و، ﴿إِذَا﴾یش لە "تاریك کردن"دا، ئاماژەیە بۆ توندوتۆڵیی سووربوونیان لەسەر بەدەستهێنانی ڕووناکی، تەنانەت هەڵی کەمترین ڕووناکی دەقۆزنەوە. هەروەها ﴿كُلَّمَا﴾ پێوانەیەکی دەراوێتەیی ڕاستەوخۆی لەخۆ گرتووە[1].

ئەو لامی ﴿أَضَاءَ لَهُمْ﴾ەش کە هی "لەپێناو هاتن" و "سوود"ە، هێمایە بۆ ئەوەی کەسی گیرۆدەی حەپەساو، نوقمی پێداویستییەکانی خۆیەتی، تەنانەت ئەو ڕووناکییەش کە دەستی "توانستی خوایی" لەبەر هەزاران دانستی هەمەکی بەناو جیهاندا بڵاوی دەکاتەوە، ئەو لای وایە کە بە تایبەتی بە مەبەستی ڕێ ڕووناك کردنەوەی ئەوە و، دەستی توانست لەبەر خاتری ئەو ناردوویەتی.

(١) واتە: "كُلَّمَا أَضَاءَ لَهُمْ مَشَوْاْ فِيهِ.. لكِنَّهُ اضاءَ لَهُمْ.. فَمَشَوْاْ فِيهِ". (وەرگێڕ)

وأما ﴿يَخْطَفُ﴾ باعتبار استعمالِه كـ"اختطفتهُ الغُول والعُقاب"، ففيه بلاغةٌ لطيفةٌ تبرُقُ للذهن، وتُشيرُ إلى أنَّ البرقَ يُسابقُ شعاعَ العينِ، مِن قَبلِ أنْ يصلَ إلى الأشياءِ ليأخذَ صوَرَها، يمرُّ هو عليه فيقطعُه ويضرِبُ على جفنه فيذهبُ بنورِه. كأنَّ نورَ العين لمّا خرجَ من بيته مُسْرِعاً لاجتناءِ صُوَرِ الأشياءِ يُسارعُ البرقُ الذي هو شعاعُ عينِ الليلِ، فيأخذُ مِن يدِ شعاعُ العينِ صورتَه قبلَ إيصالِه إلى المخزنِ، أي يختلسُ البرقُ صورتَه من يدِه.

وأما ﴿أَبْصَارَهُمْ﴾ فرمزٌ - بناءً على كونها مرآةً للقلوب - إلى عمل بصائرِ المنافقين المتعاميةِ عن البراهين القاطعةِ القرآنيةِ.

وأما هيئاتُ جملةِ: ﴿كُلَّمَا أَضَاء لَـهُمْ مَشَوْاْ فِيهِ وَإِذَا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُواْ﴾..

فاستينافُها يشيرُ إلى أنَّ السامعَ حينما رأى اختلافَ المصيبةِ وتغيُّرَها سألَ عن شأنهم في الحالتين، فأُجيبَ بذلك.

وأما ﴿كُلَّمَا﴾ في الإضاءة و ﴿إِذَا﴾ في الإظلام، فإشارةٌ إلى شدةِ حرصِهم على الضياءِ، ينتهزون أدنى الضياءِ فُرصَةً. وأيضا ﴿كُلَّمَا﴾ متضمِّنٌ لقياس مستقيمٍ استثنائيٌّ.

وأما ﴿أَضَاء لَـهُمْ﴾ بلام الأجْلية والنّفعِ، فرمزٌ إلى أنَّ المُصابَ المدهوشَ يستغرِقُ في حاجة نفسِه حتى يَظنّ الضياءَ الذي تنشُرُه يدُ القدرةِ في العالم لآلافِ حِكَمٍ كليّةٍ أنّه المُرادُ به خاصةً، ويدُ القدرةِ إنما أرسلتْه لأجْلِه.

سەبارەت بە ﴿مَشَوْا﴾ (واتە: بە ڕۆشتنی ئاسایی دەڕۆشتن) لە كاتێكدا كە هەل قۆستنەوە "ڕۆشتنی خێرا" دەخوازێت، ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە گرفتەكە ئەوانی لە پەلوپۆ خستووە، تەنانەت ڕۆشتنی خێراشیان هەر هێندەی ڕۆشتن و جوولەی ئاسایی و لەسەرخۆیە.

﴿فِيهِ﴾یش ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە ماوەی جوولەیان ماوەی ڕووناكی‌یەكەیە، كە ئەویش ڕەنگی "كات"ە. وەك بڵێی ئەو ماوەی "كات"ە مەودای "شوێن"ی ڕۆشتنەكەیان بۆ دیاری دەكات.

﴿وَإِذَا﴾ش، "واو"ەكەی هێمایە بۆ نوێكردنەوەی گرفتەكەیان، تاكو پتر كاریان تێ بكات. پشتگوێ خستن و جوزئی بوونیش لە ﴿إِذَا﴾دا، بە پێچەوانەی ﴿كُلَّمَا﴾ ئاماژەیە بۆ توندوتۆڵیی نەفرین و خۆ نابینا كردنیان، بۆیە موسیبەتەكە لەو كاتەدا دەیانگرێت كە نوقمی بەدەستهێنانی هەلەكەیانن.

دانەپاڵی ﴿أَظْلَمَ﴾ش بۆ "بەرق" (هەورە بروسكە) ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە تاریكیی دوای ڕووناكی سەختترە و، ئاماژەیشە بۆ ئەوەی كە ئەندێشەی كەسی گیرۆدە كاتێ بینیی بروسكەكە تاریكی‌یەكەی بەدەرنا و، ئنجا ڕۆشت و، جێگاكەی بە چەندین تاریكی تر پڕبووەوە، وا خەیاڵ دەكات كە كوژاوەتەوە و شوێنەكەی پڕ بووە لە دووكەڵ.

﴿عَلَيْهِم﴾یش كە ئاماژە بە "زیان" دەكات، ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە تاریك كردنەكە بە "ڕێكەوت" ڕووی نەداوە، بەڵكو سزای كرداری ئەوانە. هەروەك هێمایەكیشە بۆ ئەوەی كە مرۆڤی حەپەساو لەوكاتەدا وا خەیاڵ دەكات ئەو تاریكاییەی بۆشایی ئاسمانی پڕ كردووە، وەكو ئەوە وابێت - كە لە نێوان هەموو شتەكاندا - تەنها دنیای لەم مرۆڤە بچووك و زەلیلە تاریك كردبێت و بە تایبەت ئەوی كردبێتە نیشانەی هێرش و زیانەكانی.

هێنانی ﴿قَامُواْ﴾ش لە بریی "سكنوا"، ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە بە هۆی موسیبەتەكە و توندیی دەستگرتنیان بە دەربازبوونەوە، وا چەماونەتەوە كە بە وێنەی ئەوانەن لە "ڕكووع"دان، وەكو حاڵی ئەوانەی كە لە كاروبارياندا گەرموگوڕن.

سەبارەت بە ڕوخساری پێكهاتەی ڕستەی ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ﴾یش، ئەوا:

وأما ﴿مَشَوْاْ فِيهِ﴾ مع اقتضاءِ الفرصةِ السيرَ السريعَ، فإشارةٌ إلى أنَّ المصيبةَ أقعَدَتهم، فما سيرُهُم السريعُ إلّا مشيٌ وحركةٌ على مَهَلٍ.

وأما ﴿فِيهِ﴾ فإشارةٌ إلى أنَّ مسافةَ حركتِهم الضياءُ، الذي هو لونُ الزمانِ، فكأنّه يحدّدُ لهم المكانَ.

وأما ﴿وَإِذَا﴾ فـ"الواوُ" رمزٌ إلى تجديد المصيبةِ لتشديد التأثيرِ. وأما الإهمالُ والجزئيةُ في ﴿إِذَا﴾ عَكْسَ ﴿كُلَّمَا﴾ فإشارةٌ إلى شدّةِ نفرتِهم وتعاميهم، فتأخذُهم وهم منغمِسون في آنِ الفُرصةِ.

وأما ﴿أَظْلَمَ﴾ بالإسناد إلى البرقِ، فإشارةٌ إلى أنَّ الظُلمةَ بعدَ الضياءِ أشدُّ. وإيماءٌ إلى أنَّ خيالَ المصابِ لمّا رأى البرقَ طردَ الظلمةَ ثم ذهبَ وامتلأ موضِعُه بالظلمات، يتخيّلُ أنّه انطفأ وأورثَ دخاناً.

وأما ﴿عَلَيْهِمْ﴾ الملوِّحُ بالضرر فإشارةٌ إلى أنَّ الإظلامَ ليس تصادُفياً، بلْ جزاءٌ لعملِهم. ورمزٌ إلى أنَّ المدهوشَ يتخيَّلُ الظلمةَ المالِئةَ للفضاء كأنّها تَقصِدُ - مِن بين الأشياءِ - ذلك الإنسانَ الصغيرَ الذليلَ وتجعلُه خاصّةً هدفَ هجومِها وإضرارِها.

وأما ﴿قَامُواْ﴾ بدلَ "سكنوا" فإشارةٌ إلى أنّهم بالمصيبة وشدَّةِ التشبُّثِ تقوَّسُوا كالراكعين، كما هو شأنُ المجِدِّين في العمل.

وأما هيئاتُ جملةِ ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ﴾..

"واو"ەکە - بە هۆی نهێنیی پەیوەستکردنی "واو" بۆ ئەو شتانەی کە دەکەوێتە نێوانیانەوە - ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە "دەستی توانستی خوای گەورە" لە ژێر پەردەی "هۆکارەکان"دا هەڵسوکەوت دەکات و، ڕوانینی "دانست"یش لە بەرزاییەوە چاودێرە بەسەر هەموو هۆکارەکانەوە.

﴿لَـوْ﴾یش پێوانەیەکی دەراوێتەیی ناڕاستەوخۆی لەخۆ گرتووە. واتە: نەبوونی ویستی خوایی، هۆیە بۆ لانەبردنی گوێ و چاویان. هەروەك لانەبردنی گوێ و چاویان، بەڵگەیە لەسەر زانینی ئەوەی کە ویستی لەسەر لابردنیان نییە.

هەروەها هێمایەکیشە بۆ ئەوەی کە هۆکارەکە گەیشتووەتە کۆتایی.

﴿شَاءَ﴾ش، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە تەنها "ویست"ی خوای گەورەیە "هۆکار" و "بەهۆکراو" پەیوەستی یەکتر دەکات و، کاریگەری تەنها هی "توانست"ی ئەوە. هۆکارەکانیش جگە لە پەردەی ڕووی عیززەت و مەزنیی خوای گەورە شتێکی تر نین. ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە لە پێش چاوی ڕواڵەتی ژێریدا دەستی "توانست" ڕاستەوخۆ بەر شتە نزمەکان نەکەوێت.

هێنانی ڕاشکاوی وشەی ﴿اللّٰهُ﴾ ئاماژەیە بۆ سەرزەنشتی خەڵك لەوەی کە خۆیان بە هۆکارەکانەوە تووش بکەن و تیایاندا نوقم ببن. هەروەها بۆ بانگهێشتی زەینەکانیشە تاکو بۆ خۆیان ببینن کە "دەستی توانست" لە پشت هەموو هۆکارەکانەوەیە.

حەزف کردنی مەفعوولی ﴿شَــاءَ﴾ش هەرچەندە بە پێی دەستوورێکی پیادەکراو پێویست بووە[1]، لەگەڵ ئەوەشدا دەگونجێت - بە نیشانەی دەستە خوشکەکانی - ئاماژە بێت بۆ ئەوەی کە بارودۆخی بوونەوەران کار ناکاتە سەر "ویستی خوای گەورە" و، بۆ ئەوەش کە شتەکان کاریگەرییان لە سیفەتەکانی خوای گەورەدا نییە، نەك بە وێنەی "ویستی ئێمەی مرۆڤ" کە جوانی و ناشیرینی و، گەورەیی و بچووکیی شتەکان کاری تێ دەکات.

---

(١) یەکێك لە شوێنەکانی حەزف کردنی مەفعوول "ڕوونکردنەوە"ی دوای "پەنهانی"یە. وەك مەفعوولی فیعلی "مشیئة" و هەرچی لە واتایدایە. بۆیە بە دەگمەن مەفعوولەکەی دەهێنن گەر فیعلی مەرج بێت، چونکە وەڵامی مەرجەکە مەفعوولەکە ڕوون دەکاتەوە. وەك ئایەتی: ﴿وَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِــــينَ﴾ (النحل:٩) واتە: "لَوْ شَاءَ اللّٰهُ هِدَايَتَكم لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ". چونکە هەر هێندەی وترا: "لَوْ شَــــاءَ" دەزانرێت شتێك هەیە "مەشیئەت" پەیوەندی پێوە کردووە و ئەو شتەش نادیارە، بەڵام کە وەڵامی مەرجەکە هات، دەرکەوت ئەو شتە چییە. بەم جۆرەش زیاتر جێی خۆی لە دەروونداا دەگرێت.

فالـ"واوُ" - بسرِّ الربطِ - تلوِّحُ إلى أنَّ يدَ القدرةِ تتَصَرَّفُ تحت حجابِ الأسبابِ، وأنَّ نظرَ الحكمةِ يُراقِبُ مِن فوقُ جميعَ العللِ.

وأما ﴿وَلَوْ﴾ فمُتضمِّنةٌ لقياسٍ استثنائيٍّ غيرِ مستقيمٍ. أي عدمُ المشيئةِ علةٌ لعدمِ ذهابِها؛ كما أنَّ عدمَ الذهابِ دليلٌ على العلم بعدمِ المشيئةِ بذهابِها..

وأيضاً رمزٌ إلى أنَّ السببَ بلغَ النهايةَ.

وأما ﴿شَاءَ﴾ فإشارةٌ إلى أنَّ الرابطَ بين السببِ والمسبَّبِ إنما هي المشيئةُ والإرادةُ الإلهيةُ. فالتأثيرُ للقدرة، وما الأسبابُ إلّا حجابُ العزّةِ والعظمةِ؛ لئلّا تُباشِرَ يدُ القدرةِ بالأمور الخسيسةِ في ظاهرِ نظرِ العقلِ.

وأما التصريحُ بلفظةِ ﴿اللهُ﴾ فإشارةٌ إلى زجر الناسِ عن الابتلاءِ بالأسباب والانغماسِ فيها. وأيضاً لدعوةِ الأذهانِ إلى رؤيةِ يدِ القدرةِ خلفَ كُلِّ الأسبابِ.

وأما حذفُ مفعولِ ﴿شَاءَ﴾ وإنْ كان واجباً بالقاعدة المطَّردةِ[1]، فيجوزُ بقرينة إخوانِه أنْ يكونَ إيماءً إلى عدم تأثُّرِ المشيئةِ والإرادةِ الإلهيةِ بأحوال الكائناتِ، وعدمِ تأثيرِ الأشياءِ في الصفاتِ الإلهيةِ، كما تتأثَّرُ إرادةُ البشرِ بحُسْن الأشياءِ وقُبحِها وعظمتِها وصِغَرِها.

---

(١) إذ من مواضع حذف المفعول البيانُ بعد الابهام، كما في مفعول فعل المشيئة وما شابهه في المعنى، فإنهم لا يكادون يذكرونه، إذا وقع ذلك الفعل شرطاً؛ إذ إن الجواب حينئذ يدل على المفعول ويبينه. وعليه قوله تعالى: ﴿وَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ (النحل:٩). أي لو شاء الله هدايتكم لهداكم أجمعين، فإنه لما قيل: "لو شاء" عُلم أن هناك شيئاً تعلقت به المشيئة لكنه مبهم، فلما جيء بالجواب صار مبيَّناً، وهذا أوقع في النفس.

﴿لَذَهَبَ﴾ش، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە "هۆکارەکان" زاڵ نین بەسەر "بەهۆکراوەکان"دا، بە جۆرێ کە ئیتر ئەگەر "هۆکارەکان" لابرێن "بەهۆکراوەکان"یش لە ناخی "عەدەم"دا بمێننەوە و دەستی ڕێکەوت یاریان پێ بکات و تەفر و تونای ئەملا و ئەولایان بکات.. نەخێر، بەڵکو دەستی "توانست" هەمیشە لە پشتی هۆکارەکانەوە ئامادەیە..

هەر کاتێ کە "دەستی توانست" شتان دەهێنێتە وجوود، ئەوا "دەستی دانست" بە یاسای هاوسەنگی و ڕێکوپێکی لێی وەردەگرێت و، ڕەوانەی چەند شوێنێکی تریان دەکات و، هەرگیز پشتگوێیان ناخات. بە وێنەی ئەوەی کە هەرکات "گەرمی" پێکهاتەی "ئاو" تێکبدات، ئەوا بەو ڕێسایەی کە لەناو هەوادا هەیە هەڵمەکە بە ڕێڕەوێکی دیاری کراودا دەڕوات و، بەدیهێنەری بەرەو شوێنێکی دەستنیشان کراوی دەبات..

بە هەمان جۆر لە ﴿ذَهَبَ﴾شدا هێمایەك هەیە بۆ ئەوەی کە "پێنج هەستەوەرە ئاشکراکە" لە سرووشتەوە پەیدا نەبوون و، "لازم"ی بۆشاییەکانی گوێ و چاویش نین، بەڵکو چەند بەخشش و دیارییەکی خوای گەورەن. بۆشاییەکان و هۆکارەکانیش جگە لە چەند مەرجێکی ئاسایی شتێکی تر نین.

موتەعەددی کردنی فیعلەکەش بە پیتی "باء" لە بریی پیتی "هەمزە" ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە "دەستی توانست" شتان لە پەتی "هۆکارەکان"بەرنادات هەتا بە ئارەزووی خۆیان جموجووڵ بکەن.. نەخێر، بەڵکو جڵەویان دەداتە دەستی ڕێسایەك.

بە تاك هێنانی "سمع" و بە کۆ هێنانی "أبصار"یش، ئاماژەیە بۆ "تاك" بوونی شتی بیستراو و، فرەیی شتانی بینراو. ئەوەتا هەزار کەس یەك دانە شت دەبیستن، هاوکات لەگەڵ جیاوازیی شتە بینراوەکانیاندا.

سەبارەت بە ڕوخساری پێکهاتنی ڕستەی ﴿إِنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾یش ئەوا بزانە کە ئەم ڕستەیە پوختەیەکە بۆ هاتنەدیی سەرسامییەکە لە "نموونە" و "نموونە بۆ هێنراو"دا و، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەروەك وردەکارییەکانی حاڵی گیرۆدەبووەکان - کە ئەویش نموونەی لایەنە جوزئییەکانی حاڵی دووڕووەکانە - پشتگوێ ناخرێت.. بە هەمان جۆر، دەست وەردان و هەڵسوکەوتی "توانستی خوایی"ش لە هەموو گەردیلەیەکدا دەبینرێت.

وأما ﴿لَذَهَبَ﴾ فإشارةٌ إلى أنَّ الأسبابَ ليستْ مُسَلَّطَةً ومستوليَةً على المسبَّباتِ، حتى إذا رُفعتْ بقيت المسبباتُ في جوفِ العدمِ تلعبُ بها يدُ التصادفِ وتشتِّتُها بالاتفاقِ؛ بل يدُ القدرةِ حاضِرةٌ خلفَ الأسبابِ. إذا أخرجت الأشياءَ تأخذُها يدُ الحكمةِ الإلهيةِ، بقانون الموازنةِ والانتظامِ، ترسلُها إلى مواقعَ أُخَرَ ولا تُهملُها .كما أنَّ الحرارةَ إذا خرَّبتْ بُنيةَ الماءِ، فبالنظام المندمِج في الهواء يذهبُ البخارُ في مجرىً معيَّنٍ ويسوقُه صانعُه إلى موقعٍ معينٍ..

وكذا في ﴿ذَهَبَ﴾ رمزٌ إلى أنَّ الحواسَّ الخمسَ الظاهرةَ ليستْ متولدةً عن الطبيعة، ولا لازِمةً لتجاويفِ السمعِ والبصر، بل إنما هي هداياه تعالى وعطاياه. وما التجاويفُ والأسبابُ إلّا شرائطُ عاديةٌ.

وأما التعدِيةُ بـ"الباء" بدلَ "الهمزة" فإيماءٌ إلى أنَّ يدَ القدرةِ لا تُطلِقُ الأشياءَ عن حبلِ الأسبابِ، غَاربُها على عنقها[1] بل تضعُ أزمّتَها بيد نظامٍ.

وأما إفرادُ "السمعِ" مع جمعِ "البصرِ" فإشارةٌ إلى إفرادِ المسموعِ وتعدُّدِ المُبصَرِ، إذ ألفُ رجلٍ يسمعون شيئاً واحداً مع تخالُف المبصَراتِ.

وأما هيئاتُ جملةِ: ﴿إِنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ فاعلم أنّها فذلكةٌ لتحقيق الدهشةِ في التمثيل والممثَّلِ له، تشيرُ إلى أنّه كما لا تُهمَلُ دقائقُ أحوالِ المصابين المتمثلةِ لجزئيات أحوالِ المنافقين؛ كذلك يُرى في كلِّ ذرةٍ تصرُّفُ القدرةِ الإلهيةِ.

---

(١) لعل الأظهر: "حبلها على غاربها".. كما في المثل: "حبلُكِ على غاربك"، ويستعمل في كنايات الطلاق. والغارب: الكاهل. يقال: ألقى حبلَ الشخص على غاربه: تركه يذهب حيث يشاء. (مجمع الأمثال)

﴿إِنَّ﴾ش، وێڕای ئاماژە كردنی بۆ ئەوەی كە ئەم بڕیارە یەكێكە لە ڕاستی‌یە جێگیرەكان، هێمایەكیشە بۆ مەزنی و فراوانی و وردیی ئەم مەسەلەیە و، بۆ دەستەوسانی و لاوازی و ناتەواویی مرۆڤ تیایدا. كە ئەویش مەسەلەیەكە ئەو چەشنە گومانانە دەخاتەوە كە دەبنە هۆی دوودڵی لە شتانی "یەقینی"دا.

هێنانی وشەی ﴿اللّهَ﴾ش بە ڕاشكاوی، ئاماژەیە بۆ "بەڵگە"ی بڕیارەكە، چونكە "توانست"ی تەواوەتی و گشتگیر سیفەتێكی لازمی خوایەتی‌یە لێی جیا نابێتەوە.

﴿عَلَى﴾ش، ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە ئەو "توانست"ەی شتانی لە "نەبوون" هێناوەتە "بوون"، هەرگیز بە بێ بایەخی ئەو شتانە وەلا نانێت، بەڵكو "دانست"ەكەی چاودێرە بە سەریانەوە و پەروەردەیان دەكات.

﴿كُلِّ﴾یش، ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە "ئاسەواری هۆكارەكان" و "دەرەنجامی مەصدەر"یش لە كردارە ئیختیاری‌یەكاندا، هەر بە "توانستی خوای گەورە"یە.

وشەی ﴿شَيْءٍ﴾یش، بە واتای "مَشيء"ە، واتە: ئەو شتەی كە "ویست"ی خوای گەورە پەیوەندیی پێوە كردووە. ئەم وشەیە ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە بوونەوەران، دوای هاتنە بوونیان، لە كردگار و بەدیهێنەریان بێ نیاز نابن، بەڵكو لە هەموو چركەیەكدا بۆ "مانەوە"یان – كە دووپاتبوونەوەی "بوون"ە – پێویستیان بە كاریگەریی كردگاریانە.

وشەی ﴿قَدِيرٌ﴾یش لە بریی "قادر" هێمایەكە بۆ ئەوەی كە "توانست" تەنها بە باڵای "بەدیهاتووانی بە توانست دروست بوو" نەبڕراوە. بەڵكو هێمایە بۆ ئەوەش كە "توانستێكی خۆیی"یە، گۆڕانی تێدا نی‌یە و، بۆ ئەوەش كە سیفەتێكی پێویستی خوایەتی‌یە، هەرگیز زیاد و كەم هەڵناگرێت، لەبەر ئەوەی ناگونجێ دژەكەی تێهەڵكێشی ببێت هەتا ڕیزبەندیی "توونددوتۆڵی" و "ناتەواوی"ی بەسەردا بێت..

هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەش كە "توانست" وەكو ڕەگەز و بە وێنەی تەرازووی زانستی "صەرف" وایە واتە: وەك "فَعَلَ" وایە بۆ سەرجەم وەسفە كرداری‌یەكانی چەشنی: "الرزاق" و "الغفار" و "المحیي" و "الممیت" و، جگە لەمانەش.

دەسا فەرموو مافی شایانی بیركردنەوە و تێڕامانت بدە بەمانەی كە بیستت!

* * *

وأما ﴿إِنَّ﴾ فمع إشارتِها إلى أنَّ هذا الحكمَ من الحقائق الراسخةِ، رمزٌ إلى عظمة المسألةِ ووُسعَتِها ودقّتِها، وعجزِ البشرِ وضعفِه وقصورِه عنها، المولِّدةِ للأوهام المُنتجةِ للتردّدِ في اليقينياتِ.

وأما التصريحُ بلفظة ﴿اللهَ﴾ فإيماءٌ إلى دليل الحُكم، إذ القدرةُ التامةُ الشاملةُ لازمةٌ للألوهية.

وأما ﴿عَلَى﴾ فإيماءٌ إلى أنَّ القدرةَ المُخرِجَةَ للأشياء من العدم، لا تتركُها سُدىً هَملاً، بل ترقُبُ عليها الحكمةُ وتربّيها.

وأما ﴿كُلِّ﴾ فإشارةٌ إلى أنَّ آثارَ الأسبابِ، والحاصلَ بالمصدر من الأفعال الاختياريةِ، أيضاً بقدرته تعالى.

وأما لفظُ ﴿شَيْءٍ﴾ بمعنى مَشيءٌ، أي ما تعلقتْ به المشيئةُ، فإشارةٌ إلى أنَّ الموجوداتِ بعد وجودِها لا تستغني عن الصانعِ، بل تفتقِرُ في كلِّ آنٍ لبقائِها - الذي هو تكرّرُ الوجودِ - إلى تأثيرِ الصانعِ.

وأما لفظُ ﴿قَدِيرٌ﴾ بدلَ "قادرٌ" فرمزٌ إلى أنَّ القدرةَ ليستْ على مقدار المقدوراتِ فقط، وأنّها ذاتيةٌ لا تغيّر فيها، ولازمةٌ لا تقبَلُ الزيادةَ والنقصانَ، لعدم إمكانِ تخلُّلِ ضدِّها حتى تترتَّبَ شدةً ونقصاناً.. وتلويحٌ إلى أنَّ القدرةَ كالجنس وكميزان الصّرفِ، أعني: "فَعَلَ" لجميع الأوصافِ الفعليةِ من الرزاق والغفارِ والمحيي والمميتِ وغيرِها. تفكَّرْ فيما سمعتَ حقَّ التفكُّرِ!

***

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ الَّذِى خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ۞ الَّذِى جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَّكُمْ فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَاداً وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (البقرة: ٢١-٢٢)

## پێشەکی

بزانە کە هەر تەنها "پەرستش"ە بیر و باوەڕەکان لە بناغەوە توندوتۆڵ و جێگیر دەکات و، دەیانگۆڕێت بە حاڵەت و سیفەتێکی دامەزراو لە مرۆڤدا. چونکە ئەو شتانەی کە لە ناخی ویژداندان و ئەوانەش کە بە "ژیری" دەسەلمێن، گەر ئەو "پەرستش"ە گەشەیان پێ نەدات کە بریتییە لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و خۆپارێزی لە شتانی "نەهی لێ کراو"، ئەوا شوێنەوار و کاریگەرییان لاواز دەبێت. حاڵی ئێستای ئیسلام (موسڵمانان)[1] شایەتە لەسەر ئەمە.

ئەوەش بزانە کە: "پەرستش" هۆکارێکی (بەدەستهێنانی) بەختەوەریی هەردوو دنیایە و، هۆیەکە بۆ ڕێکخستنی ژیانی دنیا و قیامەت و، مایەی کەماڵی "کەسایەتی" و "ڕەگەزی مرۆڤ"ە و، پەیوەندییە شەرەفمەندانە باڵاکەی نێوان بەندە و بەدیهێنەرییەتی.

سەبارەت بەوەی کە "پەرستش" هۆی بەختەوەریی ئەم دنیایەی کێڵگەی ئەودنیایە، ئەوا لە چەند ڕوویەکەوەیە:

یەکێکیان ئەوەیە کە: مرۆڤ لە نێوان هەموو زیندەوەراندا بە تایبەتمەندی و جیاواز بەدی هێنراوە و، سروشتێکی ناسك و سەرسووڕهێنی تێدا دانراوە. ئەو سروشتەی

---

(١) جیهانی ئیسلامی. (ت)

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ الَّذِى خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ * الَّذِى جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَكُمْ فَلاَ تَجْعَلُواْ لله أَندَاداً وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (البقرة: ٢١-٢٢)

## مقدمة

اعلم أنَّ العبادةَ هي التي ترسِّخُ العقائدَ وتُصيِّرها حالاً ومَلَكةً؛ إذ الأمورُ الوجدانيةُ والعقليةُ إنْ لم تنمِّها وتربِّها العبادةُ - التي هي امتثالُ الأوامرِ واجتنابُ النواهي- تكُنْ آثارُها وتأثيراتُها ضعيفةً. وحالُ الإسلامِ[1] الحاضرةُ شاهدةٌ.

واعلم أيضاً أنَّ العبادةَ سببٌ لسعادة الدارين، وسببٌ لتنظيم المعاشِ والمعادِ، وسببٌ للكمال الشخصيِّ والنوعيّ، وهي النسبةُ الشريفةُ العاليةُ بين العبدِ وخالقِه.

أما وجهُ سببيتِها لسعادة الدنيا التي هي مزرعةُ الآخرةِ فمِن وجوهٍ:

منها: أنَّ الإنســانَ خُلِق ممتازاً ومستثنى من جميع الحيواناتِ بمزاج لطيفٍ عجيب، أنتجَ

(١) العالم الإسلامي. (ت)

ئەویش حەزی هەڵبژاردن و هیوای بەدەستهێنانی شتی باشتر و، ئارەزووی ئارایشتی لەودا پەیدا کردووە و، مەیلێکی سروشتیی تێدا داناوە کە بە ژیان و گوزەرانێك بژی شایانی مرۆڤایەتی بێت.

پاشان مرۆڤ لەبەر ئەو حەز و ئارەزووانەی کە باس کران، پێویستی بەوە بوو کە لە بەدەستهێنانی خۆراك و پۆشاك و شوێنی نیشتەجێ بوونیدا، لە ڕێی چەندین پیشەسازیی زۆرەوە، بە وردی و ڕێکوپێکی‌یەکی ئەوتۆ بەرهەمیان بهێنێت کە بە تەنیا خۆی توانای هەموویانی نی‌یە..

لەبەر ئەوە، ناچار بوو کە تێکەڵی هاوڕەگەزی خۆی ببێت، تاکو لە نێوان خۆیاندا بەشداری بکەن و، ئنجا هاوکاری یەکتر بن و، پاشان بەرووبوومی کۆششیان ئاڵوگۆڕ پێ بکەن.

بەڵام لەبەر ئەوەی کردگاری دانا هێزەکانی لەمەڕ ئارەزووەکان و تووڕەیی و ژیریی مرۆڤی - وەك هێز و توانای ئاژەڵان - لە سنوورێکی دیاری کراوی سروشتیدا ڕانەگرت، ئەوەش بە مەبەستی داپینکردنی بەرزبوونەوە و بەرەوپێش چوونی مرۆڤ بە زەمبەلەکی "جوزئی ئیختیاری"، ئەوا تێدا ڕۆچوون و سنوور بەزاندن ڕووی دا..

ئنجا لەبەر ئەو ڕۆچوون و سنوور بەزاندنەی کە هی دەستنیشان نەکردنی هێز و تواناکانیەتی، کۆمەڵی مرۆڤ لە گۆڕینەوەی بەروبوومی هەوڵ و کۆششیاندا پێویستیی بە سیستەمی "دادپەروەری" بۆ دروست بوو..

پاشان لەبەر ئەوەی "ژیری"ی هەموو یەکێکی ئەوان، بە تەنیا، بۆ ئەوە دەست نادات کە پەی بە "دادپەروەری" ببات، ئەوا ڕەگەزی مرۆڤ پێویستی بە "ژیری‌یەکی هەمەکی" بۆ پەیدا بوو کە ژیریی هەمووان سوودی لێ وەربگرن..

ئەو ژیری‌یە هەمەکی‌یەش جگە لە یاسایەکی گشتی شتێکی تر نی‌یە.. ئەویش تەنها بریتی‌یە لە "شەریعەت".

پاشان بۆ پارێزگاری کردن لە کاریگەری و جێبەجێ بوونی ئەو شەریعەتە، پێویست بە یاساهێنەر و ڕاگەیەنەر و کەسێك دەبێت کە لە ڕووداوەکاندا مرۆڤەکان بگەڕێنەوە بۆلای. خۆ ئەو کەسەش جگە لە پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێت - کەسێکی دیکە نی‌یە.

ذلك المزاجُ فيه ميلَ الانتخابِ وميلَ الأحسنِ وميلَ الزينةِ، ومَيَلاناً فطرياً إلى أنْ يعيشَ ويحيى بمعيشةٍ وكمالٍ لائقَين بالإنسانية..

ثم لأجْل تلك الميولِ احتاجَ الإنسانُ في تحصيل حاجاتِه في مأكله وملبسِه ومسكنِه إلى تلطيفها وإتقانِها بصنائعَ جمّةٍ، لا يقتدرُ هو بانفراده على كلِّها..

ولهذا احتاجَ إلى الامتزاج مع أبناءِ جنسِه ليتشاركوا، فيتعاونُوا، ثم يتبادلوا ثمراتِ سعيهم..

لكنْ لّما لم يحدد الصانعُ الحكيمُ قوى البشرِ الشَّهَوِيَّةَ والغَضَبيّةَ والعقليّةَ بحدٍّ فطريٍّ لتأمين ترقّيهم بزَمْبَرَكِ[1] الجزءِ الاختياريّ - لا كالحيوانات التي حُدّدَتْ قواها - حصلَ انهماكٌ وتجاوزٌ..

ثم لانهماكِ القوى وتجاوزِها - بسرِّ عدمِ التحديدِ - تحتاجُ الجماعةُ إلى العدالة في تبادل ثمراتِ السعي..

ثم لأنَّ عقلَ كلِّ أحدٍ لا يكفي في درْك العدالةِ احتاجَ النوعُ إلى عقلٍ كلّيٍّ للعدالة يستفيدُ منه عقلُ العمومِ..

وما ذلك العقلُ إلّا قانونٌ كلّيٌّ، وما هو إلّا الشريعةُ..

ثم لمحافظةِ تأثيرِ تلك الشريعةِ وجَرَيانِها لابدَّ مِن مُقنِّنٍ وصاحبٍ ومُبلِّغٍ ومَرجَع، وما هو إلّا النبيُّ عليه السلامُ..

---

(١) النابض.

پاشان پێغەمبەریش - دروودی خوای لەسەر بێت - بۆ بەردەوامیی فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتی بەسەر شتانی ئاشکرا و نادیار و، بەسەر ژیری و سروشتەکاندا، پێویستی بە تایبەتمەندی و سەرکەوتوویی دەبێت، لە ڕووی ماددی و مەعنەوی و، ژیان و ڕوخسار و، بەدیهاتن و ڕەوشتەوە.. هەروەك پێویستی بە بەڵگەیەك دەبێت لەسەر پەیوەندیی بەهێز و توندوتۆڵی نێوان خۆی و خاوەن موڵکی جیهان، خۆ ئەو بەڵگەیەش جگە لە "موعجیزەکانی" شتێکی تر نییە..

پاشان بۆ دامەزراندن و جێگیرکردنی گوێڕایەڵیی خەڵك بۆ فەرمانەکانی شەریعەت و، دابین کردنی خۆپارێزییان لەو شتانەی شەریعەت نەهیی لێ کردوون، پێویست دەکات کە زەینەکان بەردەوام لە یادی گەورەیی کردگار و خاوەنی موڵکی دنیادا بن، خۆ ئەوەش تەنها بەوە دەبێت کە "بیر و باوەڕەکان" لە کردار و ڕەفتارەکاندا دەربکەون..

پاشان بۆ بەردەوامیی ئەو بیرکردنەوەیە و جێگیرکردنی بیروباوەڕەکان، پێویست بە یادخەرەوەی جەختکار و، کرداری نوێبووی بەردەوام دەکات. خۆ ئەو یادخەرەوە جەختکارەش تەنها بریتییە لە "پەرستش".

یەکێکی تریان: مەبەست لە "پەرستش"دا ئاراستەکردنی هزر و بیرەکانە بەرەو کردگاری دانا و، ڕووکردنە دامەزراندنی ملکەچیی بەندەکانە بۆ خوای گەورە و، ملدانە بۆ گەیشتن و پەیوەست بوون بە ڕێکوپێکیی یەکجار کامڵ و، شوێنکەوتنی ڕێسا بۆ هێنانەدیی نهێنیی ئەو "دانست"ەی کە وردەکاریی بەدیهێنانی بوونەوەران شایەتیی لەسەر دەدات.

یەکێکی تریان: مرۆڤ بە وێنەی ئەو درەخت(ستوون)ەیە کە گەلێ هێڵی تەلەگراف لەسەر لوتکەی لقەکانی ڕایەڵ کرابێت. چونکە سەرەکانی سیستەمەکانی بەدیهاتن لە سەری مرۆڤ پێچراونەتەوە و، یاساکانی بەدیهاتووان بە ئاراستەی ئەو ڕاکێشراون و، دانەوەی تیشکەکانی یاسا خواییەکانیش لە گەردووندا لەودا چڕ بوونەتەوە.

کەواتە دەبێ مرۆڤ ئەو یاسایانە تەواو بکات و، بیانبەستێ بە یەکەوە و، خۆیشی پەیوەست بێت پێیانەوە و، دەست لە داوێنیان گیر بکات. تاکو ئەویش هاودەم لەگەڵ ڕەوتی ڕۆشتنی گشتینەی بوونەوەراندا بڕوات، بۆ ئەوەی پێی نەخلیسکێ و، فڕێ

ثم إنَّ النبيَّ لإدامةِ حاكميته في الظواهر والبواطنِ وفي العقولِ والطبائعِ يحتاجُ إلى امتيازٍ وتفوّقٍ مادةً ومعنى، سيرةً وصورةً، خَلقاً وخُلُقاً..

ويحتاجُ أيضاً إلى دليلٍ على قوةِ المناسبةِ بينه وبينَ مالكِ الملكِ صاحبِ العالَم، وما الدليلُ إلّا المعجزاتُ..

ثم لتأسيس إطاعةِ الأوامر وتأمينِ اجتنابِ النواهي يحتاجُ إلى إدامةِ تصوُّرِ عظمةِ الصانع وصاحبِ المُلك في الأذهانِ، وما هو إلا تجلي العقائدِ..

ثم لإدامة التصوُّرِ ورسوخِ العقائدِ يحتاجُ إلى مُذكِّرٍ مكرِّرٍ وعملٍ متجدِّدٍ، وما المذكِّرُ المكرِّرُ إلا العبادةُ.

ومنها: أنَّ العبادةَ لتوجيه الأفكارِ إلى الصانع الحكيمِ، والتوجّهِ لتأسيس الانقيادِ، والانقيادِ للإيصال إلى الانتظام الأكملِ والارتباطِ به، واتباعِ النظامِ لتحقيق سرِّ الحكمةِ. والحكمةُ يشهدُ عليها إتقانُ الصُنع في الكائنات.

ومنها: أنَّ الإنسانَ كالشجر الذي عُلّقَ على ذِروته كثيرٌ من خطوط الآلةِ البرقيةِ، قد التفَّتْ على رأسه رؤوسُ نظاماتِ الخِلقةِ، وامتدتْ مُشرَعةً إليه قوانينُ الفطرةِ، وانعكستْ مُتمركِزةً فيه أشعةُ النواميسِ الإلهيةِ في الكائنات..

فلابدَّ للبشر أنْ يتمّمَها ويربطَها وينتسبَ إليها ويتشبثَ بأذيالها، ليسريَ بالجَريانِ العموميِّ، حتى لا يُزلَقَ ولا يُطرَدَ ولا يُلقَى عن ظهر هذه الدواليبِ

نەدریێ و، لەسەر پشتی ئەم چەندین چەرخە بەجوولەیەی ناو چینەکانی بەدیهاتووان نەخرێتە خوارەوە.. خۆ ئەوەش تەنها بە "پەرستش" دەبێت، کە بریتی‌یە لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و خۆپاریزی لەو شتانەی نەهی‌یان لێ کراوە.

یەکێکی تریان: بە هۆی جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و خۆپاریزی لە شتانی نەهی لێ کراو، مرۆڤ چەندین پەیوەندیی بەرەو چەندەها پلەی زۆر و زەبەندە لە دام و دەستەی کۆمەڵگادا بۆ دروست دەبێت، ئیتر "تاکە" کەس بە وێنەی "ڕەگەز"ێکی لێ دێت، چونکە زۆرێك لە فەرمانەکان، بە تایبەت ئەوانەیان کە پەیوەندی‌یەکیان بە شەعائیر و بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەکانەوە هەیە، بە وێنەی ئەو ڕشتەیەوان کە گەلێ چۆنێتی‌یان لێ پەیوەست کراوە و چەندین مافیشیان تێدا هۆنراوە، گەر ئەو ڕشتەیە نەبێت ئەو چۆنێتی‌یانە لێك دەترازێن و ئەو مافانەش پەرت و بڵاو دەبنەوە.

یەکێکی تریان: مرۆڤی موسڵمان چەندین پەیوەندیی جێگیر و پەیوەست بوونی تۆکمەی لەگەڵ هەموو موسڵماناندا هەیە، کە ئەمانەش بە هۆی بیروباوەڕەکانی ئیمان و ڕەوشت و سیفەتە دامەزراوەکانی ئیسلامەوە، هۆکارن بۆ برایەتی‌یەکی توندوتۆڵ و خۆشەویستی‌یەکی ڕاستەقینە. هۆی هاتنەدیی ئەو بیروباوەڕەش لە موسڵماندا و بوونی بە سیفەت و خوویەکی جێگیر و دامەزراو، تەنها "پەرستش"ە.

سەبارەت بەوەش کە "پەرستش" هۆی کەماڵی خودی کەسەکانە، ئەوا بزانە کە:

مرۆڤ، سەرباری بچووکیی جەستەی و، لاوازی و، دەستەوسانی‌یەکەی و، ئەوەشی کە یەکێکە لە زیندەوەران، کەچی "گیان"ێکی بەنرخی لە خۆیدا هەڵگرتووە و، توانا و لێهاتنێکی تەواوەتیی تێدایە و، چەندین حەز و ئارەزووی نەبڕاوەی لە خۆیدا حەشار داوە و، چەندەها ئاواتی نەبڕاوەی هەیە و، گەلێ هەزری بێ سنووری پێیە و، چەندین هێزی دیاری نەکراوی تێدایە، لەگەڵ ئەوەشدا فیترەتی هێندە سەرسووڕهێنەرە کە دەڵێی پێرستێکە بۆ چەندەها ڕەگەز و جیهانی جۆراوجۆر.

جا هەر تەنها "پەرستش"ە کە هۆی کرانەوەی "گیان"ی مرۆڤ و دەرکەوتنی بەهای بێت و.. هەر ئەویش هۆی دەرکەوتن و گەشەکردنی "توانا و لێهاتنەکان"یەتی بۆ ئەوەی گونجاوی بەختەوەریی هەمیشەیی بێت و.. هەر "پەرستش"ە کە دەبێتە هۆی

المتحـركـةِ في الطبقاتِ. وما هي إلّا بالعبادة التي هي امتثالُ الأوامرِ واجتنابُ النواهي.

ومنها: أنَّ بامتثال الأوامرِ واجتنابِ النواهي يحصلُ للإنسان نِسَبٌ كثيرةٌ إلى مراتبَ عديدةٍ في الهيئة الاجتماعيةِ، فيصيرُ الشخصُ كنوعٍ؛ إذ كثيرٌ من الأوامر لاسيّما التي لها تماسٌّ بالشعائر والمصالحِ العموميةِ كالخيط الذي نيطَ به حيثياتٌ ونُظُمَ فيه حقوقٌ، لولاه لتمزقتْ وتطايرتْ.

ومنها: أنَّ الإنسانَ المسلمَ له مناسباتٌ ثابتةٌ وارتباطٌ قويٌّ مع كلِّ المسلمين. وهما سببان لأُخوَّةٍ راسخةٍ ومحبةٍ حقيقيةٍ بسبب العقائدِ الإيمانيةِ والمَلَكاتِ الإسلاميةِ. أما سببُ ظهورِ تلك العقائدِ وتأثيرِها وصيرورتِها مَلَكةً راسخةً فإنما هي العبادةُ.

وأما جهةُ الكمالِ النفسيّ، فاعلمْ أنَّ الإنسانَ مع صِغَرِ جِرمِه وضَعفِه وعَجزِه وكَوْنِه حيواناً من الحيوانات ينطوي على روحٍ غالٍ ويحتوي على استعدادٍ كاملٍ، ويتبطَّنُ ميولاً لا حصرَ لها، ويشتملُ على آمالٍ لا نهايةَ لها، ويحوزُ أفكاراً غيرَ محصورةٍ، ويتضمَّنُ قوىً غيرَ محدودةٍ، مع أنَّ فطرتَه عجيبةٌ كأنّه فهرستةٌ للأنواع والعوالمِ.

فالعبادةُ هي السببُ لانبساط روحِه وجَلاءِ قيمتِه.. وأيضاً هي العلّةُ لانكشاف استعدادِه ونموِّه ليناسبَ السعادةَ الأبديةَ.. وكذا هي الذريعةُ لتهذيب ميولِه ونزاهتِها..

پوختەکردن و خاوێنیی "حەز و ئارەزووەکانی" و.. هەر ئەوە دەبێتە هۆی هاتنەدیی "ئاواتەکانی" و، بەرهەم بەخش و پاراویان دەکات و.. هەر "پەرستش"ە کە دەبێتە مایەی رێکخستن و پەیوەست کردنی "هزرەکانی" و.. هەر ئەوە هۆکاری سنوور بۆ دانان و لەغاو کردنی "هێزەکانی" و.. هەر ئەویش لابەری ژەنگی سروشتە لەسەر ئەندامە ماددی و مەعنەوییەکانی، کە هەریەکەیان گەر روون و تەنك بکرێتەوە، بە وێنەی راپەوێنك وایە بەرەو جیهانی تایبەتی و جۆرێك لە جۆر و رەگەزەکان.. هەر "پەرستش"ە کە ئەگەر بە ویژدان و ژیری و دڵ و جەستە ئەنجام بدرێت، مرۆڤ دەگەیەنێتە شەرەفی شایان و کەماڵی بۆدیاریکراوی خۆی.. هەر ئەوە کە پەیوەندیی ورد و بلند و، پەیوەست بوونی شەرەفمەندانەی باڵایە لە نێوان بەندە و پەرستراویدا، کە هەر ئەو پەیوەندی و پەیوەست بوونەیە دوا پلەکانی کەماڵی مرۆڤە.

پاشان "ئیخلاس" لە "پەرستش"دا بریتییە لەوەی کە تەنها لەبەر ئەوە جێبەجێ بکرێت کە فەرمان بە ئەنجامدانی دراوە. خۆ هەرچەندەش هەموو یەکێکی فەرمانەکان چەندین دانستی وەهایان تێدایە کە هەر یەکەیان "عیللەت"(هۆکار)ی جێبەجێ کردنی ئەو فەرمانەن، بەڵام "ئیخلاس" داخوازی ئەوەیە کە "عیللەت"ی جێبەجێ کردنی، تەنها فەرمانەکە بێت. چونکە ئەگەر "دانست"ەکە ببێتە "عیللەت"ی ئەو جێبەجێ کردنە، ئەوا پەرستشەکە بەتاڵە. گەر تەرجیحدەریش بێت، دروستە.

* * *

پاشان کاتێ گوێ بیستان ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ﴾یان بیست، بە زمانی حاڵ پرسییان:

حیکمەتی "پەرستش" چییە؟ بۆچی ئەنجام بدرێت؟ چی ناچارمان دەکات جێبەجێی بکەین؟ لەبەر چی؟

"حیکمەت"ەکەیت لە پێشەکییەکەدا بیست.

سەبارەت بە "هۆکار"ەکەشی، ئەوا قورئان لە رێی چەسپاندنی "بوون" و "یەکتایی" بەدیهێنەر، بە فەرمایشتی: ﴿رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ..﴾ هتد و، چەسپاندنی "پێغەمبەرێتی"ش بە فەرمایشتی: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا..﴾ هتد، وەڵامی دانەوە.

وهي الوسيلةُ لتحقيق آمالِه وجعلِها مُثمرةً ريّانةً.. وكذلك هي الواسطةُ لتنظيم أفكارِه وربطِها.. وأيضاً هي السببُ لتحديد قواه وإلجامِها.. وأيضاً هي الصَيْقَلُ لرَيْنِ الطبيعةِ على أعضائِه الماديةِ والمعنويةِ التي كلٌّ منها كأنّه مَنفَذٌ إلى عالمٍ مخصوصٍ ونوعٍ إذا شفَّ.. وأيضاً هي المُوصِلَةُ للبشر إلى شَرَفِه اللائقِ وكمالِه المقدَّرِ، إذا كانت بالوجدان والعقلِ والقلبِ والقالبِ.. وكذلك هي النسبةُ اللطيفةُ العاليةُ، والمناسبةُ الشريفةُ الغاليةُ بين العبدِ والمعبودِ. وتلك النسبةُ هي نهايةُ مراتبِ كمالِ البشرِ.

ثم إنَّ الإخلاصَ في العبادة هو: أنْ تفعلَ لأنَّه أُمِرَ بها، وإنْ اشتملَ كلُّ أمرٍ على حِكَمٍ كلٌّ منها يكونُ علةً للامتثال، إلّا أنَّ الإخلاصَ يقتضي أنْ تكونَ العلةُ هي الأمرَ، فإن كانت الحكمةُ علةً فالعبادةُ باطلةٌ، وإنْ بقيتْ مُرجِّحَةً فجائزةٌ.

* * *

ثم إنَّ المخاطبين لما سمعوا ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ﴾ استفسروا بلسان الحال:

ما الحكمةُ؟ ولِمَ؟ وما المجبوريةُ؟ ولأيِّ شيءٍ؟

أما الحكمةُ فقد سمعتَ في المقدمة.

وأما العلّةُ فأجابَ القرآنُ بإثبات الصانعِ وتوحيدِه بقوله: ﴿رَبَّكُمُ الَّذِى خَلَقَكُمْ..﴾ الخ. وإثباتِ النبوّةِ بقوله: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا..﴾ الخ.

**پێشەكی‌یەك لەبارەی سەرنجەكانی ئەم ئایەتەوە:**

بزانە كە: "بەڵگە" یان "لیممی"یە كە بریتی‌یە لە بەڵگەهێنانەوە بە كاریگەر (المؤثــر) لەسەر كارتێكراو[١].. یان "ئینني"یە، كە بریتی‌یە لە بەڵگەهێنانەوە بە ئاسەوار و كارتێكراو لەسەر بوونی كاریگەر[٢]، كە ئەمەیان سەلامەت‌ترە. ئەوەش یان "بەڵگەی ئیمكان"ە، كە بەڵگەهێنانەوەیە بە یەكسانیی هەردوو لای شتێك لەسەر بوونی "تەرجیحدەر". یان "بەڵگەی حدووث"ە، كە بەڵگەهێنانەوەیە بە ڕوودانی "گۆڕانكاری" لەسەر بوونی "بەدیهێنەر". ئنجا هەریەك لەم دوانەش یان بە گوێرەی "خود"ی شتەكانن، یاخود بە گوێرەی "سیفەت"ەكانیان. هەریەك لەوانەش یان بە "بەخشینی بوون"ە، یاخود "بەردەوامكردنی مانەوە"یە. هەریەك لەوانەش یان "بەڵگەی داهێنان"ە، یاخود "بەڵگەی چاودێری".

جا ئەم ئایەتە، ئاماژەیە بۆ هەموو ئەم جۆرە بەڵگانە. لێرەدا بە كورتكراوەیی هێناومانە، لە كتێبێكی تردا بە درێژی لێیان دواین[٣].

- سەبارەت بە "بەڵگەی چاودێری" لەسەر سەلماندنی بوونی بەدیهێنەر، كە ئەم ئایەتە ئاماژەی بۆ دەكات، ئەوا بریتی‌یە لە: "سیستەمی نێوان بوونەوەران". چونكە سیستەم و ڕێسا ڕشتەیەكە سەرجەم دانست و بەرژەوەندی‌یەكانی تێدا هۆنراوەتەوە.

هەموو ئەو ئایەتانەی قورئان كە سوود و حیكمەتی شتەكان دەژمێرن، تانوپۆكار و پیشاندەری ئەم بەڵگەیەن. چونكە ئەو ڕێسایەی كە بە هۆیەوە چاودێریی حیكمەت و بەرژەوەندی‌یەكان دەكرێت، هەروەك "بوون"ی ڕێسا ڕێكخەر دەچەسپێنێت، بە هەمان جۆر دەبێتە بەڵگەش لەسەر "ئامانج" و "حیكمەت"ی بەدیهێنەر و، گومانی ڕێكەوتی كتوكوێر لەو نێوانەدا لا دەبات.

جا كاكە! ئەگەر ڕوانینت دەورانــدەوری ئەم سیستەمە باڵایە نادات كە بە نقێمی حیكمەتەكان ڕازێنراوەتەوە و، ناتوانیت "پشكنین و لێكۆڵینەوەی تەواو"[٤] ئەنجام

---

(١) وەك ئەوەی كە ئاگر دەبێتە بەڵگە لەسەر دووكەڵ.

(٢) وەك ئەوەی كە دووكەڵ دەبێتە بەڵگە لەسەر ئاگر. (ت)

(٣) مەبەست وتاری سێهەمی كتێبی "موحاكەمات"ە، كە لە بەرگی شەشەمی سەرجەمی پەیامەكانی نوور (داوەری‌یەكان)دا بە كوردی بڵاومان كردووەتەوە. (وەرگێڕ)

(٤) بۆ واتاكەی بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە: ١٤٦. (وەرگێڕ)

مقدمةٌ في نكات هذه الآيةِ:

اعلم أنَّ البرهانَ إما "لِمِّيٌّ" وهو الاستدلالُ بالمؤثِّر على الأثر[1]. وإما "إنّيٌّ" وهو الاستدلالُ بالأثر على المؤثِّرِ[2]،وهذا أسلمُ. وهو إما "إمكانيٌّ" بالاستدلال بتساوي الطرفين على المرجِّحِ، وإما "حدوثيٌّ" بالاستدلال بالتحوُّلِ والتبدُّلِ على المُوجِدِ.. وكلٌّ منهما إما باعتبار ذواتِ الأشياءِ أو باعتبار صفاتِها.. وكلٌّ منها إما بإعطاء الوجودِ أو بإدامةِ البقاءِ.. وكلٌّ منها إما "دليلٌ اختراعيٌّ" أو "دليلٌ عِنَايَتيٌّ"..

وهذه الآيةُ إشارةٌ إلى هذه الأنواعِ، فالملخَّصُ منها هنا، وقد فصّلْناه في كتابٍ آخَرَ[3].

* أما "دليلُ العنايةِ" على إثبات الصانعِ الذي تلوِّحُ به هذه الآيةُ، هو: "النظامُ المندمِجُ في الكائنات"؛ إذ النظامُ خيطٌ نيطَ به المصالحُ والحِكَمُ.

فجميعُ الآيات القرآنيةِ التي تَعُدُّ منافعَ الأشياءِ وتذكُرُ حِكَمَها إنما هي نسّاجةٌ لهذا الدليلِ، ومظاهرُ لتجلِّي هذا البرهانِ؛ إذ النظامُ المرعيُّ به المصالحُ والحِكَمُ كما يُثبِتُ وجودَ نظّامٍ، كذلك يدلُّ على قصدِ الصانعِ وحكمتِه وينفي من البَيْن وهْمَ التصادُفِ الأعمى والاتفاقيةِ العمياء.

يا هذا! إنْ لم يُحِطْ نظرُك بهذا النظامِ العالي المزيَّنِ بفصوص الحِكَمِ، ولا تقتدرُ على

---

(١) كدلالة النار على الدخان.

(٢) كدلالة الدخان على النار. (ت)

(٣) المقصود المقالة الثالثة من كتاب "محاكمات عقلية" المنشور ضمن مجلد "صيقل الإسلام".

بدەیت، ئەوا بە چاوی هەوالگرانی زانستەکان بڕوانە - کە هەستەوەرەکانی ڕەگەزەکەتن - کە ئەوانیش دەرەنجامی بە دوای یەکدا هاتنی هزرەکانن - کە ئەویش لە حوکمی هزری ڕەگەزەکەدان - تاکو سیستەمێکی ئەوتۆ ببینیت کە ژیرییەکان سەرسام دەکات و.. بۆ ئەوەش بزانیت کە هەریەك لە زانستەکانی لەمەڕ بوونەوەران، لە ڕێی هەمەکی بوونی دەستوورەکانیەوە، خشتی و ڕێکوپێکییەکی ئەوتۆ لەو بوونەوەرانەدا دەردەخات کە ژیریی مرۆڤ لەوانە کاملتر شك نابات. چونکە هەموو یەکێکی ڕەگەز و جۆرەکانی بوونەوەران یان زانستێکی تایبەت بە خۆی تێدا پێك هاتووە، یان ڕێ بەوە دەدات کە ئەو زانستەی تێدا پێکبێت.

"زانست"یش بریتییە لە چەند دەستوورێکی هەمەکی. ئنجا هەمەکی بوونی دەستووریش بەلگەیە لەسەر جوانیی ڕێسا، چونکە هەر شتێك ڕێسایەکی نەبێت "هەمەکی بوون"یشی تێدا نابێت.

ئایا نابینی گەر بلێین: "هەموو زانایەك مێزەرێکی سپیی بە سەرەوەیە" کاتێ بە هەمەکێتی ڕاست دەردەچێت کە ئەو جۆرە (واتە زانایان) ڕێکوپێکییان تێدا هەبێت؟

لەمەوە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە:

هەموو یەکێکی زانستە گەردوونییەکان، لەبەر هەمەکی بوونی دەستوورەکانی، لە ڕێی "پشکنین و لێکۆلینەوەی تەواو"ەوە، ڕێسایەکی کامڵ و گشتگیر بەرهەم دەهێنێت..

هەروەها هەموو یەکێکی ئەو زانستانەش بەلگەیەکی ڕووناکە، ئاماژە بۆ ئەو بەرژەوەندی و بەروبوومانە دەکات کە بە وێنەی چەند هێشوویەك بە ئەلقەکانی زنجیرەکانی بوونەوەراندا شۆڕ بوونەتەوە و، ئاماژە بۆ ئەو دانست و سوودانە دەکات کە لەناو پێچاوپێچی ئالوگۆڕی حالەتەکاندا حەشار دراون..

ئیتر "زانستەکان" ئالای "شایەتی" هەلدەکەن لەسەر مەبەست و دانستی بەدیهێنەر. وەك بلێی هەموو یەکێکی ئەو زانستانە ئەستێرەیەکی کوناودەرکەر بێت بۆ وەدەرنانی شەیتانەکانی ورووژاندنی گومانەکان.

ئەگەر نموونەت دەوێ، فەرموو سەیری ئەم نموونەیە بکە، بێ گوێدانە گشتی بوون. کە بریتییە لەوەی:

الاستقراء التامّ؛ فانظرْ بجواسيس الفنونِ – التي هي الحواسُّ لنوعك – الحاصلةِ مِن تلاحُق الأفكارِ ــ الذي هو في حُكمِ فكرِ النوعِ – لترى نظاماً يبهَرُ العقولَ، وتعلمَ أنَّ كلَّ فنٍّ من فنون الكائناتِ كشّافٌ بكليةِ قواعدِه عن اتساقٍ وانتظامٍ لا يُعقَلُ أكملُ منهما؛ إذ كلُّ نوعٍ من الكائنات إما تَشكّلَ فيه فنٌّ أو يقبَلُ أنْ يتشكلَ.

والفنُّ عبارةٌ عن قواعدَ كُلّيةٍ. وكلّيةُ القاعدةِ تدلُّ على حُسْنِ النظامِ؛ إذ ما لا نظامَ له لا تجري فيه الكليةُ..

ألَا ترى أنَّ قولَنا: "كلُّ عالمٍ فهو ذو عِمامةٍ بيضاءَ" إنما يصدُق كُلِيّةً إذا كان في ذلك النوعِ انتظامٌ.

فأنتجَ: أنَّ كلَّ فنٍّ من الفنون الكونيةِ، بسببِ كُلّيةِ قواعدِه يُنتِجُ بالاستقراء التامّ نظاماً كاملاً شاملاً..

وأنَّ كُلَّ فنٍّ برهانٌ نيّرٌ يشيرُ إلى المصالح والثمراتِ المتدليةِ كالعناقيد في حلَقاتِ سلاسِلِ الموجودات، ويلوِّحُ إلى الحِكَمِ والفوائدِ المستترةِ في معاطِف انقلاباتِ الأحوالِ. فتَرْفعُ الفنونُ أعلامَ الشهادةِ على قصدِ الصانعِ وحكمتِه، كأنَّ كلَّ فنٍّ نجمٌ ثاقبٌ في طرد شياطينِ الأوهامِ.

وإنْ شئت فعليك بهذا المثالِ مع قطعِ النظرِ عن العمومِ، وهو:

ئەو زیندەوەرە مایکرۆسکۆبی‌یە وردەی کە بێ ئامێری هۆکاری بینین و بە چاوی سەر نابینرێت، شێوە ڕواڵەتی‌یە بچووکەکەی مەکینەیەکی ورد و ناوازەی خوایی لەخۆ گرتووە. خۆ شتێکی بێگومان و بەڵگەنەویستە کە ئەو مەکینە گونجاوە، چ خودی خۆی چ سیفەتەکانی، لە خۆڕا و بە بێ هۆکار پەیدا نەبووە، چونکە زات و سیفەتەکان و حاڵەتەکانی ئەو مەکینەیە لە جۆری "مومکین" (گونجاو)ن، خۆ بوون و نەبوونی شتی "مومکین"یش بە وێنەی هەردوو تای تەرازوو یەکسانن و، گەر یەکێك لەو دوانە بۆ خۆی خۆی زاڵ بکردایە، ئەوا ئەو زالکردنە لە "نەبوون"یدا دەبوو..

لەبەر ئەوە، بە یەکگرتنی قسەی ژیران و هۆشمەندان دەبێ "عیللەت"ێك هەبێت "بوون"ی بەسەر "نەبوون"یدا زاڵ بکات. کارێکی مەحاڵیشە کە ئەو "عیللەت"ە چەند هۆکارێکی سروشتی بێت، چونکە ئەو سیستەمە وردەی کە لەو مەکینە بچووکەدا هەیە داخوازی ئەوپەڕی زانست و، کەماڵی هەستێك دەبێت کە هەرگیز ئەو هۆکارانەی ئەوان خۆیانی پێ دەخەڵەتێنن، دارای شتی وا نین. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هۆکارانە ساکار و کەم و بێ گیانن و، شوێنی هاتووچۆ و جووڵەیان دیاری نەکراوە، هاوکات لەگەڵ گیرخواردنیان لە نێوان هەزاران گرێمانی ئەوتۆدا کە هیچیان زیادە مافی پێشخستنی بەسەر ئەوانی تردا نی‌یە..

(جا کە ئەمە حاڵی هۆکارەکانە) ئیتر چۆن بە ڕاڕەوێکی دیاریکراودا دەڕۆن و، بەسەر شوێنێکی دەستنیشانکراوی بزواندندا دەجووڵێن و، چۆن چۆنی هەندێ لە ڕووە گونجاوەکان خۆیان زاڵ دەکەن هەتا ئەم مەکینە سەرسوورهێنە ڕێکوپێکە پەیدا ببێت کە ژیری‌یەکان لە وردەکاریی دانستەکانیدا سەرسام ماون؟

"دەروون"ت تەنها کاتێ قەناعەت دەکات و دڵنیا دەبێت کە ئەو مەکینەیە لەو هۆکارانەوە پەیدا بوو بێت، کە هەست و شعووری "ئەفلاتوون"[1] و دانستی "گالینووس"[2] بە هەموو گەردیلەیەك بدەیت و، لەو باوەڕەدا بیت کە تەلەفۆنێکی

(١) ئەفلاتوون: (٤٢٧-٣٤٧پ.ز) فەیلەسووفێکی کۆن و ناوداری یۆنانە و، یەکێکە لە گەورە فەیلەسووفانی خۆرئاوا و، لە قوتابیانی "سوقرات"ە.

(٢) گالینووس: (١٢٩-٢٠٠ز) نووسەر و پزیشکێکی یۆنانی‌یە. لە یۆنان و ئاسیای بچووك و ئەسکەندەری‌یە خوێندوویەتی. پاشان لە ڕۆما نیشتەجێ بووە. گەلێ بەرهەمی بەجێ هێشتووە، زۆربەیان لە پزیشکی و فەلسەفەدایە.

أنَّ الحيوانَ المكروسكوبيَّ الذي لا يُرى بالعين بلا واسطة، اشتملتْ صورتُه الصغيرةُ على ماكينة دقيقةٍ بديعةٍ إلهية. فبالضرورة والبداهةِ أنَّ تلك الماكينةَ الممكنةَ في ذاتها وصفاتِها ما وُجِدَتْ بنفسِها بلا علّةٍ، لإمكان ذاتِها وصفاتِها وأحوالها. والممكِنُ متساوي الطرفين ككفتَي الميزانِ، ولو وُجِدَ الترجّحُ لكان في العدم..

فباتفاقِ العقلاءِ لابدَّ لها مِن علّةٍ مُرجِّحَةٍ.. ومن المحالِ أنْ تكونَ العلةُ أسباباً طبيعيةً؛ إذ ما فيها من النظامِ الدقيقِ يقتضي نهايةَ عِلمٍ وكمالَ شعورٍ لا يمكنُ تصورُهما في تلك الأسبابِ التي يخادِعون أنفسَهم بها. مع أنها أسبابٌ بسيطةٌ قليلةٌ جامدةٌ لم يتعينْ مجاريها، ولم يتحددْ محاركُها، مع تردُّدِها بين ألوفٍ من الإمكانات التي لا أولَويةَ لبعضها..

فكيف تجري في مجرى معيّنٍ، وتتحرَّكُ على مُحرَكٍ محدودٍ، وكيف يترجَّحُ بعضُ وجوهِ الإمكاناتِ حتى تتولَّدَ هذه الماكينةُ العجيبةُ المنتظمةُ التي حيَّرت العقولَ في دقائق حِكَمها..

بل إنما تقنعُ نفسُك وتطمئنُّ بتولّدِها منها إنْ أَعطيتَ لكلِّ ذرّةٍ شعورَ "أفلاطونَ" وحِكمةَ "جالينوسَ" واعتقدتَ بين تلك الذرات مخابَرةً عموميةً..

گشتی لە نێوان ئەو گەردیلانەدا هەبێت! خۆ ئەوەش "سەفسەتە" یەکە[1] تەنانەت کەسی "سۆفستائی"یش[2] شەرم لە وتنی دەکات.

ئەمەش لە کاتێکدایە کە بەردی بناغەی هۆکارە ماددییەکان، بریتییە لە بوونی "هێزی کێشکەر" و "هێزی پاڵنەر" پێکەوە لەناو گەردیلە و بەشێکی هێندە بچووکدا کە بەشکردن و پەرت بوون هەڵناگرێت! خۆ ئەمەش وەکو ئەوە وایە کە دوو شتی دژ بە یەك کۆ بوو بێتنەوە!

بەڵێ، یاساکانی کێش و پاڵنەر و هاوشێوەیان "ناو"ن بۆ یاساکانی عادەتەکانی خوای گەورە و شەریعەتەکەی کە ناوی "سروشت"ی لێ نراوە..

جا ئەم یاسایانە قبووڵ دەکرێن، بە مەرجێ لەوە نەگوێزرێنەوە کە یاسا و دەستوور بن و، نەکرێن بە "سروشت".. لە خاوەن بوونێکی زیهنییەوە نەکرێن بە خاوەن بوونی دەرەکی.. لە شتی گوێرەییەوە نەگۆڕرێن بە شتی ڕاستەقینە.. لەوەی کە "ئامێر"ن بەرز نەکرێنەوە بۆ ئەوەی کە "کاریگەر" بن.

جا ئەگەر لەوەی ناو نموونەکە تێگەیشتیت و، لەگەڵ بچووکییەکەیدا گەورەییەکەی و، هاوکات لەگەڵ تەسکییەکەیدا فراوانییەکەیت بینی، ئەوا فەرموو سەرت بەرز بکەرەوە و سەیری بوونەوەران بکە، "بەڵگەی چاودێری"یان هێندە بە ڕوونی تێدا دەبینیت کە بە ئەندازەی پلەی فراوانیی بوونەوەران دەبێت.

هەموو یەکێکی ئەو ئایەتانەی قورئان کە نیعمەتی شتەکان دەژمێرن و سوودەکانیان یاد دەخەنەوە، ئەم بەڵگەیە پێش چاو دەخەن.

---

(١) بۆ واتاکەی بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە: ١٥٠. (وەرگێڕ)

(٢) سۆفستائییەکان: دەستەیەك بوون لە فەیلەسووفەکانی یۆنانی کۆن، کە دوای قوتابخانەی "فیساگۆرس" و لە ئەنجامی ئاڵۆزیی باری ڕامیاری و قەیرانی ئابووری پەیدا بوون. ئەم دەستەیە ئینکاریی حەقیقەتی شتانیان کردووە و لایان وا بووە کە هیچ شتێك دارای حەقیقەت نییە. "گۆرگیاس" و "پرۆتاگۆراس" بەناوبانگترینی فەیلەسووفە سۆفستائییەکانن. ئەم تاقمەش لەناو خۆیاندا چەند بەشێکن. کاتی خۆی "سوقرات" زۆر بە توندی بەرپەرچی داونەتەوە. بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەم جۆرە کەس و بیر و ڕایانە لە هەموو سەردەمێکدا بە کاڵای نوێ و ناوی جۆراوجۆرەوە پەیدا دەبنەوە. بۆ زیادە شارەزابوون سەیری ئەم سەرچاوانە بکە: "شرح العقائد النسفية" لسعدالدين التفتازاني ص ٢٣-٢٥ طبعة تركيا سنة ١٣٢٦ هـ، "كشاف إصطلاحات الفنون" للتهانوي ج١/ص٦٦٥ طبعة كلكته في الهند عام ١٨٦٢م، "الموسوعة الفلسفية الميسرة" ج١/ص١٠٣٤ طبعة دار نهضة لبنان – بيروت سنة ١٩٦٥م. هەروەها پێشەکیی (مهدی توحیدی پور) بۆ (نفحات الأنس)ی مەولانای جامی ص ٦٩-٧٠ ناشر: کتابفروشی سعدی. (وەرگێڕ)

وما هـذه إلّا سفسطةٌ يَخجَلُ منها السوفسطائيُّ.

مع أنَّ أُسَّ الأسبابِ الماديةِ وجودُ القوَّةِ الجاذبةِ والقوةِ الدافعةِ معاً، في جزءٍ لا يتجزّأُ والجوهرِ الفردِ، وإنّ هذا كاجتماع الضدَّين.

نعم، قانونُ الجاذبةِ والدافعةِ وأمثالُهما أسماءٌ لقوانينِ عاداتِ الله تعالى وشريعتِه الفطريةِ المسماةِ بالطبيعة.

فهذه القوانينُ مقبولةٌ بشرط أنْ لا تنتقلَ من القاعديةِ إلى الطبيعيةِ، وأنْ لا تخرجَ من الذهنية إلى الخارجية، وأنْ لا تتحوّلَ من الاعتبارية إلى الحقيقية، وأنْ لا تترقّى من الآلَتِيَّة إلى المؤثِّرية.

فإذ تفهّمت ما في هذا المثالِ ورأيت عظمتَه مع صِغَره، ووسعتَه مع ضيقِه؛ فارفعْ رأسَك وانظرْ في الكائنات ترَ وضوحَ "دليلِ العنايةِ" وظهورَه بمقدار درجةِ وُسعةِ الكائناتِ..

فكلُّ الآياتِ القرآنيةِ العادَّةِ لنِعَمِ الأشياءِ والمذكِّرةِ لفوائدِها مظاهرُ لهذا الدليلِ..

هەرکاتێ قورئان فەرمانی بە "بیرکردنەوە" دابێت، ئەوا بە ئاراستەکردنی گفتوگۆی بۆ گشتینەی خەڵك، ئاماژەی بۆ ڕێی ئەم بەڵگەهێنانەوەیە کردووە:

﴿فارجِعِ الْبَصَرَ هلْ تَرَى مِنْ فُطورٍ﴾؟ (الملك: ٣).

پاشان ئەو شتەی کە لەم ئایەتەدا هێمایە بۆ ئەم بەڵگەیە، بریتی‌یە لەم فەرمایشتەی خوای گەورە کە دەفەرموێ:

﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَكُمْ﴾.

- سەبارەت بە "بەڵگەی داهێنان"یش کە بەم ئایەتە ئاماژەی بۆ کراوە: ﴿الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ ئەوا بریتی‌یە لەوەی کە:

خوای گەورە "بوون"ێکی تایبەتیی بە هەموو "تاك" و هەموو "جۆر"ێك بەخشیوە کە مایەی سەرهەڵدانی ئاسەوارە تایبەتی‌یەکانی ئەو تاکە یاخود ئەو جۆرەیە و، سەرچاوەی ئەو کەماڵاتەی ئەوە کە شایستەیەتی. چونکە هیچ "جۆر"ێك لە جۆرەکان، لەبەر ئەوەی یەکێکە لە "مومکینات" و، لەبەر ئەوەش کە "تەسەلسول" مەحاڵە، ئەوا هەتا ئەزەل زنجیرە نابەستێ. هەروەها لەبەر ئەوەش کە ئەم گۆڕانکاری‌یەی بەسەر جیهاندا دێت، ڕوودانی هەندێکی بە چاو دەبینرێت و هەندێکی دیکەشی "ژیری" بە پێویستی دەزانێت.

پاشان بە هۆی هەردوو زانستی زیندەوەرزانی و ڕووەکزانی‌یەوە سەلماوە کە "جۆرەکان"ی زیندەوەر و ڕووەك، زیاتر لە دووسەد هەزار جۆرن و، تا ئەو ڕادەیە زۆری‌یان تێکەوتووە. هەریەك لەو جۆرانەش "ئادەم" و باوکێکی باڵایان هەیە.

جا بە هۆی نهێنیی "حدووث و ئیمکان"ەوە، بە بێ گومانی دەسەلمێت کە ئەو ئادەم و باوکانەی جۆرەکان، ڕاستەوخۆ بێ هیچ ناوەندە هۆکارێك، لە دەستی توانستی خواییەوە دەرهاتوون و، هەرگیز ئەو گومانەیان تێدا نی‌یە کە لە زنجیرە بەستنی "تەسەلسول"دا هەیە.

گومانی ئەوەش کە "جۆرەکان"(ی زیندەوەران) لە یەکترەوە جیا بووبنەوە، گومانێکی بەتاڵە. چونکە جۆری ناوەڕاست لە زۆربەیاندا بە وەچە لێ کەوتنەوە زنجیرەیان لێ نابێتەوە، کەواتە نابێتە سەرەتای زنجیرەیەك..

جا ئەگەر بناغە و سەرەتا ئاوا بن، ئەوا بەشەکانی زنجیرەکە باشتر وەها دەبن.

فكلّما أمرَ القرآنُ بالتفكر فإنّما أشارَ مخاطِباً للعموم إلى طريق هذا الاستدلالِ :

﴿فارجعِ الْبَصَرَ هلْ تَرَى مِنْ فُطورٍ﴾؟ (الملك: ٣).

ثم إنَّ الذي يومئُ إلى هذا الدليلِ من هذه الآيةِ، قولُه تعالى:

﴿الَّذِى جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَكُمْ﴾.

* وأما "الدليلُ الاختراعيُّ" المشارُ إليه بقوله تعالى: ﴿الَّذِى خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ فهو:

أنَّ اللهَ تعالى أعطَى لكلِّ فردٍ ولكلِّ نوعٍ وجوداً خاصّاً هو منشأُ آثارِه المخصوصةِ، ومنبعُ كمالاتِه اللائقةِ؛ إذ لا نوعَ يتسلسَلُ إلى الأزلِ لإمكانِه، ولبُطلان التسلسُلِ، ولأنَّ هذا التغيُّرَ في العالَمِ يُثبِتُ حدوثَ بعضٍ بالمشاهدة، وبعضٍ آخَرَ بالضرورة العقليةِ.

ثم إنَّه قد ثبتَ بعلم الحيواناتِ والنباتاتِ تكثُّرُ الأنواعِ إلى أزيدَ مِن مائتَي ألفِ نوعٍ، ولكلِّ نوعٍ آدمٌ وأبٌ عالٍ.

فبسرِّ الحدوثِ والإمكانِ يثبتُ بالضرورة صدورُ تلك الأوادمِ والآباءِ للأنواع عن يد القدرةِ الإلهيةِ بلا واسطةٍ. ولا يُتوهَّمُ فيها ما يُتوَهّمُ في السلسلةِ.

وتَوَهُّمُ انشقاقِ الأنواعِ بعضِها عن بعضٍ باطلٌ؛ لأنَّ النوعَ المتوسطَ لا يتسلسَلُ بالتناسُلِ في الأكثرِ، فلا يكونُ رأسَ سلسلةٍ.

فإذا كان المبدأُ والأصلُ هكذا، فأجزاءُ السلسلةِ كذلك بالطريق الأَوْلَى.

بەڵێ، چۆن بۆچوونی وا بە زەینی مرۆڤدا دێت کە هۆکارە سروشتی‌یە سادە و، بێ گیان و، بێ هەست و ویستەکان، توانای بەدیهێنانی ئەو زنجیرانەیان هەبێت کە تێگەیشتنەکان تیایاندا سەرسام ماون؟ یان بۆ هێنانەبوونی تاکەکانی زنجیرەی جۆرەکان توانای بەدیهێنانیان هەبێت کە هەریەکەیان سنعەتێکی سەرسوورهێنەرە لە موعجیزاتی توانستی خوای گەورە؟

کەواتە هەموو یەکێکی تاکەکان لەناو زنجیرەی جۆرەکەیدا، بە زمانی "حــدووث و ئیمکان"ی، شایەتی‌یەکی بێ گومان دەدات لەسەر پێویستیی بوونی بەدیهێنەری خۆی، جل جلالە.

* ئەگەر وتت:

لەگەڵ ئەوەدا کە ئەم شایەتی‌یە ئاوا بێ گومانە، ئیتر چۆن مرۆڤ باوەڕ بە گومڕاییەکانی چەشنی "ئەزەلییەت"ی ماددە و جووڵەکانی دەکات؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێ:

هەندێ جار ڕوانینی شوێنکەوتەیی(تَبَعــي) شتی مەحاڵ بە مومکین (گونجاو) دەبینێت، بە وێنەی ئەو کەسەی کە بە دوای مانگی یەك شەوەدا دەگەڕا، لەو کاتەدا مووە سپی‌یەکەی پێڵووی خۆی لێ بوو بە مانگی یەك شەوەی جەژن! چونکە مرۆڤ بە هۆی گەوهەرە بلند و ناوەرۆکە ڕێز لێ گیراوەکەیەوە، تەنها بە دوای حەق و ڕاستیدا دەگەڕێت، کاتێکیش "ناحەق" و گومڕایی دەکەونە ناو دەستی، ئەوا بە بێ ویست و گەڕانی خۆیەتی، بەڵکو بە هۆی ڕوانینی سەرزارەکی و شوێنکەوتەییەوە ئەوە ڕوو دەدات و، لە ناچاریدا قبووڵی دەکات.

چونکە کاتێ مرۆڤ خۆی لەو سیستەمە گێل کرد کە ڕشتەی هۆنینەوەی دانستەکانە و، چاوی لە دژایەتی کردنی ماددە و جووڵەکەی بۆ ئەزەلییەت نووقاند، ئەوا لە لای ڕوانینە شوێنکەوتەییەکەی گریمانی ئەوە پەیدا بوو کە ئەم نەخشە ناوازە و سنعەتە سەرسوورهێنەرە بدرێتە پاڵ ڕێکەوتی کوێر و یەکگرتنی تاك چاو، وەك ئەوەی کە "جسری"[1] لەبارەی کەسێکەوە وتوویەتی کە ڕۆشتبێتە ناو کۆشکێکی ڕازاوەی

---

(١) حسین الجسر: لە (تەرابلوس)ی لوبنان لەدایك بووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە. لە نێوان ساڵەکانی (١٢٦١-١٣٢٧ك/١٨٤٣-١٩٠٩ز)دا ژیاوە. ساڵی (١٢٨٤ك) خوێندنی لە ئەزهەر تەواو کردووە. کە گەڕاوەتەوە بۆ تەرابلوس بەکە پیاوی لەوێ و شاعیر و زانا و فەقیهێکی بەناوبانگی سەردەمی

نعم، كيف يُتصوَّرُ أنْ تكونَ الأسبابُ الطبيعيةُ البسيطةُ الجامدةُ التي لا شعورَ لها ولا اختيارَ قابلةً لإيجاد تلك السلاسِلِ التي تحيَّرَت الأفهامُ فيها، ولاختراعِ أفرادِها التي كلٌّ منها صنعةٌ عجيبةٌ من معجزات القدرةِ.

فكلُّ الأفرادِ مع سلاسِلها تشهدُ بلسان حدوثِها وإمكانِها شهادةً قاطعةً على وجوبِ وجودِ خالقِها جلَّ جلالُه.

* إنْ قلتَ:

فمع هذه الشهادةِ القاطعةِ كيف يعتقدُ الإنسانُ بأمثالِ ضلالاتِ أزليةِ المادةِ وحركتِها؟

قيل لك:

إنَّ النظرَ التَّبَعِيَّ قد يَرى المحالَ مُمكناً، كالمستهلِّ الذي رأى الشعرةَ البيضاءَ من أهدابِه هلالَ العيدِ؛ لأنَّ الإنسانَ بسببِ جوهرِه العالي وماهيتِه المكرَّمةِ إنما يدورُ خلفَ الحقِّ والحقيقةِ. وإنما يقعُ الباطلُ والضلالُ في يده بلا اختيارٍ ولا دعوةٍ ولا تحرٍّ، بل بنظرِه السطحيِّ التبَعيِّ فيقبلُه اضطراراً..

لأنَّه لَمّا تغافلَ عن النظامِ الذي هو خيطُ الحِكَمِ، وتعامَى عن ضِدِّيةِ الحركةِ والمادةِ للأزليةِ، احتملَ عند نظرِه التبَعيِّ إسنادُ هذا النقشِ البديعِ والصنعةِ العجيبةِ إلى التصادفِ الأعمى والاتفاقِ الأعورِ. كما قال "الجسريُّ" في مَنْ دخلَ قصراً مُزيناً مشتملاً على آثار

ئەوتۆ هەموو ئاسەواری شارستانێتیی تێدا بێت و، کاتێ خاوەنی کۆشك نابینێت، باوەڕ بە نەبوونی خاوەن کۆشك دەهێنێت و، ئنجا ناچار دەبێت ئارایشتەکانی کۆشك و بناغەکانی بداتە پاڵ یەکگرتن و ڕێکەوت و یاسای هەڵبژاردنی سروشتی!

هەروەها لەبەر ئەوەی کە خۆی گێل و نابینا کرد لە شایەتیدانی سەرجەم دانست و سوودەکانی ناو سیستەمی جیهان، لەسەر بوونی ویستێکی تەواوەتی و زانستێکی هەمەلایەنگیر و توانستێکی کامڵ، ئەوا لای ڕوانینە شوێنکەوتەییەکەی لەو گریمانی سەلماندنی ئەوە پەیدا بوو کە ئەم هۆکارە بێ گیانانە کاریگەریی ڕاستەقینەیان هەبێت!

دەسا کاکە! سەرباری وردەکارییەکانی سنعەتی خوای گەورە.. فەرموو، بەو مەرجەی کە پەردەی پێوە ڕاهاتن بدڕێنیت، سەرنج لە ئاشکراترینی ئاسەوارەکان بدە کە پێی دەوترێت "سروشت" و، کە لە ڕاستیدا "وێنە تیادەرکەوتن"ە..

ئایا چۆن قەناعەت بە خۆت دەکەیت و ژیریت قبووڵی ئەوە دەکات کە تایبەتکاریی ڕووی ئاوێنە، هۆکارێکی کاریگەری گونجاو بێت بۆ کێوماڵ کردنی ڕووی ئاسمان و هێنانی وێنەی بەرزییەکەی و، نەخش کێشانی - بە ئەستێرەکانیەوە - لەو شووشە بچکۆلەکەیدا؟

یان چۆن ژیریت قەناعەت دەکات کە ئەو شتەی لە ڕاستیدا وەهمییە و ناوی "کێشی گشتی"ی لێ نراوە، هۆکارێکی کاریگەری چەشنی دەزووی مەنجەنیق[1] بێت بۆ ڕاگیر کردنی زەوی و ئەستێرەکان و، جووڵاندن و خولاندنەوەیان بە ڕێسایەکی ئاوا توندوتۆڵ؟

دەرئەنجام:

گەر مرۆڤ بە ڕوانینی سەرزارەکی و شوێنکەوتەیی بڕوانێتە شتی بەتاڵ و، هۆکارە ڕاستەقینەکە نەبینێت، ئەوا گریمانی ڕاست بوونی ئەو ڕوانینەی لەلا دروست دەبێت.. بەڵام گەر بە مەبەست و، بۆ خودی شتە بەتاڵەکە بڕوانێت و، بە وێنەی کرپار لە دووی بگەڕێت، ئەوا ناگونجێ هیچ کام لەو مەسەلانە قبووڵ بکات کە لە بەشی

---

خۆی بووە. چەند بەرهەمێکی هەیە، بەناوبانگترینیان: (الرسالة الحميدية) و (الحصون الحميديـــة)یە. بڕوانە: (الأعلام)ی زەرکەلی ٢٥٨/٢.

(١) مەنجەنیق: ئامێری ئاگرهاوێژ. (وەرگێڕ)

المدنيةِ، من أنَّه حينما لا يرى صاحبَه فيعتقدُ عدمَه يضطرُّ لإسناد زينتِه وأساساتِه إلى الاتفاقِ والتصادُفِ وناموسِ الانتخابِ الطبيعيِّ.

وأيضاً لما تعامَى وتغافَلَ عن شهادة كلِّ الحِكَمِ والفوائدِ في نظام العالَمِ على اختيارٍ تامٍ وعلمٍ شاملٍ وقدرةٍ كاملة، احتملَ في نظره التبَعيِّ إثباتُ تأثيرٍ حقيقيٍّ لهذه الأسبابِ الجامدة.

فيا هذا!

مع قطعِ النظرِ عن دقائق صنعتِه جلَّ جلالُه تأمّلْ في أظهر الآثارِ التي تُسمى "طبيعةً" وهو الارتسامُ - بشرط أنْ تمزِّقَ حجابَ الأُلفة - كيف تُقنِعُ نفسَك ويَقبَلُ عقلُك أنَّ خاصيةَ وجهِ المرآةِ علّةٌ مؤثِّرةٌ مناسبةٌ لكشطِ وجهِ السماء، وجَلْبِ صورةِ ارتفاعِها ونقشِها بنجومها في زُجَيْجَتها؟

وكيف يَقنَعُ عقلُك بأنَّ الأمرَ الوهميَّ في الحقيقة المسمَّى بالجاذب العموميِّ علةٌ مؤثِّرةٌ كخيط المنجنيقِ لإمساك الأرضِ والنجومِ وتحريكِها وتدويرِها بانتظامٍ مُحكَم؟

الحاصلُ:

أنَّ الإنسانَ إذا نظرَ نظراً سطحياً تبَعيّاً إلى الأمر الباطلِ المُحال ولم يرَ العلّةَ الحقيقيةَ احتملَ صحتَه عنده.

إلّا أنّه إذا نظرَ إليه قصداً وبالذات وتحرّاهُ مشترياً له لا يمكنُ أنْ يقبلَ شيئاً من تلك

"حیكەمیات"(ی فەلسەفە)دا بە ویزەویز لێی دەدوێن. مەگەر هێندە خـۆی گێژ و گـەمژە بكات كە گریمانی بوونی ژیریی دانایان و دانستی ڕامیاران لەناو گەردیلەكاندا دابنێت.

* ئەگەر وتت:

ئەو سروشت و یاسا و هێزانە چین كە لەبەر خۆیانەوە خورتە و ورتـەی پێ دەكـەن و كاتی خۆیانی پێ بەسەر دەبەن[1]؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

سروشت:

ڕاستەیە، نەك چاوگ.. چاپخانەیە، نەك چاپكەر.. چەند یاسایەكە، نەك هـێز.. بەڵكو تەنها و تەنها شەریعەتێكی فیتریی خـوای گەورەیە كە سیستەمێكی لـە نێـوان كرداری ئەندامەكانی جەستەی جیهانی بینراودا داناوە، بە وێنەی "شـەریعەت" كـە دەرەنجام و پوختەی ئەو دەستوورانەیە هی كردارە ئیختیارییەكانن و، بـە وێنـەی ئـەوەش كە "سیستەمی دەوڵەت" كۆی دەستوورە سیاسییەكانیەتی..

جا هەروەك "شەریعەت" و "سیستەم" دوو شتی "گوێرەیی"ن، لە ڕێی "ژیری"یەوە دەزانرێن، بـە هـەمان جـۆر "سروشـت"یـش شـتێكی گوێرەییـە و، پوختـەی عـادەتی دەستبەكاری خوای گەورەیە لە بەدیهاتووانیدا.

وەهمكردنی ئەوەش كـە "سروشـت" بوونـی دەرەكیی هـەبێت، ئـەوا وەكـو هـی ئـەو كەسە كێوییە وایە كاتێ كە دەبینێت سوپایەكی سـەربازی بـە ڕێكوپێكـی دەجووڵێـن، گومانی ئەوە دەبات كە شتێكی دەرەكی (ماددی) ئەوانی پێكەوە گرێ دابێت!

جا هەر كەسێك ویژدانی كێوی بێت، ئەوا بە هۆی بەردەوامیی یاساكانی سروشـت، لەو گومانەدا دەبێت كە "سروشت" خاوەن بوونێكی دەرەكیی كاریگەر بێت!

دەرەنجام:

"سروشت" سنعەتی خوای گەورە و شـەریعەتە فیترییەكەیـەتی، یاساكانیشـی بریتـین لە یاسەكانی، هێزەكانیشی بڕیارەكانی ئەو یاسانەن.

---

(١) مامۆستا نوورسی ئەم بابەتەی لـە گەلـێ شـوێنی "پەیامەكانی نوور"دا تـاوتوێ كـردووە و، پـەیامێكی سەربەخۆیشی بە تایبەتی تێدا داناوە، كە بریسكەی بیست و سێهەم(پەیامی سروشت)ە.

المسائلِ التي يُطنطِنون بها في الحِكَمِيّاتِ، إلّا أنْ يَتبَلَّهَ بفرض عقلِ الحُكماءِ وحِكمةِ السياسيّين في الذرّات.

*إنْ قلت:

فما الطبيعةُ والنواميسُ والقُوَى التي يُدَمدِمون بها ويُسلّون أنفسَهم بها[1]؟

قيل لك:

إنَّ الطبيعةَ مِسْطرٌ[2] لا مَصدرٌ.. ومَطبعَةٌ لا طابعٌ.. وقوانينُ لا قوّةٌ. بل إنما هي شريعةٌ فطريةٌ إلهيةٌ أوقعتْ نظاماً بين أفعالِ أعضاءِ جسدِ عالَمِ الشهادة..

كما أنَّ الشريعةَ مُحصَّلُ وخلاصةُ قواعدِ الأفعالِ الاختياريةِ، ونظامُ الدولةِ مجموعُ الدساتيرِ السياسية. فكما أنَّ الشريعةَ والنظامَ أمران معقولان اعتباريان؛ كذلك الطبيعةُ أمرٌ اعتباريٌّ مُلخَّصُ عادةِ الله الجاريةِ في الخِلقة.

وأما تَوهُّمُ وجودِها الخارجيِّ فكتَوَهُّمِ الوحشيِّ الذي يرى فرقةَ العسكرِ يتحركون بانتظام، وجودَ أمرٍ خارجيٍّ ربطَ بينَهم.

فمَن كان وجدانُه وحشياً يتخيَّلُ الطبيعةَ بسببِ الاستمرارِ موجوداً خارجياً مؤثراً.

الحاصلُ:

أنَّ الطبيعةَ صنعةُ الله تعالى وشريعتُه الفطريةُ. وأما نواميسُها فمسائلُها. وأما قواها فأحكامُ تلك المسائلِ.

---

(١) بحث الأستاذ هذا الموضوع في مواضع عدة من رسائل النور وخصه برسالة مستقلة وهي اللمعة الثالثة والعشرون (رسالة الطبيعة).

(٢) مِسطَر: ما يُسطر به الكتّاب.

● سەبارەت بەو "بەڵگەی تەوحید"مش كە ﴿اعْبُدُوا﴾ ئاماژەی بۆ كردووە، بە پێی تەفسیری "ئیبن عەبباس" كە بە "وَحِّدُوا" ڕاڤەی كردووە، ئەوا بزانە كە:

قورئانی خاوەن ئیعجازی بەیان هیچ بەڵگەیەكی "تەوحید"ی بەجێ نەهێشتووە كە باسی نەكردبێت. خۆ ئەو "بەڵگەی ڕێ بە یەك نەدان"(التمانع)ەی كە ئەم ئایەتە لە خۆی گرتووە: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا ءالِهَةٌ إِلاَّ اللهُ لَفَسَدَتَا﴾ (الأنبياء: ٢٢) بەڵگەیەكی سەروزیاد و ڕێ پیشاندەرێكی ڕووناكە بۆ ئەوەی كە "سەربەخۆیی" تایبەتمەندییەكی خۆیی و "لازم"ێكی پێویستە بۆ "خوایەتی"..

پاشان هەر ئەم ئایەتە هێمایەكی تێدایە بۆ بەڵگەیەكی ورد لەسەر "تەوحید". كە بریتییە لەوەی:

هاوكاری و پەیوەندیی نێوان زەوی و ئاسمان لە هێنانەبەری بەروبوومەكاندا، بۆ ژیاندنی "جۆر"ی مرۆڤ و "ڕەگەز"ی زیندەوەر.. هەروەها لێكچوونی ئاسەوارەكانی جیهان و، باوەش بە یەكداكردنی لاكانی و، دەستی یەكتر گرتنیان بۆ تەواوكردنی ڕێكوپێكیی یەكتر.. هەروەها بەدەم یەكەوە چوونی لاكانی جیهان بۆ نەهێشتنی پێداویستیی یەكدی.. هەروەها ڕوانینی هەموویان بۆ یەك خاڵی دیاریكراو و، جووڵەی ڕێكوپێكی هەموو شیان لەسەر تەوەرەی یەك سیستەم..

هەموو ئەمانە.. ئاماژە دەكەن، بەڵكو بە ڕاشكاوی دەری دەبڕن، كە كردگاری ئەم تەنیا مەكینەیە كەسێكی تەنیایە و، ئەمەش بەسەر هەمواندا دەخوێننەوە كە:

هەموو شتێك بەڵگەی تیایە لەسەر ئەوەی خوا تەنیایە

پاشان بزانە كە: هەروەك بەدیهێنەر "واجب الوجود"ە و، "تەنیا"یە، بە هەمان جۆر خاوەنی هەموو سیفەتێكی كەمالیشە. چونكە هەرچی ڕێژنەی كەماڵ لە بەدیهاتوواندا هەیە، تەنها لە سێبەری درەوشانەوەی كەمالی كردگاریەوە بەدەست هاتووە.

كەواتە بە بێ گومانی و بەڵگەنەویستی دەزانرێت كە: جوانی و كەمالی بەدیهێنەر بە چەندین پلەی ناكۆتا لەو جوانی و كەماڵە زیاترە كە لە سەرانسەری هەموو بوونەوەراندا هەیە. چونكە "چاكەكاری" لقێكە لە سامانی "چاكەكار" و بەڵگەشە لەسەری. "بەدیهێنان"یش بەڵگەیە لەسەر "بەدیهێنەر" و، "پێویست كردنی بوون"یش بەڵگەیە لەسەر "پێویستیی بوون"ی "بوون بەخش" و.. "جوانكاری"ش بەڵگەیە لەسەر جوانیی شایستەی "جوانكار".

* أما "دليلُ التوحيدِ" الذي أشارَ اليه ﴿اعْبُدُوا﴾ على تفسير ابنِ عباسٍ أي "وحِّدوا"[١]، فاعلم أنَّ القرآنَ المعجزَ البيانِ ما ترَكَ مِن دلائل التوحيدِ شيئاً. وما تضمَّنَتْه آيةُ ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا ءَالِهَةٌ إِلاَّ اللهُ لَفَسَدَتَا﴾ (الأنبياء: ٢٢) مِن "برهانِ التمانُعِ" دليلٌ كافٍ ومنارٌ نيِّرٌ على أنَّ الاستقلالَ خاصةٌ ذاتيةٌ ولازمٌ ضروريٌّ للألوهية..

ثم في هذه الآيةِ رمزٌ إلى دليلٍ لطيفٍ على التوحيد، وهو:

أنَّ تعاونَ الأرضِ والسماءِ ومناسبتَهما في توليد الثمراتِ - لتَعَيُّشِ نوعِ البشرِ وجنسِ الحيوانِ - ومشابهةَ آثارِ العالَمِ وتعانُقَ أطرافِه وأَخْذَ بعضٍ يدَ بعضٍ بتكميلِ بعضٍ انتظامَ بعضٍ، وتجاوُبَ الجوانبِ وتلبيةَ بعضٍ لسؤال حاجةِ بعضٍ، ونظرَ الكلِّ إلى نقطةٍ واحدة، وحركةَ الكلِّ بالانتظام على محورِ نظامٍ واحدٍ؛ تُلَوِّحُ بل تُصرِّحُ بأنَّ صانعَ هذه الماكينةِ الواحدةِ واحدٌ، وتتلو على كلٍّ:

وَفِي كُلِّ شَيْءٍ لَهُ آيَةٌ  تَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ وَاحِدٌ[٢]

ثم اعلم أنَّ الصانعَ كما أنَّه واجبُ الوجودِ وواحدٌ؛ كذلك أنَّه متَّصِفٌ بجميع الأوصافِ الكماليةِ؛ لأنَّ ما في المصنوع من فيض الكمالِ إنما هو مُقتبَسٌ من ظلِّ تجلي كمالِ صانعِه. فبالضرورة يوجَدُ في الصانع جلَّ جلالُه من الجمال والكمالِ والحُسْنِ ما هو أعلى بدرجاتٍ غيرِ متناهيةٍ من عمومِ ما في عموم الكائناتِ من الحُسْنِ والكمالِ والجمالِ؛ إذ الإحسانُ فرعٌ لثروةِ المُحسِنِ ودليلٌ عليها، والإيجادُ لوجودِ الموجِدِ، والإيجابُ لوجوبِ الموجِبِ، والتحسينُ لحُسْنِ المـُحسِّنِ المناسِبِ له.

---

(١) انظر: تنوير المقباس من تفسير ابن عباس ص٤.

(٢) لأبي العتاهية في ديوانه. وينسب إلى الإمام علي كرم الله وجهه.

هەروەها بەدیهێنەر خاوێنە لە هەموو ناتەواوی‌یەك. چونكە "ناتەواوی‌یەكان" لە بێتوانایی و نائامادەیی ماهییەتی شتانی ماددی‌یەوە سەرهەڵدەدەن. خۆ بەدیهێنەری شكۆمەند خاوێنە لە ماددییەت.

هەروەها بەدیهێنەر پاك و خاوێنە لەو پێداویستی و سیفەتانەی كە هی "مومكین" بوونی ماهییەتی بوونەوەران. خۆ بەدیهێنەری مەزن "واجب الوجود"ە و، هیچ هاوشێوەیەكی نی‌یە. بە فەرمایشتی: ﴿فَـــلاَ تَجْعَلُــواْ لِلهِ أَندَاداً﴾ ئاماژەی بۆ ئەم دوو ڕاستی‌یە كردووە.

- سەبارەت بەو "بەڵگەی ئیمكان"ش كە بەم فەرمایشتەی ئاماژەی بۆ كردووە: ﴿وَاللهُ الْغَنِيُّ وَأَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ﴾ (محمد: ٣٨)..

ئەوا بزانە كە:

هەموو یەكێكی گەردیلەكانی بوونەوەران، سەبارەت بە خودی خۆی و، دانە بە دانەی سیفەتەكانی و، یەك بە یەكی حاڵەتەكانی و، هەموو یەكێكی ڕووەكانی، لەو كاتەدا كە لە نێوان چەندین گریمانی ناكۆتای زات و سیفات و حاڵەتەكان و بووندایە، كتوپڕ دەبینی بووژاوەتەوە و، هەڵساوەتەوە و، ڕێگایەكی دیاریكراوی گرتووەتەبەر و، سیفەتێكی تایبەت بە خۆی پۆشیوە و، لە حاڵەتێكی ڕێكوپێكدا خۆی گونجاندووە و، بە سەرپشتی یاسایەكی ڕێك و ڕاستدا دەڕوات و، ڕووی لە مەبەستێكی دیاری كراوە. ئنجا بەمەش "دانست" و "بەرژەوەندی"یەكی ئەوتۆی بەرهەم هێنا كە تەنها بەو شێوە دیاریكراوە نەبێت هەرگیز بەدەست نایەن..

جا ئایا ئیتر هەموو یەكێكی گەردیلەكان، بە زمانی تایبەتیی خۆی و بە ڕاشكاوانە، "مەبەست" و "دانست"ی بەدیهێنەرەكەی ڕانا گەیەنێت؟

ئنجا هەروەك خودی دانە بە دانەی گەردیلەكان بەڵگەیەكی سەربەخۆیە، لەو ڕووەشەوە كە بەشێكە لە پێكهاتوویەكی تێهەڵكێشی بەرەوسەر چوودا، بەڵگەبوونەكەی زیاتر دەبێت. چونكە ئەو گەردیلەیە كە دەبێتە بەشێك لەو پێكهاتەیە، لە هەموو پێكهاتوویەكدا شوێنێكی هەیە و، لە هەموو شوێنێكدا پەیوەندی‌یەكی هەیە و، لە هەموو پەیوەندی‌یەكدا ئەركێكی لەسەر شانە و، لە هەموو ئەركێكدا چەندین بەرژەوەندی بەرهەم دەهێنێت.. ئنجا لە هەموو پلەیەكیشدا بە زمانی خۆی بەڵگەكانی

وكذلك إنَّ الصانعَ مُنَزَّهٌ عن جميع النقائصِ، لأنَّ النواقصَ إنما تنشأُ عن عدم استعدادِ ماهياتِ الماديات، وهو تعالى مُجَرَّدٌ عن المادياتِ.

وكذلك إنَّه تعالى مُقدَّسٌ عن لوازمَ وأوصافٍ نشأتْ من إمكانِ ماهياتِ الكائناتِ، وهو سبحانه واجبُ الوجودِ ليس كمثلِه شيءٌ جلَّ جلالُه.

ولقد أشارَ إلى هاتين الحقيقتين بقوله:

﴿فَلاَ تَجْعَلُواْ لله أَندَاداً﴾.

* أما "الدليلُ الإمكانيُّ" المـُشَارُ إليه بقوله تعالى:

﴿وَاللهُ الْغَنِىُّ وَأَنتُمُ الْفُقَرَاءُ﴾ (محمد: ٣٨)..

فاعلم أنَّ كلَّ واحدةٍ من ذَرات الكائناتِ باعتبارِ ذاتِها، وباعتبار فردٍ فردٍ من صفاتها، وباعتبار واحدٍ واحدٍ من أحوالها، وباعتبار جهةٍ جهةٍ من وجوهِها؛ بينما تراها تتردَّدُ بين الإمكاناتِ الغيرِ المتناهيةِ في الذّاتِ والصفاتِ والأحوالِ والوجودِ، إذاً انتعشَتْ وقامتْ وسلكَتْ طريقاً مُعيَّناً منها ولبِستْ صفةً مخصوصةً، وتكيَّفَتْ بحالةٍ منتظَمةٍ، وركبتْ على قانونٍ مُسدَّدٍ، وتوجّهتْ إلى مقصدٍ مُعيَّنٍ، فأنتجتْ حكمةً ومصلحةً لا تُحصلان إلّا بذلك الطرزِ المعين..

أفلا تنادي بلسانها المخصوصِ، وتُصرِّحُ بقصد صانعِها وحكمتِه؟

فكما أنَّ كُلَّ ذرةٍ بنفسها دليلٌ على الانفرادِ..

كذلك تتزايدُ دلالتُها باعتبار كونها جزءاً من مركَّبات مُتداخلةٍ متصاعِدة؛ إذ لها في كلِّ مُركَّبٍ مقـامٌ.. وفي كلِّ مقـامٍ لهـا نسـبةٌ.. وفي كلِّ نسـبةٍ لها وظيفـةٌ.. وفي كلِّ وظيفـةٍ تثمـرُ

"پێویستیی بوون"ی بەدیهێنەری دەخوێنێتەوە. گەردیلە لەمەدا بە وێنەی سەرباز وایە لەناو تیپ و سوپا و لەشكرەكەیدا.

* * *

با ئێستاش دەست بكەین بە باسی هۆنینی ئەم ئایەتە، بە پێی هۆنینی لە ڕشتەی ئایەتی پێش خۆیدا، پاشان هۆنینی ڕستەكانی لەگەڵ یەكتردا، ئنجا هۆنینی شێوەی پێكهاتنی یەك بە یەكی ڕستەكانی.

سەبارەت بە هۆنینی هەمووی لە ڕشتەی پێش خۆیدا، ئەوا بزانە كە:

قورئان كاتێ بەشەكانی مرۆڤ و جۆرەكانی كەسانی ئەرك پێ سپێرراوی ڕوون كردەوە، لە ئیماندارانی پارێزكار و، كافرانی سەرسەخت و، دووڕووانی ڕاپادا.. دوای ئەوە، ڕووی كردە هەموویان و پێی فەرموون: ﴿يَـا أَيُّـهَا النَّـاسُ اعْبُـدُواْ﴾. بەدواداهێنان و ڕیزكردنی ئەمەشی لە دوای ئەوەی پێشوو، بە وێنەی ڕیزبەندیی خانوو لەسەر نەخشەی ئەندازیاری و، "ئەمر و نەهی" بە كاركردن لەسەر یاسای زانست و، قەزا لەسەر نەخشەی قەدەر و، دروستكردن و بەدیهێنانیش لەسەر چێژۆك و بەسەرهات، ڕیز كردووە و هێناوە..

چونكە كاتێ لە بابەتەكانی هەرسێ دەستەكە دوا و، تایبەتمەندی و دەرەنجامی هەریەكەیانی باس كرد، ئەوا شوێنەكە ئامادە و، گوێ بیستیش بێدار بووەوە، ئیتر بە ئاراستەكردنی ئەم گوفتارە ئاوڕی لێ دانەوە.

پاشان ئەم ئاوڕلێدانەوەیە - مەبەستم باسكردنیانە یەكەم جار لە شێوەی كەسی سێهەمدا و، ئنجا ئاراستەكردنی گوفتاری ڕووبەڕووە لەگەڵیاندا - سەرنجێكی گشتیی تێدایە لە شێوازی "ڕەوانكاری"دا، كە بریتییە لەمە:

ئەگەر "چاكە" یان "خراپە"ی كەسێك كەم كەم و وردە وردە باس بكرێت، ئەوا بە حوكمی بێداركردنەوە و وروژاندنی كەسی گوێ بیست، یان "مەیلی بە چاك زانین" یاخود "مەیلی نەفرین لێ كردن" زیاد دەكات. ئەو مەیلەش بەرە بەرە بەهێز دەبێت هەتا خاوەنەكەی ناچاری گفتوگۆی ڕووبەڕوو لەگەڵ ئەو كەسەدا دەكات. سەبارەت بە "مەقام"ەكەش، ئەوا مەیلەكانی گوێ بیستانی ئەو سیفەتانەی كەسی باسكراو داخوازی ئەوەن كە قسەبێژ كەسی باسكراو ئامادە بكات و بیهێنێتە بەردەمیان، ئنجا گوفتاری ئاراستە بكات..

مصالحَ.. وفي كلِّ مرتبةٍ تتلو بلسانها دلائلَ وجوبِ وجودِ صانعِها.. مثَلُها كمَثَلِ جنديٍّ في "طاقمِه وطابورِه وفرقتِه... الخ".

* * *

ولْنشرَعْ في نظم هذه الآيةِ باعتبارِ نظمِ مجموعِها بما قبلَها، ثم نظْمِ جُمَلها بعضٍ مع بعضٍ، ثم نظمِ هيئاتِ كلِّ جملةٍ جملةٍ.

أما نظمُ المجموعِ بما قبلَه..

فاعلم أنَّ القرآنَ لّما بيّنَ أقسامَ البشرِ وأنواعَ المكلَّفين من المؤمنين المتّقين والكافرين المعاندين والمنافقين المذبذَبين توجَّهَ إليهم كافةً مُخاطِباً بقوله: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ﴾ عقَّبَه ورتّبه على سابقه ترتيبَ البناءِ على الهندسة، والأمرِ والنهيِ بالعمل على قانون العلمِ، والقضاءِ على القَدَرِ، والإنشاءِ والإيجادِ على القصة والحكايةِ؛ إذ لّما ذكرَ مباحثَ الفِرَقِ الثلاث، وذكرَ خاصَّةَ كلٍّ وعاقبةَ كلٍّ، تهيأَ الموضعُ وانتبهَ السامعُ فالتَفَتَ مخاطِباً بذلك الخطابِ..

ثم إنَّ في هذا الالتفاتِ - أعني ذكرَهم أولاً بالغَيبة ثم الخِطابَ معهم هنا - نكتةً عموميةً في أسلوب البيانِ، وهي:

أنَّه إذا ذُكِرَتْ محاسنُ شخصٍ أو مساويه شيئاً فشيئاً يتزايدُ - بحُكم الإيقاظِ والتهييجِ - مَيَلانُ استحسانٍ أو مَيلُ نفرةٍ. ويتقوّى ذلك الميلُ شيئاً فشيئاً إلى أنْ يُجبرَ صاحبَه على المشافهة مع ذلك الشخصِ، وبالنظر إلى المقام تقتضي ميولاتُ السامعين لأوصافه أنْ يُحضِرَ المتكلمُ ذلك الشخصَ ويجرَّه إلى حضورهم فيتوجَّهَ إليه بالخطاب..

هەروەها سەرنجێكی تایبەتیشی تێدایە كە: سووككردنی ئەركەكانی سەرشانە، بە هۆی چێژی گفتوگۆی ڕووبەڕوو.

هەروەك ئاماژەیەكی بۆ ئەوە تێدایە كە لە "پەرستش"دا هیچ ناوەندە هۆكارێك لە نێوان بەندە و بەدیهێنەریدا نییە.

هۆنینی ڕستەش لە ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ﴾دا، لەوەدایە كە گوفتارێكە ئاراستەی هەموو مرۆڤێكی هەرسێ كۆمەڵە كراوە لە هەموو چینێكیاندا و لە هەرسێ كاتەكەدا. واتە: ئەی ئیمانداره كامڵەكان! بە سیفەتی دامەزراوی و بەردەوامی خواپەرستی بكەن.. ئەی ئیمانداره ناوەندەكان! بە چۆنێتیی زیاد كردنی پەرستنەكانتان خوا بپەرستن.. ئەی كافرەكان! خوا بپەرستن بە مەرجەكانیەوە لە ئیمان و تەوحید.. ئەی دووڕووەكان! بە چۆنێتیی " ئیخلاس "ەوە خواپەرستی بكەن..

دەبینی " پەرستش " لێرەدا بە وێنەی " هاوبەشایەتی مەعنەوی "وایە. دە فەرموو بیری لێ بكەرەوە.

﴿رَبَّكُمُ﴾ واتە لەبەر ئەوە بیپەرستن كە پەروەردگارێكە پەروەردەتان دەكات، كەواتە دەبێت ببنە بەندەی و بیپەرستن.

پاشكۆیەك:

﴿رَبَّكُمُ﴾ هێمایەكی وردی تێدایە، بۆ "مومكینی"ی زاتەكان.

﴿جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً﴾یش هێمایەكی وردی تێدایە بۆ " مومكینی"ی سیفەتەكان.

﴿الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ بەڵگەی تێدایە بۆ "حدوث"(پەیدابوون)ی زات و سیفەتەكان.

ئەوەش كە دەبێتە دەق لەسەر بەڵگەی "مومكینی"ی زاتەكان، ئەم ئایەتانەیە:

﴿وَاللهُ الْغَنِي وَأَنتُمُ الْفُقَرَاءُ﴾ (محمد: ٣٨)..

هەروەها: ﴿إِلَى رَبِّكَ الْمُنتَهَى﴾ (النجم: ٤٢)..

هەروەها: ﴿فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِي إِلاَّ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ (الشعراء: ٧٧)..

هەروەها: ﴿قُلِ اللهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ﴾ (الانعام: ٩١)..

وفيه نكتةٌ خصوصيةٌ هنا، وهي تخفيفُ أعباءِ التكليفِ بلذَّة الخطابِ..

وفيه أيضاً إشارةٌ إلى أنْ لا واسطةَ في العبادة بين العبدِ وخالقِه.

وأما نظمُ الجمَلِ، فـ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ﴾ خطابٌ لكلِّ إنسانٍ مِن الفِرَق الثلاثِ في الأزمنة الثلاثةِ من كلِّ طبقاتِ الفِرَقِ. أي أيُّها المؤمنون الكاملون اعبدوا على صفة الثباتِ والدوامِ.. وأيها المتوسِّطون اعبدوا على كيفيةِ الازديادِ.. وأيها الكافرون افعلوا العبادةَ مع شرطِها من الإيمان والتوحيدِ.. وأيها المنافقون اعبدوا على كيفيةِ الإخلاصِ..

فـ"العبادةُ" هنا كالمشتَرَك المعنويِّ. فتأمَّلْ!

﴿رَبَّكُمُ﴾ أي اعبدوه لأنه ربٌّ يُربِّيكم فلابدَّ أنْ تكونوا عِباداً تعبدونه.

تذييلٌ:

في ﴿رَبَّكُمُ﴾ رمزٌ دقيقٌ إلى دليلِ إمكانِ الذواتِ.

وفي ﴿جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً﴾ إلى دليلِ إمكانِ الصفاتِ.

وفي ﴿الَّذِى خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ إلى دليل حدوثِ الذواتِ والصفاتِ.

والذي ينصُّ على دليل إمكانِ الذواتِ قوله تعالى:

﴿وَاللهُ الْغَنِى وَأَنتُمُ الْفُقَرَاء﴾ (محمد: ٣٨)..

وأيضاً: ﴿إِلَى رَبِّكَ الْمُنتَهَى﴾ (النجم:٤٢)..

وأيضاً: ﴿فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِى إِلاَّ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ (الشعراء: ٧٧)..

وكذلك: ﴿قُلِ اللهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ﴾ (الأنعام: ٩١)..

هەروەها: ﴿فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ﴾ (الذاريات: ٥٠)..
هەروەها: ﴿أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ (الرعد: ٢٨)..
ئایەتەكانی تری هاوشێوەیان قیاس بكەرە سەر ئەمانە.
دە فەرموو بیر بكەرەوە.

سەبارەت بە ڕستەی ﴿الَّذِي خَلَقَكُمْ﴾یش، ئەوا بزانە كە:

كاتێ خوای گەورە فەرمانی بە "پەرستش" دا و، ئەویش سێ شت دەخوازێت: بوونی پەرستراو، یەكبوونی، شایستەیی بۆ پەرستن.. ئەوا وەڵامی ئەم پرسیارە تەقدیر كراوانەی بە ئاماژەدانی بە هەرسێ بەڵگەكانیان، دایەوە..

بەڵگەكانی بوونی پەرستراو دوو بەشن:

دەرەكییەكان و خودییەكان. خودییەكانیش دوو جۆرن: دەروونی و بنەچەیی. جا بە فەرمایشتی: ﴿الَّذِي خَلَقَكُمْ﴾ ئاماژەی بە دەروونییە هەرە نزیك و یەكجار ڕوونەكە دا، بە ﴿وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾یش بۆ بنەچەییەكە.

سەبارەت بە هۆنینی ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾یش، ئەوا بزانە كە:

قورئان كاتێ "خواپەرستن"ی ئەوانی پەیوەست كرد بە بەدیهێنانی خۆیان و باوك و باپیرانیان، ئەوا دامەزراندنی ئەو پەرستنە لەسەر بەدیهێنانی مرۆڤ، دوو خاڵی خواست:

یەكەمیان:

دەبێ بەدیهێنانیان بە جۆرێك بێت كە ئامادەیی "خواپەرستی" و توانا و لێهاتنی "تەقوا"ی تێدا بێت. بە ڕادەیەك كە هەركەسێك ئەو ئامادەییە ببینێت، هیواداری ئەوە بێت لێیان كە "پەرستش" ئەنجام بدەن، بە وێنەی ئەوەی كەسێك نینۆكی ئاژەڵە گۆشت خۆرەكان دەبینێت، چاوەڕوانی هەڵمەتی ڕاوی لێ دەكات.

دووهەم:

ئەوەیە كە مەبەست لە بەدیهێنانیان و، ئەو ئەركەی پێیان سپێرراوە و، ئەو كەماڵەی كە ڕوویان لێیەتی، ئەو "تەقوا"یە بێت كە بریتییە لە كەماڵی خواپەرستی.

﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾یش واتە: ئامانجی بەدیهێنان و كەماڵی ئێوە، كە توانا و لێهاتنی ئێوەی بۆ ساز و ئامادە كراوە، تەنها بریتییە لە: "تەقوا".

وأيضاً: ﴿فَفِرُّوا إِلَى اللهِ﴾ (الذاريات: ٥٠)..

وكذلك: ﴿أَلاَ بِذِكْرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ (الرعد: ٢٨)..

وقس، فتأمَّلْ!

وأما جملةُ ﴿الَّذِى خَلَقَكُمْ﴾ فاعلم أنَّ اللهَ تعالى لمّا أمرَ بالعبادة، وهي تقتضي ثلاثةَ أشياءَ: وجودَ المعبودِ، ووحدتَه، واستحقاقَه للعبادة.. أجابَ عن هذه الأسئلةِ المقدَّرةِ بالإشارة إلى دلائلِها الثلاثةِ.

فدلائلُ الوجودِ قسمان:

آفاقيٌّ وأنفسيّ. والأنفسيُّ نوعان: نفسيٌّ وأصوليّ. فأشار إلى النفسيِّ الأقربِ الأوضحِ بقوله: ﴿الَّذِى خَلَقَكُمْ﴾ وإلى الأصوليِّ بقوله: ﴿وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾.

وأما نظمُ ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ فاعلم أنَّ القرآنَ لمّا علّقَ العبادةَ على خَلقِهم وآبائهم، اقتضى ترتيبُ العبادةِ على خَلق البشرِ نقطتين:

إحداهما:

أنْ تكونَ خِلقتُهم باستعداد العبادةِ، وجِبلّيتُهم على قابلية التقوى؛ حتى مَن يرى ذلك الاستعدادَ يأمُلُ ويرجو منهم العبادةَ، كمَن يرى المَخالِبَ يأمُلُ الافتراسَ.

والثانيةُ:

أنْ يكونَ المقصدُ مِن خِلقتهم ووظيفتهم التي هم مأمورون بها وكمالُهم الذي يتوجهون اليه، هو التقوى الذي هو كمالُ العبادةِ.

و ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ أي المقصدُ من خلقكم وكمالِكم والذي هُيئَ له استعدادُكم إنما هو التقوى.

ڕستەی ﴿الَّذِی جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً﴾ ئاماژەیە بۆ نزیكترینی "بەڵگە دەرەكی‌یەكان" لەسەر "بوون"ی خوای گەورە..

هەروەها هێمایەكیشی بۆ ڕەتكردنەوەی كاریگەریی هۆكارەكان تێدایە، كە مایەی سەرهەڵدانی یەكێكە لە جۆرەكانی "شیرك". واتە تەخت كردنی زەوی كاری خوایە، نەك هی سروشت.

﴿وَالسَّمَاءَ بِنَاءً﴾یش، ناوهێنانی ئەو ئاسمانەی كە دراوسێی پێوەنووساوی زەوی‌یە، ئاماژەیە بۆ بڵندترینی بەڵگە دەرەكی‌یە سادەكان.

پاشان بە فەرمایشتی ﴿وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾ ئاماژەی بۆ چۆنێتیی بەڵگەبوونی "پێكهاتە" و "پەیدابووەكان" كرد لەسەر بوونی بەدیهێنەریان.

پاشان هەموو یەكێكی ئەو ڕستانەی پێشوو، هەروەك بەڵگەن لەسەر چەسپاندنی "بوون"ی بەدیهێنەر، كۆی هەموویشیان ئاماژەن بۆ "یەكتایی"ی ئەو.

ئنجا ئەو شێوە ڕیزكردنەی كە ئاماژە بۆ بوونی ڕێسا دەكات و، ئەویش ئاماژە بۆ نیعمەتەكان دەكات، هاوكات لەگەڵ بەڵگەی ﴿رِزْقاً لَكُمْ﴾دا، شایستەیی خوای گەورە دەچەسپێنێت بۆ "پەرستن". چونكە شوكری نیعمەتبەخش واجبە.

﴿رِزْقاً لَكُمْ﴾یش ئاماژەیەكیشی تێدایە بۆ ئەوەی كە هەروەك "زەوی" و "پەیدابووەكان" خزمەتی تۆ دەكەن، بە هەمان جۆر دەبێت تۆش خزمەتی ئەو كەسە بكەیت كە ئەوانەی بۆ دەستەمۆ كردوویت.

سەبارەت بە هۆنینی ﴿فَلاَ تَجْعَلُواْ للهِ أَندَاداً﴾ش، ئەوا بزانە كە چەندین هێڵی پەیوەندی لە هۆنینیەوە ڕاكێشراوە بۆ:

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ﴾ و..

بۆ ﴿الَّذِی خَلَقَكُمْ﴾ و..

بۆ ﴿الَّذِی جَعَلَ لَكُمُ﴾ و..

بۆ ﴿وَأَنْزَلَ﴾.

واتە لەگەر پەروەردگاری خۆتان پەرست، ئەوا هاوبەشی بۆ بڕیار مەدەن. چونكە هەر تەنها ئەو پەروەردگارە.

وأما جملةُ: ﴿الَّذِى جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً﴾ فإشارةٌ إلى أقرب الدلائلِ الآفاقيةِ على وجودِه تعالى.. وأيضاً فيها رمزٌ إلى ردِّ التأثيرِ الحقيقيِّ للأسبابِ الذي هو منشأٌ لنوعِ شركٍ. أي تمهيدُ الأرضِ بجعلِه تعالى، لا بالطبيعة.

وأما: ﴿وَالسَّمَاء بِنَاءً﴾ فإشارةٌ - بذكر السماءِ التي هي لصيقُ الأرضِ - إلى أعلى الدلائلِ الآفاقيةِ البسيطةِ.

ثم أشارَ بقوله: ﴿وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾ إلى وجه دلالةِ المركَّباتِ والمواليدِ على وجود صانعِها.

ثم إنَّ كُلّاً من الجُمل السابقةِ كما تدلُّ على إثبات الوجودِ؛ كذلك المجموعُ يلوِّحُ بالوحدة.

وصورةُ الترتيبِ المشيرِ إلى النظام الملوِّحِ بالنِعم مع دلالة: ﴿رِزْقاً لَكُمْ﴾ تُثبتُ استحقاقَه تعالى للعبادة، لأنَّ شُكْرَ المُنعِم واجبٌ.

وفي ﴿رِزْقاً لَكُمْ﴾ إشارةٌ إلى أنّه كما أنَّ الأرضَ والمواليدَ تخدُمُ لك لابدَّ أنْ تخدُمَ لَمن سخَّرَها لك.

وأما نظمُ: ﴿فَلاَ تَجْعَلُواْ لله أَندَاداً﴾ فاعلم أنّه قد امتدتْ من نظمها خطوطٌ إلى:

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ﴾..

وإلى ﴿الَّذِى خَلَقَكُمْ﴾..

وإلى ﴿الَّذِى جَعَلَ لَكُمُ﴾..

وإلى ﴿وَأَنزَلَ﴾..

أي إذا عبدتُم ربّكم فلا تشركوا له، لأنّه هو الربُّ..

لەبەر ئەوەش کە هەر تەنها ئەو بەدیهێنەری خۆتان و ڕەگەزتانە، ئەوا هەندێکتان هەندێکی ترتان نەکات بە چەندین خاوەن و پەروەردگار - جگە لە خوا - بەسەر خۆیانەوە..

لەبەر ئەوەش کە هەر تەنها ئەو زەویی بەدی هێناوە و، ڕایخستووە و، تەختی کردووە بۆتان و.. لەبەر ئەوەش کە هەر تەنها ئەوە کە ئاسمانی بەدی هێناوە و، کردوویەتی بە بنمیچی خانووەکەتان.. ئەوا هەرگیز باوەڕ بە کاریگەریی ڕاستەقینەی "هۆکارە سروشتی‌یەکان" مەهێنن کە مایەی سەرهەڵدانی بتپەرستی‌یە..

هەروەها لەبەر ئەوەی کە هەر تەنها ئەو پەروەردگارەیە لە پێناوی ڕۆزی و گوزەرانتاندا "ئاو"ی ناردووە بۆ زەوی و، نیعمەتیش تەنها لە لایەن ئەو پەروەردگارەوەیە، ئەوا شوکرانە و پەرستش تەنها پێشکەش بەو دەکرێ.

سەبارەت بە هۆنینی چۆنێتی و شێوەی پێکهاتنی یەك بە یەکی ڕستەکانیش، ئەوا بزانە کە:

وشەی ﴿يَا أَيُّهَا﴾ لە ڕستەی ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ﴾دا، قورئان گەلێ جار بەکاری هێناوە، ئەوەش لەبەر چەندین سەرنجی ورد و تێبینی ناسك و نیانە، چونکە ئەم جۆرە ئاراستە کردنەی گوفتار لە سێ ڕووەوە جەختی تێدایە:

بێدارکردنەوە لە ﴿يَا﴾دا و.. لێ وردبوونەوە لە ﴿أَيُّ﴾دا و.. ئاگادارکردنەوەش لە ﴿هَا﴾دا.

ئنجا گوفتاری ڕووبەڕوو لێرەدا هێمایە بۆ سێ دانە سوود:

بەرامبەر وەستانی قورسیی ئەرك پێ سپاردن بەو چێژەی کە لە گوفتاری ڕووبەڕوودا هەیە و.. ئەوەش کە بەرز بوونەوەی مرۆڤ لە بنکی نادیاری و ئامادە نەبوونەوە بۆ پلەی بەرزی ئامادەبوون، تەنها بە هۆی "پەرستش"ەوە دەبێت[1] و.. ئاماژەی ئەوەشی تێدایە کە ئەو کەسەی گوفتارەکەی ئاراستە کراوە لە سێ ڕووەوە ئەرکی خراوەتە ئەستۆ: لە ڕووی "دڵ"ەوە بە تەسلیم و ملکەچی، لە ڕووی "ژیری"یەوە بە ئیمان و تەوحید، لە ڕووی "جەستە"شەوە بە کار و پەرستن..

---

(١) هەروەها کە هیچ ناوەندە هۆکارێك لە نێوان بەندە و بەدیهێنەریدا نی‌یە. (ش)

ولأنّه هو الخالقُ لكم ولنَوعكم، فلا يجعلْ بعضُكم بعضاً أرباباً من دون الله..

ولأنّه هو الذي خلقَ الأرضَ وفرَشها ومهَّدَها لكم، ولأنّه هو الذي خلقَ السماءَ وجعلَها سقفاً لبنائكم، فلا تعتقدوا تأثيراً حقيقياً للأسباب الطبيعيةِ التي هي منشأُ الوثنيةِ..

ولأنّه هو الذي أرسلَ الماءَ إلى الأرض لرزقكم ومعيشتِكم، ولا نعمةَ إلّا منه، فلا شُكرَ ولا عبادةَ إلّا له.

وأما نظمُ كيفياتِ وهيئاتِ جملةٍ جملةٍ:

فاعلم أنَّ كلمةَ ﴿يَا أَيُّهَا﴾ في جملة: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ﴾ قد أكثرَ التنـزيلُ من ذكرها لنُكَتٍ دقيقةٍ ولطائفَ رقيقة، إذ هذا الخطابُ مؤكَّد بوجوه ثلاثةٍ:

بما في ﴿يَا﴾ من الإيقاظ، وما في ﴿أَيُّ﴾ من التوسُّم[1]، وما في ﴿هَا﴾ من التنبيه.

فالخطابُ هنا رمزٌ إلى فوائدَ ثلاثٍ:

مقابلةُ مشَقَّةِ التكليف بلـذّة الخطابِ .. وأنَّ ترَقِّيَ الإنسانِ من حضيض الغيبة إلى مقام الحضورِ إنما هو بواسطة العبادة[2].. وأيضاً إشارةٌ إلى أنَّ المخاطَبَ مكلَّفٌ بجهاتٍ ثلاث: باعتبارِ قلبِه بالتسليم والانقيادِ، ومن جهة عقلِه بالإيمان والتوحيدِ، وبالنظر إلى قالبِه بالعمل والعبادةِ..

---

(١) توسَّم الشيء: تفرسَّه وتأمَّلَ فيه.

(٢) وأن لا واسطة في العبادة بين العبد وخالقه. (ش)

هەروەك ئاماژەیە بۆ ئەوەش کە ئەوانەی گوفتارەکەیان ئاراستە کراوە، سێ دەستەن[1]..

هەروەها ئاماژەیە بۆ هەرسێ چینی تایبەتمەندان و، ناوەند و، گشتینە..

هەروەك ئاماژەیە بۆ شێوازی ئاسایی و بەکارهاتوو، کە بریتییە لەوەی یەکەم جار مرۆڤ بانگ لە کەسێك دەکات و ڕایدەوەستێنێت، پاشان لێی ورد دەبێتەوە و ڕووی تێدەکات، پاشان لەگەڵی دەدوێت و دەیخاتە کار.

جا لەسەر بناغەی ئەم سەرنجانە، جەختەکانی گوفتارەکە لەو لایەنانەوە دامەزراون.

بانگ کردنیش لە ﴿يَا﴾دا، ئەوا لەبەر ئەوەی بانگ کراوان بریتین لەو خەڵکانەی کە چین و توێژە جۆراوجۆرەکان لەخۆ دەگرن، لە: بێ ئاگایان و، ئامادە نەبووان و، نەجووڵاوان و، نەزانان و، سەرقاڵان و، پشت هەڵکەران و، خۆشەویستان و، خوازیاران و، کامڵان.. ئەوا ئەم بانگ کردنە بۆ: بێدارکردنەوە و، هەروەها ئامادە کردن و، هەروەها بزواندن و، هەروەها ناساندن و، هەروەها سەرزەنشت و، هەروەها ئاراستەکردن و، هەروەها ورووژاندن و، هەروەها هاندان و، هەروەها زیادکردن و، هەروەها ڕاچڵەکاندنە. لێرەدا هەموو واتاکانی "یا" مەبەستن.

دووری لە ﴿يَـا﴾دا، لە کاتێکدا کە شوێنەکە مەقامی نزیکییە، ئاماژەیە بۆ شکۆمەندی و گەورەیی ئەمانەتی تەکلیف (ئەرك پێ سپاردن)..

هەروەها ئاماژەیە بۆ دووریی پلەی "بەندایەتی" لە مەقامی "خوایەتی"یەوە..

هەروەها هێمایەکیشە بۆ دووریی سەردەمەکانی ئەرك پێ سپێرراوان لە شوێن و کاتی دەرکەوتنی گوفتارەکە..

هەروەها ئاماژەیە بۆ بێ ئاگایی لە ڕادەبەدەری مرۆڤ.

﴿أَيُّ﴾یش، کە بۆ لێ ورد بوونەوەیە لە ناو گشتینەدا، ئەوا هێمایە بۆ ئەوەی کە ئەم گوفتارە ئاراستەی گشتینەی بوونەوەران کراوە و، لە نێوان ئەوانیشدا و لە ڕێی فەرزی کیفایەتەوە مرۆڤ تایبەت کراوە بە هەڵگرتنی ئەمانەت. کەواتە قسوور و کەمتەرخەمیی مرۆڤ، بەزاندنی مافی سەرجەمی بوونەوەرانە..

---

(١) ئیمانداران و، کافران و، دووڕووان. (ت)

وأيضاً إيماءٌ إلى أنَّ المخاطَبين ثلاثُ فرق[١]..

وأيضاً تلويحٌ إلى الطبقات الثلاثِ من الخواصِّ، والمتوسطين، والعوام..

وأيضاً تلميحٌ إلى الطَّرْزِ المألوفِ والنَّسَقِ المأنوس وهو أنَّ المرءَ أولاً ينادي أحداً فيُوقِفُه. ثم يتوسَّمُه فيوجِّهُه. ثم يخاطِبه فيُخدِمُه[٢].

فبناءً على هذه النكتِ، تكونُ التأكيداتُ في الخطاب مؤسَّسَةً من تلك الجهات.

أما النداءُ في ﴿يَا﴾ فلأنَّ المُنادَى هو الناسُ المشتملُ على الطبقات المختلفةِ من الغافلين والغائبين والساكتين والجاهلين والمشغولين والمُعرِضين والمحبين والطالبين والكاملين، يكونُ هذا النداءُ للتنبيه، وكذا للإحضارِ، وكذا للتحريك، وكذا للتعريف، وكذا للتقريع، وكذا للتوجيه، وكذا للتهييج، وكذا للتشويق، وكذا للازدياد، وكذا لهزِّ العِطفِ. فمعاني "يا" كلُّها مُرادَةٌ.

وأما البُعدُ في ﴿يَا﴾ مع أنَّ المقامَ مقامُ القُرب، فإشارةٌ إلى جلالةِ وعَظَمةِ أمانةِ التكليفِ..

وأيضاً إيماءٌ إلى بُعدِ درجةِ العبوديةِ عن مرتبةِ الألوهية..

وأيضاً رمزٌ إلى بُعدِ أعصارِ المكلَّفين عن محلِّ وزمانِ ظهورِ الخطابِ.. وأيضاً تلويحٌ إلى شدّةِ غفلةِ البشر.

وأما ﴿أَيُّ﴾ الموضوعُ للتوسُّمِ من العموم، فرمزٌ إلى أنَّ الخطابَ لعموم الكائناتِ. فيُخصَّصُ من بينها الإنسانُ، بتحمُّلِ الأمانةِ على طريق فرضِ الكفايةِ. فإذن قصورُ الإنسانِ تجاوزٌ لحقِّ مجموعِ الكائنات..

---

(١) المؤمنون والكفار والمنافقون. (ت)

(٢) فيستخدمه. (ب)

پاشان ﴿أَيُّ﴾ ڕوانینی "كورتكردنەوە" و ئنجا "درێژە پێدان"ی تێدایە[1].

﴿هَا﴾یش، وێڕای ئەوەی كە لە بریی "موزاف ئیلەیهی"یەكە هێنراوە، ئاماژەشە بۆ بێداركردنەوەی ئەوانەی كە بە بانگی ﴿يَا﴾ ئامادە بوون.

سەبارەت بە ﴿النَّـــاسُ﴾یش، ئەوا بە حوكمی ئامـاژەدان بە وەسفە بنەڕەتی‌یەكـە (لەبیرچوون)، ئاماژەیە بۆ "گلەیی". واتە:

"ئەی خەڵكینە! چۆن پەیمانی ئەزەلیتان لەبیر دەچێتەوە"؟

هەروەها ئاماژەیە بۆ "پۆزش". واتە: "ئەی خەڵكینە! قسوور و كەمتەرخەمیتان دەبێ هی سەهوو و لەبیر چوونەوە بێت، نەك بە ڕاستی و ئەنقەست"!

﴿اعْبُدُواْ﴾ش، لەبەر ئەوەی وەڵامی ئەو بانگ كردنە گشتگیرەیە كە هەموو ئەو چینە ناوبراوانە دەگرێتەوە، ئەوا بەڵگەیە لەسەر گوێڕایەڵی و، ئاماژەیە بۆ ئیخلاس و، هێمایە بۆ بەردەوامی و، ئاماژەیە بۆ تەوحید. واتە: گوێڕایەڵ بن.. ئیخلاستان هەبێت.. دامەزراو بن.. چاكە كاریتان زیاد بكەن.. یەكتاپەرست بن.

﴿رَبَّكُمُ﴾یش ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە "پەرستش" هەروەك دەبێ هانی بۆ بدرێت، چونكە پەیوەندی‌یەكی بڵند و بەڕێزە (لە نێوان بەندە و پەروەردگاریدا)، بە هەمان جۆر دەبێ بخوازرێت و داواكاری هەبێت، چونكە پەرستش شوكرانەبژێری‌یە و، خزمەتێكە بەو كەسەی پەروەردەتان دەكات و پێویستی‌یەكانتان لای ئەوە.

سەبارەت بە ڕوخساری پێكهاتنی ﴿الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِـــن قَبْلِكُـــمْ﴾یش، ئەوا بزانە:

ئەو ﴿الَّـــذِي﴾یەی كە ڕووی زانراوی‌یەكەی "صیلە"كەیەتی[2]، ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە ناسینی خوا بە ناسینی كار و ئاسەوارەكانیەتی، نەك گەوهەری خۆی.

---

(١) چونكە وشەی (أي) كورتكردنەوە و نادیاری‌یەكی تێدایە، لەبەر ئەوەی ئیزافە نەكراوە، بەڵام وشەی "الناس" نادیاری‌یەكەی لادەبات و، كورتكردنەوەكەش درێژە پێ دەدات. (ت)

(٢) بۆ نموونە گەر بوترێت: "الذي جاءك" ئەوا ئەو لایەنەی "الذي" كە لای تۆ زانراوە هاتنیەتی بۆ لات، بەڵام لاكانی تری نەزانراوە. (ت)

"الـــذي" ئیسمی مەوصوولە و، ئیسمی مەوصوولیش ڕستەیەكی لە دوا دێت پێی دەوترێت "صیلەی مەوصوول". ئەو صیلەیە واتای ئیسمی مەوصوولەكە دیاری دەكات. دەنا بێ ئەو صیلەیە واتاكەی تەماوی و نادیارە. (وەرگێڕ)

ثم في ﴿أَيُّ﴾ جزالةُ الإجمالِ ثم التفصيلِ[١].

وأما ﴿هَا﴾ فمع كونه عِوَضاً عن المضاف إليه، إشارةٌ إلى تنبيه مَن حَضَرَ بـ﴿يَا﴾.

وأما ﴿النَّاسُ﴾ فإشارةٌ - بحكم تلميحِ الوصفيةِ الأصليةِ - إلى العتاب، أي "أيُّها الناسُ كيف تنسَوْنَ الميثاقَ الأزليَّ"؟

وأيضاً إلى العذر، أي "أيها الناسُ لابدَّ أنْ يكونَ قصورُكم عن السهو والنسيانِ لا بالعمد والجدِّ"!

أما ﴿اعْبُدُواْ﴾ فبحُكْمِ جوابيتِه للنداءِ العامِّ مناداهُ للطبقات المذكورةِ، يدلُّ على الإطاعةِ، ويشيرُ إلى الإخلاص، ويرمُزُ إلى الدوام، ويلوِّحُ إلى التوحيد. أي أطيعوا.. وأخلِصوا.. وثبِّتوا.. وازدادوا.. ووحِّدوا.

وأما ﴿رَبَّكُمُ﴾ فإشارةٌ إلى أنَّ العبادةَ كما ينبغي أنْ يُرغَّبَ فيها، لأنها نسبةٌ شريفةٌ ومناسبةٌ عاليةٌ؛ كذلك لابدَّ أنْ تُطلَبَ، لأنها شكرٌ وخدمةٌ لمَن هو يربِّيكم وتحتاجون اليه.

أما هيئاتُ ﴿الَّذِى خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾..

فاعلم أنَّ ﴿الَّذِي﴾ الذي جهةُ معلوميتِه الصلةُ[٢] يشيرُ إلى أنَّ معرفةَ الله تعالى إنما تكونُ بأفعاله وآثارِه لا بكُنهِه.

---

(١) لأن في كلمة "أيّ" إجمالاً وإبهاماً حيث ذكرتْ غير مضافة، إلّا أنَّ كلمةَ ﴿النَّاس﴾ تزيلُ ذلك الإبهامَ وتفصّلُ ذلك الإجمالَ. (ت)

(٢) فإذا قيل مثلاً: "الذي جاءك" فجهته المعلومة لديك هي المجيءُ إليك. أما سائرُ جهاته فمجهولةٌ. (ت)

﴿خَلَــقَ﴾ش، کـە بـەوە جیـاوازە لـە "إیجـاد" و "إنشـاء" کـە لەسـەر شـێوەیەکی تەقدیر کراوی ڕێکە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی توانا و لێهاتنی مرۆڤ بەرەو "ئەرك پێ سپاردن" ئاراستە کراوە و.. هێمایە بۆ ئەوەش کە "پەرستش" کارمەندی و ئەرکە، چونکە ئەنجام و پاداشتی بەدیهێنانە. پاداشتدانەوەش (لەسەر پەرستش) تەنها چاکەیەکی ڕووت و پەتیی خوای گەورەیە.

﴿الَّذِينَ﴾ بە نادیاری بوونەکەی، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو خەڵکانەی پێش ئێوە هەبوون، هەموویان نەمان و مردن و ڕۆشتن.. هەر تەنها لەو ڕووەوە زانیارییان لەسەر ماوەتەوە کە "بەدیهاتووی پێش خۆتان" بوون.. وا ئێوەش لەسەر لێواری گۆڕدان.. کەواتە پەند وەربگرن.. بە ژیانی دنیا لە خۆتان بایی مەبن.. دەست لە داوێنی "خواپەرستیی" گیر بکەن، کە هۆی (بەدەستهێنانی) بەختەوەریی هەمیشەییە.

سەبارەت بە چۆنێتی‌یەکانی ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

"لَعَلَّ" بۆ "ئومێد"ە. جا ئەگەر "ئومێدکراو" شتی حەز پێکراو بوو، ئەوا پێی دەوترێ "إطماع" (تەمادارکردن)، گەر شتی نەخوازراویش بوو، ئەوا پێی دەوترێ "إشـفاق" (مەترسی لێ بوون). جا لێرەدا "ئومێد" بە واتای "حەقیقی" سەبارەت بە قسەبێژ مەحاڵە. کەواتە یان بۆ قسە بێژە، بەڵام بە واتای "مەجازی"، یان بۆ قسە بۆکراوە، یاخود سەبارەت بە بینەران و بیسەرانە.

ئەگەر بۆ قسەبێژ بێت، ئەوا ئیستیعارەیەکی تەمسیلی‌یە. وەك ئەوەی کەسێك یەکێکی بە هۆکارەکانی خزمەتێك تەیار کرد کە بە پێی عورف و عادەت ئومێدی ئەنجامدانی ئەو خزمەتەی لێ دەکرد. بە هەمان جۆر، خوای گەورەش مرۆڤی بە ئامادەبوونی بۆ کەماڵ و، توانای ئەرك پێ سپاردن و، هۆکاری هەڵبژاردن، تەیار و پڕچەك کردووە.

جا ئەم ئیستیعارەیە ئاماژەیەکی بۆ ئەوە تێدایە کە حیکمەتی بەدیهێنانی مرۆڤ بریتی‌یە لە "تەقوا".. هەروەك هێمایە بۆ ئەوەش کە ئەنجامی "پەرستش" گەیشتنە بە پلەی "تەقوا".. هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە "تەقوا" گەورەترینی پلەکانە.. هەروەها ئاماژەیە کە بۆ جۆرە شێوازی پادشایان کە بریتی‌یە لە "تەمادارکردن" و "هێماکردن" لە جێی بەڵێنی بێ گوماندا.

ئەگەر بۆ کەسی "قسە بۆکراو"یش بێت، ئەوا وەکو ئەوە وایە کە بفەرموێت:

(لەو حاڵەتەدا خوا بپەرستن کە ئومێدی بەدەستهێنانی "تەقوا"تان هەبێت و لە نێوان "ترس" و "ئومێد"دا بن).

وأنَّ ﴿خَلَقَ﴾ الممتازُ عن الإيجاد والإنشاءِ بكونه على وجهٍ مقدَّرٍ مستوٍ، إشارةٌ إلى أنَّ استعدادَ البشرِ مُسَدَّدٌ للتكليف.. وأيضاً رمزٌ إلى أنَّ العبادةَ وظيفةٌ، لأنها نتيجةُ الخِلقةِ وأُجرتُها. فما الثوابُ إلّا مِن محضِ فضلِ الله تعالى.

وأنَّ ﴿الَّذِينَ﴾ - بناءً على إبهامِه - إيماءٌ إلى أنَّ الذين سبقوكم انقرضُوا فماتوا فذهبوا.. فلم يبقَ منهم جهةُ المعلوميةِ إلّا كونُهم مخلوقين قبلَكم.. فأنتم على شفا جُرفِ القبرِ.. فاعتبِروا.. فلا تغترُّوا بالدنيا.. فتشبَّثُوا بأذيال العبادةِ التي هي وسيلةُ السعادةِ الأبديةِ.

أما كيفياتُ ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ فاعلم أنَّ "لعلَّ" للرجاء. ففي المرغوبِ يُقالُ إطماعٌ، وفي المكروهِ إشفاقٌ. فالرجاءُ في حقِّ المتكلمِ هنا حقيقةً محالٌ. فهو إما باعتبارِه لكن مجازاً، وإما باعتبارِ المخاطَب، وإما باعتبارِ المشاهدين والسامعين:

أما باعتبار المتكلمِ فاستعارةٌ تمثيليةٌ، كما أنَّ مَن جهّزَ أحداً بأسبابِ خدمةٍ يرجو منه - عُرفاً - تلك الخدمةَ؛ كذلك إنَّ اللهَ جهّزَ البشرَ باستعداد الكمالِ وقابليةِ التكليفِ وواسطةِ الاختيارِ. ففي الاستعارةِ إشارةٌ إلى أنَّ حكمةَ خَلْقِ البشرِ هي التقوى.. وكذا رمزٌ إلى أنَّ نتيجةَ العبادةِ مرتبةُ التقوى.. وكذلك إيماءٌ إلى أنَّ التقوى أكبرُ المراتبِ.. وأيضاً تلميحٌ إلى طرزِ أسلوبِ الملوكِ بالإطماع والرمزِ في موضع الوعدِ القطعيِّ.

وأما باعتبار المخاطَبِ فكأنّه يقولُ:

"اعبدوا حالَ كونِكم راجين للتقوى، ومتوسِّطين بين الرجاء والخوف".

ئەم ڕووەش ئاماژەیەكی تێدایە بۆ ئەوەی كە دەبێ مرۆڤ پشت بە "خواپەرستی"ی خۆی نەبەستێ.. هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەش كە نابێ تەنها ئەو "پەرستش"ەی پێ بەس بێت كە ئەنجامی دەدات، بەڵكو پێویستە ئەو وتەیەی تێدا هاتبێتە دی كە دەڵێت: "بجوولێ، بە بێ وەستان" ئیتر لە هەموو پلەیەكدا چاوی لە پلەی سەروویەوە بێت.

ئەگەر بۆ بینەران و بیسەرانیش بێت، ئەوا وەكو ئەوە وایە كەسێك ببینێت مرۆڤ بە چەندین لێهاتن و ئامادەیی ئەوتۆ تەیار و پڕچەك كراوە، هیوا و ئومێدی "پەرستش"ی لێ بكات. بە وێنەی ئەو كەسەی كەڵبە و نینۆكی ئاژەڵێك دەبینێت، چاوەڕێی هەڵمەتی ڕاوی لێ دەكات.. هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەش كە "خواپەرستیی" خواستی فیترەتی مرۆڤە.

وشەی ﴿تَتَّقُونَ﴾یش، بە پێی ئەوەی كە لەسەر خواپەرستیی ئەو چینە ناوبراوانە دامەزراوە، ئەوا ئاماژەیە بۆ پلەكانی "تەقوا"، كە بریتین لە: خۆپارێزی لە شیرك، پاشان خۆپارێزی لە گوناهە گەورەكان، پاشان خۆپارێزی بە پاراستنی "دڵ" لە غەیری خوای گەورە، هەروەها خۆپارێزی بە دووركەوتنەوە لە سزا.. هەروەها خۆپارێزی بە خۆپاراستن لە تووڕەیی.. هەروەها هێمایە بۆ ئەوەی كە خواپەرستی تەنها بە "ئیخلاس" دەبێتە "پەرستش".. هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە "پەرستش" خۆی بۆ خۆی جێی مەبەستە، نەك تەنها هۆكارێك بێت.. هەروەها هێمایە بۆ ئەوەش كە نابێ "خواپەرستی" لەبەر دەستكەوتنی پاداشت و ترسی سزا بێت.

سەبارەت بە شێوە پێكهاتەی ئایەتی ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاءَ بِنَاءً﴾یش، ئەوا بزانە كە:

ئەم ئایەتە ئاماژەیە بۆ هەژاندنی گوێ بیست بۆ "خواپەرستی" لە ڕێی ڕوونكردنەوەی مەزنیی توانستی بەدیهێنەر و، هاندانیشی بۆ ئەو خواپەرستی‌یە بە منەتباری‌یەوە. وەك ئەوەی كە بفەرموێ: ئەی مرۆڤ! ئەو كەسەی كە زەوی و ئاسمانی بۆ دەستەمۆ و گوێڕایەڵ كردوویت، شایانی ئەوەیە بیپەرستیت..

هەروەها ئاماژەیەكە بۆ ڕێزداریی مرۆڤ و، بەهای باڵای و، ڕێزگیراویی لای خوای گەورە، وەك ئەوەی بفەرموێ:

وفي هذا الاعتبارِ إشارةٌ إلى أنّه لابدَّ أنْ لا يعتمدَ الإنسانُ على عبادته.. وكذا إيماءٌ إلى أنّه لابدَّ أنْ لا يكتفيَ بما هو فيه، بل لزمَ أنْ يكونَ مصداقاً لـ"عليك بالحركةِ غيرِ السكونِ" فينظُرَ في كلِّ مرتبةٍ إلى ما فوقَها.

وأما باعتبار المشاهدين والسامعين، فكأنَّ مَن شاهدَ البشرَ مُجَهَّزاً ومُسلَّحاً باستعداداتٍ، يأمُلُ ويرجو منه العبادةَ، كمَن يرى مخالبَ حيوانٍ وأنيابَه، يأمُلُ منه الافتراسَ.. وكذلك إشارةٌ إلى أنَّ العبادةَ مقتضى الفطرةِ.

أما لفظُ ﴿تَتَّقُونَ﴾ فإشارةٌ - بحكم ترتُّبِه على عبادةِ الطبقاتِ المذكورةِ - إلى مراتبِ التقوى وهي: التقوى عن الشركِ، ثم التقوى عن الكبائرِ، ثم التقوى بحفظ القلبِ عمّا سواه تعالى.. وكذا التقوى بالتجنُّبِ عن العقاب.. وأيضاً التقوى بالتحرُّز عن الغضَبِ.. وكذا رمزٌ إلى أنَّ العبادةَ بالإخلاص تكونُ عبادةً.. وأيضاً إيماءٌ إلى أنَّ العبادةَ مقصودةٌ بالذات لا وسيلةٌ محضةٌ.. وكذلك رمزٌ إلى أنَّ العبادةَ لابدَّ أنْ لا تكونَ لأجْلِ الثوابِ والعقابِ.

أما هيئاتُ آيةِ ﴿الَّذِى جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاءَ بِنَاءً﴾..

فاعلم أنّها إشارةٌ إلى التهييج على العبادة ببيان عظمةِ قُدرةِ الصانعِ، وإلى التشويق عليها بالامتنان. كأنّه يقولُ:

أيها الإنسانُ! إنَّ الذي سخّرَ لك الأرضَ والسماءَ يستحقُّ أنْ تعبدَه..

وكذا إيماءٌ إلى فضيلة البشرِ وعلوِّ قيمتِه ومُكرَّميَّتِه عند الله، كأنّه يقولُ:

"ئەو کەسەی بەوە ڕێزی لێ ناون کە ئەو تەنە مەزنە بەرز و نزمانەی گەردوونی بۆ سوودی ئێوە ئامادە کردووە، دەبێ ئێوەش بە "پەرستن"ی ئەو شایستەیی خۆتان بۆ ئەو ڕێزلێنانەی دەرببڕن"..

هەروەها ئاماژەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی "ڕێکەوت" و "یەکگرتن" و "کاریگەریی سروشت". واتە هەموو ئەو شتانەی کە دەیانبینن و سیفەتەکانیشیان بە دانانی دانەرێك و، ئامانجی خاوەن مەبەستێك و، تایبەتکردنی تایبەتکارێك و، ڕێکخستنی ڕێکخەرێکە کە دانستی ئەو لە هەموو شتێك گەورە و مەزنترە.

هەروەها ئاماژەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی ڕێبازی سروشتییەکان و ڕێڕەوی صابیئییەکان کە بەرهەمهێنی ڕێبازی بتپەرستانە..

هەروەها بێدارکردنەوەیەکە بۆ ئەوەی کە سیفەتی تەن و جەستە(ماددی)ەکان، لەو ڕووەوە کە "مومکین"ن، بەڵگەن لەسەر کردگار، چونکە گەردیلەکانی تەنەکان لە توانا و قابیلییەتی بارودۆخ و چۆنێتییە گشتییەکاندا یەکسانن، ئەوەتا هەموو سیفەتێکی "مومکین"ی ئەوان لە نێوان چەندین گریمانی زۆردا دێت و دەچێت. کەواتە هەموو تەنێك لە ڕووی سیفەت و چۆنێتییەکەیەوە پێویستی بە مەبەست و دانست و تایبەتکردنی تایبەتکارێك دەبێت.

پێشخستنی ﴿لَكُمُ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە تەختکردنی زەوی لەبەر مرۆڤە، نەك بەو واتایەی کە تەنها مرۆڤ لەسەری ڕادەکشێت و سوودی لێ وەردەگرێ، هەتا زیادەکان (شتانی تری جگە لە مرۆڤ لەسەر زەویدا) بێهوودە بن. دەسا بیری لێ بکەرەوە!

﴿فِرَاشاً﴾یش ئاماژەیە بۆ ئەو سەرنجەی ڕەوانبێژی کە خاڵی نامۆییە و، بریتییە لە بەستێنی: "هەرچەندەش سروشتی وایە کە نوقمی ئاو ببێت"..

هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ڕاخستن و تەختکردنی زەوی، کە کاری بکەرێکە، پێچەوانەی سروشتی زەوییە، چونکە سروشتی "گۆ" زاڵبوونی ئاو بەسەریدا و دەورەدانیشی بە دەوریدا، دەخوازێ. جا بەدیهێنەر، بە دانست و میهرەبانیی خۆی، هەندێکی لە گۆی زەوی لە ئاستی ئاو بەرز کردووەتەوە و ڕایخستووە و سفرەی نیعمەتەکانی خۆی لەسەر داناوە..

"إنَّ الذي أكرمَكم بأنْ هيّأ الأجرامَ العُلويةَ والسُّفليةَ بعظمتها لاستفادتكم، لابدَّ أنْ تُظهِروا لياقتَكم للكرامةِ بعبادتِه"..

وكذا تلميحٌ إلى ردِّ التصادُفِ والاتفاقِ وتأثيرِ الطبيعةِ، أي إنَّ كُلَّ ما تَرَوْنَ بصفاتِها إنما هي بجَعْلِ جاعلٍ وقصدِ قاصدٍ وتخصيصِ مخصِّصٍ ونظْمِ نظَّامٍ جلّتْ حكمتُه..

وكذا تلويحٌ إلى ردِّ مذهبِ أهلِ الطبيعةِ ومذهبِ الصابئين المولِّدِ لمذهب الوثنيين..

وايضاً تنبيهٌ إلى أنَّ صفاتِ الأجسامِ بإمكانها تدلُّ على الصانع؛ إذ الأجسامُ متساويةٌ ذراتُها في قابليةِ الأحوالِ والكيفياتِ العموميةِ، فكلُّ صفةٍ ممكنةٌ متردِّدةٌ بين احتمالاتٍ كثيرةٍ، فكلُّ جسمٍ باعتبار كلِّ صفةٍ وكيفيةٍ يحتاجُ إلى قصدٍ وحكمةٍ وتخصيصِ مُخصِّصٍ.

أما تقديمُ ﴿لَكُمُ﴾ فإشارةٌ إلى أنَّ تفريشَ الأرضِ لأجْلِ الإنسانِ، لا أنَّ المفترِشَ والمستفيدَ هو الإنسانُ فقط، حتى يكونَ الزائدُ عبثاً، فتأمَّلْ!

وأما ﴿فِرَاشاً﴾ فإشارةٌ إلى نكتة البلاغةِ التي هي نقطةُ الغرابةِ، وهي قيدُ "مع اقتضاءِ طبعِها الانغماسُ في الماء"..

وإيماءٌ إلى أنَّ التفريشَ بالجَعْلِ خلافُ الطبيعةِ؛ إذ مقتضى طبيعةِ الكرةِ استيلاءُ الماءِ عليها وإحاطتُه بها، فالصانعُ بحكمته ومرحمتِه أظهرَ قسماً منها وفرشَه ووضعَ عليه مائدةَ نِعَمه..

هەروەها بە پێی دەستووری "إذا ثبتَ الشيءُ ثبتَ بلوازِمِـــهِ" بێدارکردنەوەیەکە بۆ ئەوەی کـە: گـۆی زەوی بـە وێنـەی زەویـی ناومـاڵ ڕاخـراوە، چونکـە جۆرەکـانی ڕووەکەکان و زیندەوەران بە وێنەی شمەکی ناوماڵ بە مەبەست و حیکمەت دانراون..

هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە (بەدیهێنانی) زەوی، بـە "مەبەسـت" و "دانـایی"، ناوەندە لە نێـوان ئەو مـاددە شـلەی کە پێی لەسەر ڕاگیر نابێت و، ئەو ڕەقە یەکجار توندوتۆڵەش کە سوودی نییە و کشتوکاڵ هەڵناگرێ، تا ببێتە شتێکی بێهوودە تەنانەت گەر ئاڵتوونیش بێـت.. جا ناوەندبوونی "وشکایی" زەوی لـە نێـوان ئـەو دووانـەدا، ئاشکرایە کە بە تایبەتکردن و دانان و مەبەستی کەسێکی دانایە.

سەبارەت بە ﴿وَالسَّمَاءَ بِنَاءً﴾یش، ئەوا ئاماژەیە بـۆ ئـەوەی کە کاتێ خـوای گـەورە ئاسمانی بۆ ئێوە کرد بە خانە و بنمیچ، ئەوا ئەستێرەکانی ئەو ئاسمانەش بوونە چـەند چرایەك بۆ ئێوە، کەواتە گومـانی "ڕێکەوت" نییە لـە بڵاوکردنـەوەی ئەو ئەستێرانە بە ئاسماندا، وەك ئەوەی کە گومانی ڕێکەوت لە چۆنێتیی ئەو گەوهەرانـەدا دەکرێ کە بە بڵاوی فڕێ دەدرێنە سەر زەوی.

بزانە! ئەم ئایەتە ئاماژە و هێمایەکی بـۆ نهێنییـەکی سەیر و ورد و بـەنرخ تێدایـە، کە بریتییە لەمە:

* ئەگەر وتت:

مرۆڤ گەردیلەیەکە لـەچاو زەوییەکەی و، زەوییەکەشی گەردیلەیەکە لـەچاو بوونـەوەران، هـەروەها "تـاك"ی مـرۆڤ گەردیلەیەکـە لـەچاو "جـۆر"ەکـەی و، جۆرەکەشی گەردیلەیەکە لەچاو هاوبەشانی سوود وەرگرتنیـدا لـەم خانەیە.. هـەروەها ڕووی سـوود وەرگـرتنی مـرۆڤ گەردیلەیەکـە لەچـاو سـوود و ئامانجـەکانی ئـەم خانەیەدا و، ئەو ئامانجانەش کە ژیرییەکان هەستی پێ دەکەن گەردیلەیـەکن لـەچاو ئەو سوودانەی کە لە دانستی ئـەزەلی و زانستی خـوای گـەورەدان.. ئیتر چۆن ئـەم جیهانـە لەبەر مرۆڤ و سوودەکانی مرۆڤ بەدیـهێنراوە و هـەر مـرۆڤ "هۆکـارە ئامـانج"ی بەدیهێنانیەتی؟!

پێت دەوترێت: بەڵێ ڕاستە.. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوەشدا کـە ڕابـورد.. ئـەوا لـەبەر فراوانیـی "گیـان"ی مـرۆڤ و، خۆکـردنەوەی "ژیـری"یەکـەی و، کـرانەوەی ئامادەییەکانی و، زۆری و بەربڵاویی سوود وەرگرتنەکانیشیەتی لە بوونەوەران..

وكذا تنبيهٌ - بقاعدةِ: "إذا ثبتَ الشيءُ ثبتَ بلوازمه" - إلى أنَّ الأرضَ كأرض البيتِ مبسوطةٌ، فأنواعُ النباتاتِ والحيواناتِ فيها كأساسات البيتِ إنما وُضِعتْ بقصدٍ وحكمةٍ..

وكذا إيماءٌ إلى أنَّ الأرضَ توسَّطتْ بقصدٍ وحكمةٍ بين المائعِ الذي لا تتمسَّكُ عليه الأقدامُ، وبين الصَّلبِ الشديدِ الذي لا يقبَلُ الاستفادةَ والزِّراعةَ فيكونَ عبَثاً، ولو كان ذهباً. فبالتوسُّطِ إشارةٌ إلى أنّه بتخصيصٍ وجعلٍ وقصدِ حكيمٍ.

أما ﴿وَالسَّمَاءَ بِنَاءً﴾ فإشارةٌ إلى أنّه تعالى لما جعلَ لكم السماءَ سقفاً وبناءً، صارتْ نجومُها قناديلَ لكم، فلا يُتوهَّمُ التصادفُ في تفريق تلك القناديلِ وانتشارِها كما يُتوهَّمُ التصادفُ في وضعيةِ الجواهر التي تُرمَى على الأرض مُنْتَثِرَةً.

اعلم أنَّ في هذه الآية إشارةً ورمزاً وإيماءً إلى سرٍّ عجيبٍ دقيقٍ غالٍ، وهو:

* إنْ قلتَ:

إنَّ الإنسانَ ذرةٌ بالنسبة إلى أرضه، وأرضُه ذرةٌ بالنسبة إلى الكائنات. وكذا فردُه ذرةٌ[1] إلى نوعِه، ونوعُه ذرةٌ بالنسبة إلى شركائِه في الاستفادة في هذا البيتِ العالي. وكذا جهةُ استفادةِ البشرِ بالنسبة إلى فوائدِ وغاياتِ هذا البيتِ ذرةٌ، والغاياتُ التي تُحِسُّ بها العقولُ ذرةٌ بالنسبة إلى فوائدِه في الحكمةِ الأزليةِ والعلمِ الإلهي، فكيف جُعِلَ العالَمُ مخلوقاً لأجْل البشرِ واستفادتُه علةً غائيةً؟

قيل لك:

نعم، ولكنْ مع كلِّ ما مرَّ؛ لأجْل وُسعةِ روحِ الإنسانِ وتبسُّطِ عقلِه وانبساطِ استعدادِه وكثرةِ وانتشارِ استفادتِه من الكائنات..

---

(١) ذرة بالنسبة إلى نوعه (ش)

هەروەها لەبەر نەبوونی سەخڵەت کردن و پەرت بوون و پاڵپاڵێن لەو سوود وەرگرتنانەیدا، بە وێنەی شتی "هەمەکی" لەچاو "هەندەکی"یەکانی، چونکە "هەمەکی" بە تەواوی لە هەموو یەکێکی "هەندەکی"یەکانیدا هەیە، بە بێ سەخڵەت کردنی یەکتری و لەت بوونیش..

لەبەر هەموو ئەمانە، قورئانی پیرۆز، لایەنی سوود وەرگرتنی مرۆڤی - کە ئامانجێکی بێ وێنەی نێوان هەزاران هەزار ئامانجی ئاسمان و زەوی‌یە - خستووەتە پلەی "ئامانجە هۆکار"ی بەدیهێنانی ئاسمان و زەوی. وەك بڵێی بە گوێرەی ڕوانینی مرۆڤ هەر تەنها هۆکارە ئامانج ئەم لایەنەی سوود وەرگرتنی مرۆڤ بێت لێیان.

واتە مرۆڤ بە وێنەی حەوشەیەك سوود لە زەوی وەردەگرێت بۆ خانووەکەی و، ئاسمانیش وەك بنمیچێکی ئەو خانووە و، ئەستێرەکانیش بە وێنەی چرا و، ڕووەکەکانیش بە وێنەی کەلوپەل..

کەواتە هەموو یەکێکی مرۆڤەکان مافی خۆیەتی کە بڵێت: خۆرەکەم، ئاسمانەکەم، زەوی‌یەکەم.

دەسا فەرموو بە هاوڕێیی "ژیری"ت بیری لێ بکەرەوە!

سەبارەت بە چۆنێتی‌یەکانی ﴿وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَكُمْ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

نیسبەتدانی ﴿أَنْزَلَ﴾ بۆ لای "زەمیر"[1] ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە دڵۆپەکانی باران بە تەرازووی "مەبەست"ێك و "دانست"ێك دادەبەزێنرێن و ڕەوانە دەکرێن، تەنانەت هەموو دڵۆپێکی ئەو بارانە سیستەمێکی تایبەتی دەوراندەوری داوە، بە نیشانەی ئەوەی کە لەو ماوە دوورەدا و، لەگەڵ یاری پێ کردنی هەواشدا، کەچی بەر دەستە خوشکەکانی خۆی ناکەوێت..

ئەوەش دەری دەخات کە پەتی بۆ شل نەکراوە و جڵەوی بەر نەدراوە، بەڵکو جڵەوی هەموو یەکێکیان لە دەستی مەلائیکەیەکدایە کە نوێنەر و دەرخەری ڕێسا و سیستەمێکە.

---

(١) واتە: جێناوی (هو). (وەرگێڕ)

وأيضاً لأجْلِ عدمِ المزاحمةِ والتجزي والمدافعةِ في جهة الاستفادةِ كنسبة الكلّي إلى جزئياتِه - إذ الكلِّي بتمامِه موجودٌ في كلٍّ مِن جزئياتِه لا مزاحمةَ ولا تجزّيَ - جَعَل القرآنُ جهةَ استفادةِ البشرِ التي هي غايةٌ فذّةٌ من ألوفِ ألوفِ غاياتِ السماءِ والأرضِ، في منـزلة العلّةِ الغائيّةِ. كأنّها هي العلةُ بالنظر إلى الإنسانِ..

أي إنَّ الإنسانَ يستفيدُ من الأرض عَرْصَةً لبيته والسماءِ سقفاً له والنجومِ قناديلَ والنباتاتِ ذخائرَ، فحقٌّ لكلِّ فردٍ أنْ يقولَ: شمسي وسمائي وأرضي.

فتأمَّلْ وعقلُك معك!

أما كيفياتُ: ﴿وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَكُمْ﴾..

فاعلم أنَّ نسبةَ ﴿أَنزَلَ﴾ إلى الضمير إشارةٌ إلى أنَّ القَطَراتِ إنما تُنـزَلُ بميزانِ قصدٍ وتُرسَلُ بحكمةٍ، حتى إنَّ كلَّ قطرةٍ محفوفةٌ بنظامٍ مخصوصٍ، بأمارةِ عدمِ مصادمتِها لأخواتها في تلك المسافةِ البعيدةِ مع تلعُّبِ الهواءِ بها. فيؤذِنُ أنْ ليست غواربُها على أعناقها[1]، بل زمامُ كلٍّ في يد مَلَكٍ ممثّلٍ لنظامٍ ومَعكِسٍ له.

---

(١) سبق التنبيه إليه.

﴿مِنَ السَّمَاءِ﴾یش، ئەوا بە دانانی ئیسمی زاهیر لە جێی زەمیردا (واتە لە بریی "وأنزل منـها")، ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی کـە مەبەسـت لـەم ئاسمانـە لایەنەکەیـەتی نـەك تەنـە تایبەتی‌یەکەی[1].

سەبارەت بە ﴿مَاءً﴾یش، لە کاتێکدا کـە ئەوەی دابەزێنراوە بەفر و تەرزە و بارانە، ئەوا ئاماژەیە بۆ سەرچاوە نزیکەکەی سوود وەرگرتن کە بریتی‌یە لە: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾ (الأنبياء: ٣٠).

هێنـانی وشـەکەش بـە نـەکیرەیی ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی کـە "ئـاو" چۆنێتی‌یـەکی سەرسووڕهێن و ڕێسایەکی نامۆی هەیە و، پێکهاتە کیمیاییەکانی لای ئێوە نەزانراوە.

پیتی "فاء"ی ﴿فَأَخْرَجَ﴾ کە بۆ بە دوای یەکدا هاتنی بێ ماوەیە، لـە کـاتێکدا ماوەکەی نێوانیان بریتی‌یە لەو ماوەیەی نێوان هاتنە خوارەوەی ئاوەکە و دەرچوونی بەروبوومەکە لە زەوی، ئەوا ئاماژەیە بۆ:

"اهتزت الأرض وربَتْ.. واخضَرَّتْ.. وأنبَتَتْ من كلِّ زوج بَهيج.. فَأَخْرَجَ".

(واتە: زەوی بەو بارانە کەوتـە لـەرزە و تۆوەکان چەکەرەیان کرد و، زەوی سەوز بوو و، لە هەموو جۆرە ڕووەکێکی جوان جووتێکی ڕواند).

دانەپاڵی ﴿أَخْرَجَ﴾ش بۆ لای "زەمیر" ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی کـە هاتنـە دەرەوەی بەروبوومەکان لە زەوی تەنها بە خۆبەرهەم هێنان و خۆپێکهێنان نی‌یە، بەڵکو کردگاری دانا بە چەندین سیفەت و تایبەتمەندیی ئەوتۆ بەدییان دەهێنێت و پێیـان دەگەیـەنێت کە لـە ماددەکەیاندا نی‌یە.

سەبارەت بە ﴿بِهِ﴾ ئەوا لەبەر هەڵمژینی واتـا ڕاستەقینەکەی کە "إلصاق"(پێوە نووسـان)ە بـۆ واتـای "هۆکـارێتی"[2]، ئـەوا هێمایـە بـۆ ناسـکیی تـەڕ و پـاراویی

---

(١) چونکە شوێنەکە هی "زەمیر"(جێناو)ە. جا کە وازی لێ هێنا بۆ "ئیسمی زاهیر" دیارە کە مەبەستی ئەوەی یەکەم نی‌یە. (ب)

(٢) حەرفی جەڕی (بـ) لە ڕێزمانی عەرەبیدا چەند واتایەکی هەیە، واتا سەرەکی‌یەکەیان "إلصاق"(پێوە نووسان)ە، وەك ئەوەی بڵێیت: "امسكتُ بخالدٍ". چونکە دەستەکە بە خالیدەوە نووساوە. یەکێکی تر لە واتاکانی: "سببية"(هۆکارێتی)یە. وەك ئایەتی: ﴿فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنبِهِ﴾ (العنكبوت: ٤٠) واتە بە هۆی گوناهەکەیەوە. (وەرگێڕ)

أما ﴿مِنَ السَّمَاءِ﴾ فإشارةٌ بإقامة الظاهرِ مقامَ الضميرِ، إلى أنَّ الغَرَضَ من هذه السماءِ جهتُها لا جِرمُها المخصوصُ[١].

أما ﴿مَاءً﴾ مع أنَّ المُـنـزَلَ ثلجٌ وبَرَدٌ ومَطَرٌ، فإشارةٌ إلى المنشأ القريبِ للاستفادة: ﴿وَجَعَلْنا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾ (الأنبياء: ٣٠).

أما تنكيرُه فإشارةٌ إلى أنّه ماءٌ عجيبٌ شأنُه، غريبٌ نظامُه، مجهولٌ لكم امتزاجاتُه الكِمْيَوِيةُ.

أما فاءُ ﴿فَأَخْرَجَ﴾ الموضوعةُ للتعقيب بلا مُهلةٍ، مع المهلةِ بينَ نزولِ الماءِ وخروجِ الثَّمرِ، فتلويحٌ إلى فـ"اهتزت الأرضُ وربَتْ.. واخضرَّتْ.. وانبتتْ من كل زوجٍ بهيج.. فأخرجَ".

أما نسبةُ ﴿أَخْرَجَ﴾ إلى الضمير فإشارةٌ إلى أنَّ خروجَ الثمارِ ليس بتولُّدٍ وتركُّبٍ فقط، بل الصانعُ الحكيمُ يُنشِئُها ويرتِّبُها بصفاتٍ وخواصَّ لا توجَدُ في مادتها.

أما ﴿بِهِ﴾ فبسببِ تشرُّبِ المعنى الحقيقيِّ ــ وهو الإلصاقُ ــ للسببيةِ، رمزٌ إلى لطافة

---

(١) لأن المقام مقام الضمير، فإذا عدل عنه إلى الظاهر يكون المراد به غير الأول. (ب)

بەروبوومەکان، ئیتر "ئاو" - بە پێچەوانەی سروشتی خۆی - لە ڕێی ڕیشاڵە موویینەکانی ڕووەکەوە بەرەو ئەو بەروبوومانە بەرز دەبێتەوە و، پەرداخی بەروبوومەکان پڕ دەکات و پێیانەوە دەنووسێت.

سەبارەت بە ﴿مِنَ الثَّمَرَاتِ﴾یش، لەبەر ئەوەی "مِن" لای سیبەوەیهی لە واتای "إبتداء"(دەست پێ کردن) بێ بەش نییە، ئەوا ئاماژە بۆ مەفعوولێك دەکات کە بە پێی تێگەیشتنی بیسەر دیاری دەبێت، واتە ئەو بەروبوومانە چەندین جۆریان هەیە بە پێی حەزی خۆتان.

تەنوینی ﴿رِزْقاً﴾یش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هۆکارەکانی بەدەستهاتنی ڕۆزییەکە لای ئێوە نەزانراوە و، ئەو ڕۆزییە لە شوێنێکەوە دێت کە لە حسابدا نییە.

﴿لَكُمْ﴾یش ئاماژەیە بۆ جەخت کردنەوە لە واتای "منەت لێ نان"..

هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە "ڕۆزی" لەبەر ئێوەیە، کەواتە هیچ ڕێگرێك نییە لە سوود وەرگرتنی بوونەوەرانی جگە لە ئێوەش لەو ڕۆزییە، وەك پاشکۆیەك..

هەروەها هێمایە بۆ ئەوەی کە هەروەك خوای گەورە ئێوەی بە نیعمەتەکانی خۆی تایبەتمەند کردووە، دە ئێوەش شوکرانەتان تایبەت بکەن بەو.

سەبارەت بە هۆنینی پێکهاتەی ﴿فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَاداً﴾یش، ئەوا:

"فاء"ەکەی دەڕوانێتە هەر چوار بڕگەکە..

واتە: لەبەر ئەوەی تەنها هەر ئەو "پەرستراو"ە، ئەوا هاوبەشی بۆ دامەنێن.. لەبەر ئەوەی تەنها ئەو خاوەن توانستی ڕەهایە و، زەوی و ئاسمان لەناو دەستی ئەودایە، ئەوا لەو بڕوایەدا مەبن کە هاوبەشی هەبێت.. لەبەر ئەوەی کە هەر تەنها ئەو نیعمەت بەخشە، ئەوا لە شوکرانەیدا کەس مەکەن بە هاوبەشی.. لەبەر ئەوەی کە هەر ئەو بەدیهێنەرتانە، ئەوا بوونی هاوبەشی ئەوتان بە ئەندێشەدا نەیەت.

سەبارەت بە ﴿تَجْعَلُواْ﴾ش لە بریی "تعتقدوا" ئەوا ئاماژەیە بۆ واتای: ﴿إِنْ هِيَ إِلاَّ أَسْمَاءٌ سَمَّيْتُمُوهَا﴾ (النجم: ٢٣) واتە ئەوانە چەند ناوێکی بێ واتان خۆتان داتان ناون.

پێشخستنی ﴿لِلّهِ﴾ لەگەڵ ئەوەشدا کە بۆ بایەخ پێدانە بە مەبەستی ئەوەی لە پێش چاودا دابنرێت، هێمایەکیشە بۆ ئەوەی کە شوێنی سەرهەڵدانی "نەهی"یەکە دانانی هاوبەشە بۆ خوای گەورە.

طراوةِ الثمارِ، فيعلو إليها الماءُ - خلافَ طبيعتِه - بوساطة "الآثارِ الشَعْرية" فيملأُ أقداحَ الثمراتِ مُلصقاً بها.

أما ﴿مِنَ الثَّمَرَاتِ﴾ فلعدمِ خلوِّها من معنى الابتداءِ عند سيبويه، يشيرُ إلى مفعولٍ يتنوّعُ بتعيُّنِ فهمِ السامعِ، أي إنَّ من الثمراتِ أنواعاً كما تشتهون.

أما تنوينُ ﴿رِزْقاً﴾ فإشارةٌ إلى أنّه رزقٌ، مجهولٌ لكم أسبابُ حصولِه، فيجيءُ مِن حيث لا يُحتسَبُ.

أما ﴿لَكُمْ﴾ فإشارةٌ إلى تأكيدِ معنى الامتنانِ..

وأيضاً إيماءٌ إلى أنَّ الرزقَ لأجلكم، فلا بأسَ من استفادة غيرِكم منه تبَعاً..

وكذا رمزٌ إلى أنّه تعالى كما خصَّكم بالنِعَم فخُصُّوه بالشكر.

أما نظمُ هيئاتِ ﴿فَلاَ تَجْعَلُواْ للهِ أَندَاداً﴾..

فـ"الفاءُ" ينظرُ إلى الفِقَراتِ الأربعةِ..

أي لأنّه هو المعبودُ فلا تشركوا.. ولأنّه هو القادرُ المطلقُ والأرضُ والسماءُ في قبضتِه فلا تعتقدوا له شريكاً.. ولأنّه المُنعمُ فلا تشركوا في شكرِه.. ولأنّه هو خالقُكم فلا تتخيلوا له شريكاً.

أما ﴿تَجْعَلُواْ﴾ بدلَ "تعتقِدوا" فإشارةٌ إلى معنَى: ﴿إِنْ هِيَ إِلاَّ أَسْمَاءٌ سَمَّيْتُمُوهَا﴾ (النجم: ٢٣) أي أسماءٌ لا معنى لها، تتخيلون لها وجوداً بجعلِكم.

أما تقديمُ ﴿للهِ﴾ فمعَ الاهتمامِ بجعلِه نُصبَ العينِ، إيماءٌ إلى أنَّ منشأَ النهي كَوْنُ الشريكِ للهِ.

﴿أَندَادًا﴾یش، وشـەی "نِدّ" لە واتای وشـەی "مِثل"(هاوشـێوە)دایە. خۆ هاوشێوەی خوایش خودی دژەکەیەتی، ئەم دوانەش دژایەتی لـە نێوانیـاندا هەیـە. ئەوەش هێمایـەکی وردی تێدایە بۆ ئەوەی کە بوونی "نِدّ" لە خۆیدا بە ئاشکرا و ڕوونی بەتاڵە و نی‌یە.

هێنانیشـی بە "کۆ" ئاماژەیـە بۆ ئەوپـەڕی نـەفامیی ئەوانـەی کـە هاوبەشـیـان بۆ خـوا داناوە و، ئاماژەشـە بۆ گاڵتـە پێکردنیـان. واتـە: "ئـەو خوایـەی کـە بـە هیـچ جۆرێـك هاوشێوەی نی‌یە، ئێوە چۆن چۆنی کۆمەڵێك هاوشێوە و دژتان بۆ داناوە؟"!

هەروەها هێمایە کە بۆ بەرپەرچدانەوەی هەموو جۆرەکانی "هاوبەشایەتی". واتە نە لە زاتیدا، نە لە سیفەتەکانیدا، نە لە کردارەکانیدا هاوبەشی نی‌یە..

هـەروەها ئاماژەیـە بۆ بەرپەرچدانـەوەی سـەرجەم چینـەکانی موشریکەکان لـە بـت پەرستان و، صابیئی‌یەکان و، شوێنکەوتووانی باوەڕ بە سێ دانەیی خوا و، ئـەو سروشـت پەرستانەش کە باوەڕیان بە کاریگەریی ڕاستەقینەی هۆکارەکان هەیە.

پاشکۆیەك:

مایەی سەرهەڵدانی بتپەرستی و پەیدا بوونی بتەکان، یان بە خوا دانانی ئەستێرەکانە، یاخود خەیاڵکردنی چوونە ناوەوەی خوایە بۆ ناو شتان، یـان وەهمـی ئەوەیـە کـە خـوای گەورە - حاشا - جەستەیەك بێت (بە وێنەی بەدیهێنراوانی).

سەبارەت بە ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾یش لەگـەڵ دەستەخوشـکانی لـە کۆتـایی ئایەتـەکاندا، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مایەی سەرهەڵدانی موسـڵمان بـوون "زانسـت"ە، بناغـەی ئـەویش "ژیری"یە. جـا "ژیـری" تەنـها ئـەوەی لـێ چاوەڕوان دەکرێـت کـە "حەقیقـەت" قبـووڵ بکات و، بەرپەرچی سەفسەتەی گومانەکان بداتەوە..

پاشان "کورتکردنەوە"ی ڕستەکە، بە هۆی وازهێنـان لـە مـەفعوول، "درێژەپێـدان"ی گەیاند! واتە: ئێوە دەزانن کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە و، هیچ بەدیهێنەرێك و، هیـچ خاوەن دەسەڵاتێکی ڕەها و، هیچ نیعمەت بەخشێك نی‌یە، ئەو نەبێت.

هەروەها ئێوە دەزانن کە ئەو شتانەی ئەوان ناوی "خواکانیـان" لـێ نـاون و بتـەکان، هیچ نین و، توانایان بەسەر هیچ شتێکدا نی‌یـە و، هـەموویان بەدیـهێنراون و، بـە خـەیاڵی خۆتان داتان ناون بە خوا و بتانی پەرستراو. دەسا بیری لـێ بکەرەوە!

* * *

أما ﴿أَندَاداً﴾ فلفظُ الندِّ بمعنى المِثلِ، ومِثلُه تعالى يكونُ عينَ ضدِّه، وبينهما تضادٌّ، ففيه إيماءٌ لطيفٌ إلى أنَّ الندَّ بيِّنُ البطلانِ بنفسِه..

أما الجمعُ فإشارةٌ إلى نهايةِ جهالةِ المشركين وإيماءٌ إلى التهكُّم بهم. "أي كيف تجعلون لله الذي لا شبيهَ له بوجهٍ مّا جماعةً مِن أمثالٍ وأضداد"؟

وكذا رمزٌ إلى ردِّ كلِّ أنواعِ الشركِ. أي لا شريكَ له في ذاته ولا في صفاته ولا في أفعاله..

وتلويحٌ إلى ردِّ طبقاتِ المشركين من الوثنيين والصابئين وأهلِ التثليثِ وأهلِ الطبيعةِ المعتقدين بالتأثير الحقيقيِّ للأسباب.

تذييلٌ:

منشأُ الوثنيةِ والأصنامِ إما تأليهُ النجومِ أو تخيُّلُ الحلولِ أو توهُّمِ الجسميةِ.

أما ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ فمع أخواتِها من الفواصلِ، إشارةٌ إلى أنَّ منشأَ الإسلاميةِ هو العلمُ وأساسُها العقلُ، فمِن شأنِه أنْ يقبلَ الحقيقةَ، ويردَّ سفسطةَ الأوهامِ.

ثم إنّه أطنبَ بإيجازِ تركِ المفعولِ، أي ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ أنْ لا معبودَ حقيقياً ولا خالقَ ولا قادرَ مطلقاً ولا مُنعِمَ إلّا هو.. وكذا وأنتم تعلمون أنَّ الآلهةَ والأصنامَ ليست بشيءٍ، لا تقتدِرُ على شيءٍ، وأنّها مخلوقةٌ مجعولةٌ تتخيلونها. فتدبَّرْ!

***

﴿وَإِنْ كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللهِ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ ۝ فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُواْ وَلَنْ تَفْعَلُواْ فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾ (البقرة: ٢٣-٢٤)

## (پێشەکییەك سەبارەت بە لێکۆڵینەوە لە پێغەمبەرێتی)

بزانە کە:

هەروەك ئایەتی پێشوو یەکەم دانەی چوار ئامانجە بنەڕەتییەکانی قورئانی چەسپاند کە "تەوحید"ە.. بە هەمان جۆر، ئەم ئایەتەش دووهەم دانەی چوار ئامانجەکانی دەچەسپێنێت کە سەلماندنی پێغەمبەرێتیی محەممەدە ﷺ بە کاملترینی موعجیزەکانی، کە تەحەددی کردنە بە ئیعجازی قورئانی پیرۆز.

بەڵگەکانی پێغەمبەرێتیی ئەو سەروەرەمان لە کتێبێکی تردا بە درێژی باس کردووە. با هەندێکیان لێرەدا و لە شەش[1] مەسەلەدا کورت بکەینەوە.

مەسەلەی یەکەم:

بزانە کە: گەڕان و پشکنینی تەواو سەبارەت بە حاڵەتەکانی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - هاوکات لەگەڵ ئەو ڕێکوپێکییە بەردەوامەی کە پێی دەوترێ "قیاسی پەنهان" ئەوە بە دەستەوە دەدەن کە:

خولگە و بناغەی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت- و، چۆنێتیی مامەڵەیان لەگەڵ نەتەوەکانیاندا - بە مەرجی پەتی کردنی مەسەلەکە لە

(١) لە حەوت مەسەلەدا. (ش)

﴿وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِنْ دُونِ اللهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ * فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾ (البقرة: ٢٣-٢٤)

## مقدمةٌ في تحقيقِ النُّبُوَّةِ

اعلم أنّه كما أثبتت الآيةُ السابقةُ أوّلَ المقاصدِ الأساسيةِ القرآنيةِ وهو التوحيدُ؛ كذلك تُثبِتُ هذه الآيةُ ثانيَ المقاصدِ الأربعةِ وهو إثباتُ نبوّةِ محمّدٍ عليه الصلاةُ والسلامُ بأكملِ معجزاتِه الذي هو التحدّي بإعجازِ القرآنِ. ولقد فصَّلْنا دلائلَ نبوَّتِه في كتابٍ آخَرَ فلْنُلَخِّصْ بعضَها هنا في ستٍّ[1] مسائلَ:

**المسألةُ الأولى**

اعلم أنَّ الاستقراءَ التامَّ في أحوالِ الأنبياءِ مع الانتظامِ المطَّردِ المسمَّى بالقياس الخفيِّ يُنتِجُ أنَّ مدارَ نبوّةِ الأنبياءِ وأساسَها وكيفيةَ معاملاتِهم مع أممِهم - بشرطِ تجريدِ المسألةِ

(١) في سبع مسائل. (ش)

تایبەتکاری‌یەکانی کاریگەریی کـات و شـوێن - بـە جوانـترین شـێوە لـەو محەممـەدەدا ﷺ هەیە کە مامۆستای ئادەمیزادە لە تەمەنی کامڵیی مرۆڤدا. ئەمەش بە "طریــق الأَوْلی"[(١)] و "قیاسی ئەولەوی"[(٢)] ئەوە بەرهەم دێنێت کە ئەویش پێغەمبەری ڕەوانەکراوی خوایە..

جا هەموو پێغەمبەران - درووديان لـەسەر بێـت - بە زمانی موعجیزاتیـان وەکـو ئـەوە وان کە شایەت بن لـەسەر ڕاسـتگۆیی ئـەو محەممـەدەی ﷺ کـە بەڵگـەی ڕووناکـە لەسـەر "بوون" و "یەکتایی" پەروەردگار. دە فەرموو بیری لـێ بکەرەوە.

مەسەلەی دووهەم

بزانە کە: هەموو حاڵەت و جموجووڵێکی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر دەراساش نەبێت، ئـەوا لە سەرەتادا ئاماژە بۆ ڕاستگۆیی و لـە کۆتاییشدا بۆ "حـەق" بوونـی دەکـات. ئایـا نـابینی حـاڵی ئـەو سـەروەرە ﷺ لـە هاوشـێوەکانی ڕووداوی ئەشـکەوتەکەدا - کـە بـە پێـی عادەت - هیوای ڕزگاری نەمابوو، چۆن بووە؟ ئـەوەبوو بەوپـەڕی دڵنیـایی و جیـددی و متمانەوە دەیفەرموو: ﴿لا تَحْزَنْ إِنَّ اللّٰهَ مَعَنَا﴾ (التوبة: ٤٠)!

جا هەروەك سەرەتای بزووتنەوەکـەی - بێ گوێدانـە هیـچ نـەیارێك و بـە بێ تـرس و دوودڵـی، هاوکـات لەگـەڵ ئەوپـەڕی دڵنیـاییدا - بەڵگەیـە لەسـەر دەسـتگرتنی بـە "ڕاستی"یەوە، بە هەمان جۆر و بە تەواوبوونی بزووتنەوەکەشی، کە چەندین دەستووری ئەوتۆی دامەزراند بناغەی بەختەوەریی هـەردوو دنیـان و، "حـەق" پێکـانی و، پەیوەسـت بوونی بە حەقیقەتەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەسەر حەقە..

ئەمـە سـەبارەت بـە یـەك بـە یـەکی جموجوولـەکانی. خـۆ ئەگـەر بڕوانیتـە کـۆی جموجووڵ و حاڵەتەکانی، ئەوا بە وێنەی بروسکەی ورشەدار بەڵگـەی پێغەمبـەرێتیی ئـەو لە پێش چاوتدا دەردەکەوێت. کەواتە چاو بکەرەوە و ببینە!

مەسەلەی سێهەم

بزانـە کـە: سـەردەمی ڕابوردوو (پێـش ئـەو) هـەروەها کـاتی ئێستا (واتـە سـەردەمی پێغەمبەرایەتی‌یەکەی، کە چـەرخی بەختەوەری‌یـە) هـەروەها داهـاتووش (سـەردەمەکانی دواتر) هەر هەموویان یەکیان گرتووە لـەسەر پشت ڕاسـتکردنەوەی پێغەمبەرێتی‌یەکـەی. هەروەك زاتی خۆیشی بەڵگەیە لـەسەر پێغەمبەرێتی‌یەکەی ئەو.

---

(١) واتە پێغەمبەرێتیی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ زیاتر دەسەلمێنێت لە چاو پێغەمبەرانی تردا. (وەرگێڕ)

(٢) بۆ واتاکەی بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە: ١٣٨. (وەرگێڕ)

عن خصوصيات تأثيرِ الزمانِ والمكانِ - يوجَدُ بأكملِ وجهٍ في محمّدٍ عليه الصلاةُ والسلامُ الذي هو أستاذُ البشرِ في سنِّ كمالِ البشرِ، فينتِجُ بالطَّريق الأَوْلَى وبالقياس الأَوْلَويِّ أنّه أيضاً رسولُ الله.

فجميعُ الأنبياءِ بألسنةِ معجزاتِهم كأنّهم شاهدون على صدق محمّدٍ عليه السلامُ الذي هو البرهانُ النَيِّرُ على وجود الصانعِ ووحدتهِ. فتأمَّلْ.

**المسألةُ الثانيةُ**

اعلم أنَّ كلَّ حالٍ من أحوالِه وكلَّ حركةٍ من حركاتِه عليه السلامُ - وإنْ لم يكنْ خارقاً - يلَوِّحُ بالمبدأ على صدقِه وبالمنتهى على حقانيتِه. ألا ترى أنّه عليه السلامُ كيف كان حالُه في أمثال واقعةِ الغارِ التي انقطعَ - بحسب العادة - أملُ الخلاصِ، يقولُ بكمال الوثوقِ والاطمئنانِ والجدِّيةِ: ﴿لا تَحْزَنْ إِنَّ اللهَ مَعَنَا﴾ (التوبة: ٤٠)!

فكما أنَّ ابتداءَه بالحركة - بلا مبالاةٍ لمعارضٍ وبلا خوفٍ وتردُّدٍ مع كمالِ الاطمئنانِ - يدلُّ على تمسُّكِه بالصدق؛ كذلك تأسيسُه بانتهاء حركاتِه - لقواعدَ هي الأساسُ لسعادة الدارين - وإصابتُه للحق واتصالُه بالحقيقة دليلٌ على حقانيتِه..

فهذا فرداً فرداً. وأما إذا نظرْتَ إلى مجموع حركاتِه وأحوالِه يتجلّى لِعينك برهانُ نبوَّتِه كالبرق اللامعِ. فتبَصَّرْ!

**المسألةُ الثالثةُ**

اعلم أنَّ الزمانَ الماضيَ والحالَ (أي عصرَ السعادةِ) والاستقبالَ اتفقتْ على تصديق نبوّتِه، كما أنَّ ذاتَه دليلٌ على نبوّتِه..

دەبا ئەم چوار لاپەڕەیە بخوێنینەوە:

یەکەم شت: خۆمان بە خوێندنەوەی لاپەڕەی زاتی ئەو ﷺ بەرەکەتاوی دەکەین. بۆ ئەمەش - لە پێش هەموو شتێکدا - پێویستمان بە وێناکردنی چوار سەرنج دەبێت:

یەکەمیان: "لیس الکحل کالتکحل"[(١)]. واتە: شتی سنعەت و دەستکرد - با لە تەواوترین شێوەشدا بێت - ناگاتە پلەی سروشتی و فیتری و، هەرگیز جێی ئەو ناگرێتەوە. بەڵکو زەللەی هەڵەی شێوەی دەستکردەکە ئاماژە بۆ کاری ڕازاندنەوەی دەکات.

دووهەمیان: ڕەوشتە بەرزەکان تەنها بە هۆی "جیددییەت"ەوە پەیوەست دەبن بە زەویی حەقیقەتەوە. بەردەوامیی ژیانیان و ڕێکوپێکیی کۆی هەموو شیان تەنها بە "ڕاستی" دەبێت. خۆ ئەگەر "ڕاستی" لە نێوانیاندا لابرا، ئەوا بە وێنەی درك و داڵی وشکیان لێ دێت بەدەم باوە.

سێهەمیان: هەروەك مەیل و کێش بوون بەرەو یەکتر لەو شتانەدا هەیە کە پەیوەندییەکیان لە نێواندایە، دوورخستنەوە و دوورەپەرێزیش لە یەکتر لەو شتانەدا هەیە کە دژی یەکترین.

چوارەمیان: "للکل حکم لیس لکل". (واتە: ئەو بڕیارەی کە بۆ کۆی چەند شتێك هەیە، بۆ دانە دانەیان نییە). بە وێنەی توندوتۆڵیی پەت، هاوکات لەگەڵ لاوازیی تاڵە دەزووەکانیدا.

جا ئەگەر لەم سەرنجانە تێگەیشتیت، ئەوا بزانە کە:

ئاسەوارەکانی حەزرەتی محەممەد ﷺ، هەروەها ژیانی پیرۆزی و، مێژووی ژیانی، شایەتی دەدەن - تەنانەت بە سەلماندنی دوژمنانیشی - لەسەر ئەوەی کە خاوەنی ڕەوشت و خوویەکی گەورەیە و، سەرجەم ڕەوشتە بەرزەکانی تێدا کۆیە.

خۆ ئاشکرایە کە تێکەڵبوونی ئەو ڕەوشتانەش دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی دەروون بەرزی و پلەیەکی کۆمەڵایەتی و شەرەف و ویقارێك کە ڕێ نادەن بە دابەزین بەرەو کاروبارە نزمەکان.

---

(١) موتەنەبی دەڵێ:

لأنّ حِلمَكَ حِلمٌ لا تَكَلّفُهُ ليسَ التَّكَحُّلُ في العينينِ كالكَحَلِ

ولْنطالِعْ هذه الصحُفَ الأربعَ:

فأولاً: نتبرَّكُ بمطالعة ذاتِه عليه السلامُ. ولابدَّ أوّلاً مِن تصوُّرِ أربعِ نكتٍ:

إحداها: أنّه "ليس الكَحَلُ كالتكحُّل"(١) أي لا يصلُ الصنعيُّ والتصنعيُّ - ولو كانا على أكملِ الوجوهِ - مرتبةَ الطبيعيِّ والفطريِّ ولا يقومُ مقامَه، بل فَلَتاتُ غلَطاتِ هيئةِ حركةِ الصنعيِّ تومِئُ بمُزخرَفِيَّته.

والثانية: أنَّ الأخلاقَ العاليةَ إنما تتصلُ بأرض الحقيقةِ بالجدّيةِ، وأنَّ إدامةَ حياتِها وانتظامَ مجموعِها إنما هي بالصدق. ولو ارتفعَ الصدقُ مِن بينِها صارتْ كهشيمٍ تذروه الرياحُ.

والثالثة: هي أنّه كما يوجَدُ المَيلُ والجذبُ في الأمور المتناسبةِ، كذلك يوجَدُ الدفعُ والتنافرُ في الأمور المتضادَّةِ.

والرابعةُ: هي "أنَّ للكلِّ حُكماً ليس لكلٍّ" كقُوَّةِ الحبلِ مع ضَعفِ خيوطِه..

وإذا تفطنتَ لهذه النُّكَتِ، فاعلمْ أنَّ آثارَ محمّدٍ عليه الصلاةُ والسلامُ وسِيَره وتاريخَ حياتِه تشهَدُ - مع تسليمِ أعدائِه - بأنّه لَعَلَى خُلُقٍ عظيمٍ، وبأنّه قد اجتمعَتْ فيه الخصائلُ العاليةُ كافّةً.

ومِن شأنِ امتزاجِ تلك الأخلاقِ توليدُ عزةٍ للنفس وحيثيةٍ وشرفٍ ووقارٍ لا تساعِدُ التنـزّلَ للسفاسِفِ..

---

(١) للمتنبي:

لأنَّ حِلمَكَ حِلمٌ لا تَكَلَّفُهُ لَيسَ التَكَحُّلُ في العَينَينِ كَالكَحَلِ

جا هەروەك بەرز و خاوێنیی فریشتەکان ڕێ بەوە نادەن کە شەیتانەکان تێکەڵیان بن، کۆی ڕەوشتە بەرزەکانیش بە هەمان جۆرن، هەرگیز بوار بە تێهەڵکێش بوونی فێڵ و درۆ لە نێوان خۆیاندا نادەن..

ئایا نابینی ئەو کەسەی کە تەنها بە "ئازایەتی" ناوبانگی دەرکردووە، چۆن خۆی بەرز و بلند ڕادەگرێت لە "درۆ"، مەگەر زۆر بە زەحمەت؟ ئەی ئەگەر هەموو ڕەوشتە بەرزەکان لە کەسێکدا کۆببنەوە دەبێ چۆن بێت؟

بەمەش سەلما کە زاتی پیرۆزی ئەو ﷺ بە وێنەی خۆر وایە، بەڵگەیە لەسەر خۆی!

هەروەها ئەگەر لەحاڵەتەکانی ئەو ﷺ هەر لە تەمەنی چوار ساڵییەوە هەتا چل ساڵی ورد بیتەوە - هەرچەندەش قۆناغی لاوێتی و شاڵاوی گەرمیی غەریزەکان کارێك دەکات کە شتە پەنهانەکان دەربخات و فرۆفێڵە شارراوەکانی ناو سروشتیش دەخاتە ڕوو - ئەوا دەبینی ئەم سەروەرە ﷺ لە هەموو ساڵەکانی تەمەنیدا بە ڕاستڕەوییەکی تەواوەتی و، توندوتۆڵییەکی لەڕادەبەدەر و، داوێنپاکییەکی تەواو، هاوکات لەگەڵ بەردەوامی و، ڕێکوپێکیی ئەم ڕەوشتانەیدا، پلە بە پلە سەرکەوتووە و، هیچ حاڵێکی ئاماژەی تێدا نییە بۆ ئەوەی کە فێڵی بەکارهێنابێت، نەخوازەڵا لە بەرامبەر دوژمنانی سەرسەخت و زیرەکدا..

لەو کاتەدا کە دەبینی پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرەیە، لە سەری چل ساڵەی تەمەنیدا - کە تەمەنێکە حاڵەتەکانی مرۆڤ دەکات بە "خوو"ی بەردەوام و، عادەتەکانیشی دەگۆڕێت بە سروشتێکی دامەزراو کە ڕەفتاری پێچەوانە ناکات - ئا لەم تەمەنەدا دەبینی بە کەسێکی دەراسا دەرکەوت و، ئالوگۆڕێکی مەزن و سەرسووڕهێنی لە جیهاندا نایەوە. کە ئەوەش تەنها لە لایەن خوای گەورەوەیە.

**مسەلەی چوارەم**

**بزانە کە:**

لاپەڕەی "ڕابوردوو" کە چیرۆکی ئەو پێغەمبەرانەی لەخۆ گرتووە لە قورئاندا و لەسەر زمانی ئەو باس کراون، بەڵگەن لەسەر پێغەمبەرێتیی ئەو سەروەرە. ئەوەش بە ڕەچاوکردنی چوار سەرنج:

فكما أنَّ عُلوَّ الملائكة لا يساعدُ لاختلاط الشياطين بينهم؛ كذلك تلكَ الأخلاقُ العاليةُ بجَمعها لا تساعدُ أصلاً لتداخُل الحيلةِ والكَذِبِ بينَها.

ألا ترى أنَّ الشخصَ المشتهرَ بالشجاعةِ فقط لا يتنـزَّلُ للكَذِبِ إلّا بعُسْرٍ؟ فكيف بالمجموع؟

فثبتَ أنَّ ذاتَه عليه السلامُ كالشمس دليلٌ لنفسِه..

وأيضاً إذا تأملتَ في حالِه عليه السلامُ من الأربعِ إلى أربعين - مع أنَّ مِن شأنِ الشبابيةِ وتوقُّدِ الحرارةِ الغريزيةِ أنْ تُظهِرَ ما يَخفَى وتُلقيَ إلى الظاهر ما استترَ في الطبيعة مِن الحِيَلِ - تراه عليه السلامُ قد تدرَّجَ في سنيِّه وعاشرَ بكمال استقامةٍ ونهايةِ متانةٍ وغايةِ عِفّةٍ واطّرادٍ وانتظامٍ. ما أومأَ حالٌ من أحواله إلى حيلةٍ، لاسيما في مقابلة المعاندين الأذكياءِ..

وبينما تراهُ عليه السلامُ كذلك إذْ تنظرُ إليه وهو على رأسِ أربعين سنةً - الذي مِن شأنِه جعلُ الحالاتِ مَلَكةً والعاداتِ طبيعةً ثانيةً لا تُخالَفُ - قد تكشَّفَ عليه السلامُ عن شخصٍ خارقٍ قد أوقعَ في العالمِ انقلاباً عظيماً عجيباً. فما هو إلّا مِن الله.

**المسألةُ الرابعةُ**

اعلم أنَّ صحيفةَ الماضي المشتملةَ على قَصَص الأنبياءِ المذكورةِ على لسانِه عليه السلامُ في القرآن برهانٌ على نبوَّتِه بملاحظةِ أربعِ نُكَتٍ.

**یەکەمیان:** هەر کەسێك بناغەکانی زانستێك بە دەستەوە بگرێت و، گرێکانی ژیانی بزانێت و، بە باشی لە شوێنی خۆیاندا بەکاریان بهێنێت، پاشان دەعواکەی خۆی لەسەر ئەوانە بنیات بنێت.. ئەو کارەی، بەڵگەیە لەسەر کارامەیی و شارەزایی ئەو کەسە لەو زانستەدا.

**سەرنجی دووهەم:** ئەوەیە کە ئەگەر تۆ شارەزای سروشتی مرۆڤ بیت، کەسێك نابینیت کە بە ئاسانی و بێ دوودڵی و بێ پەروا پرکێشی درۆ و سەرپێچییەك بکات، تەنانەت گەر بچووکیش بێت.. لە نێوان خەڵکانێکدا با ژمارەشیان کەم بێت.. لە بابەتێکدا هەرچەندەش بێ بایەخ بێت.. بە شێوەیەك با لاوازیش بێت..

ئەی چی دەڵێیت سەبارەت بە کەسێکی وا کە خاوەنی جێگایەکی دیاری لەوپەڕی مەزنیدایە و، داوایەکی پێیە لەوپەڕی شکۆمەندیدایە و، لە نێوان کۆمەڵێك خەڵکدایە کە تابلێی زۆرن و، لە بەرامبەر سەرسەختییەکەوە کە لەوپەڕی توندوتیژیدایە؟! لەگەڵ ئەوەشدا کە بۆ خۆی نەخوێندەوارە و نەیخوێندووە. دەبینی لە چەند کاروبارێك دەدوێت کە "ژیری" بە تەنیا خۆی سەریان لێ دەرناکات، بەڵام ئەو بەوپەڕی جیدییەت و، لە پێش چاوی هەموو دنیادا ئاشکرایان دەکات و ڕایاندەگەیەنێت..

ئایا ئەمە بەڵگە نییە لە سەر ڕاستیی ئەو کەسە و، لەسەر ئەوەش کە ئەو شتەی ڕایدەگەیەنێت لە لایەن خۆیەوە نییە، بەڵکو لە خوای گەورەوەیە؟!

**سێهەمیان:** زۆرێك لەو زانستانەی کە لە ڕێی فێرکردنی عادەتەکان و بارودۆخەکان و ڕووداوەکان و کردارەکانەوە لە لای خەڵکانی شارنشین بوونەتە "زانراو"، لای خەڵکانی گوندنشین نەزەری و نەزانراون..

لەبەر ئەوە، هەر کەسێك داوەریی ژیری ئەنجام دەدات و بە دوای حالی گوندنشینەکاندا دەگەڕێت، دەبێ بە گریمان خۆی لەو دەشت و دەرەدا دابنێت..

**چوارەمیان:** ئەگەر کەسێکی نەخوێندەوار مونازەرەی لەگەڵ زانایانی زانستێکدا - تەنانەت با زانستی "صەرف"یش بێت - کرد و، پاشان ڕای خۆی لە باس و بابەتەکانی ئەو زانستانەدا دەربڕی و، لە شوێنی یەکگرتنی ئەواندا پشتڕاستی کردنەوە و، لە شوێنی ڕا جیاوازەکانیشدا هەڵەکانی بۆ ڕاست کردنەوە.. ئایا ئەمە نابێتە بەڵگەی ئەوەی کە لە سەرووی ئەو زانایانەوەیە و، زانستەکەشی بەخششێکی خواییە؟

إحداها: أنَّ مَن يأخذُ أساساتِ فنٍّ ويعرفُ العُقَدَ الحياتيةَ فيه ويُحسِنُ استعمالَها في مواضعِها ثم يبني مُدَّعاهُ عليها؛ يدلُّ ذلك على مهارته وحذاقتِه في ذلك الفنِّ.

النكتةُ الثانيةُ: هي أنّك إنْ كنتَ عارِفاً بطبيعةِ البشرِ لا ترى أحداً يتجاسَرُ وبلا تردُّدٍ وبلا مُبالاةٍ وبسهولةٍ على مخالفةٍ وكَذِبٍ ولو صغيراً.. في قومٍ ولو قليلين.. في دعوىً ولو حقيرةً.. بحيثيةٍ ولو ضعيفةً..

فكيف بمَن له حيثيةٌ في غاية العظَمَةِ.. وفي دعوى في غاية الجلالةِ.. في قومٍ في غايةِ الكثرةِ.. في مقابلةِ عنادٍ في غايةِ الشدَّةِ مع أنه أميٌّ لم يقرأ.. يبحثُ عن أمورٍ لا يستقلُّ فيها العقلُ ويُظهِرها بكمال الجدِّيةِ، ويُعلنُها على رؤوس الأشهادِ.

أفلا يدلُّ هذا على صدقه وأنّه ليسَ منه بل مِن الله؟

الثالثةُ: هي أنَّ كثيراً من العلوم المتعارَفَةِ عندَ المدَنيين - بِتعليم العاداتِ والأحوالِ وتلقينِ الوقوعاتِ والأفعالِ - مجهولةٌ نظريّةٌ عند البدويين..

فبناءً عليه، لابدَّ لمَن يحاكِم ويتحرَّى حالَ البدويين - لا سيما في القرون الخاليةِ - أنْ يفرِضَ نفسَه في تلك الباديةِ.

الرابعةُ: هي أنّه لو ناظرَ أميٌّ علماءَ فنٍّ - ولو فنَّ الصرفِ - ثم بيَّنَ رأيَه في مسائلِه مُصدِّقاً في مظانِّ الاتفاقِ، ومُصحِّحاً في مطارحِ الاختلافِ؛ أفلا يدلُّك ذلك على تفوُّقِه، وأنَّ علمَه وهبيٌّ؟

جا ئەگەر ئەم سەرنجانەت زانی، ئەوا بزانە کە:

پێغەمبەری عەرەبیی سەروەر ﷺ هەرچەندەش نەخوێندەوار بووە، بەڵام لەسەر زمانی قورئان بە وێنەی کەسێکی ئامادە و بینەر چیرۆکی پێشینان و پێغەمبەرانی بۆ گێڕاوینەتەوە و، لە پێش چاوی هەموو جیهاندا حاڵەت و نهێنییەکانی ئەوانی ڕوون کردووەتەوە، ئەوەش لە کێشەیەکی هێندە مەزندا کە وردبینیی خەڵکانی زیرەك بە لای خۆیدا ڕادەکێشێت..

ئەوەتا بێ پەروا و، بە بێ دوودڵی و، لەوپەڕی باوەڕ و متمانەدا، بەسەرهاتەکانیان دەگێڕێتەوە و، هەوێنی ژیانی چیرۆکەکانیان و بناغەی ئەو چیرۆکانەش بە دەستەوە دەگرێ و دەیکاتە پێشەکی بۆ دەعواکەی. بۆ ئەمەش لە هەر شوێنێکدا ئەو کتێبانە لەسەر "ڕاستی" یەکیان گرتبێت پشتیان دەگرێت و، ئەو شوێنانەش کە جیاوازییان لە نێواندایە هەڵەکانیان بۆ ڕاست دەکاتەوە. دەڵێی بە گیانی گەشتیار و ڕەهای خۆی، کە دەرخەری "وەحی"ی خوای گەورەیە، سنوورەکانی "کات" و "شوێن"ی بڕیوە و، ڕۆشتووەتە ناو قوڵایی "ڕابوردوو" ئنجا بە وێنەی بینەرێك ئەوانەی ڕوون کردووەتەوە!

ئەم حاڵەش دەیسەلمێنێت کە بەڵگەی پێغەمبەرێتیی ئەوە و، یەکێکە لە موعجیزەکانی.

کەواتە کۆی بەڵگەکانی پێغەمبەرێتیی سەرجەم پێغەمبەران - درووددیان لەسەر بێت - وەکو بەڵگەیەکی مەعنەوی وایە بۆ ئەم، هەروەك هەموو موعجیزاتیشیان موعجیزەیەکی مەعنەوین بۆی.

**مەسەلەی پێنجەم**

لە بارەی ڕوونکردنەوەی لاپەڕەی سەردەمی بەختەوەرییە، بە تایبەت مەسەلەی دوورگەی عەرەب.

لێرەشدا چوار سەرنج هەیە:

یەکەمیان: ئەگەر لە حاڵی جیهان ورد ببیتەوە، دەبینی کارێکی یەکجار قورس و دژوارە کە عادەتێك، با بێ نرخیش بێت، لابرێت لە ناو قەومێکدا، با کەمیش بن.. یان ڕەوشتێك هەڵبگیرێت، با لاوازیش بێت، لە ناو دەستەیەکدا با زەلیلیش بن، کە پادشایەك ئەنجامی بدات، کە مەزنیش بێت، بە هیممەتێك هەرچەندەش توندوتیژ بێت، لە ماوەیەکی درێژخایەندا و، بە زەحمەت و ڕەنجێکی زۆر..

إذا عرفتَ هذه النكتَ، فاعلمْ:

أنَّ محمّداً العربيَّ عليه السلامُ مع أميَّتِه قصَّ علينا بلسانِ القرآنِ قصَصَ الأولين والأنبياءِ قصَّةَ مَنْ حضَرَ وشاهَدَ، وبيَّنَ أحوالَهم وشرحَ أسرارَهم على رؤوسِ العالَمِ في دعوىً عظيمةٍ تجلِبُ إليها دِقَّةَ الأذكياءِ..

وقد قصَّ بلا مُبالاةٍ، وأخذَ العُقَدَ الحياتيةَ فيها وأساساتِها مُقَدِّمةً لمدَّعاهُ، مصدِّقاً فيما اتفقتْ عليه الكتبُ السالفةُ، ومصحِّحاً فيما اختلفتْ فيه. كأنَّه بالروح الجوَّالِ المنعكِسِ للوحيِ الإلهيِّ طيَّ الزمانَ والمكانَ، فتداخَلَ في أعماقِ الماضي فبيَّنَ كأنَّه مُشاهِدٌ.

فثبتَ أنَّ حالَه هذه دليلُ نبّوتِه وإحدى معجزاتِه.

فمجموعُ دلائلِ نُبوَّةِ الأنبياءِ في حُكمِ دليلٍ معنويٍّ له، وجميعُ معجزاتِ الأنبياءِ في حُكمِ معجزةٍ معنويةٍ له.

المسألةُ الخامسةُ

في بيانِ صحيفةِ عصرِ السعادةِ لا سيما مسألةِ جزيرةِ العربِ.

فها هنا أيضاً أربعُ نُكَتٍ:

إحداها: أنَّك إذا تأملتَ في العالَمِ ترى أنَّه قد يتعسَّرُ ويستشكِلُ رفعُ عادةٍ ولو حقيرةً في قوم ولو قليلين. أو خصلةٍ ولو ضعيفةً.. في طائفةٍ ولو ذليلين.. على مَلِك ولو عظيماً.. بهمَّةٍ ولو شديدةً.. في زمانٍ مديدٍ بزحمةٍ كثيرةٍ[1].

---

(١) في زمان ولو مديد بزحمة ولو كثيرة. (ش)

ئەی چی دەڵێیت سەبارەت بە کەسێك کە (پێشتر) کاربەدەست نەبووە و، لە ماوەیەکی کەمدا هیممەتێکی جوزئیی سەبارەت بە کارتێکراو خستووەتە کار و، چەندین داب و نەریتی ڕیشەکەن کردووە و، چەندەها ڕەوشتیشی لابردووە کە تەواو ڕیشەیان داکوتاوە، لەو شتانەی کە بە تەواوی پێیان ڕاهاتوون و تا بیشڵێی لە ناویاندا بەردەوام بووە. ئنجا کتوپڕ لە بریی هەموو ئەوانە، چەندین نەریت و ڕەوشتی تری بە خێرایی، لە دڵی قەومێکی تابڵێی زۆردا، دامەزراند کە بۆ شتانی خوو پێوەگرتوویان تابڵێی دەمارگیر بوون.

ئایا ئیتر بە کەسێکی دەراسای نابینی؟

سەرنجی دووهەم: ئەوەیە کە "دەوڵەت" کەسێتییەکی مەعنەوییە. پێکهاتنیشی - بە وێنەی گەشەکردنی منداڵ - پلە پلەیە و، زاڵبوونیشی بەسەر دەوڵەتە کۆنەکەدا - کە فەرمانەکانی وەك سروشتێکی جێگیریان لێ هاتووە بۆ میللەتەکەی - لەسەرخۆ و پلە پلەیە.

ئەی ئایا ئەو حکوومەتە مەزنەی حەزرەتی محەممەد ﷺ کارێکی بەدەر لە عادەتی پێکهێنانی دەوڵەتان نییە کە بە یەك جار و کتوپڕی پێکی هێنا و، ئامادەی ئەوپەڕی پێشکەوتنە و، بناغە بڵندە هەمیشەییەکانی لەخۆ گرتووە، هاوکات لەگەڵ زاڵ بوونی بەسەر دەوڵەتە مەزنەکاندا بە یەکجاری، لەگەڵ هێشتنەوەی فەرمانڕەوایەتیی خۆی نەك تەنها بە ڕواڵەت، بەڵکو لە ڕووی ڕواڵەت و پەنهان و ماددی و مەعنەوییەوە؟!

سەرنجی سێهەم: بە زەبر و زۆر دەتوانرێ خۆسەپاندنی ڕواڵەتی و ڕووکەش ئەنجام بدرێت.. بەڵام زاڵبوون(ی کەسێك) بەسەر بیر و هزرەکاندا و کاریگەری تیایاندا لە ڕێی بەخشینی تامی شیرینی بە گیانەکان.. هەروەها زاڵبوونی بەسەر سروشتەکاندا، هاودەم لەگەڵ پارێزگاریی دەسەڵاتی بە هەمیشە و بەردەوامی لەسەر ویژدانەکان..

ئەمە، جگە لە کاری دەراسا هیچی تر نییە و، تەنیا و تەنیا تایبەتمەندییەکی نایابی پێغەمبەرێتییە.

سەرنجی چوارەم: هەڵسووڕاندنی بیر و هزرەکانی گشتینەی خەڵك و ڕێنماییان بە ڕێگاکانی "تەرهیب" و "تەرغیب" و ترساندن و ئەرك پێ سپاردن، کاریگەرییان جوزئی و ڕووکەش و کاتی دەبێت و، ماوەیەکیش ڕێی "داوەریی ژیری" دەگرێت..

فكيفَ أنت بمَن لم يكنْ حاكماً، تشبَّثَ في زمانٍ قليلٍ بهمّةٍ جزئيةٍ - بالنسبة إلى المفعولِ - وَقَلَعَ عاداتٍ وَرَفَعَ أخلاقاً قد استقرتْ بتمامِ الرسوخِ واستُؤنِسَ بها نهايةَ استيناسٍ واستمرتْ غايةَ استمرارٍ، فغَرَسَ فُجاةً بَدَلَها عاداتٍ وأخلاقاً تكمّلتْ دفعةً عن قلوبِ قومٍ في غاية الكثرةِ ولمألوفاتهم في نهاية التعصُّبِ.

أفلا تراه خارقاً للعاداتِ؟

**النكتةُ الثانيةُ:** هي أنَّ الدولةَ شخصٌ معنويٌّ. تشكُّلُها تدريجيٌّ كنموِّ الطفلِ، وغلَبَتُها للدولة العتيقةِ - التي صارتْ أحكامُها كالطبيعة الثانيةِ لملّتها - متمهِّلَةٌ.

أفلا يكونُ حينئذٍ مِن الخارقِ لعادةِ تشكُّلِ الدُّوَلِ تشكيلُ محمّدٍ عليه السلامُ لحكومةٍ عظيمةٍ دفعةً، مُهيّأةٍ لنهايةِ الترقي، مُتضمِّنَةٍ للأساساتِ العاليةِ الأبديةِ مع غلبتِها للدُّوَلِ العظيمةِ دفعةً مع إبقاءِ حاكميتِه لا علَى الظاهرِ فقط، بل ظاهراً وباطناً ومادةً ومعنىً.

**النكتةُ الثالثةُ:** هي أنّه يمكنُ بالقهر والجبر تحكُّمٌ ظاهريٌّ، وتسلُّطٌ سطحيٌّ. لكنْ الغلبةَ على الأفكارِ، والتأثيرَ بإلقاءِ حلاوتِه في الأرواحِ، والتسلُّطَ على الطبائعِ مع محافظةِ حاكميتِه على الوجدانِ دائماً لا يكونُ إلّا مِن خوارقِ العاداتِ.. وليس إلّا الخاصةُ الممتازةُ للنبوّةِ.

**النكتةُ الرابعةُ:** هي أنَّ تدويرَ أفكارِ العمومِ وإرشادَها بحِيَلِ الترهيبِ والترغيبِ والخوفِ والتكليفِ إنما يكونُ تأثيرُها جزئياً سطحياً موقتاً يسدُّ طريقَ المحاكمة العقليةِ في زمانٍ..

بەڵام کەسێك بە ڕێنماییەکانی خۆی ڕۆشتبێتە ناو قووڵایی دڵەکان و، وردترینی هەست و نەستەکانی وروژاندبێت و، خونچەی توانا و لێهاتنەکانی ئەوانی واڵا کردبێت و، ڕەوشتەکانی ناخی مرۆڤی بێدار کردبێتەوە و، پەنهانەکانیشیانی خستبێتە ڕوو، هەروەها گەوهەری مرۆڤایەتیی ئەوانی بە وروژم هەڵقووڵاندبێت و، نرخ و بەهای هۆشمەندی و مرۆڤایەتیی ئەوانی دەرخستبێت..

ئەو کەسە، لە تیشکی حەقیقەت بەهرەمەندە و، کارەکانی دەراسان..

لەو کاتەدا دەبینی کەسێك لە دڵڕەقیی خۆیدا، بێ هیچ سۆز و بەزەییەك، کچەکەی خۆی زیندە بەچاڵ بکات، کەچی دوای ڕۆژێك لە موسڵمان بوونی بەزەیی بە هاوشێوەی مێروولەدا بێتەوە و، بە ئازاری زیندەوەرێك ئەویش ئازار بچێژێت، تو خوا پێم بڵێ ئایا ئەم ئاڵوگۆڕە هەست پێ کراوە، بەسەر هیچ یاسایەکدا جێبەجێ دەبێت؟!

جا ئەگەر ئەم سەرنجانەت زانی، ئەوا سەرنج لە خاڵێکی تر بدە، کە بریتییە لەوەی:

مێژووی جیهان شایەتە کە "بلیمەتی هەڵکەوتوو" ئەو کەسەیە تواناى بووژاندنەوەی توانا و لێهاتنێکی گشتی و بێدارکردنەوەی ڕەوشتێکی هەمەکیی هەبێت و، ببێتە هۆی دەرکەوتنی هەست و نەستێکی گشتی. چونکە کەسێك گەر هەستێکی نوستووی وەك ئەمە بێدار نەکاتەوە، ئەوا هەوڵ و کۆششی کاتی دەبێت و بە فیڕۆ دەڕوات، هەرچەندەش لە خۆیدا کەسێکی مەزن بێت.

هەر بەم جۆرە، مێژوو پیشانمان دەدات کە گەورەترین کەس ئەوەیە توانیبێتی یەك دانە، یاخود دووان، یان سێ دانە لەم هەستە گشتییانە بێدار بکاتەوە، وەك:

هەستی پەرۆشیی نەتەوایەتی و، هەستی برایەتی و، هەستی خۆشەویستی و، هەستی سەربەستی و.. هتد.

جا ئایا بێدارکردنەوەی هەزاران هەستی بەرزی پەنهان و نوستوو کە بە یەك جار و بە وێنەی ئاوی بەوروژمی هەڵقوڵاو دەربخرێن، لە نێوان قەومێکی دەشت نشینی پەرش و بڵاو لە دوورگەی عەرەبدا و، لەو بیابانە فراوانەدا، بە کارێکی نائاسایی دانانرێت؟

بەڵێ، ئەوە ڕووناکییەکی خۆری حەقیقەتە.

جا کاکە! ئەگەر کەسێك ئەم خاڵە نەخاتە ناو ژیریی خۆی، ئێمە "دوورگەی عەرەب" دەخەینە چاوی!

أمّا مَن نفذَ في أعماق القلوبِ بإرشادِه، وهيَّجَ دقائقَ الحسياتِ، وكشَفَ أكمامَ الاستعداداتِ، وأيقظَ الأخلاقَ، وأظهَرَ الخصائلَ المستورةَ، وجعلَ جوهرَ إنسانيتِهم فوّاراً، وأبرزَ قيمةَ ناطقيتِهم؛ فإنما هو مقتبِسٌ من شعاعِ الحقيقةِ ومِن الخوارقِ للعادةِ.

بينما ترى شخصاً في قساوة قلبِه يقبُرُ بنتَه حيّةً ولا يتألمُ ولا يتأثّرُ إذ تراه بعد يومٍ - وقد أسلمَ - يترحَّمُ على نحو النملِ، ويتألَّمُ بألَمِ حيوانٍ. فباللهِ عليك أينطبقُ هذا الانقلابُ الحسيُّ على قانونٍ؟

فإذا عرفتَ هذه النكتَ، تأمَّلْ في نقطةٍ أخرى وهي:

أنَّ تاريخَ العالَمِ يشهدُ: أنَّ الداهيَ الفريدَ إنما هو الذي اقتدرَ على إنعاشِ استعدادٍ عموميٍّ، وإيقاظِ خَصلةٍ عموميةٍ، والتسببِ لانكشافِ حسٍّ عموميّ؛ إذ مَن لم يوقِظْ هكذا حسّاً نائماً يكونُ سعيُه هباءً موقتاً ولو كان جليلاً في نفسه..

وأيضاً إنَّ التاريخَ يُرينا أنَّ أعظمَ الناسِ هو الموفَّقُ لإيقاظِ واحدٍ أو اثنين أو ثلاثٍ من هذه الحسّياتِ العموميةِ: كحِسّ الحَميّةِ الملّيةِ، وحسِّ الأخوّةِ، وحسِّ المحبةِ، وحسِّ الحريةِ... الخ.

أفلا يكونُ إذَن إيقاظُ ألوفٍ من الحسّياتِ المستورةِ العاليةِ، وجعلُها فوّارةً منكشِفةً في قومٍ بَدَويّين متشرين في جزيرةِ العربِ تلك الصحراءِ الوسيعةِ، من الخوارق؟.. نعم[1]! هو مِن ضياءِ شمسِ الحقيقةِ.

فيا هذا! مَن لم يُدخِلْ في عقله هذه النقطةَ نُدْخِلْ جزيرةَ العرب في عينِه!

---

(١) لعله بلى. (ش)

وا ئەمە "دوورگەی عەرەب"ە پاش سیازدە چەرخ و دوای بەرزبوونـەوەی مرۆڤ بـە پلەکانی پێشکەوتندا.

دەسا ئەی کەسی نکوولی کاری سەرسەخت!

سەد کەس لە کاملترینی فەیلەسـووفەکان هـەڵبژێرە و، ئنجا بـا ئـەوانیش سـەد سـاڵی ڕەبەق هەوڵ و تەقالا بدەن، جا ئەگەر توانییان بە هەموویان لـە سـەدا یـەکی ئـەو کارانـە ئەنجام بدەن کە محەممەدی عەرەبی ﷺ سەبارەت بە زەمان و ڕۆژگاری خۆی ئـەنجامی دا، (ئەوا چی دەڵێیت بڵێ)..

خۆ ئەگەر ئەمەت ئەنجام نەدا، کە ئەنجامیشی نادەیت، ئەوا خۆت لە ئاکامی نکوولی بەدوور بگرە!

بـەڵێ، ئـەم حاڵەتـە حاڵـەتێکی دەراسـایە و، جگـە لـە موعجیزەیـەکی نێـوان موعجیزەکانی ئەو نەبێت، شتێکی تر نییە.

ئەوەش بزانە کە هەرکەسێك دەیـەوێت لـە کارەکـانیدا سـەرکەوتوو بێـت، پێویستە لەگەڵ "یاسـای" عـادەتەکانی خـوای گـەورەدا پـەیوەندیی خۆش بێـت و، ئاشـنایەتیی لەگەڵ یاساکانی سروشـتدا هـەبێت و، پەیوەستی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بێت.

دەنا "فیترەت" بە پشت نەگرتنی و سەرنەخستنی، وەڵامی بێدەنگکەری دەداتەوە!

هـەروەها هەرکەسێك لـە ڕێبـازێکی ژیـانی کۆمەڵایـەتیدا بجووڵێـت، دەبـێ کـاری پێچەوانەی ڕەوتی گشتی نەکات، دەنا ئەو چەرخەی ژیـانی کۆمەڵایـەتی، لەسـەر پشـتی خۆی فڕێی دەدات و، ئەویش دووچاری سەرسامی دەبێ.

کەواتـە کەسێکی وەکـو محەممـەد ﷺ کـە لـەو جموجووڵـەیدا سـەرکەوتوو بوویێـت، دەیسەلمێنێت کە دەستی بە "حەق"ەوە گرتووە.

ئەگەر لەمە تێگەیشتی، ئەوا فەرموو سەرنج لـە ڕاستییەکانی "شـەریعەت" بـدە، کـە هـاودەم لەگـەڵ لـەو گرفتـە مەزنانـەی ڕووبـەڕوویان بووەتـەوە و، لـەو ئـاڵوگۆڕە سەرسووڕهێنانە و، لەم ماوە درێژخایەنەدا، کەچی پارێزگاریی هاوسـەنگیی یاسـاکانی فیترەت و پەیوەستە کۆمەڵایەتییەکانیان کردووە کە لەبەر وردییان پێـش چـاوی ژیـری ناکـەوێت، لەگـەڵ کـەماڵی پـەیوەندی و میانەباشـیی لەگـەڵ ئـەو یاسـایانەدا! هـەتا ڕۆژگاریش بێت و بڕوات ئەو پەیوەندییە زیاتر خۆی پێش چاو دەخات.

فهذه "جزيرةُ.." بعدَ ثلاثةَ عشرَ عصراً وبعدَ ترقِّي البشرِ في مدارجِ التمدُّنِ!

فانتخِبْ أيها المعانِدُ مِن أكملِ الفلاسفةِ مائةً، فليسعَوْا مائةَ سنةٍ فإنْ فعلوا جزءاً مِن مائةِ جُزءٍ مما فعلَه محمّدٌ العربيُّ عليه الصلاةُ والسلامُ بالنسبةِ إلى زمانِه[1]... فإنْ لم تفعلْ - ولن تفعلَ - فاتّقِ عاقبةَ العنادِ!

نعَم، هذه الحالةُ خارقةٌ للعادة، وإنْ هي إلّا مُعجِزةٌ مِن معجزاتِه عليه الصلاةُ والسلامُ.

واعلمْ أيضاً أنَّ مَن أرادَ التوفيقَ يلزمُ عليه أنْ يكونَ له مصافاةٌ مع عاداتِ الله، ومُعارَفَةٌ مع قوانين الفطرةِ، ومناسَبةٌ مع روابطِ الهيئةِ الاجتماعيةِ. وإلّا أجابتْهُ الفطرةُ بعدَمِ الموفَّقيةِ جوابَ إسكاتٍ..

وأيضاً مَن تحرَّكَ بمسلَكٍ في الهيئةِ الاجتماعيةِ يلزمُه أن لا يخالِفَ حركةَ الجَرَيانِ العموميِّ. وإلّا طيَّرَه ذلك الدولابُ عن ظهرِه فيسقطُ في يدِه.

فإذنْ مَن ساعدَه التوفيقُ في ذلك الجَرَيانِ كمحمّدٍ عليه السلامُ يُثبِتُ أنّه متمسِّكٌ بالحقِ.

فإذا تفهّمتَ هذا، تأمَّلْ في حقائقِ الشريعةِ مع تلك المصادماتِ العظيمةِ والانقلاباتِ العجيبةِ، وفي هذه الأعصارِ المديدةِ تَرَها قد حافظتْ على موازنةِ قوانينِ الفطرةِ وروابطِ الاجتماعياتِ اللاتي بدقّتِها لا تتراءى للعقولِ مع كمالِ المناسبةِ والمصافاةِ معها. فكلّما امتدَّ الزمانُ تظاهرَ الاتصالُ بينها.

---

(١) وجواب إن محذوف، أي فاطلب ما تشاء (ش)

لەم حاڵەتەوە دەردەکەوێ کە "ئیسلام" ئایینی فیترِیی جۆر و ڕەگەزی مرۆڤە و، ئایینی حەق و ڕەوایە. هەر لەبەر ئەوەیە کە چەندەش تەنگ بێتەوە هەر ناپچڕێت.

ئایا نابینی دەرمانی شیفا بەخشی ژیانی کۆمەڵایەتی، هاوچەشنەکانی "حەرامکردنی ڕیبا و واجبکردنی زەکات"ە، کە تەنها دوو دانەن لە نێوان هەزاران مەسەلەی ئەو شەریعەتەدا؟

جا ئەگەر لەم چوار سەرنجە، لەگەڵ ئەم سێ حاڵەدا تێگەیشتی، ئەوا بزانە کە:

محەممەدی هاشمی ﷺ هەرچەند نەخوێندەوارێکە؛ نەیخوێندووە و نەینووسیوە و، لەگەڵ نەبوونی هێزی ڕواڵەتی و دەسەڵات بۆ خۆی و پێش خۆی و، نەبوونی حەز و مەیلی خۆسەپاندن و دەسەڵاتداری، کەچی بەوپەڕی باوەڕ و متمانە و لە شوێنێکی پڕ مەترسی و مەقامێکی گرنگدا، لە دڵەوە دەستی بە شتێکی مەزنەوە گرت و، لەو ڕێیەوە بەسەر هزرەکاندا سەرکەوت و، خۆی لای گیانەکان خۆشەویست کرد و، بەسەر سروشتەکاندا زاڵ بووە و، نەریت و ڕەوشتە وەحشیگەریەیە خوو پێوەگیراوە دامەزراوە بەردەوام و زۆرەکانی ناخی دڵی ئەوانی لە ڕیشەوە دەرهێناوە.. پاشان بەوپەڕی هێز و توندوتۆڵی، کە دەڵێی تێکەڵ بە گۆشت و خوێنیان بووە، لە جێی هەموو ئەوانەدا چەندین ڕەوشتی بەرز و داب و نەریتی جوانی ڕواندووە..

هەروەك دڵڕەقیی خەڵکانێکی کش و ماتی ناو گۆشەکانی وەحشەتی گۆڕی بە چەند هەست و نەستێکی نەرم و نیان و، گەوهەری مرۆڤێتیی ئەوانی دەرخست.. پاشان لە گۆشەکانی لەبیرچوونەوەدا ئەوانی هێنایەدەر و، بە پلەکانی پێشکەوتندا هەتا لوتکەی شارستانێتی سەری خستن و، کردنی بە مامۆستای جیهانی خۆیان و، دەوڵەتێکی هێندە گەورەی بۆ دامەزراندن کە بە وێنەی عەسای مووسا - دروودی لەسەر بێت - دەوڵەتەکانی تری قووت دا. کاتێکیش کە سەرکەوت وەکو ڕۆشنایی بزۆك و نووری ڕووناکی بەخشی لێ هات، ئاگری لە هەموو پەیوەندیەکانی ستەم و خراپەکاریی بەردا و، لە ماوەیەکی کەمدا خۆرهەڵات و خۆرئاوای کردە تەختی ئەو دەوڵەتە لەپڕ دروست بووە.

ئایا ئەم حاڵەتە نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ڕێبازەکەی حەقیقەتە و، لە بانگەوازەکەشیدا ڕاستگۆیە؟

ويتظاهرُ مِن هذه الحالةِ؛ أنَّ الإسلاميةَ هي الدِّينُ الفطريُّ لنوعِ البشرِ وأنّها حقٌّ، لهذا لا ينقطعُ وإنْ رَقَّ.

ألا ترى أنَّ التِرياقَ الشافيَ للسمومِ القاتلةِ في الهيئةِ الاجتماعيةِ إنما هو أمثالُ: "حُرمةِ الربا ووجوبِ الزكاةِ" اللتين هما مسألتان في أُلوفِ مسائلِ تلك الشريعةِ.

فإذا عرفتَ هذه النُكَتَ الأربعَ مع هذه النُّقَطِ الثلاثِ، اعلمْ أنَّ محمداً الهاشميَّ عليه الصلاةُ والسلامُ مع أنّه أمّيٌّ لم يقرأْ ولم يكتُبْ، ومع عدَمِ قوّتِه الظاهريةِ وعدم حاكميةٍ له أو لسَلفِه، وعدمِ مَيلِ تحكُّم وسلطنةٍ، قد تشبثَ بقلبه بوثوقٍ واطمئنانٍ في موقعٍ في غايةِ الخطَرِ وفي مقامٍ مُهمٍّ، بأمرٍ[1] عظيمٍ، فغلَب على الأفكارِ، وتحبّبَ إلى الأرواحِ، وتسلَّطَ على الطبائعِ، وقلعَ من أعماقِ قلوبِهم العاداتِ والأخلاقَ الوحشيةَ المألـوفةَ الراسـخةَ المسـتمرةَ الكثيرةَ. ثم غرسَ في موضعِهـا في غايةِ الإحـكامِ والقُوَّةِ – كأنّها اختلطتْ بلَحمِهم ودمِهم – أخلاقاً عاليةً وعاداتٍ حسنةً..

وقد بدَّلَ قساوةَ قلوبِ قومٍ خامدين في زوايا الوحشةِ بحسياتٍ رقيقةٍ وأظهرَ جوهرَ إنسانيتِهم. ثم أخرجَهم مِن زاويةِ الوحشةِ وَرقّى بهم إلى أوْجِ المَدَنيةِ وصيَّرَهم معلّمي عالَمِهم، وأسَّسَ لهم دولةً ابتلعت الدُّولَ كـ"عصا موسى"، فلما ظهرتْ صارتْ كالشعلة الجوّالةِ والنورِ النوّارِ، فأحرقتْ روابطَ الظلمِ والفسادِ، وجعلَ سريرَ تلك الدولةِ الدفعيةِ في زمانٍ قليلٍ الشرقَ والغربَ.

أفلا تدلُّ هذه الحالةُ على أنَّ مسلكَه حقيقةٌ وأنّه صادقٌ في دعواه؟

---

(١) بأمر: متعلق بـ"تشبث".

**مەسەلەی شەشەم**

لە بارەی لاپەڕەی "داهاتوو"، بە تایبەت "مەسەلەی شەریعەت"ەوە.

دەبێ لەم مەسەلەیەدا تێبینیی چوار سەرنج بکرێت:

یەکەمیان: کەسێك، با مرۆڤێکی نائاساییش بێت، تەنها لە چوار پێنج زانستدا دەبێتە پسپۆڕ و خاوەن مەلەکە[1].

سەرنجی دووهەم: تەنیا قسەیەك هەندێ جار جیاواز دەبێت گەر لە چەند قسەبێژێکی جیاجیاوە دەربچێت.. چونکە هەروەك بەڵگە دەبێت لەسەر سادەیی و نەزانیی یەکێکیان، دەشبێتە بەڵگە لەسەر کارامەیی و لێهاتوویی ئەوی تریان، لە کاتێکدا قسەکە هەر هەمان قسەیە. چونکە یەکێکیان بۆ سەرەتا و کۆتایی ئەو مەسەلەیەی ڕوانی و، تێبینیی ئەوەی کرد کە لەگەڵ ڕەوت و سیباقی[2] ڕستەکەدا دەگونجێ و، ئەوەشی لەیاد بوو کە لەگەڵ دەستە خوشکەکانیدا تەبایە و، شوێنێکی شیاوی دۆزییەوە بە باشی بەکاری هێنا تیایدا و، بە دوای زەوییەکی بەپیتدا گەڕا، کە دۆزییەوە تیایدا ڕواند..

ئەم گوفتارەشی دەبێتە بەڵگە لەسەر لێهاتوویی و کارامەییەکەی و لەسەر ئەوەش کە لەو شتەدا خاوەن مەلەکەیە کە قسەکەی تێدا کراوە.

هەموو دەستەواژە پوختەکانی قورئان، لە زانستەکان و لەوانەش کە زانستەکان هەڵیانگرتوونەتەوە، لەم جۆرەن.

سەرنجی سێهەم: زۆرێك لەو تازە دۆزراوانەی کە بوونەتە ئاسایی و، بەهۆی کامڵبوون و پێگەیشتنی بنەما و هۆکارەکانەوە تەنانەت وایان لێ هاتووە کە منداڵان یارییان پێدەکەن، ئەگەر لە دوو چەرخی پێش ئێستادا بوونایە، بە کاری دەراسا دادەنران.

---

(١) "مەلەکە": سیفەتێکی جێگیرە لە دەروونی مرۆڤدا. واتە: بەهۆی یەکێك لە کردارەکانەوە شتێك لە ناخی مرۆڤدا دروست دەبێت پێی دەڵێن: "چۆنێتیی دەروونی". جا ئەگەر ئەو چۆنێتییە بە خێرایی نەما پێی دەوترێ: "حالەت". بەڵام ئەگەر چەند جارێك دووپات بووەوە و جێی خۆی گرت و بوو بە چۆنێتییەکی بەردەوام کە لابردنی ئەستەم بێت، پێی دەوترێ: "مەلەکە". خۆ ئەگەر بە کرداریش بەرجەستە بوو، پێی دەڵێن: ڕەوشت و خوو. بڕوانە: (التعريفات) للسيد الشريف الجرجاني. ص: ١٢٦، هەروەها: (كشاف اصطلاحات الفنون) للتهانوي. ٢/١٦٤٢. (وەرگێڕ)

(٢) واتە لەگەڵ داڕشتن و هێنانی دەستەواژەکان و، پێشخستن و دواخستنی وشەکانیدا. (وەرگێڕ)

المسألةُ السادسةُ

في صحيفة المستقبلِ لاسيما "مسألةِ الشريعةِ".

ولابدَّ مِن ملاحظةِ أربعِ نُكَتٍ في هذه المسألةِ:

إحداها: أنَّ شخصاً ولو خارقاً إنما يتخصَّصُ ويصيرُ صاحبَ ملَكةٍ في أربعةِ فنونٍ أو خمسةٍ فقط.

النكتةُ الثانيةُ: إنَّ كلاماً واحداً قد يتفاوتُ بصدوره عن متكلِّمينَ، فكما يدلُّ على سطحيةِ أحدٍ وجهلِه.. كذلك يدلُّ على ماهريةِ الآخَرِ وحَذاقَتِه، مع أنَّ الكلامَ هو الكلامُ؛ إذ أحدُهما لمّا نظرَ إلى المبدأ والمنتهى، ولاحظَ السياقَ والسباقَ، واستحضرَ مناسبتَه مع أخواتِه، ورأى موضعاً مناسِباً فأحسنَ الاستعمالَ فيه، وتحرَّى أرضاً مُنْبِتَةً فزرعَه فيها، ظهرَ منه أنّه خارقٌ وصاحبُ مَلَكةٍ فيما هذا الكلامُ منه.

وكلُّ فذلكاتِ القرآنِ مِن الفنونِ وملتقَطاتِه إنما هي مِن هذا القبيلِ.

النكتةُ الثالثةُ: هي أنَّ كثيراً من الأمور العاديةِ الآنَ - بسببِ تكمُّلِ المبادِئِ والوسائطِ حتى يلعبُ بها الصبيانُ - لو كانتْ قبلَ هذا بعصرين لعُدَّتْ مِن الخوارقِ.

جا ئەو شتەی کە بە درێژایی ئەم هەموو چەرخە دووورودرێژانە پارێزگاریی لاوی و تەڕوپاراوی و نــاوازەیی خۆی کردبێت، بێ گومــان ئەو کــارە نەریتێکی لــە ئاســایی بەدەرە و یەکێکە لە عادەتە دەراساکان.

سەرنجی چوارەم: "ڕێنمایی" کاتێ سوودی دەبێـت کـە بـە پێی پلـەی ئامادەیی بیر و تێگەیشتنی زۆرینـەی جـەماوەر بێـت. خۆ جـەماوەریش لـە ڕووی زۆرینـەوە "عـەوام"ن. عەوامیش توانای بینینی "حەقیقەت"یان بە شێوە پەتی‌یەکەی نی‌یـە و لـەگـەڵیدا ڕانایـەن، مەگەر ئەندێشەی پێوە ڕاهاتووی خۆیانی بەبەر پۆشرابێت..

لەبەر ئـەم سـەرنجەیە کـە قورئـان ئـەو حەقیقەتانـەی بـە چـەند موتەشابیهـ و تەشبیهـ و ئیسـتیعارەیەك پیشـان داوە و، ئـەو جـەماوەرەی کـە تـەواوی و کامڵی‌یـان بەدەسـت نەهێناوە، لەوە پاراستووە کە بە هەڵەوە بیانگلێنێت. دەبینی لەو بابەتانەدا کە جەماوەر بە گوێرەی هەستی ڕواڵـەتی و بـەپێی بـاوەڕی خۆیـان پێچەوانـەی واقیعی ڕاستەقینەیان بـە پێویست زانیوە، مەسـەلەکانی پشتگوێ خستووە، یـاخود بـە تـەماوی و نادیـاری لێیـان دواوە. لەگەڵ ئەوەشدا، بە دانانی چەند نیشـانەیەك، ئامـاژەی بـۆ حەقیقـەتی ئـەو بابەتانـە کردووە.

جا ئەگەر لەم سەرنجانە تێگەیشتیت، ئەوا بزانە کە:

ئـایین و شـەریعەتی ئیسـلام - کـە لەسـەر "بەڵگـە"ی ژیـری دامـەزراوە - پوختـەی چەندین هونەر و زانستە و، هەوێنی ژیانی سەرجەم زانستە بناغەییـەکانی لـەخۆ گرتـووە، وەك: هونەری پاکژکردنی "گیان" و، زانستی وەرزشی دڵ و، زانسـتی پـەروەردەکردنی ویژدان و، هونەری کارسازیی جەستە و، زانستی ماڵ بەڕێوەبردن و، هونـەری سیاسـەتی شـارسـتانی و، زانســتی ڕژێمـەکانی جیهــان و، هونــەری مافــەکان و، زانســتی مامەڵــەکان و، هونــەری داب و نەریتــە کۆمەڵایەتی‌یــەکان، هــەروەها و هــەروەها و هەروەها.. هتد.

لەگەڵ ئەوەشدا "شەریعەت" ڕوونکردنـەوە و ڕاڤـەی لـە شـوێنی پێویستدا پێشـکەش کردووە و.. لەو شوێنانەشدا کـە پێویسـت نـین، یـان هێشتا زەمینـەکان بـۆی ئامـادە نـین، یـاخود ڕۆژگـار یارمـەتیی نـەداوە، مەبەستەکەی بـە پوختەیـەك کـورت کردووەتـەوە و بنـاغـەیەکی بۆ داناوە، ئیتر لــێ هـەڵێنجان و لـێ لێکـردنەوە و نەشـونمای ئـەو شـتەی بـە ڕاوێژ و پرس و ڕای "ژیری"یەکان سپاردووە.

فما يحافظُ شبابيتَه وطراوتَه وغرابتَه على هذه الأعصارِ المديدةِ يكونُ البتةَ من خوارقِ العاداتِ والعاداتِ الخارقةِ.

**النكتةُ الرابعةُ:** هي أنَّ الإرشادَ إنما يكونُ نافعاً إذا كان على درجةِ استعدادِ أفكارِ الجمهورِ الأكثرِ. والجمهورُ - باعتبارِ المـُعْظَم- عوامٌّ، والعوامُّ لا يقتدرون على رؤيةِ الحقيقةِ عُريانةً ولا يستأنسون بها إلّا بلباسِ خيالِهم المألوفِ.

فلهذه النكتةِ صوّرَ القرآنُ تلك الحقائقَ بمتشابهاتٍ وتشبيهاتٍ واستعاراتٍ، وحافظَ الجمهورَ - الذين لم يتكمَّلوا - عن الوقوعِ في وَرْطَةِ المغلَطَةِ، فأبْهَمَ وأهمَلَ في المسائلِ التي يعتقدُ الجمهورُ - بالحِسِّ الظاهريِّ- خلافَ الواقعِ ضرورياً، لكنْ مع ذلك أومَأَ إلى الحقيقةِ بنَصْبِ أماراتٍ.

فإذا تفطنتَ لهذه النُكَتِ، اعلمْ أنَّ الديانةَ والشريعةَ الإسلاميةَ المؤسّسةَ على البرهانِ العقليِّ مُلخَّصَةٌ من علومٍ وفنونٍ تضمنتْ العُقَدَ الحياتيةَ في جميعِ العلومِ الأساسيةِ: من فنِّ تهذيبِ الرُّوحِ، وعلمِ رياضةِ القلبِ، وعلمِ تربيةِ الوجدانِ، وفنِّ تدبيرِ الجسَدِ، وعلمِ تدويرِ المنْزِلِ، وفنِّ سياسةِ المدنيةِ، وعلمِ نظاماتِ العالَمِ، وفنِّ الحقوقِ، وعلمِ المعاملاتِ، وفنِّ الآدابِ الاجتماعيةِ، وكذا وكذا وكذا... الخ..

مع أنَّ الشريعةَ فسَّرَتْ وأوضحتْ في مواقعِ اللزومِ ومظانِّ الاحتياجِ، وفيما لم يلزمْ أو لم يستعدَّ له الأذهانُ أو لم يساعِدْ له الزمانُ أجملتْ بفذلكةٍ ووضعتْ أساساً أحالَت الاستنباطَ منه وتفريعَه ونُشُوءَ نَمائِه على مَشْورةِ العقولِ..

لە کاتێکدا کە نە هەموو ئەم زانستانە و، نە سێیەکیشیان، دوای سیازدە چەرخ و، هاوکات لەگەڵ بەدوای یەکدا هاتنی هزرەکان و فراوانبوونی دەرەنجامەکانیان و، لە شوێنە شارستانی‌یەکاندا و، لەناو زیرەکەکانیشدا، لە یەك کەسدا "بوون"ی نی‌یە!

جا کەسێك ناخی خۆی بە "ویژدان" ڕازاندبێتەوە، دەیسەلمێنێت کە ڕاستیی ئەم شەریعەتە هەمیشە بەدەر لە وزەی مرۆڤە، نەخوازەلا لەو زەمانەدا. ئیتر تەسدیقی واتای ئەم فەرمایشتەی قورئان دەکات: ﴿لَمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ﴾.

"چاکە ئەوەیە کە دوژمنان شایەت بن لەسەری"[1]..

ئەوەتا "کارلایل"ی فەیلەسووفی ئەمریکا[2]، لە "گۆتە"[3]ی ئەدیبی ناوداری ئەڵمانی‌یەوە دەگێڕێتەوە کە دوای وردبوونەوەی لە ڕاستی‌یەکانی قورئان، وتوویەتی:

"جێی سەرسووڕمانە! ئایا جیهانی شارستانێتیی ئێستا دەکرێ لە چوارچێوەی ئیسلامدا بژی"؟

هەر خۆی وەڵامی داوەتەوە کە: "بەڵێ، تەنانەت ئەوانەی کە لە ڕاستی دەکۆڵنەوە ئێستا - لە ڕوویەکەوە - لەو بازنەیە سوودمەندن"!

پاشان خودی کارلایل دەڵێ:

"کاتێ ڕاستی‌یەکانی قورئان وەك خۆر هەڵهات، بە وێنەی ئاگرێکی گەڕۆکی لێ هات و، هەموو ئایینەکانی تری هەڵلووشی، حەقی خۆیشی بوو ئەو کارە بکات، چونکە شتێکی لە سەفسەتەی فەلە و خورافاتی جوولەکەی تێدا ڕوونادات"[4].

---

(١) واتای نیوە بەیتێکی شاعیری سەدەی چوارەم "سەریی ڕەفاء"ە. (سالی وەفاتی: ٣٦٦ك).

(٢) تۆماس کارلایل (١٧٩٥-١٨٨١ز/١٢١٠-١٢٩٨ك) کەسێکی نووسەر و مێژووزان و فەیلەسووفە. باوکی ئاواتەخواز بووە کوڕەکەی ببێت بە قەشە، بەڵام گومان و دوودڵییە زۆرەکانی لە بارەی ئایینەوە ڕێی لە هێنانەدیی ئاواتەکەی باوکی گرت. زنجیرە بارێکی لەمەڕ پەرێشانیی دەروونی بە خۆوە بینی کە نزیکی حەوت سالی خایاند، لە ئاکامدا لەسەر بابەتەکانی ئیمان دامەزرا. گەلێ موحازەرەی گرنگی پێشکەش کردووە، کە لە یەکێکیاندا سەبارەت بە مەزنیی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دواوە و بە ڕێزەوە ستایشی کردووە و، دەری خستووە کە پێغەمبەری ڕاست و ڕەوایە. هەروەك چەندین بوختانیشی لەم ڕووەوە پووچەڵ کردووەتەوە. بابەتەکانی ئەو وتار و موحازەرانەش لە کتێبێکدا بە ناونیشانی (قارەمانەکان) کۆکراوەتەوە و بە چەند زمانێکی جیاجیا چاپ کراوە. بە پوختی لە فەرهەنگی تورکیی (Yeni Lugat)ەوە. (وەرگێڕ)

(٣) گۆتە: (١٧٤٩-١٨٣٢ز) شاعیر و نووسەر و ڕەخنەکارێکی ناوداری ئەڵمانی‌یە. زمانەکانی: "لاتینی؛ یۆنانی؛ ئیتالی؛ ئینگلیزی؛ عیبری؛ فەرەنسی"ی زانیوە و، گەلێ شانۆگەری و کتێبیشی داناوە.

(٤) کتێبی (الأبطال)ی تۆماس کارلایل، وەرگێڕانی "محمد السباعي" لاپەڕە: ٧٣-٧٤. (وەرگێڕ)

والحالُ أنَّ كلَّ هذه الفنونِ بل ثلثَه بعدَ ثلاثةَ عشرَ عصراً - مع انبساطِ تلاحُقِ الأفكارِ وتَوَسُّعِ نتائجِها، وكذا في المواقعِ المتمدنةِ، وكذا في الأذكياءِ - لا يوجَدُ في شخصٍ.

فمَن زيَّنَ وجدانَه بالإنصافِ يُصدِّقُ بأنَّ حقيقةَ هذه الشريعةِ خارجةٌ عن طاقةِ البشرِ دائماً لاسيما في ذلك الزمانِ، ويصدِّقُ بمآلِ:

﴿لَمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ﴾.

"والفضلُ ما شَهِدَتْ به الأعداءُ"[1]:

فهذا "قارلائيلُ" فيلسوفُ أمريكا نَقَلَ عن الأديبِ الشهيرِ الألمانيِّ وهو "كوته" إذ قالَ بعد ما أمْعَنَ النظرَ في حقائقِ القرآنِ:

"عجباً، أيمكِنُ تكمُّلُ العالَمِ المدنيِّ في دائرةِ الإسلاميةِ"؟

فأجابَ بنفسِه:

"نعم، بل المحقِّقون الآنَ مستفيدون - بجهةٍ - مِن تلك الدائرةِ".

ثم قالَ الناقلُ:

لما طلعتْ حقائقُ القرآنِ صارتْ كالنارِ الجوّالةِ وابتلعتْ سائرَ الأديانِ، فحُقَّ له؛ إذ لا يحصلُ شيءٌ مِن سفسطياتِ النصارى وخرافاتِ اليهودِ.

---

(١) للشاعر: "السرّي الرّفاء" (ت ٣٦٦هـ) قوله:

وشمائلٌ شَهِدَ العدوُّ بفَضْلِها     والفضلُ ما شَهِدَتْ به الأعداءُ

ئیتر ئەو فەیلەسووفە، بەم قسانەی، تەسدیقی واتای ئەم ئایەتەی کرد:

﴿فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ ... فَإِن لَمْ تَفْعَلُواْ وَلَنْ تَفْعَلُواْ فَاتَّقُواْالنَّارَ﴾.

* ئەگەر وتت:

قورئان، هەروەها ڕاڤەکارەکەی - مەبەستم فەرموودەیە - لە هەر زانستێك پوختەیەکی وەرگرتووە. خۆ زانینی چەندین پوختە (واتە لە هەموو زانستێك) لە توانای تاکە کەسێکدا هەیە.

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

زانینی پوختەی ئەو زانستانە، بەو شێوەیەی کە بتوانێ بە ڕاستی و دروستی لە شوێنی گونجاوی خۆیدا بە جوانی دایبنێت و، لە زەوی‌یەکی بە پیتدا بەکاری بهێنێت، هاودەم لەگەڵ چەندین شتی ئەوتۆدا کە پێشتر نەبیستراون، لەو پوختەیەدا هێمایان بۆ بکرێت - کە لە سەرنجی دووهەمدا ئاماژەمان پێ دان - ئەم زانینە بە وێنەی شووشە، مەلەکە و شارەزاییەکی تەواوەتی لەو زانستەدا دەردەخەن. ئەو کاتەش زانینی ئەو پوختەیە لە حوکمی زانینی هەموو زانستەکەدا دەبێ. خۆ هاوشێوەی ئەمەش بۆ تاقە کەسێك هەرگیز ناگونجێ.

بزانە کە: دەرەنجامی ئەم داوەری‌یانە، بریتی‌یە لەوەی کە لە پێشدا ئەم دەستوورانەی خوارەوە (لە زەینی خۆتدا) ئامادە بکەیت:

* تاکەکەس لە چەند زانستێکی زۆردا پسپۆڕ نابێت..

* تەنها یەك گوفتار کە دوو کەس بیڵێن، سەبارەت بە یەکێکیان دەبێتە زێڕ و، سەبارەت بەوی تریان دەبێتە خەڵووز..

* زانستەکان ئەنجامی بە دوای یەکدا هاتنی هزرو بیرەکانە و، بە تێپەڕبوونی کاتیش کامڵ دەبن..

* زۆرێك لەو شتانەی کە لە ڕابوردوودا نەزەری بوون، ئێستا بوونەتە بەڵگەنەویست..

* قیاس کردنی "ڕابوردوو" لەسەر "ئێستا" پێوەرێکی خەڵەتێنەرە و، جیاوازیی ئەو دوو کاتەی تێدا ڕەچاو نەکراوە..

فصدَّقَ ذلك الفيلسوفُ مآلَ:

﴿فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ ... فَإِن لَمْ تَفْعَلُواْ وَلَنْ تَفْعَلُواْ فَاتَّقُواْ النَّارَ﴾.

* فإنْ قلتَ:

إنَّ القرآنَ وكذا مفسِّرَه – أعني الحديثَ – إنما أَخذَ من كلِّ فنٍّ فذلكةً، وإحاطةُ فذلكاتٍ كثيرةٍ ممكنةٌ لشخصٍ.

قيل لك:

إنَّ الفذلكةَ بحُسنِ الإصابةِ في موقعِها المناسبِ، واستعمالَها في أرضٍ مُنْبِتَةٍ مع أمورٍ مرموزةٍ غيرِ مسموعةٍ – قد أشرْنا إليها في النكتةِ الثانيةِ – تشُفُّ كالزجاجةِ عن مَلَكَةٍ تامّةٍ في ذلك الفنِّ واطلاعٍ تامٍّ في ذلك العلمِ، فتكونُ الفذلكةُ في حُكمِ العلمِ، ولا يمكنُ لشخصٍ أمثالُ هذه.

اعلم أنَّ نتيجة هذه المحاكماتِ هي أنْ تستحضرَ أوّلاً ما سيأتي من القواعدِ وهي:

أنَّ شخصاً لا يتخصَصُ في فنونٍ كثيرةٍ..

وأنَّ كلاماً واحداً يتفاوتُ من شخصَين، يكونُ بالنظر إلى واحدٍ ذهَباً وإلى الآخَر فَحْماً..

وأنَّ الفنونَ نتيجةُ تلاحُقِ الأفكارِ وتتكمُّلُ بمرورِ الزمانِ..

وأنَّ كثيراً من النظرياتِ في الماضي صارتْ بدهيةً الآنَ..

وأنَّ قياسَ الماضي على هذا الزمانِ قياسٌ مُثبِّط مع الفارقِ..

* ئەو فرت و فێڵانەی خەڵکی شار کە لە ژێر پەردەی شارستانێتیدا خۆیان شاردووتەوە، سادە و ساکاریی دەشت نشین داناپۆشن..

* زۆرێك لە زانستەکان بە تەڵقینی عادەتەکان و ڕووداوەکان و، بە وانە وتنەوەی حاڵەتەکانی سروشتی مرۆڤ بەدەست دێن، ئەوەش لە ڕێی ئامادەکاریی کات و ژینگەوە..

* ڕووناکیی ڕوانینی مرۆڤ ناڕواتە ناو داهاتوو، هەروەك چۆنێتی‌یە تایبەتەکان نابینێت..

* هەروەك ئەوەی کە ژیانی مرۆڤ تەمەنێکی سروشتیی هەیە تەواو دەبێت؛ یاساکەشی بە هەمان جۆرە، تەمەنێکی سروشتیی هەیە؛ بە بێ گومان کۆتایی پێ دێت..

* دەوروبەر و ژینگەی کات و شوێن کاریگەری‌یەکی مەزنیان لە حاڵەت و بارودۆخەکانی دەروونەکاندا هەیە..

* زۆرێك لەو شتانەی کە لە ڕابوردوودا "دەراسا" بوون، بە هۆی کامڵ بوونی بنەماکانەوە دەبنە "ئاسایی"..

* "زیرەکی"ش با ناوازە و دەراسا بێت، ناتوانێت " زانست"ێك دروست بکات و یەکسەری کەماڵی پێ ببەخشێت، بەڵکو ئەو زانستە بە وێنەی مناڵ هەنگاو بە هەنگاو گەشە دەکات.

جا ئەگەر ئەم مەسەلانەت (لە زەینی خۆتدا) ئامادە کرد و، داتنان لە پێش چاودا، ئەوا خۆت لە ئەندێشەکانی کات و وەهمەکانی دەوروبەر داماڵە و، لەسەر لێواری ئەم چەرخەی دەریای زەمانەوە بە کەشتی‌یەکی ژێر دەریایی بڕۆ هەتا لە دوورگەی چەرخی بەختەوەریی پێغەمبەریتیی ئەو دێیتە دەرەوە..

پاشان لەوێ سەرت بەرز بکەرەوە و ئەو هزرانە بپۆشە کە ئەو ڕۆژگارە بۆیان دووربوبێت.

ئنجا بڕوانە بۆ ئەو بیابانە فراوانە!

لەوێ یەکەم شتێ کە پێش چاوت دەکەوێت ئەوەیە کە:

وأنَّ أهلَ الصحراءِ لا تسترُ بساطتَهم وصفوتَهم الحيلُ والدسائسُ التي تختفي تحتَ حِجابِ المدنيةِ..

وأنَّ كثيراً من العلومِ إنما يتحصَّلُ بتلقين العاداتِ والوقوعاتِ وبتدريسِ الأحوالِ لطبيعةِ البشرِ بإعدادِ الزمانِ والمحيطِ..

وأنَّ نورَ نظرِ البشرِ لا ينفُذُ في المستقبل ولا يرى الكيفياتِ المخصوصةَ..

وأنَّه كما أنَّ لحياةِ البشرِ عمراً طبيعياً ينقطعُ؛ كذلك لقانونه عمرٌ طبيعيٌّ ينتهي البتةَ..

وأنَّ للمحيط الزمانيِّ والمكانيِّ تأثيراً عظيماً في أحوالِ النفوسِ..

وأنَّ كثيراً من الخوارقِ الماضيةِ تصيرُ عاديةً بتكمُّلِ المبادئِ..

وأنَّ الذكاءَ - ولو كان خارقاً - لا يقتَدِرُ على إيجادِ فنٍّ وتكميلِه دفعةً بل كالصبيِّ يتدرَّجُ.

وإذا استحضرتَ هذه المسائلَ وجعلتَها نُصبَ عينيكَ، فتجرَّدْ وتعرَّ من الخيالاتِ الزمانيةِ والأوهامِ المحيطيةِ، ثم غُصْ من ساحلِ هذا العصرِ في بحرِ الزمانِ، مارّاً تحتَه إلى أنْ تخرُجَ مِن جزيرةِ عصرِ السعادةِ ناظراً على جزيرةِ العربِ! ثم ارفعْ رأسَك والبَسْ ما خاطَ لك ذلك الزمانُ مِن الأفكار، ثم انظرْ في تلك الصحراءِ الوسيعةِ!

فأوَّلُ ما يتجلَّى لعينك:

مرۆڤێکی تەنیای بێ پشت و پەنا و بێ دەسەلاٌت دەبینی، کە بە تەنیا خۆی ڕۆشتووەتە زۆرانەوە لەگەڵ هەموو جیهاندا و، هێرش دەکاتە سەر هەمووان و، حەقیقەتێکیشی لەسەر شانی خۆی هەلگرتووە کە لە گۆی زەوی مەزنترە و، شەریعەتێکیشی بە دەستەوە گرتووە کە بەختەوەریی سەرانسەری مرۆڤایەتی دەستەبەر دەکات..

ئەو شەریعەتەش بە جۆرێکە دەڵێی پوختەی سەرجەم زانستە خواییەکان و، کاکڵەی هەموو هونەرە ڕاستەقینەکانە..

هەروەها ئەو شەریعەتە ژیانێکی وەهای تێدایە کە نەك وەکو پۆشاك، بەڵکو بە وێنەی پێستی جەستە وایە؛ بە گەشەکردنی توانا و لێهاتنەکانی مرۆڤ ئەویش فراوان دەبێت و، بەختەوەریی هەردوو دنیا بەرهەم دەهێنێت و، حاڵەت و بارودۆخەکانی سەرجەم گرۆی مرۆڤ – وەك بڵێی ئامادەبووانی تەنیا یەك ئەنجومەن بن – ڕێك دەخات.

جا ئەگەر پرسیاری لێ بکرێت:

یاساکانی لە کوێوە دێن؟ بەرەو کوێ دەڕۆن؟

ئەوا بە زمانی ئیعجازەکەی دەڵێت:

ئێمە لە گوفتاری "ئەزەلی"یەوە دێین و، هاوڕێی بیری مرۆڤین هەتا "ئەبەد". کاتێکیش کە لەم دنیا فانی‌یە دادەبڕێین، ئەوا بە ڕواڵەت و لە ڕووی "تەکلیف"ەوە لێیان جیا دەبینەوە، بەڵام بە مەعنەویات و نهێنی‌یەکانمان هەردەم دەمێنینەوە و هاوڕێیانین؛ خۆراك بە ڕۆحیان دەبەخشین و دەبینە ڕێ پیشاندەریان.

جا کاکە! ئایا ئەمەی کە بیستت ئەو فەرمانە دەستەوسانکارەت بەسەردا ناخوێنێتەوە کە لەم ئایەتەدایە:

﴿فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ ... فَإِن لَمْ تَفْعَلُواْ وَلَنْ تَفْعَلُواْ...﴾ هتد؟

پاشان بزانە کە ئایەتی: ﴿وَإِنْ كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا..﴾ هتد، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بەهۆی بێ ئاگایی هەندێ کەس لە مەبەستی خوای گەورەی خاوەن شەریعەت لە ڕێنمایی جەماوەردا و، نەزانینیان بەوەی کە دەبێ ڕێنمایی بە گوێرەی ئامادەباشیی مرۆڤەکان بێت، کەوتوونەتە ناو کۆمەڵێك دوودڵی و گومانەوە، کە سەرچاوەکەیان سێ دانەیە:

أنّك ترى إنساناً وحيداً لا مُعينَ له ولا سلطنةَ، يبارِزُ الدنيا برأسِه.. ويهجُمُ على العمومِ.. وحَمَلَ على كاهلِه حقيقةً أجلَّ من كُرةِ الأرضِ.. وأخذَ بيده شريعةً هي كافلةٌ لسعادةِ الناسِ كافّةً..

وتلك الشريعةُ كأنّها زبدةٌ وخلاصةٌ مِن جميعِ العلومِ الإلهيةِ والفنونِ الحقيقيةِ.. وتلك الشريعةُ ذاتُ حياةٍ لا كاللباسِ بل كالجِلدِ، تتوسَّعُ بنموِّ استعدادِ البشرِ وتثمرُ سعادةَ الدارين، وتنظِّمُ أحوالَ نوعِ الإنسانِ كأهلِ مجلسٍ واحدٍ.

فإنْ سُئلتْ:

قوانينُها مِن أينَ.. إلى أينَ؟

لقالتْ بلسانِ إعجازِها:

نجيءُ مِن الكلامِ الأزليِّ ونرافقُ فكرَ البشرِ إلى الأبدِ، فبعدَ قطعِ هذه الدنيا نفارقُ - صورةً - مِن جهةِ التكليفِ ولكنْ نرافِقُ دائماً بمعنوياتِنا وأسرارِنا فنُغذّي روحَهم ونصيرُ دليلَهم..

فيا هذا! أفلا يتلو عليك ما شاهدتَ، الأمرَ التعجيزيَّ في:

﴿فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِنْ مِّثْلِهِ ... فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَنْ تَفْعَلُواْ...﴾.. الخ؟

ثم اعلمْ أنَّ آيةَ ﴿وَإِنْ كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا..﴾.. الخ: تشيرُ إلى أنَّ ناساً - بسبب الغفلةِ عن مقصودِ الشارعِ في إرشاد الجمهورِ، وجهلِهم بلزوم كَونِ الإرشادِ بنسبة استعدادِ الأفكارِ - وقعُوا في شكوكٍ وريوبٍ منبعُها ثلاثةُ أمورٍ:

یەکەمیان:

دەڵێن:

بوونی چەند موتەشابیهـ و گرفتێك لە قورئاندا، پێچەوانـەی ئیعجـازی دامەزراویـەتی لەسەر ڕەوانبێژی، کە ئەویش لەسەر بناغـەی ڕوونیـی بـەیان و ئاشـکرایی گەیاندنـەکانی دامەزراوە..

دووهەمیان:

دەڵێن:

قورئان لە باسەکانی لەمەڕ زانستە گەردوونی‌یەکاندا بە ڕەهایی و تەماوی دواوە، لـە کاتێکدا کە ئەوەش پێچەوانەی ڕێبازی فێرکردن و ڕێنماییە.

سێ‌هەمیان:

دەڵێن:

بەشـێك لـە ڕواڵەتـەکانی قورئـان پـێ مـەیلی بـەلای پێچەوانـەی بەڵگـەی ژیریدایـە، کەواتە گریمانی پێچەوانەی واقیع هەڵدەگرێت، خۆ ئەوەش دژی ڕاستگۆیی قورئانە.

وەڵام:

پشت بە خوای گەورە دەبەستم و، دەڵێم:

ئەی ئەوانەی کە گومان دەنێنەوە!

بزانن: ئەو شتانەی کە ئێوە بە هۆکاری ناتەواویی تێدەگەن، هەر لـەوە خـۆی شـایەتی ڕاستە لەسەر ئیعجازی قورئان!

سەبارەت بە وەڵامی گومانی یەکەم:

کە "بوونی موتەشابیهـ و گرفتەکانە لە قورئاندا"، ئەوا بزانە کە:

ڕێنمایی قورئان بۆ جەماوەری هەموو خەڵکی‌یـە. زۆرینـەی جـەماوەریش "عـەوام"ن، لە ڕێنماییشدا کەمایەتی شوێنکەوتەی زۆرینەن.

ئەو گوفتارەی کە ئاراستەی "عـەوام" دەکرێـت "تایبەتمـەندان"یـش سـوود و بـەهرەی خۆیـانی لـێ وەردەگـرن. خـۆ ئەگـەر ئەمـە پێچەوانـە بووایـە، ئـەوا چینـی عـەوام بێبـەش دەمانەوە.

أحدُها:

أنّهم يقولون: وجودُ المتشابهاتِ والمشكلاتِ في القرآن مُنافٍ لإعجازه المؤسَّسِ على البلاغةِ المبنيةِ على ظهور البيانِ ووضوحِ الإفادةِ.

والثاني:

أنّهم يقولون: إنَّ القرآنَ أطلقَ وأبهمَ في حقائق الخِلقةِ وفنونِ الكائناتِ، مع أنّه مُنافٍ لمسلك التعليمِ والإرشادِ.

والثالثُ:

أنّهم يقولون: إنَّ بعضَ ظواهرِ القرآنِ أميَلُ إلى خلاف الدليلِ العقليِّ، فيَحتملُ خلافَ الواقعِ، وهو مخالفٌ لصدقِه.

الجوابُ - وبالله التوفيقُ -:

أيُّها المشككون!

اعلموا أنَّ ما تتصوّرونه سبباً للنقص إنما هو شواهِدُ صدقٍ على سرِّ إعجازِ القرآنِ.

أما الجوابُ عن الرَّيبِ الأوّلِ وهو وجودُ المتشابهاتِ والمشكلاتِ، فاعلمْ:

أنَّ إرشادَ القرآنِ لكافّةِ الناسِ، والجمهورُ الأكثرُ منهم عوامٌّ، والأقلُّ تابعٌ للأكثر في نظر الإرشادِ. والخطابُ المتوجِّهُ نحوَ العوامِّ يستفيدُ منه الخواصُّ ويأخذون حصَّتَهم منه.. ولو عكسَ لبقيَ العوامُّ محرومين..

ئنجا ئەوەش هەیە کە جەماوەری عەوام زەینی خۆیان لـە شتانی پێ ڕاهاتوویـان و لـە ئەندێشەکانیان داناماڵن، کەواتە توانای تێگەیشتنی ڕاستی‌یە پەتی‌یەکان و ئەو شتانەیان نی‌یە کە تەنها لـە بازنـەی "ژێـری"دان، مەگـەر بـە چاویلکـەی ئـەو شـتانەی کـە لـە ئەندێشـەیاندایە و، بـە وێنـەی شتانی لەگەڵ ڕاهاتوویـان بۆیـان وێنا بکرێـت، بەڵام بـەو مەرجەی کە ڕوانینیـان هـەر لەسـەر وێنەکە نەمێنێتـەوە، تـاکو شتـی "مـەحاڵ" و، بوونـی "جەستە" و "لا" لە لایان سەر هەڵنەدات، بەڵکو ڕوانینیـان لـەو شێوەیەوە بڕوات بـەرەو "ڕاستی‌یەکان".

بۆ نموونە:

جـەماوەر ڕاسـتیی هەڵسـوکەوتی خـوای گـەورە لـە بوونـەوەراندا، بـە شـێوەی هەڵسوکەوتی پادشایەك وێنا دەکەن کە لەسەر تەختی پادشایەکەی نیشـتەجێ بوو بێت. بۆیە "درکە"(کینایە)ی هەڵبژارد لە: ﴿الرَّحْـــمنُ علی العرشِ اسْتَوَى﴾دا (طه: ٥)..

جا مادەم هەست و نەستەکانی جەماوەر لەم ناوەندەدایە، ئـەوا ڕێبـازی ڕەوانبێـژی و ڕێگاکانی ڕێنمایی وا پێویست دەکەن کە چاودێریی تێگەیشتنی جەماوەر بکرێت و، ڕێز لە هەست و نەستیان بگیرێت و، شـان بـە شـانی ژیریی ئەوان هـەنگاو بنرێت و، هـزر و بیرەکانیان بە هـەند وەربگـیرێت. بـە وێنـەی کەسێك لەگـەڵ منـاڵێکدا بدوێت، دەبینی خۆی بە وێنەی مناڵ لێ دەکات، تاکو ئەو مناڵە لێی تێبگات و دڵی بۆ بکاتەوە..

جـا شێوازی قورئـان لـەم چەشـنە مەنزڵگایانـەیدا کـە چـاودێریی جـەماوەریان تێـدا کراوە، پێی دەوترێت: " دابەزاندنەکانی گوفتاری خـوای گـەورە بۆ ئاستی تێگەیشـتنی ژیریی مرۆڤ".

ئەم دابەزاندنەش بە مەبەستی ئەوەیە کە بە زەینی ئەوان ئاشنا و هاوڕاز بێت..

لەبەر ئەمەیە، کە شێوەی شتە موتەشابیهەکان بە وێنەی چاویلکەیەك لەسـەر چاویـان دانراوە.

ئایا نابینی کە "ڕەوانگۆیان" بە زۆری "خواسـتن"(إسـتعارة)یان بەکارهێناوە، تـاکو لە شـێوەیەکی سـادە و ئاسـاندا تەسـەووری واتـا قـووڵەکان بکرێـت، یـان وێنـەی واتـا پەرش و بڵاوەکان بکێشرێت؟

مع أنَّ جمهورَ العوامِّ لا يجرِّدون أذهانَهم عن المألوفاتِ والمتخيَّلاتِ، فلا يقتدرون على دَرْك الحقائقِ المجرَّدَةِ والمعقولاتِ الصِّرفةِ إلّا بمنظار متخيّلاتِهم وتصويرِها بصورةِ مألوفاتِهم. لكنْ بشرط أنْ لا يقِفَ نظرُهم على نفس الصورةِ حتى يلزمَ المحالُ والجسميةُ أو الجهةُ، بل يمرَّ نظرُهم إلى الحقائقِ.

مثلاً:

إنَّ الجمهورَ إنما يتصوّرون حقيقةَ التصرُّفِ الإلهيِّ في الكائنات بصورةِ تصرُّفِ السلطانِ الذي استوى على سرير سلطنتِه. ولهذا اختارَ الكنايةَ في: ﴿**الرَّحْـمنُ على العرشِ اسْتَوَى**﴾ (طه: ٥).

وإذا كانتْ حسيّاتُ الجمهورِ في هذا المركزِ، فالذي يقتضيه منهجُ البلاغةِ ويستلزمُه طريقُ الإرشادِ رعايةُ أفهامِهم واحترامُ حسيّاتِهم ومماشاةُ عقولِهم ومراعاةُ أفكارِهم، كمَن يتكلَّمُ مع صبيٍّ فهو يتصَبَّى في كلامِه ليُفهِمَه ويستأنسَ به.

فالأساليبُ القرآنيةُ في أمثال هذه المنازلِ المرعيِّ فيها الجمهورُ تُسمّى بـ"التّنزلاتِ الإلهيةِ إلى عقولِ البشرِ"..

فهذا التَّنَـزُّلُ لتأنيس أذهانِهم.

فلهذا وُضِعَ صورُ المتشابهاتِ منظاراً على نظر الجمهورِ.

ألا ترى كيف أكثرَ البُلغاءُ من الاستعارات لتَصوُّرِ المعاني الدقيقةِ، أو لتصوير المعاني المتفرّقةِ!

واتە ئەم موتەشابیهانە لە بەشە تەماویەکانی "ئیستیعارە"ن، چونکە چەند وێنەیەکن بۆ ڕاستییە تەماوی و نادیارەکان.

سەبارەت بە گرفتیش لە دەستەواژەدا، ئەوا یان لەبەر وردی و قووڵیی واتا و، کورتکردنەوە و بڵندیی شێوازە. کە گرفتەکانی قورئان لەم جۆرەن..

یان لەبەر داخراویی وشە و، ئاڵۆزیی دەستەواژەیە، کە ئەوەش دژی ڕەوانبێژییە. ئەمەیان لە قورئاندا نییە.

جا ئەی کەسی گوماناوی!

ئەم ڕاستییانەی کە قووڵ و دوورن لە هزری جەماوەرەوە، ئایا نزیك خستنەوەیان لە تێگەیشتنی عەوامەوە بە ڕێگایەکی ئاسان، هەر بۆ خۆی خودی "ڕەوانبێژی" نییە کە بریتییە لە "یەکاویەك بوونی گوفتار لەگەڵ خواستی حاڵ و مەقام"دا؟

دەسا بیری لێ بکەرەوە!

سەبارەت بە وەڵامی گومانی دووهەمیش:

کە نادیاری و تەماویی لێدوانی قورئانە لەسەر پێکهاتنی بەدیهاتووان، بەراورد بەو شێوەیەی کە زانستە تازەکان ڕاڤەیان کردووە..

ئەوا بزانە کە: درەختی جیهان مەیلی بەرەو کامڵبوونی تێدایە. ئەو لقەش کە لە مرۆڤ بووەتەوە مەیلی پێشکەوتنی لەخۆ گرتووە. مەیلی پێشکەوتنیش بە وێنەی "ناوك" وایە؛ گەشەکردنی بە ئەزموونی زۆر بەدەست دێت و، لە ڕێی بە دوای یەکداهاتنی هزر و بیرەکانەوە پێکدێت و فراوان دەبێت. ئیتر زنجیرە زانستێکی ڕیز بەستووی یەك لە دوای یەکی ئەوتۆ بەرهەم دێنێت کە هەتا ئەوەی پێشوویان پێك نەیەت ئەوەی دواتر دروست نابێت، هەروەها ئەوەی پێشوو نابێتە پێشەکیی زانستەکەی دوای خۆی هەتا بە وێنەی زانستە ناسراوەکان ئاشناییان لەگەڵدا بۆ دروست نەبێت..

لەسەر بناغەی ئەم نهێنییە:

ئەگەر دە چەرخ پێش ئێستا کەسێك بیویستایە خەڵکی بانگ بکات و، فێری ئەو زانستەیان بکات و تێیان بگەیەنێت کە بە ئەنجامی چەندین ئەزموونی زۆر لەم سەردەمەدا پەیدا بووە و سەری هەڵداوە، ئەوا کارەکەی دەبووە هۆی سەر لێ شێواندنی زەینەکان و، خەڵکی دووچاری سەفسەتە و هەڵە دەکرد!

فما هذه المتشابهاتُ إلّا مِن أقسام الاستعاراتِ الغامضةِ، إذ إنّها صُوَرٌ للحقائقِ الغامضةِ.

أما كَوْنُ العبارةِ مُشْكَلاً؛ فإما لدقّةِ المعنى وعمقِه، وإيجازِ الأسلوبِ وعلويتِه، فمشكلاتُ القرآنِ من هذا القبيل..

وإما لإغلاقِ اللفظِ وتعقيدِ العبارةِ المنافي للبلاغة، فالقرآن مُبرَّأٌ منه.

فيا أيها المرتابُ!

أفلا يكونُ من عين البلاغةِ تقريبُ مثلِ هذه الحقائقِ العميقةِ البعيدةِ عن أفكار الجمهورِ إلى أفهام العوامِّ بطريقٍ سهلٍ، إذ البلاغةُ مطابقةُ مقتضَى الحالِ؟ فتأمّلْ..

أما الجوابُ عن الرَّيبِ الثاني، وهو إبهامُ القرآنِ في بحثِ تشَكُّلِ الخِلقةِ على ما شَرَحَتْه الفنونُ الجديدةُ..

فاعلمْ أنَّ في شجرة العالَمِ ميلَ الاستكمالِ، وتشَعَّبَ منه في الإنسانِ ميلُ التَّرقِي، وميلُ التَّرقي كالنواة يحصُلُ نشوؤُه ونماؤُه بواسطة التجاربِ الكثيرةِ، ويتشَكَّلُ ويتوسَّعُ بواسطة تلاحُقِ نتائجِ الأفكارِ؛ فيُثمِرُ فنوناً مترتِّبَةً بحيث لا ينعقدُ المتأخِّرُ إلّا بعدَ تشكُّلِ المتقدِّمِ، ولا يكونُ المتقدِّمُ مقدمةً للمؤخَّرِ إلّا بعد صيرورتِه كالعلومِ المتعارَفَةِ..

فبناءً على هذا السرِّ، لو أرادَ أحدٌ تعليمَ فنٍّ أو تفهيمَ علمٍ - وهو إنما تولّدَ بتجاربَ كثيرةٍ - ودعا الناسَ إليه قبلَ هذا بعشْرَةِ أعصُرٍ، لا يفيدُ إلّا تشويشَ أذهانِ الجمهورِ، ووقوعَ الناسِ في السفسطةِ والمغلطَةِ.

بۆ نموونە:

گەر ئەو دەمە قورئان بیوتایە:

"خەڵکینە! سەیری وەستانی خۆر[١] و جوولەی زەوی و کۆبوونەوەی یەك ملیۆن زیندەوەر لە یەك دڵۆپدا بکەن، تاکو پەی بە مەزنیی کردگار ببەن"..

ئەوا لەبەر ئەوەی ڕوانینی جەماوەری عەوام، بەهۆی هەستی ڕواڵەتی، یاخود بەهۆی هەڵەی هەستەوە، تەختیی زەوی و سووڕی خۆر بە لایەوە لە بەڵگەنەویستە بینراوەکانە..

ئەو قسەیە یان دووچاری بەدرۆخستەوەی دەکردن.. یان لەگەڵ خۆیاندا دەکەوتنە نکوولّی و خۆ بەهەڵەبردن!

لە کاتێکدا کە شێواندنی زەینەکان - بە تایبەت لە ماوەی دە چەرخدا، لەبەر حەزی هەندێ کەسی ئەم کات و سەردەمەی ئێمە - دژی ڕێبازی "ڕێنمایی" و گیانی "ڕەوانبێژی"یە!

کاکە! گومانی ئەوە نەبەیت کە ئەم چەشنە بابەتانە بەو شتە نەزەرییانە قیاس بکرێن کە هی حاڵەتەکانی ئەودنیان[٢]. چونکە لەبەر ئەوەی هەستی ڕواڵەتی پەیوەندیی بە لایەنێکی ئەو حاڵەتانەوە نەکردووە، ئەوا لە بازنەی "مومکین"دایە و دەکرێ باوەڕ و متمانەی پێ بکرێ. کەواتە مافی ئاشکرای خۆی لەوەدایە کە بە ڕاشکاوی باس بکرێت[٣].

---

(١) لە دەمی نەخۆشی و لە نێوان "خەو" و "بێداری"دا، سەبارەت بە: ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا﴾ (یس:٣٨) ئەم خاتیرەیەم بە دڵدا هات:

واتە لەبەر ڕاگرتنی دامەزراویی کۆمەڵەکەی، لە شوێنی خۆیدا بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە. واتە جوولەکەی بۆ بەرهەمهێنانی ئەو هێزی کێشەیە کە ڕێکخەری کۆمەڵەی خۆرە. دەنا گەر خۆر ڕابووەستایە، ئەوا کۆمەڵەکەی پەرتەوازە دەبوون. (ئەم پەراوێزە خەوانەیە ورد و نیانە). (دانەر)

(٢) واتە پێت وا نەبێت کاروبار و حاڵەتەکانی ئاخیرەت کە لای ئێمە نەزانراون، وەکو ئەو شتە نەزەرییانە بن کە داهاتوو پەردەیان لەسەر لادەبات. (ت)

(٣) واتە: نابێ بوترێ: خۆ باسەکانی سەر بە قیامەتیش لە ئایندەی نازڵبوونی قورئاندا ڕوودەدەن، ئەی بۆچی قورئان ئەو باسانەی بە دەقی ڕاشکاو هێناوە، کەچی بابەتە زانستییەکانی ڕۆژگارەکانی دوای نازڵبوونی قورئانی بە تەماوی باس کردووە؟ نابێ ئەمە بوترێ، لەبەر ئەو ڕوونکردنەوەیەی کە دانەر خۆی لە دەقەکەدا هێنای. (وەرگێڕ)

مثلاً:

لو قالَ القرآنُ: "أيها الناسُ انظروا إلى سكونِ الشمسِ[1] وحَرَكَةِ الأرضِ واجتماعِ مليونِ حيوانٍ في قطرةٍ، لتتصوَّروا عظمةَ الصانعِ"، لأَوْقَعَ الجمهورَ إما في التكذيبِ وإما في المغالطةِ مع أنفسِهم والمكابرةِ معها، بسببِ أنَّ حسَّهم الظاهريَّ - أو غلطَ الحسِّ- يرى سطحيةَ الأرضِ ودوَرانَ الشمسِ من البدَهيّاتِ المشاهَدةِ..

والحالُ أنَّ تشويشَ الأذهانِ - لا سيما في مقدار عشْرةِ أعصُرٍ لتشَهّي بعضِ أهلِ زمانِنا - مُنافٍ لمنهاجِ الإرشادِ وروحِ البلاغةِ.

يا هذا! لا تظُنَنَّ قياسَ أمثالِها على النظريّاتِ المستقبَلةِ من أحوالِ الآخِرة[2]، إذ الحسُّ الظاهريُّ لمّا لم يتعلّقْ بجهةٍ منها بقيتْ في درَجةِ الإمكانِ فيمكنُ الاعتقادُ والاطمئنانُ بها فحقُّها الصريحُ التصريحُ بها.

---

(١) قد سنح لي في المرض بين النوم واليقظة في: ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا﴾ (يس: ٣٨) أي في مستقرها، لاستقرار منظومتها، أي جريانها لتوليد جاذبتها النظامة للمنظومة الشمسية، ولو سكنت لتناثرت. (هذه الحاشية النومية دقيقة لطيفة). (المؤلف)

(٢) أي لا تظنَنَّ أنَّ أمورَ الآخرة وأحوالها التي هي مجهولةٌ لنا كتلك النظريات التي يكشفُ عنها المستقبل. (ت)

بەلام ئەمەی کە لێی دەدوێین، لەبەر ئەوەی بەهۆی هەڵەی هەستەوە لای ئەوان لە پلەی "ئیمکان" و "گریمان" دەرچووە و گەیشتووەتە پلەی "بەڵگەنەویست"، ئەوا مافی خۆی لە پێش چاوی "ڕەوانبێژی"دا ئەوەیە کە بە نادیار و ڕەها باس بکرێت، وەك ڕێزنانێك لە هەست و نەستیان و، بۆ ئەوەش زەینەکان نەشێوێن..

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا قورئان - بە دانانی چەندین نیشانە - هێما و ئاماژەی بۆ "حەقیقەت" کردووە و، دەرگاکانی لە ڕووی هزر و بیرەکاندا خستووەتە سەرپشت و، خولکی چوونە ژوورەوەی کردوون.

دەسا کاکە! ئەگەر تۆ کەسێکی خاوەن ویژدان بیت و، لە دەستووری: "كَلِّمِ النَّاسَ علَى قَدْرِ عقولِهم"[1] ڕامێنێت و، لەبەر نائامادەیی کات و ژینگەی ئەو قۆناغە، بینیت کە هزرەکانی جەماوەر ئەم چەشنە تەکلیفە هەڵناگرێ و پێی هەرس ناکرێت کە دەرەنجامی بە دوای یەکدا هاتنی هزرەکانە، ئەوا دەزانیت ئەو شێوازی نادیاری و ڕەهایەی کە قورئان لە باسکردنی ئەو بابەتانەدا هەڵی بژارد "ڕەوانبێژی"یەکی سەرتاسەرییە و، یەکێکە لە بەڵگەکانی ئیعجازەکەی.

وەڵامی گومانی سێهەمیش:

واتە لارکردنەوەی هەندێ ڕواڵەتی ئایەتەکان بۆلای ئەو شتانەی کە دژی بەڵگەی عەقڵین و پێچەوانەی ئەو شتانەن کە زانست دەری خستوون، ئەوا بزانە کە:

ئامانجی بنەڕەتیی قورئان ڕێنمایی جەماوەرە بۆ لای چوار بناغە، کە ئەمانەن:

"چەسپاندنی بەدیهێنەری تاك و تەنیا و، پێغەمبەرێتی و، حەشر و، دادگەری"..

لەبەر ئەوە، باسی بوونەوەران لە قورئاندا باسێکی لاوەکی و شوێنکەوتەی باسە سەرەکییەکانە، بە نیازی ئەوەی کە بکرێن بە بەڵگە. چونکە قورئان بۆ ئەوە نەهاتووە کە وانەی "جوگرافیا" و "گەردووناسی" بڵێتەوە. بەڵکو باسی بوونەوەرانی بۆ ئەوە کردووە کە بیانکات بە بەڵگە لەسەر سنعەتی خوایی و، ڕێسای ناوازەش بکات بە بەڵگە لەسەر ڕێکخەری ڕاستەقینە کە خوای گەورەیە..

---

(١) (كلّم الناس على قدر عقولهم) دەستوورێکە لە "حیکمەتی بانگەواز"دا. واتە: (بە ئەندازەی تێگەیشتنی ژیریی خەڵك لە گەڵیان بدوێ). زانایان لە چەند ڕیوایەتێك وەریان گرتووە کە لە نێوان "مەوقوف"ی صەحیح و "مەرفووع"ی زەعیفدان، بڕوانە: البخاري: ٥٨/١ رقم ١٢٧؛ مسلم: ١١/١ رقم ٥، الفردوس بمأثور الخطاب: ٣٩٨/١ رقم ١٦١١. (وەرگێڕ)

لكنَّ ما نحن فيه لَمّا خرجَ من درجةِ الإمكانِ والاحتمالِ في نظرهم - بحكم غلطِ الحسِّ - إلى درجةِ البداهةِ عندَهم فحقُّه في نظر البلاغةِ الإبهامُ والإطلاقُ احتراماً لحسياتِهم وحفظاً لأذهانِهم من التشويشِ..

ولكنْ مع ذلك أشارَ القرآنُ ورَمَزَ ولوَّحَ إلى الحقيقةِ، وفَتَح البابَ للأفكار ودعاها للدخول بنَصْبِ أماراتٍ وقرائنَ.

فيا هذا! إنْ كنتَ مِن المنصفين إذا تأمَّلتَ في دستورِ: "كلِّم الناسَ على قَدْرِ عقولِهم" ورأيتَ أنَّ أفكارَ الجمهورِ - لعدم إعدادِ الزمانِ والمحيطِ - لا تتحمَّلُ ولا تهضِمُ التكليفَ بمثل هذه الأمورِ – التي إنما تتولَّدُ بنتائجِ تلاحُقِ الأفكارِ - لعرفتَ أنَّ ما اختارَه القرآنُ من الإبهامِ والإطلاقِ مِن محضِ البلاغةِ ومِن دلائلِ إعجازِه.

أما الجوابُ عن الرَّيْبِ الثالثِ، وهو إمالةُ بعضِ ظواهرِ الآياتِ إلى مَنافي الدلائلِ العقليةِ وما كشفَه الفنُّ..

فاعلمْ أنَّ المقصدَ الأصليَّ في القرآنِ إرشادُ الجمهورِ إلى أربعةِ أساساتٍ هي:

إثباتُ الصانعِ الواحدِ، والنبوّةُ، والحشرُ، والعدالةُ..

فَذِكْرُ الكائناتِ في القرآنِ إنما هو تبَعيٌّ واستطراديٌّ للاستدلال؛ إذ ما نزلَ القرآنُ لدرس الجغرافيا والقوزموغرافيا[1]، بلْ إنما ذَكَرَ الكائناتِ للاستدلال بالصنعة الإلهيةِ والنِظامِ البديعِ على النَّظّامِ الحقيقيِّ جلَّ جلالُه..

---

(١) القوزموغرافيا: علم الفلك.

خۆ ئاسەواری سنعەتی خوا و، کاری بە مەبەست و، ڕێکوپێکیی ڕێساکەی لە هەموو شتێکدا دەبینرێ. ئیتر پێکهاتنەکەی هەرچۆن بوو بێت، ئێمە کارمان بەسەریەوە نی‌یە، چونکە پەیوەندیی بە ئامانجی سەرەکی‌یەوە نی‌یە.

کەواتە مادەم قورئان بە مەبەستی بەڵگەهێنانەوە لە بوونەوەران دەدوێت و، دەبێ "بەڵگە"ش پێش بابەتی دەعوا لەسەر کراو خۆی شتێکی زانراو بێت و، مادەم وا بە جوان دەزانرێت کە بەڵگە ڕوون بێت، لەوا ئیتر چۆن "ڕێنمایی" و "ڕەوانبێژی" داخوازی ئەوە نابن کە شتێك بڵێن بەو جۆرە باوەڕانەی ئەوان ئاشنا بێت کە لەسەر بناغەی هەستەکانیان دامەزراوە و، چۆن ڕواڵەتی هەندێ لە دەقەکان بەو ئاراستەیە نابێت کە لەگەڵ زانیاری‌یە ئەدەبی‌یەکانی ئەواندا بڕوات، نەك بۆ ئەوەی کە بەڵگە بێت لەسەر باوەڕ و زانیاری‌یەکانی ئەوان، بەڵکو لە جۆری کینایە و شوێنکەوتەکانی گوفتار بێت، هاوکات لەگەڵ دانانی چەندین قەرینە و نیشانە بەرەو حەقیقەت بۆ کەسانی لێکۆڵەر.

بۆ نموونە:

ئەگەر قورئان لە مەقامی بەڵگەهێنانەوەدا بیوتایە:

"خەڵکینە! بیر لە وەستانی "خۆر" بکەنەوە، هاودەم لەگەڵ جووڵە ڕواڵەتی‌یەکەیدا و.. سەیری جووڵەی ڕۆژانە و ساڵانەی "زەوی" بکەن، هاودەم لەگەڵ وەستانی ڕواڵەتییدا و.. سەرنج لە کارە ناوازەکانی "کێشی گشتیی نێوان ئەستێرەکان" بدەن و.. بڕواننە کارە سەرسووڕهێنەرەکانی "کارەبا" و.. کارە نامۆکانی ئاوێتە کیمیاییەکانی نێوان حەفتا "توخمەکان" و.. سەیری کۆبوونەوەی هەزاران هەزار "زیندەوەر" بکەن لە دڵۆپێك ئاودا، تاکو بزانن کە بەدیهێنەر توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە"!

(گەر قورئان ئەمەی بوتایە)..

ئەوا ئەو کاتە، "بەڵگە"کە - بە چەندین پلە - پەنهانتر و تەماوی تر و پتر گرفتاوی دەبوو لەچاو "بابەتی دەعوا لەسەر کراو"! خۆ دیارە ئەوەش پێچەوانەی دەستووری بەڵگەهێنانەوەیە.

والحالُ أنَّ أثرَ الصنعةِ والعمدِ والنظامِ يتراءى في كلِّ شيءٍ. وكيف كان التشكُّلُ فلا علينا؛ إذ لا يتعلّقُ بالمقصد الأصليّ..

فحينئذٍ ما دامَ أنّه يبحثُ عنها للاستدلالِ، وما دامَ أنّه يجبُ كونُه معلوماً قبلَ المُدَّعَى، وما دامَ أنّه يُستحسَنُ وضوحُ الدليلِ.. كيف لا يقتضي الإرشادُ والبلاغةُ تأنيسَ معتقداتِهم الحسيةِ، ومماشاةَ معلوماتِهم الأدبيةِ بإمالة بعضِ ظواهرِ النصوصِ إليها، لا ليدلَّ عليها بلْ من قبيل الكناياتِ أو مُستَتْبَعاتِ التراكيبِ مع وضعِ قرائنَ وأماراتٍ تشيرُ إلى الحقيقةِ لأهلِ التحقيقِ.

مثلاً:

لو قالَ القرآنُ في مقام الاستدلالِ:

"أيها الناسُ! تفكّروا في سكونِ الشمسِ مع حركتِها الصُّورِيةِ، وحركةِ الأرضِ اليوميَّةِ والسَّنويَّةِ مع سكونِها ظاهراً، وتأمّلوا في غرائب الجاذبِ العموميِّ بين النجومِ، وانظروا إلى عجائبِ الأَلَكْتِرِيقِ وإلى الامتزاجاتِ الغيرِ المتناهيةِ بين العناصرِ السبعين، وإلى اجتماعِ ألوفِ ألوفِ حيواناتٍ في قطرةِ ماءٍ لِتعلموا أنَّ اللهَ على كلِّ شيءٍ قديرٌ!"..

لكانَ الدليلُ أخفَى واغمضَ وأشكلَ بدرجاتٍ مِن المدَّعَى. وإنْ هذا إلّا منافٍ لقاعدةِ الاستدلالِ.

پاشان لەبەر ئەوەی ئەم چەشنە دەربڕینە جۆرێکە لە "کینایە"، ئەوا ڕاستی و درۆ ڕوو ناکاتە واتاکانیان. نابینی وشەی "قال" ئەلفەکەی سووکەڵەییەکی تێدایە، ئیتر گرنگ نی‌یە ئەسڵەکەی چ "واو" یان "قاف" یان "کاف" بێت!

دەرەنجام: لەبەر ئەوەی قورئان بۆ سەرجەم خەڵکانی هەموو چەرخەکان هاتووە، ئەوا ئەم سێ خاڵە دەبنە چەند بەڵگەیەك لەسەر ئیعجازەکەی.

سوێند بەو کەسەی کە قورئانی خاوەن "ئیعجازی ڕەوان"ی فێری مرۆڤ کردووە، ڕوانینی ئەو خۆشەویستە مژدەدەر و ترسێنەرە و، بینایە تیژەکەی، لەوە وردتر و گەورەتر و ئاشکراتر و ڕۆچووترە کە "حەقیقەت" و "ئەندێشە"ی لێ بئاڵۆزێ و، ڕێبازە ڕەواکەشی لەوە بێ نیازتر و بلندتر و خاوێنتر و بەرزترە کە فێڵ لە خەڵکی بکات و بەهەڵەیاندا بیات!

**مەسەلەی حەوتەم**

بزانە کە: کتێبەکانی سیرەت و مێژوو، زۆریان لە موعجیزە ئاشکرا و هەست پێ کراوەکانی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و، ئەو کارە دەراساییانەش باس کردووە کە لای جەماوەر بەناوبانگن و، زانایانی لێکۆڵەریش لێکدانەویان بۆ کردوون. جا لەبەر ئەوەی فێرکردنی شتی زانراو کارێکی بێهوودەیە، ئەوا "درێژە"ی ئەم باسەمان بە کتێبەکانی ئەوان سپارد. بەڵام لێرەدا جۆرەکانیان "بە کورتی" باس دەکەین:

بیشزانە کە هەرچەند هەموو یەکێکی کارە دەراسا ئاشکراکان لە خۆیدا "ئاحاد" بێت و "موتەواتیر" نەبێت، بەڵام ڕەگەزەکەی و زۆرێك لە جۆرەکانی "موتەواتیری مەعنەوی"ن.

پاشان ئەم کارە نائاساییانە سێ جۆرن:

یەکەم:

ئیرهاصە جۆراو جۆرەکانە[1]. وەك کوژانەوەی ئاگری مەجووس و، وشك بوونی دەریای ساوە و، شەق بوونی هەیوانی کیسرا و، مژدەدانی هاتیفەکان[2]..

---

(١) "ئیرهاص" بەو ڕووداوە لەعادەت بەدەرانەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ دەوترێ کە لە پێش پێغەمبەرێتیدا ڕوویان داوە، بەڵام "موعجیزە" هی کاتی پێغەمبەرێتی‌یە. (وەرگێڕ)

(٢) دەنگێکە دەبیسترێت، بێ ئەوەی سەرچاوەکەی ببینرێت. (وەرگێڕ)

ثم لأنّها مِن قبيل الكناياتِ لا يكونُ معانيها مدارَ صدقٍ وكَذِبٍ. ألا ترى أنَّ لفظَ "قالَ" ألفُه يفيدُ خفةً سواءً كان أصلُه واواً أو قافاً أو كافاً!

الحاصلُ:

أنَّ القرآنَ لأنّه نزلَ لجميع الإنسانِ في جميع الأعصارِ يكونُ هذه النُّقَطُ الثلاثُ دلائلَ إعجازِه.

والذي[1] علَّمَ القرآنَ المعجِزَ، إنَّ نظرَ البشيرِ النذيرِ وبصيرتَه النقّادَةَ أدقُّ وأجلُّ وأجلَى وأنفذُ مِن أنْ يلتبسَ أو يشتبهَ عليه الحقيقةُ بالخيال، وإنَّ مسلكَه الحقَّ أغنَى وأعلى وأنْزَهُ وأرفعُ مِن أنْ يُدلِّسَ أو يغالِطَ على الناسِ!

المسألةُ السابعةُ

اعلمْ أنَّ كتبَ السِّيَرِ والتاريخِ قد ذكرتْ كثيراً مِن معجزاتِه المحسوسةِ، والخوارقِ الظاهرةِ المشهورةِ عند الجمهورِ، وقد فسَّرَها المحققون. فلأنَّ تعليمَ المعلوم ضائعٌ، أحَلْنا التفصيلَ على كتبهم. فلنُجمِلْ بذكر الأنواعِ:

فاعلمْ أنَّ الخوارقَ الظاهرةَ وإنْ كان كلُّ فردٍ منها آحادياً غيرَ متواترٍ، لكنَّ الجنسَ وكثيراً من الأنواع متواترٌ بالمعنى.

ثم إنَّ أنواعَها ثلاثةٌ:

الأولُ: الإرهاصاتُ المتنوعةُ كانطفاء نارِ المجوسِ، ويبوسَةِ بحرِ ساوةَ، وانشقاقِ إيوانِ كسرى، وبشاراتِ الهواتفِ..

---

(١) الواو للقسم.

تەنانەت دەڵێی ئەندێشەی مرۆڤ ئەو چەرخەی پێغەمبەری ﷺ تێدا لەدایك بووە وا دەبینێ کە بووەتە هەستیارێکی خاوەن کەرامەت و، پێش وەخت مژدەی تەشریف هێنانی ئەو سەروەرەی داوە.

جۆری دووەم:

هەواڵدانە غەیبی‌یە زۆرەکانە. لە وێنەی: فەتح کردنی گەنجینەکانی کیسرا و قەیسەر و، سەرکەوتنی ڕۆم و، فەتحی مەککە و، هاوشێوەیان. دەڵێی "گیان"ی پەتی و باڵندەی ئەو، بەربەستەکانی کات و شوێنی دیاریکراوی بڕیوە و، بەناو لایەنەکانی "داهاتوو"دا گەڕاوە و، باسی ئەو شتانەی بەو شێوەیەی کە بینیونی بۆ گێڕاوینەتەوە.

جۆری سێ‌هەم:

ئەو کارە نائاساییە هەست پێ کراوانەیە کە لە دەمی تەحەددی و ڕاگەیاندنی داواکەیدا پێش چاوی خستوون. وەك: قسەکردنی بەرد و، جووڵانی درەخت و، دوولەت بوونی مانگ و، هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجە پیرۆزەکانیەوە..

زەمەخشەری دەڵێت: "ئەم جۆرەیان دەگاتە نزیکی هەزار دانە".

هەندێ بەشی ئەم جۆرە "موتەواتیری مەعنەوی"یە. تەنانەت ئەو کەسەش کە ئینکاریی قورئانی کردووە، دەستکاریی واتای ئایەتی پیرۆزی ﴿وَانْشَقَّ الْقَمَرُ﴾ی نەکردووە (لە واتا ڕواڵەتی‌یەکەی خۆی نەیگۆڕیوە)!

* ئەگەر وتت:

موعجیزەیەکی چەشنی لەتبوونی مانگ دەبوو ناوبانگی دەربکردایە و لە جیهاندا بزانرایە.

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

لەبەر جیاوازیی هەڵاتگەکان و، بوونی هەور و، سەیرنەکردنی ئاسمان وەك ئەوەی کە لەم ڕۆژگارەدا سەیر دەکرێت و، ڕوودانی لەتبوونی لە دەمی بێ ئاگایی خەڵکی و، لە شەودا و، کەمیی ماوەکەی.. لەبەر هەموو ئەمانە، پێویست ناکات کە هەموو خەڵکی یاخود زۆرینەیان "لەتبوونی مانگ" ببینن.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە ڕیوایەتەکاندا سەلماوە کە زۆرێك لەو کاروانانەی هەڵاتگەیان هەمان هەڵاتگە بووە، بینیویانە.

حتى كأنّه يتخيَّلُ للإنسان أنَّ العصرَ الذي وُلدَ فيه النبيُّ عليه الصلاةُ والسلامُ صارَ حسّاساً ذا كرامةٍ فبشَّرَ بقدومِه بالحسِّ قبلَ الوقوعِ.

النوعُ الثاني: الإخباراتُ الغيبيةُ الكثيرةُ مِن فتحِ كنوزِ كسرى وقيصرَ، وغلبةِ الرُّومِ، وفتح مكّةَ، وأمثالِها. كأنَّ روحَه المجرَّدَ الطيّارَ مزّقَ قيدَ الزمانَ المعيّنِ والمكانِ المشخّصِ، فجالَ في جوانب المستقبلِ فقالَ لنا كما شاهَدَ.

النوعُ الثالثُ: الخوارقُ الحسيَّةُ التي أظهرَها وقتَ التحدِّي والدعوى. كتكلُّمِ الحجَرِ، وحركة الشجرِ وشقِّ القمرِ، وخروجِ الماءِ..

وقد قال الزمخشريُّ: "بلغَ هذا النوعُ إلى ألفٍ".

وأصنافٌ من هذا النوعِ متواترةٌ بالمعنى حتى إنَّ ﴿وانشقَّ القمرُ﴾ لم يتصرَّفْ في معناه مَن أنكرَ القرآنَ أيضاً.

* فإن قلتَ:

مِثْلُ انشقاقِ القمرِ لابدَّ أنْ يشتهرَ في العالمِ ويُتعارَفَ.

قيل لك:

فلاختلافِ المطالعِ، ووجودِ السحابِ، وعدمِ الترصُّدِ للسماءِ كما في هذا الزمانِ، ولكونِه في وقتِ الغفلةِ، ولوجودِه في الليل، ولكَوْنِ الانشقاقِ آنياً.. لا يلزمُ أنْ يراه كلُّ الناسِ أو أكثرُهم.

على أنّه قد ثبتَ في الرواياتِ أنّه قد رآه كثيرٌ من القوافلِ الذين كان مَطلَعُهم ذلك المطلَعَ.

پاشان سەردار و یەكەمینی ئەم موعجیزانە، بریتییە لەم "قورئان"ە خاوەن بەیانەی كە لە حەوت ڕووەوە بەڵگە لەسەر ئیعجازەكەی هێنراوەتەوە و، لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ كراوە.

* * *

لەم نەخشە سەیرە لەم باسە سەرسووڕهێنەدا لەو كاتە ڕووی دا كە لە دیاربەكر لە ماڵی جەودەت بەگ لەبەرم دەنووسییەوە، لە دەمی عەسری نۆزدەی شوباتدا كە شەوی دوای لەوە هەیبی و ڕێكەوتنی گرتنی بەتلیس و بە دیل گرتنی دانەر (بەدیعوززەمان) بوو لەو شەوەدا. وەك ئەوەی بڵێی خوای گەورە خۆی باشتر دەزانێت ڕوودانی لەم نەخشە لەو شەوەدا ئاماژەیەك بێت بۆ ڕژانی خوێنی ئەو قوتابیانەی دانەر كە لەگەڵیدا بوون و، دیل بوونی خۆیشی لەو شەوەدا. (عەبدولمەجید) هەروەها لەم نەخشە، شێوەی مارێكی كێشاوە كلكی لە دانەر ئالاندبێت و سەریشی براپێت، ئەوش ڕووسە، خوا سەریان بپڕێت. هەروەها شێوەی ئەو جۆگەلە ئاوش دەكێشێت كە دانەری بە برینداری و گەمارۆدراوی تێكەوت و، بۆ ماوەی سێ سەعات و هەموو خولەكێكی ئەو ماوەیەشی لەوێ لە چاوەڕوانیی مردندا بردەسەر. (حەمزە)

* * *

جا كە لەم مەسەلانە تێگەیشتیت، ئەوا گوێ لە باسی هەر سێ ڕووەكەی هۆنینی ئایەتەكە ڕابگرە، كە بریتین لە:

هۆنینی هەموویان لە ڕشتەی ئەوانەی پێش خۆیاندا و..

هۆنینی ڕستەكان لەگەڵ یەكتردا و..

هۆنینی شێوەی پێكهاتن و بەستێنەكانی یەك بە یەكی ڕستەكان.

هۆنینی یەكەمیان، لە دوو ڕووەوەیە:

ثم إنَّ رئيسَ هذه المعجزاتِ هو القرآنُ المبينُ المبرهَنُ إعجازُه بجهاتٍ سبعٍ أُشيرَ إليها في هذه الآيةِ.

* * *

هذا النقشُ الغريبُ في هذا المبحثِ العجيبِ وقعَ توافُقاً حينما نسختُهُ في دياربكرَ بدارِ جَودَتْ بك، في تسعةَ عشَرَ من شباطٍ عصرَ ليلةِ الجُمُعةِ صادفَ سقوطَ بتليسَ وإسارةَ المؤلفِ (بديع الزَّمان) تلكَ الليلةَ. فكأنَّ حصولَ هذا النَّقشِ علَى هذه الصحيفةِ في تلكَ الليلَةِ إشارةٌ – واللهُ أعلمُ – إلَى إراقةِ دِماءِ مَن في مَعيَّةِ المؤلِّفِ مِن الطَّلَبَةِ وإسارَتِهِ في تلكَ الليلَةِ في بتليسَ. اهـ (عبد المجيد).

وكذا يُصوِّرُ هذا النَّقشُ صورةَ حَيَّةٍ لَفَّتْ بالمؤلِّفِ ذَنَـبَها وهي مقطوعةُ الرَّأسِ، وما هي إلّا الروسُ قطعَ اللهُ رأسَهم.. وكذا يُصوِّرُ جدولَ الماءِ الذي سقطَ المؤلِّفُ فيه مجروحاً ومحصوراً وبقيَ فيه ثلاثينَ ساعةً مُنتظراً للمَوْتِ في كلِّ دقيقةٍ. اهـ. (حمزة).

* * *

وإذ تفهمتَ هذه المسائلَ فاستمعْ لما يُتلَى عليك مِن نظمِ الآيةِ بوجوهِها الثلاثةِ؛ مِن نظمِ المجموعِ بما قبلَه، ونظمِ الجُملِ بعضِها مع بعضٍ، ونظمِ هيئاتِ وقيودِ جملةٍ جملةٍ.

أما النظمُ الأوّلُ فمِن وجهين:

یەکەم: کاتێ بە مەبەستی "تەوحید" قورئان فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّـــاسُ﴾ - بە پێی لێکدانەوەی ئیبن عەبباس - ئـەوا بـەم ئایەتـەش پێغەمبـەرێتیی محەممـەدی ﷺ چەسپاند کـە یەکێکە لە بەڵگە هەرە ئاشکراکانی تەوحید..

پاشـان چەسپاندنی پێغەمبـەرێتی بـە "موعجیزات" دەبێ. گـەورەترین موعجـیزاتیش قورئانە و، وردترینی رووەکانی ئیعجازی قورئانیش لە ڕەوانبێژیی هۆنینیدایە..

پاشان هەموو موسـڵمانان یـەکدەنگن لەسـەر ئـەوەی کـە قورئـان خـاوەنی ئیعجـازە. لەگەڵ ئەوەشدا لێکۆڵەران لە ڕێگاکانی ئیعجازەکەیدا جیاجیـان، بـەڵام هیـچ کـام لـەو ڕێگایانە جێ بەوی تر لێژ ناکات، بەڵکو هەریەکەیان لایـەنێك لـە لایەنـەکانی ئیعجـازی قورئانی هەڵبژاردووە..

ئەوەتا لای هەندێکیان ئیعجازی قورئان لە هەواڵە غەیبییەکانیدایـە.. لای هـەندێکی تر ئیعجازی قورئان لەوەدایە کە ڕاستییەکان و زانستەکانی لە خۆدا کۆ کردووەتەوە.. لای هەندێکی دیکە ئیعجازی قورئان لەوەدایە کـە دژایـەتی و ناسازیی تێدا نییـە.. لای هەندێك ئیعجـازی قورئـان لـە نـامۆیی و نـاوازەیی شێوازەکەیدایە لـە بڕگـە و سـەرەتای ئایەت و سوورەتەکاندا.. لای هەندێکی تر دەرکەوتنی ئەم قورئانەیە لـە لایـەن کەسـێکی نـەخوێندەوارەوە کـە نـەیخوێندووە و نەینووسـیوە.. لای بەشـێکی دیکـە گەیشـتنی ڕەوانبێژیی هۆنینی قورئانـە بـە پلەیـەك کـە بـەدەر لـە توانـای مرۆڤـە.. هـەروەها و.. هەروەها.. هتد.

پاشان بزانە کە زانینی ئەم جۆرە ئیعجازە بە "دووورودرێژی" تەنها بە خوێندنەوەی ئەم چەشنە تەفسیرەیە و، بـە "کورتـی"ش لـە سێ ڕێگـاوە بەدەسـت دێـت (وەك ئـەوەی کـە مامۆسـتای ڕەوانبێـژی: عەبدولقـاهیری جورجـانی، هـەروەها زەمەخشـەری و، سەکاکی و، جاحیظ لە دەرەنجامی لێکۆڵینەوەکانیاندا پێی گەیشتوون).

ڕێگای یەکەم:

ئەم ڕێگایە بریتییە لەوەی کە: نەتەوەی عەرەب چۆڵ نشین و نـەخوێندەوار بـوون و، ژینگەیـەکی سـەیریان هـەبوو کـە بۆ ئـەوان دەگونجـا.. بـەو ئاڵوگۆڕە گەورانـەش بێـدار بووبوونەوە کە لە جیهاندا ڕوویان دابوو.. دیوانەکەیان بریتی بوو لە شـیعر و، زانستیان

الأولُ: أنه لمّا قال: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ لإثباتِ التوحيدِ - على تفسيرِ ابنِ عباس - أثبتَ بهذه نبّوةَ محمدٍ عليه الصلاةُ والسلامُ الذي هو مِن أظهرِ دلائلِ التوحيدِ..

ثم إنَّ إثباتَ النبوّة بالمعجزاتِ. وأعظمُ المعجزاتِ هو القرآنُ. وأدقُّ وجوهِ إعجازِ القرآنِ ما في بلاغةِ نظمِه..

ثم إنَّه اتفقَ الإسلامُ[1] على أنَّ القرآنَ مُعجِزٌ، إلّا أنَّ المحققين اختلفوا في طُرُقِ الإعجازِ، لكنْ لا تزاحُمَ بين تلك الطُّرُقِ، بل كلٌّ اختارَ جهةً من جهاتِه؛ فعند بعضٍ إعجازُه إخبارُه بالغيوب، وعند بعضٍ جمعُه للحقائقِ والعلومِ، وعند بعضٍ سلامتُه من التخالُفِ والتناقُضِ، وعند بعضٍ غرابةُ أسلوبِه وبديعيتُه في مقاطعِ ومبادئِ الآياتِ والسُّورِ، وعند بعضٍ ظهورُه مِن أُمّيٍّ لم يقرأْ ولم يكتبْ، وعند بعضٍ بلوغُ بلاغةِ نظمِه إلى درجةٍ خارجةٍ عن طَوْقِ البشرِ، وكذا وكذا.. الخ.

ثم اعلمْ أنَّ معرفةَ هذا النوعِ مِن الإعجازِ تفصيلاً إنما تحصُلُ بمطالعةِ أمثالِ هذا التفسيرِ، وإجمالاً يُعرَفُ بثلاثِ طُرُقٍ. (كما حقَّقها عبدُ القاهرِ الجرجانيُّ شيخُ البلاغةِ، والزمخشريُّ والسكاكيُّ والجاحظُ):

**الطريقُ الأوّلُ:**

هو أنَّ قومَ العربِ كانوا بدويين أمّيين، ولهم محيطٌ عجيبٌ يناسبُهم.. وقد انتبهوا بالانقلاباتِ العظيمةِ في العالَمِ.. وكان ديوانُهم الشعرَ وعلمُهم البلاغةَ، ومفاخرتُهم

---

(١) المسلمون.

ڕەوانبێژی و، شانازییەکانیشیان بە زمانپاراوییەوە بوو لە پێشبڕکێکانی چەشنی بازاڕی عوکازدا.. هەروەك زیرەکترینی نەتەوەکان بوون.. لەبەر ئەوە، لە هەموو کەسێك زیاتر پێویستیان بەوە هەبوو کە زەینیان بەم لا و ئەو لادا بگێڕن و.. زەینەکانیشیان لە وەرزی بەهاریاندا بوون..

ئا لەم کاتەدا قورئان بە وێنەی خۆر و بە شکۆداریی ڕەوانبێژییەکەی خۆی لە ئاسۆیاندا هەڵهات و، پەیکەری ڕەوانبێژیی ئەوانی سەرسام کرد و سڕییەوە، کە بریتی بوو لەو "المعلقات السبعة"یەی بە تەواوەی ئالتوون نووسرابوون و بە دیواری کەعبەدا هەڵواسرابوون..

لە کاتێکدا ئەو زمانپاراوە ڕەوانبێژانەی کە میری ڕەوانبێژی و فەرمانڕەوای زمانپاراوی بوون، دژی قورئان نەوەستانەوە و لە بەرامبەریەوە دەمیان نەکردەوە، هەرچەندەش تەحەددی کردنی پێغەمبەر ﷺ و، لۆمە و سەرزەنشتی بۆیان و، گاڵتەکردنی بە بیر و ئەندێشەیان و، بزواندنی دەماریان لە ماوەیەکی درێژخایەندا و سووکایەتی پێ کردنیان، زۆر بە توندی بەردەوام بوو. لە کاتێکدا ئەوان ڕەوانگۆی وەهایان تێدا بوو کە بە سەری غرووری خۆی شانی ئاسمانی دەخوراند و، هەندێکیشیان بە لووتبەرزییەکەی شەڕە شۆقی لەگەڵ ئەستێرەدا دەکرد..

جا ئەگەر ئەوان خۆیان تاقی نەکردبایەتەوە و، هەستیان بە دەستەوسانی نەکردبایە، ئەوا هەرگیز لە نەیاری کردنی قورئان و بەرپەرچدانەوەی بێدەنگ نەدەبوون. کەواتە دەستەوسانیی ئەوان بەڵگەی ئیعجازی قورئانە.

ڕێگای دووهەم:

بریتییە لەوەی کە:

ئەو زانایان و وردەکاران و ڕەخنەگرانەی شارەزای تایبەتکاری و وردەکارییەکانی گوفتارن، لە سوورەت بە سوورەت و دە ئایەت دە ئایەت و ئایەت بە ئایەت و وشە بە وشەی قورئان ورد بوونەوە، دوای ئەوە شایەتییان دا کە قورئان هێندە تایبەتکاری و وردەکاری و ڕاستیی لەخۆدا کۆ کردووەتەوە کە لە گوفتاری مرۆڤدا کۆ نابنەوە..

بالفصاحة في أمثال سوقِ عُكاظةَ[١].. وكانوا أذكَى الأقوامِ.. وكانوا أحوجَ الناسِ لجَوَلان الذِّهنِ إذن.. ولقد كان لأذهانهم فصلُ الربيعِ.. فطلعَ عليهم القرآنُ بحَشمةِ بلاغتِه فمحا وبهَرَ تماثيلَ بلاغتِهم وهي "المعلقاتُ السبعةُ" المكتوبةُ بذَوْبِ الذهبِ على جدارِ الكعبةِ..

مع أنَّ أولئك الفصحاءَ البلغاءَ - الذين هم أمراءُ البلاغةِ وحُكّامُ الفصاحةِ - ما عارضوا القرآنَ وما حاروا[٢] ببِنْتِ شَفَةٍ، مع شدةِ تحدِّي النبيِّ عليه السلامُ لهم، ولَومِه لهم، وتقريعِه إياهم، وتسفيهِه لأحلامِهم، وتحريكِه لأعصابِهم في زمانٍ طويلٍ، وترذيلِه لهم، مع أنَّ مِن بُلَغائِهم مَن يحكُّ بيافوخه[٣] كتفَ السماءِ، ومِنهم مَن يناطِحُ السِّماكَيْن[٤] بكبرِه..

فلولا أنَّهم أرادوا وجرَّبُوا أنفسَهم فأحسُّوا بالعجزِ، لَمَا سكتُوا عن المعارضةِ البتَّةَ؛ فعجزُهم دليلُ إعجازِ القرآنِ.

**والطريقُ الثاني:**

هو أنَّ أهلَ العلمِ والتدقيقِ وأهلَ التنقيدِ الذين يعرفون خواصَّ الكلامِ ومزاياه ولطائفَه، تأمَّلوا في القرآنِ سورةً سورةً، وعشْراً عشْراً، وآيةً آيةً، وكلمةً كلمةً؛ فشهِدُوا بأنَّه جامعٌ لمزايا ولطائفَ وحقائقَ لا تجتمعُ في كلامِ بشرٍ..

---

(١) في كتب اللغة: "عكاظ".

(٢) الحَوْرُ: الرجوع عن الشيء وإلى الشيء، وطَحَنَتْ فما أحارَت شيئاً، أي ما رَدَّتْ شيئاً من الدَّقيق. (القاموس المحيط)

(٣) اليافوخ: الموضع الذي يتحرك من رأس الطفل، والمقصود هنا: من علا قدره وتكبّر من البلغاء.

(٤) السماكان: نجمان نيّران.

ئەو شایەتانەش هەزاران هەزار کەس دەبن. ئەو شتەش کە دەبێتە بەڵگە لەسەر ڕاستگۆییان لە شایەتی‌یەکەیاندا ئەوەیە کە قورئان گۆڕانکاری‌یەکی مەزنی خستە ناو جیهانی مرۆڤایەتی و، ئایینێکی فراوانی دامەزراند. ئنجا ئەو زانستانەش کە لە خۆی گرتوون، لەسەر ڕووی ڕۆژگاردا بە بەردەوامی هێشتنیەوە، ئەوەتا هەتا زەمان پیر ببێت، قورئان لاو دەبێتەوە و، هەتا دووپاتیش بکرێتەوە پتر شیرین دەبێت.

کەواتە: ﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى﴾ (النجم: ٤).

ڕێگای سێهەم[1]:

ئەم ڕێگایە - وەك "جاحیظ" لێی کۆڵیوەتەوە - ئەوەیە کە:

زمانپاراوان و ڕەوانبێژان، وێڕای پێویستی‌یان بۆ پووچەڵکردنەوەی دەعوای پێغەمبەر ﷺ و، ڕق و سەختیی توندوتیژی‌یان بەرامبەری، کەچی وازیان لە ڕێگا هەرە نزیك و ئاسان و سەلامەتترەکە هێنا کە بەرپەرچدانەوەی قورئانە بە وشەکان و، پەنایان بردە بەر شەڕە شمشێر لەگەڵیدا، کە ڕێگا هەرە سەخت و درێژخایەنترەکەیە و دەرەنجامەکەی جێی گومانە و مەترسی‌یەکانیشی زۆرە..

زیرەکیی ئەوانیش لە بواری سیاسەتدا لە ڕادەیەکدا بوو کە هەرگیز ناگونجێ جیاوازی‌یەکانی نێوان ئەم دوو ڕێگایەیان (وەڵامدانەوە بە وشە و پیت و، وەڵامدانەوەش بە شمشێر) لێ دیار نەبێت..

جا کەسێك کە دەستبەرداری ڕێی یەکەم ببێت - گەر بگونجێت و لە توانادا بێت - لە کاتێکدا کە ئەو ڕێگایە پتر دەعوای پێغەمبەرێتی پووچەڵ دەکاتەوە و، بچێت ڕێگایەك هەڵبژێرێت کە سامان و گیانی بخاتە مەترسیی تیاچوونەوە، ئەوا یان کەسێکی گەوج و هەرزەیە.. ئەم گریمانەش دوورە لەو کەسانەوە کە دوای موسڵمان بوونیان هەموو جیهانیان بەڕێوە برد..

یان ئەوەیە لە خۆیدا هەستی بە دەستەوسانی کردووە لەوەدا کە بتوانێت ڕێی یەکەم بگرێتە بەر، بۆیە ناچاری هەڵبژاردنی ڕێی دووهەم بووە.

* ئەگەر بڵێیت:

دەگونجێ بەرەنگاری کردنی قورئان لە توانادا هەبێت.

(١) ئەم ڕێگایە بەڵگەیەکی گومان برە. (دانەر)

فهؤلاء الشهداءُ ألوفُ ألوفٍ. والذي يدلُّ على صدقِ شهادتِهم هو أنَّ القرآنَ أوقعَ في العالمِ الإنسانيِّ تحوُّلاً عظيماً، وأسّسَ ديانةً واسعةً، وأدامَ على وجهِ الزمانِ ما اشتملَ عليه مِن العلومِ. فكلّما شابَ الزمانُ شَبَّ، وكلّما تكرّرَ حَلا.

فإذنْ: ﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى﴾ (النجم: ٤).

**والطريقُ الثالثُ**[1]:- كما حقّقَه الجاحظُ - :

هو أنَّ الفصحاءَ والبلغاءَ مع شدَّةِ احتياجِهم إلى إبطالِ دعوَى النبيِّ عليه السلامُ، ومع شدَّةِ حقدِهم وعنادِهم له تركُوا المعارضةَ بالحروف: الطريقَ الأسلمَ والأقربَ والأسهلَ، والتجأوا إلى المقارعةِ بالسيوفِ الطريقِ الأصعبِ الأطولِ، المشكوكةِ العاقبةِ، الكثيرةِ المَخاطرِ؛ وهم بدرجةٍ مِن الذكاءِ السياسيِّ، لا يمكنُ أنْ يخفَى عليهم التفاوتُ بين هذين الطريقين..

فمَن تركَ الطريقَ الأوّلَ - لو أمكنَ - مع أنّه أشدُّ إبطالاً لدعواه، واختارَ طريقاً أوقعَ مالَه وروحَه في المهالك، فهو إما سفيهٌ - وهو بعيدٌ مِمَّن ساسُوا العالمَ بعد أنْ اهتدَوْا -، وإما أنّه أحسَّ مِن نفسِه العجزَ عن السلوكِ في الطريقِ الأوّلِ فاضطرَّ للطريقِ الثاني.

* فإنْ قلتَ:

يمكنُ أنْ تكونَ المعارضةُ ممكنةً.

---

(١) هذه الطريق حجة قاطعة. (المؤلف)

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

ئەگەر بەرەنگاری کردنی قورئان لە تواناندا بوایە، ئەوا لەبەر ئەوەی دەماریان ورووژێنرابوو، کەسانێك دەبوون تەماعیان لەو بەرەنگاریەدا هەبێت.. گەر ئەو تەماعەش هەبوایە ئەوا بەرەنگارییان دەکرد، چونکە پێویستییەکی زۆریان پێی هەبوو.. خۆ ئەگەر بەرەنگارییەکەیان بکردایە، ئەوا لەبەر حەز و زۆریی هۆکارەکانی ئاشکرابوون، ئەو بەرەنگارییە دەردەکەوت.. ئنجا گەر ببوایە و دەربکەوتایە، ئەوا خەڵکانێك دەبوونە خەمخۆری و داکۆکییان لێ دەکرد و دەیانوت: "ئەوەتا بەرەنگاریی قورئان کرا". بە تایبەت لەو کات و سەردەمەدا.. خۆ ئەگەر کەسانێکی لەو جۆرە ببوونایە پابەندی ئەو بەرەنگارییە بوونایە و داکۆکییان لێ بکردایە - تەنانەت گەر بە دەمارگیریش بوو بێت - ئەوا ناوبانگی دەردەکرد، چونکە سەبارەت بەوان مەسەلەیەکی گرنگە.. گەر ناوبانگیشی دەربکردایە، ئەوا کتێبەکانی مێژوو دەیانگێڕایەوە، بە وێنەی ئەوەی کە وڕێنەکانی "موسەیلەمە"یان گێڕاوەتەوە کە وتوویەتی:

"الفيل ما الفيل، وما أدراك ما الفيل، صاحب ذنب قصير وخرطوم طويل"!

* ئەگەر وتت:

خۆ "موسەیلەمە" یەکێك بووە لە زمانپاراوەکان.. ئەی ئایا چۆن قسەکەی بووەتە مایەی گاڵتە و پێکەنینی خەڵك؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت: لەبەر ئەوەی قسەکانی لەگەڵ گوفتارێکدا بەرامبەر کرا کە بە چەندین پلەی زۆر لە سەرووی ئەو بووە..

ئایا نابینی کەسێك - با جوانیش بێت - گەر لە بەرامبەری یووسفەوە - دروودی لەسەر بێت - دابنرێت، چەندەش جوان بێت هەر ناشیرین دەبینرێت؟

کەواتە بۆمان سەلما کە بەرەنگاری کردنی قورئان بە "لاسایی کردنەوەی" لە تواناندا نییە. کەواتە قورئان "موعجیز"(دەستەوسانکار)ە.

* ئەگەر وتت:

ئەوانەی کە گومان و دوودڵییان هەیە، گەلێ ڕەخنە و گومان ئاراستەی داڕشتنەکانی قورئان و وشەکانی دەکەن، وەك: ﴿إِنْ هَذَانِ﴾ (طه: ٦٣) و، ﴿الصَّابِئُونَ﴾ (المائدة: ٦٩) و، ﴿الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً﴾ و، هاوشێوەیان لە ڕەخنە نەحوییەکان؟

قيل لك:

لو أمكنتْ لطمِعَ فيها ناسٌ لتحريكِ أعصابِهم لها. ولو طمِعُوا لفعلوا لشدةِ احتياجِهم. ولو عارضُوا لَتظاهرَتْ للرغبةِ وكثرةِ الأسبابِ للظهور. ولو تظاهرَتْ لوجَدَ مَن يلتزمُها ويدافعُ عنها ويقولُ: إنّه قد عورضَ، لاسيما في ذلك الزمانِ. ولو كان لها ملتزمون ومدافعون - ولو بالتعصبِ - لاشتهرَتْ، لأنّها مسألةٌ مهمةٌ. ولو اشتهرَتْ لَنقلتْها التواريخُ كما نقلتْ هَذَياناتِ "مسيلمةَ" بقوله:

"الفيلُ ما الفيلُ، وما أدراكَ ما الفيلُ، صاحبُ ذَنَبٍ قصيرٍ، وخُرطومٍ طويل".

* فإنْ قلتَ:

"مسيلمةُ" كان مِن الفصحاءِ، فكيف صارَ كلامُه مَسْخرةً وأضحوكةً بين الناسِ؟

قيل لك:

لأنّه قوبلَ بما فاقَه بدرجاتٍ كثيرةٍ. ألا ترى أنَّ شخصاً - ولو كان حَسَناً - إذا قوبلَ بيوسفَ عليه السلامُ لصارَ قبيحاً ولو كانَ مليحاً. فثبتَ أنَّ المعارضةَ لا تمكنُ؛ فالقرآنُ معجِزٌ.

* فإنْ قلتَ:

للمرتابين كثيرٌ مِن الاعتراضاتِ والشكوكِ على تراكيبِ القرآنِ وكلماتِه، مثلِ:

﴿إنْ هَذانِ﴾ (طه:٦٣) و ﴿الصَّابِئُون﴾ (المائدة:٦٩) و ﴿الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً﴾.. وأمثالِها مِن الاعتراضاتِ النحويةِ؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

کۆتایی کتێبی "مفتاح العلوم"ی سەکاکی بخوێنەرەوە، چونکە بەمە بەردی دەرخوارد داون کە وتوویەتی: "ئایا ئەوان ئاگاداری ئەوە نین کە کەسێك، بە یەکدەنگیی هەمووان، زمانپاراو بێت و لە ماوەیەکی درێژدا قسەکەی دووپات بکاتەوە، چۆن هەست بەو هەڵانە ناکات کە پێش چاوی ئەو گەوجانە دەکەوێت"[1]!

* * *

* سەبارەت بە رووی دووهەمی هۆنینی ئایەتەکەش، ئەوا بزانە کە:

ئایەتی پێشوو کاتێ فەرمانی بە "پەرستش" دا، زەینی بیسەر پرسیی: "بە چ شێوەیەك خوا بپەرستین"؟ وەك بڵێی قورئان وەڵامی دایەوە:

"وەکو ئەوەی کە قورئان فێری کردن".

ئنجا هاتەوە پرسیی: "ئەی چۆن بزانین کە قورئان گوفتاری خوای گەورەیە"؟

وەڵامی دایەوە کە: ﴿وَإِنْ كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا﴾.. هتد.

هۆنینی ڕستەکانیش لە ڕشتەی یەکتردا ئەوەیە کە: ڕستەی ﴿وَإِنْ كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا﴾ کەوتووەتە شوێنی گونجاوی خۆی. چونکە قورئان کاتێ فەرمانی دا بە خواپەرستی، وەکو ئەوە وابوو کە پرسیاری لێ کرابێت:

"چۆن بزانین ئەوە فەرمانی خوایە، هەتا پێویست بێت پەیرەویی لێ بکەین"؟

پێی وترا:

گەر گومانت هەیە ئەوا خۆت تاقی بکەرەوە، هەتا دڵنیا بیت کە فەرمانی خوایە.

هەروەها یەکێکی تر لە رووەکانی هۆنینی ڕستەکە ئەوەیە کە:

قورئان کاتێ بە ڕستەی ﴿ذَلِكَ الْكِتَابُ لا رَيْبَ فِيهِ هُدَىً لِلْمُتَّقِينَ﴾ مەدح و سەنای خۆی کرد و، ئنجا ئەوەش مەدحی ئیماندارانی بە دوای خۆیدا خواست و، دوای مەدحی ئەوانیش زەمی کافران و دووڕووانی بە دوادا هێنا و، پاش ئەوانە فەرمان بە "پەرستش" و "تەوحید"ی بە دوادا هات..

---

(١) واتە: گەر هەڵە بن. (وەرگێڕ)

قيل لك:

عليك بخاتمةِ مفتاحِ السكاكيِّ، فإنَّه ألقَمَهم الحجرَ بـ"أفلا يتفطَّنُون أنَّ مَنْ كرَّرَ كلامَه في زمانٍ مديدٍ مع أنّه فصيحٌ بالاتفاقِ كيف لا يَحُسُّ بالغلَطاتِ التي تَظهرُ لنظرِ هؤلاءِ الحُمَقاء"؟

***

* أما الوجهُ الثاني لنظم الآية:

فاعلم أنَّ الآيةَ السابقةَ لّما أمرتْ بالعبادةِ، استَفسرَ ذهنُ السامعِ بـ"على أيّةِ كيفيةٍ نعبدُ"؟ فكأنّه أجابَ: "كما علَّمَكم القرآنُ". فعادَ سائلاً: "كيف نعرِفُ أنّه كلامُ الله تعالى؟"

فأجابَ بقوله: ﴿وَإِنْ كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا﴾ الخ.

أما نظمُ الجُملِ بعضِها مع بعضٍ فهو: أنَّ جملةَ ﴿وَإِنْ كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا﴾ قد وقعتْ في موقعِها المناسبِ؛ إذ لّما أمرَ القرآنُ بالعبادةِ كأنّه سُئل:

كيف نعرِفُ أنّه أمرُ الله حتى يجبَ الامتثالُ؟

فقيل له: إنْ ارتبتَ فجرِّبْ نفسَك لتتيقَّنَ أنّه أمرُ الله.

ومن وجوهِ النظمِ أيضاً: أنَّ القرآنَ لما أثنى على نفسِه بجملةِ ﴿ذَٰلِكَ الْكِتَابُ لا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ﴾ ثم استتبعَ مدحُه مدحَ المؤمنين، ثم استطردَ مدحُ المؤمنين ذمَّ الكافرين والمنافقين، ثم استعقبَ الأمرَ بالعبادة والتوحيد..

دوای ئەمانە، قورئان گەڕایەوە سەر یەکەمیان (کە قورئانە) بە مەبەستی ﴿لا رَيْبَ فِيهِ﴾. واتە سەبارەت بە قورئانەوە، ئەوا هەرگیز جێی شك و گومان نی یە، گومانەکانی ئێوەش تەنها هی نەخۆشیی دڵ و بیماریی سروشتی خۆتانە، وەك ئەوەی کە:

چاوی گل کردوو "خۆر" لای خەیاڵە "ئاو"یش لە دەمی نەخۆشدا تاڵە[1]

سەبارەت بە هۆنینی ﴿فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ﴾ش، ئەوا بزانە کە:

ئەمە وەڵامی مەرجە. وەڵامی مەرجیش دەبێ "لازم"ی فیعلی مەرجەکە بێت. بەڵام لەبەر ئەوەی لێرەدا فەرمانەکە تەعجیزی یە، ئەوا تەقدیری "تَشَبَّثُوا" (واتە هەوڵ بدەن) دەخوازێ. ئنجا لەبەر ئەوەی (ئەمە ئەمرە و) ئەمر ئینشائە و ئینشائیش نابێتە "لازم"، ئەوا دەبێ "لازمی ئەمرەکە" ببێتە وەڵامی مەرجەکە، کە بریتی یە لەو "وجوب"ەی کە یەکێکە لە واتا بناغەییەکانی "ئەمر". پاشان "وجووبی هەوڵدانەکە"ش دەرناکەوێ "لازمی" مەرجەکە بێت کە "ریب" (گومان)ە، بۆیە تەقدیر کردنی چەند ڕستەیەکی پێچراوە لە ژێر کورتکردنەوەی ئەم ئایەتەدا دەخوازێت. کەواتە تەقدیرەکە بەم جۆرەیە:

"ئەگەر گومانتان لەوەدا هەیە کە گوفتاری خوایە، ئەوا دەبێ ئیعجازەکەی بزانن، چونکە گوفتاری ئیعجازبەخش هی مرۆڤ نی یە، خۆ محەممەدیش ﷺ مرۆڤە. ئەگەر دەشتانەوێ ئیعجازەکەی قورئان دەربکەوێت، ئەوا خۆتان تاقی بکەنەوە با دەستەوسانیتان دەربکەوێت، کەواتە دەبێ هەوڵی هێنانی سوورەتێکی وەك ئەو بدەن".

ماشەڵڵا لە قورئان! چەندە پوختە و.. چەندەش بە تەواوی بەرامبەرەکەی دەستەوسان دەکات!

هۆنینی ﴿وَادْعُواْ شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللهِ﴾یش، لە سێ ڕووەوەیە:

یەکەمیان: ئەوان دەڵێن: دەستەوسانیی ئێمە نابێتە بەڵگە لەسەر دەستەوسانیی سەرجەمی مرۆڤ..

کەچی قورئان بە ﴿وَادْعُواْ شُهَدَاءَكُمْ﴾ (واتە: گەورە و سەرۆکەکانتان بانگ بکەن) دەمکوتی کردن.

(١) واتای: بەیتێکی بووصیری یە لە قەسیدەی "بردة المديح"دا. (وەرگێڕ)

عادَ القرآنُ إلى الأوّلِ بالنظر إلى ﴿لا رَيْبَ فِيهِ﴾ أي أما القرآنُ فليس قابلاً للشّك والرَّيبِ؛ فما ريوبكم إلّا مِن مرض قلوبكِم وسقامةِ طبعكِم. كما:

قَدْ يُنْكِرُ ضَوْءُ الشَّمْسِ مِنْ رَمَدٍ     وَيُنْفِرُ طَعْمُ الْماءِ مِنْ سَقَمِ[1]

وأما نظمُ ﴿فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ﴾..

فاعلمْ أنَّ هذه جزاءُ الشرط، وجزاءُ الشرط يلزَمُ أنْ يكونَ لازماً لفعل الشرطِ. ولّما كان الأمرُ تعجيزياً استلزمَ تقديرَ "تشبثُوا"[2]، ولما كان الأمرُ إنشاءً والإنشاءُ لا يصيرُ لازماً، يلزمُ أنْ يكونَ لازمُ الأمر جزاءً، وهو الوجوبُ الذي هو مِن أصول معاني الأمرِ، ثم وجوبُ التشبثِ أيضاً لا يظهرُ لزومُه للرَّيبِ فاقتضَى تقديرَ جُمَل مطوِيَّةٍ تحت إيجازِ الآيةِ. فالتقديرُ:

"إنْ كنتم في رَيبٍ أنّه كلامُ الله، يجبُ عليكم أنْ تتعلموا إعجازَه، فإنَّ المعجِزَ لا يكونُ كلامَ البشرِ ومحمّدٌ عليه السلامُ بشرٌ، وإنْ أردتم ظهورَ إعجازِه فجرِّبوا أنفسَكم ليظهرَ عجزُكم، فيجبُ عليكم التشبثُ بإتيانِ سورةٍ مِن مثله".

فللّهِ دَرُّ التنـزيلِ ما أوجزَه وما أعجزَه!

وأما نظمُ: ﴿وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللهِ﴾ فبثلاثةِ أوجهٍ:

أحدُها: أنّهم يقولون: "عجزُنا لا يدلُّ على عجزِ البشرِ".. فأفحمَهم بقوله: ﴿وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ﴾ أي كبراءَكم ورؤساءَكم.

---

(١) (لشرف الدين البوصيري في قصيدته البردة):

قد تُنْكِرُ العينُ ضَوْءَ الشَّمْسِ من رَمدٍ     ويُنْكِرُ الفَمُ طَعْـمَ الماءِ من سـقَمِ

(٢) أي حاولوا. والتشبّثُ بالشيء: التَّعَلُّق به.

دووهەم: ئەوان گومانیان وایە کە: ئەگەر ئێمە بەرەنگاری قورئان بووینەوە (بە هێنانی هاوشێوەی ئەو) کێ پشتمان دەگرێت و داکۆکیمان لێ دەکات؟ قورئانیش بەوە بەردی دەرخوارد دان کە: هیچ ڕێبازێك نییە "پشتگیر"ی نەبێت. خۆ ئەگەر ئێوە بەرەنگاری بکەن، ئەوا چەند شایەتێك پەیدا دەبن کە بەرگریتان لێ بکەن.

سێهەم: قورئان وەکو ئەوە وایە کە بڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ خوای کرد بە شایەت لەسەر ئەوەی کە قورئان گوفتاری خوایە، خوای گەورەش پشت ڕاستی کردەوە و، بە دانانی سکە و مۆری "ئیعجاز" لەسەر دەعواکەی شایەتیی بۆ دا. جا ئەگەر بتەکان و شایەتەکانی ئێوە سوودێکیان بۆتان هەیە، ئەوا بانگیان لێ بکەن.

ئەمەش ئەوپەڕی گاڵتەکردنە پێیان!

هۆنینی ﴿فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا﴾ش ئاشکرایە، چونکە تەقدیرەکەی ئاوایە: "ئەگەر خۆتان تاقی کردەوە، وردبنەوە و بڕوانن ئایا توانیوتانە یان نەتانتوانیوە.. جا ئەگەر نەتانتوانی، ئەوا دەستەوسانیتان دەرکەوتووە، خۆ نەشتان توانیوە هاوشێوەی بهێنن".

هۆنینی ﴿وَلَنْ تَفْعَلُوا﴾ش، وەکو ئەوە وایە کە قورئان کاتێ فەرمووی: ﴿لَمْ تَفْعَلُوا﴾ ئەوان لە لایەنی خۆیانەوە وتبێتیان: "ئەوەی کە ئێمە لە ڕابوردوودا نەمانتوانیوە هاوشێوەی قورئان بهێنین، نابێتە بەڵگە لەسەر دەستەوسانیی مرۆڤەکانی لەمەولا"..

بۆیە قورئان فەرمووی: ﴿وَلَنْ تَفْعَلُوا﴾ بەمەش لە سێ ڕووەوە ئاماژەی بە ئیعجاز دا:

یەکەمیان: هەواڵدان لە غەیب. دەرەنجامیش بەو جۆرە بوو کە هەواڵی لەبارەوە دا. نابینی ملیۆنەها کتێبی عەرەبی هەیە، کەچی وێڕای حەزی لاسایی کردنەوەی شێوازی قورئان و زۆریی نکوولیکەرانیش، کەچی گەر ئەو کتێبانە بپشکنیت، دەبینیت هیچیان لەو ناچن. دەڵێی "جۆر"ی قورئان لە "خود"ی خۆیدا قەتیس ماوە!

جا یان ئەوەیە ئاستی قورئان لە ژێر ئاستی هەموو ئەو کتێبانەوەیە، کە لەوەش بە یەکدەنگیی هەمووان بەتاڵە، کەواتە قورئان لە سەرووی هەموویانەوەیە.

ڕووی دووهەم: بێگومانیی تەواوەتی لەوەی کە هێنانی هاوشێوەی قورئانیان لە توانادا نییە، وێڕای سەرزەنشت کردنیان و وروژاندنی دەمارەکانیان لەم مەقامە گرفتاوی و دەعوا مەزنەدا، نیشانەیەکی ڕاستە لەسەر ئەوەی کە قورئان دڵنیا و پشت ئەستوورە (لە دەعواکەیدا) و، بڕوا و متمانەی بە سامان و[1] گوتەی خۆی هەیە.

---

(١) ئەم واتایە لە کاتێکدایە کە ئەگەر دەقەکە "بِمَالِهِ" بێت. بەڵام ئەگەر "بِمَآلِهِ" بێت – کە هەڵدەگرێت – ئەوا واتاکەی بەم جۆرە دەبێت: "بڕوا و متمانەی بە ئەنجام و گوتەی خۆی هەیە". (وەرگێڕ)

والثاني: أنّهم يزعمون: أنّا لو عارضْنا فمَن يلتزمُنا ويدافعُ عنا؟ فألقمَهم الحجرَ بأنّه ما مِن مسلكٍ إلّا وله متعصبون، ولو عارضْتُم لظهرَ لكم شهداءُ يذبُّون عنكم.

والثالثُ: أنَّ القرآنَ كأنّه يقولُ: لما استَشهدَ النبيُّ عليه السلامُ اللهَ تعالى، صدَّقَهُ اللهُ وشَهِدَ له بوضعِ سِكّةِ الإعجازِ على دعواه، فإنْ كان في آلهتِكم وشهدائِكم فائدةٌ لكم فادعوهم. وما هذا إلا نهايةُ التهكُّمِ بهم.

وأما نظمُ ﴿فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُواْ﴾ فظاهرٌ، إذ التقديرُ:

"فإنْ جرَّبتُم فانظروا، فإنْ لم تَقْدِرُوا ظهرَ عجزُكم، ولم تفعلوا".

وأما نظمُ ﴿وَلَنْ تَفْعَلُواْ﴾ فكأنه لمّا قال: ﴿لَمْ تَفْعَلُواْ﴾.. قيل من جانبهم: "عدمُ فعلِنا فيما مضَى لا يدلُّ على عَجزِ البشرِ فيما سيأتي". فقال: ﴿وَلَنْ تَفْعَلُواْ﴾، فرَمَزَ إلى الإعجازِ بثلاثةِ أوجهٍ.

أحدُها: الإخبارُ بالغيب وكان كما أخبرَ. ألا ترى أنَّ الملايينَ من الكُتُبِ العربيةِ مع التمايُلِ إلى تقليدِ أسلوبِ التنـزيلِ وكثرةِ المعاندين - لو فتّشتَها -؛ لم يوافقْه شيءٌ منها. كأنَّ نوعَه منحصرٌ في شخصِه. فإمّا هو تحت الكلِّ، وهو باطلٌ بالاتفاق. فما هو إلّا فوقَ الكلِّ.

والوجهُ الثاني: أنَّ القطعَ والجزمَ بعدمِ فعلِهم - مع التقريعِ عليهم وتحريك أعصابِهم في هذا المقامِ المُشْكِلِ وفي هذه الدعوَى العظيمةِ - علامةٌ صادقةٌ على أنّه واثقٌ أمينٌ مطمئنٌ بحالِه ومقالِه.

ڕووی سێهەم:

قورئان وەکو ئەوە وایە کە بڵێ: "لە کاتێکدا ئێوە کە میری زمانپاراوین و، لە هەموو کەسێ زیاتر پێویستتان بەوە هەیە لاسایی قورئان بکەنەوە، کەچی نەتوانن لاسایی بکەنەوە و هاوشێوەی بهێنن، ئەوا مرۆڤەکانی تر هەرگیز ناتوانن"!

هەروەها ئاماژەشی تێدایە بۆ ئەوەی "دەرەنجامی قورئان" کە ئەم ئایینی "ئیسلام"ەیە، هەروەك زەمانی ڕابوردوو نەیتوانیوە هاوشێوەی بهێنێت، زەمانی داهاتووش دەستەوسانە لە هێنانی ئایینێکی هاوشێوەی ئەودا.

سەبارەت بە هۆنینی: ﴿فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ش، ئەوا بزانە کە: هێنانی ﴿فَاتَّقُواْ﴾ بە دوای ﴿فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُواْ﴾دا، چێژی "ڕەوانبێژی" تەقدیرێکی وەك ئەمەی تێدا دەخوازێت:

"گەر نەتانتوانی و، ناشتوانن.. ئەوا دەرکەوت کە قورئان دەستەوسانکارە، کەواتە گوفتاری خوایە، کەواتە واجبە لە سەرتان ئیمانی پێ بهێنن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن.. هەندێ لەو فەرمانانەش ئەوەیە کە: ئەی خەڵکینە! خوا بپەرستن، با خۆتان لە ئاگری دۆزەخ دوور بخەنەوە.. کەواتە خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن".

ئنجا بزانە کە چۆن ئەو واتایانەی کورت کردەوە و، بەوەش ئیعجازی خۆی دەرخست.

بۆ هۆنینی ﴿الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ش، بزانە کە:

مەبەست لە ﴿فَاتَّقُواْ﴾دا "ترساندن"ە. واتای ترساندنیش تەنها کاتێ جەختی تێدا دەبێت کە "بە گەورە پیشاندان" و "توندی"ی تێدابێت. بۆیە بە ﴿وَقُودُهَا النَّاسُ﴾ گەورەیی بەو واتایە بەخشی، چونکە ئاگرێك کە تەختە و سووتەمەنی‌یەکەی مرۆڤ بێت، پتر سامناك و ترسێنەر دەبێت..

پاشان بە عەتف کردنەوەی ﴿الْحِجَارَةُ﴾ش پتر توندیی بە واتاکە بەخشی، چونکە هەر ئاگرێك بەرد بسووتێنێت کاریگەریی زیاتر دەبێت..

پاشان ئاماژەی دا بە سەرزەنشت کردنیان لەسەر بتپەرستی. واتە:

ئەگەر گوێڕایەڵی فەرمانی خوا نەبن و چەند بەردێکتان پەرست، ئەوا دەڕۆنە ناو ئاگرێکەوە کە پەرستیاران و پەرستراوانیان دەسووتێنێت.

والوجهُ الثالثُ: أنَّ القرآنَ كأنَّه يقولُ: "إذا كنتم أمراءَ الفصاحةِ وأشدَّ الناسِ احتياجاً إليها ولم تقتدروا، لم يقتدرْ عليه البشرُ"..

وكذا فيه إشارةٌ إلى أنَّ نتيجةَ القرآنِ التي هي الإسلاميةُ كما لم يقتدرْ على نظيرِها الزمانُ الماضي؛ كذا يعجزُ عن مثلِها الزمانُ المستقبلُ.

وأما نظمُ: ﴿فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾..

فاعلمْ أنَّ تعقيبَ ﴿فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا﴾ بـ﴿فَاتَّقُوا﴾ يقتضي في ذوق البلاغةِ تقديراً هكذا: "إن لم تفعلوا ولن.. ظهرَ أنّه معجِز، فهو كلامُ اللهِ، فوجبَ عليكم الإيمانُ به وامتثالُ أوامرِه.. ومِن الأوامرِ: يا أيُّها الناسُ اعبدوا لتتّقُوا النار.. فاتّقُوا النار".

فأوجَز فأعجزَ.

وأما نظمُ: ﴿الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾..

فاعلم أنَّ المقصدَ مِن ﴿فَاتَّقُوا﴾ هو الترهيبُ، ومعنى الترهيبِ إنما يؤكَّدُ بالتهويل والتشديدِ، فهوَّلَه بـ﴿وَقُودُهَا النَّاسُ﴾ إذ النارُ التي حطبُها كان إنساناً أَخْوَفُ وأدهشُ..

ثم شدّدَه بعطفِ ﴿الْحِجَارَةُ﴾؛ إذ ما تُحرِقُ الحجرَ أشدُّ تأثيراً..

ثم أشارَ إلى الزّجرِ عن عبادةِ الأصنامِ:

أي لو لم تتمثلوا أمرَ اللهِ، وعبدْتُم أحجاراً لدخلتُم ناراً تأكُلُ العُبّادَ ومعبوداتِهم.

هۆنینی ﴿أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾یش، ڕوونکردنەوە و ڕاڤەی "لازم" بوونی وەڵامی مەرجەکەیە "فاتقوا النار ... الخ" بۆ فیعلی مەرج "فإن لم تفعلوا ... الخ"..

واتە: ئەم موسیبەتە بە وێنەی تۆفان و ئەو موسیبەتانەی تر نییە کە تایبەت نین بە ستەمکارانەوە و، گشتین بۆ خراپکاران و چاکەکاران..

نەخێر، ئەمەیان تەنها تایبەتە بە تاوانبارانەوە؛ "کوفر" کێشی دەکات بۆیان..

خۆ جگە لە گوێڕایەڵی کردنیش بۆ قورئان هیچ ڕێگایەکی تر نییە بۆ ڕزگاربوون لێی.

پاشان بزانە ﴿أُعِدَّتْ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە "دۆزەخ" بەدی هێنراوە و، ئێستا هەیە. بە پێچەوانەی بۆچوونی دەستەی موعتەزیلە.

پاشان یەکێك لەو شتانەی کە ڕێنماییت دەکات و تێدەگەیەنێت کە دۆزەخ هەمیشەییە، ئەوەیە کە ئەگەر بە ڕوانینی "دانایی" لە ڕێی "حەدس"ەوە بیر لە جیهان بکەیتەوە، دەبینیت کە "ئاگر" بەدیهاتوویەکی گەورە و زاڵ و خۆسەپێنە، دەڵێی توخمێکی بنەڕەتییە لەناو شتانی باڵا و نزم (ئاسمان و زەوی)دا..

هەروەها تێدەگەیت کە سەرێکی گەورە و بەروبوومێکی سەیر(ی درەختی بەدیهاتووان) هەیە کە بەرەو هەتاهەتایی شۆڕ بووەتەوە. ئایا نابینی ئەگەر کەسێك تەرزێکی درێژ ببینێت تێدەگات کە کۆتاییەکەی کاڵەکێکی - بۆ نموونە - پێوەیە؟

بە هەمان جۆر، هەر کەسێك بەدیهاتنی ئاگر ببینێت، تێدەگات کە بە "گوژاڵك"ی دۆزەخ کۆتایی پێ دێت. هەروەها هەر کەسێك نیعمەتەکان و جوانییەکان و تام و چێژەکان ببینێت، بە حەدس دەزانێت کە ڕێژگە و باخچەکەیان بەهەشتە.

* ئەگەر وتت:

ئەگەر "دۆزەخ" ئێستا هەیە، ئایا شوێنەکەی لەکوێیە؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

ئێمەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت باوەڕمان وایە کە ئێستا هەیە، بەڵام شوێنەکەی دیاری ناکەین.

وأما نظمُ: ﴿أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾ فهو أنها توضيحُ وتقريرُ لزومِ جزاءِ الشرطِ لفعلِه؛ أي هذه المصيبةُ ليست كالطوفان وسائرِ المصائبِ التي لا تصيبُ الظالمين خاصّةً، بل تعمُّ الأبرارَ والأخيارَ؛ فإنها هذه تختَصُّ بالجانين، يجرُّها الكفرُ، لا سبيلَ للنجاة إلّا امتثالُ القرآنِ.

ثم اعلمْ أنَّ ﴿أُعِدَّتْ﴾ إشارةٌ إلى أنَّ جهنمَ مخلوقةٌ موجودةٌ الآنَ، لا كما زعَمت المعتزلةُ.

ثم إنَّ مما يدلُّك ويفيدُ حَدْساً لك على أبديّةِ جهنّمَ أنّك إذا تفكّرْتَ في العالمِ بنظرِ الحكمةِ ترى النارَ مخلوقةً عظيمةً مستوليةً غالبةً، كأنّها عنصرٌ أساسٌ في العُلْوياتِ والسُّفْلياتِ..

وتفهّمتَ وجودَ رأسٍ عظيمٍ وثمرةٍ عجيبةٍ تدلّتْ إلى الأبدِ. ألا ترى أنَّ مَن رأى عِرْقاً ممتداً تفطَّنَ لوجود بطيخٍ مثلاً في رأسِه؟

وكذلك مَن رأى الخِلقةَ الناريةَ تفطَّنَ لانتهائِها إلى حنظلةِ جهنّمَ.. وكذا مَن رأى النِّعَمَ والمحاسِنَ واللذائذَ يحدِسُ بأنَّ مصبَّها ومَخلصَها وروضَها الجنةُ.

* فإنْ قلت:

إذا كانتْ جهنمُ موجودةَ الآنَ، فأين موضعُها؟

قيل لك:

نحن معاشرَ أهلِ السنةِ والجماعةِ نعتقدُ وجودَها الآنَ، لكنْ لا نعيِّنُ موضِعَها.

* ئەگەر وتت:

ڕواڵەتی فەرموودەکان ئەوە دەگەیەنن کە لە ژێر زەویدا بێت..

هەروەها لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە:

"ئاگرەکەی دووسەد هێندەی ئاگری دنیا بەتین تر و گەرمترە"..

هەروەها ئەوەش کە "خۆر" دەچێتە دۆزەخەوە؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

مەبەست لە "ژێری زەوی" مەڵبەندی زەوییە. چونکە ژێری هەر "گۆ"یەك چەقەکەیەتی.

ئنجا لە بابەتە تیۆرییەکانی "دانست"دا سەلماوە کە ناوەڕاستی گۆی زەوی (چەقەکەی) ئاگرێکی هێندە بەتینی تێدایە دەگاتە دووسەد هەزار پلە. چونکە ئەگەر سی و سێ گەز - بە گەزی بازرگانەکان - لە زەوی هەڵبکەنرێت، نزیکی پلەیەك گەرما زیاد دەکات..

بەو پێیە هەتا دەگاتە مەڵبەندەکەی، ئەو پلەی گەرمییە نزیکی دووسەد پلە دەبێتەوە..

ئەمەش پڕاوپڕی واتای ئەو فەرموودەیە کە دەفەرموێ:

"ئاگری دۆزەخ بە دووسەد پلە لە ئاگری دنیا گەرمتر و بەتین ترە".

هەروەها لە فەرموودەدا هاتووە کە:

"بەشێکی دۆزەخ "زەمهەریر"ە، بە ساردییەکەی شت دەسووتێنێت"[1].

ئەم فەرموودەیەش پڕاوپڕی ئەو بۆچوونە نەزەرییەیە، چونکە ئاگری مەڵبەند هەتا دەگاتە ڕووی سەرەوە، سەرجەم پلەکانی ئاگری لەخۆ گرتووە. لە دانستی سروشتی(فیزیك)دا سەلماوە کە: ئاگر پلەیەکی هەیە بە یەکسەری گەرماییەکانی دەوروبەری بەرەو خۆی کێش دەکات و، بە "سەرما" دەیانسووتێنێت و، ئاو دەکاتە بەستەڵەك.

---

(١) بوخاری و تیرمیزی و ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە. بۆ دەقی فەرموودەکە و درێژەی تەخریجەکەی بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر. (وەرگێڕ)

* فإنْ قلت:

إنَّ ظواهرَ الأحاديثِ تدلُّ على أنَها تحت الأرضِ. وفي حديثٍ: إنَّ نارَها أشدُّ وأحرُّ مِن نارِ الدنيا بمائتي دفعةٍ. وأنَّ الشمسَ أيضاً تدخُلُ في جهنمَ؟

قيل لك:

إنَّ "تحت الأرضِ" عبارةٌ عن مركزِها، إذ تحتَ الكرةِ مركزُها.

وقد ثبتَ في نظريّاتِ الحكمةِ أنَّ في مركزِها ناراً بالغةً في الشدّةِ إلى مقدار مائتي ألفِ درجةٍ. إذ كلّما تحفِرُ الأرضَ ثلاثةً وثلاثين ذِراعاً بذراعِ التُّجارِ تتزايدُ ــ تقريباً - درجةُ حرارةٍ. فإلى المركزِ تصيرُ ــ تقريباً - مائتي ألفِ درجةٍ. فهذا النظريُّ مطابقٌ لمآلِ الحديثِ الذي يقولُ:

"إنَها أشدُّ مِن نارِ الدنيا بمائتي درجةٍ".

وأيضاً في الحديثِ: أنَّ قسماً مِن تلك النارِ زَمهَريرٌ تُحرِقُ ببرودتِها[1].

وهذا الحديثُ مطابقٌ لهذا النظريِّ؛ إذ النارُ المركزيةُ مشتملةٌ على المراتبِ الناريةِ كلِّها إلى السطحِ. وقد تقرَّرَ في الحكمةِ الطبيعيةِ: أنَّ للنار مرتبةً تجذِبُ دفعةً حرارةَ مُجاوِرِها فتُحرِقُه بالبرودةِ وتصيرُ الماءُ جَمَداً.

---

(١) عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: "اشتكت النار إلى ربها، فقالت: "يا رب! أكل بعضي بعضاً، فجعل لها نفَسين. نفس في الشتاء ونفس في الصيف. فشدّة ما تجدون من البرد من زمهريرها، وشدة ما تجدون من الحر من سمومها" (رواه البخاري، كتاب الإيمان؛ ابن ماجه ٤٣١٩؛ الترمذي ٢٥٩٢). وعن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: "هذه النار جزء من مائة جزء من جهنم" (رواه أحمد ٢٤/ ١٦٤ (الفتح الرباني). وأورده الهيثمي في المجمع ١/ ٣٨٧ وقال: رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح).

* ئەگەر وتت:

ناوجەرگە و نـاواخنی دەفـری زەوی لـە خۆیـدا بچووکـە، ئایـا چـۆن جێـی ئـەو دۆزەخەی تێدا دەبێتەوە کە ئاسمانەکان و زەوی دەگرێ؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

بەڵێ ڕاستە، لە ڕووی جیهانی ئـەم دنیـای بینـراو و بە پێی پێچراوەییەکەی دۆزەخ، هەرچەندەش نـاواخنی دەفـری زەوی بێـت، بـەڵام بـە پێـی جیـهانی ئـەودنیا، ئـەوا دۆزەخ هێندە مەزنە کە جێی هەزاران هاوشێوەی زەویی تێدا دەبێتەوە. تەنانەت "جیهانی بینراو" بە وێنەی پەردەیەکی ڕێگر وایە لە پەیوەست بوونی ئـەو ئـاگرە بـە سـەرجەم لقەکانیـەوە. جا ئەو ئاگرەی کە لە ناخی زەویـدا هەیـە، مەڵبـەندی ئـاگری دۆزەخـە و، کرۆکەکـەی، یاخود دڵی دێوەکەیەتی[1].

هەروەها "لە ژێرەوە بـوون"ی دۆزەخ، ئـەوە نـاخوازێت کـە بـە زەوییـەوە لکـابێت، چونکە لقەکانی درەختی بەدیهاتووان، بەروبوومـەکانی خـۆر و مـانگ و ئەستێرەکان و زەوی و چەندین زەویی تریان گرتووە. کەواتە "ژێـری بەروبوومەکـە" هـەموو ئـەو شـتانە دەگرێتەوە کە دەکەونە نێوان لقەکانەوە، لە هەر شـوێنێکدا بـن. چونکـە موڵکـی خـوای گـەورە فراوانـە و، لقـەکانی درەختـی بەدیـهاتووانیش پـەلوپۆیان بــە بـڵاوی بـە هـەموو لایەکدا هاویشتووە. ئیتر "دۆزەخ" بۆ هەر لایەك کۆچ بکات بەدەرنانرێت.

لـە فەرموودەیـەکدا هـاتووە کـە: "دۆزەخ پێچراوەیەکـە" (پێچراوەتـەوە). کەواتـە دەگونجێ دۆزەخ هێلکەیـەکی ئـەم زەوییـە باڵندەیـەمان بێـت، هـەرکات پـەردەی سـەر جیهانی بینراو درا، ئەو هێلکەیەش دەترووکێ و دۆزەخ خۆی دەردەخـات و ددانـەکانی لە سەرپێچیکارانی جیڕ دەکاتەوە.

لەوانەیە هەر ئەم "پێچراوەییەی دۆزەخ" بووبێت کە موعتەزیلەکانی خاوکردبێتەوە و دووچاری ئەو هەڵەیەی کردبێتن کە گوایا دۆزەخ لە ئێستادا بوونی نەبێت.

سەبارەت بە شێوەی پێکهاتن و بەستێنەکانی یەك بە یەکی ڕستەکان، ئەوا بزانە کە: ڕستەی ﴿وَإِنْ كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا﴾..

(١) دانەر لێرەدا وشەی "عفریت"ی بەکارهێناوە، کە لـە کوردیـدا بە واتـای "دێو؛ خێـو" دێـت و، لـە زمـانی عەرەبیشدا بە چەند واتایەکی مەجازی دێت، وەك: کەسی وریـا لـە چارەسـەری کێشـەدا؛ مـاڵی بزێو. دانەر جۆش و کوڵی ئەو ئاگرەی چواندووە بە کەسی وریا و بزێو. خوای گەورەش باشتر دەزانێت. (وەرگێڕ)

* فإنْ قلت:

ما في جوفِ الأرضِ ومظروفُها صغيرٌ فكيف تَسَعُ جهنمَ التي تَسَعُ السماواتِ والأرضَ؟

قيل لك:

نعَمْ باعتبار المِلك والمطوّيّةِ وانْ كانتْ مظروفةً للأرضِ، لكنْ بالنظر إلى العالمِ الأُخروِيِّ بالغةٌ في العظَمَةِ إلى درجةٍ تَسَعُ أُلوفاً مِن أمثالِ هذه الأرضِ. بل إنَّ عالَمَ الشهادةِ كحجابٍ مانعٍ لارتباط تلك النارِ بسائرِ أغصانِها. فما في جوفِ الأرضِ إلّا مركزُها وسرُّها أو قلبُ عفريـتِها.

وأيضاً لا تستلزِمُ التحتيةُ اتصالَها بالأرضِ، إذ شجرةُ الخلقةِ أثمرتْ أغصانُها الشمسَ والقمرَ والنجومَ وأرضَنا وأرَضينَ أخرى. فما تحتَ الثمرةِ يشمَلُ ما بينَ الأغصانِ أينَ كان. فمُلكُ الله تعالى واسعٌ، وشجرةُ الخِلقةِ منتشرةٌ فأينَ سافرَتْ جهنمُ لا تُرَدُّ.

وفي حديثٍ: "إنَّ جَهَنَّمَ مَطْوِيَّةٌ" فيمكنُ أنْ تكونَ بيضةً لأرضِنا الطيارةِ متى يتمزقُ حجابُ المـُلك تنفَتِقُ تلك البيضةُ وتتظاهرْ هي كاشرةً أسنانَها لأهلِ العصيانِ.

ويحتملُ أنَّ ما ثبّطَ أهلَ الاعتزالِ وأوقعَهم في الغلَطِ بعدمِ وجودِها الآن إنما هو هذه المطوِيَّتِيَّةُ.

وأما نظمُ هيئاتِ وقيودِ جملةٍ جملةٍ:

فاعلم أنَّ جملةَ: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا﴾..

"واو"ەکەی - لەسەر بناغەی بوونی پەیوەندی لە نێوان هەردوو لایەنی عەتفەکە - ئاماژە بۆ تەقدیر کردنی: "کما علمکم القرآن" دەکات[١].

هێنانی ﴿إِنْ﴾ی مایەی ڕاڕایی، لە بریی "إذا" کە بۆ بێگومانییە، لە کاتێکدا کە گومانی ئەوان شتێکی یەقینییە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە بە مەبەستی هاتنەئارای ئەو هۆکارانەی گومانەکە لا دەبەن، دەبێ گومانەکە وا باس بکرێت کە گومان لە بوونیدا هەبێت! تەنانەت (وا پیشان بدرێت کە) ئەو گومانە لە شتە مەحاڵەکانە و، بە گریمان بوونی بۆ دادەنرێت!

پاشان گومانی ﴿إِنْ﴾ بەپێی شێوازی داڕشتنی قسەکەیە، نەك لای "قسەبێژ" کە خوای گەورەیە.

هێنانی داڕشتەی ﴿كُنتُمْ فِي رَيْبٍ﴾ لە بریی "ارتبتم" - لە کاتێکدا کە ئەمەیان داڕشتنێکی کورت ترە - ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مایەی سەرهەڵدانی گومانەکە: سروشتە نەخۆشەکەیان و خودی خۆیانن.

دەفربوونی "ریب"(گومان)یش سەبارەت بەوان، لە کاتێکدا کە "گومان" ناواخنی دەفری دڵی ئەوانە، ئاماژەیە کە بۆ ئەوەی کە تاریکایی گومانەکە لە دڵەوە بڵاو بووەتەوە و پەلی هاویشتووە، هەتا بەسەر جەستەشدا زاڵ بووە، ئیتر هەموو ڕێگاکانی لێ تاریك کردووە.

نەکیرە کردنی ﴿رَيْبٍ﴾یش بۆ گشتاندنە. واتە هەر جۆرێ لە جۆرەکانی گومانتان هەبێت، وەڵامەکەی هەر ئەوەیە کە:

ئەم قورئانە ئیعجازبەخش و حەقە.. ئەو کارەی ئێوەش کە بە ڕوانینی ڕواڵەتی و سەرزارەکی بە هەڵەی دادەنێن، کارێکی هەڵەیە.. ئیتر پێویست بەوە ناکات کە هەموو گومانێك وەڵامێکی تایبەتیی هەبێت..

ئایا نابینی کەسێك سەرچاوەی کانییە ئاوێکی بینی و لێی خواردەوە و بۆی دەرکەوت کە ئاوێکی سازگارە، ئیتر پێویستی بەوە نامێنێت کە لە هەموو لق و جۆگەیەکی ئەو کانیاوە بخواتەوە (هەتا بزانێت سازگارە)؟

"مِن"ی ﴿مِمَّا نَزَّلْنَا﴾ ئاماژەیە بۆ تەقدیر کردنی وشەی: "في شـــيء مما"(لە هەر شتێك لەوانەی).

---

(١) واتە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ﴾ کما علّمکم القرآن ﴿وَإِنْ كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا﴾. (وەرگێڕ)

الواوُ فيها - بناءً على المناسبةِ بين المتعاطفَين - تومِئُ إلى: تقديرِ:

"كما علَّمكم القرآنُ"..

وإيرادُ ﴿إِنْ﴾ الترديديةِ في موضعِ "إذا" التي هي للقطعِ، مع أنَّ ريبَهم مجزومٌ به، إشارةٌ إلى أنّه لأجلِ ظهورِ أسبابِ زوالِ الرَّيبِ شأنُه أنْ يكونَ مشكوكَ الوجودِ، بل مِن المحالِ يُفرَضُ فرضاً.

ثم إنَّ الشّكَّ في ﴿إِنْ﴾ بالنظر إلى الأسلوبِ لا بالقياس إلى المتكلِّم تعالى.

وإيرادُ ﴿كُنتُمْ فِي رَيْبٍ﴾ بدلَ "ارتبتُم" مع أنّه أقصرُ، إشارةٌ إلى أنَّ منشأَ الرّيبِ طبعُهم المريضُ وكونُهم..

وظرفيةُ الرّيبِ لهم مع أنّه مظروفٌ لقلبِهم إيماءٌ إلى أنَّ ظلمةَ الرّيبِ انتشرتْ مِن القلبِ فاستولتْ على القالبِ، فأظلَمَ عليه الطُّرُقُ..

وتنكيرُ ﴿رَيْبٍ﴾ للتعميم، أي أيُّ نوعٍ مِن أنواعِ الرّيبِ ترتابونه فالجوابُ واحدٌ وهو:

أنَّ هذا معجِزٌ وحقٌّ، فتخطِئتُكم بالنظر السطحيِّ خطأٌ، فلا يلزمُ لكلِّ ريبٍ جوابٌ خاصٌّ..

ألا ترى أنَّ مَن رأى رأسَ عينٍ وذاقَه عَذْباً فُراتاً لا يحتاجُ إلى ذَوقِ كلِّ جدولٍ وفرعٍ قد تشعّبَ منه.

و"مِن" في ﴿مِّمَّا نَزَّلْنَا﴾ إيماءٌ إلى تقدير لفظِ: "في شيءٍ مما".

وشەی ﴿نَزَّلْنَا﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مایەی سەرهەڵدانی گومانەکەیان سیفەتی "نازڵ بوون"ی قورئانە. کەواتە وەڵامی گومان بڕ تەنها و تەنها چەسپاندنی نازڵ بوونیەتی.

هەڵبژاردنی ﴿نَزَّلْنَا﴾ کە دابەزینی پلە بە پلە دەگەیەنێت، بەسەر "أنزلنا"دا کە دابەزینی یەکسەری و یەکجاری دەگەیەنێت، ئاماژەیە بۆ بیانووەکەی ئەوان کە وتوویانە:

"بۆچی بە یەکجار قورئان دانەبەزیوە، بەڵکو بەپێی ڕووداوەکان پلە بە پلە و، جار لە دوای جار و، بەش بەش و، سوورەت لە دوای سوورەت هاتووە"؟

هەڵبژاردنی وشەی "عَبْد" بەسەر وشەی "النبي" و "محمد"دا، ئاماژەیە بۆ پیشاندانی گەورەیی پێغەمبەر ﷺ و، بۆ بەرزیی سیفەتی "عیبادەت"(پەرستش). هەروەك جەختە بۆ فەرمانی ﴿اعبُدُوا﴾.. هێمایەکیشە بۆ لابردنی چەندین گومان، بەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کەسێك بە پەرستش ترە و لە هەموویان زیاتر قورئان دەخوێنێت..

دەسا فەرموو بیر بکەرەوە.

ڕستەی ﴿فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ﴾یش، ئەوا:

ئەمری ﴿فَأْتُواْ﴾ بۆ دەستەوسان کردنە و، تەحەددی و سەرکوت کردن و بانگهێشتی بۆ بەرەنگاری و تاقیکردنەوە لەخۆ گرتووە، تاکو دەستەوسانییان دەربکەوێت.

وشەی ﴿بِسُورَةٍ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوپەڕی دەمکوت کردن و، قسە پێ وتن و، بەستنەوەیان. چونکە:

یەکەم چینەکانی تەحەددی ئەوەیە کە بوترێ:

دەسا ئێوە هاوشێوەی هەموو قورئان بهێنن، بە هەموو ڕاستییەکانی و، زانستەکانی و، هەواڵدانە غەیبییەکانی، هاودەم لەگەڵ هۆنینە بڵندەکەی، لە لایەن کەسێکی نەخوێندەوارەوە.

دووهەمیان ئەوەیە کە بوترێ:

ئەگەر بەو شێوەیە هاوشێوەی قورئانتان نەهێنا، دەبا شتێکی دەمهەڵبەستیش بێت، بەڵام لە هۆنینێکی ڕەوانی وەك قورئاندا بێت.

ولفظُ ﴿نَزَّلْنَا﴾ إشارةٌ إلى أنَّ منشأَ شُبهَتِهم هو صفةُ النـزولِ. فالجوابُ القاطعُ إثباتُ النـزولِ فقط.

وإيثارُ ﴿نَزَّلْنَا﴾ الدالِّ على النـزولِ تدريجاً على "أنزلنا" الدالِّ عليه دفعةً إشارةٌ إلى أنَّ ما يتحجَّجون به قولُهم: "لولا أُنزِلَ عليه دفعةً، بل على مقتضَى الواقعاتِ تدريجاً؛ نوبةً نوبةً، نجماً نجماً، سورةً سورةً"..

وإيثارُ العبدِ على "النبيِّ" و"محمّدٍ" إشارةٌ إلى تعظيم النبيِّ، وإيماءٌ إلى علُوِّ وصفِ العبادةِ، وتأكيدٌ لأمرِ ﴿اعْبُدُوا﴾، ورمزٌ إلى دفعِ أوهامٍ بأنَّ النبيَّ عليه السلامُ أعبدُ الناس وأكثرُهم تلاوةً للقرآنِ... فتفكَّرْ!

وأنَّ جملةَ: ﴿فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ﴾..

الأمرُ في ﴿فَأْتُواْ﴾ للتعجيز، وفيه التحدِّي والتقريعُ والدعوةُ إلى المعارضةِ والتجربةِ ليظهرَ عجزُهم.

ولفظُ ﴿بِسُورَةٍ﴾ إشارةٌ إلى نهايةِ إفحامٍ، وشدّةِ تبكيتٍ، وغايةِ إلزامٍ؛ إذ:

أوّلُ طبقاتِ التحدِّي هو: أنْ يُقالَ: فأتوا بمثلِ تمامِ القرآنِ بحقائقِه وعلومِه وإخباراتِه الغيبيةِ مع نظمِه العالي من شخصٍ أُمّيٍّ!

وثانيتُها: أنْ يُقالَ: إنْ لم تفعلوا كذا فأتوا بها مُفترَياتٍ لكنْ بنظْمٍ بليغٍ مثلِه.

سێهەمیان ئەوەیە كە بوترێ:

ئەگەر بەو شێوەیە نەتان هێنا، دەبا بە ئەندازەی دە سوورەتی قورئان بێت.

چوارەمیان ئەوەیە كە:

ئەگەر ئەوەشتان نەتوانی، دەبا لانی كەم هێندەی سوورەتێكی درێژی قورئان بێت.

پێنجەمیان ئەوەیە كە:

ئەگەر ئەوەشتان بۆ ئاسان نەبوو، دەبا هێندەی هەر سوورەتێك بێت، تەنانەت هێندەی بچووكترینی سوورەتی وەك ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ﴾ بێت كە لە لایەن كەسێكی نەخوێندەواری وەك ئەو بیهێنن.

شەشەمیان ئەوەیە كە:

ئەگەر نەتانتوانی لە لایەن نەخوێندەوارێكەوە بیهێنن، دە بڕۆن لای زانایەكی كارامە و نووسەرێكی لێهاتوو ئەو هاوشێوەیە بهێنن.

حەوتەمیان ئەوەیە كە:

ئەگەر ئەمەشتان بەلاوە قورس بوو، دەسا لە نێوان خۆتاندا یارمەتیی یەكتر بدەن بۆ هێنانی ئەو هاوشێوەیەی قورئان.

هەشتەمیان ئەوەیە كە:

ئەگەر ئەوەشتان نەكرد، بچن داوای یارمەتی لە سەرجەم جینننی و ئادەمیزادەكان بكەن و، سوود لە كۆی دەرەنجامی بە دوای یەكدا هاتنی هزر و بیرەكان وەربگرن، هەر لە ئادەمەوە هەتا قیامەت. خۆ ئەوەتا دەرەنجامی هزرەكانیان لە بەردەستانداین لەو كتێبانەدا كە لەسەر شێوازی زمانی عەرەبییە و، بە حەزی لاسایی و سەرسەختیی بەرەنگاری كردن نووسراون..

ئەوەتا نەك تەنها كەسانی لێكۆڵەر، بەڵكو هەر كەسێك پاشماوەیەكی كەمی تێگەیشتنی تێدا بێت - با نەزانیش بێت - گەر سەیریان بكات، دەڵێت: هەموو ئەوانە، هاوشێوەی قورئانیان تێدا نییە. جا یان ئەوەیە پلەی قورئان لە خوار پلەی هەموویانەوەیە، كە ئەوەش بە یەكدەنگیی هەموان بەتاڵە، یاخود لە سەرووی هەموویانەوەیە، كە ئەوەش خواست و مەبەستەكەیە، وەك پێشتر باس كرا.

بەڵێ، وا سیازدە سەدەیە "قورئان" بە شتێكی هاوشێوەی خۆی بەرەنگاری نەكراوە. ڕۆژگار بەم جۆرە تێپەڕیوە. هەر وەهاش تێدەپەڕێت هەتا ڕۆژی قیامەت.

وثالثتُها: أنْ يُقالَ: إنْ لم تفعلوا هكذا أيضاً فأتوا بمقدار عشْرِ سُوَرٍ.

ورابعتُها: أنه إنْ لم تقتدروا عليه أيضاً فلا أقلَّ مِن أنْ تأتوا بقَدْرِ سورةٍ طويلةٍ.

وخامستُها: أنه إنْ لم يتيسرْ لكم هذا أيضاً فأتوا بمقدارِ سورةٍ مطلقاً ولو أقصرَ كـ﴿إنَّا أعْطَيْنَاكَ﴾ مِن شخصٍ أميٍّ مثلِه.

وسادستُها: أنه إنْ لم يمكنْكم الإتيانُ مِن أُميٍّ فأتوا مِن عالمٍ ماهرٍ وكاتبٍ حاذِقٍ.

وسابعتُها: أنه إنْ تعسَّرَ عليكم هذا أيضاً فلْيُعاوِنْ بعضُكم بعضاً على الإتيان.

وثامنتُها: أنه إنْ لم تفعلوا فاستعينوا بكافّةِ الإنسِ والجنِّ واستمِدُّوا مِن مجموعِ نتائجِ تلاحُقِ أفكارِهم مِن آدمَ إلى قيامِ الساعةِ. ونتائجُ أفكارِهم هي ما بين أيديكم مِن هؤلاء الكتُبِ على الأسلوب العربيِّ مع شَوقِ التقليدِ وعنادِ المعارَضةِ..

ففضلاً عن أهلِ التحقيقِ، لو تصفَّحَها مَنْ له أدنى مُسكَةٍ - ولو جاهلاً -، لقالَ: ليس فيها مثلُه. فإمّا هو تحتَ الكلِّ وهو باطلٌ بالاتفاق، وإمّا فوقَ الكلِّ وهو المطلوبُ كما مرَّ آنفاً.

نعَمْ، لم يعارَضْ في ثلاثةَ عَشَرَ عصراً، هكذا مرَّ الزمانُ، وهكذا يمرُّ إلى يومِ القيامةِ.

نۆهەمیان ئەوەیە کە بوترێ:

بیانوو بەوە مەهێننەوە کە بڵێن: شایەت و پشتگیرمان نی‌یە و، ئێوەش شایەتیمان بۆ نادەن. نەخێر.. برۆن شایەتەکانتان و ئەوانەش بانگ بکەن کە لایەن و پشتتان دەگرن.. دەبا ئەوان بە ویژدانی خۆیاندا بچنەوە.. ئایا پرکێشیی ئەوە دەکەن کە ئەو لافی بەرەنگاری کردنەی ئێوە بە هێنانی هاوشێوەی قورئان، پشت ڕاست بکەنەوە؟

جا ئەگەر لەم چینانەی "تەحەددی" تێگەیشتیت، ئەوا بڕوانە کە چۆن دەستەوسانیی ئەوانی دەرخست بەو ئیجاز(کورتکردنەوەیە)ەی کە ئاماژەی تێدا کرد بۆ ئەم پلە و چینانەی تەحەددی و، بەوەش بەردی دەرخوارد دان و، جڵەوی بۆ شل کردن.

پاشان بزانە کە بەڵگەی "ئینی" (بەڵگەی شوێنەوار لەسەر کارتێکەر) لەسەر دەستەوسانیی مرۆڤ لە هێنانی هاوشێوەی قورئاندا، ئاشکرا و بەڵگەنەویستە. سەبارەت بە بەڵگە "لیممی"یەکەشی (بەڵگەی کاریگەر لەسەر شوێنەوار) ئەوا وتراوە کە ئەو بەڵگەیە بریتی‌یە لەوەی: خوای گەورە تواناکانی مرۆڤی لە هێنانی هاوشێوەی قورئان دوور خستووەتەوە و کەناری داوە.

ڕێڕەوی هەرە ڕاست سەبارەت بە بەڵگە لیممی‌یەکە، ئەوەی عەبدولقاهیری جورجانی و زەمەخشەری و سەکاکی‌یە کە وتوویانە:

"توانای مرۆڤ ناگاتە پلەی هۆنینە بڵندەکەی قورئان".

پاشان سەکاکی ئەوەی هەڵبژاردووە کە "ئیعجاز" چێژێکە ڕاڤە و گوزارشتی لێ ناکرێت، بەڵکو دەچێژرێت.

بەڵام خاوەنی "دلائل الإعجاز" ئەوەی هەڵبژاردووە کە "ئیعجاز" دەتوانرێت گوزارشتی لێ بکرێت. ئێمەش لەم ڕوونکردنەوەیەدا لەسەر ڕێبازی ئەوین.

هەڵبژاردنی ﴿سُورَةٍ﴾ بەسەر "نجم"(بەشێك)، یان "طائفــة"(کۆمەڵە ئایەتێك)، یان "نوبة"(بەشە نازڵ بوونی جارێك)دا، ئاماژەیە بۆ دەمبەست کردنیان لەو شتەدا کە مایەی گومانەکەیانە و، بریتی‌یە لەوەی کە وتوویانە:

"بریا هەموو قورئان بە یەکسەری و یەکجاری نازڵ بکرایەتە سەر پێغەمبەر، دروودی لەسەر بێت"..

واتە: دەسا ئێوە بتوانن هاوشێوەی قورئان بهێنن، با تەنانەت بە یەك جاریش بێت.

وتاسعتُها: أنْ يقالَ لا تتحجّجوا بأنْ ليس لنا شهداءُ وأنتُم لا تشهدون لنا. ألَا فادعُوا شهداءَكم والمتعصبين لكم فليراجِعُوا وجدانَهم هل يتجاسَرون على تصديق دعواكم المعارَضَةَ.

وإذا تفهمتَ هذه الطبقاتِ، فانظرْ إلى القرآنِ كيف أعجزَ بأنْ أوجَزَ فأشارَ إلى هذه المراتبِ، فألقمَهم الحجرَ وأرخَى لهم العِنانَ.

ثم اعلمْ أنَّ عجزَ البشرِ عن معارضةِ أقصَرِ سُورة إنِيَّـتُهُ بدَهيةٌ.

وأما لِمِيَّتُهُ فقيلَ هي: أنَّ اللهَ تعالى صرَفَ القُوَى عن المعارضةِ.

والمذهبُ الأصحُّ في اللِّمِيَّةِ ما عليه "عبدُ القاهرِ الجرجانيُّ" و"الزمخشريُّ" و"السكّاكيُّ" وهو:

أنَّ قُدرةَ البشرِ لا تصلُ إلى درجةِ نظمِه العالي.

ثم إنَّ "السكّاكيَّ" اختارَ: أنَّ الإعجازَ ذوقيٌّ لا يعبَّرُ عنه ولا يُشرَحُ بل يُذاقُ ذوقاً.

وأما صاحبُ دلائلِ الإعجازِ فاختارَ أنّه يمكِنُ التعبيرُ عنه. ونحن على مذهبِه في هذا البيانِ.

وإيثارُ ﴿سُورَةٍ﴾ على نجمٍ أو طائفةٍ أو نوبةٍ إشارةٌ إلى إلزامِهم في منشأِ شبهتِهم وهي: لولا أُنزِلَ عليه دفعةً واحدةً؟

أي فهاتوا أنتم ولو بنَوْبَةٍ فَذَّةٍ..

هەروەها ئاماژەیە بۆ دابەش کردنی قورئان بۆ سوورەت لە دوای سوورەت، لەبەر چەندین سوودی زۆر کە "زەمەخشەری" ڕوونی کردوونەتەوە. هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەش کە ئەم شێوازە ناوازەیە کۆمەڵێ وردەکاریی لەخۆ گرتووە.

وشەی ﴿مِنْ مِثْلِهِ﴾ دوو واتای تێدایە.. واتە: لە هاوشێوەی "نازڵکراو".. یان لە لایەن هاوشێوەی "کەسی لەسەر نازڵکراو"!

بزانە کە مافی دەستەواژەکە بەپێی واتای یەکەم ئەوەبوو کە بوترایە: " مثل سورة منه" بەڵام واز لەوە هێنراوە بۆ ﴿مِن مِثْلِهِ﴾ لەبەر ئاماژەدان بۆ ڕەچاوکردنی گرنگی واتای دووهەم. واتە کاتێ بەرەنگاری کردنتان داواکەی ئەو پووچەڵ دەکاتەوە کە ئەو هاوشێوەیەی دەیهێنن لە لایەن کەسێکی هاوشێوەی ئەوەوە بێت لەوەدا کە نەیخوێندووە.

هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە بەرەنگاربوونەوە کاتێ "ئیعجاز" پووچەڵ دەکاتەوە کە ئەو شتەی بۆ بەرەنگاری پێ کردن هێنراوە، لە "کۆ"ی شتێك بێت کە هاوشێوەی قورئان بێت.

هەروەها هێمایە کیشە بۆ ئاراستەکردنی زەینەکان بەرەو کتێبە ئاسمانییە نازڵکراوەکانی هاوشێوەی قورئان، تاکو زەینی بیسەر بەراورد لە نێوانیاندا بکات و، بۆ خۆی پەی بە بەرزی و بڵندیی "قورئان" ببات.

سەبارەت بە ڕستەی ﴿ادْعُواْ شُهَدَاءكُمْ مِنْ دُونِ اللهِ﴾ش، ئەوا:

هەڵبژاردنی ﴿ادْعُواْ﴾ لە ڕستەکەدا بەسەر "استعینوا" یان "استمدوا"دا (واتە داوای یارمەتی؛ پشتگیری بکەن) ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو کەسەی بەدەم بانگەکەیانەوە بڕوات و داکۆکییان لێ بکات، دوورە دەست نییە، بەڵکو ئامادەیە و، تەنها پێویستیان بە بانگکردنی هەیە.

وشەی ﴿شُهَدَاء﴾یش سێ واتای لە خۆدا کۆ کردووەتەوە:

واتە: گەورەکانتان لە زمانپاراویدا و.. ئەوانەی شایەتیتان بۆ دەدەن و.. بتەکانتان..

جا بە پێی یەکەمیان، ئەم وشەیە بەستنەوەی ئەوانی تێدایە و، بەڵگەی ئەوەیان دەبڕێت کە بڵێن: نەتوانینی ئێمە بەڵگەی نەتوانینی گەورەکانمان نییە..

بەپێی دووهەمیشیان، دەمکوتکەریانە و، بیانووی ئەوەیان دەبڕێت کە بڵێن کەس نییە شایەتیمان بۆ بدات، بەوەی کە دەری دەخات هیچ ڕێبازێك نییە خەڵکانێکی نەبێت داکۆکیی لێ بکەن و شایەتیی بۆ بدەن.

وأيضاً إيماءٌ إلى تضمُّنِ تسويرِ التنـزيلِ سورةً سورةً لفوائدَ جمّةٍ بيّنَها "الزمخشريُّ"، وإلى تضمُّنِ هذا الأسلوبِ الغريبِ للطائفَ.

ولفظُ ﴿مِنْ مِثْلِهِ﴾ فيه معنيان: أي بمثل المنـزَل، أو مِن مثل المنـزَل عليه.

اعلم أنَّ حقَ العبارةِ على الأوّلِ "مثلَ سورةٍ منه" لكنْ عُدِلَ إلى ﴿مِنْ مِثْلِهِ﴾ للإيماءِ إلى ملاحظةِ الاحتمالِ الثاني، أي إنما تكونُ معارضتُكم مُبطِلةً لدعواه لو جاءتْ مِن مثله في عدمِ التعلُّمِ..

وكذا إشارةٌ إلى أنَّ المعارضةَ إنما تُبطِلُ الإعجازَ لو كان المعارَضُ به من مجموعِ مثلٍ..

وكذا رمزٌ إلى توجيه الأذهانِ إلى أمثال القرآنِ في النـزول من الكُتب السماويةِ، ليوازنَ ذهنُ السامعِ بينَها فيتفطّنَ لِعلُوِّه.

وأنَّ جملةَ: ﴿ادْعُواْ شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللهِ﴾..

إيثارُ ﴿ادْعُواْ﴾ فيها على "استعينوا" أو "استمَدّوا" إيماءٌ إلى أنَّ مَن يُلبّيهم ويذُبُّ عنهم لا يفقِدُهُم بل حاضرٌ لا يحتاجون إلّا إلى ندائِه.

ولفظُ ﴿شُهَدَاءَ﴾ جامعٌ لثلاثةِ معانٍ:

أي: كبراءَكم في الفصاحة.. ومَن يشهَدُ لكم.. وآلهتَـكم..

فنظراً إلى الأوّلِ؛ إلزامٌ لهم؛ يقطعُ تحجُّجَهم بأنَّ عدمَ قدرتِنا لا يدلُّ على عدمِ قدرةِ كبرائِنا.

ونظراً إلى الثاني؛ إفحامٌ لهم، يقطعُ تعلُّلهم بأنْ ليس لنا شهداءُ، بأنّه لا مسلكَ إلّا له ذابّون وشهداءُ.

بەپێی سێهەمیشیان: سەرکوتکردنەوە و گاڵتەکردنە پێیان، بەوەی کە ئەو خوایانەی(بتانەی) هیوای دەستکەوتنی سوود و دوورخستنەوەی زیانیان لێ دەکەن، چۆنە وا لەم کارەدا یارمەتیتان نادەن کە بەلاتانەوە گرنگە؟

ئیزافە کردنی ﴿شُهَدَاءَ﴾یش بۆ لای ﴿كُمْ﴾ - کە تایبەتکردن دەگەیەنێت - باڵی واتای یەکەم دەگرێت، بەوەی کە: گەورەکانتان ئامادەن لەگەڵتاندا و، تایبەتکارییش لە نێوانتاندا هەیە، جا ئەگەر بیانتوانیایە، ئەوا بێ گومان یارمەتییان دەدان.

هەروەها دەگاتە باڵی واتای دووهەمیش، بەوەی کە: ئێمە شایەتیی ئەو کەسە وەردەگرین کە ئێوە لەخۆ دەگرێت و پشتیوانیتان لێ دەکات، خۆ ئەوەتا ئەوانیش پڕ کێشی ناکەن شایەتی لەسەر شتێك بدەن کە پووچەڵیی‌یەکەی بەڵگەنەویست بێت.

باسکی واتای سێهەمیش دەگرێت، لەگەڵ سەرکوت کردنیان بەوەی کە: چۆنە وا ئەو بتانەی کە کردووتانن بە چەند پەرستراوێکی خۆتان، نایەن بە هاناتانەوە؟!

وشەی ﴿مِنْ دُونِ اللهِ﴾یش، بەپێی واتای یەکەم:

ئاماژەیە بۆ گشتاندن، واتە: جگە لە خوا، هەموو زمانپاراوێك لە دنیادا. هەروەها ئاماژەشە بۆ ئەوەی کە ئیعجازی قورئان تەنها هی ئەوەیە کە لە لایەن خواوەیە..

بەپێی واتای دووهەمیش، ئاماژەیە بۆ دەستەوسانی و واق وڕماوییان لەوەدا کە وتوویانە: "خوا شایەت و زانایە کە ئێمە دەتوانین". چونکە خووی کەسی دەستەوسانی بە بەڵگە بەستراو وایە کە سوێند بە خوای گەورە دەخوات و، ئەو دەکات بە شایەت لەسەر ئەو شتانەی کە خۆی ناتوانێت بەڵگەیان لەسەر بهێنێتەوە!

بە پێی واتای سێهەمیش، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە دژایەتیی ئەوان بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ شتێك نی‌یە جگە لە وەستانی "شیرك" بەرامبەر "تەوحید" و، "بێ گیانەکان" بەرامبەر "بەدیهێنەری زەوی و ئاسمانەکان".

ڕستەی ﴿إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾یش ئاماژەیە بۆ ئەو قسەیەی کە وتوویانە: "گەر بمانویستایە ئەوا هاوشێوەی ئەممان دەوت"..

هەروەها پلارێکە بۆ ئەوەی کە ئێوە لە کەسانی "ڕاستگۆ" نین، مەگەر بە گریمان ڕاستگۆییتان بۆ گریمان بکرێت. بەڵکو ئێوە لە کەسانی سۆفستائین و، لە ڕێی حەقخوازی‌یەوە نەکەوتوونەتە گومانەوە، بەڵکو خۆتان بە دوای گوماندا گەڕان و، تێی کەوتن.

ونظراً إلى الثالثِ؛ تبكيتٌ لهم وتهكُّمٌ بهم بأنَّ الآلهةَ التي ترجُونَ منها النفعَ ودفعَ الضرِّ كيف لا تُعينُكم في هذا الأمرِ الذي يهمُّكم.

وإضافةُ ﴿شُهَدَاءَ﴾ إلى ﴿كُمْ﴾المفيدةِ للاختصاصِ تُقوّي عضُدَ المعنى الأوّلِ؛ بأنَّ الكبراءَ حاضرون معكم، وبينكم اختصاصٌ لو اقتَدَروا لعاونوكم البتةَ.

وتصِلُ جناحَ المعنى الثاني بأنّا نقبَلُ شهادةَ مَن يلتزمُكم ويتعصّبُ لكم فإنهم أيضاً لا يتجاسَرون على الشهادةِ على بدَهيِّ البُطلانِ.

وتأخُذُ بساعدِ المعنى الثالثِ مع التقريعِ بأنَّ الآلهةَ التي اتخذتموها معبوداتٍ كيف لا تمدُّكم؟!

ولفظُ ﴿مِنْ دُونِ اللهِ﴾..

نظراً إلى الأوّلِ إشارةٌ إلى التعميمِ، أي كُلُّ فصيحٍ في الدنيا ما خلا اللهَ تعالى. وكذا إلى أنَّ إعجازَه ليس إلّا لأنّه مِن الله..

ونظراً إلى الثاني إشارةٌ إلى عجزِهم ومبهوتيَّـتِهم بقولهم: "اللهُ شاهدٌ، اللهُ عليمٌ إنّا نقتدِرُ". لأنَّ ديدَنَ العاجِزِ المحجوجِ الحلفُ باللهِ والاستشهادُ به على ما لا يقتدِرُ على الاستدلال عليه..

ونظراً إلى الثالثِ إشارةٌ إلى أنَّ معارضَتَهم مع النبيِّ عليه الصلاةُ والسلامُ ليستْ إلّا مقابلةَ الشِّركِ بالتوحيدِ والجماداتِ بخالقِ الأرضِ والسماواتِ.

وأنَّ جملةَ: ﴿إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ إشارةٌ إلى قولهم: لو شئْنا لقُلنا مثلَ هذا..

وكذا تعريضٌ بأنّكم لستُم مِن أهلِ الصدقِ إلّا أنْ يُفرَضَ فرضاً، بل مِن أهلِ السفسطةِ، ما وقعتُم في الرَّيبِ مِن طريقِ طلَبِ الحقِّ بل طلبتُم فوقعتُم فيه..

پاشان وەڵامی ئەم مەرجە، (واتە مەرجی: "إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ"..) دەرەنجامەکەی پێش خۆیەتی، واتە: "فافعلوا" (داوای یارمەتی لە شایەتەکانتان بکەن).

ڕستەی ﴿فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُواْ وَلَنْ تَفْعَلُواْ فَاتَّقُواْالنَّارَ...﴾یش.. هتد، ئەوا بزانە کە:

﴿إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ بەڵگەهێنانەوەی قورئانە لە دژیان بە "پێوەرێکی دەراوێتەیی"، کە تیایدا دژی "تالی"ی دەرهاویشتووە، تاکو دژی "موقەددەم" بەرهەم بهێنێت..

پوختەی ئەوەش بەم جۆرەیە:

"ئەگەر ئێوە ڕاست بکەن لە قسەکەتاندا، ئەوا بەرەنگاری دەکەن و سوورەتێکی هاوشێوەی قورئان دەهێنن. بەڵام ئەو کارەتان نەکرد و لەمەولایش هەر نایکەن".

کەواتە دەرەنجام ئەوەیە کە:

"ئێوە ڕاستگۆ نەبوون و، ڕکابەرەکەتان کە پێغەمبەرە ﷺ ڕاستگۆ بوو. کەواتە قورئان دەستەوسانکارە و، دەبێ ئیمانی پێ بهێنن، تاکو خۆتان لە سزا بپارێزن".

بڕوانە کە چۆن قورئانی پیرۆز ئەو هەموو ڕستەیەی کورت کردەوە و، بەوەش بەرامبەرەکەی خۆی دەستەوسان کرد!

پاشان لە جێی هەڵاوێرانی دژی "تالی"یەکە، کە "لكن ما تفعلون"یە، وشەی ﴿فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُواْ﴾ی هێنا..

جا بە گومان دروستکردنی ﴿إِنْ﴾ەکە، ئاماژەی بۆ "لەگەڵ ڕۆشتن(مجاراة)ی گومانەکەیان" کرد.. بە "مەرج بوون"ی ڕستەکەش، ئاماژەی بۆ بە "لازم"خواستنی دژی "تالی"یەکە کرد بۆ دژی "موقەددەم"ەکە، پاشان لە جێی دەرەنجامەکەدا، کە دژی "موقەددەم"ەکەیە، واتە: "فلم تكونوا صادقين" هۆکاری لازمی لازمی لازمەکەی باس کرد کە ﴿فَاتَّقُواْ النَّارَ﴾یە، ئەوەش بە مەبەستی گەورە پیشاندانی هەڕەشە و ترساندنەکە[1].

سەبارەت بە ﴿إِن لَمْ تَفْعَلُواْ﴾ش، کە بەپێی ﴿لَمْ﴾ ڕابوردووە و، بەپێی ﴿إِنْ﴾یش داهاتووە، ئەوا بۆ ئاراستەکردنی زەینی ئەوانە بۆ ڕابوردوویان. وەك ئەوەی پێیان بڵێت:

---

(١) لێرەدا "مەنتیق"ی بە جوانی بەکار هێناوە. (دانەر)

ثم إنَّ جزاءَ هذا الشرطِ محصَّلُ ما قبلَه، أي فافعلُوا.

أما جملةُ: ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ فَاتَّقُواْ النَّارَ...﴾ إلخ.

فاعلم أنَّ ﴿إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ احتجاجُ القرآنِ عليهم بقياسٍ استثنائيٍّ؛ استثنى نقيضَ التالي لإنتاجِ نقيضِ المقدَّمِ.

تلخيصُه:

"إنْ كنتم صادقين تفعلُوا المعارضةَ وتأتُوا بسورةٍ، لكنْ ما تفعلون ولن تفعلوا"..

فأنتجَ: "فلم تكونُوا صادقين، فكان خصمُكم وهو النبيُّ عليه السلامُ صادقاً، فالقرآنُ معجِزٌ، فوجبَ عليكم الإيمانُ به لتتّقُوا مِن العذابِ".

أُنظرْ كيف أوجزَ التنـزيلُ فأعجزَ!

ثم إنّه ذكَرَ موضعَ استثناءِ نقيضِ التالي وهو "لكنْ ما تفعلون" لفظَ ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ﴾ مشيراً بتشكيك ﴿إِنْ﴾ إلى مجاراةِ ظنِّهم، وبالشرطيةِ إلى استلزامِ نقيضِ التالي لنقيضِ المقدَّمِ. ثم ذَكَرَ موضِعَ النتيجةِ وهي نقيضُ المقدَّمِ أعني: "فلم تكونوا صادقين" علّةَ لازمِ لازمِ لازمِها وهي قوله: ﴿فَاتَّقُواْ النَّارَ﴾ لتهويل الترهيبِ والتهديدِ[1].

أما ﴿إِن لَّمْ تَفْعَلُواْ﴾ الماضي بالنظر إلى ﴿لَمْ﴾ والمستقبلُ بالقياس إلى ﴿إِنْ﴾ فلتوجيه الذهنِ إلى ماضيهم، كأنّه يقولُ لهم:

---

(١) قد استعملَ المنطقَ هنا استعمالاً حسناً. (المؤلف)

"سەیری وتارە ڕازاوەکانتان و هەڵواسراوە ئاڵتوونییەکانتان بکەن، بزانن ئایا یەکسانن بە قورئان؟ یان ئایا نزیکی دەبنەوە، یاخود دەکەونە شوێنێکەوە کە لە قورئانەوە نزیك بێت"؟

هەڵبژاردنی ﴿تَفْعَلُواْ﴾ش بەسەر "تأتوا"دا لەبەر دوو سەرنجە:

**یەکەمیان:**

لەبەر ئاماژەدانە بەوەی کە بنەمای "ئیعجاز" دەستەوسانیی ئەوانە و، هی ئەو دەستەوسانییەش "کردار"ە نەك شوێنەوار.

**دووهەمیان:**

لەبەر "ئیجاز"(کورتکردنەوە)ە. چونکە "فَعَلَ" هەروەك لە زانستی "صەرف"دا تەرازووی فیعلەکانە و ڕەگەزیانە، بە هەمان جۆر لە "شێوازەکان"یشدا چاوگی کردارەکان و، پوختەی چیرۆکەکانە، دەڵێی زەمیری ڕستەکانە و کینایەیە لە هەموویان[1].

سەبارەت بە ﴿وَلَنْ تَفْعَلُواْ﴾ش، ئەوا بزانە کە:

جەخت و هەمیشەیی لە ﴿لَنْ﴾دا، ئاماژەیە بۆ یەکلایی کردنەوە و، ئەویش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە قسەبێژ جیددی و دڵنیایە و گومان لە بڕیارەکەیدا نییە. ئەمەش هێمایەکە بۆ ئەوەی کە فێڵی تێدا نییە.

هێنانی ﴿فَاتَّقُواْ﴾ش لە بریی "تَجَنَّبوا" بۆ ئاماژەدانە بەو شتەی کە وەڵامی مەرجەکە بووەتە جێگری، کە بریتییە لە: "ئیمان بهێنن و، خۆتان لەو "شیرك"ە بپارێزن کە هۆی چوونە دۆزەخە".

بە مەعریفە کردنی ﴿النَّارَ﴾یش بۆ "زانراوی"یە. واتە ئەو ئاگری دۆزەخەی کە هەر لە ئادەمەوە هەتا ئێستا، بە بیستن لە پێغەمبەرانەوە - دروودیان لەسەر بێت - زانراوە و لە زەینی مرۆڤەکاندا جێگیر بووە.

---

(١) سوودی بەکارهێنانی "فَعَل" لەوەدایە کە بە وێنەی "کینایە" پوختەیەکت بە دەستەوە دەدات کە پێویستیت بە درێژەدان ناهێڵێت. بۆ نموونە گەر کەسێك وتی: "ئازادم بینی، سڵاوم لێ کرد و، بردم بۆ ماڵی خۆمان و، میواندارییم لێ کرد و، ڕێزم لێ نا و.. هتد، تۆیش بە یەك ڕستە بڵێیت: "حَسَناً فَعَلْتَ" ئەوا ئەم " فَعَلْتَ"ە ڕێگاکەی بۆ کورت کردووێتەوە و، پێویستیی بەوە نەهێشت کە بەرامبەر هەموو یەکێ لەو کردارانەی ئەو، ڕستەیەك بڵێیت. (وەرگێڕ)

"انظروا إلى خُطَبكم المزَيَّنةِ ومعلقاتِكم المذهَّبةِ أتُساويه أو تُدانيه أو تقعُ قريباً منه"؟

وإيثارُ ﴿تَفْعَلُواْ﴾ على "تأتوا" لنكتتين:

إحداهُما: الإيماءُ إلى أنَّ منشأ الإعجازِ عجزُهم ومنشأُ العجزِ الفعلُ لا الأثرُ.

والثانيةُ: الإيجازُ، إذ "فَعَلَ" كما أنه في الصَّرفِ ميزانُ الأفعالِ وجنسُها؛ كذلك في الأساليبِ مصدرُ الأعمالِ وملخَّصُ القصصِ كأنّه ضميرُ الجمَلِ كنايةً عنها.

أما: ﴿وَلَن تَفْعَلُواْ﴾ فاعلمْ أنَّ التأكيدَ والتأبيدَ في ﴿لَنْ﴾ إيماءٌ إلى القطعية، وهي إشارةٌ إلى أنَّ القائلَ مُطمَئِنٌّ جدِّيٌّ لا ريبَ له في الحُكمِ. وهذا رمزٌ إلى أنْ لا حيلةَ.

أما ﴿فَاتَّقُواْ﴾ بدلَ "تجنبوا" فللإيماء إلى ما نابَ عنه الجزاءُ مِن "آمِنوا واتقوا الشركَ الذي هو سببُ دخولِ النارِ".

أما تعريفُ ﴿النَّارَ﴾ فللعهدِ، أي النارَ التي عُهِدَتْ واستقرَّتْ في أذهانِ البشرِ بالتّسامُع عن الأنبياءِ مِن آدمَ إلى الآنِ.

وەسف کردنی ئاگرەکەش بە ﴿الَّتِي﴾ی ئیسمی مەوصوول، لە کاتێکدا کە دەبێ لە پێشدا خۆی (ئیسمە مەوصوولەکە) زانراو بێت، ئەوا لەبەر نازڵبوونی ﴿ناراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾یە (التحریم: ٦) لە پێش ئەم ئایەتەدا. واتە گوێ بیستەکان پێشتر ئەو ئایەتەیان بیستووە. کەواتە "مەوصوولییەت"ەکە لە شوێنی خۆیدایە[1].

مەبەستیش لە ﴿وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ وەك کەمێ پێشتر باس کرا، بۆ "ترساندن"ە. ترساندنیش بە هۆی "گەورە پیشاندان" و "توندی" جەختی لێ دەکرێتەوە..

دەبینی بە وشەی ﴿النَّاسُ﴾ ترساندنەکەی بە گەورە پیشان دا و دای بە گوێیاندا. هەروەها بە ﴿وَالْحِجَارَةُ﴾ش ترساندنەکەی لەسەر توند کردن. هەروەك سەرزەنشتی بەم وشەیە کرد. واتە ئەو شتەی کە ئومێدی سوود و ڕزگاریان لێ دەکەن - کە بتەکانە - دەبێتە ئامێری سزادانتان.

سەبارەت بە ڕستەی ﴿أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

ئەم شوێنە شوێنی ئەوەیە بوترێت: "أُعِدَّتْ لَكُمْ"، کەچی قورئان زۆربەی جار لە کۆتایی ئایەتەکاندا پوختە و دەستووری گشتی باس دەکات، تاکو بەوە ئاماژە بۆ پێشەکییە گەورەکەی بەڵگەی بڕیارەکە بکات (لە قیاسەکەدا). چونکە گوفتارەکە لە بنەڕەتدا ئاوایە: "أُعِدَّتْ لَكُمْ إِنْ كَفَرْتُمْ، لأَنَّهَا أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ" (دۆزەخ بۆ ئێوە ئامادە کراوە گەر کافر بن، چونکە بۆ کافران ئامادە کراوە). هەر لەبەر ئەوەشە کە "ئیسمی زاهیر" (الکافرین) لە شوێنی جێناوی (کُم)دا دانراوە.

ڕابوردوویی فیعلی ﴿أُعِدَّتْ﴾یش ئاماژەیە بۆ "بوون"ی دۆزەخ لە ئێستادا، وەك پێشتر باس کرا.

* * *

---

(١) واتە وشەی ﴿الَّتِي﴾ لێرەدا بە واتای "ئەو ئاگرەی" دێت. کەواتە دەبێ بزانرێت مەبەست کام ئاگرەیە؟ دانەر ڕوونی کردەوە کە پێشتر ئایەتی: ﴿ناراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ نازڵ بووە، کەواتە ئەوان دەزانن مەبەست کام ئاگرەیە. (وەرگێڕ)

وأما توصيفُها بـ﴿الَّتِي﴾ الموصولةِ مع أنَّ مِن شأنِها أنْ تكونَ معلومةً أوّلاً؛ فلأجْلِ نزولِ: ﴿ناراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَة﴾ (التحريم: ٦) قبلَ هذه الآيةِ، فالمخاطَبون قد سمِعُوا تلك، فالموصوليةُ في موقعِها.

وأما ﴿وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ فالغَرَضُ كما مرَّ آنفاً الترهيبُ، والترهيبُ يؤكَّدُ بالتهويلِ والتشديدِ..

فهوّلَ بلفظِ ﴿النَّاسُ﴾ كما قرعَ به، وشدَّدَ بـ﴿وَالْحِجَارَةُ﴾ كما وَبَّخَ بها. أي ما ترجُون منه النفعَ والنجاةَ وهو الأصنامُ يصيرُ آلةً لتعذيبِكم.

وأما جملةُ ﴿أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾..

فاعلمْ أنَّ الموضعَ موضعُ "أُعِدَّتْ لكم"، لكنَّ القرآنَ يذكُرُ الفذلكةَ والقاعدةَ الكلِّيةَ في الأغلبِ في آخِرِ الآياتِ ليشيرَ إلى كُبرى دليلِ الحُكمِ؛ إذ أصلُ الكلامِ:

"أُعِدَّتْ لكم إنْ كفرتُم، لأنّها أُعِدَّتْ للكافرين"..

فلهذا أُقيمَ المَظهَرُ مقام المضمَرِ..

وأمّا ماضيةُ ﴿أُعِدَّتْ﴾ فإشارةٌ كما مرَّ إلى وجودِ جهنّمَ الآنَ.

***

﴿وَبَشِّرِ الَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِنْ ثَمَرَةٍ رِزْقاً قَالُواْ هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِنْ قَبْلُ وَأُتُواْ بِهِ مُتَشَابِهاً وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ (البقرة: ٢٥)

بزانە کە: هۆنینی ئەم ئایەتەش - بە وێنەی دەستە خوشکەکانی - لە سێ ڕووەوەیە:
هۆنینی هەمووی لە ڕشتەی ئەوانەی پێش خۆیدا و، هۆنینی ڕستەکان لەگەڵ یەکتردا و، هۆنینی شێوەی پێکهاتنیان.

سەبارەت بە یەکەمیان، ئەوا بزانە کە دەرەنجام و واتاکانی ئەم ئایەتانە چەند پەیوەندییەکی جیاجیایان لەگەڵ ئایەتەکانی پێشوودا هەیە و، چەند هێڵێکی جیاوازیش لەمانەوە بەرەو ڕستەکانی پێش خۆیان کێشراون.

ئایا نابینی کە قورئان کاتێ لە سەرەتای سوورەتەکەدا سەنای خۆی کرد و، مەدحی ئیماندارانی بە "ئیمان" و "کردەوەی چاك" پێش چاو خست، چۆن بەم ئایەتەش ئاماژەی بۆ ئەنجامی ئیمان و بەروبوومی کردەوەی چاك کرد؟

هەروەها کاتێ زەمی کافرانی کرد و لە خراپەی دووڕووەکان دوا و، ئەو ڕێگایەی ئەوانی ڕوون کردەوە کە بەرەو بەدبەختیی هەمیشەیی دەیانبات، بەم ئایەتەش ئاماژەی دا بە ڕووناکیی بەختەوەریی هەمیشەیی و، پیشانی دان، تاکو بە لەدەستچوونی ئەم نیعمەتە هەرە مەزنە، پەژارە لەسەر پەژارەیان بۆ زیاد بکات؟

پاشان کاتێ بە تەکلیفی ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ﴾ ئەرکی پێ سپاردن - لە کاتێکدا کە "تەکلیف" قورسی و ئەرك و وازهێنانی تێدایە لە چێژە حازرییەکان - ئەوا بەم ئایەتە دەرگای چێژەکانی ئەودنیای بۆ کردنەوە و پیشانی دان، تاکو دەروونەکان ئاسوودە و دڵنیا بکات.

﴿وَبَشِّرِ الَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِنْ ثَمَرَةٍ رِزْقاً قَالُواْ هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِنْ قَبْلُ وَأُتُواْ بِهِ مُتَشَابِهاً وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ (البقرة: ٢٥)

فاعلم أنَّ نظمَ هذه الآيةِ كأخواتها بثلاثةِ وجوهٍ: نظمُ المجموعِ بما قبلَه، والجُمَلِ بعضِها مع بعضٍ، والهيئاتِ.

أما الأوّلُ: فاعلم أنَّ لمآلِها ارتباطاتٍ متفاوتةً مع الآيات السابقةِ، وخطوطاً ممتدةً بالاختلاف إلى الجمل السالفةِ..

ألا ترى أنَّ القرآنَ لَمّا أثنَى في رأس السورةِ على نفسِه وعلى المؤمنين بالإيمان والعملِ الصالحِ، كيف أشارَ بهذه الآيةِ إلى نتيجةِ الإيمانِ وثمرةِ العملِ الصالحِ.

وكذا لَمّا ذمَّ الكفارَ وشنَّعَ على المنافقين وبيَّنَ طريقَهم المنجَرَّ إلى الشقاوة الأبديةِ، لوَّحَ بهذه الآيةِ إلى نور السعادةِ الأبديةِ، فأراهم ليزيدوا حَسْرةً على حَسرةٍ بفواتِ هذه النعمةِ العُظمَى..

ثم لما كلّفَ بـ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ﴾ - مع أنَّ في التكليف مشقّةً وكُلفَةً وتركَ اللذائذِ العاجلةِ - فتَحَ لهم أبوابَ الآجلةِ، فأراهم بهذه الآيةِ تطميناً لنفوسِهم وتأميناً لهم.

پاشان دوای چەسپاندنی ئەو "تەوحید"ەی کە یەکەم پایەکانی ئیمان و بناغەی تەکلیفە، بەم ئایەتە و بە پیشاندانی بەهەشت و بەختەوەریی هەمیشەیی، بەروبوومی تەوحید و ناونیشانی میهرەبانی و پێشەکیی ڕەزامەندیی خۆی بە ڕاشکاوی باس کرد.

پاشان دوای ئەوەی کە بە فەرمایشتی ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ...﴾ "پێغەمبەرێتی"ی بەهۆی ئیعجازەوە چەسپاند، کە دووهەم پایەی ئیمانە، بەم ئایەتە و بەوەی پێش خۆیشی، ئاماژەی بە کارمەندیی پێغەمبەرێتیی و، ئەرك لە ئەستۆ بوونی پێغەمبەر کرد، کە بریتییە لە ڕاگەیاندنی هەڕەشە و مژدەدان لەسەر زمانی قورئانەوە.

پاشان دوای ئەوەی کە لە ئایەتە نزیکەکەی پێش خۆیدا هەڕەشە و ترساندنی ئاراستە کرد، بەم ئایەتەش بەڵێن و مژدەی ڕاگەیاند، لەو ڕووەوە کە "دژایەتی" لە نێوان دوو شتدا یەکێکە لە "پەیوەندی"یەکان.

هەروەها یەکێ لەو شتانەی کە "دەروون" ملکەچ دەکات و، درێژە بە گوێڕایەڵی دەدات و، "ویژدان" دەکات بە فەرمانبەرداری فەرمانی "ژیری": وروژاندنی هەستی ترس و هەستی شەوقە پێکەوە لە ڕێی کۆکردنەوەی "خولیاندن" و "ترساندن". چونکە بڕیار و فەرمانی "ژیری" شتێکی کاتییە، کەواتە پێویست دەکات کە بزوێنەرێکی فەرماندەری بەردەوام لە "ویژدان"دا هەبێت..

هەروەها کاتێ قورئان بە ئایەتی پێشوو ئاماژەی بە یەکێك لە دوو کەرتەکەی ڕۆژی دوایی دا[1]، بەم ئایەتەش کەرتەکەی تری تەواو کرد، کە سەرچاوەی بەختەوەریی هەمیشەییە..

هەروەها لەبەر ئەوەی لەوێ بە وشەی "النار" ئاماژەی بە "دۆزەخ" دا، لێرەدا بە ڕاشکاوی باسی "بەهەشت"ی کرد.

پاشان بزانە کە: بەهەشت و دۆزەخ دوو بەری درەختی بەدیهاتووانن کە هەتا ئەبەد شۆڕبوونەتەوە و، دوو کۆتا ئەنجامی زنجیرەی بوونەوەرانن و، دوو گەنجینەن بۆ تێدا ڕۆکردنی بوونەوەران و، دوو گۆمن بۆ ئەو بوونەوەرانەی کە هەتا ئەبەد خوڕ دەبنەوە.

بەڵێ، بوونەوەران بە جووڵەیەکی توند ڕادەوەشێنرێن و تێکەڵ بە یەکتر دەبن، دوای ئەوە بەهەشت و دۆزەخ دەردەکەون و پڕ دەبن.

---

(١) کە بریتی بوو لە "دۆزەخ" بە ئاماژەی: ﴿فَاتَّقُوا النَّارَ﴾..الخ. (وەرگێڕ)

ثم لَمّا أثبتَ التوحيدَ - الذي هو أوّلُ أركانِ الإيمانِ؛ الذي هو أساسُ التكليفِ - صرَّحَ في هذه الآيةِ بثمرة التوحيدِ وعنوانِ الرَّحمةِ وديباجةِ الرِّضاءِ بإراءةِ الجنةِ والسعادة الأبديةِ.

ثم لَمّا أثبتَ النبوّةَ - ثانيةَ أركانِ الإيمانِ - بالإعجاز بقولِه: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ...﴾ الخ، أشارَ بهذه مع المطويِّ قبلَها إلى وظيفة النبوّةِ ومكلّفيَّةِ النبيِّ وهي الإنذارُ والتبشيرُ بلسان القرآنِ.

ثم لَمّا أوعدَ وأرهَبَ وأنذرَ في سابقتِها القريبةِ، وعدَ ورغّبَ وبشّرَ بهذه الآيةِ بسرِّ أنَّ التضادَّ مناسبةٌ..

وأيضاً أنَّ الذي يُطيِّع[1] النفسَ ويُديمُ الإطاعةَ ويصيِّرُ الوجدانَ مُطيعاً لحُكم العقلِ، تهييجُ حسِّ الخوفِ وحسِّ الشوقِ معاً، بجَمعِ الترغيبِ والترهيب؛ إذ حُكمُ العقلِ وأمرُه موقّتٌ، فلابدَّ مِن وجودِ محرِّكٍ آمرٍ دائميٍّ في الوجدانِ..

وكذا لَمّا أشارَ بالسابقة إلى أحدِ شِقَّي الآخرةِ كمَّلَ بهذه الآيةِ الشِّقَّ الآخَرَ وهو منبعُ السعادةِ الأبديةِ..

وكذا لَمّا لوَّحَ هناك بالنار إلى جهنَّمَ صرَّحَ هنا بالجنةِ.

ثم اعلمْ أنَّ الجنةَ وجهنمَ ثمرتان تدَلّتا إلى الأبدِ مِن شجرةِ الخِلقة، ونتيجتان لسلسلةِ الكائناتِ، ومخزنان لانصِبابِ الكائناتِ، وحوضان للكائنات الجاريةِ إلى الأبدِ.

نعم، تتمخَّضُ الكائناتُ وتختلِطُ بحركةٍ عنيفةٍ فتتظاهَرُ الجنةُ وجهنمُ فتمتلئان.

---

(١) يطيِّع، يطوِّع أي يجعلها مطيعة. (المؤلف)

ڕوونکردنەوەی ئەمەش بەم جۆرەیە کە:

کاتێ خوای گەورە لەبەر چەندین حیکمەتی زۆری هێندە ورد کە ژیرییەکان نایانبینن، ویستی جیهانێك بۆ تاقیکردنەوە دابهێنێت و، لەبەر چەند دانستێك ئەو جیهانەش ئالوگۆڕی بەسەردا بێت، ئەوا شەڕی تێکەڵ بە خێر کرد و، زیانی خستە ناو سوودەوە و، ناشیرینیی تێهەڵکێشی جوانی کرد و پەیوەستی کردن بە دۆزەخەوە (واتە شەڕ و زیان و ناشیرینی) و، بەوان یارمەتیی بە دۆزەخ گەیاند. جوانی و کەماڵاتەکانیشی دایە بەر هەتا لە بەهەشتدا دەربکەون..

هەروەها کاتێ ویستی گرۆی مرۆڤ تاقی بکاتەوە و، پێشبڕکێ بخاتە نێوانیانەوە و، لەم خانەی تاقیکردنەوەیەدا جیاوازی و گۆڕانکارییەکان هەبێت، ئەوا خراپەکارانی تێکەڵ بە چاکەکاران کرد..

پاشان کاتێ تاقیکردنەوەکە کۆتایی پێ هات و، ویستی خوا پەیوەندیی بە هەمیشەیی ئەوانەوە کرد، ئەوا خراپەکارانی کردە ئاراستەکراوی گوفتاری: ﴿وَامْتَازُوا الْيَوْمَ أَيُّهَا الْمُجْرِمُونَ﴾ (يس: ٥٩) و، چاکەکارانیشی کردە ئاراستەکراوی لوتف و ڕێزلێنانی: ﴿فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ﴾ (الزمر: ٧٣)..

ئیتر دوای ئەوەی کە هەردوو جۆرەکە لێك جیابوونەوە، ئەوا بوونەوەران پاڵفتە بوون و، ماددەی زیان و شەڕ لە توخمی سوود و خێر و کەماڵ هاتە دەر و لایەکی جیای بۆخۆی هەڵبژارد.

دەرەنجام:

گەر بە وردی سەیری بوونەوەران بکرێت، ڕێ لە دوو توخمی بنەڕەتی و دوو دەماری درێژ دەکەوێت. کە ئەگەر بەدەست بێن و هەمیشەیی بن، دەبنە بەهەشت و دۆزەخ.

## پێشەکی

ئەم ئایەتە لەگەڵ ئەوەی پێش خۆیدا، ئاماژەن بۆ قیامەت و حەشر. خولگەی تێڕوانین لەم مەسەلەیەشدا چوار خاڵە:

یەکەمیان: گونجاویی وێرانبوون و نەمانی جیهان.

دووهەمیان: ڕوودانی.

**وإيضاحُه:**

هو أنَّ اللهَ جلَّ جلالُه لمّا أرادَ أن يُبدِعَ عالَماً للابتلاء والامتحانِ لِحِكَمٍ كثيرةٍ تدِقُّ عن العقولِ، وأرادَ تغييرَ ذلك العالَمِ وتحوُّلَه لِحِكَمٍ؛ مزجَ الشرَّ بالخيرِ وأدرجَ الضَّرَّ في النفعِ، وأدمجَ القُبحَ في الحُسْنِ؛ فوصَلها بجهنمَ وأمدَّها بها. وساقَ المحاسنَ والكمالاتِ تتجَلَّى في الجنةِ..

وأيضاً لمّا أرادَ تجربةَ البشرِ ومسابقتَهم، وأرادَ وجودَ اختلافاتٍ وتغيّراتٍ فيهم في دار الابتلاءِ خلَطَ الأشرارَ بالأبرار..

ثم لمّا انقضَى وقتُ التجربةِ وتعلّقتْ الإرادةُ بأبديَّتِهم جعَلَ الأشرارَ مظهرَ خطابِ: ﴿وَامْتَازُوا الْيَوْمَ أَيُّهَا الْمُجْرِمُونَ﴾ (يس: ٥٩) وصيَّرَ الأبرارَ مظهرَ تلطيفٍ وتشريفِ: ﴿فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ﴾ (الزمر: ٧٣)..

ولمّا امتازَ النوعان تصفَّت الكائناتُ فانسلَّتْ مادةُ الضَّرِّ والشَّرِّ عن عنصر النفعِ والخيرِ والكمالِ فاختارتْ جانباً.

**والحاصلُ:**

أنَّه لو أُمْعِنَ النظرُ في الكائنات صودفَ فيها عنصران أساسان وعِرقان ممتدان إذا تحصَّلا وتأبّدا صارا جنةً وجهنمَ.

## مقدمة

هذه الآيةُ مع ما قبلَها إشارةٌ إلى القيامةِ والحشرِ. فمدارُ النظرِ في هذه المسألةِ أربعُ نُقَطٍ:

إحداها: إمكانُ خرابِ العالَمِ وموتِه.

والثانيةُ: وقوعُه.

سێهەمیان: نۆژەنکردنەوە و زیندووکردنەوە.

چوارەمیان: ڕوودانی.

سەبارەت بە گونجاویی مردنی بوونەوەران، ئەوا بزانە کە:

هەر شتێك پاسای "ڕەخسین"(التكامل) بیگرێتەوە، نەشونمای تێدایە و، تەمەنێکی سروشتیی هەیە و، لە فەرمانی مردن ڕزگاری نابێت، بە بەڵگەی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بۆ زۆربەی تاکەکانی جۆرەکان.

جا هەروەك مرۆڤ جیهانێکی بچووکە و، لە تیاچوون ڕزگاری نابێت، بە هەمان جۆر جیهانیش مرۆڤێکی مەزنە و، هەرگیز لەدەست مردن دەرباز نابێت..

هەروەك درەخت نوسخەیەکە لە بوونەوەران؛ نەمان و هەڵوەشانی لە دوایە..

زنجیرەی بوونەوەرانیش لە درەختی بەدیهاتوواندا بە هەمان جۆرە؛ لەو دەستی وێرانکارییە ڕزگاری نابێت کە بۆ نۆژەنکردنەوەیە.

خۆ ئەگەر بە ویستی ئەزەلیی خوای گەورە، پێش تەواوبوونی تەمەنی فیتریی جیهان، زریانێك یاخود نەخۆشییەکی دەرەکی نەیەتە ڕێی بوونەوەران و، پێش تەواوبوونی ئەو تەمەنە فیترییە، بەدیهێنەر خۆی بوونەوەران وێران نەکات، ئەوا بە بێگومانی و هەرچۆنێك بووە، تەنانەت بە حسابێکی زانستی، ئەو ڕۆژە دێتە پێشەوە کە: ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ * وَإِذَا النُّجُومُ انْكَدَرَتْ﴾ (التكوير: ١-٢) و ﴿إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ﴾ی (الإنشقاق:١) تێدا بێتەدی..

ئیتر لرخەی سەرسووڕهێنی سەرەمەرگی مرۆڤە گەورەکە لە بۆشایی ئاسماندا بە دەنگێکی یەکجار گەورە دەردەکەوێت.

سەبارەت بە ڕوودانیشی، ئەوا: بە کۆدەنگیی هەموو ئایینەکانی هاتوو لە ئاسمان و، بە شایەتیدانی هەموو فیترەتێکی ساغ و، بە ئاماژەی گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕی هەموو بوونەوەرانە.

ئەگەر دەتەوێت سەرەمەرگی جیهان و لرخەی ئەو سەرەمەرگە وێنا بکەیت، ئەوا بزانە کە بوونەوەران بە سیستەمێکی باڵای ورد بە یەکەوە پەیوەستن و، دەستیان لە چەندین پەیوەندیی سەرسووڕهێنەر گیر کردووە. جا ئەگەر یەك جەستەی تەنە باڵاکان

والثالثةُ: التعميرُ والإحياءُ.

والرابعةُ: وقوعُه.

أما إمكانُ موتِ الكائناتِ:

فاعلم أنَّ الشيءَ الداخلَ تحت قانونِ التكامُلِ فيه نشوءٌ ونماءٌ.. فله عمرٌ طبيعيٌّ.. فله أجَلٌ فطريٌّ؛ لا يخلَصُ من حُكم الموتِ؛ بدليل استقراءِ أكثرِ أفرادِ الأنواعِ..

فكما أنَّ الإنسانَ عالَمٌ صغيرٌ لا خلاصَ له مِن الخرابيةِ؛ كذلك العالَمُ إنسانٌ كبيرٌ لامناصَ له مِن الموتِ البتَّةَ..

وكما أنَّ الشجرَ نسخةٌ من الكائنات يعقِبُها التخريبُ والانحلالُ..

كذلك سلسلةُ الكائناتِ مِن شجرةِ الخلقةِ لا مناصَ لها مِن يدِ التخريبِ للتعمير.

ولئن لم يَعرضْ عاصفةٌ أو مَرَضٌ خارجيٌّ - بالإرادة الأزليةِ - قبلَ العمرِ الفطريِّ، ولم يخرِّبْها صانعُها قبلَه، لَيَجيءُ بالضرورةِ وعلى كلِّ حالٍ حتى بالحسابِ الفنِّيِّ يومٌ يتحقَّقُ فيه: ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ * وَإِذَا النُّجُومُ انْكَدَرَتْ﴾ (التكوير: ١-٢) و﴿إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ﴾ (الانشقاق: ١) فيتظاهَرُ في الفضاء سكراتُ الإنسانِ الكبيرِ بخَرْخَرَةٍ[1] عجيبةٍ وصوتٍ هائلٍ.

أما وقوعُه: فبإجماعِ كلِّ الأديانِ السماويةِ، وبشهادةِ كلِّ فطرةٍ سليمةٍ، وبإشارةِ تغيُّرِ وتبدُّلِ وتحوّلِ الكائناتِ.

وإنْ شئتَ أنْ تتصورَ سَكَراتِ العالَمِ وخَرْخَرَتَه فاعلمْ أنَّ الكائناتِ قد ارتبطتْ بنظامٍ عُلويٍّ دقيقٍ، واستمسَكَتْ بروابطَ عجيبةٍ، فإذا صارَ جسمٌ مِن الأجرام العُلويةِ مظهرَ

---

(١) خرخرة: صوت النائم، استعمله للمحتضر. (ش)

گوفتاری: "کُن" یاخود "لە تەوەری خۆت دەربچۆ"ی ئاراستە بکرێت، ئەوا دەبینیت جیهان دەکەوێتە سەرەمەرگ و، ئەستێرەکان دەکەون بە یەکدا و، تەنەکان لەناو یەکتردا شەپۆل دەدەن و، دەنگ و گرمەیان بەناو بۆشایی ناکۆتادا بڵاو دەبێتەوە و، دەکێشن بە دەموچاوی یەکتردا و، پزیسکی هێندەی ئەم زەوی‌یەمان تەنانەت گەورەتریش دەهاوێژن..

ئەی چی دەڵێیت بەرامبەر لرخەی مردنێك کە دەنگەکەی دەرەنجامی تەقینەوەی ملیۆنەها بۆمبایە کە بچووکترینی گوللە تۆپیان لە زەوی گەورەترە؟

بەم مردنە، بەدیهاتووان دەشڵەقێن و، بوونەوەران لە یەکتری جیا دەبنەوە. ئیتر "دۆزەخ" بە هۆزەکەی و ماددەکەیەوە جیا دەبێتەوە و، "بەهەشت"یش دەردەکەوێت و دام و دەستەکەی لە نێوان توخمەکانی خۆی دەردێنێت و لای خۆی کۆیان دەکاتەوە.

* ئەگەر وتت:

بۆچی بوونەوەران (لەم دنیایەدا) کاتین و، ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت و، وێران دەکرێن.. پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا دەکرێنە هەمیشەیی و، جێگیر و، دامەزراو؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

کاتێ "دانست" و "چاودێری"ی ئەزەلیی خوای گەورە خواستیان لەسەر ئەوە بوو کە تاقیکردنەوە بێتە کایەوە و، توانا و لێهاتنەکان نەشونما بکەن و، قابیلییەتەکان دەربکەون و، ڕاستی‌یە نیسبی‌یەکان پەیدا ببن کە لە ڕۆژی دواییدا دەبنە چەندین حەقیقەتی ڕاستەقینە و، پلە گوێڕەییەکان و چەندین حیکمەتی زۆر هەبن کە ژیری‌یەکان پەی نابەن پێیان..

ئەو کاتە، بەدیهێنەری مەزن سروشتەکانی تێکەڵ بە یەکتر کرد و، زیانەکانی خستە ناو سوودەکان و، شەڕەکانی کردە تێهەڵکێشی خێرەکان و، ناشیرینی‌یەکانی لەگەڵ جوانی‌یەکاندا کۆکردەوە. ئیتر دەستی قەدەر دژەکانی لەگەڵ یەکتردا هەڵشێلا و، بوونەوەرانی کردە شوێنکەوتەی یاسای گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕ و بەرەو کامڵ چوون..

ئنجا کاتێ کە دەرگای ئیمتیحان داخرا و، کاتی تاقیکردنەوە کۆتایی پێ هات و، وەختی دروێنەی داهات هاتە پێشەوە، ئەوا بەدیهێنەر بە چاودێریی خۆی ویستی لەسەر ئەوە دەبێت کە دژە تێکەڵبووەکان بۆ هەتاهەتایی پاڵفتە بکات و، هۆکارەکانی گۆڕانکاری لابدات و، ماددەکانی جیاوازییش پەرتەوازە بکات..

خطابِ "كُن" أو "اخْرُج عَنْ مِحْورِكَ" ترى العالمَ يشْرَعُ في السَّكَرات، وترى النجومَ تتصادمُ، وتتلاطمُ الأجرامُ فترعِدُ وتصيحُ في الفضاء الغير المتناهي، ويضربُ بعضٌ وجهَ بعضٍ، وترمِي بشَررٍ كأرضِنا هذه بل أكبرَ..

فكيف أنت بخَرْخَرَةِ موتٍ صوتُها محصَّلُ ملايينِ مَرامي مدافعَ رصاصتُها الصُغرَى أكبرُ مِن الأرضِ؟

فبهذا الموتِ تتمخَّضُ الخِلقةُ وتتميَّزُ الكائناتُ فتمتازُ جهنمُ بعشيرتِها ومادَّتِها، وتتجَلَّى الجنةُ جامعةً لطائفتِها مستمِدَّةً مِن عناصرِها.

* فإن قلتَ:

لِمَ كانت الكائناتُ مُغيَّرةً موقّتةً تخرُبُ ثم تصيرُ يومَ القيامةِ مؤبَّدةً مُحكَمةً ثابتةً؟

قيل لك:

إنَّ الحكمةَ والعنايةَ الأزليَّتَين لما اقتضتا التجربةَ والابتلاءَ، والنشوءَ والنماءَ في الاستعداداتِ، وظهورَ القابلياتِ، وظهورَ الحقائقِ النسبيةِ التي تصيرُ في الآخرة حقائقَ حقيقيةً، ووجودَ مراتبَ نسبيةٍ، وحِكماً كثيرةً لا تدرِكُها العقولُ؛ جعلَ الصانعُ جلَّ جلالُه الطبائعَ مُختلَطةً، والمضارَّ ممزوجةً بالمنافع، والشرورَ متداخلةً بين الخيرِ، والمقابحَ مجتمعةً مع المحاسنِ، فخمَّرَتْ يدُ القدرةِ الأضدادَ تخميراً، فصيّرت الكائناتِ تابعةً لقانون التبدُّلِ والتغيُّرِ والتحوُّلِ والتكاملِ..

فلمّا انسدَّ ميدانُ الامتحانِ وانقضَى وقتُ الابتلاءِ وجاءَ وقتُ الحصادِ؛ أرادَ الصانعُ جلَّ جلالُه بعنايتِه تصفيةَ الأضدادِ المختلطةِ للتأبيد، وتمييزَ أسبابِ التغيُّرِ، وتفريقَ موادِّ الاختلافِ..

ئیتر "دۆزەخ" بە جەستەیەکی توندوتۆڵەوە پەیدا دەبێت و گوفتاری ﴿وَامْتَازُوا﴾ی تێدا دەردەکەوێت..

"بەهەشت"یش بە جەستەیەکی هەتاهەتایی و بنیاتنراو بە بناغەکانیەوە دەردەکەوێت، بە هۆی نهێنیی ئەوەی کە بوونی پەیوەندی مەرجی ڕێکوپێکییە و، ڕێسایش هۆکاری بەردەوامییە..

پاشان بەدیهێنەری مەزن بە توانستی کاملی خۆی، بوونێکی بنیات نراوی ئەوتۆ بە دانیشتووانی ئەم دوو خانە هەمیشەییە دەبەخشێت کە شیتەڵ بوون و گۆڕانیان بەسەردا نایەت.

ئەوەش هەیە کە گۆڕانکاریی ئێرە، کە سەری لە نەمانەوە دەردەچێت، لەبەر جیاوازیی ڕێژەی نێوان پێکهاتن و ئەوەیە کە شی دەبێتەوە. بەڵام لەوێ، لەبەر جێگیربوونی ڕێژەکە، دەکرێ گۆڕانکاری هەبێت، بە بێ ئەوەی دەرەنجامەکەی شیبوونەوەی لێ بکەوێتەوە.

سەبارەت بە خاڵی سێهەم و چوارەمیش، مەبەستم گونجاویی نۆژەنکردنەوە و حەشر و، ڕوودانیەتی، ئەوا بزانە:

لەبەر ئەوەی دروست نییە کە "تەوحید" و "پێغەمبەرێتی" تەنها لە ڕێی بەڵگەی نەقلییەوە[1] بچەسپێنرێن، چونکە ئەو کاتە "دەور" ڕوودەدات، ئەوا قورئان ئاماژەی بۆ بەڵگە عەقلییەکان کردووە لەسەر ئەو دووانە.

بەڵام "حەشر" دەتوانرێت بە هەردوو جۆری بەڵگەی عەقلی و نەقلی بچەسپێنرێت.

سەبارەت بە "بەڵگە عەقلی"یەکە، سەردانی ئەو باسە بکە لە تەفسیری ﴿وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾دا کە بە گوێرەی توانا ڕوونمان کردووەتەوە. پوختەکەی ئەوەیە کە:

"ڕێسا" و "میهرەبانی" و "نیعمەت" کاتێ دەبنە ڕێسا و میهرەبانی و نیعمەت کە "حەشر" بێتە کایەوە.

---

(١) چونکە ڕاستیی بەڵگە نەقلییەکان (قورئان و فەرموودە) پەیوەستە بە ڕاستی و دروستیی "پێغەمبەرێتی". جا ئەگەر "پێغەمبەرێتی"ش بە بەڵگەی نەقلی بچەسپێنرێت، ئەوا مەحاڵێکی لێ دەکەوێتەوە کە بریتییە لە "دەور و تەسەلسول". لەبەر ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ بەڵگە عەقلییەکان کردووە لەسەر "تەوحید" و "پێغەمبەرێتی". (ت)

فتحصُلُ جهنمُ بجسمٍ مُحكَمٍ مَظهراً لخطابِ: ﴿وَامْتَازُوا﴾ وتتجَلَّى الجنةُ بجسمٍ مؤبّدٍ مُشيَّدٍ مع أساساتِها.. بسرِّ أنَّ المناسبةَ شرطُ الانتظامِ، والنظامَ سببُ الدوامِ.

ثم إنَّه تعالى أعطَى بقدرتِه الكاملةِ لساكني هاتين الدارَين الأبديتَين وجوداً مُشيّداً لا سبيلَ للانحلال والتغيُّرِ إليه..

على أنَّ التغيُّرَ هنا - المنجَرَّ إلى الانقراضِ - إنما هو بتفاوتِ النسبةِ بين التركيبِ وما يتحلَّلُ، وأما هناكَ فلِاستقرار النسبةِ يجوزُ التغيُّرُ بلا انجرارٍ إلى الانحلالِ.

وأما النقطةُ الثالثةُ والرابعةُ:

أعني إمكانَ التعميرِ والحشرِ ووقوعِهما:

فاعلمْ أنَّ التوحيدَ والنبّوةَ لمّا لم يصحْ إثباتُهما بالدليل النقليِّ فقط للزومِ الدَّورِ[1]، أشارَ القرآنُ إلى الدلائل العقليةِ عليهما.

أما الحشرُ فيجوزُ إثباتُه بالعقل والنقلِ:

أما العقليُّ فراجعٌ إلى ما بيَّنا بقَدْرِ الطاقةِ في تفسيرِ:

﴿وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾.

حاصلُه:

أنَّ النظامَ والرحمةَ والنعمةَ إنما تكونُ نظاماً ورحمةً ونعمةً إنْ جاءَ الحشرُ..

---

(١) حيث إن صحة الدلائل النقلية (القرآن والحديث) مرتبطة بصحة النبوة وصدقها، فإذا ما أثبتت النبوة أيضاً بالدلائل النقلية، يلزم المحال وهو الدور والتسلسل، لذا أشار القرآن إلى الدلائل العقلية عليهما. (ت)

"بەڵگە نەقلی"یەکەش، قسەی هەموو پێغەمبەرانە - درووديان لەسەر بێت - هاودەم لەگەڵ بڕیاری قورئاندا لە بارەی ڕوودانیەوە.

بۆ ئەو "بەڵگە نەقلی"یەش کە هێما بۆ "بەڵگەی عەقلی" دەکات، سەردانی ئەم شوێنەی تەفسیری "فەخرەدینی ڕازی بکە"[1]، چونکە ئەو ئایەتانەی دیاری کردووە کە "حەشر" دەچەسپێنن.

دەرەنجام:

هەرکەسێك سەرنج لە هاوشێوەکانی "حەشر" بدات لە زۆربەی "جۆرەکان"ی بوونەوەراندا، لە ڕێی نیشانە جیاجیاکانەوە پەی بە بوونی حەشری جیسمانی و بەختەوەریی هەمیشەیی دەبات.

سەبارەت بە هۆنینی ڕستەکانی ئەم ئایەتەش لەگەڵ یەکتردا، ئەوا بزانە:

ئەو ڕشتەیەی کە گەوهەری ڕستەکان و زنجیرەی ئەم ئایەتەی تێدا هۆنراوە، بریتییە لەوەی کە "بەختەوەریی هەمیشەیی" دوو بەشە:

یەکەمە باشترەکەیان: ڕەزامەندیی خوای گەورە و، لوتفی و، دەرکەوتنی و، نزیکییەتی.

دووهەمیان: بەختەوەریی جیسمانییە، کە بریتییە لە:

نیشتەجێ و خۆراك و نیکاح و، تەواوکاری هەموویشیان کە بەردەوامی و مانەوە و نەمرییە.

پاشان بەشەکانی یەکەم پێویستی بە درێژە پێدان نییە، یاخود درێژە پێدان هەڵناگرێت.

بەڵام بەشەکانی دووهەم، ئەوا:

نیشتەجێ: خۆشترینیان ئەوەیە کە ئاو بەناو ڕووەکەکانیدا بڕوات. ئایا نابینی کە ئیلهامبەخشی شیعر و، ڕێژەری عیشق لەناو دڵاندا، خوشە و خوڕەی ئاوە و، فیشکەی ڕووبارەکانە لە ژێر کۆشك و نێوان باخەکاندا؟

---

(١) بڕوانە تەفسیری: "مفاتیح الغیب"ی ئیمامی ڕازی ١/٣٩٨. چونکە لەوێ شوێنەکانی ئەو ئایەتانەی باس کردووە کە بەڵگەن لەسەر "حەشر".

وأما النقليُّ فقَوْلُ كلِّ الأنبياءِ، مع حُكمِ القرآنِ المعجِزِ بوقوعِه.

وأما النقليُّ مع الرَّمزِ للعقليِّ فراجعْ هذا الموضعَ من تفسيرِ فخرِ الدينِ الرازيِّ[1]، فإنَّه عدّدَ الآياتِ المثبِتَةَ للحشرِ.

والحاصلُ:

أنَّه ما مِن مُتأمِّلٍ في نظائرِ وأشباهِ وأمثالِ الحشرِ في كثيرٍ مِن الأنواعِ إلّا ويتحدَّسُ مِن تفاريقِ الأماراتِ إلى وجود الحشرِ الجسمانيِّ والسعادةِ الأبديةِ.

أما نظمُ جُمَلِها بعضٍ مع بعضٍ، فاعلمْ أنَّ السِّلكَ الذي نُظِمَ فيه جواهرُ جُمَلِ هذه الآيةِ وسلسلتُها هي: أنَّ السعادةَ الأبديةَ قسمان:

الأوّلُ الأَوْلَى: رضاءُ الله تعالى وتلطيفُه وتجلّيه وقُربيتُه.

والثاني: السعادةُ الجسمانيةُ وهي بالمسكنِ والمأكَلِ والمنكَحِ ومتمّمُها ومكمّلُها جميعاً هو الدوامُ والخلودُ.

ثم إنَّ أقسامَ الأوّلِ مستغنيةٌ عن التفصيل أو غيرُ قابلة[2].

وأما أقسامُ الثاني:

فالمسكنُ: ألطفُه ما يجري الماءُ بين نباتاتِه؛ ألا ترى أنَّ مُلهِمَ الشِّعرِ ومُفيضَ العِشْقِ في القلوب إنما هو خَشْخَشَةُ[3] الماءِ وخريرُه، وكَشْكَشَةُ[4] الأنهارِ وصفيرُها تحت القصورِ وبين البساتين.

---

(١) انظر: مفاتيح الغيب للإمام الرازي ١/ ٣٩٨ فقد ذكر فيه مواضع الآيات الدالة على الحشر.

(٢) غير قابلة للتفصيل.

(٣) خشخشة :صوت السلاح أو الحلي عند اصطكاكه.

(٤) كشكشة: صوت جلد الحية حين المرور، استعمله المؤلف لصوت مرور الماء كالحية. (ش)

خواردنیش: ڕۆزی، لەبەر ئەوەی كە "مایەی بژێو"ە، كەماڵی چێژ لێ بردنی لەوەدایە كە مرۆڤ پێی ڕاهاتووە. لەبەر ئەوەش كە "میوە"یە، كەماڵی تام و چێژی – لە ڕوویەكەوە – لە نوێ بوونەوەیدایە. چونكە لەبەر پێ ڕاهاتن، پلەی بەرزیی نیعمەت و باشترینی بەسەر هاوشێوەیاندا دەزانرێت.

هەروەها یەكێك لە تەواوكارەكانی تام و چێژ لەوەدایە كە مرۆڤ بزانێت پاداشتی كردەوەكەیەتی..

یەكێكی تریان ئەوەیە كە سەرچاوە و گەنجینەكەی ئامادە و لە پێش چاودا بێت، تاكو چێژی دڵنیا بوون بێنەدی.

نیكاحیش: ئەوا بزانە كە یەكێك لە توندوتیژترینی پێداویستییەكانی مرۆڤ، بوونی دڵێكە لە بەرامبەر دڵی خۆیەوە بۆ خۆشەویستی بەخشین بە یەكتری و، گۆڕینەوەی عیشق لەگەڵ یەكتردا و، خەمڕەوێنی و، هاوبەشی لە چێژدا، تەنانەت بوونی هاوكارییش لە هاوشێوەی سەرسامی و بیركردنەوەدا..

ئایا نابینی گەر كەسێك شتێك ببینێت كە مایەی سەرسامیی بێت، یان بیر لە شتێكی سەرسووڕهێنەر بكاتەوە، بانگ لە كەسێكی تر دەكات – تەنانەت ئەگەر لە زەینیشدا بووە – تاكو لە هەڵگرتنی سەرسامییەكەدا یارمەتیی بدات؟!

پاشان ناسكترین و میهرەبانترین و گەرمترینی دڵان هی بەشی دووهەمە[1].

پاشان ئەو شتەی كە تەواوكاری ئاوێتەبوونە ڕۆحییەكە و، كامڵكاری خەمڕەوێنییە قەلبییەكە و، پاڵفتەكاری تێكەڵبوونە ڕواڵەتییەكەیە، پاك و خاوێنیی بەشی دووهەمە لە ڕەوشتە خراپەكان و پێشهاتە بێزلێكراوەكان.

* ئەگەر وتت:

"خواردن" بۆ مانەوەی "كەس"ە، چونكە بەهۆی "خواردن"ەوە نۆژەنكردنەوە لە جێی شیتەڵ بووەكاندا دەكرێت.. "نیكاح"یش بۆ مانەوەی "جۆر"ە. لە كاتێكدا كەسەكانی ئاخیرەت هەمیشەیین، ئاڵوگۆڕ و شیتەڵ بوونەوەیان تێدا ڕوو نادات، هەروەها وەچەكەوتنەوەش لە دوارۆژدا نییە؟

---

(١) لە وەرگێڕانە توركییەكەی مامۆستا "عەبدولمەجید نوورسی"دا هاتووە كە مەبەست لە بەشی دووهەم "ئافرەتان"ە. (وەرگێڕ)

والمأكلُ: الرزقُ. ولأنَّه "قوت" يكونُ كمالُ لذّتِه فيما حصلَ به الألفةُ والأُنسيةُ، ولأنَّه "تفَكُّهٌ" يكونُ كمالُ لذّتِه في التجدُّدِ من جهةٍ؛ إذ بحُكمِ المألوفيةِ يُعرَفُ درجةُ علوِّ النعمةِ وتفوُّقُها على نظيرِها.

وكذا مِن مكمِّلاتِ اللذةِ أنْ يَعْرِفَ أنّه جزاءُ عمله..

ومنها أنْ يكونَ منبعُه ومخزنُه حاضراً نُصْبَ العينِ لتحصُلَ لذةُ الاطمئنانِ.

وأما المنكَحُ: فاعلمْ أنَّ مِن أشدِّ حاجاتِ الإنسانِ وجودَ قلبٍ مقابلاً لقلبه لمداولة المحبةِ ومبادلةِ العِشْقِ والمؤانسةِ والتشارُكِ في اللّذّةِ، بل التعاونِ في أمثالِ الحَيرةِ والتفكُّر..

ألا ترى أنَّ مَن رأى ما يتحيّرُ فيه أو يتفكّرُ في أمرٍ عجيبٍ يدعو - ولو ذهناً - من يُعينُه في تحمُّلِ الحَيرةِ؟!

ثم إنَّ ألطفَ القلوبِ وأشفقَها وأحرَّها قلبُ القِسم الثاني.

ثم إنَّ مُتمِّمَ الامتزاج الروحيِّ ومكمِّلَ الاستيناسِ القلبيِّ، ومُصفِّيَ الاختلاطِ الصُّوريِّ كَوْنُ القسمِ الثاني مبرَّأةً ومُطهَّرَةً مِن الأخلاقِ السيِّئةِ والعوارضِ المنَفِّرةِ.

* فإنْ قلتَ:

إنَّ الأكلَ لبقاءِ الشّخصِ؛ إذ به يحصُلُ تعميرُ ما يتحلّلُ، وإنَّ النكاحَ لبقاءِ النوعِ، مع أنَّ الأشخاصَ في الآخرةِ مؤبّدون لا يقَعُ فيهم التحويلُ والانحلالُ، وكذا لا تناسُلَ في الآخرةِ؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

سوودەکانی "خواردن" و "نیکاح"، تەنها لە "مانەوە" و "وەچەخستنەوە"دا قەتیس نابن. بەڵکو هەر لەم جیهانی ئازارەدا چێژێکی گەورەیان تێدایە. ئیتر چۆن لە جیهانی چێژ و بەختەوەریدا چەندین چێژ و لەزەتی بلند و خاوێنیان تێدا نابێت؟

* ئەگەر وتت:

لەزەت لێرە دەرکردنی ئازارە؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

بەدەرنانی ئازار یەکێکە لە هۆکارەکانی چێژ و لەزەت..

هەروەها هەڵسەنگاندنی جیهانی هەمیشەیی بە پێوەری ئەم جیهانەی ئێرە خەملاندنێکە جیاوازیی ئەو دووانەی تێدا ڕەچاو نەکراوە. تەنانەت ڕێژەی جیاوازیی نێوان ئەم باخچەی "خورخور"[1]ە و ئەو بەهەشتە بلندە، هەمان ڕێژەی نێوان چێژەکانی ئەودنیا و هاوشێوەکانیانە لەم جیهانەدا. جا هەروەك بەهەشت بە چەندین پلەی ناکۆتا و بێ سنوور لە سەرووی ئەم باخچەیەوەیە، ئەمەش بە هەمان جۆرە.

ئیبن عەبباس - خوایان لێ ڕازی بێت - ئاماژەی بۆ ئەم جیاوازییە گەورەیە کردووە کاتێ وتوویەتی: "شتانی بەهەشت لە دنیادا هەر تەنها ناوەکانیان هەیە"[2]. واتە بەروبوومەکانی دنیا هەر ناوەکانیان لەوانەی بەهەشت دەچێت.

سەبارەت بە هەتاهەتایی و بەردەوامیی "چێژ"یش، ئەوا بزانە کە: "چێژ" کاتێ بە چێژی ڕاستەقینە دادەنرێت کە "نەمان" لێڵی نەکات. چونکە هەروەك دوورخستنەوەی ئازار "چێژ"ە، یاخود هۆکارێکە بۆی، بە هەمان جۆر نەمانی "چێژ"یش ئازارە، بگرە تەسەوورکردنی نەمانیشی هەر ئازارە!

تەنانەت کۆی شیعرەکانی عاشقە مەجازییەکان تەنها و تەنها گریان و ناڵەن لە دەست ئەم ئازارە و، دیوانی هەموو عاشقێکی ناحەقیقی (مەجازی)ش سەرتاپا گریان و هاوارە لەتاو ئەم ئازارەی کە هی تەسەوورکردنی نەمانی خۆشەویستە..

---

(١) باخچەی خورخور: لە داوێنی قەڵای "وان"ە و قوتابخانەکەی دانەری لێیە.

(٢) بڕوانە: تەفسیری ابن کثیر: ١/٦٣؛ تەفسیری قورتوبی: ١/٢٤٠؛ تەبەری: ١/١٣٥؛ فتح القدیر: ١/٥٥.

قيل لك:

إنَّ فوائدَ الأكلِ والنكاحِ ليستْ منحصِرةً في البقاءِ والتناسُلِ، بل فيهما لذةٌ عظيمةٌ في هذا العالَمِ الأَلَمِيِّ. وكيف لا يكونُ فيهما في عالَمِ السعادةِ واللّذّةِ لذّاتٌ عاليةٌ مُنـزَّهة؟

* فإنْ قلتَ:

إنَّ اللذةَ هنا دفعُ الألمِ؟

قيل لك:

إنَّ دفعَ الألم سببٌ من أسبابِ اللذةِ.. وأيضاً قياسُ العالَمِ الأبديِّ على هذا العالَمِ قياسٌ مع الفارقِ، بل إنَّ النسبةَ بين حديقةِ "خُورْخُورْ"[١] هذه وتلك الجنةِ العاليةِ هي النسبةُ بين لذائذِ الآخرةِ ونظائرِها في هذا العالَمِ. فكما تفُوقُ تلك الجنةُ على الحديقةِ بدرجاتٍ غيرِ محصورةٍ؛ كذلك هذه..

وإلى هذا التفاوتِ العظيمِ أشارَ ابنُ عباسٍ رضي الله تعالى عنهما بقوله: "ليسَ في الجنة إلّا أسماؤُها"[٢] أي ثمراتِ الدنيا.

أما الخلودُ ودوامُ اللذةِ، فاعلمْ أنَّ اللذةَ إنما تكونُ لذّةً حقيقيةً إنْ لم ينغِّصْها الزوالُ؛ إذ كما أنَّ دفعَ الألمِ لذةٌ أو سببٌ لها، كذلك زوالُ اللذّةِ ألمٌ بل تصوّرُ زوالِ اللذّةِ ألمٌ أيضاً. حتى إنَّ مجموعَ أشعارِ العُشّاقِ المجازيين إنما هي أنينٌ ونياحٌ من هذا الألم. وإنَّ ديوانَ كلِّ عاشِقٍ غيرِ حقيقيٍّ إنما هو بكاءٌ وعويلٌ من هذا الألمِ الناشئِ مِن تصوُّرِ زوالِ المحبوبِ..

---

(١) حديقة خورخور: مكان يقع تحت قلعة مدينة "وان" وفيها مدرسة المؤلف.

(٢) "ليس في الدنيا مما في الجنة إلا الأسماء" أو ألفاظ مقاربة والمعنى واحد. انظر تفسير ابن كثير ١/ ٦٣؛ تفسير القرطبي ١/ ٢٤٠؛ الطبري ١/ ١٣٥؛ فتاوى ابن تيمية ٣/ ٢٨؛ المطالب العالية لابن حجر برقم ٤٦٩٢؛ فتح القدير للشوكاني ١/ ٥٥.

بەڵێ، زۆرێك لە چێژە کاتی‌یەکان گەر نەمێنن، ئەوا چەندین ئازاری بەردەوام بەجێ دەهێڵن و، هەر کات مرۆڤ بیریان لێ بکاتەوە، "ئاخ! بە داخەوە!" لەسەر زاری هەڵدەقوڵێنن! کە بەمانەش ئەم ئازارە ڕۆحانی‌یە دەردەبڕێت..

هەروەها زۆرێك لە ئازارەکان گەر کۆتاییان پێ بێت، چەندین چێژی بەردەوام دەخەنەوە و، هەر کات مرۆڤ بیر لەوە بکاتەوە کە ڕزگاری بووە لێیان، دەڵێت: "سوپاس بۆ خوا"! کە ئەوەش ئاماژە بۆ نیعمەتێکی مەعنەوی دەکات.

بەڵێ، مرۆڤ بۆ هەتاهەتایی بەدیهێنراوە. هەر لەبەر ئەوەشە کە تەنها لە شتە هەتاهەتاییەکاندا چێژی ڕاستەقینەی دەست دەکەوێت، وەك ناسینی خوای گەورە و، خۆشەویستی و، کەماڵ و، زانست و، هاوشێوەکانیان.

بە پوختی:

"چێژ" و "نیعمەت" کاتێ دەبنە چێژ و نیعمەت کە هەمیشەیی بن.

جا ئەگەر ئەم ڕشتەیەت بینی، ئەوا ڕستەکانی ئەم ئایەتەی تێدا بهۆنەرەوە.

سەبارەت بە ڕستەی ﴿وَبَشِّرِ الَّذِينَ ءامَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ﴾، ئەوا بزانە کە:

کاتێ خوای گەورە ئەرکی خستە ئەستۆی خەڵك و "پێغەمبەرێتی"ی چەسپاند و، "ڕاگەیاندنی ئایین"یشی خستە ئەستۆی پێغەمبەر ﷺ.. فەرمانی مژدەدانی پێ دا، بە مەبەستی دەستەبەرکردنی گوێڕایەڵیی ئەو ئەرك پێ سپاردنەی کە ماندووبوون و وازهێنانی تێدایە لە چێژەکانی دنیا. چونکە پێغەمبەر ﷺ هەروەك فەرمانی هەڕەشەکردنی سزای خوای بۆ سەرپێچیکاران پێ دراوە، بە هەمان جۆر فەرمانی ئەوەشی پێ دراوە کە مژدەی ڕازی بوون و، لوتف و، نزیکیی خوای گەورە و، بەختەوەریی هەمیشەیی ڕابگەیەنێت.

سەبارەت بە ڕستەی ﴿أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي﴾ش، ئەوا بزانە کە:

وەك پێشتر وترا، یەکەم پێداویستی‌یەکانی مرۆڤ - لەبەر ئەوەی خاوەنی جەستەی ماددی‌یە - جێگا و نیشتەجێ‌یە. خۆشترین جێگاش ئەوەیە کە ڕووەك و درەختەکانی تێدا بێت و، جوانترینیشیان ئەوەیە کە ئاو لە نێوان سەوزەڵانی‌یەکانیەوە گوزەر بکات و، کامڵترینیشیان ئەوەیە کە لە نێوان درەختەکانی و لە ژێر کۆشکەکانیەوە ڕووبار خوڕ بێتەوە. لەبەر ئەوەیە کە فەرمووی: ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾..

نعم، إنَّ كثيراً من اللذائذِ الموقّتةِ إذا زالتْ أثمرَتْ آلاماً مستمرَّةً كلما تَذكَّرَها[1] يفورُ مِن فيه: "أيواه! وا أسفا"! المترجَمِنِ عن هذا الألمِ الروحانيِّ..

وإنَّ كثيراً من الآلامِ إذا انقضتْ أَوْلَدتْ لذّاتٍ مستمرةً كلما تذكَّرَها الشخصُ وهو قد نجا، يتكلَّمُ بـ"الحمدُ لله" الملوِّحِ لنعمةٍ معنويةٍ.

أَجَلْ، إنَّ الإنسانَ مخلوقٌ للأبد، فإنما تحصُلُ له اللذةُ الحقيقيةُ في الأمور الأبديةِ كالمعرفة الإلهيةِ والمحبةِ والكمالِ والعلمِ وأمثالِها.

والحاصلُ:

أنَّ اللذةَ والنعمةَ إنما تكونان لذةً ونعمةً إنْ كانتا خالدَتَين.

وإذا رأيت هذا السِّلكَ فانظِمْ فيه جُمَلَ الآيةِ.

أما جملةُ: ﴿وَبَشِّرِ الَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ﴾..

فاعلم أنّه تعالى لما كلّفَ الناسَ، وأثبتَ النبوّةَ، وكلّفَ النبيَّ بالتبليغِ، أمرَه بالتبشيرِ، تأميناً لامتثالِ التكليفِ الذي فيه مَشَقّةٌ وتَرْكٌ للّذائذِ الدنيويةِ. فكما أنّه مأمورٌ بالإنذار؛ كذلك مأمورٌ بالتبشير برضاءِ الله تعالى وتلطيفِه وقُربيَّتِه وبالسعادةِ الأبديةِ.

وأما جملةُ ﴿أَنَّ لَـهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي﴾ فاعلمْ كما مرَّ أنَّ أوّلَ حاجاتِ الإنسانِ الضروريةِ - لأنّه جسمٌ - المكانُ والمسكَنُ؛ وأنَّ أحسنَ المكانِ هو المشتمِلُ على النباتاتِ والأشجارِ، وأنَّ ألطفَه هو الذي يتسلّلُ بين خضراواتِه الماءُ، وأنَّ أكمَلَه هو الذي تجري بين أشجارِه وتحتَ قصورِه الأنهارُ بكثرةٍ. فلهذا قالَ:

﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾..

---

(١) تذكرها الإنسان.

پاشان، وەك ئەوەی کەمێ پێش ئێستا بیستت، لە دوای پێویستیی جێگا، گرنگترین خواست و پێویستی و کاملترینی چێژە جەستەییەکان بریتییە لەو خواردن و خواردنەوەیەی کە "باخ" و "ئاو" ئاماژەی بۆ دەکەن.. پاشان تەواوترین ڕۆزی ئەوەیە کە مرۆڤ پێی ڕاهاتبێت و ئاشنای بێت، تاکو پلە بەرزیی بەسەر هاوشێوەکانیدا بزانێت و.. بەلەزەت ترین "میوە"ش ئەوەیە کە بەردەوام نوێ بێتەوە و.. پوخت ترین چێژیش لەوەدایە کە میوە ڕنراوەکە نزیکە دەست و شوێنەکەی زانراو بێت.. لە هەمووشیان بەتام و چێژتر ئەوەیە کە بزانێت ئەوە بەروبوومی کردەوەکانیەتی. لەبەر ئەوەیە کە خوای گەورە فەرمووی: ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقاً قَالُواْ هَـذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ﴾ واتە لە دنیادا، یان پێش ئێستا.

سەبارەت بە ﴿وَأُتُواْ بِهِ مُتَشَابِهاً﴾یش، ئەوا بزانە:

لە فەرموودەدا ئەوە هاتووە کە شێوەیان یەکێکە، بەڵام تامیان جیایە[1]. جا ئایەتەکە ئاماژە بۆ چێژی نوێ بوونەوەی "میوە" دەکات.. هەروەها کەماڵی چێژەکەش لەوەدایە کە مرۆڤ خزمەتکراو بێت و نیعمەتەکەی بۆ بهێنرێت.

سەبارەت بە ڕستەی ﴿وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

هەروەك لە ڕشتەکەدا بینیت، مرۆڤ پێویستی بە هاوسەرێك دەبێت کە لەگەڵیدا ئارام بژی و، ئەم بە چاوی ئەو، ئەویش بە چاوی ئەم بڕوانێت و، سوود لەو خۆشەویستییە وەربگرێت کە ناسکترینی بریسکەکانی میهرەبانییە. ئایا نابینی کە هۆگر بوونی تەواوەتی لەم دنیایەدا بەوانە؟

سەبارەت بە ڕستەی ﴿وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

مرۆڤ ئەگەر ڕێی لە نیعمەتێك بکەوێت، یان چێژێك بەدەست بهێنێت، یەکەم شت کە بە زەینیدا دێت ئەوەیە کە: ئایا ئەمە "بەردەوام" دەبێت؟ یان "نەمان" لێلی دەکات لێم؟ لەبەر ئەوە، بە فەرمایشتی ﴿وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئاماژەی بە تەواوکردنی نیعمەت کرد لە ڕێی هەتاهەتایی بەهەشت و، بەردەوامیی خۆیان و هاوسەرەکانیان تیایدا و، بەردەوامیی چێژەکانی ئەوێ و سوودوەرگرتنیان لێی.

---

(١) بۆ فەرموودەکە و سەرچاوەکەی، بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر. (وەرگێڕ)

ثم إنَّ أشدَّ الحاجاتِ كما سمعتَ آنفاً - بعدَ المكانِ - وأكملَ اللذائذِ الجسمانيةِ هو الأكلُ والشُّربُ اللذَين[1] يشيرُ إليهما الجنةُ والنهرُ.. ثم إنَّ أكملَ الرزقِ هو أنْ يكونَ مألوفاً ومأنوساً ليُعرَفَ درجةُ تفوُّقِه على نظيرِه.. وألذُّ الفاكهةِ أنْ تكونَ متجدِّدةً.. وإنَّ أصفى اللذّةِ هو أنْ يكونَ المقتطَفُ معلوماً وقريباً.. وإنَّ ألذَّها أنْ يُعرَفَ أنّها ثمرةُ عملِه. فلهذا قالَ: ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِزْقاً قَالُواْ هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ﴾ أي في الدنيا أو قبلَ هذا الآنِ.

وأما ﴿وَأُتُواْ بِهِ مُتَشَابِهاً﴾ فاعلمْ أنَّ في الحديث: أنَّ صورتَها واحدةٌ والطعمَ مختلِفٌ[2]. فتشيرُ الآيةُ إلى لذّةِ التجدُّدِ في الفاكهةِ.. وأنَّ كمالَ اللذَةِ أنْ يكونَ الشخصُ مخدوماً يُؤتَى إليه.

وأما جملةُ ﴿وَلَـهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ﴾ فاعلمْ كما رأيتَ في السّلكِ أنَّ الإنسانَ محتاجٌ لرفيقةٍ وقرينةٍ يسكُنُ إليها وينظرُ بعينِها وتنظرُ بعينِه، ويستفيدُ مِن المحبةِ التي هي ألطفُ لمعاتِ الرحمةِ. ألا ترى أنَّ الأُنسيةَ التامّةَ هنا بهنّ؟

وأما جملةُ ﴿وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ فاعلمْ أنَّ الإنسانَ إذا صادفَ نعمةً أو أصابَ لذةً فأوّلُ ما يتبادرُ لذهنِه: أتدومُ أم تُنَغَّصُ بزوالٍ؟ فلهذا أشارَ إلى تكميلِ النعمةِ بخلودِ الجنةِ ودوامِهم وأزواجِهم فيها ودوامِ اللذائذِ واستمرارِ الاستفادةِ بقوله:

﴿وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾.

---

(١) الظاهر: اللذان.

(٢) أخرجه ابن جرير عن يحيى بن كثير (ب) وأصل الحديث في الطبري (١/ ٣٨٧): عن يحيى بن كثير، قال: "يؤتى أحدهم بالصحفة فيأكل منها، ثم يؤتى بأخرى فيقول: هذا الذي أتينا به من قبل. فيقول الملك: كُلْ، فاللونُ واحد والطعمُ مختلف". وانظر: ابن كثير ١/ ١١٤، والدر المنثور ١/ ٣٨.

سەبارەت بە هۆنینی شێوەی پێکهاتنی یەك بە یەکی ڕستەکانیش، ئەوا:

ڕستەی ﴿وَبَشِّرِ الَّذِينَ ءامَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَـــاتِ﴾ "واو"ەکەی - بە پێی نهێنیی پەیوەندی لە نێوان هەردوو لای عەتفەکە - ئاماژەیە بۆ ئەو "أنـــذرْ"ەی کە لە کەپووی ئەوەی پێش ئەمەوە دەدلۆپێت. ﴿وَبَشِّرِ﴾یش هێمایە بۆ ئەوەی کە بەخشینی "بەهەشت" لەسەر خوا واجب نیيە، بەڵکو چاکەی خۆیەتی.. هەروەها بۆ ئەوەش کە نابێ کردەوە باشەکان لە پێناوی بەهەشتدا بێت..

شێوەی "ئەمر"ەکەش لە ﴿وَبَشِّرِ﴾دا ئاماژەیە بۆ "بَلِّغْ مُبَشِّراً" (وەك مژدەدەرێك پێیان ڕابگەیەنە) چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیاندنی خراوەتە ئەستۆ.

هێنـانی ﴿الَّذِينَ ءامَنُواْ﴾ لە بریی "المؤمنين" کە کورت ترە، ئەوا ئاماژەیە بۆ ئەو ﴿الَّذِيـــنَ﴾یەی کە لە سەرەتای سوورەتەکەدا ڕابورد، تاکو درێژەپێدانەکەی ئەوێ ڕوونکردنەوەیەك بێت بۆ ئەوەی کە لێرەدا بە کورتی هێنرا.

هێنانی ﴿ءامَنُواْ وَعَمِلُواْ﴾ لێرەدا لەسەر شێوەی "فیعلی مازی"، هاوکات لەگەڵ هێنانی فیعلەکەدا لەوێ لە شێوەی "موزاریع" لە ﴿يُؤمِنُـــونَ﴾ و ﴿يُنفِقُـــونَ﴾دا، بۆ ئاماژەدانە بەوەی کە مەقامی مەدح و هاندان بۆ خزمەت، "موزاریع" دەخوازێت، بەڵام مەقامی خەڵات و پاداشت "مازی" گونجاوە بۆی، چونکە پاداشت و کرێ لە دوای خزمەتەوە دێت.

"واو"ی ﴿وَعَمِلُواْ﴾ - بە هۆی نهێنیی جیاوازی (لە نێوان هەردوو فیعلی "آمنـــوا، عملوا"دا) - ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە "کردەوە" لە ناو "ئیمان"دا نیيە، وەك ئەوەی کە "موعتەزیلە" دەڵێن.. هەروەها بۆ ئەوەش کە "ئیمان"ی بێ "کردەوە" بەس نیيە. وشەی "عمل"(کردەوە)یش هێمایە بۆ ئەوەی کە ئەو شتەی مژدەکەی تێدایە بە وێنەی کرێ و پاداشت وایە.

سەبارەت بە ﴿الصَّالِحَاتِ﴾یش، ئەوا کورت و نادیارە.

"شێخ محەممەد عەبدەی میسری" وتوویەتی: ڕەهایی لێرەدا لەبەر سپاردنیەتی بە مەشهووری و ناسراویی "چاکەکارییەکان" لە نێوان خەڵکدا.

منیش دەڵێم: هەروەها بە پشت بەستن بە سەرەتای سوورەتەکە ڕەها کراوە.

أما نظمُ هيئاتِ جملةٍ جملةٍ:

فجملةُ: ﴿وَبَشِّرِ الَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ﴾ الواو فيها - بسرِّ المناسبةِ بين المتعاطِفَين - إشارةٌ إلى "أنذِرْ" الذي يتقطَّرُ مِن أنفِ السابقةِ.. وأما ﴿بَشِّرِ﴾ فرمزٌ إلى أنَّ الجنةَ بفضلِه تعالى لا واجبٌ عليه.. وكذا إلى أنْ لابدَّ أنْ لا يكونَ العملُ لأجلِ الجنةِ..

وأما صورةُ الأمرِ في ﴿بَشِّرِ﴾ فإيماءٌ إلى "بلِّغْ مُبشِّراً" فإنّه مكلَّفٌ بالتبليغِ..

وأما ﴿الَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بدلَ "المؤمنين" الأقصرِ، فتلويحٌ إلى ﴿ الَّذِينَ﴾ الذي مرَّ في رأسِ السورةِ ليكونَ تفصيلُه هناك مُبيِّناً لما أجمَلَ هنا.

وأما إيرادُ ﴿ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ﴾ على صيغةِ الماضي هنا، مع إيرادِ ﴿يُؤمِنُونَ﴾ و﴿يُنفِقُونَ﴾ هناك بصيغةِ المضارعِ، فللإشارةِ إلى أنَّ مقامَ المدحِ والتشويقِ على الخدمة شأنُه المضارعُ. وأما مقامُ المكافأةِ والجزاءِ فالمناسبُ الماضي، إذ الأجرةُ بعدَ الخدمةِ..

وأما واوُ ﴿وَعَمِلُواْ﴾ فإشارةٌ - بسرِّ المغايرةِ - إلى أنَّ العملَ ليس داخلاً في الإيمان كما قالت المعتزلةُ. وإلى أنَّ الإيمانَ بغيرِ عمَلٍ لا يكفي. ولفظُ العملِ رمزٌ إلى أنَّ ما يُبشَّرُ به كالأجرةِ..

أما ﴿الصَّالِحَاتِ﴾ فمُبهَمةٌ ومُجمَلةٌ. قال "شيخ محمد عبده المصريُّ":

"الإطلاقُ هنا حوالةٌ على الاشتهارِ وتعارُفِ الصالحاتِ بينَ الناسِ".

أقولُ: وكذا أُطلِقَتْ اعتماداً على رأسِ السورةِ.

سەبارەت بە ڕستەی ﴿أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

شێوەی پێکهاتنی، لە: بێگومانیی ﴿أَنَّ﴾ و، تایبەتکردنی "لام" و، پێشخستنی ﴿لَهُمْ﴾ و، بەکۆ و نەکیرە هێنانی ﴿جَنَّاتٍ﴾ و، باسی لەبەر ڕۆشتنی ڕووبارەکان و، هێنانی ﴿مِن﴾ لەگەڵ وشەی "تحت"دا و، تایبەتکردنی ﴿الأَنْهَارُ﴾[1].. هەموویان، هاوکاریی یەکتر دەکەن و بە دەم یەکترەوە دەڕۆن لە پێناوی پشتگرتنی ئامانجە بنەڕەتی‌یەکەدا، کە خۆشحالی و چێژی خەڵاتەکەیە، بە وێنەی زەویی شێدار و تەڕ کە لە هەموو لایەکیەوە ئاو دەدەڵێنێتە ناو گۆمە ناوەندەکە.

چونکە ﴿أَنَّ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مژدەدان بە شتێکی هێندە گەورەی تا ئەم ڕادەیە، ژیری دەکەوێتە گومانەوە تیایدا، بۆیە پێویستی بە جەختکردنەوە دەبێت.. هەروەها مەقامی "خۆشحالی" بەدەرنانی وەهم و گومانەکان دەخوازێت، چونکە هاتنی لەناکاوی نزمترین و کەمترین وەهم و گومان، خاتری ئەندێشە دەشکێنێت و خۆشحالی‌یەکەش بەدەر دەنێت.. هەروەها ئاماژەیەکیشە بۆ ئەوەی کە ئەمە تەنها بەڵێنێکی پەتی نی‌یە، بەڵکو ڕاستی‌یەکە لە ڕاستی‌یەکان.

"لام"ی ﴿لَهُمْ﴾ ئاماژە دەکات بۆ: تایبەتکردن و، موڵکایەتی و، شایستەیی لە لایەن فەزڵی خوای گەورەوە. ئەوەش بە مەبەستی تەواوکاریی چێژەکە و زیادکردنی خۆشحالی‌یەکەیە. دەنا زۆر جار ڕێ دەکەوێت کە پادشایەك میوانداری لە هەژارێك بکات!

پێشخستنی ﴿لَهُمْ﴾ ئاماژەیە بۆ تایبەتکردنی ئەوان لە نێوان لە نێوان خەڵکیدا بە "بەهەشت"، چونکە ڕەچاوکردنی حالی دۆزەخی‌یەکان هۆکارێکە بۆ دەرکەوتنی بەهای بەهەشت.

کۆکردنەوەش لە ﴿جَنَّاتٍ﴾دا ئاماژەیە بۆ جیاجیایی بەهەشتەکان و، جۆراوجۆریی پلەکانیان، بەپێی جۆراوجۆریی پلەکانی کردەوەکان.. هەروەها هێمایە بۆ ئەوەی کە هەموو بەشێك لە بەهەشت هەر بەهەشتێکە بۆ خۆی.. هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەش کە ئەو بەشەی بەهەشت بەر هەر یەکێك دەکەوێت - لەبەر فراوانی‌یەکەی - وەکو تەواوی بەهەشت وایە، نەك بەو واتایەی کە کۆی هەموویان بەرەو یەك شوێن دەبرێن.

(١) هەروەها بە کۆ هێنان و مەعریفەکردنیشی. (ش)

وأما جملةُ ﴿أَنَّ لَـهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾..

فاعلمْ أنَّ هيئاتِها ـ مِن: تحقيقِ ﴿أَنَّ﴾، وتخصيصِ "اللام"، وتقديمِ ﴿لَـهُمْ﴾، وجمعِ "الجنةِ"، وتنكيرِها، وذكْرِ الجَرَيانِ، وذِكرِ ﴿مِنْ﴾ مع "تَحْتِ"، وتخصيصِ "نهر"[1] وتعريفِه - تتعاونُ وتتجاوبُ على إمداد الغَرَضِ الأساسيِّ؛ الذي هو السرورُ ولذةُ المكافأةِ، كالأرضِ النّشِفَةِ الرطبةِ؛ ترشَحُ بجوانبها الحوضَ المركزيَّ...

لأنَّ ﴿أَنَّ﴾ إشارةٌ إلى أنَّ البشارةَ بما هو في هذه الدرجةِ مِن العظمةِ يتردَّدُ فيها العقلُ فتحتاجُ إلى التأكيدِ.. وأيضاً من شأنِ مقامِ السرورِ طردُ الأوهامِ؛ إذ طَرَيانُ أدنى وَهْمٍ يكسِرُ الخيالَ ويطيِّرُ السرورَ.. وكذا إيماءٌ إلى أنَّ هذا ليس وعداً صِرفاً بل حقيقةٌ من الحقائقِ.

ولام ﴿لَـهُمْ﴾ إشارةٌ إلى الاختصاصِ والتملُّكِ والاستحقاقِ الفضليِّ لتكميلِ اللذةِ وزيادةِ السرورِ. وإلّا فكثيراً ما يُضيِّفُ مَلِكٌ مسكيناً.

وتقديمُ ﴿لَـهُمْ﴾ إشارةٌ إلى اختصاصِهم بينَ الناسِ بالجنةِ، إذ ملاحظةُ حالِ أهلِ النارِ سببٌ لظهورِ قيمةِ لذّةِ الجنةِ.

وجمعُ ﴿جَنَّاتٍ﴾ إشارةٌ إلى تعدُّدِ الجِنانِ وتنوُّعِ مراتبِها على نسبةِ تنوُّعِ مراتبِ الأعمالِ.. وكذا رمزٌ إلى أنَّ كلَّ جزءٍ مِن الجنةِ جنةٌ.. وكذا إيماءٌ إلى أنَّ ما يصيبُ حصةَ كلٍّ - لِوُسْعَته - كأنّه كالجنةِ بتمامِها، لا كأنّه يُساقُ بجماعتِهم إلى موضعٍ..

---

(١) وجمعه وتعريفه. (ش)

نەکیرەکردنی ﴿جَنَّاتٍ﴾یش، ئەوە بە گوێی زەینی بیسەردا دەدات کە:

"بەهەشت شتی وای تێدایە هیچ چاوێك پێشتر نەیبینیوە و، هیچ گوێیەك نەیبیستووە و، بە دڵی هیچ مرۆڤێکیشدا نەهاتووە"[١]. هەروەها تەسەوور کردنی ئەو بەهەشتانە بە زەینی بیسەرانیان دەسپێرێت، تاکو هەرکەسە و بەو شێوەیەی کە بەلایەوە جوانە، تەسەووری بکات. هەروەها دەڵێی "تەنوین"ەکەی لە بریی ﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الأَنفُسُ﴾ (الزخرف: ٧١) هێنراوە.

سەبارەت بە ﴿تَجْرِي﴾ش، ئەوا بزانە کە:

جوانترینی باخەکان ئەوەیە کە ئاوی تێدا بێت.. پاشان جوانترینی ئەوانەش ئەوەیە کە ئاوەکەی بڕوات.. ئنجا جوانترینی ئەوانەش ئەوەیە کە ڕۆشتنی ئاوەکەی بەردەوام بێت.. جا بە وشەی ﴿تَجْرِي﴾ ئاماژەی بۆ وێناکردنی بەردەوامیی ڕۆشتنەکە کرد.

سەبارەت بە ﴿مِن تَحْتِهَا﴾ش، ئەوا بزانە کە:

جوانترین ئاوی لەبەر ڕۆشتوو لە سەوزەلانییەکاندا ئەوەیە کە بە ڕوونی و خاوێنی لەناو خودی ئەو باخەوە هەڵبقوڵێت و، لە ژێر کۆشکەکانیەوە خوڕ بێتەوە و، بە ناو درەختەکانیدا بڕوات و بڵاو بێتەوە. ئیتر بە ﴿مِن تَحْتِهَا﴾ ئاماژەی بۆ ئەم سیانە کرد.

سەبارەت بە ﴿الأَنْهَارُ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

جوانترین ئاوی ڕۆشتووی ناو باخەکان ئەوەیە کە زۆر بێت..

پاشان جوانترینیان ئەوەیە کە هاوشێوەکانی یەك لە دوای یەك لە جۆگەلەکانیەوە خوڕ بنەوە، چونکە بە ڕوانینە یەکتریی هاوشێوەکان "جوانی"یش لەسەر بەهای بەشەکان زیاد دەکات..

پاشان جوانترینی ئەمەش ئەوەیانە کە ئاوەکە سازگار و ڕەوان و خۆش بێت، وەك فەرموویەتی: ﴿مَاءٍ غَيْرِ آسِنٍ﴾ (محمد: ١٥)..

جا بە کۆ هێنانی وشەی "نهر" و مەعریفەکردنی، ئاماژەیە بۆ ئەمە.

سەبارەت بە ڕستەی ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقاً قَالُواْ هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

---

(١) واتای فەرموودەیەکە. بۆ دەقەکەی و تەخریجەکەی بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر. (وەرگێڕ)

وتنكيرُ ﴿جَنَّاتٍ﴾ يتلو على ذهنِ السامعِ:

"فيها ما لا عينٌ رأتْ، ولا أُذُنٌ سمِعَتْ، ولا خَطَرَ على قلبِ بشرٍ"[1]..

وكذا يُحِيلُ على أذهانِ السامعين حتى يتصورَّها كلٌّ على الطرزِ الذي يستحسِنُه..

وكذا كأنَّ التنوينَ بدلُ: ﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الأَنفُسُ﴾ (الزخرف: ٧١).

وأما ﴿تَجْرِي﴾ فاعلمْ أنَّ أحسنَ الرياضِ ما فيها ماءٌ، ثم أحسنُها ما يسيلُ ماؤُها، ثم أحسنُها ما استمرَّ السَّيَلانُ. فبِلفظِ ﴿تَجْرِي﴾ أشارَ إلى تصويرِ دوامِ الجَرَيانِ..

وأما ﴿مِن تَحْتِهَا﴾ فاعلم أنَّ أحسنَ الماءِ الجاري في الخضراواتِ أنْ ينبعَ صافياً من تلك الروضةِ، ويمرَّ مُتَخَرْخِراً تحتَ قصورِها، ويسيلَ منتشراً بين أشجارِها، فأشارَ بـ﴿مِن تَحْتِهَا﴾ إلى هذه الثلاثة..

وأما ﴿الأَنْهَارُ﴾ فاعلمْ أنَّ أحسنَ الماءِ الجاري في الجِنانِ أنْ يكونَ كثيراً. ثم أحسَنُه أنْ تتلاحقَ الأمثالُ من جداولِه. فإنَّ بتناظُرِ الأمثالِ يتزايَدُ الحُسْنُ على قيمةِ الأجزاءِ. ثم أحسنُه أنْ يكونَ الماءُ عذباً فراتاً لذيذاً كما قال: ﴿مَاءٍ غَيْرِ آسِنٍ﴾ (محمد: ١٥)..

فبلفظ "نهر" وجمعِه وتعريفِه أشارَ إلى هذه.

أما جملةُ ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِزْقاً قَالُواْ هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ﴾..

---

(١) عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: قال الله عز وجل: أعددتُ لعبادي الصالحين ما لا عين رأت ولا أُذن سمعت ولا خطر على قلب بشر، واقرءوا إن شئتم: ﴿فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَـهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾ (السجدة: ١٧). رواه البخاري ومسلم برقم ٢٨٢٤ ولم يذكر الآية، والترمذي (٣١٩٥ تحقيق أحمد شاكر). وزاد نسبته في صحيح الجامع الصغير ٤١٨٣ لأحمد والنسائي وابن ماجه.

شێوه پێكهاتنی ئەم ڕستەیه گەلێ ڕستەی ناوەكیی لەخۆ گرتووه: ئەوەتا دەستپێك بوونی بۆ ڕستەی نوێ، وەڵامی پرسیارێكی تەقدیر كراوه و، پرسیارەكەش خۆی لە خۆیدا ئاوێتەیەكە لە زنجیرەی هەشت پرسیار. چونكە:

كاتێ مژدەی نیشتەجێیەكی ئاوا بڵندیان پێ درا، ئەوه بە زەینی بیسەردا دێت كە:

ئایا ڕۆزیی تێدایه یان نا؟ ئەگەر ڕۆزیی تێدایه، لە كوێوه دێت و پەیدا دەبێت؟ ئەگەر لەو بەهەشته خۆی پەیدا دەبێت، ئایا لە چ شتێكی؟ ئەگەر لە بەروبوومەكانیەتی، ئایا لە میوه و بەروبوومی دنیا دەچن؟ ئەگەر لێیان دەچن، ئەی ئایا لەناو خۆیاندا هاوشێوەی یەكترین؟ ئەگەر هاوشێوەی یەكترین، ئایا تامیان جیا جیایه؟ ئەگەر تامەكانیان جیاوازه و كاتێ لە درەختەكانیان ڕنران، ئایا كەم دەكەن یان شوێنەكەیان بە هی تر پڕ دەكرێتەوه؟ ئەگەر هی تر خرایه شوێنیان، ئایا خواردن لەوانیش بەردەوام دەبێت؟ ئەگەر بەردەوام دەبێت، حاڵی بخۆرانیان چۆنه، ئایا خۆشحاڵن؟ ئەگەر خۆشحاڵن، ئایا چی دەڵێن؟

جا ئەگەر لەم پرسیارانه تێگەیشتیت، ئەوا بڕوانه كە چۆن قورئان وەڵامی ئەم زنجیره پرسیارەی بە شێوه پێكهاتنی ئەم ڕستەیه دایەوه!

وشەی ﴿كُلَّمَا﴾ ئاماژەیه بۆ بەردەوامی و بێگومانی.

مازی بوونی فیعلی ﴿رُزِقُوا﴾ ئاماژەیه بۆ ڕاستیی ڕوودانەكەی. هەروەها هێمایەكیشه بۆ یادخستنەوەی هاوشێوەكەی لە ڕۆزیيەكانی دنیا، لە زەینیاندا..

هێنانی فیعلەكەش لە شێوەی بكەر نادیاردا ئاماژەیه بۆ نەبوونی ماندووبوون لە بەدەستهێنانی ئەو ڕۆزیيەدا و، بۆ ئەوەش كە ئەوان "خزمەتكراو"ن؛ ڕۆزیيەكە دەهێنرێتە بەردەستیان.

هەڵبژاردنی ﴿مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ﴾ بەسەر "من ثمراتِها" بۆ ئەوەیه كە "دەق" بێت لەسەر وەڵامی دوو دانه لەو پرسیاره باسكراوانه.

بە نەكیرەكردنی ﴿ثَمَرَةٍ﴾ كە گشتاندن دەگەیەنێت، ئاماژەیه بۆ ئەوەی كە: هەر بەروبوومێك بێت، هەر ڕۆزیيه.

بە نەكیرەهێنانی ﴿رِزْقًا﴾یش ئاماژەیه بۆ ئەوەی كە لەو چەشنه ڕۆزیيه زانراوەی خۆتان نیيه كه بۆ نەهێشتنی برسێتییه.

فاعلمْ أنَّ هيئاتِها تتضَمَّنُ كثيراً من الجُمل الضمنيّةِ؛ فاستينافُها جوابٌ لسؤالٍ مُقدَّرٍ، وذلك السؤالُ ممزوجٌ مِن ثمانيةِ أسئلةٍ متسلسلةٍ؛ إذ لمّا بُشّروا بمسكَنٍ هكذا عالٍ، يتبادرُ لذهنِ السامعِ:

أفيه رزقٌ أم لا؟ وإذا كان فيه رزقٌ فمِن أينَ يجيءُ ويحصُلُ؟ وإذا حصلَ مِن تلك الجنةِ، فمِن أيِّ شيءٍ منها؟ وإذا كان مِن ثمرتِها، فهل هي تشبَهُ ثمارَ الدنيا؟ وإذا شابهتْها، فهل يشبَهُ بعضُها بعضاً؟ وإذا تشابهتْ، فهل تختلِفُ طعومُها؟ وإذا اختلفتْ وقد قُطِعَتْ، فهل تنقُصُ أم يُمتَلأُ موضعُها؟ وإذا تبدَّلَتْ بأخرى، فهل يدومُ الأكلُ منها؟ وإذا دامَ فما حالُ الآكلين، أفلا يستبشِرون؟ وإذا استبشَروا فماذا يقولون؟

وإذ تفطنتَ لهذه الأسئلةِ، فانظرْ كيفَ أجابَ القرآنُ عن هذه الأسئلةِ المتسلسلةِ بهيئاتِ هذه الجملةِ.

أما لفظُ ﴿كُلَّمَا﴾ فإشارةٌ إلى الدّوامِ والتحقيقِ.

وماضويةُ ﴿رُزِقُواْ﴾ إشارةٌ إلى تحقيقِ الوقوعِ.. وكذا إيماءٌ إلى إخطارِ نظيرِه مِن رزقِ الدنيا إلى ذهنِهم..

وإيرادُه على بناءِ المفعولِ إشارةٌ إلى عدمِ المشقّةِ وأنّهم مخدومون يُؤتَى إليهم.

وإيثارُ ﴿مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ﴾ على "مِن ثمراتها" للتنصيص على جوابَين عن سؤالَين من الأسئلةِ المذكورةِ.

وتنكيرُ ﴿ثَمَرَةٍ﴾ المفيدُ للتعميم إشارةٌ إلى أنّه أيّةَ ثمرةٍ كانتْ فهي رزقٌ.

وتنكيرُ ﴿رِزْقاً﴾ إشارةٌ إلى أنّه ليس مِن الرزقِ الذي تعلمونه لدفعِ الجوعِ.

وشه‌ی ﴿قَالُواْ﴾ - واته له نێوان خۆیاندا وتووێژ ده‌كه‌ن - ئاماژه‌یه بۆ مژده به‌یه‌كدانی خۆشحاڵی و نامۆیی، كه لازمی حوكمه‌كه‌ن.

سه‌باره‌ت به ڕسته‌ی ﴿هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِنْ قَبْلُ﴾یش، ئه‌وا بزانه كه:

ئه‌م ڕه‌هاكردنه چوار واتا له‌خۆ ده‌گرێت:

یه‌كه‌میان:

"ئه‌مه ڕۆزی‌یه‌كه‌مانه له كرده‌وه باشه‌كانی دنیامان". جا له‌به‌ر په‌یوه‌ندیی تۆكمه و توندوتۆڵی نێوان كرده‌وه و پاداشته‌كه‌ی، وه‌كو ئه‌وه وایه كه كرده‌وه‌كانی ئه‌م دنیایان به پاداشت له‌و دنیادا به‌رجه‌سته بووبێت.. مژده‌ی خۆشحاڵی‌یه‌كه‌یان له‌مه‌وه‌یه.

دووهه‌م:

"ئه‌مه هه‌مان ڕۆزی‌یه كه خۆراكی دنیامان بوو، له‌گه‌ڵ ئه‌و جیاوازی‌یه گه‌وره‌یه‌ی تامی نێوانیان".. به نامۆ زانینه‌كه‌ش لێره‌دایه.

سێ‌هه‌م:

"ئه‌مه هاوشێوه‌ی ئه‌وه‌یه كه پێش ئێستا خواردمان، هاوكات له‌گه‌ڵ یه‌ك شێوه‌یی و جیاوازیی ناوه‌ڕۆكیان". به مه‌به‌ستی كۆكردنه‌وه‌ی هه‌ردوو چێژی ڕاهاتن و نوێ بوونه‌وه.. شادمانی‌یه‌كه‌یان لێره‌دایه.

چواره‌م:

"ئه‌م به‌روبوومه‌ی كه به‌سه‌ر لقی دره‌خته‌كانه‌وه‌یه ئه‌وه‌یه كه پێشتر خواردمان"، چونكه یه‌كسه‌ر له جێی ئه‌ودا دره‌خته‌كان هی تر ده‌گرن، دەڵێی هه‌ر خودی ئه‌وه‌ی پێشووه.. لێره‌وه ده‌زانرێت كه به‌روبوومه‌كانی به‌هه‌شت كه‌م ناكه‌ن.

سه‌باره‌ت به ڕسته‌ی ﴿وَأُتُواْ بِهِ مُتَشَابِهاً﴾یش، ئه‌وا بزانه كه پوختكردنه‌وه و پاشكۆیه‌كه و، ڕسته‌یه‌كی تێخزاوه بۆ ناو ڕسته‌كانی تر، به مه‌به‌ستی پشت ڕاستكردنه‌وه و هۆده‌رخستنی بڕیاره‌كه‌ی پێشوو..

"بكه‌ر نادیاری"ش له ﴿وَأُتُواْ﴾دا ئاماژه‌یه بۆ ئه‌وه‌ی كه ئه‌وان خزمه‌تگوزاریان هه‌یه.

﴿مُتَشَابِهاً﴾یش ئه‌و ئاماژه‌یه‌ی بۆ كۆكردنه‌وه‌ی هه‌ردوو چێژه‌كه تێدایه كه پێشتر زانیت.

ولفظُ ﴿قَالُواْ﴾ - أي يتقاوَلون بعضُهُم لبعضٍ - إيماءٌ إلى الاستبشارِ والاستغرابِ اللازمَين للحُكمِ.

أما جملةُ ﴿هَـٰذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ﴾..

فاعلمْ أنَّ هذا الإطلاقَ يتضمَّنُ أربعةَ معانٍ:

أحدُها: أنَّ هذا ما رُزِقْنا مِن العملِ الصالحِ في الدنيا. فبشدّةِ الارتباطِ بين العملِ والجزاءِ كأنَّ العملَ تجسَّمَ في الآخرة ثواباً. ومِن هنا الاستبشارُ.

والثاني: أنَّ هذا ما رُزِقْنا مِن الأطعمةِ في الدنيا مع هذا التفاوتِ العظيمِ بين طعمَيهما. ومن هنا الاستغرابُ.

والثالثُ: أنَّ هذا مثلُ ما أكلْنا قبلَ هذا الآنِ مع اتحادِ الصورةِ واختلافِ المعنى لجمعِ لذّتَي الألفةِ والتجدُّدِ. ومن هنا الابتهاجُ.

والرابعُ: أنَّ هذه التي على أغصان الشجرةِ هي التي أكلْناها، إذ ينبُتُ بدَلها دفعةً فكأنَّها إياها. ومِن هنا يُعرَفُ أنّها لا تنقصُ.

وأما جملةُ ﴿وَأُتُواْ بِهِ مُتَشَابِهاً﴾..

فاعلمْ أنّها فذلكةٌ وتذييلٌ واعتراضيةٌ لتصديق الحُكمِ السابقِ وتعليلِه..

وبناءُ المفعولِ في ﴿وَأُتُواْ﴾ إشارةٌ إلى أنَّ لهم خَدَمَةً..

وفي ﴿مُتَشَابِهاً﴾ ما عرفتَ من الإشارةِ إلى جمعِ اللذّتَين.

سەبارەت بە ڕستەی ﴿وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

"واو"ەکەی بەهۆی پەیوەندیی "عەتف"ەوە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەوان هەروەك بۆ جەستەکانیان پێویستیان بە نیشتەجێ هەیە، بە هەمان جۆر بۆ ڕۆحەکانیشیان پێویستیان بە ئامێز و پەناگەیەك هەیە.

﴿وَلَهُمْ﴾ ئاماژەیە بۆ تایبەتکاری و موڵك بوون و، هێمایە بۆ تایبەتکردن و قەتیس کردن. ئاماژەشە بۆ ئەوەی کە جگە لە هاوسەرەکانی دنیایان، چەندین "حور العین"یشیان هەیە کە بە تایبەتی بۆ ئەوان بەدی هێنراون.

﴿فِيهَا﴾یش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو هاوسەرانە شایستەی بەهەشتن و، بە ڕێژەی بەرزیی پلەکانی بەهەشت، جوانیی ئەوانیش پلەکانیان بەرز دەبێت.. هەروەها ئاماژەیەکی پەنهانیشی بۆ ئەوە تێدایە کە بەهەشت بەوان خۆی ڕازاندووەتەوە و خۆی ئارایشت داوە[1].

﴿مُطَهَّرَةٌ﴾یش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە خاوێنکارێك بە پاکی ڕای گرتوون. ئەی ئایا گومانت بەوانە چۆنە کە دەستی توانست پاك و خاوێنی کردبنەوە؟..

بە "موتەعەددی" بوونیشی ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئافرەتانی دنیا لەوێ پوخت و خاوێن دەکرێنەوە و، بە وێنەی "حور العین"یان لێ دێت کە لە خۆیاندا پاك و خاوێنن.

ڕستەی ﴿وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾یش، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە:

ئەوان و.. هاوسەرەکانیان و.. چێژەکانی بەهەشت و.. هەموو بەهەشتیش، هەتاهەتایین.

* * *

(١) شیکردنەوەی وشەی ﴿أَزْوَاجٌ﴾ کوا؟ لەوانەیە لە دەستی نووسەرەوەکان پەڕی بێت. ئایا دەکرێ بڵێم: ناونیشانی ﴿أَزْوَاجٌ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو هاوسەرانە بەدیهاتن و سروشتیان ئەو جوانییەدایە کە سەری پێکەوە ڕاهاتن و بناغەی هاوسەرێتییە.. هەروەها هێمایەکی وردیشی بۆ ئەوە تێدایە کە بە قەد باڵای خۆیانن. بەکۆ هێنانی ﴿أَزْوَاجٌ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە - وەك فەرمووده ڕوونی کردووەتەوە - هەر یەکەیان چەندین هاوسەری زۆریان هەیە، نەك یەك و دووان. بە نەکیرەکردنیشی ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەوان لەبەر جوانی و خاوێنییان شایانی ئەوەن کە ناوی "أزواج"(هاوسەرەکان)یان لێ بنرێت. هەروەها سپاردنیشە بە چێژ و حەزی بیسەر، بە وێنەی ئەوەی کە لە ﴿جَنَّـاتٍ﴾دا وترا. هەروەها تەنوینەکەشی وەکو ئەوە وایە لە بریی ﴿عُرُباً أَتْرَاباً﴾ هێنرابێت. (ش)

وأما جملةُ ﴿وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ﴾..

فاعلمْ أنَّ "الواوَ" - بسرِّ المناسبةِ العطفيةِ - إشارةٌ إلى أنَّهم كما يحتاجون إلى المسكَنِ لأجسامِهم، يفتقرون إلى السَّكَن لأرواحِهم..

﴿وَلَهُمْ﴾ إشارةٌ إلى الاختصاصِ والتملُّكِ، ورمزٌ إلى التخصيصِ والحصرِ، وإيماءٌ إلى أنَّ لهم غيرُ النساءِ الدنيويةِ حُوراً عيناً خُلِقْنَ لأجلِهم.

و﴿فِيهَا﴾ إشارةٌ إلى أنَّ تلك الأزواجَ لائقةٌ بتلك الجنةِ، فعلى نسبةِ عُلُوِّ درجاتِها يفوقُ حُسنُهنَّ.. وكذا فيها إيماءٌ خفيٌّ إلى أنَّ الجنةَ تزيّنتْ وتبرّجَتْ بهنَّ[1].

و﴿مُطَهَّرَةٌ﴾ إشارةٌ إلى أنَّ مُطهِّراً طهّرَهُنّ، فما ظنُّكَ بمَن طهّرَهُن ونزّهَهنَّ يدُ القدرةِ؟

وكذا إيماءٌ بالتعْدِيةِ أنَّ نساءَ الدنيا يُطَهَّرْنَ ويُصَفَّيْنَ فيَصِرْنَ حِساناً كالحور العِين المتطهِّراتِ في أنفسِهنَّ.

وأما جملةُ ﴿وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ فإشارةٌ إلى أنهم، وكذا أزواجُهم، وكذا لذائذُ الجنةِ، وكذا الجنةُ كافّةً؛ أبديةٌ.

* * *

---

(١) أين تحليل لفظ ﴿أَزْوَاجٌ﴾؟ لعله سقط من أيدي النسّاخ. أفيمكن أن أقول:

وعنوان ﴿أَزْوَاجٌ﴾ إشارة إلى أنهن على حسن الخلق وطيب الطبيعة الذي هو رأس الألفة وأساس الازدواج.. وأيضاً فيه رمز لطيف إلى أنهن على وفق قاماتهم.

وجمع ﴿أَزْوَاجٌ﴾ إيماء إلى أن لكلٍ أزواجاً كثيرة - كما بينه الحديث - لا واحدة أو اثنتين. وتنكيرها إشارة إلى أنهن لحسنهن وطهرهن حَريّات باسم الأزواج. وكذا إحالة على ذوق السامع واشتهائه نظيرَ ما مرّ في ﴿جَنَّاتٍ﴾ وكذا كأن التنوين بدل ﴿عُرُباً أَتْرَاباً﴾. (ش)

﴿إِنَّ اللهَ لاَ يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلاً مَا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا فَأَمَّا الَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَا أَرَادَ اللهُ بِهَذَا مَثَلاً يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً وَيَهْدِي بِهِ كَثِيراً وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلاَّ الْفَاسِقِينَ ۞ الَّذِينَ يَنْقُضُونَ عَهْدَ اللهِ مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ أُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ (البقرة: ٢٦-٢٧)

بزانە کە: ئەم ئایەتەش هەرسێ ڕووی هۆنینەکەی تێدایە و.. واتای هەموویشی دەڕوانێتە ئایەتەکانی پێش خۆی و، ئەوانەی دوای خۆی و، کۆی هەموو قورئان.

سەبارەت بە هۆنینی بەپێی ئایەتەکانی دوای خۆی، ئەوا بزانە کە:

قورئان کاتێ نموونەی بە مێش و جاڵجاڵۆکە هێنایەوە و، لە مێروولە و هەنگ دوا، جوولەکە و مونافیقان و موشریکان دەرفەتیان بۆ ڕەخنەگرتن قۆزتەوە و، بە گەمژەیی وتیان: ئایا خوای گەورە بەو مەزنییەی خۆی دادەبەزێتە ئاستی باسکردنی ئەم شتە سووك و بێ بایەخانەی کە ئەهلی کەماڵ شەرم لە باسکردنیان دەکەن؟

قورئان بەم ئایەتە کێشای بە دەمیاندا.

سەبارەت بە هۆنینیشی بەپێی ئایەتەکانی پێش خۆی، ئەوا بزانە کە:

قورئان کاتێ "پێغەمبەرێتی"ی بە ئیعجاز چەسپاند و، "ئیعجاز"یش بە تەحەددی و، "تەحەددی"ش بە بێدەنگیی ئەوان.. لە سەرەتای سوورەتەکەشدا سەلماندی کە قورئان هێندە سیفەتی بڵند و تایبەتمەندیی تەواوی تێدایە کە لە هیچ گوفتارێکدا کۆنابنەوە..

﴿إِنَّ اللهَ لاَ يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلاً مَا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا فَأَمَّا الَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْـحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَا أَرَادَ اللهُ بِهَذَا مَثَلاً يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً وَيَهْدِي بِهِ كَثِيراً وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلاَّ الْفَاسِقِينَ * الَّذِينَ يَنْقُضُونَ عَهْدَ اللهِ مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ أُولَئِكَ هُمُ الْـخَاسِرُونَ﴾ (البقرة: ٢٦-٢٧)

اعلمْ أنَّ في هذه الآيةِ أيضاً الوجوهَ الثلاثةَ النظميةَ، وأنَّ مآلَ المجموعِ ينظرُ إلى سوابقِه وإلى لواحقِه وإلى مجموعِ القرآنِ.

وأما نظمُها بالنظرِ إلى لواحقها؛ فاعلم أنَّ القرآنَ لَمّا مثّلَ بالذباب والعنكبوتِ وبحثَ عن النمل والنحلِ انتهزَ الفرصةَ - للاعتراض- اليهودُ وأهلُ النفاقِ والشركِ فتحمّقُوا وقالوا: أيتنـزّلُ اللهُ تعالى مع عظمتِه إلى البحث عن هذه الأمورِ الخسيسةِ التي يستحي من بحثها أهلُ الكمالِ؟

فضربَ القرآنُ بهذه الآيةِ ضرباً على أفواهِهم.

وأما نظمُها بالقياس إلى سوابقِها؛ فاعلم أنَّ القرآنَ لَمّا أثبتَ النبوّةَ بالإعجازِ والإعجازَ بالتحدّي والتحدّيَ بسكوتِهم، وكذلك أثبتَ في رأس السورةِ أنَّ القرآنَ مشتمِلٌ على صفاتٍ عاليةٍ ومزايا كاملةٍ لا تجتمعُ في كلامٍ..

ئەوان لە خاڵی "تەحەددی"یەکەدا بە ڕادەیەك بێدەنگ بوون کە هیچ ڕەگێکی دەمارگیری لەواندا نەجووڵا، کەچی سەبارەت بە "کەماڵ"ی قورئان ڕەخنەیان گرت و کەوتنە بەهەڵەبردن و، وتیان: نموونەکانی چەشنی: ﴿كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً﴾ و ﴿أَوْ كَصَيِّبٍ مِنَ السَّمَاءِ﴾ لە شتە ئاساییەکان، هۆکاری دابەزینی پلەی گوفتارن و، بە وێنەی گفتوگۆی ئاسایی نێوان خەڵکن.

قورئانیش بەم ئایەتە بەردێکی دەرخوارد دان و بێدەنگی کردن.

ڕوونکردنەوەی ئەمەی باس کرا بەم جۆرەیە:

ئەوان چەند گومانێکی لاوازیان بە دەستەوەیە کە سەرچاوەکەی زنجیرە وەهمێکە لەسەر بناغەی بەهەڵەبردنێك دامەزراوە:

یەکەمیان:

ئەو قیاسەی ئەوان بەکاریان هێناوە "جیاوازی"ی تێدا ڕەچاو نەکراوە. هۆکەشی ئەوەیە کە لە ئاوێنەی شتانی پێ ڕاهاتووی خۆیانەوە دەڕواننە هەموو شتێك. لەوەتا کە دەبینن زەینی مرۆڤ، هەروەها بیرکردنەوەی، هەروەها زمانی، هەروەها بیستنی، جوزئییە و لە یەك کاتدا و ڕاستەوخۆ پەیوەندی ناکات بە دوو شتەوە و، دەزانن پێوەری هیممەتی مرۆڤ ئەو بابەتەیە کە سەرقاڵی دەکات و بایەخی پێ دەدات و، دەبینن بەها و گەورەییەکەی بە ڕێژەی هیممەتەکەیەتی، تەنانەت شتێکی سووك و نزم نادەنە پاڵ کەسێکی بلندی گەورە؛ پێیان وایە ئەو کەسە دانابەزێتە ئاستی سەرقاڵ بوون بەو جۆرە شتانەوە و، شتی سووك و بێ نرخ لە هیممەتی مەزنی ئەودا جێی نابێتەوە..

(کاتێ ئەوان بەم پێیە دەڕواننە مرۆڤ).. دەچن بەم ڕوانینە بەهەڵەبەرەش دەڕواننە خوای گەورەی "واجب الوجود" و، دەڵێن: چۆن بە گەورەیی و شکۆمەندیی خۆی دادەبەزێتە خوارەوە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ مرۆڤ بە وێنەی گفتوگۆی نێوانیان و، بۆ باسکردنی ئەم شتە جوزئییانە، بە تایبەت ئەم شتە سووك و بێ نرخانە؟

ئایا ئەو گەوجانە عەقڵیان بەوە ناشکێ کە:

"ویست" و "زانست" و "توانست"ی خوای گەورە هەمەکی و گشتی و گشتگیر و دەورەدەرن بە هەموو شتێك و، پێوەری مەزنیی خواوەند تەنها و تەنها کۆی ئاسەوارەکانیەتی و، پێوەری درەوشانەوەی ئەو خوایە سەرجەمی وشەکانیەتی کە هێندە زۆرن ئەگەر دەریاش ببێت بە مەرەکەبی نووسینیان، هێشتا تەواو نابن؟

سكتُوا في نقطة التحدِّي حتى لم ينبِضْ لهم عِرقُ عصبيةٍ. لكن اعترضُوا وغالطُوا في نقطة كمالِه وقالوا: إنَّ التمثيلَ في أمثالِ ﴿كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً﴾ و ﴿أَوْ كَصَيِّبٍ مِنَ السَّمَاءِ﴾ من الأمور العاديةِ سببٌ لنـزالةِ درجةِ الكلام فيشبهُ المحاورةَ العاديةَ بين الناس؛ فالقرآنُ ألقَمَهم حجراً وأفحمَهم بهذه الآيةِ.

وإيضاحُه:

أنَّ لهم شُبُهاتٍ واهيةً مَنشؤُها أوهامٌ متسلسلةٌ مبناها مغالطاتٌ:

إحداها: القياسُ مع الفارقِ، ومنشؤُه أنهم ينظرون إلى كلِّ شيءٍ بمرآة مألوفِهم؛ فحينما يرَوْنَ الإنسانَ ذهنُه جزئيٌّ وفكرُه جزئيٌّ ولسانُه جزئيٌّ وسمعه جزئيٌّ؛ لا يتعلّقُ كلٌّ بأمرين معاً بالذات، ويعرفون أنَّ مقياسَ الهمّةِ موضوعُ المَشْغَلةِ والاهتمامِ، ويرَوْنَ أنَّ القيمةَ والعظمةَ بنسبة الهمّةِ، حتى إنّهم لا يُسنِدون أمراً حقيراً نزيلاً إلى شخصٍ عالٍ جليلٍ؛ ظناً منهم أنّه لا يتنـزَّلُ للاشتغال بمثلِه ولا يسَعُ ذلك الأمرُ الحقيرُ همّتَه العظيمةَ.. ينظرون بهذا النظر المُثبِّطِ إلى الواجب تعالى، ويقولون: كيف يتنـزَّلُ بعظمته وجلالِه للتكلّمِ مع البشرِ بمثلِ محاورةِ الإنسانِ وللبحث عن هذه الأمورِ الجزئيةِ لاسيّما هذه الأشياءِ المحقَّرَةِ؟

أفلا يعقِلُ هؤلاء السفهاءُ أنَّ إرادةَ الله تعالى وعلمَه وقدرتَه كلّيةٌ عموميةٌ شاملةٌ محيطة، وليس مقياسُ عظمتِه تعالى إلّا مجموعَ آثاره، وما ميزانُ تجلّيه إلّا كافّةُ كلماتِه التي لو كان البحرُ مداداً لها ما نفِدَتْ؟

بۆ نموونە، ﴿وللهِ الْمَثَلُ الأَعْلَى﴾: ئەگەر خۆر - دوای دانانی گریمانی ئەوەی کە خاوەنی ویست و ژیری بێت - ڕووناکیی خۆی بخاتە سەر گەردیلەیەکی پیس، ئایا پێی دەوترێت: چۆن بەو گەورەییەی خۆی دابەزیوەتە ئاستی سەرقاڵ بوون و بایەخدان بەم چەشنە گەردیلەیە؟

بەڵێ، خوای گەورە هەروەك "جیهان"ی بەدیهێناوە و وردەکاریی تێدا کردووە و بایەخی پێ داوە، بە هەمان جۆر "گەوهەری یەکتا"شی بەدیهێناوە و، وردەکاریی لە دروستکردنیدا ئەنجام داوە. چونکە لە پێش چاوی "توانست"ی ئەودا گەوهەرە یەکتاکان بە وێنەی ئەستێرە گەڕۆکەکان وان، لەبەر ئەوەی توانست و، زانست و، ویست و، گوفتاری خوای گەورە "لازم"ی زاتیی ئەون و، خۆیین و، شتێك نین کە نوێ ببنەوە و زیادی و کەمی هەڵبگرن، هەروەك ئاڵوگۆڕیشیان بەسەردا نایەت هەتا "پلەداری" لە ناویاندا ڕووبدات، چونکە دژەکەیان کە "دەستەوسانی"یە ناگونجێ لە نێوانیاندا هەبێت.

کەواتە سەبارەت بەو توانستە، جیاوازی لە نێوان گەردیلە و خۆردا نییە، چونکە شتی "مومکین" لەبەر ئەوەی هەردوو لاکەی وەك دوو تای تەرازوو یەکسانن، ئەوا هیچ جیاوازییەك نییە لەو هێزەدا کە دەخرێتە کار بۆ بەرزکردنەوەی یەکێك لەو دوو تایە و نزمکردنەوەی ئەوی تریان، گەر ئەو دوو تایە دوو خۆر یان دوو گەردیلەیان تێدا بێت..

جا پەیوەندیی دروستکراوانی ئەو توانستە سەبارەت بە توانستە خۆییە لازمەکەی خوای گەورەوە ئاوایە. بەڵام هەرچی هێزی شتی "مومکین"ە، کە لاوەکی و، بگۆڕە و، دەستەوسانیی تێکەڵ دەبێت، ئەوا لەگەڵ ئەو توانستەی خوای گەورەی "واجب الوجود"دا بەراورد ناکرێت.

بە پوختی: گەردیلەکان و شتە نزمە بێ بایەخەکان، لەبەر ئەوەی "دروستکراو"ی خوای گەورەن، ئەوا بێگومان "زانراو"ی ئەون. کەواتە بەڵگە نەویستە کە باسکردنیان لە لایەن خوای گەورەوە نابێ جێی مشتومڕ بێت. لەسەر بناغەی ئەم نهێنییەشە کە فەرموویەتی: ﴿أَلاَ يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ (الملك: ١٤).

ئیتر چۆن ئەو کەسەی کە زانایە پێیان، لێیان نادوێ و قسەیان تێدا ناکات، لە کاتێکدا کە هەر خۆی خاوەنی عیززەت و دانستی ڕەهایە؟

مثلاً: - ﴿ولله المَثَلُ الأَعْلَى﴾ - إذا ألقت الشمسُ، بعدَ فرضِ كَوْنِها مختارةً عاقلةً، ضياءَها على ذرّةٍ ملوَّثَةٍ، أَيُقالُ لها: كيف تنزَّلتْ ـ بعظمتِها - للاشتغالِ والاهتمامِ بمثلِ هذه الذّرةِ؟

نعم، إنَّ اللهَ تعالى كما خلَقَ العالَمَ وأتقنَه صُنعاً واهتمَّ به؛ كذلك خلَقَ الجوهرَ الفردَ وأتقنَ صُنعَه..

ففي نظَرِ القدرةِ الجواهرُ الفردةُ كالنجوم السيارةِ، لأنَّ قدرتَه تعالى وعلمَه وإرادتَه وكلامَه لازمةٌ للذّات، وذاتيةٌ، فليستْ متجددةً ولا قابلةً للزيادة والنقصانِ ولا متغيرةً حتى يتداخلَ فيها المراتبُ؛ إذ العجزُ ضدٌّ لها لا يمكنُ تداخلُه بينها..

فلا فرقَ بين الذرةِ والشمسِ. إذ الممكنُ بتساوي طرفَيه كالميزان ذي الكَفَّتين، لا فرقَ في صرف القوةِ التي ترفعُ كفةً وتضعُ أخرى بين أنْ يكونَ في الكفتين شمسان أو ذرّتان..

وهكذا نسبةُ المقدوراتِ بالنسبة إلى القدرة الذاتيةِ اللازمةِ. وأما بالنسبةِ إلى قوّةِ الممكناتِ العارضَةِ المتغيرةِ المتداخَلِ بينها العجزُ فلا موازنةَ.

والحاصلُ:

أنَّ الذراتِ والأمورَ الخسيسةَ لمّا كانتْ مخلوقةً له تعالى كانتْ معلومةً له بالضرورةِ، فلا مُشاحّةَ بالبداهة أنْ يبحثَ عنها. وعلى هذا السرِّ قال:

﴿أَلاَ يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْـخَبِيرُ﴾ (الملك: ١٤).

فكيف لا يبحثُ عنها ولا يتكلَّمُ بها مَنْ عَلِمَ وهو العزيزُ الحكيمُ.

**دووهەم هەڵەیان ئەوەیە کە:**

ئەوان گومانیان وایە کە لە شێوازی قورئاندا، لە پشت قسەبێژەوە پەیکەری مرۆڤێك دەبینن. بە بەڵگەی ئەوەی کە لەسەر شێوەی گفتوگۆی نێوان مرۆڤ باس لەم شتە بێ نرخ و کاروبارە ئاساییانە دەکات..

ئایا ئەو خۆنەزانکەرانە بیر لەوە ناکەنەوە کە "گوفتار" هەروەك لە روویەکەوە دەڕوانێتە قسەبێژەکەی، لە چەندین رووی ترەوە دەڕوانێتە قسە بۆکراوەکەشی، وەك ئەوەی کە "ڕەوانبێژی" دەخوازێت گوفتار پڕاوپڕی حاڵی "قسە بۆکراو" بێت؟

جا مادەم "قسەبۆکراو" مرۆڤە و، باس لە حاڵەتەکانیەتی و، مەبەستیش تێگەیاندنیەتی، ئەوا قورئان ئەو شێوازەی مرۆڤی پۆشی کە تێکەڵی هەست و نەستەکانیەتی و، پێی دەوترێ: "دابەزاندنی گوفتارە خواییەکان بۆ ئاستی تێگەیشتنی ژیریی مرۆڤ" تاکو پێی ئاشنا بێت و لە لای نامۆ نەبێت. ئایا نابینی گەر گفتوگۆ لەگەڵ منداڵێکدا بکەیت، قسەکانی خۆت وەك هی منداڵ لێ دەکەیت؟

* لەگەر وتت:

سووکی و بێ نرخیی شتەکان، دژی گەورەیی توانست و، خاوێنیی گوفتارە؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

سووکی و بێ نرخی و ناشیرینێ لە رووی "مولـك"ی شتەکان و ئەو لایەنەیدایە کە دەڕوانێتە ئێمە و، بەپێی ڕوانینە رووکەش بینەکەی ئێمەیە. لەم رووەدا هۆکارە ڕواڵەتی‌یەکان وەك ناوەندێك دانراون بۆ خاوێن ڕاگرتنی مەزنایەتیی خوای گەورە..

بەڵام لە رووی "مەلەکووت"ی شتەکانەوە، ئەوا هەموویان روون و بەرز و بلندن. هەر ئەم رووەشە کە "توانست" پەیوەندیی پێوە دەکات و، لەم رووەدا هیچ شتێك لەم پەیوەندی‌یە بەدەر نی‌یە..

جا هەروەك "مەزنی"ی خوای گەورە داخوازی دانانی هۆکارە ڕواڵەتی‌یەکان بوون - لە رووی مولکدا - ئەوا "یەکتایی" و "عیززەت"ەکەشی - لە رووی مەلەکووتدا - داخوازی ئەوەن کە "توانست"ەکەی هەموو شتێك بگرێتەوە و "گوفتار"یشی دەوراندەوری هەموویان بدات.

وثانيةُ المغالَطاتِ:

هي أنَّهم يزعُمون أنَّهم يرَوْنَ في أسلوب القرآنِ خلفَ المتكلِّمِ تمثالَ إنسانٍ، بدليل البحثِ عن هذه الأشياءِ الحقيرةِ والأمورِ العاديةِ كأسلوب محاورةِ البشرِ..

أفلا يتذَكّرُ هؤلاء المتجاهلون أنَّ الكلامَ كما ينظرُ إلى متكلِّمه بجهةٍ؛ كذلك ينظرُ إلى المخاطَبِ به بجهاتٍ، على ما تقتضيه البلاغةُ للتطبيق على مقتضَى حالِ المخاطَبِ.

فلما كان المخاطَبُ بشراً وكان البحثُ عن أحواله والمقصدُ تفهيمَه، لبِسَ القرآنُ أسلوبَ البشرِ الممزوجِ بحسيّاتِه المسمَّى بـ"التنـزُّلات الإلهيةِ إلى عقول البشر" للتأنيس.. ألَا تراك إذا حاورْتَ مع صبيٍّ تتصبَّى له؟

* فإن قلتَ:

إنَّ حقارةَ الأشياءِ وخساستَها تُنافي عظمةَ القدرةِ ونزاهةَ الكلامِ؟

قيل لك:

إنَّ الحقارةَ والخساسةَ والقُبحَ وأمثالَها إنما هي بالنظرِ إلى ملكِ الأشياءِ وجهتِها الناظرةِ إلينا وبالنظر إلى نظرنا السطحيِّ، وقد وُضعَت الأسبابُ الظاهريةُ للتوسُّطِ في هذه الجهةِ لتنـزيه العظَمَةِ. وأما بالنظر إلى ملكوتيّة الأشياءِ فكلُّها شفّافةٌ عاليةٌ. وهذه الجهةُ هي محلُّ تعلّقُ القدرةِ، لا يخرُجُ من التعلّقِ شيءٌ..

فكما اقتضت العظمةُ وضعَ الأسبابِ في الظاهر، كذلك تستلزمُ الوحدةُ والعزةُ شمولَ القدرةِ لكلِّ وإحاطةَ الكلامِ به..

ئەوەش هەیە کە ڕەوانیی ئـەو قورئانـەی بـە گەوهـەرە یـەکتاکان لەسـەر گەردیلەیـەك نووسراوەتەوە، کەمتر نی‌یە لە ڕەوانیی ئەو قورئانەی کە بە مەرەکەبی ئەستێرەکان لەسەر لاپەڕەی ئاسمان نووسراوەتەوە.. هەروەها وردەکاریی بەدیهێنانی مێشوولە هیچی کـەمتر نی‌یە لە هی فیل. جا "گوفتار"یش بە هەمان شێوەی "توانست"ە.

* ئەگەر وتت:

کەواتە سووکیی ڕوالەتیی ئەم شتانە لەم نموونانەدا بۆچی دەگەڕێتەوە؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

تەنها بـۆ نموونـە بۆهێـنراو دەگەڕێتـەوە، نـەك نموونەهێنـەر. چونکـە هـەتا بـە جوانـتر پڕاوپڕی نموونە بۆ هـاتوو بێـت، پلـەی گوفتارەکە بەرزتر و ڕێسـای ڕەوانبێژی‌یەکەشی بالاتر دەبێت. ئایـا نـابینیت گـەر "پادشـا" پۆشـاکێکی شایستە بـە شـوانەکەی و، پارچـە ئێسـکێکی حـەزپێ کردووی سـەگیش بـدات بـە سـەگەکەی، پێـی نـاوترێ: کـارێکی نەشیاوی کردووە، بەڵکو دەوترێ: هەر یەك لەو دوو شتەی بە باشی لـە شـوێنی خۆیـدا داناوە؟!

کەواتـە هـەتا نموونـە بـۆ هێنراو سـووك بێـت، نموونەکەشـی سـووك دەبێـت.. هـەتا گەورەش بێت، گەورە دەبێت.

جـا لەبـەر ئـەوەی "بتـەکان" لـە هـەموو شـتێك نزمـترن، ئـەوا خـوای گـەورە مێشـی بەسەردا زاڵ کردوون و، لەبەر ئەوەش کـە پەرستنیان بـێ نرخـترینی شتانە، ئـەوا خـوای گەورە تانوپۆی جاڵجاڵۆکەی کردە ناونیشانی.

سێ‌هەم هەڵەیان:

ئەوانە دەڵێن:

چ پێویستی‌یەك بـە هێنانـەوەی ئـەم جۆرە نموونانـە هەیـە کـە ئامـاژە بـۆ دەستەوسـانی دەکات لە پیشاندانی حەقیقەتدا؟

وەڵام:

مـادەم ئامـانجی نـازڵکردنی قورئـان ڕێنمـایی جـەماوەرە، جـەماوەریش عـەوامن، عـەوامیش لـە پۆشـاکی ئەندێشـەکاندا نـەبێت ڕاستی‌یە پـەتی و ڕووتـەکان نـابینن، ئـەوا خوای گەورە بە سۆز و چاکـەی خۆی، پۆشـاکی شتانی پێ ڕاهـاتووی ئـەوانی بـە بـەر

على أنَّ القرآنَ المكتوبَ على ذرّةٍ بالجواهر الفردةِ ليس بأقلَّ جزالةً من القرآنِ المكتوبِ على صحيفةِ السماءِ بمِدادِ النجومِ، وأنَّ خِلقةَ الذُّبابِ ليستْ بأدنى صنعاً من خِلقة الفيلِ. فالكلامُ كالقدرة.

* فإن قلتَ:

إلى أيِّ شيءٍ تعودُ الحقارةُ الظاهريةُ في هذه التمثيلاتِ؟

قيل لك:

إنما تعودُ إلى الممثَّلِ له دون الممثِّلِ، فكلّما كانتْ مطابقتُه للممثَّلِ له أحسنَ، كانتْ درجةُ الكلامِ أعلى ونظامُ البلاغةِ أرفعَ. ألا ترى أنَّ السلطانَ إذا أعطَى راعيَه ما يليقُ به مِن اللباس وألقَى إلى الكلبِ ما يشتهيه من العَظْمِ.. الخ، لا يُقالُ إنّه فعلَ بدعةً، بل يُقالُ إنّه أحسَنَ بوضعِ كلِّ شيءٍ في موضعِه؟!

فإذنْ كلّما كان الممثَّلُ له حقيراً كان مثالُه حقيراً، وإن كانَ عظيماً فعظيماً.

ولما كانت الأصنامُ أدنَى الأمورِ سلَّطَ اللهُ الذبابَ على رؤوسِها. ولما كانت عبادتُها أهونَ الأشياءِ جعلَ اللهُ تعالى نسجَ العنكبوتِ عنوانَها.

وثالثةُ المغالَطاتِ:

أنّهم يقولون ما الحاجةُ إلى أمثال هذه التمثيلاتِ الموهِمَةِ إلى العجزِ عن إظهارِ الحقيقةِ؟

الجواب:

لمّا كان المقصدُ من إنزال التنـزيلِ إرشادَ الجمهورِ، والجمهورُ عوامٌّ، والعوامُّ لا يرَوْنَ الحقائقَ المحضـةَ والمجرَّداتِ الصِّرفةَ عُراةً عن مُتخيَّلاتِهم، ألبَسَ اللهُ تعالى بلُطفـه وإحسـانِه

ڕاستی‌یەکان پۆشی، تاکو بە باشی پێی ڕابێن. وەك لە باسی نـهێنیی "موتەشابیهەکان"دا پێشتر زانیت.

سەبارەت بە هۆنینی ڕستەکانیش لەگەڵ یەکتردا، ئەوا بزانە کە:

﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلاً مَا بَعُوضَـــةً فَمَـــا فَوْقَـــهَا﴾ پووچەڵکردنـەوە و بەدەرنانی زنجیرە ڕەخنە و بیانوویەکە.

وەك بڵێی ئەوان دەڵێن:

چ حیکمـەتێك هەیە لـە گفتوگۆکردنی خـوای گـەورە لەگـەڵ مـرۆڤ و، گلـەیی لێکردنیـان و، سـکاڵاکردن لێیـان؟ خـۆ ئەوانـە نیشـانەی ئـەوەن کـە مرۆڤیـش هەڵسوکەوتێکی تری لە جیهاندا هەبێت..

بە تایبەت لـە گفتوگۆیـەکدا کـە لـە هـی نێوان مرۆڤ بچێـت، کـە نیشانەی ئەوەیە قسـەی مـرۆڤ بێـت.. بـە تایبـەت کـە لـە پشـتی گوفتارەکـەوە وێنـەی مرۆڤێـك دەردەکەوێت.. بە تایبەت لە ڕێی چەند وێنەکێشان و نموونە هێنانەوەیەکەوە کە نیشانەی دەستەوسانی‌یە لە دەرخستنی حەقیقەتدا.. بە تایبەت ئەگەر نموونـەکان ئاسایی بن، ئـەوا نیشانەی کورت هێنانی زەینی قسەبێژە.. بە تایبەت بە باسکردنی چەند شتێکی بێ نرخ، کە ئەوەش نیشانەی سووکیی قسەبێژە.. بە تایبەت ئەو نموونانەی کە لەوانە بێت کە هیچ پێویستی‌یەکی ناچاری بۆ هێنانی نەبێت و باس نەکردنی باشـتر بێـت.. بـە تایبـەت ئەگـەر هەندێ لەو شتانە لەوانە بن کە خەڵکانی بەرز و پایەدار شەرم لـە باسـکردنی بکـەن.. بـە تایبەت ئەگەر ئەوەی باسیان دەکات خاوەنی مەزنایەتی و شکۆمەندی بێت..

قورئـان بـە یـەك جـار وەڵامـی هـەمووی دایـەوە و، هـەر لـە سـەرەتاوە هـەتا کۆتـایی زنجیرەکەی ڕووخاند و، فەرمووی:

﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَحْيِي...﴾ هتد..

چونکە لایەنی "مەلەکووت"ی شتەکان دژی مەزنایەتی و شکۆمەندی نی‌یە..

کەواتە وازی لـێ ناهێنێت و پشتگوێی ناخات، چونکە خوایەتی ئەوە دەخوازێت..

کەواتـە نموونـە بـە شـتە سـووکەکان دەهێنێتـەوە بـۆ واتـا سـووکەکان، چونکـە "دانست"ەکەی هاوکات لەگەڵ نهێنیی "ڕەوانبێژی"دا وا دەخوازن..

الحقائقَ لباسَ مألوفاتِهم لتحسُنَ ألفتُهم كما عرفتَ في سرِّ المتشابهاتِ.

أما نظْمُ الجُمَلِ بعضٍ مع بعضٍ..

فاعلمْ أنَّ ﴿إِنَّ اللهَ لاَ يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلاً مَا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا﴾ ردٌّ وطردٌ لاعتراضاتٍ متسلسلةٍ. كأنّهم يقولون:

أيّةُ حكمةٍ في مكالمةِ الله تعالى مع البشرِ، وعتابِه عليهم، والتشكّي منهم؛ فإنّها علامةٌ أنَّ للإنسان أيضاً تصرُّفاً آخرَ في العالَمِ؛ لاسيّما كالمحاورة الجاريةِ بين الناس فإنَّها علامةٌ أنّه كلامُ البشرِ.. ولاسيّما يتراءَى مِن خَلفِ الكلامِ تمثالُ إنسانٍ.. ولاسيّما بتصويراتٍ وتمثيلاتٍ فإنّها علامةُ العجزِ عن إظهار الحقيقةِ.. ولاسيّما إذا كانت التمثيلاتُ عاديةً فإنّها علامةُ انحصار ذهنِ المتكلمِ.. ولا سيّما بأمورٍ حقيرةٍ فإنّها علامةُ خفّةِ المتكلّمِ.. ولاسيّما إذا كانتْ مما لا اضطرارَ إليه وكانَ تركُه أولَى.. ولاسيّما إذا كانَ بعضُ تلكَ الأمورِ مما يستحي أهلُ العزّةِ عن البحثِ عنه.. ولاسيّما إذا كانَ الباحثُ ذا العظمةِ والجلالِ..

فأجابَ القرآنُ هدماً لهذه السلسلةِ من المبدأِ إلى المنتهَى بضربةٍ واحدةٍ فقالَ:

﴿إِنَّ اللهَ لاَ يَسْتَحْيِي...﴾ الخ..

لأنَّ جهةَ الملكوتيةِ لا تُنافي العظمةَ والجلالَ فلا يتركُها ولا يُهمِلُها؛ إذ الألوهيةُ تقتضي كذلك..

فإذنْ يمثِّل بالأمور المحقَّرَةِ للمعاني المحَقَّرةِ؛ إذ حكمتُه مع سرِّ البلاغةِ هكذا تقتضي..

كەواتە نموونە ئاساییەكان باس دەكات، لەسەر ئەو بناغەیەی كە هەر ئەوە لەگەڵ "پەروەردە" و "ڕێنمایی"دا یەك دەگرێتەوە..

كەواتە بە چەند نموونەهێنانەوەیەك وێنەی ڕاستییەكان دەكێشێت، ئەوەش بەپێی خواستی "چاودێری" و "دابەزینەكانی گوفتاری خواوەند بۆ ئاستی تێگەیشتنی مرۆڤ"..

كەواتە شێوازی گفتوگۆی نێوان مرۆڤەكان هەڵدەبژێرێت، بە گوێرەی ئەوەی كە "پەروەردگاریتی" لەگەڵ "پەروەردە"دا دەیخوازێت..

كەواتە لەگەڵ خەڵكدا دەدوێت، بەپێی ئەوەی كە "دانست" لەگەڵ "ڕێسا"دا داخوازی دەبن.

بە پوختی: لەبەر ئەوەی خوای گەورە "جوزئێكی ئیختیاری"ی لە مرۆڤدا دانا و، كردی بە "چاوگ"ێك بۆ جیهانی "كردار"ەكان، ئەوا گوفتارەكەی خۆی نارد تاكو ئەو جیهانە ڕێك بخات.

هۆنینی ڕستەی ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ ءامَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ﴾یش ئەوەیە كە:

لە ڕستەی یەكەمدا لە بابەتی دەعواكە دوا.. بەم ڕستەیەش ئاماژەی بۆ ڕێگای بەڵگەكەی كرد. هەروەها ئاماژە و هێمای بە چۆنێتیی بەدەرنانی گومانەكانیش دا..

واتە كەسێك بە نووری ئیمان و لە لای خوای گەورەوە و لە لایەنی توانستی خواوە بڕوانێت و، دانست و چاودێری و پەروەردگارێتییەكەی ئەو لە پێش چاوی خۆی دابنێت، دەزانێت ئەوە "حەق" و "ڕەوانبێژی"یە..

بەڵام كەسێك لە لای هەرە خوارووی دەروونی خۆیەوە و لە لایەنی ڕووی "مومكینات"ەوە ڕوانیی، ئەوا بێ گومان وەهمەكان هەڵی دەدەنە خوارەوە..

نموونەی ئەم دووانە وەك هی دوو كەسە كە بە ڕێگایەكی لێژدا یەكێكیان بەرەو سەر و ئەوی تریان بەرەو خوار بڕوات و، جۆگەلە ئاوێك ببینن..

یەكێكیان سەردەكەوت و سەرچاوەكەی دەبینی و لێی دەخواردەوە، ئیتر دەیزانی كە هەموو ئاوەكە سازگارە و، ڕێی لە هەر ئاوێكی لقەكانی ئەو جۆگەلانە بكەوتایە دەیزانی - تەنانەت بە نیشانەیەكی لاوازیش بووبێت - كە سازگارە. ئیتر وەهمەكان - چەندەش بەهێز بن - ناتوانن بە هەڵەیدا ببەن..

فإذنْ يذكُرُ التمثيلاتِ العاديةَ بناءً على أنّها الموافقةُ للتربية والإرشادِ.. فإذنْ يصوِّرُ الحقائقَ بتمثيلاتٍ بناءً على ما تقتضيه العنايةُ مع التنـزُّلات الإلهيةِ.. فإذنْ يختارُ أسلوبَ محاورةِ البشرِ بعضٍ مع بعضٍ بناءً على ما تقتضيه الربوبيةُ مع التربية.. فإذنْ يتكلَّمُ مع الناسِ بناءً على ما تقتضيه الحكمةُ مع النظامِ.

**والحاصلُ:**

أنَّ اللهَ تعالى لمّا أودعَ في الإنسان جُزءاً اختيارياً وجعلَه مصدراً لعالَمِ الأفعالِ، أرسلَ كلامَه لِيُنَظِّمَ ذلك العالَمَ.

وأنَّ نظْمَ جملةِ ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾.. هو أنّه لمّا ذكَرَ في الأولى المدَّعَى، أشارَ بهذه إلى طريق دليلِه. وكذا رمَزَ وأومأَ إلى وجه دفعِ الأوهامِ..

أي مَن نظرَ بنور الإيمانِ ومِن جانبِ الله تعالى ومِن جهة قدرتِه - جاعلاً حكمتَه وعنايتَه وربوبيتَه نُصبَ العينِ - عَلِمَ أنّه حقٌّ وبلاغةٌ..

وأمّا مَن نظرَ مِن جانبِ حضيضِ نفسِه، ومِن جهة الممكناتِ، فلا جَرَمَ ستهوي به الأوهامُ.

ومثَلُهما كمثَلِ شخصين مُصْعِداً منحدِراً[1] رأيا جداولَ ماءٍ؛ أما أحدُهما فيصعَدُ ويرَى رأسَ العينِ ويذوقُ فيعلَمُ أنَّ الماءَ كلَّه عَذْبٌ؛ فكلّما يصادفُ قطعةَ ماءٍ من تفرُّعاتِ الجداولِ يتفطَّنُ - ولو بأمارةٍ ضعيفةٍ - أنّه عَذْبٌ، فلا تقدِرُ الأوهامُ - ولو قويّةً - على تغليطِه.

---

(١) قال ابن عقيل في شرح الألفية في مثل هذا وهو "لقيت زيداً مصعداً منحدراً": يكون مصعداً حالاً من زيد و منحدراً حالاً من التاء (أي القائل).

بەڵام ئەوی تریان بەرەو خوار دەڕوات و لە لای لقەکانەوە دەڕوانێت و سەرچاوەکە نابینێت، بۆیە بۆ زانینی سازگاریی هەموو بەش و لقێکی ئاوەکە پێویستی بە بەڵگەیەکی یەقینی دەبێت، چونکە بچووکترین وەهم دەیخاتە گومانەوە..

یان بە وێنەی دوو کەسن کە ئاوێنەیەك لە نێوانیاندا هەبێت، یەکێکیان سەیری ڕووە ڕوونەکەی بکات و، ئەوی تریشیان ڕووە ڕەنگاوڕەنگەکەی!

دەرەنجام: بۆ ڕوانین لە سنعەتی خوا، دەبێ لە لای خوای گەورەوە سەیری بکرێت، لەگەڵ ڕەچاوکردنی "چاودێری" و "پەروەردگاریێتی"یەکەی. ئەم ڕوانینەش تەنها بە نووری ئیمان دەبێت. ئیتر ئەو کاتە وەهمەکان - چەندەش بەهێز بن - لە تانوپۆی جاڵجاڵۆکە لاوازتر دەبن..

بەڵام ئەگەر لە لایەنی "مومکینات" و، بە چاوی کرپار و، بە بیرە جوزئیەکەی مرۆڤ، سەیری ئەو سنعەتەی خوا بکرێت، ئەوا وەهمە لاوازەکان لە پێش چاویدا بەهێز دەبن و، حەقیقەتیش خۆی لێ دەشارێتەوە، بە وێنەی ئەوەی کە باڵەمێشێك (لەسەر پێڵووی چاو) ڕێ لە بینینی چیای جوودی دەگرێت.

هۆی هۆنینی ڕستەی ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُواْ ...﴾ هتد، ئەوەیە کە:

لەبەر ئەوەی ڕێی تێگەیشتنی لە "حیکمەتی شێوازی نموونەکان" پیشان دا - کە ڕوانینە بە نووری ئیمان لە لایەنی "واجب الوجود"ەوە - لێرەشدا ڕێگاکەی بەرامبەری ئەوی ڕوون کردەوە، کە شوێنی سەرهەڵدانی گومان و بڕوبیانووەکانە، ئەوەش ڕوانینە لە لایەنی کەسەکە خۆیەوە و بە تاریکایی ئەو کوفرەی کە هەموو شتێك تاریك پیشان دەدات. هاودەم لەگەڵ نەخۆشیی "دڵ"یشدا کە سووکەڵەترینی وەهم و گومانی پێ قورس دەبێت. پاشان ئەو کەسە ڕێی حەق ون دەکات، پاشان دەکەوێتە گومان، پاشان دەکەوێتە پرسیار، ئنجا نکوولی کردن..

جا قورئان بە پوختی و، بە کینایە و، بۆ ئاماژەدان بە پرسیارە نکوولی بەخشەکەیان، فەرمایشتی ﴿مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلاً﴾ی لە بریی "لا یعلمون" هێنا کە بە ڕواڵەت پراوپڕی فەرمایشتەکەی پێشوویەتی[1].

(١) واتە لەو "لا یعلمون"ەی کە بە ڕواڵەت پراوپڕی ئەم فەرمایشتەی پێشوویەتی: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعْلَمُونَ...﴾.. هتد. (وەرگێڕ)

وأما الآخَرُ فيَتَسَفَّلُ وينظرُ مِن جانبِ التفرُّعاتِ ولا يرَى منبعَ العينِ فيحتاجُ لمعرفةِ عذوبةِ كلِّ قطعةِ ماءٍ إلى دليلٍ قطعيٍّ. فأدنى وهمٍ يُورِّطُه في الشبهة..

أو كمثالِ شخصين بينهما مرآةٌ ينظرُ أحدُهما إلى الوجه الشفّافِ، والآخَرُ إلى الوجه الملوَّنِ!

والحاصلُ:

أنَّه لابدَّ في النظر إلى صنعِه تعالى أنْ يُنظَرَ إليه مِن جانبه تعالى، مع ملاحظةِ عنايتِه وربوبيتِه. وليسَ هذا النظرُ إلّا بنور الإيمانِ، ولا تكونُ الأوهامُ حينئذٍ - ولو قويَّةً - إلّا أوهَنَ مِن بيت العنكبوتِ.

ولو نُظِرَ إليه مِن جهة الممكناتِ بنظر المشتري وبفكرِه الجزئيِّ لقويتْ في عينه الأوهامُ الضعيفةُ فيتستَّرُ عنه الحقيقةُ كما يمنعُ جناحُ بعوضةٍ رؤيةَ العينِ لجبلِ الجوديِّ.

وأنَّ نظمَ جملةِ ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُواْ ...﴾ الخ هو: أنَّه لمّا أرَى طريقَ فهمِ حكمةِ أسلوبِ التمثيلاتِ - وهي النظرُ بنور الإيمانِ من جانب الواجبِ الوجودِ - بيّنَ هنا الطريقَ المقابلَ الذي هو منشأُ الأوهامِ والتعلُّلاتِ، بأنْ ينظرَ من طَرَف نفسِه بظلمةِ الكُفر التي تصوِّرُ كلَّ شيءٍ مُظلِماً مع مرضِ القلبِ الذي يَثقُلُ به أخفُّ وَهْمٍ، ثم يضِلُّ طريقَ الحقِّ ثم يتردَّدُ ثم يستفهِم ثم يُنكِرُ.

فالقرآنُ بالإيجاز والكنايةِ أوردَ - إشارةً إلى استفهامِهم الإنكاريِّ - قولَه: ﴿مَاذَا أَرَادَ اللهُ بِهَذَا مَثَلاً﴾ بدلَ "لا يعلمون" مع أنَّه المطابقُ للسابقِ ظاهراً.

هۆی هۆنینی ڕستەی ﴿يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً وَيَهْدِي بِهِ كَثِيراً﴾ ئەوەیە کە وەڵامە بۆ شێوە پرسیاری ئەوان. چونکە لەبەر مەبەستی ئەوپەڕی کورتکردنەوە، "دەرەنجام" و "کۆتایی" لە شوێنی "هۆکارە ئامانج"دا دانراوە. وەك ئەوەی کە ئەوان بپرسن و بڵێن: لەبەر چی قورئان ئاوەها بوو؟ بۆچی ئیعجازەکەی ئاشکرا و بێ گومان نەبوو؟ بۆچی ئەوەی کە گوفتاری خوایێت بەڵگەنەویست نییە؟ بۆچی بەهۆی ئەم نموونانەوە بووەتە مایەی سەرهەڵدانی گومانەکان؟

قورئان بە فەرمایشتی ﴿يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً وَيَهْدِي بِهِ كَثِيراً﴾ وەڵامی هەمووی دایەوە.

واتە: لەبەر ئەوەی هەر کەسێك بە نووری "ئیمان" بیری لێ بکاتەوە، پتر ڕووناکی بەدەست دەهێنێت و، هەر کەسێکیش بە تاریکیی "کوفر" و ڕەخنەگرتنەوە بیربکاتەوە، تاریکیەکانی ناخی دەروونی زیاتر دەبن.. ئەوەش لەبەر ئەوەی کە شتێکی نەزەرییە، نەك بەڵگەنەویست.. ئەمەش لەبەر جیاکردنەوەی ڕۆحە ساف و پاك و بڵندەکانە لە ڕۆحە لێڵە نزمەکان.. ئەمەش لەبەر جیاکردنەوەی ئەو توانا و لێهاتنانەیە کە بە نەشونما بڵند دەبن، لە توانا و لێهاتنە چەپەڵەکان.. ئەمەش بۆ جیاکردنەوەی فیترەتی ڕاست و دروستە بە خۆ کامڵ کردن و موجاهەدە و تێکۆشان، لە فیترەتی تێکچووی گەنیو.. ئەمەش لەبەر ئەوەی کە تاقیکردنەوەی مرۆڤ وا دەخوازێت.. ئەمەش لەبەر ئەوەی حیکمەتی ئیمتیحان داوای دەکات.. ئەمەش لەبەر ئەوەی کە نهێنیی "تەکلیف" کە بۆ کامڵ کردن و بەختەوەریی مرۆڤە، ئەوە دەخوازێت.

دەبینی قورئان وەڵامەکەی خۆی کورت کردەوە.

* ئەگەر وتت:

تۆ وتت: "ئەرك پێ سپاردن" بۆ دابینکردنی بەختەوەریی مرۆڤە. کەچی دەبێتە هۆی بەدبەختیی زۆرینە و، گەر ئەو نەبوایە جیاوازییەکەی نێوانیان هەتا ئەم ڕادەیە نەدەبوو؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

خوای گەورە هەروەك تەکلیفی جوزئی ئیختیاریی کردووە کە لە ڕێی "بەدەستهێنان"ەکەی خۆیەوە جیهانی کردارە ئیختیارییەکان پێکبهێنێت، بە هەمان جۆر "ئەرك پێ سپاردن"یشی کرد بە مایەی ئاودێری و ڕواندنی ئەو تۆوە بێ سنوورانەی کە لە ڕۆحی مرۆڤدا دانراون. خۆ ئەگەر ئەو ئەرك پێ سپاردنە نەبوایە، ئەو دەنك و تۆوانەش بە وشکی دەمانەوە..

وأنَّ نظمَ جملةِ ﴿يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً وَيَهْدِي بِهِ كَثِيراً﴾ هو: أنَّها جوابٌ عن صورةِ استفهامِهم؛ فلغايةِ الإيجازِ نُزِّلَ الغايةُ والعاقبةُ منـزلةَ العلّةِ الغائيّةِ، كأنَّهم يسألون ويقولون: لأيِّ شيءٍ كان هكذا؟ ولِمَ لَمْ يكنْ إعجازُه بدَهِياً؟ ولِمَ لَمْ يكنْ كونُه كلامَ اللهِ ضرورياً؟ ولِمَ صارَ معرضَ الأوهامِ بسببِ هذه الأمثالِ؟

فأجابَ القرآنُ بقوله: ﴿يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً وَيَهْدِي بِهِ كَثِيراً﴾..

أي لأجْلِ أنَّ مَنْ تفكّرَ فيه بنور الإيمانِ ازدادَ نوراً، ومَن تفكّرَ بظلمة الكفرِ والتنقيدِ ازدادَ ظُلمةً.. وهذا لأجْلِ أنّه نظريٌّ ليس بدَهياً.. وهذا لأجْلِ تفريقِ الأرواحِ الصافيةِ العُلويةِ عن الأرواحِ الكَدِرةِ السُّفليّةِ.. وهذا لأجْلِ تمييزِ الاستعداداتِ العاليةِ بالنشوءِ والنماءِ عن الاستعدادات الخبيثةِ.. وهذا لأجْلِ تمييزِ الفطرةِ الصحيحةِ بالتكمُّلِ والمجاهدَةِ والاجتهادِ عن الفطرةِ المتفسِّخةِ الفاسدةِ.. وهذا لأجْلِ أنَّ امتحانَ البشرِ يستلزمُه.. وهذا لأجْلِ أنَّ الابتلاءَ يقتضيه.. وهذا لأجْلِ أنَّ سرَّ التكليفِ لتكميلِ البشرِ وسعادتِه يستلزمُه..

فأوجَزَ التنـزيلُ في الجوابِ.

* فإن قلتَ:

قد قلتَ إنَّ التكليفَ لتأمين سعادةِ البشرِ، معَ أنّه يكونُ سبباً لوقوعِ الأكثرِ في الشقاوةِ، ولولاه لما صارَ التفاوتُ بهذه الدرجةِ؟

قيل لك:

إنَّ اللهَ تعالى كما كلّفَ الجزءَ الاختياريَّ بكسبِه تشكيلَ عالَمِ الأفعالِ الاختياريةِ؛ كذلك جعلَ التكليفَ سببَ إسقاءِ وإنباتِ البذورِ الغيرِ المحصورةِ المودَعةِ في روح البشرِ. ولولاه لبقيَت الحبوباتُ يابسةً.

ئەگەر بە ڕوانینێکی ناخ بین لە حاڵەتەکانی جۆری مرۆڤ ڕابمێنیت، دەبینیت کە:

هەرچی بەرزبوونەوەی مەعنەویی "گیان" هەیە و، هەموو خۆ کامڵ کردنەکانی "ویژدان" بە فەرمانە خواییەکان و، سەرجەم خۆ کامڵ کردنەکانی "ژیری و، هەرچی پێشکەوتنە بەرهەم بەخشەکانی "بیر"ی مرۆڤ هەن کە لە ڕادەیەکدان ژیرییەکان سەرسام دەکەن.. هەموو ئەمانە، لە ڕێی "تەکلیف"ەوە پەیدا بوون و.. تەنها بە "ناردنی پێغەمبەران" - درووردیان لەسەر بێت - بێدار بوونەوە و.. بە "شەریعەتەکان" پیتێنران و.. ئەوانیش تەنها لە "ئایینەکان"ەوە ئیلهامیان پێ بەخشرا. گەر ئەو ئایینانە نەبوونایە ئەوا مرۆڤ بە وێنەی ئاژەڵ دەمایەوە و، هیچ کام لەم کەماڵاتانەی ویژدان و هیچ یەکێك لەم ڕەوشتە جوانانەش نەدەبوون..

ئیتر بەشە کەمەکە، بە هەڵبژاردن و ویستی خۆیان "تەکلیف"یان قبووڵ کرد. بەوەش بەختەوەریی کەسیی خۆیان بەدەست هێنا، وێڕای ئەوەی کە بوونە هۆی بەختەوەریی جۆری مرۆڤیش.

بەشەکەی تر کە بە چەندایەتی زۆرن، هەرچەندەش لە دڵەوە و لەو شتانەدا کە تیایدا سەرپشك و سەربەستن، کافر بوون. بەڵام لەبەر ئەوەی هەموو حاڵێکی هەموو کافرێك کافر نییە و، هەموو سیفەتێکیشی کافر و وشك و برنگ نییە، ئەوا بەهۆی ئەوەی کە "ناردنی پێغەمبەران" هەستە ویژدانییەکانی لەخەو هەڵساند و، "پێغەمبەرێتی"ش ڕەوشتەکانی بێدار کردەوە و ، بەهۆی بەرگوێ کەوتنی "شەریعەتەکان" و ناسراویی ئاسەوارەکانیان لەناو مرۆڤدا، ئەو بەشە وایان لێ هات کە جۆرە "ئەرك"ێکی ناچاری قبووڵ بکەن.

* ئەگەر وتت:

بەختەوەریی کەمینە هاوکات لەگەڵ بەدبەختیی زۆرینەدا چۆن دەبێتە مایەی بەختەوەریی "جۆر"ی مرۆڤ هەتا شەریعەت ببێتە "میهرەبانی" بۆیان، لە کاتێکدا کە بەختەوەریی "جۆری مرۆڤ" بە بەختەوەریی هەموویان، یاخود زۆربەیان دەبێت؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

ئەگەر سەد هێلکەت هەبێت و باڵندەیەکت لەسەر کڕخستن، لە ئەنجامدا بیست دانەیان جووجەڵەیان هەڵهێنا و هەشتاکەیان پیس بوون، ئایا ناڵێیت ئەم جۆرە زیندەوەرە کامڵ بووە؟ چونکە نرخی ژیانی بیست دانەکە یەکسانە بە هەزاران دانە هێلکە..

وإذا تأملتَ في أحوال النوعِ بنظرٍ نافذٍ رأيتَ كلَّ ترقيّاتِ الروحِ المعنويةِ، وكلَّ تكمُّلاتِ الوجدانِ الإلهيةِ وتكمُّلاتِ العقلِ، وترقيّاتِ الفكر المُثمْرةِ بدرجةٍ تحيِّرَ فيها العقولُ إنما وُجدتْ كافّةً بالتكليف.. وإنَما استيقظتْ ببعثةِ الأنبياءِ.. وإنّما تلقّحَتْ بالشرائع.. وإنّما أُلهمَتْ مِن الأديانِ. ولولاها لبقِيَ الإنسانُ حيواناً ولانعدمتْ هذه الكمالاتُ الوجدانيةُ وتلك المحاسنُ الأخلاقيةُ..

أما القسمُ القليلُ فقبِلوا التكليفَ اختياراً ففازوا بالسعادة الشخصيةِ وصاروا سبباً للسعادة النوعيةِ..

وأما القسمُ الكثيرُ كميةً فهم وإنْ كفروا بقلوبِهم وفيما هم فيه مختارون، لكنْ لمّا لم يكنْ كلُّ حالٍ كلِّ كافرٍ كافراً وكلُّ صفتِه كافرةً يابسةً، كانوا بسبب إيقاظِ البعثةِ للحسّياتِ الوجدانيةِ، وتنبيهِ النبوةِ للسجايا الأخلاقيةِ، وبتسامُعِ الشرائعِ، وتعارُفِ آثارِها بحيث قد قَبِلوا أنواعاً من التكليف اضطراراً.

* فإن قلتَ:

سعادةُ القليل مع شقاوةِ الكثير كيف تكونُ مَظهراً لسعادة النوعِ حتى تكونَ الشريعةُ رحمةً، مع أنَّ سعادةَ النوعِ إنما تكونُ بالكلِّ أو الأكثرِ؟

قيلَ لك:

إذا كان لك مائةُ بيضةٍ ووضعتَها تحتَ طيرٍ، فافرخَتْ عشرين وأفسدتْ ثمانين؛ أفلا تقولُ قد تكمَّلَ هذا النوعُ؟ إذ حياةُ عشرين تساوي ألوفَ بيضةٍ.

یان ئەگەر سەد دانە ناوکە خورمات هەبوو، ئنجا ئاودێریت کردن و، بیست دانـەیان بوونـە دارخورمـای باڵابـەرز و، هەشـتاکەیان لـە گڵـدا ڕزان، ئایـا نـاڵێیت "ئـاو" بەختەوەرییە بۆ ئەم جۆرە ڕووەکە؟

یان ئەگەر کانزایەکت هەبوو، ئنجا ئـاگرت بەسەردا زاڵ کرد و، ئاگرەکەش پێنج یەکی ئەو کانزایـەی پوخـت و پاڵفتە کرد و زێڕی لـێ دەرچوو، پاشماوەکەشی کردە خەڵووز و خۆڵەمێش، ئایا "ئاگر"ەکە نابێتە هۆی کەماڵ و بەختەوەریی ئەو کانزایە؟

ئەمە بکە بە پێوەر بۆ شتی تریش..

کەواتە سەرهەڵدانی هەست و نەستە بەرزەکان و گەشـەکردنی ڕەوشتە جوانـەکان، تەنها بە "موجاهەدە"ی دژەکانیان دێتە دی و، خۆ کاملکردنی شتەکانیش تەنـها لـە ڕێی بەرامبەربوونـەوە و پاڵپـاڵێنی دژ بـە یەکـەکان دروسـت دەبێـت. ئایـا نـابینی گــەر حکوومەتێك جیهاد بکات، "ئازایەتی" گەشە دەکات و، گەر وازیشی لـێ بـهێنێت ئـەو ئازایەتییە دەکوژێتەوە؟ دەسا بیری لـێ بکەرەوە!

هۆنینی ڕستەی ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلاَّ الْفَاسِقِينَ﴾ ئەوەیە کە:

قورئان کاتێ لە ﴿يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً﴾دا بـە تـەماوی و نادیـاری دوا، زەینی بیسـەر بێـدار بووەوە و، "ترسا" و، پرسی: ئەو گومڕایانە کێن؟ بۆچی بوونەتە گومـڕا؟ ئایـا لـە نـووری قورئانەوە تاریکی دێت؟

وەڵامـی دانــەوە کــە: ئەوانــە لــە ڕێ لادەرەکــانن و، گومڕاکردنەکەشـیان سـزای لادانەکەیانە و، بەو لــە ڕێ لادانـەش "نـوور" سـەبارەت بـەو کەسـە لـە ڕێ لادەرە دەبێتـە ئاگر و، "ڕووناکی"ش دەبێتە تاریکی. ئایا نابینی ڕووناکیی خۆر دەبێتە هۆی گەنینی ئەو شتەی کە ماددەکەی چەپەڵ بێت؟

هۆی وەسف کردنیشیان بە فەرمایشتی ﴿الَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ اللهِ مِنْ بَعْـــدِ مِيثَاقِـــهِ وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللهُ بِهِ أَنْ يُوصَـــلَ وَيُفْسِـــدُونَ فِـــي الأَرْضِ﴾ ئەوەیـە کـە ئەمـە ڕاڤـە و دەرخستنی لـە ڕێ لادان (فسق)ە. چونکـە "لـە ڕێ لادان" ترازانـە لـە حـەق و، سـنوور بەزاندنە و، دەرچوونە لە توێکڵی توندوتـۆڵ و قـایم. ئـەوەش تەنـها بـە "زیـادەڕەوی" یـان "کورتبڕی" دەبێت لـە سێ هێزەکەدا: هێزی ژیری و، تووڕەیی و، ئارەزوو..

أو كان لك مائةُ نواةِ تمرٍ فأسقيتَها بالماء فصار عشرون منها نخلاتٍ باسقاتٍ وتفسّخَ ثمانون، أفلا تقولُ: الماءُ سعادةٌ لهذا النوعِ؟

أو كان لك معدِنٌ فسلطتَّ عليه النارَ فأصفَتْ خُمسَه ذهباً وصيَّرتِ الباقيَ فحماً ورماداً، أفلا تكونُ النارُ سببَ كمالِه وسعادتِه؟

وقِسْ على هذا!

فإذنْ نشوءُ الحسيّاتِ العاليةِ ونموُّ الأخلاقِ إنما هو بالمجاهدة، وتكمُّلُ الأشياءِ إنما هو بمقابلة الأضدادِ ومزاحمتِها. ألا تَرَى أنَّ حكومةً إذا جاهَدَتْ ينمو فيها الجسارةُ وإذا تَرَكَتْ انطفأتْ.. تأمَّلْ!

وأنَّ نظمَ جُملةِ ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلاَّ الْفَاسِقِينَ﴾ هو:

أنَّه لمّا أبهمَ في ﴿يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً﴾ انتبهَ ذهنُ السامعِ وخافَ فاستفسرَ قائلاً: مَن هم الضالون؟ وما السببُ؟ وكيف تجيءُ الظُلمةُ مِن نور القرآنِ؟

فأجابَ بأنهم الفاسقون، وأنَّ الإضلالَ جزاءٌ لفسقِهم، وبالفسقِ ينقلبُ النورُ في حقِّ الفاسقِ ناراً والضِّياءُ ظُلمةً. ألا تَرَى أنَّ ضياءَ الشمسِ يُعفِّنُ ما استقذرَتْ مادَّتُه.

وأنَّ وجهَ التوصيف بقوله: ﴿الَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ اللهِ مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ﴾ هو أنَّه شرحٌ وكشفٌ للفسقِ. إذ الفسقُ عدولٌ عن الحقِّ، وتجاوزٌ عن الحدِّ، وخروجٌ من القِشْرِ الحصين. وأنَّ الفسقَ إنما هو بالإفراط أو التفريط في القُوى الثلاثِ التي هي: القوّةُ العقليةُ، والغضَبيةُ، والشَّهَويّةُ..

زیادەڕەوی و کورتبڕی، هۆکاری سەرپێچی کردنن لە بەرامبەر ئەو بەڵگانەی کە بە وێنەی پەیمانی خوای گەورەن لە فیترەتی مرۆڤدا..

هەروەها دوو هۆکارن بۆ نەخۆش کەوتنی ژیانی دەروونیی مرۆڤ. جا بە سیفەتی یەکەم (پەیمان شکاندن) ئاماژە بۆ ئەمە کراوە..

هەروەها دوو بزوێنەری سەرپێچی کردنن بەرامبەر بە ژیانی کۆمەڵایەتی و، بۆ پەرت کردنی پەیوەندی و یاسا کۆمەڵایەتی‌یەکان. ئەمەش بە سیفەتی دووهەم (پەیوەندی پچڕاندن) لێرەدا ئاماژەی بۆ کراوە..

هەروەها ئەم دووانە هۆکاری خراپکاری و پشێوین، کە ئەمەش سەری لە تێکچوونی سیستەمی زەوی‌یەوە دەردەچێت. بە سیفەتی سێ‌هەم (خراپە نانەوە لە زەویدا) لێرەدا ئاماژە بۆ ئەمە کرا.

بەڵێ، کەسی لە قاوغ دەرچوو(فاسق)، بە سنووربەزاندنی "هێزی ژیری"یەکەی، لە سنووری "میانەڕەوی"، پەیوەستی بیروباوەڕەکان پەرت دەکات و، بەرگە قایمەکەی دەدڕێنێت، "کە ژیانی هەمیشەیی"یە..

هەروەها بە سنوور بەزاندنی "هێزی تووڕەیی"یەکەی، توێکڵی ژیانی کۆمەڵایەتی پەرت دەکات..

هەروەها بە سنوور بەزاندنی "هێزی ئارەزووە ئاژەڵانە"کەی و، شوێنکەوتنی هەوا و ئارەزوو، شەفەقەت بەرامبەر هاوڕەگەز لە دڵی خۆیدا لادەبات. ئیتر خراپە دەنێتەوە و، خەڵکی گرفتاری ئەو شتە دەکات کە خۆی گیرۆدەی بووە. بەوەش دەبێتە هۆی زیاندان لە جۆرەکەی و نانەوەی خراپەکاری لە زەویدا.

هۆی هۆنینی ڕستەی ﴿أُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾یش، ئەوەیە کە:

کاتێ لە تاوانەکانی کەسی "لە ڕێ لادەر" دوا و، بەوەش ترسی خستەبەر، بە سزا و دەرەنجامەکەشی جەختی لەو هەڕەشەیە کردەوە، تاکو ترساندنەکە کاریگەر بێت و، فەرمووی: ئەوانەن کە بە "فرۆشتنی ئاخیرەتیان بە دنیا" و گۆڕینەوەی "هودا" بە "هەوا" دووچاری زیان بوون.

وأنَّ الإفراطَ والتفريطَ سببان للعصيان في مقابلة الدلائلِ التي كالعهود الإلهيةِ في الفطرة..

كذا وسيلتان لمَرَض الحياةِ النفسيةِ، وأُشيرَ إلى هذا بالصفة الأُولى..

وكذلك محرِّكان للعصيان في مقابلة الحياةِ الاجتماعيةِ وتمزيقِ الروابطِ والقوانين الاجتماعيةِ، وأُشيرُ إلى هذا بالصفة الثانيةِ..

وأيضاً هما سببان للفساد والاختلالِ المنجَرِّ إلى فساد نظامِ الأرضِ، وأُشيرَ إلى هذا بالصفة الثالثةِ.

نعم، إنَّ الفاسقَ بتجاوزِ القوةِ العقليةِ عن حدِّ الاعتدالِ يكسِرُ رابطةَ العقائدِ ويُمزِّقُ القشرَ الحصينَ، أي الحياةَ الأبديةَ..

وبتجاوز القوةِ الغضَبيةِ يمزِّقُ قشرَ الحياةِ الاجتماعيةِ..

وبتجاوز القوَةِ البهيميةِ واتباعِ الهوَى يزيلُ عن قلبه الشفقةَ الجنسيةَ فيفسُدُ ويورِّطُ الناسَ فيما تورَّطَ فيه، فيكونُ سبباً لضرر النوعِ وفسادِ نظامِ الأرضِ.

وأنَّ نظمَ جُملةِ ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ هو:

أنَّه لَمّا ذكَرَ جناياتِ الفاسقِ ورهَّبَ بها، أكَّدَ التهديدَ بنتيجتها وجزائِها، ليُؤثِّرَ الترهيبُ. فقال:

هم الذين خسِروا ببيع الآخرةِ بالدنيا واستبدالِ الهُدى بالهوَى[1].

---

(١) لعله: استبدال الهوى بالهدى.

با ئێستاش دەست بە باسی هۆنینی شێوەی پێکهاتنی یەك بە یەکی ڕستەکان بکەین..
بزانە کە:

ئەم ئایەتانە و، ڕستەکانیان و، شێوەی پێکهاتنی هەریەك لەو ڕستانە، بە وێنەی ئەو میلانەی کاتژمێرن کە چرکە و خولەك و سەعات دەژمێرن. چونکە هەر هێندەی ئەمیان شتێك بسەلمێنێت، ئەویان بە پلەی خۆی پشتی دەگرێت و، ئەوی تریشیان بە ڕێژەی خۆی یارمەتیی دەدات. بە هەمان شێوە هەرکات ئەمیان شتێکی بوێت، ئەویان یارمەتیی دەدات و، ئەوی دیکەش هاوکاریی دەکات، بە شێوەیەك کە ئەم حاڵەتە ئەو وتەیە بە دڵدا دەهێنێت کە وتراوە:

جوانیت یەکێکە و باسمان جیا جیایە  یەك یەك ئاماژەی جوانیی تۆی لایە

لەبەر ئەم نهێنییەیە کە ڕەوانیی قورئان و، بەرزیی پایەی و، وردیی نەخش و نیگارەکەی، گەیشتووەتە پلەی "ئیعجاز".

سەبارەت بە شێوەی پێکهاتنی ڕستەی ﴿إِنَّ اللهَ لاَ يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلاً مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا﴾ش، ئەوا بزانە کە:

﴿إِنَّ﴾ بۆ سەلماندن و، بەرپەرچدانەوەی ڕاڕایی و نکوولییە. کەواتە ئاماژەیە بۆ ئەو زنجیرە ڕاڕاییەی کە باسکراوان.

وشەی ﴿اللهَ﴾یش بۆ بێدارکردنەوەی زەینە سەبارەت بەو هەڵەیەی کە لەو پێوەرە ناوبراوەدا هەیە.

هەڵبژاردنی ﴿لاَ يَسْتَحْيِي﴾ش بەسەر "لا يترك"دا، لە کاتێکدا "حەیاء" - کە گرژبوون و هاتنەوەیەکی دەروونە - بۆ خوای گەورە مەحاڵە و، نەفی کردنی شتی مەحالیش بێ سوودە. ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هۆکارەکانی لەمەڕ "دانست" و "ڕەوانبێژی" و جگە لەوانیش جوانیی نموونە هێنانەوە دەخوازن. کەواتە هیچ هۆکارێك نییە بۆ "تەرك" کردنی نموونە هێنانەوە "حەیا" نەبێت، خۆ "حەیا"ش سەبارەت بە خوای گەورە مەحاڵە، کەواتە هەر لە بناغەدا هیچ هۆکارێك نییە بۆ "تەرك" کردنی. ئیتر بەم وشەیە، زۆر بە وردی و توندوتۆڵی ئەوانی دەمکوت کرد..

ولْنشرَعْ في نظم هيئاتِ جملةٍ جملةٍ..

فاعلمْ أنَّ الآياتِ وجُمَلَها وهيئاتِها كأميال الساعةِ التي تعدُّ الثوانيَ والدقائقَ والساعاتِ، فكلّما يُثبتُ هذا شيئاً يؤيّدُه ذاك بدرجته ويُمِدُّه ذلك بنسبته، وكذا إذا أرادَ هذا شيئاً عاوَنه ذاك وساعدَه الآخَرُ بحيث يُخطِرُ الحالُ ما قيل:

عِبَارَاتُنا شَتَّى وَحُسْنُكَ وَاحِدٌ وَكُلٌّ إلى ذَاكَ الجَمالِ يُشِيرُ

ولهذا السرِّ قد بلغتْ سلاسةُ القرآنِ وعلوُّ طبقتِه ودقّةُ نقشِه إلى مرتبةِ الإعجازِ.

أما هيئاتُ جُملةِ ﴿إِنَّ اللهَ لاَ يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلاً مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا﴾..

فاعلمْ أنَّ ﴿إِنَّ﴾ للتحقيق وردِّ التردُّدِ والإنكارِ، فهي إشارةٌ إلى التردُّداتِ المتسلسلةِ المذكورةِ..

وأنَّ لفظةَ ﴿اللهَ﴾ لتنبيه الذهنِ على الخطأِ في القياس المذكورِ.

وأنَّ إيثارَ ﴿لاَ يَسْتَحْيِي﴾ على "لا يترُكُ" مع أنَّ الحياءَ - وهو انقباضُ النفسِ - محالٌ في حقّه تعالى ونفيُ المحالِ لا فائدةَ فيه، إشارةٌ إلى أنَّ الأسبابَ من الحكمة والبلاغةِ وغيرِهما تقتضي حُسْنَ التمثيل، فلا علّةَ للتركِ إلّا الحياءُ، والحياءُ عليه تعالى محالٌ، فلا سببَ للتركِ أصلاً.

فألزمَهم أشدَّ إلزامٍ وألطفَه..

هەروەها بە "هاوشێوەیی هاوڕێیەتی وشە"[1] ئاماژەی بە وشە گەوجانەکەی ئەوان کرد کە وتوویانە:

"ئایا پەروەردگاری محەممەد شەرم ناکات لە نموونە هێنانەوە بەم شتە بێ نرخانە"؟

هەڵبژاردنی ﴿أَنْ يَضْرِبَ﴾ بەسەر "مــــن المثــــل الحقــــير"دا، لە کاتێکدا کە ئەمە گونجاوترە، بۆ ئاماژەدانە بە شێوازێکی ورد و ناسك، کە بریتییە لەوەی: "نموونە هێنانەوە" وەك لێدان (ضَرب)ی مۆرە بۆ پشت ڕاستکردنەوە و سەلماندن، یان بە وێنەی لێدانی سکەیە بۆ نرخ و بەهادانان. ئاماژەکەش هێمایەکی بۆ جوانیی نموونە هێنانەوە کردووە، بە مەبەستی بەدەرنانی گومانەکان.. هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە "نموونە هێنانەوە" ڕێبازێکی بە جوان زانراوی بەناوبانگە، چونکە یەکێکە لە دەستوورە زانراوەکان.

هەڵبژاردنی ﴿أَنْ يَضْرِبَ﴾ش بەسەر "ضَرب"دا، لە کاتێکدا کە ئەمیان پوخت و کورت ترە، بۆ ئاماژەدانە بەوەی کە مایەی سەرهەڵدانی ڕەخنەکە هەر تەنها نزمیی نموونەکەیە. چونکە ﴿أَنْ يَضْرِبَ﴾ لەبەر ئەوەی سەربەخۆ نییە، ئەوا وەکو ئەوە وایە کە شتێکی تەنك بێت، مەبەستەکە بەرەو مەفعولەکە تێدەپەڕێنێت.. بەڵام "ضَــــرب" لەبەر سەربەخۆ بوونی[2]، وەکو شتی چڕ وایە، ڕێ لە تێپەڕبوونی مەبەستەکە دەگرێت.

﴿مَثَلاً﴾یش ئاماژەیە بۆ تایبەتکاریی "نموونە هێنانەوە". کە لەوەدایە شتی بە ژیری زانراو لە شێوەی هەست پێ کراودا و، شتی وەهمی وەکو بێگومان و، نائامادە بە وێنەی ئامادە، پیشان دەدات. لەمەشەوە ئاماژەیەك هەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی وەهم و گومان.

بە نەکیرە کردنی ﴿مَثَلاً﴾یش هێمایەکە بۆ ئەوەی کە خولگەی تێڕوانین خودی نموونە هێنانەوەکەیە و، سیفەتەکانیش لە ئەستۆی سروشتی شوێنەکە و حاڵی نموونە پێ هێنراودا دانراون.

گشتاندن لە ﴿مَا﴾دا بۆ ئاماژەدانە بە گشتاندنی دەستوورەکە، تاکو وەڵامەکە تەنها تایبەت نەبێت بەو شتەی ڕەخنەیان ئاراستە کردووە. چونکە شتی نموونە بۆ هاتوو هەر وێنە و شێوەیەك بخوازێت، "ڕەوانبێژی" بە جوانی دادەنێت.

---

(١) بۆ واتاکەی بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە: ٣١٤. (وەرگێڕ)

(٢) "ضَرْبٌ" بە سەربەخۆیی "مەصدەر"ە. بەڵام "أَنْ + يَضْرِبَ" پێکەوە لە "واتای مەصدەر"دان. (وەرگێڕ)

وكذا رمزَ بمشاكلة الصُّحبةِ إلى كلمتِهم الحمقاءِ من قولهم:

"أما يستحي ربُّ محمدٍ من التمثيل بهذه المحقَّراتِ"..

وأنَّ إيثارَ ﴿أَنْ يَضْرِبَ﴾ على "مِن المثَلِ الحقيرِ" مع أنَّه الأنسبُ، إشارةٌ إلى أسلوبٍ لطيفٍ، وهو أنَّ التمثيلَ كضَرْبِ الخاتَمِ للتصديق والإثباتِ، أو كضَرْبِ السِّكَّةِ للقيمةِ والاعتبارِ. وفي الإشارةِ رمزٌ إلى حُسْنِ التمثيلِ طرداً للأوهام، وكذا إشارةٌ إلى أنَّ التمثيلَ منهاجٌ مشهورٌ مستحسَنٌ، لأنَّ ضروبَ الأمثالِ من القواعد المعروفةِ.

وأنَّ إيثارَ ﴿أَنْ يَضْرِبَ﴾ على "ضَرْبٍ" مع أنَّه الأوجزُ، للإيماءِ إلى أنَّ منشأَ الاعتراضِ ليسَ إلّا الخساسةَ؛ لأنَّ ﴿أَنْ يَضْرِبَ﴾ لعدم استقلالِه كأنَّه لطيفٌ يُمِرُّ القصدَ إلى المفعولِ.. وأما "ضَرْب" فلاستقلالِه كأنَّه كثيفٌ يستوقفُ القصدَ.

وأنَّ ﴿مَثَلاً﴾ إيماءٌ إلى خاصيّة التمثيلِ مِن تصوير المعقولِ بالمحسوس، والموهومِ بالمحقَّقِ، والغائبِ بالشاهد. ومنه إيماءٌ إلى ردِّ الوَهمِ..

وتنكيرُ ﴿مَثَلاً﴾ رمزٌ إلى أنَّ مدارَ النظَرِ هو ذاتُ التمثيلِ، وأما الصفاتُ فمحمولةٌ على طبيعة المقامِ وحالِ المُـمَثَّل له.

وأنَّ التعميمَ في ﴿مَا﴾ إشارةٌ إلى تعميم القاعدةِ لئلّا يختصَ الجوابُ بما اعترضوا به، فالممَثَّل له أيَّةَ صورةٍ اقتضى، استحسنَتْها البلاغةُ.

تایبەتکردنی ﴿بَعُوضَةً﴾یش، ئاماژەیە بۆ زۆریی بەکارهێنانی ئەم وشەیە لە لایەن ڕەوانگۆیانەوە لە نموونە هێنانەوەدا. وەك ئەوەی کە وتوویانە:

"أضعفُ مِن البعوضةِ"..

"أشدُّ عناداً مِن البعوضةِ"..

"كلَّفتَني مُخَّ البعوضةِ"..

"أعزُّ مِن مُخِّ البعوضةِ"..

"قالت البعوضةُ للنخلةِ: استمسكي أنا أطيرُ"(١)..

"الدنيا لا توزنُ عندَ اللهِ جناحَ بعوضةٍ"(٢).

هەروەها قیاسی وتەکانی تریان لەسەر ئەمانە بکە.

ئاماژەکەش هێمایەکی بۆ لاوازیی گومانەکەیان تێدایە.

مەبەست لە ﴿مَا فَوْقَهَا﴾ش، واتە: لەو کەمتر لە بچووکیدا و، لە سەرووی ئەویش لە بەهای ڕەوانبێژیدا و، لەویش بچووکتر بە هەمان شێوە. کەواتە گوزارشت کردن بە ﴿مَا فَوْقَهَا﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە "بچووك" لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە نامۆترە و، لە ڕووی بەدیهاتنیشەوە سەرسوڕهێنەرترە.

ئەوەش بزانە کە شێوە پێکهاتنی ڕستەکان بە وێنەی تاڵەکانی ئاوریشم وایە؛ بە کۆبوونەوەیان نەخش و نیگارە جوانەکە دەردەکەوێت.

سەبارەت بە شێوەی پێکهاتنی ڕستەی ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ ءامَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَا أَرَادَ اللهُ بِهَذَا مَثَلاً﴾یش ئەوا بزانە کە:

"فاء" بۆ جیاکردنەوەی لقەکانە..

لق جیاکردنەوەش ئاماژەیە بۆ بەڵگەیەکی ناوەکی کە ئەم ڕستە دوو لقە بەرهەم دەهێنێت:

---

(١) بۆ سەرچاوەی ئەم پەندە عەرەبیيانە بڕوانە:

جمهرة الأمثال للعسكري: ٢/٣٠-٣٣؛ مجمع الأمثال للميداني: ١/١٨٨؛ ثمار القلوب للثعالبي: ١٥٢؛ رسائل الجاحظ: ١٤٧

(٢) بۆ دەقی فەرموودەکە و سەرچاوەکەی، بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر. (وەرگێڕ)

وأنَّ تخصيصَ ﴿بَعُوضَةً﴾ إشارةٌ إلى كثرة استعمالِ البُلَغاء للتمثيل بها، كقولهم: "أضعفُ من البعوضة"[١].. و"أشدُّ عناداً من البعوضة".. و"كلَّفتْني مُخَّ البعوضةِ"[٢].. و"أعزُّ من مُخِّ البعوضةِ"[٣].. و"قالت البعوضةُ للنخلةِ استمسكي أنا أطيرُ"[٤].. و"الدنيا لا توزَنُ عندَ الله جناحَ بعوضةٍ"[٥]. وقِسْ..

وفي الإشارة رمزٌ إلى ضَعفِ وَهمِهم..

وأنَّ المعْنِيَّ بـ﴿مَا فَوْقَهَا﴾ ما دونَها في الصِّغَرِ وما فوقَها في قيمةِ البلاغةِ، أو في الصِّغَرِ أيضاً. فالتعبيرُ بـ﴿مَا فَوْقَهَا﴾ إشارةٌ إلى أنَّ الصغيرَ أغربُ بلاغةً وأعجبُ خِلقةً.

واعلمْ أنَّ الهيئاتِ كخيوط الحريرِ؛ باجتماعِها يظهَرُ النقشُ الحسَنُ.

وأما هيئاتُ جُملةِ ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَا أَرَادَ اللهُ بِهَذَا مَثَلاً﴾..

فاعلمْ أنَّ "الفاءَ" للتفريعِ، والتفريعُ إشارةٌ إلى دليلٍ ضمنيٍّ يُنتِجُ هذه الجملةَ ذاتَ الشِّقَين:

---

(١) جمهرة الأمثال للعسكري ٢/ ٣٠؛ مجمع الأمثال للميداني ١/ ١٨٨.

(٢) من أمثال العرب: كلفتني مخ البعوضة؛ أي كلفتني ما لا أطيق ولا يوجد ولا يكون؛ ولم يذكر ذلك أحد من الشعراء إلا ابن أحمر، حيث قال:

كلفتني مخ البعوض فقد    أقصرت لا نجح ولا عذر

(ثمار القلوب، للثعالبي ص: ١٥٢)

(٣) جمهرة الأمثال للعسكري: ٢/ ٣٣

(٤) الرسائل للجاحظ ص: ١٤٧

(٥) نص الحديث الشريف: "لو كانت الدنيا تعدِل عند الله جناح بعوضةٍ ما سَقى الكافرَ منها جُرعة ماء". (البخاري، تفسير سورة الكهف٦؛ مسلم، المنافقون١٨، الزهد).

واتە دەستبەرداری نموونە هێنانەوە نابێت، چونکە ڕەوانبێـژی داخوازیـەتی. خـۆ هەرکەسێك ویـژدان بخاتە کـار دەزانێـت ئـەم قورئانە گوفتارێکی ڕەوانە و هـی خـوای گەورەیە.. ئەو کەسەش بە نکوولیەوە بڕوانێت، حیکمەتەکەی نازانێت و، دەکەوێتە دوودڵیەوە و، پرسیار دەکات و، نکوولی دەنوێنێت و، سووکایەتی دەکات.

دەرەنجام ئەوەیە کە:

ئیماندار – لەبەر ئەوەی بە ویژدانە – تەسدیقی ئەوە دەکات کە گوفتاری خوایە.

کافریش – لەبەر ئەوەی نکوولی دەکات – دەڵێ: چ سوودێکی تێدایە؟

﴿أَمَّا﴾ش لەبەر ئەوەی "شەرتی"(مەرجی)یـە و، هـەر لـە بناغـەی دانانیـەوە "لـزوم"ی تێدایە، ئەوا ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە:

خەبەرەکە "لازم"ی موبتەداکەیە و پێویستە بۆی. واتە ئەم موبتەدایە وا دەخـوازێ کە ئەم خەبەرەی هەبێت.

هێنانی ﴿الَّذِينَ ءامَنُواْ﴾ش لە بریی "المؤمنین" ئاماژەیە بۆ دەربڕین بە دەق لەسەر ئەوەی کە "ئیمان" هێزی زانینی حەقیقەتەکەیەتی و، زانینی حەق بوونەکەشی "ئیمان"ە[1].

﴿أَنَّهُ الْحَـــقُّ﴾یش لـە بریی "أنه البلیـغ" کـە گونجاوترە بـۆ شـوێنکە، ئاماژەیـە بـۆ دواهـەمین مەبەستی ڕەخنەکەیان، چونکە مەبەستـی ئـەوان نـەفی کردنـی ئەوەیـە کـە گوفتاری خوای گەورە بێت.

قەتیسکردنی "حەق" لەسەر "قورئان" لە ﴿أَنَّهُ الْحَقُّ﴾دا، ئاماژەیە بۆ ئـەوەی کـە هـەر تەنها ئەمە ئەو شتە جوانەیە کە بە ناشیرین دانانرێت، بە پێچەوانەی ئـەو شتەی کـە ئـەوان پێیان وایە، چونکە بێ عەیبیی شتێك کەماڵی ئەو شتە ناگەیەنێت.

---

(١) پێدەچێ لێرەدا شتێك بەهۆی لەبیرچوونەوەی نووسەرەوەکانەوە پەڕی بێت. هـەروەك سەرتاسـەری شـیکردنەوەی ﴿مَاذَا أَرَادَ اللهُ بِـــهَذَا مَثَـــلاً﴾ی بە داخـەوە لـەبیر چووە، کە ئەوەش لـە ناپەیوەسـتیی قسەکانەوە و، لە دیارنەبوونی وشەی ﴿فَيَعْلَمُونَ﴾ە و هاوتاکەی ﴿الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾وە دەزانرێـت، لـە کـاتێکدا کە ئەوەی ئەوێ بەمەی ئێرە سپێرراوە.

بۆیە – لەبریی دانەر و بەم شێوەیەی خوارەوە – (ئەگەر شوێنی خۆی گرت ئەوا باشە، دەنا ئۆباڵی لـە ئەستۆی مندایە) دەڵێم:

هێنانی ﴿الَّذِينَ ءامَنُواْ﴾ لە بریی "المؤمنـــین"ی کـورت تر، ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی کـە ویژدانـی ئیمـانداران لـە ئیمانەکەیانەوە دێت و، هەر بۆ ئیمانەکەشیان دەگەڕێتەوە.

هەڵبژاردنی ﴿فَيَعْلَمُونَ﴾ بەسـەر "فیقولون"دا، کە بەپێی ئەمـەی خـوارەوە گونجاوترە، ئاماژەیـە بـۆ دەق هێنـان لەسەر ئەوەی کە "ئیمان" هێزی زانینی حەقیقەتەکەیەتی و، زانینی حەق بوونەکەشی "ئیمان"ە. (ش)

أي لا يتركُ التمثيلَ لأنَّ البلاغةَ تقتضيه؛ فمَن أنصفَ يعرِفُ أنّه بليغٌ وحقٌّ وكلامُ اللهِ تعالى. ومَن نظرَ بالعناد لا يعلَمُ الحكمةَ، فيتردَّدُ، فيسألُ، فيُنكِرُ، فيستحْقِرُ..

فأنتجَ: إنَّ المؤمِنَ -لأنّه مُنصِفٌ- يُصَدِّقُ أنّه كلامُ اللهِ، والكافرَ -لأنّه مُعانِدٌ- يقولُ: ما الفائدةُ فيه؟

وأنَّ ﴿أَمَّا﴾ فلأنَّها شرطيةٌ لزوميةٌ في الوضعِ إشارةٌ إلى أنَّ الخبرَ لازمٌ للمبتدأِ وضروريٌّ له، يعني مِن شأنِ المبتدأِ هذا الخبرُ.

وأنَّ إيرادَ ﴿الَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بدلَ "المؤمنين" إشارةٌ إلى التنصيصِ على أنَّ الإيمانَ هو سببُ العلمِ بحقيتِه، وأنَّ العلمَ بحقّيتِه إيمانٌ[1].

وأنَّ ﴿أَنَّهُ الـْحَقُّ﴾ بدلَ "أنّه البليغُ" الأنسبِ بالمقام، إشارةٌ إلى آخِرِ نتيجةِ اعتراضِهم، إذ غرَضُهم نفيُ كونِه كلامَ اللهِ.

وأنَّ حصْرَ ﴿أَنَّهُ الـْحَقُّ﴾ إشارةٌ إلى أنَّ هذا هو المستحسَنُ الذي لا يُستقبَحُ، بخلافِ ما يزعُمُون؛ إذ السلامةُ مِن العيبِ لا تُثْبِتُ الكمالَ.

---

(١) الظاهر أن ههنا حذفاً من نسيان النساخ - كما أنه نسي تحليل: ﴿مَاذَا أَرَادَ اللهُ بِهذا مَثَلاً﴾ برمته - مع الأسف ـ يُعلَم من عدم ارتباط الكلام، ومِن فقْدِ كلمةِ ﴿فَيَعْلَمُونَ﴾ ومن عديله ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ مع الإحالة هناك على ما هنا.

فأقول بدلاً عن المؤلف على نسق ما يأتي، فإن حلّ محله فبها وإلّا فعليّ:

إنَ إيرادَ ﴿الَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ بدل "المؤمنين" الأوجزِ إيماءٌ إلى أنَّ إنصافَهم يجيء من الإيمان، ويذهب إلى الإيمان.. وأنَّ إيثارَ ﴿فَيَعْلَمُونَ﴾ على "فيقولون" الأنسبِ بما يأتي إشارة إلى التنصيص على أن الإيمان هو سبب العلم بحقيته، وأن العلم بحقيته إيمان. (ش)

﴿مِنْ رَبِّهِمْ﴾یش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئامانجی ڕەخنەکەیان نکوڵی کردنە لە دابەزینی قورئان (لە لایەن پەروەردگارەوە).

﴿أَمَّا﴾ش لە ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾دا بۆ جەخت و، سەلماندن و، درێژەپێدانە.

هێنانی ﴿الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ لە بریی "الكافرون" کە کورت ترە، ئاماژەیەکە – وەك پێشتر وترا – بۆ ئەوەی کە نکوڵییەکەیان لە "کوفر"ەوە هاتووە و، دەگەڕێتەوە بۆ کوفر.

هەڵبژاردنی ﴿فَيَقُولُونَ﴾ بەسەر "فلا یعلمون"دا – کە وەك ڕابورد بە ڕواڵەت پتر بۆ ئەم شوێنە دەگونجێت – بۆ هەڵبژاردنی ڕێی "کینایە"یە لەبەر کورتی. واتە ئەو کەسەی "کافر" دەبێت حەقیقەت نازانێت، ئیتر نەزانینەکەی سەردەکێشێت بۆ دوودڵی، ئەویش بۆ نکوڵی، ئەویش بۆ سووکایەتی کردن لە شێوەی پرسیاردا.

هەروەها ﴿يَقُولُونَ﴾ هێمایەکیشی تێدایە بۆ ئەوەی کە ئەوان هەروەك بۆخۆیان گومڕا بوون، بە هەمان جۆر و بە هۆی قسەکانیانەوە بوونە گومڕاکەریش.

سەبارەت بە شێوەی پێکهاتنی ڕستەی ﴿يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً وَيَهْدِي بِهِ كَثِيراً﴾یش، ئەوا بزانە کە:

ڕیزبەندییەکە (بەپێی سەرەتای ئایەتەکە) پێشخستنی ڕستەی دووهەم دەخوازێت، بەڵام لەبەر ئەوەی مەبەست لێرەدا بەرپەرچدانەوەی ڕەخنە و بیانووی کەسێکی ڕاڕای پرسیارکەری نکوڵیکەری بە ناشیرین زانە، ئەوا ﴿يُضِلُّ﴾ گرنگتر بوو (بۆیە پێشی خست بەسەر "یهدي"دا).

لادانی دەربڕینەکەش لە "الضلالة والهداية"وە بۆ دەربڕین لە شێوەی فیعلی موزاریعدا (یضل، یهدي) ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە:

بە ڕێژەی زیادبوونی هاتنە خوارەوەی نوێی قورئان، تاریکیی کوفرەکەی ئەوانیش یەك لەسەر یەك چڕتر دەبێتەوە. هەروەك ئیماندارانیش بە ڕێژەی پلەکانی نازڵبوونی قورئان نووری ئیمانەکەیان یەك لەسەر یەك زیاد دەکات، هەروەها هێنانیشیان بە شێوەی "فیعل" – لەبەر ئەوەی وەڵامە – هێمایە بۆ ڕوونکردنەوەی حاڵی هەردوو دەستەکە و ڕوونکردنەوەی هۆکاری ئەوەش.

وأنَّ ﴿مِنْ رَبِّهِمْ﴾ إشارةٌ إلى أنَّ هدفَ غرَضِهم إنكارُ النـزولِ.

وأنَّ ﴿أَمَّا﴾ في ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ للتأكيدِ والتحقيقِ والتفصيلِ.

وأنَّ إيرادَ ﴿الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بدلَ "الكافرين" الأوجزِ إيماءٌ - كما مرَّ - إلى أنَّ إنكارَهم يجيءُ مِن الكُفرِ ويذهبُ إلى الكفرِ.

وأنَّ إيثارَ ﴿فَيَقُولُونَ﴾ على "فلا يعلمون" - مع أنّه الظاهرُ كما مرَّ - فلاختيار طريقِ الكنايةِ للإيجاز، أي مَن كَفَرَ لا يعرِفُ الحقيقةَ فينجَرُّ إلى التردُّدِ.. فينْجَرُّ إلى الإنكارِ.. فينجَرُّ إلى الاستحقارِ بصورةِ الاستفهامِ.

وأيضاً في ﴿يَقُولُونَ﴾ رمزٌ إلى أنّهم كما كانوا ضالّين، كذلك كانوا مُضلّين بأقوالِهم.

وأما هيئاتُ جُملةِ ﴿يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً وَيَهْدِي بِهِ كَثِيراً﴾..

فاعلمْ أنَّ الترتيبَ يقتضي تقديمَ الثانيةِ، لكنْ لَمّا كان الغرَضُ ردَّ اعتراضِ المتردِّدِ المستفهِمِ المستنكِرِ المستقبِحِ، كان ﴿يُضِلُّ﴾ أهمَّ.

أما العدولُ عن "الضلالة والهداية" المناسِبتين للسؤال إلى صورة الفعلِ المضارعِ فإشارةٌ إلى:

أنَّ كفرَهم يتكاثَفُ ظُلمةً على ظُلمةٍ بنسبة تزايُدِ النُزولِ تجدُّداً؛ كما أنَّ المؤمنَ يتزايدُ إيمانُه بدرجاتِ النزولِ نوراً على نورٍ.. وكذا في الفعل - بناءً على كونه جواباً - رمزٌ إلى بيان حالِ الفريقين وبيانِ السببِ.

﴿كَثِيراً﴾یش (واتە زۆرێك) سەبارەت بە یەکەمیان: لە چەندایەتی و ژمارەدا.. سەبارەت بە دووهەمیشیان: لە نرخ و چۆنێتیدا. بەڵێ، خەڵکانی بەرێز زۆرن با کەمیش بن[1]! کەواتە گوزارشت کردن لە دووهەمیاندا بە "زۆر" هێمایە بۆ نهێنیی ئەوەی کە قورئان میهرەبانی‌یە بۆ گرۆی مرۆڤ. دەسا بیری لێ بکەرەوە!

سەبارەت بە ڕستەی ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلاَّ الْفَاسِقِينَ﴾یش، بزانە کە:

کاتێ لە ڕستەی یەکەمدا ﴿كَثِيراً﴾ی بەکارهێنا، ئەوا بە ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە "گومڕاکان" کامانەن؟ وەسوەسە و ترس و دوودڵی و تۆمەتی ناتەواویی لە قورئاندا، بەدەرنا. هەروەك ڕوونی کردەوە کە مایەی سەرهەڵدانی "گومڕایی" لەڕێ لادانی ئەوانە و هۆکارەکەشی بە دەستهێنانی خۆیانە و، ناتەواوی لە خۆیاندایە، نەك لە قورئاندا و، بەدیهێنانی گومڕاییش لەواندا سزای کرداری خۆیانە.

پاشان بزانە کە هەروەك هەموو یەکێکی ئەم ڕستانە ڕستەکەی پێش خۆی دەردەخات، بە هەمان جۆر ڕستەکەی دوای خۆیشی ڕاڤەی ئەم دەکات، وەك بڵێی بەڵگەی ڕستەی پێش خۆیەتی و، دەرەنجامی ئەوەی دوای خۆی.

ڕوونکردنەوەی ئەمەش لەوەدایە کە ئەم ڕستانە دوو زنجیرە ڕستەیان لەخۆ گرتووە:

یەکەمیان بەم جۆرەیە:

شەرم ناکات.. چونکە هیچ شتێك "تەرك" ناکات.. چونکە ڕەوانگۆیە.. چونکە "حەق"ە.. چونکە گوفتاری خوایە.. چونکە ئیماندار ئەوە دەزانێت کە حەقە..

دووهەمیشیان بەم جۆرەیە:

قورئان وەك کەسی نکوڵی کەر دەڵێت: شەرم ناکات.. چونکە ئەوان دەڵێن دەبێ "تەرك"ی ئەو نموونەیە بکات.. چونکە ئەوان حیکمەتەکەی نازانن.. چونکە دەڵێن: چ سوودێکی تێدایە؟.. چونکە ئینکاریی دەکەن.. چونکە بە چاوی سووکایەتی بۆی

---

(١) یەکێك لە سۆز و میهرەبانیی گشتگیری قورئان بۆ خەڵکی لەوەدایە کە:
چاکەی ئیماندارە کەمەکانی بە زۆر پیشان داوە و، ئەوەشی ڕوون کردووەتەوە کە مرۆڤێکی خاوەن چاکە و هیدایەت لە هەزار کەس باشترە کە لەو چاکە و هیدایەتە بێ بەش بێت. لەبەر ئەوە، کەسە بەڕێزەکان زۆرن هەرچەندەش ژمارەیان کەم بێت. (ت)

وأما ﴿كَثِيراً﴾ ففي الأُولى كميّةً وعدداً، وفي الثانية قيمةً وكيفيةً. نعم، إنَّ كرامَ الناسِ كثيرون وإنْ قلُّوا. فالتعبيرُ بالكثير في الثانية رمزٌ إلى سرِّ كَوْنِ القرآنِ رحمةً للبشر[١]. تأمَّلْ.

وأما جملةُ ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلاَّ الْفَاسِقِينَ﴾..

فاعلمْ أنّه لما ذكَرَ الكثيرَ في الأولى دفعَ الوسوسةَ والخوفَ والتردُّدَ وتهمةَ النقصِ في القرآن ببيانِ أنَّ الضالِّين مَن هُم؟ وأنَّ منشأَ الضلالةِ فسقُهم، وأنَّ سببَها كسبُهم، وأنَّ القصورَ منهم لا مِن القرآنِ، وأنَّ خَلْقَ الضلالةِ جزاءٌ لفعلِهم..

ثم اعلم أنَّ كُلَّ واحدةٍ من هذه الجُمَلِ كما أنّها كشّافةٌ لسابقتها؛ كذلك مُفسَّرةٌ بلاحقتِها كأنّها دليلٌ للسابقة نتيجةٌ للاحقة.

وإيضاحُه: أنَّ فيها سلسلتين.

إحداها هكذا:

إنّه لا يستحيي.. لأنّه لا يتركُ.. لأنّه بليغٌ.. لأنّه حقٌّ.. لأنّه كلامُ الله.. لأنَّ المؤمنَ يعلمُه.

والثانيةُ هكذا:

إنّه لا يستحيي كما يقولُ المنكِرُ.. لأنّهم يقولون: يلزمُ تركُه.. لأنّهم لا يعلمون حكمتَه.. لأنّهم يقولون: ما الفائدةُ فيه.. لأنّهم ينكرونه.. لأنّهم يستحقرونه.. لأنّهم يقَعُون في

---

(١) إذ من لطف القرآن وشمول رحمته للناس إظهار فضائل المهتدين القليلين كثيرةً، وبيان أن صاحب فضيلة وهداية أولى من ألفٍ من المحرومين منها، لذا فالكرام كثيرون وإن قلّوا. (ت)

دەڕوانن.. چونکە بە بیستنی (قورئان) دەکەونە گومڕاییەوە.. چونکە قورئان بە گومڕایان دادەنێت.. چونکە ئەوان خۆیان لە ڕێ دەرچوون و لە قاوغی خۆیان هاتنە دەرەوە.. چونکە پەیمانی خوایان شکاند.. چونکە ئەو پەیوەستەیان پچڕاند کە پەیوەندیی بە "فەرمانی تەکوینی" و "فەرمانی تەشریعی"یەوە هەیە.. چونکە ئەوان سیستەمی خوایی لە زەویدا تێك دەدەن.. کەواتە هەر ئەوانن زەرەرمەند:

لە دنیادا بەهۆی: شڵەژاویی ویژدان و، نیگەرانیی دڵ و، پەستیی ڕۆحەوە..

لە دواڕۆژیشدا بەهۆی: سزای هەمیشەیی و، ڕق و تووڕەیی خوای گەورەوە.

دەسا فەرموو بیر لە ڕەوانی و بێ گرێیی هەردوو زنجیرەکە بکەرەوە.

سەبارەت بە شێوە پێکهاتنی ڕستەی ﴿الَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ اللهِ مِن بَعْدِ مِيثَاقِهِ وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

وەسفدارکردنی ئەو لە ڕێ لادەرانەی کە گومانیان لە ئیعجاز و هۆنینی قورئاندا دەنایەوە، بەم سیفەتانە و لەم شوێنەدا، تەنها لەبەر پەیوەندییەکی ورد و بڵندە. وەك بڵێی قورئان دەفەرموێ:

ئەو لەڕێ لادەرانەی کە ئیعجازی توانستی خوای گەورەیان لە سیستەمی بوونەوەراندا نەبینی - کە قورئانە گەورەکەیە - لێیانەوە بە دوور نازانرێت کە دوودڵ بن و، ئیعجازی هۆنینی قورئانیش نەزانن. چونکە هەروەك ئەوان پێیان وایە کە سیستەمی بوونەوەران بە ڕێکەوت دروست بووە و، ئاڵوگۆڕە بەرهەم بەخشەکانیش بە شتی هەڕەمەکی و لە خۆڕا دەزانن، ئیتر - لە ئەنجامی ئەمە و لەبەر تێکچوونی ڕۆحیان - حیکمەتەکانی ئەم بوونەوەرانەش لە پێش چاوی ئەواندا خۆیان دەرنەخست..

بە هەمان جۆر و بەهۆی فیترەتە نەخۆشەکەیان و لەبەر ئارەزووە گەنیوەکەیان، ئەم هۆنینە ئیعجاز بەخشەیان بە ئاڵۆزکاو بینی و، پێیان وابوو کە پێشەکییەکانی نەزۆك و، بەروبوومەکانیشی تاڵن.

ڕستەی ﴿يَنقُضُونَ عَهْدَ اللهِ﴾یش، لەبەر ئەوەی واتای زمانەوانیی "نقض"(هەڵوەشاندنەوە) بریتییە لە جیاکردنەوە و پەرتکردنی تاڵەکانی گوریس، ئەوا ئاماژەیە بۆ شێوازێکی بڵند. وەك ئەوەی کە پەیمانی خوای گەورە پەتێکی نوورانییە و، بە "دانست" و "چاودێری" و "ویست" ڕێسراوە و بادراوە. ئیتر لە ئەزەلەوە درێژ بووە

الضلالة بسماعِه.. لأنّهم يضلُّهم القرآنُ.. لأنّهم هُم الذين فسقُوا وخرجُوا عن قِشرِهم.. لأنّهم نقضُوا عهدَ اللهِ.. لأنّهم مزَّقُوا ما اتّصَلَ بأمر التكوينِ والتشريعِ.. لأنّهم يُفسِدون النِّظامَ الإلهيَّ في الأرض.

فإذنْ هُم الخاسرون في الدنيا باضطرابِ الوجدانِ، وبقَلَقِ القلبِ، وبتوَحُّشِ الروحِ.. وفي الآخرةِ بالعذاب الأبديِّ وبغضبِ اللهِ...

فتأمَّلْ في سلاسةِ السلسلتين!

وأما هيئاتُ جملةِ ﴿**الَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ اللهِ مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ**﴾..

فاعلمْ أنَّ توصيفَ الفاسقين المشكِّكين في إعجازه ونظمِه بهذه الأوصافِ في هذا المقامِ، إنما هو لمناسبةٍ لطيفةٍ عاليةٍ. كأنَّ القرآنَ يقولُ:

ليس ببعيدٍ مِن الفُسّاق - الذين لم يرَوْا إعجازَ القدرةِ في نظامِ الكائناتِ التي هي القرآنُ الأكبرُ - أنْ يتردَّدُوا ويجهلوا إعجازَ نظْمِ القرآنِ؛ إذ كما يرَوْنَ نظامَ الكائناتِ تصادُفياً، والتحوُّلاتِ المثمِرةَ عبَثاً اتفاقيةً فتَستَّرَ عنهم - لفساد روحِهم - حِكَمُه..

كذلك بفطرتِهم السقيمةِ وتهوّسِهم الفاسدِ رأوْا النظْمَ المعجِزَ مشوَّشاً ومقدماتِه عقيمةً وثمراتِه مُرَّةً.

أما جملةُ ﴿**يَنقُضُونَ عَهْدَ اللهِ**﴾ فلأنَّ النقضَ لغةً تفريقُ خيوطِ الحبلِ وتمزيقُها، إشارةٌ إلى أسلوبٍ عالٍ، كأنَّ عهدَه تعالى حبلٌ نورانيٌّ فُتِلَ بالحكمةِ والعنايةِ والمشيئةِ فامتدَّ مِن الأزلِ

هەتا گەیشتووەتە ئەبەد و، لەم بوونەوەرانەدا لە شێوەی سیستەمێكی گشتیدا دەركەوتووە و، زنجیرەكانیشی هاویشتووە بۆ "جۆرەكان"ی بوونەوەران و، دوابڕبڕەكانیشی هەتا "جۆری مرۆڤ" درێژ بوونەتەوە. ئیتر لە ڕۆحی ئادەمیزاددا چەندین تۆوی ئامادەباشی و لێهاتنیان بەرهەم هێنا كە بەو جوزئە ئیختیاری‌یە ئاودێری دەكرێن و گوڵ دەگرن كە بە فەرمانی شەرع - واتە بەڵگە نەقڵی‌یەكان - ڕێك كرابێت..

جا "پەیمان پارێزی" لەوەدایە كە: توانا و لێهاتنەكان لەو شتانەدا بخرێنە كار كە لە پێناویاندا بە مرۆڤ دراون. "پەیمان شكاندن"یش پێچەوانەی ئەمەیە و، پەرت و بڵاوكردنیەتی. وەك ئیمان هێنان بە هەندێ لە پێغەمبەران و بەدرۆخستنەوەی هەندێكی تریان.. هەروەها وەرگرتنی هەندێ فەرمانی شەرع و ڕەتكردنەوەی هەندێكی تریان.. هەروەها بە جوان زانینی هەندێ ئایەت و نارەزایی دەربڕین لە هەندێكی تریان. چونكە ئەو كارە ڕێسا و هۆنین و ڕێكوپێكی تێكدەدات.

سەبارەت بە ڕستەی ﴿وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ﴾ش، ئەوا بزانە كە:

ئەم "فەرمان"ەی لەم ئایەتەدایە، گشتی‌یە بۆ هەردوو فەرمانی "تەشریعی" و، "تەكوینی" كە تێهەڵكێشی دەستوورە فیتری‌یەكان و عادەتەكانی خوای گەورەیە.

جا بڕینی ئەو شتەی كە خوای گەورە فەرمانی بە پەیوەستكردنی داوە، هی فەرمانە شەرعی‌یەكە وەك:

بڕینی سیلەی ڕەحم و، دابڕینی دڵی موسڵمانان لە یەكتر. شتانی تریش قیاس بكەرە سەر ئەمانە..

هی فەرمانە تەكوینی‌یەكەش وەك: دابڕكردنی كاركردن لە زانین و، پچڕاندنی پەیوەندیی زانست بە زیرەكی‌یەوە و، پەیوەندی بڕینی زیرەكی لە ئامادەباشی و، بڕینی ڕێی ناسینی خوا لە ژیری و، جیاكردنەوەی هەوڵ و كۆشش لە هێز و، دابڕكردنی جیهادیش لە ئازایەتی و.. بەم جۆرە، هتد.. چونكە بەخشینی "هێز" بۆ كارێك "فەرمان"ێكی مەعنەویی تەكوینی‌یە بۆ "هەوڵ و كۆشش".. هەروەها بەخشینی "زیرەكی" فەرمانێكی مەعنەوی‌یە بۆ زانست... هتد.

إلى أنْ اتصلَ بالأبد، فتجلّى في الكائنات بصورةِ النظامِ العموميِّ، وأرسلتْ تلك السلسلةُ سلاسلَها إلى الأنواع وامتدَّ أَعْجُبُها[١] إلى نوع البشرِ فأورثَتْ وأثمَرتْ في روح البشرِ بذورَ استعداداتٍ وقابلياتٍ تُسقَى وتتزاهَرُ بالجزء الاختياريِّ المعدِّلِ بالأمرِ التشريعيِّ، أي الدلائلِ النقليةِ..

فوفاءُ العهدِ:

صرفُ الاستعداداتِ فيما وُضعَتْ له؛ ونقضُ العهدِ خلافُه وتفريقُه، كالإيمان ببعضِ الأنبياءِ وتكذيبِ بعضٍ، وقبولِ بعضِ الأحكامِ وردِّ بعضٍ، واستحسانِ بعضِ الآياتِ واستنكارِ بعضٍ. فإنّه يُخِلُّ بالنظامِ والنظْمِ والانتظامِ.

وأما جملةُ: ﴿وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللّٰهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ﴾..

فاعلمْ أنَّ هذا الأمرَ عامٌّ للأمر التشريعيِّ والأمر التكوينيِّ المندمِجِ في القوانين الفطريةِ والعاداتِ الإلٰهيةِ.

فالقطعُ لِما أُمرَ بوصلِه شرعاً كقطعِ صِلةِ الرَّحمِ، وقطعِ قلوبِ المؤمنين بعضٍ عن بعضٍ. وعلى هذا القياسُ. وتكويناً كقطعِ العملِ عن العلمِ، وقطعِ العلمِ عن الذكاءِ، وقطعِ الذكاءِ عن الاستعدادِ، وقطعِ معرفةِ الله عن العقلِ، وقطعِ السعيِ عن القوةِ، وقطعِ الجهادِ عن الجسارةِ وهكذا.. إذ إعطاءُ القوّةِ أمرٌ معنويٌّ تكوينيٌّ بالسعيِ، وإعطاءُ الذكاءِ أمرٌ معنويٌّ بالعلمِ.. إلى آخِره.

---

(١) أعجُبها: جمع عَجْب، والعَجْبُ بالفتح: أصل الذَنَبِ. (الصحاح في اللغة)

سەبارەت بە ڕستەی: ﴿وَيُفسِدُونَ فِي الأَرْضِ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

ئەگەر کەسێك تێکچووبێت و کەوتبێتە ناو قوڕاوەوە، ئەوا بەپێی گوتەی: "بەڵا خۆشە ئەگەر گشتی بێت" بە دوای چەند هاوەڵێکدا دەگەڕێت کە ئەوانیش بکەونە قوڕاوەکەوە، تاکو سەرسامیی ئەو حاڵەتە لەسەر شانی سووك بێت! هەروەها ئەگەر نارێکی و خەوشێك کەوتە دڵی کەسێکەوە، ئەوا کەماڵاتەکانی ناو دڵی ئەو کەسە وێران دەبن و، هەست و نەستە باڵاکانی هەڵدەوەرێن، ئیتر حەزی وێرانکاریی تێدا پەیدا دەبێت. ئەوەش چێژێکی بۆ خراپەکاری تێدا دەخاتە گەڕ و، لەناو خراپەنانەوە و ئاژاوەگێڕیدا بە دوای ئەو چێژەیدا دەگەڕێت.

* ئەگەر وتت: خراپەکاریی کەسێکی لە ڕێ لادەر، چۆن کار دەکاتە سەر هەموو زەوی، کە ئەوەش بە وشەی "فِي الأَرض" ئاماژەی بۆ کراوە؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

هەر شتێك ڕێسای تێدا بێت، هاوسەنگیشی تێدایە. تەنانەت ڕێسا لەسەر بناغەی هاوسەنگی دامەزراوە. کەواتە چوونە ناوەوەی هەرشتێکی کەم و بێ نرخ بۆ ناو چەرخەکانی مەکینەیەك، کار دەکاتە سەر ئەو مەکینەیە، هەرچەندەش هەستی پێ نەکرێت. هەروەها ئەو تەرازووەش کە دوو چیای هاوسەنگ لە هەردوو تاکەیدا هەبن، دانانی یەك گوێز لە یەکێکیاندا کاری تێ دەکات.

سەبارەت بە ڕستەی ﴿أُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾یش، ئەوا بزانە کە:

مافی دەستەواژەکە ئەوە بوو کە بوترایە: "هُم خاسرون في عدمِ الهدايةِ بِـــهِ"(ئەو لە ڕێ لادەرانە بەوە زەرەرمەندن کە ڕێنماییان لێ وەرنەگرت)..

جا وشەی ﴿أُولَئِكَ﴾ و، وشەی ﴿هُم﴾ و، مەعریفەیی هەردووکیان و، ڕەهاکردنی "زیان"یش لێرەدا، لەبەر چەند سەرنجێکە:

سەبارەت بە ﴿أُولَئِكَ﴾: لەبەر ئەوەی دانانی ئەم وشەیە بۆ ئامادەکردنی شتێکی هەست پێ کراوە، ئەوا ئەو "ئامادەکردن"ەی کە لەم وشەیەوە وەردەگیرێت، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە بیسەر گەر حاڵە چەپەڵەکەی ئەوان ببیستێ، تووڕەیی و بێزێکی بەرامبەر بەوان تێدا دروست دەبێت. ئیتر بۆ دامرکانەوەی ئەو تووڕەیی و بێزهاتنەوەیەی، داوای ئامادەکردنیان لە پێش چاوی ئەندێشەدا دەکات، تاکو لە دەمی تووش بوونیان بە دەرەنجامە زیانبەخشەکە بیانبینێت..

وأما جملةُ: ﴿وَيُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ﴾..

فاعلمْ أنَّ مَن فسدَ وتورّطَ في الوحَلِ يطلبُ أنْ يكونَ له رفقاءُ متورطون ليتخففَ عنه دهشةُ الحالِ بسِرِّ "إذا عمّت البليةُ طابتْ"، وكذا إذا وقعَ في قلبِ أحدٍ اختلالٌ، يتخرّبُ في قلبه الكمالاتُ وتتساقطُ الحسياتُ العاليةُ، فيتولَّدُ فيه ميلُ التخريبِ فيُنتِجُ له لذّةً في التخريب فيتحرَّى لذتّه في الإفسادِ والاختلالِ.

* فإن قلتَ:

كيف يؤثِّرُ إفسادُ فاسقٍ في عموم الأرضِ المشارِ إليه بلفظِ "في الأرضِ"؟

قيل لك:

الذي فيه نظامٌ ففيه موازنةٌ، حتى إنَّ النظامَ مبنيٌّ على الموازنةِ، فتداخلُ شيءٍ حقيرٍ بين دواليبِ ماكينةٍ تتأثّرُ به، وإنْ لم يُحَسّ. والميزانُ الذي في كفَّتيه جَبَلان يتأثّرُ بوضعِ جَوزَةٍ على كفّةٍ.

وأما جملةُ: ﴿أُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾..

فاعلمْ أنَّ حقَّ العبارةِ "هم خاسرون في عدمِ الهداية به". فلفظُ ﴿أُولَئِكَ﴾ ولفظُ ﴿هُم﴾ والتعريفُ والإطلاقُ لنُكَتٍ:

أما ﴿أُولَئِكَ﴾ فلأنَّ وضعَه لإحضار محسوسٍ..

فالإحضارُ المستفادُ منه إشارةٌ إلى أنَّ السامعَ إذا سمِعَ حالَهم الخبيثةَ، مِن شأنه أنْ يحصَلَ له حِدّةٌ عليهم ونفرَةٌ منهم. فلتطمين نفرتِه وتشفّي حدّتِه يطلبُ أنْ يُستحضَروا إلى خيالِه ليشاهدَهم وقتَ اتصافِهم بالعاقبةِ الوخيمةِ..

"هەست پێ كراوی"یەكەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە سیفەتە خراپەكانیان هێندە زیادی كردووە كە لەبەر چاوی بینینی نەفرین و بێزدا بەرجەستەیان دەكات و، هەستیان پێ دەكرێت.. جا ئەم ئاماژەیە هێمایەكی تێدایە بۆ هۆكاری ئەو بڕیاری زیانەی كە تووشی بوون.

"دووری"یش (واتە: لە "أولئك"دا) ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە ئەوان هێندە لە ڕێی حەق دوور كەوتوونەتەوە كە ناگەڕێنەوە، كەواتە شایستەی زەم و سووكایەتی پێكردنن. بە پێچەوانەی كەسێك لەسەر ڕێی پەشیمانی و لە مەودای گەڕانەوەدا بێت.

﴿هُم﴾یش ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە "زیان" تەنها لەواندا قەتیس ماوە. تەنانەت زیانی ئیمانداران بە لەدەستدانی هەندێ چێژی دنیایی، "زیان" نییە. هەروەها زیانی خەڵكی دنیا لە بازرگانیاندا، لە چاو زیانی لە ڕێ لادەران، بە زیان دانانرێت.

"ئەلف و لام"ەكەش ئاماژەیە بۆ وێنەكێشانی "ڕاستی"یەكە. واتە هەركەسێك دەیەوێت ڕاستیی حاڵی زیانمەندان ببینێت با سەیری ئەوان بكات.. هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە سەرتاپای ڕێبازەكەیان زیانە و، بە وێنەی زیانەكانی تر نییە كە چەندەش زیانەكانی زۆرتر بێت، هەر هێشتا چەند ڕوویەكی سوودی تێدایە..

كەواتە ئەم مەعریفەكردنە، یان لەبەر كەماڵی زیانەكەیانە.. یان لەبەر بەڵگەنەویستی‌یەتی.. یاخود بۆ وێنەكێشانی ڕاستی‌یەكەیەتی.

ڕەهاكردنی "زیان"یش، ئاماژەیەكە - بە یارمەتیدانی شوێن و مەقامی ئاراستەی گوفتارەكە بۆ ئەم ئاماژەیە - بۆ سەرجەم جۆرەكانی زیانەكەیان. واتە: لە پەیمان پارێزیدا بە "شكاندن"ی پەیمانەكە زیانیان كرد.. لە سیلەی ڕەحمدا بە بڕینی.. لە چاكسازیدا بە خراپەكاری.. لە ئیماندا بە كافربوونیان.. هەروەك ئەوەش كە بە هەڵبژاردنی بەدبەختی، بەختەوەریی هەمیشەییان لە كیس چوو.

* * *

والمحسوسيةُ إشارةٌ إلى أنَّ أوصافَهم الرذيلةَ تكثّرتْ بدرجةٍ تُجسِّمُهم محسوسين نُصْبَ نظرِ النفرةِ. فمِن الإشارةِ إيماءٌ إلى علّة الحكمِ بالخسارةِ..

والبُعديةُ إشارةٌ إلى أنّهم قد بَعُدُوا عن طريقِ الحقِّ بدرجةٍ لا يرجعون، فيستحِقّون الذمَّ والتشنيعَ بخلاف مَن كان في معرِضِ الندامةِ ومسافةِ الرجوعِ.

و﴿هُم﴾ إشارةٌ إلى أنَّ الخسارةَ منحصِرةٌ عليهم حتى إنَّ خساراتِ المؤمنين لبعضِ اللذائذِ الدنيويةِ ليستْ خسارةً. وكذا خساراتُ أهلِ الدنيا في تجاراتِهم ليستْ خسارةً بالنسبة إلى خساراتِهم.

و"الألفُ واللامُ" إشارةٌ إلى تصوير الحقيقةِ، أي مَن أرادَ أنْ يرَى حقيقةَ الخاسرين فلْينظُرْ إليهم.. وكذا إيماءٌ إلى أنَّ مسلكَهم محضُ خسارةٍ لا كالخساراتِ الأُخَرِ التي فيها وجوهٌ من النفعِ لكنَّ الضرَّ أكثرُ..

فالتعريفُ إما للكمالِ أو للبداهةِ أو لتصويرِ الحقيقةِ.

وإطلاقُ الخسارةِ إشارةٌ - بإعانة المقامِ الخطابيِّ - إلى عموم أنواعِ الخساراتِ، أي خَسِرُوا في وفاءِ العهدِ بالنقضِ، وفي صلةِ الرَّحمِ بالقطيعةِ، وفي الإصلاحِ بالإفسادِ، وفي الإيمانِ بالكفرِ، وبالشقاوةِ خسِرُوا السعادةَ الأبديةَ.

* * *

﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللهِ وَكُنْتُمْ أَمْوَاتاً فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (البقرة: ٢٨)

بزانە کە:

ئەم ئایەتەش هەرسێ ڕووی هۆنینەکەی تێدایە..

سەبارەت بە هۆنینی لە ڕشتەی واتای ئایەتەکەی پێش خۆیدا، ئەوا بزانە کە خوای گەورە کاتێ خەڵکی بۆ پەرستنی خۆی و باوەڕ پێ هێنانی بانگهێشت کرد و، بناغەکانی سەرجەم باوەڕەکان و ئەحکامەکانی باس کرد و، بە پوختی ئاماژەی دا بە بەڵگەکانیان، لەم ئایەتە و سێ ئایەتەکەی دوای ئەمەشدا گەڕایەوە سەر هێنانەوەی بەڵگە لەسەریان، لە ڕێی ژماردنی ئەو نیعمەتانەی کە بەڵگەکانیان لەخۆ گرتووە.

پاشان گەورەترینی نیعمەتەکان ئەو "ژیان"ەیە کە بەم ئایەتە ئاماژەی بۆ کراوە.. پاشان "مانەوە" واتە کەماڵی ژیان، ئەوەش لە ڕێی ڕێکخستنی ئاسمانەکان و زەوی، کە بە ئایەتی دووهەم ئاماژەی بۆ کراوە.. پاشان پەسەنددانی مرۆڤ و ڕێزلێنانی بەسەر بوونەوەراندا، بە ئایەتی سێهەم.. پاشان زانست فێرکردنی، بە ئایەتی چوارەم..

جا ئەم نیعمەتانە، لە ڕووی "شێوەی نیعمەت"ەکەوە، دەبنە بەڵگەی "چاودێری" و "ئامانج". هەروەها بەڵگەی "پەرستش"یش، چونکە لە لای ژیریەکان شوکری نیعمەتبەخش واجبە و ناشکوریی نیعمەتیش حەرامە.. لە ڕووی "حەقیقەت"یشەوە بەڵگەیەکی "داهێنان"ن لەسەر بوونی سەرەتا و گەڕانەوە.

هەروەها ئەم ئایەتە هەروەك دەڕوانێتە ئایەتەکەی پێش خۆی، دەشڕوانێتە ئایەتەکانی پێشتر کە باسی کافران و دووڕووانیان کرد.

﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللهِ وَكُنْتُمْ أَمْوَاتاً فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (البقرة: ٢٨)

اعلمْ أنَّ لهذه الآيةِ أيضاً الوجوهَ الثلاثةَ النظميةَ:

أما نظمُ مآلِها بسابقها، فاعلمْ أنَّ اللهَ تعالى لَمّا دعا الناسَ إلى عبادته والاعتقادِ به، وذَكَرَ أصولَ العقائدِ والأحكامِ مُشيراً إلى دلائلها إجمالاً؛ عادَ في هذه الآيةِ مع لواحقِها الثلاثِ إلى سردِ الدلائلِ عليها بتَعدادِ النِعَمِ المتضمِّنَةِ للدلائلِ.

ثم إنَّ أعظمَ النِعَمِ "الحياةُ" المشارُ إليها بهذه الآيةِ، ثمَّ "البقاءُ" أي كمالُ الحياةِ بتنظيم السماواتِ والأرضِ المشار إليه بالآية الثانيةِ، ثم تفضيلُ البشرِ وتكريمُه على الكائنات بالآية الثالثةِ، ثم تعليمُه العلمَ بالرابعة..

فهذه النعَمُ نظراً إلى "صورة النعمةِ" دليلُ العنايةِ والغايةِ، وكذا دليلُ العبادةِ؛ إذ شُكرُ المُنعِم واجبٌ وكُفرانُ النعَمِ حرامٌ في العقول. ونظراً إلى "الحقيقةِ" دليلٌ اختراعيٌّ على وجود المبدأِ والمعادِ..

وكذا إنَّ هذه الآيةَ كما تنظرُ إلى سابقتها كذلك تنظرُ إلى الأسبقِ مِن بحثِ الكافرين والمنافقين..

جا بەم پرسیارەی كە نكوولـی و سەرسووڕمانی بەرامبەر بەوان لەخۆ گرتـووە، ئاماژەی بە سەركوت كردن و، زەم و، هەڕەشە و، ترساندنی ئەوان كرد.

سەبارەت بە هۆنینی ڕستەكانی، ئەوا بزانە كە لێرەدا ئاوڕدانەوەیەك لـە كەسـی سێهەمەوە بۆ كەسی ڕووبەڕوو (دووهەم) هەیە، چونكە یەكـەم جار لـە بارەیانـەوە دوا، پاشـان گفتوگۆی ڕووبەڕووی ئاراسـتەكردن. ئـەوەش لەبـەر سـەرنجێكی زانـراو لـە ڕەوانبێژیدا، كە بریتییە لەوەی:

ئەگەر كردارە خراپەكانی كەسێك وردە وردە باس بكرێت، تووڕەیی لـە دژی ئـەو كەسە هێندە زیاد دەبێت كە قسەبێژ – گەر مرۆڤ بێت – ناچاری گفتوگۆی ڕووبەڕوو دەكات لەگەڵیدا.. هەروەها ئەگەر پلـە لـە دوای پلـە كـردارە باشـەكانی كەسێك بـاس بكرێت، حەزی گفتوگۆ لەگەڵیدا هێنـدە بەهێز دەبێـت و پـەرە دەسێنێت كـە قسـەبێژ ڕادەپێچێت ڕووی تێ بكات و گوفتاری ئاراستە بكات..

جا لەبەر ئەوەی قورئان لەسەر شێوازی عەرەب دابەزیوە (كە ڕەوانبێژییەكەیان بەو جۆرەیە) ئەوا لـە كەسی سێهەمەوە ئاوڕی بۆ كەسی بەرامبەر دایەوە و، گوفتـاری ڕووبەڕووی ئاراستەكردن و، فەرمووی: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ﴾؟

پاشـان بزانە كـە: لەبـەر ئـەوەی مەبەسـت لـێرەدا هێنانـەوەی بەڵگەكانـە لەسـەر بناغەكانی پێشوو، لە "ئیمان" و "پەرستش" و، بەرپەرچدانـەوەی كوفـر و، ڕێ نـەدان بـە ناشكوریی نیعمەت. ئنجا ڕوونترین بەڵگەش لەسەریان ئەوەیە كە لە زنجیرە حاڵەتـەكانی مرۆڤەوە وەردەگیرێت و، تەواوترین نیعمەتیش ئەو نیعمەتانەن كە لە بۆری و لوولەی ئەو زنجیرەیەوە شۆڕ بوونەتەوە و تێهەڵكێشی گرێكانی ئەو زنجیرەیەن..

لەبەر ئەمانە، فەرمووی: ﴿وَكُنْتُمْ أَمْوَاتاً فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُـمْ ثُـمَّ إِلَيْـهِ تُرْجَعُونَ﴾ بۆ ئاماژەدان بەو زنجیرە سەرسووڕهێنەرە ڕیزبەستووە پێنج "گرێ"ییەی كە لـە پلوسك و لوولەكانیەوە هێشووی نیعمەتەكان شۆڕ بوونەتەوە..

دەبا لە پێشدا پێنج مەسەلە بهێنین بۆ كردنەوەی ئەو گرێیانە:

مەسەلەی یەكەم: لە ﴿وَكُنْتُمْ أَمْوَاتاً﴾دایە..

بزانە كە مرۆڤ لە ڕووی جەستەوە:

كاتێ چەند گەردیلەیەكی بێ گیانی پەرت و بڵاوی ناو ئەم جیهانـە بـووە، دەبینی بـە یاسایەكی تایبەت و ڕێسایەكی دیاری كراو ڕۆشتە ژێر سایەی ڕێكوپێكییەك..

فأشارَ بهذا الاستفهامِ الإنكاريِّ التعجبُيِّ إلى تقريعهم وتشنيعِهم وتهديدِهم وترهيبِهم.

وأما نظمُ الجُمَلِ، فاعلم أنَّ هنا التفاتاً من الغَيبة إلى الخطابِ؛ إذ حكَى عنهم أوّلاً ثم خاطبَهم، لنكتةٍ معلومةٍ في البلاغة وهي:

أنّه إذا ذُكِرَ مساوئُ شخصٍ شيئاً فشيئاً تزيدُ الحدَّةُ عليه، إلى أنْ يُلجِئَ المتكلِّمَ - لو كان إنساناً - إلى المشافهة والمخاطبةِ معه.. وكذا إذا ذُكِرَتْ محاسنُ أحدٍ درجةً درجةً يتقَوَّى ميلُ المكالمةِ معه إلى أنْ يُلجئَ إلى التوجُّهِ إليه والخطابِ معه..

فلنـزولِ القرآنِ على أسلوبِ العربِ التفَتَ فقالَ: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ﴾ مخاطِباً لهم.

ثم اعلم أنّه لمّا كان المقصدُ هنا سردَ البراهينِ على الأصول السابقةِ مِن الإيمانِ والعبادةِ، وردِّ الكُفرِ ومنعِ كُفرانِ النعمةِ، ثم إنَّ أوضحَ الدلائلِ هو الدليلُ المستَفادُ مِن سلسلةِ أحوالِ البشرِ، وإنَّ أكملَ النِّعَمِ هي النعمُ المتدلِّيةُ في أنابيب تلك السلسلةِ والمندمجةُ في عُقَدِها.. قال: ﴿وَكُنْتُمْ أَمْوَاتاً فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ إشارةً إلى تلك السلسلةِ العجيبةِ المترتِّبةِ ذاتِ العُقَدِ الخمسِ التي تدلّتْ من أنابيبِها عناقيدُ النِّعَمِ.

فلْنُمهِّدْ خمسَ مسائلَ لحلِّ تلك العُقَدِ:

المسألةُ الأولى: في ﴿وَكُنْتُمْ أَمْوَاتاً﴾.

اعلم أنَّ الإنسانَ باعتبار جسدِه بينما كان ذرّاتٍ جامدةً مُنتشرةً في العالَمِ، إذ تراها دخلتْ بقانونٍ مخصوصٍ ونظامٍ معيَّنٍ تحت انتظامٍ..

پاشان لەو کاتەدا کە لە ناو جیهانی تۆخمەکاندا بێدەنگ و شارراوە بوو، دەبینی بە پێی دەستوورێکی دیاری کراو هەروەها بە ڕێکوپێکییەکی وا کە ئاماژە بۆ "مەبەست" و "حیکمەت" دەکات، ڕۆشتووەتە ناو جیهانی "پەیدابووەکان"(المواليد)[1]..

پاشان ئەو کاتەی کە لەو جیهانەدا پەرتەوازە و بێ جوولەن، کتوپڕ دەبینی بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر یەك دەگرن و دەبنە "نوتفە".. پاشان بە چەند زنجیرە ئالوگۆڕێك دەبن بە "خوێنی هەڵواسراوی شێوە زەروو"(عَلَقَـــــة).. ئنجا "شێوە جووراوێك"(مُضغة).. ئنجا "ئێسك" و "گۆشت".. هتد.

جا هەموو یەکێکی ئەم قۆناغانە، هەرچەندەش سەبارەت بەوەی پێش خۆی "کامڵ" بێت، بەڵام بۆخۆی مردوویەکە و، هەمووشیان سەبارەت بەوەی دوای خۆیان مردوون.

* ئەگەر وتت:

"مردن" نەبوونی ژیان و نەمانیەتی. بەڵام خۆ ئەوانە ژیانیان تێدا نەبووە هەتا نەمێنێت؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

"مەجاز"ی هەڵبژارد، بە مەبەستی ئامادەکردنی زەینی بیسەر بۆ قبوولکردنی سێهەم و چوارەم.

مسەلەی دووهەم: لە ﴿فَأَحْيَاكُمْ﴾دایە..

بزانە کە سەیرترین و وردترینی موعجیزەکانی "توانست" بریتییە لە "ژیان"..

هەروەها "ژیان" گەورەترینی نیعمەتەکان و، ئاشکراترینی بەڵگەکانە لەسەر "سەرەتا و گەڕانەوە (زیندووبوونەوە)".

هۆی وردی و نادیارییەکەی لەوەدایە کە نزمترینی جۆرەکانی ژیان، ژیانی ڕووەکە و، یەکەم پلەشی بێداربوونەوەی گرێی ژیانە لە دەنکە تۆودا..

جا ئەم بێداربوونەوەیە، سەرباری ئاشکرایی لە ڕادەبەدەری و، گشتی بوونی و، ڕاهاتنی مرۆڤ لەگەڵیدا هەر لە سەردەمی ئادەمەوە هەتا ئێستا، کەچی لە پێش چاوی دانست و زانستی مرۆڤدا پەنهان و شارراوە بووە.

(١) جیهانی کانزاکان و، ڕووەکەکان و، زیندەوەران.

ثم بينما تراها مُتستِّرَةً ساكتةً في عالمِ العناصرِ، إذ تراها انتقلتْ متسلّلةً بدستورٍ معيّنٍ وانتظامٍ يومئُ إلى قصدٍ وحكمةٍ إلى عالمِ المواليدِ[1]..

ثم بينما تراها متفرقةً ساكتةً في ذلك العالمِ، إذ تراها تحزَّبَتْ بطرزٍ عجيبٍ وصارتْ نطفةً.. ثم بانقلاباتٍ متسلسلةٍ عَلَقَةً.. فمُضغةً.. فَلَحْماً وعظاماً وهَلُمَّ جرّاً..

فكلٌّ مِن هذه الأطوارِ وإنْ كان مُكمِّلاً بالنسبة إلى سابقِه إلّا أنه ميِّتٌ ومواتٌ[2].

* فإنْ قلتَ:

الموتُ عدمُ الحياةِ وزوالُها. ولا حياةَ فيها حتى تزولَ؟

قيل لك:

اختارَ المجازَ لإعداد الذهنِ لقبولِ العُقدةِ الثالثةِ والرابعةِ.

المسألةُ الثانيةُ: في ﴿فَأَحْيَاكُمْ﴾.

اعلم أنَّ أعجبَ معجزاتِ القدرةِ وأدقَّها "الحياةُ"..

وكذا هي أعظمُ كُلِّ النِّعَمِ وأظهَرُ كلِّ البراهينِ على المبدأِ والمعادِ.

أما وجهُ أدقّيّتِها وغموضِها فهو أنَّ أدنَى أنواعِ الحياةِ حياةُ النباتِ، وأنَّ أوّلَ درجاتِها تنبّهُ العُقْدةِ الحياتيةِ في الحبَّةِ..

وهذا التنبُّهُ - مع شدّةِ ظهورِه وعمومِه والأُلفةِ به من زمانِ آدمَ إلى الآنِ - قد بقِيَ مستوراً عن نظرِ حكمةِ البشرِ.

---

(١) عالم المعادن والنباتات والحيوانات.

(٢) بالنسبة إلى لاحقه.

هۆی ئەوەش کە "ژیان" گەورەترینی نیعمەتەکانە، ئەوەیە کە:

ئەو جەستەیەی ژیانی تێدا نییە، جگە لە شوێنە دیاریکراوەکەی و ئەو شتەی ئاوێتەیەتی، پەیوەندیی لەگەڵ هیچ شتێکی دیکەدا نییە، ئیتر بە وێنەی هەتیوێکی تەنیایە، با چیایەکیش بێت..

بەڵام گەر جەستەیەکت بینی کە ژیان ڕۆشتبووە ناوی، با بچووکیش بێت بەوێنەی هەنگێك، یەکسەری پەیوەندی بە هەموو بوونەوەرانەوە دەکات و، بازرگانیی لەگەڵ "جۆر"ەکانیدا بۆ دروست دەبێت، بە ڕادەیەك کە مافی خۆیەتی بڵێت: "بوونەوەران شوێنی منە و وەکو موڵکی مـن وان". چونکـە هـەر هێنـدەی ڕۆشـتە دۆخـی ژیـانی زیندەوەرییەوە، یەکسەر بە هەستەکانی خۆی گەشت و گوزار و هەڵسوکەوت لە هەموو کەنارێکی بوونەوەراندا دەکات. ئیتر تایبەتکاری و گۆڕینەوە و خۆشەویستی لە نێوان خۆی و جۆرەکانی بوونەوەراندا پەیدا دەبێت..

بە تایبەت ئەگەر بۆ پلەی "مرۆڤێتی" بەرز بووبێتەوە، ئەوا دەبینی کە بە نووری "ژیری" بەناو چەندین جیهاندا گەشت و گوزار دەکات. ئەوەتا هەروەك هەڵسوکەوت لە جیهانی "جیسمانی"دا دەکات، بە هەمان جۆر لە جیهانی "ڕۆحانی"دا دەگەڕێت و، بەناو جیهانی "میسال"یشدا هاتوچۆ دەکات. هەروەها وەك ئەو دەچێت بۆ ناو ئەو جیهانانە، ئەوانیش بە دەرکەوتنی وێنەیان لە ئاوێنەی ڕۆحی ئەمدا دێن بۆلای، بە ڕادەیەك کە شایستەی ئەوەیە بڵێت: "بە فەزڵ و چاکەی خوای گەورە جیهان بۆ من دروست کراوە".. ئیتر ژیانی ئەو زیندەوەرە: کرانەوە و، جۆراوجۆریی ژیانی ماددی و، مەعنەوی و، جیسمانی و، ڕۆحانی بەدەست دەهێنێت، کە هەریەکەیان چەندین چینی جیاجیا لەخۆ دەگرن..

کەواتە حەقی ئەوە هەیە کە بوترێت: هەروەك "ڕووناکی" هۆی دەرکەوتنی ڕەنگەکان و تەنەکانە، "ژیان"یش دەرخەری بوونەوەران و هۆکاری ئاشکرابوونیانە و، هەر "ژیان"ە کە گەردیلەیەك بە وێنەی جیهانێك لێ دەکات و، هەر "ژیان"یشە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کۆی جیهان چاکە لەگەڵ خودی "خاوەن ژیان"ێکدا بکات، بە بێ پاڵپاڵێن و دابەشبوون، مەگەر لە نێوان کەمترینی کەمەکانی ژمارەی مرۆڤەکاندا نەبێت.

وأما وجهُ كونِها أعظمَ النِّعَمِ، فهو:

أنَّ الجسمَ الذي لا حياةَ فيه ليس له مناسبةٌ إلّا مع مكانِه المشخَّصِ وما به يختلِطُ، فيكونُ يتيماً منفرِداً ولو كان جبَلاً.

لكنْ إذا رأيتَ جسماً ولو صغيراً كالنَّحْلِ مثلاً وقعَ فيه الحياةُ، حصلَ له دفعةً مناسباتٌ مع عمومِ الكائناتِ وتجارةٌ مع الأنواعِ، حتى يحِقُّ له أنْ يقولَ: "مكاني الكائناتُ وهي كمِلكي". إذ إذا انتقلَ إلى الحياة الحيوانيةِ تراه يجولُ بحواسِّه ويتصرَّفُ بها في أطرافِ الكائناتِ، فيحصُلُ بينَه وبين أنواعِها اختصاصٌ ومبادلةٌ ومحبّةٌ..

ولاسيّما إذا ترفَّعَ إلى طبقةِ الإنسانيةِ تراه بنورِ العقلِ يجولُ في عوالِمَ. فكما يتصرَّفُ في العالمِ الجسمانيِّ يجولُ في العاَلمِ الرُّوحانيِّ، ويطوفُ في العالم المثاليّ. وكما يسافرُ هو إلى تلك العوالمِ؛ كذلك تسافرُ هي إليه بالتَّمَثُّلِ في مرآة روحِه، حتى يستحقّ أنْ يقولَ: "إنَّ العالمَ مخلوقٌ لأجلي بفضلِ اللهِ تعالى".. فتَتَنوَّعُ حياتُه وتنبسِطُ إلى الحياة الماديةِ والمعنويةِ والجسمانيةِ والروحانيةِ التي يشتمِلُ كلٌّ منها على طبقاتٍ..

فحقٌّ أنْ يُقالَ: كما أنَّ الضياءَ سببٌ لظهور الألوانِ والأجسامِ؛ كذا إنَّ الحياةَ كشّافةٌ لكافّةِ الموجوداتِ وسببٌ لظهورِها، وإنَّ الحياةَ هي التي تُصيِّرُ ذرّةً كعالَمٍ. وإنَّ الحياةَ هي الوسيلةُ لإحسانِ مجموعِ العالَمِ لذي حياةٍ برأسِه. مع عدَمِ المزاحمةِ والانقسامِ، إلّا في أقلِّ قليلٍ بينَ البشَرِ.

هۆی ئەوەش کە "ژیان" ئاشکراترینی بەڵگەکانە لەسەر "بەدیهێنەر" و "حەشر"، ئەوا بزانە کە:

گواستنەوە و گۆڕانی یەکجاریی هەندێ گەردیلەی بێ گیان بۆ شێوە و چۆنێتییەك کە پێچەوانەی بارودۆخی یەکەمی بێت، بێ ئەوەی هیچ هۆکارێکی ئەوتۆ لەو نێوانەدا هەبێت کە "ژیری" پەسەندی بکات، بەڵگەیە کە چۆن بەڵگەیەك!

تەنانەت "ژیان" لەبەر ئەوەی لە هەموو ڕاستییەکان بەرێزتر و خاوێنترە، ئەوا لە هیچ ڕوویەکەوە هیچ سووکییەکی تێدا نییە و، هیچ لەکەیەکی بەسەرەوە نییە؛ نە لە ڕووی "مولك"ەوە، نە لە ڕووی "مەلەکووت". لەبەر ئەوە، هەردوو ڕووەکەی خاوێنن. بگرە "ژیان"ی سووکترین "زیندەوەری جوزئی"ش هەر بەرز و بڵندە. هەر لەبەر ئەم نهێنییەیە کە هیچ هۆکارێکی ڕواڵەتی نەکەوتووەتە نێوان ژیانی ئەو زیندەوەرە و توانستەوە، چونکە بەرکەوتنی توانست بەو ژیانە دژی عیززەتی ئەو توانستە نییە. لە کاتێکدا کە دانانی هۆکارە ڕواڵەتییەکان لەو شتانەدا کە بە بینینی ڕواڵەتی بە سووك و نزم دەردەکەون - وەك ڕابورد - بۆ پاراستنی عیززەتی توانستە لە بەرکەوتنیان.

کەمێ پێش ئێستا هۆی ئەوەشت بیست کە "ژیان" ئاشکراترینی بەڵگەکانە لەسەر "سەرەتا و گەڕانەوە(زیندووبوونەوە)". با (لێرەدا) کورتی بکەینەوە بۆت، کە ئەمەیە:

هەر کەسێك سەیری ئەم "ژیان"ە بکات و، پلە بە پلە بڕوانێتە قۆناغە ڕیز بەستووەکان هەتا دەگاتە ساکارترینی شێوەکانی جەستە، ئەوا چەندین شتی جوزئیی بچووك دەبینێت کە بە جیهانی گەردیلەکاندا بە هەڵوەریوی بڵاو بوونەتەوە.. پاشان لە جیهانی تۆخمەکاندا دەیانبینێت کە چەندین شێوەی تریان پۆشیوە.. ئنجا لە جیهانی "پەیدابووەکان"دا لەسەر چۆنێتییەکی تر ڕێی لێیان دەکەوێت.. پاشان لە "نوتفە"دا، ئنجا لە "عَلَقَـة"دا، ئنجا لە "مُضغَـة"دا پێیان دەگاتەوە.. پاشان دەیانبینێت کە یەکسەری و بە ئاڵوگۆڕێکی سەرسووڕهێنەر شێوەیەکیان پۆشیوە. ئنجا لە هەموو یەکێکی ئەم ئاڵوگۆڕانەشدا چەندەها جموجوڵی ڕێکوپێك بەپێی چەندین دەستووری دیاری کراو دەبینێت، کە ئەوەیان لێ بەدی دەکرێت هەموو گەردیلەیەك لە یەکەمینی قۆناغەکانەوە دیاری کراوە و، وەکو ئەوە وایە کە کارمەندێك بێت کاری ئەوەی پێ سپێررابێت بڕوات بۆ ئەو شوێنەی شیاویەتی لە جەستەی زیندەوەرەکەدا..

وأما وجهُ كونِها أظهرَ الدلائلِ على الصانعِ وكذا على الحشرِ، فاعلمْ أنَّ انتقالَ بعضِ ذراتٍ جامدةٍ وانقلابَها دفعةً إلى هيئةٍ ووضعيَّةٍ تُخالِفُ الوضعيةَ الأُولَى - بلا توسُّطِ سببٍ معقولٍ - برهانٌ أيُّ برهانٍ.

حتى إنَّ الحياةَ لكَوْنِها أشرفَ الحقائقِ وأنزهَها، لا خسّةَ فيها بوجهٍ ولا رَيْنَ عليها، لا في جهة المُلك ولا في جهة المَلَكُوتِ، فكِلا وجهَيها لطيفان، حتى إنَّ حياةَ أخسِّ حيوانٍ جزئيٌّ أيضاً عاليةٌ. ولهذا السِّرِّ لم يتوسَّطْ بينها وبين يدِ القدرةِ سببٌ ظاهريٌّ؛ إذ مباشرتُها لا تنافي عزةَ القدرةِ، مع أنَّ وضعَ الأسبابِ الظاهريةِ - كما مرَّ - لِمحافظة عزَّةِ القُدرةِ في مباشرةِ الأمورِ الخسيسةِ في ظاهرِ النَّظَرِ.

وأما وجهُ كَوْنِها أظهرَ الدلائلِ على المبدأِ والمعادِ فقد سمعتَ آنفاً، فلْنُلَخِّصْ لك وهو:

أنَّ مَنْ نَظَرَ في هذه الحياةِ وتدرَّجَ بنظرِه إلى الأطوار المترتِّبَةِ إلى أبسَطِ صُوَرِ الجسمِ يرَى أجزاءً منتشرةً في عالَمِ الذَّراتِ. ثم يبصرُها قد تلبّسَ في عالم العناصرِ صُوَراً أُخرَى. ثم يصادفُها في عالَمِ المواليدِ في وضعيةٍ أخرَى.. ثم يلاقيها في نُطفةٍ ثم في عَلَقةٍ ثم في مُضغةٍ. ثم يراها - دفعةً، بانقلابٍ عجيبٍ - قد لَبِسَتْ صُورةً..

ويرَى في هذه الانقلاباتِ حركاتٍ مُنتظَمَةً على دساتيرَ مُعيَّنَةٍ يتراءَى منها: أنَّ كُلَّ ذرةٍ كانتْ مُعيَّنَةً في أوّلِ الأطوارِ كأنّها موَظَّفةٌ للذَّهابِ إلى الموضِعِ المناسِبِ مِن جسدِ الحيِّ..

لەمەوە زەینی مرۆڤ تێدەگات کە ئەو گەردیلەیە بە "مەبەست"ێك دەبرێت بۆ ئەو شوێنانە و، بە "دانست"ێکیش ڕەوانە دەکرێت.. ئیتر ژیانی دووهەم لە پێش چاویدا - بە چەندین پلە - سووکتر و ئاسانتر و گونجاوتر دەبێت و، بە شێوەیەکی باشتر دڵی قەناعەت بە ژیانی دووهەم دەکات.

جا ئەم ڕستەیە وەك بەڵگە وایە بۆ ئەوەی دوای خۆی و، بە هەموو شیان بەڵگەن لەسەر ئەو نکوولی‌یەی کە لە ﴿كَيْفَ﴾ وەردەگیرێت.

**مسەلەی سێهەم: ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ﴾:**

بزانە کە ئایەتی: ﴿خَلَقَ الْمَـــوْتَ وَالْحَيَـــاةَ﴾ (الملك: ٢) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە "مردن" لەناودان و نەبوونی تەواوەتی و پەتی نی‌یە، بەڵکو هەڵسوکەوتێکە و، شوێن گۆڕینێکە و، دەربازکردنێکی ڕۆحە لە زیندان[1]..

هەروەها ئەو نیشانە لە ژمارە بەدەرانەی کە لە ناو جۆری مرۆڤدا هەتا ئێستا هەبووە و لە چەندین نیشانەی بێ سنوورەوە سەریان هەڵداوە، قەناعەت و حەدسێکیان (زانینێکی بەڵگەنەویستیان) خستووەتە ناو زەمینەکانەوە کە مرۆڤ لە دوای مردنی، لە ڕوویەکەوە دەمێنێتەوە. ئەوەش کە لە مرۆڤدا دەمێنێتەوە "گیان"ەکەیەتی.

جا بوونی ئەم تایبەتمەندی‌یە خۆییەی هەموو "تاك"ێکی مرۆڤ، بەڵگەیە لەسەر بوونی هەمان تایبەتمەندی - لەبەر ئەو خۆیەتی‌یە - لە تەواوی "جۆر"ەکەدا.

ئالێرەوەیە کە "موجیبەی شەخسی" داخوازی "موجیبەی کوللی" دەبێت[2]. ئەو کاتەش "مردن" بە وێنەی "ژیان" موعجیزەی توانست دەبێت، نەك ئەوەی کە مردن "نەبوو"یەك بێت هۆکارەکەی "نەبوون"ی مەرجەکانی "ژیان" بێت.

* ئەگەر وتت:

مردن چۆن بە نیعمەت دادەنرێت، هەتا لە ڕشتەی نیعمەتەکاندا بهۆنرێتەوە؟

---

(١) مەکتووبی یەکەم بە جوانی ئەمە ڕوون دەکاتەوە.

(٢) دوو زاراوەی "زانستی مەنتیق"ن. پوختەکەی ئەوەیە کە بابەتی بڕیار لەسەردراو ئەگەر لە ڕووی "چەندایەتی" و "چۆنێتی"یەوە شتێکی دەستنیشان کراو بێت و هاوبەش قبووڵ نەکات و ئامرازی "نەفی"ی لەگەڵدا نەبێت. ئەوە "موجیبەی شەخسی"یە. وەك: "مەحوی شاعیرە". خۆ ئەگەر هاوبەش قبووڵ بکات و هەمەکی بوون بۆ تاکەکانی بخوازێت، پێی دەڵێن: "موجیبەی کوللی". وەك: "هەموو زیندەوەرێك پێویستی بە ئاوە". بە پوختی لە: "ضوابط المعرفة"وە: ص ٦٩-٧٠. (وەرگێڕ)

فيتفطَّنُ الذِّهنُ أنّها بقصدٍ تُساقُ، وبحكمةٍ تُرسَلُ، وكانت الحياةُ الثانيةُ في نظره أهْوَنَ وأسهلَ وأمكَنَ بدرجاتٍ، فيقنَعُ بها قلبُه بالطريق الأَوْلَى.

فهذه الجملةُ كالدليلِ للاحقتِها، والكلُّ معاً برهانٌ على الإنكارِ المُستَفادِ مِن ﴿كَيْفَ﴾.

**المسألةُ الثالثةُ: ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ﴾.**

اعلمْ أنَّ آيةَ ﴿خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ﴾ (الملك: ٢) تدلُّ على أنَّ الموتَ ليس إعداماً وعدَماً صِرفاً، بل تصرُّفٌ، وتبديلُ موضعٍ، وإطلاقٌ للروحِ من المحبَسِ[١].

وكذا إنَّ ما وُجِدَ في نوع البشرِ إلى الآن مِن أماراتٍ غيرِ معدودةٍ، ونَجَمَ مِن إشاراتٍ غيرِ محدودةٍ، ألقَتْ إلى الأذهانِ قناعةً وحَدْساً بأنَّ الإنسانَ بعد الموتِ يبقَى بجهةٍ، وأنَّ الباقيَ منه هو الرّوحُ..

فوجودُ هذه الخاصّةِ الذاتيةِ في فردٍ يكونُ دليلاً على وجودِها في تمامِ النَّوعِ للذاتيةِ.

ومِن هنا تكونُ الموجِبةُ الشَّخصيّةُ مستلزِمةً للموجِبةِ الكُلّيةِ، فحينئذٍ يكونُ الموتُ معجزةَ القدرةِ كالحياةِ، لا أنّه عدمٌ علّتُه عَدَمُ شرائطِ الحياةِ.

* فإنْ قلتَ:

كيف يكونُ الموتُ نعمةً حتى نُظِمَ في سِلكِ النِّعَمِ؟

---

(١) المكتوب الأول يوضح هذا الأمر توضيحاً كافياً.

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

یەکەم: لەبەر ئەوەی کە پێشەکی‌یە بۆ "بەختەوەریی هەمیشەیی". خۆ پێشەکیی هەر شتێکی "جوان" یان "ناشیرین" هەمان بڕیاری جوانی یان ناشیرینیی ئەو شتەی هەیە. چونکە هەرشتێك "واجب" بەند بێت لەسەری، ئەویش واجبە. هەروەها هەرشتێك سەر بۆ "حەرام" بکێشێت، ئەویش هەر حەرامە.

دووهەم: لەبەر ئەوەی "مردن" لای لێکۆڵەرانی ئەهلی تەسەووف ڕزگاربوونی کەسەکەیە بە دەرچوونی لە هاوشێوەی زیندانی پڕ لە ئازاڵی زیانبەخش، بەرەو بیابانێکی فراوان.

سێهەم: لەبەر ئەوەی کە لە ڕووی "جۆر"ی مرۆڤەوە "مردن" نیعمەتێکی گەورەیە، چونکە ئەگەر مردن نەبوایە "جۆر"ی مرۆڤ دەکەوتە ناو چەندین نزمایی سەرسووڕهێنەرەوە.

چوارەم: لەبەر ئەوەی کە بە گوێرەی هەندێ لە کەسەکان نیعمەتێکی خوازراوە، چونکە بەهۆی "دەستەوسانی" و "لاوازی"یەوە توانای هەڵگرتنی ئەرکەکانی ژیان و، گوشاری بەڵاکان و، بەزەیی نەبوونی توخمەکانی نامێنێت. کەواتە "مردن" دەرگای ڕزگاربوونیەتی.

مەسەلەی چوارەم: لە ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾دایە..

بزانە کە بە ئاماژەی ئایەتی: ﴿أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ﴾ (غافر: ١١)... هەروەها بە هێمای بەدواداهێنانی ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ بۆ ئەم ئایەتە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی کورتیی دەربڕینەکانی قورئان، ئەوا ئەم ڕستەیە [واتە: ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾] ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ژیانی مرۆڤ لە گۆڕدا، هەروەك بەڵگەیە لەسەر ژیانی "حەشر".

* ئەگەر وتت:

گەر مرۆڤێك بسووتێنرێت و، خۆڵەمێشەکەی بە هەوادا بڵاوبکرێتەوە، چۆن تەسەووری ژیانی ناوگۆڕی ئەو کەسە دەکرێت؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێ:

لای ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت "جەستە" مەرجێك نی‌یە بۆ ئەو ژیانە، چونکە دەگونجێ "گیان" پەیوەندی بە هەندێ لە گەردیلەکانی ئەو جەستەیەوە بکات.

قيل لك:

أما أوّلاً: فلأنّه مُقدمةٌ للسّعادةِ الأبديةِ، ولمقدمةِ الشيءِ حُكمُ الشيءِ حُسناً وقبحاً؛ إذ ما يتوقّفُ عليه الواجبُ واجبٌ، وما ينجرُّ إلى الحرامِ حرامٌ.

وثانياً: فلأنَّ الموتَ عندَ أهلِ التحقيقِ مِن المتصوِّفينَ نجاةٌ للشَّخصِ بخروجِه عن نظيرِ المَحْبَسِ المشحونِ بالحيواناتِ المـُضِرَّةِ إلى صحراءَ واسعةٍ.

وثالثاً: فلأنَّه باعتبارِ نوعِ البشرِ نعمةٌ عُظمَى؛ إذ لولاها لوقعَ النوعُ في سفالاتٍ مُدهشةٍ.

ورابعاً: فلأنَّه باعتبارِ بعضِ الأشخاصِ نعمةٌ مطلوبةٌ؛ إذ بسببِ العَجزِ والضَّعفِ لا يتحمّلُ تكاليفَ الحياةِ وضغطَ البليّاتِ وعدمَ شفقةِ العناصرِ. فالموتُ بابُ فوزِه.

**المسألةُ الرابعةُ: في ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾.**

اعلم أنَّ [في ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾] بإشارةِ آيةِ ﴿أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ﴾ (غافر: ١١) وكذا برمزِ تعقيبِ هذه بـ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ مع النَّظَرِ إلى إيجازِ القرآنِ، إيماءً إلى حياةِ القبرِ كما تدلُّ على حياةِ الحشرِ.

* فإنْ قلتَ:

إذا أُحْرِقَ إنسانٌ وأُعْطِيَ رمادُه للهواءِ كيف يُتصوَّرُ فيه الحياةُ القبريةُ؟

قيل لك:

إنَّ البُنيةَ ليستْ شرطاً للحياةِ عندَ أهلِ السنةِ والجماعةِ، فيمكنُ تعلُّقُ الروحِ ببعضِ الذّراتِ.

* ئەگەر وتت:

چۆن تەسەووری سزای گۆڕ دەکرێت، لە کاتێکدا کە ئەگەر چەند ڕۆژێك هێلکەیەك لەسەر سنگی تەرمێك دابنرێت، بچووکترین جوولەی پێوە نابینرێت؟ ئیتر ژیانی چی و؟ سزای چی؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

"جیهانی میسال" لە شوێنی باسکردنیدا بەڵگەی لەسەر هێنرایەوە. تەنانەت بەلای لێکۆڵەرانی دانا ئیلاهی‌یەکانەوە[1]، بوونی ئەم جیهانە گومانی تێدا نی‌یە..

جا تایبەتمەندیی ئەو جیهانە: گۆڕینی "واتاکان"ە بە "جەستە" و، "عەرەزەکان"ە بە "گەوهەر"[2] و، شتە "بگۆڕ"ەکانە بە شتانی "جێگیر و دامەزراو".

ئەو چاوانەش کە لە جیهانی "بینراو"ەوە دەڕواننە "جیهانی میسال" بریتین لە: خەونی ڕاست و، کەشفی ڕاست و، تەنە تەنك و ڕوونەکان. چونکە ئاماژە بە "بوون"ی دەکەن.

پاشان حەقیقەتی "جیهانی بەرزەخ" چەسپاوترە لە "جیهانی میسال" کە نموونەی ئەوە. سێبەری ئەم جیهانەش: جیهانی خەونە، سێبەری ئەمیش: جیهانی ئەندێشەیە. هاوشێوەی ئەمەش تەنە ڕوونەکانە، وەکو "ئاوێنە"..

جا ئەگەر لەمە تێگەیشتیت، ئەوا سەیری جیهانی "خەون" بکە و، سەرنج لە کەسێك بدە کە لە تەنیشتی تۆدا بێ دەنگ و جوولە نووستبێت، کەچی ئەو لە جیهانەکەی خۆیدا لە جەنگ و شەڕە شمشێردایە و زامدار دەبێت، یان مارێك پێوەی دەدات؛ ئازار دەچێژێت..

خۆ ئەگەر بتوانیت بڕۆیتە ناو جیهانی خەونەکەیەوە و، پێی بڵێیت: "کاکە! دەستەوسان و تووڕە مەبە، ئەوەی کە دەیبینیت ڕاستی نی‌یە". لەگەڵ ئەم قسەیەشدا گەر هەزار سوێندی بۆ بخۆیت، هەر باوەڕت پێ ناکات و، دەڵێت:

---

(١) بەو فەیلەسووفانە دەوترێت کە باوەڕیان بە بوونی خوای بەدیهێنەر هەبووە، بەڵام لە باسی زاتی خوای گەورە و سیفەتەکانیدا و، لە خودی "بەدیهێنان" و، لەو بابەتانەشدا کە بە بێ "وەحی"ی خوای گەورە و بە تەنها لە ڕێی ژیریی‌یەوە ڕاستی‌یان نازانرێت، کەوتوونەتە هەڵەوە. (وەرگێڕ)

(٢) بۆ زانینی واتای ئەم زاراوانە بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە (٣٤٦)ی ئەم کتێبە. بۆ زانیاریی زیاتریش بڕوانە: "التعریفات"ی جورجانی. (وەرگێڕ)

* فإنْ قلتَ:

كيف يُتصوَّرُ عذابُ القبرِ مع أنّه لو وُضعتْ بيضةٌ على صدرِ جنازةٍ بأيامٍ، لا يُحَسُّ فيها أدنَى حركةٍ، فكيفَ الحياةُ والعذابُ؟

قيل لك:

إنَّ العالمَ المثاليَّ قد بُرهِنَ عليه في موقعِه، حتى إنَّ وجودَه قطعيٌّ عند المحقِّقين الإلهيين.

وخاصّةُ ذلك العالَمِ تحويلُ المعاني أجساماً والأعراضِ جواهرَ والمتغيراتِ ثابتةً.

والعيونُ الناظرةُ مِن عالَمِ الشّهادةِ إليه، الرؤيا الصادقةُ، والكشفُ الصادقُ، والأجسامُ الشّفافةُ، فإنّها تُلوِّحُ بوجودِه.

ثم إنَّ عالَمَ البرزخِ أثبتُ حقيقةً من عالم المثالِ الذي هو تمثالُه. وظِلُّ هذا العالَمِ عالَمُ الرُّؤيا، وظِلُّ هذا عالَمُ الخيالِ، ونظيرُ هذا الأجسامُ الشَّفّافةُ كالـمِرآةِ.

فإذ تفهّمتَ هذا؛ فانظرْ في عالم الرُّؤيا وتأمَّلْ في شخصٍ نامَ عندك وهو ساكِنٌ وساكِتٌ، مع أنّه في عالَمِه يُقاتِلُ ويُضارِبُ فيصيرُ مجروحاً، أو تلدَغُه الحيةُ فيتألَّمُ. ولو أمكنَ لك أنْ تدخُلَ في رؤياه وتقولَ له: "يا هذا! لا تعجَزْ ولا تغضَبْ فإنَّ هذا ليس حقيقةً" وحلفتَ له ألفَ يمينٍ لَمَا يُصدِّقك. ويقولُ لك:

"ئەمە ئازارەكەم و ئەوەش زامەكە! ئایا ئەم كەسە نابینیت كە شمشێری بە دەستەوەیە؟ ئەی ئەو مارە نابینیت كە هەڵمەتم بۆ دەهێنێت"؟ چونكە شان ئێشە و هەلامەتەكەی ئەم جیهانەی ئێرەی لە شێوەی شمشێرێكی بریندارکەر لەو جیهانەدا بۆ بەرجەستە بووە، لەبەر ئەوەی كە ئەنجامەكەیان هەر یەكێكە.. یان واتای ئەو "خیانەت"ەی كە ئازاری دڵی دەدات، لە پۆشاكی مارێكدا تەسەوور دەكات، چونكە ئازارەكەیان یەكێكە..

جا كاكە! لە كاتێكدا كە ئەمە لە سێبەری "جیهانی میسال"دا دەبینیت (كە خەونە)، ئایا هێشتا باوەڕ ناكەیت كە لەو جیهانی بەرزەخەدا هەبێت كە بە چەندین پلە حەقیقەتەكەی چەسپاوترە و لە ئێمەش دوورترە؟

سەبارەت بە ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ی ژیانی ئەودنیاش، ئەوا بزانە كە ئەو ژیانە ئەنجامی هەموو جیهانە و، گەر ئەو ژیانە نەبووایە ئەوا "حەقیقەت" شتێكی دامەزراو نەدەبوو، هەروەك ڕاستییەكانی وەك "نیعمەت" هەڵدەگەڕانەوە و دەبوون بە "نیقمەت" (ڕق و قین).

ڕاستییەكانی تریش قیاس بكەرە سەر ئەم.

بەڵگەكانی ئەمەشمان لە تەفسیری ﴿وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾دا بە پوختی هێناوە.

مەسەلەی پێنجەم: لە ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾دایە، كە دواهەمینی گرێگانی ئەو زنجیرەیە.

بزانە كە بەدیهێنەری مەزن و بەتوانا، لەم جیهانی بوون و تێكچوونەدا و لەبەر چەند حیكمەتێكی ورد، دژەكانی تێكەڵ بە یەكتری كردووە و، بۆ دەرخستنی عیززەتی خۆی چەندین پەردە و هۆكاری ڕواڵەتیی داناوە. ئیتر لەمەوە زنجیرەی "هۆكار" و "بەهۆكراوەكان" ڕیزیان لەدوای یەكتری بەست..

پاشان كاتێ بوونەوەران پاڵفتەبوون و، لە یەكتر جیابوونەوە و، لە حەشردا (هەریەكە و لەگەڵ هاوشێوەی خۆیدا) كۆبوونەوە، ئەوا ناوەند و هۆكارەكان لادەبرێن و، پەردەكە هەڵدەدرێتەوە، ئیتر هەموو شتێك بەدیهێنەری خۆی دەبینێت و خاوەنە ڕاستەقینەكەی خۆی دەناسێت.

پاشكۆیەك بۆ پوختەی هۆنینی ڕستەكان:

بزانە كە: خوای گەورە كاتێ لە ڕێی پرسیاری هەواڵخوازی ﴿كَيْفَ﴾ەوە نارەزایی لە "كوفر"ەكەی ئەوان دەربڕی و، بانگهێشتی خەڵكیشی كرد بۆ دەربڕینی

"هذا ألمي يوجِعُني وهذا جُرْحِي! أمَا ترَى هذا وبيدِه السّيفُ، وأمَا ترَى الحيةَ تهجُمُ عليّ"..

إذ تجسَّمَ معنىً وجْعُ الكَتِفِ أو نزلةُ الرأسِ(١) في صورةِ سيفٍ جارحٍ، إذ النتيجةُ واحدةٌ.

أو تصوَّرَ معنَى الخيانةِ الموجِعَةِ لقلبه في لباسِ الحيّةِ؛ إذ الألَمُ واحدٌ.

فيا هذا! إذ ترَى ذاك في ظِلِّ عالَمِ المثالِ، أفلا تُصدِّقُه في عالَمِ البرزخِ الذي هو أثبَتُ حقيقةً بدرجاتٍ وأبعدُ منّا؟

أمّا ﴿يُحْيِيكُمْ﴾ بالنظرِ إلى الحياةِ الأخرَويةِ، فاعلم أنَّ تلك الحياةَ نتيجةٌ لكلِّ العالَمِ. ولولاها لم تكنْ الحقيقةُ ثابتةً ولانقلبت الحقائقُ - كالنعمةِ - نقمةً. وقس!

ولقد لخّصْنا دلائلَها في تفسيرِ ﴿وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾.

**المسألةُ الخامسةُ: في ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ آخِرِ العُقدِ من تلك السلسلةِ.**

اعلم أنَّ الخالقَ - جلّتْ قدرتُه - مزَجَ الأضدادَ في عالَمِ الكَوْنِ والفسادِ لِحِكَمٍ دقيقةٍ، ووضعَ أسباباً ظاهريةً ووسائطَ، إظهاراً لعزَّتِه، فترتبتْ سلسلةُ العِلَلِ والمعلولاتِ. ثم لَمّا تصفّت الكائناتُ وتميّزتْ وتحزّبتْ في الحشر، ارتفعت الأسبابُ وأُسقِطَت الوسائطُ، فارتفعَ الحجابُ وكُشِفَ الغطاءُ، فيرَى كلُّ شيءٍ صانعَه ويعرِفُ مالكَه الحقيقيَّ.

**تذييلٌ لخلاصةِ نظْمِ الجُمَلِ:**

اعلم: أنّه تعالى لَمّا أنكرَ كُفرَهم الواقعَ بطريقِ الاستفهامِ الاستخباريِّ في ﴿كَيْفَ﴾ ودعا

---

(١) مرض الزكام.

سەرسووڕمانیان لێی، هات دوای "واوی حالییە"کە بە پیشاندانی چوار ئالوگۆڕ کە هەموویان گەورەن و هەریەکەشیان شایەتن لەسەر پێویستیی "ئیمان"، بەڵگەی لەسەر هۆی ئەو سەرسووڕمانە هێنایەوە..

پاشان هەموو یەکێکی ئەو ئالوگۆڕانە، چەندین قۆناغ و پلەی تێدایە و، پێشەکی و ئامادەکارە بۆ ئالوگۆڕی دوای خۆی. چونکە هەر لە قۆناغی یەکەمی ئالوگۆڕی یەکەمەوە بۆ قۆناغەکەی تری ئالوگۆڕەکەی تر، بەردەوام بناغە و خودی جەستەی زیندەوەر نوێ دەبێتەوە. ئیتر توێژاڵێك فڕێ دەدات و هی کاملتر دەپۆشێت، ئنجا ئەویش دادەماڵێت و شێوەیەکی باڵاتر دەپۆشێت، پاشان ئەویش دەخاتە لاوە و وێنەیەکی جوانتر لەبەر دەکات.. هتد.

کەواتە بەردەوام لە گۆڕینی شێوەیەکدایە بە شێوەیەکی تەواوتر، هەتا دەگاتە بەرزترینی بەرزاییەکان، ئیتر بە هاتنەدیی "بەختەوەریی هەمیشەیی" دەوەستێتەوە..

هەموو یەکێکی ئەم ئالوگۆڕانەش بە سیستەمێکی دیاری کراوە و، بەپێی یاسایەکی ڕێکوپێکە..

جا بە ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَاتاً﴾ ئاماژەی بۆ یەکەم ئالوگۆڕ کرد، کە ئەمەش چەند قۆناغێك لەخۆ دەگرێت، دواهەمینیان دەرەنجامی ئەو ﴿فَأَحْيَاكُمْ﴾ەی لێ بەرهەم دێت کە بەڵگەیە لەسەر ئالوگۆڕی دووهەم، کە ئەویش سەرسووڕهێنەرترینی ڕاستییەکانی جیهانە و، چەندین قۆناغی هەیە کە بە ئالوگۆڕی ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ﴾ کۆتاییان پێ دێت، کە ئەویش قۆناغە بەرزەخییەکانی خۆی هەیە کە بە ئالوگۆڕی ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ تەواو دەبێت، کە ئەویش قۆناغەکانی "گۆڕ" ئنجا "حەشر" لەخۆ دەگرێت کە بە ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ کۆتاییان پێ دێت!

جا ئایا کەسێك لەم ئالوگۆڕانە ورد بێتەوە، چۆن پڕ کێشیی نکوڵی دەکات؟

با ئێستاش دەست بکەین بە باسی هۆنینی شێوەی یەك بە یەکی ڕستەکان:

سەبارەت بە ڕستەی یەکەم، واتە: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتاً﴾ ئەوا مەبەست لەو پرسیارەی کە تیایدایە ئاراستەکردنی زەینی ئەوانە بۆ (هەڵوێستە) ناشیرینەکەیان، تاکو بە خۆیاندا بڕۆنەوە و، ویژدان بەکاربهێنن و دان بە "ڕاستی"دا بنێن.

الناسَ إلى التعجُّبِ منه؛ برهَنَ عليه بها بعد الواو الحالية؛ أي بإراءةِ أربعةِ انقلاباتٍ عظيمةٍ كلُّها، وكلٌّ منها، شاهِدٌ على وجوبِ الإيمانِ.

ثم إنَّ كُلَّ انقلابٍ منها مُشتَمِلٌ على أطوارٍ ومراتِبَ، ومقدِّمةٌ ومُعِدّةٌ للانقلابِ الذي يليه. فمِن الطَّورِ الأوّلِ مِن الانقلابِ الأوّلِ إلى الطَّورِ الآخَرِ مِن الانقلابِ الآخَرِ يتجدَّدُ أصلُ جسدِ الحيِّ دائماً، فيُلقِي قشراً ويَلبسُ الأكملَ، ثم يخلَعُه ويلبَسُ صورةً أعلَى، ثم يُلقيها أيضاً فيلبَسُ صورةً أحسَنَ، وهَلُمَّ جرّاً..

فهو دائماً في استبدالِ صورةٍ بأخرَى كاملةٍ إلى أنْ يصلَ إلى أعلَى الأعالي فيستقرَّ بتقرُّرِ السعادةِ الأبديةِ، وكلُّها بنظامٍ معيَّنٍ وقانونٍ منتَظَمٍ..

فأشارَ إلى أوّلِ الانقلاباتِ بقوله: ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَاتاً﴾. وهذا مشتمِلٌ على أطوارٍ، آخرُ الأطوارِ ينتجُ مآلَ ﴿فَأَحْيَاكُمْ﴾ الدّالِ على الانقلابِ الثاني، الذي هو أعجبُ حقائقِ العالَمِ المشتمِلِ على أطوارٍ آخرُها ينتهي بانقلابِ ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ﴾ المشتملِ أيضاً على أطوارِه البرزخيةِ، التي تتمُّ بانقلابِ ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ المشتملِ على أطوارِه القبريةِ ثم الحشريةِ المختومةِ بقوله: ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾!

فَمَنْ أمعَنَ في هذه الانقلاباتِ كيفَ يتجاسَرُ على الإنكارِ؟

ولْنَشْرَعْ في نَظْمِ هيئاتِ جملةٍ جملةٍ:

أما الجملةُ الأولَى أعني: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتاً﴾:

فالاستفهامُ فيها لتوجيه ذهنِهم إلى قباحتِهم ليرَوْا بأنفسِهم فينصِفُوا فيُقِرُّوا.

﴿كَيْفَ﴾ش ئاماژەیە بۆ بەڵگەهێنانەوە لەسەر نەبوونی "كوفر"[١] بە نكوولی كردن لەو حاڵەی كە "لازم"ی كوفرە.

گوفتاری ڕووبەڕووش لە ﴿تَكْفُــرُونَ﴾دا، وەك پێشتر وترا، ئاماژەیەكە بۆ توندیی تووڕەیی. هەروەها بۆیە نەیفەرموو: "لا تؤمنــون" تاكو ئاماژە بێت بۆ سەختیی پشت هەڵكردنەكەیان، چونكە واز لەو "ئیمان"ە دەهێنن كە بەڵگەكانی لەسەرە و، ئەو "كوفر"ەش وەردەگرن كە چەندین بەڵگە لەسەر پووچەڵی‌یەكەی هەیە.

"واوی حالییە"ش لە ﴿وَكُنتُمْ﴾دا، ئاماژە بۆ تەقدیر كراوێك دەكات، چونكە دوو ڕستەكە(ی یەكەم) بۆ ڕابوردوون و، دوانەكەی تریش بۆ داهاتوون. هەردووكیشیان لەگەڵ دەستووری پەیوەست بوونی "حال" بۆ كارتێكەری "خاوەن حال"دا یەك ناگرنەوە[٢]. كەواتە تەقدیرەكە بەم جۆرەیە كە:

"والحال أنكم تعلمون"( ئێستا خۆتان لە حاڵێكدان كە دەزانن)[٣].

* ئەگەر وتت:

ئەوان هەرچەندەش ژیان و مردنی یەكەم بزانن، بەڵام نازانن كە لە لایەن خواوەیە. هەروەها دان بە ژیانی دووهەمدا نانێن و، گەڕانەوە بۆلای خوا ناسەلمێنن؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

ڕەوانبێژی وا دەخوازێت كە "نەزان" لە جێی "زانا"دا دابنرێت، هەركات نیشانەكانی لابردنی نەزانی‌یەكەی دەربكەوێت.

جا لەبەر ئەوەی بیر كردنەوە لە قۆناغەكانی مردن و ژیانی یەكەم، مرۆڤ ڕادەپێچێت بۆ دان نان بە بوونی كردگاردا و، زانینی ژیانی یەكەم قەناعەت بە زەینی مرۆڤ دەبەخشێت بۆ ڕوودانی ژیانی دووهەم.. ئەوا وەكو ئەوە وابوون كە زانا بن بەم زنجیرەیە.

---

(١) واتە پووچەڵیی كوفر بە ئینكاریی حاڵەكەیان. ڕوونتر بڵێین: "كیف" بۆ پرسیار كردنە لە "حاڵ"(چۆنێتی) لە شێوەی نكوولی لێكردنیدا. كە ئەوەش نەفی كردنی ئەو حاڵە دەگەیەنێت كە "لازم"ی كوفرە. نەفی كردنی "لازم"یش نەفی كردنی "مەلزووم"ەكەی دەگەیەنێت كە "كوفر"ە. (وەرگێڕ)

(٢) واتە: نە ڕستەی ڕابوردوو نە هی داهاتوو نابن بە "حال"، بەڵكو دەبێ فیعلێك بێت هی كاتی "ئێستا" بێت سەبارەت بە "خاوەن حال". كەواتە پێویست بە تەقدیری فیعلێك دەكات هی ئێستای ئەو بێت. (وەرگێڕ)

(٣) واتە: خۆتان دەزانن كە ئێوە پێشتر "نەبوو" بوون. (ش)

و﴿كَيْفَ﴾ إشارةٌ إلى الاستدلالِ على عدَمِ الكُفرِ[1] بإنكارِ الحالِ اللازمِ.

والخطابُ في ﴿تَكْفُرُونَ﴾ إيماءٌ كما مرَّ إلى شدَةِ الغَضَبِ.

ولم يقُلْ "لا تؤمنون" إشارةً إلى شدّةِ تمرُّدِهم؛ إذ يتركون الإيمانَ الذي عليه الدلائلُ ويقبَلونَ الكُفرَ الذي على بطلانِه البراهينُ.

وواوُ الحاليةِ في ﴿وَكُنتُمْ﴾ تُشيرُ إلى مُقدَّرٍ، إذ الجملتان ماضِيَّتان والأُخْرَيان مُستقبَلتان، كلاهما لا يوافقُ قاعدةَ مُقارنةِ الحالِ لعامل ذي الحالِ..

فإذَنْ التقديرُ: "والحالُ أنّكم تعلمون"[2].

* فإنْ قلتَ:

إنَّهم وإنْ علِمُوا بالموتِ والحياةِ الأُولَى، لكنَّهم لا يعلمون أنهما مِن الله. وكذلك لا يُقِرُّون بالحياةِ الثانيةِ ولا يُصَدِّقون بالرجوعِ إليه تعالى؟

قيلَ لك:

مِن البلاغةِ تنـزيلُ الجاهلِ منـزلةَ العالمِ عند ظهورِ دلائلِ إزالةِ الجهلِ.

فلمّا كان التفكُّرُ في أطوارِ الموتِ الأوّلِ والحياةِ الأُولَى مُلجِئاً إلى الإقرارِ بالصّانعِ وكان العلمُ بها مُقنِعاً للذِّهنِ بوقوعِ الحياةِ الثانيةِ.. كانوا كأنَّهم عالِمون بهذه السلسلةِ.

---

(١) أي بطلانه بإنكار الحال. من إضافة المصدر إلى الفاعل. والباءُ متعلق بالاستدلال. علماً بأنَّ "كيف" للسؤال عن الحال.

(٢) إنكم تعلمون أنكم كنتم أمواتاً. (ش)

گوفتـاری ڕووبەڕوویش لـە ﴿وَكُنتُمْ﴾دا، ئـامـاژەیە بـۆ ئەوەی کـە ئەوان لە جیهـانی گەردیلەکانیشـدا "بـوون" و "دەسـت نیشـانکراوی"یـان هـەبووە، نـەك ئـەوەی کـە گەردیلەکان بـە هەڕەمەکیی و چۆن بۆیـان لـواوە ئاوەهـا بـە ڕێکەوت بوونەتـە جەستە دیاریکراوەکەی ئەوان.

هـەڵبژاردنی ﴿أَمْوَاتًا﴾ بەسـەر "جمـادات"(بـێ گیانـەکان) یـان "ذرات"(گەردیلەکان)دا، ئاماژەیە بۆ ناوەڕۆکی: ﴿لَمْ يَكُنْ شَيْئاً مَذْكُوراً﴾ (الانسان: ١).

سەبارەت بە ڕستەی ﴿فَأَحْيَاكُمْ﴾یش:

* ئەگەر وتت:

"فاء" بۆ "بەدواداهاتنی یەکسەری"(تعقیب) و "پەیوەست بوون"ە، کەچی لێرەدا چەندین ماوەی زۆر لە نێوان ئەو قۆناغانەدا هەیە، هەتا دەگاتە "ژیان"؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

"فاء"ەکە بۆ ئاماژەدانە بۆ شوێنی سەرهەڵدانی بەڵگـە لەسـەر بەدیهێنـەر. کـە بریتییـە لەوەی ئەو گەردیلانە بە یەکجاری و بـە بێ بوونی هۆکـارێك لـەو نـاوەندەدا کـە ژێـری پەسەندی بکات، لە دۆخی "بێ گیانی"یەوە دەگۆڕرێن بە دۆخی "زیندەوەر"، کە ئەمەش زەینی مـرۆڤ ڕادەپێچێـت بـۆ دان نـان بـە بوونـی بەدیهێنـەردا. هـەروەها قۆناغـەکان لـە حاڵەتی مردووبوونیاندا ناتەواون و ناجێگیرن، کەواتە "تەعقیب"یان بۆ دەشێت.

هەڵبژاردنی ﴿أَحْيَاكُمْ﴾ بـەسـەر "صرتم أحياءً"(بـوون بـە زیندەوەر)دا، بە مـەبەسـتی دەربڕینی ڕاشـکاوانەیە. واتـە: ئێـوە بوونـە زینـدەوەر، ئـەوەش بـە بـێ توانستی بەدیهێنـەر نابێت. کەواتە ئەنجامەکە ئەوەیە:

خوای گەورە خۆی زیندووی کردن.

هێنانی ڕستەی ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُم﴾یش لە بریی "تموتون"، ئاماژەیەکە – وەك پێشـتر وتـرا – بۆ ئەوەی کە مردن هەڵسوکەوتێکی مەزنی "توانست"ە کە بە پێـوەری "قـەدەر" ئـەنجامی دەدات..

ئایا نابینیت ئەوەی کـە تەمـەنی سروشـتیی خـۆی تـەواو بکـات و ئنجـا بگاتـە ئەجـەل ژمارەیان لە "کەم" کەمترە؟ زەینی مرۆڤ لەمەوە بێدار دەبێتەوە و تێدەگات کـە "مـردن" دەرەنجامێکی سروشتی نییە.

والخطابُ في ﴿وَكُنتُمْ﴾ إشارةٌ إلى أنَّ لهم في عالَمِ الذّرات أيضاً وجوداً وتعَيُّناً، لا أنَّ الذراتِ كيفما اتفقتْ صارتْ أجسادَهم المعيّنةَ بالتصادُفِ.

وإيثارُ ﴿أَمْوَاتاً﴾ على "جمادٍ"[1] أو "ذراتٍ" إيماءٌ إلى مآلِ:

﴿لَمْ يَكُنْ شَيْئاً مَذْكُورًا﴾ (الإنسان: ١).

وأما جملةُ: ﴿فَأَحْيَاكُمْ﴾:

* فإنْ قلتَ:

الفاءُ للتعقيب والاتصالِ مع تخلُّلِ تلك الأطوارِ وتوسُّطِ مسافةٍ طويلةٍ إلى الحياةِ؟

قيل لك:

الفاءُ للإشارةِ إلى منشأِ دليلِ الصّانعِ، وهو أنَّ انقلابَها من الجماديةِ إلى الحيوانيةِ دفعةً من غيرِ توسُّطِ سببٍ معقولٍ، يُلجئُ الذِّهنَ إلى الإقرار بالصانعِ. وكذا إنَّ الأطوارَ في حالةِ المواتِ ناقصةٌ غيرُ ثابتةٍ شأنُها التعقيبُ.

وإيثارُ ﴿أَحْيَاكُمْ﴾ على "صِرْتُم أحياءً" للتصريح، أي صِرتم أحياءً ولا يمكنُ ذلك بغيرِ قُدرةِ الصانعِ. فأنتجَ: إنَّ اللهَ تعالى هو الذي أحيا.

وأما جملةُ ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ﴾ بدلَ "تموتون"، فإشارةٌ كما مرَّ إلى أنَّ الموتَ تصرُّفٌ عظيمٌ للقدرةِ بمقياسِ القَدَرِ.. ألا ترَى أنَّ مَن استوفَى عمرَه الطبيعيَّ ثم انتهَى إلى الأجَلِ أقلُّ قليلٍ، فيتيقَّظُ الذِّهنُ إلى أنَّ الموتَ ليس نتيجةً طبيعيةً.

---

(١) على جمادات. (ش)

كەواتە "مـردن" بریتی‌یـە لـە هەڵوەشـانەوەی جەسـتە، نـەك نـەمانی ڕۆح، بـەڵكو دەربازكردنیەتی.

ڕستەی ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾یش، ﴿ثُمَّ﴾ەكەی ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە جیهانی بـەرزەخی پڕ لە سەیر و سەمەرە، دەكەوێتە نێوانی ئەو دوو قۆناغەوە.

ڕستەی ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾یش، ﴿ثُمَّ﴾ ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی پەردەیـەكی گـەورە لـەو ناوەندەدا هەیە (لە نێوان خوا و بەندەكانیدا). ﴿تُرْجَعُونَ﴾یـش ئاماژەیـە بـۆ هەڵدانـەوەی پەردە و، بەدەرنانی هۆكارەكان و لابردنی ناوەندەكان.

* ئەگەر وتت:

گەڕانـەوە بـۆلای خـوای گـەورە ئـەوە دەخوازێـت كـە یەكـەم جـار هاتنەكـە لـە لای ئـەوەوە بێـت. هـەر لێرەشـەوەیە كـە هـەندێ كـەس كەوتوونەتـە گومـانی "پەیوەسـت بوون"(الإتصال) و، هەندێ كەسی ڕێبازی "تەسەووف"یش لێی ئاڵۆزكاوە؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

لەم دنیادا "بوون" و "مانەوە"یەك هەیە و، لەو دنیاشدا "بوون" و "مانەوە"یەك..

جا "بوون" لەم دنیادا بە ڕاستەوخۆ و بە بێ هیچ ناوەندێك لـە دەستی "توانست"ەوە دەردەچێت. بەڵام سەبارەت بە "مانـەوە" لـەم جیـهانی بـوون و تێكچوونـەدا، كـە شـیتەڵ كردن و پێكهاتن و دەستكاری و ئاڵوگۆڕ گەمارۆی داوە، ئـەوا لـەبـەر ئـەو حیكمـەتـەی كە پێشتر وترا، هۆكارەكان و ناوەندەكان دەكەونە نێوانەوە..

كـەچی لـەودنیادا "بـوون" و "مانـەوە"ش بـە هـەموو پێداویسـتی و پێكهاتەكانیـەوە، یەكسەری لە دەستی "توانست"ەوە دێن و، هەموو شـتێك خاوەنـە ڕاستەقینەكەی خـۆی دەناسێت.

جا ئەگەر لەمە ورد ببیتەوە، لە واتای "رجوع"(گەڕانەوە) تێدەگەیت.

* * *

فالموتُ انحلالُ الجَسَدِ لا فناءُ الرّوحِ بلْ إطلاقُه.

وأما جملةُ ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ فـ﴿ثُمَّ﴾ إشارةٌ إلى توسُّطُ عالَمِ البرزخِ ذي العجائبِ.

وأما جملةُ ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ فـ﴿ثُمَّ﴾ إشارةٌ إلى توسُّطِ الغطاءِ العظيمِ.

و ﴿تُرْجَعُونَ﴾ إشارةٌ إلى كشفِ الغطاءِ وطَردِ الأسبابِ وإسقاطِ الوسائطِ.

* فإنْ قلتَ:

الرجوعُ إلى الله تعالى يقتضي أنْ يكونَ المجيءُ منه أوّلاً، ومِن هنا تَوَهَّمَ بعضُ الاتصالَ واشتبهَ بعضُ أهلِ التّصوّفِ.

قيلَ لك:

إنَّ في الدنيا وجوداً وبقاءً، وكذا في الآخرةِ وجودٌ وبقاءٌ..

فالوجودُ في الدنيا يصدرُ مِن يدِ القدرةِ بلا واسطةٍ، وأما البقاءُ المحفوفُ بالتحليلِ والتركيبِ والتّصَرُّفِ والتّحوُّلِ في عالَمِ الكَوْنِ والفسادِ فيتداخَلُ بينَه العِلَلُ وتتوسَّطُ الأسبابُ للحكمةِ المذكورةِ سابقاً.

وأمّا في الآخرةِ فالوجودُ وكذا البقاءُ بلوازمِه وتركيباتِه يظهرُ بالذات من يدِ القدرةِ ويَعرِفُ كلُّ شيءٍ مالكَه الحقيقيَّ.

فإذا تأمَّلْتَ في هذا علمْتَ معنَى الرجوعِ.

* * *

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ (البقرة: ٢٩)

بزانه كه ئه‌م ئایه‌ته‌ش هه‌رسێ ڕووی هۆنینه‌كه‌ی تێدایه:

سه‌باره‌ت به هۆنینی هه‌موو ئایه‌ته‌كه له ڕشته‌ی ئه‌وه‌ی پێش خۆیدا، ئه‌وا له‌وه‌دایه كه:

ئایه‌تی یه‌كه‌م (ئه‌وه‌ی پێش ئه‌مه) به به‌ڵگه خودی‌یه‌كان، كه قۆناغه‌كانی مرۆڤه، ئینكاری كردنی "كوفر" و "ناشكوریی نیعمه‌ت"ی تێدایه. له‌م ئایه‌ته‌شدا ئاماژه هه‌یه بۆ به‌ڵگه ئاسۆییه(ده‌ره‌كی‌یه)كان..

هه‌روه‌ها له یه‌كه‌میاندا ئاماژه هه‌یه بۆ نیعمه‌تی "بوون" و "ژیان"، له‌مه‌شدا بۆ نیعمه‌تی "مانه‌وه"..

هه‌روه‌ها له‌ودا به‌ڵگه له‌سه‌ر "كردگار" و، پێشه‌كی بۆ "حه‌شر" هه‌یه، له‌مه‌شدا ئاماژه هه‌یه بۆ هاتنه‌دیی حه‌شر و لابردنی گومانه‌كان. وه‌ك ئه‌وه‌ی كه ئه‌وان بڵێن: مرۆڤ ئه‌م نرخه‌ی له‌كوێ بوو؟ ئه‌و گرنگی‌یه‌ی كوا هه‌یه؟ ئایا پله‌وپایه‌ی له لای خوا چی‌یه هه‌تا له‌به‌ر ئه‌و قیامه‌ت به‌رپا بكات؟ قورئانیش به ئاماژه‌كانی ئه‌م ئایه‌ته فه‌رمووی:

مرۆڤ به‌هایه‌كی به‌رزی هه‌یه، به به‌ڵگه‌ی ئه‌وه‌ی كه ئاسمانه‌كان و زه‌وی بۆ سوودی ئه‌و ده‌سته‌مۆ و گوێڕایه‌ڵ كراون.. هه‌روه‌ها گرنگی‌یه‌كی گه‌وره‌ی هه‌یه، به به‌ڵگه‌ی ئه‌وه‌ی كه خوای گه‌وره مرۆڤی له‌به‌ر به‌دیهاتووان نه‌خولقاندووه، به‌ڵكو به‌دیهاتووانی له‌به‌ر ئه‌و به‌دی هێناوه.. لای به‌دیهێنه‌ریشی پله‌وپایه‌كی هه‌یه، به به‌ڵگه‌ی ئه‌وه‌ی كه خوای گه‌وره جیهانی له‌به‌ر خودی جیهان به‌دی نه‌هێناوه، به‌ڵكو جیهانی بۆ "مرۆڤ" و، مرۆڤیشی بۆ "په‌رستنی خۆی" به‌دی هێناوه..

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَموَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ (البقرة: ٢٩)

اعلمْ أنَّ لهذه الآيةِ أيضاً الوجوهَ الثلاثةَ النظميةَ..

أمّا نظمُ المجموعِ بالسابقِ فهو.. أنَّ في الآية الأُولى إنكارَ الكُفرِ والكُفرانِ بالدلائل الأنفُسيّةِ، وهي أطوارُ البشرِ، وفي هذه الآيةِ إشارةٌ إلى الدلائل الآفاقيةِ..

وكذا في الأُولى إشارةٌ إلى نعمةِ الوجودِ والحياةِ، وفي هذه الآيةِ إلى نعمةِ البقاءِ..

وكذا في تلكَ دليلٌ على الصانعِ ومُقدمةٌ للحشرِ، وفي هذه إشارةٌ إلى تحقيقِ المعادِ وإزالةِ الشُّبَهِ. كأنّهم يقولون: أينَ للإنسان هذه القيمةُ؟ وكيفَ له تلك الأهميةُ؟ وما موقعُه عندَ اللهِ حتى يُقيمَ القيامةَ لأجله؟ فقالَ القرآنُ بإشاراتِ هذه الآيةِ:

إنَّ للإنسانِ قيمةً عاليةً، بدليلِ أنَّ السماواتِ والأرضَ مسخَّرَةٌ لاستفادتِه، وكذا إنَّ له أهميةً عظيمةً بدليلِ أنَّ اللهَ لم يخلق الإنسانَ للخَلقِ، بل خَلَقَ الخَلْقَ له، وإنَّ له عند خالقِه لَموقعاً بدليلِ أنَّ اللهَ تعالى لم يوجِد العالَمَ لذاتِه، بل أوجدَه للبشرِ وأوجدَ البشرَ لعبادتِه.

ئەمەش ئەو ئەنجامە بە دەستەوە دەدات کە "مرۆڤ" بەدیهاتوویەکی جیاواز و نایابە و، بە وێنەی ئاژەڵان نی‌یە. کەواتە شایانی ئەوەیە گەوهەری ﴿ثُمَّ إِلَيْـــهِ تُرْجَعُـونَ﴾ لـەودا دەربکەوێت.

بۆ هۆنینی یەك بە یەکی ڕستەکانیش، ئەوا بزانە کە:

وشـەی ﴿جَمِيعاً﴾ی ڕستەی یەکەم و، وشـەی ﴿ثُـمَّ﴾ی ڕستـەی دووهـەم و، وشـەی ﴿سَبْعَ﴾ی ڕستەی سێ‌هەم، لێکۆڵینەوەیەك دەخوازن.. دەبـا لـە سـێ "مەسـەلە"دا لێیـان بدوێین:

مەسەلەی یەکەم:

* ئەگەر وتت:

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کـە هـەموو شتێکی نـاو زەوی بـۆ سـوودگەیاندنە بـە مرۆڤ. ئەی ئایا چۆن تەسەووری سوود وەرگرتنـی "زەیـد" - بـۆ نموونـە - دەکرێـت لـە هەموو بەشێك لە بەشەکانی زەوی؟ "حەبیب و عەلی"[1] چۆن چۆنی سوود وەربگرن لـە بـەردێك لـە بنـی چیایـەك لـە ناوەڕاستی دوورگەیـەك لـە ئۆقیانووسی گـەورەدا؟ چـۆن سـامانی "زەیـد" بـۆ سـوودی "عـەمر" دەبێـت؟ لـە کـاتێکدا کـە ئایەتەکـە - بـە ئامـاژەی ئایەتەکانی تری دەستەخوشکی - ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـات کـە هـەموو تـاکێکی مـرۆڤ، هەموو زەوی هی ئەوە، نەك بە دابەشکردن بەسەریاندا.. هەروەها خـۆر و مـانگ و جگـە لەوانیش - بەو گەورەییەوە - چۆن بۆ "زەید و عەمر" دەبن و، چۆن "هۆکـارە ئامـانج"ی بەدیهێنانیان سوودە جوزئی‌یەکەی ئەم دوو کەسە دەبێت؟ ئایا چۆن شتانی زیانبەخش بـۆ سـوودی مرۆڤ دەبن، لە کاتێکدا کە قورئان قســەی هەڕەمەکی و گۆترەکـاریی تێـدا نی‌یە و، زیادەڕەوییش شایانی ڕەوانبێژی‌یە ڕاستەقینەکەی نی‌یە؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

سەرنج لە شەش خاڵ بدە، وەهمەکانت هەڵدەفڕن:

یەکەم: تایبەتمەندیی "ژیان" - وەك باسی ڕابورد - جوزء دەکات بە کولل و، جوزئی دەگۆڕێت بە کوللی و، تاك بە کۆمەڵ و، پابەند بە ڕەها و، تاکە کەسـیش بـە جیـهانێك.

---

(١) هەردووکیان قوتابیی دانەر بوون لە قوتابخانەی خورخور.

فأنتجَ أنَّ الإنسانَ مُستثنىً وممتازٌ لا كالحيواناتِ، فيليقُ أنْ يكونَ مَظهراً لجوهرةِ: ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾.

وأما نظْمُ جملةٍ جملةٍ..

فاعلم أنَّ لفظَ ﴿جَمِيعاً﴾ في الجملةِ الأُولى، ولفظَ ﴿ثُمَّ﴾ في الثانية، ولفظَ ﴿سَبْعَ﴾ في الثالثةِ تقتضي تحقيقاً. فلْنتكلَّمْ عليها في ثلاثِ مسائلَ:

المسألةُ الأُولى؟

* إنْ قُلتَ:

إنَّ هذه الآيةَ تدُلُّ على أنَّ جميعَ ما في الأرضِ لاستفادةِ البشرِ. فكيفَ يُتصوَّرُ استفادةُ "زيدٍ" مثلاً من كلِّ جُزءٍ مِن أجزاءِ الأرضِ؟ و"حبيبٌ وعليٌّ"[1] كيف يستفيدان من حَجَرٍ في قعر جبلٍ في وسْطِ جزيرةٍ في البحر المحيطِ الكبيرِ؟ وكيف يكونُ مالُ "زيدٍ" لاستفادةِ "عمروٍ"؟ مع أنَّ الآيةَ بإشاراتِ أخَوَاتِها تُشيرُ أنَّ لكلِّ فردِ الجميعَ لا التوزيعَ.. وكذا كيف تكونُ الشمسُ والقمرُ وغيرُهما مع تلك العظمةِ لـ"زيدٍ وعمروٍ" والعلّةُ الغائيةُ فيها الفائدةُ الجزئيةُ لهما؟ وكيف تكونُ المضرّاتُ لاستفادةِ البشرِ مع أنّه لا مجازفةَ في القرآنِ ولا تليقُ المبالغةُ ببلاغتِه الحقيقيةِ؟

قيلَ لك:

تأمَّلْ في ستِّ نقاطٍ يتطايرْ عنك الأوهامُ:

الأولى: أنَّ خاصيّةَ الحيــاةِ كما مرَّ تُصيِّرُ الجزءَ كُلاً والجزئيَّ كُليّاً والمنفردَ جماعةً والمقيّدَ

(١) هما من طلبة الأستاذ المؤلف في مدرسة "خورخور".

ئیتر "جۆر"ەكان بە وێنەی نەتەوەی خاوەن ژیانیان لێ دێت و، دنیاش بە وێنەی ماڵەكەی و، پەیوەندیی لەگەڵ هەموو شتێكدا بۆ دروست دەبێت.

دووهەم: جیهان - وەك پێشتر زانیت - سیستەمێكی جێگیر و، ڕێكوپێكییەكی توندوتۆڵ و، چەندین دەستووری بلند و، چەندەها یاسای بنەڕەتیی بەردەوامی تێدایە. ئیتر جیهان بەمە وەكو سەعاتێك یاخود مەكینەیەكی ڕێكوپێك دەبێت. جا هەروەك هەموو چەرخێكی ئەو سەعاتە یان ئەو مەكینەیە، بگرە هەموو یەكێكی ددانەكانی هەموو چەرخەكان، تەنانەت هەموو بەشێك لە هەموو یەكێكی ئەو ددانانە، جێدەستێكیان - هەرچەندەش جوزئی بێت - لە سیستەمی مەكینەكەدا هەیە.. هەروەها بەهۆی سیستەمەكەیەوە، كاریگەریی لە سوودی مەكینەكە و ئەنجامەكەیدا هەیە..

بە هەمان جۆر "بوون"ی [هەموو بەشێكی] جیهانیش ڕۆڵی هەیە لە سوودگەیاندندا بە خاوەن ژیانەكان، كە گەورە و سەرۆكەكەیان مرۆڤە.

سێهەم: بریتییە لەوەی كە - وەك پێشتر بەرگوێت كەوت - هیچ پاڵپاڵێن و بەربەرەكانێیەك لە نێوان شێوەكانی سوود وەرگرتندا نییە. ئەوەتا هەروەك "خۆر" بە تەواوی هی "زەید"ە و، ڕووناكیی‌یەكەشی باخچە و گۆڕەپانێكە بۆ ڕوانینەكانی ئەو، بە هەمان جۆر و بە تەواویش موڵك و بەهەشتی "عەمر"ە. جا ئەگەر "زەید" - بۆ نموونە - تەنها خۆی لە جیهاندا بووایە چۆن سوودی لێ وەردەگرت، هەر بە هەمان شێوە سوودی لێ وەردەگرێت كە لەگەڵ هەموو خەڵكیدا بێت و، هیچ شتێكی لێ كەم نابێت، مەگەر ئەوەی كە هی دوو ئەشكەوتەكە بن[1]..

چوارەم: بوونەوەران تەنها ڕوویەكی تەنكیان نییە، بەڵكو چەندین ڕووی گشتیی جۆراوجۆری چین لەسەر چینیان هەیە. سوودەكانیشیان لە چەندین لایەنی گشتی و زۆر و تێهەڵكێشەوەیە و، ڕێگاكانی سوود لێ وەرگرتنیان زۆر و جۆراوجۆرە. بۆ نموونە: ئەگەر تۆ باخێكت هەبێت، خۆت لە ڕوویەكەوە سوودی لێ وەردەگریت و، خەڵكیش لە ڕوویەكی ترەوە، وەك چێژبردنی ڕوانین. بێ گومان سوود وەرگرتنی مرۆڤ بە پێنج هەستەوەرەكەی و، هەستەوەرە پەنهانەكانی و، بە جەستە و بە ڕۆحی

(١) ئەو دوو ئەشكەوتە: دەم و فەرجی مرۆڤ. یان: ورگ و فەرجیەتی. بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر.

مطلقاً والفردَ عالَماً، فيصيرُ الأنواعُ كقوم ذي الحياةِ والدنيا بيتُه، ويكونُ له مناسبةٌ مع كلِّ شيء.

والثانيةُ: أنَّ في العالَمِ - كما علمتَ - نظاماً ثابتاً، واتساقاً مُحكَماً، ودساتيرَ عاليةً، وقوانينَ أساسيةً مستمرةً، فيكونُ العالَمُ كساعةٍ أو ماكينةٍ مُنتظَمَةٍ. فكما أنَّ كُلَّ دولابٍ منها بل كلَّ سِنٍّ من كلِّ دولابٍ بل كلَّ جزءٍ من كلِّ سنٍّ له دخلٌ - ولو جزئياً - في نظامِ الماكينةِ، وكذا له تأثيرٌ في فائدةِ الماكينةِ ونتيجتِها بواسطة نظامِها؛ كذلك لوجودِه دَخلٌ في فائدةِ أهلِ الحياةِ الذين سيِّدُهم ورئيسُهم البشرُ.

والثالثةُ: أنّه - كما قرعَ سمعَك فيما مضَى - لا مزاحمةَ في وجوهِ الاستفادةِ، فكما أنَّ الشمسَ بتمامِها لزيدٍ وأنَّ ضياءَها روضةٌ وميدانٌ لنظرِه؛ كذلك بتمامِها مُلكٌ لعمروٍ وجَنّةٌ له. فزيدٌ - مثلاً - لو كان في العالَمِ وحدَه كيف تكونُ استفادتُه؛ كذلك إذا كانَ مع كلِّ الناسِ لا ينقُصُ منها شيءٌ إلّا فيما يعودُ إلى الغارَيْن[1].

والرابعةُ: أنَّ الكائناتِ ليس لها وجهٌ رقيقٌ فقط، بل فيها وجوهٌ عموميةٌ مختلفةٌ، طَبَقاً على طَبَقٍ. ولفوائدِها جهاتٌ كثيرةٌ عموميةٌ متداخلةٌ، وطُرُقُ الاستفادةِ متعدِّدَةٌ متنوِّعةٌ؛ مثلاً: إذا كان لك روضةٌ، تستفيدُ منها بجهةٍ ويستفيدُ الناسُ بجهةٍ أخرَى، كالاستلذاذِ بالقوّةِ الباصرةِ. ولا جَرَمَ أنَّ استفادةَ الإنسانِ تحصُلُ بحواسِّه الخمسِ الظاهرةِ وبحواسِّه الباطنةِ

---

(١) الغاران: فمُ الإنسان وفرجُه، وقيل: هما البطن والفرج؛ ومنه قيل: المرء يسعى لِغارَيْه؛ وقال:

ألم تر أنَّ الدهْرَ يومٌ وليلة  وأنَّ الفتَى يَسْعَىْ لِغارَيْه دائبا

(لسان العرب)

دەبێت، هەروەها بە ژیری و دڵی، هەروەها لەم دنیا و ئەو دنیای، هەروەها لە ڕووی پەند لێ وەرگرتن.. شتانی تریش بەم پێوەرە لێكبدەرەوە.. كەواتە هیچ ڕێگرێك نی یە كە ڕێ لەوە بگرێت مرۆڤ بە یەكێك لەم ڕووانە سوود لە شتانی ناو زەوی، بەڵكو هەموو جیهان وەربگرێت.

پێنجەم: بریتی یە لەوەی كە:

* ئەگەر وتت: ئەم ئایەتانە، لەگەڵ چەندین ئایەتی تردا، ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە ئەم دنیا مەزنە لەبەر مرۆڤ بەدی هێنراوە و، سوود لێ وەرگرتنی مرۆڤ كراوەتە "هۆكارە ئامانج"ی دنیا، لە كاتێكدا سوودی ئەو هەسارەی "كەیوان"ەی كە لە زەوی گەورەترە، سەبارەت بە مرۆڤ لەوە تێناپەڕێت كە جۆرە ئارایشت و ڕووناكی یەكی لاواز بێت، ئیتر چۆن ئەمە دەبێتە هۆكارە ئامانج؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

كەسی سوودوەرگر لەو ڕووەدا نوقم دەبێت كە سوودی لێ وەردەگرێت و، زەینی تێدا قەتیس دەبێت و، شتی جگە لەوەی لە بیر دەچێت و، لەبەر خۆی دەڕوانێتە هەموو شتێك و، هۆكارە ئامانج دەتربجێنێتە ئەو شتەی كە پەیوەستی دەبێت. كەواتە هیچ گۆترەكاری یەك لەو گوفتارەدا نی یە كە بە مەبەستی منەت لێنان ئاراستەی ئەو كەسە بكرێت و، سەبارەت بەو بوترێت: ئەو هەسارەی كەیوانەی كە بەدیهێنەرەكەی لەبەر هەزاران حیكمەت دروستی كردووە و، هەریەك لەو حیكمەتانەش هەزاران ڕووی تێدایە و، هەموو ڕوویەكیش هەزاران سوود لێ وەرگری هەیە.. بوترێ: هۆكارە ئامانجی بەدیهێنانی بریتی یە لەو ڕووەی كە ئەو كەسە سوودی لێ وەردەگرێت..

شەشەم: پێشتریش بێداریم لە بارەیەوە دا، ئەوەیە كە: مرۆڤ هەرچەندەش بچووك بێت، هەر گەورەیە. چونكە سوودە جوزئی یەكەی ئەو، شتێكی هەمەكی یە. كەواتە هەرەمەكێتی و بێ مەبەستی لە ئارادا نی یە.

مەسەلەی دووهەم: لە ﴿ثُمَّ﴾دایە:

بزانە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە بەدیهێنانی زەوی لە پێش ئاسمان بووە..

ئایەتی: ﴿والأرْضَ بَعْدَ ذٰلِكَ دَحَاهَـا﴾ش (النازعات: ٣٠) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە بەدیهێنانی ئاسمان لە پێش زەوی بووە.

وبجسمِه وبروحِه وكذا بعقلِه وقلبِه وكذا في دنياه وفي آخرتِه وكذا من جهةِ العِبرةِ. وقِسْ عليها.. فلا مانعَ من استفادتِه بوجهٍ من هذه الوجوهِ من كلِّ ما في الأرضِ بل العالَمِ.

والخامسةُ: أنّه:

* إنْ قُلتَ:

هذه الآياتُ مع آياتٍ أُخَرَ تُشيرُ إلى أنَّ هذه الدنيا العظيمةَ مخلوقةٌ لأجْل البشرِ وجُعِلَ استفادتُه علّةً غائيّةً لها. والحالُ أنَّ زُحلَ الأكبرَ مِن الأرض ليستْ فائدتُها بالنسبة إلى البشرِ إلّا نوعَ زينةٍ وضياءٍ ضعيفٍ فكيف يكونُ علةً غائيةً؟

قيلَ لك:

إنَّ المستفيدَ يفنَى في جهة استفادتِه، وينحصِرُ ذهنُه في طريقها، وينسَى ما عداها، وينظُرُ إلى كلِّ شيءٍ لنفسِه، ويحصُرُ العلّةَ الغائيّةَ على ما يتعلَّقُ به. فإذنْ لا مُجازَفةَ في الكلامِ الموجَّهِ إلى ذلك الشخصِ في مقامِ الامتنانِ بأنْ يُقالَ: إنَّ زُحَلَ - الذي أبدعَه خالقُه لألوفِ حِكَمٍ، وفي كلِّ حكمةٍ ألوفُ جهاتٍ، وفي كلِّ جهةٍ ألوفُ مستفيدٍ - العلّةُ الغائيةُ في إبداعه جهةُ استفادةِ ذلك الشخصِ.

والسادسةُ: - وقد نبَّهتُ عليه - أنَّ الإنسانَ وإن كان صغيراً فهو كبيرٌ، فنفعُه الجزئيُّ كليٌّ، فلا عَبَثِيَّةَ.

المسألةُ الثانيةُ في ﴿ثُمَّ﴾:

اعلمْ أنَّ هذه الآيةَ تدلُّ على أنَّ خلْقَ الأرضِ قبلَ السماءِ..

وأنَّ آيةَ ﴿والأَرْضَ بَعْدَ ذلِكَ دَحَاهَا﴾ (النازعات: ٣٠) تدلُّ على أنَّ خلْقَ السماءِ قبلَ الأرضِ..

هەروەها ئایەتی: ﴿كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا﴾ (الأنبياء: ٣٠) دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە هەردوو کیان پێکەوە بەدی هێنراون و لە ماددەیەك جیابوونەتەوە.

هەروەها ئەوەش بزانە کە بابەتە نەقلی‌یەکانی شەرع بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە لە پێشدا گەوهەرێکی - واتە ماددەیەکی - بەدی هێنا. پاشان لەسەری درەوشایەوە، ئیتر هەندێکی کردە هەڵم و هەندێکی تر شلەمەنی. پاشان بە لێ درەوشانەوەی ئەو، شلەمەنی‌یەکە چڕ بووە و کەفی کردووە. پاشان لەو کەفە زەوی یاخود حەوت دانە گۆی زەویی بەدی هێنا. پاشان هەریەك لەو زەوی‌یانە ئاسمانێکی لە هەوای نەسیمی (بەرگە هەوا) بۆ دروست بوو. پاشان ماددە هەڵمەکەی ڕاخست و حەوت ئاسمانی لێ ڕێکخستن و، ئەستێرەکانی تێدا چاندن، ئیتر ئاسمانەکان، بە ناوکەکانی ئەستێرەکانەوە، پێکهاتن..

گریمانەکانی "دانستی نوێ" و تیۆرەکانیشی، پێیان وایە کە: کۆمەڵەی خۆر لەگەڵ ئەو ئاسمانەیدا کە مەڵەی تێدا دەکات، لە پێشدا گەوهەرێکی سادە بووە.. پاشان بووە بە جۆرە هەڵمێك.. پاشان لەو هەڵمە شلەمەنی‌یەکی ئاگرین دروست بووە.. پاشان بە ساردبوونەوەی، بەشێکی ڕەق بووە.. پاشان ئەو شلەمەنی‌یە ئاگرینە بە جموجووڵ لە شێوەی چەند پارچە و پزیسکێکدا هاوێژران و لێك جیابوونەوە، ئیتر بوونە چەند هەسارەیەکی گەڕۆك، کە ئەم زەوی‌یەی خۆمان یەکێکیانە.

جا کە ئەمەت بیست، ئەوا دەتوانیت ئەم دوو ڕێبازە یەك بخەیت، چونکە دەگونجێ ئایەتی: ﴿كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا﴾ ئاماژە بێت بۆ ئەوەی کە ئەم زەوی‌یە لەگەڵ کۆمەڵەی خۆردا، بە وێنەی هەویرێك بووبێتن کە دەستی "توانست" لە گەوهەرێکی ساکار - مەبەستم ئەو ماددەی "ئەثیر"ەیە کە وەك ئاوی ڕۆشتوو وایە لە چاو بوونەوەراندا و بە ناویاندا خوڕ دەبێتەوە - هەڵی شێلابن. ئایەتی: ﴿وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ﴾ (هود: ٧) ئاماژەیە بۆ ئەم ماددەیەی کە وەکو ئاو وایە..

"ئەثیر"یش دوای بەدیهێنانی، مەڵبەندی یەکەم درەوشانەوەی خوای گەورەیە بە بەدیهێنانی شتان. واتە: دوای ئەوە "ئەثیر"ی دروست کرد، پاشان کردی بە چەند گەوهەرێکی یەکتا (چەندین گەردیلە)، پاشان هەندێکی چڕ کردەوە، پاشان لەو چڕە حەوت گۆی بە نیشتەجێ کراوی ئاوەدانی بەدی هێنا کە یەکێکیان ئەم زەوی‌یەمانە..

وأنَّ آيَةَ: ﴿كانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا﴾ (الأنبياء: ٣٠) تدلُّ على أنّهما خُلقَتا معاً وانشقَّتا مِن مادّةٍ.

واعلم ثانياً: أنَّ نقلياتِ الشَّرعِ تدلُّ على أنَّ اللهَ تعالى خَلَقَ أوّلاً جوهرةً - أي مادّةً - ثم تجلّى عليها فجعلَ قسماً منها بُخاراً وقسماً مائِعاً. ثم تكاثَفَ المائعُ بتجلّيه فأزبَدَ. ثم خَلَقَ الأرضَ أو سبعَ كُراتٍ من الأرَضين مِن ذلك الزَّبدِ، فحصَلَ لكلِّ أرضٍ منها سماءٌ من الهواء النسيميِّ. ثم بسَطَ المادةَ البُخاريةَ فسوَّى منها سماواتٍ زَرَعَ فيها النجومَ فانعقدَت السماواتُ مشتمِلَةً على نَوَياتِ النُّجومِ.

وإنَّ فَرَضيّاتِ الحكمةِ الجديدةِ ونظرياتِها تحكُمُ بأنَّ المنظومةَ الشمسيةَ أي مع سمائِها التي تسْبَحُ فيها كانتْ جوهراً بسيطاً ثم انقلبَ إلى نوعِ بخارٍ، ثم تحصَّلَ مِن البخارِ مائعٌ ناريٌّ، ثم تصلَّبَ ـ بالتبَرُّدِ - منه قسمٌ، ثم ترامَى ذلك المائعُ الناريُّ بالتحرُّكِ شراراتٍ وقطعاتٍ انفصلتْ فتكاثَفَتْ فصارتْ سيّاراتٍ، منها أرضُنا هذه.

فإذا سمعتَ هذا يجوزُ لك التطبيقُ بين هذين المسلكَين، لأنّه يمكنُ أنْ يكونَ آيةُ ﴿كانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا﴾ إشارةً إلى أنَّ الأرضَ مع المنظومةِ الشمسيةِ كانتْ كعَجينٍ عَجَنَتْه يدُ القدرةِ مِن جوهرٍ بسيطٍ أعني "مادّةَ الأثيرِ" التي هي كالماءِ السيّالِ بالنسبة إلى الموجوداتِ فتنفُذُ جاريةً بينَها. وآيةُ ﴿وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ﴾ (هود: ٧) إشارةٌ إلى هذه المادّةِ التي هي كالماءِ.

و"الأثيرُ" بعدَ خلقِه، هو المركزُ لأوّلِ تجلّي الصانع بالإيجادِ، أي فخَلَقَ "الأثيرَ"، ثم صيّرَه جواهرَ فردةً، ثم جعَلَ البعضَ كثيفاً، ثم خلَقَ مِن الكثيفِ سبعَ كُراتٍ مسكونةً، منها أرضُنا.

پاشان "زەوی" لەبەر ئەوەی پێش هەموویان چڕی و ڕەقیی بەدەست هێنا و، خێرا توێژاڵی پۆشی و، لە کاتێکی درێژخایەندا بووە شوێنی سەرهەڵدانی ژیان، لەگەڵ مانەوەی گەلێ تەنی ئاسمانیی تر هەتا ئێستا لە دۆخی شلیی ئاگریندا.. ئەوا بەدیهێنان و پێکهاتنی – لەم ڕووەوە – لە پێش بەدیهاتنی ئاسمانەکانەوەیە.

ئنجا لەبەر ئەوەی کامڵ بوونی سوودەکانی و، تەخت کردنی بۆ ئەوەی کە جۆری مرۆڤی لەسەر بژی، دوای تەخت کردن و ڕێکخستنی ئاسمانەکان بووە، ئەوا ئاسمانەکان – لەم ڕووەوە – لە پێشترن، هاوکات لەگەڵ کۆبوونەوەیان لە سەرەتادا.

جا ئەم سێ ئایەتە دەڕواننە ئەم سێ خاڵە.

وەڵامی دووهەم:

ئامانجی قورئان وتنەوەی وانەی مێژووی بەدیهاتن نییە، بەڵکو بۆ ئەوە نازڵ بووە هەتا وانەی ناسینی بەدیهێنەر بڵێتەوە.. ئەمەش دوو مەقامی تێدایە؛ لە مەقامی ڕوونکردنەوەی نیعمەت و سۆز و میهرەبانی و دەرکەوتنی بەڵگەدا، زەوی دەکەوێتە پێشتر. بەڵام لە مەقامی بەڵگەکانی گەورەیی و عیززەت و توانستدا، ئاسمانەکان لە پێشترن.

پاشان ﴿ثُمَّ﴾ هەروەك بۆ "بوونی ماوە"یە لە "زات"ی ئەو شتەدا کە بۆی بەکاردەهێنرێت، بۆ "بوونی ماوە"ش دێت لە "پلە"دا. کەواتە ﴿ثُمَّ اسْتَوَى﴾ واتە: دوای ئەوە، بزانن و بیر بکەنەوە کە ئەو: "استوى"[1].

مەسەلەی سێهەم: لە بارەی ﴿سَبْعَ﴾وەیە:

بزانە کە "حیکمەتی کۆن" (واتە فەلسەفەی کۆن، کە زانستیشی دەگرتەوە) دەڵێت: ئاسمانەکان نۆ دانەن. ئەوانەش کە ئاوا دەڵێن تەسەووری ئاسمانیان بە شێوەیەکی سەیر و سەمەرە کردووە و، ئەو بیروبۆچوونەشیان بۆ ماوەی چەندین چەرخ بەسەر

---

(١) واتە بۆ بوونی ماوەی بیرکردنەوەیە. بەو واتایەی کە هەرچەند بەدیهێنانی ئاسمانەکان لە پێشترە، بەڵام بیرکردنەوە لە بەدیهێنانیان لە پلەی دووهەمدا دێت. هەروەها هەرچەند بەدیهێنانی زەوی لە دوای ئاسمانەکانە، بەڵام بیر لێ کردنەوەی لە پێشترە. واتە: دەبێ پێش بیرکردنەوە لە بەدیهێنانی ئاسمانەکان، بیر لە بەدیهێنانی زەوی بکرێتەوە. (ت)

ثم إنَّ الأرضَ بالنظر إلى كثافتِها وتصلُّبِها قبلَ الكُلِّ، وتعجيلِها في لبس القِشْرِ وصيرورتِها من زمانٍ مديدٍ مَنشأَ الحياةِ مع بقاءِ كثيرٍ مِن الأجرامِ السماويةِ إلى الآنَ مائعةً ناريةً.. تكونُ خلقتُها وتشكُّلُها من هذه الجهةِ قبلَ خلْقِ السماواتِ..

ولما كان تكمُّلُ منافعِها ودَحْوُها (أي بسطُها وتمهيدُها لِتَعَيُّشِ نوعِ البشرِ) بعد تسويةِ السماواتِ وتنظيمِها، تكونُ السماواتُ أسبقَ مِن هذه الجهةِ مع الاجتماعِ في المبدأِ..

فالآياتُ الثلاثُ تنظرُ إلى النقاطِ الثلاثِ.

الجوابُ الثاني: إنَّ المقصدَ مِن القرآنِ ليسَ درسَ تاريخِ الخِلقةِ، بل نزلَ لتدريس معرفةِ الصانعِ. ففيه مقامان؛ ففي مقامِ بيانِ النعمةِ واللطفِ والمرحمةِ وظهورِ الدليلِ تكونُ الأرضُ أقدمَ، وفي مقامِ دلائلِ العظمةِ والعزّةِ والقدرةِ تكونُ السماواتُ أسبقَ..

ثم إنَّ ﴿ثُمَّ﴾ كما تكونُ للتراخي الذاتيِّ تجيءُ للتراخي الرُّتْبيِّ، فـ﴿ثُمَّ اسْتَوَى﴾ أي ثمَّ اعلموا وتفكّروا أنّه استوَى[1].

**المسألةُ الثالثةُ في ﴿سَبْعَ﴾:**

اعلم أنَّ الحكمةَ العتيقةَ قائلةٌ بأنَّ السماواتِ تسعةٌ، وتصوَّرَها أهلُها بصورةٍ عجيبةٍ، واستولَى فكرُهم على نوعِ البشرِ في أعصارٍ، حتى اضطرَّ كثيرٌ مِن المفسِّرين إلى إمالةِ ظواهرِ

---

(١) أي للتراخي التفكري. بمعنى أن خلق السماوات مع أنه أسبق إلّا أنّ التفكرَ فيه يأتي بالمرتبة الثانية. ومع أنَّ خلقَ الأرض بعد السماوات إلّا أنَّ التفكر فيه أسبق، أي يلزم التفكر في خلق الأرض قبل السماوات. (ت)

گرۆی مرۆڤدا زاڵ بوو. بە ڕادەیەك کە زۆرێك لە تەفسیرنووسان ناچاربوون کە ڕواڵەتی ئایەتەکان بۆلای ڕێڕەوی ئەوانە خوار بکەنەوە.

بەڵام حیکمەتی نوێ دەڵێت:

ئەستێرەکان بە بۆشاییدا هەڵواسراون..

وەك بڵێی نکوڵی لە بوونی ئاسمان بکات..

جا هەروەك یەکێکیان لەمەدا زیادەڕەویی کردووە، ئەوی تریان کورتبڕی تێدا نواندووە.

بەڵام "شەریعەت" بڕیاری وایە کە بەدیهێنەری مەزن حەوت ئاسمانی بەدی هێناوە و، ئەستێرەکانیشی لەو ئاسمانانەدا بە وێنەی ماسییەکان لێ کردووە کە مەلەی تێدا دەکەن. فەرموودەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە "ئاسمان شەپۆلێکی هێور بووە"[1].

ڕوونکردنەوەی ئەم ڕێڕەوە ڕەوایە، لە شەش پێشەکیدایە:

یەکەم: لە زانست و دانستدا سەلماوە کە بۆشایی فراوان پڕە لە ماددەی "ئەثیر".

دووهەم: پەیوەستەری یاساکانی تەنە بەرزەکان و، بڵاوکەرەوە و گەیەنەری هێزەکانی چەشنی ڕووناکی و گەرمی، ماددەیەکە لە بۆشاییدا کە ئەو بۆشاییەی پڕ کردووە.

سێهەم: ماددەی ئەثیر – وێڕای مانەوەشی بە ئەثیری – وەکو هەموو ماددەکانی تر، چەندین شێوە پێکهاتنی جۆراوجۆری هەیە و، چەند جۆرێکی جیاجیای لێ پێکدێت، وەك پێکهاتنی شێوەی هەڵم و ئاو و بەستەڵەك.

چوارەم: گەر بە وردی سەیری تەنە باڵاکان بکرێت، جیاوازی لە نێوان چینەکاندا دەبینرێت. ئایا نابینی ئەو ڕووبارەی ئاسمان کە پێی دەوترێ "ڕێی کاکێشان" و لە شێوەی پەڵە هەورێکدا دەبینرێت، لە ڕاستیدا ملیۆنەها ئەستێرەن لە دۆخی پێکهاتندا؟ جا شێوەی ئەو ئەثیرەی کە ئەو ئەستێرانەیان تێدا پێکدێت، بە بێ گومانی جیایە لە چینی ئەستێرە جێگیرە دامەزراوەکان.. ئەویش بە "حەدس"ی ڕاست جیایە لە چینەکانی کۆمەڵەی خۆر.. هەر بەم جۆرە هەتا دەگاتە حەوت کۆمەڵە خۆر..

---

(١) بۆ تەخریجەکەی بڕوانە لاپەڕەی بەرامبەر. (وەرگێڕ)

الآياتِ إلى مذهبِهم. وأما الحكمةُ الجديدةُ فقائلةٌ بأنَّ النجومَ معلَّقةٌ في الفضاءِ والخلُو، كأنّها مُنكِرةٌ لوجودِ السماءِ. فكما أفرطتْ إحداهما فرّطت الأخرَى.

وأما الشّريعةُ فحاكمةٌ بأنَّ الصانعَ جلَّ جلالُه خلقَ سبعَ سماواتٍ وجعلَ النجومَ فيها كالسَّماكِ تسْبَحُ. والحديثُ يدلُّ على أنَّ "السماءَ مَوْجٌ مكفوفٌ"[1].

وتحقيقُ هذا المذهبِ الحقِّ في ستِّ مُقدِّماتٍ.

**الأولى**: إنّه قد ثبتَ فنّاً وحكمةً أنَّ الفضاءَ الوسيعَ مملوءٌ مِن الأثيرِ.

**والثانيةُ**: إنَّ رابطةَ قوانينِ الأجرامِ العُلويةِ وناشرَ قُوَى أمثالِ الضياءِ والحرارةِ وناقلَها مادّةٌ موجودةٌ في الفضاءِ مالِئةٌ له.

**والثالثةُ**: إنَّ مادةَ الأثيرِ- مع بقائِها أثيراً - لها كسائر الموادِّ تشكُّلاتٌ مختلفةٌ، وتنوعاتٌ متغايرةٌ كتشكُّلِ البُخارِ والماءِ والجَمَدِ.

**والرابعةُ**: إنّه لو أُمعِنَ النظرُ في الأجرام العُلويةِ يُرَى في طبقاتِها تخالُفٌ. ألا ترَى أنَّ نهرَ السماءِ المسمَى بـ"كَهْكَشان"[2] المرئيِّ في صورةِ لطخةٍ سحابيّةٍ إنما هو ملايينُ نجومٍ أخذتْ في الانعقاد. فصورةُ الأثيرِ التي تنعقِدُ تلك النجومُ فيها تخالِفُ طبقةَ الثوابتِ البتّةَ، وهي أيضاً تخالِفُ طبقاتِ المنظومةِ الشمسيةِ بالحَدْسِ الصادقِ... وهكذا إلى سبعِ منظوماتٍ.

---

(١) جزء من حديث أخرجه الإمام أحمد في مسنده (٢/ ٣٧٠) والترمذي برقم (٣٢٩٨) وفي تحفة الأحوذي برقم (٣٣٥٢) وقال: هذا حديث غريب من هذا الوجه. وعزاه صاحب التحفة لأحمد وابن أبي حاتم والبزار وفي مجمع الزوائد (٨/ ١٣٢): جزء من حديث رواه الطبراني في الأوسط، وفيه أبو جعفر الرازي، وثّقه أبو حاتم وغيره وضعّفه النسائي وغيره، وبقية رجاله ثقات، وانظر فيه كذلك (٧/ ١٢١) وتفسير ابن كثير - الحديد.

(٢) درب التبانة.

پێنجەم: بە "حەدس" و، "پشكنین" سەلماوە كە: هەر كات پێكهاتن و ڕێكخستن و ڕێك كردن لە هەر ماددەیەكدا كرا، چەندین چینی جیاجیای لێ پەیدا دەبێت، وەك "كانزا" كە خۆڵەمێش و خەڵووز و ئەڵماسی لێ دەبێتەوە.. هەروەها وەك "ئاگر" كە پشكۆ و بڵێسە و دووكەڵی لێ جیا دەبێتەوە.. هەروەها وەك "هایدرۆجین و ئۆكسجین" كە ئاو و بەستەڵەك و هەڵمیان لێ پێك دێت.

شەشەم: ئەم نیشانانە بەڵگەن لەسەر فرەیی ئاسمانەكان. شەرعدانەری ڕاستگۆ كە فەرموویەتی: "حەوت"ن، ئەوا ڕاستە "حەوت"ن! ئەوەش هەیە كە "حەوت" و "حەفتا" و "حەوت سەد" لە شێوازەكانی زمانی عەرەبیدا بۆ واتای "زۆری" بەكاردەهێنرێن.

بە پوختی:

كردگاری شكۆمەند لە "ماددەی ئەثیر" حەوت ئاسمانی بەدی هێنا و، بە ڕێسایەكی سەرسووڕهێنەری ورد ڕێكی كردن و ڕێكی خستن و، ئەستێرەكانی لە نێواندا چاندن و، جیاوازیی خستە نێوان چینەكانیانەوە.

بزانە كە: هەركات بیر لە فراوانیی گوفتارەكانی قورئان و واتاكانی بكەیتەوە و، سەرنجی چاودێری كردنی قورئان بدەیت بۆ تێگەیشتنەكانی سەرجەمی چینەكان، هەر لە نزمترین كەسی عەوامەوە تا دەگاتە تایبەتمەندترین كەسە تایبەتەكان، شتێكی سەرسووڕهێنەر دەبینیت. بۆ نموونە:

هەندێ كەس وا لە ﴿سَبْعَ سَمٰوَاتٍ﴾ تێدەگات كە بریتییە لە چینەكانی هەوای نەسیمی.. هەندێ كەسی تر بەو گۆ نەسیمییانە(بەرگە هەواییانە)یان تێدەگات كە دەوراندەوری ئەم زەوییەمان و دەستە خوشكەكانی ئەویان داوە كە خاوەن ژیانیان لەخۆ گرتووە.. هەندێكی تر بەو حەوت هەسارە گەڕۆكەیان تێدەگات كە لە لایەن خەڵكەوە دەبینرێن. هەندێ كەسی تر بە حەوت چینی "ئەثیر"ی تێدەگات لە كۆمەڵەی خۆردا.. هەندێكی تر بە حەوت كۆمەڵە خۆریان تێدەگات كە یەكەمیان كۆمەڵەی ئەم خۆرەی خۆمانە.. هەندێ تر وا تێدەگات لێی كە - وەك كەمێ پێش ئێستا وترا - ماددەی ئەثیر لە پێكهاتنیدا دابەش بوو بێت بەسەر حەوت چیندا.. هەندێكی تر ڕای وایە كە هەرچی دەبینرێت لەوانەی كە بە چرای خۆرەكان و ئەستێرە جێگیرەكان ڕازاوەتەوە، تەنها یەك ئاسمانە، كە ئاسمانی دنیایە و، شەش ئاسمانی تر لە سەروویەوە هەیە

والخامسةُ: إنّه قد ثبتَ حَدْساً واستقراءً أنّه إذا وقعَ التشكيلُ والتنظيمُ والتسويةُ في مادّةٍ، تتولّدُ منها طبقاتٌ مختلفةٌ كالمعدنِ يتولّدُ منه الرّمادُ والفحمُ والألماسُ.. وكالنارِ تتميزُ جمراً ولَهَباً ودُخاناً، وكمَزْجِ مُولِّدِ الماءِ مع مُوَلِّدِ الحُموضةِ[1] يتشَكَّلُ منه ماءٌ وجَمَدٌ وبُخارٌ.

والسادسةُ: إنَّ هذه الأماراتِ تدلُّ على تعدُّدِ السماواتِ. والشارعُ الصادقُ قال هي سبعةٌ، فهي سبعةٌ. على أنَّ السبعَ والسبعينَ والسبعَمائةَ في أساليبِ العربِ لمعنى الكثرةِ.

والحاصلُ:

إنَّ الصانعَ جلَّ جلالُه خلقَ مِن "مادّةِ الأثيرِ" سبعَ سماواتٍ فسوّاها ونظّمَها بنظامٍ عجيبٍ دقيقٍ وزرعَ فيها النجومَ وخالَفَ بين طبقاتِها.

اعلم أنّك إذا تفكّرْتَ في وُسْعةِ خطاباتِ القرآنِ ومعانيه ومراعاتِه لأفهامِ عامّةِ الطبقاتِ مِن أدنَى العوامِّ إلى أخصِّ الخواصِّ، ترَى أمراً عجيباً. مثلاً:

مِن الناسِ مَن يفهمُ مِن ﴿سَبْعَ سَمٰوَاتٍ﴾ طبقاتِ الهواءِ النسيميةِ.. ومنهم مَن يفهمُ منه الكُراتِ النسيميةَ المحيطةَ بأرضِنا هذه وأخواتِها ذواتِ ذوي الحياةِ.. ومنهم مَن يفهمُ منه السيّاراتِ السبعَ المرئيةَ للجمهورِ.. ومنهم مَن يفهمُ منه طبقاتٍ سبعةً أثيريةً في المنظومةِ الشمسيةِ.. ومنهم مَن يفهمُ منه سبعَ منظوماتٍ شموسيةٍ أُولاها منظومةُ شمسِنا هذه.. ومنهم مَن يفهمُ منه انقسامَ الأثيرِ في التشكُّلِ إلى طبقاتٍ سبعةٍ كما مرَّ آنفاً.. ومنهم مَن يرَى جميعَ ما يُرَى مما زُيّنَ بمصابيحِ الشموسِ والنجومِ الثوابتِ سماءً واحدةً، هي السماءُ الدنيا

(١) الهيدروجين والأوكسجين.

کە نابینرێن. هەندێ تر ڕای وایە کە حەوت ئاسمانەکان لەم جیهانی بینراوەدا بەند نین، بەڵکو ئەو حەوت ئاسمانە لە چینەکانی بەدیهاتنی هەموو جیهانەکانی دنیا و قیامەت و غەیبدا تەسەوور دەکات..

جا هەریەك لەوانە بە ئەندازەی توانا و ئامادەیی خۆی، لە ڕێژنەی قورئان بەهرەمەند دەبێت و، بەشی خۆی لەسەر سفرەکەی ئەو هەڵدەگرێت. ئیتر قورئان هەموو ئەم چەمکانە دەگرێتەوە.

بزانە کە هۆنینی ڕستەی یەکەم، واتە: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً﴾ لە ڕشتەی ئایەتەکەی پێش خۆیدا لە پێنج ڕووەوەیە:

یەکەم: ئایەتی یەکەم (پێشوو) ئاماژە بۆ نیعمەتی "ژیان" و "بوون" دەکات. ئەمیش ئاماژە بۆ نیعمەتی "مانەوە" و "هۆکارەکانی" دەکات.

دووهەم: بریتییە لەوەی کە کاتێ ئایەتی پێشوو بڵندترینی پلەکانی بۆ مرۆڤ چەسپاند، کە گەڕانەوەیە بۆلای خوای گەورە، زەینی بیسەر بۆ ئەم پرسیارە بێدار بووەوە کە: "ئایا ئەم مرۆڤە زەلیلە ئامادەباشیی ئەوەی لە کوێ بوو هەتا بگاتە ئەم پلە باڵایە، ئەگەر بە چاکە و کێشکردنی خوای گەورە نەبێت؟". وەك بڵێی ئەم ڕستەیە لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێت:

مرۆڤ لای ئەو بەدیهێنەرەی خۆی کە هەموو دنیای بۆ گوێڕایەڵ کردووە، پلەیەکی گەورەی هەیە.

سێهەم: کاتێ لەوەی پێشوودا ئاماژەی بە "بوون"ی حەشر و قیامەتی مرۆڤ کرد، بیسەر ڕۆشت بۆ ئەم پرسیارە کە: گرنگیی مرۆڤ چییە هەتا لەبەر ئەو قیامەت بەرپا ببێت و، بۆ بەختەوەرکردنیشی جیهان وێران بکرێت؟ وەك بڵێی ئەم ڕستەیە وەڵامی بەوە دەداتەوە کە: "کەسێك هەموو شتێکی ناو ئەم زەوییە بۆ سوود پێ گەیاندنی ئەو ئامادە کرابێت و، "جۆر"ەکانی بۆ گوێڕایەڵ کرابێت، گرنگییەکی هێندە مەزنی هەیە کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات هەر ئەو ئەنجامی بەدیهێنان بێت".

چوارەم: ئایەتی پێشوو بە ﴿إِلَيْــهِ تُرْجَعُــونَ﴾ ئاماژەی بۆ لابردنی هۆکارەکان و، تایبەتکردنی گەڕانەوەش تەنها بۆلای خوای گەورە کرد. لە کاتێکدا کە مرۆڤ چەندین شوێنی زۆری گەڕانەوەی هەیە. جا ئەم ڕستەیەش دەڵێت:

وفوقَها ستُّ سماواتٍ أُخَرَ لا تُرى.. ومنهم مَن لا يرَى انحصارَ سبعِ سَمَاوَاتٍ في عالَمِ الشهادةِ فقط، بل يتصورُّها في طبقاتِ الخِلقةِ في العوالِمِ الدنيويةِ والأُخرويةِ والغيبيةِ..

فكلٌّ يستفيضُ بقَدْرِ استعدادِه مِن فَيضِ القرآنِ ويأخُذُ حصّتَه مِن مائدتِه. فيشتمِلُ على كلِّ هذه المفاهيمِ.

واعلم أنَّ الجملةَ الأُولى أعني: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً﴾ نظمُها بخمسةِ أوجهٍ:

**الأولُ**: أنَّ الآيةَ الأُولى إشارةٌ إلى نعمةِ الحياةِ والوجودِ، وهذه تُشيرُ إلى نعمةِ البقاءِ وأسبابِه.

**والثاني**: أنّه لَمّا أثبتَت الأُولى للبشرِ أعلى المراتبِ أعني الرجوعَ إليه تعالى، تنبَّهَ ذهنُ السامعِ للسؤالِ بـ"أينَ لهذا الإنسانِ الذليلِ استعدادٌ لهذه المرتبةِ العاليةِ إلّا أنْ يكونَ بفضلِه تعالى وجذبِه؟". فكأنَّ هذه الجملةَ تقولُ – مُجيبةً عن ذلك السؤالِ –: إنَّ للإنسانِ عندَ خالقِه الذي سخّرَ له جميعَ الدنيا لموقعاً عظيماً.

**والثالثُ**: أنه لما أشارت الأُولى إلى وجودِ الحشرِ والقيامةِ للبشرِ، ذهبَ السامعُ إلى سؤالِ: ما أهميّةُ البشرِ حتى تقومَ القيامةُ لأجلِه ويُخرَّبَ العالَمُ لسعادتِه؟ فكأنَّ هذه الجملةَ تُجيبُه بـ"أنَّ مَن هُيّئَ جميعُ ما في الأرضِ لاستفادتِه وسُخِّرَ له الأنواعُ، له أهميةٌ عظيمةٌ تشيرُ إلى أنّه هو النتيجةُ للخِلقةِ".

**والرابعُ**: أنَّ الأُولى أشارتْ بـ﴿إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ إلى رفعِ الوسائطِ وانحصارِ المرجعيةِ فيه تعالى، والحالُ أنَّ للبشرِ في الدنيا مراجعَ كثيرةً، فهذه الجملةُ تقولُ أيضاً:

لەم دیوی هۆکار و ناوەندەکانەوە دەستی "توانست" دەبینرێت و، گەڕانەوەی ڕاستەقینەش لە دنیادا هەر تەنها بۆ لای خوای گەورەیە و، هۆکارەکانیش لەبەر چەند حیکمەتێك بوونەتە ناوەندێك لەو ناوەدا، چونکە هەر تەنها خوای گەورە سەرجەمی ئەو شتانە بەدی دەهێنێت کە مرۆڤ پێویستی پێیانە.

پێنجەم: ئەوەی پێشوو لە کاتێکدا ئاماژەی بۆ "بەختەوەریی هەمیشەیی" کرد، ئەم ئایەتەش ئاماژەی بۆ چاکەیەکی پێشینە کرد کە ئەو بەختەوەرییە دەخوازێت. واتە: ئەو کەسەی کە هەموو شتەکانی ناو زەویی وەك "چاکە" پێ بەخشراوە، شایانی ئەوەیە کە "بەختەوەریی هەمیشەیی" پێ بدرێت.

هۆنینی ڕستەی ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ﴾یش لە چوار ڕووەوەیە:

یەکەم: ئەوەیە کە ئاسمان هاوڕێی زەوییە؛ هەرکەسێك تەسەووری زەوی بکات، یەکسەر ئاسمانیش بە زەینیدا دێت.

دووەم: هەر "ڕێکخستنی ئاسمان"ە کە ڕووی سوود وەرگرتنی مرۆڤ لە زەوی تەواو دەکات.

سێهەم: ڕستەی یەکەم ئاماژەی بە بەڵگەکانی "فەزڵ" و "چاکە"ی خوای گەورە کرد. ئەمەش ئاماژە بۆ بەڵگەکانی "مەزنی" و "توانست"ی دەکات.

چوارەم: ئەم ڕستەیە ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە سوود وەرگرتنی مرۆڤ تەنها بە شتەکانی سەر زەوییەوە بەند نییە، بەڵکو ئاسمانیش بۆ سوودی ئەو دەستەمۆ کراوە.

هۆنینی ڕستەی ﴿فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ﴾یش لە سێ ڕووەوەیە:

یەکەم: پەیوەستکردنی ئەم ڕستەیە بە ڕستەی یەکەم وەك پەیوەستیی ﴿فَيَكُـــونُ﴾ە لەگەڵ ﴿كُنْ﴾دا.

دووەم: وەك پەیوەست بوونی پەیوەندیی "توانست"ە بە پەیوەندیی "ویست"ەوە.

سێهەم: بە وێنەی پەیوەستکردنی "ئەنجام"ە بە "پێشەکی"یەوە.

هۆنینی ڕستەی ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾یش بە دوو ڕووە:

یەکەمیان: ئەوەیە کە ئەم ڕستەیە بەڵگەی "لیممی"یە لەسەر ڕێکخستنەکەی پێشوو، هەروەك ڕێکخستنەکەی پێشوو بەڵگەی "ئینی"یە لەسەر ئەم ڕستەیە. چونکە خشتی و ڕێکوپێکی بەڵگەن لەسەر بوونی "زانستی تەواو"، هەروەك "زانست"یش ڕێکوپێکی دەگەیەنێت.

إنَّ الأسبابَ والوسائطَ تشُفُّ عن يدِ القدرةِ، وإنَّ المرجعَ الحقيقيَّ في الدنيا إنما هو اللهُ تعالى وإنّما توسَّطت الأسبابُ لِحِكَمٍ، فإنّه تعالى هو الذي خلقَ للإنسان كُلَّ ما يحتاجُ إليه.

والخامسُ: أنَّ الأُولى لما أشارتْ إلى السعادةِ الأبديةِ، أشارتْ هذه إلى سابقةِ فضلٍ يستلزمُ تلك السعادةَ ذلك الفضلُ. أي مَن أُحسِنَ إليه جميعُ ما في الأرض لحقيقٌ بأنْ يُعطى له السعادةُ الأبديةُ.

وجملةُ ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ﴾ نظمُها بأربعةِ أوجهٍ:

الأولُ: أنَّ السماءَ رفيقةُ الأرضِ لا يَتصوّرُ الأرضَ أحدٌ إلّا ويخطُرُ في ذهنه السماءُ.

والثاني: أنَّ تنظيمَ السماءِ هو المكمِّلُ لوجهِ استفادةِ البشرِ مما في الأرضِ.

والثالثُ: أنَّ الجملةَ الأُولى أشارتْ إلى دلائل الإحسانِ والفضلِ، وهذه تُشيرُ إلى دلائل العظمةِ والقدرةِ.

والرابعُ: أنَّ هذه الجملةَ تُشيرُ إلى أنَّ فائدةَ البشرِ لا تنحَصِرُ على الأرضِ؛ بل السماءُ أيضاً مُسَخَّرَةٌ لاستفادتِه.

ونظمُ جملةِ ﴿فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمٰوَاتٍ﴾ بثلاثة أوجهٍ:

الأولُ: أنَّ ربطَها بالأُولى كربطِ ﴿فَيَكُون﴾ مع ﴿كُنْ﴾.

والثاني: أنّه كربْطِ تعلُّقِ القدرةِ بتعلُّقِ الإرادةِ.

والثالثُ: أنّه كربْطِ النتيجةِ بالمقدمةِ.

ونظمُ جملةِ: ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ بوجهين:

أحدُهما: أنّها دليلٌ لِمِّيٌّ على التنظيمِ السابقِ كما أنَّ التنظيمَ السابقَ دليلٌ إنِّيٌّ عليها؛ إذ الاتساقُ والانتظامُ يدلان على وجودِ العلمِ الكاملِ كما أنَّ العلمَ يفيدُ الانتظامَ.

ئەوی تریان: ڕستەی یەکەم بەڵگەیە لەسەر "توانستی تەواو"، ئەمیش لەسەر "زانستی گشتگیر".

سەبارەت بە هۆنینی شێوەی پێکهاتنی یەك بە یەکی ڕستەکانیش، ئەوا ڕستەی یەکەم ئەمانەی تێدایە:

دەستپێکی ڕستەی نوێ.. مەعریفەکردنی دوو بەشەکە.. مەعریفەکردنی خەبەرەکە.. لامی ﴿لَكُمْ﴾.. پێشخستنی ﴿لَكُمْ﴾.. وشەی ﴿فِي﴾.. وشەی ﴿جَمِيعاً﴾.

دەستپێکەکە ئاماژەیە بۆ پێنج پرسیاری تەقدیر کراو لەگەڵ وەڵامەکانیاندا. لە پێنج ڕووەکەی هۆنینی ڕستەی یەکەمدا بێداریم لە بارەیانەوە دا.

مەعریفەکردنی دوو بەشەکەش[1] ئاماژەیە بۆ "تەوحید" و، بۆ ئەو "تایبەتکردن"ەش کە بەڵگەی قەتیس کردنە لە ﴿إِلَيْهِ﴾ی ﴿إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾دا.

مەعریفەکردنی خەبەرەکەش، ئاماژەیە بۆ دەرکەوتنی حوکمەکە[2].

"لام"ی سوودیش لە ﴿لَكُمْ﴾دا ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە حوکمی بنەڕەتیی هەموو شتێك "موباح" بوونیەتی. بەڵام کاتێ کە "حەرام" بوونی دێتە ڕێ، ئەوا یان لەبەر پارێزراوییەتی، وەك سامانی خەڵك. یان لەبەر ڕێزیەتی، وەك گۆشتی مرۆڤ. یان لەبەر زیانیەتی، وەك ژەهر. یان لەبەر بێزلێکردنەوەیەتی، وەك بەڵغەمی کەسی تر. یان لەبەر پیسی‌یەتی، وەك مردارەوە بوو..

هەروەها هێمایەکە بۆ بوونی سوود لە هەموو شتێکدا و، بۆ ئەوەش کە مرۆڤ - لە هەر لایەکەوە بێت و بە هەر جۆرێك بووە - سوودێك بەدەست دەهێنێت، تەنانەت لە بێ‌نرخترین شتیش، لانی کەم ڕوانینی پەند وەرگرتن..

هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە گەلێ گەنجینەی میهرەبانی لەناو زەویدا هەڵگیراون، چاوەڕوانی ڕۆڵەکانی داهاتوو دەکەن.

پێش خستنی ﴿لَكُمْ﴾یش ئاماژەیە بۆ لایەنی سوودوەرگرتنی مرۆڤ، کە دێرینترین و باشترین و یەکەمینی ئامانجەکانە.

---

(١) "هو" موبتەدایە و، "الذي" لەگەڵ صیلەکەیدا خەبەرەکەیەتی. (ت)

(٢) لە بنەڕەتدا دەبێ "خەبەر" نەکرە بێت، بەڵام کە لێرەدا بە "مەعریفە" هاتووە ئاماژەیە بۆ دەرکەوتنی بڕیارەکە، ئەویش بریتی‌یە لەوەی:
خوای گەورە زەوی و شتانی ناوی بەدی هێناوە. ئەمەش ئاشکرا و زانراوە. (ت)

**والآخَرُ**: أنَّ الجملةَ الأُولى تدلُّ على القدرةِ الكاملةِ، وهذه على العِلمِ الشاملِ.

أما نظمُ هيئاتِ جُملةٍ جُملةٍ؛ ففي الجملةِ الأُولى:

الاستينافُ، وتعريفُ الجزئين، وتعريفُ الخَبَرِ، ولامُ ﴿لَكُمْ﴾، وتقديمُ ﴿لَكُمْ﴾، ولفظُ ﴿فِي﴾، ولفظُ ﴿جَمِيعاً﴾..

أما الاستينافُ فإشارةٌ إلى أسئلةٍ مُقدّرةٍ وأجوبةٍ قد نبّهتُ عليها في الأوجُهِ الخمسةِ لنظمِ الجملةِ الأُولى..

وأما تعريفُ الجزئين[1] فإشارةٌ إلى التوحيدِ والحصرِ الذي هو دليلٌ على الحصرِ في تقديمِ ﴿إِلَيْهِ﴾ في ﴿إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾.

وأما تعريفُ الخبرِ فإشارةٌ إلى ظهورِ الحُكمِ[2].

وأما لامُ النفعِ في ﴿لَكُمْ﴾ فإشارةٌ إلى أنَّ الأصلَ في الأشياءِ الإباحةُ، وإنما تَعرِضُ الحُرمةُ للعصمةِ؛ كمالِ الغَيرِ. أو للحُرمةِ؛ كلَحْمِ الآدميِّ. أو للضَّررِ؛ كالسَّم. أو للاستقذار؛ كبَلْغمِ الغيرِ. أو للنجاسةِ؛ كالمَيْتَةِ..

وكذا رمزٌ إلى وجودِ النفعِ في كلِّ شيءٍ، وأنَّ للبشرِ - ولو بجهةٍ من الجهاتِ - استفادةً ولو بنوعٍ من الأنواعِ ولو في أحقرِ الأشياءِ ولا أقلَّ من نظرِ العِبرةِ، وكذا إيماءٌ إلى أنّه كَم مِن خزائنَ للرحمةِ مكنوزةٍ في جوْفِ الأرضِ تنتظرُ أبناءَ المستقبلِ.

وأما تقديمُ ﴿لَكُمْ﴾ فإشارةٌ إلى أنَّ جهةَ استفادةِ البشرِ أقدمُ الغاياتِ وأَوْلاها وأَوَّلُها.

---

(١) "هو": مبتدأ، و"الذي" مع صلته: خبر. (ت)

(٢) حيث إن الأصل في الخبر أن يكون نكرة، إلّا أنّ مجيئه معرفةً إشارةٌ إلى ظهور الحكم، وهو: أن الله خالق الأرض بما فيها. وهو أمر معلوم ظاهر. (ت)

﴿مَا﴾یش کە گشتی بوون دەگەیەنێت، بە مەبەستی هاندانە بۆ گەڕان بە دوای سوود لە هەموو شتێکدا.

هێنانی ﴿فِي الْأَرْضِ﴾ لە بری - بۆ نموونە - "علـــی الأرض" ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە گەورەترینی سوودەکان لەناو ناخی زەویدایە. هەروەها ئاماژەیە بۆ گەڕان بە دوای شتانی ناویدا.. بەرەبەرە و پلەپلە بوونی سوود وەرگرتنی مرۆڤیش لە کانزاکانی زەوی و ماددەکانی ناوی، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەگونجێ ماددە و توخمی ئەوتۆی تێدا بێت کە گوشاری ئەرکەکانی ژیان، لە خۆراك و جگە لەویش، لەسەر شانی ڕۆڵەکانی داهاتوو، سووك بکات.

﴿جَمِيعًا﴾یش بۆ وەدەرنانی وەهمەکانە سەبارەت بە بێ ئامانجی لە هەندێ شتدا.

﴿ثُمَّ﴾ی ڕستەی دووهەم ئاماژەیە بۆ زنجیرەیەك کاروباری خوای گەورە، هەر لە دوای بەدیهێنانی زەوی تا دەگاتە ڕێکخستنی ئاسمان.. هەروەها هێمایە بۆ بوونی "ماوە" لە پلەی ڕێکخستنی ئاسمان لە سوودی مرۆڤدا، دوای بەدیهێنانی زەوی.. هەروەها ئاماژەیە بۆ دواکەوتنی بەدیهێنانی ئاسمان لەو.

﴿اسْـــتَوَى﴾ش کورتکردنەوەی تێدایە. واتە ویستی ڕێکی بکات. هەروەها "مەجاز"یشی تێدایە، واتە بە وێنەی کەسێك کە نیشانە لە مەبەستێك دەگرێت، بە ڕاست و چەپدا لانادات.

﴿إِلَى السَّمَاءِ﴾ واتە بەرەو ماددەکەی و لاکەی.

(فـاء)ی ﴿فَسَوَّاهُنَّ﴾ لە ڕووی لایەنی "لێق لێق کردنەوە"وە، بە وێنەی ڕیزبەندیی ﴿فَيَكُونُ﴾ە لەسەر ﴿كُنْ﴾ و، پەیوەندیی "توانست"ە لەسەر پەیوەندیی "ویست" و، هی "قەزا"یە لەسەر "قەدەر".. بەپێی لایەنی "تەعقیب"(بەدوای یەکدا هاتن)یش، ئەوا ئاماژەیە بۆ تەقدیر کردنی: "جۆراوجۆری کرد و، ڕێکی خست و، کارەکانی نێوانیانی بەڕێ کرد و، ئنجا ڕێکی کردن".. هتد..

﴿سَـــوَّى﴾ش، واتە بە ڕێکوپێکی و تەختی و یەکسانی بەدیی هێنان، لەوەدا کە هەریەکەیان ئەوەی پێ بەخشین کە بۆ ئامادەباشیی ئەو بگونجێت و، یەکسان بێت بە توانا و لێهاتوویی ئەو.

وأما ﴿مَا﴾ المفيدةُ للعمومِ فللحَثّ على تحرِّي النفعِ في كلّ شيءٍ..

وأما ﴿فِي الأَرْضِ﴾ بدلَ "على الأرضِ" مثلاً، فإشارةٌ إلى وجودِ أكثرِ المنافعِ في بطنِ الأرضِ، وكذا تشجيعٌ على تحرِّي ما في جوفها.. ويدلُّ تدرُّجُ البشرِ في الاستفادةِ مِن معادنِ الأرضِ وموادِّها على أنّه يمكنُ أنْ يكونَ في ضمنها موادُّ وعناصرُ تخفِّفُ عن كاهلِ أبناءِ الاستقبالِ ضغطَ تكاليفِ الحياةِ مِن الغذاءِ وغيرِه.

وأما ﴿جَمِيعاً﴾ فلردِّ الأوهامِ في عَبَثِيّةِ بعضِ الأشياءِ.

وأما ﴿ثُمَّ﴾ في الجملة الثانيةِ فإشارةٌ إلى سلسلةٍ من أفعالِه تعالى وشؤونِه بعدَ خلْقِ الأرضِ إلى تنظيمِ السماءِ.. وكذا رمزٌ إلى تراخي رتبةِ التنظيمِ في نفعِ البشرِ عن خِلقةِ الأرضِ.. وكذا إيماءٌ إلى تأخُّرِه عنها.

وأما ﴿اسْتَوَى﴾ ففيه إيجازٌ، أي أرادَ أنْ يسوِّيَ.. وكذا فيه مَجازٌ أي كمَن يسدِّدُ قصدَه إلى شيءٍ لا ينثني يَمنةً ويَسرةً.

و ﴿إِلَى السَّمَاءِ﴾ أي إلى مادّتِها وجهتِها.

وأما فاءُ ﴿فَسَوَّاهُنَّ﴾ فبالنظرِ إلى جهةِ التفريعِ، نظيرَ ترتُّبِ ﴿فَيَكُون﴾ على ﴿كُنْ﴾، وتعلُّقِ القدرةِ على تعلُّقِ الإرادةِ، والقضاءِ على القَدَرِ. وأما بالقياسِ إلى جهةِ التعقيبِ فإيماءٌ إلى تقديرِ: "ونوَّعَها ونظَّمَها ودبّرَ الأمرَ بينَها فسوّاهُن".. الخ.

وأما ﴿سَوَّى﴾ أي خلَقَها مُنتظَمَةً مستويةً متساويةً في أنْ أعطَى كُلّاً ما يناسِبُ استعدادَه ويُساوي قابليّتَه.

﴿هُنَّ﴾ش، ئاماژەیە بۆ جۆراجۆریی ماددەکانی ئاسمانەکان.

سەبارەت بە ﴿سَبْعَ﴾ش، ئەوا "زۆری" و، "پەیوەندی"ی لەگەڵ حەوت سیفەتەکە و لەگەڵ حەوت قۆناغەکەی پێکهاتنی زەوی، لە خۆ گرتووە.

﴿سَمٰوَاتٍ﴾یش، واتە ئەوانەی کە گوڵزاری مرواریەکان و، دەریای ماسیەکانی هەسارە گەڕۆکەکان و، کێڵگەی ناوکە تۆوی ئەستێرەکانن.

ڕستەی ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾یش:

"واو"ی عەتفەکە، کە پەیوەندی دەخوازێت (لە نێوان هەردوولای عەتفەکەدا) ئاماژەیە بۆ: ﴿وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (هود: ٤)، چونکە هەر ئەو بەدیهێنەری ئەم تەنە گەورانەیە.. ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ چونکە هەر ئەو ڕێکخەری کاروردی ئەو سنعەتەیە کە لەو ئاسمانانەدا هەیە.

"باء"ی "ئیلصاق"یش ئاماژەیە بۆ دانەبڕانی "زانست" لە "زانراو".

﴿كُلِّ﴾یش ئەو "گشتی"یەیە کە هەندێکی لێ تایبەت نەکراوە. ئەو بۆخۆی ئەو دەستوورە گشتیەی تایبەت کردووە کە دەڵێ: "هیچ شتێکی گشتی نییە کە هەندێکی لێ تایبەت نەکرابێت"! دەنا گەر وا نەبێت ئەوا ئەم دەستوورە گەر ڕاست دەرچێت خۆی بە درۆ دەخاتەوە، بە وێنەی "الجذر الأصم الكلامي"[1]!

وشەی ﴿شَيْءٍ﴾یش گشتییە بۆ "ویستەر" و "ویستراو".. هەرچییەکیش ئەم و ئەو نەبێت، وەکو نەگونجاو وایە.

﴿عَلِيمٌ﴾ واتە زاتێك کە سیفەتی "زانست" سەلماوە بۆی، کە سیفەتێکە لازمی ئەو زاتەیە.

* * *

(١) بۆ واتاکەی بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە (١٩٤، ١٩٥). (وەرگێڕ)

وأما ﴿هُنَّ﴾ فإيماءٌ إلى تنوُّعِ موادِّ السماواتِ.

وأما ﴿سَبْعَ﴾ فيتضمّنُ الكثرةَ والمناسبةَ مع الصفاتِ السبعِ ومعَ الأدوارِ السبعةِ في تشكُّلاتِ الأرضِ.

و﴿سَموَاتٍ﴾ أي اللاتي هُنَّ رياضٌ لأزاهيرِ الدراري وبحارٌ لسِماكِ السّياراتِ ومزرعَةٌ لحبّاتِ النجومِ.

أما جملةُ ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾..

فواوُ العطفِ المقتضيةِ للمناسبةِ إشارةٌ إلى: ﴿وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (هود: ٤) فهو الخالقُ لهذه الأجرامِ العظيمةِ..

﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ فهو النَظّامُ المتقِنُ للصَّنعةِ فيها.

وباءُ الإلصاقِ إشارةٌ إلى عدَمِ انفكاكِ العِلمِ عن المعلومِ.

وأما ﴿كُلِّ﴾ فهو العامُّ الذي لم يُخَصَّ منه البعضُ. وقد خَصَّ قاعدةَ: "وما مِن عامٍّ إلّا وقد خُصَّ منه البعضُ"[1] وإلّا لكانتْ هذه القاعدةُ بحيث إذا صَدَقتْ كذّبتْ نفسَها نظيرَ "الجَذْرِ الأصَمِّ الكلاميِّ".

ولفظُ ﴿شَيْءٍ﴾ يعمُّ الشائيَ والمشيءَ وما ليس بهذا ولا بذاك كالممتنعِ.

و﴿عَلِيمٌ﴾ أي ذاتٌ ثبتَ له – لازماً منه – العلمُ.

* * *

---

(١) لتوضيح القاعدة أكثر انظر: التقرير والتحبير ١/ ٤٣٦ ابن أمير حاج.

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (البقرة: ٣٠)

## پێشەکی

بزانە کە باوەڕ بە بوونی مەلائیکەت، یەکێکە لە پایەکانی ئیمان.

ئێمە لێرەدا چەند مەقامێکمان هەیە[1]:

**مەقامی یەکەم:**

هەر کەسێ سەیری "زەوی" بکات کە لەگەڵ نزمییدا (لەچاو ئاسمانەکان) پڕ بووە لە "گیاندار"ەکان و، گەر سەرنج لە ڕێکوپێکیی و وردەکاریی جیهان بدات، بە "حەدس" پەی بە بوونی دانیشتووان دەبات بۆ ئەم بورجە بڵندانە.

نموونەی ئەو کەسەی کە بوونی "مەلائیکەت" ناسەلمێنێت، وەکو هی پیاوێکە ڕۆشت بۆ شارێکی گەورە و، لە ڕێگادا ڕێی لە خانوویەکی کۆنی پڕ لە خەڵك کەوت کە بە شتی پیس و چەپەڵ سوواخ درابوو. حەوشەکەشی پڕ بوو لە گیانەوەرانی چەشنی ڕووەك و ماسی کە هەلومەرجی تایبەتی لەوێ بۆ ژیانیان هەبوو. پاشان هەزاران کۆشك و تەلاری نوێی لەولاوە بینی کە چەندین گۆڕەپان لە نێوانیاندا هەبوون بۆ گەشت و گەڕان. ئیتر ئەو کەسە لەو باوەڕەدا بوو کە ئەو کۆشکانە لەبەر ئەوەی هەلومەرجەکانی ژیانی ئەم خانووەیان تێدا نییە، چۆڵن و دانیشتووانیان تێدا نییە..

(١) وتەی بیست و نۆهەم درێژەپێدانێکی تێر و تەسەلی ئەم باسەی تێدایە .

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (البقرة: ٣٠)

## مقدمة

اعلمْ أنَّ التصديقَ بوجودِ الملائكةِ أحدُ أركانِ الإيمانِ. ولنا هنا مقاماتٌ[١].

**المقامُ الأوّلُ**

إنَّ مَن نظرَ إلى الأرضِ وقد امتلأتْ بِذَوي الأرواحِ مع حقارتِها، وتأمَّلَ في انتظامِ العالَمِ وإتقانِه، تحدَّسَ بوجودِ سكانٍ في هذه البروجِ العاليةِ..

فَمَثَلُ مَنْ لم يُصَدِّقْ بوجودِ الملائكةِ كَمَثَلِ رجُلٍ ذهبَ إلى بلدةٍ عظيمةٍ وصادفَ داراً صغيرةً عتيقةً مُلوَّثةً بالمزخرفاتِ مشحونةً بالناسِ، ورأى عرصاتِها مملوءةً مِن ذوي الأرواحِ ولحياتِهم شرائطُ مخصوصةٌ كالنباتاتِ والسَّماكِ. ثم رأى أُلوفاً مِن القصورِ العاليةِ الجديدةِ قد تخلَّلَتْ بينها ميادينُ النـُّزهةِ، فيعتقدُ خُلوَّها عن السكانِ لعدمِ جَرَيانِ شرائطِ حياةِ هذه الدارِ في تلك القصورِ.

---

(١) الكلمة التاسعة والعشرون فيها تفصيل واف لهذا البحث.

نموونەی ئەو کەسەش کە باوەڕی بە بوونی "مەلائیکەت" هەیە، وەکو هی ئەو کەسەیە کە کاتێ ئەم خانووە بچووکە دەبینێت پڕ بووە لە گیانەوەران و، لەولاشەوە ڕێکوپێکیی شارەکە دەبینێت، بە دڵنیاییەوە دەزانێت کە ئەو کۆشکە ڕازاوانەش دانیشتووانی تایبەت بە خۆیان هەیە کە بۆیان دەشێن و، هەلومەرجی تایبەت بە ژیانی خۆیان لەوێ هەیە. کەواتە نەبینینیان – لەبەر دووری یاخود بەرزییان – نایێتە بەڵگە لەسەر "نەبوون"یان.

کەواتە بە "طريق الأولى" و "قیاسی ئەولەوی"ش[1] کە لەسەر "قیاسی پەنهان"[2] دامەزراوە و، ئەویش لەسەر ڕێکوپێکیی بەردەوام و هەمە لایەنە بنیات نراوە، ئەو ئەنجامە بەدەست دێت کە ئەم بۆشاییە فراوانە – بە بورجەکان و ئەستێرەکان و ئاسمانەکانیەوە – پڕ بن لە "خاوەن گیانەکان" ئەوانەی کە شەرع پێیان دەڵێت: "مەلائیکەت" و، چەندین ڕەگەزی جۆراوجۆرن لە نێوان خۆیاندا.

دەسا بیری لێ بکەرەوە!

مەقامی دووهەم:

بزانە کە:

"ژیان" – وەك پێشتر وترا – دەرخەری بوونەوەرانە، تەنانەت دەرەنجامیشیانە. کەواتە چۆن ئەم بۆشاییە فراوانە لە دانیشتووان و ئەم ئاسمانانەش لە ئاوەدانکار چۆڵ دەبن؟

ژیران بە جۆرێکی مەعنەوی "کۆدەنگ"ن – هەرچەندەش ڕێگاکانی دەربڕینیان جیاوازە – لەسەر بوونی "واتا" و "حەقیقەت"ی مەلائیکەت.

---

(١) بۆ واتای هەردووکیان بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە: (١٣٨). (وەرگێڕ)

(٢)"قیاس" زاراوەیەکی زانستی ئوسوولی فیقهە. لەم زانستەدا دوو جۆر پێوانە (قیاس) هەیە، یەکەمیان: "جەلی" واتە ئاشکرا.. دووهەمیان: "خەفی" واتە پەنهان. "قیاسی پەنهان" پێیشی دەوترێت (ئیستیحسان): وازهێنانە لە "قیاسی جەلی" بۆ قیاسێکی تر، یان هەڵاوێرانی بابەتێکی جوزئییە لە بنەڕەتێکی کوللی، لەبەر بەڵگەیەك کە موجتەهید دڵنیایە لێی. واتە: ئەگەر مەسئەلەیەکی فیقهی بۆ موجتەهیدێك هاتە پێش کە بە "قیاسی جەلی" بڕیارێکی تایبەتیی دەخواست و، بە "قیاسی خەفی"ش بڕیارێکی جیاواز لەو، ئنجا بەڵگەیەك لای موجتەهیدەکە دروست بوو کە بڕیار بە "خەفی"یەکە بدات، پێی دەڵێن: "قیاسی پەنهان" یان "ئیستیحسان". بڕوانە: (الوجيز في أصول الفقه، ص: ٢٣٠-٢٣١). (وەرگێڕ)

ومَثَلُ المعتقِد بوجودِهم كَمَثَلِ مَنْ إذا رأى هذا البيتَ الصغيرَ وقد امتلأ مِن ذوي الأرواحِ، ورأى انتظامَ البلدةِ، جزمَ بأنَّ لتلك القصورِ المزيَّنةِ أيضاً سكاناً يناسبونَها وتوافِقُهم، ولهم شرائطُ حياةٍ مخصوصةٍ. فعدمُ مشاهدتِهم - لبُعدِهم وترفُّعِهم - لا يدلُّ على عدمِهم..

فامتلاءُ الأرضِ مِن ذوي الحياةِ يُنتجُ بالطريقِ الأَوْلَى وبالقياسِ الأولَويِّ المؤسَّسِ على القياسِ الخفيِّ المبنيِّ على الانتظامِ المطَّرِدِ، امتلاءَ هذه الفضاءَ الوسيعةَ ببروجِها ونجومِها وسماواتِها مِن ذوي الأرواحِ الذين يدعوهم الشرعُ بالملائكةِ، المنطويةِ على أجناسٍ مختلفةٍ. فتأمَّلْ!

المقامُ الثاني

اعلمْ - كما مرَّ - أنَّ الحياةَ هي الكشّافةُ للموجوداتِ بل هي النتيجةُ لها، فإذن كيف تخلو هذه الفضاءُ الوسيعةُ من ساكنيها وتلك السماواتُ من عامريها؟ ولقد أجمعَ العقلاءُ إجماعاً معنوياً - وإنْ اختلفوا في طُرُقِ التعبير - على وجودِ معنى الملائكةِ وحقيقتِهم..

تەنانــەت فەیلەسـووفە "مەشـائی"یــەکان[١] بـە "ماهییەتـە پـەتی و ڕۆحانییــەکانی جۆرەکان" گوزارشتیان لـێ کردوون. "ئیشراقییەکان"یش[٢] بە ناوی "ژیری"یـەکان و "خاوەنانی جۆرەکـان" لێیـان دواون. خـاوەن ئایینەکانیش بە "مەلائیکەتی چیاکـان" و "مەلائیکـەتی دەریاکـان" و "مەلائیکـەتی بـاران" - بۆ نموونـە - باسیان لـێ کـردوون. تەنانـەت ئـەو "مـاددی"یانـەش کـە ژیرییـان لـە چاویاندایـە نکوڵییـان لـە "واتـا"ی مەلائیکـەت بـۆ نەڕەخسـاوە، بـەڵکو لـە نـاو "هـێزە سـارییەکان"ی نـاو یاسـاکانی بەدیهاتووواندا بۆیان ڕوانیون.

* ئەگەر وتت:

ئایا ئەم یاسایانەی کە لە نـاو بەدیـهاتووواندا دەست بـەکارن، بـەس نـین بـۆ پەیوەستی نێوان بوونەوەران و گەرموگوڕیی کاری نێوانیان؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

ئـەو یاسـایانەی کـە لـە بوونـەوەراندا دەسـت بـەکارن، جگـە لـە چـەند شـتێکی "گوێڕەیـی"، تەنانـەت "وەهمـی" هیچـی تـر نـین و، گــەر بــەهۆی نوێنــەرەکانیان و دەرخـەرەکانیان و ئەوانەوە نـەبێت کـە سـەرە دەزووی ئـەو یاسـایانەیان لەدەسـتدایە، هـەرگیز "بـوون"ێکی دیـاری کـراو، یـان کەسـایەتییەکی سـەربەخۆیان نـابێت. خـۆ ئەوانەش هەر تەنها "مەلائیکەت"ن.

هەروەها "دانایـان" و "ژیـری" و "بەڵگـەی نـەقڵی" قسـەیان یەکـە لەسـەر ئەوەی کـە "بـوون" تەنـها لـەم جیهانـە بینـراوە بـێ گیـان و نـەگونجاوەدا بـۆ پێکـهاتنی "گیانـەکان"، قـەتیس نییـە. چونکـە ئـەو جیهـانی "غـەیب"(پەنـهان)ەی کـە چـەندین جیــهانی لــەخۆ گرتـووە و، بـە وێنـەی گونجـاویی ئـاو بـۆ ماسـی ئـەویش بـۆ گیانـەکان گونجـاوە، پڕە لــە مەلائیکەت و، جێی تێدا دەرکەوتنی ژیانی ئەم جیهانە بینراوەیە..

جا ئەگەر ئەم چوار شتە شایەتیت لە سەر بوونی ڕاستیی "مەلائیکەت" بۆ بدەن، ئەوا جوانترین شێوەی بوونی ئەوان کە ژیرییە ساغەکان پێی ڕازی بێت، تەنها ئەوەیە کە شەرع ڕاڤەی کردووە بـۆ "مەلائیکـەت" کـە بریتـین لـە چـەند بەندەیـەکی بـەڕێزی ئـەوتۆ

---

(١) ڕێبازێکی فەلسەفییە، لەسەر بناغەی فەلسەفەی ئەرستۆ (٣٨٤-٣٢٢پ.ز) دامەزراوە.

(٢) ڕێبازێکی "تەسەووفی - فەلسەفی"یە. شوێنکەوتووانی ئەو ڕێبازە لەو باوەڕەدان کە ناسینی خوای گەورە بە وەرزشی ڕۆحی و پاکژکردنەوەی دەروون دەخرێتە ناخی مرۆڤەوە. (وەرگێڕ)

حتى إن المشّائيين عَبَّروا عنهم بالماهياتِ المجرَّدةِ الروحانيةِ للأنواعِ، والإشراقيين عبّروا عنها بالعقولِ وأربابِ الأنواعِ، وأهلَ الأديانِ بمَلَك الجبالِ ومَلَكِ البحارِ ومَلَكِ الأمطارِ، مثلاً. حتى إنَّ الماديين الذين عقولُهم في عيونِهم لم يتيسَّرْ لهم إنكارُ معنى الملائكةِ، بل نظروا إليهم في القواتِ الساريةِ في نواميسِ الفطرةِ.

* إنْ قُلتَ:

أفلا يكفي لارتباطِ الكائناتِ وحيويّتِها هذه النواميسُ وتلك القوانينُ الجاريةُ في الخلقةِ؟

قيل لك:

ما تلك النواميسُ الجاريةُ والقوانينُ الساريةُ إلا أمورٌ اعتباريةٌ بل وهميةٌ لا يتعيَّنُ لها وجودٌ ولا يتشخَّصُ لها هُوِيّةٌ إلا بممثِّلاتِها ومَعاكسِها، ومَنْ هو آخذٌ برأسِ خيوطِها وإنْ هي إلّا الملائكةُ..

وأيضاً قد اتفقَ الحكماءُ والعقلُ والنقلُ على عدمِ انحصارِ الوجودِ في عالَمِ الشهادةِ الظاهرِ الجامدِ الغيرِ الموافقِ لتشكُّلِ الأرواحِ. فعالَمُ الغيبِ المشتملِ على عوالِمَ - الموافقُ للأرواحِ كالماءِ للسماكِ - مشحونٌ بها[1]، مَظهَرٌ لحياةِ عالَمِ الشهادةِ..

فإذا شهدتْ لك هذه الأمورُ الأربعةُ على وجودِ معنى الملائكةِ فأحسَنُ صوَرِ وجودِهم

(١) أي بالملائكة.

سەرپێچی لە فەرمان ناکەن، هەروەها چەند جەستەیەکی نیان و نوورانین کە لە نێوان خۆیاندا چەند بەشێکی جیاجیان.

**مەقامی سێهەم:**

بزانە کە: مەسەلەی "مەلائیکەت" یەکێکە لەو مەسەلانەی کە "کولل"ی ئەو شتە بە سەلماندنی بوونی یەك "جوزء"ی دەسەلمێت و، بە بینینی یەك کەسیان بوونی "جۆر"ەکەیان دەزانرێت، چونکە کەسێ نکوولی (لە یەکێکیان) بکات لە هەمووی دەکات.

پاشان هەروەك تۆ - خوا بێدارت بکاتەوە - بەلاتەوە مەحالە کە شوێنکەوتەی هەموو ئایینەکان لە هەموو سەردەمەکاندا، هەر لە ئادەمەوە هەتا ئێستا، کۆدەنگ بن لەسەر "بوون"ی مەلائیکەت و، سەلماندنی گفتوگۆ لەگەلیان و، سەلماندنی بینینیان و، گێرانەوە لێیانەوە بە وێنەی گفتوگۆ گێرانەوەی دەستە بە دەستەی خەڵك لە یەکترەوە، بە بێ ئەوەی کە دانەیەك یاخود چەند دانەیەکیان لێ بینرابێت.. یان بە بێ ئەوەی کە بوونی کەسێك یان چەند کەسێکیان بەڵگەنەویست بێت.. یان بێ ئەوەی هەست بە پێویستی و بێگومانیی بوونیان بکرێت..

(هەروەك ئەوەت بەلاوە مەحالە)..

بە هەمان جۆر ئەوەش مەحالە کە شتێکی ئاوا هەبێت کە "وەهم" بێت و، لە ناو بیروباوەڕەکانی مرۆڤدا جێی خۆی کردبێتەوە و، هەر بەو جۆرەش لە هەموو ئالوگۆڕەکاندا بە بەردەوامی بمێنێتەوە، بە بێ بوونی تۆوی "ڕاستی"یەك کە ئەو گولەی گرتبێت و، بە بێ هیچ بنەمایەکی بێ گومان کە ئەو باوەڕە گشتییە بەرهەم بهێنێت.

کەواتە پاڵپشتی ئەم کۆدەنگییە شتێك نییە جگە لە "حەدس"ێکی ئەوتۆ کە لە چەندین نیشانەی جیاجیاوە پەیدا بووە، کە هی چەندەها ڕووداوی بینراوە و، ئەویش لە گەلێ بنەمای بێگومانەوە سەری هەڵداوە. هەروەها هۆی ئەم باوەڕە گشتییە جگە لە چەند بنەمایەکی بێگومان شتێکی تر نییە، کە ئەویش لە بینینی چەندین جارەیانەوە دروست بووە، کە ئەویش لە هێزی "تەواتوری مەعنەوی"دایە. دەنا گەر وا نەبێت، ئەوا متمانە و دڵنیایی لەسەر زانیارییەکانی مرۆڤ هەڵدەگیرێن.

التي ترضَى بها العقولُ السليمةُ ما هو إلّا ما شَرَحَه الشرعُ مِن أنّهم عِبادٌ مُكرَمون لا يخالِفون ما يُؤمَرون، وكذا أنّهم أجسامٌ لطيفةٌ نورانيةٌ ينقسمون إلى أنواعٍ مختلفةٍ.

**المقامُ الثالثُ**

اعلمْ أنَّ مسألةَ الملائكةِ من المسائلِ التي يتحقَّقُ الكلُّ بثبوتِ جزءٍ واحدٍ، ويُعلَمُ النوعُ برؤيةِ أحدِ الأشخاصِ، إذ مَن أنكرَ أنكرَ الكلَّ.

ثم كما أنّه محالٌ عندك - أيقظكَ اللهُ - أن يُجمِعَ أهلُ كلِّ الأديانِ في كلِّ الأعصارِ من آدمَ إلى الآنِ على وجودِ الملائكةِ وثبوتِ المحاورةِ معَهم وثبوتِ مشاهدتِهم والرِّوايةِ عنهم كمُباحثةِ الناسِ طائفةٍ عن طائفةٍ، بدون رؤيةِ فردٍ بل أفرادٍ منهم وبدونِ ضرورةِ وجودِ شخصٍ بل أشخاصٍ منهم، وبدونِ الإحساسِ بالضرورةِ بوجودِهم..

كذلك محالٌ أنْ يقومَ وَهْمٌ كذلك في عقائدِ البشرِ ويستمرَّ هكذا ويبقَى في الانقلاباتِ بدون حقيقةٍ يَتَسَنْبَلُ عليها وبدون مبادئَ ضروريةٍ مولِّدَةٍ لذلك الاعتقادِ العموميِّ.

فإذن ليس سندَ هذا الإجماعِ إلّا حدسٌ تولَّدَ مِن تفاريقِ أماراتٍ حصلتْ مِن واقعاتِ مشاهداتٍ نشأتْ من مبادئَ ضروريةٍ. وليس سببَ هذا الاعتقادِ العموميِّ إلا مبادئُ ضروريةٌ تولدتْ مِن رؤيتِهم ومشاهدتِهم في كَرّاتٍ تُفيدُ قوّةَ التواتُرِ المعنويِّ. وإلّا رُفِعَ الأمنُ مِن يقينياتِ معلوماتِ البشرِ.

جا ئەگەر بە بێ گومانی بوونی "یەك دانە" لە ڕۆحانییەکان لە سەردەمێکدا سەلما، ئەوا بوونی "جۆر"ەکەی ئەو ڕۆحانییەش دەچەسپێت. خۆ کاتێ بوونی ئەو "جۆر"ە سەلما، ئەوا بەو شێوەیە دەبێت کە شەرع باسی کردووە و قورئان ڕوونی کردووەتەوە.

پاشان هۆنینی دەرەنجامی ئەم ئایەتە لە ڕشتەی ئەوەی پێش خۆیدا لە چوار ڕووەوەیە:

یەکەم: لەبەر ئەوەی ئەم ئایەتە لەبارەی ژماردنی نیعمەتە گەورەکانەوەیە و، ئایەتی پێش ئەمەش ئاماژەی بۆ هەرە گەورەکەیان کرد - کە لەوەدایە مرۆڤ ئەنجامی بەدیهێنانە و، هەرچی لە زەویدایە بۆ ئەو گوێڕایەڵ و دەستەمۆ کراوە و، بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێت هەڵسوکەوتی تێدا دەکات - ئەم ئایەتەش ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە "مرۆڤ" جێنشینی زەوی و فەرمانڕەوایەتی.

دووهەم: ئەم ئایەتە: دەرخستن و، درێژەپێدان و، ڕوونکردنەوە و، لێکۆڵینەوە و، بەڵگە و، جەختە بۆ ئەوەی کە لە ئایەتی پێشوودا هەیە، کە جڵەوی زنجیرەکانی هەرچی لەناو زەویدا هەیە لە دەستی مرۆڤدایە.

سێیەم: لە کاتێکدا ئەوەی پێشوو باسی بنیاتنانی هەردوو نیشتەجێی زەوی و ئاسمانەکانی کرد، ئەمیان ئاماژەی دا بە دانیشتوانیان لە مرۆڤ و مەلائیکەت.. لەو هێمای بۆ زنجیرەی بەدیهاتن کرد، ئەم ئاماژەی بە زنجیرەی گیانلەبەران دا.

چوارەم: ئەوەی پێشوو کاتێ بە ڕاشکاوی ڕایگەیاند کە مەبەست لە بەدیهێناندا (واتە هی بەدیهێنراوان) مرۆڤە و، لای بەدیهێنەریشی پلەیەکی گەورەی هەیە، ئەوە بە زەینی بیسەردا هات کە: چۆن مرۆڤ لەگەڵ زۆریی شەڕ و خراپەیدا ئەم نرخ و بەهایەی دەبێت؟ ئایا "دانست" داخوازی بوونی مرۆڤە بۆ پەرستن و پاك ڕاگرتنی خوای گەورە؟

ئەم ئایەتەش ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە چاوپۆشی لەو شەڕ و خراپکارییانەی مرۆڤ دەکرێت لە پاڵ ئەو نهێنییانەی کە لەودا دانراون و، خوای گەورەش بێ نیازە لەوەی کە مرۆڤ بیپەرستێ، چونکە هێندە مەلائیکەتی هەن کە تەسبیحاتی دەکەن و پاك ڕایدەگرن کە لە ژمارە نایەن. بەڵکو (بەدیهێنانی مرۆڤ) لەبەر حیکمەتێکە لە زانستی خوای زانای پەنهانەکاندا.

سەبارەت بە هۆنینی ڕستەکانیش لەگەڵ یەکتردا، ئەوا:

فإذا تحقَّقَ وجودُ واحدٍ من الروحانيةِ في زمانٍ مّا، تحقّقَ وجودُ هذا النوعِ. وإذا تحقّقَ هذا النوعُ، كان كما ذكرَه الشرعُ وبيّنَه القرآنُ.

ثم إنَّ نظْمَ مآلِ هذه الآيةِ بسابقِها مِن أربعةِ وجوهٍ:

**الأوّلُ**: أنّه لما كانتْ هـذه الآياتُ في تعـدادِ النِّعَمِ العظامِ، وأشـارت الأولى إلى أعظمِهـا - مِن كَوْنِ البشرِ نتيجةً للخِلقةِ وكَوْنِ جميعِ ما في الأرضِ مُسَـخَّراً له يتصرّفُ فيها على ما يشاءُ - أشارتْ هذه إلى أنَّ البشرَ خليفةُ الأرضِ وحاكمُها.

**والثاني**: أنَّ هذه الآيَةَ بيانٌ وتفصيلٌ وإيضاحٌ وتحقيقٌ وبرهانٌ وتأكيدٌ لما في الآيةِ الأولى مِن أنَّ أَزِمّةَ سلاسلِ ما في الأرضِ في يدِ البشرِ.

**والثالثُ**: أنَّ تلك لما بيّنتْ بناءَ المسكنَين مِن الأرضِ والسماءِ، أشارتْ هذه إلى ساكنيهما من البشرِ والمَلَكِ، وأنّها رمزتْ إلى سلسلةِ الخلقةِ، وأومأتْ هذه إلى سلسلةِ ذوي الأرواحِ.

**والرابعُ**: أنّها لما صرّحَتْ بأنَّ البشرَ هو المقصودُ مِن الخِلقةِ وأنَّ له عند خالقِه لموقعاً عظيماً، اختلجَ في ذهنِ السامعِ أنّه كيف يكونُ للبشرِ هذه القيمةُ مع كثرةِ شرورِه وفسادِه؟ وهل تستلزِمُ الحكمةُ وجودَه للعبادةِ والتقديسِ له تعالى؟

فأشارتْ هذه إلى أنَّ تلك الشرورَ والمفاسدَ تُغتَفَرُ في جنْبِ السرِّ المُودَعِ فيه، وأنَّ اللهَ غنيٌّ عن عبادتِه، إذ له تعالى من الملائكةِ المسبِّحين والمقدِّسين ما لا يُحصَرُ، بل لحكمةٍ في علمِ علّامِ الغيوبِ.

وأما نظْمُ الجُمَلِ بعضِها مع بعضٍ فهو:

ئەم ئایەتە - بەپێی داخوازی ﴿إِذْ﴾ بۆ هاوتایەك و، عەتف کردنیشی بۆ سەر ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ - پێویستی بەم تەقدیرە هەیە:

"کاتێ کە خوای گەورە ئەوانەی بەو شێوەیە بە ڕێکوپێکی و وردەکاری بەدی هێنا و.. کاتێ مەلائیکەت وتیان بە پەروەردگارت.. هتد".

هەروەها کاتێ خوای گەورە گفتوگۆی لەگەڵ مەلائیکەتدا کرد - بۆ ئەوەی پرسیار لە بارەی نهێنیی حیکمەت بکەن و، فێری ڕێی ڕاوێژیان بکات و، فەرمووی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ - زەینی بیسەر بەپێی نهێنیی گفتوگۆ، بەرەو ئەو پرسیارە ئاراستە بوو کە: "چییان وت؟".. هەروەها بەپێی نهێنیی پرسیار لە حیکمەتی بەدیهێنانەکە، لەگەڵ سەرسووڕمانیاندا، بەرەو ئەم پرسیارە ئاراستە بوو کە: ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا﴾؟.. هەروەها بەپێی نهێنیی جێنشین کردنیان لە جێی جیننە خراپکارەکاندا، هاوکات لەگەڵ دانانی هێزی "تووڕەیی" و "ئارەزوو"ش لەواندا، سەبارەت بە سنووربەزاندنی هێزی دووهەم بەرەو ﴿مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا﴾ و، سەبارەت بە سنوور بەزاندنی هێزی یەکەمیش بەرەو ﴿وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ﴾، ئاراستە بوو..

ئنجا دوای تەواوبوونی پرسیار و سەرسووڕمانەکان، زەینی بیسەر چاوەڕێی وەڵامی خوای گەرە بوو. ئەویش فەرمووی:

﴿قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾. واتە: شتەکان لەناو زانیارییەکانی ئێوەدا قەتیس نین، کەواتە نەبوونی زانیاریی ئێوە لەسەر شتێك، بەڵگەی نەبوونی ئەو شتە نییە و، منیش دانام؛ حیکمەتێکم لەواندا هەیە کە خراپکاری و خوێنڕێژییەکەیان لە پاڵ ئەو حیکمەتەدا چاوپۆشیی لێ دەکرێت.

سەبارەت بە هۆنینی شێوەی پێکهاتنی یەك بە یەکی ڕستەکانیش، ئەوا بزانە کە:

"واو"ی ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً﴾، هەروەها هی ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ إِنِّي خَالِقٌ بَشَراً مِنْ صَلْصَالٍ﴾ی ئایەتێکی تر (الحجر: ٢٨) - بەپێی پەیوەندیی عەتف لەو واوەدا - ئاماژەن بۆ: "کاتێ و.. کاتێ"، وەك باسی ڕابورد[١]..

---

(١) واتە: ئەوەی کە لە سەرەوە وترا: "کاتێ کە خوای گەورە ئەوانەی بەو شێوەیە بە ڕێکوپێکی و وردەکاری بەدی هێنا و.. کاتێ مەلائیکەت وتیان بە پەروەردگارت.. هتد".. (وەرگێڕ)

أنَّ الآيةَ تنصَبُّ - بناءً على اقتضاءِ ﴿إِذْ﴾ رديفاً لها، وعطفِه على ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ - إلى تقديرٍ[1]:

"إذ خلقَ ما خلقَ مُنتظَماً مُتقَناً هكذا ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ...﴾ الخ"..

وأنّه تعالى لمّا خاطبَ مع الملائكةِ - ليستفسروا سرَّ الحكمةِ ولتعليمِ طريقِ المشاورةِ قائلاً: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ - توجَّهَ ذهنُ السامعِ بسرِّ المقاولةِ إلى "ما قالوا؟"، وبسرِّ الاستفسارِ عن حكمتِه مع التعجُّبِ إلى: ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا﴾، وبسرِّ استخلافِهم عن الجنِّ المفسِدين مع توديعِ القوّةِ الغَضَبيةِ والشَّهَويةِ فيهم أيضاً إلى ﴿مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا﴾ بتجاوزِ القوّةِ الثانيةِ ﴿وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ﴾ بتجاوزِ القوّةِ الأُولى..

ثم بعد تمامِ السؤالِ والاستفسارِ والتعجبِ ينتظرُ ذهنُ السامعِ لجوابِه تعالى. فقالَ:

﴿قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ أي فالأشياءُ ليستْ منحصرةً في معلوماتِكم، فعدمُ علمِكم ليس أمارةً على العدمِ، وإني حكيمٌ، لي فيهم حكمةٌ يُغتَفَرُ في جنبِها فسادُهم وسفكُهم.

أما نظْمُ هيئاتِ جُملةٍ جُملةٍ..

فاعلمْ أنَّ الواوَ في: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ وكذا في: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ إِنِّي خَالِقٌ بَشَراً مِنْ صَلْصَالٍ﴾ (الحجر: ٢٨) في آيةٍ أخرَى - بسرِّ المناسبةِ العطفيةِ - إشارةٌ إلى "إذ، وإذ" كما مرَّ..

---

(١) وذلك لعدم وجود علاقة بين الآيتين. (ت)

هەروەها - بەپێی ئەوەش كە "وەحی" ناوەرۆكی "ذكرهـــم بذلـــك"(ئەوەیان یاد بخەرەوە)ی لەخۆ گرتووە - ئاماژەیە بۆ "واذكر لهـم إذ...الخ" (واتە ئەوەشیان بۆ باس بكە كە كاتێ...) هتد.

﴿إِذْ﴾یش كە زەمانی ڕابوردوو دەگەیەنێت، بۆ گێڕانی زەینەكانە بەناو زنجـیرە زەمانـەكانی ڕابـوردوودا و، هـەڵگرتن و هێنانیانـە بـۆ ئـەو كاتـە، تـاكو بیـانبینێت و بەروبوومی ئەو ڕووداوانە بڕنێت كە تیایاندا ڕوویان داوە[1].

﴿رَبُّكَ﴾ش ئاماژەیە بۆ بە بەڵگەنەهێشتنی مەلائیكەت (بەڵگە بڕینیان بە وەڵامـی "إني أعلم ما لا تعلمـون"..). واتـە: پەروەردگارت تۆی پەروەردە كـرد و، پێـی گـەیاندیت، هەروەك تۆی كرد بە ڕابەری گرۆی مرۆڤ بۆ لابردنی خراپەكارییان. واتـە: "تۆ ئـەو چاكە گەورەیەی جۆری مرۆڤیت كە لاسـەنگە و، ئـەو خراپەكارییانـەی داپۆشـیوە كـە مەلائیكەت ئاماژەیان بۆ كرد".

﴿لِلْمَلاَئِكَةِ﴾یش، لەناو ئەم گفتوگۆیەدا كە لە شێوەی ڕاوێژدایە، ئاماژەیە بۆ ئـەوەی كە دانیشتووانی ئاسمانەكان – مەبەستم مەلائیكەتەكانە – زێدە پەیوەندییـەكیان لەگـەڵ دانیشتووانی زەویدا هەیە – مەبەستم مرۆڤە – چونكە هەندێك لەو مەلائیكەتانـە كـار پێ سپێرراوی مرۆڤن و، هـەندێكی دیكـەیان پارێزگاریـان و، هـەندێكی تریـش نووسـەری كردەوەكانیانن. كەواتە مافی ئەوەیان هەیە بایەخیان پێ بدرێت.

﴿إِنَّ﴾ش، لەسـەر بناغـەی ئـەوەی كـە بـۆ بەرپەرچدانـەوەی ئـەو دوودڵییەیـە كـە لـە ﴿أَتَجْعَلُ﴾ وەردەگیرێت، ئاماژەیە بۆ گەورەیی و بایەخی مەسەلەكە.

"یاء"ی قسەبێژی "تاك" لێرەدا، لەگەڵ ﴿نا﴾ی قسەبێژی "كۆ" لە ﴿قُلْنـــــا﴾ی ئـەو ئایەتانەدا كە دێن، ئاماژەیە بۆ ئـەوەی كـە: كـاری داهێنـان و بەدیـهێنانی خـوای گـەورە، هیچ ناوەندە هۆكارێكی تێدا نییە، وەك ئەوەی كە لە قسە و گوفتاریدا هەیە.

یەكێك لە بەڵگەكان لەسەر ئەم سەرنجانە ئایەتی ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَـــابَ بِـــالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ﴾ه (النساء: ١٠٥)..

---

(١) وەك بڵێی "إذ" كـە بۆ زەمـانی ڕابوردووە، زەینەكان دەبات بۆ زنجیرەی زەمانەكانی ڕابوردوو، یـاخود ئەوان دەهێنێت بۆ ئەم زەمانە. (ت)

وكذا - بسرِّ أنَّ الوحيَ يتضمّنُ "ذَكِّرْهم بذلك" - إشارةٌ إلى "واذكرْ لهم إذ..." الخ.

وأنَّ ﴿إِذْ﴾ المفيدَ للزمانِ الماضي لتسييرِ الأذهانِ في الأزمنةِ المتسلسلةِ الماضَويةِ ورفعِ وجلْبِ وإحضارِ لها إلى ذلك الزمانِ[1] لتنظرَه فتجتنيَ ما وقعَ فيه.

وأنَّ ﴿رَبُّكَ﴾ إشارةٌ إلى الحجّةِ على الملائكةِ، أي ربّاك وكمّلك وجعَلك مُرشداً للبشرِ لإزالةِ فسادِهم. أي "أنتَ الحسنةُ الكبرى التي ترجّحتْ وغطّتْ على تلك المفاسدِ".

وأنَّ ﴿لِلْمَلَائِكَةِ﴾ إشارةٌ في هذه المقاولةِ الكائنةِ على صورةِ المشاورةِ إلى أنَّ لسكانِ السماواتِ - أعني الملائكةَ - مزيدَ ارتباطٍ وعلاقةٍ، وزيادةَ مناسبةٍ مع سكانِ الأرضِ - أعني البشرَ -، فإنَّ مِن أولئك موكَّلين وحَفَظةً وكَتَبَةً على هؤلاءِ، فحقُّهم الاهتمامُ بشأنهم.

وأنَّ ﴿إِنِّي﴾ بناءً على كونِها لردِّ التردُّدِ المستفادِ مِن ﴿أَتَجْعَلُ﴾ إشارةٌ إلى عظَمةِ المسألةِ وأهميّتِها.

وأنَّ ياءَ المتكلِّمِ وحدَه هنا مع ﴿نا﴾ للمتكلِّم مع الغيرِ في ﴿قُلْنا﴾ في الآياتِ الآتيةِ إشارةٌ إلى أنْ لا واسطةَ في إيجادِه وخلقِه كما توجَدُ في خطابِه وكلامِه.

ومما يدلُّ على هذه النُّكَتِ آيةُ ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ﴾ (النساء: ١٠٥)..

---

(١) فكأن "إذ" المفيدة للماضي تأخذ بالأذهان إلى الأزمنة المتسلسلة الماضية، أو تأخذ بها وتجلبها وتحضرها إلى هذا الزمان. (ت)

ئەوەتا "نون"ی مەزنایەتیی بەکارهێنا و فەرمووی: ﴿أَنزَلْنَا﴾ لەبەر ئەوەی کە ناوەندە هۆکاری "وەحی" لەوێدا هەیە..

هەر لە هەمان کاتدا فەرمووی: ﴿أَرَاكَ اللَّهُ﴾ و "تاك"ی بەکارهێنا، چونکە "ئیلهام"کردنی واتا هیچ ناوەندە هۆکارێکی تێدا نییە.

هەڵبژاردنی ﴿جَاعِلٌ﴾ بەسەر "خالق"دا، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مایەی گومان و پرسیارەکە بریتییە لە "جَعْـــل"(دانان) و "تایبەتکردن"ی مرۆڤ بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی، نەك "بەدیهێنان" و بەخشینی "بوون" پێی. چونکە "بوون" خێری پەتییە و، "بەدیهێنان"یش کاری خودی خوای گەورەیە، پرسیاری لەبارەوە لێ ناکرێت.

هەڵبژاردنی ﴿فِي﴾ لە ﴿فِي الأَرْضِ﴾دا بەسەر "عَلـــى" - لە کاتێکدا کە مرۆڤ لەسەر زەوییە - بەدەر نییە لە ئاماژەدان بەوەی کە مرۆڤ بە وێنەی ئەو "گیان"ەیە کە کراوە بە جەستەی "زەوی"دا، ئیتر هەرکاتێ مرۆڤی لێ دەرچوو، زەویش وێران دەبێت و دەمرێت.

وشەی ﴿خَلِيفَةً﴾یش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە پێش ئامادەبوونی زەوی بۆ هەلومەرجی ژیانی مرۆڤ، بەدیهاتوویەکی خاوەن هەستی تێدا بووە کە قۆناغە سەرەتاییەکانی زەوی یارمەتیی داوە بۆ هەلومەرجەکانی ژیانی. هەر ئەمەش بۆ مەسەلەی "حیکمەت" گونجاوترە.

وا بەناوبانگە کە ئەو بەدیهێنراوە خاوەن هەستە جۆرێکی جیننی بوو بێت؛ خراپەیان نابێتەوە، ئیتر مرۆڤ کرابێتە جێنشینیان.

سەبارەت بە شێوەکانی پێکهێنانی ڕستەی ﴿قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ﴾ش، ئەوا بزانە کە:

دەسپێکی ڕستەی نوێ بە ﴿قَالُواْ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئاراستە کردنی گوفتاری خوای گەورە بۆ مەلائیکەت، زەینی بیسەر ڕاپێچی ئەم پرسیارە دەکات: "ئایا مەلائیکەت چۆن پێشوازی لە دراوسێی ماڵ بە ماڵیان دەکەن؟ ئایا بە هاوڕێیەتیان ڕازین؟ ڕایان چییە لەبارەیانەوە"؟ یەکسەر فەرمووی: ﴿قَالُواْ﴾.

هۆی ئەوەش کە ئەم ڕستەیە بووە بە وەڵامی مەرجی ﴿إِذْ﴾ ئەوەیە کە:

فقال: ﴿أَنزَلْنَا﴾ بنونِ العظمةِ لوجودِ الواسطةِ في الوحيِ، وقال : ﴿أَرَاكَ اللهُ﴾ مفرداً لعدمِ الواسطةِ في إلهامِ المعنَى.

وأنَّ إيثارَ ﴿جَاعِلٌ﴾ على "خالِقٌ" إشارةٌ إلى أنَّ مدارَ الشبهةِ والاستفسارِ الجعلُ[1] والتخصيصُ لعمارةِ الأرضِ لا الخلقُ والإيجادُ، لأنَّ الوجودَ خيرٌ محضٌ والخلْقَ فعلُه الذاتيُّ لا يُسألُ عنه..

وأنَّ إيثارَ ﴿فِي﴾ في ﴿فِي الأَرْضِ﴾ على "على" - مع أنَّ البشرَ على الأرض - لا يخلو مِن الإيماءِ إلى أنَّ البشرَ كالرُّوحِ المنفوخِ في جسدِ الأرضِ؛ فمتى خرجَ البشرُ خَرِبت الأرضُ وماتتْ.

وأنَّ ﴿خَلِيفَةً﴾ إشارةٌ إلى أنَّه قد وُجِدَ قبلَ تهيُّؤِ الأرضِ لشرائطِ حياةِ الإنسانِ مخلوقٌ مُدْرِكٌ ساعدَتْ شرائطَ حياتِه الأدوارُ الأوّليةُ للأرضِ. وهذا هو الأوفَقُ لقضيةِ الحكمةِ. والمشهورُ أنَّ ذلك المخلوقَ المُدْرِكَ كان نوعاً مِن الجنِّ، فأفسدوا فاستُخلِفُوا بالإنسانِ.

أما هيئاتُ جملةِ: ﴿قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ﴾..

فاعلمْ أنَّ استينافَ ﴿قَالُواْ﴾ إشارةٌ إلى أنَّ توجيهَ خطابِه تعالى إلى الملائكةِ يُلجِئُ السامعَ إلى السؤالِ بـ"كيف يتلقَّوْن جيرانَهم بيتَ بيتَ؟ وأَيَرضَوْن بهم قُرَناءَ؟ وما رأيُهم فيهم؟" فقال: ﴿قَالُواْ﴾.

وأنَّ وجهَ كَوْنِه جزاءً لـ﴿إِذْ﴾ هو:

---

(١) أي جعل البشر وتخصيصه لعمارة الأرض. (ت)

ئەو بڕیارەی خوای گەورە لە دانانی مرۆڤدا بە جێنشین لەو زەوی‌یەی کە مەلائیکەت سەرپەرشتیی دەکەن - لە کاتێکدا کە خوای گەورە ڕاوێژکار و وەزیری نی‌یە - ئەوە دەخوازێت کە چۆنێتیی پێشوازیی مەلائیکەت لەو بڕیارە دەربکەوێت.

بەکارهێنانی شێوەی "قسە" ئاماژەیە بۆ شێوازی "گفتوگۆ" لەسەر شێوەی "ڕاوێژ"دا، ئەوەش بۆ فێرکردنی خەڵکی‌یە، دەنا خوای گەورە بێ نیازە لە ڕاوێژکردن.

پرسیاری ﴿أَتَجْعَلُ﴾ش، ئەوا لەبەر ئەوەی هاتنەدیی "دانان"ەکە بێگومانە، چونکە خوای گەورە هەواڵەکەی داوە، ئەوا مەبەست حەقیقەتی پرسیار نی‌یە لەبارەی "دانان"ەکەوە. بەڵکو نەزانراویی هۆکاری دانانەکە سەرسووڕمانێك دەهێنێتە کایەوە و، ئەویش پرسیاری لێ دروست دەبێت. واتە: حیکمەتی "دانان"یان بە جێنشین چی‌یە؟

کەواتە لە بریی "هۆکار" پرسیار لە "بە هۆکراو" کراوە، ئەوەش پرسیاری نکوولی نی‌یە، چونکە مەلائیکەت لە بێ فەرمانیی خوای گەورە "پارێزراو"ن[1].

هەروەها "دانان"(جَعْل) ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە کاروبارەکانی مرۆڤ و، پەیوەندی‌یە گوێڕەییەکانی و، بارودۆخەکانی، بەشێك نین لە پێداویستی‌یەکانی سروشت و فیترەت، بەڵکو هەریەك لەوانە بە "دانان"ی دانەرە.

﴿فِيهَا﴾ش لەگەڵ ﴿فِيهَا﴾دا، وێڕای کورتیی ماوەی نێوانیان، بۆ دەربڕینە بە دەق و بۆ ئاماژە دانیشە بە واتای:

چ حیکمەتێك لە دانانی مرۆڤدا هەیە بە "گیان"ێکی کراو بە بەر جەستەی زەویدا بۆ ژیانی زەوی، لەگەڵ بوونی خراپکاری و مراندندا سەبارەت بە زیندەوەران؟

گوزارشت کردنیش بە ﴿مَنْ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مەلائیکەت کەسی مرۆڤیان لێرەدا جێی مەبەست نی‌یە، بەڵکو سەرپێچی کردنی بەدیهاتوویەکیان بەرامبەر بە خوای گەورە، بەلاوە قورسە.

هێنانی ﴿يُفْسِدُ﴾ لە بریی "یعصي" ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە سەرپێچی لە فەرمان، سەردەکێشێت بۆ تێکچوونی سیستەمی جیهان.

---

(١) واتە مەبەست لە پرسیاری مەلائیکەت بۆ ڕەخنەگرتن نی‌یە لەسەر "دانان"ەکە، چونکە ئەو "دانان"ە بە هەواڵی خوای گەورە لە بارەیەوە بووەتە شتێکی بێ گومان و، لەبەر ئەوەش کە ئەوان بێ فەرمانیی خوا ناکەن، بەڵکو پرسیارە لە بارەی حیکمەتی "دانان"ەکەوە، لەبەر ئەوەی هۆکارەکەی لەوان نادیار بووە. (ت)

أنَّ حُكمَ الله تعالى بجَعْلِ البشرِ خليفةً في الأرضِ - التي وُكِّلَ عليها الملائكةُ - مع أنّه لا مُشيرَ له تعالى ولا وزيرَ، يستلزِمُ إظهارَ كيفيّةِ تلقّيهم لهم.

وأنَّ صورةَ القَولِ إشارةٌ إلى أسلوبِ المقاولةِ على صورةِ المشاورةِ لتعليمِ الناسِ مع تنـزُّهِه تعالى عنها.

وأنَّ استفهامَ ﴿أَتَجْعَلُ﴾ فَلِتحَقُّقِ الجَعْلِ بإخبارِه تعالى، تمتنعُ حقيقتُه. فيتولّدُ منه التعجبُ الناشئُ عن خفاءِ السببِ، فيتولّدُ منه الاستفسارُ، أي ما حكمةُ الجَعْلِ؟

فاستُفهِم عن المسبَّبِ بدلاً عن السببِ وليس للإنكارِ، لعصمتِهم[1].

وأنَّ الجَعْلَ رمزٌ إلى أنَّ شؤونَ البشرِ ونِسَبَه الاعتباريةَ ووضعياتِه ليستْ من لوازمِ الطبيعةِ، ولا مِن ضرورياتِ الفطرةِ، بل كلٌّ منها بجَعْلِ الجاعلِ.

وأنَّ ﴿فِيهَا﴾ مع ﴿فِيهَا﴾ مع قِصَرِ المسافةِ، فللتنصيصِ والإيماءِ إلى معنًى:

ما حكمةُ جَعْلِ البشرِ روحاً منفوخاً في جسدِ الأرضِ لحياتِها مع وجودِ الفسادِ والإماتةِ مِن حيثُ الأحياءُ؟

وأنَّ التعبيرَ بـ﴿مَنْ﴾ إشارةٌ إلى أنّه لا يعنيهم شخصيّةُ البشرِ، وإنّما يثقُلُ عليهم عِصيانُ مخلوقٍ لله تعالى.

وأنَّ إيرادَ ﴿يُفْسِدُ﴾ بدلَ "يعصي" إشارةٌ إلى أنَّ العِصيانَ ينجرُّ إلى فسادِ نظامِ العالَمِ.

---

(١) إن القصد من استفهام الملائكة ليس اعتراضاً على الجعل، إذ تحقق بإخباره تعالى، ولأنهم لا يعصون الله ما أمرهم، وإنما هو استفسار عن حكمة الجعل، وذلك لخفاء السبب عنهم. (ت)

بەکارهێنانی شێوەی "فیعلی موزاریع"یش، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە شتی مایەی ناڕەزایی ئەوان لەم مەسەلەیەدا، نوێ بوونەوە و بەردەوامیی سەرپێچی‌یەکەیە..

ئەوەشیان بە لێ ئاگادارکردنەوەی خوای گەورە، یان بە سەیرکردنی "لەوحی مەحفوز"، یاخود بە ناسینی فیترەتی مرۆڤ زانیوە بەوەی کە ئەو هێزانە دەستنیشان نەکراون کە لەودا دانراون. ئیتر بە سنوور بەزاندنی "هێزی ئارەزوو" خراپکاری ڕوودەدات و، بە سنوور شکاندنی "هێزی تووڕەیی"ش خوێنڕێژی و ستەم پەیدا دەبێت.

﴿فِيهَا﴾ش، واتە لەگەڵ ئەوەدا کە زەوی مزگەوتێك بوو لەسەر تەقوا دامەزرابوو..

شوێنی "واو"ەکەش بۆ کۆکردنەوەی هەردوو کردەوە "خراپە"کەیە، بە بۆنەی ئەوەی کە "خراپکاری" سەردەکێشێت بۆ "خوێنڕێژی"..

هەڵبژاردنی ﴿يَسْفِكُ﴾ بەسەر "يقتُـلُ"دا لەبەر ئەوەیە کە "سفك"(ڕشتنی خوێن) کرداری کوشتنە بە ناحەقی. دەنا کوشتن هەیە کە "جیهاد"ە لە پێناوی خوادا.. هەروەها کوشتنی "تاك" هەیە لە پێناوی سەلامەتی "کۆمەڵ"دا، وەك کوشتنی گورگ بۆ سەلامەتیی ڕانە مەڕ.

﴿الدِّمَـاءَ﴾ش جەختە بۆ ئەو خوێنەی کە لە وشەی "سفك"دا هەیە، ئەوەش بە مەبەستی خەستکردنەوەی چەپەڵیی کرداری "کوشتن"ە.

سەبارەت بە شێوە پێکهاتنەکانی ﴿وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ش، ئەوا:

"واو"ی حاڵە کە ئاماژەیە بە هەست کردنیان بەو ڕەخنەیەی لێیان دەگیرێت، کە بریتی‌یە لەوەی: "ئایا حیکمەتی ئەوەتان لێ سەروزیاد نی‌یە کە مرۆڤ خوای گەورە دەپەرستن و بە خاوێنی ڕایدەگرن"؟

﴿وَنَحْنُ﴾ واتە ئێمەی مەلائیکەتی پارێزراو لە سەرپێچیی فەرمانەکان..

"ئیسمی بوون"ی ڕستەکە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە "تەسبیح" کردنیان بۆ خوای گەورە وەکو ڕەوشتێکی جێگیرە لەواندا و، "لازم"ی فیترەتیانە و، ئەوانیش بۆ ئەوە خولقاون.

﴿نَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ﴾ش وشەیەکی واتا کۆکەرەوەیە. واتە:

بە هەموو جۆرەکانی پەرستشمان بوونی تۆ لە بوونەوەراندا ڕادەگەیەنین و.. بە وەسفدارکردنت بە هەموو سیفەتەکانی شکۆمەندی، باوەڕمان وایە کە لە هەموو ئەو شتانە پاك و بێگەردیت کە بۆ تۆ ناشێن..

وأنَّ صورةَ المضارعِ إشارةٌ إلى أنَّ المستنكَرَ تجدُّدُ العِصيانِ واستمرارُه.

وقد علموا ذلك؛ إما بإعلامِه تعالى، أو بمطالعةِ اللوحِ، أو بمعرفةِ فطرتِهم من عدمِ تحديدِ القُوَى المودَعةِ فيهم. فبتجاوُزِ الشَّهويةِ يحصلُ الفسادُ، وبتعدِّي الغَضَبيةِ ينشأُ السّفكُ والظُّلمُ.

و﴿فِيهَا﴾ أي مع أنّها كانتْ مسجداً أُسِّسَ على التقوَى..

وأنَّ موقعَ "الواوِ" الجمعُ بينَ الرذيلتَين بمناسبةِ انجرارِ الفسادِ إلى سفكِ الدّمِ.

وأنَّ إيثارَ ﴿يَسْفِكُ﴾ على "يقتلُ" لأنَّ السّفكَ هو القتلُ بظُلمٍ، ومِن القتلِ ما هو جهادٌ في سبيلِ الله، وكذا قتلُ الفَردِ لسلامةِ الجماعةِ، كقتلِ الذِّئبِ لسلامةِ الغَنَمِ.

وأما ﴿الدِّمَاءَ﴾ فتأكيدٌ لما في السّفكِ مِن الدّمِ لتشديدِ شناعةِ القتلِ.

وأما هيئاتُ ﴿وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾..

فواوُ الحالِ إشارةٌ إلى استشعارِهم الاعتراضَ عليهم بـ"أما يكفيكم حكمةُ عبادةِ البشرِ وتقديسِه له تعالى"؟

﴿وَنَحْنُ﴾ أي معاشرَ الملائكةِ المعصومين مِن المعاصي..

واسميةُ الجملةِ إشارةٌ إلى أنَّ التسبيحَ كالسجيةِ لهم واللازمِ لفطرتِهم وهُمْ له.

أما ﴿نَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ﴾ فكلمةٌ جامِعةٌ أي:

نُعلنُك في الكائناتِ بأنواعِ العباداتِ.. ونعتقدُ تنـزُّهَك عمّا لا يليقُ بجنابِك بتوصيفِك بأوصافِ الجلالِ..

ئەمەشمان تەنها و تەنها هەندێکە لەو نیعمەتانەی خۆت کە سوپاس دەکرێت لەسەریان و، دەڵێین: "سبحان الله وبحمده". هەروەها بە هەموو سیفەتەکانی شکۆمەندی و جوانی وەسف و سوپاست دەکەین.

﴿وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ واتە: خاوێن ڕاگرتنی تۆ دەکەین (لە باوەڕماندا). یاخود خۆمان و کردارەکانمان لە گوناه و، دڵیشمان لە ئاوڕدانەوە بۆلای غەیری تۆ پاك ڕادەگرین. کەواتە "واو"ەکە بۆ کۆکردنەوەی هەردوو "چاکە"کەیە کە بریتین لە: گوێڕایەڵیی فەرمانەکان و، خۆپارێزی لە شتانی نەهی لێ کراو. ئیتر پڕاوپڕی "واو"ی یەکەم دەردەچێت[1].

سەبارەت بە شێوەکانی پێکهاتنی: ﴿قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾یش، ئەوا:

دەسپێك بوونی بۆ ڕستەی نوێ، ئاماژەیە بۆ ئەو پرسیارەی کە: "ئایا خوای گەورە لە وەڵامی پرسیارەکەیاندا چیی فەرموو؟ چۆن بۆ لابردنی سەرسووڕمانەکەیان هۆکارەکەی ڕوون کردەوە؟ حیکمەت لە فەزڵدانی مرۆڤ بەسەر ئەواندا چییە"؟ بۆیە فەرمووی: ﴿قَالَ﴾ بۆ ئاماژەدان بۆ کورتە وەڵامێك، پاشان لە ئایەتی دوای ئەمەدا هەندێ درێژەی بە وەڵامەکە دا.

﴿إِنَّ﴾ی ﴿إِنِّي أَعْلَمُ﴾یش بۆ جەخت کردنەوە و بەدەرنانی دوودڵی و گومانە. خۆ ئەوەش تەنها لە بڕیارێکی نەزەریی نەسەلماودا دەبێت. کەچی زانینی خوای گەورە بەو شتانەی کە بەدیهاتووان نایانزانن، لە سەلماوە بەڵگە نەویستەکانە و، مەلائیکەتیش لەوانە نین کە لەمەدا دوودڵ بن. کەواتە ﴿إِنَّ﴾ نیشانەیە کە بۆ زنجیرە ڕستەیەك کە قورئان لە ڕێگایەکی ڕەوان و بەکارهاتوودا پوخت و کورتی کردوونەتەوە. واتە:

لەناو مرۆڤدا هێندە بەرژەوەندی و خێری زۆر هەن کە لە پەنایاندا چاوپۆشی لەو گوناهانەیان دەکرێت کە شەڕێکی کەمن. کەواتە "حیکمەت" ڕێ بەوە نادات کە لەبەر ئەمە واز لەوانە بهێنرێت. هەروەها مرۆڤ نهێنییەکی لەوتۆی تێدایە کە شایستەی جێنشینیی کردووە و مەلائیکەت لێی بێ ئاگایە و، تەنها بەدیهێنەرەکەی ئەوە دەزانێت. هەروەها مرۆڤ حیکمەتێکی تێدایە کە ئەمانی بەسەر ئەواندا پێش خستووە، ئەوان نایزانن، بەڵام بەدیهێنەرەکەیان دەیزانێت.

---

(١) واتە: "واو"ی ﴿يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ﴾ کە دوو خراپەی مرۆڤی کۆکردەوە. (وەرگێڕ)

وما هو إلا مِن نعمِك المحمودِ عليها. ونقولُ: "سُبحَانَ اللهِ وبحَمدِه". ونحمدُك ونصِفُك بأوصافِ الجلالِ والجمالِ.

﴿وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ أي نقدّسُك.. أو نطهّرُ أنفسَنا وأفعالَنا مِن الذنوبِ وقلوبَنا من الالتفاتِ إلى غيرِك. فالواوُ للجمعِ بين الفضيلتَين، أي امتثالُ الأوامرِ واجتنابُ النواهي، فيكونُ حِذاءَ الواوِ الأوّلِ.

وأما هيئاتُ: ﴿قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾..

فاستينافُها إشارةٌ إلى السؤالِ بـ"ماذا قالَ اللهُ تعالى مجيباً لاستفسارِهم، وكيف بَيَّنَ السببَ مُزيلاً لتعجّبِهم، وما الحكمةُ في ترجيحِ البشرِ عليهم؟" فقال: ﴿قَالَ﴾ مُشيراً إلى جوابٍ إجماليٍّ، ثم فصَّلَ بعضَ التفصيلِ بالآيةِ التاليةِ.

و﴿إِنَّ﴾ في ﴿إِنِّي أَعْلَمُ﴾ للتحقيقِ وردِّ التردُّدِ والشبهةِ، وهو إنما يكونُ في حُكمٍ نظريٍّ ليس بمسلَّمٍ. مع بداهةِ ومُسلّميةِ علمِ اللهِ تعالى بما لا يعلمُ الخَلْقُ. وحاشاهم عن التردُّدِ في هذا. فحينئذٍ يكونُ ﴿إِنَّ﴾ مناراً على سلسلةِ جُمَلٍ لخَصَها القرآنُ وأجملَها وأوجزَها بطريقٍ بيانيٍّ مسلوكٍ..

أي إنَّ في البشرِ مصالحَ وخيراً كثيراً تُغمَرُ في جنبِها معاصيه التي هي شرٌّ قليلٌ، فالحكمةُ تُنافي تركَ ذلك لهذا. وإنَّ في البشرِ لسرّاً أهّلَه للخلافةِ غفلتْ عنه الملائكةُ وقد عَلِمَه خالِقُه.. وإنَّ فيه حكمةً رجّحَتْه عليهم لا يعلمونها ويعلمُها مَن خلقَ.

هەروەها لەوانەیە واتای ﴿إِنَّ﴾ ڕوو بکاتە ئەو بڕیارە ناوەکی‌یەش کـە لـە بەستێنێکی ئەو وشانە وەربگیرێت "إنَّ" دەڕواتە سەریان. واتە: ئێوە بە بێ گومانی نازانن.

هەروەها ﴿أَعْلَمُ مَـــا لاَ تَعْلَمُـــونَ﴾ لـە جۆری باسکردنی "لازم" و مەبەست پێی "مەلزووم"ە. واتە شتی وا هەیە کە ئێوە نایزانن، چونکە "زانست"ی خوای گەورە لازمی هەموو شتێکە. کەواتە نەفی کردنی "زانین" بەڵگەی نەبوونی "زانراو"ەکەیە[1]. وەك فەرموویەتی ﴿بِمَا لا يَعْلَمُ﴾ (یونس: ١٨). واتە مومکین نی‌یە و شتی وا بوونـی نی‌یـە.. هەروەها بوونی "زانین" بەڵگەی بوونی "زانراو"ە.

پاشان لە لێکۆڵینەوەی ئەم پوختە وەڵامەدا، وترا کە:

خوا زانا و دانایە و، کردارەکانی بەدەرنین لـە چەندین دانـایی و بـەرژەوەندی و، بوونەوەرانیش هەر ئەوانـە نین کـە لـە چوارچێوەی زانیـاریی بەدیـهاتوواندان. نـەبوونی زانینی ئەوان بەو شتانە، نابێتە بەڵگە لەسەر نەبوونیان[2].

هەروەها کاتێ خوای گـەورە خێری پەتی واتـە "مەلائیکـەت" و، شـەڕی پـەتی واتـە "شەیتانەکان" و، ئەوانەش کە شەڕ و خێریان لـەسەر حسـاب نی‌یـە، واتـە "ئاژەڵـەکان"ی بەدی هێنا، حیکمەتی بەخشندەی ڕەها بوونـی بەشـی چوارەمیشـی خواسـت کـە ئەوەیـە خێر و شەڕی تێدا کۆیە..

جا ئەگەر هێزی "ئارەزوو" و "تووڕەیی"ی مـرۆڤ ملکـەچی هـێزی "ژیـری"یەکـەی بن، ئەوا مرۆڤ بەهۆی "موجاهەدە"وە لە مەلائیکەت لە پێشترە..

خۆ ئەگەر مەسەلەکە پێچەوانە بێتەوە، ئەوا لـەبەر نەبوونی بەهانە، پلەی لە هی ئاژەڵ نزمتر دەبێت.

* * *

---

(١) واتە: "زانست"ی خوای گەورە پەیوەندی بە شتی "زانراو" دەکات. خۆ ئەگەر زانراوەکە "بوون"ی نەبوو، ئەوا "زانین"ی ئەو شتەش بوونی نابێت. (وەرگێڕ)

(٢) واتە: زانیاریی غەیری خوا دەورەدەر نی‌یە بە هـەموو ئەو شتانەی کـە دارای "بوون"ن. کەواتـە ئەگـەر "مەلائیکەت"زانیارییان لەبارەی شتێکەوە نەبوو، ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر نەبوونی ئەو شتە. (وەرگێڕ)

وأيضاً قد يتوجَّهُ معنَى ﴿إِنَّ﴾ إلى الحكمِ الضمنيِّ المستفادِ من واحدٍ من قيودِ مدخولِها، أي لا تعلمون بالتحقيقِ.

وأيضاً ﴿أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ مِن قبيلِ ذِكْرِ اللازمِ وإرادةِ الملزومِ، أي يوجَدُ ما لا تعلمون، إذ علمُه تعالى لازمٌ لكلِّ شيءٍ، فنفيُ العلمِ دليلٌ على عدمِ المعلومِ، كما قال تعالى: ﴿بِمَا لا يَعْلَمُ﴾ (يونس: ١٨) أي لا يمكنُ ولا يوجَدُ، ووجودُ العلمِ دليلٌ على وجودِ المعلومِ..

ثم إنَّه قد ذُكرَ في تحقيقِ هذا الجوابِ الإجماليِّ:

أنَّ اللهَ عليمٌ حكيمٌ، لا تخلو أفعالُه تعالى عن حِكَمٍ ومصالحَ، فالموجوداتُ ليستْ محصورةً في معلوماتِ الخَلْقِ. فعدمُ العلمِ لا يدلُّ على العدمِ..

وأنَّ اللهَ تعالى لَمّا خلقَ الخيرَ المحضَ أعني الملائكةَ، والشَّرَّ المحضَ أعني الشياطينَ، وما لا خيرَ عليه ولا شرَّ أعني البهائمَ، اقتضتْ حكمةُ الفيّاضِ المطلقِ وجودَ القسمِ الرابعِ الجامعِ بين الخيرِ والشرِّ..

إنْ انقادت القوةُ الشَّهَويةُ والغَضَبيةُ للقوةِ العقليةِ، فاقَ البشرُ على الملائكةِ بسببِ المجاهدةِ..

وإنْ انعكسَت القضيةُ، صارَ أنزلَ مِن البهائمِ لعدمِ العُذرِ.



﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلاءِ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ ۞ قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ۞ قَالَ يَا ءَادَمُ أَنبِئْهُمْ بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُمْ بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّموَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ﴾ (البقرة: ٣١-٣٣)

## پێشەكی

بزانە كە: ئەمە موعجیزەی ئادەمە؛ تەحەددیی مەلائیكەتی پێ كراوە، تەنانەت موعجیزەی "جۆر"ی مرۆڤە لە دەعوای جێنشینیدا. بێ گومان چیرۆكەكان گەلێ پەندیان تێدایە.

پاشان بەپێی ﴿وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ (الأنعام: ٥٩) و، بە پشت بەستن بەوەی كە قورئان هەروەك بە ڕێنماییەكانی و بە دەقەكانی سوودت پێ دەگەیەنێت، بە هەمان جۆر لە ڕێی ئاماژە و هێماكانیشیەوە زانیاریت فێر دەكات..

من (بەپێی ئەم ئایەتە و بە پشت بەستن بەمە) لە ئاماژەكانی مامۆستایی ئیعجازی قورئانەوە لە چیرۆكی پێغەمبەران و باسی موعجیزاتیاندا، شەوق بەخشین و هاندانی مرۆڤ تێدەگەم بۆ هەوڵدانی گەیشتن بە هاوشێوەی ئەو موعجیزانە..

﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلاءِ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ * قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ * قَالَ يَا ءَادَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُمْ بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّموَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ﴾ (البقرة: ٣١-٣٣)

## مقدمة

اعلمْ أنَّ هذه معجزةُ آدمَ تُحُدِّيَتْ بها الملائكةُ، بل معجزةُ نوعِ البشرِ في دعوَى الخلافةِ. إنَّ في القصَصِ لعِبراً.

ثم إني - نظراً إلى ﴿وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ (الأنعام: ٥٩) ومستنِداً إلى أنَّ التنـزيلَ كما يفيدُك بدلالاتِه ونصوصِه كذلك يعلِّمُك بإشاراتِه ورموزِه - لَأفهمُ من إشاراتِ[1] أستاذيّةِ إعجازِ القرآنِ في قَصَصِ الأنبياءِ ومعجزاتِهم التشويقَ والتشجيعَ للبشرِ على التوسُّلِ للوصولِ إلى أشباهِها..

---

(١) فإن كنت في ريب فيما استخرجه من لطائف نظم التنزيل، فأقول: قد استشرنا ابن الفارض تفاؤلاً، فأجاب بـ: كأن الكرام الكاتبين تنزّلوا    على قلبه وحياً بما في صحيفة    (حبيب)

وەك بڵێی قورئان بەو چیرۆکانە پەنجە دەخاتە سەر هێڵە بنەڕەتی‌یەکان و، هاوشێوەی دەرەنجامەکانی کۆتا هەوڵ و تەقالای مرۆڤ بەرەو پێشکەوتن لەو داهاتووەدا کە لەسەر بناغەکانی ئەو ڕابوردووە بنیات دەنرێت کە ئاوێنەی ئایندەیە. دەڵێی قورئان دەستی شەوق بەخشین و هاندان بەسەر پشتی مرۆڤدا دەهێنێت و، پێی دەفەرموێت:

"هەوڵ بدە و، لەو هۆکارانەدا تێبکۆشە کە دەتگەیەننە هەندێ لەو کارە دەراسایانە"!

ئایا نابینی کە "سەعات" و "کەشتی" یەکەم دیاریی دەستی "موعجیزە"ن کە پێشکەشی گرۆی مرۆڤی کردوون[1]؟

گەر پێت خۆشە، ئەوا بڕوانە بۆ: ﴿وَعَلَّمَ ءادَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا﴾ و، بۆ ﴿وَلَقَدْ ءاتَيْنَا دَاوُدَ مِنَّا فَضْلاً يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ﴾ (سبا: ١٠) و، بۆ ﴿وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ وَأَسَلْنَا لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ﴾ (سبا: ١٢) "واتە: مس" و، بۆ ﴿اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْحَجَرَ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْناً﴾ (البقرة: ٦٠) و، بۆ ﴿وَتُبْرِىءُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ بِإِذْنِي﴾ (المائدة: ١١٠)..

پاشان سەرنج لە دەرەنجامی بە دوای یەکدا هاتنی هزرەکانی مرۆڤ و ئەوانەش بدە کە لە هەزاران زانستەوە دەری هێناون، کە هەریەکەیان زمانێکی گۆیایە لەبارەی تایبەتکاری‌یەکان و سیفەتەکان و ناوەکانی "جۆر"ێك لە جۆرەکانی بوونەوەران، بە ڕادەیەکی وا کە مرۆڤ بووەتە ئاوێنەیەك بۆ تێدا دەرکەوتنی:

﴿وَعَلَّمَ ءادَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا﴾..

پاشان بیر لەو شتە سەیر و سەمەرانە بکەرەوە کە هزری مرۆڤ بەدەستی هێناون لە: هێڵی ئاسن و، ئامێری تەلەگراف و، جگە لەمانەش لە ڕێی نەرمکردنی ئاسن و تواندنەوەی مسەوە، بە ڕادەیەك ﴿وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ﴾ کە سەرچاوەی سنعەتەکانیەتی، لەودا دەرکەوتووە..

هەروەها بیر لەو فڕۆکانە بکەرەوە کە زەینی مرۆڤ دایهێناون و، ماوەی مانگە ڕێیەك بە ڕۆژێك دەبڕن، کە خەریکە ببێتە ئاوێنەی تێدا دەرکەوتنی:

﴿غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ﴾..

(١) مەقامی دووهەمی وتەی بیستەم بە تێروتەسەلی درێژەی پێ داوە.

كأنَّ القرآنَ بتلك القصصِ يضعُ إصبعَه على الخطوطِ الأساسيّةِ ونظائرِ نتائجِ نهاياتِ مساعي البشرِ للترّقي في الاستقبالِ الذي يُبنَى على مؤسَّساتِ الماضي الذي هو مرآةُ المستقبلِ، وكأنَّ القرآنَ يمسَحُ ظهرَ البشرِ بيدِ التشويقِ والتشجيعِ قائلاً له:

اسعَ واجتهدْ في الوسائلِ التي توصِلُك إلى بعضِ تلك الخوارقِ! أفلا ترَى أنَّ الساعةَ والسفينةَ أوّلُ ما أهدتْهما للبشرِ يدُ المعجزةِ[1].

وإنْ شئتَ فانظرْ إلى ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا﴾، وإلى ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُدَ مِنَّا فَضْلاً يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ﴾ (سبأ: ١٠)، وإلى ﴿وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ وَأَسَلْنَا لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ﴾ (سبأ: ١٢) "أي النحاس"، وإلى ﴿اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْحَجَرَ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْناً﴾ (البقرة: ٦٠)، ﴿وَتُبْرِىءُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ بِإِذْنِي﴾ (المائدة: ١١٠)!

ثمَّ تأمَّلْ فيما مَخَضَه تلاحقُ أفكارِ البشرِ واستنبَطه من ألوفِ فنونٍ، ناطقٌ كلٌّ منها بخواصِّ وصفاتِ وأسماءِ نوعٍ من أنواعِ الكائناتِ، حتى صار البشرُ مظهرَ: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا﴾..

ثم فيما استخرجَه فكرُ البشرِ من عجائبِ الصنعةِ مِن السكّةِ الحديديةِ والآلةِ البرقيةِ وغيرِهما بواسطةِ تليينِ الحديدِ وإذابةِ النُّحاسِ حتى صار مظهرَ: ﴿وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ﴾ الذي هو أمُّ صنائعِه..

وفيما أفرخَه أذهانُ البشرِ من الطيّاراتِ التي تسيرُ في يومٍ شهراً حتى كادَ أنْ يصيرَ: ﴿غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ﴾..

---

(١) المقام الثاني من "الكلمة العشرين" فيه تفصيل كاف لهذا البحث.

هەروەها بیر لەو پێشکەوتنەی هەوڵ و تەقالای مرۆڤ بکەرەوە کە ئامێر و دارعەسای وای داهێناوە کاتێ دەیوەشێنێت لە زەویی لماویی وشك و برنگ، یەکسەر کانیاوێکی بەخوڕی لێ هەڵدەقوڵێت و، زەوی‌یە لماوی‌یەکە دەبێتە باخچەیەکی ئەوتۆ کە خەریکە ببێتە ئاوێنەی تێدا دەرکەوتنی:

﴿اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْحَجَرَ﴾..

هەروەها بیر لەو کارە دەراسایانەی "پزیشکی" بکەرەوە کە ئەزموونەکانی مرۆڤ بەرهەمیان هێناون و، لە ڕادەیەکدان وەختە کوێری زگماك و، کەسی بەڵەك و، نەخۆشی درێژخایەن، بە ئیزنی خوا، چاك بکەنەوە..

(جا ئەگەر بۆ ئەمانەت ڕوانی و، سەرنجت دان و، بیرت لێ کردنەوە ئەوا):

پەیوەندی‌یەکی هێندە تەواو (لە نێوان داهاتەکانی زانست و، قورئاندا) دەبینیت کە ڕێت پێ دەدات بڵێیت: ئەوە پێوەرەکانیەتی، باسکردنیشیان ئاماژەیە و هاندەرە بۆیان.

هەروەها بڕوانە بۆ فەرمایشتی: ﴿يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلامًا﴾ (الأنبياء: ٦٩) و، بۆ: ﴿لَوْلا أَنْ رَأَى بُرْهَانَ رَبِّهِ﴾ (يوسف: ٢٤)، واتە وێنەی یەعقووبی دی کە پەنجەی خۆی دەگەست، لە ڕیوایەتێکدا. هەروەها بۆ: ﴿إِنِّي لأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ﴾ (يوسف: ٩٤) و، بۆ: ﴿يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ﴾ و، بۆ: ﴿عُلِّمْنَا مَنطِقَ الطَّيْرِ﴾ (النمل: ١٦) و، بۆ: ﴿أَنَا ءاتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ﴾ (النمل: ٤٠) و، ئایەتەکانی تری هاوشێوەیان..

ئنجا دوای ئەوە، بیر لەوانە بکەرەوە کە مرۆڤ دەری خستوون، وەك ئەو پلەیەی ئاگر کە سووتێنەر نی‌یە و، ئەو هۆکارانەش کە ڕێ لە سووتاندن دەگرن..

هەروەها سەرنج لەو هۆکارانە بدە کە مرۆڤ دایهێناون و، وێنە و دەنگەکان لە چەندین ماوەی دوورەوە و پێش ئەوەی چاوت بتروکێنیت، دەهێنن و ئامادەی دەکەن بۆت.

هەروەها بیر لەو ئامێرانە بکەرەوە کە مرۆڤ دایهێناون و، دەدوێن و، قسە دەکەن..

هەروەها بیر لە بەکارهێنانی مرۆڤیش بکەرەوە بۆ چەند جۆرێکی باڵندە و کۆترەکان..

ئنجا قیاسی شتەکانی تریش بکەرە سەر ئەمانە، تاکو گونجاوی‌یەك لە نێوان ئەم دوو بەشەدا ببینیت، کە لە ڕادەیەکدایە مافی خۆیەتی بوترێت: لەمیاندا چەندین هێما بۆ ئەو هەیە.

وفيما ترقّى إليه سعيُ البشرِ مِن اختراعِ الآلاتِ والعِصِيِّ التي تضرِبُ في الأرضِ الرملةِ اليابسةِ فتفورُ منها عينٌ نضّاخَةٌ وتصيرُ الرملةُ روضةً حتى أوشَكَ أنْ يصيرَ مظهرَ: ﴿اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْحَجَرَ﴾..

وفيما أنتجَه تجاربُ البشرِ من خوارقِ الطِّبِ التي طَفِقَ أنْ تُبرِئَ الأكمهَ والأبرصَ والمـُزمِنَ بإذنِ الله..

ترَ[1] مناسبةً تامةً تصحّحُ لك أنْ تقولَ: تلك مقائسُها، وذكرُها يُشيرُ إليها ويشجِّعُ عليها.

وكذا انظرْ إلى قولِه تعالى: ﴿يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلامًا﴾ (الأنبياء: ٦٩) ﴿لَوْلا أَنْ رَأَى بُرْهَانَ رَبِّهِ﴾ (يوسف: ٢٤) أي صورةَ يعقوبَ عاضّاً على إصبعِه في روايةٍ، وإلى ﴿إِنِّي لأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ﴾ (يوسف: ٩٤) وإلى ﴿يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ﴾ وإلى ﴿عُلِّمْنَا مَنطِقَ الطَّيْرِ﴾ (النمل: ١٦) وإلى ﴿أَنَا ءَاتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ﴾ (النمل: ٤٠) وأمثالِها..

ثم تأمّلْ فيما كشفَه البشرُ مِن مرتبةِ النارِ التي لا تُحْرِقُ، ومِن الوسائطِ التي تمنَعُ الإحراقَ، وفيما اخترعَه مِن الوسائلِ التي تجلِبُ الصُّورَ والأصواتِ مِن مسافاتٍ بعيدةٍ وتُحضِّرُها إليك قبلَ أنْ يرتدَّ إليك طرفُك، وفيما أبدعَه فكرُ البشرِ مِن الآلاتِ الناطقةِ بما تتكلَّمُ، وفي استخدامِه لأنواعِ الطيورِ والحماماتِ، وقِسْ عليها، لترَى بين هذين القسمَين ملاءمةً يحقُّ بها أنْ يُقالَ: في هذه رموزٌ إلى تلك.

---

(١) جواب "فانظر".

هەروەها بیر لە تایبەتمەندیی موعجیزە هەرە مەزنەکە بکەرەوە کە تایبەتمەندیی وتنی قسەیە و، تایبەتکاریی مرۆڤە و، ئەدەب و ڕەوانبێژییەکەیەتی..

پاشان بیر لەوە بکەرەوە کە بلندترینی ئەو شتانەی گیانی مرۆڤ پەروەردە دەکەن و، ناسکترینی ئەو شتانەی کە ویژدانی پالفتە دەکەن و، جوانترینی ئەوانەی کە بیر دەڕازێننەوە و، بلاوترینی ئەو شتانەش کە شادی بە دلی دەبەخش: تەنها و تەنها جۆرێکە لە ئەدەبیات..

هەر لەبەر هۆکارێکە (شتێکە) دەبینیت کە ئەم جۆرە بلاوترین و فراوانترینی بوارە هونەرییەکانە و، لە هەموشیان پتر دەڕواتە ناو ناخ و، کاریگەریی زیاترە و، پتر بە دلی مرۆڤەوە دەنووسێت، بە ڕادەیەك دەلێی پادشای دلانە.

دەسا فەرموو بیری لێ بکەرەوە.

پاشان ئەم ئایەتەش هەر سێ ڕووی هۆنینەکەی هەیە.

سەبارەت بە هۆنینی واتاکەی لە ڕشتەی ئەوەی پێش خۆیدا، ئەوا لە چوار ڕووەوەیە:

یەکەم:

قورئان کە لە ئایەتی پێش ئەمەدا و لە ڕوونکردنەوەی حیکمەتی بەدیهێنانی مرۆڤدا، یەکەم وەلام و، لە پێشتریان و، گشتیتریان بۆ هەموان و، سووکەلەتریان و، ئاسانتریان بۆ قەناعەت بەخشین و، جوانترینیان لە کورتیدا و، پوختترینیانی باس کرد.. هات بەم ئایەتەش وەلامێکی درێژی ئەوتۆی دایەوە کە چ گشتینەی خەلك و چ تایبەتمەندانی پێ دلنیا ببێت..

دووهەم:

کە لەودا بە ڕاشکاوی مەسەلەی جێنشینیی مرۆڤی باس کرد. لەمیشدا بە باسی موعجیزەی ئەو "جۆر"ە لە بەرامبەر مەلائیکەتەوە، بەلگەی لەسەر ئەو داوایە هێنایەوە.

سێهەم:

لەودا ئاماژەی دا بە فەزلدانی مرۆڤ بەسەر مەلائیکەتدا. بەمەش هێمای بۆ "بەلگەی لیممی"ی فەزلدانەکە کرد.

وكذا تأمَّلْ في خاصِّيّةِ المعجزةِ الكبرَى التي هي خاصيّةُ الناطقيةِ؛ التي هي خاصيّةُ الإنسانيةِ، وهي الأدبُ والبلاغةُ..

ثم تدبّرْ في أنَّ أعلَى ما يربِّي روحَ البشرِ، وألطفَ ما يصفِّي وجدانَه، وأحسنَ ما يزيِّنُ فكرَه، وأبسطَ ما يوسِّعُ قلبَه إنما هو نوعٌ مِن الأدبياتِ..

ولأمرٍ مّا ترَى هذا النوعَ أبسطَ الفنونِ وأوسعَها مجالاً وأنفذَها وأشدَّها تأثيراً وألصقَها بقلوبِ البشرِ حتى كأنّه سلطانُها. فتأمَّلْ!

ثم إنَّ لهذه الآيةِ أيضاً الوجوهَ الثلاثةَ النظميةَ:

أما نظْمُ مآلها بسابقتِها فمِن وجوهٍ أربعةٍ:

**الأولُ:**

أنَّ التنزيلَ لما ذكَرَ في الآيةِ الأُولى في بيانِ حكمةِ خِلقةِ الإنسانِ ما هو أوّلُ الأجوبةِ وأَوْلاها وأعمُّها للكلِّ وأيسرُها وأسهلُها إقناعاً وأجملُها إجمالاً وأوجزُها، بيّنَ بهذه الآيةِ جواباً تفصيلياً يطمَئِنُّ به العوامُّ والخواصُّ.

**والثاني:**

أنّه لّما صرّحَ في تلك بمسألةِ الخِلافةِ للبشرِ، برهَنَ بهذه على تلك الدعوَى بمعجزةِ ذلك النوعِ في مقابلةِ الملائكةِ.

**والثالثُ:**

أنّه لما أشارَ بتلك إلى ترجُّحِ البشرِ على الملَكِ، رمَزَ بهذه إلى لِمِّيّةِ الرُّجحانِ.

چوارەم:

لەودا ئاماژەی بە شایستەیی ئەم "جۆر"ە دا بۆ جێنشینیی هەرە مەزن لە زەویدا. لەمدا بۆ بەڵگەهێنانەوە لەسەر ئەوە، ئاماژەی بەوە دا کە هەر تەنها مرۆڤ نوسخەی لەخۆگر و دەرخەری هەرە تەواوی سەرجەم درەوشانەوەکانە (هی ناوە جوانەکانی خوای گەورە) بە هۆی جۆراوجۆریی توانا و لێهاتنەکانی و، زۆربوونی ڕێگاکانی سوود وەرگرتن و، زانستەکەی..

ئەوەتا لە ڕێی پێنج هەستەوەرە ئاشکراکەی و هەستەوەرە پەنهانەکانیەوە دەوراندەوری بوونەوەران دەدات، بە تایبەت لە ڕێی "ویژدان"ی بێ بنك و بێ سنووریەوە. ئایا نابینی هاوشێوەی شیرینیی هەنگوین لە دوو ڕووەوە[1]، بگرە لە چەند ڕوویەکەوە دەزانێت، بە پێچەوانەی مەلائیکەتەوە؟ دە فەرموو بیری لێ بکەرەوە!

هۆنینی ڕستەکانیش لە ڕشتەی یەکتردا بە شێوەیەکی هێندە فیتریە کە لەوپەڕی ڕەوانیدایە:

ئەوەتا ڕستەی یەکەم هاتنەدیی ناوەرۆکی ﴿إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ و، درێژەپێدان و، تەفسیرێکە بۆ پوختی و نادیاریەکەی ئەو..

هەروەها دەری دەخات کە جێنشینیی خوای گەورە لە زەویدا بۆ جێبەجێ کردنی فەرمان و یاساکانی، بەندە لەسەر بوونی زانستێکی تەواو..

هەروەها داڕشتنی گوفتار لە ئایەتی پێشوودا سەردەکێشێت بۆ:

"ئادەمی بەدی هێنا و، ڕێکوپێکیی پێ بەخشی و، لە ڕۆحی خۆی کرد بە بەردا و، پەروەردەی کرد، پاشان ناوەکانی فێرکرد و، ئامادە و تەیاری کرد بۆ جێنشینی.. پاشان کاتێ لە مەسەلەی فەزڵدانی و شایستەییدا بۆ جێنشینی بەسەر مەلائیکەتدا هەڵی بژارد و، بە زانینی ناوەکان جیاوازی و نایابیی ئەوی دەرخست، مەقامی تەحەددی ئەوەی خواست کە "شتەکان" لە پێش چاویاندا نمایش بکرێن و داوای بەرەنگاریان لێ بکرێت.. پاشان کاتێ مەلائیکەتەکان هەستیان بە دەستەوسانیی خۆیان کرد، دانیان بە حیکمەتی خوای گەورەدا نا و دڵنیا بوون لێی"..

---

(١) ڕووی یەکەم: شیرینیی چێژە ماددییەکەیە لە ناودەمی مرۆڤدا، ڕووی دووهەمیش: شیرینیی نیعمەت بەخشینەکەیە لە لایەن نیعمەت بەخشەوە، ڕووی تر وەك: شیرینیی سوپاس لەسەر کردنی نیعمەتەکە... هتد. (وەرگێڕ)

والرابعُ:

أنّه لما لوَّحَ بها إلى مَظهَريّةِ هذا النوعِ للخلافةِ الكُبرَى في الأرضِ، لَمَحَ بهذه احتجاجاً عليها إلى أنَّ الإنسانَ هو النسخةُ الجامعةُ والمظهَرُ الأتمُّ لكلِّ التجلياتِ، لتنوُّعِ استعداداتِه وتكثُّرِ طُرُقِ استفاداتِه وعلمِه، فيحيطُ بالكائناتِ بحواسِّه الخمسِ الظاهرةِ والباطنةِ لاسيما بوجدانِه الذي لا قعْرَ له. أفلا تراه يعلمُ أمثالَ حلاوةِ العسَلِ بوجهَين بل بوجوهٍ خلافَ المَلَكِ..

فتأمّلْ!

أما نظْمُ الجُمَلِ بعضِها مع بعضٍ ففطريٌّ في غايةِ السلاسةِ:

فالأُولى: تحقيقٌ لمضمونِ ﴿إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ وتفصيلٌ لمَا أجمَلَ فيها وتفسيرٌ لما أبهَمَ..

وكذا إنَّ خلافةَ الله تعالى في أرضِه لإجراءِ أحكامِه وتطبيقِ قوانينِه تتوقّفُ على علمٍ تامٍّ..

وكذا إنَّ انصِبابَ الكلامِ في الآيةِ الأُولى ينجرُّ إلى:

"فخلقَه وسوّاه ونفخَ فيه مِن روحِه وربّاه ثمَّ علّمَ الأسماءَ وأعدَّه للخلافةِ.. ثم لمّا اصطفاه على الملائكةِ وميّزَه بعلمِ الأسماءِ في مسألةِ الرُّجحانِ واستحقاقِ الخلافةِ، اقتضَى مقامُ التحدِّي عرْضَ الأشياءِ عليهم وطلبَ المعارضةِ منهم.. ثم لمّا أحسُّوا بالعجزِ من أنفسِهم أقرُّوا بحكمتِه تعالى واطمأنُّوا".

هەر لەبەر ئەوە بوو کە فەرمووی:

﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلاءِ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾.

﴿قَالُواْ﴾ واتە بە خۆ بەری کردنیان لەو شتەی کە خۆپەرستیی شەیتان ئاخنیبوویە ناو پرسیارەکەیانەوە، وتیان:

﴿سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾[1].

پاشان کاتێ دەستەوسانییان دەرکەوت، لەبەر ئەوەی کە توانا و لێهاتنی ئەوان لەو شتانەی تێدا کۆ نییە، ئەوا مەقامەکە ڕوونکردنەوەی توانای ئادەمی خواست، تاکو تەحەددییەکە بە تەواوی بێتە دی. بۆیە فەرمووی:

﴿يَا ءادَمُ أَنبِئْهُمْ بِأَسْمَآئِهِمْ﴾.

پاشان دوای ئەوەی کە ئادەم گوێڕایەڵیی فەرمانەکەی کرد و، نهێنیی حیکمەتی تێدا دەرکەوت، مەقامەکە ئەوەی خواست کە پوختە وەڵامەکەی پێشوو ئامادە بکرێت و وەك ئەنجامی ئەم درێژە پێدانە دابنرێت، بۆیە فەرمووی:

﴿أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّموَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ﴾.

ئەوەش بزانە کە:

شێوەی گفتوگۆکە - تا ڕادەیەك - ئەوە دەردەخات و دەباتە هەستی مرۆڤەوە کە خۆپەرستیی شەیتان لە نێوان مەلائیکەتدا سەری هەڵداپێت و، وا دەباتە هەستەوە کە ڕەخنەی دەستەیەك ئاوێتەی پرسیارەکەیان بووبێت.

سەبارەت بە شێوەی پێکهاتەی ڕستە بە ڕستەش، ئەوا:

---

(١) بە بێ ویستی خۆم ئەم ئایەتەم لە کۆتایی زۆربەی "وتەکان" و "مەکتووبات"ی پەیامەکانی نووردا بەسەر زماندا هات. تەنها ئێستا تێگەیشتم کە ئەم تەفسیرەشم بەم ئایەتە کۆتایی پێ هاتووە. کەواتە هەموو "وتەکان" تەنها و تەنها تەفسیرێکی ڕاستەقینەی ئەم ئایەتە پیرۆزەن و، جۆگەلەیەکی بەخوڕن لە دەریای ئەم ئایەتەوە دێن و لە دەرەنجامیشدا دەڕژێنە ناوی. تەنانەت دەڵێی هەموو "وتە"یەکی کتێبی "وتەکان" لەم ئایەتە پیرۆزەوە هەڵدەقوڵێن. کەواتە من لەو کاتەوە هەتا ئێستا تەفسیری ئەم ئایەتەم تەواو نەکردووە، هەتا دەست بە جۆرلی دووەمی تەفسیرەکە بکەم! (پەراوێزی دانەر، سەعیدی نوورسی، لە تەرجەمە تورکییەکەدا)

ولهذا قال:

﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلاءِ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾.

﴿قَالُواْ﴾ أي متبرّئين مما دسّه في استفسارِهم أنانيةُ إبليسَ:

﴿سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾(١).

ثم لمّا ظهرَ عجزُهم لعدمِ جامعيةِ استعدادِهم، اقتضَى المقامُ بيانَ اقتدارِ آدمَ حتى يتمَّ التحدّي فقال:

﴿يَا ءَادَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ﴾..

ثم لما امتثلَ وظهرَ سرُّ الحكمةِ فيه، اقتضَى المقامُ استحضارَ الجوابِ الإجماليِّ السابقِ وجعلَه كالنتيجةِ لهذا التفصيلِ فقالَ:

﴿أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّموَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ﴾.

واعلمْ أنّه قد تَشِفُّ وتُحِسُّ صورةُ المقاولةِ عن تولُّدِ أنانيةِ إبليسَ فيما بين الملائكةِ وتُشعِرُ بتداخُلِ اعتراضِ طائفةٍ بين استفسارِهم.

أما نظْمُ هيئاتِ جُملةٍ جُملةٍ:

---

(١) لقد جاءت إلى لساني - دون اختيارٍ مني - هذه الآية الكريمة في ختام معظم "الكلمات" و"المكتوبات" من "رسائل النور"، والآن فقط أدركت أن تفسيري هذا قد اختُتم أيضاً بهذه الآية الكريمة. فجميع "الكلمات" إذن ما هي إلّا تفسير حقيقي لهذه الآية الكريمة، وجدول رقراق ينساب من بحرها ثم يصب فيه في خاتمة المطاف، حتى لكأن كل "كلمة" من "الكلمات" تنبع من هذه الآية الكريمة. فأنا إذن لم أستكمل منذ ذلك الوقت تفسير هذه الآية كي أشرع في الجزء الثاني من التفسير. سعيد النورسي. (ت)

ڕستەی ﴿وَعَلَّمَ ءادَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا﴾ واتە: لەسەر فیترەتێك شێوەی ئادەمی کێشا کە بنەماکانی سەرجەم جۆرەکانی کەمالاتی مرۆڤی لەخۆ گرتبوو.. هەروەها لەسەر ئامادەباشی‌یەك بەدیی هێنا کە هەموو جۆرە بەرزی‌یەکانی تێدا ڕواندبوو.. هەروەها بە دە هەستەوەرەکە و بە ویژدانێك تەیاری کردبوو کە هەموو بوونەوەرانی تێدا دەبینرا..

بەم سیانە، ئامادەباشیی تێدا کرد بۆ فێربوونی هەموو جۆرەکانی حەقیقەتی هەموو شتەکان. پاشان هەموو ناوەکانی فێر کرد.

"واو"ەکەی ئاماژەیە بۆ ئەم ڕستە پێچراوانەی باس کران لە ژێر کورتکردنەوەکەیدا.

﴿عَلَّمَ﴾ش ئاماژەیەکی تێدایە بۆ بەرزکردنەوەی زانست و دەرخستنی پلە بەرزی‌یەکەی و، بۆ ئەوەش کە تەوەرەی جێنشینی‌یەکەیە.. هەروەها هێمایەکە بۆ ئەوەی کە ناوەکان "تەوقیفی"ن (واتە لە بناغەدا بۆ ناولێنراوەکان دانراون). ئەوەش کە پشتی ئەمە دەگرێت، بوونی پەیوەندی‌یە - زۆربەی جار - لە نێوان ناوەکان و ناولێنراوەکاندا.. هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە "موعجیزە" کاری ڕاستەوخۆی خوای گەورەیە، بە بێ بوونی هیچ ناوەندە هۆکارێك، بە پێچەوانەی وتەی ئەو فەیلەسووفانەی کە دەڵێن: "کارە دەراساکان کرداری ڕۆحە نائاساکانن".

﴿ءادَمَ﴾یش، واتە ئەو مرۆڤەی سەر زەوی کە خوای گەورە ویستی بیکاتە جێنشین و ناوی نا "ئادەم". جا ناوهێنانی ڕاشکاوی ئەو بە مەبەستی بەرزکردنەوەی و، ناو پێ دەرکردنی و، ئامادەکردنیەتی بە شێوەی خۆی.

﴿الأَسْمَاءَ﴾یش نیشانەکانی شتەکانە لە: سیفەتەکان و، تایبەتکاری‌یەکان و، ناوەکان. یاخود ئەو زمانانەی کە نەوەی ئادەم لە نێوان خۆیاندا دابەشیان کردوون. هەروەها بە بەڵگەی: ﴿عَرَضَهُمْ﴾ ئاماژەیەکیشی تێدایە بۆ ئەوەی کە "ناو" خودی "ناونراو"ەکەیە[1]. کە ئەوەش ڕێبازی ئەهلی سوننەتە.

﴿كُلَّهَا﴾ش، دەقە لەسەر هۆی جیابوونەوەکە و، خولگەی ئیعجازەکە.

ڕستەی ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنْبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلاءِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾یش، ئەوا:

---

(١) ئەگەر مەبەست لە ناوەکە خودی شتەکە بێت. (ب)

فجملةُ ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا﴾ أي صوَّرَه بفطرةٍ تضمّنَتْ مبادئَ أنواعِ الكمالاتِ، وخلَقَه باستعدادٍ زرَعَ فيه أنواعَ المعالي، وجهّزَه بالحواسِّ العشرِ وبوجدانٍ تتمثّلُ فيه الموجوداتُ، وأعدَّه بهذه الثلاثِ لتعلُّمِ حقائقِ الأشياءِ بأنواعِها، ثم علّمَه الأسماءَ كلَّها.

الواوُ فيها إشارةٌ إلى الجُمَلِ المطويّةِ تحت إيجازِه كما مرَّ.

و﴿عَلَّمَ﴾ فيه إشارةٌ إلى تنويهِ العلمِ ورِفعةِ درجتِه وأنّه هو المحورُ للخلافةِ..

وكذا رمزٌ إلى أنَّ الأسماءَ توقيفيةٌ. ويؤيِّدُه وجودُ المناسبةِ المرجِّحةِ للوضعِ - في الأغلبِ - بينَ الأسماءِ والمسمّياتِ..

وكذا إيماءٌ إلى أنَّ المعجزةَ فعلُ الله بلا واسطةٍ، خلافاً للفلاسفةِ الذين يقولون: "إنَّ الخوارقَ أفعالٌ للأرواحِ الخارقةِ".

و﴿ءَادَمَ﴾ أي الشخصَ الأرضيَّ الذي أرادَ اللهُ تعالى خلافتَه وسمّاه آدمَ. فالتصريحُ بالعَلَمِ لتنويهِه وتشهيرِه وإحضارِه بصورتِه.

و﴿الأَسْمَاءَ﴾ سماتُ الأشياءِ مِن الصفاتِ والخواصِّ والأسماءِ، أو اللغاتُ التي اقتسمَها بنو آدمَ. وفيه إيماءٌ بدليلِ ﴿عَرَضَهُمْ﴾ إلى أنَّ الاسمَ عينُ المسمَّى[1] كما عليه أهلُ السنةِ.

و﴿كُلَّهَا﴾ تنصيصٌ على منشأِ التميُّزِ ومدارِ الإعجازِ.

وجملةُ ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلَائِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلَاءِ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾..

---

(١) أي إذا أريد بالاسم ذات الشيء. (ب)

﴿ثُمَّ﴾ بەهۆی بوونی "ماوە" و خواستی شوێنەکە، ئاماژەیە بۆ: "هەروەها فەرمووی: ئەو لە ئێوە بەرێزتر و شایانترە بۆ جێنشینی".

﴿عَرَضَهُمْ﴾یش، واتە: هەموو جۆرەکانی شتانی بۆ فرۆشتن خستە پێش چاویان، بە وێنەی پێش چاو خستنی شمەك بۆ کڕیار و، نمایشی ریزەکانی سوپا لە بەردەم میرەکەیاندا. ئەمەش ئاماژەیەکی بۆ ئەوە تێدایە کە هەریەك لە "بوونەوەران" سامانێکە بۆ کەسێك هەستی پێ بکات، بە زانست دەیکڕێت و، بە ناوەکەی وەری دەگرێت و، بە بەرجەستەبوونی شێوەکەشی دەیێتە خاوەنی.

﴿هُمْ﴾یش کە بۆ کۆی ژیرەکانە، ئەوا نهێنیی ئەو دوو "تەغلیب"(زاڵکردن)ەی کە تیایدایە و، هی مەجازەکەشی ئەوەیە کە وشەی "عرض"(نمایش) هێمای بۆ دەکات[1]. چونکە ناردنی وێنەی دەستە و پێرەکانی بوونەوەران بەم وشەیە، کە پۆل پۆل بە پێش چاودا دێن، ئەندێشە بە وێنەی چەند تیرەیەکی ژیر و هۆشمەندیان وێنا دەکات کە بێن بۆ لایان.

سەبارەت بە ﴿عَلَى﴾ش، ئەوا ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو شتانەی پیشانی مەلائیکەت دەدرێن ئەو وێنانەن کە لە "لەوحی هەرە باڵا"دا کێشراون.

"تمت بوفاء"[2]

* * *

---

(١) چونکە "تەغلیب"ی موزەکەر بەسەر موئەنەسدا و، خاوەن ژیرییەکانی بەسەر غەیری ئەواندا داوە. "مەجاز"ەکەش لە گەڕانەوەی ﴿هُمْ﴾دایە بۆ جۆرەکانی بێ گیانەکان. (ت)

(٢) ئەم ڕستەیە بە خەتی خودی دانەر نووسراوە لەسەر ئەو نوسخەیەی کە ساڵی ١٩١٨ز چاپ کراوە و، دانەر پێداچوونەوەی تێدا کردووە.

فـ﴿ثُمَّ﴾ إشارةٌ - بسرِّ التراخي واقتضاءِ المقام - إلى:

"وقال: هو أكرمُ منكم وأحقُّ بالخلافةِ".

وأما ﴿عَرَضَهُمْ﴾ أي أظهرَ أنواعَ الأشياءَ مبسوطةً للبيعِ لأنظارِهم كعرضِ المتاعِ على المشترِي، وعرضِ الصفوفِ على الأميرِ. ففيه إشارةٌ إلى أنَّ الموجوداتِ مالٌ للمُدْرِكِ يشتريها بالعلمِ، ويأخذُها بالاسمِ، ويتملَّكُها بتمثُّلِ الصورةِ.

وأما ﴿هُمْ﴾ الدالُّ على الذكورِ العقلاءِ، فسِرُّ ما فيه من التغليبَين والمجازِ ما يرمِزُ إليه لفظُ العَرضِ[1]. إذ يُتخيَّلُ - مِن إرسالِه صورَ طوائفِ الموجوداتِ مارّةً صفاً صفاً على الأنظارِ - كونُها قبائلَ مِن العقلاءِ يجيئون إليهم.

وأما ﴿عَلَى﴾ فإيماءٌ إلى أنَّ ما يُعرضُ عليهم هي الصّورُ المرتسِمَةُ في اللوحِ الأعلَى.

"تمت بوفاء"[2]

* * *

(١) حيث هناك تغليب الذكور على الإناث، وتغليب العقلاء على غيرهم. أما المجاز فهو في رجوع "هم" إلى أنواع الجمادات. (ت)

(٢) كتبت هذه الجملة بخط المؤلف في النسخة المطبوعة سنة ١٩١٨.

باسمه سبحانه

## وتەیەك لە لایەن
## شەش کەسەوە لە قوتابیانی نوور

لە خزمەت مامۆستای بەڕێزماندا بەشێکی ئەو تەفسیرەمان خوێند کە ناوی "ئاماژەکانی ئیعجاز"ە و، چل ساڵ پێش ئێستا لە دەمی یەکەم جەنگی جیهانیدا، کاتێ کە لە هێڵەکانی پێشەوەی مەیدانی جەنگدا فەرزی جیهادی جێبەجێ دەکرد و، هەندێ جاریش لەسەر پشتی ئەسپەکەی، دایناوە.

ئێمە وێڕای کەم تێگەیشتنمان لە وردەکارییەکانی زمانی عەرەبی و نهێنییەکانی ڕەوانبێژی، کاتێ ئەم تەفسیرەمان لە خزمەت مامۆستای بەڕێزماندا دەخوێند هەستمان دەکرد تەفسیرێکی ناوازە و دەراسایە. بۆیە بە گونجاومان زانی کە ئەم چوار خاڵەی خوارەوە بخەینە ڕوو سەبارەت بەوەی کە لەم تەفسیرەدا تەنها "ئیعجازی هۆنین" لە نێوان ڕووەکانی تری ئیعجازی قورئاندا ڕوون کراوەتەوە:

خاڵی یەکەم:

"واتا"کانی قورئان "گشتگیر و هەمەکی و گشتی"ن.. لەبەر ئەوە، تەنها تایبەت بە کۆمەڵێکی دیاریکراو نین، یان تەنها واتایەکی جوزئی ناگرنەوە. بەڵکو پاکترین و خۆشترین خۆراك پێشکەش بە هەزاران توێژی جۆراوجۆری جیننی و ئادەمیزاد دەکەن و.. خواستەکانی هزر و "بیر"یان بۆ دەهێننە دی و، "ژیری"یان تێر دەکەن و، خۆراك بە "دڵان"یان دەبەخشن و، "گیانەکان"یشیان دەبووژێننەوە، هەریەکە و بەو شتەی کە شایانیەتی. چونکە لەبەر ئەوەی نیگای ئاسمانی و گوفتاری صەمەدانییە، ئەوا خواوەند گوفتاری خۆی تێدا ئاراستەی سەرجەم چینەکانی مرۆڤ کردووە کە لە پشتی

چەرخەکانەوە ڕیزیان بەستووە. ئیتر وەڵامی پرسیارەکانی هەموو دەستە و کۆمەڵەکانی مرۆڤ دەداتەوە و، پێداویستی‌یەکانیشیان جێبەجێ دەکات. ئەمەشت بەلاوە سەیر نەبێت، چونکە قورئانی پیرۆز گوفتاری پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە و، لە بەرزترین پلەکانی پەروەردگارێتیی ڕەهاوە سەرچاوەی گرتووە.

خاڵی دووهەم:

وشەکانی قورئان کە وەك سەدەف وان بۆ مرواریی بەنرخی واتا گشتی و هەمەلایەنگرەکانی و، لە سیفەتی گوفتاری ئەزەلی‌یەوە نازڵ بوون و، ئاراستەی هەموو چەرخەکان و سەرجەمی مرۆڤایەتی کراون.. بێ گومان ئەم وشانەی قورئان، "هەمەکی"ن و "کۆکەرەوە"ی سەرجەمی ئەو واتایانەن لە خۆیاندا.

ئێمە لەم تەفسیرەدا هەستمان بە بەشێك لە ئیعجازی بێگومان کرد لە هەموو پیتێك لە پیتەکانی ئەو قورئانە حەکیمەدا کە هەریەکەیان دە، یان سەد، یاخود هەزار، یان چەندین هەزار چاکە بەرهەم دەهێنێت، تەنانەت لە کاتە پیرۆزەکانی وەکو "شەوی قەدر"دا سی هەزار بەروبوومی بەهەشت دەگرن.

خاڵی سێ‌هەم:

ئەو جوانی و قەشەنگی‌یەی کە لە کۆی هەر شتێکدا دەبریسکێتەوە نابێ لە دانە بە دانەی بەشەکانیدا بە دوایدا بگەڕێیت، چونکە ئەگەر ئەو جوانی‌یە لەو بەشەدا نەبینرا، بە ناتەواوی دانانرێت. کەچی ئەو "ئیعجازی هۆنین"ەی کە لە هەموو سوورەت و ئایەتەکانی قورئاندا دەیبینین، کاتێ "ڕوخسار" و "چۆنێتی" و "وشە" و "ڕستە"کانی شی دەکەینەوە و لێی ورد دەبینەوە، بە شێوەیەکی دیکە ئەو ئیعجازە دەبینینەوە!

ئەم تەفسیرەش – کە بە عەرەبی دانراوە – یەکێك لە حەوت سەرچاوەکانی ئیعجازی ئەم کتێبە حەکیمە ڕوون دەکاتەوە، کە "ڕەوانیی دەراسایە لە وشەکانی"دا و، وردترینی لقەکانی و پەنهانترینی نهێنی‌یەکانی باس دەکات. کەواتە بێ هیچ گومانێك بایەخدانی "ئاماژەکانی ئیعجاز" بە هەموو یەکێکی پیتەکانی ئەو قورئانە مەزنەی کە هەر پیتێکی دە چاکە بەرهەم دەهێنێت، تەنانەت لە هەندێ کاتدا پاداشتەکەی بۆ سی هەزار بەرز دەبێتەوە، ئەم بایەخدانەی نەك هەر ئیسراف نی‌یە بەڵکو حەقیقەتیشە.

خاڵی چوارەم:

واتاکانی قورئانی حەکیم "جەمکاری"یەکی فراوان و "هەمەکێتی"یەکی گشتگیریان هەیە، چونکە لە گوفتاری ئەزەلییەوە دەرچووە و ئاراستەی سەرجەم چینەکانی مرۆڤ لە هەموو چەرخەکاندا کراوە..

لەبەر ئەوە، واتاکانی ناترنجێنە یەك مەسەلە، وەك هی گوفتاری مرۆڤ. بەڵکو بە وێنەی چاوێکی بینەر وان کە بۆ فراوانترین مەودا دەڕوانن. لەبەر ئەوەیە کە ئەم گوفتارە ئەزەلییە لە ناوەندی ڕوانینە گشتگیرەکەیدا هەموو کاتەکانی سەرجەم دەستە و کۆمەڵەکانی مرۆڤایەتی لەخۆ دەگرێت.

لەسەر بناغەی ئەمانەی سەرەوە دەڵێین:

هەموو ئەو ڕووانەی ڕاڤەی قورئان کە تەفسیرنووسان لە کتێبە لە ژمارە نەهاتووەکانیاندا هێناویانە و، ئەو واتایانەش کە ئەوان دەریان هێناوە و، قورئانی پیرۆز چ بە ڕاشکاوی و چ بە ئاماژە و چ بە هێما و چ بە ڕەچاو کردن لەخۆی گرتوون، هەر هەموویان ڕاستەوخۆ ئامانجن لەو کتێبە پیرۆزەدا، بە مەرجێ "زانستەکانی زمانی عەرەبی" دەست بە ڕوویانەوە نەنێن و، بەلای "ڕەوانبێژی"یەوە جوان بن و، زانستی "ئوسووڵی ئامانجەکانی شەریعەت"یش وەریان بگرێت.

تاهیری، زوبەیر، سونگور، زیاء، جەیلان، بایرام.

وبه ثقتي

## وتەیەکی ستایش

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيد الخلق محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

پاشان:

پێشەوای گەورەمان، مامۆستای تێکۆشەر و زانا "بەدیعوززەمانی نوورسی" لەو کاتەوە کە چەندین ئاسۆی زانست و عیرفان لە پێش چاویدا والآ کراوە و، خۆی لە شەپۆلی دەریای کتێبە ئازیزەکە (قورئانی پیرۆز) داوە، هەمیشە چاوەڕوانی ئەوە بووە - وەك مامۆستا خۆی لە "گەیاندنی مەبەست"(إفادة المـــرام)ەکەدا نووسیویەتی - کە لیژنەیەك لە زانایانی پسپۆڕ، هەریەکەیان لە لایەکی زانستدا، دائەزرێت و، چەندین لێکۆڵینەوە لە لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەم کتێبە پیرۆزەدا بکات، تاکو لە دەرەنجامی تەقالای زۆری ئەوان و، لێکۆڵینەوەی دوورودرێژیانەوە تەفسیرێکی گشتی و کۆکار بۆ قورئانی پیرۆز دروست ببێت کە بە دەم پێداویستییەکانی سەدەی بیستەمەوە بڕوات. ئەم چاوەڕوانییەی مامۆستاش هەتا کاتی سەرەتای یەکەم جەنگی جیهانی بەردەوام بوو..

بەڵام کاتێ کە بۆمبای جەنگ لە نێوان گەلی تورکیامان و گەلی ڕووسیادا تەقییەوە، مامۆستا هەندێ نائومێدیی لە هاتنەدیی ئەو هیوایەدا تووش بوو. بۆیە ناچار بوو لەو ئاماژانەی ئیعجازی قورئان بنووسێت کە لێی دەردەکەوتن. ئیتر دەستی کرد بە تۆمارکردن و، پۆلێن کردن و، ڕێکخستنی ئەو خاتیرانەی کە لە ڕاڤەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا دەهاتنە بیری. ئەوەبوو ئەم بەشەی تەفسیرەکە لەو خاتیرانەوە سەری هەڵدا.

خۆ هەرچەندە ئەم تەفسیرە زادەی بیری تەنیا کەسێکە، بەڵام لە بواری خۆیدا تاقانەیە و، هەتا ئێستا هیچ تەفسیرێك لە شێوەی ئەم دانەنراوە. چونکە ئەو چەشنە ئیعجازە پێش چاو دەخات کە لە هۆنینی ئایەتەکانی ئەم کتێبە پیرۆزەدا هەیە، ئەوەش بە ڕێگایەکی سەرسووڕهێنەری ئەوتۆ کە پێشتر لە کتێبە بەناوبانگەکانی تەفسیردا نەمان بینیوە و ڕێمان لێی نەکەوتووە، چەشنی تەفسیری "ئەبوو سعوود" و "تەفسیری ڕازی" و "بەیزاوی" و تەفسیری مامۆستای خوا لێخۆشبوو "شێخ تەنتاوی جەوهەری" کە درێژەی بەو تەفسیرە داوە و، زۆرێکی لە زانستە جۆراوجۆرەکانی ڕوون کردووەتەوە کە ئایەتە گەردوونییەکانی قورئان ئاماژەی بۆ دەکەن.

گەر هەر گومانێکت لەم قسەیەماندا هەیە، ئەوا فەرموو یەکەم جار چاو بەو شیکردنەوەیەیدا بگێڕە کە بۆ ئەم ئایەتەی کردووە:

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ ءامَنَّا بِاللهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ﴾..

یان هی ئایەتی:

﴿خَتَمَ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَعَلَى سَمْعِهِمْ وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ﴾.. هتد.

یاخود هی ئایەتی:

﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾..

یان هی هەر ئایەتێکی تر کە لەو تەفسیرەدا ڕاڤە کراوە..

ئنجا دوای ئەوە، هەمان ئەو ئایەتانە لە تەفسیرەکانی تردا بخوێنەرەوە، پاشان با ویژدانی سەربەست و ئازادت لە کۆتی دەمارگیری، بڕیار بدات.

بە پوختی:

دەستەواژەکانی ئەم تەفسیرە سازگاری و، شیرینی و، تەڕ و پاراوییەکی ناوازە و، وردەکارییەکی یەکجار نائاساییان سەبارەت بە شیکردنەوەی ئایەتەکانی "سرووش"ی نازلکراو تێدایە.

ئەم تەفسیرە ڕووی پەیوەندیی ئایەتەکان لەگەڵ یەکتردا و، هی ڕستەکان و هاوئاهەنگییان و، چۆنێتیی تەواوکاری و بەدەم یەکەوە چوونی شێوەی داڕشتن و پێکهاتنی ڕستە و پیتەکان لە دەوری واتای مەبەستدا، ڕوون دەکاتەوە. لەمەشدا پشتی بە

وردترینی دەستوورەکانی زانستی ڕەوانبێژی و، بنەماکانی نەحوو و سەرف و، یاساکانی مەنتیق و، دەستوورەکانی زانستی ئوسوولی دین و، ئەو زانستە جۆراوجۆرانەی تریش بەستووە کە پەیوەندییان پێیەوە هەیە. تەنانەت لە وردترین پەیوەندی و بۆنەی ڕەوانبێژی دەدوێت، کە بەو مایکرۆسکۆپە نەبێت لە مێشکی مرۆڤدا دانراوە، بە شێوەی ئاسایی نادۆزرێتەوە!

لە هەمووی سەرسووڕهێنەرتر ئەوەیە کە ئەو وردەکارییە لە ڕادەبەدەر و توێژینەوە قوولانەی کاتێ ئەنجام داوە کە لێزمەی گوللەبارانی تفەنگەکانی سوپای ڕووس لە هەر چوار لاوە بەسەر دانەردا دەباری. ئەوەبوو مامۆستا لە لایەکەوە تێدەکۆشا و تفەنگەکەی بەرەو سنگی دوژمنان دەتەقاند، لە لایەکی دیکەوە بۆمبای لەتۆمیی ئیعجازی قورئانی لەناو کارگەی مێشکی خۆیدا دادەنا تاکو بینای کوفر و گومڕایی پێ برووخێنێت.

سبحان الله! چ زیرەکییەکی خوابەخشی نائاسایی هەیە کە بە قارەمانییەکی سەرسووڕهێنەر و دڵ دامەزراوییەکی زیاد لە پێویست پڕچەك و تەیار کراوە! چونکە ئەو کاتی تەنگانە و هەڵوێستە سامناکە هەرگیز دانەری نەحەپەساند و، هزری وردی ئەویشی سەرسام نەکرد و، لە گەڕان بەناو لایەنەکانی ئیعجازی قورئانی پیرۆزدا نەیترازاند.

وا ئێستا ئێمەی قوتابیانی "پەیامەکانی نوور" خۆشحاڵین بەوەی کە ئەم کتێبە دەخەینە بەردەستی کەسە مرۆڤدۆستەکان، تاکو بە شێوەیەکی بەدەر لە ئامانجەکان و، دوور لە ئارەزووەکان و دەمارگیریی نەخوازراو، لێکۆڵینەوەی بۆ بکرێت.

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَنْ كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ (ق: ٣٧).

واللهَ أسألُ أن ينفعَ به الناسَ ويهديَهم سواءَ السبيل.

صەدرەدین یوکسەلی بەدلیسی

زولحیجەی ١٣٧٨ ك

# سەبارەت بە قورئان وتوویانە

به پێنووسی

دکتۆر عیمادەدین خەلیل

---

"دکتۆر عیمادەدین خەلیل" پرۆفیسۆری مێـژووی ئیسلام و ڕێبازەکانی توێژینەوەیە لە زانکۆی مووسڵ. ساڵی ١٩٣٩ز لە شاری مووسڵ لە دایك بووە. هەر لەوێ و لە شارەکانی بەغدا و قاهیرە درێژەی بە خوێندنی داوە، هەتا لە ساڵی ١٩٦٨زدا بڕوانامەی دکتۆرای لە مێژووی ئیسلامدا لە زانکۆی "عەین شەمس" بەدەست هێناوە. لە گەڵێ زانکۆی عێراق و وڵاتە ئیسلامییەکاندا وانەی وتووەتەوە و، بەشداریی چەندین کۆنگرە و کۆنفرانسی زانستی و فەرهەنگیی لە چەندین وڵاتی جیهاندا کردووە. پتر لە چل کتێبی داناوە لە بوارە جۆراوجۆرەکانی: مێژوو؛ فەلسەفەی مێژوو؛ ڕێبازەکانی توێژینەوە؛ هزر و ئەدەبی ئیسلامی، لە ڕووەکانی تیۆر و ڕەخنە و داهێناندا.

# پێشەکی وەرگێڕ

بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان.. بارانی درووود بۆ سەر گیانی پێغەمبەری سەروەرمان و کەسوکار و هاوەڵانی.

ئەم پاشکۆیە بەندێکە بە ناونیشانی: (قالوا عن القرآن) لە کتێبی (قالوا عن الإسلام)ی مامۆستای بەتوانا دکتۆر عیمادەدین خەلیل، کە وەك پاشکۆیەك پێشکەشی کردووە بە کتێبی (ئاماژەکانی ئیعجاز).

ناوەرۆکی ئەم پاشکۆیە بریتی‌یە لە هەڵبژاردەیەکی جۆراوجۆر لە وتەی کەسانێکی زانا و پسپۆڕ لە بوارە جیاجیاکاندا سەبارەت بە "قورئانی پیرۆز".

ناسراویی هەر یەك لەو زانا و کەسایەتی‌یە بەڕێزانەش لە پسپۆڕیی خۆیاندا و، جێدەستیان لە توێژینەوە تایبەتی‌یەکانیاندا، شایەتیدانی ئەوانی سەبارەت بە "قورئان" بەرز کردووەتەوە بۆ ئاستی متمانە پێ بوون لە لایەن هاوڕەگەز و هاوئایینەکانی خۆیانەوە.

ئەو کەسایەتی‌یانە لە بنەڕەتدا سەر بە ئایینەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوان و، لە کیشوەرەکانی ئاسیا و ئەفریقیا و ئەورووپا و ئەمریکا هەڵبژێرراون، زۆربەشیان بەریتانی و فەڕەنسین و، بە جۆرێکی گشتی خەڵکی ئەم وڵاتانەن:

میسر؛ بەریتانیا؛ ئەمریکا؛ فەڕەنسا؛ لوبنان؛ هیند؛ بەلجیکا؛ پۆڵۆنیا؛ عێراق؛ ئیتانیا؛ نەمسا؛ ئەڵمانیا.

دەبێ ئەوەش بڵێم كە:

قورئانی پیرۆز پێویستی بە شایەتیدانی كەس نییە. بەڵام بەپێی ئەو دەستوورە بەناوبانگەی كە دەڵێت: "والفضلُ ما شَهِدَتْ به الأعداءُ"، هەروەها بۆ تەسدیقی ئایەتی پیرۆزی: ﴿سَنُرِيهِمْ ءايَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقّ﴾ (فصلت: ٥٣) ئەو جۆرە وتانە پێش چاو دەخرێن.

شایانی باسە هەندێ لەو زانا و كەسایەتییانە، لە دوای لێكۆڵینەوەكانیان لەبارەی قورئانی پیرۆزەوە، شەرەفمەندی هەڵبژاردنی "ئیسلام" بوون، وەك بەرنامە و ئایین و رێباز بۆ ژیانی خۆیان.

لە سەرەتای ناوی ئەو كەسایەتییانەوە، لە پەراوێزدا كورتەیەك لە ژیانی هەریەكەیان باس كراوە. ئنجا وتەیەك یان زیاتر لە وتەكانی هێنراوە، پاشان لە پەراوێزدا سەرچاوەی وتەكەی دیاری كراوە.

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

## خەلیل ئەحمەد[١]

هەندێ لە وتەکانی:

١- "ئەم پێغەمبەرە هەتاهەتایە پەیوەستە بەو ئیعجازەوە کە مەسیح - دروودی لەسەر بێت - لەم وتەیەیدا هەواڵی لەبارەیەوە داوە: (هەواڵی شتی داهاتووتان دەداتێ). لەو ئیعجازەش "قورئانی پیرۆز"ە کە هەتا دنیا بمێنێت موعجیزەی ئەم پێغەمبەرەیە و دەمێنێت.

قورئان پێش زانستی سەردەم کەوتووە لە هەموو بوارەکانیدا لە: پزیشکی، گەردووناسی، جوگرافیا، یاسا، کۆمەڵناسی، مێژوو.. هتد. لەم ڕۆژگارەماندا زانست توانیویەتی ئەو شتانە ببینێت کە قورئان پێشی کەوتووە لە ناساندن و ڕوونکردنەوەیدا"[٢].

٢ - "بە دڵنیاییەوە لەو بڕوایەدام کە ئەگەر من مرۆڤێکی "وجوودی" بوومایە، کە باوەڕی بە هیچ پەیامێکی ئاسمانی نییە.. ئنجا خەڵکانێك بهاتنایە و هەواڵی ئەو شتانەیان پێ بدامایە کە قورئان تیایاندا پێش زانستی نوێ کەوتووە، ئەوا باوەڕم بە پەروەردگاری خاوەن بەرزی و دەسەڵات و، بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی دەهێنا و، هیچ کەسێکم بە هاوبەشی دانەئەنا..."[٣].

٣ - لەم تاریکییە چڕوپڕەدا - ئەی مرۆڤی مەسیحی! - قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، تاکو خوای گەورەت پێ بناسێنێت..."[٤].

---

(١) "ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد" قەشە و موبەششیرێکی خەڵکی ئەسکەندەرییەیە. ساڵی ١٩١٩ز لە دایك بووە. هەڵگری چەندین بڕوانامەی باڵایە لە زانستی لاهووتدا، لە کۆلیجی لاهووتی میسر و زانکۆی "پرینستن"ی ئەمریکا لاهووتی خوێندووە. ماوەیەکیش لە کۆلیجی لاهووتی "ئەسیووت" مامۆستا بووە، ساڵی ١٩٥٤ز بە سکرتێری گشتیی هەناردەی تەبشیریی سویسرا ڕەوانەی ئەسوان کراوە و، ئەرکی سەرەکیی ئەو لەوێ بەگاورکردنی خەڵك و کارکردن بووە لە دژی ئیسلام. بەڵام قووڵبوونەوە و لێکۆڵینەوەی لە ئیسلام بەرەو باوەڕهێنان بەم ئایینە ڕێنماییان کرد و، لە ساڵی ١٩٥٩زدا بە شێوەی ڕەسمی موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند. گەلێ کتێبی داناوە، دیارترینیان ئەمانەیە: محمد في التوراة والإنجيل والقرآن؛ المستشرقون والمبشرون في العالم العربي والإسلامي ؛ تأريخ بني إسرائيل.

(٢) محمد في التوراة والإنجيل والقرآن: ٤٧-٤٨.

(٣) هەمان سەرچاوە: ٤٨.

(٤) هەمان سەرچاوە: ١٧٢.

٤ - موسڵمان مافی خۆیەتی شانازی بە قورئانەکەیەوە بکات، چونکە قورئان وەکو ئاو وایە ژیانی بۆ هەموو ئەوانە تێدایە کە لێی نۆش دەکەن"[1].

## ئارنۆڵد[2]

لە وتەکانی:

"ئێمە تەنانەت لەناو مەسیحییەکانیشدا کەسانی وەك "ئالڤار"ی ئیسپانی دەبینین کە بە دەمارگیریی لە دژی ئیسلام ناسراوە، کەچی بڕیاری وایە کە قورئان لەم جۆرە شێوازە ڕەوان و جوانەدا داڕێژراوە کە تەنانەت مەسیحییەکانیش نەیانتوانی نەیخوێننەوە و سەرسوورمانی خۆیانی لە بارەوە دەرنەبڕن"[3]!

## ئێرڤینگ[4]

هەندێ لە وتەکانی:

١ - "ڕۆژگارێك بووە کە "تەورات" ڕابەری مرۆڤ و بناغەی ڕەوشتەکانی بووە. ئنجا کاتێ کە "مەسیح" هات - دروودی لەسەر بێت - مەسیحییەکان شوێن

(١) هەمان سەرچاوە: ٣٢.

(٢) "سێر تۆماس ئارنۆڵد Thomas Walker Arnold" (١٨٦٤-١٩٣٠ز) یەکێکە لە گەورە خۆرهەڵاتناسانی بەریتانیا و، خاوەنی بیرۆکەی کتێبی (کەلەپووری ئیسلام)ە کە چەندین کەسی بەناوبانگی توێژەران و خۆرهەڵاتناسانی خۆرئاوا بەشداریيان لە نووسینیدا کردووە و، تۆماس ئارنۆڵد بۆ خۆیشی سەرپەرشتیاری ڕێکخستن و دەرکردنی بووە. لە زانکۆی کەمبرج خوێندوویەتی. چەند ساڵێکی درێژخایەن مامۆستا بووە لە زانکۆی ئیسلامیی "عەلی گەرە" لە هیندستان. خۆرهەڵاتناسی ناسراوی بەریتانی "گیب" بەم جۆرە وەسفی تۆماس ئارنۆڵد دەکات و دەڵێت: "لە نووسینەکانیدا زانایەکی وردەکارە. ماوەیەکی زۆر لە وڵاتی هیند ماوەتەوە و ئاشنایەتیی لەگەڵ موسڵمانانیدا بووە و هاوسۆزە لەگەڵ ئیسلامدا. هەموو ئەمانەش شایەتییەکانی ئەو لە سەررووی گومانەکانەوە ڕادەگرن". ئارنۆڵد بە هۆی کتێبێکیەوە پتر ناوبانگی دەرکرد کە ناوی "الدعوة إلى الإسلام"ە و، بۆ چەندین زمانی جۆراوجۆر وەرگێڕراوە. هەروەها کتێبی "الخلافة". جگە لەوانەش گەلێ کتێبی بەنرخی لەبارەی "هونەری ئیسلامی"یەوە بڵاوکردووەتەوە.

(٣) الدعوة إلى الإسلام: ١٦٢.

(٤) "واشینگتن ئێرڤینگ Washington Erving" خۆرهەڵاتناسێکی ئەمریکییە. بایەخێکی گەورەی داوە بە مێژووی موسڵمانان لە ئەندەلوس. ئەمەش ناوی هەندێکە لە بەرهەمەکانی: "سيرة النبي العربي" لە کۆتاییەکەیدا دەستوورەکانی ئیسلام و سەرچاوە ئایینییەکانی ئەو دەستوورانەی نووسیوە. هەروەها "فتح غرناطة" و جگە لەمانەش.

ڕێنماییەکانی ئینجیل کەوتن. پاشان "قورئان" جێی هەردووکیانی گرتەوە. چونکە قورئان لەچاو دوو کتێبەکەی دی گشتگیرتر و ڕوونکەرەوەتر بوو. هەروەك قورئان هەموو ئەو دەسکاری و ئاڵوگۆڕانەشی ڕاست کردووەتەوە کە بەسەر ئەو دوو کتێبەدا هێنراون.

قورئان هەموو شتێکی لەخۆ گرتووە و سەرجەم یاساکانی تێدایە، چونکە دواهەمین کتێبی ئاسمانییە"[1].

٢ - "قورئان بانگەواز بۆ میهرەبانی و خاوێنی و چەند ڕێبازێکی ڕەوشتیی بڵند دەکات"[2].

## برووز[3]

هەندێ لە وتەکانی:

١ - "بەرەو پێش چوون و دەسەڵات پەیدا کردنی زیاتری مرۆڤ بەسەر هێزەکانی سروشتدا هیچ شتێکی تێدا نی یە کە لەگەڵ ئاییندا تەبا نەبێت! ئەوەتا ئایەتێك لە قورئاندا هەیە دەکرێ ئەوەی لێ هەڵێنجرێ کە یەکێك لە ئامانجەکانی بەدیهێنانی کۆمەڵەی خۆر سەرنج ڕاکێشانی مرۆڤە تاکو لە گەردووناسی بکۆڵێتەوە و لە ژیانی خۆیدا ئەو زانستە بەکار بهێنێت:

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ﴾ (يونس: ٥).

قورئان گەلێ جار ئاماژە بۆ گوێڕایەڵکردنی سروشت دەکات بۆ مرۆڤ، لەو ڕووەوە کە یەکێکە لەو سێ نیشانانەی کە دەبنە هۆی شوکرانەبژێری و ئیمان:

---

(١) حياة محمد: ٧٢.

(٢) هەمان سەرچاوە: ٣٠٤.

(٣) "دکتۆر میلەر برووز Millar Burrows" سەرۆکی بەشی زمان و ئادابی زمانەکانی خۆرهەڵاتی نزیك و مامۆستای فیقهی ئایینی ئینجیل بووە لە زانکۆی "ییل". هەروەك لە زانکۆی "براون" مامۆستایەتیی کردووە و ماوەیەکیش لە زانکۆی ئەمریکیی بەیرووتیش مامۆستای میوان بووە و، لە قودسیش بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئەمریکی بووە بۆ توێژینەوەکانی خۆرهەڵات. لە نێوان ساڵەکانی (١٩٣١-١٩٤١)دا چەندین کتێبی بڵاو کردووەتەوە.

﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ الْفُلْكِ وَالأَنْعَامِ مَا تَرْكَبُونَ * لِتَسْتَوُوا عَلَى ظُهُورِهِ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا اسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ﴾ (الزخرف: ١٢-١٣).

قورئان نەك تەنها ملکەچکردنی زیندەوەری بۆ مرۆڤ باس کردووە، بەڵکو باسی لە رامکردنی کەشتیش کردووە بۆی. جا ئەگەر حوشتر و کەشتی لە نیعمەتە مەزنەکانی خوای گەورە بن، ئەی ئایا ئەو نیعمەتە زیاتر شەمەندەفەر و ئوتۆمبێل و فڕۆکەش ناگرێتەوە"[1]؟

٢ - "مەزنترین دەرەنجامەکانی زانست دەگونجێ بۆ ئامانجەکانی وێرانکاری یاخود بنیاتنان بەکاربهێنرێت. لەوانەشە مەبەست ئەمە بێت لەوەی کە لە قورئاندا بە تایبەتی لە بەکارهێنانی ئاسندا هاتووە:

﴿وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾. (الحديد: ٢٥).

ئێستا باشترین نموونەی ئەمە بەکارهێنانی چالاکیی ئەتۆمییە کە لەبەر پێداویستییەکی جەنگی توێژینەوەکان تیایدا چالاك کراوە"[2].

## بلاشێر[3]

هەندێ لە وتەکانی:

١ - "لە دوای خوا، فەزڵی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففان بوو، کە پێش ساڵی (٣٥ك/٦٥٥ز)[4] بەشداری کرد لە دوورخستنەوەی ئەو مەترسییانەی کە لە هەبوونی

---

(١) الثقافة الإسلامية: ٥١.

(٢) هەمان سەرچاوە: ٥٤.

(٣)"ریژی بلاشێر Regis Blachere" لە نزیکی پاریس لەدایك بووە. قۆناغی دواناوەندیی لە "دارولبەیزا"ی مەغریب خوێندووە. ساڵی (١٩٢٢ز) بە زمانی عەرەبی کۆلێژی ئادابی لە "جەزائیر" تەواو کردووە. کراوە بە مامۆستا لە پەیمانگای "مەولای یوسف" لە شاری "ڕیبات". پاشان دەست نیشان کراوە بە بەڕێوەبەری پەیمانگای لێکۆڵینەوە باڵاکانی مەغریب لە شاری "ڕیبات" (١٩٢٤-١٩٣٥ز). خوێندنگەی زمانەکانی خۆرهەڵات لە پاریس بانگهێشتی کردووە بۆ مامۆستای کورسیی ئەدەبی عەرەبی (١٩٣٥-١٩٥١ز). ساڵی (١٩٣٦ز) بڕوانامەی دکتۆرای هێناوە. بووە بە مامۆستای وانەبێژ لە "سۆربۆن" (١٩٣٨ز) و، سەرپەرشتیاری گۆڤاری "المعرفة" بووە کە بە هەردوو زمانی (عەرەبی و فەرەنسی) لە پاریس بڵاوبووەتەوە. ئەمەش ناوی هەندێکە لە بەرهەمەکانی: "تأريخ الأدب العربي" پاریس ١٩٥٢ز، وەرگێڕانێکی نوێ بۆ قورئانی پیرۆز لە سێ بەرگدا (پاریس ١٩٤٧-١٩٥٢ز).

(٤) کە ساڵی شەهید بوونیەتی. (وەرگێڕ)

چەند نوسخەیەکی قورئاندا لە ئارادا بوون. موسڵمانان بە درێژایی ڕۆژگارەکانی دوای ئەو قەرزاری چاکەی ئەون لە جێگیرکردنی دەقی کتێبە نازڵ کراوەکەیان"[1].

٢ - "بێگومان ئەگەر شتێك هەبێت "وەرگێڕان" دەستەوسان بێت لە دەربڕینیدا بریتییە لە: ئیعجازی ڕەوانکاری و، وشەیی و، زایەڵەی ڕەزمی ئەو ئایەتانەی کە لەو کاتەدا نازڵ بوون..

بێگومان دوژمنانی محەممەد - دروودی لەسەر بێت - هەڵیان کرد لەوەدا کە نەیانویست جگە لە چەند گۆرانییەکی سیحراوی و، نوشتە و جادوو، شتێکی دیکە لەمەدا ببینن.

خۆ هەرچەندە ئێمە لە ڕێی لێکۆڵینەوە و بەدواداگەڕاندا زانیاریمان لە بارەی هەواڵدانی کاهینەکانەوە هەیە، ئەوا دەتوانین لەگەڵ ئەوەدا لەو بڕوایەدا بین کە ئەوە ڕایەکی بێ سەرە و بەرە و پڕوپووچە، چونکە ئەو ئایەتانەی کە پێغەمبەر - دروودی لەسەر بێت - لە سەرەتای ئەم سوورەتانەدا دووپاتی دەکردنەوە، هەڵمەت و، درەخشانی و، شکۆمەندییەکی ئەوتۆیان تێدایە کە قسەی زمانپاراوەکانی مرۆڤ زۆر لە دوای خۆیان بەجێ دەهێڵن کە دەتوانین لە ڕێی ئەو دەقانەوە گەیشتوونەتە دەستمان بیانهێنین (و بەراوردیان بکەین) [2].

٣- "قورئان نەك هەر تەنها بە ناوەرۆك و ڕێنماییەکانی موعجیزەیە، بەڵکو بە هەمان جۆر، دەکرێ بوترێ پێش هەموو شتێك شاکارێکی ئەدەبیی ڕەنگینە و، لە سەرووی هەموو ئەو شاکارانەوەیە کە مرۆڤایەتی دانی پێدا ناوە و ڕێزی بۆ داناوە..

خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب - خوای لێ ڕازی بێت - لە سەرەتاوە نەیارێکی سەرسەختی ئایینە نوێکە بوو. بەڵام دوای بیستنی بڕگەیەکی قورئان بوو بە توندوتۆڵترینی یارمەتیدەرانی ئایینەکە..

---

(١) تأريخ الأدب العربي: ٢/٢٢. لە ڕاستیدا ئەو ئەرکە خەلیفەی یەکەم حەزرەتی ئەبووبەکری صەدیق - خوای لێ ڕازی بێت - ڕایپەڕاندووە، بەڵام حەزرەتی عوسمان - خوای لێ ڕازی بێت - چەند نوسخەیەکی لەبەر نوسخە سەرەکییەکەی سەردەمی ئەبووبەکر گرتەوە و ناردنی بۆ مەڵبەندە گەورەکانی ئەو ڕۆژگارەی جیهانی ئیسلامی.

(٢) هەمان سەرچاوە: ٢/٣١.

دواتر قسە دەکەین لەسەر ڕادەی شەیدابوونی بە دەقی قورئان دوای خوێندنەوەی لە لایەن ئیماندارانەوە"[(١)].

٤ - "ئیعجاز، ئەو موعجیزە پشت ڕاستکەرەوەیەی بانگەوازی محەممەدە ﷺ کە لە قسە دنیاییەکانیدا بەرەو ئاستی شکۆی قورئان بەرز نەبووەتەوە"[(٢)].

٥ - "لە هەموو ئەو بوارانەوە کە لێیانەوە ڕوانیومانە، لە زانستەکانی زمان و فەرهەنگ و ڕەوانکاری، قورئان وورووژاندنێکی هێنایە کایەوە و چەندین چالاکیی ئەوتۆی ژیاندەوە کە پتر لە بارودۆخی شارستانی دەچێت هەتا ئەوەی داخوازییەکانی هێنانەکایەی شەریعەتی ئیسلام بێت. گەلێ بواری تر هەن کە قورئان وەك هۆکارێکی بنەڕەتی تیایاندا ئامادەیە. کاریگەریی قورئانیش لەمانەدا تەنها کاریگەریی توخمێکی بێدارکەرەوە نییە، بەڵکو کاریگەریی توخمێکی داهێنەرە کە بە چۆنێتییە خۆییەکەی پتر هێزەکەی توندوتۆڵ و دامەزراو دەبێت"[(٣)].

## بوازار[(٤)]

هەندێ لە وتەکانی:

١ - "لە دەمی پێناسەی دەقی پیرۆز لە ئیسلامدا، پێویستە باسی دوو توخم بکرێت. یەکەمیان ئەوەیە کە کتێبێکی نازڵکراوی ئەزەلییە و نامەخلووقە. دووهەم کە "قورئان"ە، واتە گوفتارێکی زیندووە لە دڵی کۆمەڵدا! هەروەها ئەو ناوەندەی نێوان خوا و مرۆڤە کە هەموو کارێکی "ڕێکخستنی قەشەیی" بێ بایەخ دەکات، چونکە وەك

(١) القرآن الكريم: ١٠٢ - ١٠٣

(٢) هەمان سەرچاوە: ١٠٤.

(٣) هەمان سەرچاوە: ١٠٤-١٠٥.

(٤) "مارسیل بوازار Marcel Boisard" بیریار و مافناسێکی فەرەنسیی هاوچەرخە. بایەخێکی گەورەی بە مەسەلەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و مافی مرۆڤ داوە. گەلێ توێژینەوەی نووسیوە بۆ ئەو کۆنگرە و گۆڤارە دەورییانەی کە بایەخ بەم دوو مەسەلەیە دەدەن. کتێبەکەی بە ناوی "إنسانية الإسلام" کە لە هەمان بایەخدانەوە سەری هەڵداوە، نیشانەیەکی ڕووناکی بەخشە لە بواری لێکۆڵینەوەکانی خۆرئاوادا بۆ ئیسلام، ئەوەش لەبەر تایبەتمەندییەکانی کە بریتین لە: بابەتی بوون و، قووڵی و، پشت بەستنی توندوتۆڵی بەو سەرچاوانەی کە لایەنگیری و هەوا و ئارەزوو دیلیان ناکەن. جگە لە نووسینەکانی تری لە بارەی ئیسلامەوە.

مەرجەعێکی بنەڕەتی جێی ڕازی بوونە و، سەرچاوەیەکی بناغەیی ئیلهام بەخشینە. هەتا ئەم ڕۆژگارانەی خۆیشمان نموونەیەکی بەرزی ئەدەبی عەرەبی‌یە کە مەحاڵە لاسایی بکرێتەوە. نەك هەر تەنها ئەوەی کە نموونەیەکی پێشەنگی کاری ئەدەبی‌یە بۆ ئەوەی چاوی لێ بکرێت، بەڵکو سەرچاوەی ئەو ئەدەبی عەرەبی و ئەدەبی ئیسلامی‌یەشە کە قورئان دایهێنا، چونکە ئەو ئایینەی کە ئەم قورئانەی بە "وەحی" نارد، بناغەی گەلێ ڕێبازی فیکری‌یە کە دواتر ئەم کتێبە ناوبانگی پێ دەرکرد"[١].

٢ - "قورئان بە ڕەتکردنەوەی جیاکاری لە نێوان شتی ڕۆحی و شتی زەمەنیدا، سەلماندی کە لە هەمان کاتدا ئایینە و سیستەمی کۆمەڵایەتیشە. بەڵگەنەویستە کە قورئان و ئەو ڕێگایەش کە پێی وابوو دەتوانرێت تیایدا بەکار بهێنرێت، بە قووڵی مۆرکی خۆیان لەسەر کۆمەڵگا بەجێ هێشت"[٢].

٣ - "قورئان تەنها چاکسازیی ڕەوشتەکانی عەرەبی جاهیلییەتی تێدا حساب نەکراوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەو شەریعەتە نەمر و کاملەی لە خۆدا هەڵگرتووە کە پڕاوپڕی ڕاستی‌یە مرۆییەکان و پێداویستی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکانی هەموو کات و سەردەمێکن"[٣]!

٤ - "قورئان کەش و هەوای ژیانێك دروست دەکات کە لە ئەنجامدا هاوئاوازی‌یەك لە نێوان گوزارشتە زیهنی‌یەکاندا و، یەکسانی‌یەك لە نێوان شتە ماقووڵەکان و سیستەمە کۆمەڵایەتی‌یەکاندا پێکدەهێنێت، زۆر زیاتر لەوەی کە لە کارە سیاسی‌یەکان و نیشانە ئایدۆلۆجی‌یەکان چاوەڕوان دەکرێت کە دەدرێنە پاڵ دەوڵەتەکان.

سەبارەت بە پلەی کاریگەریی هەرە گەورەی قورئان هەر ئەوە بەس نی‌یە کە لەبارەی کاریگەریی لەسەر زەینی ئیسلامیی هاوچەرخ باس دەکرێت، چونکە قورئان هێشتا هەر سەرچاوەی سەرەکیی ئیلهامی تاك و کۆمەڵە، هەروەها دوا پەنا و داڵدەی موسڵمانانە"[٤].

---

(١) إنسانية الإسلام: ٥٢-٥٣.

(٢) هەمان سەرچاوە: ٢٠٦-٢٠٧.

(٣) هەمان سەرچاوە: ١٠٩.

(٤) هەمان سەرچاوە: ٣٤٣.

٥ - "بێ گومان ئەو ئامرازانەی كە قورئان دایبینیان دەكات، دەتوانن كۆمەڵگایەكی نوێ بنیات بنێن"[١].

## پۆتەر[٢]

هەندێ لە وتەكانی:

١ - "كاتێ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزم تەواو كرد، نوقمی هەستێك بووم بەوەی كە تەنها قورئان ئەو "حەق"ەیە كە وەڵامە شیفابەخشەكانی لەخۆ گرتووە لە بارەی باسەكانی "بەدیهاتن" و جگە لەوانیش. هەروەها بە ڕێگایەكی مەنتیقی ڕووداوەكانمان پێشكەش دەكات كە دەبینین پێچەوانەی هەندێكە لەوانەی كە لە كتێبە ئایینییەكانی تردا هاتووە! بەڵام قورئان لەسەر ڕەوتێكی ڕەنگین و شێوازێكی گومان بڕ لێیان دەدوێت كە هیچ گومانێك لەوەدا ناهێڵێتەوە كە بە دڵنیاییەوە ئەم گوفتارە لە لایەن خوای گەورەوەیە"[٣].

٢- "هەر تەنها ناوەڕۆكە ئیلاهییەكەی قورئانی پیرۆز بەرپرسە لە ڕاپەڕاندنی مرۆڤ و، ڕێنمایی كردنی بۆ زانین و ناسینی "بەدیهاتن" كە زانینێكە هەموو سەردەمێك داخوازیەتی"[٤].

٣- "محەممەد ﷺ ئەو پیاوە نەخوێندەوارەی كە لە ژینگەیەكی جاهیلیدا پێگەیشتووە، چۆن توانیی ئەو موعجیزاتانەی گەردوون بزانێت كە قورئان وەسفی كردوون و، زانستی نوێ هەتا ئەمڕۆش هەوڵی ئەوە دەدات كە پەردەیان لەسەر لابدات؟ كەواتە دەبێ ئەم گوفتارە گوفتاری خوای گەورە بێت"[٥]!

---

(١) هەمان سەرچاوە: ٣٤٥.

(٢)"دێبرا پۆتەر Deborah Potter" ئافرەتێكی خەڵكی ئەمریكایە. ساڵی (١٩٥٤ز) لە شاری ترافێرزی ویلایەتی میشیگن لە دایك بووە. لە بەشی ڕۆژنامەوانیی زانكۆی میشیگن دەرچووە. ساڵی (١٩٨٠ز) و دوای هاوسەرگیریی لەگەڵ یەكێك لە بانگخوازانی ئیسلام لە ئەمریكا و لە ئەنجامی قەناعەتێكی قووڵ بەوەی كە جگە لە ئیسلام هیچ ئایینێك ناتوانێت خواستەكانی مرۆڤ (نێرینە بێت یان مێینە) بهێنێتەدی، موسڵمان بووە.

(٣) رجال ونساء أسلموا: ٨/١٠٠.

(٤) هەمان سەرچاوە: ١١٣/٨.

(٥) هەمان سەرچاوە: ١٠٩/٨.

## بۆکای(١)

هەندێ لە وتەکانی:

١ - "یەکەم شت لێکۆڵینەوەم لە قورئانی پیرۆزدا کرد، بێ ئەوەی فکرێکی پێشینەم لە بارەیەوە هەبێت و، بە رێگایەکی بابەتییانەی تەواو لە دووی ئەوە دەگەڕام کە بزانم دەقی قورئان هەتا چەندە لەگەڵ دەرهاویشتەکانی زانستی نوێدا یەك دەگرنەوە. من پێش ئەم لێکۆڵینەوەیە و لە رێی وەرگێڕانەکانەوە دەمزانی کە قورئان چەند جۆرێکی زۆری دیاردە سروشتییەکان باس دەکات. بەڵام زانیارییەکانم لەم رووەوە کەم و کورت بوون. بەڵام بە فەزڵی لێکۆڵینەوەیەکی وریایانە بۆ دەقە عەرەبییەکە، توانیم لیستێك لەم رووەوە دەربهێنم و، دوای لێبوونەوەم لەو کارەم، تێگەیشتم کە قورئان هیچ قسەیەکی تێدا نییە کە لە رووی "زانستی نوێ"وە رەخنە هەڵبگرێت!

هەر بە هەمان لێکۆڵینەوەی بابەتییانە، هەمان پشکنینم بۆ پەیمانی کۆن و ئینجیلەکان کرد. سەبارەت بە پەیمانی کۆن (تەورات) لە یەکەم کتێبی بەولاوە (سیفری تەکوین) پێویستی بە رۆشتنی زیاتر نەکرد، چونکە چەندین قسەی ئەوتۆم تێدا بینی کە ناتوانرێت لەگەڵ زۆربەی دەرەنجامە جێگیرەکانی زانستی سەردەمدا یەك بخرێن.

سەبارەت بە ئینجیلەکانیش، دەبینین دەقی ئینجیلی مەتتا بە ئاشکرا پێچەوانەی ئینجیلی لۆقایە، ئەمەش بە راشکاوی شتێکمان پێشکەش دەکات کە لەگەڵ ئەو زانیارییە تایبەتییە نوێیانەدا یەك ناگرنەوە کە تایبەتن بە کۆنیی مرۆڤ لە زەویدا"(٢).

٢ - "لە سەرەتادا لایەنە زانستییە تایبەتەکانی قورئان دووچاری حەپەسانێکی قووڵیان کردم. چونکە باوەڕم وا نەبوو کە بەم ژمارە زۆرە و هەتا ئەم رادەیە باسی

(١) "د. مۆریس بۆکای Maurice Bucaille" پزیشك و زانا ناسراوەکەی فەرەنسایە. کتێبەکەی بە ناوی "قورئانی پیرۆز و تەورات و ئینجیل و زانست" لە هەموو ئەو دانراوانەی لەم چەشنە بابەتە دواون، رەسەنتر و گشتی تر و قووڵترە. دیارە کاری بۆکای لەم کتێبەدا چەندین قەناعەتی رەهای بە راستیی کتێبەکەی خوا پێ بەخشیوە و، ئنجا بە راستیی ئەو ئایینەش کە ئەو کتێبە هێناویەتی. چەند جارێك بانگهێشت کراوە بۆ دیداری هزری ئیسلامی کە هاوینی هەموو ساڵێك لە جەزائیر ساز دەکرێت. لەوێ پتر بۆی رەخسا کە لە ئایینی ئیسلام وەك فیکر و ژیان شارەزا ببێت.

(٢) القرآن الكريم والتوراة والإنجيل والعلم: ١٣.

تایبەت بەو بابەتانە لە قورئاندا بدۆزمەوە کە زۆر جۆراوجۆرن و، بە تەواوی پڕاوپڕی زانیاریيە زانستیيە تازەکانن. ئەوەش لە دەقێکدا کە پتر لە سیازدە سەدە پێش ئێستا نووسراوە! لە سەرەتادا هیچ باوەڕێکم بە ئیسلام نەبوو. ڕێی ئەم لێکۆلینەوەیەشم بە گیانێکی ئازاد لە هەموو بڕیارێکی پێش وەخت و، بە جۆرێکی بابەتییانەی تەواو گرتەبەر"[١].

٣ - "دەستم دایە قورئان و، بە شێوەیەکی تایبەتی لەو وەسفکردنەی قورئان بێدار بوومەوە کە لە بارەی ژمارەیەکی گەورەی دیاردە سروشتیيەکانەوە پێشکەشی دەکات. وردیی هەندێ لەو درێژەپێدانە تایبەتەی بە هەندێ لەم دیاردانە، سەرسامی کردم! ئەم درێژەپێدانانەش لە دەقە ئەسڵییەکەدا نەبێت نازانرێن. سەرسامییەکەم لە یەکاویەك بوونی ئەم زانیارییانەدا بوو بۆ ئەو چەمکانەی کە ئەمڕۆ سەبارەت بەم دیاردانە هەمانە و، هەرگیز بۆ مرۆڤێکی سەردەمی محەممەد ﷺ نەڕەخساوە کە بچووکترین بیرۆکەی لە بارەیانەوە هەبێت"[٢].

٤ - "چۆن دەگونجێ مرۆڤێك - کە هەر لە سەرەتاوە نەخوێندەوار بووە - بە ڕاشکاوی لە چەندین ڕاستیی ئەوتۆ بدوێت کە مۆرکی زانستییان پێوەیە و، لە توانای هیچ مرۆڤێکی ئەو سەردەمەدا نەبووە ئەو زانیارییانە بۆخۆی پێك بهێنێت، بێ ئەوەی کە لەو لێدوانە ڕاشکاوانەی ئەو، بچووکترین هەڵەی لە ڕووی زانستەوە تێدا دەربکەوێت؟" [٣]!

## پیکارد[٤]

لە وتەکانی:

(١) هەمان سەرچاوە: ١٤٤.

(٢) هەمان سەرچاوە: ١٤٥.

(٣) هەمان سەرچاوە: ١٥٠.

(٤) "ولیەم بێرچل بەشیر پیکارد William Burchell Bashyr Pickard" خەڵکی ئینگلتەرایە و، لە زانکۆی کانتەبری دەرچووە، نووسەرێکی بەناوبانگە و، ناوی هەندێ لە بەرهەمە ئەدەبیيەکانی بە زمانی ئینگلیزی: مغامرات القاسم؛ عالم جدید. لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا بەشداری کردووە و بە دیل گیراوە. ماوەیەك لە ئۆغەندا کاری کردووە و ساڵی (١٩٢٢ز) موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاندووە.

"نوسخەیەکی وەرگێرانە فەرەنسی‌یەکەی "سافاری"م بۆ واتاکانی قورئان کڕی، کە بەنرخترینی شتەکانمە بە لامەوە. لە خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا گەورەترین چێژم دەست کەوت و گەلێ پێی دڵخۆش بووم، تەنانەت وام لێ هات کە وەکو ئەوە وابێت تیشکی حەقیقەت بە نوورە پیرۆزەکەی بەسەر مندا هەڵهاتبێت"(١).

## حیتی(٢)

هەندێ لە وتەکانی:

١- "شێوازی قورئان لە هی غەیری ئەو جیاوازە، پاشان بەراورد قبووڵ ناکات لەگەڵ هیچ شێوازێکی دیکەدا و، لە توانادا نی‌یە لاسایی بکرێتەوە. "ئیعجازی قورئان"یش لە بناغەدا هەر ئەمەیە. "قورئان" لە نێوان هەموو موعجیزەکاندا موعجیزەی هەرە گەورەیە"(٣).

٢- "... ئیعجازی قورئان ڕێی لەوە نەگرت کە کاریگەریی بە ئەدەبی عەرەبی‌یەوە دەربکەوێت. کەچی ئێمە گەر سەیری ئەو نوسخەیەی تەورات و ئینجیل بکەین کە لە سەردەمی "پادشا جەیمز"دا کرا بە ئینگلیزی، دەبینین ئەو کاریگەری‌یەی لەسەر زمانی ئینگلیزی بەجێی هێشت یەکجار کەمە، لە چاو ئەو کاریگەری‌یەدا کە قورئان لەسەر زمانی عەرەبی بەجێی هێشت. هەر قورئان بوو کە زمانی عەرەبیی پاراست لەوەی بۆ چەند زارێك پارچە پارچە ببێت"(٤).

---

(١) رجال ونساء أسلموا: ٢/٨٦.

(٢) "فیلیپ حیتی P. Hitti" سالی (١٨٨٦ز) لە دایك بووە. خەڵکی لوبنانە و ڕەگەزنامەی ئەمریکی هەیە. سالی (١٩٠٨ز) زانکۆی ئەمریکیی بەیرووتی تەواو کردووە. سالی (١٩١٥ز) دکتۆرای لە زانکۆی کۆلۆمبیا وەرگرتووە و، سالانی (١٩١٥-١٩١٩ز) لە بەشی "خۆرهەلات"ی هەمان زانکۆدا بووە بە موعید. سالانی (١٩١٩-١٩٢٥ز) مامۆستای مێژووی عەرەب بووە لە زانکۆی ئەمریکیی بەیرووت. سالانی (١٩٢٦-١٩٢٩ز) مامۆستای یاریدەدەری ئادابی زمانە سامی‌یەکان بووە لە زانکۆی پرینستن و، پاشان سالانی (١٩٢٩-١٩٥٤ز) تا کاتی خانەنشین بوونی مامۆستا و پاشان مامۆستای کورسی و دواتر سەرۆکی بەشی زمان و ئادابەکانی خۆرهەلات بووە. لە چەندین کۆمەڵە و ئەکادیمیادا بە ئەندام هەڵبژێرراوە. ئەمەش ناوی هەندێکە لە بەرهەمەکانی: أصول الدولة الإسلامية ١٩١٦ز؛ تأريخ العرب ١٩٢٧ز؛ تـأريخ سوريا ولبنان وفلسطين ١٩٥١ز؛ لبنان في التأريخ ١٩٦٠ز.

(٣) الإسلام منهج الحياة: ٦٢٠.

(٤) هەمان سەرچاوە: ٢٨٧-٢٨٨.

## حەننا[1]

لە وتەكانی:

"دەبێ دان بەوەدا بنرێت كە "قورئان" جگە لەوەی كتێبی ئایین و شەریعەت دانانە، كتێبی زمانی عەرەبیی فوسحایشە. قورئان فەزڵێكی گەورەی لە بووژاندنەوەی زماندا هەیە. زۆرجار پێشەوایانی زمان - چ موسڵمان بن و چ مەسیحی - لە بواری ڕەوانبێژی و ڕەوانكاریی وشەدا دەگەڕێنەوە بۆلای قورئان. جا ئەگەر موسڵمانەكان لەو باوەڕەدا بن كە ڕاست و دروستیی زمانی قورئان ئەنجامێكی بێ گومانی ئەوە بێت كە قورئان كتێبێكی نازڵ كراوە و بەهەڵەدانان هەڵناگرێ، ئەوا مەسیحییەكانیش دان بەم ڕاست و دروستییەدا دەنێن، بێ ڕوانینە ئەوەی كە نازڵكراو بێت یان دانراو. بۆیە هەركاتێ گرفتێكی زمانەوانییان بێتە پێش، دەگەڕێنەوە بۆلای قورئان بۆ نموونە هێنانەوە بە زمانە ڕاست و دروستەكەی"[2].

## داوود[3]

هەندێ لە وتەكانی:

١- "نوسخەی تەرجەمەی واتاكانی قورئانم بە زمانی ئینگلیزی هێنا، چونكە زانیبووم كە ئەوە "كتێبی پیرۆز"ی موسڵمانانە. دەستم كرد بە خوێندنەوەی و بیركردنەوە لە واتاكانی. هەموو بایەخێكی منی بەلای خۆیدا ڕاكێشا. گەلێ حەپەسام كاتێ كە وەڵامی قەناعەت بەخشی ئەو پرسیارە سەرسامكەرەم (ئامانج لە بەدیهێنان) لە یەكەم لاپەڕەكانی قورئاندا دۆزییەوە. ئایەتەكانی (٣٠-٣٩)ی سوورەتی "البقرة"م خوێندەوە كە چەند ئایەتێكن بە ڕوونی "حەقیقەت" بۆ هەموو لێكۆڵەرێكی بە ویژدان

(١) "دكتۆر جۆرج حەننا" مەسیحییەكی خەڵكی لوبنانە. بیركردنەوەكانی لە ڕەهەندێكی ماددیی سروشتیی پەتییەوەیە، وەك بە ڕوونی لەو كتێبەیەوە دەردەكەوێت كە ناوی: "قصة الإنسان"ە.

(٢) قصة الإنسان: ٧٩-٨٠.

(٣) "عامر عەلی داوود" لە بنەماڵەیەكی هیندیی بە ئایین براهمییە. لەسەر دەستی ئەو موبەششیرانە بووەتە فەلە كە لەگەڵ پێشەنگی ئیستیعماردا هاتبوون. كتێبە ئایینییەكانی بە زۆری دەخوێندەوە. كاتێكیش بۆی ڕەخسا قورئان بخوێنێتەوە، موسڵمان بوو.

دەخەنە ڕوو. ئەم ئایەتانە بەوپەڕی ڕوونی و ئاشکرایی و بـە ڕێگایەکی قەناعـەت بـەخش داستانی بەدیهێنانمان بۆ دەگێڕنەوە"[١].

٢- "... لێکۆڵینەوەکەم لە قورئانی پیرۆزدا گەلـێ کێشەی فیکریی لـە پێش چـاوی مندا دەرخست و، گەلـێ ناسازیشی ڕاست کردەوە کە لە کتێبە ئاسمانی‌یەکانی پێشوودا بینیبووم"[٢].

## دێرمینگەم[٣]

هەندێ لە وتەکانی:

١- "مەسیح - دروودی لەسـەر بێـت - لـە قورئـاندا پلەیـەکی بـاڵای هەیـە، چونکـە لەدایکبوونی وەك هی خەڵکی تر نی‌یە. هەروەها ئـەو پێغەمبـەرەی خوایـە کـە بـە ئاشـکرا لـەبارەی مەبەسـتەکانی خۆیـەوە لەگـەڵ خـوادا دواوە و، ئەوەشـی بـۆ یەکـەم کـەس گێڕاوەتـەوە کـە قسـەی لەگـەڵ کـردووە. مەسیح لـە قورئـاندا وشـەی گۆیـای خـوای گەورەیە، جگە لە "وەحی". قورئان مەبەستی لە "نەسرانییەتی ڕاستەقینە"یە کاتێ دەڵێ: "عیسـا وشـەی خوایـە، یـان ڕۆحـی خوایـە ئاراسـتەی مەریـەمی کـردووە و، یەکێکـە لـە مرۆڤەکان". هەروەها زەمی ڕێچکەی ئەوانە دەکات کە دەڵێن عیسا - دروودی لەسەر بێت - خوایە. هەروەها زەمی ئـەو ڕێچکەیـەش دەکـات کـە "نـان" پێشکەشـی "مەریـەم" دەکـەن و بـە پەرستشـی دەزانـن و پاشـان دەیخـۆن. ئەمانـە و شـتەکانی تـری ڕێچکـە ئیلحادی‌یەکانی نەسرانی، نەك نەسرانییەتی ڕاستەقینە.

نەسرانیی (ڕاستەقینە) بوارێکی تری نی‌یە جگە لەوەی کە بەو هێرشەی قورئان ڕازی بێت کە دەیکاتە سەر سێ کوچکەی پێکهاتوو لە خوا و عیسا و مەریەم"[٤].

---

(١) رجال ونساء أسلموا: ٧/١١٦-١١٨.

(٢) هەمان سەرچاوە: ٧/١١٨.

(٣) "ئێمیل دێرمینگەم" Emile Dermenghem خۆرهەڵاتناسێکی فەرەنسی‌یە. بەڕێوەبەری کتێبخانـەی جەزائیر بووە. ئەمانەش هەندێکن لە بەرهەمەکانی: "حياة محمـد" پاریس ١٩٢٩ز، کە یەکێکـە لـە وردترینی دانراوەکان کە خۆرهەڵاتناسێك لە بارەی پێغەمبەرەوە ﷺ دایناوە. هەروەها "محمد والسـنة الإسـلامية" پاریس ١٩٥٥ز. هەروەها گەلێ توێژینەوەی لە گۆڤارە بەناوبانگەکاندا بڵاو کردووەتەوە، چەشنی "المجلـة الأفريقية" و "حوليات معهد الدراسات الشرقية" و "نشرة الدراسات العربية" و... هتد.

(٤) حياة محمد: ١٣١-١٣٢.

٢- "قورئان لە ئایندەدا هاندەرێکی جیهاد دەبێت کە موسڵمانان هەردەم دەیڵێنەوە، بە وێنەی ئەوەی کە خەڵکانی جگە لەوان سرووده‌کانی جەنگ دەڵێنەوە. هانی ئیمانداران دەدات بۆ جەنگ لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵی دەجەنگن و، هانی کەسانی سست و کەمتەرخەم دەدات و، ناوی دواکەوتووان دەزڕێنێت و، ئابڕووی دووڕووانیش دەبات و، بەڵێنی بەهەشت بە شەهیدان دەدات"(١).

٣- "محەممەد ﷺ خۆی بە هۆکاری گەیاندنی "سرووش" دادەنێت و، ئەوپەڕی سوور بووە لەسەر ئەوەی کە گوێ بیستێکی ئەمین یاخود تۆمارێکی ڕاستگۆ، یان گێڕەوەیەکی پارێزراو بێت بۆ گوفتاری سێبەرە درەخشانەکە و، دەنگە بێ ورتەکەی گوفتاری ئەزەلی، لە شێوەیەکی دنیایی گوفتاری خوادا کە "أم الكتاب"ە.. بۆ ئەو گوفتارەی کە چەندین مەلائیکەتی بەرێز لە ئاسمانی حەوتەمدا لەبەریان کردووە.

هەموو پێغەمبەرێك دەبێ بەڵگەیەکی هەبێت لەسەر پێغەمبەرێتییەکەی و، موعجیزەیەکیش کە تەحەددیی پێ بکات. قورئانیش تاقانە موعجیزەی محەممەدە ﷺ. چونکە شێوازی دەستەوسانکاری قورئان و بەهێزیی باسەکانی، هەتا ئێستاش لایەنی نەجوولاوی ئەو کەسانە دەورووژێنن کە دەیخوێننەوە، هەرچەندە لە خواپەرستە خاوەن تەقواکانیش نەبن.

محەممەد ﷺ تەحەددیی جینی و ئادەمیزادی دەکرد کە هاوشێوەی قورئان بهێنن. ئەم تەحەددییەش ڕاست و دروست ترین بەڵگەی محەممەدە ﷺ لەسەر ڕاستیی پەیامەکەی.

بێگومان هەموو ئایەتێکی قورئان - تەنانەت گەر ئاماژەشی بۆ وردترین ڕووداوی ژیانی تایبەتیی ئەو کردبێت - بە جۆرێك بۆی دێت (بۆی وەحی دەکرێت) کە سەرانسەری گیانی مرۆڤ لەو موعجیزە عەقڵییە دەلەرێنێتەوە. گومانیش لەوەدا نییە کە دەبێ توێژینەوە لە نهێنیی کاریگەری و مەزنیی سەرکەوتنەکەیدا بکرێت"(٢).

٤- "محەممەد ﷺ کە "سرووش"ی بۆ دەهات گەلێ ئازاری دەچەشت و، دووچاری چەند حاڵەتێك دەبوو کە پێی خۆش نەبوو خەڵکی ئاگاداری بن.

---

(١) هەمان سەرچاوە: ١٩٥.

(٢) هەمان سەرچاوە: ٢٧٩-٢٨٠.

رۆژێکیان ئەبووبەکر بە دڵێکی پڕ لە پەژارەوە تێبینیی تاڵی سپیی لە ڕیشی پێغەمبەردا ﷺ کرد، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو:

"سوورەتی هود و دەستە خوشکەکانی: واقیعە و، حاقە و، قاریعە، پیریان کردم".

لە دوای هاتنی "وەحی" پێغەمبەر ﷺ هەستی بە قورساییەك لەسەری خۆی دەکرد، کە بە مەڵهەمەکان تیماری دەکرد، هەروەك لە کاتی هاتنی "وەحی"دا دادەپۆشرا و، دەنگی پرخە و ناڵەی دەبیسترا. کە "وەحی"ی لە کاتی سەرمادا بۆ دەهات ئارەق لە ناوچاوانی دەچۆڕا!"[1].

٥- "محەممەد ﷺ کە دوورە لە داڕشتن و دانانی قورئان، هەندێ جار بە بێ سوود چاوەڕێی هاتنی "وەحی"ی دەکرد، خەفەتی بەوە دەخوارد و حەزی دەکرد پەیتا پەیتا "وەحی"ی بۆ بێت"[2].

## دی کاستری[3]

هەندێ لە وتەکانی:

١- "ژیری سەرسامە لەوەدا کە چۆن دەکرێت ئەو ئایەتانە لە کەسێکی نەخوێندەوارەوە سەرچاوە بگرێت، لە کاتێکدا کە هەموو خۆرهەڵات دانیان بەوەدا ناوە کە ئەوانە چەند ئایەتێکن هزری مرۆڤ دەستەوسانە لە هێنانی وشە و واتای هاوشێوەیاندا. ئەو ئایەتانەی کە عەقەبەی کوڕی ڕەبیعە بیستنی سەری لە جوانییان سووڕما! بەرزیی دەستەواژەکانی بەس بوون بۆ ئەوەی کە قەناعەت بە عومەری کوڕی خەتتاب بکەن، بۆیە ئیمانی بە خوای خوێنەرەکەی هێنا و، چاوی نەجاشیی حەبەشە فرمێسکی هەڵڕشت کاتێ جەعفەری کوڕی ئەبووتالیب سوورەتی زەکەریا(مەریەم)ی بۆ خوێندەوە و ئەوەش کە باسی لە دایك بوونی یەحیا دەکات. قەشەکانیش دەنگیان لێ هەڵبڕی کە ئەم گوفتارە لە هەمان سەرچاوەی گوفتاری عیساوە هەڵقوڵاوە.

(١) هەمان سەرچاوە: ٢٨٣.

(٢) هەمان سەرچاوە: ٢٨٥.

(٣) "کۆنت هێنری دی کاستری Cte. Henry De Castries"(١٨٥٠-١٩٢٧ز) بە ڕەگەز هۆڵەندییە و، موقەدەم بووە لە سوپای فەرەنسادا. ماوەیەك لە باکووری ئەفریقیا ژیاوە. ئەمەش ناوی هەندێکە لە بەرهەمەکانی: مصادر غير منشورة عن تأريخ المغرب ١٩٠٥ز؛ الأشـراف السـعديون ١٩٢١؛ رحلة هولندي إلى المغرب.

بەڵام ئێمەی خۆرئاوایی ناتوانین لە واتاکانی قورئان وەك خۆی تێبگەین، چونکە پێچەوانەی هزر و بیرەکانی ئێمەن و، جیاوازن لەوەی کە نەتەوەکانی ئێمەی لەسەر پەروەردە کراوە. لەگەڵ ئەوەشدا نابێ ئەوە هۆی ڕێگریمان بێت لەو باوەڕەی کە چ کاریگەرییەکی لەسەر ژیریی عەرەبەکان بووە.

"جان جاك ڕۆسۆ" لەوەدا پێکاویەتی کە دەڵێ:

"هەندێ کەس شتێکی کەمی زمانی عەرەبی فێر دەبێت و، ئنجا قورئان دەخوێنێتەوە و پێی پێ دەکەنێت. خۆ ئەگەر ڕاستەوخۆ گوێی لە محەممەد ﷺ بووایە کە بەو زمانە ناسکە فوسحایە بۆ خەڵکی دەخوێندەوە کە دەنگە پڕ و قەناعەت بەخشەکەی گوێی گوێبیستانی ئاو دەدا و، کاری لە دڵەکان دەکرد، ئەوا سەری سوژدەی دەنایە زەوی و، هاواری لێ دەکرد: ئەی پێغەمبەری خوا! دەستمان بگرە و بمان بە بۆ هەڵوێستەکانی شەرەف و سەربەرزی، یان شوێنە پڕ لە مەترسییەکان. ئێمە لە پێناوی تۆدا، حەز بە مردن یان سەرکەوتن دەکەین!

چۆن دەچێتە عەقڵەوە کە ئەم کتێبە بەو زمانە فوسحایە پێغەمبەر ﷺ داینابێت، لە کاتێکدا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا - بە وێنەی زمانی لاتینی - تەنها کەسانی زانا شارەزای بوون. خۆ ئەگەر قورئان جگە لە درەخشانیی واتاکانی و جوانیی دارشتنەکانی شتێکی دیکەی تێدا نەبێت، ئەوا بەسە بۆ ئەوەی کە بەسەر هزرەکاندا زاڵ بێت و دڵانی بۆ کەمەندکێش بێن"[1].

٢- "محەممەد ﷺ قورئانی وەك بەڵگەیەك هێنا لەسەر ڕاستیی پەیامەکەی. هەتا ئەمڕۆش قورئان یەکێکە لەو نهێنییانەی کە ئەستەمە کۆدەکانی بکرێنەوە و، کەس ناتوانێت بڕواتە ناخی ئەم نهێنییە پارێزراوە، مەگەر کەسێك باوەڕ بەوە بهێنێت کە لە لایەن خوای گەورەوە نازڵ کراوە"[2].

٣- "لە هەندێك شوێندا لەوانەیە لێك چوونێك لە نێوان قورئان و تەوراتدا ببینین، بەڵام زانینی هۆی ئەوە ئاسانە گەر تێبینیی ئەوە بکەین کە قورئان هاتووە تەواوکاری تەورات بێت، هەروەك پێغەمبەر ﷺ خۆیشی دواهەمینی پێغەمبەرانە"[3].

---

(١) الإسلام خواطر وسوانح: ١٨-٢٠.

(٢) هەمان سەرچاوە: ٢٠.

(٣) هەمان سەرچاوە: ٢٢-٢٣.

## دینیه[1]

هەندێ لە وتەکانی:

١- "قورئان موعجیزەیەکی هێنایەدی کە گەورەترین ئەکادیمیای زانست ناتوانێت بیهێنێتەدی، کە بریتی‌یە لەوەی زمانی عەرەبیی لەسەر ڕووی زەویدا بەرقەرار کرد. بە ڕادەیەك کە ئەگەر یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەمڕۆ بگەڕێتەوە، زۆر بە ئاسانی دەتوانێت لەگەڵ خوێندەوارەکانی زمانی عەرەبیدا لە یەکتر تێبگەن، تەنانەت قورسی‌یەکی ئەوتۆ نابینێت لە قسەکردندا لەگەڵ ئەو گەلانەی کە بە زمانی عەرەبی قسە دەکەن. ئەوەش پێچەوانەی ئەوەیە کە - بۆ نموونە - کەسێکی هاوچەرخی (ڕابیلیە)ی سەدەی پازدەهەم، کە لە چاو سەردەمی قورئاندا لێمانەوە نزیکترە، گرفت و قورسی دەبینێت لە قسەکردنی لەگەڵ بەشی هەرە زۆرینەی فەڕەنسی‌یەکانی ئەمڕۆدا"[2].

٢- "موشریکەکان لە ناخی خۆیاندا هەستیان کرد کە ئەو گوفتارە سەرسوورهێنەرەی لە قووڵایی دڵی ئەو پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵدەقوڵێت، کە لە لایەنی خواوە ئاراستەی کراوە، دڵی ئەوانی داگیر کردووە. هەمووشیان نزیك بوون لەوەی کە سەر بۆ ئەو وشە دڵگیرانە نەوی بکەن کە ئیمانێکی ئاسمانی ئیلهامی کردبوو. خۆ جگە لە حەزکردنیان لە ئامانجەکانی دنیا شتێکی دیکە نەبوو ڕێی موسڵمان بوونیان لێ بگرێت" [3].

٣- "لە ڕاستیدا موعجیزەی پێغەمبەرانی پێش محەممەد ﷺ کاتی بوون و، لەسەر پێ بوون بۆ لە بیرچوونەوەی خێرا. بەڵام دەتوانرێت موعجیزەی ئایەتەکانی قورئانی ناوبنێین بە "موعجیزە نەمرەکە" چونکە کاریگەریی ئەم موعجیزەیە هەردەم بەردەوامە. لە هەموو شوێن و کاتێکدا بۆ ئیماندار ئاسانە کە تەنها بە خوێندنەوەی ئەم کتێبەی خوای گەورە ئەم موعجیزەیە ببینێت.

---

(١) "ئەیتین دینیه" (١٨٦١-١٩٢٩ز) خەڵکی فەرەنسایە و هەر لەوێش خوێندوویەتی. ڕۆشتووە بۆ جەزائیر و، نیوەی هەموو ساڵێکی لەوێ لە شاری "بوو سەعادەت" بەسەر دەبرد. ساڵی ١٩٢٧ز موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاندووە و خۆی ناوناوە ناسیرەدین. ساڵی ١٩٢٨ز حەجی ماڵی خوای کردووە.

(٢) واتە: ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ ئەم سەردەمە. (وەرگێڕ) أشعة خاصة بنور الإسلام: ٣٥.

(٣) محمد رسول الله: ١٠٦.

هەر لەم موعجیزەیەدا هۆكاری دڵنیابەخشی ئەو بڵاوبوونەوە مەزنە دەبینین كە ئیسلام بەدەستی هێناوە، كە بڵاوبوونەوەیەكە ئەوروپاییەكان هۆكارەكەی نازانن، چونكە شارەزای قورئان نین، یان لەبەر ئەوەی تەنها لە ڕێی ئەو تەرجەمانەوە دەیناسن كە پرتەی ژیانیان تێدا نییە، جگە لەوەی كە وەرگێڕانێكی وردیش نین"[١].

٤- "جا ئەگەر سیحری شێوازی قورئان و جوانیی واتاكانی ئەم چەشنە كاریگەرییە لە دەروونی زانایانێكدا دروست بكات كە هیچ پەیوەندییەكیان بە عەرەب و موسڵمانانەوە نییە، دەبێ هێزی ئەو حەماسەتە چۆن بێت كە سەربجی عەرەبی حیجاز ڕادەكێشێت كاتێ ئەم ئایەتانە بە زمانە جوانەكەی خۆیان نازڵ دەبن؟ ئەوان هەر هێندەی ئەم قورئانەیان دەبیست چەندین كاردانەوەی گەورە و كتوپڕ بەسەر دەروونیاندا زاڵ دەبوو، بۆیە لە شوێنی خۆیاندا واقیان وڕ دەما، دەتوت بە بزمار داكوتراون بەو شوێنەدا.

جا ئایا ئەم ئایەتە نائاساییانە لە لایەن محەممەدەوە ﷺ دێن كە هیچ زانیارییەكی نەخوێندووە؟ نەخێر، مەحاڵە لە لایەن محەممەدەوە بن.

كەواتە هیچ ڕێگایەك نییە جگە لە دان نان بەوەدا كە هەر تەنها خوای گەورەی بەتوانا ئەو ئایەتە ئاشكرا و ڕوونانەی بەسەر محەممەددا خوێندووەتەوە"[٢].

٥- "جێی سەرسوڕمان نییە كە دەبینین پێغەمبەری نەخوێندەوار تەحەددیی شاعیرەكان بكات و، ئامادە بێت مافی ئەوەیان بداتێ كە بە درۆزنی دابنێن گەر دە دانە سوورەتی هاوشێوەی قورئان بهێنن، چونكە بڕوای بە دەستەوسانیی ئەوان هەبوو لە كارێكی وەهادا"[٣].

## دیورانت[٤]

لە وتەكانی:

---

(١) هەمان سەرچاوە: ١١٨.

(٢) هەمان سەرچاوە: ١١٩ - ١٢١.

(٣) هەمان سەرچاوە: ١٢١.

(٤) "ویڵ دیورانت Will Durant " نووسەرێكی ئەمریكیی هاوچەرخە. كتێبە سێ بەرگییەكەی كە ناوی "قصة الحضارة"یە (لە بنەڕەتدا یازدە بەرگە) یەكێكە لە بەناوبانگترینی ئەو كتێبانەی كە مێژووی شارستانێتیی مرۆڤ بە هەموو ئاڵۆزییەكانیەوە دەخاتە ڕوو. هەروەها كتێبێكی تری هەیە بە ناوی "قصة الفلسفة".

"قورئان بە درێژایی چوارده سەده لە یادی موسڵمانان‌دا بە پارێزراوی ماوەتەوە، ئەندێشەیان دەهەژێنێت و، ڕەوشتیان پێکدەهێنێت و، بەهرەکانی سەدان ملیۆن کەس دەمەزەرد دەکاتەوە. قورئان ئاسانترینی بیروباوەڕەکان و، کەمترینیان لە ڕووی ئاڵۆزی و لێڵایی و، دوورترینیان لە پابەندبوون بە ڕێ و ڕەسم وبەند و باوە ئایینی‌یەکان و، سەربەست ترینیان لە کۆتی بتپەرستی و قەشەیی، لە دەروونەکاندا دادەمەزرێنێت.

قورئان گەورەترین فەزڵی هەیە لە بەرزکردنەوەی ئاستی ڕەوشتی و فەرهەنگیی موسڵمانان‌دا، هەر قورئانە کە بناغەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی و یەکبوونی کۆمەڵگای تێدا دامەزراندن و، هانی دان شوێن دەستووره ڕاست و دروستەکان بکەون و، ژیریی ئەوانی لە گەلێ وەهم و خورافات و، ڕەفتاریشیان لە ستەم و توندوتیژی ڕزگار کرد، هەروەك حاڵی کۆیلەکانی باش کرد و، عیززەت و کەرامەتی لە دەروونی زەلیلەکاندا دروست کرد و، پلەیەکی میانەڕەوی و دووری لە ئارەزووبازیی خستە نێوان موسڵمانانەوە کە لە هیچ شوێنێکی ئەم جیهانەی کە مرۆڤی سپیی تێدایە هاوشێوەی ئەوە نی‌یە"[1].

## ڕۆزنسال[2]

لە وتەکانی:

"هەندێ لە هاندەرە عەمەلی‌یەکانی لێکۆڵینەوە لە مێژوو، زۆریی مادده مێژووییەکەیە لە قورئاندا، کە ئەوەش تەفسیرنووسەکانی خستە سەر ڕێی گەڕان بە دوای زانیاریی مێژووییدا بۆ ڕاڤەکردنی ئەوەی کە لە قورئاندا هاتووە. بایەخدان بە مادده مێژووییەکە بە درێژایی ڕۆژگار بوو بە یەکێك لە لقەکانی ئەو زانیاری‌یەی کە پەیوەستە بە قورئانەوە. خۆ ئەگەر پێغەمبەر ﷺ هەندێ زانیاری و هەواڵی مێژوویی بیستبێت، ئەوا نابێتە بیانووی گریمانکردنی ئەوەی کە سەرچاوە مێژووییەکانی چەشنی تەوراتی بە

(١) قصة الحضارة: ١٣/٦٨-٦٩.

(٢) "فرانز رۆزنسال Franz Rosenthal" لە مامۆستایانی زانکۆی "ییل"ە. گەلێ توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی لە گۆڤارە بەناوبانگەکاندا هەیە، وەك: "الثقافة الإسلامية"؛ "الشـرقيات". هەروەك چەندین کتێبی داناوە، بەناوبانگترینیان بریتین لە: مناهج العلماء المسلمين في البحث العلمي؛ علم التأريخ عند المسلمين.

زمانی عەرەبی خوێندبێتەوە. چونکە زانیاریی مێژوویی ئەوتۆ لە قورئاندا هاتووە کە جیاوازە لەوەی جولەکە لافی بوونی لە تەوراتدا لێ دەدەن.

پێغەمبەر ﷺ باسی لەوە کردووە کە جولەکە و دیانەکان دەستکاریی تەوراتیان کردووە و، موسڵمانانیش دەستیان تەنها لەوە گیر کردووە کە لە قورئاندا هاتووە. قورئان ئاماژەی بە گەلێ لەو ڕووداوانە داوە کە دەوراندەوری پێغەمبەریان ﷺ دابوو. ئەوەش بایەخ و گرنگیی خۆی هەیە لە مێژووی ئیسلامدا، چونکە ئەو ڕووداوانەی کە ئایەتەکان ئاماژەیان بۆ کردووە دوایی گرنگییەکی گەورەیان لە لایەن موسڵمانانەوە بۆ دروست بوو، هەروەك توێژینەوە مێژووییەکانیشی ورووژاند"[1].

## ڕیسلەر[2]

هەندێ لە وتەکانی:

١- "جوانیی قورئان لە شێوازەکەیدا بوو، چونکە قورئان بۆیە نازڵ بوو کە بە دەنگێکی بەرز بخوێنرێتەوە. هیچ وەرگێڕانێك ناتوانێت کە وردەکارییە پڕ لە هەستیارییە خۆرهەڵاتییەکەی قورئان دەرببڕێت و، دەبێ لەو زمانەی خۆیدا بخوێنرێتەوە کە پێی نووسراوە، تاکو بتوانیت پەی بە هێز و چێژی ڕستەکانی و، بەرزیی داڕشتنەکەی ببەیت. پەخشانە مۆسیقییە سەرواداره‌کەی قورئان سیحرێکی کاریگەر لە دەروونـدا دروست دەکات، چونکە هزرەکانی لێوانلێوە لە هێز و، وێنەکانیشی بریسکەی تەڕ و پاراوییان لێ دەدرەوشێتەوە.

هیچ کەسێك ناتوانێ نکوڵی لەوە بکات کە دەستەڵاتە سیحری و بەرزییە ڕۆحییەکەی قورئان بەشدارن لە پێدانی ئەو هەستەماندا کە محەممەد ﷺ لە لایەن شکۆمەندی و مەزنیی خوای گەورەوە ئیلهام کراوە"[3].

٢- "قورئان - جگە لەوەی کە کتێبێکی ئایینییە - پوختەی سەرجەم زانیارییەکانی لەخۆ گرتووە و، سەردەمانێکی درێژخایەن یەکەم کتێب بوو

(١) علم التأريخ عند المسلمين: ٤١ — ٤٢.
(٢) "جاك. س. ڕیسلەر" توێژەرێکی فەڕەنسیی هاوچەرخە و، مامۆستایە لە پەیمانگای ئیسلامی لە پاریس.
(٣) الحضارة العربية: ٣٠ — ٣١.

دەخوێندرایەوە و لە هەمان کاتدا یەکبوونی کتێبی زانیاری و پەروەردەی پێکدەهێنا. هەتا ئەمڕۆش قورئان ئەو دەقەیە کە بناغەکانی خوێندنی لەسەر دادەمەزرێت لە زانکۆ ئیسلامی‌یەکاندا.

وەرگێڕانەکان ناتوانن سامانی زمانەوانیی قورئان بگوێزنەوە (چونکە جوانیی زمانی قورئان لە وەرگێڕاوەکاندا بە وێنەی ئەو گوڵە سیس دەبێتەوە کە لە ڕەگەوە دەرهێنرابێت)..

لەبەر ئەوە، پێویستە قورئان لە دەقە ئەسڵی‌یەکەی خۆیدا بخوێنرێتەوە"[1].

٣- "قورئان چارەسەر بۆ هەموو کێشەکان دەدۆزێتەوە و، یاسای ئایینی بە یاسای ڕەوشتی‌یەوە پەیوەست دەکات و، تێدەکۆشێت کە سیستەم و یەکبوونی کۆمەڵایەتی دابمەزرێنێت و، کوێرەوەری و توندوتیژی و خورافەتەکان کەم بکاتەوە. قورئان هەوڵ دەدات دەستی چەوساوەکان بگرێت و، ئامۆژگاری بە چاکە و فەرمان بە میهرەبانی دەدات. لە ماددەی یاسا دانانیشدا، بۆ وردترین درێژە پێدانەکانی هاوکاریی ڕۆژانە چەندین دەستووری داناوە و، گرێبەست و میراتی‌یەکانی ڕێکخستووە و، لە بواری ناو خێزانیشدا ڕەوشی هەموو یەکێکیانی دەستنیشان کردووە سەبارەت بە مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵ و کۆیلە و ئاژەڵەکان و، لەمەڕ تەندروستی و پۆشاك و.. هتد"[2].

٤- "لە ڕاستیدا شەریعەتی قورئان وەك بنەمایەکی سەرەکی لە ژیانی موسڵماندا بە جێگیری و دامەزراوی مایەوە و، ئەو تێڕوانین و ڕەوشت و ڕێنمایەی لە قورئاندایە دووچاری ئاڵوگۆڕی قووڵ نەبوون"[3].

٥-"قورئان بە درێژایی سەدەکانی یەکەمی کۆچی وەك بنەمایەك سەرچاوەی ئیلهام بەخشین بووە بۆ هەموو کارێکی لەمەڕ ژیریی موسڵمانان، چونکە هەموو ئەو هزر و هەستە پێویست و سەروزیادەی لە خۆدا هەڵگرتووە کە توێشوو بە مەزنترین لێکۆڵینەوە فیکری‌یەکان ببەخشێت"[4].

---

(١) هەمان سەرچاوە: ٤٥ .
(٢) هەمان سەرچاوە: ٥١.
(٣) هەمان سەرچاوە: ٧٥.
(٤) هەمان سەرچاوە: ٢١٢.

## سارتن[1]

لە وتەکانی:

"زمانی قورئان بەو پێیەی کە ئەو زمانەیە خوای گەورە هەڵی بژاردووە بۆ "وەحی"، زمانێکی کاملە.

بەم جۆرە قورئان یارمەتیی بەرزکردنەوەی زمانی عەرەبی دەدات بۆ پلەی نموونەی هەرە بەرز لە دەربڕینی مەبەستەکاندا و، ئەو زمانەی کردە هۆکارێکی نێودەوڵەتی بۆ دەربڕینی باڵاترینی ئامانجەکانی ژیان"[2].

## شچایجفێسکا[3]

لە وتەکانی:

"هەرچەندە قورئانی پیرۆز بۆ سەر پیاوێکی عەرەبی نەخوێندەوار دابەزیوە کە لە ژینگەیەکی نەخوێندەواردا پێگەیشتووە، کەچی یاساگەلێکی وەهای هێناوە کە مەگەر لە پێشکەوتووترین زانکۆکاندا مرۆڤ بتوانێت فێریان بێت. هەروەك لە قورئاندا چەندین ڕاستیی زانستی دەبینیت کە جیهان دوای چەندین سەدەی درێژخایەن نەبێت نەیزانیوە"[4].

---

(١) "جوزرج سارتن George Sarton" (١٨٨٤ - ١٩٥٦ز) خەڵکی بەلجیکایە و، دکتۆرای لە زانستەکانی سروشت و بیرکاریدا هێناوە. ڕۆشتووە بۆ ئینگلتەرا و دواتر بۆ ئەمریکا و ڕەگەزنامەی ئەوێی وەرگرتووە. لە زانکۆکانی واشینگتن ١٩١٦ز و، هارفارد ١٩١٧ - ١٩٤٩ز وانەبێژ بووە. لە زانکۆی ئەمریکیی بەیرووت زمانی عەرەبیی خوێندووە. زیاد لە پێنج سەد توێژینەوەی هەیە و، باشترین کتێبی بە ناوی "المدخل إلى تـــأريخ العلم"ە لە پێنج بەرگدا.

(٢) الثقافة الغربية في رعاية الشرق الأوسط: ٣٧ - ٣٨.

(٣) "بوجینا گەیانە شچایجفێسکا Bozena-Gajane Strzewska" ئافرەتە توێژەرێکی پۆلۆنیی هاوچەرخە. بۆ ماوەی پێنج ساڵ (١٩٦١ - ١٩٦٥ز) ئاینی ئیسلامی لە ئەزهەر لەسەر دەستی چەندین مامۆستا و سەرپەرشتیار خوێندووە و، لەو ماوەیەدا زمانی عەرەبی فێر بووە. لە کۆلێجی مافەکان و پەیمانگای زمانە خۆرهەڵاتییەکانی پۆلۆنیا خوێندنی تەواو کردووە.

(٤) تأريخ الدولة الإسلامية وتشريعها: ١٧.

## ستیڤنز[١]

هەندێ لە وتەکانی:

١- "لەو ماوەیەی ژیانمدا وام دەبینی کە هەموو شتێکم ئەنجام داوە و، بۆ خۆم سەرکەوتن و ناوبانگ و سامان و ئافرەتان و هەموو شتێکم بەدەست هێناوە.. بە وێنەی مەیموونم لێ هاتبوو لە درەختێکەوە بازم بۆ درەختێکی تر دەدا و، کەسێکی قەناعەتکار نەبووم. بەڵام خوێندنەوەی قورئان بووە جەخت کردنەوەیەك بۆ هەموو ئەو شتانەی کە لە ناخی خۆمدا بە حەقم دەزانین و، بارودۆخی من وەکو ئەوە وابوو کە ڕووبەڕووی کەسایەتیی ڕاستەقینەی خۆم بووبێتمەوە"[٢].

٢- "قورئانی پیرۆز گەلێ شت لەبارەی هاوسەرگیری و، پەیوەندیی نێوان ژن و پیاو باس دەکات و، وەختە بڵێم لەبارەی هەموو بابەتێکی ترەوە بڕیاری خۆی هەیە"[٣].

## سەلهەب[٤]

هەندێ لە وتەکانی:

١- "ئەو ئایەتەی پێم خۆشە باسی بکەم ئەوەیە کە سنگ فراوانیی لێ هەڵدەقوڵێت، چونکە دەڵێت:

﴿وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلاَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ وَقُولُوا ءامَنَّا بِالَّذِي أُنزِلَ إِلَيْنَا وَأُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَهُنَا وَإِلَهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ (العنكبوت: ٤٦).

---

(١) "کات ستیڤنز Cat Stevens" گۆرانی بێژی بەناوبانگی بەریتانیی بە ڕەچەڵەك نەمسایە. لە ساڵەکانی شەست و سەرەتای حەفتاکانی سەدەی پێشوودا نزیکەی یەك ملیۆن لە کاسێتەکانی فرۆشرا. ساڵی ١٩٧٦ز دوای ئاشنابوونی بە قورئان و لە ڕێی براکەیەوە موسڵمان بوو. ئێستا زۆربەی کاتەکانی لە مزگەوت بەسەر دەبات و، ڕۆڵێکی کارای هەیە لە هەڵسووڕاندنی ئیشوکاری ڕەوەندی موسڵمانان لە لەندەن.

(٢) رجال ونساء أسلموا: ١٠٣/١٠.

(٣) هەمان سەرچاوە: ١٠٣/١٠.

(٤) "نەصری سەلهەب" مەسیحییەکی خەڵکی لوبنانە. بە تێڕوانینی بابەتییانە و گەڕانی بە دوای حەقیقەتی پەتیدا تایبەتمەندە، هەروەك بە چالاکیی سەرومڕی بۆ هێنانەدیی پێکەوە ژیانی ئاشتییانە لە نێوان ئیسلام و مەسیحیدا لە لوبنان، ناسراوە. هەندێ لە بەرهەمەکانی بریتین لە: لقاء المسيحية والإسلام ١٩٧٠ز؛ في خطى محمد ١٩٧٠ز.

ئەمە ئەو شتەیە کە موسڵمانەکان بە مەسیحی‌یەکانی دەڵێن و باوەڕیان پێیەتی، چونکە گوفتاری خوایە ئاراستەیان کراوە. ئەمانە چەند دەستەواژەیەکن کە شایانی ئەوەن ئێمەی مەسیحی و موسڵمان هەموو ڕۆژێك بیانڵێینەوە، لەبەر ئەوەی بەردەکانی ئەو بناغەیەن کە دەمانەوێت تەلارەکەی هەتا ئاسمان بەرز بکەینەوە، ئەو بینایانەی کە تیایدا بە یەك دەگەین و پێکەوەش دەگەینە خوای گەورە. چونکە هەر شوێنێك "خۆشەویستی"ی تێدا هەبێت، خوایش لەوێیە. قورئان بە ڕاشکاوی باس لەوە دەکات کە کتێبە نازڵکراوەکان یەکێکن و ئەسڵەکەیان لە لایەن خواوەیە، ئەم ئەسڵەش هەندێ جار پێی دەوترێت:

"أم الكتاب" و، هەندێ جاری تر "لەوحی مەحفووز" و، هەندێ جاری دیکەش "ئیمامی موبین".."[1].

٢ - "محەممەد کەسێکی نەخوێندەوار بووە؛ نەیخوێندووەتەوە و نەینووسیوە. کەچی ئەم نەخوێندەوارە ڕەوانترین ئاسەواری نووسراو پێشکەش بە مرۆڤایەتی دەکات کە لەو کاتەوە مرۆڤایەتی هەیە بە ئاواتیەوەیە. ئەوەش قورئانی پیرۆزە، ئەو کتێبەی کە خوا ناردی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ بە مەبەستی ڕێنمایی ئەوانەی تەقوای خوایان هەیە"[2].

٣ - "چەندەش قەڵەمەکەمان پلەی ڕەوانبێژیی بەرز بێت، هەر هێشتا ئیسلام پێویستی بە قەڵەمی ئێمە نی‌یە. بەڵکو قەڵەمەکەمان پێویستی بە ئیسلامە.. پێویستی بە سامانە ڕۆحی و ڕەوشتی‌یەکەیەتی.. پێویستی بە قورئانە ڕەنگینەکەیەتی کە دەتوانین گەلێ شتی لێ فێر ببین"[3]!

٤ - هیچ کتێبێکی پێش چاپەمەنی - جۆر و گرنگیی هەرچی‌یەك بێت - لەو چاودێری و گرنگی‌یەی قورئانی بۆ نەڕەخساوە و، ئەو هۆکارانەی ئەویشی بۆ دروست نەبووە کە لە تیاچوون و دەستکاری و ئەو شتانەش بیپارێزێت کە دەگونجێ - بەپێی عادەت - تێکەڵ بە کتێبەکان بین"[4].

---

(١) لقاء المسيحية والإسلام: ٢٢.
(٢) هەمان سەرچاوە: ٩٤.
(٣) هەمان سەرچاوە: ١٢١.
(٤) هەمان سەرچاوە: ٣٣٧.

٥ - ئەو زمانەی کە خوای گەورە ویستی لوتکەی زمانەکان بێت، قورئان بووە بە لوتکەی. کەواتە قورئان لوتکەی لوتکەکانە، چونکە گوفتاری خوایە"[١].

## سووسە[٢]

هەندێ لە وتەکانی:

١ - "مەیلم بەلای ئیسلامدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە بۆ یەکەم جار قورئانی پیرۆزم خوێندەوە و، بە گەرموگوڕی شەیدای بووم.. ئەوکاتە خۆشحاڵ دەبووم بە خوێندنەوەی ئایەتەکانی"[٣].

٢- ".. لە واقیعدا گۆڕانکاری لە موصحەفەکانی "یەهوود"دا شتێکە زانایانی سەردەمی ئێستامان لە ئەنجامی گەڕان و پشکنیندا کۆدەنگن لەسەری. ئەوەش پشتگیرییەکی زانستییە بۆ ئەو گوتە پەروەردگارییانەی کە زیاتر لە سیازدە سەدە پێش ئێستا لەسەر زمانی پێغەمبەری عەرەبیی بەڕێزەوە ﷺ بە وەحی بۆی هاتوون. بەڵام قورئانی پیرۆز، لەبەر بەخەمەوە بوونی گەرموگوڕی موسڵمانان و دەستپاکی و ئەمینداریی ڕاستیان، بە جوانی پاراستیان.

لە ڕاستیدا تاقانە کتێبی پیرۆزە کە هەمووان کۆدەنگن لەسەر ساغ و سەلامەتی و خاوێنیی لە یاری پێ کردن و دەستکاری. خوێنەر هێندەی بەسە ئەو شتانە بخوێنێتەوە کە لەم بارەوە خۆرهەڵاتناسەکان نووسیویانە، ئەوانەی کە وەسفی کۆکردنەوە و نووسینی قورئانیان کردووە. لە کاتێکدا کە ئەوانە بێگانە و نامۆن و، گەلێ جاریش تیرە ڕەخنەگرە ژەهراوییەکانیان دەگرنە ئیسلام.

لە واقیعدا بەڵگە مێژووییەکان هێندە ڕوون و ئاشکران کە هیچ گومانێك لەوەدا ناهێڵنەوە کە قورئانی پیرۆز هیچ دەستکاری و ئاڵوگۆڕێکی تێدا نەکراوە و،

---

(١) هەمان سەرچاوە: ٣٤٢.

(٢) "دکتۆر ئەحمەد نەسیم سووسە" توێژەر و ئەندازیارێکی عێراقییە و، ئەندامی کۆڕی زانیاریی عێراقە و، یەکێکە لە هەرە پسپۆڕە دیارەکانی مێژووی ئاودێری لە عێراقدا. لە پێشدا جوولەکە بووە، پاشان بە کاریگەریی قورئانی پیرۆز موسڵمان بووە. چەند ساڵێك لەمەوبەر کۆچی دوایی کرد. گەلێ بەرهەمی هەیە، بەناوبانگترینیان: مفصل العرب واليهود في التأريخ؛ في طريقي إلى الإسلام.

(٣) في طريقي إلى الإسلام: ١/١٥.

گوفتارەکەی خوای گەورە بە تەواوەتی لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ هاتووە، بە بێ ئەوەی کە تەنانەت یەك پیتیشی گۆڕانی بەسەردا هاتبێت"[١].

٣-"لە قورئاندا هاتووە کە چاودێرە بەسەر ئەو کتێبانەی پێش خۆیەوە. دەکرێ لەمەوە بەڵگە وەربگیرێت لەسەر ئەوەی کە ڕێنمایە خواییە پیرۆزە ئەسڵییەکان قورئانی پیرۆز پاراستنیانی دەستەبەر کردووە، لە ڕێی ڕوونکردنەوەی حەقیقەتەوە، کاتێ شتانی ڕاست و دروست و، هەروەها شتە دەرەکییە نامۆکانی ئەو کتێبە باوانەی کاتی نازڵبوونەکەی دەرخستووە. کەواتە بەم ڕوونکردنەوەیەی قورئان دەردەکەوێت کە باشترین چاودێر و دەمڕاستە بەسەر کتێبە ڕاستەقینەکانی خوای گەورەدا و، باشترین پارێزەریانە لە یاری پێکردن"[٢].

٤-"لە واقیعدا ئەستەمە بۆ کەسێك بە باشی زمانی عەرەبی نەزانێت و شارەزای ئەدەبیاتی نەبێت، پەی بە پلەوپایە و بەرزیی ئەم قورئانەی خوای گەورە و ئەو موعجیزاتە درەخشانانەش بیات کە لەخۆی گرتوون.

جا لەبەر ئەوەی قورئان لە هەموو جۆرەکانی هزرەکان و شەریعەت دانان دواوە، ئەوا دژوارە بۆ تاکە مرۆڤ کە بڕیار بەسەر هەموو ئەم بابەتانەدا بدات. ئایا هیچ ڕێگایەکی تری جگە لە کێش بوون بەرەو موعجیزەی قورئان لە بەردەم مرۆڤدا هەیە کاتێ لە نەخوێندەواریی پێغەمبەری ئیسلام ورد دەبێتەوە و شارەزای نهێنییەکانی ژیانی پێغەمبەر ﷺ دەبێت؟ ئەوەتا خوای گەورە موعجیزەی قورئان و نەخوێندەواریی محەممەدی ﷺ کردووە بە بەڵگە لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرێتییەکەی و دروستیی نیسبەتدانی قورئان لەو"[٣].

٥-"موعجیزەی قورئانی پیرۆز پتر لەم سەردەمەی ئێستاماندا کە سەردەمی ڕووناکی و زانستە دەردەکەوێت لەچاو ئەو سەردەمانەی تردا کە نەزانی و خامۆشی باڵی بەسەردا کێشابوون"[٤].

(١) هەمان سەرچاوە: ٨٦/١.
(٢) هەمان سەرچاوە: ٨٧/١.
(٣) هەمان سەرچاوە: ١٨٢/١ - ١٨٣.
(٤) هەمان سەرچاوە: ١٨٥/١.

## سێدیلۆو[١]

هەندێ لە وتەکانی:

١- "ئایەتێك لە قورئاندا نابینیت کە خۆشەویستی‌یەکی توندوتۆڵی خوای گەورەت پێ نەبەخشێت.

قورئان جگە لەو دەستوورانەشی کە تایبەتن بە ڕەوشتەکان، هاندانی توندوتۆڵی تێدایە بۆ ڕەفتاری بەرز و کردەوەی باش. هەروەك بانگهێشتێکی گەورەی تێدایە بۆ لەگەڵ یەك گۆڕینەوەی هەست و سۆزەکان و نیازجوانی و چاوپۆشی لە جنێوی خەڵك و، ڕقی تێدایە لە بەخۆنازین و تووڕەیی.. ئاماژەی تێدایە بۆ ئەوەی کە هەندێ جار گوناهـ بە بیر و بینین دەبێت.. هاندانی مرۆڤی تێدایە بۆ پاراستنی پەیمان و بەڵێن تەنانەت لەگەڵ کافرانیشدا و، بۆ خۆنەویستی و خاکی بوون و، خۆشبوون لەو خەڵکانەی کە خراپەی بەرامبەر دەکەن، نەك لەعنەت لێکردنیان. ئەو هەموو قسانەی کە لە قورئاندا کۆکراونەتەوە و پڕن لە حیکمەت و ڕێنمایی ڕاست، بەسن بۆ چەسپاندنی پاکوخاوێنیی دەستوورەکانی ڕەوشت لە قورئاندا.. قورئان هەموو شتێکی بینیوە (هیچ شتێکی فەرامۆش نەکردووە).."[٢].

٢-"قورئان شایان بوو بۆ ئەوەی کە بکرێتە نموونەیەك بۆ "شێواز" و بۆ "دەستوورەکانی ڕێزمان". ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی زانستی زمان. ئەوەبوو زانستی "بەیان"(ڕەوانکاری) هاتە کایەوە کە تیایدا لێکۆڵینەوە لە پێکهاتنی گوفتار و خواستی حاڵ و مەقام دەکرێت. هەروەها "بەدیع" و ڕووەکانی "ڕەوانبێژی". هەروەك سنعەتی خوێندنەوەی قورئان و تەفسیرەکەی پتر لە سەد لقی لێ بووەوە. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە لە هەموو یەکێکی ئەو لقانەدا چەندین کتێبی زۆر دابنرێت و، زمانی

(١) "لویس پییَغ یوژین سێدیلۆو Louis-Pierre-Eugene Sedillot" (١٨٠٨ - ١٨٧٦ز) خۆرهەڵاتناسێکی فەڕەنسی‌یە. دانراوەکانی باوکی (جان جاك سێدیلۆو)ی کە ساڵی ١٨٣٢ز مردووە، بڵاو کردووەتەوە. ساڵی ١٨٣١ز بە ئەمینداری قوتابخانەی زمانەکانی خۆرهەڵات دامەزراوە. گەلێ توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی لە گۆڤارە ناسراوەکاندا بڵاو کردووەتەوە. لە بەرهەمەکانی: خلاصة تأريخ العرب؛ تأريخ العرب العام.

(٢) تأريخ العرب العام: ٨٩، ٩٨-٩٩، ١٠٠-١١٧.

عەرەبیش بە چەندین دەستەواژەی نوێی زۆر دەوڵەمەند بێت کە زۆر دوورن لە تێکچوونەوە لە ڕێی تێکەڵبوونیەوە بە زمانەکانی تر"[١].

٣-"یەکێك لەو شتانەی شایانی باس کردنە ئەوەیە کە: "قورئان" لە نێوان هەموو ئەو زمانانەدا کە گەلە جۆراوجۆرە موسڵمانەکان لە ئاسیا و تەنانەت لە هیندیشدا قسەیان پێ دەکەن و، لە ئەفریقیاش تا دەگاتە سوودان، تاقانە کتێبە کە هەمووان لێی تێدەگەن. هەروەها ئەوەش کە قورئان ئەم هەموو گەلە بە سروشت جیاوازانەی بە پەیوەستی زمان و هەست و نەست پێکەوە گرێ داوە"[٢].

## سێرۆیا[٣]

لە وتەکانی:

"قورئان وەحی‌یەکە لە لایەن خوای گەورەوە، شێوازی مرۆڤ نزیکی نابێتەوە. لە هەمان کاتیشدا شۆڕشێکی "بیروباوەڕ"ە کە دان نە بە پاپا و نە بە هیچ کۆڕێکی زانایانی دیان و قەشەکاندا نانێت، چونکە هیچ ڕۆژێك ئیسلام لەوە نەترساوە کە بیری بە حەکەم کردنی عەقڵی فەلسەفی لە دژی هەڵبسێت.

خۆ ئەگەر بەراوردێکی ئیسلام بە ئایینی یەهوودی و مەسیحی بکەین، چەند هێڵێکی جیاکار دەبینین کە بە تەواوی لەگەڵ ئەواندا، بە تایبەت لەگەڵ مەسیحییەتدا وەك یەك دەرناچن. چونکە سیستەمی مەسیحی و یەهوودی لە هی ئیسلام جیان، لەوەتا لە ئیسلامدا بۆشایی نی‌یە لە نێوان بەدیهێنەر و مرۆڤی بەدیهێنراودا، کەچی ئەم بۆشاییە لای جولەکە و مەسیحی‌یەکان بە هۆکارەکان پڕ کراوەتەوە. خۆ هیچ کام لەم شتانە لەگەڵ ئیسلامدا یەك ناگرنەوە.

محەممەد ﷺ پێغەمبەرێکە لە لایەن خواوە ڕەوانە کراوە، هیچ کات نکوولیی دەرنەبڕیوە لە بانگەوازی هەریەك لە مووسا و عیسا - درووودیان لەسەر بێت - بەڵکو

---

(١) هەمان سەرچاوە: ٤٥٨.

(٢) هەمان سەرچاوە: ٤٥٨.

(٣) "هێنری سێرۆیا Henri Serouya" خۆرهەڵاتناسێکی فەرەنسی‌یە. لە بەرهەمەکانی: موسى بن ميمون: ترجمته وآثاره وفلسفته؛ الصوفية والمسيحية واليهودية؛ "فلسفة الفكر الإسلامي.

هەموو تەقالایەکی لەوەدا بوو کە بەپێی ئەوەی لە قورئاندا هاتووە ئەو دوو بانگەوازە پالفتە بکات.

ئەو قورئانەی کە لە یەکەم سالی نازلبوونیەوە هێرشی کردە سەر بڕوای سێ کوچکەیی و، هۆشیاریی دا کە "عیسا" جگە لە پیاوێك کە کوڕی مەریەمە - نەك کوڕی خوا - شتێکی دیکە نییە و، وتنی ئەوەش کە خوا کوڕی هەبێت "شیرك"ێکی هێندە گەورەیە کە وەختە ئاسمانەکان پەرت بکات و زەوی قلیش ببات و چیاکانیش دووچاری هاڕین ببن. "روح القدس"یش تەنها مەلائیکەتێکی وەك جیبریلە، رۆلی ئەوەیە کە بانگەوازە پیرۆزەکە بۆ عیسا و محەممەد ﷺ بگوێزێتەوە. "مەریەم"یش ئافرەتێکی داوێن پاك و خاوێنە، نەك دایکی خوا"[1].

## شاد[2]

هەندێ لە وتەکانی:

١-"کاتێ ئیمانم بە یەکتاپەرستی هێنا، کەوتمە گەڕان بە دوای ئەو بەلگانەی کە دەیسەلمێنن "قورئان" کتێبی خوای گەورەیە و دواهەمینی کتێبە ئاسمانییەکانە. من گەلێ سوپاسی خوا دەکەم کە ڕێی چارەسەری ئەم کێشەیەی بۆ ئاسان کردم. چونکە قورئانی پیرۆز تاقانە کتێبە کە دان بە کتێبە ئاسمانییەکانی دیکەدا دەنێت، کەچی دەبینین هەندێکی ئەوان دان بە هەندێکیاندا نانێن. لە ڕاستیدا ئەمەش یەکێکە لە تایبەتکارییەکانی قورئانی پیرۆز کە دواهەمینی کتێبە ئاسمانییەکانە"[3].

٢-"قورئانی پیرۆز تاقانە کتێبی ئاسمانییە کە هەزاران کەس لە شوێنە جیاجیاکانی سەرزەویدا لەبەریان کردووە و لەو ڕێیەوە پاراستوویانە، کەچی دەبینین کتێبە

---

(١) فلسفة الفكر الإسلامي: ٣٢ - ٣٣.

(٢) "بەشیر ئەحمەد شاد" سالی ١٩٢٨ز لە بنەمالەیەکی فەلەی هیندی لە دایك بووە. باوکی موبەششیرێکی نەسرانی بووە و، هەولی داوە کوڕەکەی لەسەر هەمان ڕێباز پێبگەیەنێت. سالی ١٩٤٧ز خوێندنی تەواو کردووە و، وەك موبەششیر لە "لاهور" دەستی کردووە بە کارەکانی. بەلام دوای بیست سال لێکۆلینەوە، بە تەواوی قەناعەتی بە ئایینی نەسرانی نەما و، سالی ١٩٦٧ز موسلمان بوونی خۆی ڕاگەیاند.

(٣) رجال ونساء أسلموا: ١٩/٧-٢٠.

پیرۆزەکانی (ئایینەکانی) تر تەنها بە خەتی چاپکراو پارێزراون. خۆ ئەگەر لەبەر هەر هۆکارێك کتێبە چاپکراوەکان نەمێنن، هەر قورئان تەنیا کتێبی خوا دەبێت کە لە سنگی مرۆڤەکاندا پارێزراو دەبێت..

بەم جۆرە، قورئان مافی ئەوەی هەیە شانازی بکات بەوەی کە لە دەستکاری پارێزراوە و، لەو ڕۆژەوە کە وەحی هێناویەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ تا ئێستا یەك پیتی لێ زیاد و کەم نەبووە. هیچ ناسازی و هەڵەیەك لە هیچ جۆرێکی (نووسینەکانی) قورئاندا نییە. ئەمەش لە کاتێکدایە کە نوسخەکانی ئێستای سەرجەم کتێبە ئاسمانییەکانی تر پڕن لە دەستکاری و گۆڕانکاری. ئەمەش هۆکارێکی باوەڕهێنانمە بە ئیسلام"[1].

## ڤایلێری[2]

هەندێ لە وتەکانی:

١-"موعجیزەی هەرە گەورەی ئیسلام ئەو "قورئان"ەیە کە لە ڕێی ڕیوایەتی جێگیر و نەپچڕاو چەندین هەواڵمان بۆ دەگوێزێتەوە کە بە دڵنیایی ڕەها وەسف دەکرێن.

قورئان کتێبێکە هەرگیز ڕێگایەك بۆ لاسایی کردنەوەی نییە، هەموو یەکێکی دەستەواژەکانی گشتی و هەمەلایەنەن، لەگەڵ ئەوەشدا قەبارەیەکی گونجاوی هەیە، نە هێندە دوور و درێژە لە پێویست زیاتر بێت و نە هێندەش کورتە کە لە پێویست کەمتر بێت. شێوازەکەشی ڕەسەن و تاقانەیە. لەو ئەدەبی عەرەبییەی گەیشتووەتە دەستمان و هی سەردەمانی پێش قورئانن، هیچ جۆرە شێوازێکی هاوشێوەی قورئان نییە.

ئەو کاریگەرییەش کە قورئان لە دەروونی مرۆڤدا دروستی دەکات تەنها لە ڕێی بەرزیی سەلیقەی خۆیەتی و بە بێ هیچ هاوکارێکی دەرەکی و خستنە پاڵی شتێکی دیکەیە. هەموو یەکێکی ئایەتەکانی لە هەمان ئاستی ڕەوانبێژیدان تەنانەت لەو

(١) هەمان سەرچاوە: ٧/٢٠.

(٢) "لاورا ڤیچە ڤایلێری Laura Veccia Vaglieri" ئافرەتە توێژەرێکی هاوچەرخی ئیتالییە. لێ براوە بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی کۆن و نوێی ئیسلام و، فیقهی زمان و ئەدەبیاتی. ئەمەش ناوی هەندێکە لە بەرهەمەکانی: "قواعد العربية" دوو بەرگ (١٩٣٧ - ١٩٤١ز)؛ "الإسلام" ١٩٤٦ز؛ "دفاع عن الإسلام" ١٩٥٢ز، هەروەها چەندین لێکۆڵینەوەی دیکەش کە لە گۆڤارە ناسراوەکانی "خۆرهەڵاتناسی"دا بڵاو کراونەتەوە.

کاتانەشدا کە باس لە بابەتگەلێك دەکات کە دەبوو کاریان بکردایەتە سەر ئایەتەکان و زایەڵەیان، وەك بابەتەکانی وەسیەت و نەهی و هاوشێوەیان.

"قورئان" چیرۆکی پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێت - و، وەسفەکانی سەرەتا و کۆتایی جیهان و، سیفەتەکانی خوا و لێکدانەوەیان دووپات دەکاتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی هێندە سەرنج ڕاکێش کە کاریگەرییان لاواز ناکات.. هەروەها لە بابەتێکەوە دەگوێزێتەوە بۆ بابەتێکی دیکە، بێ ئەوەی هێز و پێزی خۆی لەدەست بدات.

ئێمە لە شێوازی ئەم قورئانەدا دەکەوین بەسەر "قووڵی" و "سازگاری"دا پێکەوە، کە دوو سیفەتن بەپێی عادەت (لە بەرهەمێکدا) کۆ نابنەوە، چونکە جێبەجێ بوونی هەموو وێنەیەکی ڕەوانبێژیی بە تەواوی تێدا دەبینیت. ئیتر چۆن دەکرێت ئەم کتێبە دەستەوسانکارە کاری محەممەد ﷺ بێت، کە ئەو عەرەبە نەخوێندەوارەیە دوو سێ بەیت نەبێت زیاتری نەهۆنیوەتەوە کە ئەوانیش هیچ بەهرەیەکی شیعری پیشان نادەن"[١]؟

٢-" هێشتا هەر بەڵگەیەکی دیکەشمان بۆ سەرچاوە خواییەکەی قورئان لە بەردەستدایە لەم حەقیقەتەدا، کە بریتییە لەوەی: بە درێژایی ئەو سەدە درێژخایەنانەی نێوان نازڵبوونی و هەتا ئەمڕۆ، دەقەکەی بە پاك و خاوێنی و بێ هیچ دەسکارییەك ماوەتەوە. بە پشتیوانیی خوا هەتا گەردوونیش بمێنێت بەو حاڵی پاك و خاوێنی و دەسکاری نەکراوییەی دەمێنێتەوە"[٢].

٣-"ئەم کتێبەی کە ڕۆژانە بە پانتایی و درێژیی جیهانی ئیسلامی دەخوێنرێتەوە، هیچ هەستێکی بێزاری ناخاتە دەروونی ئیماندارەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە ڕێی خوێندنەوەی دووپاتبوو "قورئان" ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پتر خۆی لای ئیمانداران خۆشەویست دەکات.

قورئان هەستێکی قووڵی سام و شکۆمەندی دەهاوێتە دەروونی ئەو کەسەی کە دەیخوێنێتەوە یان گوێبیستی دەبێت. مرۆڤ بە ئاسانی و بێ هیچ گرفتێك دەتوانێت لەبەری بکات. تەنانەت لەمڕۆدا و لەگەڵ پاشەکشێی شەپۆلی ئیمانیشدا هەزاران کەس دەبینین کە دەتوانن هەموو قورئان لەبەر بخوێننەوە. هەر تەنها ژمارەی ئەوانەی کە لە

---

(١) دفاع عن الإسلام: ٥٦ -٥٧.

(٢) هەمان سەرچاوە: ٥٨ - ٥٩.

میسردا قورئانیان لەبەرە زۆر زیاترە لە ژمارەی ئەوانەی کە لە هەموو ئەورووپادا دەتوانن ئینجیل بخوێننەوە"[١]!

٤-"بڵاوبوونەوەی خێرای ئیسلام نە لە ڕێی "هێز"ەوە بووە و، نە بە هەوڵ و تەقالای دانەبڕاوی موبەششیرەکان. بەڵکو ئەو تەنها شتەی کە بووەتە هۆی ئەو بڵاوبوونەوەیە لەوەدایە کە ئەو کتێبەی موسڵمانەکان پێشکەشی گەلە ژێرکەوتووەکانیان کرد و سەرپشکیان کردن لە وەرگرتن یان لە وەرنەگرتنیاندا: کتێبی خوایە.. وشەی حەقە.. گەورەترین موعجیزەیە کە محەممەد ﷺ توانیویەتی پێشکەشی کەسە ڕاڕاکانی سەر ئەم زەوییەی بکات"[٢].

٥-سەبارەت بە هەر شتێك کە پەیوەندیی بە بەدیهێنانی گەردوونەوە هەبێت، ئەوا قورئان وێڕای ئاماژەدانی بە حاڵەتی بنەڕەتی و بناغەی جیهان، هیچ سنوورێك لە بەردەم هێزەکانی ژیریی مرۆڤدا دانانێت، بەڵکو ڕێگا بە ڕەهایی و کراوەیی دەخاتە سەر پشت، تاکو ژیرییەکان ئەو ڕێگایە بگرنەبەر کە دەیانەوێت"[٣].

## ڤەیز[٤]

هەندێ لە وتەکانی:

١ - "بەم جۆرە و بە ئاماژەدان بە هۆشیاری و ژیری و زانیاریی مرۆڤ، قورئان دەستی کرد بە نازڵبوون"[٥].

(١) هەمان سەرچاوە: ٥٩.

(٢) هەمان سەرچاوە: ٥٩.

(٣) هەمان سەرچاوە: ٦٠.

(٤) "لیۆپۆلد ڤەیز Leopold Weiss" بیریار و ڕۆژنامەنووسێکی خەڵکی نەمسایە، موسڵمان بووە و خۆی ناوناوە "محەممەد ئەسەد". لە کتێبە بەنرخەکەیدا "الطريق إلى مكة" درێژەی گەشتی خۆی بەرەو ئیسلام باس کردووە. ساڵی ١٩٢٧ز لە شاری حەیدەر ئابادی هیندستان لەگەڵ ئۆ موسڵمانێکی دیکەدا بە ناوی "ولیەم پیکتۆڵ" گۆڤاری "الثقافة الإسلامية"ی دەرکردووە کە تیایدا گەلێ هەڵەی خۆرهەڵاتناسانی لە بارەی ئیسلامەوە ڕاست کردووەتەوە. ئەمەش ناوی هەندێکە لە بەرهەمەکانی: وەرگێڕانی صەحیحی بوخاری بۆ زمانی ئینگلیزی؛ أصول الفقه الإسلامي؛ الطريق إلى مكة؛ منهاج الإسلام في الحكم؛ الإسلام على مفترق الطرق.

(٥) الطريق إلى مكة: ٣٠٣.

٢ - "ئەلیسای خێزانم - بە وێنەی من - بە تێپەڕبوونی کات پتر دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو پێکەوە نووسانە نادیارەی نێوان ڕێنماییە ڕەوشتییەکانی قورئان و ڕێنماییە عەمەلییەکانی. خوا لە ڕوانینی قورئانەوە داوای ملکەچییەکی نابینایانەی لە مرۆڤ نەکردووە، بەڵکو لەگەڵ ژیریی مرۆڤدا دواوە کە: خوا لە چارەنووسی مرۆڤەوە دوور نییە، بەڵکو لە ڕەگی لاملی نزیکترە لێیەوە. قورئان هیچ هێڵێکی جیاکەرەوەی نەکێشاوە لە نێوان ئیمان و ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکاندا"[١].

٣ - "ئێستا و بە شێوەیەك كە دەمقاڵی هەڵناگرێت تێدەگەم ئەو کتێبەی گرتبووم بە دەستمەوە کتێبێك بووە لە لایەن خوای گەورەوە بە وەحی هاتووە. خۆ هەرچەندە زیاد لە سیازدە سەدەیە لە بەردەستی مرۆڤدا دانراوە، کەچی قورئان بە ئاشکرا چاوەڕوانی هاتنەدیی شتی ئەوتۆ بووە کە مەگەر لەم سەردەمە ئاڵۆزەی ئێمەدا توانرابێت وەك حەقیقەتێك بێتەدی.

خەڵکانی هەموو سەردەمێك پێشبڕکێیان بۆ زۆرکردنی ماڵ و مناڵ و سامان بە خۆیانەوە بینیوە، بەڵام هیچ کاتێکی پێشتر ئەم پێشبڕکێیە بۆ زۆرکردن نەگەیشتووەتە ئەوەی کە تەنها حەزێکی پەتی بێت بۆ خاوەندارێتیی شتەکان و، ببێتە یاری و ڕابواردنێك ڕێ لە بینینی شتی تر بگرێت، وەك ئەوەی کە لەمڕۆ زیاتر لەچاو دوێنێ و سبەینێش زیاتر لەچاو ئەمڕۆدا ڕوودەدات.

ئێستا تێ گەیشتم کە ئەمە[٢] تەنها حیکمەتێکی مرۆیی کەسێك نەبووە کە لە ڕابوردوویەکی دووری ناو دوورگەی دووری عەرەبدا ژیابێت. چونکە ئەم مرۆڤە چەندەش تا ئەم ڕادەیە حیکمەتی لەم جۆرەی هەبێت، هێشتا هەر بە تەنیا خۆی ناتوانێت پێشبینی بۆ ئەو سزایە بکات کە ئەم سەدەی بیستەمە پێی تایبەتمەدە.

لە ڕاستیدا لە قورئانەوە دەنگێك لەگەڵ مندا دەدوا کە زۆر گەورەتر بوو لە دەنگی محەممەد ﷺ"[٣].

---

(١) هەمان سەرچاوە: ٣١٨.

(٢) ئاماژە بۆ سوورەتی "التكاثر"ی قورئانی پیرۆز دەکات کە بە ئیعجازێکی غەیبی هەواڵی لە قەیرانی سەدەی بیستەم داوە.

(٣) هەمان سەرچاوە: ٣٢٨ - ٣٢٩.

## فیشەر[١]

هەندێ لە وتەکانی:

١- "قورئان گوفتاری خوایە، دڵی ئیماندار کەمەندکێش دەکات و، جوانی‌یەکەی پتر دەردەکەوێت کە بە دەنگێکی بیستراو بخوێنرێتەوە"[٢].

٢-"قورئـان کتێبـی پـەروەردە و رۆشـنبیرکردنە. هـەموو شـتانی نـاوی لـەبارەی فەرزەکان و رێ و رەسمە ئایینی‌یەکانەوە نی‌یە. ئەو کردار و ئاکارە بەرزانەی کـە قورئـان هـانی موسـڵمانانیان بۆ دەدات جوانـترین ئاکـار و قورسـترینیانن لـە تـەرازووی رەوشـتە بەرزەکاندا. رێنمایی ئەم کتێبە لەو شتانەدا دەردەکـەوێت کـە "نـەهی"ی لـێ کـردوون، وەك ئەوەی کە لەو شتانەدا دەردەکەوێت "فەرمان"ی پێ داون"[٣].

## گیب[٤]

هەندێ لە وتەکانی:

١- "گەر کەسێك رای وابێـت کـە قورئـان جـەختی زۆری لەسـەر کرداری چاکـە نەکردووەتەوە، ئێمە بە بەڵگە هەڵەکەی ئەو کەسە دەسەلمێنین و، ئەو پێناسـە گشـتگیرەی "چاکە"ی بۆ دەهێنین کە لەم ئایەتە مەزنەدا هەیە:

---

(١)"دکتۆر سیدنی فیشـەر Sydney Fisher" مامۆستای مێژوو بووە لـە زانکـۆی ئۆهـایۆی ئـەمریکا و، خاوەنی چەندین لێکۆڵینەوەیە لـە کاروبـاری وڵاتـەکانی خۆرهـەڵاتدا کە زۆرینـەی رۆڵـەکانی موسـڵمانن و، دانەری کتێبی "الشرق الأوسط في العصر الإسلامي"یە کە تیایدا لەو هۆکارە کارایانە دەدوێـت بوونەتـە هـۆی بەرەوپێش چوونی گەلان و رووداوەکانی ئەم ناوچەیە، کە یەکەمیان "ئیسلام"ە.

(٢) الشرق الأوسط في العصر الإسلامي. لە کتێبی "ما يقال عن الإسلام"ی عەققادەوە: ٥٤.

(٣) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

(٤) "سێر هـاملتن ئـەلێکزاندەر رەسـکین گیـب Sir Hamilton Alexander Rosskeen Gibb" کەسایەتی‌یەکی ناوداری سکۆتلەندی‌یە و، بە پێشەوای خۆرهەڵاتناسە هاوچەرخەکانی بەریتانیا دادەنرێت و، یەکێکە لە نووسەرانی ئینسایکلۆپێدیای ئیسلامی. لە ساڵی ١٩٣٠ز دا بووە بە مامۆستای زمانی عـەرەبی لـە زانکۆی لەندەن. لـە سـاڵی ١٩٣٧ز دا بـووە بـە مامۆسـتای زانکـۆی ئۆکسـفۆرد. ئەندامی دامەزرێنەرە لە کۆڕی زانیـاریی میسـری. لـێ براوە بۆ ئـەدەبی عـەرەبی و وانـەی ئـەو ئەدەبـەی لـە "قوتابخانەی ئادابـەکانی خۆرهەڵات" لە لەندەن وتووەتەوە. لە بەرهەمەکانی: دراســات في الآداب العصريــة ١٩٢٦؛ الفتوحــات الإسلامية في آسيا الوسطى؛ إتجاهات الإسلام المعاصرة.

﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَـكِنَّ الْبِرَّ مَنْ ءامَنَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلآئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَءاتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّآئِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلاةَ وَءاتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُواْ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ والضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَـئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَـئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ﴾ (البقرة: ١٧٧).

کەواتە "چاکە" تاجی ئیمانی ڕاستەقینەیە کاتێ کە ئیماندار لە دەرەنجامدا تێدەگات خوای گەورە هەمیشە دەیبینێت. بۆیە ئیماندار لە هەموو بیر و کردارێکیدا بەدەم ئەو بینینەی خواوە دەڕوات"[(١)].

٢- "کەواتە ئەمە ئەو پەیامەیە کە قورئان گەیاندی بە یەکەم دەستەی موسڵمانان و، لەو کاتەوە بەردەوام دەیگەیەنێت بە هەموو نەوەکانی دیکەش. قورئان تۆماری ئەزموونێکی ڕاستەوخۆی زیندووە لە مەیدانی "ئولووهییەت"دا، ئەزموونێکی دوو سەرە: یەکێکیان تەنیای ڕەهایە و، ئەوی دیکەیان پەیوەستە بە کاروبارە گشتییەکانی ژیانەوە و، بانگهێشتێکە بۆ "بەدیهاتوو" بۆ ئەوەی ژیانی خۆی ڕێك بخات، تاکو بتوانێت بەشی خۆی لەو ئەزموونەدا وەربگرێت.

کاتێ موسڵمان بە شوێن فەرمانەکانی قورئاندا دەگەڕێت و تێدەکۆشێت گیانی ڕێنماییەکانی نەك تەنها بە هزر و بیر، بەڵکو بە دڵ و گیانیش تێبگات، ئەوا هەوڵ دەدات کە شتێك لەو بینینە حەدسی و ئەزموونە بەدەست بهێنێت کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ هەیبوو.

کاکڵەی هەموو ئایەتێکی قورئان لە پێش چاوی موسڵماندا گەورە دەبێت، لەبەر ئەوەی ئیمانی بەوە هەیە کە گوفتاری خوایە.

تەنانەت ئەگەر ئەم ئیمانەش لقێك نەبێت لە بیر و باوەڕەکەی، ئەوا لەو ڕووەوە کە سەرچاوەیەکی زیندووی ئیلهام بەخشین و بینایی ئایینییە، هەر بەهای لای ئەو کەم ناکاتەوە"[(٢)].

---

(١) دراسات في حضارة الإسلام: ٢٥٤.

(٢) هەمان سەرچاوە: ٢٥٤.

٣- "ڕاست و ناڕاستیی بەهرەوەرگرتنی ئیسلام لە ئایینەکانی پێش خۆی چەندەش بێت، هەر ئەم ڕاستی‌یە ناگۆڕێت کە: ئەو هەڵوێستە ئایینی‌یانەی قورئان دەری بڕیون و گەیاندوونی بە خەڵك، تەلارێکی ئایینیی نوێ و جیاواز لەخۆ دەگرن"(١).

٤- "هەرچەندەش زانایانی دواتر گەشەیان بە زانستێکی "کەلام"ی ئیسلامی و مەنهەجی دا، بەڵام هێشتا ئەوەی پێشتر وتمان هەر ڕاستە کە: جەماوەری موسڵمانان لە چەند گەلێك پێکهاتبوو کە جێبەجێ کردنی ڕاستی‌یەکانی ئایین بە مومارەسەیەکی حەدسی، کاریگەری‌یەکی بەهێزتر و خێراتری لە هەر ئەندازەیەکی وتووێژی عەقلی و وریایی و کارامەیی، لای ئەوان بەجێ‌هێشتبوو"(٢).

٥- "ئێمە هەڵەیەکی زۆر گەورە دەکەین گەر ڕوانینمان بۆ ئەم بیر و باوەڕە تەنها بە وێنەی ڕوانینمان بێت بۆ ڕێچکەیەکی لاهووتیی ئەوتۆ کە بەشێوەیەکی بۆماوەیی لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە لە ماوەی هەزار و سێ‌سەد ساڵدا هاتبێت و ڕێکوپێك کرابێت. بەڵکو ڕاستی بە پێچەوانەی ئەمەوەیە، دڵنیایی و ئیمانێکی زیندووە کە بەردەوام لە دڵ و گیان و بیری موسڵماناندا تازە دەبێتەوە و جەختی لەسەر دەکرێت کاتێ دیراسەی دەقە پیرۆزەکە دەکرێت.

ڕێبازی ئەهلی سوننەت، کە بە شێوەیەکی گشتی ڕێبازە دەستگرەکەیە بە قورئانەوە، نەیاری وەرگێڕانی قورئانە بۆ زمانە ئیسلامی‌یەکانی تر، هەرچەندەش هەندێ جار لەگەڵ وەرگێڕانی تورکی یان فارسی یان ئوردی و زمانەکانی دیکەشدا پێش چاو دەکەوێت. ئەم هەڵوێستی نەیاری کردنی وەرگێڕانە پشت بە داوەری‌یەکی شەرعیی توندوتۆڵ دەبەستێت کە تا ڕادەیەك بەڵگەکانی بە شێوەیەکی "ژیری"یانە دادەڕێژێت و، لەوەشدا پشت بە چەند ڕەچاوکردنێکی دوور لە "ژیری" دەبەستێت.

لە واقیعدا ناتوانرێت بە شێوەیەکی بنەڕەتی تەرجەمە بکرێت، وەك ئەوەی کە شیعری بەرز و بڵند تەرجەمە ناکرێت، چونکە لە تواناندا نی‌یە کە بە زمانی ئاسایی گوزارشت لە گەوهەری قورئان بکرێت و، ناتوانرێت وێنا و نموونەکانی بە وەرگێڕان دەربڕدرێن.

(١) هەمان سەرچاوە: ٢٥٤ - ٢٥٥.

(٢) هەمان سەرچاوە: ٢٥٥.

چونکە هەر عەتفێك یان هەر مەجازێك یاخود هەر کارامەییەکی زمانەوانی لـە قورئـاندا دەبێ بە درێژی لێکۆڵینەوەی لـێ بکرێت هەتا واتاکەی بۆ خوێنەر دەردەکەوێت.

هەروەها قورئان شیرینی و پاراوی و هۆنینێکی ناوازەی ڕێکوپێکی ئەوتۆی هەیـە کـە ناتوانرێت سنووری بۆ دیاری بکرێت، چونکە ئەو کاریگەرییـەی قورئـان کـە وەك هـی کاریگەری سیحر وایە، بیر و هزری کەسی بیسەر بۆ وەرگرتنـی ڕێنماییـەکانی ئامادە و لەسەر پێ دەکات.

بێ گومـان وەرگێڕانی وشـەکانی قورئـان بـۆ زمـانێکی تر، دەیشـێوێنێت و زیـانی خالیس دەکات بە سوالەت"[1].

## کۆبۆڵد[2]

هەندێ لە وتەکانی:

١ - "... باسـی ئەوەشـم کـردووە کـە لـە قـورئـاندا هـاتووە لـەبارەی بەدیـهێنانی جیـهان و، ئـەوەش کـە چـۆن خـوای گـەورە لـە هـەموو "جـۆر"ێکـی بەدیـهاتووان "جووت"ێکی دروست کردووە و، کە چۆن زانستی نـوێ، دوای چـەندین توێژینـەوەی دوور و درێژ و لێکۆڵینەوەی ئەوتۆ کە چەند جیلێکی خایـاندووە، ئنجا ئـەم بۆچوونـەی پشت ڕاست کردووەتەوە"[3].

٢ - "جێدەستی قورئان لەم هـەموو پێشکەوتنە شارستانێتی‌یەی ئیسلامدا نکوڵیـی لـێ ناکرێت. چونکە هەر تەنها قورئان عەرەبەکانی هان دا جیهان فەتح بکەن و، ڕێی بـۆ ئاسـان کـردن کـە ئیمپراتۆرییـەك دابمەزرێنن لـەوەی ئەسکەندەری گـەورە زیـاتر و لـە ئیمپراتۆرێتیی ڕۆمیش فراوانتر و بەهێزتر و ئاوەدان تر و شارستانی تر بوو"[4].

---

(١) الاتجاهات الحديثة في الإسلام: ٣٠- ٣١.

(٢) "لەیدی ئیڤلین کۆبۆڵد Lady Evelyn Cobbold" ئافرەتە وەجاخزادەیەکی سکۆتلەندییە. موسڵمان بووە و خۆی ناوناوە "زەینەب" و، سەردانی حیجاز و حەجی ماڵی خوای کردووە. یاداشتەکانی ئەو گەشتەی لە کتێبێکدا بە ناونیشانی "حەج بۆ مەککە" لە لەندەن ساڵی ١٩٣٤ز بڵاو کردووەتەوە، کە بە زمانی عـەرەبی بە ناوی "البحث عن الله" چاپ کراوە.

(٣) البحث عن الله: ٤٥.

(٤) هەمان سەرچاوە: ٥١.

٣ - "لە واقیعدا ڕستەکانی قورئان و ناوازەیی شێوازەکەی شتێکە قەڵەم ناتوانێت وەسف و پێناسەی بکات. بێگومانە کە وەرگێڕان جوانی و ڕەنگینی و مۆسیقای وشەکانی ناهێڵێت کە لە هیچ کتێبێکی تردا نییە. لەوانەیە ئەوەی کە "جوهانسن"ی خۆرهەڵاتناس لەم بارەیەوە نووسیویەتی گوزارشتێکی تەواو بێت لە ڕای ڕۆشنبیرانی فەرەنگ و گەورە بیریارانی. کاتێ کە وتوویەتی:

گەر شیعر نەبێت، کە ئەوەش گومانی تێدایە، چونکە دژوارە مرۆڤ بڵێت: شیعر یان شتێکی تری جگە لەوە. لە ڕاستیدا زۆر لە شیعر گەورەترە. لەگەڵ ئەوەشدا مێژوو نییە و وەسفیش نییە و، بە وێنەی "ئامۆژگاریی چیاکە"ش[1] نییە و، نە زۆر و نە کەم لە کتێبی "بووزییەکان"یش ناچێت. هەروەها چەند وتارێکی فەلسەفیی چەشنی گفتوگۆکانی "ئەفلاتون"یش نییە. بەڵکو دەنگی پێغەمبەرێتییە لە دڵە بڵندەکانەوە دەردەچێت و، لە ڕستەکانیدا جیهانییە و، سوورەت و ئایەتە جیا جیاکانی دارای واتای قووڵن. تەنانەت لە هەموو شوێنێکدا و لە هەموو وڵاتێکدا کە خۆری لێ هەڵدێت دەخوێنرێتەوە"[2].

٤ - "دکتۆر ماردیل"ی خۆرهەڵاتناسی فەرەنسی کە حکوومەتی فەرەنسا ئەرکی وەرگێڕانی هەندێ سوورەتی قورئانی خستە ئەستۆ، ئاماژەی بۆ ئەو تایبەتکارییانەی قورئان کردووە کە لە هیچ کتێبێکی تری جگە لەودا نییە. وتوویەتی:

سەبارەت بە "شێوازی قورئان" ئەوا شێوازی بەدیهێنەری مەزنە، چونکە ئەو شێوازەی کە قورئان هەیەتی و ئەو کەسەی کە لە پشتی ئەو شێوازەوەیە جگە لە خوا کەسی تر نییە. لە ڕاستی و واقیعدا بەگومان ترینی نووسەرەکان سەریان بۆ دەسەڵات و سیحری قورئان نەوی کرد.

ئەو دەسەڵاتەی کە قورئان هەیەتی بەسەر ملیۆنەها موسڵمانی بڵاو بەسەر ڕووی زەویدا لە ڕادەیەکدایە کە موبەششیرە بیانییەکانی وا لێ کردووە دان بەوەدا بنێن کە

(١) "ئامۆژگاریی چیاکە" بریتییە لە سێ بەندی یەك لە دوای یەکی ئینجیلی مەتتا کە پێی وایە "مەسیح" درودی لەسەر بێت، لەسەر چیایەك بیست و یەك بابەتی بۆ قوتابیانی خۆی باس کردووە کە کاکڵەی "ئینجیل"ن، تەنانەت کاکڵەی سەرجەم ئامۆژگارییەکانی ئەون بۆ قوتابیانی. (وەرگێڕ)

(٢) هەمان سەرچاوە: ١١١- ١١٢.

مەحالە تا ئێستا یەك ڕووداو بسەلمێنرێت كە موسڵمانێك لە ئایینەكەی خۆی پاشگەز بووبێتەوە. چونكە ئەم شێوازەی قورئان كە لە ڕێكوپێكی‌یەكی توندوتۆڵدا ڕەوانیی لێ دەچۆڕێت، كاریگەری‌یەكی قووڵ لە دەروونی هەر بیسەرێكدا كە لە زمانی عەرەبی تێبگات بەجێ دەهێڵێت. لەبەر ئەوە، هەر هەوڵێك بۆ گواستنەوەی كاریگەریی ئەم پەخشانە ناوازەیەی كە هاوشێوەی نەبیستراوە بدرێت بۆ هەر زمانێكی دیكە، هەوڵێكی بێ ئەنجامە"[(١)].

٥ - "لە واقیعدا قورئان شێوازی سەرسووڕهێنەری هەیە و جیاوازە لە هۆنراوە و پەخشانی عەرەب. چونكە جوانیی داڕشتنی و، یەكانگیر بوونی وشەكانی و، ڕووەكانی پوختكردنەوەی و، باشیی بڕگەكانی و، جوانیی بەڵگەهێنانەوەكانی و، پێكەوەگونجانی چیرۆكەكانی و، ناوازەیی نموونەكانی و، تایبەتمەندی‌یەكانی جگە لەمانەش، قورئانیان گەیاندووەتە بڵندترینی پلەكانی ڕەوانبێژی و، هێزێكیان بە شێوازەكەی داوە كە دڵان پڕ لە جوانی دەكەن و، خوێنەرەكەشی لێی بێزار نابێت و وتنەوەی چەند جارەش كۆنی ناكات.

قورئان بە ئاسانیی وشەكانی تایبەتمەندە، بە ڕادەیەك كە دەگمەنە وشەیەكی نامۆی تێدا ببینیت. هاوكات لەگەڵ ئاسانی‌یەكەیدا ڕەوان و سازگاریشە، وشەكانی لەگەڵ یەكتردا هاوشێوە و دەست لەملانن، هەست ناكەیت وشەیەكی تێدا بێت بە براكەی بێگانە بێت. جا ئەگەر بەرزیی واتاكانیشی بخەیتە سەر ئەمە، ئەو كاتە پەی بە ڕەوانبێژی و ئیعجازەكەی دەبەیت"[(٢)].

## كویلیەم[(٣)]

هەندێ لە وتەكانی:

---

(١) هەمان سەرچاوە: ١١٢- ١١٣.

(٢) هەمان سەرچاوە: ١١٣.

(٣) "عەبدوڵلا كویلیەم" بیرمەندێكی ئینگلیزە. ساڵی ١٨٥٦ز لەدایك بووە و، ساڵی ١٨٧٧ز موسڵمان بووە و، نازناوی "شێخ عەبدوڵلا كویلیەم"ی بۆخۆی داناوە. لە بەرهەمەكانی: العقیدة الإسلامیة؛ أحسن الأجوبة.

١ "تەنها لە رووە زانستی‌یەکەیەوە و بە بێ روانینە ئەوەی کە کتێبێکی وەحی کراوە، قورئان رەوانترین کتێبە لە خۆرهەڵاتدا و، پڕە لە مەجازە بڵندەکان و ئیستیعارە رەنگینەکان"(١).

٢- "بڕیارەکانی قورئان تەنها تایبەت نین بە فەرزە ئەدەبی و ئایینی‌یەکانەوە. بەڵکو قورئان یاسای گشتیی جیهانی ئیسلامی‌یە، یاسایەکی گشتگیرە بۆ یاسای شارستانی و بازرگانی و جەنگی و داوەری و سزاکان..

پاشان یاسایەکی ئایینی‌یە کە هەموو کاروبارێکی دین و دنیا لەسەر ئەو تەوەرەیە بەڕێوە دەبرێت، هەر لە پاراستنی گیانەوە تا پاراستنی جەستە، لە مافی هاوولاتی‌یانەوە تا مافی تاك، لە سوودی خودیی تەنیا مرۆڤەوە تا سوودی کۆمەڵگا، لە چاکەوە تا خراپە، لە تۆڵەسەندنەوەی ئەم دنیاوە هەتا تۆڵەسەندنەوەی ئەو دنیا..

کەواتە قورئان بەم پێیە لە رووی ماددی‌یەوە جیایە لە کتێبە پیرۆزەکانی مەسیحییەت کە هیچ شتێکیان لە بنەما ئایینی‌یەکان تێدا نی‌یە، بەڵکو زیاتر پێکهاتەیەکە لە چیرۆك و خورافات و تێکەڵەیەك لە کاروبارەکانی پەرستن و، لەگەڵ ژیریدا یەك ناگرنەوە و، کاریگەری‌یان نی‌یە"(٢).

٣- "لە ئینسایکلۆپێدیای گشتی"دا بڕگەیەکم دۆزی‌یەوە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

زمانی قورئان بە رەوانگۆترینی ئەو شتانە دادەنرێت کە لە زمانی عەرەبیدا هەن. چونکە جوانیی داڕشتنەکەی و قەشەنگیی کارامەیەکەی، بە بێ لاساییکار و بە بێ هاوشێوەیی هێشتوویانەتەوە. بڕیارە عەقڵی‌یەکانیشی پوخت و خاوێنن و، گەر مرۆڤ بە بینایی دڵ بیریان لێ بکاتەوە ژیانێکی شادمان بەسەر دەبات"(٣).

٤- "هەر کەسێك چاوی پەند وەرگرتن بەم قورئانەدا بگێڕێت کە کتێبی حیکمەتە و، بە وردی بڕوانێتە شێوازە ناوازەکانی و ئیعجازەکەی، دەبینێت کە هەرچەندەش هەزار و سێ‌سەد و بیست ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە، کەچی دەڵێی لەم سەردەمەدا وتراوە. چونکە

(١) العقيدة الإسلامية: ١١٩-١٢٠.
(٢) هەمان سەرچاوە: ١٢٢-١٢٣.
(٣) هەمان سەرچاوە: ١٣٩-١٤٠.

هاوکات لەگەڵ ئاسانی‌یەکەیدا ڕەوانە و، لاسایی کردنەوەی لە تواناد‌ا نی‌یە. چەندەش کورت و پوختە کەچی بە تەواوی مەبەستەکەی دەگەیەنێت. هەروەك لە کاتی سەرهەڵدانیدا، لە ڕووی زار و شێوازیەوە بە پراوپڕی گوفتار دادەنرا، بە هەمان جۆر لە هەموو سەردەم و زارێکدا پراوپڕی گوفتارە. هەتا پتر توانای کاری نووسین پێش بکەوێت، زیاتر نرخی ڕەوانبێژی‌یەکەی دەزانرێت و، تایبەتکاری‌یەکانی بۆ ژیری‌یەکان دەردەکەون.

بە پوختی:

زمانپاراوی و ڕەوانبێژی‌یەکەی، سەرجەم ڕەوانگۆیانی زمانپاراوی دەستەوسان کردووە و، زمانپاراوەکانی سەرەتا و دواییشی سەرسام کردووە. خۆ ئەگەر لە ڕووی "ئەحکام"ەوە جارێکی دی سەیری بکەینەوە و بۆ ئەو بڕیارانە بڕوانین کە قورئان لەخۆی گرتوون، دەبینین هەموو ئەو شتانەی لە خۆیدا کۆ کردووەتەوە کە پێداویستیی مرۆڤن بۆ ژیان و کەماڵ و ڕێك کردنی ڕەوشتی. "نەهی"ی لەو کردار و ڕەوشتە خراپانەش کردووە کە بە ئەزموونە زۆرەکان سەلماوە ناشیرینن و زیانیان هەیە.

جگە لەوانە، گەلێ شتی دیکەشی تێدایە کە پەیوەندی‌یان بە سیاسەت و ئاوەدانیی شارەکان و وڵاتەکانەوە هەیە و، ئەوانەش کە ئاسایش و ئارامی بۆ میللەت دەستەبەر دەکەن لەو بڕیارە شکۆدارانەی قورئان کە بە کردەوە و ئەزموون، چ جای بە وتن، سوود و زیانەکانیان دەرکەوتووە"[١].

٥ - "دوو شت لە نێوان چاکەکاری‌یەکانی قورئاندا زۆر ڕوونن:

یەکەمیان: نیشانەی ویقار و گوێڕایەڵی، کە هەمیشە بە موسڵمانانەوە دەبینرێت کاتێ لە بارەی خواوە دەدوێن و ئاماژەی بۆ دەکەن.

دووهەمیان: نەبوونی چیرۆکە ئەفسانە و خورافیاتەکان و باسی عەیب و خراپەکانە.. هتد تیایدا. ئەوەی کە - بەداخەوە - بە زۆری لەو شتەدا هەیە کە مەسیحی‌یەکان پێی دەڵێن: (پەیمانی کۆن).."[٢].

---

(١) أحسن الأجوبة: ٢٣-٢٦.

(٢) العقيدة الإسلامية: ٣٨.

## لاندۆ[١]

هەندێ لە وتەکانی:

١- "لەبەر ئەوەی ئەرکی وەرگێڕانی قورئان بە هەموو وزە زایەڵەییەکانی خۆی بۆ زمانێکی تر پێویستی بە بایەخدانی کەسێك دەبێت کە "شاعیری" و "زانست"ی کۆکردبێتەوە، ئەوا تا ماوەیەکی نزیکیش وەرگێڕانێکی باشمان نەبینیوە کە توانیبێتی شتێك لە ڕۆحی "وەحی"ی محەممەدی بقۆزێتەوە.

لە واقیعدا زۆرێك لە وەرگێڕەکانی پێشین نەك تەنها لە پاراستنی جوانیی ئەسڵەکەدا دەستەوسان بوون، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا هێندە پڕبوون لە ڕق بەرامبەر بە ئیسلام کە وەرگێڕانەکانیان لە ژێر بارێکی قورسی ڕقەکاندا دەیانناڵاند. تەنانەت باشترین وەرگێڕانیش کە لە شێوەی نووسراودا لە توانادا بێت هێشتا هەر ناتوانێت زایەڵەی پەخسیرکەری سوورەتەکانی قورئان وەك خۆی بپارێزێت بەو شێوەیەی کە موسڵمان دەیخوێنێتەوە.

مرۆڤی خۆرئاوایی لە توانایدا نییە کە پەی بە هەندێ لە جوانی و هێز و پێزی قورئان ببات، مەگەر کاتێ گوێبیستی چەند بڕگەیەکی ببێت کە بە زمانە ئەسڵییەکەی بخوێنرێتەوە"[٢].

٢ - "کۆکردنەوەی ئایەتەکانی قورئان لە شێوەی کتێبێکدا خرایە ئەستۆی نووسەرەوەی "وەحی": زەیدی کوڕی سابیت، ئەبوبەکر - خوای لێ ڕازی بێت - خۆی سەرپەرشتیی ئەم ئەرکە گرنگەی دەکرد. دواتریش و لە ئەنجامی هەوڵێکی نوێ و بە فەرمانی خەلیفە عوسمان - خوای لێ ڕازی بێت - قورئان دوایین شێوەی تەشریعیی

---

(١) "ڕۆم لاندز Rom Landau" پەیکەرتاش و ڕەخنەسازێکی هونەریی ئینگلیزە. ساڵانی ١٩٥٢ - ١٩٥٧ز لە چەندین زانکۆی ئەمریکا وانەبێژ بووە و، ساڵی ١٩٥٣ز لە کۆمەڵگای ئەمریکا بۆ لێکۆڵینەوە ئاسیاییەکان لە "سان فرانسیسکۆ" مامۆستای لێکۆڵینەوەکانی لەمەڕ ئیسلام و باکووری ئەفریقیا بووە. لە بەرهەمەکانی: الله ومغامرتي ١٩٣٥ز؛ "بحث عن الغد ١٩٣٨ز؛ "سلم الرسل ١٩٣٩ز؛ دعوة إلى المغرب ١٩٥٠ز و، جگە لەمانیش.

(٢) الإسلام والغرب: ٣٦-٣٧.

خۆی وەرگرت کە بە ساغ و سەلامەتی و بێ هیچ دەستکاری‌یەك گەیشتووەتە دەستمان"[١].

٣ - "پەیوەندی‌یەکی ڕەنگین لە نێوان ئایەتەکانی کورتە سوورەتەکاندا هەیە کە کاریگەریی خۆی لەسەر ویژدان بەجێ دەهێڵێت، هەرچەندەش "کێش"ێکی یاسایی لە گۆڕێدا نی‌یە. لە ڕاستیدا بیستنی سوورەتەکانی قورئان لە دەقە عەرەبی‌یەکەیدا گەلێ کاریگەریی قووڵ لە دەروونی مرۆڤدا بەجێ دەهێڵێت. قورئان وای بۆ دیاری کراوە کە بە دەنگێکی بەرز بخوێنرێتەوە و، دەبێ مرۆڤ بە خوێندراوەیی گوێی لێ ڕابگرێت، تاکو بڕیاری دادگەرانەی لەسەر بدات و ڕێزی شایانی لێ بگرێت..

هەروەها قورئان بەو سیفەتەی کە وتەی ڕاستەقینەی خوای گەورەیە "موعجیز" واتە (دەستەوسانکار)ە و، هیچ ڕێگایەك بۆ لاسایی کردنەوەی نی‌یە. زۆر بە ڕوونی و سادەیی بڵێین: هیچ شتێك نی‌یە هاوشێوەی بێت"[٢].

## لو بۆن[٣]

هەندێ لە وتەکانی:

١- "بلندیی بناغەکانی ڕەوشت لە قورئاندا لە هی هەموو ئایینەکانی تر - پێکەوە - بەرزترە و، ڕەوشتی ئەو نەتەوانەش کە شوێن ئایینەکەی قورئان کەوتن بە گۆڕانی ڕۆژگار و دەمارەکان گۆڕانێکی وەك هی ئەو نەتەوانەیان بەسەر هات کە ملکەچی ئایینی عیسان، درورودی لەسەر بێت. گرنگترین ئەنجامێك بتوانرێت لەم بوارەدا هەڵبهێنجرێت بریتی‌یە لە کاریگەریی قورئانی مەزن لەو نەتەوانەدا کە گەردنیان بۆ فەرمانەکانی نەوی کردووە. ئەو ئایینانەی کە بە وێنەی ئیسلام دەسەڵاتیان بەسەر دەروونەکاندا هەبێت زۆر کەمن..

(١) هەمان سەرچاوە: ٢٩٦.

(٢) هەمان سەرچاوە: ٢٩٦-٢٩٧.

(٣) "دکتۆر گوستاف لو بۆن Gustave Le Bon" پزیشك و مێژوونووسێکی فەرەنسی‌یە. ساڵی ١٨٤١ز لەدایك بووە. بایەخی بە شارستانێتیی خۆرهەڵات داوە. لە بەرهەمەکانی: حضارة العرب؛ الحضارة المصرية؛ حضارة العرب في الأندلس.

لەوانەشە هیچ ئایینێك شك نەبەین کە ئەو کاریگەرییە بەردەوامەی وەك ئەوەی ئیسلامی بۆ ڕێ کەوتبێت. قورئان تەوەرەی ژیانە لە خۆرهەڵاتدا، ئەوەتا کاریگەریی ئەو لە وردترینی شتەکانی ژیاندا دەبینین"[1].

٢ - "ئەم کتێبە (قورئان) یاسادانانێکی ئایینی و سیاسی و کۆمەڵایەتییە و، بڕیارەکانیشی ماوەی دە سەدەیە جێبەجێ کراوە"[2].

## لیختنستادتەر[3]

هەندێ لە وتەکانی:

١ - موسڵمانی ئەم سەردەمە باوەڕی وایە کە کتێبەکەی ڕێی پێ دەدات، تەنانەت پێویستیشی دەکات لەسەری کە کێشەکانی سەردەمەکەی بە شێوەیەك چارەسەر بکات لەگەڵ ئایینەکەیدا یەك بگرێتەوە. قورئان بەرژەوەندی لەدەست نادات و، ڕێ لە زانیاری ناگرێت بەو جۆرەی کە زانستی سەردەمەکەی پێی گەیشتووە. تایبەتمەندیی قورئان لە بیروباوەڕی موسڵماندا ئەوەیە کە تەواوکاری کتێبە ئاسمانییەکانە و، لە بناغەکانی ئیماندا لەگەڵیاندا یەکە، بەڵام لە سیفەتە گشتییەکەیدا لێیان جیایە. قورئان نە پەیوەستە بە پەیامێکی دیاری کراوەوە کە لەگەڵ تەواوبوونی کات و سەردەمەکەی ئەویش بڕوات، نە بە نەتەوەیەکی تایبەتیشەوە کە تەنها بۆ ئەو نەتەوەیە بگونجێت و بۆ هی تر دەست نەدات. هەرشتێك بەردەوامیی تێدا مەبەست بێت، دەبێ لەگەڵ هەموو سەردەمێکدا یەك بێت و بۆ گشت کاتێکیش دەست بدات"[4].

٢ - "بۆ پەی بردن بە کاری قورئان لەو ڕووەوە کە کتێبێکی ئایینی و کۆمەڵایەتییە، دەبێ لە ڕاستگۆیی کەسی موسڵمان تێبگەیت کاتێ جەخت دەکاتەوە لەوەی کە دەبێ

(١) حضارة العرب: ٤٣١-٤٣٢.

(٢) النتائج الأولى للحرب. لە "الإسلام والحضارة العربية"ی محەممەد کورد عەلییەوە: ١/٧٤.

(٣) "دکتۆر ئیلس لیختنستادتەر Ilse Lichtenstadter" ئافرەتێکی ئەڵمانییە. لە زانکۆی فرانکفۆرت، پاشان لە زانکۆی لەندەن زانستەکانی لەمەڕ ئیسلام و زمانی عەرەبیی خوێندووە. نزیکەی سی ساڵ لە وڵاتانی هەردوو خۆرهەڵاتی نزیك و ناوەڕاستدا ماوەتەوە. بایەخێکی تایبەتیی بە بانگەوازەکانی ئیجتیهاد و نوێکاری و بەراوردی نێوان مەزهەبەکان داوە. لە بەرهەمەکانی: الإسلام والعصر الحديث.

(٤) الإسلام والعصر الحديث. لە کتێبی "ما يقال عن الإسلام"ی عەققادەوە: ١٩.

قورئان بناغەیەك بێت بۆ پەی بردن بەو حیکمەتە ئالۆزانەی کێشەکانی کۆمەڵگای نوێ چارەسەر دەکەن. چونکە پێغەمبەر ﷺ پێی وایە کە قورئان ئەڵقەی پەیوەندییە لە نێوان خوای گەورە لە کەماڵی خوایەتییەکەیدا و، جێنشینەکەی کە بە ڕێزنە پەروەردگارییەکەی و، بە نیشانە هەرە مەزنەکەی لەودا دەردەکەوێت (کە مرۆڤە).

ئەرکی سەرشانی مرۆڤ کارکردنە - بەپێی ویستی خوا - بۆ ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان جیهانی خوایی و جیهانی بەدیهاتن و بینراو.

باشترین ڕێ بۆ گەیشتن بەم داخوازییە ئەوەیە کە کۆمەڵە مرۆڤێك بیخەنە ئەستۆی خۆیان کە بە دوای قووڵترین و پێویست ترین فەرمانەکانی خوادا بگەڕێن کە فەرمانەکانی: دادپەروەرییە بۆ هەمووان و، میهرەبانی و نەرمونیانی و چاکەیە بەرامبەر لاوازان. هەر ئەمانەش ئەو هۆکارانەن کە خوای گەورە بە دەستی مرۆڤیان دەسپێرێت بۆ رزگاربوونی. کەواتە مرۆڤ بەرپرسە لە کارەکانی، هەروەك بەرپرسە لە چارەنووسی"[1].

## مۆنتای[2]

هەندێ لە وتەکانی:

١ - "من هیچ گومانێکم لە پێغەمبەرێتیی محەممەددا ﷺ نییە و، باوەڕم وایە کە دواهەمینی پێغەمبەرانە و، بۆ هەموو مرۆڤەکان بێ جیاوازی ڕەوانە کراوە و، پەیامەکەشی بۆ کۆتایی هێنان هاتووە بەو وەحییەی کە لە تەورات و ئینجیلدا نازڵ بووە. باشترین بەڵگەش لەسەر ئەوە "قورئانی موعجیزە"یە.

من ئەو بۆچوونانەی "پاسکاڵ"ی زانای ئەورووپی ڕەت دەکەمەوە کە کەسێکی ڕقاوی و قین لەدڵە بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان. تەنیا بۆچوونێکی نەبێت کە

(١) هەمان سەرچاوە: ١٩.

(٢) "فینسای مۆنتای المنصور بالله الشافعي" خەڵکی فەرەنسایە. کەسێکی گەڕیدە و توێژەرە. پسپۆڕە لە لێکۆڵینەوەی کێشەکانی وڵاتانی عەرەب و ئیسلام لە نزیکەوە. چەندینساڵی لە مەغریب و خۆرهەڵات و ئەفریقیا و ئاسیا بەسەر بردووە، دەیان توێژینەوە و کتێبی دەربارەی ئیسلام و شارستانێتییەکەی بڵاو کردووەتەوە. لە ئەنجامدا و لە هاوینی ساڵی ١٩٧٧ز موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاندووە.

وتوویەتی: هەروەك ئینجیل دانراوی مەتتی نی‌یە، قورئانیش دانراوی محەممەد ﷺ نی‌یە"[١].

٢-"هەر هزرێکی عەرەبی و ئیسلامی کە لە کاریگەریی قورئان دوور خرابێتەوە، چەشنی پیاوێکە خوێنەکەی لێ دەرهێنرابێت"[٢]!

## هەنی[٣]

لە وتەکانی:

"چەندەش هەوڵ بدەم هەر ناتوانم وەسفی ئەو کاریگەری‌یە بکەم کە قورئان لە دڵی مندا بەجێی هێشت. من هێشتا خوێندنەوەی سێهەم سوورەتی قورئانم تەواو نەکردبوو، کە خۆمم بینی‌یەوە سوژدەم بۆ بەدیهێنەری ئەم گەردوونە دەبرد! ئەوەش یەکەم نوێژم بوو لە ئیسلامدا"[٤].

## وات[٥]

هەندێ لە وتەکانی:

١-"قورئان پێی وایە کە نیگەرانی‌یەکانی سەردەم دەرەنجامی چەند هۆکارێکی ئایینی‌یە، وێڕای هۆکارە ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی‌یەکان. هەروەها پێی وایە کە وەك هەموو شتێکی تر چاکسازی‌یان تێدا ناکرێت مەگەر لە ڕێی بەکارهێنانی هۆکارە ئایینی‌یەکانەوە نەبێت. گومان کردن لە حیکمەتی قورئاندا، چاونەترسی‌یە، گەر بڕوانینە

(١) رجال ونساء أسلموا: ٥/٤٥.

(٢) هەمان سەرچاوە: ٥/٥٠- ٥١.

(٣) "عائیشە بریجت هەنی Ayesha Bridget Honey" لە خێزانێکی مەسیحیی ئینگلیزدا پێگەیشتووە. حەزی لە خوێندنی فەلسەفە بووە. ڕۆشتووە بۆ کەنەدا بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی. لەوێ بواری بۆ ڕەخساوە کە بە ئیسلام ئاشنا ببێت و لە ئەنجامدا موسڵمان ببێت. دوایی بووە بە مامۆستا لە قوتابخانەیەکی باڵای نایجیریا.

(٤) رجال ونساء أسلموا: ١/٥٩ — ٦٠.

(٥) "ولیەم مۆنتگۆمەری وات William Montgomery Watt" ڕاگری پێشووی بەشی دیراساتی عەرەبی‌یە لە زانکۆی ئەدنبرە. لە بەرهەمەکانی: عوامل انتشار الإسلام؛ محمد في مكة؛ محمد في المدينة؛ الإسلام والجماعة الموحدة.

سەرکەوتنی محەممەد ﷺ لە گەیاندنی ئەو پەیامەی کە خوا فەرمانی گەیاندنی پێ دابوو"[١].

٢-"من ڕام وایە - هەڵوێستی ئایینیمان هەرچی‌یەك بێت - کە پێویستە پەیامی قورئان بە سەرهەڵدانێکی داهێنەر دابنێین لە بارودۆخی مەککەدا. بێ گومان کۆمەڵە کێشەیەك هەبوون کە چارەسەریان دەخواست و، چەندین قەیرانیش هەبوون کە هەندێ کەس هەوڵیان دا تەنك و سووکی بکەن. بەڵام گواستنەوەی ئەو بارودۆخە لەو کێشە و قەیرانانەوە بۆ پەیامی قورئان ئەستەمە لە ڕێی بیرکردنەوەی مەنتیقی‌یەوە بوو بێت.

بێ گومان پەیامی قورئان چەندین کێشەی کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی و فیکری چارەسەر دەکات، بەڵام هەموویان بە یەك جاری و بە شێوەیەکی بەڵگەنەویست چارەسەر ناکات.

لەوانەیە مێژوونووسێکی دنیایی بڵێت: محەممەد ﷺ بە ڕێکەوت ڕێی لە چەند بیرۆکەیەك کەوتووە کە بە وێنەی کلیل وابوون بۆ چارەسەرکردنی کێشە بنەڕەتی‌یەکانی ڕۆژگاری خۆی..

ئەوە شتێکی نەگونجاوە و، هیچ هەوڵێکی تەجریبی و هیچ بیرێکی تیژ ناتوانن وەك پێویست پەیامی قورئانمان بۆ ڕاڤە بکەن"[٢].

* * *

(١) محمد في مكة: ١٣٥.

(٢) هەمان سەرچاوە: ١٣٥-١٣٦.

وێنەی لاپەڕەیەکی دەستنووسەکەی مامۆستا "عەبدولمەجید نوورسی"
کە مەرەکەبی بەسەردا ڕژاوە لە بەرواری بەدیل گیرانی دانەر
لە یەکەم جەنگی جیهانیدا

فالخطاب هنا

٩٨

اذ هذا الخطاب مؤكد بوجوه ثلاثة بما في (يا) من الايقاظ وبما في (اي) من التوضيح وبما في (ها) من
التنبيه فكأنه [illegible]) ومن فوائد ثلاثة مقابلة مشقة التكليف بلذة الخطاب وان ترقي الانسان
من حضيض الغيبة الى مقام الحضور انما هو بواسطة العبادة وايضا اشارة الى ان المخاطب مكلف
بجهات ثلاث باعتبار قلبه بالتسليم والانقياد ومن جهة عقله بالايمان والتوحيد وبالنظر
الى قالبه بالعمل والعبادة وايضا ايماء الى ان المخاطبين ثلاث فرق وايضا تلويح الى الطبقات
الثلاث من الخواص والمتوسطين والعوام وايضا تلميح الى العرف المألوف والنسق المأنوس
ومعتاد المرء اولا ينادي احدا فيوقظه ثم يتوسط فيوجهه فيوجهه اليه فيخاطبه فيخدمه
فبناء على هذه النكت تكون التأكيدات في الخطاب مؤسسة من تلك الجهات اما النداء في (يا) فلان
المنادى هو كل الناس المشتمل على الطبقات المختلفة من الغافلين والغائبين والساكتين والكاملين و
المشغولين والمعرضين والمحبين والطالبين والكاملين يكون هذا النداء للتنبيه وكذا للاحضار وكذا
للتحريك وكذا للتعريض وكذا للتفريغ وكذا للتوجيه وكذا للتهييج وكذا للتشويق وكذا
للازدياد وكذا لهز العطف واما البعد في (يا) مع ان المقام مقام القرب فاشارة الى جلالة
وعظمة امانة التكليف وايضا ايماء الى بعد درجة العبودية عن مرتبة الالوهية وايضا رمز
الى بعد اعصار المكلفين عن محل ومن وزمان ظهور الخطاب وايضا تلويح الى شدة غفلة
البشر واما (اي) الموضوع للتوسع من العموم فرمز الى ان الخطاب لعموم كل انسان فيحقق
من بينها الانسان يحمل الامانة على طريق فرض الكفاية فاذا تصور الانسان خاطب لحق مجموع كل انسان
ثم في (اي) جزالة الاجمال ثم التفصيل واما (ها) فمع كونه عوضا عن المضاف اليه اشارة الى التنبيه
من حيث يا واما (الناس) فاشارة بحكم تلميح الوصف الاعلى الى العتاب اي ايها الناس كيف
تنسون الميثاق الازلي وايضا الى العذر اي ايها الناس لابد ان يكون قصوركم عن السهو والنسيان
لا بالعمد والجحد حقيقة الى التشويق اي ايها الانسان المستأنس بذكر الله [illegible]
اما (اعبدوا) فبحكم جوابيته للنداء العام مناداه للطبقات المذكورة يدل على الاطاعة ويشير الى
الاخلاص

فمعاني كلها مرادة

وێنەی لاپەڕەیەکی دەستنووسەکەی مامۆستا "عەبدولمەجید نوورسی"

کە دانەر بە خەتی خۆی ڕاستکردنەوەی تێدا ئەنجام داوە

# اشارات الاعجاز فی مظان الایجاز

لبدیع الزمان



ناشری

عبدالرحمن



فیاتی

قرق غروش



اوقاف اسلامیه مطبعه‌سی
١٣٣٤

وێنەی یەکەم لاپەڕەی چاپی یەکەمی (إشارات الإعجاز)

الانبياء * وانه مرسل لكافة الاقوام * وان شريعته ناسخة لجميع الشرائع * و جامعة لمحاسنها اما وجه انعكاس المقصد الاول فى تلك الكلمة فهو ان (من قبلك) انما يقال اذا اتحد المسلك وكان الطريق واحدا فكأن هذه الكلمة تترشح بان الحجج على نبوة من قبله و صدق كتبهم حجة بمجموعها بتنقيح المناط و تحقيق المناط بالقياس الاولى على نبوة محمد عليه السلام و نزول كتابه فكأن جميع معجزاتهم معجزة فذة على صدق محمد عليه السلام * واما وجه انعكاس المقصد الثانى وهو «الاكملية» فيها فهو ان (من قبلك) بناءً على ملاحظة عادة ان السلطان يخرج فى أخريات الناس * وعلى قاعدة التكمل فى نوع البشر المقتضية لاكملية المربى الثانى عن المربى الاول * وعلى اغلبية مهارة وزيادة الخلف على السلف تلوح بان محمداً عليه السلام سلطان الانبياء اكمل من كلهم كما ان القرآن اجمع واجل من كتبهم * واما وجه تشربها من المقصد الثالث وهو «الخاتمية» فهو ان (من قبلك) بسر قاعدة ان الواحد اذا تكرر تسلسل لا يمكن وان الكثير اذا اتحد استقر لا ينقطع . وبايهام المفهوم المخالف تلمح بانه عليه السلام خاتم الانبياء * واما وجه انصباغها من المقصد الرابع وهو «عموم الدعوة» فهو ان من قبلك المفيدة انك خلفهم وكل منهم سلفك بسر قاعدة ان الخلف يأخذ تمام وظيفة السلف و يقوم مقامه تشير بانه اذا كان كل منهم سلفك فانت نائب الكل ورسول جميع الامم ثم لا يكون الا كذلك اذ الفطرة حاكمة له والحكمة قاضية به لانه كانت امم العالم الانسانى قبل زمان السعادة فى غاية التباعد والاختلاف مادةً ومعنىً و استعدادا و تربيةً ما كفت لهم التربية الواحدة وما شملت الدعوة المنفردة * ثم لما انتبه العالم الانسانى بزمان السعادة بعده وتمايل الى الاتحاد * بمداولة الافكار * ومبادلة الطبائع * واختلاط الاقوام * وتحرى البعض عن حال البعض حتى تمخض الزمان بكثرة طرق المخابرة والمناقلة فصارت الكرة كمملكة وهى كولاية وهى كبلدة و اتصل الرحم بين اهل الدنيا كفت الدعوة الواحدة والنبوة الفريدة للكافة * واما وجه اشمامها بالمقصد الخامس فهو ان (من قبلك) المومية من «من» الى «الى» ومن «الى» الى الاغناء اى انتهت الرسالة بقدومك اذ اغنت شريعتك ترمز بان شريعته عليه السلام ناسخة بالانتهاء و جامعة بالاغناء * واعلم ان الامارة لنظر البلاغة على تشرب هذه الكلمة لهؤلاء اللطائف هى ان هذه المقاصد الخمسة كالانهار الجارية تحت هذه الايات حتى يفور هذا بكماله فى آية و ينبع ذاك بتمامه فى اخرى و يتجلى ذلك بشر اشيره فى آخرة * فادنى ترشح على السطح يومى بتماس عروق الكلمة بها * و ايضا تتسلسل هذه المعانى فى آيات مسوقة لها (وبالآخرة هم يوقنون) اعلم ان مآل هذه الآية هو المقصد الرابع من المقاصد الاربعة المشهورة وهو «مسئلة الحشر» ثم انا قد استفدنا من نظم القرآن عشرة براهين عليها ذكرناها فى كتاب آخر فناسب تلخيصها هنا وهى ان الحشر حق * لان فى الكائنات نظاما اكمل قصديا * وان فى الخلقة حكمة تامة * و ان لاعبثية فى العالم و ان لا اسراف فى الفطرة و المزكى لهؤلاء الشواهد الاستقراء التام بجميع

(حاشية: هو الفناء الفارق .)

(حاشية: وهو صنف العلماء المتفق عليها فى النوع اى اقامة الدليل على وجه ما فيه)

وێنەی لاپەڕەیەکی چاپی دووهەمی (إشارات الإعجاز) بە خەتی مامۆستا صەدرەدین بەدلیسی پەراوێزی لەسەر نووسراوە

من مخطوط:

«السيد طاهر الشوشي» رحمه الله تعالى

## قيمة الكتاب

| | |
|---|---|
| هذا الكتاب الذي لو يشتريه فتىً | بوزنـه ذهباً أقســمتُ لم يُلَمِ |
| لأنه معـدن الأســرار والنكـت | وأنـه منبـع الأنــوار والحكـم |
| وانه سُــلَّمُ المســتصعــدين إلى | إعجــاز نظم كلام اللهّ فاغتنم |
| طوبى لصــاحبه يا أجـر ناشـره | بشـــرى لقــارئـه بأوفـر النعم |
| اغفـر لصاحبه واغفــر لكاتبـه | واغفر لقارئه يا أوســـع الكرم |

# پێڕستی بابەتەکان

# فهرس الموضوعات

| الموضوع | الصفحة |
| --- | --- |

## سوورەتی "البقرة"

سورة البقرة

* * *

***

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَا اللهُ، يا رَحْمنُ، يَا رَحِيمُ، يَا فَرْدُ، يَا حَيُّ، يَا قَيُّومُ، يَا حَكَمُ، يَا عَدْلُ، يَا قُدُّوسُ.

تو حەققی ئیسمی ئەعزەم و حورمەتی قورئانی خاوەن ئیعجازی بەیان و ڕێز و شەرەفی پێغەمبەری ئەکرەم، دروودی لەسەر بێت، هەموو ئەو کەسانەی کە کاریان لە چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبی "ئاماژەکانی ئیعجاز"ەدا کردووە و یارمەتیدەرە پیرۆزەکانیشیان و قوتابیانی پەیامەکانی نوور بخەرە ناو بەختەوەریی هەمیشەیی لە بەهەشتەکانی فیردەوسدا. ئامین..

هەمیشە و بەردەوام لە خزمەتی ئیمان و قورئاندا تەوفیقیان بدە. ئامین.. لە بەرامبەر هەر پیتێکی کتێبی "ئاماژەکانی ئیعجاز"ەوە هەزار کردەوەی چاك لە لاپەڕەی کردەوە چاکەکانیاندا بنووسە. ئامین.. بە چاکەی خۆت دامەزراوی و بەردەوامی و ئیخلاسیان لە بڵاوکردنەوەی نوورەکاندا "پەیامەکانی نوور" پێ ببەخشە. ئامین..

یا أرحم الراحمین! سەرجەمی قوتابیانی پەیامەکانی نوور لە هەردوو دنیادا بەختەوەر بفەرموو. ئامین.. لە شەڕی شەیتانەکانی ئینس و جینن بیانپارێزە. ئامین.. لە قسوورەکانی ئەم "سەعید"ە بەندە بێچارەیەش خۆش بە. ئامین.. ئامین.. ئامین.

بە ناوی هەموو قوتابیانی نوورەوە

سەعیدی نوورسی

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

يَا اللهُ، يا رَحْمنُ، يَا رَحِيمُ، يَا فَردُ، يَا حَيُّ، يَا قَيُّومُ، يَا حَكَمُ، يَا عَدْلُ، يَا قُدُّوسُ.

بحقِّ الإسمِ الأعظمِ وبحُرمةِ القرآنِ المعجزِ البيانِ وبكرامةِ وشَرَفِ الرسُّولِ الأكرمِ، عليه الصلاة والسلام، أَدْخِلْ مَن اشتغلَ بطبعِ ونشرِ «إشاراتِ الإعجازِ» هذه وأدخِلْ مُساعِديهم المباركين ورفقاءهم وطلبةَ رسائلِ النورِ في السعادة الأبديةِ في جنّاتِ الفردوس. آمين. ووفّقْهم في خدمةِ الإيمانِ والقرآنِ دَوْماً .آمين. واكتبْ في صحيفةِ حسناتِهم ألفَ حسنةٍ لكلِّ حرفٍ مِن حروفِ كتابِ «إشاراتِ الإعجاز».. آمين. وأحْسِنْ إليهم بالثباتِ والدّوامِ والإخلاصِ في نشرِ الأنوار "رسائل النور".. آمين.

يا أرحمَ الراحمين! أسعِدْ جميعَ طُلابِ النورِ في الدنيا والآخِرَةِ واجعلْهم سُعَداءَ. آمين. واحفظْهم وقِهِمْ شرَّ شياطينِ الجِنِّ والإنسِ.. آمين. وتجاوَزْ عن تقصيراتِ هذا العبدِ المسكينِ سعيدٍ.. آمين ..آمين.. آمين.

باسمِ جميعِ طلبةِ رسائلِ النورِ

**سعيد النورسي**

# "پەیامەکانی نوور" بە زمانی کوردی

لەبەر ئەوەی ئەم کتێبەی بەردەستمان وەرگێرانی "ئاماژەکانی ئیعجاز"ە بە زمانی کوردی، کە ئەویش لە زنجیرەی "سەرجەمی پەیامەکانی نوور"ە، ئەوا بە پشتیوانیی خوای گەورە ئەم بەندەی خوارەوە - بە دەستکاری‌یەکی کەم - لە کتێبی "ژیاننامە"ی دانەرەوە دەهێنین، چونکە هەندێ بە تێر و تەسەلی باس لە وەرگێرانی پەیامەکانی نوور بۆ زمانی کوردی دەکات.

وەك ئاشکرایە زۆرینەی نووسینی زمانی کوردی بە دوو زاری سەرەکی بڵاودەکرێنەوە:

١ - کرمانجیی ژووروو (بادینانی، شکاکی).

٢ - کرمانجیی خواروو (سۆرانی).

## پەیامەکانی نوور بە زاری کرمانجیی ژووروو

سەبارەت بە کرمانجیی ژووروو، پێی بزانم مامۆستا "عەبدولقادر بادللی" - خوا لێی خۆش بێت -کە قوتابی‌یەکی مامۆستا نوورسی‌یە، یەکەم کەس بێت کە پەیامێکی نووری وەرگێرابێتە سەر ئەو زارەی زمانی کوردی و چاپی کردبێت، کە بریتی‌یە لە "وتە بچووکەکان" و، بە ناوی "پەیڤێن بچووك" لە لایەن دەزگای پەخشی "دار الانوار"ەوە لە ئەستەمبوڵ بە پیتی عەرەبی بڵاوکراوەتەوە.

لە خودی مامۆستا عەبدولقادر بادللیم بیست کە مامۆستا "محەممەد زاهیدی مەلازگوردی" - خوا لێی خۆش بێت - جگە لە وەرگێرانە عەرەبی‌یەکەی بۆ پەیامەکانی نوور، هەموو پەیامەکانی وەرگێراوەتە سەر زاری کرمانجیی ژووروویش، بەڵام هێشتا هەر دەستنووسن.

برای بەڕێزمان مامۆستا ئیبراهیم خەلیل ئامەدی هەردوو کتێبی "ئاساری بەدیعییە" (داوەری‌یەکان) و "مەسنەویی نووری"ی کردووە بە کرمانجیی ژووروو، لە لایەن دەزگای پەخشی "زەهرا"وە بە پیتی لاتینی بڵاوکراوەتەوە.

دەزگای پەخشی ناوبراو چەند پەیامێکی تری نووری بە کوردی بڵاو کردووەتەوە، کە لە لایەن چەند وەرگێڕێکەوە کراون بە زاری کرمانجیی ژووروو.

برای بەڕێزمان مامۆستا مەلا فەیزی زوزنجی ئامەدی "وتە بچووکەکان" و "وتەی بیست و سێ‌هەم" و "مەکتووبی بیستەم"ی بە شێوە زاری کرمانجیی ئامەد دارشتووەتەوە و، دەزگای پەخشی "ر.ن.ك" لە دوو توێی کتێبێکدا بڵاوی کردووەتەوە.

لەم ساڵانەی دواییشدا دەزگای پەخشی "خزمەت وەقفی" چەند پەیامێکی دیکەی بە زاری کرمانجیی ژووروو بڵاو کردەوە کە لە لایەن چەند وەرگێڕێکی بەڕێزی لاوەوە کرابوون بە کوردی.

ئەم هەوڵانەی کە لە سەرەوە باسمان کردن سەبارەت بە زاری کرمانجیی ژووروو، هەموویان لە باکووری کوردستاندا ئەنجام دراون و، ڕاستەوخۆ لە زمانی تورکی‌یەوە کراون بە کوردی.

لە باشووری کوردستانیش، برای بەڕێزمان مامۆستا "ئیدریس غازی" تا ئێستا چەند پەیامێکی لە عەرەبی‌یەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، زاری کرمانجی ژووروو (بادینانی). ئومێدی سەرکەوتن و بەردەوامبوونی لە خوای گەورە بۆ دەخوازین.

هیواداریـن ئەم خزمەتە پەرت و بڵاوەی کە بۆ وەرگێڕانی پەیامەکان بۆ زاری کرمانجیی ژووروو دراوە و دەدرێت، لە لایەن ئەو دڵسۆزانەوە پەیوەست بکرێت و، بە وێنەی دەستەیەکی زانستیی تەواوکەری یەکتر هەوڵەکانیان یەك بخەن و کارەکانیان دابەش بکەن، بە پێی ڕێنمایی مامۆستا نوورسی بۆ ئەو چەشنە کارانە.

## پەیامەکانی نوور بە زاری کرمانجیی خواروو (سۆرانی)

❐ وەرگێڕان و کارەکانی پێش بڵاوکردنەوە

خوای گەورە بە چاکە و میهرەبانیی خۆی پشتیوانیی لە وەرگێڕی ئەم کتێبە و نووسەری ئەم چەند دێڕە کرد و، لە ساڵی هەشتای سەدەی بیستەمەوە دەستم دایە وەرگێڕانی ئەم پەیامانە لە زمانی عەرەبی‌یەوە بۆ زمانی کوردی (زاری سۆرانی).

خۆ هەرچەندە کاری "وەرگێڕان"ەکەم بە تەنیا کەس ئەنجام داوە، بەڵام بەرەکەتی "ئیمان" لە پەیامەکانی نووردا وەرگێڕانەکەی ئێمەی لە کاری تەنیا کەسەوە کردە کارێکی بەکۆمەڵ، چونکە دەستەیەك ئیمانداری دڵسۆز و نیاز جوان و وریای نارد بە هانای لاوازی و کەم توانایيمەوە کە هەر یەکەیان لە ڕوویەوەکەوە هاتن بۆ یارمەتیم و بەشێکی ئەم ئەرکە قورسەیان لەگەڵدا هەڵگرتم.

جا ئەگەر ناوهێنانی سەرجەمی ئەو بەڕێزانەی کە دەستی خاوێنی یارمەتی‌یان بۆ ئەم پەیامە کوردی‌یانە درێژ کردووە لێرەدا مەیسەر نەبێت، کە لێم ڕوونە بەو ناوهێنانە ڕازی نین چونکە بە نیازی ڕەزامەندیی لای خوای گەورە ئەو خزمەتانەیان پێشکەش کردووە، ئەوا هەرگیز ناتوانم ڕۆڵی گەورەی ئەم بەڕێزانە فەرامۆش بکەم:

برای بەڕێزم جەنابی مامۆستا (حسەین حەسەن کەریم) مامۆستا لە زانکۆی سلێمانی هەموو بەرگەکانی "سەرجەمی پەیامەکانی نوور"ی لەگەڵ وەرگێڕانە عەرەبی و دەقە عەرەبی‌یەکاندا بەرامبەر کردووە و، گەلێ تێبینیی سوودبەخشی پێش چاو خستووە.

هەروەها بەڕێزان (کاك عەبدولکەریم عەبدوڵڵا - خوا لێی خۆش بێت -، دکتۆر دیدار کامەران، دکتۆر محەممەد خالید، ئەحمەدی کوڕم) کاری بەرامبەرکردنەوەی وەرگێڕانەکەی ئێمەیان لەگەڵ ئەو دەقانەی پەیامەکاندا خستە ئەستۆی خۆیان کە لە بنەڕەتدا بە زمانی "تورکی"ن و، هەردەم ئاگادارمان دەکەنەوە لە هەر تێبینی‌یەك کە پێویست بێت بۆ یەکاویەك دەرچوونی ئەم کوردی‌یانە لەگەڵ دەقە ئەسڵی‌یەکاندا.

چەند برایەکی بەڕێزیش لە ڕێکخستنی پیتەکانی پەیامەکاندا لەسەر کۆمپیوتەر بەشداری‌یان کردووە، وەك بەڕێزان کاك (هیوا حسەین، ئوسەید ئیحسان، ئەسکەندەری حاجی شێخ قادر، ئەحمەدی کوڕم، کاك سەعید خالید) و چەندین بەڕێزی

تر. بەڵام ڕۆڵی سەرەکی و ماندووبوونی زۆر لەم ڕووەوە زیاتر بەر کاك "هۆشیاری مام تۆفیق" کەوت کە بۆ ماوەی چەند ساڵێك ئەم ئەرکەی لە ئەستۆ گرت.

پاکنووسی وەرگێڕانی پەیامەکانیش، بەشی هەرە زۆری، کاك "شازاد سەعید" خستیە ئەستۆی خەتە جوانەکەی خۆی کە تەنانەت هەندێ جار نەك هەر پاکنووسەکان بەڵکو ڕەشنووسەکانیشی دەنووسییەوە.. هەندێ جاری تر نەك هەر بە نووسینەوەی دەستی بەڵکو ڕاستەوخۆ وەرگێڕانەکەی لە زاری من وەردەگرت و لە کۆمپیووتەردا دەینووسییەوە! جگە لەوەی کە لە کاری تایپکردندا پشکێکی زۆری بەر کەوت.

کاك شێخ خالید بەرزنجیش، وێڕای کاری بەراوردکردن، چەندین جاریش خۆی و کوڕەکانی (دکتۆر محەممەد و مامۆستا سەعید) بە وردی ئەم پەیامانەیان خوێندەوە و لە ڕاستکردنەوە و هەڵەگیری و پێشکەش کردنی تێبینییە وردەکاندا جێدەستیان نمایانە. هەر لەم کاری هەڵەگیری و پێداچوونەوەیەشدا بەڕێزانی تری وەك کاك (حامید و جەمال و هۆشیار و شازاد و هێمن و شاخەوان و فەرمان و سەیوان) بە وردی بەشدارییان کردووە و سوودمان لە تێبینییەکانیان وەرگرتووە.

لە پێش هەموو ئەو بەڕێزانەشەوە ناتوانم ڕۆڵی مامۆستای بەڕێزم "ئیحسان قاسم ساڵحی" فەرامۆش بکەم کە هەموو مافێکی شەرعی و یاسایی ئەم پەیامانەی پێ بەخشیم.

خۆ ئەگەر لە نزیکتریشەوە ئاوڕ لە جێدەستی خاوخێزانم بدەمەوە، ئەوا لە ڕووی ئەمەکەوە هەرگیز ناتوانم ڕۆڵی هاوسەری خۆشەویستم لەیاد بکەم کە چەندین ساڵی درێژخایەن گەلێ ئەرکی خێزانیی منی خستە ئەستۆی خۆی، تاکو بتوانم بۆ ئەم خزمەتە لێ ببڕێم و بەشێکی کاتەکانمی بۆ تەرخان بکەم.

جا من لێرەدا، بە شانازییەوە، پێزانین و سوپاسگوزاریی خۆم پێشکەش بە هەموو یەکێکی ئەو بەڕێزانە دەکەم کە ناوم هێنان و بەوانەش کە هەر ڕۆڵێکی ئیجابییان لەم خزمەتەدا بینیوە. لە هەمان کاتدا دەستی نزا و لاڵانەوەش لە دەرگانەی خوای گەورە و میهرەباندا بەرز دەکەمەوە کە پاداشتی یەك بە یەکی هەموویان بە پلەی بەرزی بەهەشتی بەرین بداتەوە. هەروەك ناوە جوانەکانیشی دەکەم بە تکاکار کە لێمان خۆش ببێت و، لەودنیادا بە ڕەزامەندیی خۆی بەهرەمەندمان بکات و، لەم دنیاشدا نیازی خاوێن و پاکیمان لە کردار و گوفتاردا - لەگەڵ خۆی و بەندەکانی - پێ ببەخشێت. هەروەها بە ڕوانینی فەزڵ و میهرەبانیی خۆیشی ئەم ڕەنجەمان لێ قبووڵ بفەرموێت. ئامین.

تکای برایانەشم لە خوێنەری بەڕێزی ئەم کتێبانە ئەوەیە کە لە پاشملە دوعای خێرمـان بۆ پاشەکەوت بکات و، هەر تێبینییەکی سوودبەخشی هەیـە، چ لـە ڕووی وەرگێڕان و چ لە ڕووی داڕشتن و هـەر ڕوویـەکی تـرەوە بێـت، بـە دیـاری بۆمـان بنـێرێت، تـاکو لـە چاپەکانی داهاتوودا سوودی لـێ وەربگرین و، ئەویش لەم خێرەدا بەشدار بێت.

❑ بڵاوکردنەوەی ئەم وەرگێڕاوە کوردییانە.

هـەروەك خـوای گـەورە بـەو جـۆرە یارمـەتیی دایـن بـۆ وەرگـێڕانی بەرهەمـەکانی "مامۆستا سەعیدی نوورسی" بۆ زمانی کوردی و ئامادەکردنیان بۆ چاپ، هەر بە هەمان جۆر یارمەتیشی داین کە تا ئێستا بەم جۆرەی خوارەوە بڵاویان بکەینەوە، کە هەندێکیان چەندین جار چاپ کراونەتەوە:

### یەکەم: لە شێوەی کتێب و نامیلکەی سەربەخۆدا

١ – پەیامی بیماران.
٢ – پەیامی پیران.
٣ – وتە بچووکەکان.
٤ – سروشت هونەرە یان هونەرمەند؟!
٥ – مەلائیکەت و ژیانی دواڕۆژ.
٦ – پەیامی ڕەمەزان.
٧ – حیکمەتی خۆپەنادان لە شەیتان.
٨ – پەیامی ئیخلاس و برایەتی.
٩ – زللەی میهرەبانی.
١٠ – چـارەسـەری وەسـوەسـە.
١١– مرۆڤ و ئیمان.
١٢ – بەری درەختی ئیمان.
١٣ – موعجیزاتی ئەحـمـەدی.
١٤ – ئیجتیهاد لەم سەردەمەدا.
١٥ – پەنجەرەکان.
١٦ – پەیامی حەشر.
١٧ – (من) خودیی مرۆڤ و بزووتنی گەردیلەکان.

١٨ - ڕابەری لاوان.
١٩ - ڕابەری خوشکان.
٢٠ - ڕابەری خزمەتگوزارانی قورئان.
٢١ - ڕاستییەکانی ئیمان.
٢٢ - ڕاستیی تەوحید.
٢٣ - شوکرانەبژێری.
٢٤ - بینینەکانی گەشتیارێك.
٢٥ - میعراجی پێغەمبەر ﷺ.
٢٦ - موعجیزاتی قورئانی.
٢٧ - لاوێتیی قورئان.
٢٨ - سوننەتی پێغەمبەر ﷺ پلیکانە و ڕێبازە.
٢٩ - نوورەکانی حەقیقەت.
٣٠ - موناجات.
٣١ - کلیلێك بۆ جیهانی نوور.
٣١ - وتاری شام.
٣٢ - مونازەرات.
٣٣ - بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت.
٣٤ - سنووحات.. شەش هەنگاوەکان.
٣٥ - گزنگەکان.. ئاماژەکان.. هێماکان.

## دووهەم: لە شێوەی کۆمەڵە پەیام و بەرگی گەورەدا

١ - وتەکان.
٢ - مەکتووبات.
٣ - بریسکەکان.
٤ - تیشکەکان.
٥ - پاشبەندەکان.
٦ - داوەرییەکان
٧ - ئاماژەکانی ئیعجاز (ئەم کتێبەی بەردەستت)
٨ - مەسنەویی نووری (بە پشتیوانیی خوا، کە ئامادە کرا بۆ چاپ، بڵاودەکرێتەوە).
٩ - ژیاننامەی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی.

# إشارات الإعجاز

الجلد السابع من كليات رسائل النور

التي ألفها: بديع الزمان سعيد النورسي

ترجَمها من العربية إلى الكردية: فاروق رسول يحيى



# SIGNS OF MIRACULOUSNESS

From the Risale-i Nur Collection

By:

Bediuzzaman Said Nursi

Translated from Arabic into Kurdish by:

Farooq Rasool Yahya



# İŞÂRĂTÜ'L-İ'CÂZ

Risale-i Nur Külliyatından

Müellifi:

Bediüzzaman Said Nursi

Kürtçeye Mütercimi:

Faruk Resul Yahya



# اشارات اعجاز

هفتمين كتاب از كليات رسائل نور

تأليف دانشمند بزرگ: بديع الزمان سعيد نورسى

مترجم به زبان كردي: فاروق رسول يحيى